# ناوەڕۆك

## پێشەکی وەرگێڕ

ژان پۆل ســـارتەر (١٩٠٥-١٩٨٠) تەنیا فەیلەســـوف نییە، ڕۆمان، شانۆگەری و ڕەخنەی ئەدەبیشـــی نوسیوە. لە ســـاڵی ١٩٦٤دا خەڵاتی نۆبلی لەسەر ئەدەب پێبەخشراوە، بەڵام لەبەر هۆکاری ڕامیاری وەرینەگرتوە. بەرهەمە ئەدەبییەکانی، بێجگـــە لە جوانکاری لە شیوازی دەربڕیندا، ناوەڕۆکێکی فەلسەفیشـــیان بەخۆوە گرتوە. ئەم بیریارە هەوڵیداوە لە دەروازەی ئەدەبەوە بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی بە خوێنەر بگەیەنێت. بیروباوەڕی فەلسەفی سارتەر، کە بە بوونگەرایەتی ناسراوە لەم شابەرهەمەیدا (بوون و نەبوون) باســـکراوە و ڕۆشنایی خراوەتە ســـەر کێشە گرنگەکانی. دەتوانـــم بڵێم، ئەم بەرهەمە دوای (کات و بوون)ی مارتن هایدیگەر بە گەورەترین کتێبی فەلسەفی بوونگەرایەتی دادەنرێت.

ســـارتەر یەکێکە لەو بیریارانەی کاریگەرێتی بەســـەر ســـەردەمەکەی و دوای خـــۆی ئاشکـــرا دەبینرێت. پاش جەنگـــی جیهانی دووەم گەلێـــک لە فێرگە و بزوتنـــەوە ئەدەبی و هونەرییەکان، تەنانەت شۆڕشـــی خوێندکاران لە ئەوروپا و بزوتنەوەی چەپی نوێ ســـودیان لە بیروباوەڕەکانی وەرگرت. هەروەها، ســـارتەر هەوڵیدا پردی پەیوەندی لە نێوان بوونگەرایەتی و مارکسیزمدا دروستبکات و دژی ستالیزمیش ڕاوەستا. هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەکەشی لەگەڵ سیمۆن دیبۆڤوار، کە فەیلەســـوفێکی ژنی بوونخوازە و یەکێکە لە پێشـــەوایانی فێمەنیزم واتایەکی نوێی بە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو بەخشـــی. بێجگە لەمانە، هەڵوێستی ڕامیاری ســـارتەر بۆ بەرگریکردن لە مافی گەلانی چەوســـاوە فەرامۆش ناکرێت. لەبەرئەم هۆکارانە، مەبەستم جێگەی مێژوویی سارتەر و گرنگی نوسراوەکانی بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی بوونگەرایەتی بە پێویستم زانی ئەم کتێبە بۆ کوردی وەرگێڕم تاکو خوێنەری کورد ڕاســـتەوخۆ، لە ڕێگەی ئەم نوسراوەوە مامەڵە لەگەڵ بیروباوەڕە فەلسەفییەکانییدا بکات.

سارتەر لە ساڵی ١٩٣٩دا دەستی بە نوسینی ئەم کتێبە کردوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٣دا تەواوی کردووە و لەچاپیداوە. کاریگەرێتی بیروباوەڕی ئەدمۆند هوســـرڵ و مارتـــن هایدیگەری بە ئاشکرا بە ســـەرەوە دیارە. بەڵام، پێویستە ئەو خاڵەش باســـبکەین، کە سارتەر پێش ئاشنابوونی بە فەلسەفەی هایدیگەر فینۆمینۆلۆجی هوسرڵی ناسیوە. لە ســـاڵی ١٩٣٢ بۆ توێژینەوە لەسەر میتۆدی فینۆمینۆلۆجی بـــۆ بەرلین دەچێت و لە ســـاڵی ١٩٤٠دا کاتێک نازییەکـــان بە دیل دەیگرن و لە

ئۆردوگایەکی نزیک شاری (تریەر)ی ئەڵمانیا دادەنرێت، کەشیشێکی ئەڵمانی (بوون و کات)ی هایدیگەر بە نهێنی بە سارتەر دەدات. لەو کاتەوە سارتەر دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی هایدیگەرەوە. دواجاریش لە ساڵی ١٩٤٢، دوای بەربوونی، بۆ یەکەمجار دەبێت بە میوانی هایدیگەر و یەکدی دەبینن. ئەم شاکارە فەلسەفییەی سارتەر لە ساڵی ١٩٥٨ دا لەلایەن (هایزڵ ئی بارنس)ەوە، کە لە زانکۆی کۆڵۆرادۆ مامۆستای فەلسەفــــە بوو، کرا بە ئینگلیزی و بڵاوکرایـــەوە. منیش لە دەقە ئینگلیزییەکەی ئەم مامۆســـتایەوە بۆ کـــوردی وەرمگێڕاوە و هیوادارم خوێنەری کورد ســـودی لێوەرگرێت. دواجاریش، سوپاســـی (تابان)ی خوشکم دەکەم، کە وەکو جارەکانی پێشو ڕەشنوسەکەی خستەسەر کۆمپیوتەر. سوپاسی، هونەرمەند ڕوشدی ئەنوەر بۆ دانانی نەخشـــی بەرگەکەی دەکەم و هەروەها سوپاســـی دەزگای 'ســـەردەم' دەکەم، کە ئەرکی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمایان گرتەخۆ.

د. محەمەد کەمال
زانکۆیماڵبۆرن
٢٠١١

## پێشەکی

### ١. گەڕان بە دوای بووندا

بیرکردنەوەی نوێ، لەگەڵ گەڕانـــەوەی بوون بۆ زنجیرەیەک دیاردە، کە خۆی تیایاندا بەرجەســـتە دەکات، بەرەو پێشـــەوە چووە. ئەمەش بـــۆ لەناوبردنی ئەو بۆچوونە دووەلیستییە خراوەتەگـــەر، کە فەلسەفەی شەرمەزار کردوە و لەجێگەی ئـــەو [بۆچوونێکی] یەکانەگـــی دیاردەیی دامەزرانـــدووە.[1] ئایا ئـــەم هەنگاونانە سەرکەوتوانەیە؟ ئێمە بەدڵنیاییەوە بۆ یەکەمجار دووەلیزم لەناودەبەین، کە لە نێو هەمـــوو هەبووەیەکدا لایەنی ناوەوە و دەرەوە، دژوەســـتاو ڕادەگرێت. ئەو لایەنەی دەرەوەی هەبوو، وەکو پەردەیەک ڕاستییەکی ناوەکی لە پشتی خۆیەوە شاردبێتەوە، نامێنێت. هەروەها ڕاســـتی ناوەکیش ئەگەر ئەو نهێنییەبێت بوونی شتێکی لەسەر ڕاوەســـتابێت، مرۆڤیش تەنیا بیرۆکەیەکی لەبـــارەوە هەبێت و هەرگیز پێی نەگات چونکە (ناوەکی)یە؛ دەفەوتێت. ئەو دیاردانەی بوونی تێدا بەرجەستە دەبن، ناوەکی یان دەرەکی نین؛ هەموویـــان یەکسانن و ئاماژە بۆ دیاردەکانی دیکە دەکەن. هیچ کام لەم دیاردانە بوونێکی بەرزی نییە. بۆنموونە، هێز بنەڕەتێکی نەزانراو نییە خۆی لەودیو کارتێکراوەکانییەوە شاردبێتەوە: ئەو هەموو کارتێکراوەکانە. بەهەمان شێوە، وزەی کارەبا بۆ سەرچاوەیەکی شاراوە ناگەڕێتەوە؛ بەڵکو هەمووی جوڵە و چالاکییە کیمیاوی و فیزیکییەکانە، کە بەرجەستە دەبێت. هیچ کام لەم چالاکییانە بە تەنیا و بـــە بێ ئەوی دی ناتوانێت ئەو بەرجەســـتە بکات. هیچ چالاکییەکیش ئاماژە بۆ لایەنێکـــی نادیار ناکات. ئاماژە بۆ خـــۆی و زنجیرەی هەموو دیاردەکان دەکات. لە ئاکامدا بەو خاڵە دەگەین، کە بۆچوونی دووەلیستانەی نێوان بوون و دیاردەکان لە فەلسەفەدا جێگەی نابێتەوە. دیاردە بەشێکە لە زنجیرەی هەموو دیاردەکانی دیکە و بۆ ڕاســـتییەکی شاراوەی ئەودیو خۆی ناگەڕێتەوە. هەروەها، بەوجۆرەی هەندێک لە بیریاران بۆیدەچن، دیاردە خۆدەرخستنێکی نەرێی بوون نییە یان لایەنی نالەباری نۆمینە نییە.[2] نۆمینەش بوونی نییە و شتێکی ئەندێشەییە و بە هەڵە دانراوە.

---

١ زاراوەی (یەکانەگی)م بۆ مۆنیزم و (دیاردە) بۆ فینۆمینە بەکارهێناوە. یەکانەگی بۆچوونێکی ئۆنتۆلۆجییانەیە، کە فرەلایەنی و زۆری دیاردەکان بۆ یەک بنەڕەت دەگەڕێنێتەوە. ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی دووەلیستانەیە، کە باوەڕی بە دوو بنەڕەتی جیاواز بۆ هەبووەکان هەیە. (وەرگێڕ)

٢ لێرەدا سارتەر ئاماژە بۆ بۆچوونە دووەلیستییەکەی کانت دەکات، کە بوون و دیاردەی بە نۆمینە و فینۆمینە داناوە.(نۆمینە) ڕاستی و بنەڕەتی نەناسراوی دیاردەکانە لەو دیو دەستەڵاتی زانینی مرۆڤەوە. بۆ ئەمەش بڕوانە:
Immanuel Kant. *Critique of Pure Reason*, translated by Norma Kemp Smith. London: Macmillan, 1963. A: 235, B: 294.

هەرچەندە هەندێک لە فەیلەسوفەکان باوەڕیان بەم لایەنەی بوون هەیە، بەڵام سەلماندنی و هێشتنەوەی کێشەی زۆری بۆ دروستکردون. ئەگەر ئێمە ئەو لایەنەی نیتشـــە بە"جیهانە ئەندێشاوییەکانی ئەودیو پەردەکان" دایدەنێت ڕەتبدەینەوە و باوەڕ بە ڕاســـتییەک لەو دیو دیاردەکانەوە نەکەین، دیاردە پۆزەتیڤانە دەبینرێت. ناوەڕۆکـــی دەبێت بەوەی دەردەکەوێت، کە شتێک نییە دژی ڕاوەســـتێت، بەڵکو دەبێت بە پێوەری بوونی خۆی. بوونی هەموو هەبووەکان ئەوەیە، کە دەردەکەوێت. کەوابوو، ئێمە بە بیرۆکەی دیاردە دەگەین، کە لای هوســـرڵ یان هایدیگەر ڕەها و پەیوەندیـــدارە. دیارە لەوێدا پەیوەندیدارە، کە بـــۆ دەرخستنەکەی پەیوەندی بە کەســـێکەوە بەستراوە. بەڵام پەیوەندییەکەی نییە. خۆی بۆ ڕاستییەکی دیکە ناگەڕێنێتەوە بەوجۆرەی کانت باســـیدەکات، کە گوایە دووجار خۆی دەردەخات، ئەمـــەش لایەنی ڕەهای ئەوە. دیاردە بە تەواوی [ڕەهایانە]ئاماژە بۆ بوونی خۆی دەکات. پێویستە بەمشێوەیە باسبکرێت و لەبوونی بکۆڵرێتەوە. دووەلیستی نێوان هێزەکی و کردەکیـــش بە هەمان شێوە هەڵدەوەشێتەوە. کردەوە هەموو شتێکە. هیچ هێزێک یان چاکەیەکی[شاراوە]لەودیو کردەوەوە نییە. ئێمە، بۆنموونە، ناڵێین پرۆســـت خاوەنی هێزێکی بلیمەتانە بوو بۆیە توانی بنوسێت. بلیمەتی پرۆست، نـــە لە بەرهەماکانیدایە و نە لە تەواناي نوســـینیدا. ئـــەم دوو لایەنە لە یەکدی جیاناکرێنـــەوە. بلیمەتی لە کۆی بەرهەمە کاندایـــە، کە ئەو تاکە دایاندەهێنێت. لەبەرئەمە دووەلیستی نێوان دیاردە و ناوەڕۆک ڕەت دەدەینەوە. دیاردە ناوەڕۆک داناپۆشێت، بەڵکو دەریدەخات و خۆی ناوەڕۆکە. ناوەڕۆک لە هەبوویەکدا شاراوە و نادیار نییە. یاســـایەکی بەرجەســـتەبووی زنجیرەیـــەک دیاردەیە. بە بۆچوونی نۆمینەڵزمی 'پۆینکێر' ڕاســـتەقینەی فیزیکی بەسەرجەمی شەپۆلە کارەباییەکان دادەنرێت. 'دوهێم' لە دژوەســـتانەکەیدا بەرانبەر بیردۆزەکەی خۆی دروســـت بۆ کێشـــەکە چووە و ئەو ڕاستەقینەیە بەتێهەڵکێشکردنێکی یەکگرتووی هەموو وزە بەرجەســـتەبووەکان دەبینێت. ئاشکرایە، فینۆمینۆلۆجی نۆمینەلیزم نییە. بەڵام ناوەڕۆک، بەدڵنیاییەوە، وەکـــو بنەڕەتی زنجیرەی دیاردەکان لێی جیانابێتەوە و خودی دیاردەکانە. ئەمەش ناســـینی ناوەڕۆک (بۆ نموونە دیاردەکانی هوســـرڵ) مسۆگەر دەکات. بوون خۆی دەردەخات؛ ناوەڕۆکی خۆی بەرجەستە دەکات. ئەو بێجگە لە زنجیرەی دیاردە و خۆ دەرخستنەکانی چی دیکە نییە.[٣]

ئایـــا بە گەڕانەوەی بـــوون بۆ دیاردەکانـــی توانیومانە بە ســـەر دووەلیزمدا سەرکەوین؟ یان ئێمە ئەم دووەلیزمەمان لابردووە و شێوازێکی دیکەی دووەلیزممان

٣ نۆمینەڵیزم وشەیەکی لاتینییە، ئەو بۆچوونەیە، کە چەمکە هەمەکییەکان بەڕاست لەدەرەوە یان لەنێو بیرکردنەوەدا دانانێت. هەرچەمکێکی هەمەکی (وەکو ئەسپ) (ناوە)،کە بۆ بابەتە هەندەکییەکانی ئەو جۆرە دانراوە.

هێناوەتـــە کایەوە؛ ئەویش دووەلیزمی نێوان بڕاوە و نەبڕاوەیە؟ بوون زنجیرەیەک دیاردەی بڕاوە نییە چونکە هەر یەکێک لەو دیاردە بڕاوانە پەیوەندییان بە (بابەت) ێکەوە هەیە، کە بەردەوام لەگۆڕاندایە. هەرچەندە، لەوانەیە بابەتێک لە ڕوویەکەوە خۆی دەربخات بەڵام یەکێک لە خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی بابەت فرەلایەنی بۆچوون و هەڵسەنگاندنـــی ئـــەو ڕووەی بابەتەکەیە. ئەمەش دەبێتـــە هۆکاری زۆرکردنی نەبڕانەوەی ڕووەکانی بابەتەکـــە. ئەگەر زنجیرەی دیاردەکانیش بڕاوەبن ئەوا ئەو دیاردانەی یەکەمجار دەردەکەون لەوانەیە جارێکی دیکە سەرهەڵنەدەنەوە. ئەمەش لەخۆیـــدا بۆچوونێکی نالەبارترە یان هەموویان پێکەوە یەکجار ســـەرهەڵدەدەن. هێشتا ئەمەش هەر نالەبارە. با واتێبگەین، کە بیردۆزەکەمان لەســـەر دیاردەکان بیرۆکـــەی ڕاســـتەقینەی دیاردەکانـــی لابـــردووە و لە جێگەی ئـــەودا بیرۆکەی بابەتگـــەری دیاردەکانی هێناوەتە کایەوە و دیاردەکانیشـــی بـــە نەبڕاوە داناوە. ڕاستەقینەی پەرداخێک لەوەدایە،کە پەرداخەکە [دیاردەیەکە] لەوێدایە، هەروەها ئـــەو پەرداخەش (من) نییە. لە ڕاڤەکردنی ئەمـــەدا ڕووندەبێتەوە، کە زنجیرەی خۆدەرخستنەکانی پەرداخەکە پشت بە بوونی من نابەستێت. بەڵام خودی دیاردەی پەرداخەکە، بێ گەڕانەوەی بۆ زنجیرەی دیاردەکانی، ســـەر بەهەستکردن و (خۆ) یەو پەیوەندی بە کارتێکردن بە (خـــۆ)وە هەیە. ئەگەر دیاردەیەک وەکو شتێکی بەرز خۆی دەرخات، پێویستە خۆیە هەستیارەکەش خۆی بەو بەرزییە بگەیەنێت و زنجیرەی هەموو دیاردەکانی بناســـێت. ڕەنگێکی سور بەڕێگەی ئینتیباعی سور دەدۆزێتەوە.[٤] مەبەست لەسەربنەڕەتی زنجیرەکەیە، یان شەپۆلە کارەباییەکان لەســـەر ئەلەکترۆلیسس ڕاوەستاون. ئەگەر لایەنە بەرزەکە بە هۆکارێکی پێویست دابنرێت و هەمیشـــە بەرز بێـــت، لەو دیو دیاردەکەوە بێت لـــە ئاکامدا بابەتەکە لەســـەر ئەو بنەڕەتە زنجیرەی دیاردەکانی دادەمەزرێنێت، زنجیرەکەش بە نەبڕاوە دەردەکەوێـــت. کەوابوو، دیاردەی بڕاوە بە شێوەی بڕاوە خۆی دەردەخات. بەڵام مادامەکـــی دیاردە بە دیـــاردەی ئەو شتە دادەنێین، کە خـــۆی دەردەخات، ئەوا دەبێت لە سەر ئەو دیاردەیەوە زنجیرەیەکی نەبڕاوەی دیاردەکانیش هەبێت.

ئـــەم بۆچوونـــە نوێیە دژوەســـتانی نێوان بـــڕاوە و نەبڕاوە یـــان باشتر وایە بڵێین (نەبڕانـــەوەی دیاردە بڕاوەکان) لادەبات و لە جێگەی ئەو دوو لایەنی نێوان بـــوون و دیـــاردە دادەمەزرێت. لێرەدا 'یەک لایەنی' بابەتەکـــە دەردەکەوێت، کە لـــە دەرەوەیدایـــە. هەمانکات هەموویـــان لەنێو یەکدان و ئـــەو لایەنە دیاردەی

٤ ڕەنگی سور، وەکو دیاردەیەکی سور لە بابەتێکی سوردا لە (ڕەنگی سور بە گشتی)یەوە وەرگیراوە. مەبەستی سارتەر لەم نموونەیەدا گەڕانەوە بۆ بۆچوونەکەی ئەفلاتون سەبارەت بوونی چەمکە هەمەکییەکان لەودیو هەندەکییەکانەوە نییە، چونکە سارتەر باوەڕی بە ناوەڕۆکی بەرز بۆ دیاردەکان نییە. ئەو دەیەوێت جیاوازی و لێکچونی (بۆ نموونە) گوڵێکی سور لە گەڵ سور بە گشتی ڕوونبکاتەوە. (وەرگێڕ)

بابەتەکەیە. بابەتەکەش بونیادی دیاردەکەو بنەڕتی زنجیرەی خۆدەرخستنەکانە. هەموویــان پێکــەوە لــە دەرەوەن چونکــە خــودی زنجیرەکە دیــاردە نییە. لێــرەدا دەرەوە دەبێــت بە دژوەســتاوێکی نوێ بۆ ناوەوە و ئــەو بوونەش، کە دیــاردە نییە بۆ دیاردە. لایەنێکی هێزەکیش بــۆ نێو دیاردە دەگەڕێتەوە و ژوور دیاردەکــە دەکەوێت و لەنێو زنجیرەکــەی دیاردەکاندا گەشەدەکــات. بلیمەتی پرۆســت، ئەگەر تەنیا لە نوســراوەکاندا بێت، لە بۆچوونــە ژمارە بەدەرەکانی خوێنەر کەمتر نییە، کە ماندوونەبوونی پرۆســتی تێدا دەردەکەوێت. بەڵام، ئایا ئــەم ماندوونەبوونە، کە ئاماژە بۆ لایەنی بەرز و نەبڕاوە دەکات، بۆ تێگەیشــتن لــە بابەتەکــە جۆرێک لە جادو نییــە؟ ناوەڕۆک لە ئاکامدا لە تاک دەســەنرێت و دەبێــت بە زنجیــرەی نەبــڕاوەی خۆدەرخستنەکان. ئایا ئەم کارە لە ســود یــان زیانی ئێمەدایــە؟ وەڵامی ئەم پرســیارەمان بەم زووانە دەســتدەکەوێت. ئێستــا ئەو خاڵە دەخەمە ڕوو، کــە بەگوێرەی "بیردۆزەی دیــاردە" دیاردە بۆ نۆمینــەی کانــت ناگەڕێتەوە.[٥] مادامەکــی هیچ شتێک لەو دیــو دیاردەکانەوە نییــە و دیاردەکان ئاماژە بۆ خۆیان دەکەن، ئەوا بوونیان لە ســەر هیچ شتێکی دیکە ڕانەوەســتاوە. ئەگەر ناوەڕۆکی دیاردە خۆدەرخستن بێت، کە بەرانبەر هیچ بوونێک دژانە ڕاناوەستێت، ئەوا گرفتی بوونی دیاردەکان خۆی دەسەپێنێت. ئەم گرفتەش لە هەموو گرفتەکانی دیکە لە پێشترەو لە توێژینەوەکەماندا لەسەر بوون و نەبوون هەنگاوی یەکەمی گەشتەکەمانە. .

## ٢. دیاردەی بوون و بوونی دیاردە

دیاردە لە سەر بوونێکی جیاوازتر لە خۆی ڕاوەستاوە؛ ئەو بوونی خۆی هەیە. یەکەم بوون لە توێژینەوەکەمانــدا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین بوونی دیاردەیە. ئایا ئەم بوونە دیاردەیە؟ لەســەرەتاوە بەمشــێوەیە دەردەکەوێت. دیاردە ئەوەیە کە خــۆی دەرخستوە و بوونیش لەبەر ئەوەی دەتوانین بیناســین و باســی بکەین بــە یەکێک لە شێوەکانی خــۆی دەرخستوە. کەوابوو، دەبێــت دەیاردەی بوون باسبکرێت. بوونیش بە یەکێک لە شێوەکانی ڕاستەوخۆ بە ڕێگەی بێزاربوون یان قێزکردنەوە و هتد خۆی دەردەخات. ئۆنتۆلۆجی لێکۆڵینەوەیە لە ســەر دیاردەی ئەو بوونە. بە هەرحاڵ لە هەموو لێکۆڵینەوەیەکی ئۆنتۆلۆجیدا پرســیارێک هەیە، کە خۆی دەسەپێنێت: ئایا دیاردەی بوون و بوونی دیاردە وەکو یەکن؟ ئایا ئەو بوونەی خۆی بۆ من دەردەخات و دەبێت بە دیاردە هەمان ســروشتی بوونەکەی

---

٥ کانت لەو باوەڕەدایە لەودیو دیاردەکانەوە ڕاستەقینەیەکی شاراوە و نەناسراو هەیە، کە سەرچاوەی بوونی دیاردەکانە و بە نۆمینە ناوزەدی دەکات. (وەرگێڕ)

هەیە، کە خۆی دەرخستوە؟ دەردەکەوێت وەڵامەکە سەخت نەبێت. هوسرڵ [بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە] پەنای بۆ داماڵینی بیرۆکەیی بردوە؛ لەوێوە لە دیاردەکەوە خۆی گەیاندۆتە ناوەڕۆکی دیاردەکە. بۆ هایدیگەر "ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی" ئۆنتیک-ئۆنتۆلۆجییانەیە؛ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە[مرۆڤ دەتوانێت] لەو دیو دیاردەکانەوە بوون بناسێت. بەڵام گەیشتن بە ناوەڕۆک لە ڕێگەی بابەتێکی هەندەکییەوە تێپەڕبوونە لە هاوجۆرێکەوە بۆ هاوجۆرێکی دیکە. ئایا تێپەڕبوونیش لە بوونەوە بۆ دیاردەی بوون هەمان جۆرە؟ ئایا ئەم تێپەڕبوونە دەمانگەیەنێتە بوونی دیاردەکە؟ جیاکردنەوەی خەسڵەتەکانی بابەتێکی هەندەکی کارێکی گران نییە. ئێمە دەتوانین بابەتێک بۆ ڕەنگ و بۆن و هتد بگەڕێنینەوە. لێرەوە، وەکو چۆن واتاکەی دەدۆزینەوە بە ناوەڕۆکیشی دەگەین و سەرجەمی (ناوەڕۆکەکەی) دەبێت بە کۆ یان هەمووی بابەتەکە. ناوەڕۆک لەنێو بابەتەکەدا نییە؛ واتای بابەتەکەیە و بنەڕەتی زنجیرەی خۆ دەرخستنەکانێتی. بوون، بە پێچەوانەوە، یەکێک لە خەسڵەتەکانی بابەت و واتاکەشی نییە. بابەت ئاماژە بۆ بوون ناکات؛ مەحاڵە، بۆ نموونە بوون بە ئامادەبوون پێناسبکەین، چونکە ئامادەنەبوونیش بوون دەردەخات. بابەت خاوەنی بوون نییە هەبووی ئەویش بەشداریکردن لە بوون و پەیوەندی نییە. بابەت نە بوون دەشارێتەوە نە دەریدەخات. ناتوانین خەسڵەتەکانی بابەتێک لابەرین تاکو بە بوونی بگەین چونکە بوون بە بێ جیاوازی بوونی هەموو خەسڵەتەکانیشە. هەروەها، بێهودەشە یەکێک بۆ ناسینی بوون بابەتێک بخاتە بەردەمی و لێیبکۆڵێتەوە. بوون دیاردەیە؛ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە خۆی وەکو سەرجەمی خەسڵەتەکان نیشاندەدات. دیاردە خۆی، نەک بوون دادەمەزرێنێت. بوونیش مەرجە بۆ هەموو خۆدەرخستنەکانی. بوون بوونە بۆ خۆدەرخستن، نەک خۆدەرخستنی بوون. کەوابوو، مەبەستی هایدیگەر لە تێپەڕبوون بەرەو ئۆنتۆلۆجی چییە؟ بە دڵنیاییەوە دەتوانم ئەم مێزە یان کورسییە تێپەڕبکەم، پرسیار لە بارەی بوونیانەوە بکەم. بەڵام لە کاتی پرسیار کردنەکەدا چاو لەسەر مێزەکە لادەبەم و بیر لە دیاردەی بوون دەکەمەوە، کە مەرج نییە بۆ سەرجەمی دەرخستنەکان خۆی بەرجەستە بکات. دەبێت بە دیاردەیەک، کە ئەویش پێویستی بە بوونێک دەبێت خۆی لە سەری ڕاگرێت و لەوێوە خۆی دەربخات. ئەگەر بوونی دیاردە دیاردەی بوون نەبێت، ئێمەش بە بێ ناسینی دیاردەی بوون نەتوانین باسی بوون بکەین ئەوا پێویستە پەیوەندی نێوان بوونی دیاردە و دیاردەی بوون بدۆزینەوە. ئەمەش لەوێدا چاکتر دەگونجێت ئەگەر بڵێین، ڕوونکردنەوەکانی پێشو، لە بەرڕۆشنایی ئەزموونی ڕاستەوخۆمان لەگەڵ دیاردەی بووندا سەریان هەڵدا. لەوێدا، کە بوونمان بە مەرج بۆ بەرجەستەبوون دانەناو وەکو دیاردە بینیمان، دەتوانین لە ڕێگەی چەمکەکانەوە باسیبکەین. هەروەها

دەبێت بزانین، کە زانین بە تەنیا بوونمان پێناناسێنێت؛ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کــە بوونی دیاردە نابێت بە دیاردەی بــوون. بوونی دیاردە ئۆنتۆلۆجیانەیە. لەم ڕووەوە ئێمــە بەرەو بەڵگــەی ئۆنتۆلۆجی کەشیــش ئەنسلم و دێکارت دەڕۆین. دیاردەی بوون پێویستی بە پێشــگر هەیە. مەبەستمان لەوە نییە بوون خۆی لە پشتی دیاردەکانەوە شاردبێتەوە (باسمانکرد دیاردە بوون ناشارێتەوە) یان دیاردە ئاماژە بۆ بوونێکی دوور دەکات.

## ٣. کۆجیتۆی پێش تێڕامان و هەستکردن

هەڵبەتە کەســێک دەتوانێت ئەو پرســیارەمان ئاڕاســتە بکات و بڵێت؛ ئەو گرفتانەی لە ســەرەوە ئاماژەمان بۆ کردن پەیوەندییان بە چەمکێکی دیاریکراوی بوونــەوە و جۆرێک ئۆنتۆلۆجی ڕیالیزمانەوە هەیــە، کە لەگەڵ چەمکی دیاردەدا هاوتەراز دانانرێت. لەڕاستیدا ئەوەی بوونی دیاردە دەردەخات خۆدەرخستنەکەیە. مادامەکی ڕاســتەقینەمان بۆ فینۆمینە گەڕاندۆتەوە دەتوانین بڵێین فینۆمینە ئەو شتەیە خۆی دەردەخات.[٦]

بۆچی بە کورتی نەڵێین بوونی دیاردە خۆدەرخستنەکەیەتی؟ ئەمەش دەربڕینی گوتــە کۆنەکــەی بارکلی یە "ئەوەی هەیە هەســتپێکراوە" و لــە کالاو بەرگی چەند زاراویەکی نوێدا نیشانمانداوە. هوســرڵ و شوێنکەوتوەکانیشی هەمانشتیان کردووە.

پــاش داماڵینــی فینۆمینۆلۆجیانە گەیشــتونەتە ئەو بــاوەڕەی، کە نۆمینە ڕاســتەقینە نییە و ئەوەی هەیە ئەو شتەیە لە هەستکردندا دەردەکەوێت. بەڵام دەردەکەوێــت گوتەکەی بارکلی ئێمە ڕازی نەکــات، چونکە هەموو بیردۆزەیەکی زانین ئاماژە بۆ جۆرێک ســیستەمی مێتافیزیک لە پێش خۆیەوە دەکات. ئەمەش ئــەوە دەگەیەنێت، کە ئایدیالیزمێک[بۆ نموونــە] لەگەڵ داماڵینی بوون بۆ زانین پێویستی بە زەمینەیەک هەیە ئەو زانینەی لە ســەر ڕاوەستابێت. ئەگەر یەکێک بــە دوای ئەو زەمینەدا نەگەڕێت، هاوکات جەخت لە ســەر ئەوەش بکات ئەوەی هەیە هەســتپێکراوە، ئەوا بناخەی سەرجەمی هەســتکردنە هەستکراوەکان لەق دەبێــت و بەرەو نەبوون دەڕوات. زانین بە خــودی زانین ناپێورێت؛ ناخرێتە بەر ئەزموونی هەستکردنەوە. کەوابوو، بناخەی بوونی هەستکردن هەستکەرەکە نییە.

---

٦ زاراوەی (فینۆمینە) هەمان واتای (دیاردە)ی هەیە. بەڵام هەندێک جار، هایدیگەر و سارتەر بە دوو شتی جیاوازی دادەنێن. بۆ نموونە نەخۆشی فینۆمینەیە، کە بە چەند شێوەیەک خۆی دەردەخات، وەکو سەریەشە، بەرزبوونەوەی گەرمایی لەش یان ڕشانەوە. هەموو ئەم شێوانە دیاردەکانی ئەو فینۆمینەیەن (نەخۆشیەکە)، کە لە ڕێگەیانەوە خۆی دەردەخات. (وەرگێڕ)

دەبێت پێشــگری فینۆمینەی هەبێت. لێرەدا بۆ خاڵی ســەرەتامان دەگەڕێینەوە و دەتوانین ڕێکەوین، کە هەســتکەر ئەو بوونەیە یاســاکانی دیاردەی بە سەردا ناسەپێنرێت. هەمانکات بوونی پێشــگرە بۆ خۆی. هەروەها هەستکەر ئاماژە بۆ بوونە هەستکراوەکان دەکات، زانراویش بۆ زانین و زانینیش بۆ ئەو بوونەی تەوانای زانینـــی هەیە؛ ئەمەش زانین بۆ ئاگامەندی دەگەڕێنێتەوە. هوســرڵ گەیشتە ئەو باوەڕەی ئەگەر (نۆیمە) بوونێکی ڕاســتەقینەی نەبێت، نکۆڵی لەپەیوەندییەکەی بە (نۆیەســس) بکرێت، یاساکانی بوونی لە هەســتکردندابن، تەنیا (نۆیەسس) وەکو ڕاســتەقینە بەرجەستە دەبێت. بەڵام یاسای بوونی ئاگامەندی لەوەدایە، کە ئەو بوونە بــە ئاگا بێت. ئاگامەندی شێوازێکــی تایبەتی جۆرێک لە زانین نیە واتایەکی ناوەکی هەبێت یان تەنیا بــە خۆ-ئاگایــی ناوزەدبکرێت. ڕەهەندێکی پێشــگرانەی فینۆمینەی لە بوونی (خۆ)دا هەیە.[٧] یاســای بوون لە هەستیاردا ئەوەیە، کە ئەو بوونە ئاگامەندە. با زۆرتر لەم ڕەهەندەی بوون وردببینەوە. ئێمە گوتمان ئاگامەندی بوونێکی هەستیارانەی هەیە، تەوانای زانینی هەیە یان تەوانای هەیە بزانێــت، نەک بزانرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بۆ ســەلماندنی بوونی زانین پێویستە، واز لە پێشــخستنی زانین بهێنین. بێگومان، ئاگامەندی دەتوانێت خۆی بناســێت بەڵام ئەم زانینە لە بارەی خۆیەوە جیاوازە. بەوشێوەیەی هوسرڵ ڕوونیکردۆتــەوە، هەموو ئاگامەندییەک ئاگاییــە لە شتێکەوە. هیچ ئاگامەندییەک نییــە ڕوو لە بابەتێک نەکات و ناوەڕۆکێکی نەبێــت. هەموو شتێکی بێ لایەن و لــە پەیوەندی بەدەرەی ناوەوە و دەرەوەی ئاگامەندی ڕەتدەدەینەوە. مێز لە نێو ئاگامەندیــدا نییە. ئەو بیرۆکەیەش نییە نوێنەرایەتــی دەکات، بەڵکو شتێکە لە نێــو شوێن و کاتدایە و نزیک پەنجەرەکە دانــراوە. بوونی مێزەکە بۆ ئاگامەندی بنکەیەکــی تەماوی و نادیارە، کە پێویستی بە گــەڕان و دۆزینەوەیەکی نەبڕاوە هەیــە تاکو [ئاگامەندی] بە ناوەڕۆکەکەی بگات. ئامادەکردنی ئەم بوونە تەماوی و نادیــارە لە بەردەم ئاگامەندییدا پرۆســەیەکی نەبڕاوە و بەردەوامە. هەنگاوی یەکەم لە کاری فەلسەفەدا دەرکردنی بابەتەکانە لە نێو ئاگامەندییدا و بەستنەوەی ڕاستەقینەی ئاگامەندییە بە جیهانەوە. هەموو ئاگابوونێک ئامادەبوونە لە بەردەم بابەتێکی بەرز و دەرەکییدا و لە پێناوی گەیشتن بەو بابەتەیە. بۆ ئەو مەبەستەش ئاگامەندی خۆی ماندوو دەکــات. ئەم هەڵوێستەی ئاگامەندی ویستدارانەیە، ڕوو لە دەرەوە بەرەو مێزەکە دەکات؛ هەموو ئەو دەســتەواژانەی دروستیان دەکات،

---

٧ هوسرڵ بابەتی هەستپێکراو یان ئەو دیاردەیەی لە بەردەم ئاگامەندییدا خۆی قوتدەکاتەوە و فینۆمینۆلۆجییانە دەناسرێت ناو ناوە (نۆیمە) و چالاکی ئاگامەندیش لە ناسینی ئەو بابەتە دەرەکییەدا بە (نۆیەسس) ناوزەد کردوە. هاوکات هیچ لایەنێکی لەم دوانەی نەکردووە بە قوربانی لایەنەکەی دیکە. (وەرگێڕ)

هەڵسوکەوت و خۆئامادەکردنەکانی بــەرەو دەرەوە یان بەرزتر لەخۆیان دەڕوانن ڕوو لــە مێزەکە دەکەن و لە ناویا دەتوێنــەوە. هەموو ئاگابوونێکیش زانین نییە بەڵام هەمــوو زانینێکی ئاگامەندانــە زانینە لە بارەی بابەتەکــەوە. بەهەرحاڵ، بارودۆخی پێویست و تەواو ئاگابوون لە بارەی بابەتەکەیەوە بە زانین دەگیەنێت ئەوەیــە، کە خۆی بەو زانینە دابنێت. ئەمــە پێویستە، چونکە ئەگەر ئاگامەندی مــن ئاگابوون لەوە نەبێت، کە من ئاگام لــە مێزەکەیە، ئەوا دەبێت بە ئاگابوون لــە مێزەکە بــە بێ ئەوەی من ئاگام لە خۆم بێت. بــە کورتیەکەی ئاگابوونێکی بێئاگایــە لە خۆ، کە ئەمەش شتێکی لە واتا بەدەرە. ئەمە بارودۆخی تەواوە بۆ زانیــن چونکــە خۆ- ئاگایی من لەوەی، کە ئاگام لە مێزەکە بەســە بۆ ئەوەی ئاگــام لە مێزەکە بێت. بێگومــان ئەمە بەس نییە بۆ ئــەوەی من بەو ڕادەیەی بڕیار لە ســەر خودی بوونی مێزەکە بدەم. تەنیا ئەوەندە دەزانم، کە مێزەکە لە بەردەممدایە. ئاگایی لە ئاگامەندی چییە؟ پشــت بەســتن بە پێشخستنی زانین بەو هەڵەیەمان دەگەیەنێت، وەکو ســپینۆزا، ئاگایــی لە ئاگامەندی بە بیرۆکەی بیرۆکە یان زانینی زانین دابنێین. 'ئالەین' ئەم کێشــەیەی بەمجۆرە باســکردوە "زانین ئەوەیە بزانیت تۆ دەزانیت." لێرەدا توانیومانە پێناســەی تێڕامان، ئاگایی لە ئاگامەندی یان باشتروایە بڵێین زانینی ئاگاماندی بکەین. ئەمەش ئاگابوونێکی تەواوە لە شتێک، کە ئەو شتە ئاگامەندی نییە؛ یان ئاگاییە لە ئاگامەندی، وەکو بابەتــی تێڕامان. بە هەمان شێوە، چۆن ئاگامەندی بۆ ناســینی جیهان ڕوو لە دەرەوە دەکات، بۆ ناســینی ئەم بابەتەش دەبێت لە خۆیەوە دەرچێت. بەڵام ئەو بابەتەی دەیەوێت بیناســێت و بیگاتێ خۆیەتی. دەردەکەوێت ئەم ڕاڤەکردنەمان لاپەسەند نەبێت. بە گەڕانەوەی ئاگامەندی بۆ زانین کێشەی دووەلیستی نێوان خۆ و بابەتمان لادروست دەبێت. هەروەها، لەگەڵ دامەزراندنی دوو لایەنی زانەر- زانراو دا پێویستی زاراوەیەکی دیکەش ســەرهەڵدەدات و لەم دووڕیانەیەدا گیردەخۆین: دەبێــت لەگەڵ یەکێک لەم زاراوانەدا زانــراو، زانەر، زانەری زانەر بە زانراو هتد.. ڕاوەســتین و لەوەزۆرتر نەڕۆین. سەرجەمی فینۆمینەکە بە نەزانراوی دەمێنێتەوە و لەبەردەم تێڕامانێکدا دەوەســتین، کە خۆ-ئاگا نییە یان دەبێت ڕانەوەستین و زنجیرەکەی (بیرۆکە و بیرۆکــەی بیرۆکە و بیرۆکەی بیرۆکەی بیرۆکە) بەردەوام بڕوات. ئەمەش لە واتا بەدەرە. کەوابوو، بۆ پێویستییەکانی دامەزراندنی بناخەی ئۆنتۆلۆجیانە بۆ ئاگامەندی پێویستییەکی دیکە زیاد دەکەین: ئەویش دامەزراندنی ئەپستمۆلۆجییانەیە. ئایا پێویستە یاسای دوولایەنی بۆ ئاگامەندی دابنێین؟ ئاگایی لــە خۆ دوولایەنی نییە. ئەگەر بمانەوێت لە زنجیرە نەبڕاوەکانیش دووربکەوینەوە دەبێــت پەیوەندییەکی ڕاســتەوخۆ و نا-ئەپستمۆلۆجییانەی (خۆ) لەگەڵ خودی خۆدا هەڵبەســتین. ئاگامەندی خۆی دەخاتە بــەر تێڕامانەکەی خۆی و دەبێتە

بابەت بۆ خۆی. لێرەدا دەتوانم حوکم بە ســـەر ئەو ئاگامەندییەدا بدەم، کە بووە بـــە بابەتی تێڕامانەکەم. دەڵێم؛ من شەرم لە خۆم دەکەم، شانازی پێوە دەکەم، دەمەوێت یان نامەوێت و هتد. ئاگامەندی ڕاستەوخۆش، کە من لە هەستکردنەکەدا هەمە ڕێگەم نادات ئەم حوکمانە بدەم. هەســـتکردنەکەم ناناســـێت و ئاڕاستەی دەرەوەی ناکات. بـــە کورتییەکەی، هەموو ئاگاییەک لـــە بابەتێکی دەرەکییەوە هەمانکات خود-ئاگاییە.

ئەگـــەر جگەرەکانی نێو پاکەتەکە بژمێرم ئەوا من خەســـڵەتێکی دەرەکی ئەو جگەرانەم دەرخستوە: ژمارەیان دوانزەیە. ئەم خەسڵەتە لە دەرەوەی ئاگامەندی مندایـــە و لە نێو جیهانـــە. دەگونجێت من ئاگام لە ژمـــاردن نەبێت. منداڵ، کە دەتوانێت دوو ژمارە بخاتە ســـەر یەکدی لەوانەیە نەتوانێت بۆمان باسبکات چۆن بەو ئاکامە گەیشـــتوە. تاقیکردنەوەکەی 'پیاجێت' و هاوکێشەکەی 'ئەلەین' زانین ئەوەیـــە، بزانیت تۆ دەزانیت" ڕەتدەداتەوە. هەمانکـــات، کە ژمارەی جگەرەکان بۆ من دەردەکەوێت بیر لە کۆکردنەوەیان ناکەمەوە. ئەگەر لێم بپرســـن "تۆ چی دەکەیت؟" لە وەڵامدا دەڵێم، "دەیان ژمێرم." ئەم وەڵامە تەنیا ئاوەڕ لەو ئاگاییە خێرا تێپەڕیوە ناداتەوە، کە من لە تێڕامانەکەمدا هەمە.

ئـــەو جـــۆرە ئاگاییانەش دەگرێتەوە، کـــە خێرا بە بێ ئـــەوەی تێیان بڕوانم تێدەپـــەڕن. تێڕامان پێش ئەو ئاگامەندییە ناکەوێـــت، کە تێی دەڕوانێت. ئەوەی ئەو ئاگامەندییە دەردەخات تێڕامانەکە نییە. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەی تێڕامان دەهێنێتەکایـــەوە ئاگامەندییە، کە لە تێڕامان بەدەرە؛ **کۆجیتۆی پێش تێڕامانە**، کە دەبێت بە مەرج بۆ ســـەرهەڵدانی کۆجیتـــۆی دێکارتی.[٨] ئەمەش وەکو ئەوە وایە بڵێین بۆ ئەوەی بتوانیت شتەکان بژمێریت پێویستە ئاگایی ژماردنت هەبێت. دەشێـــت هەندێک ئەمە بە ســـوڕانەوەیەکی بازنەیی دابنێـــن. ئایا پێویست ناکات من بۆ ئەوەی ئاگایی ژماردنم هەبێت، شتەکان بژمێرم؟ ئەمە ڕاســـتە. بەڵام ئەمە ســـوڕانەوەی بازنەیی نییە و ئاگامەندیش بۆ ئەوەی هەبێت، بە شێوەیەکی بازنەی دەســـوڕێتەوە. دەتوانین ئەم بۆچوونە بەمشێوەیە ڕوونبکەینەوە: هەموو بوونێکی ئاگامەند، ئاگاییە لە بوون. لێرەوە تێدەگەین بۆچی ئاگایی ئاگامەندی ڕوو لە دەر نییـــە؛ چونکە ئەو ئاگاییەو ئاگاماندی یەک شتن. ئـــەو لەهەمانکاتدا خۆی وەکو ئاگامەنـــدی و بابەتی ئاگاییەکەشی دەبینێت. پێویستی زمانەوانی زۆری لێکردوین

٨ کۆجیتۆکەی دێکارت (من بیردەکەمەوە، کەوابوو من هەم) لە ئاکامی تێڕامانی ئاگامەندییەوە بۆ بوونی خۆ یان (خود) سەرهەڵدەدات. بەڵام سارتەر دەیەوێت ئەوە بسەلمێنێت، کە خۆ یان ئاگامەندی پێش ئەم تێڕامانە جۆرێک لە ئاگایی لە بارەی خۆیەوە هەیە، کە پێویستی بە تێڕامان نییە. (وەرگێڕ)

باســـی ئەو جۆرە ئاگامەندییە بکەین، کە بۆ ناســـینی بابەتەکەی ڕوو لەدەر نییە. لە بـــەر ئەم پێویستیەشە لـــەگەڵ بەکارهێنانی " ئاگایی لە خـــۆ"، وشەی "لە" دەخەینـــە کەوانەوە. ئاگایی لە خۆ (یان خۆ-ئاگایی) شتێکی نوێ نییە. شێوازێکی بوونی ئاگامەندانەیە لە ئاســـتی هەبوویەکدا. وەکو چۆن بابەتێکی دەرەکی ســـێ ڕەهەنـــدی هەیە، ڕەهەندەکانی ئاگایی لە خۆ مەبەســـت و چێژ و خەمخۆرییە، کە ڕاســـتەوخۆ بەم ئاگاییەوە بەستراون. ئەگەر مەبەست لە نێو ئاگامەندییدا نەبێت، ئەوا بوونی مەبەســـت دەبێت بە خودی ئاگامەندی. با واتێنەگەین، کە هۆکارێکی دەرەکی (وەکـــو گرفتێکی ئۆرگانیکی، هاندەرێکی شـــاراوە یان ئەزموونێکی ژیان) ئەو ڕووداوە دەروونییەی، وەکو چێژ دروستدەکات و دەبێتە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی ئاگایی لە خۆوە.

ئەگـــەر وا بێت ئەوا خەســـڵەتی ئاگایی لە خۆ بۆ هەســـتکردنمان بە مێزەکە زیـــاد دەکەین و دەکەوینەوە نێو وەهمی پێشـــخستنی زانیـــن. هەروەها، دانانی ڕووداوێکـــی دەروونی بە شت، وەکو چۆن کاغەزێک بە ســـور دادەنێین، ئەویش بـــە ئاگایی دابنێن چێژ، لۆجیکانـــەش لە ئاگایی چێژەوە جیا ناکرێتەوە. ئاگایی لە چێـــژ پێکهاتەی چێژە، شێـــوازی بوونەکەیەتی، وەکو جەســـتەی نەک فۆرم بـــۆ شتێـــک. چێژ پێش هەســـتکردن بـــە چێژ یـــان ئاگایی لە چێـــژەوە پەیدا نابێـــت. تەنانەت، وەکـــو لایەنێکی هێزەکیش پێـــش ئاگاییەکـــە نادۆزرێتەوە. چێژێکی هێزەکـــی دەتوانێت، وەکو ئاگایی لە بوونـــی هێزەکی چێژەکە هەبێت. لایەنە هێزەکییەکانـــی ئاگامەندی، وەکو ئاگایی لەو لایەنـــە هێزەکییانەدا هەن. بە پێچەوانەشەوە، بەو شێوەیەی لە پێشـــتر ئاماژەم بۆ کرد، پێویستە خۆمان لە پێناســـەکردنی چێژدا بەو ئاگاییەی لە بارەیەوە هەمانە دوورخەینەوە. ئەگەر ئەم کارە نەکەین بۆ ئایدیالیزم و پێشخستنی زانین دەگەڕێینەوە. پێویست ناکات چێژ لەو دیو خۆ-ئاگاییەکەیەوە بشـــارینەوە؛ چێژ نوێنـــەری بابەتێکی دەرەکی نییە، ڕووداوێکی کۆنکریتییە و پڕو ڕەهایە. چێژ بوونی خۆ ئاگاییە و خۆئاگاییش یاسایەکە بۆ بوونی چێژ. ئەمەش هایدیگەر چاک بۆی چووە، کە دەنوســـێت (با لە دازاین، نـــەک ئاگامەندی بدوێین.): "چۆنییەتی (ناوەڕۆکی) ئەم بوونە، ئەگەر بتوانین بە گشـــتی لە ســـەری بدوێین پێویستە وەکو بوونی تەماشابکرێت." واتە ئاگامەندی شتێکی ڕووتکراوە نییە، لە نێو بووندایە و خۆی ناوەڕۆکی دروستدەکات. ئەویش ســـەرجەمی پرۆژە گونجاوەکانییەتی. ئەمە ئـــەوە دەگەیەنێت بوونی ئاگامەندی بەپێچەوانەی ئەو بوونەوەیە، کە لە بەڵگەی ئۆنتۆلۆجیدا دەسەلمێنرێت.

مادامەکـــی ئاگامەندی لە پێش بووندا نییە، بوونیشـــی ســـەرچاوەی هەموو پرۆژەکانـــە، ئەوا بوونـــی ناوەڕۆکێتی. هوســـرڵ ئەمـــەی بە"پێویستی هۆکار" ناوزەدکـــردوە، بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی چێژ بدۆزینەوە پێویستە ئاگایی لەو چێژەوە،

وەکو هۆکارێکی پێویست هەبێت. یاسا لایەنێکی بەرزی زانینە؛ ئاگایی لە یاساوە هەیە، بەڵام یاسـای ئاگایی نییە. لەبەرئەمە، مەحاڵە بێجگە لەخودی ئاگامەندی هاندەرێکی دیکە بۆ ئاگامەندی ساخبکەینەوە. ئەگەر ئەمە نەکەین، لەم حاڵەتەدا جۆرێک لە ئاگایی دێتەکایەوە، کە ئاگای لە خۆی نابێت. تاکو ڕادەیەکیش ئاگای لـە بوون نابێت. لێرەدا دەکەوینە نێو وەهمی ئەو بۆچوونەی باوەڕی بە نەبزێوی ئاگامەنـدی و نیوە – ئاگامەندی هەیە. بەڵام ئاگامەندی هەمیشـە ئاگامەندییە، بێجگە لە خۆی هیچی دیکە سـنورداری ناکات. نابێت سەربەستی ئاگامەندی بە پێکهاتـە یان پێکهێنان دابنێین چونکە ئاگامـەندی پێش بوونی خۆی ناکەوێت. تەنانەت ئەم سەربەسـتییەی، کە ئەوە دەگەیەنێت خۆی ئافەریدکردبێت کردەوە نییـە چونکە ئاگامەندی خۆی بەکردەوە نابێت. ئاگامەندی بوونێکە سـەربەخۆ، ئەمـەش خەسـڵەتێکی بنەڕەتی ئـەم بوونەیە. بۆ دەرخستنی ئەم خەسـڵەتە زاراوەی"هۆکارە بۆ خودی خۆی" بەکارنەهێنین، کە بە ئاکاممان ناگەیەنێت. لەم ڕووەوە باشتـرە بڵێین: بوونی ئاگامەندی لە ئاگامەندییەوە دەردەچێت. هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت، کە ئاگامەندی لە نەبوونەوە دەرنەچووە. نەبوونی ئاگامەندی پێـش ئاگامەنـدی نییە. پێش ئاگامەنـدی بوون هەیە، کە ئامـاژە بۆ نەبوونی ئاگامەنـدی ناکات. ئەگەر نەبوونی ئاگامەنـدی هەبێت، پێویستە ئاگامەندییەکی لە پێشـتر هەبووبێت، کە ئێستا نییە. ئاگامەنـدی ئێستاش بۆ ئەو ئاگامەندییە نەبوونە گەواهی بدات. ئاگامەندی پێش نەبوون دەکەوێت و لە بوونەوە دەرچووە. ڕازیبـوون بەم ئاکامانە، بۆ هەندێک دژوارە. بەڵام ڕاسـتییەکەیان ئاشکرادەبێت ئەگەر وردتر لە نزیکەوە سـەرنجیان بدرێتێ. پارادۆکسەکە لەگەڵ ئەو هەبووانەدا نییـە، کە بوونی خۆیان دەخەنە گەر، بەڵکو لـە وەدایە، کە جۆرێکی دیکەیان نییـە. ئەوەی مەحاڵە بیریلێبکرێتەوە هەبوویەکی ناچالاکە؛ هەبوویەک ، کە هیچ هێزێکی نەبێت و بوونی خـۆی بەردەوام بکات و بیپارێزێت. ئەوەی لە دەرەوەی بیرکردنەوەدایـە یاسـای نەبزێوییە. ئایا ئاگامەندی، ئەگەر لـە شتێکەوە پەیدا نەبووبێت، چۆن هاتۆتە کایەوە؟ لەنێو بێ– ئاگایی یان فسیۆلۆجیەوە هاتووە؟

ئەگەر ئەو پرسیارەش بکەین ئایا ئەمانە لە کوێوە هاتون؟ لەوەڵامدا بە چەمکی بوونێکـی نەبزێو دەگەین. لەوە زۆرتر نازانین چۆن ئەو بێ-ئاگاییە یان فزیۆلۆجییە پەیدابووە. ئەمەش بەڵگەی چاکتر دەسەلمێنێت. *Contingentia mundi* [9] لەگەڵ ڕەتدانـەوەی ئەو بۆچوونەدا، کە زانین پێش دەخات، بوونی زانەرمان دۆزییەوە و

---

٩ ئەمە بەڵگەیەکە بۆ بوونی ئافەریدکەر بە ڕێگەی هەبووەکانەوە. هەرچەندە ئەم بەڵگەیە بە بەڵگەی لایبنیز ( ١٦٤٦- ١٧١٦) دادەنرێت، بەڵام بنەڕەتی بیرۆکەکەی بۆ ئەریستۆ دەگەڕێتەوە. دەتوانین بە شێوازێکی بەڵگەی کۆسمۆلۆجی دابنێین. زاراوەکە لاتینییە و واتای هەڵکەوتووە دەبەخشێت. هەرشتێک هەڵکەوتووبێت پیویستی بە بوونێکی دیکەیە پشتگیری بکات. ئەمەش لەلای هەندێک بیریارە موسوڵمانەکانی، وەکو فارابی و ئبن سینا و ئەل جوەینی بووە بە بەڵگە بۆ سەلماندنی بوونی ئافەریدکەر. (وەرگێڕ)

بەرانبەر ئەو ڕەهایە ڕاوەســـتاین، کە بیریارە هۆشەکییەکانی سەدەی حەڤدەهەم بـــە بابەتی زانینیان ناوزەدکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی پرســـیارەکە ســـەبارەت ئەو ڕەهایە لە بارەی بوونیەوەیەتی نەک ناسینی، ئەوا ڕەخنەکەمان لەسەر ئەوە نییە، کە ئەو بوونە ڕەهایە بە ناسین ڕەهایەتی خۆی وندەکات و پەیوەندی خۆی لەگەڵ زانیندا دروســـتدەکات. لەڕاستیدا، بوونی ئەم ڕەهایە لە سەر بوونیادێکی لۆجیکی ڕانەوەســـتاوە، پەیوەندی بە زانینەوە نییە، بەڵکو بـــەو خۆیەوە هەیە، خاوەنی ئەزموونـــە کۆنکرێتییەکانـــە. هەروەها لەبەر پەیوەندییەکەی بـــە ئەزموونەکەوە ڕێژەیـــی نییە چونکە خۆی ئەزموونەکەیە. بە هەمان شێوە ڕەهایەکی لە ناوەڕۆک بەدەر نییـــە. هەڵەی ئۆنتۆلۆجـــی فێرگەی هۆشەکی دێکارت لـــەوەدا نییە ئەم ڕەهایە بە بوونێکی لە پێشـــتر لە ناوەڕۆک دانابێت، بەڵکو ئەو ڕەهایە ناوەڕۆک نییە. ئاگامەندی ناوەڕۆکی نییە، ئەوەی هەیەتی دیاردەیەکی ڕووتە. بوونیشی بە خۆدەرخستنەکەیەوە بەستراوە. ئاگامەندی دیاردەیە و بۆشاییەکی گەورەیە (چونکە هەموو جیهـــان لە دەرەوەی ئەودایە) لەبەر ئەوەی بوونی و دیاردەی بوونی یەک شتن و جیاوازییان نییە، ئاگامەندی ڕەهایە.

## ٤. بوونی هەستکەر

لەوە دەچێت بە ئامانجی توێژینەوەکەمان گەیشتبین. شتەکانمان بۆ سەرجەمی دیاردە نەبڕاوەکانیان گەڕاندۆتەوە. هەروەها ئەوەشمان ڕوونکردەوە، کە دیاردەکان بـــۆ بوونێک دەگەڕێنەوە، کە ئەو بوونە خودی دیاردەکان نییە. ئەوەی دەســـتی پێدەکرێت ئاماژە بۆ هەستکەرەکە دەکات. ئەویش ئەو بوونەیە، کە بە ئاگامەندی ناوزەدمـــان کرد. لێرەوە بناخـــەی ئۆنتۆلۆجیانەی زانینمـــان دۆزییەوە. ئەمەش یەکـــەم بوونە، کە هەموو دیاردەکان خۆیانی نیشـــاندەدەن. ئەو ڕەهایەیە هەموو فینۆمینۆیەک لە پەیوەندییەکەیـــدا دەبێت بە شتێکی ڕێژەیی. ئەمەش ئەو (خۆ) یە نییە کانت ئامـــاژەی بۆ کردوە، بەڵکو خودگەرایەتییە، خۆیەکە لەنێو خۆیدا. لەبەرئەمەیـــە خۆمان لـــە ئایدیالیزم دووردەخەینەوە. ئایدیالیـــزم بوون بە زانین دەپێوێت و بۆ ســـەر ڕاڕەوی دووەلیستـــی دەگەڕێتەوە. تەنیا بوونی زانراو هەیە؛ ئەویش پرســـیارە لە بارەی خودی بیرەوە. بیر لە ڕێگەی بەرهەمەکانیەوە خۆی دەردەخـــات؛ ئەویش واتای بیرەکانە. فەیلەســـوفیش لە گەڕانیـــا بە دوای بیردا پێویستە پرســـیار لە زانستەکان بۆ مەرج و گونجاندنی بیرەکان بکات. ئێمە، لە لایەکـــی دیکەوە، بە جۆرێک لە بوون گەیشـــتوین، کە بابەتی زانین نییە و زانین دادەمەزرێنێـــت. بیرێکە، کە دڵنیایـــن لەوەی نابێت بە واتا یـــان نوێنەری بیر، بەڵکو ڕاســـتەوخۆ دەناسرێت. ئەم شێوەی ناســـینەش فینۆمینەی زانین نییە و

بوونیادی بوونە هەرچەندە هوســـرڵ لەگەڵ یەکەم حەدەسیدا ڕاستگۆ نەبوو. ئێمە خۆمان لە ســـەر زەمینەی فینۆمینۆلۆجی هوســـرڵ ڕادەگرین. ئایا ئێمە لە ئەمە ڕازین؟ ئێمە توشی فنۆمینۆیەکی پێشـــگر بووین، بـــەڵام ئایا ئەمە ئەو بوونەیە، کـــە فینۆمینەی بوونی بۆ دەگەڕێتەوە؟ ئایا ئاگامەندی دەتوانێت ببێت بەبناخەی خـــودی دیاردەکان؟ ئێمە بوونی دیاردەکانمان لـــە فینۆمینەوە دەرهێنا و دامان بە ئاگامەنـــدی. لەوباوەڕەشدا بووین ئاگامەندی جارێکی دیکە بۆ فینۆمینەکەیان دەگەڕێنێتەوە. ئایا ئەم کارە دەکرێت؟ وەڵامی ئەمە لە لێکۆڵینەوەکەمان لەســـەر ئۆنتۆلۆجی هەستکەر دەدەینەوە.

پێش هەموو شتێک پێویستە بزانین، کە بوونی ئەو شتەی هەستکراوە[لەدەرەوەی بیردا]یـــە. تەنانـــەت ئەگەر مێزەکە بۆ چەند خەســـڵەتێکی هەســـتەکی ناوەوە بگەڕێنمەوە پێویستە باوەڕم بەوە هەبێت، کە مێزەکە لە ڕێگەی ئەو خەسڵەتانەوە، وەکو بابەتێکی دەرەکی خۆی دەردەخات. مێزەکە لە بەردەم هەســـتکردنەکەدایە و خودی هەســـتکردنەکە نییە، ئەگینا دەبێت بە ئاگامەندی یان شتێکی ناوەوەی خۆ و لەبەر چاو وندەبێت. ئەگەر خەسڵەتە هەستەکییەکانی مێزەکە لە یەکدیش جیابکەمەوە پێویستە بوونێکی بۆ بدۆزمەوە، کە لە ســـەری ڕادەوەســـتێت. ئەو بوونەش هەستکەرەکەیە. هەروەها بوونی هەستکەر بۆ هەستکراوەکان ناگەڕێتەوە. ئێستا شێوازی بوونی هەستکەر نەبزێوی یە. کەوابوو ئەگەر بوونی فینۆمینە لەنێو هەســـتکردندابێت، ئەم بوونەش نەبزێوە و چالاک نییە. نەبزێوی و ڕێژەگەری دوو خەسڵەتی ئەم بوونەن. ئایا نەبزێوی چییە؟ من نەبزێوم ئەگەر بە گۆڕانێکدا بڕۆم و خۆم سەرچاوەی گۆڕانەکە نەبم؛ واتە، من نەسەرچاوە و نەداهێنەری گۆڕانەکەم. بوونم شێوازێک وەردەگرێت، کە خۆی پەیدای نەکردوە. بەڵام، لەگەڵ ئەمەشدا، بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە ڕووبدات پێویستە من هەبم. لەبەرئەمە بوونم هەمیشە کەوتۆتە ئەولای نەبزێوییەوە. لایەنگرتنی نەبزێوانەش جۆرێکە لە هەڵسوکەوت، کە من بڕیاری لەسەر دەدەم، لەبەر ئەوەی دەتوانم بڕیاری ڕەتدانەوەشی بدەم، سەربەستییەکەم دەخاتەگەر. ئەگەر من ئەو کەسەبم هەمیشە پەست و توڕەیە، پێویستە لە بوونی خۆمدا ببینم، کە من خۆم بڕیار لەسەر ئەو بوونەم دەدەم. هەروەها بە جۆرێکیش وەڵام دەدەمەوە، خۆم لە ئاستی ئەوەی پەست و توڕەم دەکات نەبزێو دەرنەخەم. لێرەدا ئەم چەند ڕێگەیەمان لەبەردەممدایە تاکو یەکێکیان هەڵبژێرین: من خۆم بە نەبزێو دەرناخەم، دەبم بەزەمینەی هەڵچونەکانم، ئەگەرچی ســـەرچاوەکانیان من نیم یان نەبزێو و کارتێکراوم. بوونم دەبێت بە شتێکی هەســـتپێکراو و دەکەوێتە نێو نەبوونـــەوە. بەمجۆرە نەبزێوی بە دوو شێـــوە فینۆمینەیەکی پەیوەندیدارە. لـــە لایەکەوە پەیوەندی بە بزێوی و چالاکی ئەو کەســـەوە هەیە، کە بە کردەوە وەڵامدەداتەوە، لە لایەکەی دیکەوە بە بوونی ئەو کەســـەوە، کە ئازار دەچێژێت.

ئەمەش دەریدەخات نەبزێوی بە سەر بوونی ڕاستەقینەی کەسێکی نەبزێوەوە کاریگەر نییە. پەیوەندی بوون نییە بە نەبوونەوە، بەڵکو پەیوەندی بوونە لەگەڵ بوونێکی دیکەدا. کەسێک بەوجۆرە لە داهێنان تێدەگات، کە داهێنراوەکە بۆ ئەوەی لە بوونی خۆی نزیک ببێتەوە و بڕیاری لەسەر بدات، خۆی لە داهێنەرەکە جیابکاتەوە. پەرتووکێک لە نوسەرەکەیەوە جیاوازە. بەڵام بۆ ئەوەی کاری داهێنان بەردەوام بمێنێتەوە، داهێنراوەکە سەربەخۆ نەبێت، پێویستی بە پشتگرتن هەبێت، شتێک بێت، کە خۆی لە نێو خۆیدا و بە تەنیا هیچە، لە داهێنەرەکەی جیانابێتەوە و لە ناویدا تواوەتەوە. داهێنەرەکەش لەنێو جیهانی ناوەوەی خۆیدا دەمێنێتەوە و دەرناچێت. لەسەرو ئەمەوە، نەبزێوی هەستپێکراوەکە داوای نەبزێوی لە هەستکەرەکەش دەکات. ئەمەش لە یاسای کردەوە و ڕەتدانەوەی کردەوەدا دەردەکەوێت؛ لەبەر ئەوەی دەستم تەوانای شکاندن، گرتن و بڕینی هەیە، بەهەمانشێوەش دەستم دەشکێت، دەگیرێت یان دەبڕێت. بەڵام هەستکردن و زانین چ جۆرە نەبزوێیەکیان تێدایە؟ ئەوان چالاکی و جوڵانن. بەڵام ئەوان جوڵانێکی ڕووتی بێ ئارەزوومەندانەن. هیچ شتێک نایانگرێت. کەوابوو، لەوێدا، کە دەڵێین ئەوەی هەیە هەستپێکراوە، پێویستیمان بە ئاگامەندی یان جوڵانێکە، کە کار لە سەر هیچ شتێک ناکات. هوسرڵ هەوڵیداوە بە گەڕانەوەی نەبزێوی بۆ ناوەڕۆک چارەسەری ئەم کێشانە بکات، کە بووە بە هێولی و جوڵانی ڕەوانی ئەزموونەکان و ماتەر بۆ نەبزێوییە تێهەڵکێشراوەکان. بەڵام ئەو گرفتێکی دیکەی بۆ زیادکردووین. کۆمەڵێک خەسڵەتی پێدراوی بۆ ڕیزکردووین کە بوونیان مەحاڵە. دڵنیام لەوەی ئەمانە (ناوەڕۆکەکانی) ئاگامەندی نین و بە نەزانراوەیش دەمێننەوە. هێولی ئاگامەندی نییە چونکە لەنێو شەفافییەتدا وندەبێت، مانەوەی بناخە و سەرنجەکان ناپارێزێت. بەڵام ئەگەر ئاگامەندی نەبێت ئەمە لە کوێوە هاتوە؟ چۆن دەتوانێت خەسڵەتی شتەکان وەرگرێت و لەبەردەم خۆیی بیرۆکەکانیشدا خۆڕاگربێت؟ ناوەڕۆکیشی لە شتە هەستکراوەکانەوە سەرهەڵنادات چونکە هێشتا ئەو شتانە هەستیان پێنەکراوە. ئاگامەندیش بۆ ناسینیان ڕوو لە دەرەوە دەکات و بوونی خۆی جێدەهێڵیت. هێولی پشت بە خۆی بۆ بوونی دەبەستێت. لێرەدا جارێکی دیکە ڕووبەڕووی گرفتە لە چارە بەدەرەکەی پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و ئەو بوونە دەبینەوە، کە پشت بە ئاگامەندی نابەستێت و سەربەخۆیە. ئەگەر لەگەڵ هوسرڵدا باوەڕ بە هێولی وەکو ناوەڕۆکیش بکەین، هێشتا تێناگەین چۆن ئاگامەندی جیهانی ناوەوەی خۆی جێدەهێڵێت و ڕوو لە جیهانی دەرەکی دەکات. هەندێک بیردەکەنەوە، کە هوسرڵ بە دانانی هێولی بە شت و هەروەها ئاگامەندیش چارەسەری ئەم گرفتەی کردووە. بەڵام ئەو تەنیا لە موتوربەکردنیان سەرکەوتوو بوو، کە ئاگامەندی پێی ڕازی نییە و نایەوێت ببێت بە بەشێک لە جیهان.

وەکو بینینمان، بە گوێرەی بوونی هەستکەر هەستپێکردن ڕێژەییە. ئایا بوونی ئەو شتەی زانراوە لە ئاستی زانیندا ڕێژەییە؟ ئایا ڕێژەیی ڕاوەستانە لە سەر شتێکی دیکە؟ بێگومان ناتوانین بوونێک لە ئاستی خۆیدا بە دەرەکی دابنێین. شتێکی هەستپێکراو لە بەردەم ئاگامەندییدایە؛ ئاگامەندی بەو شتە ناگات و ئەو شتەش ناچێتە نێو ئاگامەندییەوە. هەمانکات شتێکە لە ئاگامەندی دابڕاوە. ئەگەر ئەم بوونە بەو جۆرەی هوسرڵ باسیدەکات بە ناڕاست دابنێین سودی نییە. تەنانەت، وەکو شتێکی ناڕاستیش دەبێت هەبێت. کەوابوو، ئەم دوو خەسڵەتانە؛ نەبزێوی و ڕێژەیی، کە پەیوەندییان بە شێوەکانی بوونەوە هەیە بۆ خودی بوون ناگەڕێنەوە. ناوەڕۆکی فینۆمینە ئەوە نییە، کە هەستپێکراوە. بوونی پێشگیرانەی فینۆمینەی ئاگامەندی نابێت بە بناخەی پێشگیری فینۆمینەی بوون. ئێمە لێرەدا هەڵەی بیریارە فینۆمینەلیستەکان دەبینین: ئەوان بابەتیان بۆ کۆمەڵێک دیاردە گەڕاندۆتەوە. لەو باوەڕەدابوون، کە بابەت کۆمەڵێک شێوازی بوونە. ئەمەشیان بە چەمکەکان باسکردوە و بەسەر شێوازەکانی بووندا سەپاندوویانە. ئاماژەیان بۆ پەیوەندییەکانی نێوان ئەو شتانە کردووە، کە هەن و لە بەر چاون.

## ٥ . بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی

بوون بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە. ئێمە لەو باوەڕەدا بووین بە دانانی پێشگری فینۆمینە بۆ بوون بە ئاکامەکەمان دەگەین چونکە پێشگری فینۆمینەی بوونی ئاگامەندیشمان دۆزییەوە. بەڵام ئێستا هەوڵدەدەین بە پێچەوانەوە ئەوە ئاشکرا بکەین، کە ئەو پێشگرە فینۆمینەیەو پێویستی بە بوونی فینۆمینەکەیە. بۆ ئەم مەبەستەش بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی بەکاردەهێنم، کە لە سەر **کۆجیتۆی پێش تێڕامان** ڕادەوەستێت. هەموو ئاگامەندییەک ئاگاییە لە شتێک. ئەم پێناسەکردنەی ئاگامەندی دوو واتای هەیە: ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئاگامەندی بوونی بابەتەکەی پێکدەهێنێت یان ئاگامەندی پەیوەندی بە بوونێکی بەرزەوە هەیە.[١٠] بەڵام واتای یەکەم زوو توشی گرفت دەبێت و هەڵدەوەشێتەوە: ئاگایی لە شتێکەوە بوونی بابەتێکی کۆنکریتی لەبەردەم ئاگامەندییدا قوتدەکاتەوە، کە ئەو بابەتە لە ئاگامەندییەوە جیاوازە. بێگومان کەسێک دەتوانێت ئاگای لە بوونی شتێک بێت، کە لە بەردەمیا ئامادە نییە. بەڵام ئەم ئامادەنەبوونە، هەمانکات پێشمەرجێکی پێویستە بۆ ئامادەبوون.

---

١٠ مەبەست لە بوونی بەرز جیهانی فۆرمە بەرز و هەمەکییەکانی ئەفلاتون یان نۆمینەی کانت نییە. لە فەلسەفەی بوونگەرایەتیدا بابەتی زانین وەکو مێز هەمیشە لە دەرەوەی ئاگامەندییدایە و لەنێو ئاگامەندییدا نییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئاگامەندی دەبێت ڕوو لە دەرەوەی خۆی بۆ ناسینی بابەتەکە بکات. بێگومان سارتەر زاراوەی (بەرز)ی بۆ بابەتەکانی دەرەوەی ئاگامەندی لە هایدیگەرەوە وەرگرتوە و هایدیگەریش بەهەمان شێوە بۆ هەمان مەبەست باسیکردوە و بەکاریهێناوە. (وەرگێڕ)

ئاگامەنـــدی خۆگەرانەیە و ئـــەوەی دەیزانێت ناوەکییـــە. خۆگەرێتی ئاگامەندی ناتوانێت بچێتە دەرەوە و خەســـڵەتەکان بە ســـەر بابەتەکـــەدا بسەپێنێت. ئەگەر سووربین لەسەر ئەوەی بوونی دیاردەیەک پشت بە ئاگامەندی دەبەستێت، بابەتەکە دەبێـــت لە ئاگامەندی جیابکرێتەوە، نەک بـــە ئامادەبوونی لە بەردەم ئاگامەندییدا بەڵکـــو بـــە ئامادەنەبوونی. نەک بـــە پڕی لە ڕووی خەســـڵەتەکانیەوە بەڵکو بە نەبوونی ئە پڕییە. ئەگەر بوون بۆ ئاگامەندیش بگەڕێتەوە، هێشـــتا ناتوانین بابەت بە ئاگامەند دابنێین و بڵێین شتێکە، کە نییە. ئەمەش پەیوەندی بە باسەکەمانەوە لە ســـەر نەبڕاوە هەیە، کە لە پێشـــتر ئاماژەمان بۆ کرد. بۆ هوسرڵ، بۆ نموونە، لایەنەکانی هێولی بەس نین تاکو ئاگامەندی بۆ دەرەوەی خۆیان پەلکێشبکەن. ئەو مەبەســـتانەی بابەتگەرین لە ڕاستییدا پوچەڵن. ئەوانەن دەیانەوێت خۆیان بەو دیو دیاردەی خۆ بگەیەنن. پێویستە بزانین مەبەستەکان دەیانەوێ بەو دیاردانە بگەن، کە لە یەک کاتدا خۆیان بە دەستەوە نادەن. مەحاڵە سەرجەمی زنجیرە نەبڕاوەکەی دیاردەکـــان لە یەک کاتدا خۆیان لە بـــەردەم ئاگامەندییدا ڕاگرن. ئەگەر ئامادەش بن، هەموو خەسڵەتە لە ژمارە بەدەرەکان لەنێو خۆدا دەتوێنەوە؛ ئامادە نەبوونیان بوونێکی دەرەکییان پێدەبەخشـــێت. لەم ڕووەوە بوونی بابەتێک نەبوونێکی ڕووتە. بە کەم و کورت پێناســـەدەکرێت. بوونی ئەو شتەیە، کە لە دەستمان ڕادەکات و بە چەند شێوەیەکیش خۆی دەردەخات. چۆن نەبوون دەبێت بە بناخەی بوون؟ چۆن ئامادەنەبوون دەبێت بـــە ئامادەبوون؟ ئەو خۆشییەی بە ئومێدەوەم بیگەمێ، ئەو ناخۆشییەی دەترســـم توشم بێت، جۆرێک لە بەرزێتیان تێدایە. بەڵام ئەم بەرزێتیە ئێمە لە نـــاوەوە بۆ دەرەوە پەلکێش ناکات. دروســـتە شتەکان ڕوخساری خۆیان نیشانددەن؛ خۆیان دەردەخەن، هەروەها دروستە هەر یەکێک لەو دیاردانە ئاماژە بۆ دیاردەیەکی دیکە دەکات.

بەڵام خودی هەر یەکێک لەو دیاردانە بوونێکی بەرزە و خەسڵەتێکی هەستەکی نێو ئاگامەندی نییە. بوونێکی پڕە نەک کەم، ئامادەیە نەک ئامادە نەبوو. ناتوانین ڕاستەقینەی بابەت بۆ خەسڵەتە هەستەکییەکان و نەبوون بگەڕێنینەوە. شتێکی دەرەکی لە ناوەکییەوە سەرهەڵنادات. بوونیش لە نەبوونەوە پەیدا نابێت.

هوســـرڵ ئاگامەندی بە بەرز دادەنێت. ئەمەش لەوێدا ڕاســـتە، کە نۆمینە بە ناڕاســـت دادەنێت بەڵام توشی ناکۆکی دەبێـــت. هەموو ئاگامەندییەک ئاگاییە لە شتێک. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە ئاگامەندی بونیادێکی بەرزی هەیە؛ ئاگامەندی لـــەو ڕۆژەوە پەیدا بووە بوونی لەســـەر شتێک ڕاوەســـتاوە، کە ئەو شتە خودی ئاگامەنـــدی نییە. ئێمە ئەمە بە "بەڵگەی ئۆنتۆلۆجـــی" ناوزەد دەکەین. دڵنیام هەندێـــک ئەو ڕەخنەیەشمان لێدەگرن، کە داواکارییەکانی ئاگامەندی تەواو نابن و جێبەجێش ناکرێن.

بەڵام ئەمە کار ناکاتە سەر بۆچوونەکەی هوسرڵ لە سەر مەبەستداریێتی ئاگامەندی. هەرچەندە هوسرڵ لە ناوەڕۆکی کێشەکە تێنەگەیشتوە. هەموو ئاگامەندییەک ئاگاییە لە شتێک، ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لە دەرەوەی ئاگامەندییدا بێجگە لە دەرخستنی ئەو بابەتەی لە ئەزموونەکەدا دەردەکەوێت چی دیکە نییە.

بۆنموونە، دەرخستنی بابەتە بەرزەکە. ئەوەی بە خۆگەرایەتی ناویدەبەین ئاگایی ئاگامەندییـــە لە خـــۆی. بەڵام ئەو ئاگاییەی ئاگامەندی دەبێت هەبێت. بوونیشـــی بەو حەدەســـەوە گرێـــدراوە، کە بەرەو بابەتەکـــە دەڕوات، ئەگینا هیچە. حەدەس ئەوە دەگەیەنێـــت، کە بابەتێک لەنێو ئەو ئەزموونەدا ناســـراوە. ئەمەش لەوانەیە لەهەڵوێستی ڕەتدانەوەی کانت دژی ئایدیالیزم بچێت.

بەڵام من لێرەدا بیر لە دێکارت زیاتر دەکەمەوە. ئێمە لە سەر زەمینەی بوون، نەک زانین ڕاوەستاوین. نامانەوێت مشتومڕ لە سەر ئەو کێشەیە بکەین، کە دیاردەکانی نێو هەستمان ئاماژە بۆ بابەتە دەرەکییەکانی نێو شوێن دەکەن. بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونی ئاگامەندی پەیوەندی بە بوونێکی نا-ئاگامەند لە دەرەوەی خۆیدا هەیە.

ئەگـــەر بڵێین ئاگامەندی ئاگاییە لـــە شتێک، ئەوا پێویستە ئاگامەندی خۆی وەکـــو بینەری پرۆســـەی بینینی ئەو بوونە بینراوە خـــۆی دەربخات، کە لێوەی جیاوازە. لە هەمانکاتدا لە کاتی ئەزموونەکەی ئاگامەندیدا شتێکە، کە هەیە.[11] لێرەوە دیاردەی ڕووت جێدەهێڵین و بە بوونێکی پڕ دەگەین. ئاگامەندی بوونێکە، کە ناوەڕۆکی خۆی دادەهێنێت و هەروەها ئاگاییە لەو بوونەی ناوەڕۆکی لە پێش بووندایە و دیاردەکەی ئەو بوونە بەرجەستە دەکات. بوون لەهەموو شوێنێکدایە. دەتوانین لە پێناسەکردنی ئاگامەندیشدا پەیڕەوی پێناسەکەی هایدیگەر بۆ دازاین بکەین.[12] بەڵام لەو باوەڕەداین پێناسەکە پێویستی بە تەواوکردن هەیە. لەبەرئەمە دەڵێیـــن: ئاگامەندی ئەو بوونەیە، کە لە بوونیدا پرســـیار لە بـــارەی بوونیەوە دەکرێت و ئاماژەش بۆ بوونێکی تر لەخۆی دەکات. ئەم بوونە نۆمینە و لایەنێکی شـــاراوەی ئەو دیو دیاردەکان نییە. بوونی ئەم مێـــزە، پاکەتە جگەرەیە، چرایە یان بەگشـــتی بوونی جیهانە، کە لە بـــەردەم ئاگامەندییدایە. هەروەها بوونی بە تەنیا بە خۆ دەرخستنەکەیەوە گرێنەدراوە. بۆ ئاگامەندی ئەم بوونە پێشگیرییەی فینۆمینەکان بوونە لەنێو خۆیدا.

11 مەبەستی سارتەر ئەوەیە ،کە لە ئەزموونی ئاگامەندی مرۆڤدا بابەتێکی دەرەکی ،وەکو مێز پیویستی بە ئاگامەندی بۆ بوونی نییە .مێزەکە لە کاتی ئەزموونەکەدا یان پێش ڕوودانی ئەزموونەکە دەبێت هەبێت ،تاکو کەسێک بیناسێت ،ئەگینا مێزەکە لە ئەزموونەکەوە پەیدانەبووە و سەر بە جیهانی ناوەوەی خۆ نییە .ئەمەش ڕەتدانەوەی بۆچوونە ئایدیالیستییەکەی بارکلی یە و بابەتگەرێتی بوون دەسەپێنێت (.وەرگێڕ)

12 دازاین زاراوەیەکی ئەڵمانییە ( دا-لێرە) و (زاین-بوون) :واتە بوون لێرە . هایدیگەر ئەم زاراوەیەی بۆ بوونی ئاگامەندی مرۆڤ بەکارهێناوە (وەرگێڕ)

## ٦. بوون—لەنێو—خۆدا

ئێستـــا دەتوانین ســـەبارەت دیاردەی بوون بە هەندێـــک ئاکام بگەین. مەندی هەبووەکان دەناســـێت و هەبووەکانیش لە ســـەر بناخـــەی بوونیانەوە خۆیان بۆ ئاگامەنـــدی دەردەخەن. بەڵام ئەو بوونەی بناخـــەی هەبووەکانە بە تەواوی خۆی دەرناخات. هەروەها هەبوویەک لە بوونی دانابڕێت؛ بوون هەمیشـــە لە هەبووەکاندا ئامادەیە؛ لە هەموو شوێنێکدا و لە هیچ شوێنێکیشدا نییە. هیچ بوونێکیش بە بێ شێواز نیە. ئاگامەندیش هەمیشـــە دەتوانێت خۆی بەو دیو هەبووەکان بگەیەنێت، نەک لـــە بوونی بەڵکو لەواتـــای بوونی ئەو هەبووانە تێبگـــات. لەبەرئەمەشە بە ئۆنتیـــک- ئۆنتۆلۆجیانە ناوزەدی دەکەین چونکە لە هەبووەکانەوە (ئۆنتیک) واتای بوون (ئۆنتۆلۆجی)تێدەگـــات.[١٣] ئەوەی خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات دیاردەی بوونە، ئاگامەندی هەوڵدەدات لە واتاکەی تێبگات. ئەو واتایەش بوونی خۆی هەیە، کە لە ســـەر ئەو شتە ڕادەوەســـتێت و خۆی دەردەخات. لەم گۆشە نیگایەوە لە گوتەی بیریارانی سەدەکانی ناوەڕات تێدەگەین، کە گوایە هەموو دەستەواژەیەک لە سەر بوون لەنێو خولەیەکی بازنەییدا دەسوڕێتەوە، چونکە هەموو دەستەواژەیەک لە ســـەر بوون پێویستی بەو بوونەیە لە پێش خۆیدا هەیە. بەڵام لە ڕاستییدا ئەم کێشەیەی ئێمە سوڕانەوەی تێدا نییە. پێویست ناکات پاش تێگەیشتن لە واتای بوون بەرەو واتایەکی دیکە بڕۆین. واتای بوون هەموو فینۆمینەیەک دەگرێتەوە و تەنانەت بوونی واتاکەشی تێدایە. دیاردەی بوون بوون نییە، کە لە پێشـــتریش باسمانکرد بـــەڵام ئاماژە بۆ بـــوون دەکات و پێویستی بە بوونە. ئـــەو بەڵگە ئۆنتۆلۆجییەی لە پێشـــتر ڕوونمانکردەوە بۆ ئەم لەبار نییە. بـــەڵام جۆرێک بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی هەیـــە بۆ ئاگامەندی لەبـــارەو دەتوانین بەکاری بهێنین. هەمـــوو ئەو زانیاریانەی پێدەسەلمێنرێت، کە لە دیاردەی بوونەوە دەستمان دەکەوێت. لەهەموو حاڵەتێکدا بەوشێوەیەی هایدیگەر باسیدەکات، تێگەیشتنێکی پێش-ئۆنتۆلۆجییانەمان هەیە؛ ئەو تێگەیشتنەی هێشتا پێویستی بە چەمکەکان و ڕوونکردنەوە نییە.[١٤] لێرەدا

١٣ جارێکی دیکە سارتەر زاراوەی هایدیگەر بۆ بوونی ئاگامەندی یان مرۆڤ بەکاردەهێنێت. بە دیدی هایدیگەر مرۆڤ تەنیا بوونەوەرێکە لەنێو هەبووەکاندا خۆی بەو دیو بوونی (ئۆنتۆکی) هەبوو دەگەیەنێت و پرسیار لەبارەی واتای بوون بەگشتی دەکات. من ئەم خاڵەم لە پەرتووکەکەمدا (هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی) باسکردوە. بڕوانە: محەمەد کەمال. هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٦. لاپەڕە، ٣٩-٤٠.

١٤ تێگەیشتنی پێش- ئۆنتۆلۆجییانە هایدیگەر بەو هەڵوێستەی دادەنێت، کە ئاگامەندی ڕاستەوخۆ دیاردەکەی لادەردەکەوێت. بۆ نموونە من چاو بە ژوورەکەدا دەگێڕم و لە ناوەڕاستدا مێزەکە دەبینم. لەم ئەزموونەدا مێزەکە خۆی بۆ من دەرخستوە، منیش چاوم بە مێزەکە کەوتووە. ئەمە هەڵوێستێکی سادەیە و من لەم ئەزموونەدا پەنام بۆ چەمکەکان و زمان نەبردووە، تاکو لە بارەی ڕاستی بوونی مێزەکەوە بدوێم. (وەرگێڕ)

پرسیار لەبارەی دیاردەکەوە ناکەین تاکو واتاکەی بە ڕێگەی چەمکەکانەوە دەربڕین. هەروەها پێویستە ئەم خاڵانەش ڕەچاو بکەین:

**یەکەم**، ڕوونکردنەوەی واتای بوون تەنیا بۆ بوونی دیاردەکە لەبارە. مادامەکی بوونـــی ئاگامەندی جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە پێویستە باســـکردنیش لەم بوونە تایبـــەت بێت و بەو بوونە دابنرێت، کە دیاردەکان تیایدا دەناســـرێن و ناویدەنێین بوون-بۆ-خۆ، لە دواییدا باســـی ئەم بوونەش دەکەین و دژوەستاو بەرانبەر بوون-لەنێو-خۆیدا دایدەنیین.

**دووەم**، ڕوونکردنەوەکەمان ســـەبارەت واتـــای بوون-لەنێو-خۆدا کاتییە. ئەو لایەنانەی باسیاندەکەین ئاماژە بۆ شتی دیکە دەکەن، کە پێویستە لێیان تێبگەین. توێژینەوەکەمان بە تایبەتـــی دوو دەڤەری بوونی لە یەکدی جیاکردۆتەوە: بوونی پێش تێڕامانی کۆجیتۆیی و بوونی دیاردە. هەرچەندە ئەم دوو دەڤەرە لە پەیوەندی دابـــڕاون پێویستە بزانین چۆن هەردووکیان ســـەر بە بوونێکـــن. ئەمەش زۆرمان لێدەکات لە بوونیان بکۆڵینەوە. دژوارە لە واتای یەکێکیان بەبێ ئەوی دیکەیان و بەستنەوەیان بە یەکدییەوە بە تەواوی تێبگەین. ئێمە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەکەمان لە سەر ئاگایی لە خۆوە روونمانکردەوە بوونی دیاردە کار ناکاتە سەر ئاگامەندی. لێـــرەوە پەیوەندییەکی ڕیالیستانەمان لە نێوان دیـــاردە و ئاگامەندییدا دۆزییەوە. هەروەها باسی ئەوەشمانکرد لە کۆجیتۆی پێش تێڕاماندا ئاگامەندی لەنێو دەلاقەی خۆگەرایەتی خۆیەوە ناچێتە دەرەوە؛ کارناکاتە سەر بوونە بەرزە [دەرەکییەکە]. بۆ ئەمەش چارەسەرکردنێکی ئایدیالیستانەمان خستەڕوو. بەمجۆرە لەوانەیە وادەرکەوێت ئێمە هەموو دەرگاکانی پەیوەندی نێوان بوون و ئاگامەندیمان داخستبێت. پێویستە بیسەلمێنین، کە بێجگە لە چارەســـەرەکانی ڕیالیزم و ئایدیالیزم ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی دیکەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم گرفتەدا بکەین و چارەسەری بکەین. هەندێکجار تێڕوانینمان بۆ دیاردەی بوون بە هۆکاری ئەو بۆچوونەوە، کە گوایە هەموو شتێک ئافەریدکـــراوە، تەم و مـــژاوی دەبێت. مادامەکی زۆر کەس لـــەو باوەڕەدایە خوا جیهانی ئافەریدکردوە، ئەوا بوون بە شتێکی نەبزێو دادەنرێت.

بەڵام ئافەریدکردنی بوونێک لە نەبوونەوە ناتوانێت بۆمان بسەلمێنێت چۆن بوون پەیدابووە. هەرشتێک خۆگەرانەبێت، تەنانەت باوەڕمان بەوەبێت، کە لەنێو (خۆ)ی خواشدایە، هەرگیز نابێت بـــە شتێکی بابەتگەرانە و لەنێو (خۆ)کەدا دەمێنێتەوە. ئەم جۆرە خۆیە ناتوانێت نوێنەری بابەتەکەشی بێت.

لەبەرئەوە ویستی ئافەریدکردنی لەلا ســـەرهەڵنادات. ئەگەر بوون بەو جۆرەش بێت لایبنیز باســـیدەکات، کە لە خۆوە دەردەچێت، دەبێت بە شتێکی دژوەستاو و دوورەپەرێز لە ئافەریدکەرەوە ڕادەوەستێت، ئەگینا لەنێو خۆدا دەمێنێتەوە و نابێت بـــە شتێکی دەرەکی. لە بیردۆزی ئافەریدکردنی بەردەوامدا لەگەڵ لابردنی ئەوەی

ئەڵمانییەکان بە "سەربەخۆ" ناوزەدیدەکەن لەنێو خۆی خوادا دەتوێتەوە. ئەگەر بوون لە خواوە جیاوازبێت دەبێت بە سەرچاوەی بوونی خۆی؛ هیچ ئاسەوارێکی خوا و مۆرکی خوایەتی پێوە دیارنابێت. ئەگەر ئافەریدیش کرابێت هێشتا بوونی-لەنێو-خۆیدا، بە تەم و مژاوی دەمێنێتەوە، لەبەر ڕۆشنایی بیردۆزەی ئافەریدکردندا لە واتاکەی ناگەین.

ئەمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا، کە بوون بە ئافەریدنەکراو دادەنێت هاوتەرازە. بەڵام نابێت جەخت لەسەر خۆ ئافەریدکردنی بوونیش بکەین، چونکە لەم حاڵەتەدا بوون دەبێت پێش ئافەریدکردنی خۆی [لەپێشتر] هەبێت. بوون بە جۆری ئاگامەندی نییە[١٥] بوون خۆیەتی، نەبزێوە و نەنەبزێو. ئەم دوو زاراوانە[بزێو و نەبزێو] خەسڵەتی بوونی مرۆڤن. بزێوی لەوەدایە ئاگامەندی بۆ مەبەستێک دەیەوێت بە ئاکامێک بگات. ئەو بابەتانەش بە نەبزێو دادەنێین، کە کاریان لەسەر دەکەین چونکە بەبێ مەبەستی ئێمە بە هیچ کۆتاییەک ناگەین. مرۆڤ بزێوە و ئامێرەکانی دەستیشی نەبزێو. ئەگەر ئەم زاراوانە لەبوونی مرۆڤ ڕووتبکەینەوە، بەتەنیا دایانبنێن هیچ واتایەک نابەخشن. بوون بە تایبەتی بزێو نییە؛ بۆ گەیشتن بە کۆتایی لە ڕێگەی ئامێرەکانەوە، پێویستە بوونێک هەبێت بەو کارە هەستێت. هەمانکات نەبزێویش نییە. ئەوەی نەبزێوە دەبێت هەبێت. بوون و بەردەوامییەکەی لەودیو واتای بزێوی و نەبزێوییەوەیە. بوون، بە هەمان شێوە، لەودیوو ڕەتدانەوە و سەلماندنەوەیە. سەلماندن، هەمیشە سەلماندنی هەبوویەکە؛ هەروەها سەلماندن، وەکو کردەوە لە شتە سەلمێنراوەکەوە جیاوازە. ئەگەر ئەو شتەی دەسەلمێنرێت، سەلماندنەکە بهێنێتەکایەوە و لەگەڵیا یەک بێت سەلماندنی ئەم سەلماندنە مەحاڵ دەبێت. ئێمە لە پەیوەندی شتە سەلمێنراوەکەوە بە ئاگامەندییەوە بوون دەدۆزێتەوە. لەم ڕووەوە بە ناوەکی دانانرێت. بوون پەیوەندی بەخۆیەوە نییە. ئەو خۆیەتی. بەڵام ناتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت. بزێوییەکە، کە نابزوێ چونکە بە خۆیەوە نوساوە. هەموو ڕووداوێک، وەکو ئەوە وایە بوون بۆ خۆ بسەلمێنێت، هاوکات بوونیش دەردەخات. پێویستە بوونیش بە شتێکی نەگۆڕی خۆسەلمێنەر دابنرێت. نەگۆڕی و یەک جۆری بوونی-لەنێو-خۆیدا لە ژوور زنجیرە نەبڕاوەکەی خۆسەلماندنەوەیە. لێرە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین، کە بوون شتێکە لەنێو خۆیدا. بەڵام بوونی-لەنێو-خۆیدا، وەکو ئاگامەندی پەیوەندی لەگەڵ خۆی دروستناکات

---

١٥ *Causa sui* وشەیەکی لاتینییە، واتە بوون بۆ خۆ، بۆ نموونە، ئەمڕۆ زۆر لە بیریارە ئایدیالیستەکان خوا بەم هۆکارە دادەنێن. لەو باوەڕەدان هۆکارێکی دەرەکی بۆ بوونی خوا نییە و ناتوانین بڵێین بوونی خوا ئافەریدکراوە. لەم حاڵەتەدا بوونی دەبێت بە هەبوویەکی هەڵکەوتوو، نەک بوونێکی پێویست. بەڵام زاراوەی خۆ-هۆکاری لەخۆیدا ناکۆکە، چونکە هەر بوونێک (خوا یان جیهان) ئەگەر ببێت بە هۆکار بۆ بوونی خۆی پیویستە پێش ئەوەی خۆی بهێنێتەکایەوە یان وەکو هۆکارێکی لەپێشتر هەبێت، ئەمەش بۆچوونێکی پوچەڵە. (وەرگێڕ)

چونکە بوونێکی پڕی هەیە و خاوەنی ناسنامەیە. لەبەرئەمەشە بوون لە ژێر (خۆ) وە دادەنێین. لە ڕاستیدا بوون تاریک و شاراوەیە لە خۆی، چونکە پڕە. باشترین شێوەی دەربڕینی ئەم خەسـڵەتەی بوون لەوێدایە بڵێین بوون ئەوەیە، کە هەیە. ئەم دەستەواژەیە بە ڕواڵەت شیکەرەوانەیە و دووریشە لە یاسای (خۆیەتی)یەوە، کە بناخەی هەموو دەستەواژەیەکی شیکەرەوەیە.(١٦)

پێـش هەموو شتێک ئاماژە بۆ دەڤەرێکی دیاریکراوی بوون دەکات، کە ئەویش بوونە- لەنێو- خۆیدا. هەمانکات بوون- بۆ خۆی، بە پێچەوانەی بوون- لەنێو-خۆیدا پێناسەیەکی جیاوازی بۆ دەکرێت. بوون- بۆخۆی ئەو بوونەیە، کە نییە و ئەو شتەش نییە، کە هەیە. کەوابوو پرسـیارەکەمان سـەبارەت بنەڕەت و تێهەڵکێشەکردنە. ناتوانین بەو شێوەیەی باسی بوون- لەنێو- خۆ دەکەین، وەکو ئەو شتەی هەیە، لە سەر بوونی ئاگامەندی بدوێین، چونکە ئاگامەندی هێشتا نەبووە بەوەی هەبێت.(١٧) ئەمەش واتایەکی تایبەتی بە وشەی (هەیە) دەدات. لە یەکەم سـاتی سەرهەڵدانی هەبووەکانـەوە ئەو هەبووانە هەن. ئەمەش لەسـەر یاسـای هەڵکەوتنی بوون- لەنێو-خۆیدا ڕادەوەسـتێت. بەهەمانشێوەش یاساکانی (ناسنامە یان خۆیەتی) و دەستەواژەی شیکەرەوە دەبن بە یاسای بوون و تاریکی و شاراوەیی ئەم جۆرە بوونە دەردەخەن. تاریکی و شاراوەیی بوون-لەنێو-خۆیدا بە پەیوەندی ئێمەوە لەگەڵ ئەم بوونەدا نەبەستراوە؛ نەکەوتۆتە سەر تێگەیشتنی ئێمە و وەستانی ئێمە لە دەرەوەی ئەودا. ئەم بوونە لایەنی ناوەکی نییە تاکو بەرانبەر لایەنی دەرەکی دژانە ڕاوەستێت و یاسـای ئەوبوونەش بێت. بوون-لەنێو-خۆیدا خاوەنی نهێنی نییە؛ شتێکە ڕەق. ئێمە بەشتێکی تێهەڵکێشـراوی دادەنێین، بەڵام لەڕاستیدا هێندە ڕەقە لەوە زۆرتر ناتوێتەوە و لەگەڵ خۆیدا تێهەڵکێشـراوە. ئاکامی بۆچوونەکەشمان ئەوەیە، کە ئـەم بوونە دوورەپەرێزەو بێجگە لە خـۆی لەگەڵ هیچ شتێکی دیکەدا پەیوەندی نییە. تێپەڕین، پەیدابوون، ئەو خەسڵەتەی پێشتر بۆ ئاگامەندییمان دانا، وەکو ئەو شتە نییە، کە هەیە؛ بۆ ئەم بوونە ناگونجێت. بوون بوونی پەیدابوونە، لەبەرئەمە لەودیو پەیدابوونەوەیە. شتێکە، کە هەیە و ئەوەش نییە؛ کەهێشـتا پەیدانەبووە. لەبەرئەوە لایەنی ڕەتدانەوە (نێگەتیڤی) نییە و پۆزەتیڤێکی پڕە. ئەوی دی نییە؛

---

١٦ بە دیدی کانت دەستەواژەی شیکەرانە یان شیکەرەوە، وەکو سێ گۆشە سێ گۆشەی هەیە، ناسنامەیەکی تەواوی هەیە. هاوکات زانیارییەکی دیکە یان هیچی دیکە بۆ ناسینی بابەتی دەستەواژەکە زیاد ناکات. (وەرگێڕ).

١٧ سارتەر تاکو ئەم شوێنە بوونی مرۆڤ بە ئاگامەندی ناوزەد دەکات. لێرەوە زاراوەی بوون- بۆ-خۆ بەکاردەهێنێت. بوون- بۆ-خۆ و ئاگامەندی بوونی مرۆڤ سێ زاراوەی جیاوازن بۆ یەک شێوازی بوون. (وەرگێڕ)

خۆی بەرانبەر دژەکەی ڕاناوەستێنێت و پەیوەندی لەگەڵی دروستناکات. بەردەوام خۆی لەنێو بوونی خۆیـــدا ڕادەگرێت. لێرەشەوە بەو خاڵە دەگەین، کە لە دواییدا باســـیدەکەین. ئەم بوونە کاتیگەر نییە. کاتێک هەستیپێدەکەین، ناتوانین بڵێین شتێکە تێپەڕیوە، نەماوە یان ئاگامەندییمان دەریدەخات ئەو بوونە، بەســـەرچووە چونکـــە ئاگامەندی بوونێکـــی کاتیگەرانەی هەیە و کاتییە. بـــوون لەو شوێنەدا، کـــە هەیە و کەم نییە. بوونێکی پـــڕ و پۆزەتیڤە. ئەو شتێکە لە ڕابردوودا هەبوو، ئێستاش هەیە و هەموو شتێکە. دواجار،ســـێیەم خەســـڵەتی بوونـ لەنێو خۆیدا ئەوەیە،کەئـــەم بوونە (هەیە). ئەمەش ئەو واتایە دەگریتەوە، کە لە هەڵکەوتووەوە پەیـــدا نەبووە و نابێت بە بوونێکی پێویستیش. پێویستی پەیوەندی لە نێوان ئەو دەستەواژانەدا هەڵدەبەستێت، کە کێشەیەک دەخەنە ڕوو یان لە داکەوتدا نەبێت. هەروەها دیاردە لە بوونێکی ڕووتەوە سەرهەڵنادات. ئەمەش بە هەڵکەوتنی بوونـ لەنێو خۆدا دادەنێین. بوونـ لەنێو خۆدا لە شتێکی گونجاویشـــەوە پەیدا نابێت. گونجاو لە بونیادی بوونـ لەنێو خۆیدا نییە و ســـەر بە دەڤەرێکی دیکەی بوونە. کەوابـــوو، بوونـ لەنێو خۆیـــدا شتێکی مەحاڵ و گونجاویـــش نییە. شتێکە هەیە. لەبەرئەمەیـــە ئاگامەنـــدی، بوون بە شتێکی زیادە دادەنێـــت چونکە لە شتێکەوە ئافەرید نەکراوە. لە هۆکار بەدەرە و پەیوەندی بە هیچەوە نییە و هەمیشە زیادەیە. بوون هەیە و لەنێو خۆیدایە. ئەو شتەیە، کە هەیە. ئەم بوونەش سێ خەسڵەتی هەیە، لەم قۆناخەدا لەمە زۆرتر ناتوانین لە سەری بدوێین. ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی تـــەواوی ئـــەو بوونە نییە، کـــە هەیە و لەوە زۆرتر بە چی دیکـــە نابێت. ئێمە لە توێژینەوەکەماندا لەســـەر دیاردەکان باســـی دوو جۆر بوونمان کرد؛ بوونـ لەنێو خۆیـــدا و بوونـ بۆ خـــۆی. زانیارییەکەمان لەبارەی هەردووکیانـــەوە تەواو نییە و ســـەرەتاییە. وەڵامی گەلێک پرســـیارمان لەبارەیانەوە نەداوەتەوە: واتای تەواوی ئـــەم دوو جۆرەی بوون چییە؟ بۆچی هەردووکیان ســـەربە بوونە گشـــتگرەکەن؟ واتای ئەو بوونە گشـــتگرە چییە، کە ئـــەم دوو بوونە جیاوازەی بەخۆوە گرتووە؟ ئەگەر ئایدیالیزم و ڕیالیزم لە دیاریکردنی پەیوەندی نێوان ئەم دوو جۆرەی بووندا ســـەرکەوتوونەبن، چۆن ئێمە چارەسەری ئەم کێشەیە بکەین؟ چۆن بوونی دیاردە لە ژوور دیاردەوەیە؟ من ئەم پەرتووکەم بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە نوسیوە.

# بەشی یەکەم

## بنەڕەتی ڕەتدانەوە

١. پرسیارکردن

توێژینەوەکەمان بەرەو ناخی بوونی بردوین. بەڵام لەبەر ئەوەی نەمان توانیوە پەیوەنــدی نێوان دوو جۆرەکــەی بوون بدۆزینەوە لەســەر کۆڵانێکی دەرنەچوو ڕاوەستاوین. بێگومان ئەمەش بە هەڵبژاردنی ڕێگەکەمانەوە بەستراوە. دێکارتیش لــە مامەڵە کردنی پەیوەندی نێــوان دەروون و لەشدا توشی هەمان گرفت بووە. هەوڵیــداوە لە ڕێگەی پێکەوە بەســتنی ناوەڕۆکی بیرکەرەوە و ئەســتو (ماتەر) ەوە، چارەسەری گرفتەکە بکات. ئەو پەیوەندییەی لەنێو ئەندێشەدا پەیداکردوە. بۆچوونەکەی شیاوی ئاوەڕلێدانەوەیە. بێگومان ئێمە، وەکو دێکارت بۆ کێشــەکە ناڕۆیــن، بەو جــۆرەش بیر لە ئەندێشــە ناکەینەوە. بەڵام ئــەو خاڵە پێویستە ڕەچاوبکرێــت، کــە جیاکردنــەوەی دوو زاراوەی پەیوەندیدار لــە یەکدییەوە بۆ بەســتنەوەیان جارێکی دیکە بە یەکدییەوە کارێکی سودبەخش نییە. پەیوەندی تێهەڵکێشــکردنە. لەئاکامدا لایەنە شیکراوەکان بە تێهەڵکێشکردن ناشاردرێنەوە. لاپۆت دەڵێت: پرۆســەی ڕووتکردنەوە لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە شتێک نەتوانێت بە تەنیا، بەبێ هەبووەکانی دیکە ڕاوەســتێت و لە حاڵەتی دابڕانیشــدا نەبێت. کۆنکرێتیش (هەموو) یەکە، کە بە تەنیا دەتوانێت هەبێت. هوسرڵ هەمان بۆچوونی هەیە؛ ڕەنگی سور ڕووتکراوەیە چونکە ڕەنگ بەبێ فۆرم نییە. لە لایەکی دیکەوە، ئــەو هەبووەی لەنێو کــات و شوێندایە، بە (هەموو) خەســڵەتەکانیەوە شتێکی کۆنکرێتییــە. لەم گۆشەنیگایەوە، ئاگامەنــدی ڕووتکراوەیە چونکە لەنێو خۆیدا ســەرچاوە ئۆنتۆلۆجییەکەی دەڤەری لەنێو- خۆدا دەشارێتەوە. بە هەمانشێوەش مادامەکی دیاردە ئەو شتەیە خــۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات، دەبێت ڕووتکراوە بێت. کۆنکریت هەموویەکی تێهەڵکێشــراوە و ئاگامەندی پێکدەهێنێت. کۆنکرێت مرۆڤــە لەنێو جیهانــدا، یەکگرتنی هەردووکیانە یان هایدیگــەر گوتەنی "بوونە- لەنێو- جیهاندا." ئێمە بە مەبەستەوە لە ڕووتکردنەوەوە دەست پێدەکەین، ئەگەر وەکو کانت پرســیار لە بارەی 'ئەزموون'ەوە بکەین و لەو بارو دۆخانە بکۆڵینەوە ئەزموون دەهێننە کایەوە یان وەکو هوســرڵ داماڵینی فینۆمینۆلۆجییانە بخەینە گەڕ، کــە جیهان بۆ ناوەڕۆکــە پەیوەندیدارەکان بە ئاگامەندییــەوە دادەماڵێت

ســـەرکەوتوو نابین. وەکو ســـپینۆزاشمان لێدێت، کە ویستی لە سەرجەمی شێوە نەبڕاوەکانەوە بە ناوەڕۆک بگات.

پەیوەنـــدی نێوان دەڤەرەکانی بوون بەشێکی گرنگە لە بوونیادی ئەو بوونانە. ئێمـــە لە یەکـــەم تێڕامانەوە ئەم گرنگییەمان بینی. ئێستـــاش پێویستە چاومان بکەینەوە و پرسیار لە بارەی بوونی مرۆڤ-لەنێو- جیهاندا بکەین. لەگەڵ باسکردنی ئەم پەیوەندییەدا دەتوانین وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەینەوە:

**یەکەم،** لەم تێهەڵکێشەیەدا ئەو پەیوەندییە چییە، کە بە بوون-لەنێو- جیهاندا ناوزەدمانکرد؟

**دووەم،** مـــرۆڤ و جیهـــان چین. تاکـــو پەیوەندییان لەگـــەڵ یەکدا هەبێت؟ لە ڕاســـتیدا ئەم دوو پرســـیارە لە یەکـــدی جیاناکرێنەوە. ئێمـــەش نامانەوێت وەڵامەکانیـــان جیابکەینـــەوە. هەمـــوو هەڵوێستێکـــی مـــرۆڤ هەڵوێستە لەنێو جیهانـــدا و بوونی مـــرۆڤ جیهـــان و پەیوەندییەکـــەی نێوانیـــان دەردەخات. ئێمە توێژینەوەکەمان بە یەکێک لەو هەڵوێستانەوە سنوردار ناکەین. بە پێچەوانەوە دەبێت لە چەند هەڵوێستێک و پەیوەندیشیان بە یەکدییەوە بکۆڵینەوە و هەوڵبدەین بە واتای تەواوی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهان بگەین.

بەڵام لە سەرەتاوە لە یەک شێوازی هەڵوێست دەکۆڵینەوە و لەوێوە گەشتەکەمان دەســـتپێدەکەین. ئێستا توێژینەوەکەمان لـــەو هەڵوێستەوە دەکەوێتە گەڕ؛ ئەو مرۆڤـــەی، کە منم-ئەگەر بەو جۆرە ببینم، کە ئێستا لەنێو جیهاندایە دەگەمە ئەو خاڵەی ئەو مرۆڤە، وەکو توێژەرێک لەبەردەم بووندا ڕاوەســـتاوە. لەگەڵ پرسیار کردنەکەمدا، "هیـــچ هەڵوێستێـــک هەیە پەیوەندی نێوان مـــرۆڤ و جیهان بۆ من دەربخات؟" پرسیارم کردووە. ئەم پرسیارەش بە بابەتی دادەنێم چونکە گرنگ نییە کێ ئەو پرســـیارە دەکات، من یان ئەو خوێنەرەیە ئەم پەرتووکەم دەخوێنێتەوە. هەمانکات پرســـیار سەرجەمی ئەو وشانە نییە، لە ڕاستەیەکدا لەسەر لاپەڕەیەک بووبێت بە شێکی بابەتی و دەرەکی. پرسیارکردن هەڵوێستی مرۆڤانەیە و پڕە لە واتـــا. ئایا ئەم هەڵوێستە چی دەردەخات؟ لە پرســـیارکردندا لەبەر ئەو بوونەدا ڕادەوەســـتین، کە پرســـیاری لەبارەوە دەکەین. هەموو پرسیارکردنێک ئاماژە بۆ بوونی پرســـیارەکە و پرسیارلێوەکراو دەکات. ئەمەش پەیوەندییە بنەڕەتییەکەی نێوان، مـــرۆڤ و بوون-لەنێو-خۆیدا نییە، بەڵکو مرۆڤ لەنێو ســـنورداریێتی ئەم پەیوەندییەدا ڕادەوەســـتێت و بەدوای وەڵامدا دەگەڕێت. لە لایەکی دیکەوە، ئێمە پرسیار لەبارەی شتێکەوە لە بوونە پرسیارلێوەکراوەکەدا دەکەین. پرسیار لەبارەی ئـــەو شتەوە، کە من دەمەوێت، دەبێت بە لایەنێکی بوونە بەرزەکە. من پرســـیار لـــە بوون لەبـــارەی شێوازییەوە یان بوونیەوە دەکەم. لەم ڕووەوە پرســـیارکردن چاوەڕوانییە؛ من چاوەڕوانی وەڵامەکە دەکەم. چاوەڕوانم ئەو بوونە خۆی دەرخات،

شێوەکـــەی خۆیم نیشـــانبدات. وەڵامەکەش'ئا' یان 'نا'یـــە. بوونی ئەم دووانە، جیـــاوازی نێـــوان دوو وەڵامی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ دەهێنێتـــە کایەوە. هەندێک پرســـیار وادەردەکەون وەڵامێکی نێگەتیڤیـــان نەبێت، بۆ نموونە، "ئەم هەڵوێستە چی بۆ ئێمە دەردەخات؟" بەڵام لەگەڵ ئەو پرسیارانەدا، کە وەڵامەکەی بە'هیچ'، "هیچ کەسێک" یان "هەرگیز نا"یە ڕەتدانەوە سەرهەڵدەدات. ئەو کاتەی دەپرسم، "هیـــچ هەڵوێستێک هەیە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهان بۆ من دەربخات؟" من چاوەڕوانـــی وەڵامێکی نێگەتیڤی وەکو "هیـــچ هەڵوێستێک نییە" دەکەم. ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت ئێمە چاوەڕوانی نەبوونی هەڵوێستێک لە ئاســـتی ئەو بوونەی ڕووبەڕووی دەبینەوە دەکەین.

هەندێک باوەڕیان بە بوونی بابەتگەرانەی نە-بوون نییە. لەوانەیە بڵێین، ئەمە خۆگەرانەیە؛ لەو بوونە بەرزەوە تێدەگەم، کە ئەو هەڵوێستە بوونی نییە و شتێکە لەنێو ئەندێشەدایە. بەڵام، لە ڕاستیدا دانانی ئەو هەڵوێستە بە شتێکی ئەندێشاوی داپۆشین و ڕەتدانەوەیە نەک لابردنی. "ئەندێشەی ڕووت" و "شتێکی ئەندێشاوی"، کـــە جیاوازییان نییە. لە ئاکامدا، لەناوبردنی ڕاســـتەقینەی ڕەتدانەوە هەمانکات لەناوبردنی ڕاســـتەقینەی وەڵامدانەوەیە. ئەم وەڵامە، لەڕاستیدا، ئەو شتەیە، کە دەستم دەکەوێت؛ ڕەتدانەوە بۆ من دەردەخات. کەوابوو، ئەگەری وەڵامی نێگەتیڤ بۆ پرسیارکەر هەیە. بەڵام پرسیارکەر نازانێت وەڵامەکە نێگەتیڤە یان پۆزەتیڤ. پرســـیارکردن لەم ڕووەوە پردێکە لەنێوان دوو نە-بووندا: نەبوونی زانین لەبارەی ئەو بوونەوە لای پرســـیارکەرەکە و نەبوونی ئەو شتـــەی لەنێو بوونە بەرزەکەدا پرسیاری لەبارەوە کراوە. لە کۆتاییشدا، پرسیارکردن لەبارەی ڕاستی بوونەوەیە. لە پرسیارکردندا، پرســـیارکەرەکە چاوەڕێی وەڵامێکی پۆزەتیڤی، وەکو "ئەمەیە و ئەوە نییە" دەکات. ڕاســـتی، کە لەبوونەوە جیاوازە جۆری سێیەمی نەبوون بە پرسیارەکەوە دەبەستێتەوە. ئەویش نەبوونی سنورداریێتییەتی. ئەم سێ جۆرەی نەبوون مەرجن بۆ هەموو پرســـیارێک بەتایبەتی پرسیاری مێتافیزیکیانەی، وەکو پرسیارەکەی ئێمە. لە توێژینەوەکەماندا، پرسیارکردنەکانمان بەرەو ناخی بوونی بردووین. بەڵام لە پرسیار کردنەکەدا ڕووبەڕووی نەبوون بووینەوە. نەبوون بەردەوام لە دەرەوەماندا و لەنێو ئێمەدا حوکم بەسەر پرسیارکردنەکەمان لەبارەی بوونەوە دەدات و وەڵامەکە سنوردار دەکات. چ بوونێک لەسەر بناخەی نەبوون دێتەکایەوە؟ هەرجـــۆرە بوونێک بێـــت ئەوە دەردەخات، کە "بوون ئـــەو شتەیە و لەدەرەوەی ئەودا هیچ نییە". کەوابوو، نەبوون، وەکو پێکهاتەیەکی نوێی ڕاســـتەقینە بۆ ئێمە سەریهەڵداوە. لێرەدا گرفتەکەمان ئاڵۆزتردەبێت چونکە بەتەنیا لەسەر پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بوون- لەنێو- خۆی ناکۆڵینەوە. پێویستە باســـی پەیوەندی نێوان بوون و نەبوون، نەبوونی مرۆڤ و بوونی بەرزیش بکەین.

## ٢ . ڕەتدانەوە

دەشێــت هەندێک ڕەخنەمــان لێبگرن و بڵێــن بوون-لەنێو-خۆیــدا وەڵامی نێگەتیڤــی هەڵنەگرتووە . ئایــا ئێمە نەمانگوت، کــە بوون-لەنیو-خۆیدا لە ژوور هەموو وەڵامیکی نێگەتیــڤ و پۆزەتیڤەوەیە؟ هەروەها ئەزموونێکی ڕووتکراوە و تەنیا نەبــوون بۆ ئێمە دەرناخات . من لەو باوەڕەدام هەزارو پێنج ســەد فرانکم لەنێو جانتاکەدا داناوە . بەڵام، کە جانتاکەم دەکەمەوە هەزارو ســێ سەد فرانک دەدۆزمــەوە . ئەمە ئەوە ناگەیەنێت من هەزارو پێنج ســەد فرانکم نەدۆزیبێتەوە یــان لــە ئەزموونەکەمدا شتێک بێت، کە نییە . بەڵکو من هەزار و ســێ ســەد فرانکــم ژماردووە . واگوتراوە ڕەتدانەوە بە تەنیا نییــە و بیریلێناکرێتەوە؛ لەنێو دەســتەواژەدا سەرهەڵدەدات .[١٨] لە ڕێگەی دەســتەواژەوە من ئاکامە چاوەڕوان کراوەکە لەگــەڵ ئاکامە پەیدابووەکەدا بەراورد دەکــەم . لەم ڕووەوە ڕەتدانەوە دەبێت بە خەســڵەتی دەستەواژە . پرسیارکەرەکەش چاوەڕوانی ئەو دەستەواژەیە دەکــات، کە وەڵامەکەی تێدایە . بەم جۆرە نەبوون لە دەســتەواژەی نێگەتیڤەوە سەرهەڵدەدات؛ چەمکێکە لەنێو دەستەواژەی، وەکو (ئەوشتە نییە) وە پەیدادەبێت .

ئێمــە دەزانین، ئەم بیردۆزەیە بە کوێمان دەگەیەنێت؛ بەوەمان دەگەیەنێت بڵێین بــوون- لەنێو-خۆیــدا پۆزەتیڤــە و ڕەتدانەوە بە خۆوە ناگرێت . دەســتە واژەی نێگەتیڤیــش، لە لایەکــی دیکەوە، لەبەر ئەوەی هەڵوێستێکــی ناوەکی (خۆ)یە، لە دەســتەواژەیەکی پۆزەتیڤی دەچێت . هەندێک کــەس نابینێت کانت بونیادی ناوەکی دەســتەواژەی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لە یەکدی جیاکردۆتەوە . لە هەر دوو دەســتەواژەکاندا چەند چەمکێکمان تێهەڵکێش کردوە . ئەم تێهەڵکێشکردنە، کە کۆنکرێتییە، ڕووداوێکە پەیوەندی بە (خۆ)وە هەیە .

لە ڕێگەی (هەیە)و (نییە)وە خۆی دەرخستوە .[١٩] بەهەمانشــێوە، جیاکردنەوە و دامەزراندنی شتەکانیش بە دەســتی خۆمان دوو جــۆر هەڵسوکەوتن و هەمان ڕاســتەقینەیان لەگەڵ خۆیانــدا هەڵگرتــوە . کەوابــوو، ڕەتدانەوە "لە کۆتایی" حوکمدانەکــەدا دەبێت بەوەی" لەنێو" بووندا نەبێت . وەکو ئەو شتە ناڕاســتەیە لەبەردەم دوو ڕاستەقینەدا، هیچ کامیان خۆی ناکات بە خاوەنی؛ ئەگەر پرسیار لە بوون- لەنێو-خۆیدا سەبارەت ڕەتدانەوە بکرێت، ئەوا بە دەستەواژەمان دەناسێنێت

---

١٨ سارتەر ئاماژە بۆ کانت دەکات . بە بۆچوونی ئەم فەیلەسوفە، ڕەتدانەوە پەیوەندی بە دەستەواژەی نێگەتیڤەوە، وەکو (سوکرات فەرەنسی نییە .)وە هەیە . (وەرگێڕ)

١٩ ئەم دوو چەمکە (هەیە is) و ( نییە is not) بارو بارهەڵگری و دەستەواژەکان پێکەوە دەبەستێتەوە و پەیوەندییەکانیان پۆزەتیڤانە و نێگەتیڤانە نیشاندەدات ،لەزمانی ئینگلیزیدا بە copula ناوزەد دەکرێت . (وەرگێڕ)

چونکــه بــوون ئەوەیە هەیــە. ڕەتدانەوە لــە ئاکامــی هەڵسوکەوتەکانی (خۆ) وە ســەریهەڵداوە. خۆ بە تەنیا شتێک نییە هەبێــت و بوونەکەی پەیوەندیدارە. ئەوەی هەیە بەتەواوی ئەو شتەیە، کە ئاگامەندی هەســتی پێدەکات. ڕەتدانەوە، وەکو چەمکێکی یەکانەکی نێو دەســتەواژە نێگەتیڤەکان ڕاســتەقینە نییە. ئێمە باسی (لیکتۆن)ی ڕواقییەکان ناکەین. ئایا ئێمە ئەم چەمکە پەسەند دەکەین؟[٢٠] ئەو پرسیارانەی لێرەدا یەخەمان دەگرن ئەمانەن:

ئایا ڕەتدانەوە، وەکو بونیادی دەســتەواژەی نێگەتیڤ زاگەی نەبوونە؟ یان بە پێچەوانەی ئەمەوە نەبوون، وەکو بوونیادی ڕاستەقینە دەبێت بە زاگەی ڕەتدانەوە؟ بەمجــۆرە دەبینین گرفتی بوون ئێمەی مرۆڤی گەیاندە هەڵوێستی پرســیارکردن و گرفتی پرســیارکردنیش بەبوونی ڕەتدانەوەمان دەگەیەنێت. ئاشکرایە، نەبوون لــە چاوەڕوانییەکانی مرۆڤەوە ســەرهەڵدەدات. من چاوەڕێی هەزارو پێنج ســەد فرانکم دەکرد، هەزارو ســێ ســەد فرانکم دۆزییەوە. زانایەکی فیزیکی چاوەڕوانە گریمانەکەی لە ڕێگەی دیاردە ســروشتییەکانەوە بسەلمێنێت، بەڵام سروشت بە پێچەوانــەوە دەجولێتەوە. نکۆڵیکردن لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهان، وەکو زاگەی ڕەتدانەوە کارێکی نالەبارو نەزۆکە. جیهان نەبوون بۆ ئەو بوونە دەرناخات، کە چاوەڕوانی ناکات. بەڵام ئەمەش بەو باوەڕەمان دەگەیەنێت ڕەتدانەوە ناوەکی و خۆیی بێت؟ یان وەکو (لیکتۆن)ی ڕەواقییەکان و (نۆیمە)ی هوسرڵە؟ نا، ئێمە بەمشێوەیە بیریلێناکەینەوە.

**یەکــەم**، ڕەتدانــەوە بە تەنیا خەســڵەتی دەســتەواژە نییە. پرســیارکردن لەنێو دەســتەواژەیەکی لێکۆڵینەوەرانــەوە پێکدێت، بەڵام خودی پرســیارەکە دەســتەواژەنییە. هەڵوێستێکە پێش حوکمدان ســەریهەڵداوە. مــن دەتوانم بە تەماشاکــردن یان بە چاو پرســیاربکەم. لــە شێوازەکان لەبــەردەم بوونێکد ڕادەوەســتم. دەستەواژە هەموو شێوەکانی پەیوەندی و تەنیا ئەو شێوەیەیە، کە بە دەربڕین پەیوەندییەکە دەردەخات. هەروەها پێویستیش ناکات پرسیارکەرەکە، پرســیار لە کەســێکی دیکە لەبارەی بوونەوە بکات. ئەگەر پرسیارکردن لەنێوان دوو کەسدا بێت، ئەوا لەنێوان (خۆ)کاندا دەمێنێتەوە. لەو بوونەشەوە دادەبڕێت، کە پرســیار لەبارەیەوە دەکرێت و دەبێت بە دایەلۆگ. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە، پرســیاری نێو دایەلۆگ جۆرێکە لە پرســیاکردن بەگشــتی. مەرجیش نییە ئەو بوونەی پرسیاری لەبارەوە دەکەین بوونێکی بیرکەرەوە بێت. ئەگەر ئۆتۆمبیلەکەم لــە کار بکەوێت، لەوانەیە کاربرێتەکەی یان پلاکەکانی خراپ بووبن، پرســیاریان لەبارەوە دەکەم. ئەگەر کات ژمێرەکەم بوەســتێت پرســیار لەو کەســە دەکەم کــە، کاتژمێر چاک دەکاتــەوە و داوا دەکەم هۆکاری وەســتانەکەیم پێ بڵێت.

٢٠ لیکتۆنی فێرگەی ڕواقییەکان ئەو چەمکە ڕووتکراوانەن، وەکو کات و شوێن، کە بە ناو هەن.

بەڵام ئەو کەســـەی کات ژمێرەکە چاک دەکات تەماشـــای هەموو لایەنەکانی ئەو ســـیستەمە دەکات، کە کات ژمێری لێدروســـتکراوە. ئەوەی من لە کاربڕێتەرەکە چاوەڕوانم یان وەســـتای کات ژمێرەکە دەیەوێت بیدۆزێتەوە، لەســـەر دەستەواژە ڕاناوەســـتێت. بەڵکو خۆدەرخستنی بوونە و لەســـەر ئەو خۆدەرخستنەشە، ئێمە دەستەواژە دروستدەکەین. ئەگەر خۆدەرخستنی بوون چاوەڕوان بکەم پێویستە بە هەمان شێوەش، خۆم بۆ خۆدەرخستنـــی ئەو بوونە ئامادەبکەم. ئەگەر بیر لەوە بکەمەوە کاربڕێتەرەی ئۆتۆمبیلەکەم خـــراپ بووە، دەشێت وانەبێت و خراپییەکە لـــە کاربڕێتەرەکەدا نەبێت. کەوابوو، پرســـیارەکەم لەنێـــو خۆیدا و پێش ئەوەی وەڵامەکەی لە دەستەواژەیەکدا دروستبکرێت، نەبوونی هەڵگرتوە. پەیوەندی نێوان بـــوون و نەبوونی تێدایە. بێجگـــە لەمە، ئەگەر ناوەڕۆکی پرســـیار تەم و مژاوی بێت، لەبەر ئەوەی پرســـیارکردن لەنێوان مرۆڤەکاندا ڕوودەدات، دەبێت ئاماژە بۆ ئەو خاڵەش بکرێت، کە گەلێک ڕێگەی دیکە پێش دروســـتکردنی دەستەواژە هەن نەبوونی تیایاندا دەردەکەوێت. بۆ نموونە، ڕوخاندن، ئەو چالاکییەیە بە دڵنیاییەوە دەســـتەواژە بۆ خۆ دەرخستنەکەی بەکاردێت، بەڵام هێشتا لە هەموو ڕوویەکەوە پشت بە دەستەواژە نابەستێت. بونیادی "ڕووخاندن" و "پرسیارکردن" وەکو یەکن چونکە مرۆڤیش تەنیا بوونێکە لە ڕێگەیەوە ڕوخاندن ســـەرهەڵدەدات. زریانێک بۆ سروشت ڕوخێنەر نییە و تەنیا گۆڕان لە دابەشبوونی تەنەکاندا دروستدەکات. هیچ شتێک لەو تەنانە، دوای زریانەکە کەم ناکاتەوە. تەنیا ئەوەندەیە، کە لە شێوەیەکی دیکەدا، خۆی دەردەخات. تەنانەت ئەگەر کەســـێک نەبێت گۆڕانکارییەکە ببینێت، ئەم ڕاســـتیەش دەرناکەوێت. ئامادەنەبوونی ئەو گەواهە گۆڕانەکە ناســـەلمێنێت. ئەگـــەر زریانەکە ببێتە هۆکاری مردنی چەنـــد زیندەوەرێک، مردنەکە لەبەرئەوەی لە ئەزموونی زیندەوەرە کوژراوەکاندایە، بە ڕوخاندن دادەنرێت. ڕوخاندن لەســـەر پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بوون ڕادەوەســـتێت و پێویستە مرۆڤ بوونە ڕوخاوەکە بناســـێت. ئەمەش جۆرێکە لە سنوردارکردنی بوون. ئەو بوونەی باسیدەکەین هیچ شتێـــک لە دەرەوەیدا نییـــە. کاتێک تفەنگ بە دەســـتێک ڕووی تفەنگەکەی لە نیشانێک دەکات و تەماشای هیچ لایەکی دیکە ناکات هێشتا هیچ ڕوونادات ئەگەر نیشانەکە وەکو بوونێکی شکاو خۆی دەرنەخات. بوونێکیش دەشکێت ئەگەر نەبوونی خۆی هەڵگرتبێت. دیسانەوە دەڵێم خەسڵەتی لە شکان هاتووی بوونێک تەنها بۆ مرۆڤە. ئەو ســـنورداریتییەی لە پێشتر باســـمانکرد، خەسڵەتی لەشکان هاتووی بوونەکەیە. هەبوویەک نەک هەموو بوون دەشکێت. بوون لە ژوور هەموو ئەگەرێکی تێکشـــکاندنەوەیە. کەوابوو، پەیوەندی نێوان تاکیکی هەبووی ســـنوردار، کە لە بەردەمی مرۆڤدا قوت بۆتـــەوە، بۆ مرۆڤ هەبوویەکە دەشکێت و ئەگەری نەبوون تیایدا ســـەرهەڵدەدات. بۆ ئەوەی ڕووخانی هەبوویەک بێتەکایەوە پێویستە مرۆڤ

هەبێت. بوونی مرۆڤ ئەگەری نەبوون پەیدادەکات؛ هەمانکات پێویستە هەوڵبدات بە پێوەرێکی دیاریکراو ڕووخانەکە بناسێت یان بە ڕەتدانەوەی نەبوون هەبووەکە ڕابگرێت. مرۆڤ شارەکان بە ڕوخاو دادەنێت چونکە ئەو بەشێکی لە شکان هاتوو دادەنێت و هەوڵی پاراستنیان دەدات. لەبەر بوونی ئەوە بوومەلەرزە یان ئاگرپژان شارەکان وێران دەکات. واتا و مەبەستی جەنگ لە بچوکترین خانوودا دەردەکەوێت. لەبەرئەمە پێویستە بزانرێت، کە ڕووخان بە بوونی مرۆڤەوە گرێدراوە. مرۆڤە لە ڕێگەی بوومەلەرزەوە یان زریان بە وێران دادەنێت. خودی مرۆڤ کەشتیەکانی نێو دەریا تێکدەشکێنن. هەمانکات پێویستە بزانین ڕووخان لە پێش حوکمداندا پێویستی بە ئاماژەکردن بۆ نەبوون و هەڵوێستیش لە ئاستی ئەو نەبوونەدا هەیە. لەسەرو ئەمەشەوە، هەرچەندە ڕووخا لەگەڵ بوونی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات، شتێکی دەرەکییە و ناتوانین بە بیرۆکەی دابنێین. شکاندن بەسەر بوونی ئەو گوڵدانەدا مۆرکراوە، شکاندنەکەشی ڕووداوێکە گەڕانەوەی مەحاڵە. بۆ نەبوونیش بە هەمان شێوەی بوون، پێشگرێکی فینۆمینانە هەیە. توێژینەوەش لەسەر 'ڕووخان' بەهەمان ئاکامی توێژینەوەکەمان لەسەر 'پرسیاکردن'مان دەگەیەنێت. ئەگەر نیازی گەیشتنمان بە دڵنیایی هەبێت، پێویستە جەخت لەسەر نموونەی دەستەواژەی نێگەتیڤ بکەین. ئەو پرسیارەش لە خۆمان بکەین ئایا دەستەواژەی نێگەتیڤ نەبوون لەنێو بووندا پەیدادەکات یان تەنیا ئەوەی دەریدەبڕێت سنوردار دەکات. من لەگەڵ (پیرۆ) کاتژمێری چوار ژوانم هەیە. من چارەکێک دواتر دەگەمە قاوەخانەکە. پیرۆ هەمیشە لە کاتی خۆیدا دەگاتە جێ ژوان. ئایا ئەو چاوەڕوانی منی کردوە؟ تەماشایەکی نێو قاوەخانەکە دەکەم و دەڵێم، "ئەو لەوێ نییە." ئایا ئامادەنەبوونی پیرۆ لە ئەزموونی حەدەسی منداییە یان ڕەتدانەوە تەنیا لە دەستەواژەدا دەردەکەوێت؟ لە یەکەم سەرنجدا باسی حەدەس ناکرێت. ئەگەر بمەوێت بەتەواوی ڕاستبم، حەدەسی نەبوونم نییە. بەڵام ناتوانین بڵێین، بۆ نموونە، "من کتوپڕ بینیم، کە ئەو لەوێ نەبوو." ئایا ئەمە جێگە گۆڕینی ڕەتدانەوەکەیە؟ باشتر وایە ئەم کێشەیە لە نزیکەوە تەماشابکەین. ئاشکرایە، قاوەخانەکە بە هەموو کورسی، مێز، ئاوێنە، ڕووناکی، دوکەڵی جگەرە، دەنگەدەنگ، تەقەی پیاڵە و دەنگی پێ بوونێکی پڕی هەیە. هەموو حەدەسەکانم پڕن لە بۆن، دەنگ و ڕەنگی بابەتانەی بوونێکی پێشگریان هەبوو. بە هەمان شێوە ئامادەبوونی (پیرۆ) ش لەو شوێنەی من نازانم بوونێکی پڕی هەیە. لەوە دەچێت هەموو شوێنێک پڕ بێت. بەڵام با ئەوەش بزانین لە هەستکردندا هەمیشە جۆرە دامەزراندنێکی شێوە هەیە. هەموو ئەو شتانەی دامەزراون پەیوەندییان بە من و تێڕوانینی منەوە هەیە. کاتێک خۆم دەکەم بە قاوەخانەکەدا، چاو بۆ پیرۆ دەگێڕم، هەموو بابەتەکانی نێو قاوەخانەکە تێهەڵکێش دەکەم، لەسەر ئەو زەمینە ڕایان دەگرم، کە پیرۆ خۆی

تێدا دەردەخات. ئەم دامەزراندنـــەی قاوەخانەکە، وەکو زەمینەیەک لەناوبردنێکی بنەڕەتییـــە. هەر یەکێک لە هەبووەکانی نێو قاوەخانەکە، خەڵکەکە، کورســـی و مێزەکان خۆیان دوور دەخەنەوە و بەبێ جیاوازی دەکەونە پشـــتەوە؛ لەســـەر ئەو زەمینە دەتوێنەوە و وندەبن. ئەم ون بوون و توانەوەیە مەرجێکی ســـەرەکییە بۆ ســـەرهەڵدانی ئەوەی من بە دوایدا دەگەڕێـــم، کە لەم نموونەیەدا پیرۆی هاوڕێمە. ئەم لەناوبردن و بەنەبوون کردنە لە حەدەســـی منـــدا ڕوودەدات. من لەناوچوونی هەموو ئەو بابەتانە، یەکەیەکە لە پێناوی دۆزینەوەی هاوڕێکەمدا دەبینم، (تۆ بڵێی ئـــەوە پیرۆ بێت؟) بە خێرایی، لەبەر ئەوەی پیـــرۆ نین، هەر یەکێک لەو دیاردانە [لـــە ئەزموونەکەمدا] هەڵدەوەشێنمەوە. لەگـــەڵ ئەمەدا، ئەو کاتەی پیرۆ دەبینم، جاریکی دیکە حەدەســـەکەم پڕ دەبێتەوە و خۆی لە ئاســـتیدا ڕادەگرێت، هەموو بابەتەکانی نێو قاوەخانەکە خۆیان لە دەوروبەری بوونی ئەودا دادەمەزرێننەوە.

بـــەڵام پیرۆ لێـــرە نییـــە. ئامادەنەبوونی ئەو بـــە بەشێکی ئـــەو شوێنەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵکو ئەو لە هەموو بەشەکانی قاوەخانەکەدا نییە. قاوەخانەکە دەبێت بە بەســـتێنێک و خـــۆی ونناکات، بەڵام دەچێتە پشـــتی ڕووداوەکەوە و لەســـەر شاردنەوە و نەمانی خۆی بەردەوام دەبێت. ئەو بۆ شێوەیەکی دیاریکراو [کـــە بـــە دواییدا دەگەڕێن]، دەبێت بە بەســـتێنێکی خۆ دەرخستـــو. لەنێو ئەم بەستێنە لەناوچوەی قاوەخانەکەوە پیرۆ، وەکو نەبوون سەرهەڵدەدات. ئەوەی لە حەدەسەکەی مندا خۆی زەق کردۆتەوە تروسکەی نەبوونە؛ نەبوونی بەستێنەکەو ئـــەوەی من بە دواییدا دەگەڕێـــم. ئەمەش دەبێت بە بناخە بۆ دروســـتکردنی دەســـتەواژەی "پیرۆ لێرە نییە". لەڕاســـتیدا ئەمە ئاگابوونە لە دوو جۆر نەمان. بێگومان ئامادەنەبوونی پیرۆ پەیوەندییەکەی نێوان من و قاوەخانەکە دەردەخات. من چاوەڕوان بووم پیرۆ ببینم. بەڵام چاوەڕوانییەکەم ئامادەنەبوونی پیرۆی، وەکو ڕووداوێکـــی زەق لە قاوەخانەکەدا هێنایە کایەوە. دۆزینەوەی ئامادەنەبوونی پیرۆ لە قاوەخانەکەدا فاکتۆرێکی دەرەکییە. هەروەها تێهەڵکێشەیەکی پەیوەندی نێوان پیرۆ و ئەو شتە دامەزراوانەیە، من لە گەڕانەکەمدا بە دوای هاوڕێکەمدا تەماشایان دەکەم. ئامـــادە نەبوونی پیرۆ دەبێتە هۆکاری لەناوچوونـــی قاوەخانەکە، وەکو بەســـتێن بۆ هەموو ئەو شتانەی تیایدایە. بەپێچەوانەوە، ئەو دەســـتەواژانەی لە ئاکامدا دروستیان دەکەم، وەکو (وێڵنگتن لەم قاوەخانەیە نییە، پۆل ڤالیری لێرە نەماوە، هتد.) واتایەکی ڕووتکراوەیان هەیە. لەسەر یاسای ڕەتدانەوە ڕاوەستاون و پەیوەندییەکـــی ڕاســـتەقینەش لەنێـــوان قاوەخانەکە و وێڵنگتـــن و ڤالیرییدا دروســـتناکەن. لێرەدا پەیوەندییەکە، کە لە (نییە)دا دەربڕاوە لەنێو بیردایە. ئەم نموونەیە بۆمان دەردەخات ڕەتدانەوە لە دەستەواژەی نێگەتیڤەوە سەرهەڵنادات؛ بە پێچەوانەوە، دەستەواژەی نێگەتیڤ لەسەر ڕەتدانەوە ڕادەوەستێت.

چۆن ئەمە بـــە پێچەوانەوە دەبێت؟ چۆن بیر لە دەســـتەواژەیەکی نێگەتیڤ بکەینـــەوە لـــە کاتێکدا بـــوون پڕ و پۆزەتیڤ بێـــت؟ ئێمە لـــەو باوەڕەدابووین ڕەتدانەوە لە بەراوردکردنی نێوان ئاکامە چاوەڕوانکراوەکان و دەســـتکەوتوەکاندا پەیدادەبێت. بەڵام پێویستە ســـەرنجێکی بەراوردکردنەکە بدەین. ئەمە نموونەی حوکمدانێکـــی پۆزەتیڤ و چالاکییەکی دەروونییە و فاکتۆرێکی دامەزرێنراوە، کە دەڵێم: ”هەزارو ســـێ ســـەد فرانک لە جانتاکەمدا هەیە.“ بەڵام دەستەواژەیەکی دیکەش هەیە، کە لە ئەمەوە جیاوازە و هاوکات فاکتۆرێکی دامەزرێنراویشە: ”من چاوەڕێیی دۆزینەوەی هەزارو پێنج ســـەد فرانک بووم.“ ئێمە فاکتۆری ڕاستەقینە و دەروونی و دەســـتەواژەی پۆزەتیڤمان لە بەردەســـتدایە. لـــە کوێدا ڕەتدانەوە دابنێین؟ ئایا ڕەتدانەوە سەپاندنی کاتیگۆرییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین، هۆش، لەنێو خۆیدا (نییـــە)ی بۆ ڕیزکردن و جیاکردنەوەی شتەکـــان، وەکو فۆرم هەڵگرتوە؟ لێرەدا ئێمـــە کەمترین گومانی ڕەتدانەوە لە خـــودی ڕەتدانەوە دادەبڕین. ئەگەر ئێمـــە لەو باوەڕەدابین (نییە) کاتیگۆرییەکە لەنێـــو هۆشدا لەگەڵ بوونی ئێمەدا دێتەکایـــەوە، و بەســـەرشتەکاندا دەیسەپێنین. هەمـــوو چالاکیەکانی ڕەتدانەوە لـــە ڕەتدانەوە ڕووتدەکەینەوە. ڕەتدانەوە نکۆڵی کردنـــە لەبوون. لە ڕەتدانەوەدا ڕووبەڕووی بـــوون دەبینـــەوە و فڕێیدەدەینە نێو نەبوونەوە. ئەگـــەر ڕەتدانەوە کاتیگۆری بێت، ئەو فۆرمە بێت بەســـەر هەموو دەســـتەواژەیەکدا بەبێ جیاوازی ساخ بێتەوە، چۆن دەتوانین بڵێین بوون لەناودەبات و فڕێیدەداتە نێو نەبوونەوە؟ ئەگەر دەســـتەواژەیەکی لەپێشـــتری فاکتۆرێک دەربخات، وەکـــو ئەو نموونانەی ئاماژەمـــان بۆکردن، ڕەتدانەوە دەبێت دۆزینەوەیەکی سەربەســـتانە بێت و لەنێو ئـــەم چواردیوارەی شتە پۆزەتیڤەکاندا ڕزگارمان بکـــات. ڕەتدانەوە بڕانەوەیەکی کتوپڕە لە بەردەوامبوونی بووندا، کە هەرگیز لە دەســـتەواژەیەکی لەپێشـــترەوە ســـەرهەڵنادات و ڕووداوێکـــی بنەڕەتییـــە. ئێمە لەگەڵ ڕەتدانـــەوەدا لە جیهانی ئاگامەندیداین. بـــەڵام ئاگامەندی ناتوانێت بەبێ ئەوەی ئاگامەندییەکی ڕەتدانەوە بێت ڕەتدانەوە دروســـتبکات. لەنێو ئاگامەندییدا هیـــچ کاتیگۆرییەک دانەنراوە. (نییـــە)، وەکو دۆزینەوەیەکی کتوپڕ لە حەدەســـدا ئەزموونێکی ئاگامەندانەیە و لەگەڵ (نییە)دایـــە. بە جۆرێکی دیکە، ئەگەر بوون هەمـــوو شوێنێک پڕکاتەوە؛ برگسۆن گوتەنی، نەبوون بیریلێناکرێتەوە. بوونیش نابێت بە سەرچاوەی ڕەتدانەوە. بـــەردەوام بوون لە ئامادەبوونی نەبووندا لە دەرەوە و ناوەوەی ئێمەدا، دەبێت بە مەرج بۆ دەربڕینی وشەی (نییـــە). بە واتایەکی دیکە، نەبوون دێوەزمەی بوونە. بەڵام نەبوون لە کوێوە پەیدادەبێت؟ ئەگەر نەبوون مەرجێکی سەرەکی پرسیارکردن یان بە گشتی توێژینەوەی فەلسەفی و زانستی بێت، ئایا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و نەبوون چییە؟ ئەو هەڵوێستە چییە دەبێتە سەرچاوەی لەناوبردن؟

### ٣. چەمکی دیالێکتیکانەی نەبوون

هێشـــتا کاتی ئەوە نەهاتوە واتای نەبوون دەستنیشـــان بکەین و وەڵامی ئەو پرســـیارە بدەینەوە، کە خۆی لەبەر دەمماندا قوتکردۆتـــەوە. بەڵام لە ئێستاوە دەتوانیـــن چەند ئاکامێک بخەینـــە ڕوو. بەتایبەتی گرنگـــە پەیوەندی بوون بەو نەبوونەوەی ڕاویدەکات دیاریبکەین. ئێمە ئاماژەمان بۆ چەند هەڵوێستێک کرد، کە لەسەر دوو هێڵی تەریبی دادەنرێن و مرۆڤ بەرانبەر بوون و نەبوون بەرجەستەیان دەکـــات. ئەمەش ئێمەی هاندا بـــوون و نەبوون، وەکـــو دوو لایەنی تەواوکەری یەکدی و ڕاســـتەقینە بە جـــۆری ڕووناکی و تاریکی دابنێیـــن. بە کورتییەکەی، ئێمە مامەڵە لەگەڵ دوو چەمکی ســـەردەمدا دەکەین، کە لەنێو بەروبوومی بووندا یەکدەگرن و ناتوانین، لە یەکدیان جیابکەینەوە. بوونی ڕووت و نەبوونی ڕووت دوو چەمکی ڕووتکراوەن و تەنیا بەهۆکاری ڕاستەقینەیەکی کۆنکرێتییەوە یەکدەگرن. بـــە دڵنیاییەوە، ئەمە بۆچوونی هیگڵ بوو. ئەو لەنێـــو پەرتووکی (لۆجیک)دا لە پەیوەنـــدی نێوان بوون و نەبوون دەکۆڵێتەوە. هەروەها لۆجیک بە "ســـیستەمی بیرۆکـــە ڕووتەکـــان" ناوزەد دەکات. بەمجۆرەش پێناســـەی دەکـــات و دەڵێت، "بیرۆکەکان بەو جۆرەی نیشاندەدرێن، ڕووت نین. ئەو بوونەی بیریان لێدەکاتەوە ناوەڕۆکێکی ئەزموونگەرانەیان دەداتێ. لە لۆجیکدا بیرۆکەکان بەو جۆرە دەناسرێن، کە ناوەڕۆکیان نەبێت و ڕووت بن." ئەم خەســـڵەتانە "لە قولایی هەبووە کاندان" ئەو کاتەی یەکێک بیریانلێدەکاتەوە لەنێو بیرەوە دەریاندەهێنێت و ڕاستییەکەیان لەوێدا دەدۆزێتـــەوە. بەهەرحاڵ هەوڵدانی لۆجیکی هیگڵ لەوەدایە"نا لەباری هەر یەکێک لەو چەمکانە دەرخات و لەوێوە لە واتاکانیان تێبگات و خۆی بە قۆناغێکی باشتری تێگەیشتن بگەیەنێت".

دەتوانین بەو جۆرەی لاســـین باســـی فەلسەفەی هاملین دەکات، کەسێکیش بڕوانێتـــە هیـــگڵ و بڵێت، "هەر یەکێک لـــە چەمکە نزمەکان پشـــت بە چەمکە بەرزەکان دەبەستێت، ڕووتکراوەش لەسەر کۆنکرێت ڕادەوەستێت، کە ئەمەش بۆ تێگەیشتن لە واتاکەی پێویستە." هەبوویەکی کۆنکرێتی ڕاستەقینە بۆ هیگڵ ئەو شتەیە ناوەڕۆکی هەبێت؛ سەرجەمی هەموو لایەنە تێهەڵکێشراوەکانە. لەم ڕووەوە بـــوون ڕووتکراوەترین و هەژارترینە. لەڕاســـتیدا "بوون، وەکو چۆن ڕاســـتەوخۆ بەرانبەر ناڕاستەوخۆ دادەنرێت، پەیوەندی بە ناوەڕۆکەوە هەیە. شتەکان بەگشتی هەن، بەڵام بوونیان بە بەرجەســـتەبوونی ناوەڕۆکیانەوە گرێدراوە. بوون دەچێتە نێو ناوەڕۆکەوە. دەتوانین ئەمەش بەمجۆرە دەربڕین و بوون پشـــت بە ناوەڕۆک دەبەســـتێت؛هەرچەندە ناوەڕۆک بەبنەڕەت دادەنرێت. بوون بۆ زەمینەکەی خۆی

گەڕاوەتەوە و ناوەڕۆکیش تێپەڕ یدەکات." [٢١] لەگەڵ دابڕانی بوون لە ناوەڕۆکەوە یان لە زەمینەکەیەوە، بوون دەبێت بە چەمکێکی پوچەڵی ڕاستەوخۆ. بەمجۆرەش پەرتووکــی (فینۆمینۆلۆجی هۆش) باســی بوونی ڕووت دەکــات "لە گۆنیگای ڕاستییەوە" چەمکێکی ڕاستەوخۆی وەرگیراوە. [٢٢]

ئەگەر لۆجیک بە[چەمکێکی] ڕاستەوخۆ دەستپێبکات پێویستە سەرەتای بوون بدۆزێتــەوە، کە"ڕووتکراوە و لە خەســڵەت بەدەرە و پێش هەموو خەســڵەتێک دەکەوێت. لەخەسڵەت بەدەرێک، کە دەبێت بە خاڵێکی ڕەهای دەسپێکردنەکە." بەڵام بوون، [چەمکێکی] ڕووتکراوەی لەخەسڵەت بەدەر و"دەچێتە نێو" دژەکەیەوە. هیگڵ لەپەرتووکی لۆجیکدا دەنوسێت، "ئەم بوونە ڕووتهەڕەتدانەوەیەکی ڕەهایە، لەوســاتەدا، کە ڕاستەوخۆ دەناسرێت نەبوونە." ئایا نەبوون شتێک نییە لەخۆی بچێت، بەتاڵییەکی تەواو، بی خەســڵەت و لــە ناوەڕۆک بەدەری نییە؟ کەوابوو، بــوون و نەبوونــی ڕووتکراوە یــەک چەمکن یان لەوانەیە ڕاســت بێت ئەگەر بە جیاوازیان دابنێین. بەڵام جیاوازییەکەیان ناوزەد ناکرێن و بۆچوونێکن خەسڵەتێکی دیاریکراویان نییە. [٢٣]

واتــە "هیــچ شتێک لە ئاســمان و زەوییــدا نییــە بــوون و نەبوونی تێدا نەبێت." [٢٤] هێشــتا زووە باســی چەمکەکەی هیگڵ بکەین؛ پێویستە لە ئاکامی توێژینەوەکەمانەوە بڕوانینە ئەم کێشــەیە. لێرەدا تەنیا ئەوەندە باسکەین، چۆن هیــگڵ بوونی بۆ هەبووەکــان گەڕاندۆتەوە. بوون لەنێــو ناوەڕۆکدا پێچڕاوەتەوە و نــاوەڕۆک بــووە بە بنەڕەت و زەمینــە بۆی. بیردۆزەکەی هیگڵ لەســەر ئەو خاڵە ڕاوەســتاوە، کە لە فەلسەفەدا پێویستە بیرۆکەیەکی ڕاســتەوخۆ وەرگیراو لە ڕێگەی بیرۆکەیەکی ناڕاســتەوخۆی ڕووتکراوەوە، لــە کۆنکرێتییەوە وەرگرین و ببێــت بە بناخەی. ئێمە باســمانکرد پەیوەندی نێوان بــوون و دیاردە، وەکو پەیوەندی نێوان ڕووتکراوە و کۆنکرێتی نییە. بوون "یەکێک لەبونیادەکان" نییە، بەڵکــو بناخە و مەرجە بۆ هەمــوو بونیادەکان. ئەو زەمینەیــە، کە دیاردەکان خۆیانی لەسەر بەرجەســتەدەکەن. هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕانین، کە بوونی

---

٢١
*Treatise on Logic*, written by Hegel for his course at the gymnasium at Nuremberg.

٢٢ فینۆمینۆلۆجی هۆش پەرتووکێکی هیگڵە پێش پەرتووکی لۆجیک لەساڵی 1805 دا نوسیویەتی. من لە پەرتووکەکەمدا بە ناوی(فەلسەفەی هیگڵ) باسی ناوەڕۆکی (فینۆمینۆلۆجی هۆش)م کردوە و دیالیکتیکی کۆیلە و خاوەنکۆیلە، کە هیگڵ لێرەدا باسیدەکات ڕوونمکردۆتەوە. بڕوانە: محەمەد کەمال، فەلسەفەی هیگڵ، دەستگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠١، لاپەڕە٦٠-٥١

٢٣ Hegel,P.c. E.98

٢٤ *Greater Logic*, chp.$1_2$ ,Hegel

شتەکان "لەســـەر بەرجەستەبوونی ناوەڕۆکیان ڕاوەســـتاوە." ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، بوونی ئەو بوونەش دەبێت بە شتێکی پێویست. لەسەرو ئەمەشەوە، ئەگەر بوونی شتەکان لەسەر بەرجەســـتەبوونی ناوەڕۆکیان ڕاوەستابێت، دژوارە بزانین چۆن هیگڵ گەیشـــتۆتە ئەو خاڵەی بوون ڕووتکراوەیە، لەکاتێکدا ئاســـەوارێکی ئەو بناخەیەمان بۆنادۆزرێتەوە. دروســـتە بوونی ڕووت، بە ڕێگەی تیگەیشتنەوە دەناسرێت. تیگەیشتن لە خەسڵەتەکانی رووتدەکاتەوە و جارێکی دیکە بە یەکیانەوە دەبەســـتێتەوە. بەڵام ئەگەر بوون بچێتە نێو ناوەڕۆکییەوە و تێگەیشتنیش تەنیا خەســـڵەتەکان بناسێت، ئێمە نازانین چۆن تێگەیشتن ئەو بوونە دەدۆزێتەوە، کە لە بەرجەستەبوونەکە پێکهاتووە. ئێمە دەتوانین، بەرگری لە بۆچوونەکەی هیگڵ بکەین و بڵێین هەموو بڕیاردانێک ڕەتدانەوەیە. ئاگامەندی ئەو شتە ڕەتدەداتەوە، کـــە بابەتەکەی جیاوازە. بەڵام مادامەکی بوون دەچێتە نێو شتێکی دیکەوە، ئەوا تێگەیشـــتن ناتوانێت حوکمی بەســـەردا بدات. ئەگەر خۆی تێپەڕ بکات و خۆی زەمینـــە و بنەڕەتی تێپەڕبوونەکەی بێت، ئەوا بوون دەبێت بۆ تێگەیشـــتن خۆی دەربخات، ئاگامەندیش خەســـڵەتەکانی دیاریبکـــات. کاتێک دەڵێین، بوون هەیە، ئەوا بـــوون وەکو خۆی یان بنەڕەتی تێپەڕبوونەکەی خـــۆی دەهێڵێتەوە. لێرەدا دەبینیـــن چەمکی تێپەڕبوون، کە هیگڵ بەکاریهێناوە تەمومژاوییە. بە دۆزینەوەی بوون، وەکو ئەوەی هەیە لە لایەن تێگەیشتنەوە بەس نییە. پێویستە بزانین ئەو بوونـــەی هەیە چۆنە و چییە. ئەم ڕوونکردنەوەیەش بە ئاوڕدانەوە لە فینۆمینەی بوونەوە ســـەرهەڵدەدات و نەبەســـتراوە بە پرۆســـەی ڕەتدانەوە لە تێگەیشتندا. ئەوەی پێویستە لێی بکۆڵینەوە دەســـتەواژەکەی هیگڵە. گوایە بوون و نەبوون دوو لایەنی دژوەستاون و جیاوازییەکەیان لە حاڵەتی ڕووتکردنەوەیاندا دەبێت بە 'بۆچوون'. دژوەســـتانی بوون بەرانبەر نەبوون، وەکو دژوەستانی بابەت بەرانبەر دژەبابەت، هیگڵ گوتەنی، ئەوە دەگەیەنێت، ئەو دوو دژە هاوسەردەمی یەکدی بن. لەمحاڵەتەدا دوو دژ لە یەککاتدا بەرانبەر یەکدی سەرهەڵدەدەن. پێویستە ئەوەش بزانین، تەنیا دوو لایەنە دژ وەســـتاوەکە دەتوانـــن لەیەک کاتدا هەبن و بەرانبەر یەک ڕاوەســـتن، چونکە هەردووکیان بە یەکڕادە پۆزەتیڤ (یان نێگەتیڤن). بەڵام نەبوون دژوەســـتاوی بوون نییە؛ لایەنە ناکۆکەکەیەتی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەگوێـــرەی بیرکردنەوەی لۆجیکانە، نەبوون پاش بـــوون دەکەوێت چونکە خۆی بوونە، کە لەوەوپێش ناســـیومانە و ئێستا ڕەتی دەدەینەوە. بوون و نەبوون ئەو چەمکانە نین هەمان ناوەڕۆکییان هەبێت. بوون هەر شتێکی هەبێت، نەبوون ڕەتی دەداتەوە. ئەمەش ڕێگە بە هیگڵ دەدات بوون و نەبوون بەنێو یەکدیدا تێپەڕبکات و ڕەتدانەوەش بکات بە بەشێک لە پێناســـەکەی بۆ بوون. ئەمەش شتێکی بەڵگە نەویستە. چونکە هەموو پێناســـەکردنێک ڕەتدانەوەیە. لێرەدا هیگڵ ســـودی لە

گوتەکەی سپینۆزا وەرگرتووە، کە دەڵێت، "هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەیە"[٢٥] ئایـــا ئەو نانوســـێت، "گرنگ نییە چ ناوەڕۆک و خەســـڵەتێک بـــوون لە شتێکی دیکە جیادەکاتەوە؛ ئەوەی ناوەڕۆکی پێدەبەخشێت لە ڕووتکردنەوەی دەپارێزێت. ئـــەوەی نەبوون بە ئێمە ناناســـێنێت، ڕووتکردنەوە وبێ خەســـڵەتیە."؟ ئەوەی ڕەتدانەوە لە دەرەوە بەســـەر بوونێکدا دەسەپێنێت، بۆیەدەردەکەوێت ئەو [بوونە] بە نەبوون دەگەیەنێت.

بەڵام ئێمە لێرەدا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەتدانەوەدا کایەمان بە زمانەکەشمان کردووە. ئەگەر من هەموو ناوەڕۆکێکی بوون ڕەتبدەمەوە و ڕێگە نەدەم خەسڵەتێکی هەبێت، هەمانکـــات پێویستە ئەوبوونە بەو شێوەیەی هەیە بسەلمێنم. هەموومان دەتوانین بە ئـــارەزووی خۆمان، ڕەتی بوونێک بدەینـــەوە، بەڵام ناتوانین بڵێین بـــوون نییە. ڕەتدانەوە، کارناکاتە ســـەر ناوکی بوون، کە پڕ و پۆزەتیڤانەیە. بەپێچەوانەشەوە،نەبوون لە ناخی بووندا نییە. کاتێک هیگڵ دەنوسێت، "بوون و نەبوون" دوو چەمکی بەتاڵ و ڕووتکراوە دادەنێت،[٢٦] ئەو خاڵەی ڕەچاونەکردوە، کە بەتاڵی بێبەریبوونە لە شتێکەوە.[٢٧] بوون، بێجگە لە ناسنامەکەی، لە هەموو خەســـڵەتێک ڕووتکراوەتەوە، بەڵام نەبوون بوونی لێسەندراوە. بە کورتییەکەی، ئێمە دژی هیـــگڵ دەڵێین، بوون هەیە و نەبوون نییە. هەرچەندە بوون نابێت بە زەمینەی خەسڵەتە جیاوازەکان، نەبوون لۆجیکانە لە پاش بوونەوە سەرهەڵدەدات چونکـــە پێویستی بە بوونە تاکو ڕەتی بداتەوە. ئەمەش ئەو واتایە ناگەیەنێت بۆ هاو تەرازکردنی بوون و نەبوون تەنیا پێویستیمان بە ڕەتدانەوە هەبێت. پێویستە ئاگامـــان لەو خاڵەش بێـــت، کە هەرگیز نەبوون بەو چاڵـــە قووڵە دانەنێین، کە بوونی لێوە ســـەرهەڵدەدات. هەروەها جێگەی سەرســـوڕمانە بە ڕێگەی زمانەوە نەبوونـــی شتەکان و بوونی مـــرۆڤ دەردەبڕین. ئاماژە بۆ کۆمەڵێک شت دەکەین و. دەڵێیـــن، "دەســـت لە هیچ مـــەدە." واتە هیچی ئەو شتانە. بەهەمانشـــێوە، ئەگەر پرســـیارێک لە بارەی ڕووداوێکەوە لە کەســـێکبکەین لـــە وەڵامدا لەوانەیە بڵێیت، "هیچ نازانم". ئەم هیچە [نەبوونە] سەرجەمی فاکتورەکان دەگرێتەوە، کە

٢٥ ئەمە گوتەیەکی سپینۆزایە و هیگڵ بە یاسایەکی گرنگی لۆجیکی دیالێکتیکی دادەنێت. لەو باوەڕەدایە، هەموو شتێک لەنێو خۆیدا لایەنە دژەکەی هەڵگرتوە. سپینۆزاش دەڵێت: هەموو سەلماندنێک یان دەستەواژەیەکی پۆزەتیڤ، بۆ نموونە (گۆچان خوارە.) هەمانکات ڕەتدانەوەی لایەنێکی دیکەی ئەو بوونەیە، لە دەستەواژەکەدا باسیدەکەین. کاتێک دەڵێین (گۆچان خوارە) ئەم دەستەواژەیە ئەوە دەگەیەنێت، کە (گۆچان ڕاستە نییە.) دەستەواژەی واتایەکی لاتینییە (هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەیە.) (وەرگێڕ).

٢٦ Elxxxvii E. 2ed. p.c.

٢٧ هیگڵ یەکەم بیریاریشە دەڵێت، "هەموو ڕەتدانەوەیەک، ڕەتدانەوەی خەسڵەتێکە." ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕەتدانەوە پەیوەندی بە ناوەڕۆکەوە هەیە.

پرسیارەکەی لەبارەوە کراو. ســـوکراتیش لە گوتەکەیدا "ئەوەی دەیزانم ئەوەیە، کە من هیچ نازانم" ئەو (هیچ)ەی ئاماژەی بۆ دەکات سەرجەمی بوون و ڕاستییە. ئەگـــەر بۆ بۆچوونی ئەوانـــەش بگەڕێینەوە، کە لەبـــارەی پەیدابوونی جیهانەوە دەدوێن و بپرســـین، چ شتێک لە پێش جیهاندا هەبوو و لە وەڵامدا دەڵێن 'هیچ' ئەوا باوەڕ بە 'هیچ' لە پێش جیهاندا دەکەن. ئەو هیچەش پێویستی بە شتێکی لەپێشتر هەیە. بەمجۆرە بەردەوام بەرەو دواوە[بۆ بنەڕەتی جیهان] دەگەڕێینەوە. ئەمـــڕۆ ئەوەی ئێمـــە ڕەتیدەدەینەوە ئەو بوونەیە، کە لە پێـــش بووندا هەبووە. لێـــرەدا ڕەتدانەوە لە ئاگامەندییەوە هەڵدەقوڵێت و بەرەو ســـەرەتا دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئێمـــە لەو شتە بەتاڵ و ڕووتکراوەیە خەســـڵەتی بەتاڵ بوونی لێدابڕین، جیهانی بخەینە نێو، پڕی بکەین لە ســـەرجەمی شتەکان، خەســـڵەتی لەپێشتری لێبسەنیـــن، کە ئاماژە بـــۆ لەپاشتریش دەکات، ڕەتدانـــەوە بەتەواوی وندەبێت. کەوابوو، دەستەواژەکەی ســـپینۆزا وەردەگێڕین و دەڵێین، هەموو ڕەتدانەوەیەک ســـەلماندنە. ئەمەش دەیسەلمێنێت، کە بوون پێـــش نەبوون دەکەوێت و دەبێت بە زەمینە بۆ نەبوون. هەروەها ئەم پێشـــخستنەی بـــوون تەنیا لۆجیکانە نییە. لەنێو هەبووە کۆنکرێتییەکانیشدا نەبوون لە بوونەوە سەرهەڵدەدات. لەبەرئەمەشە دەڵێیـــن، نەبوون دێوەزمەی بوونە. بوون پێویستی بـــە نەبوون بۆ بوونی نییە. بـــەڵام نەبوون پێویستی بە بوونە و لە بوونـــەوە پەیدا دەبێت. نەبوونی بوونێک لەنێو ســـنوری بووندا خۆی دەردەخات. لەناوچوونی سەرجەمی بوون ڕوونادات. نەبوون بە ڕووی بوونەوە گیرساوەتەوە.

### ٤. چەمکی فینۆمینۆلۆجییانەی نەبوون.

ڕێگەیەکی دیکەش بۆ تێگەیشـــتن لـــە پەیوەندی نیوان بوون و نەبوون هەیە. ئێمە دەتوانین هەردووکیان یەکسانی بەپێکهاتە پێویستییەکانی جیهانیان دابنێین. بەبێ ئەوەی هیگڵ ئاســـایی بڵێێن، بوون دەچێتە نێو نەبوونەوە یان بەبێ ئەوەی سوربین لەسەر پێشـــخستنی بوون جەخت لەسەر هاوتەرازبوونی ئەم دوولایەنە دەکەین. ئەم بۆچوونەشە هایدیگەر ڕوویتێکردوە.[٢٨] بۆ ڕوونکردنەوەی پێشکەوتنی بیردۆزەکەی هایدیگەر و ڕەتکردنی هیگڵ سەبارەت نەبوون دوور ناڕۆین. یەکەم، بوون و نەبوون [بۆ هایدیگەر] دوو چەمکی ڕووتکراوە و بەتاڵ نین. هایدیگەر لە گرنگترین پەرتووکیدا بایەخی بە پرســـیارکردن ســـەبارەت بوون داوە؛ ئەم بوونە خەســـڵەتی ئەو بوونەی نییە بیریارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست باسیان کردوە و

٢٨ سارتەر ئاماژەی بۆ بۆچوونەکەی هایدیگەر لە پەرتووکی (ئایا مێتافیزیک چییە؟) دا دەکات. (وەرگێڕ)

هیگڵیش لەوانەوە وەریگرتوە. واتای بوون پیویستە رووبنکرێتەوە؛ تێگەیشتن پێش بیرکردنەوەی ئۆنتۆلۆجییانەی بوون هەیە، کە لەنێو هەڵوێستەکانی مرۆڤدا خۆی سەقامگیرکردوە، بۆ نموونە، لە هەموو پرۆژەکانی مرۆڤدا ئەم جۆرە تێگەیشتنە هەیە. بەهەمان شێوەش، ئەو گرفتانەی لە مامەڵەکردنمان لەگەڵ نەبووندا دەهاتنە پێش دەردەکەوێت بناخەیان نەبێت. ئەو گرفتانە لەبەرئەوەی تێگەیشتن سنوردار دەکەن بە گرنگیان دەبینین و دەریش دەکەوێت لەنێو تێگەیشـــتندا نەبن. گەلێک هەڵوێســـت لە بوونی مرۆڤدا هـــەن، وەکو ڕق، قەدەخەکـــردن و پەشیمانی لە ڕێگەیانەوە نەبوون دەناســـین. بوونی 'دازاین' یش بەردەوام لەبەردەم نەبووندایە و دیاردەیەکە لە حاڵەتی دوودڵیدا دەیدۆزیتەوە.[٢٩] هایدیگەر، لەگەڵ دامەزراندنی ئەو حاڵەتانەدا، کە دیاردەی نەبوون تیایاندا سەرهەڵدەدات توشی هەڵەکەی هیگڵ نەهاتـــوە. بوون لەبەر نەبوون ناپارێزێـــت. نەبوون نییە و خۆی لەناودەبات. پشـــت بە شتێکی بەرز دەبەســـتێت. ئێمـــە دەزانین، هایدیگـــەر بوونی مرۆڤی بە "بوون-لەنێو-جیهان" ناوزەدکردوە. جیهانیش تێهەڵکێشـــراوی هەموو کەل و پەلەئاڵۆزەکانە، کە پێکەوە بەســـتراون و مرۆڤیش لەنێویاندا هەوڵ دەدات خۆی بناسێت. ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ، لەم پەیوەندییەدا، لەگەڵ بوون و دۆزینەوەی خۆی لەنێو بووندا بەرجەســـتە دەبێت. هەروەها، ڕاســـتەقینەی مرۆڤ دەبێت بە سەرچاوەی سەرهەڵدانی دەوروبەر و ئەو جیانەی ناسراوە.

ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتـــی بـــە تێپەڕبوونی بـــوون دەتوانێت بـــوون، وەکو ســـەرجەمی ئەو شتـــە ڕێکخراوانـــەی جیهان دەربخـــات. هەموو ســـەلماندنێک بـــۆ هایدیگەر تێپەڕبوونـــە چونکە هەمانکات، خـــۆ دوورخستنەوەیە لە خاڵێکی تێڕوانینەکـــەوە. ئـــەم تێپەڕبوونـــەی جیهان لـــە ڕێگەی دازاینـــەوە ڕوودەدات. خەســـڵەتی خۆگەری لەوێدایە مرۆڤ هەمیشە لەســـەر زەمینەی ئەو شتەوە، کە ئـــەوەی نییەتی خۆی لەوە جیابکاتەوە، کـــە هەیەتی. لەو پەڕی جیهانەوە خۆی ببینێـــت و بناســـێتەوە و تەماشای خـــۆی بکات، تاکو جیهانـــی ناوەوەی خۆی بدۆزێتـــەوە. مرۆڤ "بوونە دوورەکانە." لەم جوڵانەدا بـــەرەو ناوەووەی خۆ، کە هەمـــوو بوون دەپێچێتەوە، بوون خۆی بە ڕێـــک وپێکی بۆ جیهان دەردەخات و ئاماژە بۆ پێشـــخستنی جوڵانەکە یان خۆی ناکات. بـــەڵام دەرکەوتنی (خۆ) لەو دیو جیهانەوە، لەو دیو ســـەرجەمی ڕاستەقینەکانەوە، سەرهەڵدانی "ڕاستەقینەی مرۆڤە" لەنێو نەبووندا. تەنیا لەنێو نەبووندا بوون ڕەتدەکرێت. لەم گۆشەنیگایەی ئەو دیو جیهانـــەوە بوون بەجیهان کراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، لە لایەکەوە ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی، وەکو بوون لەنێو نەبووندا ســـەرهەڵدەدات، لە لایەکی

٢٩ دازاین، زاراوەیەکی ئەڵمانییە لە دوو بەش پێکهاتوە. (دا- واتە لێرە) و (زانین- بوون). ئەم زاراوەیە، کە واتای (بوون-لێرە) دەبەخشێت، هایدیگەر بۆ بوونی مرۆڤی بەکارهێناوە. (وەرگێڕ)

دیکەوە جیهان لەنێو نەبووندا 'ڕادەگیرێت'. لەم دوو جۆرە لەناوچوونە بەردەوامەدا دوودڵی دەدۆزینەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی جیهاندا دازاین هەســـت بەوەدەکات، کە جیهان بوونێکی هەڵکەوتوی هەیە؛ ئەو پرسیارەش دەکات، "چۆن لە جێگەی نەبوون بوون هەیە؟"[30] بەمشـــێوەیە هەڵکەوتنی جیهان تاکو ئەو ئاستەی ڕاستەقینەی مـــرۆڤ لەنێو نەبووندا خۆی دادەمەزرێنێت، خۆی نیشـــاندەدات. لێرەدا، نەبوون لـــە هەموو لایەکەوە چواردەوری بوونی گرتوە. هەمانکات لەنێو بووندا دەرکراوە. لێرەدا نەبوون نەخشەی جیهانمان وەکو ئەو جیهانەی دەردەکەوێت بۆ دەکێشێت. ئایا ئێمە بەم چارەســـەرکردنە ڕازین؟ بەدڵنیاییەوە، تێگەیشتن لە جیهان، وەکو جیهـــان لەناوبردنە. لەو ســـاتەوە جیهان، وەکو جیهـــان دەردەکەوێت تەنیا بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە دەناسرێت. ئەم دەرکەوتنەش پێویستی بە سەرهەڵدانی "ڕاستەقینەی مرۆڤانە" لەنێو نەبووندا هەیە. بەڵام لە کوێوە ڕاستەقینەی مرۆڤانە دەستەڵاتی سەرهەڵدان لەنێو نەبوونەوە پەیدادەکات؟ بێگومان، هایدیگەر لەوێدا دروست بۆ کێشەکە چووە، کە نەبوون بناخەی ڕەتدانەوەیە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە نەبوون لەنێـــو خۆیدا 'نییە'ی هەڵگرتوە. ئەو بناخەیە[هیگڵ گوتەنی] چەمکێکی ڕاستەوخۆی ڕووتکراوە نییە. نەبوون دەبێت بە سەرچاوەی دەستەواژەی نێگەتیڤ چونکـــە خودی خۆی ڕەتدانەوەیە. ڕەتدانـــەوە چالاکی نەبوونە چونکە ڕەتدانەوە ڕوو لـــە بوون دەکـــات. نەبوون لەوێدا نەبوونە، کە خـــۆی وەکو نەبوونی جیهان ڕەتدەداتـــەوە؛ واتە لەگەڵ لەناوبردندا ڕوو لە جیهـــان دەکات و ڕەتی دەداتەوە. نەبـــوون بوون لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت. بەرزیتی، کە "پرۆژە دانانی خۆیە بەرەو ئەودیو" نەبوون دانامەزرێنێت.

بـــە پێچەوانەوە، نەبـــوون، کە لەنێو هەموو پرۆژەیەکی بەرزدایە ســـنورداری دەکات.

هایدیگـــەر ویستویەتی بـــە زاراوە پۆزەتیڤەکان باســـی دازاین بکات و لایەنی ڕەتدانەوەی بشـــارێتەوە.[ئەو دەڵێت] "دازایـــن لەنێو جیهاندا لە دەرەوەی بوونی خۆیدایـــە"، "بوونـــە دوورەکانە"، نیگەرانییە؛ "پرۆژەکانـــی خۆیەتی" و هتد. بە کورتییەکەی لە جێگەی ئەم خەســـڵەتانە دەتوانیـــن بڵێین، دازاین ئەو بوونەیە، کـــە 'نییە'. ئەم خەســـڵەتە جیهان تێپەڕدەکات و خـــۆی وەکو ئەو شتەی نییە دەردەخات. لەم خاڵەدا هیگل لە هایدیگەر ڕاسترە و دەڵێت، هۆش ڕەتدانەوەیە. ئێمە دەتوانین یەک پرسیار بە دوو شێوەی جیاواز ئاراستەی هەردووکیان بکەین. بە هیگڵ دەڵێین: "بەس نییە هۆش بە نێگەتیڤ و ناڕاستەوخۆ دابنرێت؛ پێویستە ڕەتدانەوە، وەکو بونیادی هۆش بسەلمێنرێت. ئایا هۆش چییە تاکو بە ڕەتدانەوە

٣٠ ئەم پرسیارە "بۆچی بوون لە جێگەی نەبوون هەیە؟ پرسیارێکە هایدیگەر لە سەرەتای نوسراوەکەیدا بە ناوی (پێشەکییەک بۆ مێتافیزیک) دایناوە.(وەرگێڕ)

دابنرێت؟" هەمان پرسیاریش لەهایدیگەر بەمشێوەیە دەکەین: "ئەگەر ڕەتدانەوە بونیادی بەرزێتی[دازاین] بێت بۆ ئەوەی ڕاســـتەقینەی مـــرۆڤ جیهان ڕەتبکات ســـەرچاوەی بونیادە بەرزەکەی بوونی چییە؟" لە هـــەردوو حاڵەتەکەدا چالاکی ڕەتدانەوە باســـکراوە، بەڵام ئەو چالاکییە نەخراوەتە ســـەر بوونێکی نێگەتیڤ. لەسەرو ئەمەشەوە، هایدیگەر نەبوون بە مەبەستی ئەو بوونە بەرزەوە دەبەستێتەوە بەبێ ئەوەی بزانێت لەپێشـــتر بـــە بونیادی بەرزێتی داناوە. چ ســـودێکی هەیە بڵێیـــن، نەبـــوون زەمینەی ڕەتدانەوەیە ئەگەر ئەمە تەنیا ئـــەو بیردۆزەیەمان بۆ دامەزرێنێت، کە نەبوون لە هەموو ڕەتدانەوە کۆنکرێتییەکان جیادەکاتەوە؟ ئەگەر مـــن لەنێو نەبوونەوە بەودیـــو جیهان بگەم، چۆن ئەم نەبوونە دەبێت بە بناخەی ئەو ڕەتدانەوانەی لە هەڵوێستەکانمان لە ئاســـتی ڕووداوەکاندا بەرجەستە دەبن؟ مـــن دەڵێـــم "پیۆ لێرە نییە"، "پـــارەم لەوە زۆرتر نییە" و هتـــد. ئایا پێویست دەکات لە جیهانەوە خۆمان بە نەبوون بگەیەنین و لە نەبوونیشەوە جارێکی دیکە بەرەو بوون بگەڕێینەوە، تاکو زەمینە بۆ دەستەواژەکان بدۆزینەوە؟ بۆ ئەم کارە پێویســـت ناکات جیهان بخەینە نێو نەبوونەوە و لە بەشێکی بووندا ڕاوەســـتین. ئەوەی دەیکەین ڕەتدانەوەی خەســـڵەتێکی بابەتەکەیە. کەسێک دەتوانێت بڵێت هـــەر یەکێک لەو خەســـڵەتانەی ڕەتدراونەتەوە یان ئەو بوونـــەی نکۆڵی لێکراوە هەمـــان شێوازی نەبوونە. نەبوون پڕی ئـــەو شتانەیە، کە نین و جیهانیش لەنێو نەبووندا ڕاگیراوە. لێرەدا هەر یەکێک لە ڕەتدانەوەکان جۆرێک ڕەتکردنیان هەیە؛ ڕەتکردنـــی بوونێک بـــەرەو بوونێکی دیکە. بەڵام ئەم ڕەتکردنـــە ئەگەر چەمکە ناڕاستەوخۆکەی هیگڵ نەبێت، چییە؟ تەنانەت ئەگەر باسەکەمان بۆ ڕەتدانەوەی بابەتە کۆنکرێتییەکان دروست بێت (بۆ نموونە دەڵێین سێنتارۆس لێرە نییە، هیچ هۆکارێک نییە ئەوی دواخستبێت، یۆنانییە کۆنەکان باوەڕیان بە چەندهاوســـەری نەبوو) ڕەتدانەوەکـــان دەبن بە پێکهاتە بۆ نەبوون. چۆن دەتوانین بڵێین ئەمانە لەنێو جیهان و نەبوونیشدا هەن؟ بۆ نموونە، چەمکی دووری، کە شوێن سنوردار دەکات. ئاســـانە ساتێکی نێگەتیڤی تێدا ببینین. دوو خاڵ دەبن بە دووری ئەگەر لە یەکدی جیاکرابێتنەوە.

درێژی نێوانیان یان هێڵی نێوانیان خەسڵەتێکی پۆزەتیڤە. هەندێک دووری بە بوونی ئەو درێژییە دادەنێن لەنێوان دوو خاڵی، وەکو (ئەلف) و (با) و سنورداری دەکەن.

ئایا ئەم کەسانە ئەوە نابینن، کە لێرەدا تەماشاکردنەکەشیان سنوردارکردوە؟ ئەو بەشە بینراوە بابەتی ڕاستەوخۆی حەدەسە، کە وەکو شتێکی پڕ و پۆزەتیڤ دەردەکەوێـــت. ئەو لایەنە نێگەتیڤـــەی لەم بەشەدا دەرنەکەوتـــوە لە دوو جۆر ســـنورداریێتیدا دەبینرێت: ئەگەر بڵێین خاڵی (با) دوا خاڵی ئەو دوورییەیە، ئەوا

جەخت لەسەر ئەوە دەکەین، کە ئەو هێڵە خاڵی (با) ڕەتناکات. لێرەدا ڕەتدانەوە دەبێت بە بونیادێکی ناسەرەکی بۆ بابەتەکە. ئەگەر بڕوانینە دوو خاڵەکەش (ئەلف) و (بـــا)، لەنێـــو شوێندا ڕاســـتەوخۆ دەبن بە دوو بابەتی حەدەســـەکەمان. لەم حاڵەتـــەدا بەشەکە، وەکـــو شتێکی پڕ و بابەتێکی کۆنکرێتـــی دەشاردرێتەوە و دەبێـــت بـــە نێوانەی دوو خاڵ و بەتاڵ و ئەو لایەنـــە نێگەتیڤەی دوو خاڵەکە لە یەکـــدی جیادەکاتەوە. شێوەی تەواوی ئەو بەشەو هـــەردوو خاڵەکان و بونیادی ناوەکـــی ڕەتدانەوەکەی بە دوو جۆر بۆ تێگەیشـــتنمان دەردەکەون. دوو شێوازی هەیە و بەرجەســـتەبوونی یەکەمیان دەبێت بە هۆکار بـــۆ لەناوبردنی دووەمیان. ئەمە لە هەستکردنیشـــدا ڕوودەدات. لە هەردووکیاندا هەمان چەندەکی ڕەتدانەوە دەبینین، جارێک دەبێت بە چەمکی ســـنورداڕێتی و جارەکەی دیکە دووری نێوان خاڵەکان. بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناتوانین تێپەڕی بکەین.

ئایا ئەو ڕەخنەیەشمان لێدەگرن، کە گوایە دووری حاڵەتێکی دەروونییە و تەنیا ئەو درێژبوونەوەیەشە، کە لە خاڵی ئەلفەوە بە خاڵی (با)مان دەگەیەنێت؟

ئێمـــە لە وەڵامـــدا دەڵێین، هەمـــان ڕەتدانەوە بۆ ئەمـــە و درێژبوونەوەکەش دەبێت. لەگەڵ هایدیگەردا لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەوین، کە "ڕاستەقینەی مرۆڤانە دوورکەوتنەوەیـــە لە خۆوە"، ئەو بوونەیە لە جیهاندا دووریەکان دەهێنێتە کایەوە و هەمانکات لەناویان دەبات.

ئەم دوورکەوتنەوەیە لە خۆوە، ئەگەر بۆ دامەزراندنی دووریش بێت بەگشـــتی، حاڵەتێکی پێویستە و لەنێو خۆیدا دووری، وەکو بونیادێکی ڕەتدانەوە هەڵدەگرێت، تاکو بە ســـەریا زاڵ بێت. بێسودە دووری تەنیا بۆ پێواندنی درێژی بگەڕێنینەوە. ئـــەوەی لەنموونەکـــەی ســـەرەوەدا دەردەکەوێت یەکێتییەکی لەچـــارە بەدەرە، لەنێـــو دوو خاڵەکان و بەشەکـــەدا، کە ئەڵمانییەکان بە (گیشـــتاڵت) ناوزەدی دەکەن.[31] ڕەتدانەوە هەوێنی ئەم یەکێتییەیە. پەیوەندییەکی ڕاســـتەوخۆ لەنێوان ئـــەو دوو خاڵـــەدا دەردەخات و لە بەردەم حەدەســـەکەماندا، وەکو ئەویەکێتییە لەچـــارە بەدەرە ڕایدەگرێـــت. ئەم ڕەتدانەوەیە لەوێـــدا دادەپۆشرێت و دەتوانین بیشـــارینەوە، کە دووری بۆ درێژی نێوان خاڵەکان بگەڕێنینەوە و بیپێوین.ئەوەی لەبـــارەی دوورییەوە باســـمانکردوە دەتوانین لە ڕێگەی چەند ڕاســـتەقینەیەکی دیکەشەوە، وەکـــو ئامادەنەبوون، گۆڕان، ئەوی دیکـــە، دەرکردن، پەشیمانی و ڕوخانـــدن و هتد ڕونیبکەینەوە. ژمارەیەکی زۆر لەم ڕاســـتەقینانە هەن تەنیا لە دەســـتەواژەکاندا دەرناکەون بەڵکو مرۆڤ هەســـتیان پێدەکات و ڕەتدانەوەش لە بونیـــادی ناوەکییاندایە. ئێمە بەم ڕاســـتەقینانە دەڵێین ڕەتدانەوەکان. کانت لە

---

٣١ گیشتاڵت وشەیەکی ئەڵمانییە، واتە بونیاد، شێوە، فۆرم، ڕوخسار و ئەندازە دەبەخشێت. فەرمانەکەی واتای فۆرم دروستکردن، شێوەپێدان، خستنە نێو چێوەو قاڵبەوە دەگرێتەوە. (وەرگێڕ)

باســـەکەیدا لەســـەر هەندێک لە چەمکەکان (بۆنموونە نەمری دەروون) بە کورتی ئاوەڕی لێیان داوەتەوە. ئەم چەمکانەی بە تێهەڵکێشـــەی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ داناوە. لەنێویاندا نێگەتیڤ دەبێت بە زەمینە بۆ پۆزەتیڤ. ڕۆڵی ڕەتدانەوەکەش بەگوێرەی بابەتەکە دەگۆڕێت. نەبوون لەودیو جیهانەوە ڕەتدانەوەیەکی ڕەهایە. هەروەها نەبوون، ئەگەر لەســـەر بوون ڕاوەســـتابێت نابێت بە نەبوون و جارێکی دیکە دەکەوینەوە ســـەر بـــوون. ئەگەر نەبوون هەبێت ئـــەو نەبوونە لەپێش و لەپاش بوونەوە نییە. تەنانەت لە دەرەوەی بوونیشـــدا نییە. نەبوون، وەکو کرم لەنێوبووندا پێچی خواردووە.

## ٥. بنەڕەتـــی ڕەتدانـــەوە

باشترە ئاوەڕێک لەو ڕێگەیە بدەینەوە، کە بڕیومانە. ئێمە لە سەرەتاوە پرسیارمان سەبارەت بوون کرد. لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەمان لەسەر ئەم پرسیارکردنە گەیشتینە ئەو باوەڕەی پرسیارکردن هەڵوێستی مرۆڤ بێت. دوایی دەرکەوت بەبێ ڕەتدانەوە پرسیارکردنیش ســـەرهەڵنادات. ڕەتدانەوەش بۆ نەبوون گەڕایەوە و نەبوون بوو بە زەمینە. بۆ ئەوەی ڕەتدانەوە لەنێو جیهاندا هەبێت و ئێمەش بتوانین پرســـیار لەبارەی بوونەوە بکەین، پێویستە نەبوون هەبێت. هەروەها بەو باوەڕەش گەیشتین نەبـــوون لە دەرەوەی بووندا نییە. شتێک نییـــە تەواوکەری بوون یان چەمکێکی ڕووتکراوە بێت. نەبوون دەبێت لە ناخی بووندا بێت لەوێوە ئێمە ئەو ڕاستەقینانە دەناسین، کە بە ڕەتدانەوەکان ناوزەدمانکردن. بەڵام نەبوون لەبوونی لەنێو خۆوە دەرناچێـــت؛ بوونێکی پڕ و پۆزەتیڤ نەبـــوون ناگرێتە خۆی. هەمانکات ناتوانین بڵێین، نەبوونی ئەم بوونەش نییە و یان نەبوون هیچ پەیوەندییەکی بەم بوونەوە نییە. ئەو پرسیارەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت ئەوەیە: ئەگەر نەبوون لە دەرەوەی بوونـــدا نەبێت، بوون نەبێت و نەبوونیش نەتوانێـــت ببێت بە هێز بۆ لەناوبردنی خۆی، ئایا نەبوون لە کوێوە پەیدا دەبێت؟

بۆ ئەوی توێژینەوەکەمان بەرەوپێشـــەوە بەرین خەسڵەتی "خۆ-لەناوبردن" بە نەبوون نادەین چونکە تەنیا بوون ئەم خەسڵەتەی هەیە. لەبەر ئەوەشە باسیدەکەین چونکە ڕواڵەتی بوونی پێوەدیارە. نەبوون نییە، بەڵام دروســـت دەکرێت. نەبوون خۆی لەناو نابات بەڵکو لەناودەبرێت. کەوابوو، پێویستە بوونێک هەبێت (ئەمەش بوون-لەنێو-خـــۆ نییە)، کە بتوانێت نەبوون لەناوبەرێت، پشـــتگیری بوونی بکات و بـــەردەوام بیهێڵێتەوە. بوونێـــک، کە لە ڕێگەی ئەوەوە نەبـــوون بێتەکایەوە. بـــەڵام چۆن ئـــەم بوونە پەیوەندی بـــە نەبوونەوە هەیە، کـــە لەکاتێکدا دەڵێین لـــەوەوە نەبوون دەردەچێت؟ پێویستە، یەکەمجـــار ئەوە بزانین، کە ئەو بوونەی

لێرەدا بەســـەرچاوەی نەبوونی دادەنێین لە پەیوەندییەکەیدا بە نەبوونەوە چالاکە و نەبزیـــۆ نییە. نەبوونیـــش لە ڕێگەی بوونێکی دیکەوە بە ئەم بوونە ناگات. ئەو بوونـــەی نەبوون دەهێنێتەکایەوە، وەکو هۆکاری ڕواقییەکان، بەبێ ئەوەی گۆڕان بەسەرخۆیدا بهێنێت کار لەسەر هۆکردەکەی ناکات. مەحاڵە بوونێکی پڕ و پۆزەتیڤ لـــەدەرەوەی خۆیدا، نەبوون ڕاگرێت یـــان پەیدابیکات. ئەو بوونەی نەبوونی لێوە دەردەچێت ئەو بوونەیە، کە دەتوانێت نەبوون لەنێو بووندا لەناوبەرێت. هەمانکات نەبوون لە ناخی بوونیشـــدا دامەزرێنێت. ئەو بوونەی نەبوون دەهێنێتە جیهانەوە ئەو بوونەیە پرســـیار لەبارەی نەبوونی بوونی خۆیەوە دەکات. بوونێکە دەبێت بە نەبوون بۆ خۆی. ئەمەش بە چالاکی لەناوبردنی بوونەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵکو خەسڵەتێکی ئۆنتۆلۆجییە لەم بوونەدا. با بزانین لە چ دەڤەرێکی بووندا ئەو بوونە پەیدا دەکرێت. باشتروایە جارێکی دیکە بۆ کێشـــەی پرســـیارکردن بگەڕێینەوە. ئەگەر لە بیرمان بێت ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە هەموو پرســـیارێک لەنێو خۆیـــدا ئەگەری وەڵامدانەوەی نێگەتیڤی هەڵگرتوە. لە پرســـیارکردندا پرســـیار لەبـــارەی بوونەوە یان شێـــوەی بوونی بوونێکەوە دەکەین. ئـــەو بوونە یان ئەو شێوەیە[لە کاتی پرســـیارکردنەکەدا] نادیارەو ئەگـــەری ئەوەش هەیە ئەو بوونە یان شێوەی بوونەکە خۆی، وەکو نەبوون دەربخات. لەبەر ئەوەی لەوباوەڕەداین هەموو پرســـیارکردنێک لایەنی نەبوونیش هەڵدەگرێت و بەرجەستەش دەکات لە پرســـیارکردندا خۆمان لە بابەتەکەوە دوورەپەرێـــز ڕادەگرین. ئەمەش جۆرێک لە گۆڕان و بەرزی و نزمی لە پەیوەندی نێوان بوون و نەبووندا دەستنیشان دەکات. کەوابوو، پێویستە پرسیارکەر ئامادەبێت خۆی لە زنجیرەی هۆکارەکانی پێکهێنانی بوون دووربخاتەوە. ئەگەر لەو باوەڕەدابین خەسڵەتی هەمەکی پرسیار لە مێشکی پرســـیارکەرەکەدا ڕەنگدار دەکات ئەوا پرســـیار وندەبێت و ناناســـرێت. هۆکاری ڕاســـتەقینە دەبێت هۆکاری ڕاســـتەقینەی لە دوابێت. هەر بوونێکیش پێکهاتبێت پۆزەتیڤە و بوونی بە هۆکارەکەیـــەوە گرێدراوە. ناتوانێت لەنێو خۆیدا بچوکترین گەرای نەبوون هەڵگرێت. مادامەکی پرسیارکەرەکە هەڵوێستی خۆ دوورخستنەوەی [لە بابەتە پرسیار لێکراوەکەوە] هەیە، بەر کاریگەرێتی پەیوەندییە هۆکارییەکانی جیهـــان ناکەوێت. ئەو لە ئاســـتی بووندا خـــۆی دوورەپەرێز ڕادەگرێت. ئەمەش دوو جۆر لەناوبردنی تێدایە، لەلایەکەوە ئەو بابەتە لەناودەبات، کە پرســـیارەکەی لەبارەوە کراوە و بەشێکی بێ لایەن لەنێوان بوون و نەبووندا دادەنێت. لە لایەکی دیکـــەوە تاکو بتوانێـــت زەمینە بۆ ئەگەری نەبـــوون خۆشبکات پەیوەندی خۆی بەبابەتەکەوە لەناودەبات. لەم ڕووەوە، پرسیارکردن جۆرێک ڕەتدانەوە دەهێنێتە نێو جیهانەوە. درەوشانەوەی نەبوونی پێدەبینین. هەروەها، دەبینین پرسیارکەر، بۆ ئەوەی پرســـیارەکەی ئاراستە بکات، خۆی لە بوونەوە دوورەپەرێز ڕادەگرێت.

دوورەپەرێزی پرۆسەیەکی مرۆڤانەیە. لەم پرۆسەیەدا مرۆڤ نەبوون لەنێو جیهاندا بەرجەســـتەدەکات. خۆشی دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی نەبوونەوە. ئەم بۆچوونانە یارمەتیمـــان دەدەن لە واتای ئەو ڕەتدانەوانە تێبگەین، کە لەپێشـــتر ئاماژەمان بۆکـــردن. گومان لەوەش ناکرێت، ئەو ڕەتدانەوانە ڕاســـتەقینەی بەرزبن؛ دووری، بۆ نموونە شتێکە بەســـەر ئێمەدا سەپێنراوە و پێویستە ئێمە هەوڵی لەناوبردنی بدەین. ئەم ڕاستەقینانەش سروشتی تایبەتی خۆیان هەیە؛ هەموویان پەیوەندی بوونی مرۆڤ بە جیهانەوە دیاریدەکەن و لە کردەوەوە ســـەرهەڵدەدەن، کە پرۆژە یـــان چاوەڕوانیکردنی مرۆڤە. هەموویان ئەو لایەنەی بوون دەردەخەن، کە مرۆڤ خۆی پێوەخەریکدەکات. ئەم ڕاســـتەقینانە پەیوەندییان بەو پەیوەندییانەوە نییە لە ئاکامی ئەزموونەکانماندا پەیدادەبن. ئێمە باســـی ئەو پەیوەندییانە ناکەین لە ڕێگەی ئامێرەکانەوە ســـەرهەڵدەدەن و هایدیگەر بـــە وبابەتانەیان دادەنێت، کە خۆیـــان بۆ مرۆڤ دەردەخەن. هەریەکێک لە ڕەتدانەوەکان مەرجێکی پێویستە بۆ پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و ئامێرەکانی بەردەستی. بۆ ئەوەی سەرجەمی بوون، وەکو ئامێر و کەلوپەل خۆی دەربخات و بەکاربهێنرێت، پێویستە ڕەتدانەوە ببێت بە کاتیگۆری مۆرکردن بەسەر ڕێکخستن و خۆدەرخستنی بوونی هەمووشتەکانەوە. سەرهەڵدانی مرۆڤ لە ناوەڕاستی بووندا دەبێتە هۆکاری دۆزینەوەی جیهان. بەڵام خاڵی بنەڕەتی و ســـەرەکی ئەو سەرهەڵدانە ڕەتدانەوەیە. لێرەوە ئێمە بە یەکەم ئامانجـــی توێژینەوەکەمـــان دەگەین. مرۆڤ ئەو بوونەیە، کـــە نەبوون دەهێنێتە نێـــو جیهانەوە. بەڵام پرســـیارێکی دیکە یەخەمان دەگرێـــت: ئایا بوونی مرۆڤ، ئەوبوونەی نەبوون دەهێنێتە جیهانەوە، دەبێت چیٚ بێت؟

لە بوونەوە تەنیا بوون پەیدادەبێت. ئەگەر مرۆڤ سەر بە پرۆسەی پەیدابوون بێـــت، لەم بوونەوە بوونیکـــی دیکە دێتەکایەوە. ئەگەر لـــەو باوەڕەدابین مرۆڤ دەستەڵاتی پرسیارکردنی لەبارەی پرۆسەکەوە هەیە، بۆ نموونە، پرۆسەکە دەکات بە بابەتی توێژینەوە، پێویستە بتوانێت تەماشای ســـەرجەمی پرۆســـەکە بکات. پێویستـــە خۆی بە دەرەوەی بوون بگەیەنێت و بونیادی بوون لاواز بکات. بەڵام، هیشـــتا مرۆڤ دەســـتەڵاتی لەناوبردنی تەنێکی بوونی پێنـــەدراوە. مرۆڤ تەنیا توانـــای گۆڕانی بوونی هەیە نەک لەناوبردنی. بۆئەوەی مرۆڤ بوونێک لەناوبەرێت پێویستە خۆشی بەو نەبوونە بگەیەنێت. بەڵام ئەو نابێت بە بابەتی نەبوون و لە دەرەوەیدایە. نەبوون دەستی بەو ناگات چونکە ئەو خۆی بەودیو نەبوون گەیاندوە. دێکارت لەژێر کاریگەرێتی ڕواقییەکاندا ئەم حاڵەتەی بوونی مرۆڤی بە سەربەستی ناوزەدکردووە. بەڵام سەربەستی لەم بۆچوونەدا چەمکێکی ڕووتە. ئەگەر بمانەوێت زۆرتر بە دوای وەڵامی پرســـیارەکەماندا بگەڕێین، لێرەدا ناوەستین و پرسیارێکی دیکە لەخۆمان دەکەین، ئایا سەربەســـتی مرۆڤ، کە نەبوون دەهێنێتە جیهانەوە

چییه؟ مامەڵە لەگەڵ کێشەی سەربەستی بەتەواوی ناکرێت. لە وەهەنگاوانەوە تاکو ئەم قۆناخەی هەڵماننناوە ئەوە دەســـەلمێنرێت، کە سەربەستی بەشێک نەبێت لە دەروونی مرۆڤ و لەوێدا دانرابێت و ئێمەش بە تەنیا ڕایگرین و لەسەری بکۆڵینەوە. ئێمە پێناسەی مرۆڤمان کردووە، کە بوونی دەبێتە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی نەبوون. ئەمـــەش، وەکو سەربەســـتی بۆ ئێمە دەردەکەوێت. کەوابوو، سەربەســـتی ئەو مەرجەیە بۆ لەناوبردنی نەبوون و خەســـڵەتێکی چەسپاوی ناوەڕۆکی مرۆڤ نییە. پەیوەنـــدی نێوان بوون و ناوەڕۆک لە مرۆڤدا لەگەڵ پەیوەندی بوون و ناوەڕۆکی هەبووەکانی نێو جیهاندا بەراودناکرێت. سەربەستی پێش ناوەڕۆکی مرۆڤ دەکەوێت و ناوەڕۆک وەدەســـت دەهێنێت؛ ناوەڕۆکی مرۆڤ بەسەربەستییەوە هەڵواسراوە. دژوارە سەربەستی و ڕاستەقینەی مرۆڤانە لە یەکدی جیابکرێنەوە. مرۆڤ لەپێشدا پەیدانابێـــت و دوایی سەربەســـت بێت؛ جیاوازی لەنێـــوان بوونی مرۆڤ و بوونی سەربەســـتیدا نییە. مامەڵەکردنمان لەگەڵ سەربەستیدا لەم ڕووەوە بەستراوە بە پەیوەندی سەربەستی بە نەبوونەوە.

ئاشکرایە ڕاســـتەقینەی مرۆڤانە بە پرســـیارکردن خۆی لە جیهان دادەبڕێت و دەتوانێت گومان بکات. دێکارت سەربەســـتی لەســـەر زەمینەی گومان ڕاگرت و حوکمدانـــی دواخست. ئەلەین هەمان بۆچوونی دێکارتـــی هەیە. لەم واتایەشەوە هیگڵ باســـی سەربەســـتی دەکات و بە هۆشەوە گرێیـــدەدات. فەلسەفەی نوێش ئاگامەنـــدی مرۆڤ بە جۆرێک لە دەرچوون لە خـــۆوە دادەنێت، کە هایدیگەر بە بەرزێتی ناوزەدیکردوە. چەمکی مەبەســـتگەرێتی لای برینتانۆ و هوسرڵیش، تاکو ڕادەیەک واتای دەرچوونی خۆ لە خۆوە دەبەخشێت. بەڵام هێشتا ئێمە ئامادە نین سەربەســـتی بە بونیادی ناوەکی ئاگامەندی دابنێین. ئێمە لەم حاڵەتەی ئێستادا ئەو میتۆد و ئامێرانە شک نابەین، تاکو ئەم خاڵەی پێبسەلمێنین. ئارەزووەکەمان لێرەدا کاتییە چونکە پرســـیارکردن، وەکو گومانکـــردن جۆرێکە لە هەڵوێست و ڕەفتاری مرۆڤ. ئەوەش دەردەخات مرۆڤ دەتوانێت لەنێو بووندا خۆی بەرجەستە بکات و بۆ لەناوبردنیش دوورەپەرێز ڕاوەســـتێت. لەم بۆچوونەوە، هەوڵدانەکەمان بـــۆ ڕوونکردنـــەوەی شێوەی ئەو بارودۆخەیە، کـــە لەناوچوونی تێداڕوودەدات و هەمانکات لەنێو پرۆسەکاتییەکەدا دەبێت بە پەیوەندی لەگەڵ (خۆ)دا.

ژووری ئەو کەسەی دیار نییە، لاپەڕە کراوەکانی پەرتووکەکەی، ئەو بابەتانەی لەوێدا دانراون و دەستی لێداون تەنیا پەرتووک و بابەتن؛ ڕاستەقینەی پڕن. لەنێو بارودۆخی ئامادەنەبوونی ئەو کەســـەدا ئەم شتانە، بە ئاسەوار و پاشماوەی ئەو دەبینرێـــن. پەرتووکەکە و ئەو لاپەڕانـــەی خوێندراونەتەوە بە تەنیا بەبێ (پیرۆ) نابێت بـــەو پەرتووکەی پیرۆ لاپەڕەکانـــی هەڵداوەتەوە. ئەگەر ئـــەو پەرتووکە بەشتێکی دانراو (ئامادەکراو)، بە بابەتێکی دەرەکی هەستکردنم یان تێهەڵکێشەی

چەند خەسـڵەتێکی هەسـتەکی دابنرێت، ئەوا دەبێت بەو پەرتووکەی پەڕەکانی هەڵدراونەتـەوە؛ ئامـاژە بۆ خۆی، بۆ چراکەی تەنیشـتی یـان مێزەکە دەکات لەسەری دانراوە. بێسودە بەو جۆرەی ئەفلاتون، لە دایەلۆگی فیدۆدا هەوڵیبۆداوە ئامادەنەبوونی کەسێک بە هەستکردن بە بوونی گیتارەکە یان تارەکەوە دەربخەین. وێنەی ئەو کەسـە ئامادەنەبووە، لەنێو ئەندێشەماندا لە بیردۆزە کلاسیکییەکاندا بوونێکی پڕ و دیاریکراوی هەیە؛ فاکتۆرێکی سایکۆلۆجی پۆزەتیڤانە و کۆنکرێتییە. ئەو حوکمەی بەسەریا دەدەین پێویستە دووجار ڕەتدانەوەی تێدابێت: ڕەتدانەوەی خۆیـی، کە تیایدا دەردەکەوێت، وێنەکە هەسـتکردن نییە؛ ڕەتدانەوەی بابەتی، ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت پیرۆ، ئەو کەسەی من وێنەکەیم لەنێو ئەندێشەمدا دروست کردووە، لێرە نییە. ئەمە خەسڵەتێکی ناوداری وێنەکانی نێو ئەندێشەیە، کە بیریارانی دەروونناسـی لە تەیناوە بۆ سـپایەر خۆیان پێـوە ماندووکردوە. پەیوەسـتکردن، وەکو بینیمان، چارەی کێشەکە ناکات و بۆدواوە بەرەو تێڕامان پاڵمـان پێوەدەنێت. بەڵام لە هەموو حاڵەتێکـدا، پێویستی بە ڕەتدانەوە هەیە. لە شوێنێکی دیکەدا ئاماژەم بۆ ئەو خاڵە کردوە، ئەگەر وێنەی نێو ئەندێشـە بە نوێکردنەوەی هەستکردن دابنرێت، دژوارە لەخودی هەستکردن جیابکرێتەوە.[٣٢] لەنێو بونیادی وێنەی ئەندێشـەدا لەناوبردن هەیـە و لەوێدا خۆشی دەردەخات، کە بیەوێت بابەتی وێنەکە، وەکو هەبوو یان نەبوو بناسـێت. ئەندێشـە دووجار ڕەتدانەوەیە: یەکەم جار، لەناوبردنی جیهانە (چونکە جیهان وێنەیەکی ئەندێشە، وەکو بابەتێکی هەسـتەکی و ڕاستەقینە دەرناخات). دووەم جاریش، لەناوبردنی وێنەی ئەندێشەیە (چونکە بابەتەکەی هەبوویەکی ڕاستەقینە نییە). هەروەها لە دەربڕینی ئامادەنەبوونەکەی پیرۆدا بێسودە پەنا بۆ "مەبەستی پوچەڵ"ی هوسرڵ بەرین. بێگومان لەنێوان مەبەسـتەکاندا جۆرە پەیوەندییـەک بە هاندەرەکانەوە دەدۆزرێتەوە (بەڵام هاندەر هۆکار نییە). لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێک لە مەبەستەکانمان پڕ و ئەوانی دیکە پوچەڵن. لەبەر ئەوەی ئەو بابەتانەی مەبەسـتەکان پڕدەکەن ئامادەنیـن، نابن بە هاندەر و بونیادی مەبەسـتەکان. مادامەکی مەبەسـتەکانی دیکەش پڕن نابن بەهاندەری مەبەسـتە پوچەڵەکان. لەسـەرو ئەمەوە مەبەست دەروو نییە و بە شت دانانرێت. وەکو وەرگر، ئەو شتانەی پێی دەدرێ بەگوێرەی بارودۆخەکانی پڕ یان پوچەڵی دەکەن و لە ئاسـتی پڕی و پوچەڵیشدا بێ لایەن ڕادەوەستێت. دەردەکەوێت هوسرڵ نەیتوانیوە خۆی لە بۆچوونی ماتەریالیستانە ڕزگاربکات. بۆ ئەوەی پوچەڵ بێت، مەبەسـتێک پێویستە ئاگای لە خودی خۆی

٣٢ لێرەدا سارتەر ئاماژە بۆ نوسراوێکی دەکات بەناوی (ئەندێشە) لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

بێت و بزانێت، کە پوچەڵە و بابەتەکەی دەستنەکەوتوە. مەبەستێکی پوچەڵ خۆی بە پوچەڵی پێکدەهێنێت و بابەتەکەی وەکو نەبوون یان ئامادەنەبوو دەردەخات. بەکورتی، مەبەســتی پوچەڵ ئاگاییە لە ڕەتدانەوە، کە ڕوو لە بابەتێکی دەرەکی دەکات. بابەتەکەش خۆی بە نەبوو یان ئامادە نەبوو دەردەخات. بە هەر جۆرێک باسبکرێت گرنگ نییە، ئامادەنەبوونی پیرۆ، بۆ ئەوەی خۆی دامەزرێنێت پێویستی بە ڕەتدانـــەوە هەیە. لەو ڕێگەیەوە ئاگامەندی لەگـــەڵ هەموو ئامادەنەبووەکانی پێشوتردا خۆی وەکو ڕەتدانەوە دەردەخات.

ئەگەر تەماشای نێو ژوورەکە بکەم و ئەو کەسەی تیا نەبینم، کە پێشتر لەوێ بوو، جۆرێک بیرکردنەوەم لا سەرهەڵدەدات، کە هیچ شتێکی لەپێشتر سنورداری ناکات و نابێت بە هاندەری. ئەویش پچڕانی منە لە بوونەوە. چەند بە بەردەوامیش ڕەتدانەوەکان بخەمە گەڕ، تاکو هەبووەکان لە یەکدی جیابکەمەوە و مەرجداریان بکەم، بۆ نموونە، بیریان لێبکەمەوە، زنجیرەی "حاڵەتەکانی بیرکردنەوەم" دەبێت بـــە دابڕانێکی بەردەوام لەنێـــوان هۆکار و هۆکردەکاندا چونکـــە هەر یەکێک لە پرۆسەکانی لەناوبردن پێویستە ببێت بە سەرچاوەی خۆی. مادامەکی هەر یەکێک لە حاڵەتە نوێکانم درێژەپێدانی  حاڵەتەکەی پێشوە، هەر یەکێک لەو بۆچوونانەی ڕەتدانـــەوە دەهێنێتە کایەوە بەریان بەتەواوی دەگیرێت. لەبەرئەمە هەریەکێک لە پرۆســـەی دەروونی لەناوبردن کەلەبەرێکی لەنێوان ئێستا و ڕابردوودا تێدایە. ئەو کەلەبەرە نەبوونە. هەســـتکردن بـــە ئامادەنەبوونی پیرۆ، پەشیمانی لە نەبینینی ئەو لەمندا دروســـتدەکات؛ بەڵام ئەگەری لەناوبردنەکانمان لانەبردووە. بێجگە لە داپچڕانی زنجیرەی لایەنەی پۆزەتیڤەکان لە یەکدییەوە، دانانی هاندەری نەبوون بە نەبوون، چ واتایەک  دەبەخشێت؟ بوونێک دەتوانیت بۆ هەمیشە خۆی لەناوبەرێت. لـــەم حاڵەتەشدا ئەو بوونە لـــەوەش دەبورێت، کە خۆی بە بنەڕەتی دیاردەیەکی دابنێت.  ئەوەی دەمێنێتەوە باسبکرێت ئەو جیاکردنەوەیە یان خۆ نەبەستنەوەی ئاگامەندییە، کە تیایدا ڕەتدانەوە ســـەرهەڵدەدات. ئەگەر ئاگامەندی لەپێشتر بە هاندەر دابنێن، دەبینین نەبوون لەنێوان ئەو حاڵەتەی پێشـــوتر و ئێستادا خۆی دەهاوێتە ژوورەوە. داپچڕان لەنێو پرۆسەی جوڵانە کاتییەکەدا ڕوونادات. ئەمەش زۆرمان لێدەکات بۆ چەمکی کات، وەکو خاڵە لەبن نەهاتووە دابەشکراوەکان یان دابڕاوەکـــان بگەڕێینەوە. درێژبوونەوەیەکی کتوپـــڕ و توخمێکی نادیاریش نایەتە کایـــەوە تاکو، وەکو چۆن چەقۆ میوە قاش دەکات، ئەمیش ســـاتەکانی ڕابردوو لە ســـاتەکانی ئێستا دانەبڕێت. هاندەرە بە ئاگاکەی پێشوش لاواز ناکات، بەڵکو بەبێ گـــۆڕان دەمێنێتەوە و هیچ وناکات. ئەوەی ڕابردوو لە ئێستا جیادەکاتەوە هیچە. ئەم هیچە (نەبوونە) لەبەر ئەوەی هیچە بێ هەستە. لەگەڵ لابردنی هەموو کۆســـپێکدا شتێکی پۆزەتیڤ هەیە، کەلا دەبرێت. ئەو ئاگاییەی لەپێشترە لەوێ

هەیە. لەگەڵ ڕاڤەکردنەکەی ئاگاییەکەی ئێستادا پەیوەندی دروســـتدەکات. بەڵام لەسەر ئەم پەیوەندییە بوونگەرانەیەوە، لەنێو کایەکەدا دەردەچێت و خۆی ناخاتە نێو کەوانەکە، وەکو ئەوانەی فینۆمینۆلۆجییانە دەڕواننە دەرەوە جیهان دەخەنە نێو کەوانەوە. لەم ڕوانینەدا جیهان لە ناوەوە و لە دەرەوەی ئەویشدایە. ڕاستەقینەی مرۆڤانە دەتوانێت نکۆڵی لە جیهان یان بەشێکی بکات چونکە نەبوون لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێـــت و ئەو نەبوونەش ڕابردووی لە ئێستای جیادەکاتەوە. بەڵام هێشـــتا ئەم باســـە تەواونەبـــووە. ئەو نەبوونەی لیرەدا دەیبینیـــن واتای تەواوی نەبوون نابەخشـــێت؛ هەڵواســـینی ئەو بوونەی هێشـــتا ناومان بۆ دانەناوە و ئاگاشی لە هەڵواسینەکەی نییە لە دەرەوەماندایە. ئەم لایەنە تاریک و نادیارەش لە ناخی ئەم ڕووینەدا دەبێت بە دوو کەرتەوە. هەروەها ئەم هیچە نابێت بە نێگەتیڤ. نەبوون، بەو شێوەیەی لەسەرەوە بینیمان، زەمینەی ڕەتدانەوەیە چونکە ڕەتدانەوەی لەنێو خۆیدا شاردۆتەوە، وەکو بوونیش خۆی دەبینێت بەڕەتدانەوە. لەم ڕووەوە پێویستە بوونێکی ئاگامەند بە هۆکاری نەبوونەوە خۆی لە ڕابردووی جیابکاتەوە. پێویستە لە بوونی ئەو کەلەبەرە بە ئاگا بێت. ئەو کەلەبەرەش دیاردەیەکی ئەزموونەکانی نییە، بەڵکو بونیادی ئاگامەندییەکەیەتی. سەربەســـتی لەوێدایە مرۆڤ ڕابردووی خۆی لەگـــەڵ بەنهێنی کردنی نەبوونـــدا بخاتە ئەولاوە. ئەمـــەش باروودۆخێکی دەروونی نییە. چەند جارێک یان ئەو کاتە سەرهەڵدەدات، کە ئاگامەندی دەیەوێت نکۆڵـــی لە شتێک بکات یان لێی بکۆڵێتـــە. ئاگامەندی بەردەوام خۆی بەو بوونە دادەنرێـــت، کە لـــە ئەزموونەکانیدا ڕابردووی لەناودەبات. لەوانەیە کەســـێک لەو باوەڕەدابێـــت، لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا هاوڕانەبێت و ئـــەو ناڕەزاییە دەربڕێت، کە خۆمان جارێک باســـمانکردوە: ئەگەر ئەو ئاگامەندییەی شتێک لەناودەبات، وەکو ئاگامەندی لەناوبەر خۆی دەرخات دەتوانین پێناســـەیەک بۆ ئاگامەندی دابنێین و بەردەوام شێوازی ئاگامەندیمان نیشانبدات. ئەویش ئاگامەندی لەناوبردنە. ئایا ئەم ئاگامەندییە هەیە؟ لێرەادا پرسیارێکی نوێمان لێکراوە: ئەگەر سەربەستی شێوازی بوونـــی ئاگامەندی بێت، ئەوا پێویستە ئاگامەندی، وەکو ئاگامەندی سەربەســـتی هەبێت. ئاگامەندی سەربەستی چ شیوازێکی هەیە؟ لە سەربەستیدا مرۆڤ دەبێت بە ڕابردووی خۆی (هەروەها داهاتوش) لە شێوازی لەناوبردندایە.

ئەگەر توێژینەوەکەمان ســـەرمان لێنەشێوێنێـــت، پێویستە مرۆڤ بۆ ئەوەی دژی ڕابردوو داهاتوی خۆی ڕاوەستێت، خۆی ئەو ڕابردووە و داهاتوە بێت دەبێت بتوانین وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە و بڵێین؛ لە دوودڵیدا مرۆڤ سەربەستییەکەی خـــۆی دەدۆزێتەوە یـــان ئەگەر تۆ حەزبکەیت دەڵێم، دوودڵـــی، وەکو ئاگایی لە بوونەوە، شێوازی بوونی سەربەســـتییە. سەربەستی لەنیو دوودڵیدایە. پێویستە دان بەوەدابنێیـــن، کە کیرکیگارد ڕاســـت بۆ کێشـــەکە چـــووە؛ دوودڵی و ترس

دوو شتـــی جیاوازن. ترس بـــە بابەتەکانی نێو جیهانەوە بەســـتراوە. دوودڵێش مـــن لەبەردەم بوونی خۆمدا ڕادەگرێت. ســـەرگێژی تاکو ئـــەو ڕادەیە دوودڵێیە، کە من لەوە ناترســـم بەســـەرشتێکدا بکەوم، بەڵکو خۆم بەسەرییدا بدەم. ترس لەوێدا ســـەرهەڵدەدات، کەمـــن بزانم ژیانم گۆڕانی بەســـەردا دێت و گۆڕانەکەش هۆکارێکی دەرەکی هەیە. دوودڵێش لە وونکردنی باوەڕ بەخۆم و هەڵچونمە لەنێو حاڵەتێکدا. تۆپباران ترس لە لای سەربازێک دروستدەکات، بەڵام دوودڵی لە لای سەربازەکە لەوێدا دێتەکایەوە، کە پێش تۆپبارانەکە بیردەکاتەوە، چ هەڵوێستێکی هەبێت. پرســـیاری 'خۆڕاگرتن' لە خۆی دەکات. بەهەمانشـــێوە ئەوەی لە کاتی جەنگدا دەکرێت بە سەرباز لە هەندێک حاڵەتدا لە مردن دەترسێت، بەڵام زۆربەی کات"لەوە دەترسێت، کە دەترسێت". ئەو لە ئاستی بوونی خۆیدا دوودڵە. زۆرجار ئەو حاڵەتانەی هەڕەشەکەرن بەڕیز سەرهەڵدەدەن. هەندێک جار بە ڕێگەی ترس و جاری دیکەش دوودڵییەوە هەســـتیان پێدەکرێت. ئەمە دەکەوێتە ســـەر ئەوەی مرۆڤ چـــۆن دەیبینێ و هەڵوێست بەرانبەری چـــۆن وەردەگرێت. ئەوەی توشی ڕووداوێکـــی ناخۆش بووە، بۆنموونـــە لە ڕووداوێکی ئۆتومبیلدا تەندروســـتی لە دەســـتداوە یان لە هەژاری دەترســـێت، دوایی توشی دوودڵی دەبێت و لە خۆی دەپرســـێت: "دەتوانم چی بکەم؟ من چ دەتوانم بکـــەم"؟ لەم حاڵەتەدا ترس و دوودڵی دەبن بە دوو شتی جیاواز. ترس هەستکردنە بە بابەتە هەڕەشەکەرەکەی دەرەوە بەبێ بیرکردنەوە. دوودڵێش بیرکەدنەوەیە لە خۆ؛ یەکەمیان بە لەناوچوونی دووەمیـــان لە دایک دەبێت. لەم نموونەیەدا هێنامانەوە هەر یەکێک لەوان دەچنە نێو یەکدییەوە. حاڵەتیش هەیە، کە تەنیا دوودڵی لەئاســـتیدا ســـەرهەڵدەدات و تـــرس نابێت بەهاوبەشی. ئەگەر من کارێکی نـــوێ و گرنگم پێبسپێدرێت دوودڵ دەبـــم لەوەی مـــن بتوانم ئەو کارە بکەم یـــان نا. هەمانکات لەوە ناترســـم، کە ســـەرکەوتو نەبم. واتای دوودڵی لەو نموونانەی سەرەوەدا چییە؟ با بگەڕێینەوە بۆ نموونەی ســـەرگێژی. ســـەرگێژی بە ترســـەوە پەیدادەبێت. من بە شوێنێکی باریـــک و بەرزدا دەڕۆم بێ ئەوەی بتوانم دەســـت بە شتێکەوە بگرم. هەڵدێرەکە بە جۆرێک خۆی دەردەخات ، کە من دەبێ لێی دووربکەومەوە؛ مەترســـی مردن دەخاتـــە بەرچاوم. هەمانکات، من چەند هۆیەک دەبینـــم، کە ئەو مردنە دەکەن بە ڕەەداوێکی ڕاســـتەقینە؛ دەکەومە سەر بەردێک یان ناوچاڵێکەوە؛ زەوییەکەی ژێرپێـــم هەرەس دەهێنێ و دەکەومە خـــوارەوە. لەگەڵ ئەم جۆرە بیرکردنەوە و چاوەڕوانیانـــەدا مـــن خۆم وەکو شتێک دەبینم لەبەردەم ئـــەم ئەگەرانەدا چالاک نیـــم، کە لە دەرەوە بەرەو ڕووی مـــن دێن. هەروەها منیش بابەتێکی نێو جیهانم و یاسای ڕاکێشـــان بەسەرمدا چەســـپاوە. هەموو ئەم چاوەڕوانیانە ئەگەرەکانی بەردەم منن. لەم ســـاتەدا ترس لەلام سەرهەڵدەدات چونکە من، وەکو بابەتێکی

بەرەونەمـــان چوو لەنێو بابەتەکانی دیکەی جیهانـــدا دەبینم، کە خۆی نەبوە بە هۆکاری لەناوبردنی داهاتوی. بیر لە بەردەلانییەکەی خوارەوە دەکەومەوەو خۆم لە قەراخەکە دووردەخەمەوە. بە هەموو دەســـتەلاتێکەوە هەڕەشەکە لەسەر خۆم لادەبەم و چەند هەڵوێستێک بۆ ئەم مەبەســـتەش دیاریدەکەم. ئەم هەڵوێستانە ئەگەرکانی منن. من خۆم لە ترسەکە لە ڕێگەیانەوە دووردەخەمەوە.

لەبەرئـــەوەی ئـــەم هەڵوێستانە ئەگەرەکانی منـــن، وادەردەکەوێت هۆکارێکی بێگانەیـــان نەبێت. دڵنیانیم لـــەوەی کاریگەرێتی یان بوونێکی ســـەربەخۆشیان هەبێـــت. لێرەدا دەتوانین گوتەکەی بارکلی بگۆڕین و بڵێین "بوونیان ڕاگیراوە" و "ئەگەری بوونیان پێویستە ڕابگیرێـــت". ئەمەش ئەگەرەکان، وەکو بارودۆخێکی پێویست دەکات بە هەڵوێستێکی ڕەتدانەوە (مەبەست لەوە نییە ئاوەڕ لە بەردەکان نەدرێتەوە، شەقامەکە نەبینرێت، ڕا بکەیت یان بیر لە شتێکی دیکە بکەیتەوە یان هەڵوێستێک بەپێچەوانەی ئەمانەوە، بۆ نموونە خۆت فڕێبدەیتە نێو کەندەلانەکەوە وەرگریت. ئەو ئەگەری دەمەوێت بیگۆڕم بۆ ئەگەرێکی کۆنکرێتی لەنێو بەســـتنی لۆجیکانەی هەموو ئەگەرەکانەوە ســـەردەردێنێت. ئەگەرە ڕەتدراوەکانیش بێجگە لەوەی بوونیان ڕاگیراوە چی دیکە نین. منیش بوونیان ڕادەگرم. بە پێچەوانەشەوە نەبوونیان دەکـــەم بەوەی پێویست نەکات ڕابگیرێـــت. هۆکارێکی دەرەکی لایان نابات. من تەنیا سەرچاوەیەکی نەبوونی ئەوانم و لە ڕێگەی خۆخەریکردنی منەوە ســـەرهەڵدەدەن یان من دەبم بە هۆکاریـــان. ئەگەر من لە پەیوەندییەکانمان بەم هەڵوێستانـــەوە خۆم، وەکو ئەو هۆکارە ببینم، کە هۆکردەیەکی لێوە دەردەچێت دوودڵی لەلام پەیدانابێت. هۆکردەکە، کە ئەگەرێکی منە لەژێر دەستەلاتی مندایە. بـــەلام لە ئەگەری دەکەوێـــت و دەبێت بەوەی "خەریکـــە ڕوودەدات" ئەگەر من حەزبکەم خۆم توشی دوودڵی و ســـەرەگێژە نەکەم. مـــن لەوێدا توشی دوودڵی دەبم، کە هەڵوێستەکانم ئەگەرەکان بن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، لە کاتێکدا من هەموو هاندەرەکان کۆدەکەمەوە و بـــۆ دوورخستنەوەی حاڵەتەکە بەکاریدەهێنم تێدەگـــەم، کە کاریگەرێتی تەواویان نییە. لەو ســـاتەشدا، ئەو کاتەی من بوونی خۆم لە ترسدا دەبینم تێدەگەم ترسەکە پەیوەندییەکی دیاریکراوی بە هەڵوێستی منەوە نییە. لە لایەکەوە ترسەکە داوای خۆپاراستن لە من دەکات و خۆی دەکات بە هێڵکاری نەخشەیەکی لەپێشتر بۆ خۆپاراستنەکە؛ لە لایەکی دیکەوە ترسەکە دوا ڕوخساری هەڵوێستەکەم دەردەخات چونکە من هەڵوێستەکە بە هۆکار دانانێم و بە پێویستی دەزانم.

لێـــرەدا بۆمان دەردەکەوێـــت ئاگایی لە بوونەوە بوونی ئاگاییە. پرســـیار لە بارەی بیرکردنەوەوە پاش ســـەرهەڵدانی ترسەکە ناکەم. بوونی ترسەکە بە خۆی دەردەخات "هۆکار نەبێت" بۆ ئەو هەڵوێستەی بەرانبەری ڕادەوەستێت. نەترسان،

کـــە داهاتوویەکی بەرزم بۆ دیاریدەکات، دیاریکراوە. مـــن لەم حاڵەتەدا پەنا بۆ بیرکردنەوە دەبەم، بەڵام بیرکردنەوەکە داهاتوویەکی دیاریکراو بۆ من دەرناخات. لـــە دامەزراندنی هەڵوێستێکدا، وەکو یەکێک لە ئەگەرەکان من دەزانم هیچ شتێک زۆر لـــە من ناکـــات ئەو هەڵوێستـــە هەڵبژێرم. هەمانکات من خـــۆم بە داهاتوو گەیانـــدووە. من بۆ ئـــەوەی بەو بوونە بگەم هەموو هێـــز و تەوانام بەکاردەهێنم و ڕێگاکـــەم دەگۆڕم. لێرەوە پەیوەندی نێوان بوونـــی ئێستام و بوونی داهاتووم دروســـتدەبێت. بەڵام نەبوون خۆی خزانۆتە نێـــو پەیوەندییەکەوە؛ من ئەو خۆیە نیم، کە لە داهاتوودا پەیدادەبێت.

یەکەم، چونکە (کات) لەنێوان من و ئەودایە. دووەمیش، منی ئێستا بناخەی منی داهاتوو نییە. دواجاریش، من ئەو خۆیەی داهاتوو نیم چونکە هیچ هەبوویەکی ڕاســـتەقینە حوکم بەسەر ئەوەدا نادات. من لە داهاتوودا چۆن دەبم. هێشتا، من ئەوەم، کە لە داهاتوودا دەبم (ئەگینا حەزم لە هیچ شتێک نەدەکرد)، من ئەو (خۆ) یـــەم، کە لە داهاتوودا دەبم بەو بوونەی ئێستا نییە. لە ترســـدا ڕوو لە داهاتوو دەکەم. ترس لەنێو پرۆژەی داهاتووشمدا خۆی لەناودەبات. دوودڵیش، بە تەواوی، لە شێوەی نەبووندا ئاگاییە لە داهاتووم. لەناوبردنی ترس، وەکو هاندەر هەڵوێستە پۆزەتیڤەکانی دیکەش دەردەخات (من دەتوانم خۆم فڕێبدەمە نێو کەندەڵانەکەوە) و بـــە ئەگەرێکـــی نێو ئەگەرەکانی دابنێم. ئەگەر هیـــچ شتێک وام لێنەکات خۆم ڕزگـــار کەم، هیچ شتێکیـــش ڕێگەم ناگرێت خۆم هەڵدەمە نێـــو کەندەڵانەکەوە. هەڵوێستێکی بڕیاردراو لە منەوە بەرجەســـتە دەبێت، کە هێشتا پەیدانەبووە. ئەو منەی ئێستا هەم پشـــت بەو منە دەبەستێت، کە هێشتا پەیدانەبووە. ئەو منەی پەیداش نەبووە پشت بە منی ئێستا نابەستێت. سەرگێژی لە ئاکامی ناسینەوەی ئـــەم پەیوەندییە [لە نێوان دوو منەکەدا] پەیدادەبێت. لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی کەندەڵانەکەدا من لە قوڵایی ناخمەوە بە دوای خۆمدا دەگەڕێم و یاری بە ئەگەرەکان دەکەم. تەماشای قوڵـــی کەندەڵانەکە دەکەم، بیر لە کەوتنەخوارەوە دەکەمەوە؛ هەمـــان کات خۆکوشتنیش دەبێت بە یەکێک لە ئەگەرەکان (خۆ کوشتن کۆتایی بەدوودڵـــی دەهێنێت). خۆشبەختانە، هاندەوەکـــان خۆیان کاریگەرانە دەرناخەن و پاڵ بەمنەوە نانێن، خۆم بکوژم و ترســـم، من لـــە کەوتنیش دەپارێزێت. ئەم لایەنەیـــە دژی دوودڵی ڕادەوەســـتێت و لەگەڵ ســـەرهەڵدانی بڕیارێکی نادیاردا کۆتایی بە دوودڵی دەهێنێت. بڕیاری نادیار داوای بڕیاردانمان لێدەکات و لەپڕێکا خۆم لە کەناری کەندەڵانەکە دووردەخەمەوە و دەڕۆم. نموونەکەی بەردەســـتمان دوودڵی، وەکو "دوودڵی لە ئاســـتی داهاتوودا" نیشاندا. جۆرێکی دیکەی دوودڵی هەیـــە: کە دوودڵی لە ئاســـتی ڕابردوو پێدەوترێـــت. قومارچییەک پاش ئەوەی سەربەستانە و دڵسۆزانە بڕیاردەدات واز لە قومارکردن بهێنێت، ئەو کاتەی نزیک

مێزی قومارکردن دەبێتەوە بڕیاردانەکەی پێشـــوی بەتاڵ دەکاتەوە. ئەم دیاردەیە ئـــەوە ڕووندەکاتەوە لەگەڵ نزیک بوونـــەوە لە مێزی قومارکردنەکە جۆرە مەیل و ئارەزوویەک لـــە ناخدا دەوروژێت، کە لەگەڵ بڕیاردانی پێشـــودا بۆ وازهێنان لە قومارکردن دەکەوێتە ناکۆکییەوە. ئەم ڕوونکردنەوەیە تاکو ڕادەیەک ماتیریەلیستانە لە کێشـــەکە دەدوێت. خەڵکی لە ڕێگەی دیکەشەوە دژی قومارکردن ڕادەوەستن، بۆ نموونە (لە ڕێگەی ئاکاری و گوتە ناودارەکەی دەڵێت، هۆش و ســـۆز دەکەونە زۆرانبازی)، ئەمە هۆکارەکان ناخوێنێتەوە. لەڕاستیدا، نامەکانی دۆستۆیڤسکی بۆ ئەمە بەڵگەن. هیچ شتێک لە بوونی ئێمەدا، وەکو مشتومڕی ناوەوەی دەروونمان نییە، کە پێـــش بڕیاردانمان دەردەکەوێت. بڕیاردانەکەی پێشـــو بۆ وازهێنان لە قومارکردن هەمیشـــە لەوێ یە. لە زۆربـــەی حاڵەتەکاندا، کە قومارچییەکە نزیک مێـــزی قومارکردنەکە دەبێتەوە لەوە دەچێـــت داوای یارمەتی لێبکات. ئەو حەز لـــە قومارکـــردن ناکات یان ڕۆژێـــک لەوەوپێش بڕیـــاری داوە واز لە قومارکردن بهێنێت. خۆی دەردەخات حەز لە قومارناکات و لەسەر بڕیارەکەی سوربێت. بەڵام لـــە دوودڵییدا لاوازی بڕیاردانەکەی دەدۆزێتـــەوە. بڕیارەکە لە منەوە دەرچووە و منیـــش بەردەوام ئاگام لە بوونی خۆمە و خۆم لەنێو جوڵان و گۆڕانە کاتییەکاندا دەناســـمەوە. هەمانکـــات، من خۆم نیـــم چونکە بووم بە بابەتـــی ئاگامەندی بۆ خۆم. بڕیاردانەکە هێشـــتا بەرقەرارە و لەشێوەی نەبووندا دەبێت بە (من). ئەوەی قومارچییەکە هەســـتیپێدەکات دابڕانێکی هەمیشەییە لە ناچاربووندا؛ ئەو نەبوون لە خودی خۆی جیادەکاتەوە؛ مـــن نامەوێت قوماربکەم، دوێنێ بۆم دەرکەوت چ ئاکامێکـــی خراپی هەیە (ماڵ وێرانی، گلەیی خـــزم و کەس) ڕێگەی قومارکردنم لێدەگـــرن. لەوە دەچێت دیوارێکم لەنێوان قومارکـــردن و خۆمدا بەرزکردبێتەوە. ئێستا، لەپڕ بۆم دەردەکەوێت تێگەیشتنەکەی پێشو بووە بە بیرۆکە و چۆتە نێو بیرەوەریمەوە. بۆ ئەوەی جارێکی دیکە تێگەیشتنەکەم [لەزیانەکانی قومارکردن] فریـــام بکەوێت پێویستە سەربەســـتانە لە نێو هیچەوە دروســـتی بکەمەوە.[٣٣] قومارنەکردن یەکێکە لە ئەگەرەکانم و قومارکردنیش ئەگەرێکی دیکەیە. پێویستە ترس لە ئیفلاسبوون یان بێزاری خێزانەکەم و هتد.، بکەم.

پێویستە ئەزموونی ئەو ترســـە لە ناخمدا زیندووبکەمەوە و هەستبکەم، وەکو دێوەزمە لەپشـــتەوە شوێنم دەکەوێت. پاش هەڵبەســـتنی ئەم دیوارە و چەقین لەنێـــو بازنـــەی بڕیاردانەکەمدا بە دوودڵییەوە تێدەگەم هیـــچ شتێک نییە من لە قومارکردن دووربخاتەوە. من دوودڵییەکـــەم چونکە، وەکو مرۆڤێکی ئاگامەند لە بـــوون خۆم ناکەم بـــە ڕابردووی بڕیارە چاکەکان، کە خـــودی منن. ڕەتدانەوەی بنەچـــەی دوودڵییەکـــەش، وەکو نەزانینـــی بارودۆخە دەروونییەکـــان بێسودە.

٣٣ *ex nihilo* وشەیەکی لاتینییە واتای (لە هیچەوە) دەبەخشێت. (وەرگێڕ)

بەگوێرەی ئەم بۆچوونە، دوودڵییەکەم لە کەمی زانینەوە سەرهەڵدەدات و تاریکی نێــو ئەودیو ئاگاییم حوکم بەســەر کردەوەکانمدا دەدات. ئێمــە بۆ وەڵامدانەوە پێویستە لەپێشــەوە بیسەلمێنن دوودڵی بۆ سەربەستی مرۆڤ نەبووە بە بەڵگە. سەربەســتی، وەکو بارودۆخێکی پێویست بۆ پرسیارکردن بۆ ئێمە ئامادەکراوە. ئێمــە ویستمان ئاگاییەکی دیاریکراو لە سەربەســتی دەستنیشــان بکەین. لەم بۆچوونەشەوە ناچارەکی ســایکۆلۆجی سەرنجامەکەمان بەتاڵ ناکاتەوە. بێگومان دوودڵــی دەبێت یەکێک لەم دووانە بێت؛ نەناســینەوەی ناچاربوونێکی نەزانراو، کە دوودڵی تێدا دەبێت بە سەربەســتی یان دەڵێین دوودڵی ئاگاییە لە بوون و هۆکارە ڕاستەقینەکانی هەڵوێست و کردەوەکانمان ناناسێت. لە حاڵەتی دووەمدا دوودڵی لە ســەرچاوەی هەستکردن بە مەترسی یان شتێکی چاوەڕوان نەکراوەوە و هاندەرێکی گەورەوە سەرهەڵدەدات و لە ئاکامیشدا توشی هەستکردن بە ئازاری ویژدانیمــان دەکات. لەم حاڵەتەدا خۆمان لەنێو جیهاندا، وەکو شتەکان دەبینین؛ خۆمان بە بابەتێکی بەرز دادەنێین. دوودڵی وندەبێت و ڕێگە بۆ ترس خۆشدەکات، چونکە ترس پێکهاتەی بابەتە بەرزەکەیە، وەکو شتێکی ترسناک.

ئەم سەربەســتییەی لەنێو دوودڵیدا دەردەکەوێــت پەیوەندی بەو نەبوونەوە هەیە، کە خۆی دەخزێنێتە نێوان هاندەر و کردەوەکانمانەوە. مەبەست لەوە نییە مادامەکی من سەربەســتم کردەوەکانم ناکەونە ژێــر کاریگەرێتی هاندەرەکانەوە بەڵکو بــە پێچەوانەوە، بونیادی هاندەرەکان دەبێت بــە بارودۆخێکی ناکاریگەر بۆ سەربەســتییەکەم. ئەگەر کەســێک پێمان بڵێت نەبــوون دەبێت بە بناخەی سەربەستی لە وەڵامدا دەڵێین، ناتوانین باسیبکەین، چونکە ئەو بناخەیە نەبوونە. ئەوەندەمــان لە دەســت دێت ئاماژە بۆ واتاکەی بکەیــن و بڵێین ئەو نەبوونە لە ڕێگەی بوونی مرۆڤ و پەیوەندی ئەو بوونە بەخۆیەوە پەیدابووە.

لێرەدا نەبوون پێویستییە بۆ سەرهەڵدانی هاندەر، وەکو هاندەرێک و پەیوەست بە ئاگایی بە هاندەرەوە. بە کورتییەکەی، هەر کاتێک دەست لە ناوەڕۆکی ئاگامەندی هەڵگرین دەبینین لەنێو ئاگامەندییدا هیچ هاندەرێک نییە؛ هاندەرەکان شتێکن بۆ ئاگامەندی. لەبــەر ئەوەی هاندەر، وەکو دیاردە خۆی دەردەخات ناکاریگەرانەش دەوری خــۆی دەبینێت. بێگومان شتێک نییە بوونێکــی دەرەکی لەنێو شوێن و کاتدا هەبێت؛ هەمیشە سەر بە جیهانی ناوەوەیە و وەکو شتێک بۆ من و لە مندا دەبینرێت. هاندەر خەســڵەتی لە ناوەوەدایە و بەرزیشــە. ئاگامەندیش نابێت بە بابەت بۆ هاندەر چونکە ئاگامەندی هاندەر دەهاوێتە دەرەوە و گرنگی و واتاکەی دەخاتە ڕوو. ئەو نەبوونەی ئاگامەندی و هاندەر لە یەکدی جیادەکاتەوە خەسڵەتی بەرزێتی لە ناوەوە هەیە. ئاگامەندی، وەکو شتێکی ناوەکی ســەرهەڵدەدات و ئەو نەبوونــە لەناودەبات، کە ئاگامەندی بە بوونێکی بــەرزی دادەنێت. دەبینین ئەو

نەبوونەی دەبێت بە بناخەی هەموو ڕەتدانەوە بەرزەکان لە ڕێگەی ڕوونکردنەوەی دوو جۆر لەناوبردنەوە واتاکەی دەردەکەوێت:

١. ئاگامەنـــدی نابێت بە هاندەر بۆ خـــۆی چونکە بەتاڵە و ناوەڕۆکی نییە. ئەمەش لەناوبردنی بونیادی کۆجیتۆی پێش تێڕامانە.

٢. ئاگامەنـــدی بەرانبەر ڕابـــردوو، هەروەها داهاتووی خـــۆی، وەکو نەبوون ڕادەوەستێت. ئەمەش ئاماژە بۆ لەناوبردنی بونیادی کات[کاتیگەرێتی] دەکات.

ئێستا ناتوانین واتاکانی ئەم دوو جۆرە لەناوبردنە باسبکەین چونکە ڕێگەیەکمان نەدۆزیوەتەوە و هیچمان لەبەردەســـتدا نییە یارمەتیمان بدات. پێویستە ئەوەندە بزانین، کە باســـکردن لەسەر ڕەتدانەوە پەیوەندی بەتێگەیشتن لە خۆ—ئاگایی و کاتەوە [کاتیگەرێتییەوە] هەیە.

ئەوەی گرنگە ئاماژەی بۆ بکەین سەربەستییە، کە لەدوودڵیدا بەرجەستەدەبێت و بەردەوام پەیوەندی بە نوێبوونەوەی (خۆ)وە هەیە. لە پێشتر باسمانکرد، دوودڵی لەگەڵ هەموو ئەگەرەکانی بووندا ســـەرهەڵدەدات چونکـــە بەردەوام بوونی ئەو ئەگەرانە بە منەوە بەســـتراوە. ئەگەر قومارچییەکە هەڵوێستێکی نوێ بۆ (خۆ)ی بدۆزێتەوە و قومارنەکات پێویستە بزانێت، کە (خۆ)ی خستۆتە نێو هەڵوێستەوە. ئەم (خۆ)یـــە بە هەموو ناوەڕۆکەکانی پێشـــویەوە و لە مێژوودا ناوەڕۆکی مرۆڤە. دوودڵـــی، کە بەرجەســـتەبوونی سەربەســـتییە لە ئاســـتی (خۆ)دا دەریدەخات. نەبوونیـــش بوە بە هۆکاری جیابوونەوەی بوونـــی مرۆڤ لە ناوەڕۆکییەوە. هیگڵ ئەم خاڵەی بەمجۆرە دەربڕیوە:

نـــاوەڕۆک ئـــەو شتەیـــە، کـــە هەیـــە *wesen ist was gewesen ist*

ناوەڕۆک ئەو شتانەیە لە بوونی مرۆڤدان. دەتوانین بە وشە دەریان بڕین و بڵێین، هەن. لەبەر ئەم هۆکارە ســـەرەنجامی ئەو خەســـڵەتانەیە، کە واتای کردەوەکان بە دەســـتەوە دەدات. بـــەڵام کردەوە لەودیو ناوەڕۆکەوەیـــە، چونکە ئەو کاتەی دەڵێیـــن ئەو شتە هەیە، دەبێت بەوەی مرۆڤ پەیدای کردووە و دەســـتیکەوتوە. مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا جۆرە تێگەیشـــتنێکی هەیە، کە بە ڕێگەی دەســـتەواژەکان و حوکمدانـــەوە پێش دەربڕینی ناوەڕۆکـــی دەکەوێت. ئەمەش بوونی مرۆڤ لە ناوەڕۆکـــی بە هۆکاری نەبوونەوە لە یەکدی جیادەکاتەوە. ناوەڕۆک بوونی مرۆڤ لەناوەوە بەوشتانە دادەنێت، کە هەیەتی.

لێـــرەدا دوودڵی، کە بـــەردەوام خۆی لـــەو شتانە جیادەکاتـــەوە دەبێت بە تێگەیشـــتن لە (خـــۆ). ئێمە هەرگیز ناتوانین ژیان بـــەوە دابنێین، کە لە ئاکامی خۆرسکێکی پێدراوەوە پەیدا بووبێت.[٣٤] هەڵچونی بەردەوامی ئاگامەندیمان ئەو خۆرسکە پێکدەهێنێت. هەروەها بەردەوام لە دوای ئێمە دەمێنێتەوە و لە ناخماندا

٣٤ *Erlebnis* وشەیەکی ئەڵمانییە دیلتی و هایدیگەریش بەکاریان هێناوە.(وەرگێڕ)

جێنشین دەبێت و دەبێت بە بابەتی ئاوەڕدانەوەمان. ئەم خۆرسکە سەرچاوە نییە و شتێکە داوایەدەکەین بۆیە لە دوودڵییدا دەدۆزرێتەوە، لە دوودڵییدا سەربەستی بەردەوام خۆی ڕادەگیرێت و دەردەکەوێت، هیچ شتێک پەیوەستی نەکات. لەوانەیە هەندێک بڵێن ئێمە دوودڵییمان بە بونیادی نەبڕاوەی بوونی مرۆڤ پێناسەکردوە؛ ئەگەر دوودڵی سەربەستی بەرجەستەبکات ئەوا دوودڵی بارودۆخی نائاساییە.

چۆن ئێمە بتوانین باسی نائاسایی دوودڵی دەبێت بە شتێکی نەبڕاوە و لە کۆتایی بەدەر. بە پێچەوانەی ئەمەوە بکەین؟ پێویستە بزانین لە زۆربەی حاڵەتەکانی ژیانماندا، ئەو حاڵەتانەی بەسەر هەموو کەسێکدا دێن، ئێمە ئەگەرەکانی ژیانمان بەبێ سەرهەڵدانی دوودڵی دەناسین. دوودڵی، لە ڕاستیدا ناسینەوەی ئەگەرێکە، وەکو ئەگەری من؛ کاتێک ئاگامەندی هەستدەکات نەبوون لە ناوەڕۆکی خۆی دابڕیوە یان سەربەستانە لە داهاتووی جیابۆتەوە دوودڵی تیایدا سەرهەڵدەدات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەو نەبوونە لەناوبەرە هەموو بیانوەکانم دەسڕێتەوە و پڕۆژەی داهاتووم بووە بە ئەگەرێک چونکە ئەو داهاتووەی من دەمەوێت پێی بگەم هێشتا نەبووە بە بەشێک لە من. لەم حاڵەتانەدا مامەڵە لەگەڵ کاتدا دەکەم و خۆم بەرەو داهاتوو دەبەم، لەوێدا من "ژوانێک لەدوا کاتژمێری ئەو ڕۆژەدا یان کۆتایی ئەو مانگە" بۆ خۆم دادەنێم. دوودڵی ترس کردنە لەوەی من. نەتوانم ژوانەکە دابنێم و بەو کاتە بگەم، کە تیایدایە. هەروەها بە هەندێک کاریش هەڵدەستم. کە ئەگەرەکان کتوپڕ دەخەنە بەردەمم. لە داگیرسانی جگەرەکەمدا کتوپڕ ئەگەرەکە دەناسم، کە حەزکردنە لە جگەرەکێشان. ئەو کاتەی دەست دەدەمە پاندانەکە و لاپەڕە سپییەکان بەرەو لای خۆم ڕادەکێشم ڕاستەوخۆ دەزانم دەمەوێت کار لەسەر نوسینی ئەم پەرتووکە بکەم. ئەم کارانە لەم حاڵەتانەدا ئەگەری منن چونکە دەتوانم دەستیان لێهەڵگرم. لاپەڕەکان بخەمە لاوە و سەری پاندانەکەشم دابخەم. بەڵام وازهێنانەکە، هەمانکات لەبەر ئەوەی کارەکە، کە خۆی لە ڕێگەی منەوە دەردەخات، وەکو شتێکی بەرزە و تاکو ڕادەیەکیش سەربەخۆیە. ئاگامەندی مرۆڤ لە کارکردندا تێڕامانی نییە. ئاگاییە لە شتێکەوە. ئەو شتە بەرزەی خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات خەسڵەتێکی دیاریکراوی خۆی هەیە. بونیادێکی پێویستی لەنێو جیهاندا هەیە. جیهانیش لە ڕێگەی ئەوەوە ئاڵۆزی پێکهاتنی کەلوپەل و ئامێرەکان نیشاندەدات. لەنێو نامەکانی مندا ئەو ڕستەیەی هێشتا نەنوسراوە شتێکە پێویستە بنوسرێت. لەگەڵ نامە نوسیندا پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی کەلوپەلەکانیش (پاندان، مەرەکەب، کاغەز، دێر، پەراوێز، و هتد)لە چواردەورم ئامادەدەبێت. لە ژیانی گشتی ڕۆژانەمدا، خۆم بە کارەکانەوە خەریک دەکەم، لەگەڵ هەستان بە کارەکانم ئەگەرەکانم دەدۆزمەوە و بە پێویستیان دادەنێم و کەلوپەل و ئامێرەکانم لا ئاشکرا دەبن.

بێگومـــان لەگەڵ هەموو کارکردنێکدا دەتوانرێت پرســـیار لە بارەی کارەکەوە بکرێـــت و لـــە ئاکامەکەی یان لایەنـــە دوورەکانی بکۆڵرێتەوە. بـــۆ نموونە، ئەو ڕستەیەی من دەینوسم لەو پیتانە پێکهاتوە من بەدوایاندا گەڕاوم و دۆزیومنەتەوە، بەڵام نوســـراوەکە بە گشتی واتاکەی لە ڕستەکەدایە. پڕۆژەی نوسینەکەشم لەبەر پەیوەندییەکەی بە دوودڵییەکەوە دەبێت بە ئەگەرێک؛ ئەگەری ڕاستەقینەی من. من دڵنیانیم لەوەی سبەینێش لەسەر ئەم پڕۆژەیە بەردەوام دەبم یان نا. سبەینێ لە پەیوەندییەکەیدا بە پڕۆژەکەمەوە لەسەر سەربەستی و دەستەڵاتی لەناوبردنی منەوە ڕاوەســـتاوە. دوودڵییەکەم لە ئاســـتی پڕۆژەکەدایە، وەکو ئەگەرێکی من. پێویستە ڕاستەوخۆ بەرانبەری ڕاوەستم و پەیوەندییەکەم لەگەڵیا بناسم. ئەمەش وا لە من دەکات ئەو جۆرە پرسیارانەی، وەکو "پێویست دەکات بنوسم؟" نەکەم چونکە پەیوەندیم بە حاڵەتێکی فراوانترەوە و پرسیارێکی دیکەوە دەبەستێت، بۆ نموونە، لەم بوارەدا باشە بنوسم؟ ئایا ئەم نوسینەم دووپاتکردنەوەی نوسینێکی دیکەم نییە؟ ئەوەی دەینوسم پەسەند دەکرێت؟ هتد. هەموو ئەمانە گرنگییەکی بەرز لە جیهاندا دەخەنە بەردەممان.

بۆ ئەوەی لە نوسینی پەرتووکەکەمدا سەربەستییەکەم بە دوودڵییەوە پەیوەست بێـــت، پێویستە پەرتووکەکە بـــەو جۆرە خۆی دەرخات، کـــە پەرتووکی منە. لە لایەکەوە پیویستە ناوەڕۆکی خۆم، وەکو ئەوەی هەم بدۆزمەوە، کە من ئەوە کەسەم "ئارەزووی نوســـینی پەرتووکەکەی" هەیە. لەو باوەڕەدام نوســـینی ئەم پەرتووکە خۆشە و خۆم وا بەو جۆرەش نیشـــاندەدەم، ئـــەم پەرتووکە بووە بە ئەگەرێکی بنەڕەتی بۆ بوونم و بەبێ ئەو ئەگەرە تێگەیشتن لە بوونی من مەحاڵە. لە لایەکی دیکەوە، پێویستە ئەو نەبوونە بدۆزمەوە، کە ناوەڕۆکی من و سەربەســـتییەکەم لە یەکدی جیادەکاتەوە: من حەزدەکەم پەرتووکەکە بنوســـم و (هیچ) شتێک، تەنانەت بەو جۆرەی هەم زۆرم لێنەکات بینوســـم. دواجار، پێویستە ئەو نەبوونە بدۆزمەوە، کەمن و ئەو (من)ەی دروستدەبێت لە یەکدی جیادەکاتەوە: بۆم دەردەکەوێت ئەگەری وازهێنان لە نوسینی پەرتووکەکە، کە هەمیشە لە بەردەممدایە بۆ نوسین و هەروەها بۆ واتای سەربەستییەکەم مەرجە. پێویستە لەگەڵ نوسینەوەی پەرتووکەکەدا وەکو پڕۆژەیەکی من، سەربەســـتییەکەم بە دەســـتەڵاتێکی ڕوخێنەری ئێستاو داهاتووی بوونم دابنێم. دەبێت بیر لە بوونی خۆم بکەمەوە. تاکو لە نوســـین بەردەوام بم و لەسەر پەرتووکەکەم کاربکەم. پەرتووکەکە دوور و نادیارە ئەگەرەکانم بۆ بەرجەستە دەکات و ئاکامی کارکردنەکە یە[نوســـین]؛ نەکراوە بە بابەتێک بۆ خۆی؛ تەوانای پرســـیارکردنی نییە؛ نە پێویستە و نە شتێکی هەڵکەوتـــوو. شتێکی بەردەوامە. واتاکەشـــی لە وێدایە، کە من ئێستا دەنوســـم و لەم ڕووەوە بـــە بوون دادەنرێت؛ لەوێدایە پەرتووکەکە ببێت بە زەمینە بۆ ئێستای سەرهەڵدانی ڕستەکان.

لـــه هەموو حاڵەتێکدا، ئێمە لەنێو جیهاندایـــن و خۆمان بە جیهانەوە خەریک کردوە. پێش ئەوەی ئەگەرەکانمان دیارییکەین دەســـت بە کارکردن دەکەین. ئەو ئەگەرانـــەی دیاریکـــراون یان دیاریدەکرێن واتاکانیان بـــە جۆرێک بە کارکردنەوە بەســـتراون، کە ئێمە دەمانەوێت پرســـیار لە بارەیانەوە بکەین. ئەو کاتژمێرەی بەیانیان زەنگەکە لێدەدات ئاماژە بۆ چوونە سەر کارەکەم دەکات، کە ئەگەرێکی منـــە. بـــەڵام زەنگلێدانەکە، وەکـــو فەرمانێک یـــان دەنگێک بۆ هەســـتانی من و خۆئامادەکردنـــم بۆ چوونە ســـەرکار واتای لە خەوهەســـتانی هەیە. کەوابوو، لە خەوهەســـتان[وەکو کارێک] ئەو پرســـیارە دەهێنێتە کایـــەوە، "ئایا کارکردن ئەگەری منە؟" لە ئاکامدا من ناخاتە نێو هەڵوێستی دوورەپەرێزی و بێدەنگییەوە یان ڕەتدانـــەوەی کارکردنەکەم و ڕەتدانەوەی جیهان یـــان ئەگەری مردنەوە. بە کورتییەکەی، لەگەڵ تێگەیشتنی واتای زەنگلێداندا من بەخەبەر دێم. ئەمەش من دژی هەستکردن بەو دوودڵییە ڕادەگرێت، کە تەنیا من (پێویستی) بە زەنگلێدانی کاتژمێرەکە دەدەم.

بەهەمانشـــێوە، ئاکاری ڕۆژانەمـــان بەبێ دوودڵی نابێـــت. کاتێک پەیوەندیم بـــە بەهاکانەوە دیاریدەکـــەم توشی دوودڵی ڕەوشتی دەبم. بەهاکان لەڕاســـتیدا داواکارییەکن، کە لەســـەر بناخەیەک ڕادەوەســـتن. بەڵام ئـــەو بناخەیە بە هیچ شێوەیەک بوون نییە. هەر بەهایەک بناخەکەی لەسەر سروشتە تەواوەکەی خۆی دابمەزرێنێت، وەکو بەها نامێنێتەوە. بوونی بەها لە پێویستیدایە، پێویستیەکەش لە خودی بەهاکەدا نییە. بەها لە چالاکییەکی سەربەســـتانەدا خۆی بەرجەســـتە دەکات و دەناسرێت. دەردەکەوێت سەربەستییەکەم بناخەیەکی تایبەتی بەهاکان بێـــت. هیچ شتێکـــی دیکە نییە وام لێبکات بڕیار لەســـەر ئەم یـــان ئەو بەهایە بدەم. من، وەکو ئەو بوونەی بەها دەهێنێتەکایەوە، بێ پاکانەم. سەربەستییەکەم دوودڵییـــە لە ئاســـتی بوون بە بناخـــە بۆ بەهاکان. هەروەهـــا دوودڵییە چونکە بەهاکان لە سەربەســـتییەکەمدا بەرجەستەبوون و تاکو نەخرێنە بەر پرسیارکردن نابـــن بە ئەگەرەکانی بوونم. دوودڵیم لە ئاســـتی بەهاکاندا هەســـت بە تەواویی بەهاکان دەکات. بە ئاســـایی، هەڵوێستم لە ئاســـتی بەهاکاندا دڵنیابوونەوەیە و خۆخەریکردنی منیش لەنێو جیهانی بەهاکان دەردەخات. تێگەیشـــتن لە بەهاکان بە دوودڵییەوە، بەو جۆرەی سەربەســـتییەکەی من دەیهێڵێتەوە، ســـەرەکی نییە و دیاردەیەکە بیریلێکراوەتەوە. ئەوەی ڕاســـتەوخۆ دێتـــە بەردەممان جیهانە بە پێویستییەکەیەوە؛ ئەو جیهانـــەی خۆم لەناوییدا خەریککردوە و کارەکانم، وەکو ســـوێسکە دەبن بە هۆکاری ســـەرهەڵدان و فڕینی بەهاکـــان. تورەبوون بەهای نێگەتیڤی 'کەمی' و پەســـەنکردنەکەشم بەهای پۆزەتیڤـــی 'شکۆداری' دەداتێ. لەسەرو ئەمانەشەوە، ملکەچ کردنم بۆ کۆمەڵێک نەریتی قەدەخەکراو، بوونی شتە

قەدەخەکراوەکان بۆ من دەردەخات. ئەو بورژوازیانەی خۆیان بەهاووڵاتیانی بەرێز دادەنێن، لە ڕێگەی بیرکردنەوە لە بەها ڕەوشتیەکانەوە بەڕیز نابن. ئەوان لە یەکەم ڕۆژی بوونیانـــەوە فڕێدراونەتە نێو کۆمەڵێک لە هەڵوێست و ڕەفتارەوە، کە واتای ڕێزیان بۆ دادەنێت. ڕێزلێنان پێویستی بە بوونێکە و نەخراوەتە بەر پرسیارکردن. [لەم حاڵەتەدا] هەزارەها بەها، وەکو ئەو نوســراوانەی لــە باخەکاندا دانراون و ئاگادارمان دەکەنەوە بە ســەر چیمەنەکەدا نەڕۆین، فڕێدراونەتە ســەر ڕێگەمان. لەچیدا جیهان ڕاستەوخۆ لەبەردەم ئاگامەندییماندا ڕادەوەستێت و ئێمەش خۆمان بەوجــۆرە نابینیــن، فڕێدرابینە نێو پڕۆژەکانمانەوە؟ بوونمان ڕاســتەوخۆ لەنێو هەڵوێستدایــە، لەبەردەم پڕۆژەکاندا ڕادەوەســتێت و بیریان لێدەکاتەوە. خۆمان لەنێــو جیهانێکــدا دەدۆزینەوە پڕە لە خەڵکی و ئەوانیــش لەگەڵ پڕۆژەکانماندا داواکارییان هەیە. بۆنموونە، من جگەرە دەکێشــم، ئــەم ئێوارەیە پیرۆ دەبینم. پێویستە وەڵامی سیمۆن بدەمەوە. نابێت ڕاستی لە کلاودە بشارمەوە. هەموو ئەم شتە چاوەڕوانکراوانە بەهاکانی ڕۆژانەن واتاکانیان لە هەڵبژاردنی مندا هەڵدەقوڵێن. هەڵبژاردنەکەش پــڕۆژەی منە لەنێو جیهاندا. بــە شێوەیەکی ئاشکراتریش ئەو پڕۆژەیە، کە ڕوو لە ئەگەرەکان دەکات و دەبێت بە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی بەهاکان و شتە چاوەڕنەکراوەکان یان بە گشتی بۆ جیهان لەودیو جیهانەوە بە ڕووتکراوی واتاکەی خۆی نیشــاندەدات. شتەکانی دیکە، وەکو کاتژمێرەکە، نوســینی سەر شەقامەکان، فۆرمی باجدان، پۆلیسەکان و کارمەندەکانی ئیستگەی شەمەندەفەر بــە کۆنکرێتی لە بەرانبەر دوودڵییەکەمــان هەبوون. هەر ئەو کاتەی پڕۆژەکە لە دوورەوە هەستی پێدەکرا و خۆی نیشانی من دەدا، منیش ئامادەم بۆ بوونی خۆم دەکرد چونکە دەبێت چاوەڕوانی سەرهەڵدانی خۆم لە داهاتوودا بکەم. خۆم، وەکو ئەو کەسە دەبینم واتا بە کاتژمێرەکە دەبەخشێت. من ئەو کەسەم بە خوێندنەوەی نوســینی نێو باخەکە بەســەر چیمەنەکەدا ناڕۆم و گوڵەکان ناشێلم. ئەو کەسەم پەرتووکەکە دەنوسم و دەزانم چ سودێکی هەیە. لە کۆتاییدا، من بەهاکان دەهێنمە کایەوە تاکو حوکم بەسەر کارەکانمدا بدەم. من لە دوودڵییەکەمدا بەرانبەر بوونی خۆم ڕادەوەستم؛ هەموو ڕێگرەکان بە هۆی سەربەستییەکەمەوە لەناودەچن. هیچ بەهایەک دژی ئەو ڕاســتییە نایەتە پێش، کە من لە بووندا بەهاکان دەپارێزم و گلیــان دەدەمەوە. هیچ شتێک بوونی من لە جیهان و ناوەڕۆکی خۆم لەو نەبوونە دانابڕێــت، کــە منم. پێویستە لە واتای جیهــان و ناوەڕۆکی خۆم تێبگەم؛ بەبێ بیانوو یان ســەلماندن بڕیاریان لەســەر بدەم. کەوابوو، دوودڵی تێگەیشــتنە لە سەربەســتی. لەم ڕووەوە هەرچەندە ڕاستەوخۆ سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەو شتەش بیریلێدەکرێتەوە و ڕەتدانەوەی داواکارییەکانی جیهانە. لەوێدا دێتەکایەوە، کە من پاش خۆ خەریکردنــم بە جیهانەوە خۆم دوور دەخەمەوە و هەوڵدەدەم لە خۆم،

وەکو ئاگامەندیەک تەوانای هەڵسەنگاندنی پێش ئۆنتۆلۆجیانەی بۆدەروونی خۆی هەبێت، تێبگەم. دوودڵی دژی بیرکردنەوەی ئەو کەســـە جدییەیە، کە بەهاکان بە جیهان دادەنێت و ماتەریالیستیانەش لە ناوەڕۆکیان دەکۆڵێتەوە. من لە مەزاجێکی جیدییـــدا خۆم بەو بابەتە دادەنێم، کە هەموو شتە لەپێشـــترەکانی خستۆتە ئەو لاوە، کـــە من لەگەڵیاندا لەو کاتەدا کارناکەم؛ ئەو واتایەی سەربەســـتییەکەم بە جیهان بەخشیوە وا بۆیەچم لە جیهانەوە هاتوە و منیش دەبێت پەیڕەوی بکەم. لە دوودڵییدا من خۆم، وەکو هەموو سەربەستییەکەم دەبینم و بێجگە لەو واتایەی مـــن بە جیهانی دەدەم باوەڕ بە واتای دیکە ناهێنـــم. نابێت ئەو بابەتەی لێرەدا بیریلێکراوەتـــەوە و ئەگەرەکانی ڕاســـتەوخۆ دەرخستوە بە مەرجێکی تەواوی بۆ تێگەیشتن لە دوودڵی دابنێین. لە هەموو حاڵەتێکی بیرکردنەوەدا دوودڵی دەبێت بە بونیادی ئەو ئاگامەندییەی بیردەکاتەوە. بەڵام هێشتا دەتوانم لە ڕێگەی چەند هەڵوێستێکی دیکەوە دوودڵییەکەم بناســـمەوە-بۆنموونە لە هەڵوێستی ڕاکردندا. هەموو شتێک، کە ڕوودەدات، لە ڕاستیدا، لەبەر ئەوەیە هەڵوێستی ڕاستەوخۆمان لـــە دوودڵییەکەدا ڕاکردنە. فێرگەی ناچارەکی ســـایکۆلۆجی، پێش ئەوەی ببێت بـــە بیردۆزە، هەڵوێستییێکی بیانودۆزینەوە بوو یـــان ئەگەر حەز بکەیت بیانووی بـــۆ هەڵوێستەکان دادەنـــا. ئەوەش دەردەخات لە ناخی هـــەر یەکێک لە ئێمەدا هێزی ناکۆک و دژوەســـتا و هەیە بوونیان، کە وەکو بوونی شتەکانە. دەیەوێت ئەو بۆشاییە پڕکاتەوە، کە لـــە چواردەورماندایە و پردی پەیوەندی نێوان ئێستا و ڕابـــردوو، هەروەها ئێستاو داهاتوو هەڵبەســـتێت. خۆرســـکێک لە کردەوەکان بـــۆ مرۆڤ پێکدەهێنێـــت و کردەوەکانیش بە بەرز دادەنێـــت. کردەوەکانیش بۆ ســـەر بناخەیەک لە دەرەوەیاندا دەگەڕێنێتەوە. ناچارەکی ســـایکۆلۆجی بەرزێتی بوونی مرۆڤ، کە لە دوودڵیدا لەودیو ناوەڕۆکییەوە سەرهەڵدەدات، ڕەتدەداتەوە. هەروەهـــا بە کەمکردنەوەی ئێمـــەش بۆ ئەو شتەی ئێستا هەیـــن دەمانکات بە بوونێکی پۆزەتیڤی لەنێو—خۆدا و لە ناوەڕاستی بووندا دامانده‌نێت.

بەڵام ئەم جۆرە ناچارەکییەی بووە بە بەرگریکردن دژی دوودڵی، حەدەسێکی تێڕامانانە نییە. هیچ ســـەلماندنێکی دژی سەربەســـتی پێ نییە؛ بووە بە جۆرێک پەنابردن و ڕێگەیەک بۆ خۆدەربازکردن لە دوودڵی. ئەمەش لەو ڕوانگە فەلسەفییەوە باشتر ئاشکـــرا دەبێت، کە زانایانی ناچارەکی ســـایکۆلۆجی بـــاس لەوە ناکەن بۆچوونەکانیان لەســـەر بناخەی بەخۆداچوونـــەوە دامەزراندبێت. بۆچوونەکانیان تەنیا گریمانەیەکە و بۆ فاکتۆر یان لە دامەزراندنی فێرگە ســـایکۆلۆجییەکەیان بۆ پاشگرەکان دەگەڕێنەوە. باوەڕ بە ئاگاییەکی ڕاســـتەوخۆ لە ئاستی سەربەستیدا دەکەن، کە نایارەکانیان بەناوی "سەلماندنی هەستی ناوەوە بە ڕێگەی حەدەس" ەوە دژی ئەوان بەکاریدەهێنن. لە مشتومڕەکەیاندا جەخت لەسەر بەهای ئەو هەستەی

ناوەوە دەکەن. لەبەرئەمە ئەو حەدەســـەی دەبێت بە هۆکاری ناسینەوەی بوونی خۆمان و کردەوەکانمان لای کەس باسنەکراوە. ئێمە، لەبەر ئەوەی واتێگەیشتوین، کە ســـەرچاوەی کردەوەکانی خۆمانین، هەســـتدەکەین بیرکردنەوە لە دوودڵی و تێپەڕکردنی بە حوکمدان بەســـەریدا لەنێو دەســـتەڵاتماندایە. ئەو گرفتەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت بڕواکردنە بە ناڕاســـتەوخۆی دوودڵییەوە. ئایا ئەو دوودڵییەی حوکمی بەسەردا بدرێت دەستەڵاتەکەیمان لێسەندوە و چەکمان کردوە؟ ئاشکرایە نـــا. لێرەدا دیاردەیەکی نـــوێ لەدایک دەبێت، ئەویش پرۆســـەی 'ڕوخاندن'ە لە پەیوەندییەکەمان بە دوودڵییەوە. ئەم پرۆسەیەش پێویستی بە هێزێ لەناوبردنە. ناچارەکی بە تەنیا و بەبێ پشتبەستن بە شتێکی دیکە نابێت بە ڕوخێنەر چونکە ناچارەکی گریمانەیە. ئەم پرۆسەیە ڕاکردنێکی ئاگامەندانەیە. یەکەمجار، دەبێت بە هەوڵدانێک بۆ ڕوخاندنی ئەو ڕێگرانەی دێنەبەر ئەگەرەکەم. کاتێکیش ئەگەرەکەی خۆم دەناســـم، لە کۆتایی پرۆژەکەمدا بوونیشـــی دەناسم و بە بەشێک لە بوونی خۆمـــی دادەنێم، وەکو ئەو شتەی لە داهاتوودا چاوەڕێم دەکات و هیچ شتێک لە منی جیاناکاتەوە. لەم ڕووەوە، من دەبم بە ســـەرچاوەی ئەگەرەکەم و ئەمەیە بە ئاگایی لە سەربەستی ناوزەدی دەکەین. ئەم بونیادەی ئاگامەندییە شوێنکەوتوانی فێرگەی سەربەستی ویست، کە باســـی هەستی ناوەوە دەکەن، بیریلێدەکەنەوە. بەڵام من هەموو ئەو ڕێگرانەی دێنەبەردەم ئەگەرەکەم دووردەخەمەوە. لەڕاستیدا ناتوانم بوونیان بـــەو شێوەیەی ئەگەرەکانی خـــۆم دەهێنمەکایەوە، دەرنەخەم. ناتوانـــم بە ئەگەر دایاننەنێم و هەروەها نەبن بـــە ئەگەریش بۆ من. زۆر لە خۆم دەکەم بە هەبوویەکی لۆجیکانە یان وەکو شت بیانبینم. ئەگەر بیر لە نوسینی ئەم پەرتووکە بکەمەوە و بە ئەگەرێک دایبنێم ئەوا لەنێوان ئەم ئەگەرە و ئاگاماندییما دەبـــم بە هۆکاری نەبوونی ئەو بوونەی دەبێت بە ئەگەری نوســـینەکە و ئەگەری نەنوسینیشـــی. بەڵام هەوڵدەدەم خۆم لەو دیوی ئەگەری نەنوســـینەوە دابنێم و دەمەوێت بزانم چ دەبینم؛ هەوڵدەدەم لە ئەگەری نەنوسین، وەکو پێویستییەک بۆ بیرکەوتنـــەوە، نەک ئەوەی من بایەخی پێدەدەم، تێبگەم. ئەگەرەکەش پێویستە شتێکی دەرەکی بێت لە پەیوەندییەکەیدا و بەمنەوە و لەپەیوەندی نێوان جوڵان و تۆپە وەستاوەکانی یاری بلیارد بچێت. ئەگەر لەمەدا سەرکەوتوبم، ئەوا ئەگەرەکانی دژی ئەم ئەگەری منن، دەبن بە شتێکی لۆجیکی و کاریگەرێتی خۆیان لە دەست دەدەن. لە دەرەوە وەکو بێگانە دەبینرێن و ناتوانن هەڕەشەمان لێبکەن. لەوانەیە کەســـێکی دیکەش وەکو ئێمە بەمجـــۆرە تەماشایان بکات یان هایدیگەر گوتەنی، ببن بە هەڵوێستی دەرەکی کەســـانی دیکە. من نوســـینی ئەم پەرتووکە دەکەم بە پرۆژەی خۆم. هەمانکات کەســـێکی دیکە نییە هەمان پرۆژەی نوســـینی ئەم پەرتووکەی هەبێت. ئەگەرەکان بوونی من دەهێڵنەوە و بڕیار لەســـەر سەربەستی

من دەدەن، بـــەڵام ڕێگەیان نادەم ببن بە هەڕەشەکـــەر. من بایەخیان پێنادەم. ئەو ئەگـــەرەی هەڵیدەبژێرم دەبێـــت بە ئەگەرێکی کۆنکرێتـــی و نەبوون لە من جیادەکاتەوە. ڕاکردن لە دوودڵی سەرلێشـــێوان لە ئاستی داهاتوودا نییە. بەڵکو داماڵینـــی ڕابردووشە لە هەڕەشەکردن. ئەوەی من لێـــی ڕادەکەم بەرزێتییەکەی بوونـــی خۆمە، کە دەیەوێت خۆی بگەیەنێتـــە ژوور ناوەڕۆکی ئێستاوە. من خۆم بە ناوەڕۆک، وەکو ئەو بوونەی لەنێو خۆدایە دادەبێم. هەمانکات، ئەو ناوەڕۆکەم بە پێکهاتەیەکی مێژوویی دانانێـــم و پەیوەندییەکەشی بە کردەوەکانمەوە، وەکو پەیوەنـــدی نێوان بازنە و خەســـڵەتەکانی دەبینمەوە. من ئـــەو ناوەڕۆکە بەبێ ئەوەی ســـەرەتا و کاتـــی پەیدابوونی بۆ دابنێم بە جێگەزا و ســـەرەتای هەموو ئەگەرەکانی ناوزەد دەکەم. لێرەوە ئەو کردەوەیە بە کارێکی سەربەستانە دادەنێم، کە نوێنەرایەتی دەروونم بکات، ئەم سەربەستییە، کە ئەگەر لەپێش بوونی منەوە هەبووبێت پەشیمانم دەکات، بۆ ناوەڕۆکم دەیگەڕێنمەوە و دەروونم بەو خوایە بچوکە دادەنێم، کە لەنێو بوونمدایە و سەربەســـتییەکەمی، وەکو چاکەیەکی مێتافیزیکی لێوە دەردەچێت. من ئەو بوونە سەربەســـتە نیم. ئەوەی سەربەســـتە (خۆ)کەی نـــاوەوەی منە، کە لەنێـــو ئاگامەندییما دەژی. ئەمـــەش چیرۆکێکی خەیاڵاوییە، چونکە سەربەســـتییەکەم لەناخی بوونێکی نادیارەوە ســـەردەردەکات. ناوەڕۆکم بوونێکی دیار و ڕوونی نییە، شتێکی ناوەکی بەرزە و سەربەســـتییەکەشم دەبێت بە یەکێک لە خەســـڵەتەکانی. بە کورتییەکەی، من سەربەستییەکەی خۆم لەنێو بوونێکـــی دیکەدا دەدۆزمەوە. پوختەی ئەم چیرۆکە خەیاڵاوییەش ئەمەیە: (خۆ) ی من دەبێت بە سەرچاوەی کردەوەکانم و خاوەنی ئەو کەسایەتییەی پێکهاتوە. دڵنیام، کە (خۆ) ئەژی و خۆشی دەگۆڕێت. هەر یەکێک لەو کردەوانە تیایدا دەبنە هۆکـــاری گۆڕانکارییەکان. بەڵام هارمۆنی و گۆڕانکارییەکان لەســـەر بناخەیەکی بایۆلۆجـــی دادەنرێن. لەو گۆرانکاریانە دەچێت من پاش ئەوەی پیرۆی هاوڕێم بۆ ماوەیەکی زۆر نابینم هەستیان پێدەکەم. برگسۆن باسی ئەوەی کردوە چۆن (خۆ) بەردەوام خۆی ڕێکدەخات و لەگەڵ ئاگامەندییدا هاودەم ڕادەوەستێت. ئاگامەندی ناتوانێـــت بگاتە ئەودیو بوونی (خۆ)وە، کە وەکو پەیوەندی نێوان باوک و منداڵ بەرانبەر دەبێت بە ســـەرچاوەی کردەوەکانم. کردەوە لـــە خۆ دووردەکەوێتەوە، بەڵام هەمیشـــە لەســـەر ئەو ڕێگەیە دەمێنێتەوە؛ بە دڵنیاییـــەوە تاکو ڕادەیەک خـــۆی دانابڕێت. ئێمە خۆمانی تێدا دەناســـینەوە و وەکو چـــۆن باوکێک بوونی خـــۆی لە منداڵەکەیدا دەبینێتەوە، ئێمەش خۆمـــان لەنێو کردەوەکەدا دەبینین. لە گەڕانەوەی سەربەســـتییەکەم بۆ هەبوویەکی دەروونـــی، وەکو (خۆ) برگسۆن دەمامەکێک دەخاتە ســـەر ڕووی دوودڵییەکەمـــان. ئەم کارەش لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئاگامەندییدایە. ئەوەی لێرەدا[برگسۆن] باسیدەکات، سەربەستییەکەمان نییە

بەوجۆرەی دەردەکەویت، بەڵکو سەربەستی شتێکی دیکەیە لە بوونی ئێمەدا.

ئەمە ئەو پرۆســـەیەیە ئێمە تیایدا دوودڵییەکەمان دەشارینەوە. بە هەڵگرتنی ئەگەرێک واز لە هەموو ئەگەرەکانی دیکە دەهێنین. ئەو ئەگەرەش نادەینە دەست سەربەستییەکەمان و بۆ شتێکی دەگەڕێنینەوە، کە لێوەی دەرچووبێت. هەمانکات، ئەو شتە خۆمانین، بەڵام وا باســـکراوە، کە شتێکی دەرەکی بێت و ئێمە نەبین. هەروەهـــا ئێمە حەزدەکەین لە سەربەســـتییەکەمان ڕابکەین و پەنا بۆ ناچارەکی بەریـــن و بەهانـــە بۆ هەڵسوڕانی کردەوەکانمان پەیدابکەیـــن. ئێمە بۆ ئەوەی لە دوودڵی ڕابکەین، خۆمان بە (شت)یـــان ئەوی دیکە دادەنێین. ئەو[شتە] دەکەین بە ســـەرچاوەی سەربەســـتی و کردەوەکانمان. ئایا ئەو پیکهاتەیە لە داپۆشین و شاردنەوەی دوودڵییەکەماندا سەرکەوتووە؟

ئاشکرایە، ناتوانین بەســـەر دوودڵییدا زاڵ بین چونکە ئێمە ئەو بوونەین، کە دوودڵیین. بێجگە لەوەی بیرکردنەوە ڕێگەمان نادات لە واتای شاردنەوە بە ڕووتی تێبگەیـــن، بەڵام پێویستە بزانین ئەو هەڵوێستـــە چییە و چۆنە، کە شاردنەوەی تێدا ڕوودەدات. ئێمە دەتوانین بابەتێکی دەرەکی بشـــارینەوە چونکە ئەو بابەتە لە دەرەوەی بوونی ئێمەدایـــە. لەبەر هەمان هۆکار دەتوانین ڕوومان وەرگێڕین و تەماشای نەکەین و چاومان بخەینەســـەر بابەتێکی دیکە. لێرەدا بوونی من و ئەو بابەتە بەردەوام دەمێنیتەوە و پەیوەندییەکەی نێوانمان، کە ڕوویدا لەناودەچێت. بەڵام ئەگەر من ئەو بوونە بم، کە حەز لە شاردنەوە و داپۆشین دەکات پرسیارەکە سەبارەت شاردنەوە شێوازێکی دیکە وەردەگرێت. من ئەو کاتە حەز ناکەم لایەنێکی بوونـــم ببینم و بیشـــارمەوە، کە ئەولایەنەم بینیبێت. بۆئـــەوەی بیریلێنەکەمەوە دەبێـــت بیر لەوە بکەمەوە، کە بیریلێنەکەمەوە. لەم پەیوەندییەدا ئەوەی حەز لە ڕاکردنەکە دەکات، منم و هەروەها منیش ڕوو لەو بابەتە دەکەم، کە دەمەوێت لێی ڕابکەم. ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت، کە دوودڵی و مەبەستی دیاریکراوی دوودڵییەکە و ڕاکردنەکەش لە دوودڵی هەموویـــان پێکەوە لەنێو ئاگامەندییدان. من ڕادەکەم لەوەی نەزانم، بەڵام ناتوانم نەزانم، کە من ڕادەکەم. ڕاکردن لە دوودڵی شێوازێکی ئاگاییە لە دوودڵی. لەبەرئەمە، دوودڵی داناپۆشرێت و ناتوانین لێیڕابکەین. هێشتا دوودڵ بیت و لە دەست دوودڵیش ڕابکەیت، بە تەواوی وەکو یەک نین. ئەگەر من دوودڵییەکەی خۆم بم و هەوڵ بدەم لە دەستیشی ڕابکەم ئەوە دەگەیەنێت، کە من خۆم لە بوونی خۆم بەو شێوەیەی هەم دووردەخەمەوە و دەتوانم ببم بە دوودڵی بەبی ئەوەی دوودڵ بم و واز لە دەســـتەڵاتی لەناوبردنی بهێنم. ئەم دەســـتەڵاتی لەناوبردنەش، مادامەکی لە دوودڵی ڕادەکەم دوودڵی لەناودەبات. ئەم هەڵوێستە بـــە بڕوای خراپ ناوزەد دەکەین. دوودڵی لـــە ئاگامەندی دانابڕێت و دیاردەیەکی دەرەوونی ئەودیو ئاگامەندیش نییە؛ ئاســـاییە من لە ئاســـتی بڕوای خراپدا توشی

ئـــازاری ویژدانی ببم و ئەو دوودڵییەش بناســـمەوە، کە خۆمم. ئەم بڕوای خراپە دەیەوێت ئەو نەبوونییە پڕبکاتەوە کەمنم و لە پەیوەندییەکەم بە بوونی خۆمەوە ســـەرهەڵدەدات. ئێمە بە کۆتایی باسکردنی یەکەم گەیشتوین. لێکۆڵینەوەکەمان لەســـەر ڕەتدانەوە لەمە زۆرتر ناڕوات. ئـــەم لێکۆڵینەوەیە جۆرێک هەڵوێستی بۆ دەرخستوین؛ هەڵوێست لە ئاستی نەبووندا، کە پێویستی بە جۆریک بوونی بەرزە بناســـرێت و بە جیا باســـیبکەین. کەوابوو، لەم حاڵەتەدا خۆمان لە ئاستی دوو جـــۆر بەرزی[یان دەرچوون لە خۆوە] دەبینینـــەوە: یەکەمیان ئێمە فڕێ دەداتە نێـــو بوون— لەنێو—خۆوە و دووەمیش ئێمە بە نەبوونەوە خەریکدەکات. لێرەدا، بە گەیشـــتن بەم خاڵە، لەوە دەچێت گرفتە بنەڕەتیەکەمان سەبارەت پەیوەندی مرۆڤ بە بوونەوە چارەســـەر کردبێت. بەڵام بـــەردەوام بوونمان لە شیکردنەوەی بەرزێتی بەرەو نەبوون و گەیشـــتن بە ئاکامەکەی زانیارییەکی بەنرخمان دەداتێ. بێجگە لەمە ناتوانین کێشـــەی نەبوون ڕەچاونەکەین. ئەگەر مرۆڤ هەڵوێستێکی دیاریکراوی لە ئاستی بوون—لەنێو—خۆدا وەرگرت و توێژینەوە فەلسەفییەکەشمان پرســـیار لەبارەی ئەو هەڵوێستـــەوە بکات لەبەر ئەوەیە، کە مـــرۆڤ ئەو بوونە نییـــە. ئێمە نەبوونمان، وەکو مەرجێکی ڕووکردن بەرەو ئەو بوونە دانا. کەوابوو، پیویستە زۆرتر لە نەبوون بکۆڵینەوە و ڕێگە نەدەین لە دەستمان دەرچێت.[٣٥]

بەهەرحاڵ، وەڵامدانەوەی پرســـیارەکەمان لەسەر واتای ڕەتدانەوە زۆرشتی بۆ ڕوونکردوینەتەوە. ئێمەی بە سەربەســـتی ئەزمونگەرانە گەیاندوە، کە دەستەڵاتی لەناوبردنی مرۆڤە لەنێو کاتدا و تێگەیشتن لە هەموو جۆرەکانی ڕەتدانەوەیە. بەڵام ناکرێت ئەم جۆرە سەربەستییە لەناوبردن و بناخەی لەناوبردنیش بێت. لە ڕاستیدا بەشێکە لە پێکهێنانی ئەو بەرزێتییە-ناوەکییەی هەموو ڕەتدانەوەکان مەرجداردەکات. هاوکات ئاماژە بـــۆ بناخەکە ناکات. لەبەرئەمە دۆزینەوەی بناخەی ڕەتدانەوەکان پێویستـــە. دەبێت ئەو کردەوەیە بدۆزینەوە، کە مرۆڤ تێیدا دەبێت بە نەبوون بۆ خۆی. دەبێت بزانین چۆن مرۆڤ، وەکو ئاگامەندی لەنێو جیهاندا، کە بناخەی نەبوونـــی خۆیەتی نەبـــوون لەگەڵ خۆیـــدا دەهێنێتە جیهانـــەوە. لەوە دەچێت بۆچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، ئامێرێکمان بە دەستەوە نەبێت. بەڵام ڕەتدانەوە ڕاســـتەوخۆ سەربەستی دەهێنێتە پێشـــەوە. ئێمەش دەبێت لە سەربەستیدا ئەو هەڵوێستـــە بدۆزینەوە، کە توێژینەوەکەمان بەردەوام دەخاتەگەر. ئایا لەپێشـــتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە نەکرد، کە لە بڕوای خراپدا ئێمە ئەو دوودڵییەین، کە لە

---

٣٥ Transcendence چەمکی بەرزێتی چەند جارێک سارتەر بەکاریهێناوە ئەو واتایە نابەخشێت، کە بیریارە ئایدیالیستەکان، وەکو ئەفلاتون یان کانت، ڕوونیانکردۆتەوە. سارتەر، وەکو هایدیگەر بەکاریهێناوەو بۆ هەموو ئەو بابەتانە دادەنرێت لە دەرەوەی ئاگامەندییدان و ئاگامەندی ڕوویان تێدەکات تاکو بیانناسێت.(وەرگێڕ)

دەســـت دوودڵی ڕادەکات و ئەمەش لەنێـــو ئاگامەندییدا ڕوودەدات؟ ئەگەر بڕوای خراپ هەبێت ئەوا دەبێت بتوانین لەنێو ئاگامەندییدا بوون و نەبوون و ئەو بوونەی، کە نایەوێت ببێت بەو شتە بناسینەوە. بڕوای خراپ سەرباسی لێکۆڵینەوەکەمانە. بۆئەوەی مرۆڤ دەســـتەڵاتی پرسیارکردنی هەبێت، پێویستە نەبوونی خۆی بێت؛ لەنێو بووندا بنەڕەتی نەبوون بێت.

کەوابوو، هەمیشـــە شتە بەرزەکانی ڕابردوو یان داهاتوو لەنێو ڕاســـتەقینەی کاتیگەرانەی بوونی مرۆڤدا خۆیان دەردەخەن.

بەڵام بـــڕوای خراپ کتوپڕ ســـەرهەڵدەدات. کەوابوو، چـــۆن بڵێین پێویستە ئاگامەنـــدی کتوپڕانـــە کۆجیتۆیەکی پێش تێڕامان بێـــت، ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بڕوای خراپی هەبێت؟

# بەشی دووەم
# بڕوای خراپ

## ١. بڕوای خراپ و ناڕاستی

مــرۆڤ تەنیا ئەو بوونە نییە لە ڕێگەی ئەوەوە ڕەتدانەوەکان دێنە جیهانەوە؛ بەڵکو دەتوانێت بەرانبەر خۆشی هەڵوێستی ڕەتدانەوەی هەبێت. ئێمە لە پێشەکی ئەم پەرتووکەدا ئاگامەندییمان پێناســکرد و گوتمان مادامەکی ئەم بوونە ئاماژە بۆ ئەوی دی دەکات بوونێکە، کە پرســیار لە بارەیەوە ســەرهەڵدەدات. هەروەها واتای پرسیارکردنیشــمان ڕوونکردەوە و لــەم ڕووەوە دەڵێین، "ئاگامەندی ئەو بوونەیە، کە لــە نەبوونی خۆی بە ئاگایە". لە قەدەخەکردندا، بۆ نموونە، مرۆڤ شتێکــی بەرزی نێو داهاتوو ڕەتدەداتــەوە. بەڵام ئەم ڕەتدانەوەیە زەق و ئاشکرا نییە. ئاگامەندییەکەم بە بینینی ڕەتدانەوەکەوە نەبەســتراوەتەوە. وەکو هێزێکی لەناوبــردن بۆ ئەگەرێک دەردەکەوێت، کە ئەو ئەگەرە کەســێکی دیکە دەیەوێت بیکــات بە پرۆژەی خۆی. لەبەر ئەوە لەنێو جیهاندا دەبێت بە (نا)، ئەو چەمکەی بۆ یەکەمجار کۆیلە بەرانبەر خاوەنەکەی بەکاریدەهێنێت یان زیندانییەک لە کاتی ڕاکردندا لە ئاستی پاسەوانەکاندا دەریدەبڕێت. تەنانەت کەسانێک، وەکو (بەرپرس، پاسەوانی زیندان یان چاودێرێک) هەن، کە ژیانی کۆمەڵایەتییان لەسەر چەمکی (نا) ڕاوەستاوە. کەسانی دیکەش ئەم چەمکە دەکەن بە بەشێکی جیهانی ناوەوەیان و کەسایەتیان دەبێت بە ڕەتدانەوەیەکی بەردەوام. ئەمەش واتای گوتەکەی شیلەرە، کە دەڵێت، "مرۆڤی ڕیسوا" لە ڕاستیدا (نا)یە.

بــەڵام هەڵوێستی دیکەش لە بوونی مرۆڤدا هەن بەرەوناوەوەی ئاگامەندیمان دەبەن. گاڵتە یەکێکە لەو هەڵوێستانە. مرۆڤ لە گاڵتەکردندا ئەو شتە ڕەتدەداتەوە، کــە دەیەوێت دەریبڕێت. لە پێنــاوی ئەوەی باوەڕی پێنەکەیــن بەو باوەڕەمان دەگەیەنێت. ئەوە ڕەتدەداتەوە، کە دەیسەلمێنێ و ئەوەش دەسەلمێنێت، کەڕەتی دەداتەوە. بابەتێکی پۆزەتیڤمان دەخاتە بەردەست و ئەو بابەتە هەمانکات بێجگە لەهیچ، چی دیکە نییە. هەڵوێستەکانی ڕەتدانەوە بەرانبەر (خۆ) پرسیارێکی نوێ لە بەردەمماندا قوتدەکاتەوە: ئێمە چین تاکو بڵێین مرۆڤ ئەگەری خۆڕەتدانەوەی هەیە؟ بەڵام لێکۆڵینەوە لەســەر (خۆ—ڕەتدانەوە)ی هەمەکی لە دەرەوەی بواری نوســراوەکەماندایە. ئــەو جۆرە هەڵوێستانــەی دەکەونە ژێر ئەم سەرباســەوە فــرە و جۆراوجۆرن. لەوانەیە بتوانین زۆر بە کورتی باســیان بکەین. لەبەرئەمە

پێویستــە ئەو هەڵوێستــە هەڵبژێرین، کە لە بوونی مرۆڤــدا لەوانی دیکە زۆرتر گرنــگ و بنەڕەتییە. هەروەها لەم هەڵوێستــەدا ئاگامەندی لە جێگەی ڕووکردنی ڕەتدانەوەکــەی لە بابەتێکــی دەرەکی ڕوو لە خۆی دەکــات. ئەم هەڵوێستە بۆ مــن بڕوای خراپــە. هەندێکجار بــڕوای خراپ لەگەڵ ناڕاســتیدا جیانابێتەوە. بەبێ جیاوازی ئەو کەســەی توشی بڕوای خراپ دەبێت، بە درۆزن لەگەڵ خۆیدا دایدەنێیــن. لەبەرئەمە بڕوای خراپ بە درۆکردن لەگــەل خۆدا ناوزەد دەکەین و لە درۆکردن بە شێوەی گشــتی جیادەکەینەوە. ئێمە لەســەر ئەو خاڵە هاوڕاین، کــە درۆکردن هەڵوێستێکی نەرێیە. بەڵام نەرێی بوونەکە ناکەوێتە ســەر خودی ئاگامەنــدی و ڕوو لە بابەتێکــی بەرز[دەرەکی]دەکات. هەروەهــا ناوەڕۆکی درۆ لەوەدایە، کە درۆزنەکە ڕاســتی دەناســێت بەڵام دەریناخــات. ئەوەی لە شتێک نەزانێــت، درۆی لە بارەوە ناکات و ئــەو کاتەی بە هەڵەشدا دەچێت درۆ ناکات. چاکترین وەسفکردنی درۆزن ئەوەیە بڵێین، ئەوەی درۆ دەکات گوێنەدەرە و ڕاستی دەناسێت، بەڵام نکۆڵی لێدەکات. ڕاستییەکە ڕەتدەداتەوە و ئەوەش ڕەتدەداتەوە، کە ڕەتی داوەتەوە. ئەم هەڵوێستە دوو جار ڕەتدانەوەیە و پێویستی بە بابەتێکی بەرز و دەرەکی هەیە. ئەو هۆکارەی درۆی لە بارەوەکراوە شتێکی بەرزە و بوونی ڕەتدراوەتەوە. ڕەتدانەوەکەی ناوەوەش دەکەوێتە ســەر بەکارهێنانی وشەکان بۆ دەربڕینی خۆئامادەکردنەکەی درۆزن، کە ئەرێ یە؛ دەتوانرێت حوکمی سەلماندنی بەسەردا بدرێت. درۆزن دەیەوێت فێڵ بکات و ئەوەش لە خۆی ناشارێتەوە. بەڵکو بــە پێچەوانەوە، ئەو کاتەی پرســیاری لێدەکرێت پەنای بــۆ دەبات. بە ئاشکرا دەستەڵات بەســەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانیا دەگرێت. بۆ سەرگرتنی درۆکەش ئەو گوتانەی وەکو (من هەرگیز فێڵت لێناکەم! ئەمە ڕاســتە! یان سوێند دەخۆم) بەکاردەهێنێت، بابەتی ڕەتدانەوەی ناوەکین. بەڵام درۆزنەکە بە مەبەســتی خۆی دانانێت. درۆکــردن دیوی ناوەوەی ئاگامەندی دەرناخات؛ ڕەتدانەوەکانی ڕوو لەو بابەتە دەرەکییانە دەکان، کە ئاگامەندی لەنێو خۆیدا هەڵیان ناگرێت. لەبەرئەمە، درۆکردن پێویستی بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی نییە. باســکردنەکەشمان لەســەر ڕەتدانەوەکان بەبێ گۆڕان بۆ فێڵکردنیش دروستە. بێگومان ئێمە باسی درۆکردنی نموونەییمان کردووە؛ هەندێک جار ڕوودەدات درۆزنەکە دەبێت بە قوربانی درۆکانی خۆی، خۆی بە تــەواوی باوەڕ بە درۆکردنەکەی ناکات. ئەم جۆرە درۆکردنانەش دەکەونە نێوان بڕوای خراپ و ناڕاســتییەوە. درۆکردن هەڵوێستە بەرەو بابەتێکی بــەرز و دیاردەیەکی ئاســاییە، کــە هایدیگەر بە بوون لەگەڵ کەســانی دیکەدا ناوزەدیدەکــات. ئاماژە بۆ بوونی من و بوونی کەســانی دیکــە، هەروەها بوونی کەسانی دیکە بۆ من دەکات. کەوابوو، دژوار نییە بڵێین درۆزن لە درۆکەی خۆی بە ئاســانی تێدەگات و دەزانێت ئەو ڕاســتییە چییە و دەیەوێت گۆڕانی بەسەردا

بهێنێت. ئەوە بەســـە بۆ ئەو، کە ویستی خۆی بەرانبەر کەسانی دیکە دەرناخات و کەســـانی دیکەش درۆکەی بە ڕاست وەردەگرن. لە درۆکردندا ئاگامەندی خۆی لە کەســـانی دیکە دەشارێتەوە. بۆ بەرژەوەندی و ســـودی خۆی باوەڕ بە جۆرێک دووانەی ئۆنتۆلۆجی لەنێوان خۆی و هەروەها ئەو خۆیەی کەسانی دیکە دەیبینن دەهێنێـــت. ئەگەر بڕوای خراپ درۆکردن بێـــت لەگەڵ خۆدا حاڵەتەکە دەگۆڕێت. بـــە دڵنیاییەوە ئـــەوەی خاوەنی بڕوای خراپە ڕاســـتییەکی ناخۆش دەشارێتەوە یان ناڕاســـتییەکی خۆش دروســـتدەکات. لەم ڕووەوە دەردەکەوێت بڕوای خراپ بونیادی درۆکردنی هەبێت. ئـــەوەی لە درۆکردنی جیادەکاتەوە لەوەدایە، کە من لە بڕوای خراپدا ڕاســـتییەکە لە خۆم دەشارمـــەوە. دوو لایەنی هەڵخەڵەتێنەر و هەڵخەڵەتێنراو ســـەرهەڵنادەن. بە پێچەوانەوە، بڕوای خراپ جەخت لەسەر یەک لایەنی ئاگامەندی دەکات. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشـــێت، کە بڕوای خراپ وەکو هەڵوێستەکانی دیکەی مرۆڤ پەیوەندی بە بوونی کەســـانی دیکەوە نییە. بوونی کەسانی دیکە دەبێت بە بارودۆخێک، کە بڕوای خراپ ڕێگەی تێپەڕبوونی دەدات؛ بڕوای خراپ شتێک نییە لە دەوەوەی ڕاســـتەقینەی مرۆڤەوە سەرهەڵدات. کەس توشی نابێت و حاڵەت نییە. ئەوەی بڕوای خراپ دروستدەکات خودی ئاگامەندییە. لەبەرئەمـــە پێویستە بـــڕوای خراپ ویست و پرۆژەی ئاگامەنـــدی بێت؛ پێویستە ئاگامەندی لە بڕوای خراپ تێبگات و تێگەیشـــتنەکەشی لەســـەر کۆجیتۆی پێش تێرامان ڕاوەســـتابێت. پێویستە بزانین ئـــەوەی درۆکە دەکات و درۆکەی لەگەڵدا دەکرێت یەک کەسن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت من، کە ئەو کەسەم درۆکە دەکەم ڕاستییەکە دەزانم و لە بەرئەوەشە لە خۆمی دەشارمەوە و خۆم هەڵدەخەڵەتێنم. چەند بە تەواوی ڕاســـتییەکە بزانـــم ئەوەندەش بە چاکی دەتوانم بیشـــارمەوە. ئەمەش لە دوو کاتی جیاوازدا ڕوونادەن و لە یەک کاتدا سەرهەڵدەدەن و سەر بە یەک پرۆژەن. چۆن درۆکردن دەمێنێتەوە ئەگەر دوو لایەنەکەی لێ دابڕین؟

بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا، شەفافیەتی ئاگامەندی دەخەینە بەردەم. ئـــەوەی لە بڕوای خراپـــدا دەژی دەبێت ئاگای لە بڕوای خراپ بێت چونکە بوونی ئاگامەندی هەمیشـــە ئاگاییە لە بابەتەکـــەی. کەوابوو، بۆ ئەوەی ئاگام لە بڕوای خراپ بێت، پێویستە لە بڕوای چاکدا بم، بە تایبەتی بۆ ئەو کاتەی، کە هەســـت بە بڕوا خراپەکەی خۆم دەکەم. بەڵام ئەم سیستەمە سایکۆلۆجییە لەناودەچێت. پێویستە لەســـەر ئەو خاڵە ڕێکەوین، ئەگەر من بە ئەنقەســـت درۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم، من لە درۆکردنەکەمدا ســـەرکەتو نابم چونکە درۆکردنەکە دەناسم؛ ئاگاییم درۆکردنەکـــە دەیڕوخێنێت. لێرەدا دیاردەیەکی لەنابـــراو دێتە کایەوە، کە تەنیا لەنێو جیاوازییدا دەتوانێت هەبێت. ئەم حاڵەتە زوو زوو ڕوودەدات و لە ڕاســـتیدا بڕوای خراپ لەناودەبرێت و بەردەوامیش لەنێوان بڕوای چاک و بێ دەربەستییەکەی

ئێمەدا سـەرهەڵدەدات. هەرچەنـدە بڕوای خراپ بوونێکی نادیـار و دادەنرێت بونیادێکـی دەروونی هەیە ،کـە بەهەمانکات حاڵەتێکە بەردەوام و metastable درێژخایەن.[٣٦] لای هەندێک شێوازێکی ئاسایی ژیانە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەو کەسەی لە بڕوای خراپدایە ناتوانێت بڕوای چاکی هەبێت یان بێ دەربەستانە بژی. لەوێدا هەست بە شەرمەزاری دەکەین، کە نەتوانین واز لـە بڕوای خراپ بهێنین و لێی تێنگەیـن. هەندێک بۆ خۆ دوورخستنەوە لەم گرفتانە پەنا بۆ ئەودیو ئاگامەندی دەبەن. بۆنموونە، لە سایکۆلۆجی شیکەرایەتیدا گریمانەی چاودێری بەکاردەهێنن، کە دەبێت بە هێڵی جیاکردنەوە لەگەڵ نەریت و فەرمانگەی پەساپۆرت دەرکردن و پارەدان و هتد. لەوێوە دوو لایەنە هەڵخەڵەتێنەر و هەڵخەڵەتێنراوەکە دەستنیشـان دەکەن. لێرەدا هاندەرەکان دەبن بە پێکهاتەی ڕاستەقینەی بوونی تاکە کەس. هاندەریش نە ڕاستە و نە درۆ چونکە شتێک نییە بە تەنیا و سەربەخۆ هەبێت. وەکو بوونی ئەم مێزەیە، کە تەنیا ڕاست و ناڕاست نییە، بەڵکـو شتێکە، کە هەیە یان ڕاسـتەقینەیە. هێماکانیش بۆ ئاماژەکردنی هاندەرەکـان لەنێو ئاگامەندییـدا ناوەکین. ترس لە بیرچوونـەوە و خەونەکان، وەکـو وشـە و لا ڕەفتاری درۆزنێـک کۆنکرێتیە. پەیوەندی نێـوان بکەر و ئەم دیاردانـەش لە پەیوەندی نێوان هەڵخەڵەتێنەر و هەڵخەڵەتێنراو دەچێت. جۆرە ڕاستییەک لە ڕەفتار و کردەوەی هەڵخەڵەتینەرەکەدا هەیە؛ بۆنموونە درۆکردنەکە لای هەڵخەڵەتینراوەکە دەبێت بە ڕاسـت. هەروەها ڕاسـتیش لەنێو بەکارهێنانی هێماکانـدا دەدۆزرێتەوە: ئەمەش زانای سـایکۆلۆجی شیکاری لە دەروونی تاکە کەسـەکاندا دەریدەهێنێت و ئاماژەی بۆ دەکـات بەچاودێر دایاندەنێت. کەوابوو، بکەر لە بارەی واتای هەڵوێستەکەیەوە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت. ئەو هەڵوێستە بە شتێکی کۆنکرێتی نەک ڕاستی دادەنیت چونکە ناتوانێت بۆ ئەو پێکهاتە دەروونییەی بگەڕێنێتـەوە، کە بوونێکی جیاوازی هەیـە. فرۆید لەگەڵ دامەزراندنی جیاوازی نێوان 'ئید' و 'ئیگۆ' دا دەروونی کردووە بە دوو بەشەوە.[٣٧] من 'ئیگۆ' و 'ئید' نیم و پەیوەندییەکی تایبەتیشم بەو دیو ئاگامەندیمەوە نییە. من دیاردەیەی دەروونی خۆمم چونکە دیاردە دەروونییەکانم ڕاستەقینەیەکن لەئاگامەندی مندا. بۆ نموونە من دەمەوێت ئەو پەرتووکەی لەسەر ڕەفەکە دانراوە بدزم. من ئەو ئارەزووەم، کە دەیەوێت دزییەکە بکات؛ من ئەو ئارەزووە بەرجەسـتە دەکەم و بۆ دزیکردنەکە

٣٦ ئەم چەمکە metastab زاراوەیەکە سارتەر بۆ شێوازی یەکەمی بڕوای خراپ بەکاریهێناوە لە دوو بەش پێک هاتووە (ئەودیو-نەگۆڕ) ؛ بەواتە لەودیو گۆڕانەوە. لەڕاستیدا من نەمزانی چ چەمکێکی کوردی بۆ دابنێم.

٣٧ ئەم دوو زاراوەیەی فرۆیدم وەکو خۆیان داناوە و بۆ کوردیم وەرنەگێڕاون: (ئێد) سەرچاوەی حەز و ئارەزووەکانی لەشە؛ (ئیگۆ) خۆیە؛ فرۆید باوەڕی بە بەشی سییەمی دەروونیش هەیە، کە بە (سوپەر ئیگۆ) خۆی بەرز ناوزەدیدەکات .(وەرگێڕ)

دەیخەمەگەر. دزیکردنەکەش، کە من لە ئارەزووەکەمدا دەریدەبڕم بەستراوە بە نەبوونییەوە یان بەرژەوەندی من لەپەرتووکەکەدا، نرخی پەرتووکەکە-لەڕاستیدا پرۆسەیەکە لە ئاکامی خۆ—سزادانەوە پەیدابووە و کەم یان زۆر بە گرێی ئۆدیبەوە بەستراوە.[٣٨] هاندەرەکە بۆ دزیکردن و ڕاستییەکی لەنێو خۆیدا شاردۆتەوە و ئێمە بەلێکۆڵینەوە دەتوانین بیدۆزینەوە. پێوەری ئەو ڕاستییەش کۆمەڵێک فاکتۆری دەروونین، کە دەژمێردرێن. دوا جاریش بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستییە پێویستیمان بەبیریارێکی سایکۆلۆجی شیکەرێتی هەیە، کە دەبێت بە یاریدەدەر لەنێوان ژیانی ئاگامەنــدی من و هاندەرەکانــی ئەو دیو ئاگامەندیــم. دەردەکەوێت (ئەوی دی) توانیبێتی لە ســەرهەڵدانی تێهەڵکێشــەی نێوان بابەتی ئــەو دیو ئاگامەندییم و دژەبابەتــی ئاگامەندیم کاریگەربێت. من لە ڕێگەی یارمەتیدانی ئەو کەســەوە لە خۆم تێدەگەم. من لە پەیوەندیەکەمدا لەگەڵ 'ئید' لە ڕێگەی ئەو کەســەوە خۆم دەبینمــەوە. ئەگەر کەمێک زانیاریم لە ســایکۆلۆجی شیکەرێتیدا هەبێت دەتوانم دەروونی خۆم شیبکەمەوە. بەڵام من لەوێدا لە شیکردنەوەکەمدا سەرکەوتودەبم، کە بڕوا بە حەدەسەکان نەکەم و لە دەرەوەدا خۆم ببینم. ئاکامەکانیشی، کە خۆم بەتەنیا یان لەگەڵ یارمەتی کەســێکی دیکەدا پێیان گەیشتوم دڵنیاییم نادەنێ. ئەوان تەنیا زەمینە بۆ ســەلماندنی گریمانەیەکی زانستی خۆشدەکەن. گریمانەی "گرێی ئۆدیب"، وەکو بیردۆزەی ئەتۆمی بیرۆکەیەکی ئەزمونگەرانەیە؛ پیەرس لەم بارەیەوە دەڵێت. نابێت خۆمان لەسەرجەمی ئەزموونەکان جیابکەینەوە، کە لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا دەڕوانینە داهاتوو. کەوابوو، ســایکۆلۆجی شیکەرێتی لەجیگەی بڕوای خراپ درۆکردن بەبــێ درۆکەرەکە دادەنێت؛ بۆم ڕووندەکاتەوە چۆن بەبێ ئەوەی درۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم درۆم لەگەڵدا دەکرێت، چونکە پەیوەندییەکی نێوان ئەو کەسە [شیکەرەوەکە] و من لە پەیوەندی نێوان من و دەروونی خۆم جیاناکاتەوە. دوو لایەنی هەڵخەڵەتێنەر و هەڵخەڵەتێنراو لا دەبات. لەگەڵ دامەزراندنی دوولایەنە دەروونییەکــەدا 'ئید' و 'ئیگۆ' بارودۆخی پێویست بــۆ درۆکردنیش لەناودەبات. بونیــادی بوون—لەگەڵ—ئەواندا بــە قوڵی لەنێو دەروونی منــدا دادەمەزرێنێت. ئایــا ئەم بۆچوونە ئێمە ڕازیدەکات؟ نزیکبوونەوەمان لە بیردۆزەی ســایکۆلۆجی شیکەرێتی دەریدەخات ئەم بیردۆزەیە ئەوەندە ئاسان نییە. دانانی 'ئید' بە شت نالەبارە. 'شت' گوێناداتە ئەو بیرۆکانەی باسیاندەکەین، بەڵام 'ئید بە پێچەوانەوە گوێیاندەداتێ، بە تایبەتی لەو کاتەدا دەمانەوێت ڕاستییەک بدۆزینەوە. فرۆید باسی جۆرێک بەرگریکردن دەکات، کە پزیشــکێک لــە کۆتایی قۆناخی یەکەمدا هەوڵی

---

٣٨ گرێی ئۆدیب چەمکیکی فرۆیدە بۆ حەزو ئارەزووی جوتبوون لە دەروونی کوڕدا لەگەڵ دایکدا بەکاردێت. فرۆید ئەم چەمکەی لە شانۆگەری ئۆدیبی پاشای سۆفۆکلیسەوە وەرگرتوە، کە ئۆدیب لەو شانۆگەریەدا باوکی دەکوژێت و لەگەڵ دایکیدا هاوسەرێتی دەبەستێت.(وەرگێڕ)

دۆزینەوەی ڕاستی دەدات. ئەم بەرگریکردنە ڕەفتارێکی دەرەکییە: نەخۆشەکە بەرگری دەکات، نایەوێ هیچ بڵێت و زۆر بە جوانی باسی خەونەکانی دەکات، هەندێک جار خۆی لە چارەسەرکردنە دەروونییەکەش دوور دەخاتەوە. دەگونجێت ئەو پرسیارە بکەین، چ بەشێکی دەروونی نەخۆشەکە بەرگری دەکات. ئەو بەشە 'ئیگۆ' نییە، کە بە سەرجەمی فاکتۆرەکانی ئاگامەندی دادەنرێت؛ ئەمەش نامانخاتە گومانەوە بەرانبەر پزیشکەکە، لەوەی واز لە چارەسەرکردنەکە بهێنێت، لەبەر ئەوەی 'ئیگۆ'، وەکو پزیشکەکە بە واتای ڕەتدانەوەکانی گەیشتوە. لەوانەیە 'ئیگۆ' بە گریمانەکەوە ببەستێتەوە، کە لەوەو پێش نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە. ئایا دەتوانین بڵێین، نەخۆشەکە بەو ڕاستییانەی پزیشکەکە ڕۆژانە بۆی دەردەخات، پەرێشان دەبێت و هەوڵدەدات لەناویان بەرێت و لەناخیشەوە دەیەوێت لە چارەسەرکردنەکە بەردەوام بێت؟ لەم حاڵەتەدا ناتوانین بڕوای خراپ بۆ ئەودیو ئاگامەندی بگەڕێنینەوە؛ بڕوای خراپ بە هەموو ناکۆکییەکانییەوە لەنێو ئاگامەندییدایە. بەڵام ئەمە بەرگریکردنەکە نییە، کە پزیشکەکە باسیدەکات؛ بۆ ئەو بەرگرییەکە نهێنیە و لە قولاییدایە، لە دوورەوە دێت؛ ڕەگوڕیشەی لەوێدا داکوتیوە، کە پزیشکەکە دەیەوێت ڕوونیبکاتەوە. سەرەڕای ئەمە، مەحاڵە بەرگریکردنەکە بۆ ئەو سەرچاوە ئاڵۆزە بگەڕێنێتەوە، کە پزیشکەکە دەیەوێت بیخاتە ڕوو. ئەو سەرچاوە ئاڵۆزە دەستکردی پزیشکەکەیە چونکە پزیشکەکە بە ئاگاوە دەریدەبڕێ و دەیەوێت لە زمانی نەخۆشەکەی دەربهێنێت. تەنیا بە ڕێگەی چاودێریکردن[سانسۆر] ئەو بابەتە ڕەتدەدرێتەوە. لەوێوە لە پرسیارەکان و دۆزینەوەکانی پزیشکەکە تێدەگەین و دەمانەوێت شتێک دەربڕین یان بیشارینەوە. ئێمە لە چاودێریکردنەکەدا دەزانین چی خەفە دەکەین. ئەگەر زمان و میتۆدی سایکۆلۆجی شیکەرێتی ڕەتبدەینەوە بەو باوەڕەش دەگەین، کە چاودێریکردن لەگەڵ هەڵسوڕان بە چالاکییەکەی دەزانێت، چی خەفە کردووە. ئەگەر هەموو ئەو میتافۆر و بیرۆکانەی لە بارەی هێز و دەستەڵاتە نادیارەکانەوە هەن ڕەتبدەینەوە، دەبێت ئەو شتە هەڵبژێرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت چاودێریکردن دەزانێت چی دەکات. ئەگینا چۆن ڕێگە بە جووتبونێکی سێکسی یاسایی دەدات یان برسێتی و تینوێتی و پێویستی بۆ نوستن بە ئاگاوە دەردەبڕێت؟ چۆن دەتوانێت لەوە زۆرتر چاودێری نەکات یان بکەوێتە ژێر فێڵکردنی ئارەزووەکانیەوە؟ تاوانبارکردنی هاندەرەکان بەس نییە. پێویستە ئەو هاندەرەرانە بۆ ئەوەی بیشارێتەوە بناسرێن. بە کورتییەکەی چۆن چاودێریکردن ئەو هاندەرانەی پێویستە خەفەبکرێن جیادەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بزانێت جیایکردوونەتەوە؟ چۆن زانین لەبارەی خۆیەوە بێ ئاگا دەبێت؟

بە بۆچوونی ئەلاین، لە زانیندا دەزانیت، کە تۆ دەزانیت. ئێمە دەتوانین لەوەش زۆرتر بڵێین، کە هەموو زانینێک ئاگاییە لە زانین. ئامادەنەبوون و بەرگریکردنی

نەخۆشەکە لە دەربڕینی ئەو شتانەی دەیشارێتەوە ئاماژە بۆ زانین دەکات. هەموو ئەو چالاکییانەی نەخۆشەکە بۆ شاردنەوەی ئەو شتانەی دەیزانێت ئەوە دەگەیەنن، کـــە نەخۆشەکە، وەکو چاودێرێک لە خۆی بە ئاگایە. بەڵام ئەو چاودێرە چ جۆرە خۆ–ئاگاییەکـــی هەیە؟ دەبێـــت ئاگایی بێت لەوەی، کە ئاگـــای لە خەفەکردنی هاندەرەکانێتی، کە دەریاندەخات و ئاگاداریان نییە. ئەگەر ئەم چاودێرە لە بڕوای خراپدا نەبێت چییە؟ مادامەکی ســـایکۆلۆجی شیکەرایەتی بۆ لەناوبردنی بڕوای خراپ لەنێوان ئاگامەندی و ئەودیو ئاگامەندییدا، ئاگامەندییەکی ســـەربەخۆی بۆ بـــڕوای خراپ دامەزراندووە، ئەوا هیچی بۆ ئێمە نەکردووە. دامەزراندنی لایەنەکان بۆ دەروون دووان یان ســـیان بن (وەکو ئید و ئیگۆ و ســـوپەرئیگۆ) کێشەیەکی زمانەوانی و وشەسازییە. شاردنەوەی ڕاستییەک لەخۆ ئەوە دەگەیەنێت ئەو (خۆ)یە یەکەیەکی سایکۆلۆجییە و چالاکییەکی دوو لایەنی هەیە. لە لایەکەوە هەوڵدەدات بەرجەستەی بکات و لە لاکەی دیکەوە خەفەی بکات. هەر یەکێک لەم دوو لایەنەی چالاکییەکە تەواوکەری ئەوی دیکەیە و ئاماژە بۆ بوونی دەکات. بە جیاکردنەوەی ئاگامەندی لە لایەنی ئەودیوی ئاگامەندییەوە زانایانی ســـایکۆلۆجی شیکەرایەتی لە جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنەدا ســـەرکەوتو نەبوون چونکە لبیدۆ کوێرانە ڕوو لە دەربڕینەکانـــی ئاگامەندی دەکات و دیاردەکانی نێـــو ئاگامەندیش نەبزێون و ئاکامێکی ساختەیان هەیە. سایکۆلۆجی شیکەرایەتی ئەم دوو لایەنەی ڕەتدانەوە و ڕاکێشانی داوەتە دەست چاودێرکەرەکە.

لەســـەرو ئەمەوە، ئـــەو یەکێتییـــەی ســـەرجەمی دیاردەکانی (خەفەکردنی هاندەرەکان و شاردنەوەیان لەژێر دەمامەی هێماکاندا) تێدایە بە تەواوی باسنەکراوە و پەیوەندی نێوان جیاوازییەکان هەڵنەبەســـتراوە. چۆن هاندەرێکی خەفەکراو بە جۆرێکی دیکە خۆی دەردەخات ئەگەر: **یەکەم**، بە خۆی نەزانێت، کە خەفەکراوە. **دووەم**، نەزانێت خزێنراوەتە پشتەوە چونکە بەو جۆرەی هەیە نامانەوێت. **سێیەم**، لەبارەی پرۆژەی شاردنەوە و هەڵخەڵەتاندنەکەوە نەزانێت؟

چۆن بتوانین باســـی خۆشیەک یان دوودڵی بکەیـــن ئەگەر ئاگامەندی لەودیو چاودێرەکەوە ئاگای لە ئاکامەکە نەبێت و هەمانکات، نەزانێت ئەو ئاکامە ئەوەیە، کـــە حەزدەکەین بیگەیەنێ یان خۆمانی لێبپارێزیـــن؟ فرۆید لەگەڵ دابەشکردنی دەروونـــدا زۆری لە خۆی کردووە و لە هەمـــوو شوێنێکا یەکێتییەکی جادوگەرانە لەنێو بەشەکان و دیاردە دوورەکاندا دروســـتبکات. هاندەرێکی ئەودیو ئاگامەندی بە جادو خەسڵەتی 'خەفەکردن' یان 'تاوانبارکردن' ی پێداوە و ڕەنگاوڕەنگ کراوە و جادوگەرانـــەش جۆرێک لە هێماگەری بۆ هێناوینەتە کایەوە. بەهەمان شێوەش، دیاردەکانی نێـــو ئاگامەندی لەنێو هێما واتادارەکانـــدا ڕازاونەتەوە و بە تەنیاش ئـــەو واتایانە بەبێ پەیوەندییان بەڕوونی دەرناکـــەون. بێجگە لەم کەموکەرتییە،

جادوکردنەکە ڕێگەی پێکەوەبوونیان لەودیو ئاگامەندییەوە ناگرێت. شوێنکەوتوانی ئـــەم بیردۆزەیە نەیـــان توانیوە لە بڕوای خراپ ڕابکەن و باســـینەکەن. ئەمەش هانی (شتێـــگل)، زانای ســـایکۆلۆجی لە ڤینس دا، واز لە نەریتی ســـایکۆلۆجی شیکەرایەتی بهێنێت و بنوســـێت، "هەمـــوو جارێک لـــە توێژینەوەکەمدا ئەوەم سەلماندوە، کە ناوکی دیاردە دەروونییەکان ئاگامەندییە."

هەروەهـــا لەو نموونانەدا، کە لەم توێژینەوەیەدا باســـیاندەکات بڕوای خراپی دۆزیوەتـــەوە، کە فێرگـــەی فرۆید ئاماژەی بۆ ناکات. بـــۆ نموونە ژنێک هەیە لە ژیانـــی مێردایەتیـــدا منداڵی نابێت: لەگەڵ هاوســـەرەکەیدا توانیویانە نەک تەنیا ئاڵۆزی کێشـــەکەیان خستۆتە لایەنێکی تاریک و قوڵی دەروونیانەوە، بەڵکو ئەو هەڵوێستانەشیان شاردۆتەوە، کە لە دەرەوەدا دەبینرێن و دەتوانرێت بناسرێنەوە. زۆرجـــار، پیاوەکە بە شتێگل دەڵێت، ژنەکە حەزی خۆی بۆ منداڵ دروســـتکردن دەربڕیوە، کەچی ژنەکە، کە پرســـیاری لـــەو بارەیەوە لێدەکرێت بە توندی ڕەتی دەداتـــەوە و نکۆڵی لێدەکات. لێرە جۆرێک لـــە ڕوخاندن دەدۆزینەوە. بەگوێرەی زانیارییەکـــەی شتێگل دەردەکەوێت، ئەو ژنانەی بە حاڵەتی نەزۆکی گەیشـــتون، لەپێشەوە ئەو خۆشییەی لێی دەترسن، دەڕوخێنن. زۆریان لە کاتی جوت بووندا لەگەڵ هاوســـەرەکانیان بیر لە سێکس ناکەنەوە و بیریان دەبەن بەلای کاروباری ڕۆژانە و ئیشـــی ناوماڵ. ئایا کەس هەیە لێرەدا باســـی ئەودیو ئاگامەندی بکات؟ هێشـــتا، ئەگـــەر ئەو ژنە نەزۆک و ســـاردیش بێت، ئاگایی خـــۆی لەو خۆشییە لەناوبەرێت، ئەوا لەو ڕووەوە لەگەل خۆیدا ناکۆکە و دەیەوێت سارد و سڕیەکە بۆ خۆی بسەلمێنێت. کەسێک بۆ ئەوەی نکۆڵی لە چێژوەرگرتن بکات دەبێت دان بە بوونی ئەزموونی چێژ وەرگرتنەکە بهێنێت. ئەمەش لەخۆیدا بڕوای خراپە. بۆئەوەی ئەزموونەکە ڕەتبداتەوە دەبێت ئەزموونەکەی هەبێت. لێرەدا، ئێمە لەسەر زەمینەی سایکۆلۆجی شیکەرایەتی ناتوانین بمێنینەوە. پەنابردنەبەر ئەو دیو ئاگامەندی و دابەشکردنی دەروون بە ئاکامێکی تەواومان ناگەیەنێت. لەلایەکی دیکەوە لەبڕوای خراپدا چەند هەڵوێستێک سەرهەڵدەدەن، کە لەنێو ئاگامەندییدان. لەبەرئەمە ئەو گرفتەی باسمانکرد هێشتا چارەسەر نەکراوە. ئەگەر بمانەوێت خۆمان لەم گرفتە ڕزگاربکەیـــن، پێویستە لە نزیکەوە باســـی جۆرەکانی بـــڕوای خراپ بکەین. ئەم باســـکردنەش چاکتر ئەو بارو دۆخەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە بڕوای خراپی تێدا پەیدادەبێت؛ ئەو پرسیارەش خۆی دەسەپێنێت و دەبێت وەڵامی بدەینەوە: "ئەو بوونەی مرۆڤ چییە، کە دەتوانێت بڕوای خراپی هەبێت؟"

بیر لەو ژنە بکەوە بۆ یەکەمجار لەگەڵ پیاوێکدا دەچێتە ژوانەوە. ئەو زۆر چاک لە مەبەستی پیاوەکە تێدەگات و دەزانێت زوو یان درەنگ دەبێت بڕیاریشی لەسەر بـــدات. بەڵام بە پێویستـــی نازانێت پەلەی تێدابکات. تەنیـــا بیر لەوە دەکاتەوە

چۆن بەڕێزانە خۆی نیشـــانی پیاوەکە بدات. ئەو نازانێت ئەوەی لەم هەڵوێستەدا دەســـتیدەکەوێت ئێمە بە "یەکەم نزیکبوونـــەوە"ی ناوزەددەکەین. ئەو نایەوێت لە هەڵوێستەکەیدا چوونە پێشـــەوەکە ببینێـــت و حەز ناکات بێجگە لە واتا زەق و دەرەکییەکـــان بیر لـــە واتاکانی ژێرەوەی گفتوگۆی پیاوەکـــە بکاتەوە. ئەگەر پیاوەکـــە بڵێت، تـــۆ زۆرجوانیت، هەموو کاڵایەکی ســـێکسی لەبەر دادەکەنێت و ڕاســـتەوخۆ بە واتایەکی دیکـــەوەی گرێدەدات و خەســـڵەتێکی دیکەی دەداتێ. پیاوەکە، وەکو کەســـێکی ڕاستگۆ و بەڕێز دەبینێت، ئەمەش بۆ ئەو لەو ڕاستییە دەچێـــت، کە مێزەکـــە چواگۆشەیە یان ڕەنگی دیوارەکە شینە. خەســـڵەتەکانی پیاوەکە بەمشـــێوەیە، وەکو خەســـڵەتی شتێک، دەبن بە نەگۆڕ و هەمیشـــەیی. هۆکـــاری ئەمەش لەوەدایە، کە ئـــەو ژنە نازانێت چی دەوێـــت. ئەو دەزانێت چ جـــۆرە حەز و ئارەزوویەک بووە بە هاندەری، بـــەڵام دەربڕینی حەز و ئارەزووی لەبەردەم پیاوەکەدا شەرمەزاری دەکات و دەیترســـێنێت. هەمانکات ڕێزلێنانیش بەسەرنجڕاکێش و خۆش دانانێت، ئەگەر تەنیا ڕێزلێنان بێت و مەبەستێکی دیکەی لە پشتەوە نەبێت بۆ ڕازیکردنی خۆی، لەم حاڵەتەدا، دەبێت جۆرە هەستکردنێک هەبێت، کە هەموو کەسایەتییەکەی بگرێتەوە- بۆ نموونە، هەموو سەربەستییەکەی بناســـێتەوە. پێویستە ئەم هەســـتکردنەش ئارەزوویێت و ببێـــت بە بابەتێک بۆ لەشـــی. لێرەدا نایەوێت ئەو ئارەزووە بناســـێت و بزانێـــت چییە. تەنانەت ناوی لینانێت. ناسینەوەکەی لەوێدا دەبینێتەوە، کە ئارەزووەکە ببێت بە پەسەندکردن و ڕێزلێنان و شێوازێکی دیکە وەرگرێت، کە ئەو، وەکو بابەتێکی گەرم یان تەنێک دەرناخات. بەڵام گریمان پیاوەکە دەستی ژنەکە دەگرێت. ئەم هەڵویستە ژوانەکە دەخاتە مەترســـییەوە و داوا لـــە ژنەکە دەکات خێرا بریارێـــک بدات. لانەبردنی دەســـتی لە نێو دەســـتی پیاوەکەدا ئەوە دەگەیەنێت ژنەکە حەزی لە دەستبازی پیاوەکەیە. ئەگەر دەستیشـــی لابەرێت ئەوا کاتە خۆشەکە تێکدەچێت و ژوانەکە دەشێوێـــت. لێرەدا ژنەکە دەیەوێت بڕیاردانەکـــەی خۆی[بۆ لابردن یان لانەبردنی دەستی] دوابخات. ئێمەش دەزانین دوای ئەمە چی ڕوودەدات؛ ژنەکە بەبێ ئەوەی ببینێت دەســـتی لەنێو دەستی پیاوەکەدا دەهێڵێتەوە. لەم حاڵەتەدا بە ڕێکەوت ژنەکە بووە بە هۆش. بوونـــی پیاوەکە، دەخاتە نێو پلەیەکی بەرزی بیرکردنەوە بەســـۆزەکەیەوە؛ باســـی چۆنیەتی ژیانی بەگشـــتی و ژیانی خۆی بەتایبەتی بۆ دەکات. کەســـایەتی خۆی نیشان پیاوەکە دەدات. لێرەدا دەستی لە نێو دەستی گەرمی پیاوەکەدا دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی بڕیار لەسەر لابردنی یان مانەوەی بدات. ئێمە دەڵێین، ئەم ژنە لە بڕوای خراپدا دەژی. چەند ڕێگەیەکیش بۆ مانەوەی بڕوای خراپ دەگرێتەبەر. ئەو هەڵوێست و ڕەفتارەکانی پیاوەکەی لە هەموو مەبەستێک ڕووتکردۆتەوە و وەکـــو خۆیان دەیانبینێت — کردوونی بە بوون— لەنێو—خۆیدا.

بـــەڵام ڕێگەشی بە خۆی داوە چێژ لە حەز و ئـــارەزووی پیاوەکە وەرگرێت و بە ڕادەیەکیـــش بەو جۆرە بیریلێناکاتەوە، کە هەیە و بە بەشتێکی بەرزی دادەنێت. دواجار، ئەوەندەش نکۆڵی لە بوونی لەشی خۆی دەکات و نایەوێت دەریخات، دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە ئەو لەش نییە. لە دەرەوەی لەشیەوە بیر لە لەشی دەکاتەوە و بەو تەنە نەبزێوەی دادەنێت، کە ڕووداوەکانی بەسەردا دێت بەبێ ئەوەی بتوانێت کاریگەرێتی بەســـەریانەوە هەبێت. چ یەکێتییەک لــە نێوان ئەم جۆرانەی بڕوای خراپدا هەیە؟ کۆکردنەوەی لایەنە ناکۆکەکان و تێهەڵکێش کردنیان هونەرە. هەر چەمکێـــک دابهێنین ئەو چەمکە ئاماژە بۆ دوو خەســـڵەتی بوونی مرۆڤ دەکات؛ مرۆڤ لە یەک کاتدا فاکتۆر و بەرزێتیشـــە. ئەم دوو لایەنەی ڕاستەقینەی بوونی مـــرۆڤ هاوئاهەنگییەک دەردەخەن. بەڵام بڕوای خراپ نایەوێت ببێت بە هۆکاری ســـەرهەڵدانی ئەو هاوئاهەنگییـــە و بچێتە ئەودیو تێهەڵکێشـــەکەیانەوە. بڕوای خراپ لەگەڵ پاراســـتنی جیاوازەکانیان لەیەکچونیشـــیان دەسەلمێنێت. فاکتۆر، وەکـــو شتێکی بەرز دەســـەلمێنێت و بەرزەکەش بە فاکتـــۆر دادەنێت. ئەمەش بەجۆرێک ڕوودەدات، کە تاکە کەس بە ناســـینی یەکێک لەم دوو لایەنە خۆی لە بەردەم لایەنەکەی دیکەشدا دەبینێت. لە هەندێک گوتندا پێکهاتەیەکی سازکراوی بـــڕوای خراپ بەئاســـانی دەدۆزینـــەوە. بۆنموونە لە ناونیشـــانی پەرتووکەکەی جاک چـــاردۆن "خۆشەویستی گەلێک لە خۆشەویستـــی زۆرترە." دەبینین چۆن یەکێتیەک لەنێوان خۆشەویستی و فاکتۆرەکەیدا دروســـتکراوە، "جووتبوونی دوو شت پێکەوە"، هەستەوەری، ئیگۆیزم، هەستکردنی میکانیکی غیرە لای پرۆست، بیرۆکەی جەنگی نێوان دوو سێکسەکە لای ئەدلەر و هتد. هەروەها خۆشەویستی، وەکو هەســـتکردنێکی بەرز، "ڕووباری ئاگرین" ی مۆریکا، تۆســـتەڵجا بۆ ژیانی هەمیشەگی، ئیرۆســـی ئەفلاتون و حەدەسی گەردوونی قوڵ لای لۆرینس و هتد. لێـــرەدا، فاکتۆرەکان لە پیناوی دۆزینەوەی خۆمان لەودیو ســـاتەکانی ئێستاوە جیدەهێڵیـــن. بارودۆخی بوونـــی مرۆڤ لەودیو فاکتـــۆرە دەروونییەکانەوە لەنێو جیهانێکی مێتافیزیکدا دادەنێین. لە لایەکی دیکەوە، ناونیشـــانی شانۆگەریەکەی ســـارمنت "من خـــۆم زۆر مەزن دەبینم"، کە ئاماژە بۆ بـــڕوای خراپ دەکات، بۆ ئەوەی لەنێو چوار دیـــواری فاکتۆرەکاندا زیندانیمان بکـــات لەبەردەم بەرزێتیدا ڕامان دەوەســـتێنێت. ئەم بونیادە لە گوتەیەکی ناوداری دیکەشدا دەبینین: "ئەو بووە بەو شتەی، کە لەپێشـــتر وابوو." یان لە گوتەیەکی دیکەدا، کە پێچەوانەی ئەم گوتەیە دەڵێت، "لە کۆتاییدا ژیانی هەمیشـــەیی مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ خودی خـــۆی." ئەم گوتانە دیاردەی بڕوای خراپیان تێدایە. پارادۆکسیان لەنێو خۆیاندا هەڵگرتوە، کە بیرکردنەوە دەهەژێنێت و ڕووبەڕووی شتێکی نادیاری دەکاتەوە.

لەڕاســـتیدا ئەم دیاردەیە ناوەڕۆکی باسەکەمانە. ئەوەی گرنگە بزانین ئەوەیە،

کە ئەمە پێکهاتەیەکی نوێ و بوونیادی بیرۆکەیەکی نوێ نییە؛ بە پێچەوانەوە، وا دانراون تاکو بەردەوام لە ڕوخاندندابن و ئێمە بتوانین هەر کاتێک ئارەزوومان کرد لە حاڵەتێکی سروشتی ئێستادا ڕوو لە بەرزێتی بکەین و لە بەرزێتیشەوە بەرەو ئێستا بگەڕێینەوە.

بۆمان دەرکەوت چۆن بڕوای خراپ سود لەو گوتانە وەردەگرێت، کە هەموویان دەیانەوێت ئەوە دامەزرێنن، کە من ئەوەنیم ئێستا هەم. ئەگەر من تەنیا ئەوەبم، کە ئێستا هەم، دەمتوانی بۆنموونە بیر لەوەش بکەمەوە کەسێک بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتەوە ڕەخنەم لێبگرێت و منیش پرسیار لە بوونی خۆم بکەم، بەزۆریش ئەو ڕاستییە وەربگرم. بەڵام سوپاس بۆ بەرزێتی. من تەنیا ئەوەنیم، کە ئێستا هەم. بەو جۆرەی سۆزان بە فیگارۆ دەڵێت، "بۆئەوەی بیسەلمێنم من ڕاستم، پێویستە باوەڕ بەوەش بکەم، کە من کەسێکم دەگونجێت توشی هەڵەکردن ببم." مــن ئەو بوونەم شەرمەزار نابم چونکە بەرزێتی لەبەردەممدایە. دەتوانم لە بوونی خــۆم ڕابکەم. دڕاندنی جــل و بەرگەکەم دەخەمە ئەســتۆی ئەوانەی خەتابارم دەکــەن. بەڵام لایەنی نادیار و تەمومژاوی بڕوای خراپ لەوێدایە من، وەکو شتێک لە بەردەم بەرزێتییەکەمدا ڕادەوەستم. لەم حاڵەتەشدایە لە هەموو تاوابناربوون و خەتایەک ڕادەکەم. ژنەکە خۆی لە هەموو جۆرە حەز و ئارەزوویەک پاکدەکاتەوە، کــە دەبنە هۆکاری شەرمــەزاری. ئەو خۆی بە بوونێکی بــەرز دەبینێت. بەڵام، بــە پێچەوانەوە، "من خۆم زۆر مــەزن دەبینم" بە گۆڕانــی بەرزێتییەکەمان بۆ فاکتۆرەکان دەبێت بە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی بیانووەکان لە ئاستی ڕوخان و زەبونیمانــدا. کچێکی نازکەر بەڕادەیــەک هەوڵدەدات بەرزێتیەکە بپارێزێت، کە واتێدەگات ئەو ڕێزلێنانەی پیاوەکــە بۆیداناوە جۆریکە لەو بەرزێتییە. بەڵام ئەو بەرزێتیە دەچەقێنێت و فاکتۆرەکانی لە ئێستاوە توند دەیانبەستێتەوە. ڕێزلێنان بێجگە لە ڕێزلێنان چی دیکە نییە. ئەو شتە گیرخواردووەیە، کە لەوە زیاتر نابێت بە شتێکی دیکە.

ئــەم چەمکە ( metastable ) ەی "بەرزێتی—فاکتــۆری" یەکێکە لە ئامێرە بنەڕەتییەکانــی بڕوای خراپ، بەڵام تاکە ئامێــر نییە. ئێمە دەتوانین دوو لایەنی دیکــەش لەوێدا بدۆزینەوە، کاتێک دەڵێیــن، بوون— بۆ— خۆ لەگەڵ بوون—بۆ— کەسانی دیکەدا خۆی تەواو دەکات. هەموو هەڵوێستێکی من بە دوو چاو دەبینرێت؛ چاوی من و چاوی کەسانی دیکە. لەم دوو جۆرە بینینەدا بونیادی هەڵوێستەکەش گۆڕانی بەســەردا دێــت. بەڵام، وەکو دوایی ڕوونیدەکەینــەوە و هەر یەکێک لەو چاوانــە دەبینین، لەهــەر دوو حاڵەتەکەدا جیاوازی لە نێــوان بوون و دیاردەی بوونمــدا نابینرێت. ڕاســتی بوونم بەو شێوەیە دەناســرێت، کە خۆم دەردەخەم و کەســانی دیکە هەســتی پێدەکەن. ئەوەی من، وەکو بوون—بۆ—کەسانی دیکە

و بوون—بۆ–خــۆ هەمە، بەردەوام تێهەڵکێشـــەکە هەڵدەوەشێتەوە و لەنێو کایەی ڕاکـــردن و خۆشاردنەوە لـــە بوون—بۆ— خۆوە بۆ بوون—بۆ— کەســـانی دیکە و دیسانەوە بۆ بوون—بۆ—خۆ دەمهێڵێتەوە. هەروەها ئەو بوونەشمان لە ناوەڕاستی جیهاندا لـــە ڕێگەی ژنەکەوە بینی. بـــۆ نموونە، گۆڕانی بوونمـــان بۆ بابەتێکی نەبزێـــو، وەکو بابەتەکانی دیکە تاکـــو خۆی لە چالاکییەکان و خۆ خەریکردن بە جیهانەوە بدۆزێتەوە و هەوڵنەدات پرۆژە و ئەگەرەکانی خۆی دابهێنێت. با بیر لەو تێهەڵکێشـــراوانە بکەینەوە، کە ئاڵوز و تەمومژاوین و کاریگەرێتییان بەسەر ئەم جۆرە لە خۆ دهرچوونە کاتییانەوە هەیە. جەخت لەســـەر ئەوە دەکەین، کە من ئەوەم هەیە (مرۆڤێک لە قۆناخێکدا دەوەســـتێت و ئامادەی گۆڕان نییە)هەروەها من ئەوە نیـــم، کە هەم (مرۆڤێک نکۆڵی لە خەتاکانـــی ڕابردووی دەکات چونکە باوەڕی بە سەربەســـتی و داهێنانی بەردەوام هەیە.) ئێمە دەبێت مامەڵەکردنمان لەگـــەڵ بوونی مرۆڤدا لەســـەر ئەم زەمینەیە بێت، کە ئـــەم بوونە ئەوەیە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە. چی بۆ بوونی ئەم چەمکانە پێویستە و ئاگامەندی چۆن دەیانناســـێت؟ئاوەڕدانەوەیەکی خێرا لەبیرۆکەی (دڵسۆزی) کە دژەبابەتی بڕوای خراپە، یارمەتیمان دەدات لەم کێشەیە تێبگەین. لە ڕاستیدا، دڵسۆزی داواکارییە نەک حاڵەت. ئایا چی لە دڵسۆزییدا وەدەست دێت؟ پێویستە مرۆڤ بوون— بۆ— خۆ بێت و ئەوە بێت، کە هەیە. بەڵام ئایا ئەمە پیناسە بۆ بوونێک—لەنێو— خۆدا نییە؟ باســـی یاسای ناســـنامە (خۆیەتی) ناکات؟[٣٩] بۆ ئەوەی چەمکی بڕوای خراپ بۆ ســـاتێکیش بێت ئێمە هەڵفریوێنێت و پاکی "دڵە ڕەوانەکان" (بۆ نموونە لە نوســـراوەکانی گید و کیسیل دا باسکراون) بەســـەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیدا بسەپێنرێت، نابێت بوونی مرۆڤ بە یاسای ناسنامەوە ببەستینەوە. بوونی مرۆڤ نابێت ئەو شتە بێت، کە هەیە، بەڵکو پێویستە ئەو شتە بێت، کە هێشتا پەیدا نەبووە. واتای ئەمە چییە؟ ئەگەر مرۆڤ ئەوە بێت، کە هەیە بۆ هەمیشە، بڕوای خـــراپ ڕوونـــادات و پاکیش نابێت بەنموونەیەکی بەرز بـــۆ ئەم بوونە. بەڵام ئایا مرۆڤ ئەو بوونەیە، کە هەیە؟ یان بەگشتی چۆن دەبێت بەوەی هەیە لە کاتێکدا ئـــەو ئاگامەندە؟ ئەگەر دڵسۆزی و پاکی ببـــن بە بەهای هەمەکی، ئاشکرایە ئەو گوتەیەش، کە دەڵێت "پێویستە تۆ چۆنیت هەر وابیت" نابێت بە بناخەی حوکمدان و ئـــەو چەمکانەی من لەبارەی بوونی خۆمەوە بەو جۆرەی هەم، بەکاریاندەهێنم. ئەو تەنیا نابێت بە نموونەیەکی بەرز بۆ زانین، بەڵکو نموونەیەکی بەرزیشـــە بۆ

---

٣٩ یاسای ناسنامە یان خۆیەتی یەکێکە لە یاساکانی بیرکردنەوە لە لۆجیکی ئەریستۆدا. جەخت لەسەر سەلماندنی ڕاستی فاکتۆر یان بوونێک دەکات و دژی ڕەتدانەوەی ئەو ڕاستییە ڕادەوەستێت. بۆ نموونە ئەو کاتەی دەڵێن (بەفر سپیە) ئێمە لەم دەستەواژەیەدا ناسنامەی (بوون بە سپی)مان بە بەفر داوە و ناکرێت هەمانکات بڵێین بەفر سپی نییە. (وەرگێڕ)

بوون. پێشـــنیاری یەکسانییەکی ڕەهای بـــوون لەگەڵ خۆیدا دەکات. لەم ڕووەوە پێویستە ببین بەوەی هەین. بەڵام لە کاتێکدا بەرپرسین لەوەی بەردەوام خۆمان دروستبکەین، ئایا دەبێت ئێمە چی بین؟

بیـــر لەو لاوە دەکەینەوە لە قاوەخانەیەکـــدا کاردەکات. ئەو خێرا کاردەکات، هەندێـــک جـــار لەســـەرخۆ و جـــاری دیکـــە بە پەلـــە دێت و دەچێـــت. خۆی دادەنەوێنێتـــەوە. دەنـــگ و چاوەکانـــی ئەوەندە خەم و ئـــارەزووی بۆ داواکاری کڕیارەکـــان دەرنابڕێـــت. دواجـــار، بەســـینییەکەوە بـــە پەلـــە دەگەڕێتـــەوە. هەڵوێستەکانـــی بۆ ئێمە، وەکو یاریکـــردن دەردەکەون. جوڵـــە و هاتوچۆکەی میکانیکـــی و دووبارەبوونەوەیـــە. تەنانەت دەنگ و دەموچـــاوی و جوڵانەکەشی میکانیکیـــن. ئەو یاریدەکـــات. بەڵام چ جۆرە یارییەک؟ بۆ باســـکردنی یارییەکە پێویســـت ناکات زۆر تەماشای بکەین. ئەو یـــاری بوون بەخزمەتکار لە قاوەخانە دەکات. ئەمەش جێگەی سەرسوڕمان نییە. یاریکردن جۆرێکە لە دەستنیشانکردن و گـــەڕان بـــە دوای شتەکانـــدا. منداڵێک بۆ ئەوەی لەشی خۆی بناســـێت یاری پێدەکات. خزمەتکارەکەش لە قاوەخانەکەدا یاریدەکات تاکو هەســـت بە حاڵەتی بوونـــی خۆی، وەکو خزمەتکار بکات. ئەم لێپرســـینەوەیە لەوەی بازرگانەکانیش جیـــا نییە. هەموویان لە حاڵەتی ئاهەنگ گێڕاندا دەژین. خەڵکی داوایان لێدەکان بـــەو جۆرە خۆیان دەربخـــەن. بەقـــاڵ، درومانکەر، جارچی نێـــو مەزاتخانە بۆ ڕاکێشانی کڕیارەکان بە لای خۆیاندا سەمادەکەن. ئەوان کڕیارەکانیان بەو باوەڕە دەگەیەنـــن، کە بێجگە لە بەقـــاڵ و درومانکەر و جارچی هیچی دیکە نین. ئەگەر بەقاڵەکـــە خـــەون بە شتێکی دیکـــەوە، بێجگە لە بەقاڵی ببینێـــت، کڕیارەکەی دڵگـــران دەبێت. کۆمـــەڵ داوای لێدەکات وەکو چۆن ســـەرباز دەبێت کارەکەی ســـەربازی بێت، ئەمیش بەقاڵی بکـــات. بێگومان، ئەگەر لەوە بترســـین مرۆڤ دەتوانێـــت ڕابکات و خۆی دەرباز بکات، گەلێک ڕێگە بـــۆ زیندانی کردنی لەنێو ئـــەو حاڵەتەدا، کە تیایەتی و لەو بوونەدا، کە هەیە، دەدۆزرێتەوە. لەم حاڵەتەدا و لەنێـــوەوە خزمەتکـــاری قاوەخانەکـــە، ڕاســـتە و خۆ نابێت بـــە خزمەتکاری قاوەخانـــە. بوونی ئەو، وەکو بوونی شوشە مەرەکەبەکە یان پەرداخ نییە. شوشە مەرەکەب شوشـــە مەرەکەبە و پەرداخیش پەرداخە. ئەو دەتوانێت بیر لە بوونی خۆی بکاتەوە و حوکمی بەســـەردابدات. ئەوە دەزانێـــت: دەبێت کاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو هەســـتێت، پێش کردنەوەی قاوەخانەکە زەوییەکەی پاک بکاتەوە، قۆرییەک چا بخاتە ســـەر ئاگر و هتد. مافەکانی خۆشی، وەکو مافی بەخشـــیش وەرگرتـــن و بوون بە ئەنـــدام لەنێو یەکێتی کرێکاراندا دەزانێت. بەڵام هەموو ئەم چەمـــک و بیرکردنەوانـــە پەیوەندییان بە بەرزێتییەوە هەیـــە و ڕووتکراوەن. ئەو کەســـەی ئەو مافانـــەی هەیە منم، کـــە دەمەوێت ببم بەو کەســـە (گریمان ئەو

خزمەتکارە منم)، هەمانکات ئەوەم، کە هێشـــتا نەبووم. ئەوە ناگەیەنێت من حەز نەکەم ببم بەو کەســـە یان دەمەوێت ئەو کەســـە لە منـــەوە جیاوازبێت. بەڵکو پێوەرێکی گشـــتی لەنێوان بوونی من و ئەودا نییە. بوونی ئەو بۆ من و کەســـانی دیکەش لە 'نوێنەرایەتیکردندایە'. ئەگەر من نوێنەرایەتی ئەو بکەم، من ئەو نابم، وەکو بابەت و خۆ لەیەکدی جیادەبینەوە. ئەوەی لە یەکمان جیادەکاتەوە هیچە. بـــەڵام ئەو هیچە من لە بوونی ئەو دوور دەخاتەوە. من ناتوانم ببم بە ئەو. تەنیا دەتوانـــم دەوری ئـــەو ببینم. بە ئەندێشـــە خۆم بکەم بە ئـــەو. لەبەرئەمە هیچ کاریگەرێتییەکـــم بەســـەر بوونی ئـــەوەوە نییـــە. هەوڵدانەکەشم بـــۆ بوون بە خزمەتکاری نێو قاوەخانەکە بێهودەیە. من، وەکو چۆن ئەکتەرێک دەوری هاملێت دەبینێـــت، دەتوانـــم ببـــم بە ئـــەو. ئـــەوەی هەســـتی پێدەکـــەم خزمەتکاری قاوەخانەکەیە، کە بووە بە بوون—لەنێو—خۆدا. دەردەکەوێت هەســـتانی لە خەو کاتژمێـــر پێنجی بەیانی یان مانـــەوەی لەنێو جێگا تاکـــو درەنگێک، ئەگەرچی لەســـەر کارەکە بە دەرکردنی دەدات هەموو ئـــەرک و مافەکانی هەڵبژاردنی ئەو نەبـــن. لەوە دەچێت ئـــەو خۆی بە حاڵەتێکـــی بەرزتر لەودیو ئـــەو حاڵەتەوە نەگەیەنێـــت. هێشـــتا، گومان لـــەوەدا نییە، کە ئـــەو بەم واتایـــە خزمەتکاری قاوەخانەکەیە. ئەگەر ئەمە بەمشێوەیە نەبێت، ئایا نەیدەتوانی خۆی بە دیپلۆمات و ڕۆژنامەنـــوس دابنێت؟ بـــەڵام ئەگەر من خزمەتکارێکـــی قاوەخانەکە بم، ئەوا نابێت بە بوونێکی— لەنێو— خۆ دابنرێم. من، وەکو خزمەتکار هەم، هێشتا بوونم ئـــەو شتەش نییە، کە ئێستا هەیـــە. بێجگە لەمە، ئێمـــە مامەڵە لەگەڵ چەند شێوازێکی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دەکەین؛ من هەرگیز یەکێک لە هەڵوێستەکان و کردەوەکانم نیم. قسەزانێکی چاک ئەو کەســـەیە قسەی چاک دەکات چونکە ئەو قسەکردن نییە. ئەو خوێندکارەی گوێگرە و چاوەکانی دەخاتە سەر مامۆستاکەی و گوێدەگرێـــت ئەوەندە خـــۆی بەم نواندنەوە خەریک دەکـــات، لە کۆتاییدا وای لێدێت گوێـــی لەهیچ نەبێت. ئەگەر بەردەوام گـــوێ نەدەمە لەشم و کردەوەکانم دەبێـــت بەوەی ڤالیری بە "ئامادەنەبوونی پیـــرۆز" ناوزەدی دەکات. ناتوانم بڵێم بەوجۆرەی "ئەو پاکەتە شقارتەیە لەســـەر مێزەکەیە" مـــن لێرەم یان لێرە نیم. ئەمەش بوونم—لەنێو—جیهاندا لەگەڵ بوونم— لە ناوەڕاستی جیهاندا ئاڵۆزدەکات. من نەدانیشـــتوم و نەڕاوەســـتاوم؛ ئەمە لەشم توشی ئاڵـــۆزی دەکات. لە هەموو لایەکـــەوە لە بوون ڕادەکـــەم و کەچی هەم. بیر لەو شێـــوازی بوونە بکەوە، کە تەنیا منی تێدام: من خەمبارم. لەوانەیە کەســـێک بۆی بچێت من خەمبار بم، لەو شێـــوازەی بوونەدا، کە هەم. ئایا خەمباری بێجگە لەو یەکگرتنە مەبەســـتدارەی سەرجەمی هەڵسوێتەکانم دەردەخات چییە؟ خەمباری واتای ڕوانینێکی دێزی من بـــۆ جیهـــان دەخاتەڕوو. شان تەســـککردنەوە و ســـەردانەواندن و بێزاری لەشم

دەستنیشـــاندەکات. بـــەڵام لەم حاڵەتانـــەدا نازانم، کە دەتوانم لـــەم شێوازەدا بەردەوام بم یان نا. ئایا ئەو کاتەی کەســـێک دەبینم ســـەری بۆ بەرزناکەمەوە و ڕوویەکـــی خۆشی نادەمێ؟ خەمبارییەکەم بۆ ئەو کاتەی ئەو دەڕوات دوا ناخەم؟ ئایـــا خەمبـــاری هەڵوێست نییە؟ ئایـــا جۆرێک لە ئاگایی نییـــە؟ لێرەدا ناڵێین خەمباری ئەوەیە کەســـێک خۆی خەمبار بکات؟ گرنگیش نییە هۆکارەکەی چییە و بۆچـــی خەمبار دەبین. ئـــەوەی گرنگە ئەوەیە، کە ئـــەو ئاگامەندییەی خۆی توشی خـــەم دەکات، ئاگاییەکـــی خەمبارانەیە. بەڵام دژوارە لە ســـروشتی ئەو ئاگامەندییـــە تێبگەیـــن؛ بوونـــی خەمبـــار ئەو هەبـــووە ئامادەکـــراوەی، وەکو پەرتووکەکـــە نییە بیـــدەم بە خۆم یان بیـــدەم بە هاوڕێیەکم. من خەســـڵەتی کاریگەرێتیـــم لەســـەر بوونی خۆم نییە. ئەگەر من بڕیار لەســـەر خەمباری خۆم بـــدەم دەبێت، لە توانامـــدا هەبێت ئەو خەمبارییە لەنێو فایلـــدا دانێم و نەتوانم دروســـتی بکەمەوە. ئەو حاڵەتەش نییە پاش ڕوودانێک لەنێو لەشمدا ڕوودەدات. هێزی بـــەردەوام لەنێو ئاگامەندییدا نییە. ئەگەر مـــن بمەوێت خۆم خەمباربکەم لەبـــەر ئەوەیـــە، کە خەمبار نیـــم. بوونم، وەکو بوونێکی خەمبـــار بەم کارە لە دەســـتی من ڕادەکـــات. بوونێکی—لەنێو—خـــۆی خەمبار بـــەردەوام دەبێت و هەمانکات دەبێت بـــە دێوزمەی ئاگاییم لەو بوونەی، کە خەمبارە و بەهایەکیش، کە من هێشـــتا هەســـتم پێنەکردوە. ئەو بوونەی واتا بەخشی خەمەکەمە نابێت بـــە پێکهاتـــە بۆ شێوازی بوونی. دەشێت کەســـێک بڵێـــت، ئاگامەندیم بە لای کەمـــەوە بابەتەکەی هەرچی بێت یان هەر حاڵەتێکـــی ئاگامەندانە بێت، شتێکە هەیە. بەڵام چۆن خەمبـــاری و ئاگاییم لە خەمباری لەیەکدی جیابکەینەوە؟ ئایا هەردووکیان یەک شت نین؟ ئایا ڕاستە بڵێین ئاگامەندیم شتێکە هەیە؟ هەمانکات پێویستـــە لە بیرمان نەچێت بەو جۆرەی هوســـرڵ بۆی دەچێـــت، ئاگامەندیم لە بنەڕەتـــەوە بەرانبەر کەســـانی دیکە، وەکو شتێکی ئامـــادە نەبوو دەردەکەوێت. وەکـــو بابەتێـــک واتای هەموو هەڵوێســـت و کردەوەکانمـــی هەڵگرتبێت هەیە و ئامادەیە. هەروەها هەمیشـــە و ئامادە نییە چونکە لە ئاســـتی حەدەسی ئەوانی دیکەدا، خۆی وەکو سەربەســـتییەکی هەمیشەیی دەردەخات، کە بوونی پرسیاری لەبـــارەوە لێدەکرێت. کاتێک پیرۆ چاو دەبڕێتە من، دەزانم تەماشای من دەکات. چاوەکانی خستۆتە ســـەر لەشم. لەشم لەنێو جیهاندایە. بابەتێکە هەیە. هەروەها فاکتۆرێکە لەنێو جیهاندا. واتـــای تەماشاکردنەکەی لەنێو جیهاندا نییە. ئەمەش دەبێتە هۆکاری پەرێشـــانبوونی من. هەرچەنـــدە زەردەخەنەی بۆ دەکەم، بەڵێن دەدەم یـــان هەڕەشە دەکەم، بـــەڵام هیچ شتێک ڕەزامەندی یان حوکمدانەکەم بۆ دەســـتگیرناکات. ئەوە شتێکە دەکەوێتە ئەودیو من و لە هەڵوێستەکەمدا هەستی پێدەکەم. ئەمەش وەکو مامەڵەکردنی کرێکاریک لەگەڵ ئامێرەکەی بەردەســـتیدا

نییە. ڕەتدانەوەکانم لە ئاســـتی کەسانی دیکەدا، کە دەبن بە پرۆژەکانم تەنیا بۆ من نین. ئەوان دەبن بەنوێنەری بوونم و چاوەڕوان دەکەن بە دڵسۆزییەوە یان نا دڵسۆزانە بخرێنە گەڕ. فاکتۆری بوون—لەنێو—خۆی ئاگامەندی کەســـانی دیکەی لەنێو ڕەتدانەوە و سەربەســـتیدا دەرخستوە. ئاگامەندی کەســـانی دیکە، وەکو نەبوونە؛ لە بوونی—لەنێو— خۆدا "ئێستا و لێرەدا"شتێکە، کەنەبووە. ئاگامەندی کەســـانی دیکە ئەوشتەیە، کە نییە. ئاگامەندی من، وەکو ئاگامەندی کەســـانی دیکـــە نییە. مادامەکی بوونی ئەو ئاگامەندانەیـــە، کەوابوو شتێکە هەیە و خۆی دروستدەکات. خۆ دروستکردن بەردەوامی بە بوونی دەدات. پێویستە ئاگامەندی ببێت بە بناخەی بوونی خۆی و لەســـەر بوونێکی دیکە خۆی ڕانەگرێت. لەناخی خۆگەرایەتیـــدا بوونی خـــۆی دەپارێزێت، کە ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت بوونێک لەنێویدا جێنشـــین بووە، بەڵام ئەو بوونە هیچە: ئاگامەندی ئەوە نییە، کە هەیە. لەژێر ئەم بارودۆخانەدا گرنگی دڵسۆزی بێجگە لەوەی شتێکە ناتوانین دەســـتمان بکەوێـــت چی دیکـــە نییە. واتاکەشی لەگەڵ بونیـــادی ئاگامەندییمدا ناکۆکە. بۆ ئـــەوەی دڵسۆز بیت، دەبێت ببیت بـــەوەی هەیت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، من لـــە بنەڕەتەوە ئەوە نیـــم، کە هەم. لێـــرەدا لە گوتەکەی کانـــت "ئەوە ئەرکی ســـەرشانی تۆیە، کەوابوو دەتوانی بیکەیـــت." تێدەگەین. من دڵسۆز دەبم؛ ئەمە ئەرکی منە و دەبێت هەوڵی بۆ بدەم. بەڵام ئێمە دەمانەوێت بیسەلمێنین بونیادی بنەڕەتـــی "ئەوە نیت، کە هەیـــت" مەحاڵە. هەوڵدان بەرەو بوون لەنێو خۆدا یان "ئەوبوونـــەی هەیە" بـــێ ئاکامە. ئەمەش لـــە ئاگامەنـــدی نەشاردراوەتەوە. بە پێچەوانـــەوە، ئاگامەندی ئەمە دەزانێت و جۆرێکە لە شەرمەزاریش توشی دەبین. بێ دەســـتەڵاتییەکەمان لە پێکهێنانی بوونمان، وەکو شتێکی هەبوو دیاریدەکات. لێـــرەدا دەردەکەوێـــت ئـــەو کاتەی خۆمان بـــە بوونێک دادەنێیـــن و لە ڕێگەی ئەزموونێکی ناوەکییەوە یان زانینێکی لەپێشـــترەوە حوکمی بەســـەردا دەدەین، ئەو بوونە ڕەتدەکەین. ڕەتکردنەکەشمان بەرەو بوونێکی دیکە نییە، بەڵکو بەرەو بۆشاییە یان بەرەو نەبوونە.

چـــۆن ئەو کەســـانەی لەگەڵمان دڵسۆز نەبـــوون تاوانبارکەیـــن یان ئێمە دڵسۆزییەکەمان دەربخەیـــن لە کاتێکدا دڵسۆزی کارێکی مەحاڵ بێت؟ چۆن لە گفتوگۆکردندا دان بە تاوان کردن یان لە تێڕامانێکدا دڵسۆزی دەربڕین، کە ئەو دەربڕینە کارێکی ســـەرکەوتوانە نییە؟ لـــە تێڕاماندا دەمەوێت ببم بەوەی هەم. بیر لە بوونی ڕاستەقینەی خۆم دەکەمەوە. ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت من خۆم، وەکو شتێک دادەنێم؟ پێویست دەکات هاندەر و مەبەستەکانی ئەم کردەوەیەشم دامەزرێنم؟ بـــەڵام ئەمە دەبێت بە هۆکار و ناچارکردنـــی حاڵەتە هەڵچوەکانی ئاگامەندیم، وەکو ڕووداوە سروشتییەکان دەیانبینێت. ئایا دەبێت پەردە لەسەر

هاندەرەکان لابەرم، گرنگ نییە توشی حاڵەتی شەرمەزاریشـــم بکات؟

ئایا ئەمە خۆ دوور خستنەوەیەکی ئەنقەست نییە لەوەی من خۆم لەو هاندەرانە ڕازی بووم؟ هاندەرەکان هێزێکی ســـروشتی نین و من خۆم بڕیارم لەسەر داون؟ پێویست دەکات حوکم بەسەر کەسایەتییەکەمدا بدەم؟ ئایا ئەمە شاردنەوەی ئەو زانینـــە لە خۆم نییە، کە چاک دەیزانم؟ حوکم بەســـەر ڕابردوومدا دەدەم و بیر لـــە ئێستا ناکەمەوە؟ بەڵگەی ئەمەش ئەو کەســـەیە بە دەربڕینی دڵسۆزییەکەی دەیەوێت بڵێت، ئەو شتەیە، کە هەبوو. لە ئاستی کاری بەرانبەرەکەشی توڕەیە و ناڕازە. دەیەوێت خۆی لە دڵسۆزییەکەی دوورخاتەوە و بیسەلمێنێت، کە ناتوانێت ببێت بەو کەســـەی پێشـــو. کاتێک دادگا حوکم بەسەر کەسێکدا دەدات سەرسام و توڕە دەبین لەوەی حوکمدانەکە کاردەکاتە ســـەر ئەو کەسە چونکە ئەو کەسە، وەکو خۆی نەماوەتەوە و ئەوە نییە، کە هەستی بە تاوان کرد. هەمانکات داوا لەو کەسەدەکەین خۆی بەو بوونە دابنێت، کە هەستی بە تاوان کرد. کەوابوو، بێجگە لە جۆرێک بڕوای خراپ دڵسۆزی دەبێت چی بێت؟

ئێمـــە ڕوونمان کردەوە، کە لە بڕوای خراپدا مـــرۆڤ ئەو بوونەیە، کە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە؟ ئەم نموونەیە دەهێنمەوە: کەسێکی هاوسێکسخواز زۆرجار توشـــی ئازاری ویژدانی دەبێت. هەموو بوونی لەبەردەم ئەمجۆرە هەســـتکردنەدا ڕادەوەستێت. کەسێک لەپێش وەختەوە لەنێو بڕوای خراپدا دەیبینێت. لەڕاستیدا زۆر جاریش ڕوودەدات هاوســـێکسخوازەکە، لەگەڵ ناســـینەوەی هەڵوێستەکەیدا و ئاشکراکردنـــی کارەکانی ڕەتی بوون بەهاوســـێکسخوازییەکەی خۆی دەداتەوە. حاڵەتەکـــەی خۆی بە جۆرێکی دیکە، وەکو ڕێکەوت یان بەد بەختی دەردەخات. هەمـــوو هەڵەکانی لەنێـــو ڕابردوودا دادەنێت. بەو شێوە جوانەش باســـدەکرێت، کە ژن پێی ڕازی نییە. ئێمـــەش گەڕانێکی ئۆقرەنەگری تێدادەدۆزینەوە. لێرەدا، بـــە دڵنیاییەوە مرۆڤێک بە بـــڕوای خراپەوە دەبینیـــن و ڕەفتارەکەشی شیاوی گاڵتـــە پێکردنە چونکە لە فاکتۆرەکانـــی ژیانیەوە خۆی بە ئاکامەکە ناگەیەنێت. هاوڕێکەشی، کە زۆر ڕەخنەی لێدەگرێت، لەم خۆ هەڵخەڵەتاندنەی بێزاردەبێت.

هاوڕێ ڕەخنەگرەکە پرســـیاری سەبارەت یەک شت لێدەکات—لەوانەیە خۆشی وادەرخات، کە چاوی لە کێشـــەکە پۆشی بێت: ئەویش ئەوەیە، کە ئەو کەســـەی هەســـت بەتاوانکـــردن بکات تاوابنـــارە. مرۆڤە هاوســـێکسخوازەکە بە ئاشکرا—فشـــەکەرانە یان کەم ڕێزانە دەڵێت: "من هاوســـێکسخوازم". ئێمەش دەپرسین: کێ بڕوای خراپی هەیە؟ هاوســـێکسخوازەکە یان ئەو کەســـەی خۆی بە دڵسۆز دادەنێت؟ مرۆڤە هاوسێکسخوازەکە، هەڵەکانی خۆی دەناسێتەوە، بەڵام بە هەموو توانایەوە دەیەوێت ئەو بۆچوونە لەناوبەرێت، کە ئەو هەڵانە دەکات بە پێکهاتەی بوونی. ئەو نایەوێت، وەکو شت بناســـرێت. ئەو بیرۆکەیەی لە لایە، هەر چەندە

زۆر ئاشکــرا نییــە و بەو جۆرە نییە، کە مێزەکە میزە و کەســێکی قژ زەرد قژ زەردە. هاوســێکسخواز هاوســێکسخواز نییە. وا دەزانێت بە باسکردن و دان نان بە هەڵەکانیدا لەو هەڵانە ڕزگاریدەبێت. تەنانەت هەســتدەکات بەم کارە دەروونی خۆی پاکدەکاتەوە و وەکو مرۆڤێکی تازە لە دایکبوو ژیان دەستپێدەکاتەوە. ئایا ئــەو بە هەڵەدا چووە؟ ئایا ئەو هەڵوێستێکی بنبڕ نەکراوی ڕاســتەقینەی بوونی مرۆڤ ناناســێتەوە؟ هەڵوێستەکەی ڕاستی ناشارێتەوە. بەڵام، هاوکات پێویستی بــەو لە دایکبوونەوەیە و ڕاکردنە[لە ڕابردوو] بــۆ ژیان هەیە. بۆ ئەوەی خەڵکی حوکمی بەســەردانەدەن خۆی بە دەستەوە نادات. کەوابوو، یاری بە وشەی بوون دەکات. ئەو ڕاســتە ئەگەر لەم گوتەیە "من هاوسێکسخواز نیم" بەو واتایەی "من ئەوە نیم، کە هەم" تێگەیشتبێت. ئەو دەتوانێ بڵێت، "تاکو ڕادەیەک ڕەفتارەکانم، وەکو ڕەفتاری هاوســێکسخوازێک پێناســدەکرێن و من هاوسێکسخوازم". لەبەر ئەوەی تاکو ڕادەیەک ڕاســتەقینەی مرۆڤ بەو ڕەفتارانە ناناســرێت، کەوابوو من هاوســێکسخواز نیــم. بەڵام ئەو بە جۆرێکی دیکە مامەڵــە لەگەڵ وشەی 'بوون' دا دەکات. واتای نەبوونی بــە "نە-بوون—لەنێو—خۆدا" لێکدەداتەوە. بانگەشەی "نە-بوونــی هاوســێکسخوازی" دەکات. ئەمــەش وەکو ئەوە وایــە بڵێین، ئەو مێــزە شوشەی مەرەکەب نییە. لەم ڕووەوە ئەو کەســە لە بڕوای خراپدا دەژی. مرۆڤە دڵسۆزەکە لە بەرزێتی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بێ ئاگا نییە. ئەو دەزانێت بۆ بەرژەوەندی خۆی چ کاتێک ڕووی تێبکات. ئایا هاوسێکسخوازەکە یەکەمجار بە ناوی دڵسۆزییەوە و دووەمجاریش، بە ناوی سەربەســتییەوە، نایەوێت بانگەشەی هاوســێکسخوازی خۆی بکات؟ ئایا بەمە کەسەکەی بەرانبەری ناگەیەنێتە ئەوەی چاوی لێبپۆشێ؟

چ ڕوودەدات ئەگەر ئەو کەسەی بانگەشەی هاوسێکسخوازی دەکات، نەتوانێت واز لە هاوســێکسخوازی بهێنێت و بەرەو سەربەســتی و بڕوای چاک بڕوات؟ ئەو کەســەی ڕەخنەی لێدەگرێــت داوای واتای ئەو گوتەیــەی لێدەکات، کە دەڵێت، "لەگەڵ دان نــان بە هەڵەکانتدا نیوەی لێبوردنەکــەت بردۆتەوە." ڕەخنەگرەکە دەڵێت، تاوانبارەکە بۆ ئەوەی، وەکو شت مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت خۆی دەکات بە شت. ئەم ناکۆکییەش لەنێو پێکهاتەی دڵسۆزییدایە. کێ ناتوانێ بزانێت گوتەی "ئەو هاوسێکسخوازە" چەند کەسانی دیکە توڕە دەکات و چۆن دڵنیابوونێکیش بە من دەبەخشێت؟ ئەمە هاوسێکسخوازەکە دەکات بەشت و ئاواتی ڕەخنەگرەکەش دێتە دی. هاوســێکسخوازەکە دەبێت سەربەســتییەکەی، وەکو شمشاڵێک بداتە دەســت ڕەخنەگرەکــەی و ڕەخنەگرەکەش، وەکو چــۆن دەرەبەگێک شتێک بۆ جوتیارەکــە دەگەڕێنێتــەوە، ئەویش ئەو سەربەســتییە بۆ هاوســێکسخوازەکە بگەڕێنێتەوە. کەســە دڵسۆزەکەش لە بڕوای خراپدا دەژی. وا خۆی دەردەخات،

کە حوکم دەدات و لەو باوەڕەشدایە سەربەســتی، وەکو سەربەســتی دەبێت بە شت. لێرەدا تەنیا مردنی ئاگامەندییمان دەستدەکەوێت، کە هیگڵ لە "پەیوەندی نێــوان کۆیلە و خاوەن کۆیلەدا" دەریخستوە. کەســێک داوا لە کەســێکی دیکە دەکــات بە نــاوی ئاگامەندییەوە ئەو بوونە ئاگامەندانەیــەی خۆی لەناوبەرێت و هەمانکــات، بەو ئومێدەشەوە دەمێنێتەوە، کە پاش ئەو لەناوبردنە جارێکی دیکە لە دایک ببێتەوە. زۆرباشە، دەشێت کەســێک بڵێت، ئەم مرۆڤە مامەڵەی خراپ لەگەڵ دڵسۆزییدا دەکات. لایەنێک دژی لایەنەکەی دیکە بەکاردەهێنێت. پێویستە باســی دڵسۆزی لەنێوان تاکەکاندا نەکەیــن. لەو دڵسۆزییە بدوێین تاکێک لەگەڵ خۆیدا هەیەتی. بەڵام کی ناڵێت، دڵسۆزی نێوان تاکەکانیش بەهەمان شێوە نییە؟ کــێ نابینێت مرۆڤێکی دڵسۆز بۆ ئــەوەی لەوە ڕابکات، کە نەبێت بە شت، چۆن لــە دڵسۆزییەکەیــدا خۆی دەکات بە شت؟ ئەو مرۆڤــەی دان بە خراپی خۆیدا دەهێنێــت، خۆی بە شتێکی خراپ داناوە و بووە بــەو شتەی هەیە. هەمانکات، لەگــەڵ دان پێدانانەکەیدا دەیەوێت، لەو بوون بە شتە ڕابکات چونکە ئەو بیر لە بوون بە شت دەکاتەوە و دەتوانێت لەناوی بەرێت یان بیهێڵێتەوە. دڵسۆزییەکەی دەکات بــە پێوەر و ئەوەی شیاوی دڵسۆزییە بە کەســێکی خراپەکاری دانانێت چونکە ئەو دەیەوێت بەو دیو خراپە بگات. هەروەها خراپییەکەش چەک کراوە و بووە بە هیچ و سەربەســتی ئەو مرۆڤەی بەرانبەر دانراوە. لەم ڕووەوە ئەو مرۆڤە داهاتوویەکــی پاک و لــە خراپەبەدەر بۆ خۆی دیاریدەکــات و ڕێگەش بە خۆی دەدات هەموو شتێک بکات. بەمجۆرە، بنەڕەتی دڵسۆزی لە بنەڕەتی بڕوای خراپ جیاناکرێتەوە. مرۆڤی دڵسۆز بۆ ئەوەی نەبێت بەوەی هەیە، خۆی وانیشاندەدات، کە ئەو شتەیە ئێستا هەیە. ئەمەش ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات چۆن دڵسۆزی دەبێــت بە بڕوای خراپ. ڤالیری ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و حاڵەتی (ســتێندال) بەمشێوەیە دەبینێت. هەوڵدان بۆ چەسپاندنی دڵسۆزی لەگەڵ خۆدا، هەوڵدانێکی بەردەوامە بۆ جیاکردنەوەی ئەو کەســە لە خودی خۆی. تاکێک خۆی لە دەستی خــۆی بە دانانی خۆی، وەکو بابەتێک ڕزگاردەکات. ئامانجی بڕوای خراپیش، بەو شێوەیەی باســمانکرد، خۆ دوورخستنەوە و خــۆ دانانە لە شوێنێکدا، کە کەس دەستی نەیگاتێ. جۆرێکە لە ڕاکردن. لێرەدا بەهەمان شێوە پێناسەی دڵسۆزیمان کردوە. ئایا ئەمە چ واتایەک دەبەخشێت؟

لە کۆتایی شیکردنەوەکەمان بەو خاڵە گەیشتین، کە ئامانجی دڵسۆزی و بڕوای خراپ جیاواز نین. بە دڵنیایشەوە، دڵسۆزی هەیە پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە و ئێمە لێرەدا بایەخی پێنادەین. من دڵسۆزم، ئەگەر دان بەوەدا بنێم لە ڕابردوودا حــەزم لەچی کردووە یــان نیازی چیم هەبووە. دەبینین، ئــەم جۆرە دڵسۆزییە دروستە چونکە مرۆڤەکە پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە و بووە بە بوون— لەنێو—

خۆدا. بەڵام ئێمە لەو دڵسۆزییە دەکۆڵینەوە، کە پەیوەندی بە ئێستاوە هەیە. ئایا چ ئامانجێکـــی لە دوایە؟ بـــۆ ئەوەی دان بە بوونی خۆمدا بنێم، بە خۆم بڵێم من چیـــم، لەوانەیە لە کۆتاییدا بمەوێت لەگەڵ بوونمدا خۆم ڕێک بخەم؛ بە واتایەکی دیکـــە، بۆ ئەوەی ببـــم بە هۆکار بۆ بوونی خۆم، لە شێـــوازی بوون— بۆ—خۆدا دەبێـــت، ببم بەو بوونـــەی "ئەوە نییە، کە ئێستا هەیە". لـــە قوڵایی دڵسۆزییدا بـــەردەوام خۆمان لەنێو ئاوێنـــەدا دەبینین و بەردەوام لەو بوونـــەوە، کە هەیە دەبیـــن بەو بوونەی، کە نییە و جارێکـــی دیکەش لەم بوونەوە دەبینەوە بەوەی، کە هەیە. دیسانـــەوە ئامانجی بڕوای خراپ دەبێتە هۆکاری خۆدەرخستنی بوونی مـــن، کە هەیە، وەکو بوونێک، کە نییە؛ یان ئەو بوونەی، کە من نیم لە شێوازی ئەو بوونەدا، کە هەیە. لە تەماشاکردنی خۆمان لە ئاوێنەدا هەمان کایە دەکەین. لـــە ڕاســـتیدا بۆ ئەوەی دڵسۆز بم، پێویستە هەمانکـــات ئەو شتە بم، کە هەم و نیم. دڵسۆزی شیوازێکی بوون یان خەســـڵەتێکی تایبەتیم ناداتێ، بەڵکو من لە شێوازێکـــی بوونەوە بۆ شیوازێکی دیکە دەگۆڕێت. شێوازی دووەمی بوونەکە، کە دڵسۆزی دەیەوێت، سروشتم ڕێگە نادات بیگەمێ؛ لەو کاتەدا هەوڵ دەدەم بیگەمێ و بیر لەوەش دەکەمەوە، کە نەیگەمێ. بەڵام بۆ ئەوەی لە مەبەستی بڕوای خراپ تێبگەم، پێویستە ئەو ســـروشتەم هەبێت، کە هانم دەدات لە بوونی خۆم ڕابکەم. ئەگەر بەو جۆرەی بوونی ئەم شوشە مەرەکەبە هەیە، منیش ترسنۆک یان خەمبار بوومایـــە، بیرم لە بڕوای خراپ نەدەکردەوە. نەک بە تەنیا نەمدەتوانی لە بوونی خـــۆم ڕابکەم تەنانەت بیرکردنەوەش لەو ڕاکردنە ســـەریهەڵنەدەدا. ئەگەر بڕوای خـــراپ لەگەڵ پرۆژەدا بێتەکایەوە، بەبێ پرۆژەکانیش بوونی من لەگەڵ نەبوونمدا جیانابێتـــەوە. بڕوای خراپ هەیە چونکە دڵســـۆزی لە لابردنی ئامانجەکەی خۆی بە ئاگایە. ئەمەش بە ســـروشتی دڵسۆزییەوە گرێـــدراوە. من لەو کاتەدا دەتوانم خۆم بە ترسنۆک دانەنێم، کە بترسم. من نامەوێت ببم بەو کەسە ترسنۆکەی لێی ڕادەکـــەم. بەڵام ئەگەر لە شێوازی ئەو بوونەدا، کە نییە ترســـنۆک نەبم ئەوا من لە بڕوای چاکدام و دەتوانم بانگەشەی ئەوەش بکەم، کە ناترســـم. کەوابوو، ئەم ترســـنۆکییە هەســـتپێنەکراوە شتێکە، کە نییە؛ ئەگەر منیش نەمەوێت ترسنۆک بم، دەبێت لە ڕوویەکەوە ترسنۆک بم. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، پێویستە کەمێک ترسنۆک بم، یان تاکو ڕادەیەک بترسم. نا، من دەبێت بە تەواوی ترسنۆک بم یان بە تەواوی نەترســـم. لەم ڕووەوە بڕوای خراپ لەسەر بوونی من، وەکو ئەو شتەی نییە ڕادەوەســـتێت؛ واتە جیاوازییەکی هەڵنەســـەنگیراو لەنێوان بوون و نەبوونی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیدا هەیە. بڕوای خراپ تەنیا ڕەتدانەوەی خەسڵەتەکانم نییە و لەوێـــدا نییە، کە من بەو شێوەیەی هەم نەبینراوە. بڕوای خراپ بوونی منیش، وەکو ئەو بوونە دەردەخات، کە نییە. من بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ، وەکو ئازایەک

دادەنێت بەبێ ئەوەی من ئازا بم. ئەمەش لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە من ئەو بوونە بم، کە نیم؛ یان ئەگەر نەبوون لە بوونی مندا، وەکو نەبوونیش بوونی نەبێت بێگومان، پێویست ناکات من ئازا بم، ئەگینا بڕوای خراپ نەدەبوو بە بڕوای خراپ. هەروەها لە بڕوای خراپدا ئەو تێگەیشتنە ئۆنتۆلۆجیانەم لە بوونی خۆم هەیە، کە شتێکم هەم و هەمانکات لەڕاستیدا من ئەو شتە نیم. لێرەدا جیاوازی لەنێوان بوونی خەمبارانە و (من لەشێوازی ئەوبوونەدا، کە نییە) نەبوونی—بوونێکی سەربەستانە نییە، کە من دەمەوێت لە خۆمی بشارمەوە. لەسەرو ئەمەوە، پێویستە ئەوەی ڕەتدەدرێتەوە بوونەکە خۆی بێت و خۆی ببێت بە ناوبردنێکی بەردەوام. بەمجۆرە واتای 'نەبوون' بەردەوام دەبەستین بە پرسیارکردن لەبارەی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤەوە. ئەگەر من بەو شێوەیەی شوشەمەرەکەبەکە یان مێزەکە هەن ئازا نەبم؛ خۆم لە ترسنۆکییەکەم دووربخەمەوە و دژی ڕاوەستم و نەتوانم بەرانبەر دژەکەی ڕایگرم، ئەگەر من نەتوانم خۆم بە ترسنۆکیش دابنێم و ونکۆڵی لە ئازایەتییەکەم بکەم و لە ترسنۆکییەکەم ڕابکەم، ئەگەر هاودەمبوونی ترسنۆک—نەبوونی من و ئازایەتییەکەم مەحاڵ بووایە، پرۆژەی بڕوای خراپ نەدەهاتە کایەوە. بۆ سەرهەڵدانی بڕوای خراپ پێویستە دڵسۆزی لەنێو بڕوای خراپدا بێت. مەرجی سەرهەڵدانی بڕوای خراپ ئەوەیە، کە ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ، بەو شێوە ڕاستەوخۆیەی دەردەکەوێت، لە بونیادی کۆجیتۆی پێش تێڕاماندا، ئەو شتە بێت، کە نییە و ئەو شتەش نەبێت کە هەیە.

## ٢. بڕوا و بڕوای خراپ

ئێمە لەو بارودۆخانە دواین، کە یارمەتیمان دەدەن لە بڕوای خراپ تێبگەین و بونیادی ئەو شێوازەی بوونیشمان دەستنیشان کرد، کە لەنێویدا دەتوانین چەمکەکانی بڕوای خراپ دروستبکەین. بەڵام ناتوانین خۆمان بەمانەوە ببەستینەوە؛ هێشتا جیاوازی نێوان بڕوای خراپ و ناڕاستیمان ڕوووننەکردۆتەوە. درۆزنێک بۆ بەرانبەرەکەی هەر دوو ڕووی ئەم چەمکانە بەکاردەهێنێت. ئەم دووڕووەش پەیوەندی بە بوونی مرۆڤەوە، نەک ئەزمونێکی دیکەوە هەیە. گرفتی ڕاستەقینەی بڕوای خراپ لەوەدایە، کە بڕوای خراپ بڕوایە. ناتوانین بە درۆکردنێکی بێ دەربەست یان بابەتێکی حەدەسی دابنێین. ئەگەر لەو باوەڕەدا بین بڕوا واتایەکی هەیە و ئەو واتایەش سەربە بابەتەکەیەتی، ئەو بابەتەش شتێکی بەردەست نییە و هەمانکات دووریش نییە، ئەوا بڕوای خراپ دەبێت بە بڕوا؛ گرفتی بنەڕەتی بڕوای خراپیش دەبێت بە گرفتی بڕواکردن. چۆن ئێمە لە ڕێگەی ئەو چەمکانەوە دامانهێنان واتای بڕوای خراپ بۆ خۆمان ڕوونبکەینەوە؟ پێویستە ئەو خاڵە

ڕەچاوبکەیـــن، کە خودی پرۆژەی بڕوای خراپ پێویستـــە بڕوای خراپ بێت. من تەنیا لە کۆتایی هەوڵدانەکەمدا و دەرخستنی دووڕووی چەمکەکان بۆ ڕازی کردنی خۆم توشی بڕوای خراپ بووم. لە ڕاستیدا، من خۆم بەو ڕادەیەی ڕازی بم، خۆم ڕازی نەکردووە. لەو کاتەشدا خۆم لە بەردەم بڕوای خراپدا دانا و لە بڕوای خراپدا بووم. بۆ من ئامادەبوون لە بەردەم بڕوای خراپدا دەبوایە بێ دەربەســـتی بوایە؛ ئەگەر دڵسۆزانەش بڕوات پێی هەبێت، ئەوا لە بڕوای چاکدا دەبێت. کەس ناوێرێت بە ئاشکرا بڕیار لەسەر بڕوای خراپ بدات. بڕوای خراپ بڕوای بە خۆیەتی، بەڵام خۆی بە بڕوای خراپ دانانێت، خۆشی ناخاتە ڕیزی بڕوای چاکەوە. ئەمەش لەگەڵ ســـەرهەڵدانی *weltanschauung* بڕوای خراپـــدا ڕوودەدات و هەڵوێستی وەکو دەردەخات.[٤٠]

بڕوای خراپ نەریت و پێوەری بۆ ڕاستی نییە، تاکو بیناسینەوە. ئەوەی بڕوای خراپ بڕیاری لەســـەر دەدات چۆنیەتی ڕاستییە. ئەوەی بڕوای خراپ دەریدەخات ڕاستی و میتۆدی بیرکردنەوە و جۆرێکە لە بوون، کە وەکو بابەتەکانن. خەسڵەتی ئۆنتۆلۆجیانـــەی جیهان لەبڕوای خراپدا بەمشـــێوەیەیە: بوون لێرەدا ئەوەیە، کە نییـــە و ئەوەش نییە، کە هەیە. لە ئاکامدا ئەو بەڵگەیەی ئاشکرا دەبێت شتێکە ڕازیمان ناکات.

بـــڕوای خراپ بەڵگەکـــە ئاشکرا دەکات، بەڵام پێـــش ئاشکراکردنەکەی خۆی گەیاندۆتـــە ئەو بڕوایەی، کـــە بە بەڵگەکە ڕازی نەبێت و خـــۆی بە بڕوای چاک بگەیەنێـــت. خۆی لـــە پلەیەکی کەمـــدا دەردەخات، بێ ئاگا نییـــە و بڕواش بە بڕیاردان دادەنێت. دوای هەموو حەدەســـێک دەگاتە بڕیاردان و ناسینەوەی بوون بەو شێوەیەی هەیە. کەوابوو، بڕوای خراپ لە سەرەتای پرۆژەکەیەوە و هاتنە نێو جیهانەوە بڕیار لەسەر داواکارییەکانی خۆی دەدات. ئەم پرۆژەیە بڕیاردانی بڕوای خراپە لەسەر چۆنیەتی سروشتی بڕواکەی. با ئەوەش بزانین، کە ئەمە بڕیاردانێکی سەربەستانە و بیرکردنەوە نییە، بەڵکو حوکمدانێکی کتوپڕی بوونە. کەسێک بەو جۆرەی دەچێت بخەوێت و خەودەبینێت بڕیار لەســـەر بڕوای خراپ دەدات. بڕوای خـــراپ، وەکو خەو بینینە. کاتێک بڕوای خراپ ڕوودەدات دژوارە ئەو کەســـە بە ئاسانی خۆی لێدەرباز بکات. ئەوەی خەو دەبینێت ناتوانێت خۆی خەبەربکاتەوە و خەوەکەی بپچڕێنێت. بڕوای خراپ شێوازێکی بوونە لە نێو جیهاندا. شێوازێکە، وەکو خەو بینین یان لە خەوهەســـتان خۆی بەردەوام دەهێڵێتەوە. بەڵام بڕوای خراپ بونیادی خۆی دەناسێت. ئەگەر بڕوای خراپ بڕوا بێت و لەنێو پرۆژەکەشیا ڕەتدانـــەوەی هەڵگرتبێت، ئەوا لەگەڵ دەســـتپێکردنیا ئەو بڕوایەی نایەوێت ڕازی

٤٠ *Weltanschauung* وشەیەکی ئەڵمانییە لە دوو بەش پێکهاتووە: *Welt* واتە جیهان، *anschauung* واتە تێڕوانین.(وەرگێڕ)

بێت پێویستـــه بێتەکایەوە. ئایا بارودۆخە پێویستییەکان بۆ ســـەرهەڵدانی ئەم بڕوایـــە چین؟ لەو بڕوایەدام پیرۆ خۆی بە هاوڕێی من دادەنێت. بڕوا بەمە، وەکو بڕوای چاک دەکەم. من لەم بڕوایەدام، بەڵام بەڵگەیەکی حەدەسیم بۆ سەلماندنی نییە چونکە هاوڕێیەتی بابەتی حەدەس نییە. من تەنیا بڕوا بە هاوڕێیەتییەکەیم؛ خۆم هاندەدەم باوەڕ بەم بڕوایە بکەم و لەســـەر بڕیارەکەم بمێنمەوە. دواجار بەو شێوەیـــە خۆم دەردەخەم، کە دڵنیـــام و گومانم لە هاوڕێیەتییەکەی نییە. بڕوای چاک لێرەدا، ئەو چەمکە ڕاســـتەوخۆیەیە هیگڵ باســـیکردوە. بڕوایەکی سادەیە. هەروەها، هیگڵ ئەوەی سەلماندوە، کە چەمکێکی ڕاستەوخۆ پێویستی بە چەمکێکی ناڕاســـتەوخۆ هەیـــە. بڕوا، بۆ ئـــەوەی ببێت بە بڕوا دەبێت ببێـــت بە نا— بڕوا. ئەگـــەر لەو باوەڕەدابم پیرۆی هاوڕێم منـــی خۆشدەوێت، دەبێت هاوڕێیەتییەکەی لەنێـــو هەمـــوو هەڵسوکەوتەکانیا خۆی بۆ من دەربخات. بـــەڵام ئەگەر بزانم من بـــڕوا دەکـــەم، ئەوا بڕوا دەبێت بـــە چەمکێکی نێو بیرکردنـــەوە و پەیوەندی بە بابەتێکی دەرەکییەوە نییە. لەبەرئەمەش چەمکی 'بڕوا' بەبێ جیاوازی بەکاردێت بۆ شێوازەکانی دیکەی بڕواش دەگونجێت ("بڕوا بە خوا، بڕوام بە تۆیە") و دەبێت بـــە چەمکێکی ڕووتکراوەی نێو بیرکردنەوە. ئایا پیـــرۆ هاوڕێمە؟ نازانم یان لەو بڕوایەدام. لێرەدا لەنێو ئاگامەندییدا چەمکە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکە بوون بە یـــەک. بڕواکردن ئەوەیە بزانیت بڕوا دەکەیـــت. بڕواکردنیش لەوێدا کۆتایی دێت، ئەگـــەر بزانیت بڕوا دەکەیـــت. کەوابوو، بڕواکردن بڕوانەکردنـــە. بێگومان لێرەدا بە زۆر باســـی ئەم دیاردەیەمان کردووە چامکی زانینمان بەســـەریا ســـەپاندوە؛ ئاگاییەکی لە بیردۆزە بەدەر زانین نییە. بەڵام شەفافیەتەکەی سەرچاوەی هەموو زانینێکـــە. کەوابوو، ئاگایی لـــە بیردۆزە بەدەری بـــڕوا لەناوبردنی بڕوایە. بەڵام کۆجیتـــۆی پێش تێرامان ئەوە دەســـەلمێنێت، کە بوونی بـــڕوا بە ئاگایی بڕواوە گرێدراوە. بڕوا ئەو بوونەیە پرســـیار لە بوونی خۆی دەکات. خۆی لەناودەبات و بە ڕەتدانەوەی خۆی لەبەردەم خۆیدا ڕادەوەســـتێت. بوونێکە بۆ ئەوەی هەبێت، پێویستە خـــۆی دەرخات، لەگەڵ خۆدەرخستنەکەشـــدا نکۆڵی لە خۆی دەکات. بڕواکـــردن بڕوانەکردنە. ئێمە هۆکاری ئەمـــە دەزانین؛ بوونی ئاگامەندی لەوەدایە هەبێـــت و خۆی ڕەتبکات. لـــەم ڕووەوە ئاگامەندی بەردەوام لە خۆی ڕادەکات و بڕوا دەبێت بەبێ بڕوایی و ڕاســـتەوخۆش بە ناڕاستەوخۆ، ڕەها دەبێت بە ڕێژەی و ڕێژەییش بە ڕەها. نموونەی بڕوای چاک (بڕوا بەوە بکەیت، کە بڕوات پێیەتی)، وەکـــو دڵسۆزییە (ئەوە بیت، کە هەیت)، ئەمەش نموونـــەی بوونە-لەنێو—خۆدا. هەموو بڕوایەک کورت دەهێنێت. کەس ناگاتە بڕوایەکی ڕەها. لە ئاکامدا پڕۆژەی ســـەرەتایی بڕوای خراپ لەناو بردنی فاکتـــۆری ئاگامەندییە. ئەگەر بڕوای چاک مەحـــاڵ بێت، ئەوا هەموو بڕوایەک مەحاڵە. تەواناییم بۆ بڕواکردن بە خۆم، وەکو

کەسێکی ئازا، ورەم کەم ناکاتەوە، چونکە هەموو بڕواکردنێک بڕوانەکردنیشە. ئەم بڕوانەکردنە مەحاڵە بڕوای منە. ناتوانم بۆ ئەوەی بڕوانەکەم لە خۆمی بشـــارمەوە یـــان بۆ ئەوەی بڕوانەکەم بڵێم بڕواناکەم. بـــەڵام لەناوبردنی بڕوای خراپ نابێتە سەرسوڕمان بۆ من چونکە لەناوبردنەکە لەنێو هەموو بڕوایەکدا هەیە. ئەو کاتەی دەمەوێت بڕوا بە ئازایەتی خۆم بکەم من کەســـێکی ترســـنۆکم. ئەمەش بڕواکەم لەناودەبـــات. بـــەڵام یەکەم، من وەکو جاران، کە ترســـنۆک بـــووم ئازاش نیم. دووەم، مـــن نازانم، کە ئازام. خۆ بە ئازا دانانم لەگەڵ بڕواکەدا ســـەرهەڵدەدات. سێیەم، ڕاستە، کە بڕوای خراپ لەگەڵ ئەو بڕوایەدا نییە، کە کەسێک حەزدەکات هەیبێـــت. بڕوای خـــراپ ڕازی بوونە بەوەی بڕوانەکەی، بـــەوەی بڕوات پێیەتی. بـــڕوای چاک لـــە بڕوانەکردن—بەوەی—بڕوات پێیەتی ڕادەکـــات و خۆی بە بوون دەگەیەنێت. بڕوای خراپ لە بوون ڕادەکات و بڕوانەکردنە-بەوەی—بڕوات پێیەتی. لە ســـەرەتاوە هەموو بڕواکردنێکمان لە خەســـڵەتەکانی داماڵێوە. لە خواســـتی خۆلەناوبردنەوە، کە زانست ناتوانێت بیسەلمێنێت، بڕواکانی دژ بە خۆ دەڕوخێنین. ئێمە لێرەوە باشتر لە دیاردەی بڕوای خراپ تێدەگەین. لە بڕوای خراپدا درۆکردنی بێ دەربەستانە و خۆئامادەکردنێکی بە ئاگاش بۆ هەڵخەڵەتاندنەکە نابینین. یەکەم هەنگاوی بڕوای خراپ ڕاکردنە لەوەی ناتوانین لێی ڕابکەین، ڕاکردنە لەوەی هەیە. پڕۆژەی ڕاکردنەکـــەش هەڵوەشاندنەوەی بوونێک لە بـــڕوای خراپدا دەردەخات. لەبەرئەمـــە ئەوەی بڕوای خـــراپ دەیەوێت هەڵوەشاندنەوەیە. لە ڕاســـتیدا، دوو هەڵوێستە ڕاستەوخۆکەمان بەرانبەر بوون بە سروشتی ئەو بوونەوە و پەیوەندیمان بە بوون—لەنێو—خۆوە بەســـتراوە. بڕوای چاکیش دەیەوێت لە هەڵوەشاندنەوەی ناخـــی بوونم، وەکو بوون— لەنێو—خۆ یان ئـــەو بوونەی هەیە، کە نییە ڕابکات. بڕوای خراپ دەیەوێت بە ڕووخانی بـــوون لەناوەوە لە بوون—لەنێو—خۆ ڕابکات، بەڵام ڕووخـــان و هەڵوەشاندنەوەکە ئاشکراناکـــات و نکۆڵی لەوەش دەکات، کە بڕوای خراپە. بڕوای خراپ لە ڕێگەی "ئەوە نییە، کە هەیە" لە بوون—لەنێو— خۆ ڕادەکات و دەبێت بەو بوونەی، کە هەیە. نکۆڵی لە خۆی دەکات و دەیەوێت ببێت بە بوون—لەنێو—خۆدا، کە بوونێکە "ئەوە نییە، کە نییە." بڕوای خراپ ڕوودەدات چونکـــە لە پڕۆژەی بوونی مرۆڤدا هەڕەشەیەکی ڕاســـتەوخۆ و بەردەوامە و لەنێو ئاگامەندییدا شاردراوەتەوە. ئەمەش بە چییەتی ئاگامەندی، وەکو شتێک ئەوەیە، کـــە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە گرێدراوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوانەدا لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندی نەک وەکو هەموو لایەنێکی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ، بەڵکو لایەنێکی ناوەکی تیژ، دەکۆڵینەوە.

# بەشی یەکەم
# بونیادی ڕاستەوخۆی بوون-بۆ-خۆ

## ١. ئامادەبوونی خۆ

ڕەتدانەوە ئێمەی بە سەربەستی گەیاندو سەربەستی بە بڕوای خراپ و بڕوای خراپیش بە بوونی ئاگامەند، کە پێشمەرجە بۆ سەرهەڵدانی بڕوای خراپ. لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوەکەمان لە بەشەکانی پێشودا جارێکی دیکە بۆ باسەکەمان لەسەر کۆجیتۆی پێش تێڕامان دەگەڕێینەوە. ئێستا، کۆجیتۆ وەڵامی پرسیارەکەمان بۆ ئامادەدەکات، هەروەها دێکارت پرسیار لە بارەی ڕۆڵی کردەکی کۆجیتۆ بە بەستنەوەی بیرکردنەوە بە گومانکردنەوە دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم لایەنە کردەکییەی کۆجیتۆ بە دیالێکتیکی بوونەوە نابەستێتەوە، خۆی توشی هەڵەی قوتکردنەوەی ناوەڕۆک کردوە. هوسرڵ ئەم هەڵەیەی ناسیوەتەوە بۆیە لە چوارچێوەی باسکردن نەچۆتە دەرەوە. لەبەرئەمە پێویستە بە بیریارێکی فینۆمینەلیست نەک فینۆمینۆلۆجیست دابنرێت. بۆچوونە فینۆمینە لیستەکەشی هاوسنوری فەلسەفەی ئایدیالیستانەی (کانت)ە. هایدیگەر خۆی لە فینۆمینەلیزم دوور دەخاتەوە چونکە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بەرەو فەلسەفەی میگاری و جیا دانانێکی نا— دیالێکتیکی ناوەڕۆک و شیکردنەوەی بوون بەبێ کۆجیتۆمان دەبات. لەبەر ئەوەی لە سەرەتاوە دازاین لە ئاگامەندی دابڕاوە ئەوا هەرگیز ناتوانێت ببێتەوە بە خاوەنی ئاگامەندییەکەی. هایدیگەر خەسڵەتی لە خۆ—تێگەیشتن بە بوونی مرۆڤ دەدات، کە بە پڕۆژەی دەرچوونی لە خۆوە داناوە. بە دڵنیاییەوە من نامەوێت بوونی پڕۆژەکان ڕەتبدەمەوە، بەڵام چۆن تێگەیشتن بەبێ ئەوەی بزانیت، کە تێدەگەیت سەرهەڵدەدات؟ پڕۆژەی چوونە دەرەوەی ئاگامەندی لە خۆوە بەبێ ئەم جۆرە ئاگاییە کوێرانەیەو ڕاستەقینەی مرۆڤیش دەکات بەشت. لە ڕاستیدا، کۆجیتۆ پێویستە خاڵی سەرەتای گەشتەکەمان بێت، بەڵام بەو مەرجە ڕابەریمان بکات، کە ڕەتی بکەین. بۆ بەڕێخستنی توێژینەوەکەمان پرسیار لە بارەی بوونی کۆجیتۆوە دەکەین و دەمانەوێت ئامێرێکی دیالێکتیمان بداتێ و بتوانین بەو ئامێرە لە کۆجیتۆوە بەرەو سەرجەمی بوون دەرچین. با لێرەدا بۆ خۆ—ئاگایی ڕاستەوخۆ [بێ بیردۆزە] بگەڕێینەوەو بزانین بەو جۆرەی دەڵێین، ئاگامەندی ئەو شتە نەبێت، کە هەیە و ئەوەش بێت، کە نییە، چ واتایەک دەبەخشێت.

لە پێشەکی باسەکەماندا گوتمان ئاگامەندی ئەو بوونەیە، کە پرسیار لەبارەی بوونـــی خۆیەوە دەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بـــە تەواوی بوونی ئاگامەندی لەگـــەڵ خۆیدا هاوســـەنگ نییە. هاوســـەنگی، کە لە بوونـــە- لەنێو — خۆکاندا هەیـــە ئەو بوونەیە، کە هەیـــە. لەنێو بوون— لەنێو— خـــۆدا هیچ بەشێک دوور ڕاناوەســـتێت؛ دوو لایەنـــی جیاوازی نییە. ئەمەش هانمـــان دەدات ئەم بوونە بە شتێکی نەبڕاوە دابنێین. بوونێکە پڕو وەســـتاو. یاســـای ناســـنامەی [خۆیەتی] بەسەردا ســـاخدەبێتەوە چونکە چارەنوســـێکی نەبڕاوەی هەیە.ئەلف ئەلفە ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەلف نەبڕاوەیە و چارەنوسێکی نەبڕاوەشی هەیە. ناسنامە چەمکێکە بۆ سنوردارکردنی یەکێتی ئەو بوونە. ئەوە دەردەخات بوون—لەنێو—خۆ پێویستی بە هیچ پێکهاتەیەکی دیکە نییە و پێکهاتەکەشی دەبێت بە ناســـنامە. ناسنامە نموونەی (یەک بوون)ە، یەکیش لە ڕێگەی بوونی مرۆڤەوە دێتە جیهانەوە. بوون—لەنێو–خۆ پڕو تەواوە، هیچی دیکەی ناخرێتە سەر. بۆشایی لە بوونیدا نییە و تەنانەت درزێکی بچوکی تێدا نابینرێت تاکو لەوێوە نەبوون خۆی بخزێنێتە ناوی. ئاگامەندی بوونێکی پەستێنراوی نییە. دژوارە بەو بوونە دابنرێت، کە هاوسەنگی خـــۆی بێت. دەتوانم بڵێم ئەم مێـــزە، مێزە. بەڵام ناتوانم بڵێـــم بڕواکەم بڕوایە چونکە بڕواکەم ئاگامەندانەیە. هەندێک کەس لەو باوەڕەدان بیرکردنەوە فاکتۆری ئاگامەنـــدی لەو شتانەدا دەگۆڕن، کە ئاگامەندی ڕوویان تێدەکات. هوســـرڵ لەو باوەڕەدایە ئەو کەسەی (ببینرێت)، ئەو بینینە شێوازی ژیانی دەگۆڕێت. بەڵام لەو باوەڕەدام من سەلماندومە، کە یەکەم مەرج بۆ هەموو تێڕامانێک [بیرکردنەوەیەک] کۆجیتـــۆی پێش تێڕامانە. ئەم کۆجیتۆیە بابەتێک بەرانبەر خۆی ڕاناگرێت؛ لەنێو ئاگامەندیدا دەمێنێتەوە. لە بنەڕەتەوە، کۆجیتۆ خەســـڵەتی لەناوبردنی گەواهێک بۆ ئەزمونەکەی هەیە، هەرچەندە ئەو گەواهە خودی ئاگامەندیشـــە. کەوابوو، لەو کاتەدا باســـی بڕواکـــەم دەکەم یان لە بڕواکەم تێدەگەم، کـــە بڕواکەم بە ڕووتی خۆی دەرنەخـــات و ببێت بە بڕوایەکی گرفت ئامێز. حوکمدانە ئۆنتۆلۆجیەکەمان "بڕوا ئاگاییە لە بڕوا" دەبێت بە دەســـتەواژەیەک، کە تیایدا یاســـای ناســـنامە خۆی دەســـەپێنێت. بار و بارهەڵگرەکە ڕادیکاڵانە دوو شتی جیاوازن و یەکێکیان بەسەردا سەپێنراوە و بە یەک شت دانراون. باشە، کەسێک دەڵێت، ئاگایی لە بڕوا ئاگاییە لە بڕوا. لێرەدا ناسنامەیەک دەدۆزینەوە. بەڵام ڕاست نییە بڵێین، ئاگایی بڕوا ئاگاییە لە بڕوا و ئاگامەندی لە بڕوا دابڕین و بیکەینەوە بە بابەتی ئاگامەندی. ئاگایی لە بڕوا، کە ئاگاییە لە بڕوا لەڕاستیدا دەبێت جۆرە ئاگاییەک بێت لە خودی خۆی. لێرەدا بڕوا دەبێت بە بابەتێکی بەرز و دەرەکی بۆ ئاگامەندی. ئاگامەندیش لە ئاستی بڕواکەدا سەربەســـتانە ڕادەوەستێت. ئەمەش لە بۆچوونەکەی ڤیکتۆر کەزن دەکات، کە گوایە ئاگامەندی دیاردە دەروونییەکان یەکە یەکە باسدەکات و

ڕوونیاندەکاتەوە. بەڵام بەو جۆرەی هوســرڵ ئاماژەی بۆ دەکات تەنیا لە میتۆدی گومانکارییدا ئاگامەندی دەتوانێت خۆی لەو بابەتانەوە دوور ڕاگرێت، کە دەیەوێت گومانمــان لێبکات. لە تێڕاماندا بابەتەکە دەخەینە نێــو کەوانەوە و لەوێدا ئەوە ڕەتدەدەینەوە، کە هوســرڵ بە هاوبەشیکردن ناوزەدی دەکات. ئاگایی بڕوا، لەو کاتەدا گۆڕانی بەسەردا دێت، جیاوازی لەنێو خۆیدا و لەگەڵ خۆیدا نەبینێت. ئەو هەیە تاکو وەکو بڕوا خۆی بناســێنێت. لێرەدا دەڵێین ئاگایی بڕوا خودی بڕوایە. لە ســەرەتاشەوە ئەم دوو لایەنەی بڕوامان (ئاگایی بڕوا و بڕواش ئاگایی بڕوایە) دەمەزراندوە. هــەر یەکێک لەم چەمکانە دەچێتە ناو ئەوەی دیکەوە و ئاماژە بۆ یەکدی دەکەن، هاوکات لە یەکدییەوە جیاوازن. دەزانین بڕواو خۆشی و چێژ بەبێ ئاگامەندی نین. ئاگامەندی پێوەری بوونیانە. هەمانکات ڕاستیش نییە بڵێین، بڕوا گرفت ئامێزە و لەگەڵ سەرهەڵدانیا لە خۆی ڕادەکات. کەوابوو، ئاگایی بڕوا و بڕوا یەک شتن و ناوەکین. بەڵام ئەو کاتەی بمانەوێت بیگرین لە دەســتمان ڕادەکات و خۆمــان لە بەردەم دوو شتدا دەبینین. ئاگامەندی تێڕامانە و ناتوانین بیگرین. فەیلەســوفەکان، لەبەرئەمە، هەوڵیان نەداوە لە بونیادی تێڕامان بکۆڵنەوە و بە شتێکی نەبڕاوە و لەبن نەهاتوو دایانناوە. هەندێکیان، وەکو سپینۆزا، بە بیرۆکەی بیرۆکەی ناوزەدیکردوە. هیگڵ، وەکو گەڕانەوە بۆ ســەرخۆ پێناســیکردوە و بە نەبڕاوەی داناوە.

بــەڵام دانانی ئاگامەندی بە نەبڕاوە خەســڵەتی بوون—لەنێو—خۆی دەداتێ. ئەگەر بەمەش ڕازی نەبین و هێشــتا بمانەوێت تێڕامان بە بابەت دابنێین، دەبێت بوونی، وەکو بــوون— لەنێو—خۆ نەبینین یان بەو یەکێتییەی دانەنێن، کە لەنێو خۆیدا دوو شت بێت و بابەت و دژە بابەتی هەڵگرتبێت. بەڵکو پێویستە بەو دوو لایەنە ببینرێت، کە یەک شتن. تێڕامان ئەو شتەیە، کە خۆی دەبینێت.

ئەگــەر بمانەوێت لە ســەرجەمی ئەم دیاردەیە (یەکێتیی ئــەو دوو لایەنەی ئاگایــی لــە بڕوایــە) تێبگەین ڕاســتەوخۆ ئاماژە بــۆ یەکێک لــەو دوو لایەنە دەکەین. ئــەو لایەنەش یەکێتییە ناوەکییەکەمان پێدەناســێنێت. بە پێچەوانەی ئەمەشــەوە، ئەگــەر بمانەوێــت لــە ســەرەتایەکی دووەلیستیەوە دەســت بە گەشتەکەمان بکەین و ئاگامەندی و بڕوا، وەکو دوو شتی جیاواز بەرانبەر یەکدی دابنێیــن، ڕووبەڕووی (بیرۆکەی بیرۆکە)ی ســپینۆزا دەبینەوە. لــەم حاڵەتەدا دیــاردەی پێــش تێڕامــان نادۆزینەوە، کــە دەمانەوێت لە ســەری بکۆڵینەوە. هۆکــاری ئەمــەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵــەی، کە ئاگامەنــدی پێش تێڕامان ئاگایــی ئاگامەندییە لە خۆی. لێرەدا پێویستە لە چەمکی (خۆ)بکۆڵینەوە چونکە ئاگامەندییمان پێدەناســێنێت. وابۆی دەچین چەمکی (لەنێو—خۆ)، کە لە نەریتی پێشــترەوە وەرمانگرتــوە و بەکارمان هێناوە بۆ بوونێکی بــەرز دانانرێت. لەبەر

ئەوەی (خـــۆ) شتێک نییە لەگەڵ خۆیدا هاوســـەنگ بێت، بە بوونێکی لەنێو—خۆ دانانرێت. بە ســـروشت خاوەنی تێڕامانە و لەزمانی لاتینیشدا ئەم دوو شتە *ejus* و *sui* جیاکراوەتەوە.

چەمکـــی خۆ ئاماژە بۆ ناوی بکەرێـــک دەکات. هەروەها پەیوەندی ئەو بکەرە لەگـــەڵ خۆیدا دەردەخات. ئەم پەیوەندییەش دوو لایەنی هەیە. لە لایەکی ترەوە چەمکی خۆ ئاماژە بۆ بوون، وەکو بار یان بارهەڵگر ناکات. ئەگەر لە دەستەواژەی "ئەو بێزار بووە"، 'ئەو'، کە بارهەڵگرە ڕێگەی بە خۆی داوە لە پشت خۆیەوەشتێک هەڵگرێت. ئەمەش ئـــەوە ناگەیەنێت، کە 'ئەو' تەنیا بارهەڵگرە چونکە بارهەڵگر ناســـنامەی هەیە. لەبەر ئەوەی بارهەڵگرەکەی لە پشـــت خۆیەوە داناوە شتێکی ڕاستەقینەش نییە. لە ڕاستیدا خۆ بە شتێکی ڕاستەقینە دانانرێت.

بکەر خۆ نییە، چونکە بکەر ناســـنامەی هەیە. ئەگەر خۆ خاوەنی ناســـنامە بێت، وەکو خۆ نامێنێتەوە. هەروەها خۆ ئاماژە بۆ بابەتێک دەکات، کە خۆیەتی. کەوابوو، خۆ نوێنەرایەتی دووریـــەک لەنێو خۆیدا و ئاماژە بۆ پەیوەندی لەگەڵ خۆیدا دەکات. خۆی لە ناســـنامە دەپارێزێـــت و بەردەوام ل ەناکۆکی نێوان (ئەو یەکێتییـــەدا دەژی، کە فرەلایەنەکـــان ناگرێتە خۆی و ئەو فرەلایانانەی، کە یەک ناگرن) دەژی.

ئێمـــە ئەم حاڵەتە بـــە ئامادەبوونی خۆ لە بەردەم خۆیدا دادەنێین. یاســـای بوونی (بـــۆ خۆ)، وەکو بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندی ئەوەیە، کە ئەم بوونە لە بەردەم خۆیدا و لە ئامادەبوونەکەیدا خۆی بێت. ئامادەبوونی خۆ لە بەردەم خۆیدا هەندێک فەیلەســـوفی بەو خاڵە گەیاندووە ئاگامەندی بە بەرزترین هەبوو دابنێن. بەڵام ئەم ئاکامە پاش لێکۆڵینەوە لە واتای ئامادەبوون لەناودەچێت. لە ڕاستیدا، ئامادەبـــوون ئامادە بۆ دوو شت دەکات یان بـــەلای کەمەوە دوو شتی لە یەکدی داپچـــڕاو دەردەخات. ئامادەبوونی بوونیش لە بەردەم خۆیدا دەریدەخات، کە ئەو بوونە لە خۆی جیایە. ناسنامەکەشی لایەنێکی نێگەتیڤی لەنێو خۆیدا هەڵناگرێت. بێگومان یاسای ناســـنامە بەو شێوەیەی هیگڵ باسیکردووە پەیوەندی بە یاسای ناکۆکییـــەوە هەیە. ئـــەو بوونەی هەیە دەبێت ئەو بوونـــە نەبێت، کە نییە. ئەم ڕەتدانەوەیـــە، وەکو هەموو ڕەتدانەوەکانی دیکە، بوونی مرۆڤ دەیهێنێتە کایەوە، نەک دیالیکتیک. ئێمە ئەمەشمان لەپێشـــتر باســـکردووە. هەروەها ئەم یاســـایە پەیوەندی دەرەکی بوون دەردەخات چونکە لە بارەی پەیوەندی بوونەوەیە لەگەڵ ئـــەو شتەدا، کە نییەتی. کەوابوو، ئێمە مامەڵە لەگەڵ پەیوەندییە دەرەکییەکانی بووندا دەکەین. ئەو پەیوەندییانەش لە ئامادەبوونیان لەگەڵ بوون— لەنێو— خۆدا و لەنێو جیهاندا بۆ مرۆڤ دەردەکەون. ئەم یاســـایە بە پەیوەندییە ناوەکییەکانی بوونـــەوە گرێنەدراوە؛ ئەم پەیوەندییانـــە لەبەر ئەوەی ئەوی دیکە دەردەخەن بە

تەنیا ناتوانن هەبن. یاسای ناســنامە ڕەتدانەوەی هەموو پەیوەندییەکە لە ناخی بوون—لەنێو-خۆدا. ئامادەبوون لە بەردەم خۆدا ئەوە دەگەیەنێت درزێک کەوتۆتە بوونەوە. خۆ لەو کاتەدا لە بەردەم خۆیدا ئامادە دەبێت، کە بە تەواوی خۆی نەبێت. ئامادەبوون ڕاستەوخۆ هاودەمی بوون لەناودەبات و ئاماژە بۆ جیابوونەوە دەکات. بەڵام ئەگەر ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، ئایا ئەو شتە چییە [لە ئامادەبووندا] (خۆ) لە خۆی جیادەکاتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین (هیچە). جیابوونەوە بە هۆکاری دووری لەنێو شوێندا، گۆڕان لەنێو کاتدا، جیاوازییە دەروونییەکان یان بەگشــتی لەنێــوان دوو تاکدا ڕوودەدات، کە پێکــەوەن. بە کورتییەکەی ئەو جیابوونەوەیە هەمیشــە ڕاستەقینەیەکی خەسڵەتدارە. لێرەدا، (هیچ) شتێک ئاگایی بڕوا لە بڕوا جیاناکاتەوە و بڕواش بێجگە لە ئاگایی بڕوا چی دیکە نییە. هەر شتێکی دەرەکی خەســڵەتدار لە دەرەوەی کۆجیتۆی پێش تێڕامانەوە بچێتەســەری یەکبوونەکە دەشوێنێت؛ شتێک لەنێو ئاگامەندییدا ســەرهەڵدەدات، کە ئاگاماندی نایناسێت و بوونێکی ئاگامەندانەشی نابێت. ئەوەی بڕوا لە خودی بڕوا جیادەکاتەوە بە تەنیا نابینرێت. ئەو کاتەی بمانەوێت بیناســین لەناودەچێت و نامێنێت. بڕواش، وەکو شتێکی ناوەکی ڕووت خۆی دەردەخات.

ئەگــەر بمانەوێت خودی بڕوا بناســین درزەکەش بێ ئــەوەی حەزبکەین لە بەردەممانــدا قوتدەبێتەوە و کە بیریشــی لێدەکەینەوە خۆی وندەکات. کەوابوو، درزەکە ڕەتدانەوەیەکی ڕووتە. دووری لەنێو شوێندا و گۆڕان لەنێو کاتدا و جیاوازییە دەروونییەکــان لایەنــی پۆزەتیڤ و لایەنی ڕەتدانەوەیان ئاســانە. درزەکە لەنێو ئاگامەندییدا (هیــچ)ە و ناتوانین بیبینین. ئەم ڕەتدانەوەیە، کە هیچە و هەمانکات هێــزی لەناوبردنە نەبوونە. لە هیچ شوێنێکــدا بەم شێوە ڕەوانە نادۆزرێتەوە. لە شوێنەکانی دیکەدا بۆ ئەوەی، نەبوون بناسین ڕوو لە بوون— لەنێو—خۆ دەکەین. بــەڵام ئەو بوونەی لەنێــو ئاگامەندییدا لە دایک دەبێت (هیچ)ە و دروســتکراوە. بڕوا، بۆ نموونە، پەیوەندی بوونێک لەگەڵ بوونێکی دیکەدا نیشــانادات؛ بەڵکو ئامادەبوونێکــە لەبــەردەم خۆیدا. ئەگەر بــڕوا بەمجۆرە نەبێــت یەکێتییەکەی بوون—بۆ—خو بەســەر دوو بوونی— لەنێو— خۆدا دابــەش دەبێت. لە بەر ئەمە پێویستە بوون—بۆ—خۆ هەمانکات نەبوونیش بێت. ئاگامەندی دوور بەرانبەر خۆی ڕاوەســتاوە، بەڵام ئەم دوورییە (هیچ)ە و نییە. کەوابوو، بۆ ئەوەی (خۆ) هەبێت پێویستــە یەکێتیی ئەم بوونە نەبوونی لەنێو خۆیدا بۆ لەناوبردنی ناســنامەکەی هەڵگرتبێــت. ئەو هیچەی خۆی دەهاوێتە نێو بــڕواوە هیچە. هیچی بڕوایە لەنێو بڕوادا، کە کوێر و پڕە یان "بڕوایەکی ســادەیە". بــوون— بۆ- خۆ ئەو بوونەیە تاکو ئەو ســاتەی خاوەنی ناسنامە نییە و لەگەڵ خۆیدا هاودەم نییە خۆی بڕیار لەسەر بوونی دەدات.

یەکێـــک ناتوانێت نەبوون لـــە هەموو شوێنێک یان لە هەمـــوو هەڵوێستێکدا وەکو بوون بدۆزێتەوە. بوون— بۆ— خۆ هەمیشـــە خـــۆی بە جۆرێک دەنوێنێت، کە تێکشـــکانی خۆی بە دەســـتی خۆی. بێت. ئەم تێکشـــکاندنەش بە بوونێکی دیکەوە نابەســـتێتەوە؛ بەڵکو لـــە تێڕامانی خۆیدایە، لە تێڕامانـــی تێڕاماندایە. ئەمـــەش جوڵانێکی لە کۆتایی بەدەر نییە و لەنێو یەکێتییەکەی بوون—بۆ—خۆدا ڕوودەدات. جوڵانی لە کۆتایی بەدەر بە ناســـینی سەرجەمی لایەنەکانی دیاردەدا دێتەکایەوە، کە لە تێڕامانێکەوە بۆ تێڕامانێکی دیکە بەبێ وەستان دەکەوێتە گەر. کەوابـــوو، نەبوون ئەم کەلێنەی بوونە، کەوتنی بوون—لەنێو—خۆیە بەرەو بوون—بۆ—خۆ. کەوتنێکە، کە دەبێت بەپێکهاتەی بوون—بۆ—خۆ.

بەڵام نەبوون 'دروست کراوە' و پەیوەندی بە هەڵوێستی لەناوبردنەوە هەیە. ئەم کارە هەمیشـــەییەی بوون—لەنێو—خۆ بەرەو ڕوخان دەبات بە کارێکی ئۆنتۆلۆجی ناوزەدیدەکیـــن. نەبوون پرســـیارکردنی بوونـــە لەبارەی بوونـــەوە. ئەو بوونەی پرســـیارەکە دەکـــات ئاگامەندییە یان بوونە-بۆ—خۆ. کاریکـــی ڕەهای بوونە لە ڕێگەی بوونەوە دێتە بوونەوە. مادامەکی بوون—لەنێو— خۆ سەرجەمی لایەنەکانی پۆزەتیڤـــە، ئەوا بێجگە لە نەبوون، هیـــچ بوونێک لە بوونەوە پەیدا نابێت و هیچ شتێکیش بەســـەر بووندا لە بوونەوە ڕوونـــادات. نەبوون ئەگەری تایبەتی بوونە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ئەگەرە لەو کارەدا دەردەکەوێت، کە دەیناسێتەوە. مادامەکی نەبوون نەبوونی بوونە، ئەوا بوون دەیهێنێتە کایەوە. لە ڕێگەی بوونێکی تایبەتەوە دروســـتدەبێت، کە بوونی مرۆڤە. بوونی مرۆڤ هیچە و بنەڕەتی پرۆژەی نەبوونی خۆیەتی. بوونی مرۆڤ ئەو جۆرە بوونەیە، کە لەنێو بوونیدا نەبوون هەیە.

## ٢. فاکتۆری بوون—بۆ—خۆ

بوون— بۆ— خۆ شتێکە، کە هەیە. لەگەڵ ئەوەی بوونێکیشـــەە، کە نییە یان ئەو بوونەیە، کە هێشتا پەیدا نەبوە، دەتوانین بڵێین هەیە. لێرەدا بیر لە پرۆژەی دڵسۆزی دەکەینەوە. بوون—بۆ—خۆ، وەکو ڕووداو هەیە. ئەم بوونەش، وەکو ئەوەیە مـــن دەڵێم فلیپی دووەم هەبوو یان پیرۆی هاوڕێم هەیە یان نییە. بوون—بۆ—خۆ هەیە ئەگەر خۆی ئەو شیوازی بوونەی هەڵنەبژاردبێت. بۆ نموونە، پیرۆ لە ساڵی ١٩٤٢ دەژی و بوژواییەکی فەرەنسییە و سمت لە ساڵی ١٨٧٠ دا لە بەرلین کرێکار بوو. بوون—بۆ—خۆ هەیە ئەگەر [بەبێ خواستی خۆی] فڕێدرابێتە نێو بارودۆخێکی بوونەوە؛ وەکو هەموو ڕێکەوتەکانی دیکە؛ ئەم دیوارە، ئەم درەختە، ئەم پەرداخە یان ئەو پرســـیارەی دەیکەین: "بۆچی ئەم بوونە بەمشـــێوەیەیە و بەشێوەیەکی

دیکــه نییه؟“هەیە. لەوێدا دەڵێین هەیە چونکە خــۆی نەبووە بەبناخەی ئەوەی هەیەتی و خۆشی نەهێناوەتە نێو جیهانەوە. ئەم بوونە نابێت بە بناخەی خۆی. ئەم هەســتکردنەش لە هەموو کۆجیتۆیەکدا هەیە. ڕاستەوخۆ لەنێو کۆجیتۆکەی دێکارتدا دەردەکەوێت کاتێک دێکارت دەیەوێت ســود لەم هەســتکردنە بکات و خۆی وەکــو بوونێکی ناتەواو دادەنێت ”چونکە گومان دەکات“. لەنێو ئەم بوونە نا تەواوەشدا بیرۆکەی تەواوکۆیی پەیدا دەبێت و کەلەبەرێک لەنێو بوونی خۆی و ئەو بوونەی بیریلێدەکاتەوە دێتەکایەوە و لە یەکدیان جیادەکاتەوە. ئەم کەلەبەرە یان کەمی بوونە بۆ بوونی خوا دەبێت بە بەڵگەی دووەم. ئەگەر زمانی فەلسەفیی بیریارانی سەدەکانی ناوەڕاســت بەکارنەهێنین، چۆن ئەم بەڵگەیە دەمێنێتەوە؟ گوایە ئەو بوونەی بیرۆکەی تەواوکۆیی تێدا دروستدەبێت ناتوانێ ببێت بە بناخەی بوون بۆ خۆی. ئەگەر ئەو بناخەیە بوایە ئەوا بوونی خۆی بە تەواوی بە گوێرەی بیرۆکەی تەواوکۆیی دروستدەکرد. بە کورتییەکەی، ئەو بوونەی بناخەی خۆیەتی بە ناتەواوی خۆی دروستناکات.

تێگەیشتنی بوون بە کەم و ناتەواو لە کۆجیتۆدا نا تەواوی ئەم بوونە دەسەلمێنێت. من بیردەکەمەوە، کەوابوو من هەم. بەڵام من چیم؟ ئەو بوونەم، کە بناخەی بوونی خۆی نییە. ئەم تێگەیشتنە لە بوون ئەو هاندەرەشە، هایدیگەر بۆ تێپەڕبوونی ئەم بوونە لە شێوازی ناڕەســەنییەوە بۆ ڕەسەنی باسیدەکات. لەم بوونەدا بەردەوام بانگــەواز و ئازاری ویژدانی هەیە. لە ڕاســتیدا، هایدیگــەر ئاماژە بۆ بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجــی ئاکار دەکات، کە نایەوێــت خۆی لە قەرەی بدات و مرۆڤایەتییەکەی لەگەڵ بەرزێتی ئایینیدا هاوسەنگ بکات. تێگەیشتن لە بوونی خۆمان، وەکو بوونێکی بە ڕێکەوت هەستکردن بە ئازاری ویژدانی نییە. هەمانکات تێگەیشتن لە بوونمان فاکتــۆرە نەویستەکانمان بۆ دەردەخات. لەپێشــتر، بوونی خۆمان بە ئاگامەندی دانــا— ”ئەو بوونە بوو، کە بــۆ خۆیەتی“. چۆن ئەم بوونە لەگەڵ یەکێتییەکەیدا دەتوانێت خۆی بێت، لە کاتێکدا ئەو بناخەی بوونی خۆی نییە؟ یان بوون—بۆ—خۆ، وەکــو ئەو شتەی هەیە، خۆی نییە (بۆ نموونە، بناخەی خۆی نییە)؟ چۆن وەکو بوون—بۆ—خۆ دەبێت بە بناخەی نەبوونی خۆی؟ وەڵامەکە لەنێو پرسیارەکەدایە. کاتێــک دەڵێین بوون، وەکو هێــزی لەناوبردنی خۆی دەبێت بە بناخەی نەبوون، ئــەوە ناگەیەنێت ئەو بوونە دەتوانێت بناخەی بوونیشــی بێت. بۆ ئەوەی ببێت بــە بناخەی خۆی پێویستە خــۆی دوور لە بوونی خۆی ڕاگرێت. ئەمەش یەکێتی ئــەو بوونە دەکات بە دوو بەشەوە. بــە کورتییەکەی، هەر کاتێک بیر لەو بوونە بکەینەوە، کە دەبێت بــە بناخە بۆ بوونی خۆی لەبەردەم بوونێکی هەڵکەوتوودا ڕادەوەســتین، کە دەبێت بە بناخەی نەبوونــی خۆی. ئەو کارەی خوا دەیکات و دەبێت بەهۆکار بۆ بوونی خۆی، خۆ لەناوبردنە. هەروەها بوونی پێویست لەســەر بوونی هەڵکەوتوو ڕادەگیرێت.

هەوڵدانەکەی لایبنیز لە پێناسەکردنی بوونی پێویستدا لەسەر بوونی هەڵکەوتوو، کە دواجار (کانت)یش سودی لێوەرگرتوە بە زانین، نەک بوونەوە بەستراوە. گۆڕان لە ئەگەرەکانەوە بۆ بوونێکی پێویست، بەو شێوەیەی لایبنیز بیریلێدەکاتەوە (بوونی پێویست ئەوەیە بوونێکی هەڵکەوتوو لەسەری ڕادەوەستێت) لەوە دەچێت ئێمە لە نەزانینەوە بەرەو زانین بەرێت. لە ڕاستیدا، مادامەکی ئەگەرەکان پێش بوون دەکەون ئەوا ئەگەرەکان دەبن بە بابەتی زانین. لەپێشتریش باس لەوەکرا لە دوو ڕووەوە بیر لە ئەگەرەکان دەکەینەوە. دەتوانین لەناوەوە ئاماژەیان بۆ بکەین. دەستەواژەی "لەوانەیە پیرۆ مردبێت." ئەوە دەردەخات من لەبارەی پیرۆوە نازانم و ئەو ئەگەرە پێویستی بە گەواهی هەیە. بوون لە دەرەوەی خۆیدا، بەو جۆرەی لەبەردەم ڕێکەوتەکانیدا ڕادەوەستێت، ئەگەرەکانی خۆی دەردەخات.

ئەگەرەکان لەپێشوەختا بە ئێمە دەدرین، بەڵام وەرگرتنیان دەکەوێتە سەر ئێمە. ئەو تۆپی بلیاردەی لەسەر مێزەکە دەڕوات خاوەنی ئەگەری لادان نییە ئەگەر پەڕۆی سەرمێزەکەش کاری تێبکات. تەنانەت ناتوانێت خۆی لە پەڕۆکەش لابدات. ئەو ڕووداوە پێویستی بە گەواهە. ئەگەرەکان، وەکو بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی ڕاستەقینەش بۆ ئێمە دەردەکەون. کەوابوو، سەر بە بوونێکی تایبەتین. ئەو ئەگەرانەن، کە هەن و دەبێت هەبن. لەم ڕووەوە بوون ئەگەرەکانی خۆی دەهێڵێتەوە و دەبێت بە بناخەیان. بوونی پێویستیش لەم ئەگەرانەوە دەرناچێت. لەبەرئەمە، ئەگەر خوا هەبێت، بوونێکی هەڵکەوتوی هەیە.

کەوابوو، لەبەر ئەوەی بوونی ئاگامەندی لەنێو خۆیدا بۆ ئەوەی، وەکو بوونێک بۆ-خۆی لەناوبەرێت، بوونێکی هەڵکەوتوی هەیە؛ ئاگامەندی بوون بۆ خۆی نابەخشێت و لە دەرەوەی خۆشیدا لە بوونێکی دیکەی وەرناگرێت. بێجگە لەمە، بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی، وەکو بەڵگەی کۆسمۆلۆجی ناتوانێت (بوونێکی پێویست) بسەلمێنێت.[41] بوونی من بە بوونی پێویستەوە نەبەستراوە.

پێشەکییەکانی وەکو "بوونی پێویست بناخەی هەموو بوونێکی هەڵکەوتووە و ئێستا من بوونێکی هەڵکەوتووم هەیە" خواستی دۆزینەوەی بناخەیەک دەکات بەبێ ئەوەی باس لە بوونی بناخەیەکی ڕاستەقینە بکات. ئەم پێشەکییانە تەنیا مامەڵە لەگەڵ بیرۆکەی بوونی هەڵکەوتوو دەکەن نەک ڕاستەقینەی ئەو بوونە. هەروەها پرسیارەکە پەیوەندی بە بوونی بەهاوە، نەک فاکتۆرەوە هەیە. بوون-لەنێو-خۆ هەڵکەوتووە و بە خۆ هەڵوەشاندنەوەی لەنێو بوون-بۆ-خۆدا چاک

41 بوونی پێویست لە مێژووی فەلسەفەدا بەو بوونە دادەنرێت، کە بناخەی خۆیەتی و پیویستی بە بوونێکی دیکە نییە لێوەی پەیدا بێت. بوونی هەڵکەوتوو ئەو بوونەیە پێویستی بە بوونێکی دیکەیە تاکو پەیدای بکات. بە دیدی هەندێک لە فەیلەسوفەکان، بوونی هەڵکەوتوو دەبێت بە فاکتۆر و بەڵگە بۆ بوونی پێویست چونکە هەڵکەوتوو ناتوانێت خۆی ئافەریدبکات و پشت بەو بوونە دەبەستێت، کە پێویستە. (وەرگێڕ)

دەبێتەوە. دەیەوێــت لەنێو بوون—بۆ—خۆدا بێت. بە کورتییەکەی، بوون هەیە و دەتوانێــت هەبێت. بەڵام ئەگــەری تایبەتی بوون، کە لە کــردەوەی لەناوبردندا ســەرهەڵدەدات ســەر بە بوونێکە، وەکو ئاگامەندی، کە لــە ڕێگەی لەناوبردنی خۆیــەوە دەبێت بە بناخە بۆ خۆی. بوون—بۆ—خۆ ئەو بوونە-لەنێو—خۆیەیە، کە بــۆ ئەوەی ببێــت بە ئاگامەندی خــۆی، وەکو بوون— لەنێو—خــۆ لەناودەبات. کەوابوو، ئاگامەندی لەنێو خۆیدا بوونی ئاگامەندانەی خۆی دەپارێزێت. مادامەکی دەبێــت بە هێزی لەناوبردنــی خۆی پەیوەندی بە خۆیەوە هەیــە؛ ئەوەی لەنێو ئاگامەندییــدا لەناودەبرێت، هەرچەندە ناتوانین بە بناخــەی ئاگامەندی دابنێن، بوونێکی —لەنێو-خۆی هەڵکەوتووە. بوون—لەنێو—خۆ بناخەی هیچ شتێک نییە. بۆخــۆ دۆزینەوەش دەبێــت خۆی بکات بە بوون—بۆ—خۆ. ئــەو، ئەگەر گۆڕانی بەسەردابێت و وەکو بوونێکی—لەنێو—خۆ نەمێنێتەوە، دەتوانێت ببێت بەبناخەی بوونــی خۆی. ئەگەر بوون—لەنێو—خۆ بناخەی بوونــی خۆی و بوونەکانی دیکە نەبێــت، ئەوا بیرۆکــەی بناخە لە بوون—بۆ-خۆوە لەنێــو جیهاندا پەیدا دەبێت. ئەمــەش تەنیا لەوێدا نییە، کە بوون—بۆ—خــۆ بتوانێت خۆی لەناو بەرێت یان بناخە دروســتبکات، بەڵکو لەگەڵ ئەم بوونــەدا بناخە بۆ یەکەمجار دێتەکایەوە. ئەو بوونە-لەنێو—خۆیەی گەمــارۆدراوە و لەناودەبرێت لەناخی بوون—بۆ—خۆدا، وەکــو بنەڕەتێکی هەڵکەوتوو دەمێنێتەوە. ئاگامەندی بناخەی خۆیەتی، بەڵام بۆ ئــەوەی هەبێت و نەبێــت بــە بوونێکی—لەنێو—خۆی هەمیشــەیی، دەبێت بە هەڵکەوتوویــی بمێنێتەوە. خەســڵەتی هەڵکەوتوویی ئاگامەنــدی لە ناخی ئەم بوونەدایــە. ئەگەر لە بابەتە دراوەکانــی کۆجیتۆی پێش تێڕامان بکۆڵمەوە ئەوە دەســەلمێنین، کــە بوون—بۆ-خۆ ئاماژە بــۆ بوونی خۆی دەکــات. ئەم بوونە هەرچییەک بێت بوونێکە لە شێوازی ئاگامەندیدا. تینوێتی ئاماژە بۆ هەســتکردن بــە تینوێتی دەکات، کــە هەیە و بناخەیەتــی. بەڵام ســەرجەمی "تێرامانی—تێڕامان"، ئەگــەر هەبێت، هەڵکەوتووە و لەنێو—خۆدایە. بەڵام ئەم ســەرجەمە شتێــک نییــە دەســتکەوێت چونکە من ناتوانم بڵێم هەســتکردن بــە تینوێتی هەســتکردنە بە تینوێتــی یان تینوێتــی تینوێتییە. ئەو، وەکــو لەناوبردنێکی ســەرجەم یان یەکێتییەکی لەناوچووی دیاردەیەک هەیە. ئەگەر من دیاردە، وەکو فرەلایەنــی ببینــم، ئەو فرەلایەنییــە هەمانکات ئاماژە بۆ یــەک بوونی دەکات. لەبەرئەمە واتای بوونێکی هەڵکەوتوو دەبەخشــێت. دەتوانم بپرســم "بۆچی من تینوم؟" "بۆچی ئــەو پەرداخە دەبینم؟ لە کاتێکدا ســەرجەمی شتەکانم لەنێو بوون—لەنێو—خــۆدا بۆ دەردەکەوێت ســەرجەمەکە خــۆی لەناودەبات؟ ئایا بۆ ئــەوە نییە؛ بــۆ ئەوەیە نەبێت؟ لێرەدا من بۆ بــوون— بۆ— خۆ دەگەڕێمەوە و دوولایەنــی تیــادا دەبینم. من توڕەم چونکە خۆم، وەکو ئەو کەســە دەردەخەم

ئاگـــای لە تووڕەبوون بێت. ئەگەر من ئەو هۆکارە دەرنەخەم، کە خۆمم و خەفەی بکـــەم، تۆ هیچ نابینیت. تەنانەت تووڕەبوونیـــش نادۆزیتەوە چونکە تووڕەبوون لە بوونی بوون—بۆ—خۆدا هەیە. کەوابوو، هەڵکەوتنێکی هەمیشـــەیی بوون—بۆ—خۆ ڕادەگرێت. بوون—بۆ—خۆش لە ئاســـتیدا بەبێ ئەوەی بتوانێت داپۆشێت، خۆی بە لێپرســـراو دادەنێت. ئەم لەناوچوونە بەردەوامـــەی بوون—لەنێو— خۆ، بەبێ ئەوەی ڕێگەبدات هەســـتی پێبکرێت، دێوەزمەی بوون—بۆ— خۆیە و ئەم بوونە بە بوون—لەنێو—خۆوە دەبەســـتێتەوە. ئەم بوونـــە هەڵکەوتووە فاکتۆری بوون—بۆ خۆیە. ئەم فاکتۆرەیە هانماندەدات بڵێین بوون—بۆ خۆ شتێکە، کە هەیە. لەگەڵ ئەمەشـــدا ئێمە هەســـت بە فاکتۆرەکە ناکەین، بەڵام هەمیشـــە لـــە ڕێگەی ئەم بوونەوە دەیناســـین. لەپێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، ئێمە بەبێ کایەکردن لەگەڵ بوونـــدا هیچین. گوتمان "ئەگەر لە قاوەخانەیەکـــدا خزمەتکاربم"، ئەمە لەوێـــدا ڕوودەدات، کـــە مـــن لە شێـــوازی بوونی خۆمـــدا نەبم و ناســـنامەیەکی هەڵکەوتوشـــم نەبێـــت. هەروەها من نیـــم. ئەم بوون—لەنێو—خـــۆ هەڵکەوتووە هەمیشـــە لێـــم ڕادەکات. بەڵام بۆ ئەوەی سەربەســـتانە واتایـــەک بە ئەرکەکەم ببەخشـــم، بۆ ئەوەی لەم هەڵوێستەمدا هەڵکەوتنی بوون—لەنێو—خۆم لەناوبەرم، پێویســـت دەکـــات ســـەرجەمی بوون—بۆ—خـــۆ لەناوبچێـــت. ئەمـــەش لەوێدا ســـەرهەڵدەدات، کە من دەمەوێت وەکو خزمەتکـــاری قاوەخانەکە خۆم بنوێنم. ناتوانم خۆم بە کەســـێکی دیبلۆماســـی یان کەشتییەوانێک نیشـــانبدەم چونکە من[لەو حاڵەتەدا] دیبلۆماسی یان کەشتییەوان نیم. ئەم هۆکارە دەستگیرنەبووەی حاڵەتەکەم و جیاوازییە هەستپێنەکراوە تێگەیشتنەکە و هۆکاری سادەی بوون—بۆ—خـــۆ لە یەکدی جیادەکاتـــەوە. هەمانکات لە هەڵبژاردنـــی واتایەکدا بۆ ئەو حاڵەتـــە و دانانی خۆی بە بناخەی حاڵەتەکـــە، خۆی هەڵنابژێرێت. ئەم بەشەی حاڵەتەکـــەم من بە لێپرســـراو بەرانبەر بوونی خۆ دادەنێـــت چونکە من بناخەی حاڵەتەکەم، بەڵام هێشـــتا ســـەرجەمی بوونم[لەو حاڵەتەدا] پاکانەی بۆ ناکرێت. بەبـــێ فاکتۆرەکان ئاگامەنـــدی دەتوانێت، وەکو دەروون لـــە کۆماری ئەفلاتوندا باســـکراوە و پەیوەندی بە جیهانەوە دەبەســـتێت، ئەویش خـــۆی بە جیهانەوە گرێبـــدات. ئەگەر بتوانم بڕیاربدەم "وەکو کرێکارێک یان بورژوایەک لەدایک ببم"، هێشـــتا لە لایەکی دیکەوە، فاکتۆرەکان، وەکو کرێکـــار یان بورژوایەک نابن بە پێکهاتـــەی بوونی من. فاکتۆر تەنیا ئاماژەکردنێکە بۆ بوونم، لە کاتێکدا بمەوێت لەگـــەڵ خۆمدا هاوســـەنگ بم بەو شتەی هەیـــە. مادامەکی فاکتـــۆر بە تەواوی دۆزراوەتەوە و سەربەســـتانە خۆی دامەزراندوە مەحاڵە بە ڕووتکراوی بیناســـین. فاکتۆرێکـــی ســـادەی وەکو "بوون لەوێدا" لە تەنیشـــت مێزەکەوە یان لەســـەر کورســـیەکە، بابەتێکـــی ڕووتە و چەمکی ســـنورداری خۆی هەیە و ناناســـرێت.

هەمانکــات لەنێو ئاگامەندییدا بووە بــەو شتەی لەوێدایە و هەڵکەوتوویەکی پڕ و تــەواوە. بوون—بۆ—خۆ قــووڵ دەڕوانێتە خۆی و خۆی بــە ئاگایی بوون لەوێدا دادەنێت. ئەوەی لەنێو خۆیدا دەیدۆزێتەوە هاندەرەکانییەتی؛ بەردەوام ئاماژە بۆ خۆی و سەربەستییەکەی دەکات. (من لە پێناوی ... لەوێدام و هتد). پەیوەندی نێــوان بوون—بۆ—خــۆ، کە بناخەی خۆیەتــی، لەگەڵ فاکتۆرەکانــدا بەپێویست دادەنرێت. ئەم پەیوەندییە فاکتۆرییە پێویستەیە. دێکارت و هوسرڵ بە پێکهاتەی کۆجیتۆی دادەنێــن. بوون—بۆ—خۆ بوونێکی پێویستی هەیــە، چونکە بناخەی بوونــی خۆیەتــی. لەبەرئەمەشە دەبێت بە بابەتی حــەدەس و ناتوانم گومان لە بوونــی خۆم بکەم. بــەڵام لەبەر ئــەوەی بوون—بۆ—خۆ شتێکــە نییە. هەموو هۆکارێکــی هەڵکەوتــووی تێدایــە. بەوجــۆرەی سەربەســتییەکەم لەدوودڵیدا دەناســمەوە، بوون—بۆ—خــۆ لە فاکتۆرەکانی بــە ئاگا دەبێتەوە. هەســت بە سوپاســگوزاری دەکات و خۆی بەوبوونە دەبینێت لەبەر هیــچ لەوێدا دانرابێت. نابێــت فاکتۆرەکان لەگــەڵ ناوەڕۆکی دێکارتییدا تێکەڵ بکەین، کە خەســڵەتی بیرکردنــەوەی هەیە. ئەم ناوەڕۆکــە هەیە چونکە بیردەکاتــەوە. لەبەر ئەوەی ئافەریدکــراوە، دەبێت بە شتێک لــەو شتانەی دروســتدەکرێن و شتێکە هەیە. ناوەڕۆکێکە خەســڵەتی بوون—لەنێو—خۆ وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە بوون—بۆ—خۆ دادەنرێت. ئەمەش بۆچوونێکی ئەندێشاوی دێکارتییە بۆ بوونی ناوەڕۆک. بە پێچەوانەشەوە، بــۆ ئێمە دیاردەی بوون—بۆ—خۆ ئاماژە بۆ هەوڵدانی بوون—لەنێو—خــۆ بۆدامەزراندنــی خۆی دەکــات؛ هەوڵدانی بوونە بــۆ لابردنی لایەنە هەڵکەوتووەکــەی خۆی. بەڵام ئــەم هەوڵدانە بە لەناوبردنــی بوون—لەنێو-خۆ کۆتایــی دێت. بوون—لەنێو-خۆ بەبــێ ئامادەکردنی (خۆ)یان تێڕامان و بوون بە بۆ—خۆ، ناتوانێت ناســنامەکەی خــۆی لەناوبەرێــت. بوون—بۆ—خۆ، کەوابوو، تێکشــکاندنی بونیــادی بوون—لەنێو—خۆیــە و ئــەم بوونــە لــە پێناوی خۆ دامەزراندنەکەیــدا لەناودەبرێــت. فاکتۆر ناوەڕۆک نییە و نابێت بە خەســڵەتی بیرکردنــەوە بۆ بوون—بۆ—خۆ. بەڵکو شتێکە لەنێو ئەم بوونەدا، وەکو یادەوەری یان ئامادەبوونی لە مەبەســت بەدەری ئەم بوونە لەنێو جیهاندا جێنشــین بووە. بوون—لەنێو—خــۆ دەتوانێــت نەبوونی خــۆی دامەزرێنێت، بــەڵام بوونی خۆی دانامەزرێنێت. لەنێو بوون—بۆ—خــۆدا، خۆی لەناودەبات و دەبێت بە بوون—بۆ-خــۆ و بناخەی خۆی. بەڵام ئەو لایەنە هەڵکەوتــووەی بوون—بۆ-خۆ لە بوون—لەنێو—خۆوە بۆی بەجێمــاوە ناگیرێت. ئەو لایەنەی بوون— لەنێو—خۆی بوون—بۆ—خۆیە ماوەتــەوە و دەبێت بە هۆکاری پەیوەندی فاکتۆری پێویست. بناخەی ئاگایی بوون—بۆ-خۆیە لە بوون. کەوابوو، ئاگامەندی لە هیچ حاڵەتێکدا خۆی لە بوون نادزێتەوە و بەرانبەر سەرجەمی بوونی خۆشی لێپرسراوە.

## ٣. بوون—بۆ—خۆ و بوونی بەها

هەموو توێژینەوەیەک لە بوونی مرۆڤ دەبێت لە کۆجیتۆوە بکەوێتە گەر. بەڵام "مـــن بیردەکەمەوە"ی دێکارتی پەیوەندی بە خێـــرا تێپەڕینی کاتەوە هەیە. ئایا دەتوانین ئەم خێرا تێپەڕینە کاتییەی کۆجیتۆ تێپەڕ بکەین؟ ئەگەر ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتـــی بە "من بیردەکەمەوە" ســـنوردار بکەین، ئەوا ڕاســـتییەکەی تەمەن کورت و ســـاتی دەبێت. بێگومان دروستە لەگەڵ کۆجیتۆکەی دێکارتدا دەتوانین ســـەرجەمی خێرا تێپەڕبوونەکە بناســـین چونکە لە داهاتوو نادوێ، هەروەها بۆ تێپەڕبوون لە ساتێکەوە بۆ ســـاتێکی دیکە 'داهێنانی' بەردەوام پێویستە. بەڵام ئایا دەتوانین ڕاستی ساتێکیش بناسین؟ هایدیگەر دەیەوێت بۆمانی بسەلمێنێت، کـــە "مـــن بیردەکەمەوە"ی هوســـرڵ تەڵەیەکە بۆ کڵاوکورە گرتـــن دانراوە بۆیە لە توێژینەوەکەیدا لەســـەر (دازاین) ئاماژەی بـــۆ ئاگامەندی نەکردوە. هەوڵیداوە ڕاســـتەوخۆ[ئەم بوونە]بە نیگەرانی دابنێت؛ لە پرۆژەی (خۆ)وە بەرەو ئەگەرەکان ڕۆیشتوە. ئەم پرۆژەی (خۆ)یەی لە دەرەوەی خۆدا ناو ناوە 'تێگەیشتن'. ئەمەش هایدیگـــەری گەیاندوە بەو باوەڕەی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بە "ئاشکراکردنی—ئاشکراکردن" ناوزەدبکات. بەڵام ڕاکردن لە (خۆ)ی دازاین توشی چەند گرفتێکمان دەکات. ئێمە ناتوانین ڕەهەندی ئاگامەندی خەفە بکەین. تێگەیشـــتن لەوێدا واتا دەبەخشـــێت، کە ببێت بە ئاگایی تێگەیشتن. ئەگەرەکانم لەوێدا دەبن بە ئەگەری مـــن، کە ئاگامەندیـــم ڕوویانتێدەکات. ئەگەر ئەمە دروســـت نەبێت، هەموو بوون و ئەگەرەکـــان دەکەونـــە نێو ئاگامەندییەکەوە، کە دەبێت بـــە بوونـ‌لەنێو—خۆ. ئێمـــە جارێکی دیکە فڕێدەدرێینە نێو کۆجیتۆوە. پێویستە ئەمە بکەین بە خاڵی دەستپێکردنەکەمان. ئایا باسکردنەکەمان بۆ بوون—بۆ—خۆ چی ئاشکرا دەکات؟

یەکـــەم، ئێمە توشـــی لەناوبردن هاتین، کـــە بوون—بۆ—خـــۆ لەنێو بوونیا هەڵیگرتوە. ئاشکراکردنی ئەم نەبوونە لە چوارچێوەی کۆجیتۆوە ناچێتە دەرەوە. بەڵام با نزیکتر تەماشای ئەم کێشەیە بکەین.

بوون—بۆ—خـــۆ بەبێ ئاشکراکردنی بوونی خۆی بە کەمی و ناتەواوی ناتوانێت بەردەوام دەســـتەڵاتی لەناوبردن ڕاگرێت. ئەمەش ئـــەوە ناگەیەنێت لەناوبردن و بەتاڵـــی ئاگامەندی یەک شتن. بوون—بۆ—خـــۆ بەردەوام دەیەوێت، وەکو بوون—لەنێو—خۆ نەناســـرێت. بوونێکـــە لەنێو—خۆ، بـــەڵام دژی بوون—لەنێو—خۆیە. مادامەکی لەناوبردن هەمیشـــە لەناوبردنی بوونە، ئەوا لەناوبردن پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوونـ‌لەنێوـ‌خـــۆ دیاریدەکات. بوونی کۆنکرێتی و بوون—لەنێوـ خۆ بە پڕی لەبەردەم ئاگامەندییدا ئامادەیە. ئاگامەندیش ســـورە لەســـەر ئەوەی لـــەو بوونەوە جیاوازە. کۆجیتۆ دەبێت ســـەرجەمی ئەو بوونـــە دەرەکییەمان بۆ

ئاشکــرا بکات. هەروەها وەســتانی ئەو بابەتەش لــە دەرەوەدا بەرزێتی بوون—بۆ—خۆ دەردەخات. بەڵام لە ڕاســتیدا دەســتەڵاتی لەناوبردنــە لەنێوان بوون—بۆ—خــۆ و بوون—لەنێو—خۆدا، کە دەبێت ببێت بە بنەڕەتی بەرزێتییەکە. لێرەدا دەزانین چۆن لە کۆجیتۆوە دەرچین. دوایی ڕوونیدەکەینەوە چۆن کۆجیتۆ واتای چوونەدەرەوەش دەبەخشــێت. ئەوەی توێژێنەوە ئۆنتۆلۆجییەکەمان دەریدەخات ئەو خاڵەیە، کە ئەم بوونە کەم و ناتەواوە بناخەی خۆیەتی و خۆی خەسڵەتەکانی بوونی خۆی لەســەر ئەو کەمــی و ناتەواوییە دروســتدەکات. لەگەڵ ئەمەشدا، گەلێــک ڕێگەی نەبوون هەیە. هەندێکیان ســروشتی نــاوەوەی ئەو بوونەی، کە بــەو جۆرە نییە، کە نییە تێکنادەن. ئەگەر، بۆ نموونە، بڵێم شوشەی مەرەکەب باڵنــدە نییە، بوونی شوشــە مەرەکەبەکە و باڵندە بــەم ڕەتدانەوەیە ناشێوێن. ئەمە پەیوەندییەکی دەرەکییە. لــە ڕێگەی بوونی مرۆڤەوە دادەمەزرێت و مرۆڤ دەبێت بە گەواهــی پەیوەندییەکە. بە پێچەوانەشەوە، جۆرە ڕەتدانەوەیەک هەیە لەنێــوان دوو لایەنەکەی ڕەتدانــەوەدا دەبێت بە پەیوەندییەکــی ناوەکی. لەنێو هەموو ڕەتدانەوە ناوەکییەکاندا، ئەوەی لە هەموویان زۆرتر ناخی بوون دەپێکێت و نکۆڵــی لەنێــو بوونە نکۆڵی کەرەکــەدا دەکات (کەمیی)یە. کەمیی ســەر بە بوون لەنێو—خۆ نییە چونکــە ئەم بوونە لە هەموو لایەنێکەوە پۆزەتیڤە. لەگەڵ بوونــی مرۆڤدا لەنێــو جیهاندا پەیدادەبێت. تەنیا لەنێــو جیهانی مرۆڤدا کەمیی دەبینرێت. هەروەها کەمیی پێویستی بە ســێ لایەنی لەپێشتر هەیە: ئەو شتەی نییە یان کەمییە، ئەوەی کەمییەکەی هەیە، دوا جاریش ئەو هەبووە سەرجەمەی کەمییەکە ڕوخاندوییەتی و بەتێهەڵکێشکردنی 'کەمییەکە' و ئەو (بوون)ەی خاوەنی کەمییەکەیە دروستدەبێتەوە، ناویدەنێین (کەمیی). ئەو بوونەی خۆی لە حەدەسی مرۆڤــدا دەردەخات هەمیشــە کەمییە. بۆ نموونە، ئەگەر بڵێــم مانگ پڕ نییە و چارەکێکی کەمە. ئەم دەستەواژەیەی من بە حەدەسەکەمەوە بەستراوە، کە مانگ بە هیلالی دەبینێت. ئەوەی لە حەدەســەکەمدا دەرکەوتوە بوونێکە-لەنێو—خۆدا، کــە تەواو یان نا تەواویش نییە، بەڵکو شتێکە هەیــە و پەیوەندی بە شتەکانی دیکەشەوە نییە. بۆ ئەوەی ئەم بوونە، وەکو هیلال ببینرێت پێویستە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ئەوەش بزانێت، کە[مانگ] بە پڕیش هەیە و دوای ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەزمونەکەی و مانگەکە بە هیلالی دەبینێت. ئەمە تێپەڕبوونە بەسەر ئەو کەمییەدا. لەم ڕووەوە کەمیی، وەکو بوونە و بوونیش کەمییە. ئەم کەمییەش، کە تەواوکەری بوونە بەســتراوە بە سەرجەمی تێهەڵکێشــراوی کەمییەوە. کەوابوو، لە جیهانی مرۆڤدا ئەو بوونە ناتەواوەی بە حەدەس دەناســرێت و کەمییەکەی دەردەکەوێت پێکهاتەی بوونی کەمیی تێدایە و شتێکە، کە نەبوون حوکمی بەســەردا دەدات. هــەر ئەو مانگە پڕەیە خۆی بە هیلالی دەردەخات و ئەوەی نییە حوکم بەســەر

هەبووەکەدا دەدات. هەروەها لە بوونی مرۆڤیشدایە، وەکو بوونێک لەبەر بەرزێتی و دەرچوونی لە خۆیەوە پەیوەندییەکانی دروستدەکات، کەمییەکان دەناسێتەوە و واتاکانیـــان لێکدەداتەوە. بوونی مرۆڤ، ئەو بوونەی کەمیی دەهێنێتە جیهانەوە، پێویستە خودی بوونی کەمیی بێت. کەمیی لە ڕێگەی کەمییەوە دێتە جیهانەوە. بوون—لەنێو—خـــۆ کەمیی پەیدا ناکات. بە واتایەکـــی دیکە، ئەو بوونەی کەمیی تێدابێت یان شتێکـــی کەم بێت، دەبێت خودی خۆی ببێت بە کەمیی. تەنیا ئەو بوونەی کەمیی هەیە دەتوانێت هەوڵبدات بەو شتە بگات، کە کەمە یان نییەتی.

بوونی ئارەزوو لە مرۆڤدا بەڵگەیە بۆ کەمیی. لە ڕاستیدا ناتوانین لە ئارەزوو بدوێین ئەگەر بە حاڵەتێکی دەروونی دابنێین؛ ئەو بوونە بێت، کە سروشتەکەی شتێک بێت هەبێـــت. ئەو بوونەی هەیە نەبوون لەخۆیدا نابینێت و هەوڵی خۆ تەواوکردن نادات. بازنەیەکی ناتەواویش تەواو نابێت ئەگەر بوونی مرۆڤ ئەو ناتەواوییە نەناســـێتەوە. بازنە ناتەواوەکە لەنێو—خۆیدا وەکو هێڵێکی چەماوە بوونێکی تەواوی هەیە. حاڵەتی دەروونی لەبـــەردەم هێڵە چەماوەکەدا هیچ شتێک زیاد یان تەواو ناکات و ناتوانێت پەیوەندی خۆی بە کەمییەکەوە دروســـتبکات. بۆ ئەوەی هەســـت بە برسێتی یان تینوێتی بکات پێویستە بوونێک هەبێت لە بەرزێتییەکەیدا لەخۆیەوە دەرچێت و ڕوو لە دەرەوەبکات و ســـەرجەمی (تێربوون)؛ بەو جـــۆرەی مانگی پڕی بۆ دیاریکردنی شێوەی هیلالی ناسی، ئەمیش بناسێتەوە. بە دانانی ئارەزوو، وەکو هێزێکی فیزیکی لـــە گرفت ڕزگار نابین. ئەگەر بەو جـــۆرەش دایبنێین، ئەو هێزەی دەبێت بە هۆکار لە خۆیەوە بەرەو حاڵەتێکی دیکە دەرناچێت. ئەو هۆکارەی دەبێت بە ســـەرچاوەی هۆکردەکە لەگـــەڵ ئارەزوودا هاوتەراز دانانرێن. تینوێتی دیاردەیەکی ئۆرگانی نییە؛ پێویستییەکی فزیۆلۆجی بۆ ئاو نییە. ئەو ئۆرگانەی کەمیی ئاوی هەیە، پۆزەتیڤانە خۆی دەردەخات: بۆنموونە، خەســـتبونەوەی خوێن، کـــە دەبێت بە هۆکاری چەند دیاردەیەکی دیکە. دامەزران حاڵەتێکی پۆزەتیڤی ئۆرگانیزمە و ئاماژە بۆ بوونی خۆی دەکات. ئەو شلەیەی ئاوی تێدا نەماوە و خەست بۆتەوە ئارەزووی ئاو خواردنەوەی نییە. ئەگەر بمانەوێت پەیوەندی نێوان لایەنی هۆشەکی و فسیۆلۆجی نیشانبدەین، پێویستیمان بە بناخەیەک بۆ ناسنامەیەکی ئۆنتۆلۆجی دەبێت. ئەمەش ئەو خاڵەیە ســـپینۆزا ئاماژەی بۆ کردوە. لە ئاکامدا بوونی لایەنە دەروونییە تینوەکە دەبێت بە بوون-لەنێو-خـــۆی حاڵەتەکە و ئێـمەش جارێکی دیکە دەبێت گەواهێکی دەرەکی بۆ نیشان بکەین. کەوابوو، تینوێتی ئارەزوو بۆ بابەتە دەرەکییەکەیە نەک بۆ خۆی. لە چاوی کەسێکی دیکەدا، دەبێت بە ئارەزوو. ئەگەر ئارەزوو بۆ خۆی ببێت بە ئارەزوو، پێویستـــە بوونێکی بەرزی هەبێت؛ دەبێت لە خۆیەوە دەرچێت و ڕوو لە بابەتەکەی بکـــات. دەبێت کەمیی بێت— نەک بابەتی کەمیی و کەمیش بێت بۆ خۆی. ئارەزوو کەمیی بوونە و گەواهی لەسەر کەمیی بوونی مرۆڤ دەدات. بەڵام ئەگەر بوونی مرۆڤ

کەمیی بێت، ئەوا سێ لایەنەکەی بوون و کەمیی و ئەوەی کەمە دێتە کایەوە. ئایا ئەم سێ لایەنە چێن؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە بۆ بیرۆکەی کەمیی بگەڕێینەوە و بزانین پەیوەندی بە بوونەوە چییە. ئەم پەیوەندییە نابێت هەڵکەوتوو بێت. ئەگەر کەمیی لە ئامادە نەبووندا بێت، ئەوا ئامادەبوونێش لە ناخی بووندایە چونکە بوون و کەمی هەردووکیان دەبن بە سەرجەمی یەک ڕاستەقینە. ئەوەی بە کەمیی دادەنرێت، دەتوانێت خۆی ڕەتکاتەوە و بەرەو ڕووخان بڕوات. کەوابوو، کەمیی دیاردەیە و لەسەر زەمینەی سەرجەمی بوونەکەدا ڕادەوەستێت. گرنگیش نییە ئەگەر ئەو سەرجەمە لەپێشتر درابێت و ئێستا تێکشکا بێت (بۆ نموونە، "هەردوو قۆڵی پەیکەری ڤینۆس شکاون")یان هەرگیز هەستیپێنەکراون. (بۆ نموونە، دەڵێین "ئەو ئازا نییە.") هەموو کەمییەک کەمیی شتێکە و بۆ شتێکە. ئایا ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی (بۆ) چییە؟ بوون—بۆ—خۆ بناخەی خۆی و سەرچاوەی ڕەتدانەوەیە. خۆی لەنێو پەیوەندی ڕەتدانەوە لەگەڵ خۆیدا دەدۆزێتەوە. ئەوەی ڕەتیدەداتەوە و لەناویدەبات بوون— لەنێو—خۆیە. گرنگ نییە بوون—لەنێو—خۆ چی هەبوویەکدا بێت: بوونی مرۆڤ پێش هەموو شتێک بناخەی نەبوونی خۆیەتی. ئەوەی ڕەتیدەداتەوە و لەناویدەبات خۆیەتی. واتای بوونی مرۆڤ وابەستە بەم لەناوبردنەوەیەوە؛ لەم ڕووەوە ئەوەی بوونی مرۆڤ نییەتی و کەمییە بۆی بوونی خۆیەتی، وەکو بوونێکی —لەنێو—خۆ. مادامەکی پەیوەندی بوونی مرۆڤ لە سەرەتاوە لەگەڵ خۆیدا ئەوە نییە، کە هەیە ئەوا پەیوەندییەکەی سەرەتایی نییە، واتاکەشی لە بنەڕەتەوە لەو پەیوەندییەدا دەبینرێتەوە، کە هیچە. ئەو (خۆ)یەی هەیە بوون—بۆ—خۆ بەو بوونە دادەنێت، کە ئەوە نییە هەیە؛ پەیوەندی نێوان ئەم بوونە و خۆی بە ناسنامەوە نابەستێتەوە. ئەوەی بوون— بۆ—خۆ نییەتی (خۆ)یە یان بوون— لەنێو—خۆیە. لەگەڵ ئەمەشدا، نابێت ئەم کەمییە بە فاکتۆر دابنرێت. سەرنەکەوتنی فاکتۆری بوون-لەنێو—خۆ لە دۆزینەوەی خۆیدا، پەیوەندی بە ئامادەبوونی بوون— لەنێو- خۆ لە جیهاندا هەیە. بوون—لەنێو-خۆ وونبوەکە، لە لایەکی دیکەوە ئامادەبوونێکی ڕووتە. هەروەها سەرنەکەوتنی دۆزینەوەکە بووە بە هۆکار بۆ بوون—بۆ—خۆ، کە لە خۆیەوە دەردەچێت و دەبێت بە بناخەی نەبوونی. واتای سەرنەکەوتنی دۆزینەوەکەش بە بەرزێتی دەمێنێتەوە. بوون—بۆ—خۆ لەبەر ئەوەی بوونێکی سەرنەکەوتوانەی هەیە، بناخەی نەبوونی خۆیەتی. سەرنەکەوتن لە بوونی ئەودایە. واتاکەشی لەوێدا دەردەکەوێت، کە بوون—بۆ—خۆ لە ئاستی سەرنەکەوتنەکەدا سەرنەکەوتنی خۆی بناسێتەوە. کۆجیتۆ بە سروشت ئاماژە بۆ کەمیی و کەمبوون دەکات چونکە بوون داگیریکردوە. دێکارتیش ئەم ڕاستییەی زانیوە.

ئەمە سەرچاوەی بەرزێتییە. بوونی مرۆڤ ڕوو لە شتە کەمەکانی دەکات؛ ڕوو لە بوونێکی هەندەکی هەبوو دەکات. بوونی مرۆڤیش لەپێشدا دروست نەبووە و لە

دواییدا کەمییەکە خرابێتە سەری؛ لە سەرەتاوە بە کەمییەوە پەیدادەبووە. کەوابوو، ئەو ڕووداوەی مرۆڤ لە ئاستی کەمییەکەی بوونیدا ڕادەگرێت ئامادەبوونێتی لەنێو جیهاندا. لەگەڵ پەیدابوونیدا مرۆڤ خۆی بە بوونێکی ناتەواو دەبینێت. لەبەردەم کەمییەکەیدا خـــۆی بەو بوونە دادەنێت، کە نییە. بوونـــی مرۆڤ تێپەڕبوونێکی بەردەوامە بەرەو هاوســـەنگ بـــوون لەگەڵ بوونی خۆیدا بۆ ئەوەی ســـەرکەوتن بە دەســـت بهێنێت. ئەگـــەر کۆجیتۆ بە بوونێک بگات لەبـــەر ئەوەیە، کە خۆی تێپەڕدەکـــات و ڕوو لـــە بوونێک دەکات؛ چونکە لەگەڵ خۆیدا هاوســـەنگ نییە. کۆجیتۆ بەبێ توانەوە بە بوون—لەنێو—خۆوە بەستراوە. ئەمەش، وەکو پەیوەندی نێـــوان بیرکردنەوەو بابەت نییـــە، کە بوون—لەنێو—خۆ دەکـــات، بە شتێکی پەیوەندیـــدار، بەڵکو، وەکو کەمییە. لەم ڕووەوە بەڵگـــەی دووەمی دێکارتی لە جێگەی خۆیەتـــی. بوونی ناتەواو بەرەو تەواوکۆیـــی دەڕوات؛ تەنیا ئەو بوونەی بناخـــەی نەبوونی خۆیەتی بەرەو ئەو بوونە دەڕوات، کە بناخەی بوونی خۆیەتی. بـــەڵام ئەو بوونەی مرۆڤ ڕوویتێدەکـــات و دەیەوێت بیگاتێ خوایەکی بەرز نییە؛ بوونی خۆیەتی؛ سەرجەمی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤە.

ســـەرجەمی ئەم بوونە هەڵکەوتوویەکی ســـادە و ڕووتی بوون—لەنێو— خۆی بەرز نییە. ئەگەر ئەو سەرجەمە بەمجۆرەبێت، لەگەڵ لەناوبردنەکەی ئاگامەندییدا هاوســـەنگ دادەنرێت. بەڵام ئاگامەندی بەرەو لەناوبـــردن ناڕوات؛ نایەوێت خۆی لەنێو ناســـنامەی بوون—لەنێو—خۆدا ونبکات. تێپەڕبوونەکەی لەپێناوی بوون—بۆ—خۆدایە.

کەوابـــوو، ئامادەنەبوونە بەردەوامەکەی بووە بـــە دێوەزمەی بوون—بۆ—خۆ لە بوون—لەنێو—خۆدا چەسپاوە. تێهەڵکێشـــانێکی نەگونجاوی بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆیە؛ بناخـــەی خۆیەتی نەک، وەکو نەبوون بەڵکو، وەکو بوون و شەفافییەتـــی ئاگامەندیش لە هاودەمبوونی نێوان ئاگامەندی و بوون—لەنێو—خۆ دەپارێزێـــت. گەڕانەوەی ئاگامەندی بۆ خۆی دەپارێزێت، کە هەموو پێویستییەک و بناخەیەک ســـنوردار دەکـــات. گەڕانەوەکە مـــەودای نییە؛ لەبـــەردەم خۆیدا ئامادەنابێت، بەڵام هاوســـەنگە. بـــە کورتی، ئەم بوونە بە تـــەواوی خۆیەتی و لەپێشـــتریش بەو بوونەمان دانا، کە بەردەوام خۆی لەناودەبات. ئەم (خۆ)یەشە بوونێکی ناوەڕۆکـــی هەیە. کەوابوو، بوونی مرۆڤ لەبەردەم کەمیی ســـەرجەمی بوونی خۆیدا ڕادەوەستێت. سەرجەمی بوونی شتێک نییە سروشت پێی ببەخشێت چونکە لەنێو خۆیدا خەســـڵەتی نایەکسانبوونـــی بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خـــۆی هەڵگرتوە. با ڕێگە نەدەین یەکێک بە ئەندێشـــە ئەم جۆرە بوونەمان بۆ دابهێنێـــت؛ ئامادەنەبوونی ڕەهای ئەو بوونە لەودیو جیهانەوە بە (خوا)ی دابنێت. ئایـــا خوا ئەو بوونە نییە، کە هەیە و پۆزەتیڤە و بناخەی جیهانە؟ هەمانکاتیش

ئەو بوونە نییە، کە هەیە و ئەوەشە، کە نییە؛ خۆ ئاگا و بناخەی پێویستی بوونی خۆیەتی؟ مرۆڤ بوونێکی ئازارچێژە چونکە بێهودە دەیەوێت بەسەرجەمی بوونی خـــۆی بگات و ناتوانێت بەبێ وازهێنان لە بوون—بۆ—خۆ ببێت بە بوون—لەنێو—خۆ. ڕاســـتەقینەی مرۆڤانە، کەوابوو، لە بنەڕەتەوە ئاگامەندییەکی نابەختەوەرە و ئومێدیـــش ناکرێت نابەختەوەرییەکەی تێپەربکات. ئایا ســـروشتی ئەو بوونەی ئاگامەندی نابەختەوەر ڕوویتێدەکات چییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین نییە؟ دۆزینەوەی ناکۆکییەکـــان لەناویدا دەریدەخات و بە شتێکی نەناســـراوی دادەنێت. بەڵام هیچ شتێک دژی ئەم ڕاستییە بەڵگەنەویستە ڕاناوەستێت: لەوێدا ئاگامەندی دەتوانێت هەبێـــت، کە خۆی بە بوونەکانـــی دەوروبەرییەوە خەریک بکـــات و ئامادەبوونی خۆیانی بۆ دەربخەن. ئایا دەکرێت بڵێین بوونێکی پەیوەندیارە بە ئاگامەندییەوە؟ ئەمەش لەگەڵ بابەتدا تێکەڵی دەکـــات. ئەم بابەتە لەبەردەم ئاگامەندییدا خۆی قوتنەکردۆتـــەوە. ئاگامەندیش بۆ ئەم بابەتە نییە چونکە پێش تێڕامانیش بوە بە دێوەزمـــەی ئاگامەندی. ئاماژە بۆ ئاگامەنـــدی، وەکو واتای بوونی خۆی دەکات، هەمانکات ئاگامەندی ئەو ئاگاییەش لەو بوونە نییە و ئاگاییە لە خۆی. هەمانکات ناتوانێت خۆی لە ئاگامەندی بدزێتەوە؛ بەڵام تاکو ئەو ڕادەیەی ئاگامەندی ئاگاییە لـــە بوون ئەو بوونە هەیـــە. ئاگامەندی، بەو جۆرەی واتا بە شوشەمەرەکەبەکە و پاندانەکە دەبەخشـــێت، واتا بۆ ئەم بوونە دانانێت. هاوکات بەبێ ئەم بوونە، کە فۆرمی نەبوونی هەیە، ئاگامەندی، بۆ نموونە، وەکو کەمیی نییە. بە پێچەوانەوە، ئاگامەنـــدی لەم بوونەوە واتا بۆ خۆی دادەنێت. ئـــەم بوونە لەگەڵ ئاگامەندییدا دێتەکایـــەوە و بوونێکی دەرەکی و ناوەکیشـــە. لە پێش بوونی ئاگامەندییدا نییە و ئاگامەندیـــش پێـــش ئەو ناکەوێت. هەردووکیان دوانـــەن. هەڵبەتە ئەم بوونە بەبـــێ بوون— بۆ—خۆ نییە، بەڵام بوون—بۆ-خـــۆش بەبێ ئەو نابێت. ئاگامەندی لـــە پەیوەندییەکەیـــدا لەگەڵ ئەم بوونـــە دەبێت بەم بوونە، چونکـــە ئەم بوونە ئاگامەندییە، بەڵام وەکو ئەو بوونەی، کە ئاگامەندی ناتوانێت هەیبێت ئاگامەندییە لە خودی ئاگامەندییدا و هەمانکات بوونێکە پێیناگات و ئامادەنەبووە و نەناسراوە. کۆکردنەوەی ناکۆکییەکان لە سروشتیدایە؛ پەیوەندییەکەی لەگەڵ بوون—بۆخۆدا ناوەکییە، کە لە ڕێگەی بەرزێتییەوە دەستیدەکەوێت. بێجگە لەمە پێویست ناکات ئـــەم بوونە لە بەردەم ئاگامەندییدا ئامادەبێـــت. ئاگامەندی کۆنکرێتی حاڵەتێکی تایبەتی و تاکە لەگەڵ پەیوەندی بە حاڵەتەکەیەوە ســـەرهەڵدەدات.(خۆ) لەنێو ئەمجـــۆرە ئاگاییـــەدا ئامادەیە و پەیوەندی بە هەمـــوو لایەنەکانی ئەم ئاگاییەوە هەڵدەبەستێت. (خۆ) تاکە؛ ئەو تاکەیە خۆی تەواو کردووە و بووە بە دێوەزمەی بوون—بۆ—خۆ. هەستکردن [ســـۆز]بۆ نموونە، هەستکردنە لە ئاستی نەریتێکدا؛ کە هەســـتکردن دەبێت بەوەی هەیە. ئەو نەریتە، وەکو ســـەرجەمی کاریگەرێتی

خـــۆ ڕاســـتەوخۆ ئامادەبوونی کەمیی لەناخی ئاگامەندییـــدا دەردەخات و توشی ئەشکەنجـــەی دەکات. [هەندێکجار] کەســـێک توشی ئەشکەنجـــە دەبێت بەوەی توشی ئەشکەنجـــەی زۆر نەبووە. ئەو ئەشکەنجەیەی باســـیدەکەین هەرگیز ئەو ئەشکەنجەیە نییە توشی دەبین و هەســـتی پێدەکەین. ئەوەی بە ئەشکەنجەیەکی 'چـــاک' یان 'ڕاســـت' ناوزەدیدەکەین و ئێمە دەجولێنێت بەڕوخساری کەســـانی دیکەوە دەیبینین یـــان باشتر لە پۆرترەیت، پەیکەر یان دەمامەیەکی شانۆگەری تراجیدیـــدا دەیدۆزینەوە. ئەو ئەشکەنجەیەیە، کـــە هاتۆتە بوونەوە. بۆ ئێمەش، وەکـــو کۆکراوەیەکـــی دەرەکی بێ ئـــەوەی چاوەڕێمان بکات خۆی بەرجەســـتە دەکـــات. ئەشکەنجەیەکی پەیدابووە لەنێو جیهانـــدا، وەکو ئەو درەختە یان ئەو بـــەردە شتێکی ڕەق و پڕە؛ بەردەوام دەمێنێتەوە و دواجاریش شتێکە، کە هەیە. دەتوانین باســـی بکەیـــن یان لە ڕێگەی ڕووگرژییەوە نیشـــانی بدەین. بەهۆکاری لەشمانەوە دەریدەبڕین، بەڵام لەش ســـەرچاوەی ئەشکەنجە نییە و بەسەر لەشدا ســـەپێنراوە؛ شتێکە لەودیـــو کارتێکردن و کارتێکراوەوە، لـــەو دیو ڕەتدانەوە و ســـەلماندن و شتێکە، کە هەیـــە. بەهەرحاڵ، ئەشکەنجە ئاگاییـــە لە خۆ. ئێمە دەزانین ئەو دەمامەیە لایەنی ئەودیو ئاگامەندی کەســـێکی نوســـتو یان هەستی مردوویەک نیشانناداتی. ئاماژە بۆ ئەگەرەکان و هەڵوێستەکانی نێو جیهان دەکات. ئەشکەنجـــە لە پەیوەندی ئاگامەندییدایە بـــەم ئەگەرانە و هەڵوێستانەوە و وەکو برۆنز بە ســـەر بوونەوە ڕەق بوەو بەســـتویەتی. بەمجۆرەیە بۆیە دەبێتە هۆکاری سەرســـوڕمانمان. ئەشکەنجەی نێو ئەزمونی من، بـــە پێچەوانەوە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ دۆزینەوەی خۆیدا لەناودەچێت هەرگیز لەبار نییە. وەکو ئەشکەنجە بەرەو ئاگایـــی لە ئەشکەنجە ڕادەکات و کتوپڕ خۆی دەرناخات چونکە لە ئەزموونەکەی مندا تاکو ڕادەیەک دەردەکەوێت.

شەفافییەتبوونـــی قوڵییەکـــەی لەناودەبـــات. منیش بەو شێوەیـــەی ئازار و ئەشکەنجـــە لـــە ڕوخساری پەیکەرێکدا دەبینم ئەم نابینم چونکە من هەســـت بە ئەشکەنجەکـــەی خـــۆم دەکەم. ئەگـــەر بمەوێت توشی ئەشکەنجـــە بم پێویستە ئەشکەنجەکەم، وەکو زریانێک هەڵکاتە ســـەر بوونم کەچی من خۆم سەربەستانە دەیهێنمـــە بوونەوە. من خۆم بـــۆی دەناڵێم و دەلاوێنمەوە و هەســـتیپێدەکەم. دەســـتەئەژنۆ دادەنیشـــم، دەگریـــم تاکـــو ئـــەو بوونە-لەنێو—خۆیـــە دەنگ و ڕوخسارەکـــەی نێو جیهانی، کە ئەشکەنجەی هەڵگرتوە لـــە بوونی مندا نەبێت. هەموو ئاخ هەڵکێشان و ڕوخسارێکی خەمۆکی لە مرۆڤدا بۆ داتاشینی پەیکەرێکی ئەشکەنجەیە لە بووندا. بەڵام ئەو پەیکەرە بەبێ بوونی کەســـانی دیکە نابینرێت. ئەشکەنجەی من لەوێدا توشی ئەشکەنجە خواردن دەبێت، کە دەبێت بەوەی نییە و ئـــەوەش نییە، کە هەیە. لەو حاڵەتەدا، کـــە لەبەردەم خۆیدا قوتدەبێتەوە، لە

خـــۆی ڕادەکـــات و جیادەبێتـــەوە. جیابوونەوەکەشی لەخۆیـــەوە بەو (هیچ)وە بەســـتراوە، کە هەمانکـــات دەبێت بە بناخەی شتێکی زۆربڵـــێ چونکە نالەبارە. لەبێدەنگیشـــدا وەکـــو بێدەنگـــی پەیکەرەکە یان ئەو کەســـەی لەژێـــر لێداندا ســـەردادەخات و دەست بە دەموچاویەوە دەگرێت و بێدەنگ دەبێت هیچ دەورێک نابینێت. ئەو کەســـە بۆ من بێدەنگـــە، بەڵام لەناوەوە بـــەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەدوێت و مشـــتومڕێتی. لە چاوانی مندا لەنێو ئەشکەنجەدا تێکشکاوە. ئەو خۆی دەزانێت بەرپرســـە لە ئـــازار و ئەشکەنجەکەی و خۆی بێ ئـــەوەی بیەوێت ئەو بارودۆخەی بەســـەر خۆیدا هێنـــاوە. ئەو خەمەی بە کەمییەکی هەمیشـــەییەوە بەســـتراوە و پەیوەنـــدی بە نەبوونی ســـەرجەمبوونی بوون-بۆ-خـــۆ وە هەیە ئەشکەنجەیە. [لەم ڕووەوە]ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ ئەشکەنجاوییە. ئەشکەنجەی ڕاســـتەقینەی من لەوەدا نییە بە (خۆ) بگەم، بەڵکو لەوەدایە، کە ئاستی نەبوونی تەواوی ئەشکەنجـــەدا، ئەوەندە ئەشکەنجـــەم نەخواردوە. ئێستـــا دەتوانین بە دڵنیاییەوە لەســـەر بوونی (خـــۆ) بدوێین: خۆ بەهایە. بەهـــاش لە دوو لایەنەوە کاریتێدەکرێـــت، کـــە بیریارانی زانستی ئاکار بە ناتەواوی باســـیانکردوە و بەبێ مـــەرج بە هیچیان دانـــاوە. بێگومان بەها، وەکو بەها بوونـــی هەیە. بەڵام مەرج نییە ئەمجۆرە بوونە ڕاســـتەقینە بێت. بوونی ئـــەو لەوەدایە، کە بەهایە و بوون نییـــە. کەوابوو، بوونی بەها، وەکو بەهـــا ئەو شتەیە، کە بوونی نییە. لەبەرئەمە بەها دەســـتگیرنابێت. ئەگەر بە بوون دابنرێت ئەوا لە ڕاستەقینەکەی تێناگەین و وەکو زانا کۆمەڵناســـەکانیش بە یەکێک لـــە فاکتۆرەکانی دادەنێین. لەم ڕووەوە لایەنـــی هەڵکەوتوویی بوون بەها لەناودەبات. بـــە پێچەوانەی ئەمەشەوە، ئەگەر بەهـــا بە بیرۆکە دابنرێت و بوونی لێـــوە دەرهێنین ئەوا دەتوێتەوە. بێگومان بەو جـــۆرەی شیلەر بـــۆی دەچێت، ئێمە لە هەڵوێستێکدا هەســـت بـــە بوونی بەها دەکەین؛ هەســـت بە چاکە لە کارێکی چاکدا دەکەین. بەڵام ئەم بەهایەی لێرەدا هەســـتیپێکراوە بوونی لە شێوەی بوونـــی کردەوەکەدا یان هەڵوێستەکەدا نییە و پەیوەندییەکەی بە کردەوەکەوە لە پەیوەندی نێوان ڕەنگی سور و بابەتێکی سور دەچێت. بەها لەودیـــو کردەوەکانەوەیە. بۆنموونە چاکـــە شتێکی نەبڕاوەی ئەو دیـــوو کـــردەوە چاکەکانە. بەها لەو دیـــو بوونەوەیە. هەمانکـــات پێویستە ئەم بوونەی ئەو دیو بوون شێوازێکی بوونی هەبێت. ئەم ڕوونکردنەوانە بەو ئاکامەمان دەگەیەنـــن، کە بەها لـــە ڕێگەی بوونی مرۆڤەوە دێتە نێـــو جیهانەوە. بوون-بۆ بەهـــا ئەوە دەگەیەنێت، ئـــەو بوونە بەرەو بەها لە بوونـــی خۆیەوە دەردەچێت؛ هەمـــوو هەڵوێستێک لەبەردەم بەهادا دەرچوونە لـــە بوونەوە بەرەو ئەو بەهایە. مادامەکـــی بەها هەمیشـــە و لە هەمـــوو شوێنێکـــدا لـــەو دەرچوونەدایە، ئەوا یەکگرتنێکـــی بـــێ مەرجە لەو دەرچوونەدا. لە خۆیـــدا دوو لایەنی هەڵگرتوە؛ لە

لایەکـــەوە دەرچوونـــە لە بوونەوە و لە لایەکی دیکەوە ئـــەو دەرچوونە دەهێنێتە بوونەوە و دەبێت بە ڕاســـتەقینەیەکی مرۆڤانـــە. هەروەها دەبینین لەبەر ئەوەی بەهـــا دەرچوونێکـــی بێ مەرجە، ئەوا دەبێت لە بنەڕەتـــەوە لەودیو ئەو بوونەوە بێـــت، کە بـــۆی دەردەچێت. تەنیا لەم حاڵەتەدا بەهـــا دەبێت بە شتێک لەودیو بوونـــەوە. ئەگەر هەموو دەرچوونێک تەوانای دەرچوونـــی هەبێت، پێویستە ئەو بوونەی دەردەچێت لەپێشتر بێت چونکە ســـەرچاوەی دەرچوونەکەیە. کەوابوو، بەها یان بەهای بەرز دەکەوێتە ئەودیوەوە و بەرزە. شتێکە لەودیوەوە دەبێت بە بناخـــەی دەرچوونەکانـــم، بـــەڵام ڕوو لـــەو شتە دەکـــات، کە مـــن هەرگیز لە دەرچوونەکەمـــدا ناتوانم جێی بهێڵم چونکە دەرچوونەکانم پێویستییان بە بوونی ئـــەوە. لەنێو هەموو بارودۆخەکانـــی کەمییدا ئەوەی کەمـــە بەهایە؛ بەڵام بەها کەمیـــی نییە. بەها، بـــەو ڕادەیەی (خۆ) دەبێت بە دێوەزمـــەی بوون—بۆ—خۆ، دەبێت بـــە خۆ. ئەو بەها بەرزەی ئاگامەندی دەیەوێـــت بیگاتێ بوونێکی بەرزی خـــۆ و خاوەن ناســـنامەیەکی ڕەوان و بەردەوامە و دەیکـــات بە بناخەی خۆی. لێـــرەدا ئێمـــە تێدەگەین، کە بۆچی بەها هەیە و نییـــە. واتایەکی لەودیو هەموو تێپەڕبوونەکانـــی ئاگامەندییەوە هەیە؛ ئامادەنەبوونـــی بوون—لەنێو—خۆیە لەنێو بوون—بۆ—خۆدا. هەمانکات لەگەڵ ناسینەوەی بەهادا تێدەگەین، کە خودی بەها تێپەڕبوونـــی بوون—لەنێو—خۆیە چونکە بەها بوون بە خۆ دەبەخشـــێت. لەودیو بوونی خۆیەتی چونکە لەگەڵ خۆیدا هاوتەرازە و بوونی خۆی، کە هەمیشـــەیی و بەردەوام و خاوەن ناسنامەیە تێپەڕدەکات. بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر بوونی بەها لەبـــەردەم خۆیدا ئامادەبێت ئامادەبوونەکەی ڕاســـتەوخۆ دەبێت بەبوونێکی پڕ و پتەو یان بوونێ—لەنێو—خۆ.ئەو ســـەرجە مە پەیدانەبووەی بوونیشـــی هەمانکات لەنێو بوونیدا ســـەرهەڵدەدات. بۆ ئـــەو بوونە دێتە پێش، کە بناخەی لەناوبردنی خۆیەتـــی. لێـــرەدا بەها دەبێت بە دێوەزمەی ئەو بوونـــەی خۆی دادەمەزرێنێت، نەک ئەو بوونەی هەیە. بەها دێوەزمەی سەربەســـتییە. ئەمەش ئەوە دەردەخات، کـــە پەیوەندی بەها لەگەڵ بوون—بۆ—خـــۆدا تایبەتە؛ ئەو بوونەیە، کە تاکو ئەو ڕادەیەی بناخەی نەبوونی خۆیەتی دەبێت هەبێت. هێشتا، لەو کاتەدا دەبێت بەو بوونـــە لەبەر ئەوە نییە، کـــە لەژێر پاڵەپەســـتۆیەکی دەرەکییدایە؛ بەها، وەکو جوڵێنەری لە جوڵەبـــەدەری ئەریستۆ ئارەزووی بۆ فاکتۆرەکان کاریتێناکات یان لەبەر ئەوە نییە هەســـت بە بوونی کراوە؛ بەڵکو لەبەر ئەوەیە خۆی دەکات بەم بوونە یان بە (خۆ)، بوون—بۆ—خۆ و پەیوەندییەکانیشـــی لەســـەر سەربەســـتی دادەمەزرێـــن. ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت بێجگە لەو سەربەســـتییەی، کە بوونی منیش دەهێنێتە کایەوە و لەنێو فاکتۆرەکانیشـــدا سنوردارە— دەبێت بە بناخەی نەبوونی خۆی و هیچ شتێکی دیکە بەها دروستناکات. هەروەها مادامەکی بوون—

بۆ—خـــۆ بناخەی نەبوونـــی خۆیەتی ئـــەوا ناتوانێت ببێت بـــە بناخەی بوونی. لەبەرئەمەشە بوون—بۆ بەها هەڵکەوتە (لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ ئاکاردا دەبێت بە ڕێژەیی) و هەمانکاتیش پێویستییەکی ڕەها و سەربەســـتە. بەها شتێک نییە بوون—بۆ—خۆ دابنێـــت؛ بەڵکو لەگەڵ ئەم بوونەدایە. ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بوون—بۆ-خـــۆ و بەهایە. ئەگـــەر بڵێین بەها دێوەزمـــەی بوون—بۆ-خۆیە و ئەو داینەناوە لەبەر ئەوەیە، کە بەها بابەت نییە؛ ئەگینا بوون—بۆ-خۆ لەو حاڵەتەدا، کـــە لەگەڵ بەهادا دوو شتی جیاواز دەبینرێـــن، دبێت بە دانەری بابەت. کەوابوو بـــوون— بۆ-خۆ، وەکو بوونێکـــی بەئاگا لە خۆ، وەکو مۆنادەکـــەی لایبنیز، کە لەبـــەردەم خوادا ڕادەوەســـتێت، ڕوو لە بەها ناکات. هەروەهـــا لەم قۆناخەشدا ناناســـرێت چونکە زانین بابەتی زانراو لەبەردەم ئاگامەندییدا ڕادەگرێت. بەها لە هەمـــوو شوێنێکـــدا هەیە و لـــە هیچ شوێنێکیشـــدا نییە؛ لە ناخـــی لەناوبردنی پەیوەنـــدی "تێرامانی تێرامانداییـــە"، شتێکە ئامادەیە و دەستیشـــمان نایگاتێ. شتێکـــە واتای کەمیی بە بوونم دەبەخشـــێت. بۆ ئەوەی بەهـــا ببێت بە بابەتی بوون—بۆ-خـــۆ دەبێت خـــۆی لەبەردەم تێرامانـــدا قوتبکاتـــەوە. ئاگامەندی لە تێڕوانینـــدا دوو شـــت وەدەســـت دەهێنێـــت؛ ئەزموونی ژیان، کە لـــە تێڕاماندا دەردەکەوێـــت و بە کەمیـــی دادەنرێت و بەهاش لەنێو ئـــەو کەمییەدا دەبێت بە شتێکی دوور و دەســـتنەکەوتوو. لەم ڕووەوە ئاگامەنـــدی لە تێڕاماندا دەبێت بە ئاگامەندی ئاکاری چونکە بەبێ بەرجەســـتەکردنی بەها سەرهەڵنادات. ئاشکرایە لـــە بیرکردنەوە و تێڕاماندا دەتوانم سەربەســـتانە بیر لـــە بەهاکان بکەمەوە یان ئاوەڕیان لێنەدەمەوە، ئەمـــەش وەکو ئەوە وایە من بمەوێت تەماشای ئەو مێزە، پاندانەکەم، یان کیسەی توتنەکەم لە نزیکەوە بکەم. ئەوانە بابەتی بیرکردنەوەی منن. پێویست ناکات خۆمان بەو ئاکامە بگەیەنین و بڵێین تەنیا تێڕامان بەهاکان دەردەخات و بە ڕێگەی لێکچونیشـــەوە بەهاکانی بوونمـــان لە جیهانێکی بەرزدا دابنێین. ئەگەر بابەتی حەدەس دیاردەی ڕاســـتەقینەی بوونی مرۆڤ بێت، نەک بوونێکی بەرز ئەوا ئەو بابەتە لەگەڵ بەهادا خۆی دەردەخات. بوونی بوون—بۆ—خۆیەکـــی دیکەش دیاردەیەکی نادیار و شـــاراوە نییە تاکو لە ڕێگەی لێکچونێکی هۆشەکییەوە بیدۆزینەوە. ئەو بوونە خۆی بۆ من نیشـــاندەدات؛ دەبینین بوون—بۆ—خـــۆ لەبەردەم بوون—بۆ ئەوانـــدا پێویستە. بەها، لـــەم ڕووەوە، دەبێت بە شتێکی پێویست لەئاستی بوونی— ئەواندا. بەڵام لەبەر ئەوەی چۆنیەتی بوونی— ئەوانمان ڕووننەکردۆتەوە، ئەوا ناتوانین باســـی ڕووبەڕووبوونەوەی دەرەکی بەها بکەین. لە بەشی سێیەمی ئەم نوسراوەدا مامەڵە لەگەڵ ئەم کێشەیەدا دەکین.

## ٤. بوون—بۆ—خۆ و بوونی ئەگەرەکان

ئێمــە بینیمان ڕاســتەقینەی بوونی مرۆڤ، وەکــو بوون—بۆ—خۆ لە کەمیی پێکهاتبوو. ئەو کەمییەش جۆرێکە لە هاوسەنگی بوون لەگەڵ خۆیدا.

هەریەکێک لەبوون—بۆ—خۆی تاکەکان جۆرێک ڕاســتەقینەی تایبەتی کەمە. ئەگەر ئەو بوون—بۆ—خۆیە لەگەڵ ئەو ڕاستەقینەیەدا تێهەڵکێش بکرێت دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ. ئەم بوونە کەمیی شتێکە بۆ شتێک؛ لە مانگی هیلالی دەچێت و دەیەوێت بگات بە پڕی. کەمییەکەی لەنێو پرۆسەی بەرزێتییەکەیدا سەرهەڵدەدات و لە گەڕانەوەی بەرەو کەمییەکانی حوکمی بەســەردا دەدرێت. کەمیی بەگوێرەی بەرزێتی پێناســدەکرێت. کەمیی مانگ لــە شێوەی هیلالدا هەوڵدانێتی بۆ خۆپڕ کردن و تەواوبوونی خۆی.

کەمیــی گۆشەیەکی کراوەی، وەکــو (ا ب س) بۆ ئەوەی ببێت بە دووگۆشەی ڕاســت گۆشەی تیژی (س ب د) یە. لەوێدا، کەمیی بوون—بۆ— خۆ، کە دەیەوێت ببێت بە (ســەرجەمی)خۆی بوونی خۆیەتی. بــەڵام بۆ ئێمە بوون—بۆ—خۆ؛ ئەو بوونــەی، کــە من نیم شتێکــی دوور و بێگانە نییە. لە ڕاســتیدا ئەو کەمییەی بوون—بۆ—خــۆ هەیەتی منم. لــە لایەکی دیکەوە، ئەگەر ئــەو کەمییە من بم و ناسنامەیەکیشــم هەبێــت، ئەوا پێکهاتەکە دەبێت بــە بوون—لەنێو—خۆ. من بۆ بوونی خۆم لەو شیوازەدا، کە هێشتا نیم و نەگەیشتوم بەو خۆیەی ناسنامەیەکی هەبێت منم. کەوابوو، پەیوەندییە بەرزەکەی بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ (خۆ)دا بەردەوام لەو پرۆژەیــەدا دەردەکەوێت، کە من تیایدا ئامادەنیم و کەمیم. ئەو کەمییەی لە بوون—بۆ—خۆدایە ئــەو بوونە خۆیەتی. لەبەرئەمە ڕوونادات بوون—بۆ—خۆ بەبێ پــڕۆژە و ڕوونەکردن لــە ئەگەرەکانیەوە هەبێت. هەمانکــات کۆجیتۆ دەبێت بە پاڵنەری دەرچوونەکەی بەرەو ئــەوەی نییەتی. بۆ ئەوەی باشتر لەوەبگەین، کە ڕاســتەقینەی مرۆڤانە ئەوەیە هەیە و نییە، پێویستە بۆ ئەگەرەکان بگەڕێینەوە و لە واتاکەی تێبگەین. ئەمەش لە تێگەیشــتن لە بوونی بەها سەختتر نییە چونکە پێش ئەگەرێکی ڕەوان خۆی دەســەپێنێت؛ هەمانکاتیش بوونی، وەکو ئەگەرێکی ڕەوان خــۆی دەردەخــات. ئایا ئێمە ناڵێین "لەوانەیە ئەو بێت"؟ لە ســەردەمی لایبنیزەوە، (ئەگەر) بەو ڕووداوە دانراوە، کە زنجیرەی هۆکارەکان نییە و لەگەڵ خۆی و سیستەمەکەشیدا ناکۆک نییە.

لەم ڕووەوە پێناســی ئەگەر لەسەر زانین کراوە چونکە ئێمە ناتوانین بوون و نەبوونی ئەگەرێکی بەردەممان ڕەتدەینەوە. کەوابوو، دوو هەڵوێستمان لە ئاستی ئەگەر دا هەیە: وەکو ســپینۆزا دەتوانین بڵێیــن، ئەگەرەکان لە پەیوەندییان بە

نەزانینمانـــەوە پەیدا دەبن و لەگەڵ نەمانی نەزانینەکەماندا ئەوانیش لەناو دەچن. لێرەدا لەســـەر ئـــەو ڕێگایەی دەمانەوێت لێوەی بە زانینـــی تەواو بگەین ئەگەر دەبێـــت بە قۆناخێکی ناوەکـــی لەنێو خۆدا. بوونێکی خۆیی یـــان دەرونی هەیە و لەنێـــو جیهاندا نییە. بەڵام بەو جۆرەی لایبنیـــز دەڵێت، دەکرێت زنجیرەیەکی نەبڕاوەی ئەگەرەکان، وەکو بابەتی نێو بیر لە نێو تێگەیشـــتنی خوادا دابنێین و بە ڕاســـتەقینەیەکی ڕەها ناوزەدیان بکەین. ئەم بۆچوونە یارمەتی ویستی خواش دەدات و چاکتریـــن ســـیستەم لەنێویاندا پێکبهێنێت. لـــەم حاڵەتەدا، هەرچەندە زنجیرەی هەســـتکردنی مۆنادەکان دیاریکـــراوە،[42] لەو ڕوانگەیـــەوە، کە گوایە ناوەڕۆکی ئادەم، ئەو بوونەی هەمووشتێک دەزانێت و دەتوانێت بڕیاربدات، بێهودە نییە بڵێین: "لەوانەیە ئادەم دەســـت بۆ ســـێوەکە نەبات". ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لەنێو بیری خوادا سیستەمێکی دیکە، بە تەنیشت ئەم ئەگەرەوە هەبـــووە و تیایدا ئادەم میوەی درەختی زانینی نەخواردوە.[43] ئایا ئەم چەمکە لەوەی ســـپینۆزاوە جیاوازە؟ لەڕاستیدا ڕاســـتەقینەی (ئەگەر) لەبیری خوادایە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە بوونی لەنێو بیرکردنەوەدا هەیە، بەڵام هێشتا لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا سەریهەڵنەداوە. لێرەدا کێشەی خۆگەرایەتی شێوازێکی جیـــاواز وەردەگرێت چونکە ئێمە مامەڵە لەگـــەڵ ئاگایی خوا نەک مندا دەکەین. ئەگـــەر خۆگەرایەتی لەگەڵ بوونێکی بڕاوەدا تێکـــەڵ بکەین ئەوا لەم بۆچوونەدا خۆگەرایەتی دیارنامێنێت و تێگەیشـــتنەکە دەبێت بەنەبڕاوە. بەهەرحاڵ، هێشتا ئەگەرەکـــان لەنێو بیرکردنەوەدا بە بیرۆکەیی دەمێننـــەوە. لەوە دەچێت لایبنیز جۆرێک ســـەربەخۆیی و تایبەتمەندێتی بۆ ئەگەرەکان دانابێت. لەو نوســـراوانەدا (کۆنـــورات) لە چاپیـــداون دەردەکەوێت ئەگەرەکان خۆیان بە ســـیستەمێکەوە دەبەستن و ئەوەی لە هەموویان زۆرتر پڕ و تەواوە خۆی ئامادە دەکات ببێت بە هەبوویەکی ڕاستەقینە. ئەمە تەنیا بۆچوونێکە و لایبنیز نەیتوانیوە بەرەوپێشەوەی بەرێـــت و بیکات بە ڕێچکەیەک. لە دوو حاڵەتدا ئەگەرەکان بەرەو بوون دەبرێن: لـــە حاڵەتی یەکەمدا ئەگەر خودی ئەگەرەکان بوونێکی پڕیان هەبێت و دووەمیش هەمـــان شێواز یان جـــۆری بوونیان هەبێت، بۆ نموونـــە تەوانایی بە خونچەیەک

٤٢ بۆ لایبنیز(١٦٤٦ — ١٧١٦) فەیلەسوفی ئەڵمانی، جیهان بە هەموو هەبووەکانەوە و بوونی مرۆڤیشەوە لە ئەتۆمی گیانەکی پێکهاتوون، کە بە (موناد) ناوزەدیان دەکات. هەروەها لەو باوەڕەدایە، ئەم مونادانە لە مونادی ڕەهای خواوە بە پڕی و تەواوی دێنەکایەوە و هەر یەکێک لەوان جیهانێکی پڕو سەربەخۆیە.(وەرگێڕ)

٤٣ سارتەر نموونەی(ئادەم) ی لە داستانی نێو(تەورات)ەوە وەرگرتوە. لە (تەورات) دا بە تایبەتی پەرتووکی (پێکهاتن)، کە بەشی یەکەمی تەوراتە ئادەم سێوی نەخواردوە بەڵکو بەری درەختی زانینی تامکردووە. ئەو درەختەی لە ئادەم قەدەغەکراوە درەختی زانین بووە. بڕوانە: تەورات، پەرتووکی پێکهاتن بەشی ٢: ١٦.(وەرگێڕ)

دەدرێـــت، تاکو ببێـــت بە گوڵ یان لـــە وەرزی گوڵی نێـــو بیرکردنەوەی خوادا ئەو ئەگـــەرە بیرۆکەیەکی—هێزدارە و لە ســـیستەمێکدا دامەزراوە و ویستی خوا دەردەخات. بەڵام لێرەدا ئێمە لەنێو جیهانی خۆگەرایەتی دەرناچین.

هەروەها لە پێناســـەکردن (ئەگەر)دا، وەکو شتێکی لە ناکۆک بەدەر بوونێکی پێدەبەخشین، کە تەنیا لەنێو بیرکردنەوەدا هەبێت و پێش بوونی جیانیش بکەوێت یـــان پێش بیرۆکەی بوونی جیهان بکەوێت. لـــە هەر دوو حاڵەتەکەدا ئەگەرەکان بوونی خۆیان وندەکەن و لەنێو خۆدا دەتوێنەوە.

ئەو بوونەی بۆ ئەگەری دادەنێین لە ســـروشتی ناچێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ســـروشتی لەناودەبات. لە ژیانی ڕۆژانـــە و مامەڵەکردنمان لەگەڵ ئەگەرەکاندا بە لایەنێکـــی نەزانینەکەمان و ئەو بونیادە لە ناکۆک بەدەرەی نێو جیهانی دانانێین، کە هێشـــتا نەناســـراوە. ئەگەرەکان، وەکو خەســـڵەتی بوون خۆیـــان بۆ ئێمە دەردەخـــەن. من تەماشای ئاســـمان دەکەم و دەڵێـــم، "لەوانەیە باران ببارێت." لێرەدا لە واتای ئەگەر، وەکو شتێکی لە ناکۆک بەدەری حاڵەتی ئاسمان تێناگەم. ئەو ئەگەرە، وەکو هەڕەشەیەک ســـەر بە بوونی ئاســـمانە؛ پەیوەندی بە هەوری ئاســـمانەوە هەیە، کە من دەیبینم بارانی هەڵگرتوە. ئـــەم تێپەڕبوونە هەورەکە هەڵیگرتـــوە و ئـــەوەش دیاریدەکات، کە هەورەکە بوونێکی بـــەرزی بەرەو باران باریـــن هەیە. لەم نموونەیـــەدا (ئەگەر) بە بوونێکی هەندەکییەوە بەســـتراوە و ئامـــاژە بۆ هێز دەکات. ئەم نموونەیە بەســـەر چاوەڕوانکردنی ئێمەشدا لە هاتنی هاوڕێیەکماندا دەســـەپێنرێت و دەڵێین، "لەوانەیە ئەو بێت." یان "ئەو دەتوانێت بێت." لەم ڕووەوە (ئەگەر) نابێت بە ڕاســـتەقینەیەکی خۆگەرانە. هەروەها پێش ڕاستەقینەکەش ناکەوێت. خەســـڵەتێکی کۆنکریتی ڕاستەقینەی هەبووەکانە. بۆ ئەوەی باران بارین ببێت بە (ئەگەر)، پێویستە هەور بە ئاسمانەوە بێت. بێهودەیە بوون لە پێناوی دەرخستنی ئەگەرەکاندا بشـــارینەوە. تێپەڕبوون لە نەبوونەوە بۆ بوون بەنێو ئەگەرەکاندا ڕاســـتەقینە دەرناخات. بـــە دڵنیاییەوە، (ئەگەر) شتێک نییە پەیدابووبێت یان هەبێت، حاڵەتێکی گونجاوە، کە بوون و نەبوونی لەســـەر ڕادەوەســـتێت. بێگومان، ئەگەر بەمجۆرە کێشـــەکە ڕوونبکەینـــەوە لە چەمکی 'هێزەکی'ی ئەریستۆ نزیکدەبینەوە. ئەمەش بۆ خۆ دوورخستنەوەمان لە چەمکی ئەگەرێکـــی لۆجیکـــی لە (چاریبدس) ەوە بەرەو (ســـکیلا)مان دەبـــات و داوای داهێنانی چەمکێکی سیحراویمان لێدەکات. بوون—لەنێو—خۆیدا بوونێکی هێزەکی نییـــە و خاوەنی لایەنێکی هێزەکیش نییە. ئەم بوونە ئەوەیە، کە هەیە و خاوەنی ناســـنامەیە. هەور لایەنـــی هێزەکی باران بارین نییە و هەڵمـــی ئاوە، کە لە ژێر پاڵەپەســـتۆی هـــەوا و ڕادەیەکی دیاریکراوی پلەی گەرمـــادا بووە بەوەی هەیە. بوون—لەنێو—خـــۆ بوونێکی کردەکییە. بەڵام تێدەگەین چۆن هەڵوێستی زانستانە

لەگــەڵ داماڵینی جیهان لە مرۆڤایەتی ئەگەرەکانـــی بە لایەنی هێزەکی داناوە و هەموو ئەگەرێکی بە لایەنی ناوەوەی مرۆڤ و نەزانینەوە بەســـتۆتەوە. هەنگاوی یەکەمی هەڵوێستە زانستییەکە دروســـتە؛ (ئەگەر) لەگــەڵ بوونی مرۆڤدا پەیدا دەبێت. ئەو هەورانە باران دەبارێنن ئەگەر من گۆڕانەکە ببینم، هیلالیش بەشێکی مانگە ئەگەر من بە مانگی یەک شەوەوە بینەســـتمەوە. ئایا پێویست دەکات ئەم ئەگەرانە بە جیهانی نـــاوەوەی مرۆڤەوە گرێبدەین؟ وەکو چۆن کەمی لەگەڵ ئەو بوونەدا هاتە جیهانەوە، کە لە بوونیدا کەمی[نەبوون] هەیە، ئەگەریش لەگەڵ ئەو بوونەدا پەیدا دەبێت، کە لە بوونیدا ئەگەر هەیە.

پێویستە لەوەش دڵنیابین، ئەگەر و بیرۆکەی ئەگەر هاوجوت نین. لەڕاســـتیدا ئەگەر (ئەگەرەکان) بابـــەت نەبن و بوونێکی دەرەکییان نەبێت نابن بە ناوەڕۆکی بیرۆکەکانیان. ئەگەر (ئەگەرەکان) لەنێو تێگەیشـــتنی خـــوادا دابنێین و ببن بە ناوەڕۆکـــی بیرۆکەی خوا ئـــەوا وەکو بیرۆکەی کۆنکرێتی[نێو تێگەیشـــتنی خوا] دەبینرێـــن. لێرەدا ئەمە وەکو گریمانەیەک دادەنێین، هەرچەندە مەحاڵە تێبگەین چۆن ئەم هێزە نەرێیە دەبێت بە بوونێکی ڕاســـتەقینە دەڵێین خوا دەســـتەڵاتی ڕەتدانەوەی هەیە، بۆ نموونە دەتوانێت لایەنی نەرێی بیرۆکەکانی دەربخات. لەگەڵ ئەمەشدا، مەحاڵە بزانین چۆن ئەم بیرۆکانە دەبن بە ئەگەرەکان.

ئەنجامـــی ڕەتدانەوە و دەربڕینێکی نەرێ ئـــەوە دەردەخات، کە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا هاوجوت نییە. کاتێک دەڵێین لە جیهاندا نییە مەبەســـتمان ئەوەیە، کە ئەو ئەســـپەی ســـەری مرۆڤی پێوەیە بوونێکی (ئەگەر)ی هەیە. سەلماندن و ڕەتدانەوەی خەسڵەتی (ئەگەر)لەسەر بیرۆکەیەک دەرناکەون. لەوانەیە لای هەندێک ئەو خەسڵەتە بە تێهەڵکێشکردنی سەلماندن و ڕەتدانەوە دەرکەوێت، بەڵام هێشتا تێهەڵکێشکردن هەموو لایەنێکی ئەو شتەمان نیشاننادات. لەبەرئەمە لایەنی ناوەوە و ســـەلماندنی نەزانینمان لە دەرخستنـــی پەیوەندی نێوان بیرۆکەکان و داکەوتدا نابن بە زەمینە بۆ ئەو خەسڵەتەی ئەگەرێک بە بیرۆکەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئەو بونیادەشمان پێناناسێنێت، کە ئەگەرەکەی لەسەر دامەزرێت.

ئەگەر جۆرە بۆچوونێکیش کاربکاتە سەر بیرکردنەوەم لە هەڵبژاردنێکدا، ئەوا دەتوانم بڵێم، کە ئەو کارتێکردنە بوونی ئەو شتەی هەڵیدەبژێرم لەپێشتر دادەنێت ئەو شتە، بەو جۆرەی باســـم کرد، وەکو کەمی دەبێ هەبێت. لە حاڵەتی ئامادە نەبوونی ئەگەرەکانیشـــدا بۆچوونەکان کاریگەرێتی خۆیان لەسەر حەزی ئێمە بۆ هاوجوتکردنی بیرۆکەکانمـــان و داکەوتی دەرەکییەوە تۆماردەکەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بەســـتنەوەی ئەگەرەکان بە داکەوتەوە لەسەر تێگەیشتنی ئێمە لـــە ئەگەرەکان ڕادەوەســـتێت. هەموو هەوڵدانێک بۆ دامەزراندنی ئەگەر لەســـەر زەمینەی خۆگەرایەتی ئاکامێکی ســـەرنەکەوتوی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا دروستە

بڵێیـــن، (ئەگەر) هەیـــە و دەتوانین هەڵیبژێرین. هەروەهـــا (ئەگەر) لەگەڵ ئەو بوونەدا دێتە جیهانەوە، کە (ئەگەر) لە بوونیدا هەیە و ئەم بوونەش ڕاستەقینەی مرۆڤە. لێرەدا دروســـتە، ئەگەر بڵێم من مافم هەیە بەو جۆرە بم، کە هەم. بەڵام ئەم مافە لەو بوونەم جیادەکاتەوە، کە مافی بوونی هەیە. مافی موڵکدارێتی لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە کەسێک لەسەر موڵک ململانێم لەگەڵدا دەکات و ئەو موڵکەش لەژێر دەســـتی مندا دەردەهێنێت. ئەو خۆشییەی من لـــەو موڵکەوە وەریدەگرم فاکتۆرە و ماف نییە. لەم ڕووەوە ئەگەر (ئەگەر) هەبێت، ئەوا بوونی مرۆڤ دەبێت شتێکـــی جیاوازتر بێت لە خۆی. (ئەگەر) خەســـڵەتی بوونە-بۆ—خۆی، کە لەم بوونەدا بوونی—لەنێو-خۆ ڕەتدەداتەوە.

ئەگـــەر لـــەو باوەڕەدابین (ئەگەر) لەگەڵ ئەو بوونەدا دێتـــە جیهانەوە، کە لە بوونی خۆیدا ئەگەر هەیە، لەبەر ئەوەیە، کە بوون—لەنێو-خۆ و ئەگەر لە دەرەوەی ئەم بوونەدا و ئەو بوونەش دروستیدەکات، کە بەرانبەر ئەگەرەکان ڕادەوەستێت. ئـــەو پارچە کوتاڵەی جوڵانـــی تۆپی بلیارد دەوەســـتێنێت (ئەگەر)ی تێدا نییە. ئەگەری وەســـتانی تۆپەکە لەوێدا دێتە جیهانەوە، کە بوونێک هەبێت لەو ئەگەرە بـــە ئاگا بێت. لەبـــەر ئەوەی ئەگەرەکە بابەتێکی دەرەکی ڕووت نییە و ســـەربە بوون—لەنێو—خـــۆ نییە، هەمانکاتیش بابەتێکی ڕووتی ناوەکی نییە، ئەوا دەبێت ئەو بونیادە دەرەکییە بە ئاگاییەوە ببەستینەوە. تێگەیشتن لە ئەگەر و وەستان لە ئاســـتی ئەگەری خۆتدا پێویستی بوونێک دەردەخات، کە بوون لە لای دەبێت بە پرســـیار. بوونێکیش خاوەنی ئەگەر بێت ئەوە دەردەخات ئەو بوونە هێشـــتا لایەنێکی بوونی پەیدانەبووە و بوونێکە لە خۆی ڕادەکات و بەرەوپێش دەڕوات. بە کورتییەکەی، هەموو ســـاتێک لە بوونمدا دەبێت بەو بوونەی، کە هەیە و هاوکات هێشـــتا نەبووە بەوەی، کە هەیە. من فرێدراومەتە دەرەوەی بوونی خۆم و بەرەو دامەزراندنی واتایەکی دیکەی بوونم دەڕۆم. بەڵام نابێت ئەمە لەگەڵ لایەنی ناوەوە و بیرۆکەکانی نێوخۆدا تێکەڵ بکەین.

دێکارت لە دەربڕینی بوونی خۆیدا، بە ڕێگەی گومانەوە لە کۆجیتۆکەیدا ئەگەر دەربڕینەکەی تەنیا لەسەر تەماشاکردن دامەزرێنێت ناتوانێت ئەو

گومانە پێناســـبکات. واتـــای گومان لەوێدا دەردەکەوێـــت، کە وەکو (ئەگەر) تەماشابکرێـــت و لـــەو باوەڕەشدابین لە داهاتوودا نەمێنێـــت. پێویستە دڵنیابین لەوەی هیچ فاکتۆرێکی ئاگامەندی ئاگامەندی نییە. ئەگەر هوســـرڵ ئاسایی باسی ســـترەکچەری ناوەکی ئاگامەندی بکەین، کە هیـــچ شتێکی لێوە دەرنەچێت و لە ناوەوەبمێننەوە، [فاکتۆرەکان] لەم حاڵەتەدا، لەو مێشـــانە دەکەن، کە خۆیان بە شوشوی پەنجەرەکەیا ئەدەن و ناتوانن بچنە دەرەوە.

ئەو کاتەی ئاگامەندی بە گومان، هەستکردن، تینۆێتی و هتد.. دادەنێین، ئێمە

ئاماژە بۆ ئەو نەبووە دەکەین، کە هێشتا نییە. ئاگامەندی لە خوێندنەوەدا ئاگایی نییە لە وشەکان و ڕستەکان و تەنانەت پەڕەگرافێکی نێو پەرتووکەکە. ئاگاییە لە خوێندنەوەی پەرتووکەکە، کە ئاماژە بۆ هەموو ئەو لاپەڕانەش دەکات هێشتا نەخوێنراونەتەوە و ئاگامەندی لە خۆی دووردەخاتەوە. ئەو ئاگاییەیە ئاگاییە لە شتێکی هەبووەوە، کە دەبێت ئەو هەبووە بە تەواوی باسبکات. هەموو بوونێکی بۆ–خۆ جۆرێک کەمی تێدایە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەم بوونە لە مەراقی ئەوەدایە ببێت بەوەی خۆی دەیەوێت. ئەو کەمییەی بوون–بۆ–خۆ توشی بووە و ئەوەی دەیەوێت هەیبێت و بیکات بە (خۆ) بوونی خۆیەتی.

لەپێشتر بینیمان، کە بوون–بۆ–خۆ لەبەردەم بوونی خۆیدا ڕاوەستاوە و ئامادەیە. پەیوەندی نێوان بوون–بۆ–خۆ و ئەگەرەکان لە لەناوبردنی ئامادەبوونە لەبەردەم خۆیدا و هێشتا ڕووینەداوە. کەوابوو، بوون–بۆ–خۆ تاکو ئەو ڕادەیەی لەبەردەم خۆیدا ئامادە نییە ئەو ئامادەنەبوونە لە بوونیدا دەبێت بە کەمی. هەموو ئاگاییەک جۆرە کەموکورتییەکی تێدایە.

بەڵام پێویستە بزانین ئەم کەمییە، وەکو کەمی ناتەواوی مانگی هیلال، لە دەرەوە نایەت. کەمی بوون–بۆ–خۆ لەنێو ئەو بوونەدایە. ئامادەنەبوونی ئەم بوونە لەبەردەم خۆیدا و دەبێت بە بناخەی نەبوونی ئەم بوونە. (ئەگەر) ئامادەنەبوونی ئاگامەندی ئەم بوونەیە چونکە ئەم بوونە هێشتا نەبوە بەوەی خۆی دەیەوێت.

تینوێتی، بۆنموونە، تینوێتی نییە ئەگەر لەنێو ئەم بوونەدا خۆی دەرنەخات و ئامادە نەبێت. لەم حاڵەتەدا تینوێتی بۆ بوون–بۆ–خۆ دەبێت بە کەمی. کەمی ئەگەری ئەم بوونەیە نەک لایەنی کردەگی.[٤٤] تینوێتی کەمییەو بوون–بۆ–خۆ دەیەوێت پڕیبکاتەوە.

بەڵام پڕکردنەوەی ئەم کەمییە لە تینوێتی شکاندندا خەفەکردنی تینوێتی نییە. بە پێچەوانەوە، پەڕینەوەی تینوێتییە بۆ پڕکردنەوەی بوون. تینوێتی، کە خۆی تێردەکات، وەکو فۆرم لای ئەریستۆ گۆڕان بەسەر ئەستو (ماتەر)دا دەهێنێت و دەبێت بە تینوێتییەکی هەمیشەیی. ئەم بۆچوونە تازە هاتۆتەکایەوە. لەوە دەچێت گوایە مرۆڤی تینو دەیەوێت خۆی لە تینوێتی ڕزگاربکات یان پیاوێک تەنیا بۆ تێرکردنی ئارەزووی سێکسی لەگەڵ ئافرەتێکی لەش فرۆشدا جوت

٤٤ لایەنەکانی هێزەکی و کردەکی، لە مێتافیزیکی ئەریستۆدا لە بوونی هەموو ئەو بابەتانەی گۆڕانیان تێدا ڕوودەدات هەن. لایەنی هێزەکی، کە لێرەدا سارتەر بە ئەگەرەکانی بوون ناوزەدی دەکات ئەو جۆرە لایەن و خەسڵەتانەن، کە هێشتا پەیدا نەبوون و بە کردەوە لە داکەوتدا نین. تۆوی میوەیەک لە بوونیدا ئەوەندە هێزی تێدایە ئەگەر لە زەوییەکی بە پیت و تێر ئاودا بچێنریت ببێت بە درەخت. کاتێک دەبێت بە درەخت ئەوا بە کردەوە درەختە. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر بۆچوونی ئەریستۆ لەسەر ئەم دوو لایەنەی بوون بڕوانە: ئەریستۆ، میتافیزیک، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، بەشی کاپا، ل ٢٣٦–٢٣٨. (وەرگێڕ)

دەبێت. تینوێتی و ئارەزووی سـێکسی لە حاڵەتی سـەرەتایی و بێ بیرکردنەوە دەیانەوێت چێژوەرگـرن. دەیانەوێت لەگەڵ دڵنەواییـدا پێکبێن. تینوێتی خۆی بە تینوێتی دەناسـێنێت و دەزانێت بە ئاو خواردنـەوەش تێر دەبێت. کەوابوو، ئەپیکۆر دروست و نادروستیش بۆ ئەو کێشەیە چووە، کە گوایە ئارەزوو بەتاڵییە. بـەڵام هیچ پرۆژەیەک بەبێ بیرکردنەوە هەوڵی خەفەکردنی ئەم بەتاڵییە نادات. ئارەزوو دەیەوێت بەردەوام بمێنێتەوە. مرۆڤ درندانە دەست بە ئارەزووەکانییەوە دەگرێـت. ئارەزوو دەیەوێـت بەتاڵییەکە پڕ بکاتەوە. بەڵام ئەو کەسـەی بڕیار لەسەر تێربوونەکە دەدات لەو قاڵبە دەچێت شێوەی برۆنزە تەواوەکەی نێو خۆی دادەڕژێت. ئەگەری بە ئاگا

لە تینۆێتی ئاگاییە لە خواردنەوە. ئێمە دەزانین پێکبوون لەگەڵ (خۆ)دا مەحاڵە چونکـە بوون—بۆ-خۆ بەردەوام لە بوونیدا و ئەگەرەکان لەبەردەمیا قوتدەبنەوە. جۆرە نائومیدییەک توشی ئەم بوونە لە تێربوونیدا سەرهەڵدەدات، کە پەیوەندی بەم پرسـیارەوە هەیە: "تەنیا ئەمە هەیە؟" ئەمەش بەرەو ئەو چێژە کۆنکرێتییە دەڕوات لەگەڵ (خۆ)دا پێک نایەت. بەم پێیە دەتوانین ئاوەڕێک لە بنەرەتی (کات) بدەینـەوە چونکـە تینوێتی ئەگەرە و ئەو شتەشە، کە ئەگـەری ئەو نییە. ئەم نەبوونە لە بوونی مرۆڤدا لە نبەڕەتی کاتدایە.

بـەڵام پێویستـە بۆ ئەم خاڵـەش بگەڕێینـەوە، بوون—بۆ-خـۆ لەگەڵ خۆ ئامادەبوونەکەیـدا، کە کەمی ئەگەری خۆیەتـی، جیادەبێتەوە. جیابوونەوەکەی لەسەر (نەبوون) و هەروەها بوونی تەواوی بوون—بۆ-خۆ لەنێو جیهاندا ڕادەوەستێت. بوون—بۆ-خۆ دەیەوێت لە ڕێگەی پرۆژەکانیەوە لەنێو جیهاندا لەگەڵ خۆیدا پێکبێت و لەگـەڵ ئەگەرەکانیدا ببێت بە یەک. ئێمە ئەم[هەوڵدانە] بە[سـوڕانەوەی خۆ] نـاوزەد دەکەین، کە پەیوەنـدی بە بوون—بۆ-خۆ لەگەڵ ئەگەر و جیهاندا هەیە. ئێستـا ئێمە دەتوانین واتای بوونی (ئەگـەر) ڕوونبکەینەوە. (ئەگەر) ئەو جۆرە کەمییەیە بوون—بۆ-خۆ لەبەردەم بوون بەو شتەی دەیەوێت ببێت هەیەتی.

لـەم ڕووەوە ئەگەرێکی[لۆجیکـی] ڕووت نییە، مەگەر، لـەم حاڵەتەدا بوون لـە دوورەوە بەو دیاردەیە دابنێین، کە هەیە.(ئەگـەر) بیرۆکەیەکی ڕووت نییە. کەمییەکی ڕاسـتەقینەی بوونە، کـە وەکو کەمی لەودیـو بوونەوەیە. بوونێکی کەمییە، کە کەمی بوونە.

(ئەگـەر) شتێکە نییە، ئەگەرێکە لە بوونـی بوون—بۆ-خۆدا، کە یاریدەی ئەم بوونـە دەدات ببێت بە خۆی. (ئەگەر) ئەو نەبوونەیە دەکەوێتە ئەودیو بوونی ئەم بوونەوە. بە دڵنیاییەوە، لە سەرەتاوە ئەمەش وەکو بیردۆزەیەک خۆی دەرناخات.

بەڵکو لەودیو جیهانەوەیە و واتاش لەنێو (سوڕانەوەی خۆ)ی مندا بە ئاگاییم دەبەخشـێت. (ئەگەر) سـنورداریێتی خۆ—ئاگایی و ئاگامەندیـش دیاریدەکات.

ئاگایی ڕاســـتەوخۆ لـــە تینوێتی لەگەڵ بینینی پەرداخێک ئاودا ســـەرهەڵدەدات بەبـــێ ئەوەی (خۆ) بیر لە کۆتایهێنان لـــە ئارەزووەکەی بکاتەوە. بەڵام تینوێتی شکاندنەکە بەستراوەیە، ئاگامەندی ڕاستەوخۆ لەنێو ڕەهەندی پەرداخە ئاوەکەدا لەنێو جیهاندا دروستدەبێت.

## ٥. خۆ و سوڕانەوەی خۆ

هەوڵمـــداوە لـــە نوســـراوێکمدا لـــە گۆڤـــاری *Recherches Philosophiques* ئەو خاڵە بسەلمێنم، کە ئیگۆ ســـەر بە بوون-بۆ-خۆ نییە.[٤٥] من نامەوێ ئەم خاڵـــە لێرەدا دووبارە بکەمەوە، بەڵام پێویستـــە لەبەرزێتی ئیگۆ تێبگەین: وەکو بناخەیەک بۆ یەکگرتنی ئەزمونەکانی ژیان، ئیگۆ دەبێت بوونێک بێت لەنێو—خۆدا نەک بوون—بۆ-خۆ. ئەگەر بوونێکی ئاگامەندانەی هەبێت ئەوا پێویستە بڵێین ئەو بوونەیە، کە هێشـــتا نەبووە بەوەی دەیەوێـــت، هەروەها ئەوەش نییە، کە هەیە. ئەمـــەش ئەو بوونەیە کە (من)م. لە ڕاســـتیدا ئاگامەندی (مـــن) ناهێنێتە کایەوە چونکە (من) هەمیشە لە پێش ئاگامەندییمدا شتێکی دانراوم و هەم.

کەوابوو، ئیگۆ بۆ ئاگامەنـــدی شتێکی بەرزە و بوونێکی لەنێو—خۆی لەنێوی جیهانی مرۆڤ نەک، وەکو خۆرسکی ئاگامەندی، هەیە. بوونێکی نا کەس نییە. بەڵام ئیگۆ لە بوونی کەســـەوە دوورە؛ کە بە بێ ئاگامەندی هەمیشە بەو نا—کەسییەوە دەمینێتەوە. ئاگامەنـــدی لەژێر بارودۆخی تایبەتیدا (ئیگـــۆ)، وەکو دیاردەیەکی بەرزی (خـــۆ) دەردەخات. هاوکات با ئاگامان لەو خاڵەش بێت، کە بوون—بۆ-خۆ ســـادە و ڕووت و دەبینین دژوارە بە بوونێکی لەنێو—خۆ بڵێین، لەنێو—خۆیە یان شتێکـــە، کە هەیە. لەم حاڵەتەدا، هەندێـــک وا بۆی دەچن (من)، ئەو بوونەی بە دیدی ئەوان لەنێو ئاگامەندییدایە، ئاگامەندی (من)ە، نەک (خۆ). ئەم بیریارانە لە ئاکامی بیرکردنەوەکەیان و دانانـــی بوون—بۆ-خۆ بە لەنێو—خۆ تێڕامانی[مرۆڤ] لەســـەر خودی خۆی ڕادەگرن و دەیڕوخێنن. ئاگامەندی بۆ[ئیگۆ] دەگەڕێتەوە و (ئیگـــۆ)ش ئاماژە بۆ هیچ بوونێک ناکـــات. پەیوەندی نێوانیان بووە بە چەقێکی نادیار و وەســـتاو. ئێمەش، بە پێچەوانەی ئەم بیریارانەوە، ڕوونمانکردەوە (خۆ) لەنێـــو ئاگامەندییدا دانانرێت. ئەو، ئەگـــەر بتەوێت، هۆکارە بۆ جوڵانی نەبڕاوەی بیرکردنەوە و پەیوەندی خۆی لەگەڵ بابەتەکەیدا دروستدەکات. لە پێناسەکردنیا بە شتێکی سنوردار و نموونەیی دادەنێین. سنورداریێتیش لە ڕەتدانەوەی ڕاستەقینەی

---

٤٥ ئەم نوسراوەی سارتەر لە ژمارە (٦) ی ئەم گۆڤارەدا لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

هەبوویەکدایە لە بووندا. لەگەڵ یەکەم ســەرهەڵدانیا، ئاگامەندی بەو ڕەتدانەوەیە کەســێتی خۆی پێکدەهێنێت؛ چونکە کەســایەتی لــە خاوەنێتی (ئیگۆ)دا نییە. ئیگۆ تەنیا ئاماژەکردنە بۆ کەســایەتی. ڕاســتییەکەی لەوەدایە، کە بوون هەیە و لەبــەردەم خۆیدا ئامادەیە. ئەم جوڵانــەی تێڕامانی ئاگامەندی ئاماژە بۆ (خۆ) ش دەکات. لەنێو (خۆ)ی منــدا ئەگەرەکانم لە ئاگامەندیمدایە و ئەو ئاگامەندییە دەکــەن بەو شتەی هەیە.(خۆ) تاکــو ڕادەیەک لەناوبردن و ڕوخانی لەنێو خۆیدا هەڵگرتــوە چونکە ئەو ئەگەرەی، کە لە بوونی مندایە ئامادەبوونێکی ڕووت نییە، بەڵکــو ئامادەنەبــوون و ئامادەبوونە. بوون—بۆ-خۆ لەودیو خۆیەتی و دەســتی بە خۆی ناگات. ئەم سەربەســتییە پێویستەی بوون، کە بوونی هەموو کەســێک بە کەمی دەردەخات (خۆ)ی تاکە کەســە. چۆن پێناســەی (کەس)بکەین، ئەگەر سەربەســتانە پەیوەندی بە بوونی خۆیەوە نەبێت؟ لە جیهاندا، بۆنموونە هەموو ئەو هەبوانەی هەن و پەیوەندییان بە سوڕانەوەی خۆوە هەیە، لەم ئەزموونەدا (خۆ) دەیەوێت تێپەڕیان بکات و بە خۆی بگات. بەگوێرەی پناسەکەی هایدیگەر جیهان "ئەوەیە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەو جۆرەی هەیە دەیناسێت." ئەو ئەگەرەی بۆ منە ئەگــەری بوون—بۆ-خۆیە، بەو شێوەیەش لەبەردەم بوون—لەنێو خۆیدا و بۆ ئاگامەندی ئامادەیە. ئەوەی من لە جیهانم دەوێت پێکهاتنە لەنێوان بوون—بۆ-خۆ یان (من) و ئاگایی لە جیهان. بەڵام ئەو ئەگەرەی، کە بە ئامادەنەبوون و ئامادەبوون ناوزەدمان کرد، لەبەردەم ئاگامەندییدایە، وەکو بابەتێکی بیرکردنەوە ئامادە نییە. لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئامادەبێت ئاگامەندی دەتوانێت لەبەردەمیا ڕاوەستێت و بیری لێبکاتەوە. شکاندنی تینوێتیم، کە مامەڵە لەگەڵ تینوێتی کردەکیدا دەکات ئاگایی نییــە لە شکاندنی تینوێتی. ئاگاییە لــە خواردنەوەی پەرداخێک ئاو. هۆکارە بۆ دەرچوونی[ئاگامەندی] بەرەو پەرداخە ئاوەکە. پەرداخە ئاوەکەش، وەکو ئەگەری پەرداخێکی پڕ ئاو دەردەکەوێت، کە پەرداخێکە ئاوی پێ دەخورێتەوە. کەوابوو، جیهــان تاکو ئەو ڕادەیەی لەگەڵ نەبوونــدا هاوپەیوەندییان هەیە، جیهانی منە. بەبێ جیهان نە (خۆ) هەیە و نە کەس. هەروەها بەبێ خۆ و بەبێ کەس جیهانیش نییــە. بەڵام ئەو جیهانەی لەبەردەم کەســێکدا قوت دەبێتەوە جیهانی کۆجیتۆی پێش تێڕامان نییە. بێگومان بێهودەیە بڵێم ئەو جیهانەی دەیناســم جیهانی منە. هەمانکــات، کە دەڵێم جیهانی منە، ئەم جۆرە[خاوەنێتییە] بونیادێکی هەیە، کە لەژێر دەســتماندا ڕادەکات و بەردەوام منیش تیایدا دەژیم. جیهان بۆ منە چونکە پڕە لــە ئەگەرەکان. ئاگاییم لە هەر یەکێک لــەم ئەگەرانە هەمانکات ئەگەرێکی خۆ—ئاگاییــە، کە (مــن)ە. ئەم ئەگەرانە یەکێتی و واتا بە جیهان دەبەخشــن. توێژینەوەکەمان لەسەر هەڵوێستی ڕەتدانەوە و بڕوای خراپ ڕێگەی بۆ خۆشکردین لەسەر کۆجیتۆ ئۆنتۆلۆجییانە بکۆڵینەوە. کۆجیتۆش، وەکو (بوون—بۆ-خۆ) خۆی

بـــۆ ئێمە دەرخست. ئەم بوونەش هەوڵدەدات خۆی بگەیەنێتە ئەگەر و بەهاکان، بۆیـــە بوونێکی بەرزی هەیە و لەنێو چوارچێـــوەی کۆجیتۆکەی دێکارتدا گرێمان نەداوە. لەبەرئەمە بەو ئاکامانە دڵخۆش نین، کە پێیان گەیشتوین. ئەگەر کۆجیتۆ بەرز بێت و بەرەو ئەگەرەکان بکەوێتەگەر، ئەوا ڕەتکردنێکی (کاتی) هەیە. بوون—بۆ-خۆ لە شێوازی ئەو بوونەدا، کە هێشـــتا پەیدانەبـــوە، ئەگەرەکانی خۆیەتی. ئەگەرەکانـــم لەنێو کاتدا و لەنێو جیهاندا ســـەرهەڵدەدەن و دەبن بە موڵکی من. ئەگەر ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بە شتێکی کاتـــی دابنرێت بەرزێتی ئەم بوونەش کات بێت و تاکو لە گرنگی ئەم بوونە لەنێو کاتدا تێنەگەین ئەوا واتای بوون—بۆ-خۆ ڕووناکەینەوە. تەنیا لەم بۆچوونەوە دەتوانین مامەڵە لەگەڵ کێشـــەکەمان، کێشەی پەیوەندی ئاگامەندی بە بوونەوە بکەین.

# بەشی دووەم

## کات

### ١. فینۆمینۆلۆجییای سێ ڕەهەندەکانی کات

ئاشکرایە کات بونیادێکی ڕێکوپێکی هەیە. سێ لایەنەکەی کات، کە بە ڕابردوو، ئێستـــا و داهاتوو ناوزەدیان دەکەین، ئەو دراوانە نیـــن ئێمە کۆمانکردبنەوە، بۆ نموونـــە زنجیرەی نەبڕاوەی (ئێستا)کان نییە، کـــە هەندێکیان گوزەریان کردبێت و ئەوانی دیکەشیان هێشـــتا ســـەریان هەڵنەدابێت. کات، بە پێچەوانەی ئەمەوە، بونیادێکی تێهەڵکێشـــراوی هەیە. ئەگینا توشی ئەو پارادۆکسە دەبین، کە گوایە ڕابـــردوو ئەوەیـــە، کە تێپەڕیـــوە و داهاتوش پەیدانەبووە. هەموو کەســـێکیش دەزانێت، کە ســـاتەکانی (ئێستا) بێجگە لە زنجیرەیەک لـــە یەکەی دابەشکراوی نەبـــڕاوە چ دیکە نین، لەو خاڵانە دەچن ڕوو لە هیـــچ شوێنێک ناکەن. کەوابوو، ئەم زنجیرەیـــە دووجار بەرەونەمان دەچێت؛ چونکە ئەو (ئێستا)یانەی ســـەریان هەڵنەداوە (هیـــچ)ن و هەمانکات[لەگەڵ ســـەرهەڵدانیان] ڕوو لە ڕابردوو دەکەن و بەرەو نەمان دەگوزەرێن. تەنیا میتۆدێکی گونجاو بۆ توێژینەوە لەسەر کات هەبێت ئەو تێڕوانینەیە، کە کات تیایدا بەگشتی خۆی دەردەخات و ڕووناکی دەخاتە سەر بوونیادەکەی و واتایان پێدەبەخشـــێت. لەم ڕووەوە هەرگیز کاتمان لا ون نابێت. هاوکات ناتوانین لە بوونی کات بکۆڵینەوە ئەگەر لە سەرەتاوە لە واتا نادیارەکانی ڕەهەندەکانـــی کـــات فینۆمینۆلۆجیانە یان لە ڕوانگـــەی پێش—ئۆنتۆلۆجییانەوە تێنەگەیـــن. پێویستە ئـــەم تێڕوانینە فینۆمینۆلۆجییانەیە بـــە هەوڵدانێکی کاتی لەم قۆناخەدا بۆ مەبەســـتی تێگەیشـــتنمان لە کات بەگشتی بەکاربهێنین. لێرەدا ڕەهەندەکانی کات لەو زەمینە گشتییەوە خۆیان دەردەخەن بەبێ ئەوەی وابەستە بوونیان بە یەکدی و بەو بونیادەوە فەرامۆش بکرێت.

#### ئەلف. ڕابردوو

ئەو بیردۆزانەی لەســـەر بیرەوەری دانراون پێیان وایـــە بیرەوەری پەیوەندی بـــە ڕابردووەوە هەیە. ئەم پەیوەندیەش لەبەر ئەوەی ڕوونەکراوەتەوە کێشـــەی بیرەوەری و کاتیش بەگشـــتی ئالۆزکردوە. ئێمە پێویستە ئەو پرســـیارە بکەین: بوونـــی ڕابـــردوو چییـــە؟ بۆچوونە باوەکان لەنێـــوان واتای دوو جـــۆر چەمکدا

دەســـوڕێنەوە. گوایە، ڕابردوو ئەوەیە، کە تێپەڕیوە و نەماوە. لەم ڕووەوە تەنیا دەتوانیـــن بڵێین (ئێستا) یان ڕانەبردوو بوونی هەیە. ئـــەم گریمانە ئۆنتۆلۆجییە بۆتە هۆکاری ســـەرهەڵدانی بیردۆزە بە ناوبانگەکە، کە باســـی نیشـــانەکانی نێو مێشـــک دەکات. مادامەکی ڕابردوو تێپەڕیـــوە و لەنێو نەبووندا تواوەتەوە، ئەگەر بیرەوەری بەردەوام بێت، پێویستە لەســـەر گۆڕانکارییەکانی بوونی (ئێستا)ماندا خۆیڕاگرێـــت. بۆ نموونە، ئەوەی لە ئێستادا ڕوودەدات، وەکو نیشـــانی مۆرکردن بەسەر بەشێکی مێشکمانەوە دەمێنێتەوە.

کەوابوو، هەموو شتێک ڕانەبردووە: لەش، ئەو هەستکردنەی ئێستا هەمە، ڕابردوو، وەکو نیشان لەنێو لەشدا، کردەکین: چونکە نیشانکردنەکە بەبێ بیرەوەری ناتوانێت هەبێت. هەموو ئەمانە پێکەوە دەبن بە نیشانێکی کردەکی. ئەگەر بیرەوەری جارێکی دیکە دروســـت ببێتەوە ئەوا لەنێو ڕانەبردوودایە و پرۆســـەیەکی ڕانەبردووە، وەکو پچڕانێکی هاوتایی پرۆتۆپلازمی لەنێو خانەکانی مێشکدا دادەنرێت. سایکۆلۆجی—فیزیۆلۆجییانە دەیەوێت باس لە چۆنیەتی پرۆسە سایکۆلۆجییەکە لە پەیوەندی نێوان دیاردەیەکی دەروونی ئامادەبوو بە وێنەیەکی نێو بیرەوەری مێشـــکەوە بکات. ئەو بیرۆکەیەی تازە بە ناوی (ئینگرام) پەیدابووە بە کوتاڵێکی نازانستانەی زاراوەکان دەپێچێتەوە. بەڵام ئەگەر هەموو شتێک ڕانەبردوو بێت، چۆن بتوانین باسی بیرەوەری بکەین؟ لە بیرەوەریدا ئاگایی دەیەوێت بەسەر ئێستادا تێپەڕێ و ڕووداوێکی ڕابردوو بە بیر بهێنێتەوە. من لە شوێنێکی دیکەشدا ئەو خاڵەم ڕوونکردۆتەوە، کە وێنەی هەســـتکردن[لەنێو مێشکدا] لە هەستکردنەوە جیاناکرێتەوە ئەگەر ئێمە وێنەکە بە دووبارە کردنەوەی هەســـتکردنەوە دابنێین.[٤٦] ئەگینا توشی هەمان کاری مەحاڵ دەبینەوە. لەســـەرو ئەمەوە، ئێمـــە ئەو میتۆدە دەخەینەلاوە، کـــە بیرەوەری لە وێنەکانی نێو ئەندێشـــە جیادەکاتـــەوە. لاوازی و کاڵبونەوە و ناتەواوی و ناکۆکی بیرەوەری لەگەڵ هەستکردەکاندا ئەوە دەرناخات وێنەکانی نێو ئەندێشە جیاواز بن. لەسەرو ئەمانەوە، لەبەر ئەوەی ئەم خەسڵەتانە ئێستا هەن و لە ڕانەبردوودان، ئەوا ناتوانن ئێمە لەنێو ڕابردوو دەربهێنن و بەرەو ڕانەبردوو پەلکێشمان بکەن. بەگوێرەی بۆچوونەکانی کلاپەرێد و جەیمس، لە باسکردنەکەیاندا لەسەر خۆشەویستی، ئێمە بێهودە ســـتایش بۆ بیرەوەریمان دەکەین. لێرەدا خەسڵەتەکان تەنیا بارودۆخێکی ڕانەبردوومان بۆ بەرجەســـتە دەکـــەن، کە بە بیرەوەرییـــەوە پێچراونەتەوە، لەم حاڵەتـــەدا لەنێو ڕانەبردوودا دەمێننەوە یان پەیوەندییـــان بە ڕابردووەوە هەیە و واتایەکی لەپێشتریش ئامادە دەکەن.

٤٦ لێرەدا سارتەر ئاماژە بۆ نوسینێکی دەکات بە ناوی ئەندێشە، کە لە ساڵی ١٩٣٦ دا بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

هەندێــک بیریار لەو باوەڕەدان خۆیان لەم کێشــەیە بە ڕێگــەی گەڕانەوەی بیرەوەری بۆ جۆرێک لە بەستێنی کۆمەڵایەتی ڕزگار دەکەن.

بێگومان ئەم کارکردنانەی [بیرەوەری] لەم بەستێنەدا هەن و پێویستە زانستی دەروونناسی لە ســەریان بکۆڵێتەوە. بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکەی بە ڕابردووەوە نەدۆزینــەوە، ئەوا کارکردنەکانی بیرەوەری ناتوانن دروســتی بکەن. ئەگەر ئێمە لــە تەنیارەوی مــرۆڤ لەنێو دوورگــەی ڕانەبردوویەوە دەســتپێبکەین و هەموو شێوازەکانی بوونی ســروشتانە لەگەڵ دەرکەوتنیاندا لەنێو ڕانەبردوودا گیربخۆن، ئــەوا ڕادیکاڵانە هەموو میتۆدێکمان بۆ دیاریکردنی پەیوەندییەکەی بە ڕابردووەوە لەناوبردوە. ناتوانین ســەرکەوتوانە بنەمانی ڕەهەندی (ڕابردوو) لەنێو ڕانەبردوودا دەربهێنیــن. هەوڵدانەکەمان چی لە هەوڵدانی زانایانی جێنەتیک کەمتر نابێت، کە نەیانتوانیوە بەردەوامبوونی جینەکان بەچینە لەناوچووەکانەوە ببەستنەوە.

بۆچوونی گشــتی کێشەی لەبەردەم ڕەتدانەوەی بوونی ڕاستەقینەی ڕابردوودا هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا جۆرە باوەڕێکی دیکەی دامەزراندوە، کە گوایە ڕابردوو بە ناو هەیە. بوونی ڕابردوو لە ئاســتی ڕووداوێکدا واتای خانەنشینی، لە ناوچوونی کارتێکردن و بوون دەبەخشــێت. برگسۆن سودی لەم بۆچوونە وەرگرتوە: گوایە ڕووداوێــک لە ڕابردوودا وون نابێت، تەنیا هێزی کارتێکردنی نامێنێ و لە شوێنی خۆیدا هەمیشە بە چەق وەستاوی دەمێنێتەوە. لەم ڕووەوە، بوون لەنێو ڕابردوودا پارێزراوە. ئێمەش ئەوە دەسەلمێنین، کە بەردەوامی فرەلایەنی ساتەکانە و ڕابردووش بە ڕانەبردووەوە بەســتراوە. بەڵام هێشــتا بەڵگە و هۆکارمان بۆ دانەمەزراندوە. باســماننەکردوە چۆن ڕابردوو لە دایک دەبێتەوە و دەبێت بە مۆتەکە و[ســواری کۆڵمان دەبێت] یان بەکورتییەکەی چۆن لە لای ئێمە ســەرهەڵدەداتەوە. ئەگەر برگسۆن گوتەنی، لەو دیو ئاگایی ئێمەوە بێت و ئەو دیو ئاگایشمان چالاک نەبێت و کارتێکــەر نەبێــت، چۆن خۆی دەخاتە نێو خوری چنــراوی ئاگامەندیمانەوە؟ ئایــا خاوەنی هێزە؟ [ئەگەر خاوەنی هێز بێــت] ئایا ئەو هێزە لەنێو ڕانەبردوودا نییە؟ چۆن لە ڕابردووەوە ســەرهەڵدەدات؟ ئایا ئێمە، وەکو هوسرڵ، پرسیارەکە هەڵگێڕینــەوە و لەنێو ئاگامەندی ڕانەبردوودا کایەی"گلدانەوە" نیشــانبدەین، کە ئاگاییەکانی ســاڵی ڕابردوو لەنێو مێژووی ڕووداوەکانیاندا دەچەقێنێت و نایەڵێت لەنێو بچن؟ بەڵام ئەگەر کۆجیتۆکەی هوســرڵ کتوپڕ ســەرهەڵدات ئەوا ناتوانین لێــی دەرچین. ئێمە لە بەشی پێشــوی[ئەم پەرتووکە] بینیمان چۆن دەرچوونی ئاگامەندی لە خۆوە بێهودە بەر شوشەی پەنجەرەی ڕانەبردوو دەکەوێت و نەیتوانی بیشکێنێت. ئەمە بۆ "گلدانەوە"ش دەبێت.

هوســرڵ بە درێژایی تەمەنی بیرکردنــەوەی فەلسەفییانەی خۆی بە بیرۆکەی بەرزێتی و تێپەڕبوونەوە ماندووکردوە. بەڵام تەکنیکی فەلسەفی ژێردەستی هوسرڵ

بەتایبەتـــی چەمکی ئایدیالیستانەی بۆ بوون ڕێگەی نەدا واتای بەرزێتی بەتەواوی بناسێت. چەمکی مەبەستدارێتی [ئاگامەندیش] لای ئەم فەیلەسوفە کاریکاتێرییە. ئاگامەندی، بە بۆچوونی هوســرڵ، ناتوانیــت ڕوو لە جیهان و داهاتوو بکات یان بــۆ ڕابردوو بگەڕێتـــەوە. کەوابوو، بە دان پیانان بە بوونـــی ڕابردوودا هیچمان دەست نەکەوتوە چونکە بەگوێرەی زاراوەکان ڕابردوو دەبێت نەبوون بێت. ئەگەر ڕابردوو بەگوێرەی بۆچوونی هوسرڵ و برگسۆن شتێک بێت، کە هەیە یان دیکارت گوتەنی، شتێکە نییە و فەوتاوە، هەموو ئەم بۆچوونانە ســودبەخش نابن ئەگەر ئێمە پردی پەیوەندی نێوان ڕابردوومان و ڕانەبردوو بڕوخێنین. لەڕاســـتیدا ئەگەر سەرنجێکی تایبەتی لە ڕانەبردوو بدەین و بیکەین بە "ئامادەبوون لەنێو جیهاندا" پێویستـــە ڕەخنەش لە ڕابردوو، وەکـــو هەبوویەک لەنێو ئەم جیهانەدا بگرین. بۆ هەندێک ئێمە لە پێشـــدا لەگەڵ ئەم میز و کورســـییەدا هەبیـــن، ئەنجا دەڵێین، پێویستە لە واتای کات تێبگەین. بەڵام ئەو کاتەی خۆمان لەنێو جیهاندا دەبینین تەوانـــای جیاکردنەوەی ئەو شتانە ون دەکەین، کـــە تێپەڕبوون و نین. لەوانەیە هەندێـــک ئەوەی تێپەڕیوە و نەماوە بەو شتە دانێن، کە پێشـــتر هەبووە. ئەوەی (نییە) بە هیچ شێوەیەک پەیوەندی بە بوونەوە نییە. ئەمە دروســـتە. دەتوانین بە ئاســـانی یاسای بوون لەنێو جیهاندا دەربڕین و بڵێین (ئەو شتەیە، کە هەیە). ئەمـــەش واتای بوونێکی پـــڕ و چەندەکی و ئەرێ دەبەخشـــێت و (نەبوون) بە هیـــچ جۆرێک لەگەڵ خۆیـــدا هەڵناگرێت. ئەو بوونە پڕەی هەیـــە لە بووندایە و پەیوەنـــدی بە نەبوونەوە یان بەو شتـــەی تێپەڕیوە و نەماوە نییە. ڕەتدانەوە بە هەمـــوو جۆرەکانیەوە لەم بوونەدا نادۆزرێتەوە. لەم ڕووەوە، ڕابردوو، وەکو خۆی هەیـــە و پردی پەیوەندییەکەی ڕووخـــاوە. تەنانەت بوون لە بیرنەچۆتەوە چونکە لـــە بیرچوونەوە جۆرێکە لە پەیوەندی. ڕابردوو، وەکو خەونێک لەژێر دەســـتمان دەرچووە و ڕەویوەتـــەوە. ئێمە واز لە چەمکەکانی دێکارت و برگسۆن دەهێنین چونکە بەهەمان شێوە دەتوانین ڕەتیانبدەینەوە. ڕابردوو لەناوبچێت یان بمێنێتەوە، لای ئەم بیریارانە پەیوەندی بە ڕانەبردووەوە پچڕاوە. ئەوان ئەو چەمکەی بەسەر بوونی ئاگامەندیشدا ســـەپاندوویانە بوونێکی، وەکو لەنێو—خۆیان بە ئاگامەندی داوە. ئاگامەندییان بەو شتە داناوە، کە هەیە. لەبەرئەمە پێویست ناکات سەرمان لەو ئاکامەیان بسوڕمێت، کە نەیانتوانیوە پەیوەندی نێوان ڕابردوومان و ڕانەبردوو دروســـتبکەن چونکە ڕانەبردوومان بـــە هەموو توانایەوە ڕابـــردوو ڕەتدەداتەوە. ئەگەر ئەوان دیاردەی کات بەگشـــتی ببینن، دەیانتوانی ببینن، کە ڕابردووی (من) لەپێش هەموو شتێکدا ڕابردووی منە و لەو بوونەدا کاریگەرێتی خۆی دەنوێنێت، کە (مـــن)ە. ڕابردوو (هیچ) نییە. هەروەها ڕانەبـــردووش بە (هیچ) دانانرێت؛ بەڵام لەبنەڕەتـــەوە بـــە ڕانەبردوویەکی دیار و داهاتوویەکی دیارەوە گرێدراوە و ســـەر

بەوانە. ئەوەی پێیدەوترێت (هینی من) و کلاپەرێد باسیدەکات، لایەنێکی خۆیەکی نییە بیرەوەری دروست بکات. پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجییە بۆ بەستنی ڕابردوو بە ڕانەبردووەوە. ڕابردووم هەرگیز تەنیا و بە دابڕاوی ڕاناوەستێت. تەنانەت بێهودەیە بـــەوە دابنرێت، کە وەکو خۆی بوونی هەیە. لـــە بنەڕەتدا ڕابردوو ڕابردووی ئەم ڕانەبردووەیە. پێویستە لەم بۆچوونەوە لە واتاکەی بکۆڵینەوە.

من دەنوسم، کە پۆڵ لە ساڵی ١٩٢٠دا خوێندکاری خوێندنگای پۆلیتەکنیک بوو، ئەو کێیە یان کێ بوو؟ ئاشکرایە (پۆڵ)ە، بەڵام پۆڵ چییە؟ لاوێکی ساڵی ١٩٢٠؟ بەڵام شێوەی ئە فەرمانەی (بوونی هەبێت) بۆ پۆڵ لە ســـاڵی ١٩٢٠ دا بەکاربێت و پەیوەندی بە خەســـڵەتی پۆڵەوە، وەکو خوێندکاری پۆلیتەکنیک هەبێت، لە دۆخی ڕانەبردوودایـــە. ئەو لە ڕابردوودا هەبوو کەچی ئێمە دەڵێێن (ئەو هەیە.) ئەگەر ئەم پۆڵەی ئێستا هەیە ببێت بە ڕابردوو، کە خوێندکاری تەکنەلۆجی بوو، ئەوا هەموو پەیوەندییەکانی بە ئێستاوە دەپچڕێت: ئەو مرۆڤەی ئەم خەسڵەتانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە و گلیداونەتەوە، وەکو (خۆ) لە ساڵی ١٩٢٠ دا بووە. ئەگەر بمانەوێت لە بیرمان بێت، کە دەمێنینەوە و [بوونیان بەردەوامە] پێویستە لەســـەر ئەم بۆچوونە ڕابردوومان و ڕانەبردوو لە یەکدی دانەبڕین. تێگەیشتنمان لەم بۆچوونەش مەحاڵە، ئەگەر لەســـەر بنەمای شێوازی بوون داینەمەزرێنین. ســـەرنەکەوتنمان لە پێکەوە بەستنی ڕابردوومان بە ڕانەبردوومانەوە، ڕابردوومان دوورەپەریز و دابڕاو جێدەهێڵین. ئایا ئەم دابڕانە لە بوونی کەسێکدا چ واتایەک دەبەخشێت؟ پرۆست لەو باوەڕەدایە دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی چەند کەسایەتییەک لە بوونی تاکە کەسێکدا و توشی گرفتی زۆرمان دەکات، کە فێرگەی پەیوەستدارێتی دژیان وەستا.

هەندێک پێشـــنیاری بەردەوامی [بنەڕەتێک] لەنێـــو گۆڕانەکاندا دەکەن: ئەو خوێندکارەی لە ساڵی ١٩٢٠ لە خوێندنگای پۆلیتەکنیک دەیخوێند و ئێستا هەیە هەمان کەســـە، کە (پۆڵ)ە.[٤٧] هەمان کەسە، کە (خوێندکاری پۆلیتەکنیک بوو) ئێستاش دەلێین، (ئەو خوێندکاری کۆنی پۆلیتەکنیکە.) هێشـــتا بەردەوام بوونی لە گرفتەکـــان ڕزگارمان ناکات. ئەگەر هیچ شتێک ســـاتەکانی (ئێستا) بۆ دواوە

٤٧ مەبەستی سارتەر لەوانەی ئاماژە بۆ بنەڕەتێکی نەگۆڕ لەنێو گۆڕانەکاندا دەکەن ئەریستۆ و شوێنکەوتوانی فەلسەفەی ئەریستۆیە. ئەریستۆ لەو باوەڕەدابوو گۆڕان تەنیا لەنێو ئەو سێ کاتیگۆرییانەدا (چۆنیەتی و چەندەکی و شوێن) ڕوودەدات، کە دەتوانین لایەنە ناکۆکەکانیان یان بەپێچەوانەی ئەوانەوە بدۆزینەوە. بەڵام کاتیگۆری جەوهەر (بۆ نموونە سوکرات) لەبەر ئەوەی لایەنی پێچەوانەی نییە، وەکو خۆی دەمێنێتەوە و گۆڕانکارییە چۆنیەتی و چەندەکی و نێو شوێن کارناکەنە سەربوونی. بۆ نموونە، سوکرات قەڵەو یان لاواز دەبێت، لەنێو باخچەکەدا پیاسەدەکات، بەڵام هەر ئەو تاکە کەسەیە (ئەو جەوهەرەیە، کە ناوی سوکراتە) و نابێت بە شتێکی دیکە. بۆ خوێندنەوەی زۆرتر لەسەر بۆچوونەکەی ئەریستۆ بڕوانە: ئەریستۆ، میتافیزیک، وەرگێڕانی د.محەمەد کەمال. دەستگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٤٤- ٢٣٧.

نەگەڕێنێتەوە و تەنیا لەنێو ئەم زنجیرەی کاتەدا مانەوە و بەردەوامی بچەسپێنێت، ئەوا بەردەوامی بێجگە لە حاڵەتێکی کتوپڕ، بەبێ خۆ گرێدانی بە چارەنوســـەوە، هیچی دیکە نییە. پێویستە ڕابردوو هەبێت، هەروەها شتێک یان کەسێک، کە ئەو ڕابردووەیە بەردەوام هەبێت. بەردەوامی یارمەتیمان دەدات بونیادی کات تێبگەین و گۆڕان و بوونی خۆشی بۆ ئێمە دیاریدەکات.

بۆ باســـەکەی پێشـــومان دەگەڕێینەوە. ئەگەر شێوازی بوونـــی ڕابردووم لە ڕانەبردووەوە دەرنەچێت، دوێنێم لەودیو ئەمڕۆمەوە نەبێت، ئەوا لە دروستکردنی پەیوەندی نێوان ڕابردوومان و ڕانەبردوودا نائومێد دەبین. ئەو کاتەی باســـی پۆل دەکـــەم و دەڵێم، لە پۆلیتەکنیک خوێندکاربوو، ئامـــاژە بۆهەمان کەس دەکەم، کە ئێستاش هەیە و تەمەنی چل ســـاڵانە. ئـــەو ئێستا ئەو هەرزەکارە نییە، کە خوێندکـــاری پۆلیتەکنیک بوو. مادامەکی ئەوســـا هەبوو ئێستاش هەیە. ئەو، کە ئێستا تەمەنی چل ساڵانە خوێندکاریش بوو. لە ڕاستیدا کەسە سی ساڵییەکەش خوێندکاربوو. بەڵام ئایا ئەو لە تەمەنی ســـی ســـاڵییدا چۆن دەبێت ئەگەر بەو کەســـەی دانەنێین، کە ئێستا چل ســـاڵانە؟ لەو پەڕی سنوری ئێستایدا، کە چل ســـاڵانە دەبێت بەو خوێندکارەی لە پۆلیتەکنیـــک دەیخوێند. لە کۆتاییدا، لەنێو ئەزموونەکانی ژیانییدا دەبێت بە کەســـێکی چل ساڵان، سی ساڵان و هەرزەکار. ئەمانە هەموویان شێوازی بوونی ئەون. کاتێک باسی ئەزموونەکانی ژیانی دەکەین، دەڵێین ئەمڕۆ هەیە و تەمەنی چل ســـاڵانە و لـــە کاتی خۆشیدا هەرزەکار بووە. ئەمـــڕۆ بەشێک لە ڕابردووی پێک دەهێنێت و ڕابردووش لەمڕۆی ئەزموونی ژیانی پۆڵـــدا لە ڕانەبردوویدایـــە. هەموو شێوازە جیاوازەکانی بـــوون بەو جۆرەی هەن یان هەبوون لە بووندان و[شتێکن] بە ڕاســـتی هەن. ڕابردوو هەمیشـــە ڕابردووی شتیک یان کەســـێکە؛ هەموو کەسێک خاوەنی ڕابردووە. ئەم ئامێرە، کۆمەڵە یان تاکە کەســـەیە ڕابردووی هەیە. ڕابردوو شتێکی هەمەکی نییە، بەســـەر تاکەکاندا دابەشبکرێت و ببێت بە هەندەکی. ئەو گرفتە ڕاستەقینەیەی لەم بەشەدا یەخەمان دەگرێت دۆزینەوەی ئەو پرۆسەیەیە ئەم ڕابردووە هەندەکییانە لەنێو دەلاقەی یەک ڕابردوودا کۆبکاتەوە و بە یەکدیانەوە ببەســـتێتەوە. هەڵبەتە ئەو ڕەخنەیەشمان لێدەگرن، کە ئێمە لە باســـەکەماندا لەسەر بەردەوامی (خۆ) لە ڕابردوو هەروەها ئێستاکە بارێکی گرانمان خستۆتە سەر تای تەرازووەکە. ئێمە نموونەی دیکەشمان لە بەردەســـتدایە. دەتوانم باســـی (پیرۆ)تان بۆ بکەم، کە مردووە. ئەو حەزی لە مۆســـیقا بوو. لەم حاڵەتەدا بابەتەکە ئاماژە بۆ ڕابردوو دەکات. پیرۆ کەســـێکی زیندوو نییە تاکو ڕابردووەکەی جارێکی دیکە ســـەرهەڵبداتەوە. بەڵام بە جۆرێک باســـیدەکەین، کە حەزکردنی پیرۆ لە مۆسیقا، وەکو ڕابردوو دەرنەکەوێت. پیرۆ هەمیشـــە لەگەڵ حەزەکەیدا، کە حەزی ئەوە هاوســـەردەمی بوونیەتی، بەڵام لە

ژیاندا نەماوە و لەنێو کەسایەتییەکەشیدا ناژی. ئەوەی لێرەدا تێپەڕیوە و بووە بە ڕابردوو حەزی پیرۆیە لە مۆسیقا. هەروەها پرسیارەکەی پێشترم جارێکی دیکە دەخەمەوە بەردەم و دەڵێم: بۆ کێ پیرۆ بووە بە ڕابردوو؟ ناتوانین پەیوەندی بە ڕانەبردوویەکی هەمەکییەوە ببەستینەوە، کە سەلماندنێکی ڕووتی بوونە؛ کەوابوو ڕابردووی بوونی راستەقینەی منە. لە ڕاستیدا پیرۆ کەسێکە بۆ—من. منیش بۆ—ئەوم. بوونی پیرۆ کاریکردۆتە سەرناخم. جۆرێک لە ئامادەبوونی منی لەنێو—جیهاندا پێکهێناوە، کە بۆ من و بۆ کەسانی دیکەش ئەو کاتەی پیرۆش زیندوو بوو لە ڕابردووی مندا بوو. ئەو بابەتانەی وندەبن لەنێو ڕابردوودان ئەگەر بەشێک بێت لە ڕانەبردووی کەسێکی زیندوو. مالارۆ دەڵێت "ئەو شتە ناخۆشەی سەبارەت مردن هەیە ئەوەیە، کە ژیان بەرەو چارەنووس دەبات". واتە مردن بوون—بۆ خۆ و بۆ—کەسانی دیکە دەگۆڕێت بۆ بوون—بۆ کەسانی دیکە. ئەمڕۆ، من بە تەنیا لەنێو سەربەستییەکەمدا بەرپرسم لە مردنی پیرۆ. ئەو مردوانەی ڕزگارنەکراون و بۆ سنورەکانی ڕابردوویەکی کۆنکرێتی لای زیندووەکان نەگویزراونەتەوە ڕابردوو نین؛ لەگەڵ ڕابردوویاندا لەنێوچوون. کەوابوو، جۆرە هەبوویەک هەیە خاوەنی ڕابردووە. لەپێشتر ئاماژەمان بۆ ئامێرەکان و کۆمەڵ و بوونی مرۆڤ کرد. ئایا ئەوە دروست بوو؟ ئایا دەتوانین ڕابردوو بە هەموو هەبوویەکی بڕاوە بدەین؟ یان تەنیا بە لایەنێکی دیاریکراویان؟ ئەمەش لەوێدا باشتر دەردەکەوێت، کە لە واتای (خاوەنی ڕابردوو) بکۆڵێنەوە. کەسێک بەو جۆرەی ئوتومبیلێکی هەیە ڕابردوو نابێت بە موڵکی. ئەو کەسەی ئێستا هەیە بەو جۆرەی من لە دەرەوەی پاندانەکەمدا هەم لە دەرەوەی ڕابردوودا ڕادەوەستێت. لەبەر ئەوەی (خاوەنێتی) پەیوەندییەکی دەرەکی لە نێوان خاوەن موڵک و موڵکەکەدا دەردەبڕێت، ئەم زاراوەیە[بۆ باسەکەمان] لەبار نییە. پەیوەندی دەرەکی کەلێنێکی قووڵ لە نێوان ڕابردوومان و ڕانەبردوودا نیشاندەدات، کە هەردوو ئەم لایەنە بە دوو فاکتۆری لەیەک دابڕاو بەدەستەوە دەدات. تەنانەت ڕاڤەکردنەکەی برگسۆنیش بۆ ڕانەبردوو، لەبەر ڕۆشنایی ڕابردوومانەوە، ئەم گرفتە چارەسەر ناکات چونکە ڕاڤەکردنەکەی بۆ بەستنەوەی ڕانەبردوو بە ڕابردووەوە لە ڕانەبردووەوە دەستپێدەکات. بێگومان، ڕابردوو لە نێو ڕانەبردوودا دەبینرێت، بەڵام بەم کارە ئێمە هەموو ئەو ڕێگایانەمان بەستوە، کە بە جۆرێکی دیکە لە ڕابردوو تێبگەین و ڕابردوومان وەکو بەردێک فڕێداوەتە بنی گۆمەکەوە. ڕابردوو دەتوانێت لە نێو ڕانەبردوودا بژی، بەڵام ڕانەبردوو نییە؛ ئەو ڕانەبردووەیە، کە ڕابردووی خۆیەتی. کەوابوو توێژینەوەکەمان لەسەر پەیوەندی ڕابردوو بە ڕانەبردووەوە، لە ڕوانگەی ڕابردووەوە پەیوەندی ناوەکی نێوانیان دەرناخات. بەو ئاکامەش دەگەین هەبوویەکی لەنێو—خۆ، کە ڕانەبردووی ئەوەیە، کە هەیە، نابێت بە خاوەنی ڕابردوو. ئەو نموونانەی شێڤەلیەر بۆ سەلماندنی

تێزەکەی باســـیدەکات هیچ کارێکی ئەســـتویی (ماتەر)، کە لـــە ڕابردوودایە، بە ئێستاوە نابەســـتێتەوە. ئەم نموونانەی ئامادەیکردوون بە ئاسانی لەبەر ڕۆشنایی جوڵەی میکانیکیدا دەناسرێن. ئەو دوو مێخەی ئەم بیریارە ئاماژەیان بۆ دەکات، یەکێکیان ئێستا دروستکراوە و بەکارنەهاتوە، دووەمیان لێدانی چەکوشەکە خواری کـــردوە؛ هەردووکیان بە تەواوی لە یەکدی دەچن. بەڵام یەکێکیان بە چەکوشێک دەچێتە نێو دیوارەکە و دووەمیان جارێکی دیکە دەچەمێتەوە. ئەمەش کارێکە لە ڕابردوودا ســـەریهەڵداوە. بە دیدی ئێمە، کەمێک بڕوای خراپ بۆ بینینی ئەو ارە لە ڕابـــردوودا پێویستە. لێرەدا یەک ڕاڤەکردن هەیە؛ ڕواڵەتی دەرەوەی مێخەکان وەکو یەکە و هەردووکیان لەیەکدی دەچن، بەڵام بونیادی گەردیلەکانیان جیاوازە. ئەو گەردیلانەی ئێستا لەم بارودۆخەدا هەن، هەمان گەردیلەن پێشـــوتر هەبوون. ئەمـــەش بۆ زانایەک ئـــەوە دەگەیەنێت، تێپەڕبوون بەنێـــو باروودۆخەکاندا بەبێ مانـــەوە و بەردەوام بوونی ڕابردوو ڕوونـــادات. گۆڕانەکە لەنێوان دوو باروودۆخدا بـــۆ دواوە لەنێو (کات)ی فیزیادا ناگەڕێتەوە. بەهەمان شێوەش، بۆ ســـەلماندنی بەردەوامبوونی ڕانەبردووش، لە نموونەی ڕاکێشانی پارچەیەک ئاسن بە موگناتیس یارمەتیمان نادات. ئەمە دیاردەیەکە، کە خۆی بەو دیوو هۆکارەکەی دەگەیەنێت، وەکـــو هۆکاریکی ڕووت یان ڕابردوویەکـــی ڕووت نامێنێتەوە. پاش ئەوەی ئاوەکە لە هەوڵدانێکی درێژخایەندا، تاشەبەردەکەی کلۆرکرد بۆ ناو دەریاکە کشـــایەوە. شەپۆلەکانیش بەردەوام خۆیان بە کەنارەکەدا دەدەن. بەڵام کەس پەنا بۆ ڕابردوو نابات، تاکو باســـی ئەم دیاردەیەمان بـــۆ بکات؛ شێوازی کارکردنە میکانیکییەکە دیارە و ڕاڤەکردنێکی جیاوازتری بۆ ناکرێت.

ئاشکرایە زاراوەی (خاوەنی ڕابردووە)، کە شێوازی خاوەنێتی و بوونی خاوەنەکە ناچالاک دیاریدەکات بەسەر بوونی ئەستۆشدا دەسەپێنرێت. لەبەرئەمەیە باشترە بڵێین (ئەو ڕابردووی خۆیەتی). ڕابردوو بۆ ئەو ڕانەبردووە هەیە، کە ناتوانێ بەبێ ڕابردووەکەی هەبێت. تەنیا ئەو هەبووانە ڕابردوویان هەیە، کە ڕابردوو لە بوونیاندا پرســـیارە. ئەمەش ئەو بیرۆکەیە ڕەتدەداتەوە، کە ڕابردوو بە هەبوویەکی لەنێو—خۆ دەبەخشـــێت (ئەمەش نکۆڵی کردن لە ڕابـــردووی ئەم بوونە نییە). کەوابوو، ناتونین بە یەکجاری گرفتی ڕابردوو لە بوونەوەرە زیندووەکاندا چارەســـەربکەین. پێویستـــە بـــە وردی ســـەرنج بدەین ئەگەر ڕابـــردوو بە ژیان بدەیـــن. پێویستە بیسەلمێنیـــن، کە ژیان ڕێگە بە ســـەرهەڵدانی ڕابردوو دەدات. لەبەرئەمە، دەبێت ژیان لە هەبوویەکی ئەستویی سەر بە سیستەمی کیمیایی—فیزیکی جیابکەینەوە. هەوڵدانـــە جیاوازەکەی شیڤەلیەر کارێکی بێهودەیە. ڕابردوو لەنێو ڕاســـتەقینەی بوونی مرۆڤدا ســـەرهەڵدەدات چونکە ڕاســـتەقینەی بوونی مرۆڤ دەیەوێت ببێت

بـــەوەی هەیە. لـــە بوونی بۆ—خۆوە ڕابـــردوو دێتە نێو جیهانـــەوە. ئەو کاتەی دەڵێم (من هەم) هەمانکات فۆرمی (من منم)ی هەیە. .

کەوابوو، واتای (هەبـــوو) چییە؟ ئەم فرمانە جگە لـــە بکەرەکەی کارتێکراوێکی ڕاستەوخۆشی دەوێت. ئەگەر بڵێم، (پۆڵ ماندووە.) کەسێک لەوانەیە بڵێ، وشەی (is) [کە لەنێوان دوو وشەی نێو ئەم ڕستەیەدا بەکارهاتوە] بەهایەکی ئۆنتۆلۆجی هەیە. بەڵام ئەو کاتەی ڕستەکە دەگۆڕین بۆ (پۆڵ ماندوو بوو.) واتا بنەڕەتییەکەی (بوو)، کە ڕاســـتەوخۆ خۆی بۆ ئێمە دەردەخات. پۆڵ، کە ئێستا هەیە خاوەنی ئەو ڕابردووەیە. ئەگەر ماندووبوونەکەی لە بوونیدا نەهێشتایەتەوە ئەو حاڵەتەشی لـــە بیـــر نەدەچووەوە. پێویستە شتێـــک هەبێت، کە تێپەڕیـــوە و نەماوە، تاکو لەگەڵ (نە-بـــوون) دا هاوتا بێت. ماندوو بوونەکـــە ون دەبێت؛ لەم ڕووەوە ئەو هەبوەی هەیە بنەڕەتی ڕابردووی خۆیەتی؛ (هەبوو) لەنێو ئێستاییدا بەرجەســـتە دەبێـــت. نابێت بەو جـــۆرەش لە ڕانەبردوو تێبگەین، کـــە گوێناداتە ڕابردوو یان گۆڕانکاری بەســـەردا ناهێنێت.(هەبوو) واتە ئەو بوونـــەی ئێستا هەیە بنەڕەتی ڕابـــردووی خۆیەتی و خۆی هەمانکات ئـــەو ڕابردووەیە. ئەمە چ واتایەکی هەیە؟ چۆن ڕانەبردوو ڕابردووە؟

جەوهەری ئەم پرسیارە لە وشەی (هەبوو)دایە، کە دەکەوێتە نێوان ڕابردوومان و ڕانەبـــردووەوە. وشەکەش نە بەتـــەواوی ڕابردووە و نەڕانەبردوو. لە ڕاســـتیدا هیچ کامیان نییە چونکە لە هـــەردوو حاڵەتەکەدا بوونی لەنێو خۆیدا هەڵگرتوە. (هەبـــوو) بازدانێکی ئۆنتۆلۆجییانەیە لـــە ڕانەبردووەوە بۆڕابـــردوو. هەمانکات تێهەڵکێشـــکردنی هەردووکیان دەردەخات. چۆن لەم تێهەڵکێشـــەیە بگەین؟ لە سەرەتاوە چەمکی (هەبوو)، وەکو شێوازێکی بوون دەیبینم. لەم ڕووەوە من دەبم بـــە ڕابردووی خۆم. من خاوەنی ڕابردووم نیم، بەڵکو ڕابردووی خۆمم. کەســـێک باســـی کارێکی منی کرد، کە دوێنێ بە ئەنجامم گەیاند یان ئەو مەزاجەی تیایدا بووم؛ لە ئازاردا بووم یان کەســـێک ستایشـــی بۆکـــردم، ناڕەزایی خۆم دەربڕی، یـــان گوێم نەدایە. بەمجۆرە خۆم لە ڕابردوو دانابڕم. بێگومان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا لەوانەیە هەوڵبدەم لە ڕابردوو داببڕێم. دەتوانم بڵێم من ئەو کەسە نیم، کە هەم و گۆڕانم بەسەرداهاتوە و پێشکەوتوم. بەڵام ئەم کارە سەرەکییە، کە نییە. ئـــەو کاتەی مـــن نکۆڵی لە ڕووداو یان دۆخێکی ڕابـــردووم دەکەم هەمانکات ئەو ڕابردووەی خۆم دەســـەلمێنم. بە مردنیش من دەبم بە ڕابردوویەکی تەواو. مردن دەتوانێت پێناســـە بۆ بوونم بکات. ئەمەش ســـۆفۆکلیس لە (تراشینیا)دا لەسەر زاری دیانێریاوە بەمجۆرە باســـیکردوە، (پەندێکی باوە، کە کەس ناتوانێت حوکم بەسەر بوونی مرۆڤدا بدات و بڵێت، بەختەوەر بوو یان بەختەوەر نەبوو، تاکو ئەو مرۆڤە نەمرێت.) ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکەی ماڵرۆدا هەمان واتا دەبەخشێت، کە

دەڵێت، (مردن چارەنوســـی ژیان دەگۆڕێت.) ئەمەش وای لە بێلیڤەر کرد لە کاتی مردندا هەســـت بەو ترســـناکییە بکات و بڵێت، هیچ کارتێکی دیکەم بەدەستەوە نامـــاوە تاکو یارییەکەمی پێ بـــەردەوام بکەم. مردن ئێمـــە بەبوونی خۆمانەوە دەبەســـتێتەوە. ژیانی هەمیشەیی ئێمە دەکات بە خۆمان. لە سەرەمەرگدا، ئێمە خۆمانین؛ ئێمە لە ئاســـتی حوکمدانی کەسانی دیکەدا بێ بەرگریکردن لە خۆمان ڕادەوەســـتین. ئەوان دەتوانن حوکم بەسەر ڕاستی بوونی ئێمەدا بدەن و ئێمەش ڕێگەی هەڵاتنمان نییە. لە دوا ســـاتی ژیاندا داوای لێبوردن لە هەڵە بۆ شکاندنی ئـــەو بوونەی لە چواردەوری ئێمەدا بەســـتویەتی دەکەین. مردن دوا هەنگاوە بۆ دابڕانی خۆمان لە وەی، کە هەین. بەڵام ئەمە کارێکی بێهودەیە. مردن هەموویان ڕادەوەســـتێنێت. دەبێت بە ڕابـــردوو. کەوابوو، ڕابردوو ئـــەو لایەنەیە بەردەوام لـــە بوونی—لەنێو—خۆدا، کە ئێمەین گەورە دەبێت. هێشـــتا، تاکو ئەو ســـاتەی نەمردوویـــن، ئێمە بوون—لەنێو—خۆ نین و خاوەنی ناســـنامەش نین. بوونێکین، کـــە دەمانەوێت ببین بەوەی دەیخوازین. ڕق و کینە بەرانبەر کەســـێک بە مردنی تەواو دەبێت چونکە مردووەکە لەگەڵ ڕابردوویدا یەکیان گرتووە؛ ئەو ڕابردوویەتی بەبـــێ ئەو بەرپرس بەرانبەری دابنرێت. ئەو کەســـە چەنـــد لە ژیاندا بێت ڕق و کینەکەش بەردەوام دەبێت. من ئەو کەســـە لە ئاستی ڕابردوویدا هەموو کاتێک، کـــە ئەو هەڵوێستەی [من بە دڵم نییە] دووبارە دەکاتەوە شەرمەزاردەکەم چونکە بەرانبەری بەرپرسە. ڕاست نییە بڵێین ڕق و کینەکە ئەو کەسە لەنێو ڕابردوویدا دەچەقێنێـــت. ئەگەر بەمجۆرە بوایە پێویستی بە مـــردن نەدەبوو. من ڕابردووی خۆمم، ئەگەر وانەبێت ئەوا ڕابردووشم بۆ من و بۆ کەسانی دیکەش نەدەبوو. من ئەو کەسەم ڕابردووم دەهێنمە نێو جیهانەوە.

بەڵام با ئەو خاڵەش لە یاد نەکەین، کە من بوون بە ڕابردوو نابەخشم؛ واتە، وەکو نوێنەری (من) بوونی نییە چونکە من ئەو ڕابردووەم، کە دێتە نێو جیهانەوە. ڕابردوو ئەوەیە من پێویستە ببم. هاوکات خەســـڵەتی ڕابردوو لەگەڵ ئەگەرەکانی بوونمدا جیـــاوازە. ئەگەرێک، کە شێوازێکی بوونی منە لایەنێکی کۆنکریتییە، کە دژ وەســـتاوەکەشی ئەگەرێکی دیکەیە. ڕابـــردوو، بەپێچەوانەوە، هیچ ئەگەرێکی [دژوەستاوی] نییە؛ هەموو ئەگەرەکانی خۆی بڕانۆتەوە. من [وەکو ڕابردوو] دەبم بەو بوونەی لەوە زۆرتر لەسەر تەوانای بوون-بە-شتێکی دیکە ڕاناوەستێت چونکە هەموو شتێکی لەنێو خۆیدا پێچاوەتەوە.

ئەو ڕابردووەی، کە (من)ە هیچ ئەگەرێکی تێدا نەماوە. من خۆم بەرپرســـیار بەرانبەری دادەنێم، وەکو بڵێی، کە دەتوانم بیگۆڕم، بەڵام وانییە. لە دواییدا ئەم خاڵـــە ڕووندەکەمەوە، کە ئێمە چۆن بـــەردەوام دەمانەوێت ڕابردوومان بگۆڕین و وەکو داهاتوو مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. بەڵام هێشتا، ناتوانم دەستکاری ناوەڕۆکی

ڕابردوو بکەم. ڕابردووم ئەوەیە، کە هەیە، بوونێکی—نێو—خۆیە لە جیهاندا.

ئەو بوونەی من لە ڕابردوودا هەمە بوونێکە لەنێو—خۆدا و خاوەنی ناسنامەیە و لەگەڵ خۆیدا جوتە، لەلایەکی دیکەوە من ڕابردوو نیم، چونکە ڕابردوو بووم. بە کینە و ڕقی کەسانی دیکە سەرسام و توڕە دەبم. چۆن ئەوان ڕقیان لەو کەسەیە، کە ئێستا هەیە و ئەو کەسەشە، کە[لەپێشتر] هەبوو؟ زانایانی کۆمەڵە دێرینەکان ئەم ڕاستییەیان دەرخستوە گوایە، ناتوانم خۆم بە ناڕاست دابنێم لەو کاتەدا، کە هێشتا خۆم بە ناڕاست نەسەلماندوە. هیگڵ سودی لەمە وەرگرتووە. من هەر کارێک بکەم، هەر شتێک بڵێم، لەو کاتەدا، کە دەمەوێت بیکەم یان بیڵێم ئەوا کردوومە و گوتوومە. بەڵام با لە نزیکەوە سەرنجێکی ئەم پەندە بدەین.

ئەم پەندە ئەوە دەگەیەنێت حوکمدانێک بەسەر بوونی خۆمدا نادروستە چونکە ئەو کاتەی حوکمەکە دەدەم من دەبم بە شتێکی دیکە.

ئایا ئەو شتە چییە؟ ئەگەر ئەو شتە شێوازێکی بوونی مرۆڤ بێت، هەمان بوونی، وەکو ئەو بوونەی ئێمە ڕەتی دەدەینەوە هەبێت ئەوا توشی هەڵەیە دەبین. ئێمە خەسڵەتێکمان پێداوە و خەسڵەتێکی دیکەمان پێنەداوە، کە دەبێت هەبێت. ڕاوکەرێک تفەنگێک بە باڵندەیەکەوە دەنێت بەڵام باڵندەکە ئەو کاتەی گولەکەی دەگاتێ لەو شوێنە نامێنێ و هەڵدەفڕێت. ئەو دەتوانێت باڵندەکە بکوژێت، ئەگەر ڕووی تفەنگەکەی لەو شوێنە بکات، کە باڵندەکە لەگەڵ تەقەکردنەکەدا هەڵدەفڕێت و بۆی دەچێت. ئەگەر باڵندەکە لەو شوێنە نەبێت ئەوا لە شوێنێکی دیکەیە.

دەبینین بۆچوونی زانایانی ئیلیا لەسەر جوڵان لەوێدا، کە تیرێک لە خاڵی ئەلفەوە بۆ با و هتد، دەڕوات و جوڵان لەنێو زنجیرەی ئەم خاڵانەدایە هەڵەیە[٤٨] بەهەمان شێوە، ئەگەر بڵێین، ئەو کاتەی من هەبووم زنجیرەیەکی نەبڕاوەی دۆخەکانیش هەبوون و لەناوچوون و ئێستا نین، ئەوا (من) دەبم بە زنجیرەیەک دۆخی نەگۆڕ و چەسپاوی یەک لە دوای یەک، وەکو وێنەی نێو فانۆسێکی سیحراوی دێن و دەچن. ئەگەر من ئەو شتە نەبم، کە باسیدەکەم، ئەوە ناگەیەنێت دیوارێک کەوتۆتە نێوان بوونم و باسەکەمەوە یان جیاوازی لەنێوان حوکمدانەکە و فاکتۆرەکەدا هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە من لە بوونی ڕاستەوخۆمدا و لە ئێستامدا، ئەو شتە نیم. بە کورتییەکەی، هۆکار ئەوەی من ئەوە نیم، کە جاران هەبوو، دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکاری و پەیدابوون چونکە لە بنەڕەتەوە بوونم جیا جیایە. تێگەیشتنی جیهان لەبەر ڕۆشنایی پەیدابووندا و تێهەڵکێشکردنی بوون و نەبوون

---

٤٨ ئەمە بەڵگەیەکە سارتەر دژی زینۆی ئیلیا بەکاریهێناوە. بە دیدی زینۆ جوڵان نییە چونکە هەرچ تەنێک بجوڵێت دەبێت بە نێو زنجیرەیەک خاڵی نەبڕاوەدا تێپەڕێت، کە ئەمەش مەحاڵە. (وەرگێڕ)

بە ئاســـانی دەردەکەوێت. پێویستە ئەوەش بزانین بوون لە پرۆسەی پەیدابووندا ئەم تێهەڵکێشـــەیە، کە نەبوونی خۆی تێدادیاریدەکات. ئەگەر من ئەوە نەبم، کە جـــاران بووم، پێویستە تێهەڵکێشـــکردنی ئەوەشم تێدابێـــت. بتوانم لە لایەکەوە بوونی خۆم بپارێزم، ئەگینا پەیوەندیم بە جارانی خۆمەوە، کە تێپەڕیوە نامێنێت و بوونی پۆزەتیڤانەشم لەنێو پرۆسەی پەیدابووندا نەبوون هەڵناگرێت. پەیدابوون شێوازی بوونێکی ڕاســـتەوخۆی نییە؛ ئەگەر بەمجۆرە بێت، بوون و نەبوون لەنێو ئەم بوونەدا لەتەنیشت یەکدییەوە دادەنرێن و تێهەڵکێش ناکرێن. پەیوەندی نێوان بوون و نەبوون ناوەکییە. لەنێو بوون بەگشـــتیدایە. ئەمەش یاســـایەکی سروشت نییە، سەرهەڵدانی بوونێکە، کە لەنێو خۆیدا نەبوونی هەڵگرتوە.

ئەگـــەر من ڕابردووی خۆم نەبـــم ئەوا [ڕابردووەکـــەم] ناکەوێتە نێو شێوازی پەیدابوونمەوە. ڕاســـتییەکەی ئەوەیە من دەبێت ڕابردووی خۆم بم تاکو نەبم بە ڕابردوو. هەروەها بۆ ئەوەی ببم بە ڕابردووم ئەبێ ڕابردوو نەبم. ئەمەش شێوازی (هەبوو)مـــان بۆ ڕووندەکاتەوە: ئەگەر من ئەوە نەبم، کە هەبوو، لەبەر ئەوە نییە من گۆڕاوم، بەڵکو من لە ناخی بوونمدا پەیوەندیم بە نەبوونەوە هەیە.

تاکـــو ئێرە تێدەگەین، کە من چونکە ڕابردووی خۆمـــم ئەوا نابم بە ڕابردوو؛ پێویستی ئەم شێوازی بوونەمە ڕێگەی لە من گرتووە، کە ببم بە ڕابردوو. ئەگینا، لە هەموو ســـاتێکدا نە ئەبم بە ئەو نە ئەتوانم ئەویش نەبم. ئەم ڕوونکردنەوەیە جۆرە ڕاســـتییەک لـــە ڕاڕەوی گومانکاری هیراکلیتســـدا دەردەخات، کە دەڵێت، لە کاتی گوتندا من ئەو کەســـە نیم، کە باســـی خۆی دەکات. گرنگ نییە چۆن باســـی من دەکرێت، هێشتا من ئەو کەســـە نیم، کە باسم دەکەن. بەڵام دروست نییە بڵێم، من هەروەها ئێستا ئەو کەســـەی پێشو نیم. خۆ ئەگەر مەبەستمان لە بوون هەبوویەکی لەنێو—خۆ بێت، ئەوا من هەرگیز ئەوە نیم. لە لایەکی دیکەوە، ئـــەوەش ناگەیەنێت بە دانانی خۆم بەو ڕابردووە توشی هەڵە بووم. پێویستە من ئـــەو ڕابردووە بـــم، تاکو ڕابردوو نەبم. من لـــە شێوازی (هەبوو)دا ڕابردووم. هەر چییـــەک لەبارەی بوونمەوە، وەکـــو بوونێکی لەنێو—خۆ بوترێت، کە پڕ و خاوەن چارەنوســـێتی (بۆ نموونە پێم بڵێن زوو توڕە دەبم، کارمەندم، ناڕازییم) هەمیشە لەبارەی ڕابردوومەوەیە. لە ڕابردوودا من ئەوەم، کە هەم. بوونێکی پڕو گرانم داوە بە کۆڵما. دوورییەکی ڕەهاش من و ئەو لە یەکدی دادەبڕێت و نایەڵێت دەســـتم بەبێ پەیوەندی بیگاتێ. ئەگەر من بەختەوەر بوومایە ئەوە دەگەیەنێت بەختەوەر نیم. بەڵام واتای ئەوە نییە من نا—بەختەوەرم، بەڵکو تەنیا لە ڕابردوودا بەختەوەر بـــووم. ئەمەش لەبەر ئەوە نییە مـــن خاوەنی ڕابردووم و پێویستە بوون بە دوای خۆما ڕاکێشـــم؛ بەڵکو ڕابردوو ئەو بونیـــادە ئۆنتۆلۆجییەیە، کە من ناچاردەکات ببم بەوەی دەکەوێتە پاش بوونیەوە. ئەمەیە واتای (هەبوو). لە پێناســـەکردندا

بۆ بوون—بۆ—خۆ دەردەکەوێت ئەم بوونە لە ئاســتی بوونیدا بەرپرســە و بێجگە لــەوەی بوونێکە بۆ خۆی چی دیکە نییــە. بوونی خۆی بە خۆوە دەگرێت. پاش ئەوەی ئەو بوونە دەدۆزیتەوە، کە نێوانێکی دوور پێکدەهێنێت. لە کاتەدا دەڵێم، من بوونێکی— لەنێو—خۆم هەیە ئەوە دەســەلمێنم، کە من ئەو بوونە نیم چونکە هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەیە. بوون—بۆ—خۆ هەمیشە لەودیو ئەو شتەوەیە، کە هەیە چونکە بوونێکە بۆ—خۆ و لە پەیدابووندایە. هاوکات، ئەوەی لە پشــتییەوە دەژی بوونــی خۆیەتی و بوونێکی دیکە نییە. لێــرەدا واتای (هەبوو) پەیوەندی بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ خۆیدا دەستنیشاندەکات. ڕابردوو ئەو بوونە- لەنێو—خۆیە یە، کە منم. هەروەها منیش ئەو بوونە-لەنێو—خۆیەم، کە تێدەپەڕێت.

ئــەوەی دەمێنێتــەوە ڕوونکردنەوەی شێوازێکی تایبەتــی بوون—بۆ—خۆیە، وەکو (هەبوو) یان ڕابردووی خۆی. ئێستا دەزانین بوون—بۆ—خۆ لەو کاریگەرێتییەدا سەرهەڵدەدات، کە بوون—لەنێو-خۆ بۆ ئەوەی خۆی بدۆزێتەوە تیایدا لەناودەچێت. بوون—بۆ—خۆ بناخەی خۆیەتی چونکە بوون—لەنێو—خۆ ناتوانێ ببێت بە بناخەی بوونی خۆی. بوون—بۆ —خۆ ناتوانێت بە بوون—لەنێو—خۆ بگات و خۆی بە ئەم یان بە ئەو بوونە دابنێت. ناتوانێ ڕێگەی ئەوەش لە خۆی بگرێت، کە نەبێت بەوەی هەیە و دوورەپەرێز لە خۆی ڕاوەســتێت. ئــەم هەڵکەوتنەی بوون—بۆ—خۆ، ئەم تێپەڕبوون و خۆ گلدانەوەیە فاکتۆری ئەم بوونە و رابردوویەتی. فاکتۆر و ڕابردوو دوو چەمکی جیاوازن بۆ یەک شت. ڕابردوو، وەکو فاکتۆر هەڵکەوتێکی دەستکاری نەکــراوە لە بوون—لەنێو—خــۆدا، کە من ناتوانم نەمبێت. ڕاســتەقینەیەکی خۆ چەســپێنەر و پێویستە. بوونی فاکتۆرە، کە ناوەڕۆکی هاندەرەکانم داگیر ناکات، بەڵام ئیفلیجیان دەکات چونکە تێپەڕبوون و گۆڕانیان مەحاڵە. لەوە زۆرتر بەچی دیکە نابن. ئەم بوونەیە بەرپرسە لەوەی لە هەموو دۆخێکدا من بڵێم دیبلۆماسی یان سەرباز نیم و مامۆستام. هۆکاری بێ توانایم بۆ گەڕانەوەم بە ڕابردوومدا هێزێکی نادیار نییە ڕابردوو لە دەرەوەی دەستەڵاتی من ڕاگرێت. لەبەر ئەوەیە، کە ڕابردوو شتێکــە لەنێو—خۆدا و منیش بوونێکم بۆ—خۆ. ڕابردوو ئەو بوونەمە، کە ناتوانم بیژێنمەوە. ڕابردوو جەوهەرە. لەم بۆچوونەوە دەبێت کۆجیتۆکەی دێکارت بگۆڕین بۆ: من بیردەکەمەوە، کەوابوو، من **هەبووم**. ئەوەی ئێمە فریودەدات لەیەکچوونی ڕابــردووە لە ڕانەبــردووەوە. ئەو شەرمەزارییەی دوێنێ توشــم بوو بەشێک بوو لــە بوون—بۆ—خۆ لە ئەزموونی (ئەگەر)ی منــدا. لەو باوەڕەشداین ئەمڕۆ بۆ ئەم بوونە وەکــو خۆی ماوەتەوە. من بە هەڵەدا دەچم ئەگــەر نەتوانم بیگەڕێنمەوە چونکە[ئەوەی دوێنێ ڕوویدا]نەماوە. بەڵام دەبێت پەیوەندییەکە دروستبکەینەوە تاکو ڕاســتی بناسین. لەنێوان ڕابردوومان و ڕانەبردوودا جیاوازییەکی ڕەها هەیە. نەگەڕانــەوەی منیش بۆ ڕابردوو لەبەر ئەوەیە، کە ڕابــردوو شتێکە هەیە. تەنیا

ڕێگەیـــەک من بە ڕابـــردوو بگەیەنێت گۆڕانی خۆمە بـــۆ بوونێکی— لەنێو—خۆ و لەناوبردنی خۆمە و دامەزراندنی ناسنامەیەکی چەسپاوە بۆ بوونم. ئەمەش شتێکە لە بوونی مندا نییە. لە ڕاستیدا ئەو شەرمەزارییەی دوێنێ تیایدا ژیام شەرمەزاری بوون—بۆ-خۆمە و هەمیشـــەش شەرمەزارییە لـــە ڕانەبردوومدا و ناوەڕۆکەکەشی بـــە بوونێکی— لەنێو—خۆ دادەنرێـــت. بەڵام بوونەکەی بۆ—خـــۆی نییە چونکە تێپەڕیـــوە و نەماوەتەوە. هەرچەندە دەتوانین بـــە بوونێکی—بۆ—خۆی دابنێین، کەچی شتێکە (هەیە). ڕابردوو بوونێکی— بۆ-خۆی هەیە و دەبێت بە بوونێکی— لەنێو—خـــۆ. مادامەکی من دەژیـــم، شەرمەزارییەکەم ئەوە نییە، کە هەیە. ئێستا من ئـــەوەم، کە هەبووم؛ دەتوانـــم بڵێم: شەرمەزاری بووە بـــە شتێکی (هەبوو) لەپشت بوونی منەوە و هەمیشـــە دەمێنێتەوە و بووە بە بوونێک—لەنێو—خۆیدا. لەڕوویەکەوە، ڕابردوو، کە لە یەک کاتدا بوون—بۆ—خۆ و بوون— لەنێو—خۆیە لەو بەهایە یان (خۆ)یە دەچێت ئێمە لە بەشی پێشودا باسمانکرد؛ چونکە جۆرێکە لە تێهەڵکێشەی بوون. ئەو شتەیە هەیە و ئەوەش نییە، کە هەیە. بەم واتایە دەتوانین لەسەر بەهای لەناوچووی ڕابردوو بدوێین. بیرەوەریمان ئەو بوونە پڕە دەردەخات، کە (ئێمە)یـــە. ئەو خەم و پەژارەیەی لە ڕابردوودا توشمان بوو بەردەوام ئێستاش کاردەکاتە ســـەرمان. هاوکات بووە بە شتێکـــی لەنێو—خۆ و نەگۆڕ. پەیکەرێکی وەستاو. بۆ کارتێکردنەکەی پێویستی بەسەرهەڵدانەوە نییە.

بـــە پێچەوانەشەوە، دەبینین بووە بە خەســـڵەتێک یـــان شێوازێکی بوونمان. زانایانی دەروونناس لەو تێڕامانەوە بۆ بارودۆخی دەروون هەیانە، گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی ئاگامەندی خەسڵەتێکە، کە کاردەکاتە سەر بارودۆخی دەروون بەبێ ئەوەی شێوازی بوونی بگۆڕێت. بارودۆخە دەروونییەکانی ڕابردوو لەنێو ئەم بوونەدا، وەکو چۆن وتمان پیرۆ مرۆڤێکی قژ زەردە یان ئەو درەختە داربەڕووە، هەن.

لەبەر ئەم هۆیەشە ڕابردوو، کە لە بەها دەچێت بەهانییە. لە بەها داناندا بوون— بۆ—خۆ بەتێپەڕکردن و دامەزراندنی بوونی دەبێت بەخۆی؛ ئەو بوون—لەنێو—خۆ لەبوونی دەدۆزێتەوە. لە ئاکامی ئەم کارەشدا، لایەنە هەڵکەوتوەکانی بوون ڕێگە بۆ لایەنە پێویستەکان خۆشدەکات. ڕابردوو، بەپێچەوانەوە، لە ســـەرەتاوە دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ. بـــوون —بۆ—خۆ لە ڕێگەی بوون—لەنێو—خۆوە بەردەوامی بـــە بوونی دەدات. ڕابـــردووی بوونە-لەنێو—خۆدا و بۆ ئێمـــەش، وەکو بوونێکی هەڵکەوتـــووی ڕووت خۆی دەردەخات. پێویست ناکـــات ڕابردوومان ئەو یان ئەم شتە بێت؛ ئـــەو لەنێو زنجیرەی تەواوی فاکتۆرەکانـــدا دەردەکەوێت. ئێمەش بە فاکتۆرێکی ڕووت و سوپاسگوزاری دەیبینین. بە کورتییەکەی، بەهایەکی گەڕاوەیە، کە بوون—بۆ—خۆ دەیدۆزێتەوە و بە هۆکاری ئەوەوە دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ و چەســـپاو. بەو بوونە پڕ و کوێر دەبێـــت و ناتوانێت لە وێوە ببێت بەو بوونەی

بڕوانێتـــە بوونی خۆی. لەبەرئەمەش ڕابردوو بـــۆ ئەم بوونە دەبێت بەو بابەتەی، وەکـــو بەها تەماشای بکات و لەو دوودڵییەش ڕابکـــات، کە بەردەوام لە ئاکامی نەدۆزینەوەی (خـــۆ)دا یەخەی دەگرێت. بەڵام[ڕابـــردوو] لە ناوەڕۆکەوە لە بەهاوە جیاوازە؛ ئاماژە بۆ لایەنێک دەکات، کە هیچ شتێکی پێویستی لێوە دەرناهێنرێت؛ فاکتۆرێکـــی تایبەتمەندی هەر یەکێک لە بوون—بۆ—خۆیـــە، ئەو لایەنە نەگۆڕ و هەڵکەوتوانەیە، کە دەبن بە بوونی من.

کەوابوو، ڕابردوو بوون—بۆ—خۆیە و گەڕاوەتەوە و بوون—لەنێو—خۆ دایپۆشیوە و لەنێو خۆیدا گلیداوەتەوە. ئەمە چۆن ڕوودەدات؟

ئێمە باســـی بوونی ڕابردووی ڕووداوێک و ڕابردووی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیمان کـــردوە. ڕوونمانکردەوە، کە ڕابردوو یاســـایەکی ئۆنتۆلۆجییە بۆ بوون—بۆ-خۆ؛ هەموو بوون—بۆ—خۆیەک پێویستە لەودیو بوونی خۆیەوە بێت و نەتوانێت بیگاتێ. لەم بۆچوونەوە لەگەڵ هیگڵـــدا هاوڕا دەبین، کە دەڵێت: (ڕابردووم ناوەڕۆکمە)؛ ڕابردوو یاســـایە بۆ بوون. بەڵام ڕوونمان نەکردەوە چۆن ڕووداوێک بۆ ئەم بوونە دەبێـــت بە ڕابردوو. چۆن بوون—بۆ—خۆ، کە ڕابردووی خۆیەتی لەوێدا دەبێت بە ڕابردوو، کـــە بوون—بۆ—خۆیەکی نوێ پەیدا دەبێـــت؟ ڕەوتکردن بەرەو ڕابردوو گۆڕانکارییە لەم بوونەدا. ئایا ئەم گۆڕانکارییە چییە؟

بۆئەوەی لەم خاڵە تێبگەین پێویستە لە پێشدا لە پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆو ڕانەبردوو بکۆڵینەوە. لێرەوە ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت، کە لێکۆڵینەوەمان لەسەر ڕابردوو بە ڕانەبردووەوە بەستراوە.

## با. ڕانەبردوو

بەپێچەوانەی ڕابردووەوە، کە بوون— لەنێو—خۆیە، ڕانەبردوو بوونە-بۆ—خۆی. ئایـــا ئەم بوونە چییە؟ جۆرێک پارادۆکس لەنێو ڕانەبردوودا هەیە: لە ڕوویەکەوە ئێمـــە بە بوونی دادەنێیـــن؛ ئەوەی ڕانەبردووە شتێکە ئێستـــا هەیە. ئەمەش بە تـــەواوی لە واتـــای داهاتوو هەروەها ڕابردووەوە جیاوازە. داهاتوو هێشـــتا پەیدا نەبووە و ڕابردووش تێپەڕیوە.

ئەگـــەر لێکۆڵینـــەوە وردەکە بیەوێت ڕانەبـــردوو بە ڕابـــردووە و داهاتووەوە گرێنـــەدات، ئەوا ڕانەبردوو دەبێت بە دەســـتەیەکی لە ژمـــارە بەدەری بارودۆخە ســـاتییەکان. هوسرڵ لە نوســـراوەکەیدا (ئاگایی ناوەوەی کات) ئەو سنورەی بۆ دابەشکردنەکە داناوە و ڕووی لە لایەنێکی نەبڕاوە کردوە، لە ڕاستیدا هیچە. هەرچ کاتێک بمانەوێت لە ڕاســـتەقینەی مرۆڤ تێبگەین ڕووبـــەڕووی بۆچوونێکی نوێ دەبینەوە و بوون و نەبوون پێکەوە دەدۆزینەوە.

ئایا واتـــای بنەڕەتی ڕانەبردوو چییە؟ ئاشکرایە ئەوەی ئێستا هەیە لەســـەر خەســـڵەتی ڕانەبردووی لە هەموو شتێکی دیکە جیادەکرێتەوە. ئەو کاتەی ناوی سەربازێک یان خوێندکارێک لە پۆلدا دەخوێنرێتەوە، سەربازەکە یان خوێندکارەکە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت، ئامادەیە. ڕانەبردوو دژوەستاوی ئامادەنەبوون و ڕابردووە. کەوابوو، ڕانەبردوو واتای ئامادەبوون بۆ شتێک دەبەخشێت. لەبەر ئەوە دەکرێت بپرسین، کە ڕانەبردوو لە ئاستی چیدا ئامادە بوونە یان ڕانەبردوو چییە و کێیە؟ ئەمەش هانماندەدات لە بوونی ڕانەبردوو بگەڕێین.

ڕانەبـــردووی من ئامادەبوونمە. ئامادەبوونی بۆ چـــی؟ لەبەردەم ئەم مێزەدا، لـــەم ژوورەدا، لە پاریس، لەنێو جیهانـــدا یان بە کورتییەکەی بۆ بوون— لەنێو— خۆ. ئایا دەتوانین ئەم دەســـتەواژەیە هەڵگەڕێنینەوە و بڵێین بوون—لەنێو—خۆ لەبەردەم من و بـــوون— لەنێو—خۆیەکی دیکەدا ئامادەیە؟ ئەگەر بەمجۆرە بێت، ئەوا ڕانەبردووەکان بەرانبەر یەکدی ڕادەوەستن و پەیوەندی دروستدەکەن. بەڵام ئێمە بە ئاســـانی دەتوانین بیسەلمێنین، کـــە وا نییە. ئامادەبوون پەیوەندییەکی ناوەکـــی لەنێوان ئامادە بووەکـــە و ئەو شتەدا هەیە، کـــە ئامادەبوون خۆی بۆ دەردەخات. ئامادەبوون ئەوە دەســـەلمێنێت، بوونێک لە دەرەوە یان نزیک خۆی ڕاوەســـتاوە. لەگەڵ ئامادەبووندا بوونێک هەیە پەیوەندی بە بوونەکانەی دیکەوە دەبەســـتێت. من ئەو کاتە لەبەردەم کورســـییەکەدا ئامادەم، کە پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجی تێهەڵکێشـــمان بکات. تەنیا لەوێدا، کە من لەنێو بوونی کورسییەکەدا هەم، بەڵام کورسییەکە نیم. ئەو بوونەی ئامادە دەبێت (بوون—لەنێو—خۆ) نییە؛ بوون—لەنێو—خۆ ڕابردووە و ناتوانێـــت ئامادە بێت. ئەو شتێکە هەیە. کەوابوو، ڕانەبـــردوو تەنیا بۆ بوون—بۆ—خۆ لـــە ئامادەبوونیدا بۆ بوون—لەنێو—خۆ هەیە. ئـــەم ئامادەبوونەش هۆکـــردی ڕووداوێک نییە پێکەوە بەســـترابن، بەڵکو هەموو شتە بەســـتراوەکان پێویستیان بە ئامادەبوونەکە هەیە. دەبێت، وەکو بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی بوون—بۆ—خۆ تەماشای بکەین. ئەم کورسییە لەو جیهانەدا بۆ مێزەکە ئامادە بێت، کە ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤی تێدابێت. بوون—بۆ—خۆ بە خۆکردن بەم بوونە خۆی بۆ بوون ئامادە دەکات.

هەروەها، ئەگەر خۆی بە بوون—بۆ—خۆ دانەنێت ئامادەبوونەکەشی نامێنێت. بوون—بۆ—خـــۆ بەو بوونە پێناس دەکرێت، کە لە بووندا ئامادەیە. بۆ چ بوونێک بوون—بۆ-خۆ ئامادە دەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و ئاشکرایە. بوون—بۆ— خۆ ئامادەی بـــوون— لەنێو—خۆ دەبێت. دەتوانین بڵێین ئامادەبوونی بوون—بۆ- خۆ وا لە بوون— لەنێو—خۆ دەکات گشـــتگرانە و (هەموو)ی خۆی دەربخات. لەم ئامادەبوونەدا لەبەردەم بوون بەگشـــتی هەموو ئـــەو ئەگەرانە خراونەتە لاوە، کە بوون— بۆ—خۆ زۆرتر لەبـــەردەم هەبوویەکدا ئامادە دەکات و ئاوەڕ لەوانی دیکە

ناداتەوە. هەرچەندە فاکتۆری بوونی دەبێتە هۆکاری ئەوەی ئەم بوونە لێرەدا بێت و لە شوێنێکی دیکەدا نەبێت، هێشـــتا بوون لێرە لە ئامادەبوونەوە جیاواز دیارە. بوون لێرە ئـــەو تێڕوانینە دەردەخات، کە ئامادەبوونی هەموو بوون— لەنێو—خۆ تیایـــدا دەردەکەوێت. بە هۆکاری بوون لێرەدا ئەم بوونـــە هەموو هەبووەکان لە ئامادەبوونەکەیدا دەهێنێتە کایەوە. هەبووەکان لەنێو جیهاندا لە تەنیشت یەکدییەوە ڕیزکـــراون و بوون—بۆ—خۆ پێکەوە بە خوێنی خۆی و قوربانیدان بەو دەرچوونە لە خۆیەوە و ئامادەبوونی هەموویان پێکەوە دەبەستێتەوە. پێش ئەم قوربانیدانە دژواربوو بڵێین هەبووەکان پێکـــەوە یان بەجیا هەبوون. لەگەڵ بوون— بۆ-خۆدا ئامادەبوونیش دێتە نێو جیهانەوە؛ هەبووەکانی نێو جیهان پێکەوە ئامادە دەبن و بوون—بۆ—خـــۆش لەبەردەم هەموویاندا ئامادە دەبێت. کەوابوو، بۆ ئەو بوونانەی بە لەنێو—خۆ دایاندەنێین ئامادەبوون بەو واتاگشتیەی بەکاریدەهێنین، هەرچەندە بێجگە لە بوونیان چی دیکە نییە، بەڵام لە بوونیان جیادەکرێتەوە. ئامادەبوونیان پێکەوە بوونە ئەگەر بوون— بۆ—خۆ لەبەردەمیاندا ئامادە بێت.

ئێستا ئێمە دەزانین ئامادەبوون چۆنە و لەبەردەم چیدا ئامادەبوون سەرهەڵدەدات. بەڵام ئایا ئامادەبوون چییە؟ زانینمان [ئامادەبوون] پێکەوە بوونی دووجۆر هەبوو نییە و پەیوەندییەکەشیان دەرەکی نییە چونکە لە پەیوەندی دەرەکییدا پێویستیمان بە لایەنی سییەم هەیە پەیوەندییەکە باسبکات. ئەم لایەنی سێیەمەش لەنێو جیهاندا و لەگەڵ هەبوویەکی دیکەدا پەیوەندی هەیە؛ تەنیا بوون—بۆ—خۆ دەتوانێت لەگەڵ ئامادەبوونەکەیدا پێکەوەبوون و هاوئامادەبوونی شتەکان دامەزرێنێت. هەروەها لە ئامادەبوونـــی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم بوون—لەنێو—خۆدا پێویستیمان بە لایەنی تاکو ســـێیەم نییە[ئامادەبوونەکە یان پەیوەندییەکـــە] دابمەزرێنێت. بێجگە لەم بوونـــە هیچ گەواهێکی دیکە یان خوا ئامادەبوونەکـــە دانامەزرێنێت، ئامادەبوون شێـــوازی بوونـــی هەبوویەکی لەنێو—خۆ نییە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کـــە بوون—بۆ—خۆ تاکو ئەو ســـاتەی گەواهـــی ئامادبوونەکەیە، خۆی ئامادە بۆ هەبووەکان دەردەخات. ئێمە چۆن لەم خاڵە تێدەگەین؟ ئێمە دەزانین بوون—بۆ—خۆ گەواهی لەسەر بوونی هەموو شتەکان دەدات. لێرەدا، بوون— بۆ—خۆ ئامادە بوونـــە بۆ بوون، ئەگەر بەو مەبەســـتەوە ڕوو لە دەرەوەی خۆی بکات. پێویستە بەبـــێ ئەوەی خـــۆی بە ئەو دابنێت زۆر خۆی لە بـــوون نزیک بکاتەوە. ئەم خۆ نزیکردنەوەیە، کە لە بەشی داهاتـــوودا ڕوونیدەکەینەوە ڕیالیستانەیە چونکە لە دایکبوونی خۆی بەو بوونەوە دەبەستێتەوە؛ ئەو گەواهی بۆ خۆی دەدات، کە ئەو بوونە نییە. لەبەرئەمە لە دەرەوەی ئەو بوونەدایە.

لەســـەرو ئەمەوە، بۆ تێگەیشـــتنمان لە واتـــای ئامادەبوون ئامـــاژە بۆ ئەم ئاکامانە دەکەم: ئامادەبوون لەبەردەم هەبوویەکدا ئەوە دەگەیەنێت ئامادەبووەکە

پەیوەندییەکی ناوەکی بە هەبووەکەوە هەیە؛ ئەگینا هیچ پەیوەندییەک دروست نابێت. بەڵام پەیوەندییە ناوەکییەکەش لە نێوانیاندا (نەرێ)یە و نکۆڵی لەوە دەکات، کە ئەو بوونەی لەبەردەم هەبووەکەدا ئامادەیە یەک شت بن. ئەگەر پەیوەندییەکە ئەم جۆرە نکۆڵیکردنەی تێدانەبێت ئەوا هەردوو لایەنەکە لە پەیوەندییەکەیاندا دەبن بە یەک و یەک جۆر ناسنامەشیان پێدەدرێ. کەوابوو، ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم بووندا ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەم بوونە گەواهە بۆ ئامادەبوونی لەبەردەم بوونێکدا، کە لە بوونی ئەمەوە جیاوازە و ئەم نییە. ئامادەبوون لەبەردەم بووندا ئامادەبوونی بوون—بۆ-خۆیە، تاکو ئەو رادەیەی، کە بوون—بۆ-خۆ نییە. لایەنی نەرێ تەنیا لەسەر جیاکردنەوەی دوو شت راناوەستێت و جیاوازیشە لە بووندا. ئەمەش لەو گوتەیەدا دەردەکەوێت، کە دەڵێین ئامادەبوون نییە. مەبەست لە نەبوونی ئامادەبوون و بوون—بۆ—خۆ چییە؟ بۆ تێگەیشتن لەم کێشەیە پێویستە بۆ بوون—بۆ—خۆ و شێوازی بوونی بگەڕێنەوە و پەیوەندییە ئۆنتۆلۆجییەکەی لەگەڵ بووندا باسبکەین. کاتێک لە بارەی بوون—بۆ—خۆوە دەدوێین، پێویستە نەڵێین ئەم بوونە شتێکە هەیە بەو جۆرەی دەڵێین ئێستا کات ژمێر(نۆ)یە، چونکە ئەمە بوونێکی پڕ دەردەخات، کە لەگەڵ خۆیدا کۆکە و ناجوڵێت. بوون—بۆ—خۆ دیاردەیەکە گەواهی دەدات. گەواهییەک، کە لەسەر تێڕامان رادەوەستێت بەبێ ئەوەی بابەتی تێرامانەکەشی لەوێدا قوت بووبێتەوە. بوون—بۆ—خۆ هەبوو نییە چونکە بوونی دووری هەیە؛ بوونی لە تێڕاماندایە ئەگەر تۆ دیاردە بە خۆ دەرخستن و تێڕامانیش بە تێڕاوانین دابنێیت. هەروەها ئەگەر ئەم دوو شتە بە ڕووتی و بەبێ پەیوەندی بخوێنیتەوە. لەسەر و ئەمەوە، بوون—بۆ—خۆ هەبوو نییە. ئەو ئاشکرا بەو جۆرە خۆی دەردەخات، کە هەبوو نییە. ئەو ئاگامەندییە، کە ڕوو لە دەرەوە دەکات و ڕەتدانەوەی ناوەکییە. بناخەی ئەم بوونە لە هەڵوێستی مەبەستدارێتی و ڕەتدانەوەی ئەم بوونەیە لە پەیوەندییە ناوەکییەکەیدا بە بوونەوە. ئەم بوونە لە دەرەوەی خۆیدا خۆی پێکدەهێنێت، وەکو دەسەڵاتی ڕەتدانەوە خۆی دەردەخات. لەم لایەنەوە، یەکەم پەیوەندی بوون—بۆ—خۆ بە بوونە گشتییەکەوە ڕەتدانەوەیە. لەم بوونەدا، کە لە هەبووەکانەوە جیاوازە، ئەم جیاوازییە دەردەکەوێت و بەو شێوەیە خۆی نیشاندەدات، کە نییە. لە هەردوو لایەنەکەوە لە بوون ڕادەکات؛ لە لایەکەوە بوونێکی ناوەکی ناتەواوە و لە لاکەی دیکەوە ڕەتدانەوەیە. ئامادەبوون ئەم ڕەتدانەوەیەیە لە بوون—بۆ—خۆدا؛ ڕاکردنە لە دەست بوون. بوون—بۆ—خۆ لە ئامادەبوونیدا لەبەردەم بووندا هەمانکات لە دەست بوون ڕادەکات. ئامادەبوون ڕاکردنێکی بەردەوامە لە دەست بوون. لەم ڕووەوە، ئێمە توانیومانە پێناسەی ئامادەبوون بکەین و بڵێین ئامادەبوون نییە. ساتەکانی ڕانەبردوو لە چەمکی

ڕاســـتەقینە و ڕیالیستانەی بوون—بۆ-خۆوە پەیــدا دەبن. ئەو چەمکەی واتایەک بەگوێرەی شێـــوازی ئامادەبوون لەبەردەم بووندا بـــە بوون—بۆ—خۆ دەدات. بۆ نموونـــە، ئەو پەنجەیەی ئاماژە بۆ کاتژمێرەکەی دەکات. لێرەدا ناکرێت بڵێین بۆ بوون—بۆ—خۆ کاتژمێر نوێیە. بـــەڵام بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ ئەو پەنجەیەی ئاماژە بـــۆ کاتەکە دەکات ئامادەیە. ئەو هەڵەیەی توشمان بووە ئەوەیە، کە ئامادەبوون بەو شتـــە دادەنێین، کە ئامادەبوونەکەی بۆ ئامادە کراوە. دژوارە ســـاتەکان بە ئامادەبوون دابنرێن، چونکە سات لەنێو ئامادەبووندایە و ئامادەبوون لەنێو ساتدا نییە. ئامادەبوون لە شێوازی ڕاکردندا خۆی دەردەخات.

ئامادەبـــوون بەتەنیـــا لایەنی نەبوونی بوون—بۆ—خۆ نییـــە، کە خۆی ئامادە دەکات. بوون—بۆ—خۆ لە دەرەوەی بوونی خۆیدا و لە پێش و لە پشـــتەوەیە. لە پشتەوە، ڕابردوویەتی و لە پشتەوە داهاتووی. بوونی ئەم ڕاکردنە بەرەو دەرەوە لە دەســـت هەبووەکان و بەرەو ئەوەی لە داهاتـــوودا چاوەڕوانێتی. لە ئێستاییدا ئەوە نییە، کە لە ڕابردوودایە و هێشـــتا نەبووە بەوەی لە داهاتوودا پێی دەگات. لێرەدا ئێمە ئاماژە بۆ داهاتوو دەکەین.

## جیم — داهاتوو

لێـــرەدا ئەوە دەڵێم، کە بـــوون— لەنێو—خۆ لە داهاتوو بـــەدەرە و تەنانەت بەشێکی داهاتووشی تێدا نییە. مانگی یەک شەوە بۆ من پاش مانگی هیلال دێت و ڕاســـتییەکە بۆ مرۆڤ هەیە. داهاتـــوو لەگەڵ بوونی مرۆڤدا دێتەکایەوە. مانگی هیلال  شتێکە هەیە و هیچ لایەنێکی هێزەکی تێدا نییە[کە هێشتا پەیدانەبووبێت.] ئـــەو بوونێکی کردەکی پڕی هەیە. داهاتوو، وەکـــو ڕابردوو دیاردەیەکی بوونی— لەنێـــو— خۆ و کاتی ئەم بوونە نییە. ئەگەر بوون— لەنێو—خۆ داهاتووی هەبێت، داهاتووکـــەی لەنێو—خۆیدایە و وەکـــو ڕابردوو لە بوون دابـــڕاوە. ئەگەر لەگەڵ لاپلاسیش هاوڕا بین و لەسەر ڕاڕەوی ناچارەکی پێشبینی داهاتوو بکەین، هێشتا دەبێت ئەو داهاتووە بەو بوونەوە ببەستینەوە، کە لەگەڵ خۆیدا داهاتوو دەهێنێتە نێو جیهانەوە، ئەگینا کات دەبێت بە فۆرمێکی نێو ئەندێشە.

ئەگەر داهاتوو لە ئاســـۆی جیهاندا ببینرێت ئەوا دەبێـــت بوونێک هەبێت،کە ئەو داهاتووە بێت. لێرەدا جارێکـــی دیکە بوونیادی چوونە دەرەوە[لە خۆوە] بۆ دەردەکەوێت، کە لە باسکردنەکەمان لەسەر ڕابردووەوە نزیکە. بوونێک دەتوانێت داهاتوو بێت، کە بوونی خۆیەتی. بەڵام بوون بە داهاتوو چ واتایەک دەبەخشێت؟ چ جۆرە بوونێک داهاتووی هەیە؟

له سـەرەتاوە واز لـەو بیرۆکەیە دەهێنیـن، کە داهاتوو بـە وێنەیەکی نێو ئەندێشـە دادەنێت. دواجار، ئەگەر نوێنەری[شتێکـی دەرەکی بێت] ئەوا نابێت لەنێو ئەندێشـەی مندا بێت چونکە ناوەڕۆکـی هەیە و ناوەڕۆکیش دەبێت، وەکو شتێک هەبێت. لەوانەیە هەندێک بڵێن ئەو ناوەڕۆکە لەگەڵ مەبەسـتەکانی ئێمەدا لەنێو داهاتوودا خۆی بەرجەسـتە دەکـات و دێتە ژیانەوە. ئەمەش هیچ واتایەک نابەخشێت. گریمان ئەو مەبەستە هەیە، بوونی ئەو دەبێت (پێویست)بێت ئەمەش چارەسـەری کێشەی داهاتوو ناکات؛ یان ئەو مەبەسـتە بۆ گەیشتن بە داهاتوو خۆی دەگەیەنێتە ئەو دیو ئێستاوە. لێرەدا بوونی ئەو مەبەسـتە شتێکە هێشـتا پەیدا نەبووە. هەروەها، ئەگەر بوون—بۆ—خۆ لەنێو ئێستادا گیریخواردبێت، چۆن دەتوانیـن بە داهاتوو بگات؟ چۆن زانینی لەبارەی داهاتووەوە دەسـتدەکەوێت؟ هیچ بیرۆکەیەکی سـاختە و دروستکراو نوێنەرایەتی داهاتوو ناکات. ئەگەر ئێستا بە ئێستاوە گرێبدەین، ئەوا هەرگیز ناتوانین خۆمان بەو دیو ڕانەبردوو بگەیەنین. پێویستیـش ناکات بڵێین (ڕانەبردوو سـکی بە داهاتوو پـڕە.) ئەم گوتەیە هیچ واتایەکمـان ناداتێ یـان کاریگەرێتی لەنێو ڕانەبردوودا دیاریدەکات یان یاسـای بوونی بوون—بۆ—خۆمان بۆ دەردەخات، کە ئەم بوونە داهاتووی خۆیەتی. بوون—بۆ—خۆ سـکی بە داهاتوو پڕ نییە. تەنانەت چاوەڕوانـی داهاتووشی لێناکرێت. زانیـن لەبارەی داهاتووشەوە نییە. تەنیا پەیوەنـدی بنەڕەتی بە بوونی خۆیەوە هەیـە. ناتوانین تۆزقاڵێک لەبارەیەوە داهاتووبین بین ئەگەر ئەو بوونە نەبێت لە بوونیـدا داهاتوو هەبێت و بەو بوونە خۆی دەرنەخـات، کە دەتوانێت لە بوونی خۆیەوە دەرچێت و بەرەو داهاتوو نەڕوات.

لێـرەدا نموونەیەک باسـدەکەم. بەو شێوەیـەی لە شوێنـی یاری (تێنس) ڕادەوەستم لەوێدا واتا بەخشە، کە من بتوانم لەو چەقەوە بجوڵێم و بە ڕاکێتەکە تۆپەکـە بگەیەنمـە خانەی ئەو دیـو تۆڕەکە. من پەیڕەوی ئـەو وێنانە ناکەم، کە لەنێو ئەندێشـەدا لەبـارەی جوڵانی داهاتووەوە هەن. وێنەکانی ئەندێشـە و بیروڕا ئەو پەیکەرانەی[نێو بیرکردنەوەن]، کە زانایانی دەروون ناس دایانتاشیون. جوڵەکەی داهاتووە، کە هێشتا نەبووە بە بیرۆکە، لەو دیو شێوە وەستانی منەوە ڕادەوەسـتێت و منیش شوێنی دەکەوم. لەگـەڵ لێدانی تۆپەکەدا من خۆم لەنێو یاریگاکە دەدۆزمەوە و تۆپەکە بۆ خانەکەی دیکە دەگەڕێنمەوە. من وەکو کەمییەک لـە بوونمدا، ڕادەوەسـتم، ئەو شێوازانەی تیایاندا ڕادەوەسـتم، بە داهاتوومەوە گرێمدەدەن. واتای هەر یەکێک لە شێوازی ڕاوەستانەکانم بە داهاتوەوە بەستراوە. هیچ ساتێک لەنێو ئاگامەندی مندا نییە، کە پەیوەندییەکی ناوەکی بە داهاتووەوە نەبێت. ئەو کاتەی دەنووسم، جگەرە دەکێشم، ئەخۆمەوە، پشودەدەم، بارودۆخی ئاگاییم هەمیشە بەرەو دووری دەڕوات و لە دەرەوە دایە. هایدیگەر دروست بۆ ئەم

کێشـــەیە چووە و دەڵێت، دازاین"هەمیشە لەوە زیاترە، کە هەیە." لەمەش باشتر ئەوەیە بڵێین ســـنوردارکردنی ئەم بوونە مەحاڵە چونکە ســـنوردانان ڕانەبردووی [ئەم بوونە] دەکات بە بوون—لەنێو—خۆ. کەوابوو، دروســـتە، کە دەڵێین کۆتایی هۆکارێکی گەڕاوەیە و کاریگەرێتییە لە داهاتوودا. بەڵام زۆرجار هەندێک کەس لە بیریان دەچێت سادە لە واتای ئەم گوتەیە تێبگەن.

داهاتـــوو ئەو (ئێستا)یە نییە، کە هێشـــتا پەیدانەبووە. ئەگەر بەمجۆرە بێت، دەکەوینە نێو بوون—لەنێو—خـــۆوە. لەمەش خراپتر بەو ئاکامەدەگەین، کە کات دەلاقەیەکی وەســـتاو و نەگۆڕ بێت. داهاتوو ئەو بوونەیە، کە من ئێستا ئەو نیم، بەڵام دروســـت دەبێت. ئەو خاڵە بە بیردەهێنمەوە، کە گوتمان بوون—بۆ—خۆ لە بـــەردەم بوونـــدا، وەکو ئەم بوونە یان ئەوەی لە ڕابـــردوودا هەبوو، خۆی ئامادە دەکات. ئەم خۆ ئامادەکردنە [هەمانکات] هەڵهاتنە. ئەمەش مامەڵەکردنە لەگەڵ هەڵهاتن و دەرچوون بەرەو پێشـــەوە. هەڵهاتن دوو لایەنی هەیە؛ هەڵهاتنە بەرەو ئەو بوونەی، کە نییە. هەڵهاتینشە لەو بوونەی، کە هەیە. بەڵام بەرەو چ بوونێک هەڵدەکات؟

پێویستە لە بیرمان نەچێـــت، کە خۆ ئامادەکردن لەبەردەم بووندا لە پێناوی هەڵهاتنە لە کەمی. بوون—بۆ-خۆ خاوەنی کەمییە. خۆ دەرخستنی (من) دوورییە. لێرەدا واتای هەڵهاتنەکەمان، وەکو ئامادەبوون دەســـتدەکەوێت؛ هەڵهاتنە بەرەو بـــوون؛ بەرەو ئەو بوونەی، کە خاوەنی کەمییە و خۆشی ئەو کەمییەیە. داهاتوو ئـــەو کەمییەیە، کە بوون لە ئێستا و بـــوون— لەنێو—خۆ دووردەخاتەوە. ئەگەر ڕانەبـــردوو کەمیی نەبێت ئەوا دەبێت بە خاوەنی ناســـنامەیەکی نەگۆڕ. کەمییە ڕانەبـــردوو دەکات بە ڕابردوو چونکە ڕانەبـــردوو لە دەرەوەی خۆیدا و بەرەو ئەو کەمییـــەی هەیەتی خۆی دەگەیەنێتە ئـــەو دیو بوونی خۆی و جیهان. ئەو، وەکو ڕانەبردوو لەبەردم بوونێکی—لەنێو—خۆدا ئامادە دەبێت، کە نییەتی.

داهاتوو ئەو بوونەیە، کە بوون—بۆ—خۆ دەیەوێت لەوێو ببێت بە ئەو. مادامەکی بوون—بۆ—خـــۆ نایەوێت ئەو بوونە بێت، کـــە هەیە، داهاتووش هەیە. ئەو بونەی بوون—بۆ-خۆ دەیەوێت بیگاتێ بوونێکی ئێستا و لەنێو خۆی بوون—بۆ—خۆ نییە. لەم حاڵەتەدا نابێت بەوەی، کە دەیەوێ بیگاتێ. ئێمەش ناتوانین پێناســـی ئەم بوونە، وەکو کەمی بکەین، یان (کانت) گوتەنی بوون هیچ ناخاتە سەر چەمکەکەی. ئـــەم بوونە هەیە چونکە ئەو خۆی کردووە بـــەوەی هەیە. ئەو دەڕوانێتە دوور و خۆی بەوە دەبینێت، کە هێشـــتا پەیدا نەبـــووە. هاوکات، گرنگە ئەم کەمییە بە بوونی تاکە کەسی بوون— بۆ—خۆوە ببەستنەوە. ئەگینا بوون—بۆ—خۆ ناتوانێت پەیوەندییەکانـــی خـــۆی لە داهاتوودا ببینێت. بۆ ئەم بوونـــە داهاتوو بەو جۆرە خـــۆی دەردەخات لە کاتێکدا بوون— بۆ—خۆ لە کەمی خۆی بە ئاگایە و دەزانێت

ئەو بوونەیە هێشـــتا پەیدانەبووە و لەنێو ئێستادا خۆی بەرەو پرۆژەکانی داهاتوو دەبـــات. داهاتوو بەبێ ئەم ئاگاییە نییەو نابێت. ئاگاییەکەش پێویستی بە خۆ—ئاگایی هەیە؛ پێویستی بە بوون—بۆ—خۆیە ئەم ئاگاییەی لادروست بێت.

بەپێچەوانەشـــەوە، ئاگایی لـــەم ئاگاهاتنەوە دەکەوێتە ئەودیـــو ئاگاییەوە، بۆنموونـــە دەکەوێتە نێو بوونی— لەنێو—خۆوە. کەوابوو، تەنیا ئەو بوونەی خۆ—ئاگایە، ئەو بوونەی پرســـیار لەبارەی بوونی خۆیەوە دەکات، خاوەنی داهاتووە. ئەمـــەش ئەوە دەگەیەنێـــت ئەم بوونە نەبووە بـــەوەی دەیەوێت و خۆی بە هیچ [نەبـــوون] دادەنێت—بوونێکە پڕی و تـــەواوی بوونی لە خۆیەوە دوورە. پڕی ئەم بوونە لەودیو خۆیەوەیەتی. ئەوەی لەودیو ئەم بوونەوەیە داهاتووە.

ئایا "ئەو دیو" چ واتایەکی هەیە؟ بۆ تێگەیشتنمان لە واتاکەی پێویستە ئەو خاڵە ڕەچاو بکەین، کە داهاتوو لە بوونی بوون—بۆ—خۆدا خەسڵەتێکی بنەڕەتی هەیە. ئەویش ئەوەیە، کە ئامادەبوونە لەبەردەم بووندا و لە داهاتوودا. ئامادەبوونی ئەم بوونەیـــە لەبەردەم بووندا. کاتێک دەڵێم، "دەمەوێت بەختەوەر بم"، ئامادەبوونی بـــوون— بۆ—خۆیە، کە دەیەوێت بەختەوەر بێـــت. ئەزموونی ئەم بوونەیە لەگەڵ هەمـــوو ئەو بارودۆخانـــەی پیایدا تێپەڕیوە و هەمانکات بـــەرەو داهاتوو بەدوای خۆیدا ڕایاندەکێشـــێت. لە ئامادەبوونەکەیدا بەختەوەر دەبێت؛ ئامادەبوونەکەشی لە داهاتوودا ســـەرهەڵدەدات. واتـــای ئامادەبوون لەم بوونـــەدا هاوتایی لەگەڵ داهاتووشدا دەردەخات. ئەوەی لێرەدا خۆی بۆ ئاگایی بوون—بۆ—خۆ دەردەخات جیهانـــی داهاتووە بەبێ ئەوەی ئاگامەنـــدی بزانێت، کە ئەوەی خۆی دەرخستوە جیهانـــە. واتای ئەم جیهانە بە بوونی منەوە، وەکو ئامادەبوونم لەبەردەم ئەوەی، کە دەمەوێت بیگەمێ، بەســـتراوە. ئەمەیە لە کۆتایی ئامادەبوونەکەمدا و لەودیو بوون— لەنێو—خۆوە دەبێت بە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی ئەو جیهانەی من ویستومە بیگەمێ. ئەگەر بنووســـم من ئاگام لەو وشانەیە، کە نووســـراون و ئەوانەش، کە دەنوســـرێن، ئەوا وشەکان، وەکو داهاتوو دەردەکـــەون و چاوەڕوانی من دەکەن بیان نووســـم. بەڵام چاوەڕوانییان ئەوە دەگرێتەوە (نووسین)، وەکو هەڵوێستێکی خۆ—ئاگایی ئەگەرێکە لەبوونی مندا. کەوابوو، داهاتوو، وەکو ئامادەبونی بوون—بۆ—خۆ لە داهاتوودا بوون—لەنێو-خۆ بەدوای خۆیدا بەرەو داهاتوو ڕادەکێشـــێت. ئەو بوونەی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەمیدا ئامادە دەبێت بوون— لەنێو—خۆیە لەگەڵ ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆدا و ئەم بوونەشە واتای داهاتووی دەداتێ.

مادامەکـــی بوون—بۆ—خۆ دەتوانێت لـــە دەرەوەی خۆیدا لەبـــەردەم بووندا ئامادەبێت، داهاتووش هەیە. داهاتوو تەنیا داهاتووە بۆ بوون—بۆ—خۆ. لە داهاتوودا داهاتوویەکی دیاریکراو دێتە کایەوە. ئەمەش لە ئامادەبوونی ئەم بوونەدا لەو دیو بوونی خۆیەوە ســـەرهەڵدەدات. لەم خەسڵەتەی بوون—بۆ—خودا، لەودیو بوونی

خۆیـــەوە، ئەم بوونە دەبێت بەوەی دەیخوازێت. گوتەیەک هەیە دەڵێت (پێویستە بوویم بەوەی هەبووم.) ئەمە ئەوە دەگەیەنێت بەو جۆرەی من دەمەوێت ئەگەرەکان بە جیهان دەدەم. ناچارەکی لەســـەر زەمینەی پرۆژەکانی داهاتووم دەردەکەون و داهاتووم لە وێنەیەکی ئەندێشەیی جیادەکاتەوە، کە من تیایدا ئەوە نیم، کە هەم. واتای بوونم لەوێدا دەدۆزمەوە، کە هێشتا پێی نەگەیشتوم. ئەم بوون—بۆ—خۆیە یان (من) لەنێو زەمینەی ڕەتدانەوەی جیهاندا سەرهەڵدەدەم.

بەڵام داهاتوو بە تەنیا ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەودیو بوونییەوە نییە. شتێک چاوەڕوانـــی ئەم بوونە دەکات، کـــە ئەو شتە بوونی منە. کاتێک دەڵێم دەمەوێت بەختەوەربـــم، منم ڕابردووم بە دوای خۆمدا ڕادەکێشـــم و دەمەوێت بەختەوەربم. کەوابو، (مـــن) داهاتووم، لەبەردەم بووندا ڕاوەســـتاوم و دەمەوێت خۆم بەو دیو بگەیەنم. من دەمەوێت لە داهاتوودا پرۆژەی بوونم دامەزرێنم و ئەو کەمییەی هەمە لەناوی بەرم؛ بە تێهەڵکێشـــکردنم لەگەڵ ڕانەبردوومدا (من) دەکات بەوەی هەم. ئەوەی بوون—بۆ—خۆ دەخاتە بەردەم بوون و ئەودیو بوونیش ئەگەرەکانی بوونی خۆیەتـــی. داهاتوو خاڵێکی نموونەییە بۆ بەســـتنەوەی فاکتۆرەکان (ڕابردوو) و بوون—بۆ—خۆ (ڕانەبردوو) و ئەگەرەکان (داهاتوویەکی دیاریکراو و هەندەکی)، کە دەبێت بە هۆکار بۆ ســـەرهەڵدانی (خۆ)، وەکو بوونێکی— لەنێو—خۆی—بۆ—خۆ. پرۆژەکانی نێو داهاتووی بوون—بۆ—خۆ بۆ بوون—لەنێو-خۆیە. لەمڕووەوە بوون—بۆ—خۆ دەبێت ببێت بە داهاتووی خۆی چونکە دەتوانێت ببێ بە بناخەی ئەوەی لەبـــەردەم و ئەو دیوییدایە. لەمبوونەدا داهاتوو کەلەبەرێکی گەورەیە. لەبەر ئەوە بـــەو جۆرەی ئێستا هەیە ئەوە نییـــە لە داهاتوودا دەبێت. هاوکات داهاتووی ئەم بوونە دەبێت بە ڕابردوو. داهاتوویەکی دیاریکراو لە ڕابردووی بوون— بۆ—خۆدا بۆ نموونە، دوا هەڵوێستم لەنێو یاریگای تێنسدا بەستراوە بە هەموو هەڵویستەکانی دیکەمـــەوە، کە دوای ئەو دێن. دواجاریش هەموویان دەبن بە یەک جۆر زنجیرەی جوڵان. بەڵام ئەم یەکگرتنەیان ڕاستەقینە نییە و ڕوونادات.

داهاتوو ڕێگەنـــادات گرێبدرێت. ئەو دەکەوێتە نێو ڕابـــردووەوە. ڕانەبردووش دەبێت بە بناخەی نەبوون بۆ خۆی و کەمییەکانی بوون لەنێو داهاتوودا. لێرەدا، لەگەڵ هەموو ســـەرهەڵدانێکی بوون—بۆ—خۆ لە داهاتوودا گومانێکی ئۆنتۆلۆجی لەناودەچێت، "لەژێر ســـایەی ئیمپراتۆریەتدا کۆمارەکە چەند جوان بوو!" ئەگەر ڕانەبردووشـــم بە ناوەڕۆک لە داهاتـــوو بچێت، ئەوا ئەم ڕانەبردووەم نییە، کە من کردم بە پرۆژەی بوونم؛ چونکە پرۆژەکەم لە داهاتوودا بوو. لەو خاڵەدا، کە بوونم تیایدا دەبوو بە یەک و (خۆ) سەریهەڵدەدا.

ئێستا ئێمە باشتر دەتوانین پرســـیار ســـەبارەت داهاتـــوو بکەین چونکە ئەو داهاتووەی دەمەوێت بیگەمـــێ ئەگەرێکی ئامادەبوونە لەبەردەم و لەودیو بووندا.

لەم ڕووەوە داهاتوو دژوەستاوی ڕابردووە. دڵنیاین، من ڕابردووم، کە لە دەرەوەی خۆمدام. بەڵام ئەو بوونەشم، کە هەمە و بەبێ ئەوەی بتوانم نەمبێت.

بەمجۆرە پێناسی ڕابردوومان کرد و گوتمان بوونێکە لە پشت خۆیەوە. بوونی مـــن لە داهاتوودا، بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەوەیە، کە دەبم؛ سەربەســـتییەکەم لە بناخەکەیەوە ســـەرهەڵدەدات. داهاتوو واتای بوونـــی بوون—بۆ—خۆ لە ئێستاییدا بە پرۆژە دادەنێت. بەڵام ئەمەش لەپێشـــتر بوونی مـــن ناچار ناکات چونکە ئەم بوونە دەتوانێت پێویستییەکان لەناوبەرێت و بناخەی (نەبوون)ی خۆیەتی. داهاتوو تەنیا ئەوەندە بەســـەر بوون—بۆ—خۆوە کاریگەرە، کە هەڵدێ و خۆی بۆ بوونێک لـــە داهاتوودا ئامادە دەکات. ئـــەوەی لە داهاتوودا پەیدا دەبێت بوونی منە ئەگەر من سەربەسست بم و تەوانام هەبێت ببم بەوەی دەمەوێت. کەسێک ئەو پرسیارەم لێدەکـــات و دەڵیت، چی دەکەیت؟ خەریکی ئەم مافـــوری دیوارەم، تابلۆیەکە بە دیوارەکەدا هەڵدەواســـم. هەمانکات داهاتووی بوون—بۆ—خۆ خۆی چەک دەکات؛ چونکە ئەو بوون— بۆ—خۆیەی پەیدا دەبێت حوکم بەســـەر خۆیدا دەدات و ببێت بـــەو جۆرە بوونە؛ داهاتوو دەبێت بە داهاتووی ڕابردوو، کە لەپێشـــتر ئەم بوونە نەخشـــەی بۆ کێشاوە. دەبێت بەو ڕابردووەی کاریتێدەکات ببێت بەوەی دەیەوێت. واتە، بەردەوام من ئەو داهاتووەم، کە نیم. لێرەدا ئەو دوودڵییەی لەپێشتر باسمان کـــرد و لە ئاکامی ئەوەدا ســـەریهەڵدا، کە من بە تـــەواوی داهاتوو نیم، هۆکاری ئەوەیە، من ئەو بوونەم واتاکەی هەمیشـــە توشی گرفتمـــان دەکات. بێهودە ئەم بوونە بە ئەگەرەکانیەوە بەســـتراوەتەوە و لـــە دەرەوی خۆیدایە. ئەم بوونە بەبێ گرفـــت داهاتووی خۆی نییە چونکە لەنێوان ئەم بوونە و داهاتوودا نەبوون هەیە. بەکورتییەکەی، بوون—بۆ—خۆ سەربەستە. سەربەستییەکەشی بۆ بوونی سنوردارە. سەربەســـتی لەوەدایە حوکم درابێت سەربەست بیت. لەم ڕووەوە داهاتووی ڕووت نییـــە. داهاتوو نییە و تەنیا ئەگەرە. داهاتوو بە ئەگەر دانانی ئەگەرەکانە. لێرەدا واتای بوون—بۆ—خۆ گرفت ئامێزە و لەژێر دەستمان ڕادەکات.

بەو جۆرەی پێناســـی داهاتوومـــان کرد، ئەو شاتانە ناگرێتەوە، کە هێشـــتا ســـەریان هەڵنەداوە. بەدڵنیاییشەوە ئەگەرەکانی بوونم لە نهۆمی جیاوازدا هەن. نهۆمەکەشیـــان پەیوەندی بە کاتی جیهانەوەیـــە. من کۆمەڵێک ئەگەری نەبڕاوەم چونکـــە واتای بوون—بۆ—خۆ ئاســـان نییە و گرفتی لە دوایـــە. بەڵام ئەگەرێکی دیاریکـــراو لەوانەیـــە باشتر واتـــای بوون—بۆ—خۆمان بۆ دەربخـــات و لە کاتی جیهانیشـــەوە نزیکی بکاتـــەوە. بۆ نموونە، بینینی هاوڕێیەکـــم کاتژمێری دووی نیوەڕۆ، کە دوو ســـاڵە نەمبینیوە، ئەگەرێکی بوونی منە. بەڵام هێشـــتا باســـی کۆمەڵێک ئەگەری، وەکو چوون بۆ لای هاوڕێکەم بە پێ، بە پاس یان شەمەندەفەر نەکردووە. من ئەم ئەگەرانە نیم. هەروەها لەنێوان ئەم ئەگەرانەدا بۆشایی هەیە.

لـــە ڕووی زانینەوە، بۆشاییەکەیان بە لێکچونی ســـاتەکان پڕ دەبنەوە. لە ڕووی کـــردەوەوە بۆشاییەکان (ویست) پڕیاندەکاتەوە. ئەمەش هەڵبژاردنی ئەگەرەکانە؛ هەموو ئەو ئەگەرانەش دەگرنەوە، کە نابن بە ئەگەری من.

## ٢. ئۆنتۆلۆجی کات

### ئەلف. کاتی وەستاو

توێژینەوە فینۆمینۆلۆجییەکەمان بۆ سێ ڕەهەندەکانی کات یارمەتیمان دەدات بونیادێکی گشـــتی کات ببینیـــن و بزانین چۆن لایەنە کەمتـــر گرنگەکانی لەنێو ئەم بونیادەدا ســـەرهەڵدەدەن. بـــەڵام لێکۆڵینەوەکەمان لە دوو خاڵی جیاوازەوە دەســـتپێدەکات. هەندێک جار باســـکراوە، کە کات پێناس ناکرێت. بەڵام هەموو کەســـێک لەو باوەڕەدایە، پێـــش هەموو شتێک، کـــات دوابەدواییە. دوابەدوایش ئەو ڕیزکردنەیە، کە تیایدا پەیوەندی پێشـــتر و پاشتـــر دەدۆزێتەوە. ڕیزکردنی چەندبارەیـــی لەم ڕووەوە، کە پێشـــتر و پاشتری تێدایـــە دەبێت بە چەندبارەیی کاتی. کەوابوو، دەگونجێت، لە باسەکەماندا سەبارەت کات بە چەمکەکانی پێشتر و پاشتر سەرەتاکەمان دیاری بکەین. ئەمەش ناودەنێین کاتی وەستاو [ستاتیک] چونکە ئەم دوو چەمکەمان بە گۆڕانکارییەوە نەبەستۆتەوە. بەڵام کات بۆ ڕیزکردنی چەندبارەیی بە تەنیا وەســـتاو نییە. وردبوونـــەوە لە کات فاکتۆری دوابەدواییش دەردەخات. ئەوەی پاش دەکەوێت پێشیش دەکەوێت، ڕانەبردوو دەبێت بە ڕابردوو، داهاتوش بە داهاتویەکی لەپێشتر. ئەمەش دەکەین بە ناوەڕۆکی باسێکی دیکەمان بە ناوی دینامیکییەتی کات. لەبەر ڕۆشنایی ئەم جۆرە کاتەدا بەدوای نهێنی کاتی وەســـتاودا دەگەڕێین و هەوڵی ناسینی پێکهاتەکەی دەدەین. بەڵام باشترە کێشە دژوارەکەمان دابەش بکەین. لەلایەکەوە دەتوانین بونیادی کاتی وەســـتاو بە جیا دابنێین، کە کانت بە ڕیزکردن ناویدەبات. کاتی دینامیکیش بە جوڵانی ئەســـتووە دەبەســـتینەوە و زاراوەکەی کانت؛ ڕێچکەی کاتی بۆ دادەنێین. بۆ ئێمەش باشە لەپێشدا باسی کاتی وەستاو بکەین.

ڕیزکردنی "پێشتر و پاشتر" گەڕانەوەی بۆ دواوە تێدا نییە. ئێمە بەم زنجیرەیە دەڵێیـــن دوابەدوایـــی. لەبەر ئەوەی هەر یەکێک لە چەمکەکانی پێشـــتر و پاشتر بـــە جیـــا و تەنیا لە یەک کاتدا دادەنرێن و لەنێو یەکـــدا نین، هەندێک ویستویانە لەنێو ئەم چەکمانەدا فۆرمی جوداییش ببینن. لە ڕاســـتیدا کات من لە تێگەیشتن لـــە ئارەزووەکانم جیادەکاتەوە. ئەگەر من چاوەڕوانیان بم، ئەوا لەبەر ئەوەیە، کە ئارەزوەکانـــم پاش چەند ڕووداوێک ســـەرهەڵدەدەن. بەبێ دوابەدوایی 'پاشتر' من

کتوپــــڕ دەبم بەوەی دەمەوێــت؛ دووری نێوان منی ئێستا و منی دوایی نامێنێت و جیاوازییەکانی نێوان خەونەکان و کردەوەکانیشــــم ون دەبن. شاعیرەکان و ڕۆمان نوسەکان جەختیان لەسەر هێزی کات بۆ جیاکردنەوە کردوە. لەو بیرۆکەیە دەدوێن، کە لەگەڵ کاتی دینامیکییدا پەیدادەکرێت و دەڵێن هەموو 'ئێستا'یەک دەبێت بەوەی 'پێشتر' هەبوو. کات دەخوا و جیابوونەوە دروست دەکات و دەفرێت. هەروەها بە جیاکردنەوەی مرۆڤ لە ئازارەکان کات چارەسەری مرۆڤ دەکات.

پاشا بە دۆن ڕۆدیریگۆی گوت، "با کات کاری خۆت بکات." بەگشــــتی هەموو کەســــێک دوابەدوای پێشــــتر و پاشتر بە پێویست دادەنێت. تەنانەت ئەو شتەی هەمیشــــەییە، ئەم مێزە، کە لەوە زیاتر بە چی دیکە نابێت، لەگەڵ ئەو گۆڕانەی بەســــەر مندا دێت ئەویش دەبێــت خۆی لەنێو کاتدا پەرشوبــڵاو بکاتەوە. کات مــــن لە بوونی خۆم، لەوەی، کە هەم، لــــەوەی دەمەوێت بیگەمێ و لە بابەتەکان جیادەکاتەوە. کات دەبێت بە پێوەرێکی بەکردەوە بۆ دووری؛ ئەو شارە یەک کات ژمێــــر و نیو دوورە، ئەوی دیکەیان کات ژمێرێک دوورە؛ بۆ تەواوکردنی ئەم کارە ســــێ ڕۆژمان دەوێت، هتد. لەم تێڕوانینانەوە جیهان و بوونی مرۆڤ لەنێو پێشتر و پاشتردا دەتوێنەوە.

یەکــــەی ئەم توانەوەیە یان ئەتۆمی کاتیی چرکەیە[ســــاتە]، کە پێش و پاش ساتەکانی دیکە دەکەوێت بەبێ ئەوەی لەنێو خۆیدا پێشتر و پاشتری هەڵگرتبێت. ســــات لەوە زۆرتر دابەش ناکرێت. مادامەکی کاتیش دوابەدواییە ئەوا سات کاتی نییە. بەڵام جیهان لەنێو ساتە لە ژمارە بەدەرەکاندا دەتوێتەوە. هەروەها تێپەڕبوون لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە لای دێکارت کێشەیەکی دژواربوو چونکە ساتەکان لە تەنیشــــت یەکەوەن، بۆ نموونە هیچ شتێک لەنێوانیاندا نییە جیایان بکاتەوە، بەڵام هێشتا پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا نییە.

بەهەمان شێوە، پرۆســــت دەپرسێت، چۆن (خۆ)ی لە ساتێکەوە بە ساتێکی دیکــــە دەگات؟ چۆن، بۆ نموونە، پاش ئەوەی شــــەو دەخەوێت و بەیانی لەخەو هەڵدەســــتێت (خۆ)ی دوێنێی دەدۆزێتەوە؟ لەســــەرو ئەمەوە، ئەزمونگەرییەکان باوەڕیان بــــە بوونی (خۆ)یەکی بەردەوام نییە و بێهودەش هەوڵیانداوە یەکێتیەک لەنێوان ســــاتەکانی دەروون دامەزرێنن. لەم ڕووەوە، ئەو کاتەی بەمجۆرە باســــی هێزی توانەوەی کات دەکەین ناچار دەبین خۆمان لە ســــاتێکدا بەبێ بەستنەوەی بە ســــاتێکی دیکــــەوە ببینین و نەڕوانینــــە داهاتوو. کەوابــــوو، گرفتەکە لەوێدا ســــەرهەڵدەدات، بۆ نموونە، چۆن باســــی جیهان، وەکــــو زنجیرەیەک گۆڕانکاری پێکەوە بەستراو یان بەردەوامیی کات بکەین.

هێشتا کات بەتەواوی جیاکردنەوە نییە. ئەگەر بە وردی سەرنجی [چەمکەکانی] پێشــــتر و پاشتر بدەیــــن، ئەم خاڵە ئاشکرا دەبێت. گریمــــان (ئەلف) دوای (با)

دێت. لێــرەدا پەیوەندییەکمان لەنێوان ئەم دوو شتەدا دامەزراندوە و یەکێتییەک لە ڕیزکردنەکــەدا دەردەخات. تەنانەت، ئەگەر هیچ جــۆرە پەیوەندییەکی دیکە لەنێوانیانــدا نەدۆزرێتەوە ئەم ڕیزکردنە پەیوەندی نێوانیانی ســەلماندوە چونکە ڕێگە بە بیرکردنەوە دەدات لە یەکێکیانەوە بەوی دیکە بگات. کەوابوو، ئەگەر کات جیاکردنــەوە بێت، ئەوا جیاکردنەوە شتێکی دیاریکراوە، وەکو ئەو دابەشکردنەی جارێکی دیکە یەکێتییەیەکە دروستدەکات.

تاکــو ئێرە باســەکەمان چاکە، بەڵام هەندێک دەڵێن، ئــەم یەکێتییەی بووە بە پەیوەندی[نێوان ســاتەکان] دەرەکییە. شوێنکەوتوانی فێرگەی پەیوەستداری ویستیان ئەو بۆچوونە بسەلمینــن، کە پەیوەندییەکی دەرەکی ئینتباعەکانی نێو مێشــکی پێکەوە گرێداوە. ئایا ئەوان، لەدواییدا ئەو پەیوەندی و پەیوەستییەیان بە[چەمکەکانی] پێشــتر و پاشترەوە نە بەستۆتەوە؟ ئایا کانت باسینەکردوە، کە یەکێتی نێوان ئەزمونەکان و گۆڕانکارییەکانی نێو کات بۆ پەیوەستدارێتی شتێکی پێویستە؟ با وریاتر لە بیردۆزەی پەیوەستداری وردبینەوە.

ئەم بیردۆزەیە بەو چەمکەوە بەســتراوە، کــە بوون بوونە-لەنێو—خۆدا. هەر یەکێک لــە ئینتیباعەکانی نێو مێشــک شتێکە لەنێو—خۆیدا، کــە هەیە؛ لەنێو ئێستادا سەربەخۆ ڕاوەستاوە و ئاماژە بۆ کەمی یان داهاتوو ناکات. هیوم ویستی ئەم یاســایە بە ڕێگــەی ئەزموونەوە دابمەزرێنێت: هــەر ئینتیاعێک وەرگریت و لەسەری بکۆڵێتەوە دەبینیت سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندییەکی بە شتەکانی پێش و پاش خۆی نییە و ئەو پەیوەندییە نادۆزێتەوە.

ئێمە لێرەدا نموونەی ناوەڕۆکی کاتی (ئەلف) دەهێنینەوە کە بوونێکە-لەنێو—خــۆدا و ناوەڕۆکــی کاتی (با)ش پاش ئــەو دێت و بەهەمــان شێوەش هەیە؛ ئەویش خاوەنی ناســنامەیە و شتێکە لەنێو خۆیدا. ئەم ناســنامەیەش بەو جۆرە دەریاندەخات، کە هیچ کامیان لە ســاتێکدا یان بۆ هەمیشە لەخۆیان جیانابنەوە. بۆ ئەم ســاتانە حاڵەتی کتوپڕ و هەمیشــەیی وەکو یەکن چونکــە پەیوەندییە ناوەکییەکەی نێوان پێشــتر و پاشتریان کاتی نییە. لەوانەشە ئەو پرســیارەمان لێبکرێــت، چۆن لەنێو ئەم بارودۆخــەدا حاڵەتی (ئەلف) پێش (با) دەکەوێت؟ لە وەڵامدا هیچ ســودێکی نییە بڵێین ئــەوەی پێش و پاش دەکەوێت بارودۆخ نییە، بەڵکو ســاتەکانە چونکە بەگوێرەی ئەم بیردۆزەیــە جیاوازی لەنێوان بارودۆخ و ساتەکاندا نییە. ساتەکانیش، وەکو بارودۆخەکان بوون—لەنێو—خۆن. بەڵام پێش خستنی (ئەلــف) ئەوەش دەردەخات، کە (ئەلف) شتێکی تــەواو نییە و ئاماژە بۆ (با) دەکات. ئەگەر (ئەلف) پێش (با) بکەوێت ئەوا بە هۆکاری (با)وە بە شتێکی لەپێشــتر دادەنرێت. ئەگەر (با) لە سەرهەڵدان و لەناوچوونیدا بە ساتێکی جیا و دوورەپەرێز دابنرێت، هیچ جۆرە خەسڵەتێک بە (ئەلف) نابەخشێت. بەکورتییەکەی،

ئەگەر (ئەلف) پێش (با) ڕووبدات، پێویستە لە بوونیدا (با)، وەکو داهاتووی (ئەلف) هەبێــت. بەپێچەوانەشەوە، ئەگەر (با) پاش (ئەلف) ڕووبدات، ئەوا دەبێت (ئەلف) لە پاش خۆی دابنێت، کە واتای پاشتر بە (با) دەبەخشێت. ئەگەر (ئەلف) و (با) بە دوو بوونی— لەنێو—خۆی لەپێشــتر دابنێین، ئــەوا مەحاڵە پەیوەندییەکەیان لەســەر دوابەدوایی دابمەزرێنین. پەیوەندییەکە دەبێت بە پەیوەندییەکی دەرەکی ڕووت و بە ئاســمانەوە هەڵدەواســین. لە هەموو ناوەڕۆکێکی دووردەخەینەوە و بەبێ هێز بۆ ســەلماندنی یەکێک لەو دوو ساتە لەنێو دەلاقەیەکی لە کات بەدەر و هیچدا دەیچەسپێنین. ئەوەی پەیوەندی نێوان پێشتر و پاشتر دەردەخات، ئەو گەواهەیە، کە [لە ئەزمونەکەدا] دەردەکەون. بەڵام گرفتەکە لەوێدایە، ئەگەر ئەم گەواهە لــە یەک کاتدا لەنێو ڕووداوی (ئەلف) و (بــا) بێت هۆکاری ئەوەیە، کە خودی خۆی بوونەوەرێکی کاتییە یان بەپێچەوانەوە بوونێکی کاتی نییە و لەژوور کاتەوەیە. ئەمەش ڕێگەچارەیەک بوو دێکارت و کانت بۆ ئەم گرفتە دۆزیویانەتەوە و لەمە زۆرتر لەســەر ئەم کێشەیە نەدواون. بۆ ئەوان ئەوەی ڕووداوە جۆراوجۆر و فرەکــان پێکەوە گرێدەدات و یەکبوون لە نێوانیاندا پێکدەهێنێت، ئەو بوونەیە، کە خۆی لــە کاریگەرێتی کات ڕزگارکردوە. ئــەم دوو بیریارە بانگەشەی بوونی کاتێکی لەپێشــتر دەکــەن، کە دابەش دەکرێت و لەنێــو ڕووداوە فرەجۆرەکاندا دەتوێتەوە. مادامەکی یەکێتی کات لەســەر زەمینەی کات دروســت نابێت، ئەوا بوونەوەرێکــی لە کات بەدەر دەبێت بەو زەمینەیە؛ ئەوبوونەش بۆ دیکارت خوا و ئاگامەنــدی خوایە لە ئافەریدکردنی هەبووەکاندا بە بەردەوامی و بۆ کانتیش ئەو یەکێتییەیە، کە لە ئاکامی تێهەڵکێشــکردنی سەرهەڵدەدات. بۆ دێکارت، یەکێتی کات لەســەر ئەو ناوەڕۆکە دامەزراوە، کە بەردەوام لە هیچەوە ئافەرید دەکرێت؛ بۆ کانت ئەو چەمکانەی نێو تێگەیشــتنی ڕووتن، دەخرێنە سەر فۆرمی کات. لە هەردوو حاڵەتەکەدا (خوا و من) لەنێو کاتدا، وەکو دوو بوونەوەری لە کات بەدەر کات بە ڕووداوەکان دەدەین. کات دەبێت بە پەیوەندییەکی ڕووت و دەرەکی نێوان جەوهەرە لە کات بەدەرەکان.

ئاشکرایە ئەم دامەزراندنە بەرەو (کات)مان نابات. ئێمە دەبێت لەناوەوە ئەوەی لــە کات بەدەرە بگۆڕین بۆ بوونێکی کاتی. ئەگەر ئەم کارەش نەکەین ئەوەی بە کات دادەنرێت دەبێت بە شتێکی ئەندێشەیی و فۆرمێکی نێو خەونی مرۆڤ. ئەگەر کات ڕاســتەقینە بێت پێویستە خواش چاوەڕییــی "شەکرەکە بکات لەنێو ئاودا بتوێتــەوە." ئەو دەبێت لەنێو ڕابــردوو، ئێستا و داهاتوودا بێت تاکو ڕووداوەکان پێکــەوە گرێبدات. کەوابــوو، لە کات بەدەرێتی ئەو ســاختەیە و هەمانکات ئەو چەمکانــەی، وەکو نەبڕانەوەی کات دەشارێتەوە. بەڵام واتای ئەم جۆرە چەمکانە لەوێدا دەردەکەون، کە فۆرمە تێهەڵکێشکراوەکانیان لەو (خۆ)یەی بوون لەنێو خۆ

نییە جیا دەبنەوە. ئەگەر ئێمە، بۆ نموونە، زانیننی خوا لەسەر کات بەدەرێتی ئەم بوونە دابمەزرێنین، ئەوا خوا پێویستی بەوە نییە بۆ ئەوەی بزانێت شەکر لەنێو ئاودا دەتوێتەوە چاوەڕوانی شەکرەکە بکات تاکو دەتوێتەوە. لەوانەیە پێویستبوون بە چاوەڕوانی و کات بەسەربردن لەنێو ئەندێشەی مرۆڤدا هەبن چونکە مرۆڤ بوونێکی بڕاوەی هەیە. درێژخایەنی ڕووداوەکان پەیوەندی بە ئاڵۆزی هەستکردنەوە لە ڕێکەوتنی ڕووداوەکاندا هەیە، کە لۆجیکمەندانە و هەمیشەییە. ئەم بەڵگەیەش دژی بۆچوونەکەی کانت لەسەر کێشەی (من بیردەکەمەوە) بەبێ ئەوەی گۆڕانی بەسەردا بهێنین بەکاردێت. ڕەتدانەوەی ئەو خاڵە، کە گوایە کات لەبەر ئەوەی فۆرمێکی لەپێشترە دەبێت بە یەکێتی، بێهودەیە چونکە کێشەکەمان ئەوەندەی لەسەر پەیوەندی نێوان پێشتر و پاشترە لەسەر یەکێتی نییە.

دەشێ هەندێک باسی کاتێکی هێزەکی بکەن، کە یەکێتی دەیکات بە کاتێکی کردەکی. هێشتا ئەم زنجیرەیەی بە هێزەکی هەیە لەو زنجیرە ڕاستەقینەیەی لەسەری دەدوێین، کەمتر دەناسرێت. ئەو زنجیرەیە چییە، کە چاوەڕوانی یەکێتییەکە دەکات تاکو بیکات بە زنجیرە؟ ئەو زنجیرەیە بۆ کێ یان بۆ چییە؟ ئەگەر لە هیچ شوێنێکدا نەدۆزرێتەوە، چۆن بوونەوەرێکی لە کات بەدەر بەبێ ئەوەی خەسڵەتی هەمیشەبوون بدۆڕێنێت، لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرێت؟ لەسەرو ئەمەوە، لێرەدا چەمکی یەکێتی تەمومژاوییە و لە واتاکەی تێنەگەیشتوین. لەڕاستیدا ئێمە باسی دوو شتی لەنێو خۆمان کردووە، کە لە یەکدییەوە جیاوازن و هەر یەکێک لە ئەوان دەکەوێتە نێو کات و شوێنی خۆیەوە. چۆن ئێمە بتوانین پێکەوە گرێیان بدەین؟ ئایا دەتوانین یەکێتییەکی ڕاستەقینەیان بۆ دابمەزرێنین؟ لێرەدا، ئێمە یاری بە وشە دەکەین و هەرگیز ناتوانین ئەم دوو شتە جیاوازە پێکەوە ببەستین یان دەبێت یەکیتییەکی نوێ لە نێوانیاندا بدۆزینەوە، کە هەر یەکێک لەو دوولایەنە لەم یەکێتییەدا لە دەرەوەی خۆیاندا ڕادەوەستن، تاکو پێشتر و پاشتری خۆیان بسەلمێنن. ئەمەش پێویستی بەوەیە هەر یەکێک لە ئەوان خۆی، وەکو شتێکی کاتی دەربخات. ئەمەش هەردووکیان بە یەکەوە نابەستێتەوە. چۆن یەکیتییەکی لە کات بەدەری (من بیردەکەمەوە) وەکو بەشێکی سادەی بیرکردنەوە دەتوانێت یەکێتی دروستبکات؟ ئایا دەتوانین بڵێین یەکێتییەکی هێزەکییە؟ لەو دیوو هەستکردنەوە، وەکو (نۆیما)کەی هوسرڵ جۆرە یەکێتییەکمان بۆ دادەمەزرێنێت؟[٤٩] ئایا چۆن بوونەوەرێکی لە کات بەدەر بڕیار لەسەر بوونی

٤٩ نۆیما وشەیەکی یۆنانییە واتای (هەست کردن یان تێگەیشتن) دەبەخشێت، ناوەڕۆکی هەستکردنیش، کە بیرۆکەیەکە سەبارەت بابەتە هەستپێکراوەکە بە (نۆیەتا) دادەنرێت. ئەفلاتون بۆ نموونە، هەموو فۆرمە هەمەکییەکانی جیهانی بەرزی بە نۆیەتا (بیرۆکە)ی (نۆیما) تێگەیشتن داناوە. لێرەدا هوسرڵ هەموو بابەتێکی مەبەست دارێتی ئاگامەندی بە (نۆیەتا) دادەنێت و هەروەها نوێما و نۆیەتا؛ ئاگامەندی و بابەتەکەی لە یەکدی جیاناکاتەوە. (وەرگێڕ).

زنجیره دەدات؟ گریمان ناوەڕۆکی کات ئەوەیە، کە هەستی پێدەکرێت، ئایا ئەو هەستپێکراوە چۆن پێکدێت؟ کەوابوو تاکو ئەو ڕادەیەی کات فۆرمێکی جیا و تێهەڵکێشراویش بێت، لە شتێکی لە کات بەدەرەوە سەرهەڵنادات و ڕێگەش نادات بەسەر ئەوانەی لە کات بەدەرن بسەپێنرێت. لایبنیز دژی دێکارتە و برگسۆنیش دژی کانتە، لەوێدا، کەتەنیا پەیوەندییەکی ڕووتیان لەنێو ئامادەبوون و هێزی لکاندنیان بەکات داناوە.

لایبنیز لەو باوەڕەدایە گرفتی گوزەرکردن لە ڕووداوێکەوە بۆ ڕووداوێکی دیکە و لەناوچوونیشی، هەروەها ئافەریدکردنی بەردەوام گرفتێکی ساختە و چارەسەرکردنێکی بێسودیشە. بە دیدی ئەو، دێکارت لە بیری چووە باسی بەردەوامبوونی کات بکات. تێگەیشتنمان لە کات، وەکو بەردەوامی، ڕێگەمان نادات کات بە فۆرمی ساتە لە یەکدی داپچڕاوو جیاوازەکان دابنێین؛ ئەگەر ساتیش نەبێت ئەوا پەیوەندی پێشتر و پاشتری نێوان ساتەکانیش لەناودەچێت. کات بەردەوام بوونێکی بەربڵاوی ڕەوتکردنە، کە ناتوانین هیچ پێکهاتەیەکی بنەڕەتی بۆ دیاری بکەین.

لایبنیز ئەو خاڵەشی فەرامۆشکردووە، کە فۆرمی پێشتر—پاشتر لە خۆیدا جۆرێکە لە جیاکردنەوە. ئەگەر کات بەردەوامی بێت و تەوانای جیاکردنەوەشی هەبێت، ئەوا کەسێک دەتوانێت پرسیارەکەی دێکارت بگۆڕێت و بە جۆرێکی دیکە ئاراستەمانی بکات: ئایا هێزی لکاندنی بەردەوامبوون لە کوێوە پەیدا دەبێت؟ بێگومان پێکهاتەی بنەڕەتی هەیە، کە لەنێو بەردەوامییەکەدا لایەنەکان پێکەوە دەنوسێنێت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە لە سەرەتاوە جۆرە یەکێتییەک هەیە. لەبەر ئەوەیە من هێڵێکی ڕاست دەکێشم، وەکو کانت دەڵێت، ئەو هێڵە ڕاستە یەک کردەوەیە و لە زنجیرەی نەبڕاوەی خاڵەکانەوە جیاوازە. کێ کات دەکێشێت؟ بەکورتییەکەی، بەردەوامی ڕستەقینەیەکە پێویستە ئاوەڕی لێبدرێتەوە و بە چارەڕێگە دانانرێت. لێرەدا نموونەی پێناسەکەی پۆین کیرە دەهێنینەوە، کە گوایە: ئەلف و با و سین دەبێتە زنجیرەیەکی بەردەوام، ئەگەر بتوانین ئەلف = با، با = س، ئەلف÷ سین بنوسین. ئەم پێناسەیە گرنگە چونکە ئەو بوونەمان بۆ دەردەخات، کە ئەو شتە نییە ئێستا هەیە. کەوابوو، (ئەلف) لەگەڵ (سین) دا یەکسان نین. هەروەها (با) لەگەڵ (ئەلف) و (سین)دا یەکسانە، ئەوا لەگەڵ خۆیدا بەگوێرەی ئەوەی (ئەلف) و (سین) نایەکسانن ئەویش جیاوازە. بەڵام ئەم پێناسەیە، بەو شێوەیەی ئێمە لە ڕووبەڕووبەنمان لەگەڵ بوون— لەنێو—خۆدا توشمان بوو، یاریکردنە بە وشە. لەبەر ئەوەی بوونێکمان پێدەناسێنێت، کە لە یەک کاتدا هەیە و نییە. بنەڕەت و بناخەمان بۆ دەستنیشان ناکات. لە توێژینەوەکەمان لەسەر کات چاک دەزانین بەردەوامی چۆن خزمەتی کێشەکەمان

دەکات. ئەگەر لەنێوان (ئەلف) و (سین)، گرنگ نییە چەند لە یەکدییەوە نزیکیش بــن، ئێمە (بــا) دابنێین، لەم هاوکێشــەیەدا ئەلف= با، با = ســین، ئەلف ÷ ســین؛ (با) لە (ئەلف) و (سین) جیاناکرێتەوە، بەڵام (ئەلف) و (سین) دوو لایەنی جیــاوازن. لەم حاڵەتەدا (بــا) پەیوەندی پێش و پاش دەردەخــات. تاکو ئێرە باســەکەمان دروستە، ئەی چۆن ئەو بوونە هەیە؟ لەکوێوە دەرچووە؟ چۆن ئەو دابەشبوونــە ڕوونەداوە؟ چۆن نابێت بــە دوو چەمک و یەکێکیان لەنێو (ئەلف) و ئەوی دیکەیان لە (ســین)دا ناتوێتەوە؟ چییە لە بینینی یەکێتییەکەی نێوانیان بەرچاومان دەگرێت؟ ســەرنجدانێکی قووڵ لەم کێشــەیە ئاشکــرای دەکات، کە بوون—بۆ—خــۆ دەتوانێت ئامادەی یەکێتییەکەی خــودی خۆی بێت. بەڵام ئێمە هێشتا بەوقووڵییە ســەرنجمان نەداوە و هێزی پێکەوەلکاندنی کاتیش بۆ لایبنیز بووە بە یەکێتی و ناسنامەیەکی ڕەهای لۆجیکی. ئەگەر کات بەردەوامی تێدابێت، نابێت ئەو بەردەوامییە بە ناسنامە دابنرێت چونکە بەردەوامی ناسنامە نییە.

بەهەمانشــێوە، برگسۆن لەگەڵ چەمکی بەردەوامییــدا پێکهاتە و فرەلایەنی ڕاڤەکردنــدا ئــەوە دەرناخات، کــە پێکهاتەی فرەلایەنەکــان پێویستی بە کاری پێکهێنان هەیە. ئەو بە ســەرکوتکردنی ساتەکان لە دێکارت دروستر بۆ کێشەکە چــوە؛ هێشــتا بۆچوونەکــەی کانت لەوێدا، کــە ڕەتی تێهەڵکێشــە دەداتەوە، لەوەی برگسۆن دروســترە. بەو شێوەی بروگسۆن باســی ڕابردوو دەکات و لەنێو ڕانەبردوودا دەیتوێنێتەوە بێجگە لە گوتارێکی ڕووت چی دیکە نییە. ئەو گرفتانەش دەردەخات ئەم بیریارە لە بیردۆزەکەیدا لەســەر یادکردنەوە توشی بووە. ئەگەر ڕابــردوو، بەو جــۆرەی برگسۆن ئاماژەی بۆ دەکات، چــالاک و بزێو نەبێت، ئەو بوونەی ئێستاش ئاوەڕ لە رابردوو نەداتەوە، ڕابردوو لەودیو ئێستاوە دەمێنێتەوە و هەرگیــز بۆ نێــو ڕانەبردوو ناگەڕێتــەوە. بێگومان، بۆ برگســۆن ئەو بوونەی بەردەوام بەنێو ســاتەکاندا تێدەپەڕێت یەک بوونە. بەڵام ئەم بۆچوونە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەکی ئۆنتۆلۆجی هەیە. ئێمە نازانین ئەوەی بەردەوام دەمێنێتەوە خودی بوونە یان خودی بەردەوامی. ئەگەر بەردەوامیش بە بوون دابنرێت پێویستە برگسۆن بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونە باســبکات؛ ئەگەر بەپێچەوانەشەوە بێت، ئەوەی بەردەوام دەمێنێتەوە جۆرێک بێت لە بوون، ئەوا دەبێت بزانین چ شتێک بەردەوامی بەو بوونە دەدات.

ئایا ئاکامی ئەم توێژینەوەیەمان چییە؟ یەکەم، ئەوەیە، کە کات هێزی توانەوەیە، بــەڵام ئەو هێزە لە ناوەندی یەکبوونەکەدایە؛ کەمتریش، وەکو ڕاســتەقینەیەکی فرەلایەنی بەبێ یەکێتی خــۆی دەردەخات. ئێمە نابێت ئەم دوولایەنە لە یەکدی جیابکەینەوە. ئەگەر بە تەنیا ئاوەڕ لە یەکێتی کات بدەینەوە زنجیرەی ساتەکانی نابینیــن و ئاوەڕدانەوەش لە زنجیرەی ســاتەکان یەکێتییەکــەی دەشارێتەوە و

ناتوانین یەک کات ببینین. ئەگەر یەکێتی پێش فرەلایەنی نەکەوێت یان فرەلایەنی پێش یەکێتـــی دانەنرێت، دەبێت لەو باوەڕەدا بین کات، وەکو یەکێتییەک، خۆی دابەشدەکات و فرەلایەنی خۆی دەهێنێتەکایەوە؛ لێرەدا کات دەبێت بە پەیوەندی بوونێـــک بە خودی خۆیـــەوە. بوونی نابێت بە نێوانێکـــی دراو چونکە ئەمە ئەو خاڵـــە ڕەتدەکاتەوە، کە کات فرەلایەنەکانی خۆی پێکدەهێنێت. کات شتێک نییە هەبێت. ئەوەی هەیە بوونێکە، کە لە بونیادیدا کات، وەکو یەکێتی ئەو بوونە خۆی دەردەخات. واتای لەپێشتر و پاشتر لە پەیوەندی ناوەکییدا دەردەکەوێت؛ لەوێدا بوونێـــک هەبێت پێش خۆی بکەوێت. ئەمـــەش ئەوە دەگەیەنێت، کە کات ئاماژە بـــۆ شێوازێکی بوون دەکات، کـــە ئەو بوونە لە دەرەوەی خۆیدایە. کات پێویستە بونیـــادی (خۆ)ی هەبێت. لەبەر ئەوەی (خۆ) دەتوانێت لە دەرەوەی خۆیدا پێش یان پاش بکەوێت، لەپێشتر و پاشتریش بەگشتی هەن. کات بونیادێکی لەپێشتری ئەو بوونەیە، کە دەبێت بە بناخە بۆ بوونی خۆی؛ ئەو بوونەی بۆ—خۆیە. ئەمەش ئـــەوە ناگەیەنێت، کە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونە پێش کات دەکەوێت. بەڵکو کات بوونی بوون—بۆ—خۆیە چونکە بوون بۆ خۆ ئەو بوونەیە لە دەرەوەی خۆیدا. کات نییە، ئەوەی هەیە بوون— بۆ-خۆیە، کە بوونێکی کاتی هەیە.

توێژینەوە فینۆمینۆلۆجییەکەمان لەسەر ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو دەیسەلمێنێت، کە بوون—بۆ—خۆ بەبێ شێوازی بوونێکی کاتی نییە و نابێت. بوون—بۆ—خۆ لەنێو بوونـــدا، وەکو لەناوبەری بوون—لەنێو—خۆ ســـەرهەڵدەدات و پێکهاتەکانی خۆی لەنێـــو ڕەهەندەکانی لەناوچوندا دەدۆزێتەوە. لەهـــەر گۆشەنیگایەکەوە تەماشای بکرێت، بەو بوونە دەبینرێت، کە بە دەزوویەک خۆی ڕاگرتوە یان باشتروایە بڵێین، ئەو بوونەیە، کە دەبێتە هۆکاری هەموو ڕەهەندەکانی لەناوچونی خۆی. لە کۆندا پێکـــەوە ژیان و لێکدابڕانی گەلی جولەکەیان بەو شێـــوازی بوونە دادەنا، کە بە "پەرت و بڵاوبوونەوە" ناوزەدکرا. ئەو زاراوەیە یارمەتیمان دەدات لە واتای بوونی بوون—بۆ—خۆ تێبگەین. بوون—لەنێو—خۆ یەک جۆر ڕەهەندی بوونی هەیە، بەڵام دیاردەی دروستکراوی نەبوون لە ناخی بووندا بونیادی بوونی (خۆ) ئاڵۆز دەکات. لە دواییدا باســـیدەکەین چۆن تێڕامان، بەرزێتی، بوون—لەنێو—جیهاندا و بوون—بۆ—کەسانی دیکە دەبن بە ڕەهەندەکانی لەناوچون یان چۆن دەبن بە جۆرەکانی پەیوەندی نێوان (خۆ) و بوون.

کەوابوو، نەبوون فرەلایەنییەکی ناڕاست دەهێنێتە ناخی بوونەوە. ئەم فرەلایەنە ناڕاســـتەش دەبێت بە بناخەی هەموو فرەلایەنییەکـــی ڕۆژانە، چونکە فرەلایەنی لەســـەر زەمینەی یەکێتییەکی لەپێشـــتر دادەمەزرێت. لەم ڕووەوە میەرسۆن بە هەڵە بۆ کێشەکە چووە.[ئەم زانایە] لەو باوەڕەدایە فرەلایەنی ئابڕوبردنە و ئەوەی ئابڕوش دەبات ئەوەیە، کە هەیە و ڕاســـتەقینەیە. بـــوون— لەنێو—خۆ فرەلایەن

نییە؛ جۆراو جۆر نییە. بۆ ئەوەی ئەم بوونە فرەلایەنی لەنێو خۆیدا دەربخات ئەوا پێویستە بوونێک لەبەردەمییدا و لە ئاستی هەر یەکێک لەو لایەنە جۆراوجۆرانەیدا قوت ببێتەوە. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لایەنی جۆراوجۆری ئەو بوونە دەهێنێتە ناو جیهانەوە. فرەلایەنی ناڕاســـتی بوون—لەنێو—خۆیە و دببێتە هۆکاری سەرهەڵدانی ژمارە لەنێو جیهاندا.

ئایا ئەو فرەلایەنە ناڕاســـتانە بۆ بوون—بۆ—خۆ چ واتایەک دەبەخشن؟ ئەوانە جۆرەکانـــی پەیوەندیـــن لەگەڵ بوونی ئـــەودا. ئەو کاتەی شتێـــک، بەو جۆرەی دەردەکەوێت هەیە یـــەک شێوازی بوونی خۆی دەردەخات. لە کاتێکدا ئەو بوونە دەگۆڕێت و وەکو خۆی نامێنێتەوە، کتوپڕ جۆری جیاوازی بوون ســـەرهەڵدەدەن. بوون—بۆ-خۆ، بەو جۆرەی لە خۆیەوە دەردەچێت، دەتوانێت ئەم ســـێ لایەنەمان بۆ دابمەزرێنێت:

(۱) ئـــەوە نییـــە، کە هەیە. (۲) ئەوەیـــە، کە نییە. (۳) ئـــەوە نییە، کە هەیە و ئەوەشە، کە نییە. لێرەدا، ئێمە مامەڵە لەگەڵ سێ جۆر دەرچوونی ئەم بوونە لە خۆیەوە دەکەین. هیچ ئاگامەندییەک نادۆزینەوە خاوەنی ئەم سێ ڕەهەندە نەبێت. ئەگەر کۆجیتۆ یەکێک لەم سێ لایەنە زووتر لە لایەنەکانی دیکە بدۆزێتەوە، ئەوە ناگەیەنێـــت ئەو لایەنەی دۆزراوەتەوە لەلایەنەکانی دیکە لەپێشـــترە. بەڵکو، ئەو لایەنە ســـەربەخۆ دەردەکەوێت و هەمانکات دوو لایەنەکەی دیکەش لەگەڵ خۆیدا بەرجەستە دەکات. بوون—بۆ—خۆ ئەو جۆرە بوونەیە، کە دەست و برد بە هەموو لایـــەن و ڕەهەندەکانییەوە بوونی خۆی دەخاتەگـــەر. لێرەدا، ئەو دوورییەی لەم بوونەدا دەبینرێت دوورییە لە بوونی خۆیەوە و شتێکی ڕاســـتەقینە نییە. شتێکە نییە؛ جیابوونەوە و نەبوونێکی دروستکراوە. هەر یەکێک لە ڕەهەندەکان پرۆژەی بێهودەی ئەم بوونەیە بەرەو (خۆ)ی. لێرەدا باســـی هەر یەکێک لەو سێ ڕەهەندە بە جیا دەکەین.

لە ڕەهەندی یەکەمدا بوون—بۆ—خۆ لەودیو بوونی خۆیەوە دەبێت بە خۆی. بوونی ئەو لەوێدایە، بەرانبەرخۆی. نەبوونیش ئەم و ئەو بوونەی لە یەکدی جیادەکاتەوە. ئەو نەبوونەش فاکتۆرەکانی ئەم بوونەیە. بوون—بۆ—خۆ، وەکو بنەڕەتی نەبوونییەکەی خۆی لە ڕووداوەکانی بوونی جیایە؛ ناتوانێت بە تەواوی لەناویانبەرێت یان لەگەڵیاندا بێـــت. ئەو بوون—بۆ—خۆیە، بەڵام لە شێوازی بوونێکی بێچارە و سوپاســـگوزاردا دەژی. بوون—بۆ—خـــۆ، وەکو بوونێک خۆی دەبینێت و لە خۆیەوە دوورە. ئەمەش لـــە کایەی تێڕامانی—تێرامان دەچێت، کە دەخزێتە نێو بوون—لەنێو—خۆوە و هیچ تێڕامانێک نامێنێتەوە بە تێڕامان هەستێت. ئەو بابەتە لەنێو تێڕامانی ڕووتدا پەیدا ناکرێت. لەو پەیوەندییەدایە ئەم بوونە لەگەڵییدا دروســـتیدەکات. بوون— بۆ—خۆ بوونی ئەو بوونەش دانامەزرێنێت، بەڵکو پێی دەدرێت.

لێرەدا، ئێمە مامەڵە لەگەڵ ئەو پێویستییەدا دەکەین، کە هیچ مەرجێک لەبەردەم خۆیدا دانانێت: گرنــگ نییە بە چ شێوەیەک بیر لە بوون—بۆ-خۆ بکەینەوە، ئەو بوونێکە هەرگیز ئەوە نییە، کە ئێستا هەیە. ئەوەی هەیە دەکەوێتە پشت بوونی ئەوەوە و ئەویش بەردەوام ڕەتیدەکات. ڕابردووش بەم ڕەتکردنە ســـەرهەڵدەدات. کەوابوو، ڕابردوو بونیادێکی پێویستی ئەم بوونەیە. بوون— بۆ—خۆ ئەو ڕەتکردن و لەناوبردنەیە و ئەو واتایەش دەبەخشێت، کە لە ڕەتکردنەکەیدا شتێک ڕەتدەکات. لە ئاکامدا، ئێمە ناتوانین ئەم بوونە بە شێوەیەک ببینین، کە هێشتا نەبووە بەو ڕابردووەی باسیدەکەین. پێویست ناکات باوەڕ بەوە بکەین ئەم بوونە هەیە و بەبێ ڕابردوو لەنێو جیهاندا دەژی. لە هەموو ڕوویەکەوە شتێکی نوێیە و دوایی ڕابردوو بۆ خۆی دادەمەزرێنێت. ئەو بە هەر جۆرێک بژی پەیوەندی بە ڕابردوویەوە هەیە. هیچ ســـەرەتایەکی ڕەهای بێ ڕابردوو نییـــە. مادامەکی بوون—بۆ—خۆ دەبێت بە ڕابردووی خۆی، ئەوا بە ڕابردووەوە دێتە جیهانەوە.

ئەم ڕوونکردنەوەیە ڕۆشنایی دەخاتە ســـەر لە دایکبوونی ئەم بوونە. ڕاســـتی ســـەرهەڵدانی ئاگامەندی لە لەشی کۆرپەدا دوای قۆناغێکی [گەشەکردنی لەشی] دەمانهەژێنێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، لەپێشـــتر ئەو کۆرپەیە بێ ئاگابووە و کتوپڕیش ئاگامەندی بەبێ ئەوەی هیچ ڕابردوویەکی هەبێت لەنێویدا گیریخواردوە. هەژاندنەکەش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا، کە گوایە هیچ ئاگاییەک بەبێ ڕابردوو نییە، نامێنێت. با واتێنەگەین مەبەســـتمان ئەوەیە هەموو ئاگامەندییەک لەپێش خۆیدا ئاگامەندییەکی دیکەی چەق وەســـتاوی هەیە. پەیوەندی بوون—بۆ—خۆی ئێستا لەگەڵ خۆیدا دەبێت بە بوون— لەنێو—خۆ. هەروەها پەیوەندییە سەرەتاییەکەش بـــە ڕابردووەوە لە ئێمە دەشارێتەوە، کە پەیوەندییە لەنێوان ئەم بوونە و بوون— لەنێو—خۆی ڕووتدا. لەڕاســـتیدا، پەیدابوونی بوون—بۆ—خۆ لەنێو جیهاندا، وەکو لەناوبردنی بوون— لەنێو—خۆیە. لەم پەیدابوونەدا ڕانەبردووش ســـەرهەڵدەدات. ئەوەی دەبێت بە بنەمای ئەم بوونە پەیوەندییەکەیەتی لەگەڵ ئەو بوونەی ئاگامەند نییە و لەنێو شەوی تاریکی ناســـنامەکەیدا چەقیـــوە. بوون—بۆ-خۆ، کە هەرگیز نابێت بەو بوونە[بێ ئاگایە] لەبەردەمییدا بوونێکی نوێی هەیە. بەڵام هەســـت بە هاوکاریکردن لەگەڵییدا دەکات و ئەمەش بە وشەی (لەپێش) دەردەبڕێت. بوون— لەنێو—خۆ ئەو بوونەیە، کە بوون—بۆ—خۆی لەپێشـــە. لەم ڕووەوە، ئێمە ڕابردوو بە دەزوویەکی باریکەوە دەبەســـتینەوە و دەبێت بە ڕاستەقینە. ئەگەر ئاگامەندی بەبـــێ ڕابردوو بێتە جیهانەوە و لەنێو هەنگاونانە نادیارەکانی پێشـــکەوتنەکەیدا بەردەوام بێت چونکە ئەو منداڵەی لەنێو ســـکدا بوو من بووم، جۆرە سنورێک بۆ یادەوەریم دروستدەکات. بەڵام لە ڕووی بیردۆزەییەوە ڕابردووم سنوردار ناکات.

لەدایکبوون گرفتێکـــی مێتافیزیکی لەگەڵ خۆیـــدا دەهێنێتەکایەوە. جێگەی

سەرسوڕمانە من لەو کۆڕپەیەوە پەیدا بووم، کە لەنێو سکدا دروستبووە.
دۆزینەوەی چارەسەریش بۆ ئەم گرفتە مەحاڵە. بەڵام ئەمە گرفتێکی ئۆنتۆلۆجیی نییە. ئێمە پرسیار سەبارەت بوونی ئاگامەندی ناکەین چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی ئاگامەندییدا بوون—لەنێو—خۆ لەناودەچێت. لەدایکبوون، وەکو پەیوەندی بەستن لەگـــەڵ بوون—لەنێو—خۆدا ، وەکو بوونێک، کە هێشـــتا نەبـــوە بەوەی هەیە و مەرجێکی لەپێشتریش بۆ ڕابردوو دەبێت بە یاسا بۆ بوونی بوون— بۆ- خۆ.
بۆ ئەوەی بوون—بۆ— خۆ هەبێت پێویستە لەدایک بێت. بەڵام پێویست ناکات ئەو پرســـیارە میتافیزیکییە ســـەبارەت پەیدابوونی ئەم بوونە لە بوون— لەنێو—خـــۆ بکەین و بڵێین چۆن بوون— لەنێو— خۆ لەپێـــش لەدایکبوونی بوون— بۆ-خـــۆ هەبوو؟ چۆن بوون— بۆ—خۆ لـــە بوون—بۆ—خۆیەکی دیکەوە پەیدانەبووە؟ هەموو ئەم پرســـیارانە ناتوانین ئەو ڕاستییە دەرخەن، کە ڕابردوو لەگەڵ بوونی بوون—بۆ—خۆ پەیدا دەبێت.
ئەگەر (لەپێشـــتر) هەبێت ئەوا لەبەر بوونی بوون—بۆ—خۆیە، کە هاتۆتە نێو جیهانـــەوە و ڕابردووش ئەو دایمەزراندووە. بەبێ بوون—بۆ—خۆ جیهان دەبێت بە ڕووداوە لـــە یەک دابڕاوەکان. بوون—بۆ—خۆ بە یەکەییاننەوە گرێدەدات و لەگەڵ خۆشیدا (لەپێشتر) دەهێنێتە جیهانەوە و ڕابردوو دادەمەزرێنێت.
کەوابوو، بوون—بۆ—خۆ لە جیهاندا لە دایک دەبێت و لەو بوونە-لەنێو- خۆیەوەی لێوەی پەیدا دەبێت لە ناوەڕاســـتی جیهاندایە؛ لەگەڵ ڕابردوودا هاوســـەردەمە و پێش لەدیکبوونیـــش هیچ شتێکی نەبووە. هەروەها، بوون—بۆ—خۆ (لەپێشـــتر) دەهێنێتەکایەوە و لەنێو یەکێتی بوونیدا ئێستا و ڕابردووی دیاریدەکات. هیچ کاتێکی گەردوونـــی نییە ئەم بوونە لەنێویدا بۆ یەکەمجار بەبێ ڕابردوو ســـەریهەڵدابێت. بەڵکو، لەگەڵ لەدایکبووندا، وەکو یاســـایەک بـــۆ بوون—بۆ—خۆ جیهان و کاتی گەردوونی، ئەو کاتەی دەتوانین تیایدا ئەو ســـاتە دیاریبکەین، کە بوون-بۆ—خۆ لێرە نەبووە و پەیدابووە، خۆیان دردەخەن. لەدایکبوون پەیوەندبەســـتی تەواوە بە ڕابردووەوە. ڕابردوو بە لەدایکبوون دێتە جیهانەوە. لەدواییدا زۆرتر باسی ئەم کێشەیە دەکەین و جارێکی دیکە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.
ڕابـــردوو، وەکو بوونێکی نەگۆڕی من و بەبێ ئەگەرەکانی ژیان لەنێو یەکێتیی تێڕامانـــی ڕووتدا[تێڕامانـــی تێڕامـــان] نییە و لـــە دەرەوەیدایـــە. هەروەها، بەو جـــۆرەش نییە، بۆ نموونە، دەڵێین ئەو کورســـییەی هەســـتپێکراوە ئەوەیە، کە ئاگامەندییەک هەیە هەستیپێکردبێت. لە حاڵەتی هەستکردن بە کورسییەکە ئێمە ئەوە دەســـەلمێنین، کە کورسییەکە وەکو شتێکی جیاواز لە ئاگامەندییەوە هەیە. بوون—بۆ—خۆ کورســـییەکە نییە. بوون بە نەبوونی کورســـییەکە لە ئاگامەندی ئەم بوونەدایە. لێرەدا دەتوانین گەواهیـــش بۆ (نەبوون—بەو) شتە پەیدا بکەین.

کەوابــوو، ڕەتدانەوە ئاشکرا دەردەکەوێت و دەبێت بــە بنەمای پەیوەندییەکەی نێوان بابەتە هەستپێکراوەکە و بوون— بۆ—خۆ.

بێجگە لەم نەبوونە، کە ڕەتدانەوەی بابەتە هەستپێکراوەکەیە، بوون— بۆ—خۆ چی دیکە نییە. هەرچەندە ڕابردوو لە دەرەوەدایە، هێشــتا پەیوەندییەکە دەبێت جیاواز تەماشای بکرێت چونکە بوون—بۆ—خۆ خۆی دەکات بەو ڕابردووە. لەبەرئەمە ڕابردوو نابێت بە بابەت چونکە ئێمە دەبین بەوەی هێشــتا پێی نەگەیشتوین. لە هەســتکردندا بوون—بۆ—خۆ بۆی دەردەکەوێت، کە ئەو بابەتە هەســتپێکراوەکە نییــە. ئەو کاتەی ڕابردووی دەردەخات ناتوانێت خــۆی لێجیابکاتەوە و بڵێ من ڕابــردوو نیم، تەنیا خــۆ جیاکردنەوەیەکی ئەم بوونە لەگــەڵ ڕابردوو ییدا لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە ئەم بوونە هەمانکات نەبوونیشە.

ڕابردوو بابەت نییە و لەنێو بوون— بۆ—خۆشدا نییە: لەو ساتەشەوە بوون—بۆ —خۆ دەڵێت، من ئەو یان ئەم شتە نیم، دەبێت بە دێوەزمەی ئەم بوونە. ڕابردوو ئەو حاڵەتەی بوونە، کە بوون بۆ خۆ ناتوانێت ڕەتی بداتەوە یان بیسەلمێنێت.

بەدڵنیاییەوە، ڕابردوو دەبێت بۆ بابەت بۆ من و هەندێک جاریش دەتوانم بیری لێبکەمــەوە. لەم حاڵەتەدا ڕابردوو دەبێــت بە بابەتی لێکۆڵینەوە و لە دەرەوەی بوونی بوون—بۆ—خــۆدا [بۆ لێکۆڵینەوەکە] دادەنرێــت. هەروەها ڕابردوو نابێت بەوەی بەجێمهێشــتوە و بەردەوام، وەکو ڕابردووش دەمێنێتەوە، بەڵام من دەبم بەو بوونەی ڕابردوو نیم. لە سەرەتادا من بەبێ ئەوەی بزانم ڕابردووی خۆم بووم، دووایی هەســتم بە ڕابردووی خۆم کرد. بەڵام من ئەو ڕابردووە نەبووم. لەوانەیە هەندێک ئەو پرسیارە بکەن چۆن من بێ بیرکردنەوە دەتوانم ببم بە ڕابردوو. هێشتا ڕابــردوو بەردەوام هەیە. من کردوومە بە بابەتی توێژینەوەکەم و دەتوانم بیبینم. ڕابردوو بنەڕەتی کردەوەکانمە و بوونی منە، وەکو تاکە کەس. بەکورتی، ڕابردوو پەیوەندییەکــی هەڵکەوتوە لەنێوان من و جیهاندا، کە من بەردەوام دەمەوێت ئەو نەبم. زانا دەروونناســەکان بەمە دەڵێن، زانینی ئەزموونی و سایکۆلۆجییانە و لە واتاکەی دەکۆڵنەوە. زانینی ئەزموونی لە هەموو شوێنێکدا هەموو شتێک تەنانەت یادەوەریش سنوردار دەکات. یادەوەری پێویستی بە زانینی لەپێشترە.

لــە ڕەهەندێکی دیکەی لەناوچوونــدا بوون—بۆ-خۆ بوونــی خۆی، بە کەمی دەبینێــت. ئــەو کەمییەیە، کە دەبێت بە ئەوەی هەیە. مەبەســت لە خواردنەوە تەواوکردنــی خواردنەوەکە نییە. من ئەو شتــەم، کە لەودیو خواردنەوەکەم. ئەو کاتــەی "خواردنەوەکە تــەواو دەبێت" و من خواردوومەتەوە: ئــەوەی ڕوویداوە دبێت بــە ڕابردوو. بەڵام لە کاتــی خواردنەوەکەدا من ئــەو خواردنەوەیەم، کە هەیە و هەروەها نییە. هەموو ئەو دامەزراندنانەی دەبن بە من و ناســنامەیەک بۆ مــن دادەنێن ڕوو لە ڕابردوو دەکەن. ئەگــەر لە (ئێستا)ی بوونی مندا بن لەبەر

ئەوەیە، کە بەشێکیان هێشتا ڕووی نەداوە. منیش وا دەردەخات، کە هێشتا ئەو لایەنـــەی خۆمم دانەمەزرانبێت. ئەو لایەنەی هێشـــتا نەبووە پەیوەندی بە کەمی و سەربەســـتی بوون—بۆ—خۆوە هەیە. ئەمەش تەنیا ئەوە ناگەیەنێت بوونی ئەو شتێکی دوورە و پێی نەگەیشتووە، بەڵکو ئەو بوونە کەمە و پڕ نییە.

کەوابوو، ئەم بوونە لە ڕوانگەی ئەو لەناوچوونەیەوە پێش بوونی خۆی دەکەوێت و ئێستاش لەپشـــت خۆیەوەیەتی. ئەو لەپێش و لەپشت خۆیەتی و هەرگیز خۆی نییە. ئەمانە واتای ڕابردوو هەوەها داهاتوو بەم بوونە دەبەخشـــن. لەبەرئەمەش خودی بەها بە ســـروشت لەنێو کاتدا نییە. ئەو نەمرییەی مرۆڤ دەیەوێت بیگاتێ نەبڕانەوە لەنێو کاتدا یان ڕاکردن بەدوای خودی خۆیدا نییە، کە لێی بەرپرســـە. مرۆڤ دەیەوێت بە ئارامی بژی و بەتەواوی خۆی بێت.

دواجـــار لە ڕەهەندی ســـێیەمدا، بوون—بۆ—خۆ لەنێـــو کایەیەکی بەردەوامی تێڕاماندا پەرش و بڵاو دەبێتەوە، لە دەست یەکجۆر یەکێتیی بوونی خۆی ڕادەکات. لێرەدا بوون دەبێت بەوەی لە هەموو شوێنێکدا هەیە و لە هیچ شوێنێکیشدا نییە. ئەگـــەر بتەوێت بیگریت لە هەموو شوێنێکدا لەبەر دەســـتدایە و کەچی هێشـــتا ناگیرێت. ئەم جۆرە یارییەی کورسی و مۆسیقایە، لە بوونی بوون—بۆ—خۆدا بووە بـــە ئامادەبوون لە بووندا. بوون—بۆ—خۆ بوونـــی خۆی بە نێو ڕابردوو، ئێستا و داهاتـــوودا پەرش و بڵاو دەکاتەوە و دەیەوێت بوونی خۆی ڕەتبکات. هیچ یەکێک لەم سێ ڕەهەندەی کات لەوانی دیکە لەپێشتر نییە و بەبێ ڕەهەندەکانی دیکەش نابێـــت. لەگەڵ ئەمەشـــدا، باشترە گرنگی بە ڕابردوو نـــەک داهاتوو بەو جۆرەی هایدیگـــەر بۆی چووە، بدرێت. لە ڕانەبردوودا بوون—بۆ—خۆ تێدەگات، کە بوونی ئـــەو ڕابردووی خۆیەتـــی و دەبێت بوونی خۆشی ڕەتبکـــات. ئەو تێدەگات چۆن کەمیی بووە بە دێوەزمەی بوونی و ڕوو لە داهاتوو دەکات. مەبەستمان ئەوە نییە، کە "ڕانەبـــردوو" ئۆنتۆلۆجییانە ڕەهەندێکی لەپێشـــترە. چۆن دوو ڕەهەندەکەی دیکە لەســـەر ڕانەبردوو ڕادەوەســـتن ئەمیش بە هەمان شێـــوە پەیوەندی لەگەڵ ئەو دوو ڕەهەندەدا هەیە. بـــەڵام قاڵبێکی نەبووی پێویستە بۆ فۆرمێکی تەواوی تێهەڵکێشـــراوی کات. کەوابوو، مەبەســـتمان لە کات ئەو فۆرمە گەردوونییە نییە هەموو بوونەوەرێکی تێدابێت. ئەو یاســـا ســـەپێنراوەش نییە لە دەرەوەی بووندا دانرابێـــت. بوونیش نییە، بەڵکو بونیادی ناوەوەی بوونێکە، کە خۆی لەناودەبات یان شێوازی بوونی بوون—بۆ—خۆیە. بوون— بۆ—خۆ ئەو بوونەیە، کە لەنێو کاتدا پەرتوبڵاو بۆتەوە.

## با . دینامیکیەتی کات

ســـەرهەڵدانی بوون—بۆ—خۆ لەنێو ڕەهەندەکانی کاتـــدا گرفتی بەردەوامیمان بۆ چارەســـەر ناکات. ئەم گرفتە پەیوەندی بـــە دینامیکییەتی کاتەوە هەیە. لە ســـەرەتاوە گرفتەکـــە وادەردەکەوێت دوو لایەنی هەبێت. بۆچی گۆڕان بە ســـەر بوون—بۆ—خۆ دێت و دەبێت بە ڕابردوو؟ هەروەها بۆچی بوون—بۆ—خۆیەکی نوێ لە هیچەوە سەرهەڵدەدات و دەبێت بە ڕانەبردووی ئەو ڕابردووە؟

ئـــەم گرفتە بـــۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر نـــاوی بوون— لەنێو- خـــۆدا واتاکەی شارابووەوە. لەڕاســـتیدا واتـــای گۆڕانی بەردەوامی لـــە ڕەتدانەوەکەی کانت بۆ بۆچوونە ئایدیالیستییەکەی بارکلی و بەڵگەکەی لایبنیزدا دەردەکەوێت.

ئەگەر ئێمە بەردەوامی بۆ بوونێکی لە کات بەدەر دابنێین ئەوا کات دەبێت بە پێوەری گۆڕانەکان و بەبێ گۆڕانەکان، ناتوانرێت بیر لە کات بکرێتەوە. بۆ لایبنیز گۆڕان لۆجیکمەندانە بووە بە پەیوەندی نێوان پێشـــەکی و ئاکامەکان. لەبەرئەمە کاتێکی ڕاستەقینە نییە.

ئـــەم چەمکە بۆ چەند هەڵەیەک دەگەڕێتەوە. لەســـەرو هەموویانەوە، ئەوەی دەبێت بە بناغەی بەردەوامییەکە پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە گۆڕانەکان دەبینێت و هەروەها خۆشی لەگەڵ ئەوەی دەگۆڕێ و بەردەوامیش دەمێنێتەوە یەکدەگرێ. یەکگرتن گۆڕان و بەردەوامی بۆ سەرهەڵدانی گۆڕان شتێکی پێویستە.

بـــەڵام ئەم چەمکـــی یەکگرتنەی لایبنیز و کانتیش بەکاریـــان هێناوە، لێرەدا واتاکەی خۆی [بە ئێمە] نادات. ئایا ئەم یەکگرتنە چ واتایەکی هەیە؟ ئایا شتێکی دەرەکییـــە؟ کەوابوو، واتـــای نییە. لەوانەیە واتای بوون ببەخشـــێت. بەڵام ئەم واتایەی بوون ئەوەش دەگەیەنێت، کە ئەو شتەی بەردەام دەمێنێتەوە گۆڕانیشی بەســـەردا دێت. لـــەم ڕووەوە یەکگرتنەکە ئاماژە بۆ هەڵچوونـــی بوون— بۆ—خۆ دەکـــات چونکە بوون—بۆ—خۆ ئەو بوونەیە لەخۆیەوە دەردەچێت. یەکگرتن ڕێگە بە بەردەوامی و گۆڕان نادات ببن بە بوون—لەنێو—خۆ.

ئـــەو خاڵەی لێرەدا باســـمان نەکردوە، ئەوەیە، کـــە بەردەوامی و گۆڕان ئەو دیاردانەن بوونێکی پەیوەندیداریـــان هەیە؛ بوون—لەنێو—خۆ، وەکو نۆمینە دژی دیاردەکان ڕاناوەستێت[٥٠] تەنانەت پەیوەندیش لەنێوان دیاردەکان دەگەڕێتەوە بۆ

---

٥٠ نۆمینە وشەیەکی لاتینییە بۆ ئەو بوونە دادەنرێت لەودیو دیاردەکانەوە هەیە. کانت، بۆ نموونە، یەکێکە لەو بیریارانەی لەو باوەڕەدا بووە لەودیو بوونی دیاردەکانەوە جۆرە بوونێک هەیە دەبێت بە هۆکار بۆ ئەوان و ئەو هۆیەی بە (نۆمینە) ناوزەدکردوە. بەڵام کانت نەیتوانیوە باسیبکات و گوایە تێگەیشتنی مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ئەو نۆمینەیە بناسێت و بە نەزانراوی دەمێنێتەوە. (وەرگێڕ)

بوونێــک، که دەتوانێت لەخۆیەوە دەرچێــت و ئەو شتە بێت، کە نییە. هەروەها گەڕانەوەشمان بۆ گۆڕان لە پێناوی دامەزراندنی بەردەوامییدا کارێکی بێهودەیە.

ئــەو خاڵەی لایبنیز و کانت دەیانەوێ بیسەلمێنن ئەوەیە، کە گۆڕانی ڕەها بە گۆڕان دانانرێت چونکە پشت بەو بابەتە نابەستێت گۆڕانەکەی تێدا ڕوودەدات یان پەیوەندی بە هیچ شتێکی گۆڕاوەوە نییە. لەڕاستیدا هەر شتێک گۆڕانی بەسەردا هاتبێــت و ئەو شتەش بێت، کە لەپێش گۆڕانەکەدا هەبــووە ئەوا بەردەوامی نا پێویستــە. لەم حاڵەتەدا گۆڕان دەبێت بە ڕەهــا و گۆڕانکاریش هەموو لایەنێکی بــوون داگیردەکات. بەردەوامیــش بەم گۆڕانە ڕەهایەوە دەبەســتینەوە. کاتێک مامەڵە لەگەڵ ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیدا دەکەین، ئەوەی پێویستە گۆڕانی ڕەهایە، لەسەرو گۆڕانەوە، کە هیچ شتێکی تێدا نییە بگۆڕێت و دەبێت بە بەردەوامییەکی بە کردەوەش. ئەگەر لەوباوەڕەدا بین، بۆ نموونە، بوون—

بۆ—خۆ بەتاڵییەکی ڕەهایە، ئەوا هیشــتا ئاگامەندی نابێت بە شتێکی لە کات بەدەر. کەوابوو، هەمیشەیی نییە. ئەوەی هەیە بەردەوامییەکی پێویستە، کە تیایدا بوون—بۆ—خۆ ئێستای خۆی دەکات بە ڕابردوو. ئەگەر کەسێک پێمان بڵێت ئەم بەردەوامییە لە گۆڕانی ئێستاوە بۆ ڕابردوو دەبێتە هۆکاری ســەرهەڵدانی گۆڕان لــە ناوەوەی بوون—بۆ—خۆدا ئەوا ئێمە دەڵێین، ئــەو گۆڕانە دەبێت بە بناخەی کاتییەتی ئەم بوونە. لە هەمانکاتدا ناتوانین ئەو گرفتانەش بشــارینەوە، کە ئەم پرســیارانەمان لا دروســتدەکەن: بۆچی ئێستا دەبێت بە ڕابردوو؟ ئەو (ئێستا) نوێیە چییە؟ لە کوێوە پەیدا دەبێت؟ لەسەرو ئەمانەوە هەرچ جۆرە گۆڕانکارییەک ڕوویدات، لە فۆرم یان ناوەڕۆکدا، لە ئێستاوە بۆ ڕابردوو، هەروەها ئێستا لە کوێوە ســەرهەڵدات، پرســیارە گرنگەکەی [بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێین] سەبارەت پێویستــی بوونە. ئایا ئەمانە بۆ ئێمــە گرفتن؟ با لە نزیکەوە تەماشایان بکەین. ڕانەبردوو تێناپەڕێت، ئەگەر نەبێت بە شتێکی پێشــتر بۆ بوون— بۆ—خۆ و ئەم بوونەش خۆی بە شتێکی لەپاشتری ئەو ڕانەبردووە دانەنێت.

کەوابوو، یەک دیاردەمان لە بەردەمدایە: سەرهەڵدانی ڕانەبردوویەکی نوێیە، کە ڕابــردوو دەکات بەو ڕانەبردووەی هەبووە و ڕانەبردووش دەکات بەو ڕانەبردووەی بوون—بۆ—خۆ تیایدا ڕادەوەســتێت و ڕانەبردووەکەی دەکات بە ڕابردوو. دیاردەی پێکهێنان لەنێو کاتدا گۆڕانکارییەکی جیهانییە چونکە ئەو ڕابردووەی پەیوەندی بە هیــچ بوونێکەوە نییە ڕابردوو نییە. ئەگەر ڕانەبردووش پەیوەندی بەم ڕابردووەوە هەبێت ئەوا بە ڕووتکراوی دەمێنیتەوە. ئەمە، بە هەمان شێوە، کار دەکاتە سەر داهاتــوش. ئەو ڕابردووەی ڕانەبــردوو، دوای گۆڕانکارییەکە، دەبێت بە ڕابردووی ڕابــردوو. لێرەدا جیاوازییەکانی ڕابردوو لەگەڵ ڕانەبردوودا دەرناکەون. ڕانەبردوو، وەکــو ڕانەبردووی ڕابــردوو دەمێنیتەوە و دەبێت بە ڕانەبــردووی ڕابردووی ئەو

ڕابردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، ئەم ڕانەبردووە لەگەڵ زنجیرەی ڕانەبردووەکاندا هاوواتایـــە و گەڕانەوەیە بۆ ئەو خاڵەی لێوەی پەیدابوە. هەروەها ئەم ڕانەبردووە لەوە زیاتر لەو لایەنەوەی ببێت بە شتێک، نابێت بە ڕابردووی خۆی چونکە بووە بەو شتە. پەیوەندی ڕابردوو لەگەڵ ڕانەبردوودا لە شێوازی بوون—لەنێو—خۆدایە و لەســـەر بناخەی ڕانەبردووی بوون—بۆ—خۆ دادەمەزرێــت. ئەم پەیوەندییەشە زنجیرەی ڕابردووە ڕووتکراوەکان دەخزێنێتە نێو تاکە قەوارەیەکەوە.

داهاتووش، هەرچەندە گۆڕانکارییەکــە کاریتێدەکات، لەناوناچێت و بەردەوام لە دەرەوەی بوون—بۆ—خــۆ دەمێنێتەوە. بەڵام دەبێت بە داهاتووی ڕابردوو یان داهاتووی داهاتوو. لە حاڵەتی یەکەمدا، ڕانەبردوو لە پەیوەندییەکەیدا بە ڕابردووەوە داهاتـــووە: "ئەوەی چاوەڕوانیم دەکرد، هاتــە بەردەمم." ڕانەبردووی ڕابردووە لە شێوازی داهاتووی پێشـــوی ئـــەم ڕابردووەدا. هەمانکـــات، بوون—بۆ—خۆیە، کە دەبێـــت بە داهاتووی ڕابردووەکـــە. لێرەدا جۆرە دووفاقییـــەک بە دی دەکرێت: ڕانەبـــردوو دەبێت بە داهاتووی پێشـــوتری ڕابردوو لە کاتێکـــدا نکۆڵی دەکرێت لەوەی ئەو داهاتووەیە. داهاتووە ڕاســـتەکە نەناسراوەتەوە و لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ ڕانەبردوودا بە داهاتوو دانانرێت. بەڵام لە ئاستی ڕابردوودا، وەکو داهاتوو دەمێنێتەوە. دەبێت بە هاوســـەرێکی ئێستای ڕانەبردووی نەناسراو. ناسنامەیەکی پڕ و تەواویش بۆ خۆی پێکدەهێنێت، "ئەمە ئەو شتە بوو من چاوەڕوانیم دەکرد؟" ئـــەو داهاتووەیە لەگەڵ ڕانەبردوودا دەژی و دەبێت بە داهاتوویەکی ڕابردووی ئەم ڕانەبردووە و هێشتا نەناسراوەتەوە.

کاتێک داهاتوو لە دوورەوە دەبینرێت، دەبێت بە داهاتووی ڕانەبردوویەکی نوێ؛ ئەگەر ڕانەبردووش بەو جۆرە نەبینرێت، کە لە بوونیدا ئەو داهاتووەی کەمە، ئەوا داهاتوو خەســـڵەتی (ئەگەر)ی خۆی وندەکات، پەیوەندییەکەی لەگەڵ ڕانەبردوویدا جیاوازییەکـــان دەرناخات و دەبێت بە ئەگەرێکـــی دراو؛ ئەگەرێک، کە لە بوون—بۆ—خـــۆدا بوون— لەنێو—خۆیە. دوێنێ ئەگەرێک بوو بۆ من، دەبوایە دووشەممەی داهاتوو بۆ لادێ بچومایە. ئەمڕۆ من خاوەنی ئەو ئەگەرە نیم. ڕابردووی ڕانەبردوو لەگەڵ داهاتوودا بەســـتویانە و لەنێو ڕانەبردووی مندا بوون بە بوون—لەنێو—خۆ. داهاتوو، لەنێو گۆڕانکارییەکانی نێو کاتدا، بەبێ دۆڕاندنی خەسڵەتی (داهاتوویی) خۆی دەبێت بە بوون—لەنێو-خۆ. داهاتوویەکە نەبووە بە دەســـتکەوتی ڕانەبردوو، بەڵکو تەنیا داهاتوویەکی دانراوە. کاتێک داهاتوو دەبێت بە دەســـتکەوت ناسنامە وەردەگرێت؛ بەڵام ناسنامە بوون—لەنێو—خۆیە. خۆی بە کەمییەکی دراوی ڕابردوو دەردەخـــات نەک ئەو کەمییەی لە ئێستای بوون—بۆ—خـــۆدا هەیە و شتێک، کە هێشـــتا پەیدا نەبووبێت. لەگەڵ تێپەڕکردنی داهاتوودا، داهاتوو بۆ هەمیشە لەنێو زنجیرەی ڕابردووەکاندا، وەکو داهاتووی پێشتر دەمێنێتەوە.

پێویسته باســـی گۆڕانی ڕانەبـــردووی بوون—بۆ—خۆ بۆ ڕابـــردوو، هەروەها ســـەرهەڵدانی ڕانەبردوویەکی نوێ بکەین. لەوێشـــدا توشی هەڵـــە دەبین ئەگەر لەو باوەڕەدابین ڕانەبردووی پێشـــو لەناودەچێـــت و ڕانەبردووە نوێکەش وێنەی ڕانەبـــردووە لە ناوچووەکەی تێدایە. لەلایەکەوە، بۆ دۆزینەوەی ڕاســـتی دەکرێت گوتەکەمان هەڵگێڕینەوە چونکە دانانی ڕابردووی ڕانەبردووەکانی پێشو گۆڕانە بۆ بوون—لەنێو—خۆ. سەرهەڵدانی ڕانەبردووی نوێش لەناوبردنی بوون—لەنێو—خۆیە. ڕانەبروو بوون— لەنێو—خۆیەکی نوێ نییە؛ ئەو شتەیە، کە هێشـــتا پەیدانەبووە و لەودیـــو بوونەوەیە. ئەو شتەیە، کە دەتوانین لە ڕابردوودا بڵێین'هەیە'. ڕابردوو لەناونەچـــووە؛ ئەوەیە، کە بووە و بوونـــی ڕانەبردووە. لەکۆتاییدا، بەو شێوەیەی باسمانکرد، پەیوەندی ڕانەبردوو بە ڕابردووەوە پەیوەندی بوونە نەک بیر.

لە ئاکامدا، ئەو خاڵەی ســـەرنجمان ڕادەکێشێت، تێگەیشتنە لە بوون—بۆ—خۆ لە ڕێگـــەی بوونەکەی دەریدەخات. ئەم بوونە ناتوانێـــت نەبوونی خۆی ڕاگرێت. ئەو کەلەبەرەی لـــە بوون—بۆ—خۆدایە پڕکراوەتەوە؛ ئـــەو نەبوونەی (هێنراوەتە جیهانـــەوە) نامێنێت و لەگەڵ ڕابردووی بوون—بۆ—خۆدا دەبێت بە بوون—لەنێو—خـــۆ. ئەزمونی خەمباریم لـــە ڕابردوودا ئەوە دەگەیەنێت ئـــەو خەمبارییە، وەکو ئەزمونێک لەبەردەم مندا نەماوە. خەمبارییەکە ئەو خاســـییەتەی بوونی نەماوە، کـــە لەگەڵ ســـەرهەڵدانەکەیدا خۆی بسەپێنێت چونکە ئـــەو ڕوویداوە و بووە بە ڕابردوو. ڕابردوو وەرچەرخانی مەرگەساتە. بوون—بۆ—خۆ دەتوانێت ببێت بەوەی خۆی دەیخوازێت، بەڵام پێویستی بوون چارەسەرنارێت. کەوابوو، ڕابردوو بوون—بۆ—خۆیە، کە ناتوانێت لە بوونی خۆیەوە دەرچێت و لەبەردەم بوون—لەنێو—خۆدا ئامادە بێت. ئەوەی دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ دەکەوێتە ناوەڕاســـتی جیهانەوە. ئەو بوونەی من دەمەوێت بیگەمێ و لە جیهاندا بۆی ئامادە دەبم و هێشـــتا پێی نەگەیشـــتوم، دەبێت بەو بوونەی، کە من بوو. هەروەها من [لەگەڵ تێپەڕبوونی] دەخاتە ناوەڕاستی جیهانەوە. من، وەکو هەبووەکان دەردەخات. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو جیهانەی بوون—بۆ—خۆ دەبێت بەوەی هەیە. ئەو جیهانە نییە، کە بە ڕاستی هەیـــە. بەمجۆرە ڕابردووی ئەم بوونە دەبێت بە ڕابردووی ڕانەبردووی ئامادەبوون لەنێـــو جیهاندا. لـــەو حاڵەتەشدا، گریمان لەگـــەڵ تێپەڕبوونی بوون—بۆ—خۆ لە ڕانەبـــردووەوە بۆ ڕابردوو جیهان گۆڕانکاری تێـــدا ڕوونادات. گۆڕانکاری لە ناخی بوون—بۆ—خۆدا ســـەرهەڵدەدات. ئەم گۆڕانکارییەش بـــە جوڵانی ئاگامەندییەوە بەستراوە.

لەو ئەزموونانەدا، کە دەکەونە نێو ڕۆخانی ڕابردووەوە، بوون— بۆ—خۆ دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ و بە "بوون—لە ناوەڕاستی—جیهاندا." جیهانیش دەبێت بەو ڕەهەندەی ڕابردووی ئەم بووە تیایدا خۆی دەردەخات. وەکو چۆن لەشی (سێرین)

لە کلکی ماسی دروستکرا چەندبارە بوونەوەکانی بوون—بۆ—خۆش لەودیو بوونی خۆیەوە بووە بە (شت) و لەنێو جیهاندا جێگەی خۆی گرتوە. من تورەم، خەمبارم، گرێی ئۆدیبم هەیە یان هەســت بە کەمی دەکەم بەڵام هێشتا ئەو کەسەم، کە لە ڕابردوومدا یان جــاران فەرمانبەر، کرێکار یان بێقۆڵ بووم. جیهان لە ڕابردوومدا چواردەورمی داوە. منیش دەستەڵاتم بەسەر حوکمدانە هەمەکییەکەیدا نییە؛ بەڵام ڕادیکاڵانــە ڕوو لە داهاتوو دەکەم و ڕابردووم جێدەهێڵم. ئەو بوونێکە—بۆ—خۆی و (نەبــوون) لە بوونیدا نەماوە و بووە بــە بوون—لەنێو—خۆ. ئەو بوونەیە لەنێو جیهانــدا تواوەتەوە و بووە بە ڕابردوو. ئەمەش لەگەڵ ســەرهەڵدانی ئەم بوونە و ڕەتکردنــی ڕانەبــردووی خۆی ڕوودەدات. ئایا واتای ئەم ســەرهەڵدانە چییە؟ ئێمە باســی ســەرهەڵدانی بوونێکی نوێ ناکەین. هەموو ئەوانەی ڕوودەدەن بە جۆرێک ڕانەبردوو نیشاندەدەن، کە کۆتایی نەیەت یان ئەو ساتەی تێپەڕی دەکەین ڕانەبردوویەکی دیکــە جێگەی دەگرێتەوە. دەردەکەوێــت ڕانەبردوو هەڵهاتنێکی بەردەوام بێت لە دەســت بوون—لەنێو—خۆ، کە تاکو دوا ســەرکەوتنی هەڕەشە لــە بوونمان دەکات. ئەو ســەرکەوتنە بە مردن وەدەســت دەهێنرێت. مردن دوا گرتنی کاتــە، کە تیایدا هەموو شتێــک لەنێو ڕەهەندی ڕابــردوودا دەخزێنرێت و (هەمووڵایەنی) ڕاستەقینەی مرۆڤ دەبینرێت.

چۆن لە خەسڵەتی دینامیکی کات تێدەگەین؟ ئەگەر ئەمە خەسڵەتێکی پێدرا و نەبێــت، ئەوا دەبێت لە بونیادی بوون—بۆ—خۆدا هەبێت و بە شتێکی دەرەکی دانەنرێت. بوون—بۆ—خۆ لە هەمانکاتدا نەبوونە. لەم خاڵەوە ئێمە دەتوانین دەست بە گەشتەکەمان بکەین. لە ڕاســتیدا، لە ئاستی ئەم توێژینەوەیەدا توشی گرفت نابین. ئەگەر توشی گرفتیش ببیــن، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مامەڵەکردنمان لەگەڵ ئــەم بوونەدا، وەکو شتێکی بوون—لەنێو—خــۆ. ئەگەر لە بوون— لەنێو—خۆوە توێژینەوەکەمان دەســتپێبکەین دیاردەی گــۆڕان توشی گرفتمان دەکات. بەپێچەوانەشەوە، ئەو دەســتپێکردنە لە بوون—بۆ—خــۆوە داوای ڕوونکردنەوەی گۆڕانمان لێناکات. ئەوەی پێویستە لەسەری بدوێین بەردەوامییە؛ ئەگەر هەبێت. هەروەها، ئەگەر لە باســەکەماندا کات بە ڕێکخستن دابنێین ئەوا کات دەبێت بەو شتەی پەیوەندیدار نەبێت. خەسڵەتی دەرچوون—لەخۆی ئەو بوونەی کاتییە هیچ لە کێشــەکەمان بۆ ناگۆڕێت چونکە ئەو خەســڵەتە لە ڕابردوو نەک لە بوونیادی بوون—بۆ—خــۆدا دەبینرێت. دەبێت بە خەســڵەتێک، کــە پێویستی بە بوون—لەنێو—خــۆ هەیە. ئەگەر بیریش لە داهاتوو بەو جــۆرە بکەینەوە، کە داهاتووی بوون—بۆ—خۆیــە و ئەو بوون بۆ خۆیەش ڕابردووی هەیــە، ئێمەش ئەم گۆڕانە بە گرفت دابنێین، ئەوا داهاتوو دەبێت بە وەســتانێکی کتوپڕ. خەسڵەتی نەگۆڕ بە بوون—لەنێو—خۆ دەدەیــن. ئەوەی دایدەمەزرێنین دەبێــت بە (هەموویەکی)

دروســـتکراو. ڕابـــردوو لەگەڵ داهاتوو ئەم بوونە ســـنووردار دەکەن. ئێمە خۆمان لە ســـاتە کتوپڕەکان ڕزگارکرد چونکە هەر یەکێک لەو ســـاتانە لەبەر ئەوەی لە هەر دوو ســـەرەوە؛ ڕابردوو هەروەها داهاتووەوە بە (هیچ)ەوە بەستراوە، بووە بە بوون—لەنێو—خـــۆ. ئەگەر ئەم کارە نەکەین ئەوا کات دەکەین بە شتێکی جیاواز تر لە کات و بوونیش بە خەون.

گۆڕان خەسڵەتی بوون—بۆ—خۆیە چونکە ئەم بوونە خۆی گۆڕان دروستدەکات و لە خۆیەوە گۆڕانەکە دەردەچێت یان گۆڕانەکەی (خۆرا) یە. خۆڕایی ئەم بوونە شتێکە هەیە؛ یان دەتوانین بڵێین لەخۆڕایی ئەم بوونە پێناســـەی خۆی دەکات. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەم بوونە بناخەی بوون و نەبوونی خۆیەتی. جۆرێکـــە، کە خۆی دژی خۆی ڕادەوەســـتێت و ئـــەو دژەش ڕەتدەداتەوە. بەبێ ئـــەم کارە بوونی دەبێت بە هەبوویەکی بەردەوام و وەرگیراو. دەشێ هەندێک لەو باوەڕەدابن، کە بەردەوامی و خەسڵەتی پێدراوی ئەم هەبووە جەخت لەسەر (کات) ێکی لەپێشـــتر بۆ ئەم بوونە دەکەن. ئەمەش دروستە چونکە خەسڵەتی لەخۆڕا ئەو لایەنە وەرگیراوە ڕەتدەداتەوە. ڕەتدانەوەکەش دەبێتەوە بە لایەنی وەرگیراو. خەســـڵەتی لەخۆڕا بەبێ کات نییە. ڕەتدانەوەی ئەو خاڵەی گوایە ناتوانین بەبێ کـــات بیر لە بوونی شتێک بکەینـــەوە بێهودەیە و ئـــەو گوتەیەی (کانت)یش بۆ نموونە دەهێنینەوە، کە دروستە خەسڵەتی لەخۆڕای لە کات بەدەر نادۆزرێتەوە، بەڵام ئەمە کێشـــەیەک نییـــە توشی ناکۆکیمان بکات. بۆ ئێمـــە، بەپێچەوانەوە، ئەو لەخۆڕایەی لە خۆی ڕاناکات و دەتوانین دەستنیشـــانی بکەین و بڵێین "ئەو شتەیە"، لەنێو خۆیدا ناگۆڕێت و بوونی ناکۆکە.

هەمانکات، دەبێت بە ناوەڕۆکێکی سەلمێنراو و هەمیشەیی، کە هەرگیز ناتوانین بیکەین بە بار[بۆ بارهەڵگر].

لەســـەرو ئەمەوە، لەخـــۆڕا بۆ دواوە ناگەڕێتەوە و خـــۆی دەدۆزێتەوە چونکە لەو ســـاتەوە خۆی دەردەخات بوونی خـــۆی ڕەتدەداتەوە و خۆدەرخستنی بەبێ ئاوەڕدانەوە لە ڕابردوو ڕەتدانەوەی بوونی خۆیەتی. ئەگینا هەموو وزەیەکی خۆی دەســـوتێنێ و دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ. زنجیرەی (وەرگرتن و ڕەتدانەوە) لە ڕووی ئۆنتۆلۆجییـــەوە پێش گۆڕان دەکەوێـــت. گۆڕان پەیوەندی ئەم زنجیرەیەیە بە ناوەڕۆکی ئەستۆییی[ماتەریاڵ]ەوە. ئێمە ئەوەشمان باسکرد، کە نەگەڕانەوەی کات بۆ فۆرمی لەپێشـــتری لەخـــۆڕای بوون پێویستە. من لـــەم تێزەدا چەمکی لەخۆڕابوونـــم بەکارهێناوە چونکە لە خوێنـــەرەوە نزیکە. ئێستاش لە واتای ئەم چەمکە لەسەر بناخەی بوون—بۆ—خۆ بە زمانی خۆمان ڕووندەکەمەوە.

ئەو بوون—بۆ—خۆیەی، کە ناتوانێت بەردەوام بێت ڕەتدانەوەی بوون—لەنێو—خۆیە و هەمانکاتیش بوونی خۆی لەناودەبات. بەڵام ئەم لەناوچوونەی پێدەدرێت.

ئـــەو دەیەوێت ببێت بە بوون—لەنێو-خۆ. ئەمەش ڕێگەی پێنادات وەکو ئەو هێزە بمێنێتەوە، کە لەنێو خۆیـــدا نەمانی خۆی هەڵدەگرێت. هەڵهاتنی بوون—بۆ—خۆ ڕەتدانەوەی ئەگـــەری بوون بە نەبوونی خۆیەتی. بەڵام هەڵهاتن خۆ دەربازکردنە لە شتێک. ئـــەو کاتەی بوون—بۆ—خۆ هەڵدێت جێگـــەی خۆی جێناهێڵێت. ئەو ناتوانێت خـــۆی لەناوبەرێت چونکە من ئەوم. هەروەها ناتوانێت ببێت بە نەبوون بۆ خۆی لە کاتێکدا ئەو بووە بەوەی دەیویست بیگاتێ. ئامادەبوونی ئەو تێکڕایی بوونێتی. ئەم تێکڕاییەش هەرگیز دەستناکەوێت بوون—بۆ—خۆ بەردەوام لە تێکرایی ڕادەکات. کەوابوو کات بۆ ئاگامەندی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییە، کە بوونی خۆی دەکـــات بە شتێکی کاتی و ئەو تێکڕاییەشی هەرگیز مسۆگەر ناکرێت. نەبوونێکە، کە دەکەوێتە نێو تێکڕاییەکی بە تێکڕایی نەبووی گۆڕان. ئەم تێکڕاییەی بە شوێن خۆیدا دەگەڕێ و خۆشی ڕەتدەداتەوە و نایەوێت ســـنوردار بکرێت. هیچ ســـاتێک نییـــە بوون—بۆ—خۆ تێیدا بمێنێتەوە تاکو بڵێین ئـــەم بوونە ئەو شتەیە چونکە بوون—بۆ—خۆ هەرگیز ئەوە نییە، کە هەیە.

## ٣ . کاتی بنەڕەتی و کاتی دەروونی: تێڕامان

بوون—بۆ—خۆ، وەکو ئاگامەندی بێ بیرکردنەوە لە کات بەردەوام دەمێنێتەوە. بەڵام هێشتا من هەست بە تێپەڕبوونی کات دەکەم و خۆم بەو یەکێتییە دەبینم، کە بە زنجیرەی [ساتەکاندا] تێدەپەڕێ. لەم حاڵەتەدا من ئاگام لە بەردەوامبوون هەیـــە. ئەم ئاگاییە بیرکردنەوەیـــە و جۆرێکە لە زانین و بابەتی خۆی هەیە. ئایا چ پەیوەندییـــەک لە نێوان کاتە بنەڕەتییەکـــە و ئەم کاتە دەروونییەدا هەیە، کە من تیایدا هەســـت بە بەردەوامی بوونی خۆم دەکەم؟ ئەم کێشـــەیە ڕاســـتەوخۆ لەبەردەم کێشـــەیەکی دیکـــەدا ڕامان دەگرێت چونکە ئاگایی لـــە بەردەوامبوون ئاگاییە لەو ئاگاییەی بەردەوامە. لەم لایەنەوە پرســـیارکردن سەبارەت سروشت و یاسای بیرکردنەوە لە بەردەوامبوون هەمانکات پرسیارکردنە لە سروشت و یاسای تێڕامان. لە ڕاســـتیدا ئەو کاتەی پەیوەندی بە بەردەوامبوونی دەروونییەوە هەیە سەر بە تێڕامانە.

پێش پرســـیارکردن سەبارەت ئەوەی چۆن بەردەوامبوونی دەروونی ڕاستەوخۆ دەبێـــت بە بابەتی تێڕامـــان، پێویستە وەڵامی ئەم پرســـیارەش بدەینەوە، کە؛ چۆن تێڕامـــان بابەتێکی ڕابردوو لەبەردەم خۆیدا دادەنێت؟ دێکارت و هوســـرڵ لەو باوەڕەدابوون تێڕامان ڕاســـتەوخۆ لە بەردەم بابەتەکەیدا ڕادەوەســـتێت. ئایا دەتوانێـــت ئەم کارە لەگەڵ شتێکی تێپەڕیودا بکـــات؟ مادام ئۆنتۆلۆجییەکەمان

لەسەر ئەزمونی تێڕامان دامەزراوە، ئایا دەتوانێت یاساکانی خۆی بپارێزێت؟ ئێمە تەنیا لە گەڕانەوەمان بۆ دیاردەی تێڕامان و ناسینی بونیادەکەی دەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

تێڕامـــان ئـــەو بوون—بۆ—خۆیەیە، کە لە بوونی خۆی بـــە ئاگایە. هەروەها، لەبەر ئەوەی بوون—بۆ—خۆ زۆربەی کات خۆ— ئاگاییەکەی بیرکردنەوە نییە ئەوا تیڕامـــان بـــە ئاگاییەکی نوێ دادەنێین، کە کتوپـــڕ دەردەکەوێت ڕووبەڕووی ئەو ئاگاییـــە دەبێتەوە، کە بیری لێدەکرێتەوە. هەردووکیان پێکەوەدەژین. ئەمەش، وەکو بۆچوونەکەی سپینۆزا لەبارەی بیرۆکەی بیرۆکەوەیە.

دژوارە باســـی دەرچوونی ئەم تێڕامانە لە هیچەوە بکەین. بێگومان مەحاڵیشە بڵێیـــن، کە بوونی ئەو شتەی لەم تێڕامانەدا بیری لێدەکرێتەوە شتێکە هەســـتی پێکراوە چونکە پێویستی بە هەســـتکردن نییە. پەیوەندییەکەشی بە تێڕامانەوە، وەکو پەیوەندی بابەتێکی هەستەکی نییە. ئەگەر لەو باوەڕەدابین بابەتە زانراوەکە لە ئاســـتی پلەی بوونـــی زاناکەدایە ئەوا بۆ ڕیالیزمی ســـادەگی دەگەڕێنێتەوە و دەبێت باســـی پەیوەندی نێوان ئەم دوو شتە بکەین. لێرەدا توشی کێشـــەیەکی گـــەورەی ڕیالیزم دەبین: چۆن دوو شتی جیاواز و ســـەربەخۆ پەیوەندی لەگەڵ یەکدی دروســـتدەکەن، بەتایبەتی چۆن ئەو پەیوەندییە ناوەکییەی ئێمە بە زانین ناوزەدی دەکەین، دروستدەکەن؟ ئەگەر یەکەمیان بە ئاگامەندی سەربەخۆ دابنیین هەرگیـــز ناتوانین بەو ئاگامەندییەوە ببەســـتینەوە، کە لە تێڕامانەکەماندا بیری لێدەکەینەوە. هەمیشە بە دووانی دەمێنێتەوە. ئەگەر بە جۆرێکی دیکەش بیریان لێبکەینـــەوە، ئاگامەندییە تێرامانکەرەکە بـــە ئاگامەندی ئەو ئاگاییە دابنێین، کە تێرامانی هەیە، ئەوا پەیوەندییەکەی نێوانیان دەرەکی خۆی دەردەخات. لەوانەیە بتوانیـــن بڵێین ئەو تێرامانەی ســـەربەخۆیە و لە بابەتەکەوە دوورە بیرۆکەی ئەو ئاگامەندییـــەی لەلایە، کـــە بیردەکاتەوە. لێرەدا بـــەرەو ئایدیالیزم دەڕۆین. ئەو زانینـــەی لە تێرامانەوە ســـەرهەڵدەدات بەتایبەتی کۆجیتـــۆ دڵنیابوونەکە خۆی دەدۆڕێنێت و دەبێت بە ئەگەر و پێناســـکردنیش توشی کێشەمان دەکات. لەسەر ئەو خاڵە ڕێکەوتووین، کە پێویستە بوون و تێڕامان و بابەتی تێڕامانەکە پێکەوە ببەستێتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو ئاگامەندییەی خاوەنی تێڕامانەکەیە تێرامانێکی ئاگامەندە.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئێمە پرســـیار لە بـــارەی ئەوەوەناکەین، کە ئەم دوو لایەنە بەتەواوی لە یەکدی دەچن یان نا. هەروەها، تووشی ئەو بوونە دەبینەوە، کە پێناســـەی بوون—بۆ—خۆ دەکات: ئەویش تێڕامانە چونکە دەسەلمێنرێت، کە تێرامـــان ئەوەیە بیر لە شتێک دەکاتەوە. تاکو ئـــەو ڕادەیەی تێڕامانیش زانینە، ئەوەی بیری لێدەکرێتەوە دەبێت بابەتی تێڕامانەکە بێت. ئەمەش بوونی دوو شت

لە یەکدی جیادەکاتەوە. لەبەرئەمە پێویستە تێڕامان لە خۆڕا ڕوودبدات و[وەستان] و بیرکردنەوە لە ئاستی شتێکدا نەبێت. ئێمە لە باسەکەمان لەسەر بوون—بۆ—خۆ ئاماژەمـــان بۆ ئەم بونیادی ئۆنتۆلۆجییە کردووە. بەڵام لەوێدا واتایەکی جیاوازی هەبوو. لە ڕاســـتیدا بە دوو زاراوەی (تێڕامانی تێڕامان)، کە سەربەخۆ ڕادوەستێت دوو لایەنمان نیشـــانداوە. لە تێڕاماندا کێشەی دوولایەنی کەمێک جیاوازە چونکە بابەتـــی تێڕامانەکە بۆ تێڕامانەکە هەیە. تێڕامـــان و بابەتەکەی وەکو دوو شتی سەربەخۆ دەردەکەون. ئەوەی جیایان دەکاتەوە هیچە.

لێرەدا پێویستە دوو خاڵ دەستنیشان بکەین: یەکەم، تێڕامان، وەکو گەواهێک لە ڕێگـــەی دیاردەوە هەیە. ئەمەش ســـەربەخۆییەکەی لەناودەبـــات. بوونی بە هەڵوێستەکەوە و هەڵوێستیش بە بوون—بۆ —خۆوە بەســـتراوە، کە تێڕامانەکەی هەیە. دووەم، تێڕامان لـــە شتێک تێڕامانەکە دەگۆڕێت، چونکە تێڕامان ئاگاییە لەخـــۆ لە کاتێکـــدا ئەو ئاگاییە تێڕامانەکەی لا ســـەرهەڵدەدات و بیر لە دیاردە بەرزەکە دەکاتەوە. ئەو تێڕامانەی بیر لە بابەتەکە دەکاتەوە دەزانێت، کە لەسەری دەڕوانن. ئەمەش لەو نموونەیەدا چاکتر دەردەکەوێت، کەسێک دەنوسێت و بەسەر مێزەکەدا ســـەری شۆڕکردۆتەوە و هەمانکات دەزانێت کەســـێکی دیکە لەپشتەوە ڕاوەســـتاوە و تەماشای ئەو دەکات. ئەوەی بیـــری لێدەکرێتەوە جۆرە ئاگاییەکە لەبارەی خۆیەوە و دەزانێت شتێک لە دەرەوەش هەیە. مەبەست لەوەیە، کە خۆی دەکات بە بابەت بۆ-، لەم لایەنەوە خۆی لە بابەتەکە جیا ناکاتەوە و هەمانکات دوور بەرانبـــەر خۆشی ڕادەوەســـتێت و ئەوەی بیری لێدەکاتـــەوە لە تیڕامانەکە سەربەخۆتر نییە.

هوســـرڵ بۆمان باســـدەکات، کە بابەتی تێڕامان "پێـــش تێرامانەکە لەوێدایە خۆی دەردەخات". بەڵام نابێت بەهەڵەدا بچێن چونکە سەربەخۆیی ئەوەی هێشتا نەبووە بە بابەتی تێڕامان و نابێت بە دیاردەی تێڕامان، خەســـڵەتی خۆی وەکو دیاردە وندەکات. دیاردە ئەوەیە لە تێڕاماندا دەردەکەوێت. لە تێڕاماندا ئاگامەندی گۆڕانکاری تێدا ڕوودەدات و ســـەربەخۆییەکەی لەدەستدەدات. لەکۆتاییدا، لەبەر ئەوەی هیچ شتێک تێڕامان و بابەتی تێڕامان لە یەکدی جیا ناکاتەوە. ئەو هیچەی لێـــرەدا ناتوانێت بوون بۆ خۆی دامەزرێنێت پێویستە دروســـتبکرێت. تەنیا ئەو بونیادەی لـــە بوونێکی یەکگرتودا هەیە دەتوانێت ببێـــت بە بناخەی نەبوون بۆ خۆی. لەڕاستیدا تێڕامان و بابەتەکەی ناتوانن ئەم هیچە دروستبکەن، کە جیایان دەکاتەوە. بـــەڵام تێڕامان، وەکو بوون—بۆ—خۆیەکی بـــێ تێڕامان یەک بوونە و بۆ بوون زیـــاد نەکراوە. ئەو بوونەیە، کە دەبێـــت نەبوونی خۆی بێت. دیاردەی ئاگاییەکی نوێ نییە ئاڕاســـتەی بوون—بۆ—خـــۆ کرابێت، بەڵکو بونیادی ناوەکی بوون—بۆ—خۆیە. بوون—بۆ—خۆیە، کە خۆی دەکات بەو بوونەی تێڕامانی هەیە و

بیردەکاتـــەوە. ئەو بوونەی بیر لە بوونی من دەکاتەوە شتێکی ئەودیو کات نییە، بەڵکـــو منم. من بـــەردەوام ئاگام لە بوونی خۆمە و مێـــژووی خۆم دیاریدەکەم. مێژووی مـــن و بوونم لەنێو—جیهاندا و بەردەوام بوونی دەروونم—ئەو بوون—بۆ—خۆیـــە پێکدەهێنن، کە منە و لەشێوازی ئـــەو بوونەدا دەژی، کە تێڕامانی هەیە. کەوابوو، دیاردەی تێڕامـــان لەناوبردنی بوون—بۆ—خۆیە. لەناوبردنێک، کە لەنێو خۆیدایە و ئەو بوونەش لەناوبردنەکەیە.

ئایا بنەڕەتی ئەم لەناوبردنە چییە؟ چ هاندەرێکی هەیە؟

لەگەڵ پەیدابوونی بوون—بۆ—خـــۆ و ئامادەبوونی لە بووندا پەرتوبڵاوبوونەوە ڕوودەدات: بوون—بۆ—خۆ لە دەرەوەی بوونی خۆیدا لە تەنیشت بوون—لەنێو—خۆدا لەنێو سێ ڕەهەندەکەی کاتدا ووندەبێت. ئەم بوونە لە دەرەوەی خۆیدایە چونکە تێڕامانـــی هەیە و دەڕوانێتە دەرەوەی خـــۆی. تێڕامان ئەگەرێکی بەردەوامی ئەم بوونەیە، کە دەتوانێ بوونی پێبدۆزێتەوە. هەروەها لە ڕێگەی تێڕامانەوە ئەم بوونە لـــە دەرەوەی بوونیدا دەژی و خـــۆی وونکردوە؛ بوونی خۆی دەدۆزێتەوە و خۆی دەناسێت. ئەو بە چاوی خۆی خۆی دەبینێت. ئامانجی ئەمەش، بەکورتییەکەی، گرتنی ئەو بوونەیە، کە لە دەست خۆی ڕادەکات.

گرنگە ئەو بوونە خۆی بدۆزێتەوە و خۆی بکات بەوەی هەیە. هاندەری تێڕامان دوو لایەنی هەیە: لە لایەکەوە هەوڵدەدات خۆی بە دەرەوە بگەیەنێت و لە لایەکی دیکەوە لەناوەوە دەمێنێتەوە. بوونێکە یەکێتی ناوەوە و دەرەوە دروستدەکات.

ئـــەم هەوڵدانـــە بۆ دۆزینەوەی خۆی و خۆکردن بـــە بناخە بۆ بوونی خۆی و ڕاکردن لە دەســـت خۆی ئاکامێکی ســـەرنەکەوتوی هەیە. لەڕاستیدا تێڕامان ئەم ســـەرنەکەوتنەیە. ئەم بوونە هەر ئەو بوونەیە بوونی ونبووی خۆی دەدۆزێتەوە. خـــۆ دۆزینەوەکەش شێوازێکـــی بوونە؛ بوون—بۆ— خۆیە لـــە شێوازی ڕاکردندا. بوون—بۆ—خـــۆ دەیەوێت ببێت بەوەی هەیە یـــان ئەو بوون—بۆ—خۆیەیە، کە بۆ خۆیەتی. کەوابوو، بوون—بۆ—خۆ لە هەوڵدانەکەیدا بۆ دۆزینەوەی خۆی بۆ بوونی خـــۆی دەگەڕێتەوە. ئەو بوونـــەی دەیەوێت ببێت بە بناخـــەی بوونی خۆی ئەو بناخەیە لـــە نەبوونی بوونی ئەودایـــە. ئەم بوونە بەردەوام خـــۆی لەناودەبات. هەروەها، گەڕانەوە بـــۆ خۆ جۆرە دوورییەک لەنێوان خۆی گەڕاوە و ئەو خۆیەدا دروستدەکات، کە بۆی گەڕاوەتەوە. ئەم گەڕانەوەیە دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی نەبوون لەم بوونەدا. ئەوەی دەتوانێت بوون—بۆ—خۆ بدۆزێتەوە ئەو بوونەیە، کە لە بناخەوە بوون—بۆ—خۆیە. کەوابوو، دۆزینەوەی ئەم بوونە دەکەوێتە سەرشانی بوون— بۆ—خۆ و بوونە دۆزراوەکەش دەبێت بوون— بۆ—خۆ بێت.

ئـــەم دوو بوونە یەک بوونن. بەڵام لە پێنـــاوی دۆزینەوەی خۆیدا ئەم بوونە

دوورییەک لەنێوان بوونی خۆی و ئەو بوونەدا لەنێو یەکێتیی بووندا دروستدەکات، کە بە دوایدا دەگەڕێت.

تێڕامان، وەکو هەوڵدانی بوون—بۆ-خۆ بۆ دۆزینەوەی بوونی خۆی جۆرێکە لە ناوبردن و دەکەوێتە نێوان بوونی سادە و ڕەوانی بوون—بۆ— خۆوە و بوون—بۆ—ئەوان. هەوڵدانی بوون—بۆ—خۆیە بۆ دۆزینەوەی بوونی خۆی، وەکو ئەو بوونەی، کە نەبوو نییە.

ئایا هیچ یاسایەک هەیە، لەبەر ئەوەی بوون—بۆ—خۆ کاتییە، تێڕامان سنوورداربکات؟ ئێمە لەوباوەڕەداین نییە. بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان کات و تێڕامانمان بۆ دەرکەوێت، پێویستە دوو جۆر تێڕامان لە یەکدی جیابکەینەوە: تێڕامان ڕەوان یا ناڕەوانە. تێڕامانی ڕەوان ئامادەبوونێکی سادەی تێڕامانە لەبەردەم ئەو بوونەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەمەش شێوازی بنەڕەتی تێڕامان و فۆرمێکی ئایدیالە؛ ئەو بناخەیەیە، کە تێڕامانی ناڕەوانی لەسەر ڕادەوەستێت. تێڕامانی ناڕەوان، کە لەدواییدا ڕوونیدەکەینەوە، تێڕامانی ڕەوانی تێدایە، بەڵام لەوێدا ناوەستێ و ڕەتی دەکات.

ئایا خۆسەلماندن و داواکارییەکانی تێڕامانی ڕەوان چین؟ تێڕامان ڕوو لەو بابەتە دەکات، کە مەبەستێتی. لە دەرەوەی ئەودا تێڕامان نادۆزینەوە. بەڵام، لەو حاڵەتەدا، کە تێڕامان ڕوو لە دەرەوە دەکات هێشتا لەنێو خۆیدایە. ئەمەیە وا لە ئێمە دەکات بڵێین، بابەتی تێڕامان بابەتێکی دەرەکی لەپێشتر نییە. لەڕاستیدا ئەو ئاگامەندییەی دەڕوانێتە بابەتەکە هێشتا نەچۆتە دەرەوەی خۆی و نەبووە بەوەی لە ئاگامەندییەوە جیابووبێتەوە. نەبووە بەو بابەتەی بۆچوونی خۆمانی لەسەر ڕاگرین. بۆ ئەوی ئاگامەندی بیر لە خۆی بکاتەوە دەبێت لەگەڵ ئەو بوونەدا، کە بیری لێدەکرێتەوە جیاواز بێت و ئەوەش نەبێت، کە نییە. ئەمەش بوونی—ئەوانی— دیکە دەردەخات.

تێڕامان زانینە سەبارەت بەوەی گومانپێکراو نییە. هەڵوێستی ڕاوەستانی لە ئاستی بابەتەکەیدا هەیە و بوونی ئەو ئاگامەندییەش دەسەلمێنێت، کە بووە بە بابەتی بیرکردنەوە. بەڵام هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەشە. سەلماندنی ئەم بابەتە لەهەمانکاتدا ڕەتدانەوەشێتی. هەروەها بۆ ئەوەی بزانین دەبێت خۆمان بکەین بە وی دی. لێرەدا تێڕامان ناتوانێت بەتەواوی خۆی بکات بە هیچ شتێک بێجگە لەوەی ڕووی تێکردوە چونکە ئەو دەیەوێت ببێت بەوەی لە ئاستیدا ڕاوەستاوە.

بەڵام سەلماندنەکەی ناتەواوە چونکە ڕەتدانەوەکەی بەتەواوی بەکار نەهێناوە. لەبەرئەمە خۆی لە بابەتی بیرکردنەوەکەی جیاناکاتەوە و بۆچوونی بەرانبەر بابەتەکەش نییە. زانینەکەی گەرێنتییە و لەگەڵ بابەتەکەدا یەکیان گرتوە.

هەمووشتێک بە یەکجار دراوە و نزیکبوونەوەیەکی ڕەهای تێدایە. ئەوەی ئێمە بە زانینی دادەنێین لایەن و بەرزی و نزمی تێدا دەبینرێت. تەنانەت زانینی ماتماتیکی پەیوەندییان بە ڕاســتییەکانی دیکەوە هەیە و بە یەکجار خۆیان دەرناخەن. بەڵام زانینی تێڕامان لە بــارەی بابەتەکەیەوە[کە خۆیەتی] لە بابەتەکەیەوە دوور نییە و پێویستی بە باســکردنیش نییە. ئەو تەنیا لە ئاستی بابەتەکەیدا ڕادەوەستێت و هیچیان فێر ناکات.

لــەو کاتەدا زانین ســەبارەت بابەتێکــی دەرەکی پەیدادەبێــت بابەتەکەش دەردەکەوێت، بەڵام بابەتەکە لە خۆدەرخستنەکەیدا درۆمان لەگەڵ دەکات. بەڵام لە خۆدەرخستنی تێڕاماندا بوونێک ڕاوەســتاوە، کە لەپێشــتریش خۆی بۆ ئێمە دەرخستبــوو. لە تێڕاماندا ئەوەی خۆی دەردەخات تێڕامانە. بابەتەکەی بوونێکی دەرەکی نییە تاکو خۆی دەرخات، بەڵکو بوونێکە، کە خۆی دەرخستوە. تێڕامان بڕوانامەیە نەک زانین. هاندەری بنەڕەتییە بۆ تێگەیشــتنی پێش—تێڕامان لەوەی دەمانەوێت بیدۆزینەوە.

بــەڵام، ئەگەر تێڕامان ئــەوە بێت تێڕامان ڕووی تێدەکــات، ئەم یەکێتییەی بوونیش یاســاکانی ســنوردار‌دەکات، ئەوا پێویستە ئەو خاڵەش باسبکرێت، کە تیڕامــان دەبێت بە ڕابردوو هەروەها داهاتووش بــۆ بوونی خۆی. کەوابوو نابێت دەســتکەوتی تێڕامانەکــەی دێکارت یــان کۆجیتۆکەی بە ســاتە نەبڕاوەکانەوە ببەســتینەوە. ئەمەش ئاکامی ئەو باوەڕەیە، کە گوایە بیرکردنەوە ڕابردوو لەنێو خۆیــدا هەڵدەگرێ و داهاتــووش دیاریدەکات. لــەم ڕووەوە دێکارت دەڵێت؛ من گومــان دەکەم، کەوابوو من هەم. چی بەســەر میتۆدی گومانکارییدا دێت ئەگەر گومان بە ساتەکانەوە ببەستینەوە؟ هەڵبەتە ئاکامەکەی پاشخستنی حوکمدانە.

بــەڵام پاشخستنی حوکمدان گومان نییە و بونیادی پێویستی گومانکردنە. بۆ ئەوەی گومان هەبێت، پاشخستنــی حوکمدان پێویستە و ناتەواوی ئەو هۆکارانە پەیدایدەکــەن، کە ڕێگەمان نادات زانینەکــە بسەلمێنن یان ڕەتیبدەنەوە. گومان لەسەر بناخەی تێگەیشتنی پێش—ئۆنتۆلۆجییانە پەیدا دەبێت و داوای دۆزینەوەی ڕاســتیمان لێدەکات. ئەم تیگەیشــتن و داواکارییە واتا بە گومان دەبەخشێت و ڕاســتەقینەی مرۆڤایەتی لەنێو جیهاندا ســەرقاڵ دەکات؛ ئەوان بابەتێکی زانین و گومــان لەنێو کاتێکی جیهانیدا دەهێننە پێــش. کەوابوو، گومانکردن جۆرێکە لە هەڵوێست، هەڵوێستی ڕاســتەقینەی مرۆڤایەتییــە لەنێو جیهاندا. ئەو کاتەی خۆمــان لەنێو گومانــدا دەدۆزینەوە بەرەو ئەو داهاتــووە ڕێدەکەین، کە کۆتایی شاردۆتــەوە. خۆمــان دەگەیەنینە ئەو دیوو ڕابردوو، کــە هاندەر و قۆناخەکانی گومانکردنمان نیشان نادات. ئێمەش لە گوماندا بەرەو دەرەوەی خۆمان دەڕۆین و لەنێو ڕانەبردوودا و لە جیهاندا ڕوو لە بابەتە گومانلێکراوەکە دەکەین.

ئـــەم خاڵانەی ڕوونمانکردنەوە بۆ هەموو دەســـتەواژەیەک دەبێت، کە تێڕامان دروستیان دەکات: بۆ نموونە، من دەخوێنمەوە، من خەودەبینم، من هەستدەکەم، من کاردەکەم. ئەم دەستەواژانە، لە لایەکەوە ڕێگەمان نادەن بەڵگە بۆ سەلماندنی تێڕامانەکەمـــان دامەزرێنین. لـــەم حاڵەتەدا ئەو زانینە لەبـــارەی خۆمەوە هەمە دەتوێتـــەوە و لەگـــەڵ بوونمدا دەبێت بـــە ئەگەرێکی ڕووت (چونکـــە بوونی من لەو ســـاتەدا بوون نییە) یان دەبێت یاســـای تێڕامان بەسەر هەموو ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییـــدا بسەپێنیـــن؛ بۆ نموونە، بۆ ڕابردوو، ڕانەبـــردوو، داهاتوو هەروەها بابەتەکەی دابنێین. بەڵام تێڕامان بوون—بۆ—خۆیە، کە بە دوای خۆیدا دەگەڕێ و دەیەوێت هەمووی بوونی خۆی بەردەوام بدۆزێتەوە. بوون—بۆ—خۆ بوونێکی کاتی هەیە و ئەمەش بەم ئاکامانەمان دەگەیەنێت:

یەکـــەم، تێڕامـــان، وەکو شێوازی بوونی بوون—بۆ—خـــۆ دەبێت کاتی بێت و ڕابردوو و داهاتووی خۆی بێت.

دووەم، تێڕامان یاساکانی خۆی بەسەر ئەگەرەکاندا ساخدەکاتەوە. ئەگەرەکان ئێستای من و ڕابردووی منیش بوون. هەروەها تێڕامان ساتی نییە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت تێڕامان لە داهاتوودا داهاتووی ئەو بابەتە دەبینێ، کە ڕووی تێدەکات و لـــە ڕابردووی ئەویشـــدا ڕابردووی ئەو ئاگامەندییە هەیە، کە دەبێ بناســـرێت. بەپێچەوانەوە، لە ڕێگەی ڕابردوو و داهاتووەوە تێڕامان و بابەتەکەی لەنێو بوونە یەکگرتوەکانیاندا جیادەکرێنـــەوە. داهاتووی تێڕامان دامەزراندنی ئەگەرەکانێتی. بە هەمان شێوە ئەمە بۆ ڕابردووی تێڕامانیش دروســـتە. لەم بۆچوونەوە، تێڕامان پـــەرش و بڵاو دەبێتەوە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی لەبەردەم خۆیدا ئامادەیە، ئەوا بەم خۆ ئامادە بوونەوە لەنێو ڕەهەندەکانی کاتدا هەیە.

دەشێ هەندێک بڵێن چۆن تێڕامان سەبارەت ڕابردوو توشی هەڵەکردن دەبێت. منیش دەڵێم، ئەو خۆی لە هەڵەکردن دەپارێزێت ئەگەر ڕابردوو، وەکو دێوەزمەی ڕانەبـــردوو لە شێوازی بیرۆکەدا نەبێت. ئـــەو کاتەی دەڵێم من دەخوێنمەوە، من گوماندەکـــەم، من هیوادارم و هتد، من لە ڕانەبردوومەوە بۆ ڕابردوو دەگەڕێمەوە. ئێستا لـــە دەربڕینی ئەو حاڵەتانەدا توشی هەڵە نابـــم. بەڵام لەوێدا، کە بیر لە ڕابـــردووم دەکەمەوە توشی هەڵەدەبم چونکـــە پەنا بۆ یادەوەری دەبەم. من لەم حاڵەتەدا بیردەکەمەوە و ڕابردووی خۆم نیم. کەوابوو، تێڕامان ئاگاییە لەنێو سێ ڕەهەندەکـــەی کاتدا. ئاگاییەکە بێ بیرکردنەوە لەنێو ئەو ئاگاییەدا، کە بەردەوام بیردەکاتەوە و دەمێنێتەوە. بـــۆ تێڕامان ڕابردوو لەگەڵ ڕانەبردووی ئەو بابەتەی تیرامان ڕووی تێدەکات بوونێکی لەپێشـــتریان هەیە و لە دەرەوە دانراون: ئەوان تەنیـــا لەنێو بوون—بۆ—خـــۆدا نین، بەڵکو بۆ بوون—بۆ—خۆشـــن، کە (هیچ) لە یەکیان جیادەکاتەوە. بە تێڕامان ڕەوتەکە بەو بوونە دەگات، کە لە دەرەوەیە و لە

دەرەوەش نییە. هێشتا تێڕامانی ڕەوان لەوێدا، کە نایەوێ ببێت بە شتێکی، وەکو بوون—لەنێو—خۆ کات دەدۆزێتەوە. ئەگەرەکانی خۆی دەبینێت. ڕانەبردووی خۆی بە ڕەهەندێکی بەرز دادەنێت. تەنانەت ڕابردووشی، کە بووە بە بوون—لەنێو—خۆ بە ڕانەبردووەوە دەبەستێتەوە. تێڕامان، بوون—بۆ—خۆ، وەکو بابەتێکی نایاب بۆ خۆی دەدۆزێتەوە؛ بوون—بۆ—خۆ، وەکو ئەو (خۆ)یەی لە دەرەوەی خۆیدایە و هەمیشەش خۆیەتی و لە ڕەهەندەکانی ڕابردوو، ڕانەبردوو هەروەها داهاتوودا لەنێو جیهاندایە. کەوابوو، تێڕامان کات دەردەخات و بوونی تایبەتمەندی (خۆ) ش، وەکو هەبوویەکی مێژوویی دیاریدەکات. بەڵام ئەو بەردەوامییە دەروونییەی ڕۆژانە سودی لێوەردەگرین و دەبێت بە زنجیرەی ساتەکانمان بەپێچەوانەی مێژوو بوونەکەیە. لەڕاستیدا دەستکردی گۆڕانکارییە دەروونییەکانە. ئەم خۆشییەی هەمە، بۆنموونە، ئەو حاڵەتە دەروونییەیە پاش ناخۆشی توشم بووە و پێس ئەویش، دوێنێ بە حاڵەتێکدا تێپەڕیم، کە شەرمەزاریکردم. پەیوەندییەکانی، وەکو پێشتر و پاشتر لەنێوان ئەم حاڵەتە گۆڕاوانەدا دادەنرێن. هەروەها ئەمانە ئەو حاڵەتانەن بۆ دیاریکردنی کات بەکاردێن. کەوابوو، تێڕامانی مرۆڤ—لەنێو-جیهاندا و لە ژیانی ڕۆژانەیدا، لەنێو حاڵەتە دەروونییەکانیدا پەیوەندییەکی دەرەکی زنجیرەی حاڵەتەکان دەردەخات.

من باسی ئەو خۆشییە دەکەم هەمە یان حەزدەکەم هەمبوایە؛ ئێمە دەڵێین لەنێو خۆشی منداڵیە. ئەمەش لەوەدەچێت من ئەو خۆشییەم هێنابێتەکایەوە یان وەکو شێوازە براوەکانی سپینۆزا، کە لە خەسڵەتەکان جیا بۆتەوە، شتێک بێت لە من دابڕابێت. تەنانەت دەڵێین، من ئەم ئەزموونی خۆشییەم هەیە و ئەویش هات و، وەکو مۆر بەسەر کاتی منەوە خۆی نەخشاند؛ یان باشترە بڵێم، وەکو ئەوەوایە خۆشی و هەستکردن و بیرۆکەکان میوانی ئێستای من بن. ناکرێت بە وەهم دایانبنێین. بەردەوامبوونی دەروونی ڕەوتێکی کۆنکرێتییە. بەکورتییەکەی، فاکتۆرە دەروونییە بەردەوامەکان فاکتۆری ئاگامەندین. بێگومان ڕاستەقینەی ئەم فاکتۆرانە بابەتە دەروونییەکانن، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا، کە پەیوەندییەکەیان بەدەروونەوە، وەکو حاڵەتی غیرەکردن، ڕق و کینە، پێشنیار و فێڵ و تەڵەکەبازی و هتد، دیارە. هەمانکات ناتوانین بوون—بۆ-خۆ، کە دەبێت بەبناخەی بەکاتبوون ئەم خەسڵەتانە بێت. ئەگینا یەکێتی بوونی پەرتوبڵاو دەبوەوە و هەر بەشێکی بوونی لە دەرەوەدا بەرانبەر بەشەکانی دیکەی ڕادەواستا و جارێکی دیکە کێشەی کات سەریهەڵدەدایەوە. دەگونجێت بوون—بۆ—خۆ بە ڕابردووی خۆی دابنێین، بەڵام ناکرێت بڵێین ئەو خۆشییەی من هەمە لەو خەمەوە سەریهەڵداوە، کە لەپێشتر توشم بوو.

زانا دەروونناسەکان ئەم فاکتۆرە دەروونییانەیان لە ئاستێکی نزم داناوە و لەو

باوەڕەدان پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. گوایە هەورەگرمە پاش بێدەنگییەکی درێژخایەن دەبیسترێت. ئەمە دروستە، بەڵام پەیوەندییەکەیان بەزنجیرە دانەناوە چونکە باسی بناخە ئۆنتۆلۆجییەکەیان نەکردوە. لەڕاستیدا، ئەگەر ئێمە لە واتای بوون—بۆ—خۆ، وەکو بوونەوەرێکی مێژوویی تێبگەین، ئەوا فاکتۆرە دەروونییەکان لەناودەچن. حاڵەت و کردەوەکان نامێنن و ڕێگە بۆ بوون—بۆ-خۆ خۆشدەکەن تاکو بەوجــۆرە خۆی دەربخات، کە بەبێ ئەو یان بەبێ تایبەتمەندێتی ئەو، وەکو تاک پرۆسەی مێژووی نابێت. ئەم بناخەیە دەبێت بە سەرچاوەی بەردەوامبوونەکە و بە باری گرانی ڕابردوویەوە ڕوو لە داهاتوو دەکات. لێردا بۆمان دەردەکەوێت ئەم فاکتــۆر و حاڵەتانە لەنێو بوونی ئەودا بوون نین. ئەوەی هەیە پەیوەندی ناوەکی نێوانیانە لەم بووندا و بەبێ بوون—بۆ—خۆ نادۆزرێتەوە.

ئێمە لەبەردەم دووجۆر کاتدا ڕادەوەستین: کاتی بنەڕەتی، کە بوونی ئێمەیە. دووەمیــش کاتی دەروونی، کە کتوپڕ دەردەکەوێــت و ناتوانێت لەگەڵ شێوازی بوونمــان هاوتەراز دابنرێــت. ئەم جۆرە کاتە، وەکو ڕاســتەقینەیەکی دەروونی بابەتی لێکۆڵینــەوەی زانستانەیە و ئامانجی کردەوەکانی مرۆڤە (من هەوڵدەدەم کارێــک بکەم تاکو ئانا منــی خۆشبوێت)، (هەوڵدەدەم خۆشەویستی ئەو بۆ من دروستبێت). ئەم کاتە دەروونییە ڕاستەوخۆ لە کاتە بنەڕەتییەکەوە سەرهەڵنادات؛ کاتی بنەڕەتی بناخەی بوونی خۆیەتی. بەڵام کاتی دەروونی لەسەر بوونی خۆی ڕاناوەســتێت و بەردەوام بوونی فاکتۆرەکانە. لەسەرو ئەمانەوە، کاتی دەروونی بەبــێ تێڕامان و بیرکردنــەوە نییە. بیرکردنەوە کاتی دەروونی دروســتدەکات. ئەو پرســیارەی لێرەدا پێویستە بکرێت ئەوەیە، ئایا چۆن تێڕامان، کە ڕەوان و ســادەیە ئەم کاتە دەروونییە پێکدەهێنێت؟ پێویستە تێڕامانی ڕەوان و ناڕەوان لــە یەکدی جیابکەینــەوە. ئەوەی بەردەوامبوونی کاتــی دەروونی پێکدەهێنێت تێڕامانی ناڕەوانە. ئەوەی ڕۆژانە توشمان دەبێت ڕەوان نییە. تێڕامانی ڕەوان پاش گۆڕانکاری دروســت دەبێت. لە شێوازی خەم دەربڕیندایە. ئێمە لێرەدا جێگەمان بۆ باسکردن لەسەر خەم ڕەوانەوە نییە. ئەوەی مەبەستمانە ڕوونکردنەوەی واتای تێڕامانــی ناڕەوانە. ئەو تێڕامانە کاتی دەروونی بە ئێمە دەناســێنێت. تێڕامان، بــەو جۆرەی ڕوونمانکردەوە ئەو جــۆرە بوونەیە، کە بە بوون—بۆ—خۆ ناوزەدی دەکەین و دەیەوێت ببێت بەوەی هەیە. کەوابوو، تێڕامان لە مەبەست بەدەر نییە و بوونێکــی بێباک و گوێنەدەری نییە. ئەو هەمیشــە (بۆ) شتێکە. بوونێکە، کە لــە بناخەیدا (بۆ) هەیە. واتای تێڕامان کەوابوو، لە بوون—بۆ—خۆدایە. بەئاشکرا دەتوانین بڵێیــن تێڕامان ئەو بوونە-بۆ—خۆیەیە، کە بۆ دۆزینەوەی خۆی بوونی خــۆی لەناودەبــات. تێڕامان لەگــەڵ ڕوونکردن لە بابەتەکــەی لە بوونی خۆی ڕادەکــات و نایەوێــت، وەکو ئەو شتــە بمێنێتەوە، کە هەیــە. بۆ ئەوەی خۆی

بدۆزێتـــەوە و بگات بە خۆی لە بوونی خـــۆی ڕادەکات. ئەمەش دەبێتە هۆکاری دۆزینـــەوەیتێڕامانـــیڕەوان.

تێڕامانی ناڕەوان، لەگەڵ وەستان لە ئاستی بابەتەکەیدا دەبێت بە بوون-لەنێو - خۆ. هاندەرەکەی، وەکو لەپێشـــتر باســـمانکرد، دوو لایەنی هەیە؛ لەنێو خۆیدا دەمێنێتەوە و لە دەرەوەشدایە. تێڕامانی ناڕەوان وەســـتانە لەبەردەم بابەتەکەیدا و دەیەوێت ببێت بەو بابەتە.

ئەمـــەش ئەوە دەگەیەنێت، کە تێرامانی نا-ڕەوان ســـێ لایەنی هەیە: خودی تێڕامان، بابەتی تێڕامان و ئەو بوونە-لەنێو-خۆیەی پاش تێڕامانەکە سەرهەڵدەدات. ئەمـــەش بۆ تێڕامان یان بوون-بۆ-خۆ پرۆژەیـــە و بوونی شتێک نییە هەبێت، بەڵکو دروســـت دەکرێت. بابەتێکە تێڕامـــان ڕووی تێدەکات و بوونی دەردەخات. هەمانکات، نابێت ئەم بوونە-لەنێو-خۆیە بە بەها دابنرێت چونکە بابەتێکە بوونی بۆ هەموو تێڕامانێک پێویستە. ئەو بابەتە بەرزەیە لە دەرەوەی تێڕاماندا و هەموو تێڕامانێک ڕووی تێدەکات. هەڵوێستی تێڕامان لە ئاستی بابەتەکەشدا بەمجۆرەیە؛ یەکەم، ڕووکردنە بابەتەکەیە لە لایەن تێڕامانەوە.

دووەمیـــش، دیاریکردنـــی بۆچوونە بەرانبەر بابەتەکە. لـــە داکەوتدا ئەم دوو هەڵوێستـــە یەک شتـــن چونکە ڕەتدانـــەوەی تێڕامان بۆ بابەتەکـــە دیاریکردنی بۆچوونـــە. دەبینیـــن بابەتکردنەکە پەیوەندی بە خۆ جیاکردنـــەوەی تێڕامان لە بابەتەکەیـــەوە هەیە. خۆ جیاکردنـــەوەی تێڕامان ئەوە دەردەخات، کە بۆ ئەوەی بابەتی تێڕامان هەبێت، تێڕامان بابەتەکەی بە شتێکی جیاوازتر لە خۆی دادەنێت. بەهەرحـــاڵ، ئەم تێڕامانە لە بـــڕوای خراپدا هەیە. پەیوەنـــدی نێوان تێڕامان و بابەتەکـــە دەبڕێت. بانگەشەی ئەو خاڵەش دەکـــات، کە تێڕامان لە شێوازی ئەو بوونـــەدا، کە نییە و لە کاتـــی ڕووکردنی لە بابەتەکە ئەو بابەتە نییە و جیاوازە. تێڕامان لە بڕوای خراپدا دەژی ئەگەر خۆی بە دەرخستنی ئەو بابەتە دابنێ، کە من-دروســـتیدەکەم. بەڵام، دەبێت ئەوەش بزانین ئەو لەناوبردنە ڕادیکاڵە ڕاست یان ڕوودانێکی مێتافیزیکی نییە. ڕوودانی ڕاست لە پرۆسەی سێیەمدایە، کە دەبێت بە بوون بۆ ئەوان. تێڕامانی نا-ڕەوان هەوڵدانی بوون-بۆ-خۆیە بۆ ئەوەی ببێت بـــە شتێکی دیکە و هەمانکاتیـــش، وەکو خۆی بمێنێتەوە. ئەوەی تێڕامان ڕووی تێدەکـــات و لە دەرەوەی تێڕامانداییە، وەکو بابەتێکی بەرز خۆی دەردەخات تەنیا بوونێکە، کە تێڕامان دەتوانێت لە بارەیەوە بڵێێت، ئەو شتەیە، کە خودی تێڕامان نییە. بەڵام ئەو بوونە ســـێبەرە و دروســـتکراوە. تێڕامانیش بۆ ئەوەی خۆی لەو بابەتە جیابکاتەوە دەبێت خۆی بکات بە ئەو. ئەم سێبەرەی بوون و پەیوەندییە پێویستـــەی تیرامانی ناڕەوانە لە زانستی دەروونناســـیدا بـــە فاکتۆری دەروونی ناوزەد دەکرێت. کەوابوو، فاکتۆری دەروونی سێبەری ئەو بابەتەیە تێڕامان ڕووی

تێدەکـــات. لێرەدا، تێڕامان ئەگەر (بوونێکی—بۆ—خـــۆی لەنێو—خۆ) بێت دەبێت بـــە ناڕەوان. ئەوەی خۆی بۆ تێڕامان دەردەخـــات شتێکی کاتی و بێ ناوەڕۆکی مێژوویی نییـــە. بوونێکە خاوەنی ناوەڕۆک و بونیادێکـــی دامەزراو. یەکێتی ئەم بوونانـــەش ژیانی دەروونی پێکدەهێنێت. تێڕامانی ناڕەوان زانینێکی لەپێشـــترە؛ دەتوانیـــن بڵێین، کە زانینـــی تێڕامانی دەروون هەیە. هـــەر یەکێک لە فاکتۆرە دەروونییەکان خەســـڵەتی ڕاســـتەقینەیان، وەکو بابەتی تێڕامان هەیە. بەڵام لە ئاستی خۆیان دابەزیون و بوون بە شتێکی لە-نێو—خۆ. ڕوونکردنەوەی زۆرتریش لەبارەی دەروونەوە ڕووناکی دەخاتە سەر ئەم بابەتە لەنێو—خۆیە.

١. مەبەســـت لە دەروون (خۆ)یە و هەموو دۆخ و خەسڵەت و چالاکییەکانیشی دەگرێتەوە. (خۆ) لە ڕێزماندا دوو واتای هەیە (من) و (خۆم)؛ ئەمەش کەسایەتی ئێمـــە، وەکو کەســـایەتییەکی یەکگرتـــوی بەرز دەردەخات. باســـی ئەمەمان لە شوێنێکـــی دیکەدا کردوە. ئێمـــە خۆ یان بکەرین، کارتێکەر یـــان کارتێکراوین، خۆبەخشـــین یان بابەتێکی گونجـــاو، کە حوکمیان بەســـەردا دراوە و لەبەردەم لێپرسینەوەیەکدا ڕاوەستاوین.

خەســـڵەتەکانی (خۆ) لە چاکەکان و تەوانـــا و هەڵسوکەوتەکان پێکهاتوون. خۆ خەسڵەتی توڕەبوون، کۆششـــکەر، غیرەتکەر، هەستیار و هتد یە. پێویستە ئەو خەســـلەتانەش بناسینەوە، کە پەیوەندییان بە مێژوومانەوە هەیە و بەمجۆرە دەردەکەون؛ من دەتوانم تەمەنی خۆم دەربخەم، بڵێم ماندووم، بەرەو لاوازی دەڕۆم یان پێشدەکەوم؛ دەتوانم بڵێم سەرکەوتنم مسۆگەر کردووە یان بەپێچەوانەوە هێدی تامی خۆش و سێکس پاش نەخۆشکەوتنێکی گران ناکەم. دۆخەکان بەپێچەوانەی خەســـڵەتەکانەوە بە هێزەکی هەن و دەبن بە کردەکی. خۆشەویستی، ڕق و غیرە دۆخن. نەخۆشی، لەوێدا نەخۆشەکە هەســـتی پێدەکات و توشی دەبێت حاڵەتە. بەهەمان شێوە ئەو هەڵسوکەوتانەی لە دەرەوە بە کەســـایەتی منەوە نوساون و من لەگەڵیاندا دەژیم بۆ بوونم دەبن بە حاڵەت. ئەوەی نییە، تاڕاوگەنشـــین، یان ســـەرکەوتن حاڵەتن. دەتوانین جیاوازی نێوان خەسڵەت و حاڵەت ڕوونبکەینەوە: دوێنێ پاش ئەوەی توڕەبووم هەڵچونەکەم لە شێوازێکی ســـادەدا تاکو ڕادەیەک مایەوە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، پاش کردەوەکەی پیتەر نواندی و من ناڕازیبووم لەسەری، ڕقەکەم، وەکو هەستکردنێکی ڕاستەقینە هەرچەندە من ئێستا لەوانەیە بیـــر لە شتێکی دیکە بکەمەوە، بەردەوام ماوەتەوە. هەروەها خەســـڵەت شتێکی زکماکە یان دراوە، کە کەسایەتی هەیەتی. حاڵەت شتێکە بە سەر مندا ڕوودەدات. هەندێکجار شتێک هەیە دەکەوێتە نێوان حاڵەت و خەســـڵەتەوە. بۆنموونە، ڕق و کینەی (پـــۆزۆ دی بۆرگۆ) بەرانبەر ناپلیـــۆن هەرچەندە پەیوەندییەکی بڕاوە و تەمـــەن کورت لەنێوان ئەو دوو مرۆڤەدا دیاریدەکـــات، بەڵام پێکهاتەیەک بوو لە

کەســـایەتی ڕۆژانەدا. مەبەســـت لە کردەوە چالاکییەکانی تاکە کەسە؛ ئەو ڕێگە و مەبەســـتانە دەردەخات بۆ گەیشتن بە کۆتایی دەیانگرینەبەر. ئەم کردەوانەش لە دەرەوەی بوون—بۆ—خۆدان و تێهەڵکێشـــەیەکی بـــەرزی دەروونین. مەشقکردنی یاریزانێکی مشتبازی کردەوەیەکی بەرزە و یاریدەی بوون—بۆ—خۆ دەدات لە ڕێگەی مەشقکردنەکەوە بوونی خۆی بناســـێت. ئەمە بەسەر توێژینەوە و گەڕانی زانست و هونەرمەند و تەنانەت پڕوپاگەندەی دەســـتەڵاتمەدارێک لـــە کاتی هەڵبژاردندا دەســـەپێت. لەم کردەوانەدا بوون—بۆ—خـــۆ دەبێت بە نوێنەری بوونێکی بەرز لە جیهاندا و لایەنێکی دەرەکی بوونی  خۆی دیاریدەکات.

٢. چەمکی (دەروونی) بە کاتیگۆری زانینەوە بەستراوە. پەیوەندی بە کارکردنی تێڕامانـــەوە هەیە. لە کاتێکدا بوون—بۆ—خۆ تێڕامانی نییە، دەبێت بە شێوازێکی لە بیرکردنەوە بەدەر. ئەوانـــەی بە مەحاڵ دادەنرێن ئەگەرن لەنێو جیهاندا. هەر شتێک بـــۆ بیرکردنەوە یان بیرنەکردنەوە دەرکەوێت بەحاڵەتەوە بەســـتراون. لە ئاکامدا ئەو گۆڕانکارییانەی بیرکردنەوە لە جیهاندا دەیان خاتە گەر لەشمان، وەکو ئامێرێک بۆ ئەنجامدانیان بەکار دەهێنێت.

ئەو کەســـەی توڕەیە تەماشای بەرانبەرەکەی دەکات و ڕوخساری دەبینێت، وا هەستدەکات ئەو ڕوخسارە داوای مشتێکی لێدەکات. ئێمە هەندێکجار دەڵێین (لەشی بـــۆ لێدان دەخورێت) یان (بە دوای کێشـــەدا دەگەڕێـــت.) لەشمان، وەکو ناوەند بـــۆ حاڵلێهاتـــن بەکارهێناوە. لە ڕێگەی لەشەوە هەســـت بـــە هەندێک حاڵەتی، وەکو (خەریکە دەخۆینەوە، یارمەتی بـــە ڕێگەوەیە یان خەریکە ئاژەڵێکی دڕندە دەکوژین) دەکەین. لەم حاڵەتانەدا لە پەیوەندی ئۆنتۆلۆجی نێوان بوون—بۆ—خۆ و ئەگەرەکان (وەکو بابەت) تێدەگەین. کەوابوو، کردەوە خۆی لەبەردەم تێڕامانی ئاگامەندییدا قوتدەکاتەوە. مەحاڵە من لە یەک کاتدا و لە یەک ئاستدا ئاگام لە پیرۆ و هاوڕێیەکەشـــی بێت. بوون—بۆ—خۆ ئەم دوو شتە لە یەکدی جیادەکاتەوە. ئەم بوون—بۆ-خۆیەش ڕاستەقینەیەکی شاراوەیە؛ لە حاڵەتی ئاگامەندییدا ئەو شتەیە، کـــە بیری لێنەکراوەتەوە و لە جیهاندا کارتێکراوە. لـــە حاڵەتی بیرکردنەوەشدا، بـــوون— بۆ—خۆ ڕوو لە بابەتە دەرەکییەکەی دەکات. تەنیا ئاگامەندی دەتوانێت بوون—بۆ—خۆ بناسێت و ڕووناکی بخاتە سەر. ئێمە چەمکی (دەروونی) بۆ هەموو ئەو هەبووە بەرزانە بەکاردەهێنین، کە زەخیرەیەکی بەردەوامن بۆ تێڕامانی ڕەوان و بابەتی توێژینەوەی زانستی دەروونناس.

٣. ئەم بابەتانـــە کۆنکرێتین و ڕووتکراوە نین؛ تێرامان بەبێ ناوەڕۆک ڕوویان تێناکات. ئێمە چەمکی بەڵگە بۆ ئامادەبوونی ڕاســـتەوخۆی ڕق و تاراوگەنشـــین و گومانی بەردەوام لە کەســـایەتی تاکە کەســـدا بەکار دەهێنین. بۆ سەلماندنی ئەمـــەش وەبیرهاتنەوە لە ئەزمونەکانی خۆمانـــدا یارمەتیمان دەدات. بۆ نموونە،

دەتوانیـــن بیر لـــە خۆشەویستێکی مردوو یان بارودۆخێکی هۆشەکی پێشـــومان بکەینـــەوە. هەوڵدەدەین چەمکی تایبەتییان بۆ دابنێین و باســـیان بکەین. بەڵام دەزانیـــن لەوێ نین. هەروەها حاڵەتیش هەیـــە خۆشەویستییەکەمان تێداکردوە، بەڵام هەستمان پێنەکردوە. پرۆست جوان باسی ئەم حاڵەتە وەستاوانەی نێو دڵی کـــردوە. بەپێچەوانەشەوە، ئێمە دەتوانین هەســـت بە پڕی خۆشەویستی بکەین. لێرەدا بوون—بۆ—خۆ پێویستی بە تێڕامان دەبێت تاکو بیر لە بابەتەکە بکاتەوە. من بیر لە هاوڕێیەتیم لەگەڵ پیرۆ دەکەمەوە، بەڵام ئەو لەسەر بناخەی بەزەیی من بووە بە بابەتی تێڕامانەکەم. بەکورتییەکەی، تەنیا ڕێگەیەک خەسڵەت و حاڵەت و کردەوەکانی تێدا بناسرێن خۆگەیاندنە بە بوون-لەنێو— خۆ.

نموونـــەی ئامادەکردنی خۆشەویستی بۆ بابەتێکی بەرزی دەروونی بەڵگەیەکی چاکە. لـــەو حاڵەتەدا کتوپڕ خۆشەویستییەکەم دەبینـــم و ئەو بابەتە لەبەردەم ئاگامەندیمدا ڕادەوەستێت. من دەتوانم بۆچوونی خۆمی لەسەر دیاریبکەم، حوکمی بەسەردابدەم چونکە بووە بە بابەتی تێڕامان و من لەناویدا نیم. بووە بە بابەت یان بوون— لەنێو—خۆیەکی پڕ و ڕەق و شەفاف. لێرەوە بەو باوەڕە دەگەین، کە ئەو بەڵگەیەی دەروون بۆ تێڕامانی ناڕەوان ئامادەی دەکات سەلمێنراو نییە. کەلێنێک لـــە نێوان ئەو بوون—بۆ—خۆیەی داهاتوودا، کە تێڕامان ڕوویتێکردووە و بەردەوام ئازادییەکەی منیش دەیخوات و ســـوکتری دەکات، هەروەها خۆشەویستییەکەیدا هەیە. ئەگەر من خۆشەویستی، وەکو بابەتێکی دەروونی لە داهاتوودا نەبینم، ئایا دەتوانیـــن بڵێین خۆشەویستی هەیە؟ ئایا نابێت بە ئارەزوویەکی کتوپڕ؟ ئایا ئەو ئارەزووە کتوپـــڕە وەکو خۆی دەمێنێتەوە و نابێت بە خۆشەویستی؟ لەناوبردنی داهاتووی بوون—بۆ—خۆ لە ئاستی دامەزراندنی خەسڵەتەکانی بوون—لەنێو—خۆدا ڕێگـــرە. لەم لەناوبردنە بەردەوامەدا لایەنە دامەزرێنـــراوە دەروونییەکان دەبن بە ئەگەر و شتێکی شیاو. ئەمانەش خەسڵەتی دەرەکی نین و زانین پەیدایان ناکات، بەڵکو هەڵسوکەوتی ئۆنتۆلۆجییانەن.

٤. فۆرمـــی دەروونی، بەردەوام کەم هێز دەبێت. وەکو دەســـتنەکەوت خۆی دەردەخـــات، چونکە بوون—بۆ—خۆ لەنێو بوونـــی هەمووگیری خۆیدا پەرشوبڵاو دەبێتـــەوە. ئەوەی دەروونییە لەنێو ســـێ ڕەهەندەکەی کاتدا؛ ڕابردوو، ڕانەبردوو و داهاتـــودا دەبینرێت. پرۆژەی خۆشەویستی ئەم ســـێ ڕەهەندەی لەنێو خۆیدا پێکەوە بەســـتۆتەوە. دروســـت نییـــە بڵێین خۆشەویستی خاوەنـــی داهاتووە و داهاتووش بە شتێکـــی دەرەکی دابنێین. داهاتوو بەشێکی ڕەوتی خۆشەویستییە و واتاکەی دەردەخات. بـــە حوکمی ئەوەی بابەتی دەروونی بوون—لەنێو—خۆیە، ئـــەوا ڕانەبـــردووی ئەم بابەتە هەڵهاتن نییـــە و داهاتووشی نابێت بە ئەگەرێکی ڕەوان. لەم ڕەوتەدا ڕابردوو دەبێت بە بنەڕەتی و خۆسەپێنەر، کە بوون—بۆ—خۆ

تیایدا ژیاوە و ئەم بوونەش دەکات بە بوون—لەنێو—خۆ. تێڕامان هەموو بابەتێکی دەروونی لە سێ ڕەهەندەکەدا دەبینێت، بەڵام ئەم سێ ڕەهەندە لەسەر ڕابردووی بابەتەکـــە دادەمەزرێنێت. داهاتوو، دەبێ هەبێت ئەگینا چۆن خۆشەویستییەکەی مـــن دەبێت بە خۆشەویستـــی؟ خۆشەویستییەکەم ئێستا هەیـــە، بەڵام نەدراوە یـــان خۆی دەرنەخستوە. کەواتـــە، نابێت بەو ئەگەرەی مـــن دەمەوێ بیگەمێ؛ خۆشەویستییەکەم و خۆشییەکەم نابن بە داهاتوو چونکە وەکو چۆن پاندانەکەم شتێکـــە هەیە، ئەوانیش هەن. ڕانەبردووش بە ڕاســـتەقینە و لەوێدا دەبینرێت و لەسەرەوە تاکو خوارەوە خۆی چەکدارکردووە و دامەزراوە. ئەو کاتەیە لە یارییەکەدا دێتە دەرەوە و بۆی دەگەڕێتەوە. تێپەڕبوونی (ئێستا) لە داهاتووەوە بۆ ڕانەبردوو، لە ڕانەبردووشەوە بۆ ڕابردوو گۆرانکـــاری ناهێنێتە کایەوە چونکە داهاتوو هەبێ و نەبـــی ڕابردووە. نموونەی ئەمەش لە هەوڵدانی ئەو زانا دەروونناســـەدا ئاشکرا دەبێت، کە دەیەوێت بـــۆ لایەنەکانی ئەودیو ئاگاییەوە بگەڕێتەوە و لە (ئێستا)ی حاڵەتە دەروونییەکە تێبگات. ئەو (ئێستا) بەو ڕانەبردووە دادەنێت، کە لەبەردەم ئاگامەندییدا ئامادە بووە. ئەوانەی بەرەو داهاتووشن بەهەمان شت دادەنرێن، بەڵام لەنێوان ئاگامەندی و ئەودیو ئاگامەندییدا دەمێننەوە. یادەوەری ئەودیو ئاگامەندی ڕابردووی (ئێستا)یە و لە چاوەڕوانییەکەشیدا (ئێستا)یە لە داهاتوودا. لەم ڕووەوە، شێوازی دەروونی شتێک نییە پەیدا بێت؛ چونکە ئەو هەیە و دروستکراوە؛ تەواو بووە، ڕابـــردوو، ڕانەبردوو لەگەڵ داهاتووی ســـەریانهەڵداوە. ئەو (ئێستا) یانەی پێکیدەهێنن یەکەیەکە، پێش گەرانەوەیان بۆ ئاگامەندی دادەنرێن.

مادامەکـــی شێـــوازی دەروونـــی شتێکـــە هەیـــە و دروســـتکراوە، هەوەها زنجیرەیەی (ئێستا)کانە، بەو ئاکامە دەگەین، کە دوو فۆرمی ناکۆکی بوونی تێدایە. خۆشی، بۆ نموونە، لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە دەڕوات چونکە داهاتووەکەی شتێکی بینراوە و هەیە. لەڕاستیدا، پێکەوەنوسانی شێوازە درەوونییەکان، بێجگە لە یەکگرتنی بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆ چی دیکە نییە. ڕق پارچەپارچە ناکرێـــت و بەشی نییە؛ تەنانەت کـــۆی هەڵوێست و حاڵەتەکانی نێو ئاگامەندیش نییە. ئـــەو خۆی لەنێو حاڵەتەکانـــی ئاگامەندییدا وەکو یـــەک شت بەبێ بەش دەردەخات. یەکێتی بوون—بۆ—خۆ پەیوەندی بە دەرچوونی ئەم بوونە لەخۆیەوە و ژیانێتـــی لەنێـــو ڕەهەندەکانی کاتدا هەیە. شێوازی دەروونـــی، بەپێچەوانەوە، شتێکی دروســـتکراوەوە ناتوانێت خۆی بڕیار لەســـەر بوونـــی خۆی بدات. بەڵام هێزی بەردەوامی هەیە و زانا دەروونناسەکانیش لەو باوەڕەدان حاڵەتی نەخۆشی دەروونییە. لەم ڕووەوە دێکارت لەسەر (سۆزەکانی دەروون) دەنوسێت. هەرچەندە بوونـــی شێوازە دەروونییەکان لە بوونی بابەتێکـــی دەرەکی ناچێت، بەڵام هێزی بەردەوامبوونی یارمەتیمان دەدات لەگـــەڵ بابەتە دەرەکییەکاندا پەیوەندییەکەی

دیاریبکەیـــن. خۆشەویستی بەرانبـــەر بابەتە حەزلێکراوەکە ســـەرهەڵدەدات. لە ئاکامدا پێکەوەنوسانە هەمووگرییەکەی شێوازە دەروونییەکان، لەبەر ئەوەی نابێت بە تێهەڵکێشـــەی بوونی خۆی، یەکگرتنەکەی شتێکی دروستکراوە دەردەچێت و ناناسرێت.

ڕق زنجیـــرەی ئێستاکانە و لەنێو خۆیدا دابەشبوونێکـــی نەبڕاوەی هەڵگرتوە هەمانکات، لەبەر ئەوەی شێوازی دەروونی بابەتێکی ئۆنتۆلۆجی ئەو یەکێتییەیە کە بوون—بۆ—خۆ هەیەتی، دابەشبوونەکە شاراوەیە و دەرناکەوێت. جۆرە یەکگرتنێکی سیحراوی لەنێوان (ئێستا)کانی ڕقدا هەیە، کە پەیوەندییە دەرەکییەکانی نێوانیان لادەبات.

جۆرە ئاڵۆزییەک لە بیردۆزەکەی برگسۆندا سەبارەت بەردەوامبوونی پیاچوونی فرەلایەنەکانی ئاگامەندی سەرهەڵدەدات. ئەوەی برگسۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردوە حاڵەتی دەروونییە نەک ئاگامەندی یان بوون—بۆ—خۆ. ئایا پیاچوون چ واتایەکی هەیـــە؟ بەگوێرەی بیـــردۆزەی دابەشکردن دەبێ هەبێت. بـــەڵام بەشەکانی، کە هەریەکەیان بە تەنیا ڕادەوەستێت، بە سیحراوی دەچنە نێو یەکدییەوە و پێکەوە دەنوسێن و گشتگرییەک پێکدەهێنن. ئەم گشتگرییە ڕێگە بە ئێمە نادات لەسەری بکۆڵینەوە. برگسۆن نایەوێت خەسڵەتی شێوازی دەروونی لەسەر بونیادێکی ڕەهای بوون—بۆ—خۆ دابمەزرێنێت. ئەو، وەکو شتێکی دراو لە ڕێگەی تێڕوانینێکی سادەوە دەیبینێت و بە لایەنە فرە ناوەکییەکانی دادەنێت. خەسڵەتی بەردەوامبوونی هەیە و دەتوانێـــت بەبێ ئەوەی ئاگامەندی بیری لێبکاتـــەوە هەبێت. مادامەکی مرۆڤ تەوانای ناســـینی نییە، ئـــەوا دەتوانێت بەبێ ئەوەی ئاگامەندی هەســـتیپێبکات هەبێت. کەوابوو، بابەتێک لە جیهاندا بەبێ هەســـتکردن بە بوونی هەیە. هەروەها خەســـڵەتی بەردەوامبوونی دەروونی بۆ برگسۆن فاکتۆرێکی ئەزموونییە؛ ئێمە بەو شێوەیە دەیبینیـــن. کاتی دەروونی بەردەوامبوونێکـــی دراوە. ئەو بەردەوامییە بەبێ ئەوەی کات کاریتێبکات خۆی لەنێو کاتدا دادەنێت. بێگومان یەکێتی ڕەهای دەروون پرۆژەیەکی ئۆنتۆلۆجی بوون—بۆ—خۆیە لەنێو ڕەهەندەکانی کاتدا. بەڵام لەبـــەر ئەوەی ئەو پرۆژەیـــە بوون—لەنێو—خۆیەکی دروســـتکراوە، بەشەکانی لە یەکدی جیادەکرێنەوە و دەبن بە ژمارەیەکی (ئێستا)ی نەبڕاوە.

لەبەرئەمـــە بەشداربوونی نێوان بوون—لەنێو—خـــۆ و بوون—بۆ—خۆ لە کاتی دەروونیدا جـــۆرە ناکۆکییەکی لەچارەبەدەر دەشارێتەوە. ئەمەش بۆ ئێمە مایەی سەرســـوڕمان نییە. کاتی دەروونی بەرهەمی تێڕامانی ناڕەوانە و شتێکی نەبووی دروســـتکراوە و ئەو شتە نییە، کە دروســـتکراوە. پاش ئـــەم توێژینەوەیە باشتر لـــە واتای پەیوەندییەکانـــی نێوان شێوازە دەروونییەکـــان لەنێو کاتی دەروونیدا تێدەگەیـــن. لەپێش هەموو شتێکدا دەڵێین، ڕاڤەکردن حوکم بەســـەر پەیوەندی

نێوانیان دەدات. هەموو کەسێک دەزانێت هەستکردنەکانی، وەکو حەسودی و ڕق یان ئەوانەی ڕۆماننوسـەکان باسیدەکەن لەنێو دەروونددا هەن. بێگومان دەتوانین ڕاڤەی ئەو هاوڕێیەتییە بکەین، کە حەسـودی، وەکـو چۆن شیر ڕەنگی قاوەکە دەگـۆڕێ، تەڵخی کردووە. لەو باوەڕەدام ئـەم بەراودکردنە جۆرە زیادەڕۆییەکی تێدابێت. هێشـتا شەیدابوون لە هاوڕێیەتییـدا بەشێک لە جۆری هاوڕێیەتی نییە و بەو شێوەیەی لاکێشـەیەکی هاودوولا سـەر بە جۆری لاکێشـەیە. هاوڕییەتی خۆشەویستـی پڕی دەکاتەوە. هەمانکـات خۆشەویستیش نییە. ئەگەر ببێت بە خۆشەویستی نابێت بـە هاوڕێیەتی. دەبێت بە بابەتێکی نەگۆڕ لەنێو خۆیدا، کە زمان ناتوانێت ناوێکی بۆ بدۆزێتەوە.

لە پرۆسـەی دەروونیدا شێوازی دەروونی دوور و لەپێشـتر کاردەکاتە سـەر شێوازی دەروونی پاشتر. ئەمەش سـەر بە یاسـای هۆکارێکی—میکانیکی نییە. پەیوەندیی بە بۆچوونەکەی (جۆن سـیتوارت میل)ەوە نییە، کە باسـی پێکەوە بوونی دوو ڕووداو دەکات. مادامەکی لایەنی دەروونی خۆ بەبابەتکردنی بوون—بۆ-خۆیە ئەوا سـەرهەڵدانە کتوپڕییەکەی ناوەکییـە و لە شێوازە دەروونییەکەشیدا لەو هێزە جیانابێتەوە، کە لێوەی هەڵقولاوە. سـەرهەڵدانی کتوپڕی ئەم شێوازە شتێک نییە لە فۆرمێکی پێشـوترەوە پەیدا بووبێت. فۆرمی لەپێشتر لە دوورەوە کاریگەرێتی خۆی بەسەر فۆرمێکی نوێدا دەخاتەگەر و ئەم فۆرمە نوێیەش کتوپڕ هەڵقولاوە. لێرەدا، ئێمە مامەڵە لەگەڵ ئەو بوونەدا ناکەین، کە دەبێت بە داهاتوو و ڕابـردووی خۆی، بەڵکـو مامەڵەکەمان لەگەڵ زنجیرەی ڕابـردوو، ڕانەبردو و داهاتوودایە. هەموویان لە فۆرمی (هەبوو)دان و لە دوورەوە کاریگەرێتییان بەسەر یەکدییەوە هەیە.

ئەم کاریگەرێتییەش دوو جۆرە، بزواندن و چوونەناوەوە. ئەگەر چوونە ناوەوە بێـت تێڕامان دوو بابەتی دەروونی جیاواز بە یەک شت دەبینێت. ئاکامی ئەمەش بابەتێکی نوێی تێهەڵکێشـراوە. ئـەم بابەتە نوێیەش لەنێو خۆیدا خەسـڵەتی بابەتەکانی پێشـوی هەڵگرتوە. کاریگەرێتی بزاواندن، بەپێچەوانەی کاریگەرێتی چوونەنـاوەوە، دوو بابەتەکە تێهەڵکێش ناکات. هەر یەکێک لە ئەوان لە جێگەی خۆیاندا دەمێنێتـەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتی دەروونـی فۆرمێکی ڕێکخراوە و فرەلایەنـە. هەموو بابەتەکە کتوپڕ کاردەکاتە سـەر هەمووی بابەتێکی دیکە. ئاکامەکەشی کارتێکردنێکی سیحراویی دوورە لەسەر بابەتێکی دیکە. بۆ نموونە، شەرمەزارییەکەی دوێنێ بووە هۆکاری بزاواندنی مەزاجی ئەمڕۆم.

لەڕاستیدا ئەم کارتێکردنە لە دوورەوە سیحراوی و ناماقوڵە. نەزۆکی هەوڵدانی دەروونناسـە هۆشەکییەکانیش بۆ مانەوەیان لەسەر پلەی دەروونی و بەستنەوەی [ئەم بزاواندنەش] بە یاسای هۆکارێکی هۆشگەرییەوە دەسەلمێنێت.

پرۆست، لەڕێگەی هۆشەکییەوە بەردەوام هەوڵیداوە پەیوەندییە هۆشەکییەکان، کە دەبن بە هۆکار بۆ یەکدی لەنێوان دۆخە دەروونییەکاندا بدۆزێتەوە. لەکۆتاییشدا بەم ئاکامەی خوارەوە گەیشتووە:

ئەو کاتەی (سوان) توانی (ئۆدیتە) بە بێ ڕق و کینە بهێنێتە بەرچاوی، بیر لە جوانی زەردەخەنەکەی بکاتەوە، ئەو کاتەی حەزو ئارەزووی ویستی (ئۆدیتە) لای خۆی گلبداتەوە بەبێ غیرە لەوانی دیکەی دووربخاتەوە، خۆشەویستییەکەی جارێکی دیکە ڕوویکردە ئەو تام و خۆشییەی ئۆدیتە پێی دابوو. خۆشییەک، کە لە نیگایەک، زەردەخەنەیەک یان دەنگە ناسکەکەیەوە هەستی پێدەکرا. خۆشییەک جیاواز لەوانی دیکە و[سوان]ی ئارام و هەستکردن بە پێویستی[ئۆدیتە]ش لەلای زۆرتر دەکرد.................................
لەبەرئەمە، پاش دەرهێنانی غیرە لە خۆشەویستییەکەیدا بەرانبەر ئۆدیتە ناسکتر بووەوە.

بەدڵنیاییـــەوە ئەم دەقە پەیوەندی بە کێشـــەیەکی دەروونییەوە هەیە. چەند سۆزێکی تاکە کەسێکی تێدا دەبینین و هەر یەکەیان کاردەکاتە سەر ئەوەی دیکە. پرۆســـت هەوڵی ڕوونکردنەوەیـــان دەدات و دەیەوێت ئێمە لە هەڵچون و داچونی ئەزمونەکەی سوان تێبگەین. پرۆست نایەوێت ئاکامی ئەزموونەکە (بۆ نموونە، لە ڕق و کینەی نێو غیرەوە بۆ نەرم و ناسکی خۆشەویستی) باسبکات؛ ئەو دەیەوێت باسی ئەو گۆڕانکارییە بکات لە ئەزمونەکەدا دۆزیویەتەوە.

ئایا ئاکامی ئەم شیکردنەوەیە چییە؟ ئایا ناماقوڵیەتی کێشـــە دەروونییەکان لاچـــووە؟ چۆن غیرە دەبێت بە هاندەر بۆ دوورخستنـــەوەی [خۆشەویستەکەی] لە کەســـانی دیکە؟ چۆن (ئەو کاتەی غیرە دەبێت بە بەشێکی خۆشەویستییەکە، وەکـــو تەڵخکردنـــی قاوەکە) ڕێگەی نـــادات تامی ئەو خۆشییە بکـــات ئۆدیتە، وەکـــو کـــەس دەیداتێ؟ چۆن خۆشـــی دەبێت بە پێویستی؟ چـــۆن غیرە لەنێو خۆشەویستیدا پەیدا دەبێت و ئۆدیتە لە کەســـانی دیکـــە دووردەخاتەوە؟ چۆن خۆشەویستی پاش ڕزگاربوونی لە غیرە نەرمی و ناســـکی دروستدەکات؟ لێرەدا، پرۆســـت بە شێوەیەکی میتافۆری باسی کێشەکەمان بۆ دەکات. میتافۆرەکەشی یان بەو جۆرەی ئەو بیر لە کێشـــەکە دەکاتەوە هانـــدان و لایەنە ناماقوڵەکەمان بـــۆ دەرناخات. هەوڵدانەکەی ئێمە بـــەرەو ڕاڤەکردنێکـــی میکانیکی بۆ شێوازە دەروونییەکان پەلکێش دەکات. لەبەرئەمـــە ڕوونکردنەوەکەی کەموکورتی تێدایە و کارتێکردنەکەشـــی بۆ جیاکردنەوەی شێوازەکان بنەڕەتی نییە. پێویستە واز لە کەمکردنـــەوەی لایەنە ناماقوڵەکان بۆ هۆکارە دەروونییەکان بهێنین. ڕووکردن لە

هۆکـــاری دەروونی نزمدانانی ڕەهەندە کاتییەکانی بوون—بۆ—خۆیە. ئەم بوونە لە دوورەوە و لە دەرەوەی خۆیدا لەنێو خۆیدایە. زانا دەروونناســـەکان دەبێت ڕاڤەی ئەم لایەنە ناماقوڵانە و پەیوەندییەکانی نێوانیان بکەن و بە بابەتی ڕاســـتەقینەی نێو جیهانی دەروون دایبنێن.

کەوابـــوو، ئاگمەندی تێرامانـــە. ئاگامەندییەکی بەردەوامـــە و بەردەوامبوونی دەروونیش لەنێو ئاگامەندییدایـــە. کاتی دەروونیش بەتەواوی لەناودەچێت ئەگەر بوون—بۆ—خۆ لەســـەر زەمینەیەک ڕاوەســـتێت، کە تێڕامانی نەبێت. لەم ڕووەوە کاتـــی دەروونی لە کاتە بنەڕەتییەکـــە دەچێت و پەیوەندی نێـــوان بابەتەکانی دروستدەکات.

بەڵام جیاوازییەکەی لەگـــەڵ کاتی بنەڕەتییدا لەوێدایە، کە ئەم لەو کاتەشدا، کە کاتـــی بنەڕەتی خۆی دەردەخـــات، هەیە. لێرەدا کاتـــی دەروونی ڕابردووە، تەنانـــەت داهاتووشی، وەکو ڕابـــردوو دوای ڕانەبردوو دێت. ئەمەش فۆرمێکی بێ ناوەڕۆکـــی لەپێشـــتر و پاشترە. هاوکات، ئەم کاتـــە دەروونییە، کە خۆی نابێت بـــە بناخە بۆ بوونی خۆی و دەبێت بەردەوام دروســـتبکرێت. کاتێکە لە (ئێستا) هەبووەکان پێکهاتـــوە. هەر یەکێک لەم (ئێستا)یانە لەنێو هەمووی دەروونەکەدا، لـــە دوورەوە کاردەکەنە ســـەر یەکدی. ئەمەیە لەگـــەڵ بەردەوامی لە فەلسەفەی برگسۆندا بەراوردمانکرد. ئەو کاتەی مامەڵەش لەگەڵ تێڕامانی ناڕەواندا دەکەین، ئـــەو تێڕامانەی دەڕوانێتە بوونی من و دەستنیشـــانم دەکـــات بەو جۆرەی هەم، ئەوا جیهان و کەســـانی دیەکەش دەردەکەون. ئەم جیهانە، کە ئامادەیە و بابەتی گونجاوی تێڕامانمە جیهانی دەروونیی منیشە. لە ڕوویەکەوە بوونی ئەو لە فۆرمێکی ئایدیا[بیرۆکە]دایـــە و لـــە ڕوویەکی دیکەوە شتێکە هەیە. شتێکە دروســـتکراوە، هەروەها خۆی بۆ ئاگامەندیش دەرخستوە.

لەســـەرو ئەمەوە، جیهان لەبەردەم بوون—بۆ—خۆدا ڕاستەقینەیە. لە ڕێگەی جیهانـــەوە بوون—بۆ—خۆ دەتوانێت ببێت بەوەی دەیەوێت. من، بۆ نموونە، لەبەر ئەوەی دژی کەسێکم بۆ ماڵی ناڕۆم. یان بەگوێرەی حەز و ڕقم بڕیار لەسەر کارێک دەدەم؛ لەبەر ئەوەی زوو توڕە دەبم و هەڵدەچم لەگەڵ بەرانبەرەکەمدا مشـــتومڕ لەسەر کێشەیەکی ڕامیاری ناکەم.

لەگەڵ بوونی جیهانی دەرەوەدا، کە پێکهێنانێکی نەبڕاوەیە یەکێتی بوونیش، وەکـــو لایەنێکی ناوەکـــی و بە بابەتبوونی کاتـــە بنەڕەتییەکە خۆی دەردەخات. لەگەڵ لایەنی ناوەکییـــدا لایەنی دەرەکیش دەدۆزینـــەوە؛ بوون—بۆ—خۆ لایەنی دەرەوە بە چاوەکانی خۆی دەبینێت، کە لایەنێکی ڕاستەقینەی ڕووتە. لە دواییدا ڕوونیدەکەینەوە چۆن بوون—بۆ—کەسانی دی ئەم لایەنە دەرەکییە دەبینێت.

# بەشی سێیەم

## بەرزێتی

بــۆ ئەوەی توێژینەوەکەمان ســەبارەت بــوون— بۆ—خۆ پڕ و تــەواو بێت، لەبارەی هەڵوێستی ڕەتدانەوە دەدوێین. لەپێشتریش ڕوونمانکردەوە پرسیارکردن و وەڵامدانــەوەش ئەگەری هەمیشــەیی (نە-بوون)ی لە دەرەوە و ناوەوەی ئێمەدا هەڵگرتوە. مەبەستی سەرەکی ئێمە دۆزینەوەی هەڵوێستی ڕەتدانەوە لە بونیادی بوون—بۆ—خۆدا نییە. ئێمە لە پێشــەکی [ئەم نوسراوەدا] توشی گرفتێک هاتین و هەوڵی چارەسەرکردنیماندا: ئایا پەیوەندی بنەڕەتی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بە بوونی دیاردەکانەوە یان بوون—لەنێو—خۆوە چییە؟ هەروەها لە پێشــەکییەکەدا بۆچوونی ئایدیالیست و ڕیالیستەکانمان بۆ چارەســەرکردنی ئەم گرفتە پەسەند نەکــرد. دەرکەوت، کــە هەبوویەکی بــەرز [دەرەکی] ناتوانێت کاربکاتە ســەر ئاگامانــەی و ئاگامەندیش ناتوانێــت بە دەربڕینی لایەنــە ناوەکییەکانی بابەتە بەرزەکە دابمەزرێنیت. لەم ئاکامەوە بەو خاڵە گەیشــتین، کە پەیوەندی بنەڕەتی لەگــەڵ بووندا دەرەکی نییە و بەســتنەوەی دوو جەوهــەری جیاواز و لە یەکدی دابڕاو دەرناخات. "پەیوەندی نێوان لایەنەکانی بوون سەرهەڵدنێکی سەرەتاییە". ئێمەش بۆ ئەم مەبەستە گوتمان، "بونیادی هەبووەکان پێکدەهێنێت." هەبوویەکی کۆنکرێتی وەکو هەموویەکی تێهەڵکێشراو خۆی دەردەخات. ئاگامەندی لایەنەکانی پێکەوە دەبەستێتەوە و دایدەمەزرێنێت.

هەرچەندە لە ڕوویەکەوە ئاگامەندی ڕوتکراوە و دوور ڕادەوەستێت و دیاردەکانیش —تەنانــەت دیاردەی بونیش— بەهەمان شێــوە دوور و دابڕاون و ناتونن ببن بە دیاردە، ئەگەر خۆیان بۆ ئاگامەندی دەرنەخن، هێشتا بوونی دیاردەی یان بوون—لەنێو—خۆ بەو شێوەیەی هەیە بە ڕووتکراوە و دابڕاو دانانرێت.

بوونی ئەو لەسەر خۆی ڕادەوەستێت. بەڵام، لەلایەنێکی دیکەوە تێگەیشتنمان لە بوون—بۆ—خۆ دەریدەخات چۆن ئەو لایەنە لەناو براوە؛ بوون—بۆ—خۆ دەکات بە (نەبوون) بۆ خۆی. هەروەها چۆن ئەم بوونە لەنێو یەکێتییە ئۆنتۆلۆجییەکەی ڕەهەندەکانی کاتدا دەژی.

کەوابوو، لە کاتێکدا جەخت لەســەر پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خــۆدا، وەکو پێکهاتەیەکی بنەڕەتی دەکەین، پێویستە ئەم پەیوەندییە بە

پێکهاتـــەی بوون—بۆ—خۆ، نەک بوون—لەنێو—خـــۆ دابنێین. پێویستە لە بوونی بوون—بۆ—خۆدا بە شوێن کلیلـــی پەیوەندییەکە بگەڕێین. ئەو پەیوەندییەی، کە بە زانین ناوزەدی دەکەین. بوون— بۆ—خۆ بەرپرســـی پەیوەندییە لەگەڵ بوون—لەنێو—خۆدا.

ئێمە ئەو کاتەی ئاگامەندییمان بەو بوونە دانا، کە لە بوونیدا پرسیارکردن هەیە، پێشبینی ئەم پەیوەندییەمان کرد. بەڵام لەو کاتەوە ئەم پێناسەیەمان بۆ ئاگامەندی داناوە، زانینی زۆرترمان پەیداکردوە. بەتایبەتی دەزانین چۆن ئەم بوونە دەبێت بە بناخەی نەبوونی خۆی. ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتوە ئەم زانینە لە پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆدا لەســـەر بناخەکانی بیر و کردەوە باسبکەین؟ ئایا بەو قۆناخە نەگەیشـــتوین بتوانین وەڵامی پرسیارە بنەڕەتییەکەمان بدەینەوە؟ ئێمە ڕوونمان کردەوە چۆن بوون—بۆ—خۆ دەبێت بە بنەڕەتی ئەو شێوازی بوونەی، کە پێش تێڕامان دەکەوێت. ئایا ئێمە ناتوانین وەڵامی ئەم پرســـیارانە بدەینەوە؟ مادامەکـــی بوون—لەنێو—خۆ ئەو بوونەیە، کـــە هەیە، چۆن و بۆچی بوون بۆ—خۆ دەبێت بە زانینی ئەو بوونە؟ یان ئایا بەگشتی زانین چییە؟

## ١. زانین وەکو پەیوەندی نێوان بوون—بۆ–خۆ و بوون—لەنێو—خۆدا

تەنیـــا زانینی ڕاســـتەوخۆ و بە حەدەس هەیە. ســـیلۆجیزم و بەڵگەدانان بە هەڵـــە بە زانین دانراون. ئەمانە ئامێری گەیشـــتن بـــە زانینن. بۆ حەدەس چەند میتۆدێک بەکاردەهێنین؛ لە حاڵەتی نەگەیشتن بە بابەتەکە هۆش و بەڵگە لەودیو حەدەســـەوە دەبن بە هێما. ئەگەر بەو بابەتەش بگات و بەڵام لە ئێستادا نەبێت بـــە شێوازێکی ئاگامەندی من، ئەو ڕێنماییانەی بەکاریان دەهێنم وەکو پاشماوەی ئەزمونەکانم دەمێننەوە و دێکارت گوتەنی دەبن بە "یادەوەری بیرۆکەکان". ئەگەر کەســـێک داوای پێناسەی حەدەس بکات، هوســـرڵ، کە زۆرینەی فەیلەسوفەکان لەگەڵیـــدا هاوڕان، وەڵام دەداتـــەوە و دەڵێت؛ ئامادەبوونـــی شتێکە لەبەردەم ئاگامەندییدا. زانین، کەوابوو، بەو جۆرەی لە بەشی پێشـــوتری ئەم نوســـراوەدا باسمانکرد، شێوازێکی بوونە یان ئامادەبوونە. ئێمە ئەو خاڵەشمان ڕوونکردەوە، کـــە بوون—لەنێو—خۆ ناتوانێت ئامادەبێت. ئامادەبوون شێوازی بوونی بوون—بۆ—خۆیـــە. لێرەدا ناچار دەبین کێشـــەکە هەڵبگێڕینەوە و پێناســـەکەمان بەمجۆرە دابمەزرێنین: حەدەس ئامادەبوونی ئاگامەندییە لەبەردەم شتێکدا. لەم بۆچوونەوە پێویستە واتا و خەسڵەتی ئەم ئامادەبوونە ڕوونبکەینەوە.

لە سـەرەتاوە، هەرچەنـدە واتای ئاگامەنـدی بەتـەواوی ڕووننەکرابووەوە، ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵەکرد، کە ئاگامەندی ئاگاییە لە شتێک. لەم خاڵەوە دەبینین ئاگامەنـدی خۆی لە هەموو شتێکی دیکـە جیادەکاتەوە و هەمانکات بوونێکە لە خۆی ئاگایە؛ ئەو ئاگامەندییەی ئاگایی لە شتێک نییە، ئاگاییە لە هیچ. بەڵام ئێمە لـەم قۆناخانەدا بە واتای ئاگامەندی یان بوون—بۆ—خۆ گەیشـتوین، لەبەرئەمە دەتوانین بپرسـین: ئایا مەبەست لەو خاڵە چییە، کە دەڵێین ئاگامەندی دەبێت ئاگایی بێت لە شتێک، بەتایبەتی لە ڕوانگەی ئۆنتۆلۆجییەوە؟

ئێمە دەزانین بوون—بۆ—خۆ بناخەی نەبوونی خۆیەتی. مەبەسـتی تیڕامانیش تێڕامانـە. تێڕامانیش هەمیشـە تێڕامانـی تێڕامانە. دوو لایەنی ئـەم تێڕامانە پەیوەندییـان بە یەکدییەوە هەیە. بەڵام ئەگـەر پەیوەندییەکە لەنێوان ئەم دوو لایەنـەدا بمێنێتەوە، ئـەوا یەکدیش لەنێودەبەن. پێویستـە تێڕامان، لە پێناوی مانـەوەی خۆیـدا، ڕوو لە بابەتێک بکات. ئەگەر خـودی تێڕامان شتێک بوایە و ڕووی لە شتێک نەکرایە، ئەوا دەبوو بە بوون—لەنێو—خۆ نەک تێڕامان. تیڕامان لە بوون—بۆ—خۆدا تێڕامانکردنە. ئەگەر تێڕامان بەمشێوەیە بناسرێت لە تێڕامانکراو جیادەبێتـەوە و دیاردە و ڕاسـتەقینەکەشی دەبن بە دوو لایەنـی جیاواز؛ لەم حاڵەتەدا کۆجیتۆش مەحاڵ دەبێـت. تێڕامان کتوپڕ دەبێت بە شتێک لەبەردەم تێڕاماندا و دەبێت بە هیچ. ئەوەی تێڕامانی تێڕامان پێناس دەکات، ئامادەبوونە لە بەردەم تێڕاماندا. تەنانەت خۆشی، بێ بیرکردنەوەش، کە دڵمان خۆشدەکات یان دەمانهێنیتە پێکەنین، ئامادەبوونێکی تێڕامانانەیە. بەڵام لەپێشتر باسمانکرد، کە نەبوون بونیادێکی پێویستی ئامادەبوونە. ئامادەبوون ڕەتدانەوەیەکی ڕادیکاڵانەی ئەوەیە، کـە نییە. من ئەو شتە نیم لەبەردەم مندا خۆی قوتکردۆتەوە. هەروەها ئەو (نە-بوون)ەو لەنێو هەموو بیردۆزەیەکی زانیندا مەرجێکی لەپێشترە. مەحاڵە بەبێ ئەم ڕەتدانەوەیە و بەبێ جیاکردنەوەی ئاگامەندی لە بابەتەکەیەوە بیرۆکەی بابەتێک سـەرهەڵدات. ئەمەش بە ئاسانی چەمکی (جیاوازتر لە خۆ)ی بە ئێمە دەدات و بـۆ جیهانی دەرەوەی خۆ بەکاریدەهێنین. لەڕاسـتیدا، پێکەوەگرێدانی بیرۆکەکـان، پێکهاتە دەروونییەکان، ڕەوتـە نەگەڕاوەکانی نێو کات و گەڕانێکی لـە کۆتایـی بەدەر، بۆ پێکهێنانـی بابەتێک یارمەتیمان نادەن. ئـەو بابەتە بە دژوەسـتاو بەرانبەر من دانانێن ئەگەر ڕەتدانەوەکە لەپێشتر نەدرابێ و نەبووبێت بە زەمینەیەکی لەپێشتر بۆ ئەزموونەکان.

شتێک، پێش هەموو بەراوردکردنێکی یان پێکهێنانێکی، ئەوەیە خۆی لەبەردەم ئاگامەندییـدا قوتبکاتەوە و هەمانکات ئاگامەندیـش نەبێت. پەیوەندی بنەڕەتی ئامادەبـوون، کە دەبێت بە بناخەی زانین ڕەتدانەوەیە. بوون—بۆ—خۆ ڕەتدانەوە دەهێنێتە نێو جیهانەوە؛ مادامەکی ئەو شتەی لەبەردەم ئاگامەندییدا ڕاوەسـتاوە

شتێکە هەیە و خاوەنی ناسنامەیە، ئەوا نابێت بەو شتەی بوون—بۆ-خۆ نییە چونکە ڕەتدانەوە لەو شتەوە پەیدانابێت و سەر بە بوون—بۆ—خۆیە. هەروەها، ڕەتدانەوە لەو دەستەواژەیەدا نییە ئێمە بۆ حوکمدان بەسەر شتەکەدا دروستی دەکەین و نکۆڵی لە لایەنێکی دەکەین. ئەم جۆرە ڕەتدانەوەیە لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە بوون—بۆ—خۆ، وەکو جەوهەرێکی پڕ و تەواو دابنرێت. ڕەتدانەوەی ڕاستەقینە لەوێدایە، کە بوون—بۆ—خۆ خۆی بە بوونێکی جیاواز لە شتەکەی بەردەمی دەبینێت. لە ئاکامدا، پێناسەکەی پێشوترمان بۆ ئاگامەندی بەمجۆرە دادەمەزریت: "بوون—بۆ-خۆ ئەو بوونەیە، کە لە بوونیدا پرسیارکردن سەرهەڵدەدات چونکە ئەم بوونە ئەوە نییە، کە هەیە و دەیەوێت ببێت بە بوونێکی جیاواتر لە خۆی."

زانین، کەوابوو، شێوازێکی بوونە. ئەو پەیوەندییە نییە پاش ڕوودانێک لەنێوان دوو بووندا یان لە چالاکی نێوانیان ڕوودەدات. هەروەها چۆنیەتیش نییە. بەڵکو ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆیە؛ خۆناسینی بوون—بۆ—خۆیە، لە ئامادەبوونەکەیدا، وەکو بوونێکی جیاواز لەو شتەی بەرانبەری ڕاوەستاوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بوون— بۆ—خۆ دەبێت لە شێوازی تێڕاماندا بێت تاکو بتوانێت خۆی لە بابەتی تێڕامانەکەی جیا بکاتەوە. بابەتی تێڕامانەکە لە دەرەوەدا ئەو بوونە دیاریدەکات، کە بوون—بۆ—خۆ نییە. ئەمەش واتای "ئاگایی لە شتێکەوە" [بۆ ئێمە] ئاشکرادەکات. پێویستە واتای ڕەتدانەوەی بنەڕەتی زۆرتر ڕوونبکەینەوە. لەڕاستیدا، دەبێت دوو جۆر ڕەتدانەوە لەیەکدی جیابکەینەوە: ڕەتدانەوەی دەرەکی و ڕەتدانەوەی ناوەکی. یەکەمیان پەیوەندییەکی دەرەکییە لەنێوان دوو بووندا و گەواهێکیش ئاماژەی بۆ دەکات. کاتێک، بۆ نموونە، من دەڵێم

"پیاڵە شوشەی مەرەکەب نییە،" ئاشکرایە بناخەی ڕەتدانەوەکە [نییە] لە پیاڵەکە یان لە شوشەی مەرەکەبەکەدا نییە. ئەم دوو بابەتە ئەوەن، کە هەن و لەوە زۆرتریش بە چی دیکە نابن. من ڕەتدانەوەکەم لە نێوانیاندا بەبێ گۆڕانکاری لە بوونیاندا داناوە. ئەوانیش لەگەڵ دانانی ڕەتدانەوەکەدا تۆزقاڵێک خەسڵەتی خۆیان نەدۆڕاندوە یا چی دیکە نەخراوەتە سەر بوونیان. ڕەتدانەوەکە هەژار یان دەوڵەمەندی نەکردوون، لەبەرئەمە ڕەتدانەوەیەکی دەرەکییە. واتای جۆری دووەمی ڕەتدانەوەش ئاشکرا دەبێت ئەگەر سەرنجێک لەم دەستەواژانەی، وەکو "من دەوڵەمەند نیم." یان "من جوان نیم." بدەین. ئەم دەستەواژانە تەنیا ئەوە ناگەیەنن، کە گوتەبێژەکە جۆرە کەمییەکی هەیە یان جۆرێک خەسڵەت لە بوونیدا نییە، بەڵکو ئەو نەبوونییە کاردەکاتە سەر بونیادی ناوەوەی ئەم بوونەش. کاتێک دەڵێم، "من جوان نیم" ئاماژە بۆ سنورداریێتی خۆم لە ڕێگەی نکۆڵیکردنەکەوە ناکەم، تاکو بوونم بپارێزم و گۆڕان تیایدا ڕوونەدات (بەو جۆرەی دەڵێم "گوڵدانەکە سپییە و خۆڵەمێشی نییە"- یان "شوشەی مەرەکەبەکە لە سەرمێزەکە نییە و لەنێو

چەکمەجەکەدایە.") دەمەوێ بڵێم "جوان نەبوونم" خەسڵەتێکی بنەڕەتی بوونی منە. بوونی من لەناوەوە دەردەخات، وەکو ڕەتدانەوە خەسڵەتی ڕاستەقینەی منە. ئەم ڕەتدانەوەیەش هۆکاری خەمباری یان سەرنەکەوتنم لە ژیاندا دەردەخات.

ڕەتدانەوەی ناوەکی پەیوەندییە لەنێوان دوو بووندا بە مەرجێک نکۆڵیکردنەکە لە بوونی یەکێکیاندا و نەبوونی ئەوەی نکۆڵیلێکراوە لە ناوەڕۆکییدایە. لێرەدا ڕەتدانەوەکە دەبێت بە پەیوەندییەکی ناوەڕۆکی لەو بوونەدا. ئاشکراشە ئەمجۆرە ڕەتدانەوەیە بەسەر بوون—لەنێو—خۆدا ناسەپێنرێت. بە سروشت لەنێو بوون—بۆ—خۆدایە. بوون—بۆ—خۆ ئەو بوونەیە لەبوونیدا ئەوە نییە، کە هەیە. ڕەتدانەوەی ناوەکی لەنێو جیهاندا ئەو کاتە سەرهەڵدەدات، کە ئێمە دەڵێین ئەو مروارییە ڕاستی نییە، میوەکە پێنەگەیشتوە و هێلکەکە تازە نییە هتد. بوون—بۆ—خۆ ڕەتدانەوەی ناوەکی دەهێنێتە جیهانەوە. زانین تەنیا خەسڵەتی بوون—بۆ—خۆیە. تەنیا ئەم بوونە دەتوانێت بە شێوەیەکی جیاوازتر لە بابەتە زانراوەکەی خۆی ببینێت. لێرەدا دیاردە و بوون دەبن بە یەک شت چونکە بوون—بۆ—خۆ دیاردەی خۆیەتی. بوون—بۆ—خۆ بوونی بابەتەکە لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت و هەمانکات وەکو شتێکی جیاوازتر لەو بابەتە پرسیار لەبارەی بوونی خۆیەوە دەکات. دەبێت خۆمان لەو جۆرە وەهمە بپارێزین، کە گوایە، بۆ پێکهێنانی بوونی خۆم نەک، وەکو هەبوویەکی هەندەکی، پێویستە پێش کات یان زانین لەبارەی ئەم بوونەوە بکەوم. من ناتوانم حوکم بەسەر جیاوازییەکانی نێوان خۆم و ئەو بوونەدا بدەم، کە هیچی لە بارەوە نازانم. دروستە، ئێمە لە ئەزموونی ڕۆژانەماندا جیاوازی نێوان خۆمان و مرۆڤێکی یابانی، ئینگلیز، کرێکاریک یان فەرمانبەرێک، نازانین تاکو زانیاریمان لەبارەی جیاوازییەکانی نێوان ئەم بوونانەوە نەبێت. بەڵام ئەم جیاوازییانەی لە سەرچاوەی ئەزمونەکانەوە، دەدۆزرێنەوە سود بە ئێمە ناگەیەنن. ئێمە دەمانەوێت لە پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجی بکۆڵینەوە، کە دەبێت بە بناخەی دامەزراندنی هەموو ئەزمونێک و لێوەی فێردەبین چۆن بابەتێک لەبەردەم ئاگامەندییدا خۆی دەردەخات. مەحاڵە من ئەزمووونی بابەتێکم، وەکو بابەت هەبێت و ئەو بابەتەش من نەبم ئەگەر من بڕیار لەسەر بابەت بوونی بابەتەکە نەدەم. بەپێچەوانەشەوە، سەرهەڵدانی لەپێشتری بابەتە ئەزمون پێکدەهێنێت. سەرهەڵدان فاکتۆریکی بنەڕەتی بوون—بۆ—خۆیە و ئامادەبوونی ئەم بوونەیە، وەکو بوونێکی جیاواز لەبەردەم بابەتەکەدا. ئەوەی پێویستە لێرەدا بکرێت وەرچەرخانی چەمکەکانە لە ڕوونکردنەوەی پێشوماندا و بەمشێوەیە باسەکە دابمەزرێنین: پەیوەندی بنەڕەتی، کە بوون—بۆ—خۆ تیایدا، وەکو هەبوویەکی هەندەکی لەبەردەم بابەتەکەیدا خۆی دەرناخات، بناخەی هەموو زانینێکی ئەم بوونەیە. بەڵام بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم پەیوەندییە پێویستیمان بە ڕوونکردنەوەی زۆرتر هەیە.

ڕاســـتی لەنێو ئەو دەســـتەواژەیەدا و وەهمی ڕۆشنبیران لەوێدایە، من نەتوانم خۆم بەو بابەتە بکەم، کە هەمیشە بە منەوە وابەستبووە. نکۆڵی لەوە ناکەم من هەبوویەکـــی هەندەکیم، ئەگەر لە دوورەوە خۆم لەم بوونە ڕاگرم. ئەگەر بوونێک بناسم و ئەو بوونە لەنێو خۆیدا بێت ئەوە شتێکە، کە هەیە. ئەمەش ڕێگە نادات ژوورێک لەم بوونەدا بۆ زانین و ڕەتدانەوە هەبێت. لەم ڕووەوە، ڕەتدانەوەی ناوەکی پەیوەندییەکـــی ئۆنتۆلۆجییە. ئێمە مامەڵە لەگـــەل ئەو ڕەتدانەوە ئەزمونگەریانە ناکەیـــن، کە تیایاندا ئـــەو خەســـڵەتانەی نکۆڵییان لێکراوە بـــە ئامادەبوونیان لەیەکدی جیاکراونەتەوە. لە ڕەتدانەوەی ناوەکییدا بوون—بۆ—خۆ دەکەوێت بەسەر نکۆڵیلێکراوەکەدا. بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم خەسڵەتە نکۆڵیلێکراوەکاندا ئامادەیە. لەبەردەمیانـــدا هێزی ڕەتدانـــەوە و نوێکردنەوە دەخاتەگەر. لـــەم بۆچوونەوەوە خەســـڵەتە نکۆڵیلێکراوەکان دەبـــن بە فاکتۆری پێکهاتوی ئـــەم بوونە؛ بوون—بۆ—خـــۆش لە دەرەوەی بوونی خۆیدا لەبەردەمیاندا ڕادەوەســـتێت. ئەوانیش، بۆ ئەوەی ڕەتبدرێنەوە، دەبێت هەبن. بەکورتییەکەی، بنەڕەتی ڕەتدانەوەی ناوەکی لـــە بوون—بۆ—خۆدا، ئەو شتەی لە دەرەوەدایە یان لە دەرەوەی ئەودا هیچ نییە، ئـــەو نەبوونەی لە شتێکی هەبوو بە ڕەتدانـــەوەی ڕەوان جیادەکرێتەوە، دەبن بە ناوەڕۆک.

گرفتـــی ماتەریالیزم، لە پێکهێنانـــی زانیندا لەوەدایـــە ماتەریالیزم دەیەوێت جەوهەرێـــک لە ڕێگـــەی جەوهەرێکی دیکەوە دەربهێنیت. هێشـــتا ئەم گرفتە بۆ ئێمە ڕێگر نییە چونکە لـــەو باوەڕەداین لە دەرەوەی بوون—لەنێو—خۆدا، بێجگە لـــە تێڕامـــان هیچی دیکە نییە. ئـــەم هیچییەش، کە دوو بەشـــی لێبۆتەوە لەبەر ڕۆشنایی بوون—لەنێو—خۆدا پێناس دەکرێـــت. لەم پەیوەندییەدا، کە دەبێت بە بناخـــەی ڕەتدانەوەی ناوەکی و زانیـــن، بوون—لەنێو—خۆیە، وەکو کەس دەبێت بە ئەســـتونێکی پڕ و بوون—بۆ— خـــۆش بەو بۆشاییەی بـــوون— لەنێو—خۆی لێدابڕاوە.

مادامەکی بوون—بۆ—خۆ ئەوەیە، کە نییە ئەوا لە دەرەوەی بوونی خۆیدا لەنێو بـــوون— لەنێو—خۆدایە؛ یەکەم پەیوەندی نێوان بوون— بۆ—خۆ و بوون—لەنێو— خۆدا، کەوابوو، بوونە. بەڵام ئـــەم پەیوەندییە کەمی یان ئامادەنەبوون نییە. لە ئامادەنەبوندا بوونی من دەبێت بەوەی، کە من نییە، شتێکە نییە یان لەوێدا نییە. بوونـــی من، لەنێو پڕی ئەزمونەکانمدا بۆشایی داگیری دەکات. لەلایەکی دیکەوە، لە زانیندا، بەو جۆرەی ئێمە بە پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجی دادەنێین، ئەو بوونەی لە منـــەوە جیاوازە بوونێکـــی لەنێو—خۆی پڕ و ڕەقە. منیـــش، بەپێچەوانەوە، ئامادەنەبـــوون و هیچـــم. لەو شێـــوازی بوونەدا، کە بە زانین نـــاوزەدی دەکەین ئەو بوونەی ڕووبـــەڕووی دەبینەوە و بەردەوام لەوێدایە شتە زانراوەکەیە. ئەوەی

زانینەکەی لایە نییە و نەناســـراوە. ئەو بێجگە لـــەو بوونەی شتەکانی بەرانبەری دەردەخـــات چی دیکە نییە. بابەتێک بە تەنیا ناتوانێت ئامادە یان ئامادە نەبێت و شتێکە هەیـــە. بەڵام ئامادەبوونی شتە زانراوەکە، ئامادەبوونە لەبەردەم هیچدا چونکـــە ئەوەی زانینەکەی لایە تێڕامانێکی ڕەوانی نەبوونە؛ ئامادەبوون پێویستی بـــە هەموو لایەنە شەفافەکانی بوون—بۆ—خۆ و بابەتی زانراو لەگەڵ ئامادەبوونی ڕەها هەیە. بۆچوونی ســـایکۆلۆجییانە و ئەزمونگەری پەیوندییە بنەڕەتییەکە بۆ خولیابوون دەگەڕێنێتەوە. لە خولیانووندا، کە زانین ڕاســـتەوخۆ سەرهەڵدەدات، کەسەکە هیچێکی ڕەها و ڕەتدانەوەیەکی ڕەوانە؛ خۆی لە هیچ شوێنێکدا نادۆزێتەوە و نییە. لـــە خولیابووندا بێجگە لە بابەتێکی هەرەمـــەزن لە بیابانی بووندا، چی دیکە نابینرێت. هەروەها حەدەسی خولیابوونەکەش لەگەڵ بابەتەکەیدا یەکناگرن. خولیابوون پێویستی بـــە بەرزکردنەوەی پلەی بابەتەکەیەتی لەنێو بەســـتنێکی بەتاڵەوە. ئەمەش من دەکات بە ڕەتدانەوەی ڕاستەوخۆی بابەتەکە.

ئێمـــە ڕەتدانەوەی ڕەوانیش لەگەڵ ئەو حەدەســـە یەکانەگییانەی بووندا، کە ڕۆســـۆ بـــە ڕووداوی کۆنکرێتیی دەروونـــی نێو مێژوو ناوزەدیـــان دەکان، پەیدا دەکەیـــن. ئەو، لەو باوەڕەدایە، لـــەم دۆخانەدا لەنێو جیهاندا تواوەتەوە و جیهان بووە بـــە ئامادەبوونێکی ڕەها و هەموویەکی لەمەرج بـــەدەر. بێگومان دەتوانین لـــەم ئامادەبوونەی جیهان تێبگەیـــن، هەروەها دەزانین لـــەم دۆخەدا بێجگە لە جیهـــان چی دیکە نەبینراوە. بەڵام ئەمە ئەوەش دەرناخات، بەو جۆرەی ڕۆســـۆ باسیدەکات، یەکگرتنێکی تەواو لەنێوان ئاگامەندی و جیهاندا ڕوویدابێت. یەکگرتن واتای توانەوەی بوون—بۆ—خۆ لەنێو بوون—لەنێو—خۆدا دەبەخشێت. دروستە لە بۆچوونـــی یەکانەگی بووندا بێجگە لە جیهـــان هیچی دیکە نییە. ئەمەش بوون—لەنێو—خـــۆ بە زەقی ئامادەدەکات و دروســـتە چونکە زانیـــن ئامادەبوونە و[لە زانیندا] هیچ شتێک ئاگامەندی و بابەتی زانراو لەیەکدی دانابڕێت.

هەندێکجـــار، حەدەس بـــە ئامادەبوونێکی ڕاســـتەوخۆی بابەتەکە لەبەردەم ئاگامەندییدا پێناســـکراوە. بـــەڵام زۆرکەم بیرمان لـــە هەلومەرجەکانی چەمکی ڕاســـتەوخۆ کردۆتەوە. ڕاستەوخۆیی ئامادەنەبوونی ناوەندە. ئەگەر ناوەند هەبێت ئەوا ئێمە ناوەندەکە نەک شتە ڕاســـتەوخۆکە دەناسین. ئەگەر ناوەندیش نەبێت پێویستە بە یەکجار بەردەوامـــی و پچڕاندن لە ئامادەبوونەکەی نێوان ئاگامەندی و بابەتـــی زانراودا ڕەتبدەینـــەوە چونکە بەردەوامی پێویستـــی بە ناوەند هەیە. کەوابوو، بونیادی بابەتەکە گومدەبێت؛ بوون—بۆ—خۆ بەتەواوی نکۆڵی لە بوونی بابەتەکە، وەکو بوون—بۆ—خۆ دەکات. هێشـــتا، ئێمە پەیوەندی بنەڕەتی بوون—

بۆ—خۆ لەگــەڵ بوون—لەنێو—خۆدا بە نابــەردەوام دانانێین. جیاکردنەوەی دوو شتی نابەردەوام لەیەکدییەوە بۆشایی دروســتدەکات، بــۆ نموونە، ئەو بۆشاییە هیچە، بەڵام هیچێکی ناسراوە. ئەم هیچە ڕاستەوخۆیی ئامادەبوونەکە لەناودەبات و دەبێت بە شتێک. مادامەکی پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆ بەردەوامی و نابەردەوامیش نییە، ئەوا نکۆڵیکردنێکی ڕەوانی ناسنامەیە.

بــۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەمان، پەنا بــۆ بەراوردکردن دەبەین. دوو هێڵی چەماوە بە یەکدەگەن و ئامادەبوونێک بەبێ ناوەند دەهێننەکایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چــاوی ئێمە لە یەکگرتنەکەیاندا هێڵێکی ڕاســت دەبینێت. ئەگەر ئەو دوو هێڵە چەماوانــە شاراوە بوونایە ئێمە تەنیا هێڵێکمان لــە (ئەلف)ەوە بۆ (با) دەبینی و نەمــان دەتوانــی دوو هێڵەکە لەیەکدی جیابکەینەوە. لەڕاســتیدا، ئەوەی لە یەکیــان جیادەکاتەوە هیچە؛ ئەوەی هەیە بەردەوامی و نابەردەوامی نییە، بەڵکو ناســنامەیەکی ڕووتە. دوای ئەمە، ئێمە دوو هێڵەکە دەناســینەوە و دەزانین دوو شتی جیاوازن. هۆکاری ئەمەش لەوەدایە، کە هەر یەکێک لەم هێڵانە ڕەتدانەوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە.

ئەوەی لەیەکدیان جیادەکاتەوە هیچە، تەنانەت دووریش نییە؛ ڕەتدانەوەیەکی ڕووتە دژی تێهەڵکێشــبوونەکەیان ڕادەوەســتێت. ئەمەش باشتر ئێمە بە واتای پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان ئاگامەندی و بابەتی زانراو دەگەیەنێت.

دەردەکەوێت، ڕەتدانەوە پێویستی بە شتێکی لەپێشــتر بۆ پێکهێنانی بوونی هەبێت. بۆ نموونە، ئەگەر بڵێم شوشەی مەرەکەب مێز نییە، ئەوا شوشەی مەرەکەب و مێــز دوو بابەتن، کە هەن و پێکهاتــون و بوونیان، وەکو بوونێکی—لەنێو—خۆ پشــتگیری ڕەتدانەوەکە دەکات. بەڵام لە پەیوەندی نێوان (زانەر و زانراو)دا هیچ شتێک لەلایەن زانەرەوە بۆ پشتگیری ڕەتدانەوەکە نییە. جیاوازی (لەوێدا) لەنێوان زانەر و زانراودا نادۆزرێتەوە. ئەو ڕاستییەی زانەر و زانراو دەریدەخەن بوونە. لەم ڕووەوە دەتوانیــن بڵێین زانین بە تەنیا ڕاوەســتانی بابەتە زانراوەکەیە. دیاردەی زانین هیچ بۆ بوون زیاد ناکات و داناهێنیت. بوون دەوڵەمەند ناکات چونکە زانین ڕەتدانەوەی ڕووتە و تەنیا بوون دەردەخات.

دەرخستنــی بوونیش ناوەکــی نییــە و ڕەتدانەوەیە. لــەم ڕووەوە، هەموو دەرخستنێکی لایەنی پۆزەتیڤی بوون لایەنی نایاری ئۆنتۆلۆجییانەی ڕەتدانەوەی ڕەوانــە لــە بوونــی بوون—بۆ—خۆدا. بۆ نموونە، لە دوایشــدا ئەمــە دەبینین، دەرخستنی شوێن لە بووندا ئاماژەکردنە بۆ بوونی بوون— بۆ—خۆ، وەکو شتێکی درێژ نەبوو. درێژبوونی بوون—بۆ—خۆش خەسڵەتێکی پۆزەتیڤ، لایەنی شاراوەی

گیانەکی لەودیو خەسڵەتە نێگەتیڤەکانەوە نییە؛ پەیوەندییەکی سروشتی ئەم بوونەیە. لە ڕێگەی درێژبوونی بوون—لەنێو—خۆدا ئەم پەیوەندییەی خۆی، وەکو شتێکی درێژ نەبوو دەدۆزێتەوە. بوو—بۆ—خۆ لەپێشدا خۆی بە درێژنەبوو نابینێت تاکو درێژبوونی بوون— لەنێو—خۆ لە شویندا نەبینێت. چەمکی درێژنەبوون لە ڕەتدانەوەی درێژبووندا واتا دەبەخشێت.

درێژبوون حوکمدانێکی بەرزە، کە بوون—بۆ—خۆ لە نکۆڵیکردنی درێژبووندا دروستی دەکات. لەبەرئەمەش چەمکی ئاگایی، کە دوو واتای ئۆنتۆلۆجیمان بۆ دانا، پەیوەندی ناوەکی نێوان بوون و زانینمان بۆ ئاشکرا دەکات.

من ئاگام لە پرۆژەیەکە چونکە پرۆژەکە بە بوون دەگەیەنم. هەمانکات بە درێژیی ژیانم ئاگام لە بارودۆخی خۆمە و پرۆژەکەش بە پرۆژەی خۆم دادەنێم. ئاگام لە تێکچوون و دژواری تێگەیشتنە.

زانین بوون (لەوێدا) دادەنێت و لە تێڕامانەکەدا بەهێزی ڕەتدانەوەوە دەڕوانێتە بوون. ئەوەی ڕاستەقینەیە زانراوە. ئێمە بەرزێتی بەو ڕەتدانەوە ناوەکییە دادەنێیین، کە بوون—لەنێو—خۆ دەردەخات و خەسڵەتەکانی بوون—بۆ-خۆ دەستیشان دەکات.

## ٢. سەلماندن وەکو ڕەتدانەوە

لە ئاستی چ بوونێکدا بوون—بۆ— خۆ ئامادەیە؟ ئەم پرسیارە ڕاستەوخۆ وا دەردەکەوێت باش دانەنرابێت. بوون ئەوەیە، کە هەیە؛ ئەو شتە نییە تاکو لە پرسیارکردنەکەدا بڵێین (چ شتێکە؟) ئەم پرسیارەش پڕ واتایە ئەگەر لەنێو جیهاندا بکرێت. لە ئاکامدا بەو خاڵە دەگەین، کە بوون—بۆ—خۆ ناتوانێت لە ئاستی ئەم بوونەدا نەک بوونێکی دیکەدا ئامادەبێت چونکە ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ دەبێتە هۆکار بۆ بوونی ئەم شتە نەک ئەو شتە.

نموونەکانمان ئەوەی دەرخست، کە بوون—بۆ—خۆ بوونێکی هەندەکی نییە. ئەمەش لە باسکردنەکەمان بۆ پەیوەندی زانین پێش ڕوونکردنەوەی بونیادی ڕەتدانەوەی دەرکەوت. ڕەتدانەوە لە پلەی دووەمدا خۆی بەرجەستەکرد. ڕەتدانەوە وەکو بەرزێتییەکی بنەڕەتی (ئەم) شتە نییە؛ بەڵکو دەبێت بە هۆکار بۆ بوونی (ئەم) شتە.

ئامادەبوونی بنەڕەتی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم بووندایە. ئایا دەتوانین بڵێین ئامادەبوونەکەی لەبەردەم هەموو بووندایە؟ ئەمە بۆ هەڵەکەی پێشومان دەگەڕێنێتەوە. هەمووی بوون لە ڕێگای بوون—بۆ—خۆوە پەیدا دەبێت. هەموگیری

بوون پێویستی بـــە پەیوەندی ناوەکی لەنێون فرەلایەنەکـــان و فرەلایەناکانیش پێویستییـــان بـــە هەمووگیرییەکی ناوەکی بۆ لایەنەکان هەیـــە. لێرەدا زۆرکردن دەبێـــت بە تێهەڵکێشـــکردن. هەمووگیری بوون ئەو بوونـــە پەیدادەکات، کە لە ئامادەبوونەکەیـــدا هەموو بوونی خۆیەتی. ئەمەش لـــە تەوانای بوون—بۆ—خۆدا دەبینرێت. بوون—بۆ—خۆ لـــە ئامادەبوونەکەیدا لەبەردەم بوونێکدا تێدەگات، کە ئـــەو ئامادەبوونە لەبەردەم هەموو بووندا مادامەکـــی هەمووگیری پەیوەندییەکی ناوەکییـــە لەنێوان (ئەوان)دا ئەوان لە ڕێگەی دەرخستنی تاکەکانەوە[ئەو یان ئەم شتەدا] دەدۆزرێتەوە. ئەمەش لە تێگەیشتنی بوون—بۆ—خۆ و لە ئامادەبوونەکەدا ئاشکرا دەبێت. ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەنێو جیهاندا ئامادەبوونێتی لەبەردەم شتێک یان چەند شتێکدا. دەتوانین ئەمەش هەڵگەڕێنینەوە و بڵێین، ئامادەبوونی لەبەردەم شتێکی تاکدا بەستراوە بە تێگەیشتنمان لە ئامادەبوونی لەنێو جیهاندا. هەستکردن بە ئامادەبوون لەنێو جیهاندا دادەمەزرێت.

جیهانیش دەبێت بە زەمینە بۆ ســـەرهەڵدانی هەموو هەســـتکردنێک. ئەوەی پێویستە بیسەلمێنین ئەو خاڵەیە، کە چۆن ســـەرهەڵدانی بوون—بۆ—خۆ بوونی (هەمووی) شتەکان یان (ئەوان) دەهێنێتەکایەوە.

ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم هەمووی بووندا، لەو ڕاستییەوە هاتووە، کـــە بوون—بۆ—خۆ دەبێت لەو شێوازی بوونەدا بێت، کە ئەوە نییە هەیە. لێرەدا هەمووی بوون لەبەردەم بوونێکدا ڕادەوەســـتێت، کە نییە. ڕەتدانەوەی بنەڕەت، لەم ڕووەوە، ڕادیکاڵانەیە. بوون—بۆ—خۆ بە ئامادەبوونی لەبەردەم بووندا هەمووی خۆیەتـــی، هەمـــووی ڕەتدانەوەیە و لە بەرئەمە ڕەتدانەوەی هەمووی بوونیشـــە. کەوابـــوو، هەموو جیهان دەبێـــت بە پێکهاتەی بوون بەبێ ئـــەوەی هەمووگیری وەدەســـت بهێنین. لە ڕێگەی جیهانەوە بوون—بۆ—خۆ دەتوانێت هەمووی خۆی، وەکو شتێکی نا- هەموو بناسێت.

واتـــای بوونی بوون—بۆ—خۆ لە دەرەوەی بوونـــی خۆیدا پەیدادەکرێت، بەڵام هێشتا بوون—بۆ-خۆیە واتا بە بوون دەبەخشێت. ئەم هەمووگیرییەی بوون بێجگە لـــە دەرخستنی بوون هیچی نوێ ناخاتە ســـەر بوون، وەکـــو شتێکی جیاواز لە بوون—بۆ—خۆوە چی دیکە نییە. ئـــەو بوونەش لە دەرەوەی بوون—بۆ—خۆدایە. دەرخستنـــی هەمووی بـــوون هیچ شتێک بۆ بوون زیاد ناکـــات. ئەگەر ئێمە دوو پیاڵە لەســـەر مێزەکە ببینین و بیانژمێرین، ئەو ژماردنەمان کاریگەرێتی بەســـەر بوون یان ســـروشتی پیاڵەکانەوە ناخاتەگـــەر. هەمانکات[ئەو دەرخستنە] ئاماژە بۆ لایەنێکـــی ناوەکی ڕووتی بوون—بۆ—خۆ ناکات. بـــەڵام ئەگەر بوون—بۆ—خۆ ئـــەو نەبوونە بێت، کە (ئەو شتـــە لێرەدا) دەردەخات ئەوا بـــوون لە بنەڕەتەوە دەبێت (هەمـــوو) بێـــت. کەوابوو، زانیـــن جیهانە. هایدیگـــەر گوتەنی؛ جیهان و

دەرەوەی ئەو نەبوونەیە. بەڵام ئەو نەبوونە ئەوە نییە ڕاســـتەقینەی مرۆڤی تێدا پەیدادەبێـــت. ئەم نەبوونە خودی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییـــە و ڕەتدانەوەیەکی ڕادیکاڵە، کە جیهان تیایدا ســـەرهەڵدەدات. تێگەیشـــتن لە بوونی جیهان، وەکو شتێکـــی هەمووگیر بوونی[ئێمەش]لەنێو جیهاندا، کە نەبوونێکە ئەو هەمووگیرییە بەردەوام دەهێڵێتەوە، دیاریدەکات.

لەڕاســـتیدا، ئەو نەبوونە ڕەهایە لە دەرەوەی هەمووی جیهاندا هەمووگیرییەکە دەســـەلمێنێت. لەبەرئەمەیە هەمووگیری هیچی زیادە ناخاتەســـەر بوون چونکە لەگەڵ ســـەرهەڵدانی ئـــەو نەبوونـــەوە پەیدادەبێت. ئەم نەبوونە ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییـــە بەردەوام لـــەو دیو بوونەوە و بە نەبوونییـــەوە لە خۆی تێدەگات. دەتوانین بڵێین، ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی هەمووی بوونی مرۆڤ دەردەخات یان ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی ڕێگەنادات لەوێدا بێجگـــە لە بوون چی دیکە لە دەوەی بووندا هەبێت. ئەم دوو دەســـتە واژەیە واتایەکیان هەیە. ئەم نەبوونە ئەگەرە بۆ ئەوەی لەودیو جیهانەوەیە و لەوێدایە، (١) دەبێتە هۆکاری دەرخستنی بوون، وەکو جیهان و(٢) ئەو ئەگەرەش ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە. لەگەڵ ئامادەبوون لەبەردەم بووندا خولی دەروون پێکدەهێنیت.

ئەگەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی خۆی بەودیو ڕەتدانەوەی کۆنکرێتی بگەیەنێت، ئـــەوا ناتوانێـــت هەمووگیری ڕاتدانەوەکان وەدەســـت بهێنێـــت. هەروەها ئەگەر ئاگامەنـــدی ڕەوانی ڕەتدانەوە جیانەکراوەکان بێـــت ناتوانێت خۆی بسەلمێنێت. لەم حاڵەتەدا نابێت بـــە هەمووگیرییەکی کۆنکرێتی. ئەو لەوێدا هەمووگیرەکە لە ڕیگەی ڕەتدانەوەکانی دیکەوە لـــە ڕەتدانەوەیەکی کۆنکرێتی خۆی ڕزگاردەکات. لەوێدا هەمووگیرە ئەگەر بەرەو هەموو بوونی خۆی بکەوێتە ڕێ و بەشەکانی خۆی جێبهێڵێـــت. ئەگینا ئەو دەبێت بەو شتەی ئێستا هەیـــە و بەو هەمووەی بوونی ناگات، کە هێشـــتا پەیدای نەکردوە. بەشێکی بونیـــادی ڕەتدانەوە دەبێت لەنێو زەمینەی ڕەتدانەوە دیاری نەکراوەکانەوە ســـەرهەڵدات. ئەو زەمینە بوونی منە. منیش، لەگەڵ جیاکردنەوەی بوونی خۆم لە بوون—لەنێو—خۆوە، خۆم دەناســـم. ئەو شتەی لەوێدا لەبەردەم مندا دانراوە (من) نییە. ئەو شتەش، لەنێو بەســـتێنی بوون بەگشتییەوە خۆی دەردەخات و خۆی بە من دەناسێنێت.

پەیوەنـــدی نێوان ئەو شتـــە و هەمووی بوون ســـەرچاوەی پەیوەندی نێوان شێوە و زەمینەیە لە بیردۆزەی گێشـــتاڵتدا باســـکراوە.(ئەو) شتە هەمیشـــە بە زەمینەیەکەوە بەســـتراوە؛ ئەوەندەی بوون—بۆ—خۆ ڕەتدانەوەیەکی دیارینەکراوی ڕادیکاڵانەیە، ئەویش لەنێو هەموویەکی دیارینەکراوی بووندایە. لەکاتێکدا شتێکی دیکـــە لەبەردەم ئاگامەندییدا قوتدەبێتەوە، شتەکەی پێشـــو جارێکی دیکە لەنێو هەمـــووە دیارینەکراوەکەدا خـــۆی وندەکات. بوونی منیش بـــە شێوەیەک خۆی

دەردەخـــات، کە ئەوەو ئەویش نییە. ئەوە، وەکو نە-بوون و بوونی ئەویش نییە. لەم بەســـتێنەوە ڕەتدانەوەکەی ئێستام بەرانبـــەر ئەو شتە دەردەکەوێت، ئەگینا ڕەتدانەوەکـــەم لەنێو ڕەتدانـــەوە نادیاریکراوەکاندا دەتوێتـــەوە. خۆ دەرخستنی ئەو شتـــە لەنێو زەمینە هەمووگیرەکـــەدا پەیوەندی بـــە هەڵوێستێکی تایبەتی ڕەتدانەوەی بوون—بۆ—خۆوە هەیە. ئەو شتە هەیە چونکە من هێشـــتا نەبووم بە هێـــزی ڕەتدانەوەی داهاتوو، هەروەها بەتەواویـــش ڕەتدانەوەکانی ڕابردووی خۆم نیم. ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت بوونی ئاگامەندی، وەکو ڕەتدانەوەیەک لەســـەر زەمینەی هەموو ڕەتدانەوە ڕادیکاڵەکانی ڕادەوەستێت.

بوون—بۆ—خـــۆ جیهان نییە. شوێـــن، بەردەوامی و ماتەر بەگشـــتی بوون—لەنێو—خۆن. بەڵام جیاکردنەوەکە لەســـەر ئەوە دادەمەزرێت، کە بوون—بۆ—خۆ ئـــەو مێزە، ئەو پەرداخە و ئەو ژوورە نییە. ئەمەش لەســـەر زەمینەی ڕەتدانەوە هەمووگیرییەکەدا دادەمەزرێت. بوونی (ئەو شتە) ئاماژە بۆ ڕەتدانەوەی ڕەتدانەوە دەکـــات. ڕەتدانەوەیەکـــی ڕادیکاڵانە، کە نکۆڵی دەکـــات و هەمانکات خۆی بەو شتەوە بە دەزوییەکی ئۆنتۆلۆجییەوە گرێـــدەدات. لەم ڕووەوە (ئەو)، وەکو (ئەو) لە ڕێگەی خۆگەڕانەوە بەرەو زەمینەی جیهان دەردەخات. سەلماندنی بوونی، کە بناخەی سەلماندنەکانی دیکەیە، دەبێت بە ڕەتدانەوە.

پێویستـــە بزانین ئـــەم ڕەتدانەوەیە- لە ڕوانگەی بوونی (ئەو)ەوە- بەگشـــتی بیرۆکەیە. هیچ شتێکی زیادە ناخاتەســـەر بوون و کەمیشـــی ناکات. ئەو بوونەی ڕووبـــەڕووی دەبینەوە نابێـــت بە شتێکی دیکەو پەیداش نابێـــت چونکە شتێکە هەیە. لە دەرەوەی بوونی خۆیدا ڕاناوەســـتێت تاکو ناسنامەکەی لەنێو بەستێنە هەمووگرییەکـــەوە نکۆڵی لێبکرێـــت. ڕەتدانەوەی (ئەو) شتـــە بوونێک دەیهێنێتە کایـــەوە، کـــە لەبەردەم هەمووی بووندا و ئەم و ئـــەو شتەش ئامادەدبێت. بەڵام مادامەکی نکۆڵیکردنەکە بوونـــی بنەڕەتی ئەو شتە، خۆی دەهێڵێتەوە و گۆڕانی بەســـەردا ناهێنێت ئەوا ڕەتدانەوەکەی دەرەکییـــە؛ پەیوەندی نێوان ئەو شتە و هەمووش دەرەکییە. دەبینین [لێرەدا] سەلماندن دەبێت بە ڕەتدانەوەی دەرەکی و بەستراویشە بە ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی ڕادیکاڵەوە، کە (من)ە. ئەمە واتای شاراوە و ئاڵۆزی جیهانە، وەکو تێهەڵکێشـــەیەکی هەمووگیر و کۆی هەموو (ئەو) شتانە خۆیـــان دەردەخەن. بەڵام، مادامەکی جیهان، وەکو زەمینەیەکی هەمووگیر خۆی دەردەخـــات و بوون—بۆ—خۆ دەبێت بە (نەبوون) بۆ بوونـــی خۆی، ئەوا جیهان دەبێت بە دیارینەکراو. مادامەکی ئـــەم دیارینەکردنەشی لەودیو دیارینەکردنێکی کۆنکرێتـــی و لەناوبردنی ئەو شتەیە ئێستـــا لەبەردەممانداية ئەوا جیهان، وەکو ســـندوقێک هەمیشـــە لەبەردەســـتماندا بۆ کردنەوە و دەرهێنانی (ئەو) شتانەی تیایدایە ئامادەیە.

ئـــەو کاتەی لە زەوییەکی پان و بەرین نزیـــک دەبینەوە شتە وردیلەکانی نێو زەوییەکەمـــان لائاشکرا دەبێـــت. بەهەمان شێوە لـــە تاقیکردنەوەیەکی فێرگەی گیشتاڵتدا ئەو بەستێنە گشتییەی دەبینرێت کتوپڕ دەبێت بە جیهانی شتە وردیلە و زۆرەکـــان. بەمجۆرە جیهـــان، وەکو پەیوەندییەک لەنێـــو شتە فرەلایەنەکان و هەمووگیرییەکەدا، ئەو بەستێنە بەرفراوان و هەمووگیرەیە، کە تێهەڵکێشکردنێکی بنەڕەتی پێکناهێنێت. بەردەوام بوونی جیهانیش، وەکو خەسڵەتێکی فۆرمەلیستی دەبێـــت بە زەمینـــە بۆ بەردەوام نەبوونـــی ئەو شتانەی پەیوەنـــدی دەرەکییان لەگـــەڵ هەمووگیری جیهاندا هەیە. ئەمجۆرە پەیوەندییەشە لەنێوان بەردەوامی و نابەردەوامییدا پێناســـە بۆ شوێن دادەنێت. شوێـــن بوون نییە، بەڵکو پەیوەندی جوڵاوی ئەو بوونانەیە، کە پەیوەندیدار نین. ســـەربەخۆیی تەواوی هەموو بوونە-لەنێو—خۆکانـــە و بـــۆ ئەو بوونە خۆی دەرخستوە، کە لەبـــەردەم هەموو بووندا ئامادەبووە. شوێن دەرەوەیە. دەرەوەبوونی شوێنیش سەر بە هیچ بوونێک نییە، بـــە تەنیا نییە و ناتوانێت خۆی پەیدابکات. بوون لە شوێندا لەســـەر پەیوەندی نێـــوان بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ هەمووی جیهان و یەک شتدا ڕادەوەســـتێت. شوێن جیهان نییە، بەڵکـــو گۆڕانکارییەکە لە هەمووی جیهاندا چونکە جیهان بەردەوام دەبێـــت بە زۆربوون و فرەلایەنی شتە دەرەکییەکان. شوێن شێوە و زەمینە نییە، بەڵکـــو زەمینەیەکی ئایدیاڵییە و لەنێو شێوە زۆرەکاندا دەتوێتەوە. بەردەوام یان نابەردەوام نییە، بەڵکو گۆڕانێکی هەمیشـــەییە لە بەردەوامییەوە بۆ نابەردەوامی. شوێن ئەوە دەســـەلمێنیت، کە بوون—بۆ—خۆ لە دەرخستنی بوونێک (لە ئەوێدا) بـــە ئامادەبوونەکەی هیچی زیادە ناخاتە ســـەر بوون. شوێن تێهەڵکێشـــەیەکی ئایدیالییە؛ هەموویەکە لە جیهانەوە پەیدادەبێت. شوێن ڕێگەش بە حەدەســـێکی کۆنکرێتی نادات بیدۆزێتەوە چونکە بوونی نییە. شوێن پشـــت بە کات بۆ بوونی دەبەســـتێت چونکە بوونێک دەیهێنێتە جیهانەوە، کە کاتییە. شوێن پەیوەندی بە بوونێکەوە هەیە، کە بۆ تێگەیشتن لە خۆی لە بوونی خۆیەوە دەردەچێت. شوێن بۆ (ئەو) شتە بۆ بوونی زیادنەکراوە و بەڵکو شوێنە بۆ ئەوە. پەیوەندی دەرەکی ئـــەو شتە بە زەمینەکەوە دیاریدەکات. لێرەدا بێســـودە بڵێین شوین فۆرمێکە و لەڕێگەی بونیادێکی لەپێشـــتری هەستکردن بەســـەر دیاردەیەکدا سەپێنراوە.[٥١]

٥١ لێرەدا سارتەر دژی بۆچوونەکەی کانت لەبارەی کات و شوێنەوە ڕادەوەستێت. بۆ کانت، کات و شوێن دوو فۆرمی لەپێشترن بۆ هەستکردن، بەڵام کات و شوێن بە ڕێگەی هەستکردنەوە نادۆزرێنەوە. مرۆڤ هەست بە هەر بابەتێک بکات پێویستە ئەو بابەتە و مرۆڤەکەش لە پێش هەمووشتێکدا یان پێش سەرهەڵدانی زانینەکە لەنێو کات و شوێندا بن. کەوابوو، کات و شوێن دوو پێشمەرجی بنەڕەتین بۆ ئەزمونی هەستکردن. کانت لە بەشی یەکەمی پەرتووکی یەکەمییدا بە درێژی باسی کات و شوێنی کردوە. (وەرگێڕ)

شوێن فۆرم نییە چونکە هیچە. ســـەبارەت بە بوون—بۆ—خۆش، ئەگەر ئەم بوونە شوێن نەبێت، لەبەرئەوەیە، کە خۆی وەکو بوون—لەنێو—خۆ نابینێت. ئەو لەگەڵ نکۆڵیکردنی بوونـــی خۆی، وەکو شتێکی دەرەکی و دەرچوون لە بوونی خۆیەوە بڕیار لەســـەر دیاریکردنی شوێن دەدات. هەروەها پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو-خۆ دەرەکییەکی شاراوە نییە.

پەیوەندییەکـــەی لەگـــەڵ بوون— لەنێو—خۆیـــدا ڕەتدانەوەیەکـــی ناوەکییە. لەبەرڕۆشنایـــی ئـــەم پەیوەندییەشدایە بوون—لەنێو—خۆ بـــەردەوام پەیوەندییە دەرەکییەکەی لەگەڵ هەبووەکانی نێو جیهاندا دروســـتدەکات. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە باســـی ئەو بوونە بکەین ڕەتدانەوەی دەرەکی دەبێت بە خاوەنی و بوون—بۆ—خۆش دەیهێنێتە جیهانەوە.

ئێمە دەزانین ئەو بوونە سەر بە (ئەو) شتە نییە. ڕۆژنامەی سەرمێزەکە ناتوانێت بڵێـــت، کە ئەو مێزەکە نییە. لەم حاڵەتـــەدا ڕۆژنامەکە دەبێت لە دەرەوەی خۆیدا ڕاوەســـتێت و ڕەتدانەوەکەشی ناوەکی بێت؛ لە بوون—لەنێو—خۆوە دەبێ ببێت بە بوون—بۆ—خۆ. پەیوەندییەکە لەنێوان ئەو یان ئەم شتەدا نییە، بەڵکو بەبێ ئەوەی ببێت بە ئەوان لەنێو خۆیدا کۆیان دەکاتەوەو وەکو خۆیان جێیان دەهێڵێت.

لێرەدا دەستەواژە ناسراوەکەی ســـپینۆزا "هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەیە"، کە هیگڵ گرنگییەتییەکەشی ناســـیوە، دەگۆڕیـــن. بانگەشەی ئەوە دەکەین، کە هەر سەلماندنێک لە بوونی ئەو شتە باسکراوەدا نەبێت ڕەدانەوەیەکی ئایدیالییە. تەنانەت ئەگـــەر شوێن ســـایکۆلۆجیزمی ڕەخنەگرانـــەی ئەزمونگەریش بکەوین هێشـــتا ناگەینە ئەو باوەڕەی بابەتە دەروونییەکە خاوەنی ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی تێهەڵکێشراو بێت.

هیـــچ هۆکارێکیش نامانگەیەنێتـــە ئەو باوەڕەی بوون—بۆ—خـــۆ ڕەتدانەوەی دەرەکی نێوان بابەتە دەرەکییەکان لەناوبەرێت، لە کاتێکدا بوون—بۆ—خۆ خودی ڕەتدانەوەکە نەبێـــت. لەبەرئەمە، ڕەتدانەوەی دەرەکی، وەکو پێکهاتەیەکی (ئەو) شتە خەســـڵەتی شتەکە نییە و لەناو ئەویشـــدا نییە. مەبەســـت لە پێکهاتەش ئەو خەســـڵەتەیە لـــە بنەڕەتەوە لەنێو ئەو بوونەدا بێـــت. ئەمەش بەو خاڵەمان ناگەیەنێـــت، کە ڕەتدانەوەی دەرەکی لەنێو خودی بوون—بۆ—خۆدا بێت. بوون—بۆ—خۆ ڕەتدانەوەی ناوەکی ڕووتە؛ بوونی ڕەتدانەوەی دەرەکی لەنێو بوون—بۆ—خۆدا دەبێتە هۆکاری ڕووخان و لەناوچوونی بوونی.

بوونی دەرەکی ئەو "لەنێو هەوادا" دەیهێڵێتەوە و لە دەرەوەی بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆدا ڕایدەگرێت. لەبەرئـــەوەی دەرەکییە، ئەمجۆرە ڕەتدانەوەیە بەتەنیاش ڕاناوەستێت و پشـــت بە هیچیش نابەستێت. لە بنەڕەتەوە بوونی ئەو سەربەخۆ نییە و هەمانکات بۆ هیچ جەوهەرێکیش ناگەڕێتەوە. ئەو هیچە.

لەڕاسـتیدا هیچە چونکە شوشە مەرەکەبەکە، مێزەکە، سەبیلی جگەرەکە یان پەرداخەکە نییە. ئێمە ئەو شتە، وەکو شوشەی مەرەکەب دەبینین.
هەمانکـات ئەگەر بڵێم، "شوشە مەرەکەبەکە مێزەکـە نییە" من بیر لە هیچ ناکەمـەوە. کەوابوو، سـەلماندن هیچ نییـە، وەکو بونیادێکـی ناوەکیش نە لە ئاگامەنـدی و نە لەنێو شتەکەدایە. بوونی ئەو بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ ڕەتدانەوەی ناوەکییدا ئەو کاتەی بوون—لەنێو—خۆ، وەکو شتێکی جیاواز لە بوون—بۆ—خۆوە خۆی دەردەخات، پەیدای دەکات.

## ٣. چۆنیەتی، چەندەکی، هێزەکی و ناوەندیکردن

چۆنیەتی بوونی ئەو شتەیە، کە پاش داماڵینی پەیوەندییە دەرەکییەکانی لەگەڵ جیهـان و شتەکانی دیکەدا خۆی دەردەخات. زۆرجار چۆنیەتی بە خەسـڵەتێکی سـادەی ناوەوە دانراوە و بە لایەنێکی دەرونییـەوە گرێدراوە. لێرەدا، گرفتەکە، بەوجـۆرەی دەردەکەوێـت، دۆزینـەوەی لایەنە پێکهاتوەکانـی بابەتێکە، وەکو یەکێتییەکی بەرزی هەموو چۆنییەتیەکانی. ئێمە لەپێشـتر باسـمانکرد، کە ئەم گرفتە چارەسەر ناکرێت. ئەگەر چۆنیەتییەک ناوەکی بێت، ناتوانێت خۆی بکات بە خەسڵەتێکی دەرەکی. گریمان یەکێتی بابەتێک لەودیو چۆنیەتییەکانییەوە دانراوە؛ هەریەکێک لە ئـەوان دەبێت کاریگەرێتییەکی دەروونی بەسـەر ئێمەوە هەبێت. بەڵام ڕەنگی زەرد لە لیمۆدا لە تێگەیشـتنێکی دەروونی ئێمەوە سـەرهەڵنادات. زەردییەکە لیمۆکەیە. لیمۆکە بە حوکمی چۆنیەتییەکانی هەیە. چۆنیەتییەکانیش پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. ترشی لیمۆکە لە ڕەنگ زەردییدایە و ڕەنگ زەردی لیمۆکەش ترشییە. ئێمـە ڕەنگی کێک دەخۆین، ڕەنگی کێکەکەش ناوەندێکە بۆ دەرخستنی شێوەکەی و ئەو شتەی بە حەدەسـی خواردەمەنی ناوزەدی دەکەین. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، ئەگەر پەنجەم بخەمە نێو شوشەیەک مرەباوە ساردی و لینجی مرەباکە تامە شیرینەکەی بە پەنجەم دەگەیەنێت. شلی، ساردی، ڕەنگ و جوڵەی ئاوەکە لە حەوزەکەدا لە یەک سـاتدا بەڕیز خۆیان نیشانی من دەدەن؛ تەفسیری هەموو ئەو خەسـڵەتانەش پێکەوە (ئـەو) شتە دەردەخات. ئەمەش لە ئەزمونی هونەرمەندەکانی شێوەکارییدا، بەتایبەتی سیزان، ئاشکرا دیارە. هوسرڵ لەوێـدا بە هەڵەدا چـووە، کە دەڵێت تێهەڵکشـکردنە پێویستییەکە بەبێ مەرج ڕەنگ و فۆرم پێکەوە دەبەسـتێتەوە. لەڕاستیدا فۆرم ڕەنگ و ڕووناکییە. ئەگەر هونەرمەندێکی شێوەکار یەکێک لەوانە بگۆڕێت ئەوی دیکەش گۆڕانی بەسەرداد‌ێت. ئەمەش لەبەرئەوە نییە، کە ئەم دوو خەسـڵەتە بە یاسـایەک پێکەوە گرێدراون، بەڵکو هەردووکیان یەک شتن.

لەم ڕووەوە چۆنیەتی بوون هەمووی بوونە. چۆنیەتی ئامادەبوونی ڕەهای ئەو بوونە پێکهاتووەیە. ئێمە بە ناســینی چۆنیەی هیچ شتێک ناخەینە ســەر بوون. ناســینەکەمان تەنیا بوون، وەکو ئەو شتە لەوێــدا دەردەخات. چۆنیەتی لایەنی دەرەکــی بوونێک نییە. ئــەوەی خاوەنی ناوەوە نەبێــت دەرەوەشی نییە. بەڵام بۆ ئەوەی چۆنیەتــی هەبێت ئەبێت بوونێک بۆ نەبوون هەبێت، کە لە بنەڕەتەوە هیچە.

هێشــتا بوون لەنێو خۆیدا چۆنیەتــی نییە. بەڵکو چۆنیەتی هەمووی بوونە و لەنێو سنوری (ئەو) شتەدا خۆی دەردەخات. ئەو دەرەوەی بوون نییە؛ لەبەرئەوەی بــوون بۆ بوون نییە، ئەوا چۆنیەتی هەمووی بوونە. ئەمەش [ڕاســتیەکە]بۆ ئەو بوونەی، کــە دەتوانێت خۆی لەو بوونە جیابکاتــەوە. پەیوەندی بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ چۆنیەتیدا ئۆنتۆلۆجییانەیە.

ناســینی چۆنیەتــی هەڵوێستێکــی ســیستی وەرگرتن نییــەو ئاگامەندیش بوون—لەنێو—خــۆ نییە تاکو ببێت بەو شتەی هەیــە. بوون—بۆ—خۆ لە ڕیگەی چۆنیەتییەوە ئەو شتەی بەردەمی دەناســیت. بۆ ئــەوەی بوون—بۆ—خۆ ڕەنگی سوری کتێبەکە ببینێت، پێویستە خۆی، وەکو ڕەتدانەوەی ناوەکی ئەو چونیەتییە دابنێت. ناسینی چۆنیەتی، بەو جۆرەی هوسرڵ بۆیدەچێت، خۆ تەواوکردن نییە، بەڵکو فۆرمێکی دەستکەوتوە لەو بۆشاییەدا. لەم ڕووەوە، چۆنیەتی لە دەرەوەی دەســتەڵاتی ئێمەدا، دەبێت بە ئامادەبوونێکی نەبڕاوە. تاکو ئێستا کێشەی زانین چارەسەرنەکراوە و لەگەڵ خواردندا بەراوردکراوە. گوایە بابەتە زانراوەکە دەخورێت و هەزم دەکرێت. زانەرەکەش پڕدەکاتەوە. ئێمە لە باســکردنی بنەڕەتی دیاردەی هەســتکردندا وابۆیدەچین پەیوەندی نێوان چونیەتــی و ئێمە نزیکبوونەوەیەکی ڕەهــا بێــت. بابەتەکە لەوێدا بەبێ ئەوەی خۆی لەناوبەرێت یان تەســلیم بکات، لەبەردەم ئێمەدا دەردەکەوێت. نزیکبوونەوەی بابەتەکەش دووریی ئەو لە ئێمەوە دیاریدەکات. ئەو شتێکە لە دەرەوەی ئێمەدا ڕاوەســتاوە. ئێمە خۆمان بە هەژار [لــە بارەیەوە] دەبینین. تێڕامانمان، وەکو چۆن برســییەک دەڕوانێتە خواردن و دەســتی بە خواردنەکە ناگات، یان وەکو برسێتییەکەی (تەنتالۆس)، ئێمە زۆرتر خولیا و برسیتر دەکات. چونیەتی ئەو بوونە دەگەیەنێت، کە لە ئێمەوە جیاوازە و شێوازێکی بوونیشــە، کە[هێشتا] وەدەســتمان نەهێناوە. ناسینی چۆنیەتیش بەســتراوە بە ناســینی شتێکەوە. چۆنیەتی هەرشتێک بێــت، خۆی وەکو بوون نیشان دەدات. ئەو بۆنەی بە چاوداخراوی بە لوتی مندا تێدەپەڕێت، پێش ئەوەی بزانم بۆنــی چییە، ڕامانێکی (ئینتباعێکی) دەروونــی نییە و بوونی خۆی هەیە. ئەو تیشــکەی بەیانیان بەرچــاو دەکەوێت بوونی خۆی هەیــە. ئەمەش ئاشکرا دەبێت ئەگەر کەســێک بەوردی بیر لە بوونی چۆنیەتی بکاتەوە. بێگومان، وەکو

شتێکـــی هەبوو، خۆی بۆ لایەنە دەروونییەکە دەردەخات. ئەولایەنە دەروونییەش ئـــەوە نییە، کە ئێستا هەیە. لەگەڵ ئەوەشـــدا، کاتێک دەڵێیین چۆنیەتی بوونی خۆی هەیە، مەبەســـتمان لە جەوهەر بوونی چۆنیەتی نییە. ئەوەی مەبەســـتمانە جیاکردنـــەوەی شێوازی بوونی چۆنیەتییە لە شێـــوازی بوونی بوون—بۆ—خۆوە. ڕەنگی ســـپی یـــان ترشی ڕەهەندەکانـــی کاتیان نییە. ئەگەر ئەو پرســـیارەمان لێبکرێـــت، چۆن شتێک چۆنیەتی هەیە؟ لە وەڵامـــدا دەڵێین، ئەو شتە هەمووی خۆی لەسەر زەمینەی بوونی لەنێو جیهاندا دەردەخات. ئەمەش یەکێتییەیەکە لە هەموو هەبووەکاندا هەیەو لەیەکدیـــان جیاناکاتەوە. ئەوەی خۆی جیادەکاتەوە، بەرانبەر شتێک ڕادەوەســـتێت و چۆنیەتییەکەی دەدۆزێتـــەوە بوون—بۆ—خۆیە. هەڵوێستی ڕەتدانەوەی بوون—بۆ—خۆ، کە سەربەســـتی ئەم بوونە دەسەلمێنێت، بوون دەردەخات. ئەمەش سەلماندنێکی تەواوی بوونە لە ڕێگەی ڕەتدانەوەوە. بۆ ئەوەی بوون—بۆ—خۆ لە دەستەڵاتی ڕەتدانەوە تێبگات و بۆی ڕوونببێتەوە، کە ئەو شتە نییە، دەبێت تایبەتمەندێتی بوونی خۆی بناسێتەوە. ئەم سەلماندنە ڕەهایەی چۆنیەتی، وەکو بوونی (ئەو) شتە ســـەربە سەربەستی بوون—بۆ—خۆیە. شتێک نییە هەبێت، بەڵکو پەیدادەبێت. هەموو کەسێک بە چاوی خۆی دەتوانێت ببینێت، چۆن سەرهەڵدانی چۆنیەتی شتێک دەبێت بە فاکتۆرێکی سەربەستی. ئەو کاتەی من نەتوانم ڕەنگی زەردی تویکڵی پرتەقاڵەکە بوەســـتێنم، ئەوا من لە ناســـینی ئەو توێکڵە زەرد و زبرەدا بەرپرســـم. بەڵام پەیوەندی نێوان شێوە و بەســـتێن، تاکوڕادەیەک لـــە پەیوەندی نێوان شتێک و جیهانەوە جیـــاوازە. وادەردەکەوێت بەســـتێنەکە و شیـــوە لەنێو یەکدیدابن. من توێکڵەکە بـــە زەرد دەبینم، زبری و ڕەونەقی ڕەنگەکەشی بەستێنێکی ناوەکی هەیە. من لێرەدا، لایەنە یەکگرتوەکانم لەیەکدی جیانەکردۆتەوە و بوون بووە بەو شتەی لەبەردەممدایە. بەڵام ناســـینی بوون پێویستی بە پرۆسەی ڕوتکردنەوە هەیە. ڕوتکردنەوەش ناسینی چۆنیەتییەک نییە بە ئاســـمانەوە هەڵواسرابێت، بەڵکو ناســـینی (ئەو) چۆنیەتییەیە دەبێت بە زەمینەیەکی ناوەکی بۆ هاوتابوونێکی ڕەها. ڕووتکردنەوەی ڕەنگی زەرد لە بوونی ڕەنگەکە کەم ناکاتەوە. ڕووتکردنەوە، بەهەرحاڵ، ئامادەبوونە لەبەردەم بووندا و بوونـــە ڕووتکراوەکەش بوونی دەرەکی خۆی دەپارێزێت. بەڵام لە ئامادەبوونەکەدا لەودیو بوونەوە دەبینرێت و دەبێت بە شتێک لەدەرەوەدا ڕاوەستابێت. ئامادەبوون لەبـــەردەم بووندا ئەگەرێکی بوون—بۆ—خۆیە. ڕووتکردنەوەکەش دەبێت بە واتای چۆنیەتـــی بۆ ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ. ڕەنگـــە زەردە ڕووتکراوەکە واتایەکی پێکهاتـــوی ئـــەو شتە کۆنکرێتییەیـــە و خۆی بۆ من دەردەخـــات. ئەمەش ئێمە بەرەو ناوەندیکردن و کاتیەتی جیهان پەلکێشـــمان دەکات. دوایی بۆ ئەم باســـە دەگەڕێینەوە، لێرەدا ئەوەندە لەبارەی ڕووتکردنەوە، وەکو ئەگەرێک بەسەر بوون—

لەنێو—خۆدا سەپێنرابێت، بەسە بزانین. هەستکردن هەرچییەک بێت ڕووتکردنەوە هەمیشە شتێکی دروستکراوە. من لە داهاتووی خۆمدا دەیدۆزمەوە. هاوبوونی ئەگەری ئامادەبوونی منە.

ئەگەر کەسێک ئەو کێشانەمان بهێنێتەوە یاد، کە پەیوەندییان بە ڕووتکردنەوە لە بۆچوونە کلاسیکییەکاندا هەیە ئێمەش دەڵێین، ئەو کێشانە لە جیاکردنەوەی (ئەو) شتە و پرۆسەی ڕووتکردنەوەکەوە سەریانهەڵداوە. ئەگەر شتێک لایەنی هێزەکی ڕووتکردنەوەی تێدا نەبێت، لەدواییدا ناتوانین چۆنیەتییەکی ڕووتبکەینەوە. ڕووتکردنەوە، وەکو ئەگەرێکی داهاتووی من، بەشێکە لە بوونی ئەو شتە. بوون—بۆ—خۆ ڕووتکەرەوەیە. ئەمەش پەیوەندی بە لایەنی دەروونی ئەم بوونەوە نییە، بەڵکو لەبەرئەوەیە بوون—بۆ—خۆ لە داهاتودا لەبەردەم بووندا ئامادە دەبێت. بوون بە تەنیا و لەنێو خۆیدا کۆنکریتیی، ڕووتکراوە، ئێستا و داهاتوو نییە: شتێکە هەیە. هەروەها، ڕووتکردنەوە بوون دەوڵەمەند ناکات. ڕووتکردنەوە تەنیا دەرخستنی نەبوونی بوونە لەو دیو بوونەوە.

پەیوەندی نێوان شتەکان کارتێکردنەسەر، هۆکارێکی یان سەرهەڵدان لەنێو یەک زەمینەوە نییە. ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم یەک شتدا جەخت لەسەر بوونی شتەکانی دیکەش لەنێو جهاندا دەکات. بەڵام هەموویان خۆیان بەو زەمینەیەوە دەبەستنەوە. ئەو شتەی ئامادەبووە لەسەری ڕاوەستاوە. لە دامەزراندنی پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئەم یان ئەو شتەدا دەبێت شتی دووەم، خۆی لەنێو جیهاندا و لە دەربڕینی ڕەتدانەوەکەی مندا دەربخات. لە هەموو حاڵەتێکدا شتی دووەم دەبێت لە شتی یەکەم جیابکرێتەوە و بە ڕەتدانەوەکەم دەرکەوێت، کە ئەو شتی یەکەم نییە. لەبەرئەمە پەیوەندی نێوان ئەم و ئەو شتە لەسەر ڕەتدانەوەی دەرەکی ڕادەوەستێت. ئەم شتە ئەو شتە نییە. ڕەتدانەوەی دەرەکیش بۆ بوون—بۆ—خۆ دەبێت بە شتێکی بەرز؛ لە دەرەوەی ئەم بوونەدا هەیە و بوون— لەنێو-خۆیە. ئایا چۆن لەم بۆچوونە تێبگەین؟

لە سەرەتاوە، سەرهەڵدانی ئەم و ئەو شتە، وەکو هەمووگیر دەردەکەوێت. پەیوەندییەکەش بە یەکێتی ئەو هەمووگیرییەوە بەستراوەتەوە. یەکێتییەکەش تەواناى لەناوچوونی هەیە. بوون—بۆ—خۆش ئەم و ئەو شتە نییە. ئەم و ئەو شتە لەگەڵ ئامادەبوونی مندا دەبێت بە ژوورەکەم. ئەم ڕەتدانەوە کۆنکرێتییە لەگەڵ لەناوچوونی یەکیتییەکەدا وننابێت و بەپێچەوانەوە دەبێت بە مەرجێکی پێویست بۆ لەناوچوونی یەکێتیەکە. بەڵام لەسەر زەمینەی ئامادەبوونەکە بوون خۆی بە دەرەکی دەردەخات. بوونی دەرەکی خۆی بۆ من دەردەخات چونکە من یەکێتییەکی فرەلایەنیم. هەڵوێستە ڕەتدانەوەکانی من لەنێو جیهاندا بێجگەلەوەی هەڵوێستی منن و منیش ڕەتدانەوەم هیچ پەیوەندییەکی دیکەیان بە یەکدییەوە نییە. یەکێتی

نـــاوەوەی ڕەتدانەوەکان لە بوونـــی مندایە. من لەبەردەم مێز و کورســـییەکاندا ئامادەم، هەروەها منیش کۆمەڵێ ڕەتدانەوەی هاوتام. ڕەتدانەوەکانیش ناوەکین. بە ئامادەبوونم لەبەردەم مێزەکەدا ناگرنگی کورسییەکانم بۆ دەردەکەوێت (کە من لەو حالەتەدا ئەوان نیم). بە نەبوونی مێزی یاریکردنەکە [لە ژوورەکەدا] بەرەو نە-بوون دەڕۆم و خولەکە دەپچڕێت.

کەوابوو، کەلەبەر لە بووندا هەیە. بەڵام کەلەبەر و جیاکردنەوە لەگەڵ ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەبەردەم بووندا دروست دەبن. ڕەتدانەوەی یەکێتییەکە، هەمانکات دەبێت بە ســـەرچاوەی پەیوەندی نێوان شتەکـــان و ڕەتدانەوە دەرەکییەکانیان. پەیوەندییـــە دەرەکییەکەش لە وشەی (وە)دا دەردەکەوێت. لەجێگەی (ئەمشـــتە ئەوشتە نییە) دەنوسین (ئەم وە ئەو). ڕەتدانەوەی دەرەکی خەسڵەتی دوولایەنی هەیە،بوون-لەنیو-خۆ و ناسنامەیەکی ڕەوانیشە. ئەو بوونێکە -لەنێو—خۆ، چونکە بوون—بۆ—خۆ نییە. هەروەها ئێمە مامەڵە لەگەڵ ڕەتدانەوە بەوجۆرە ناکەین، تاکو بوون بکەین بەوەی هەیە. ئەمجۆرە ڕەتدانەوەیە سەر بە هیچ شتێک نییە؛ شتێکە سادە و ڕەوان. ئەوشتەیە، کە هەیە. هێشتا خەسڵەتی (ئەو)شتەش نییە و نابێت بە یەکێک لە چۆنیەتییەکانی. پشـــت بە بوونی شتەکانیش نابەســـتێت. ئەوەی شتەکـــان لەیەکدی جیادەکاتەوە هیچە. ئەم هیچەش ئەو شیوازەیە ئاگامەندی بە ناسنامەی تێهەڵکێشراوی بوونی دادەنێت.

هیـــچ یان نەبوونی ئایدیالی بوون—لەنێو—خۆ چەندەکییە. چەندەکی لایەنێکی دەرەکی ڕووتە؛ پشت بە چەمکە زیادکراوەکان نابەستێت و پەیوەندی بە سەپاندنی ســـەربەخۆییانەوە هەیە. ژماردن تەوانای جیاکردنەوەیە لەنێو ئەو هەمووگیرییەی هێزی هەڵوەشاندنەوەی تێدایە. ژمارەش سەر بە (ئەو) شتانە نییە، کە دەژمێردرێن و ناتوانیـــن هەمووگیرییەکـــە بکەین بە خاوەنی. ئەو کاتـــەی دوو کەس بەرانبەر کەسێکی دیکە ڕادەوەستن و دەدوێن من یەکەمجار، وەکو دەستەیەک یان کۆمەڵێک لـــە ئاخاوتندا نایانبینم تاکو بزانم چەند کەســـن. ژماردنیـــان یەکێتییەکەشیان، وەکو دەســـتە یان کۆمەڵێک ناشێوێنێت. دەستە سێ قۆڵییەکەیان خەسڵەتێکی کۆنکرێتی کۆمەڵ یان دەستە نییە. هەروەها نابێت بە خەسڵەتی ئەندامەکانیشی. هیچ کامیان ژمارە سێ نییە- تەنانەت سێیەمیشیان ژمارە سێ نییە.

پەیوەندی چەندەکی لەگـــەڵ بوون—لەنێو—خۆدایـــە. پەیوەندی ڕەتدانەوەی دەرەکییە. بەو شێوەیەی باســـمانکرد ســـەر بە شتەکان و هەمووگیرییەکەشیان نییـــە. پەیوەندییەکـــی دەرەکی نێوان شتەکانە و لـــە دەرەوەی خۆی و شتەکان ڕادەوەســـتێت. لەو کاتەدا دەردەکەوێت، کە بوون هەبێت و لە ڕێگەی بوون—بۆ—خۆوە بە بوونیش بگات. لەم ڕووەوە شوێن و چەندەکی یەکن و دەبن بە یەکجۆری ڕەتدانەوە. لەگـــەڵ دەرکەوتنی شتەکاندا بۆ من شوێن و چەندەکیش پەیدادەبن.

هەریەکێک لە ئـــەوان پەیوەندییە لەنێوان شتەکاندا یان ئەگەر حەزبکەین دەڵێم، ئـــەو پەیوەندییەی، کە نەبـــوو ئێستا بوونیک هێناوییەتـــە جیهانەوە پەیوەندی خودی بوونی خۆیەتی. ئەمەش هوســـرڵ بە کاتیگۆرییەکانی دادەنێت (یەکێتی—فرەلایەنی—پەیوەندی نێـــوان بەشەکان لەگەڵ هەموودا— کەم و زۆر—لەدەوری—تەنیشت— شوێنکەوتو— یەکەم— دووەم و هتد. یەک، دوو، سێ و هتد—لەناوەوە و لەدەرەوە، هتد.) ئەمانە تێکەڵکردنی ئایدیالانەی شتەکانە و کارناکاتە سەریان. دەوڵەمەند و هەژاریان ناکات. بەڵکو سەربەســـتی بوون—بۆ—خۆ لە ناسینی ئەو شتە فرەجۆرە نەبڕاوانەدا دیاریدەکات.

لـــە ڕوونکردنەوەکەماندا بۆ گرفتی بنەڕەتـــی پەیوەندی بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ بووندا وادەرکەوت، کە ئەم بوونە بەو جۆرەی لە کۆجیتۆکەی دێکارتدا دەبینرێت، ســـادە و ئاگاییەکی کتوپڕ بێت. لەڕاستیدا باسی ئەوەشمانکرد، چۆن دەرچوونی ئـــەم بوونە لە خۆوە بۆ دەرخستنی شتەکـــان و ڕووتکردنەوەیان پێویستە. بەڵام هێشـــتا دەرچوونی بوون—بۆ—خۆ ناوەکی بوو. باشتـــرە نەڵێین بوون لەبەردەم بوونێکـــدا دەردەکەوێت، کە لە پێشـــا خـــۆی ئامادە دەکـــات و دوایی خۆی لە داهاتـــوودا پێکدەهێنێت. بەڵکو بوون—لەنێو—خـــۆ بۆ بوونێک خۆی دەردەخات، کە بەو بوونەی دەیەوێـــت خەریک دەبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ڕەتدانەوەی بوون—بۆ—خۆ لە ئامادەبوونەکەیدا لەبەردەم بووندا لە هەڵوێستە دەرچووەکەیەوە ڕەهەنـــدی داهاتووی تێدایە؛ تاکو ئەو ڕادەیـــەی من ئەوشتە نیم، کە ئێستا هەم ئـــەوا من نابم بەو بوونە- لەنێو—خۆیەی لەبەردەممدا قوت بۆتەوە. من لەبەر ئەم و ئەوشتـــەدا ئامادەم بەبێ ئەوەی هەمووگیریم وەدەســـت هێنابێت. ئایا ئاکامی دەرکەوتنی ئەوشتـــە چییە؟ مادامەکی من بەردەوام لەودیـــو ئەو بوونەوەم، کە هەمـــە و خەریکە بە بوونی خـــۆم دەگەم، ئەوا (ئەو)شتەی لەبـــەردەم مندایە و منیش بۆی ئامادەبووم شتێکە بۆ مەبەســـتی گەیشـــتن بـــە بوونی خۆم تێپەڕی دەکەم. هەستپێکراو لە بنەڕەتدا ئەوشتەیە تێپەڕکراوە. من ڕەتدانەوەی ئەوشتەم و لەهامانکاتـــدا ئەم ڕەتدانەوە تێپـــەڕ دەکەم و خۆم بە ڕەتدانەوەیەکی تەواوکەر دەگەیەنم. لێکدانی هەردووکیان من دەکات بە بوونێکی—لەنێو—خۆ. پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجییانە لەنێوان ڕەتدانەوەی (ئەو)شتە و جۆری دووەمی ڕەتدانەوەکە هەیە. جۆری دووەم ڕەتدانەوەیەکی تەواوکـــەرە بۆ ئامادەبوونم لەبەردەم بووندا. لەبەر ئەوەی بوون—بۆ—خۆ لـــە ئامادەبوونەکەیدا، وەکو ئاگایی لە بوونی خۆی، خۆی پێکدەهێنێت ئەوا لە دەرەوەی بوونی خۆیدا خۆی بەو بوونە دەبینێت، کە هێشتا پەیدا نەبـــووە. ڕەتدانەوەی تەواوکەری بوون—بۆ—خۆ ئەگـــەری ڕەتدانەوەیە لە ئامادەبوونەکەیـــدا. بوون—بۆ—خۆ ئەو ڕەتدانەوەیەیە، کە ئاگامەندانە ڕوو دەکاتە ئەودیو بوون.

بوون—لەودیو—بوونەوە بە ئامادەبوونی (ئەو)شتەوە نەک پەیوەندی دەرەکییەوە بەستراوە. وابەستە بە تەواوکەرێتییەوە، کە پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و داهاتوو دیاریدەکات. لەپێش هەموو شتێکدا، (ئەو) شتە لە ڕەتدانەوەی بوونێکدا خۆی دەرخستوە، کە بوونی خۆی لە شتەکە جیادەکاتەوە. (ئەو)شتە نییە و ئەگەرێکە لەودیوو ئێستاوە. ئەم ئەگەرەی نێو ڕانەبردوو کەمی ئەم بوونە نیشاندەدات. بوونێکە، کە نەبووە بە بوون—لەنێو—خۆ و پرۆژەیەکە لە ڕەتدانەوەی ڕابردوودا خۆی لە نێو جیهاندا سەرگەرم کردوە. هەرچ ڕەتدانەوەیەک پەیوەندی بە سەرگەرمی ئەم بوونە و خۆگەیاندن بەودیو ڕانەبردووەوە نەبێت، گرنگێتی خۆی، وەکو ڕەتدانەوە وندەکات. ئەوەی بوون—بۆ—خۆ ڕەتیدەداتەوە پەیوەندی بە ڕەهەندی داهاتووەوە هەیە. ڕەتدانەوەکەی دەرەکی (وەکو ئەمشتە ئەوشتە نییە، ئەو کورسییە مێز نییە) یان ناوەکییە لە بوونی ئەودا. کاتێک دەڵێین ئەمشتە ئەوشتە نییە پەیوەندییەکی دەرەکی لەنێوان ئەم و ئەو شتەدا ئێستا یان لە داهاتوودا دیاریدەکەین. لە هەردوو جۆری ڕەتدانەوەکەدا واتای ڕەتدانەوە بە داهاتووەوە بەستراوە. هەموو ڕەتدانەوەیەک دەرچوونە.

دەرکەوتنی مێزەکە، وەکو مێز پێویستی بە بەردەوامی بوونی مێز لە داهاتووشدا هەیە. ئەمەش شتێکی دامەزرێنراو نییە، بەڵکو لایەنێکی هێزەکییە. هەروەها بەردەوامییەکە شتێک نییە لە داهاتوودا دانرابێت و کاتێکی نەبڕاوەی هەبێت. کاتی نەبڕاوە هێشتا پەیدانەبووە. مێزەکە وا خۆی دەرناخات، کە ئەگەری بوونی مێز بێت بەبێ بڕانەوە. ئەو (کات)ەی لێرەدا ئاماژەی بۆ دەکەین، بڕاوە یان نەبڕاوە نییە؛ لایەنی هێزەکی دەبێت بە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی داهاتوو.

کاتێک باسی واتای ڕەتدانەوە دەکەین، مەبەستمان ئەو کەمییەیە ڕەتدانەوەی بوون—بۆ—خۆ بۆ ئەوەی ببێت بە ڕەتدانەوە، هەیەتی. لەم ڕووەوە، ڕەتدانەوە لە داهاتوودا دەبێت بە سەلماندنی ڕەتدانەوەی ئێستا. لە داهاتوودا واتای بوونی من، وەکو ئەوشتەی نییە دەردەکەوێت. ڕەتدانەوەی ئەوشتە، کە ڕەنگی سەوز تیایدا لەسەر زەمینەی هەمووگیری (زبری و ڕووناکی) پێکهاتووە، واتا بەخشە دەردەچێت ئەگەر ڕەتدانەوەی ڕەنگی سەوز بێت؛ بوونی سەوز یان ئەو زەمینە بێت، کە فرەلایەنەکانی بەبێ جیاوازی تیادا کۆبۆتەوە.

نەبوونی واتا لە ڕەتدانەوەکەی مندا لەنێو ئەو زەمینەدا بە ڕەنگی سەوزی ڕووتەوە بەستراوە. ڕەنگی سەوزی ڕووت لە داهاتوودا دێتە نێو (سەوز— زبر— ڕووناکی) و واتا بە دەستەوە دەدات. لێرەدا واتای ڕووتکردنەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت. ناوەڕۆک لە نێو هەبووەکاندا، وەکو چۆنیەتی دانەبڕاوە. سەوز هەمیشە سەوز نییە. ناوەڕۆک لە زەمینەی داهاتووی بوونەوە پەیدادەبێت و لەو واتایە دەچێت، کە هێشتا نەدۆزراوەتەوە. پەیوەندی و ناسنامەیەکی ڕووتی ڕەتدانەوەی

منه. لێرەوە دەبینین، ڕووتکردنەوە پرۆسەیەکی سایکۆلۆجییانە نییە. شێوازێکی بنەڕەتـــی و ئۆنتۆلۆجییانەی بوون—بۆ—خۆیـــە. ڕووتکراوە بونیادی جیهانە و بۆ سەرهەڵدانی شتە کۆنکرێتییەکان پێویستە. شتێکی کۆنکرێتی لەوێدا کۆنکرێتییەکە لەسەر ڕووتکردنەوە ڕابوەستێت و لە ڕێگەی ڕووتکردنەوەوە بناسرێت.

بوونـــی بوون—بۆ—خۆ دەرخستنـــی ڕووتکردنەوەیە. لەم ڕووەوە بەردەوامی و ڕووتکردنەوە دەبن بـــە یەک شت. ئەگەر میزێک، وەکو خۆی تەواناى بەردەوامی هەبێـــت دەبێ مێـــز بێت. بەردەوامـــی ئەگەری یەکبوونی (ئـــەو) شتەیە لەگەڵ ناوەڕۆکییدا.

ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم نوسراوەدا ڕوونمانکردەوە پەیوەندی نێوان ئەگەری بوونـــی من و ئەو ڕانەبردووەی لێپڕادەکەم پەیوەندی نێوان کەمی و ئەو بوونەیە، کـــە خاوەنی کەمییەکەیە. تێهەڵکێشـــکردنێکی ئایدیالیانەی نێوان کەمی و بوونە کەمەکە ئەو هەمووگیرە نەناســـراوەیە توشـــی بوون—بۆ—خۆ بووە و نەبوونی لە بوونیدا پەیداکردوە. ئەم ئایدیاڵە ناودەنێین بەها یان بوون—لەنێو—خۆی—بوون—بۆ—خۆ. بەڵام پێش ســـەرنجدان و تێڕامان ئەم بەهایە نابینرێت چونکە دۆخێکی بوونە. ئەگـــەر ئاکامەکانمان گونجاوبن، ئەم تێهەڵکێشـــکردنە ئایدیالییە دەبێت بـــە ئاماژەکردنێکی دەرەکی بـــۆ بوونیادی ئایدیالانەی بابـــەت. بونیادەکەش بە ئاسانی لە ڕەتدانەوەدا دەردکەوێت. لەم تێهەڵکێشکردنەدا ڕووتکردنەوە دەبێت بە بناخـــەی شتە کۆنکرێتەکە. ئەوەی کۆنکرێتە (بە خوێن و گۆشتەوە) یان بوونەکە پێویستە ناوەڕۆکیش بێت. ناوەڕۆک لایەنە کۆنکرێتە دروستکراوەکەیە. لایەنی پڕ و دەوڵەمەند؛ فۆرم و هەمووی شتەکەیە. بوونی ماتەری ئەوە یان بەپێچەوانەوە، ماتەر فۆرمی ڕەهای دروستکراوی ئەو بوونەیە.

ئەم تێهەڵکێشە بەردەوامە مەحاڵەی نێوان بوون و ناوەڕۆک سەر بە ڕانەبردوو یان داهاتـــوو نییە. تێهەڵکێشـــکردنی ڕابردوو، ئێستا و داهاتـــووە. (هەمووی) ڕەهەندەکانـــی کاتە. بەهایەکی بـــەرزە؛ ئەوشتەیە، کە بە (جـــوان)ی دادەنێین. جوانـــی حاڵەتێکی ئایدیاڵی جیهانە. دەرکەوتنـــی یەکگرتنەکەیە لەنێوان بوون و ناوەڕۆکدا و بەخشینی ناسنامەیە بەویەکگرتنە بۆ بوونێک، کە لەو خۆدەرخستنەدا لەگـــەڵ بوون—لەنێوان—خـــۆ دەبێت بە یەک شت. ئەمـــەش لەبەرئەوەیە چونکە جوانی بەتەنیا تێهەڵکێشکردنێکی دەرەکی نییە و پەیوەندی بەتێگەیشتنی ئێمەوە هەیە.

ئەمـــەش هۆکاری حەزی ئێمەیـــە لە جوانی و جیهـــان و بوونی خۆشمان بە جۆرێـــک دەبینین لەو جوانییە بێبەشکرابین. شتێکـــی جوانیش هێندەی بوون—لەنێو—خۆی بوون—بۆ—خـــۆ، وەکو ئەگەرێک بۆ بوون بۆ—خۆ لایەنێکی هێزەکی نییە. لەبەر ئەوەی هێشـــتا نەناسراوە بووە بە دێوەزمەی جیهان. شتێکی جوان،

وەکو بەها، بە بیرکردنەوە نابێت بە بەهایەکی دەرەکی ئەودیو دەسەڵاتی ئێمە و لەنیو جیهاندا. لەناوەوە دەناسرێت. ئەو کەمییەیە لەنێو ناتەواوی جیهانەوە خۆی دەردەخات. ئەمانە هەموو لایەنەکانی (ئەو)شتە بۆ ناسینی نین. تاکو ئەو ڕادەیەی بوون—بۆ—خۆ دەبێت خۆی بە ئەودیو بوونی بگەیەنێت و (ئێستا) ڕەتبکات، ئەوا ئەودیو بوون دەردەخات و لەنێو زەمینەی بووندا (ئەو)شتە دەناسـێت. تاکو ئەو ڕادەیەی بوون—بۆ—خۆ، وەکـو مانگێکی هیلالییە و دەیەوێت خۆی لە داهاتوودا پڕ و تەواوبکات، ئەوا هیلالی لایەنی هێزەکی بوونیەتی. تاکو ئەو ڕادەیەی بوون—بۆ—خۆ خونچەیـە و خۆی بەودیو بوونی خونچەکە دەگەیەنێت و دەبێت بە گوڵ ئەوا بـوون بە گوڵ لایەنی هێزەکی خونچەیە. دەرخستنی ئەم لایەنە هێزەکییانە پەیووەندی ئەم بوونە بە ڕابردووشەوە دیاریدەکات. لە ڕابردوودا پەیوەندی نێوان شێوەی هیلالی مانگ و مانگی پڕ یان خونچە و گوڵدا دەبینرێت.

ڕابردووی بوون—بۆ—خۆ، وەکو زانین بۆ ئەم بوونە ڕادەوەستێت. ئەم زانینەش بە نەگۆڕی نامێنێتەوە و لە دەورەوەی بوون—بۆ—خۆدایە و لەبەر دەسـتدا نییە. لەنێو یەکێتی هەرسـێ ڕەهەندە کاتییەکەی بوون—بۆ—خۆدا ئەم بوونە دەتوانێت ڕابردووی خۆی هەڵگـرێ و لەوێوە داهاتوش ببینێت. بوونی من بە جۆرێکە، کە دەتوانێـت ببێت بە هۆکـاری ئەوەی ئێستا نیم و یان ببم بـەوەی لە داهاتوودا هـەم. ڕەتدانەوەی (ئـەو) شتە لە بوونی مندا دوو لایەتی من دەردەخات: من لە شێـوازی ئەو بوونەدا، کە تێپەڕمکـردووە و ئێستا ئەو نیم. هەروەها لە شێوازی ئەو بوونەشدا، کە هێشتا پێینەگەیشتوم و لە داهاتوودا دەبم بە ئەو. من لەو دیو مانگـی هیلالەوەم، ڕادیکاڵانـە ڕەتی دەدەمەوە و دەمەوێت ببم بە مانگێکی پڕ و تەواو؛ مانگە پڕەکەش بۆ ڕابردوو دەگەڕێتەوە تاکو حوکم بەسەر شێوازی هیلالی مندا بدات. مانگە پڕەکە ئەوەیە، کە مانگی هیلالی نییەتی و پێینەگەیشتوە. ئەو نەبوونیەیـە شێوازی هیلالی بە مانگی هیـلال دەدات. لەنێو یەکێتی ڕەتدانەوەی ئۆنتۆلۆجیـدا من ڕەهەندی داهاتوو بە مانگـە هیلالییەکە دەدەم و ئەو بوونەش لەسـەر بناخەی نەبوونیەکـەی بە هیلالی دادەنێم. ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتی بۆ گەیشـتن بە ئەگەرەکانی لە ڕێگەی ڕەتدانـەوە بوونی خۆی ڕەتدەکات و دەبێت بـەو بوونەی ڕەتدانـەوە دەهێنێتە جیهانەوە. ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتی کەمی و نەبوونی لەنێو شتەکاندا، وەکو لایەنێکی هێزەکی شتەکان، ناتەواییان، یان ڕاگرتن دەسەلمێنیت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەمییەی لە دەرەوەدا هەیە، ڕەهەندێکی کاتی ناوەکی نییە. بـا لێرەدا لە واتای ئەمە وردبینـەوە. بوون—لەنێو—خۆ ناتوانێت ببێـت بە لایەنی هێزەکـی خۆی لە شێوازی بوونێکدا، کە هێشـتا پەیدانەبووە. خۆدەرخستنی بوون—لەنێو —خۆ لە ئاشکراکردنی ناسنامەکەیدایە. بوون—لەنێو—خـۆ شتێکە هەیە و خاوەنـی ڕەهەندەکانی کات نییە. ئەو، وەکو من، ئەو بوونە

ناتەواوە نییە و ڕووە لە داهاتوو ناکات. پەیدابوونی من لەنێو جیهاندا سەرهەڵدانی ئەگەرەکانە. ئەگەرەکانیش لەگەڵ سەرهەڵدانیاندا لە دەرەوەدا بەردەوام وندەبن. لێرەدا پێویستە جارێکی دیکە لە دوولایەنی بەرزێتی بدوێین، کە هەمانکات دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی چەمکی شوێن؛ چونکە ئەگەرەکان لە دەرەوەدا ڕیزکراون. ئەگەرەکانی داهاتوش بوونی (ئەو)شتە دەسەلمێنن. بەڵام پەیوەندی نێوان بوون—لەنێو—خۆ و ئەگەر دەرەکییە. مانگی هیلال لە پەیوەندییەکەیدا بە مانگی پڕەوە کەم و ناتەواوە. هەمانکات، مانگی هیلال بەو شیوەیەی هەیە؛ وەکو مانگێکی هیلالی تەواو خۆی دەردەخات. ئەو شتێکی کۆنکرێتییە لە ئاسماندا و لەوە زۆرتر پێویستی بە چی دیکە نییە بیکات بە هیلالی. ئەمە بۆ خونچەکەش یان دەنکە شقارتەیەک دروستە. هیچی دیکە نییە لەوە زیاتر دەنکە شقارتەکە بکات بە دەنکەشقارتە یان ئەو دارەسپییەی لەسەرە ڕەشکراوەکەیەوە ئاگر دەگرێت. شوشەمەرەکەبەکە دەشکێت، فڕێدەدرێت و دەکێشرێت بە دیواری ئاگردانەکەدا. ئەگەری شکاندنەکەی لە بوونی شوشە مەرەکەبەکەوە جیاوازە. فڕێدانی شوشەمەرەکەبەکە و کەوتنی بە دیواری ئاگردانەکەدا پەیوەندی بە ئەگەری فڕێدان لە بوونی مندا هەیە. شوشە مەرەکەبەکە لە بوونی خۆیدا نە دەشکێت نە ناشکێت؛ ئەو شتێکە هەیە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت شتێک لە دەرەوەی هەموو ئەگەرەکاندا بێت؛ لەو ڕاستییەوە، کە من داهاتووی خۆمم، ئەوشتەی خۆی بۆ من دەردەخات، لە ئەگەر بێبەش نییە. ئەو کاتەی دەنکە شقارتەکە، وەکو دارێکی سپی سەر ڕەشکراوە دەبینم ئەگەرەکانیش لەگەڵیدان. بۆ ئەوەی شتێک بەبێ ئەگەر ببینم، ئەوا دەبێت من ڕانەبردوویەکی ڕووت بم؛ ئەمەش نابێت و بیریلێناکرێتەوە. هەموو شتێک خاوەنی کۆمەڵێک ئەگەرە و پەیوەندییەکی یەکسانی لە گەڵیاندا هەیە چونکە شتەکان ئەگەرەکان نین. لەسەرو ئەمەوە، ئەگەرەکانی منیش بوونیان نییە. ئەوان تەنیا ئەگەرن و لەنێو سەربەستییەکەی مندا دەتوێنەوە؛ من هەرجۆرە ئەگەرێکم هەبێت لایەنە دژوەستاوەکەشی ئەگەرە. من دەتوانم شوشە مەرەکەبەکە بشکێنم یان لەنێو چەکمەجەی مێزەکەم دایبنێم. من دەتوانم لەودیو مانگی هیلالەوە خۆم بە مانگی پڕ بگەیەنم. هەمانکات دەشێ جەخت لەسەر بەردەوامی و مانەوەی مانگی هیلال بکەم بەو شێوەیەی هەیە. لە ئاکامدا بەو خاڵە دەگەین، کە شوشەمەرەکەبەکە کۆمەڵێ ئەگەری بەرانبەر یەک وەستاوی هەیە: دەیشکێنم یان لەنێو چەکمەجەکە دایدەنێم. ئەو مانگە هیلالییە کەوانەیەکی کراوەیە یان بازنەیەکی هەڵواسراوە بە ئاسمانەوە. ئەو ئەگەرانەی بۆ شتەکان دەگەڕێنەوە بەڵام شتەکان دروستیان ناکەن، بە ئەگەری ڕوودان ناوزەدیان دەکەین و لە شێوازی بوون—لەنێو—خۆدا هەن. من ناتوانم بڵێم ئەگەرەکانم هەن؛ ئەوان ئەگەرن. بەڵام

ئەگەری ڕووداوەکان ڕووداو نین. هەر یەکێک لە ئەوان ئەگەری ڕووداوێکە و دەشێ ڕووبدات. لەم ڕووەوە، شوشەمەرەکەبەکە هەیە، بەڵام بوونی ئەو، وەکو شوشەی مەرەکەب ئەگەرێکی ڕووداوە؛ چونکـــە شوشەمەرەکەبەکە ئامادەبوونێکی ڕووتی هەیە، کە ڕاستەوخۆ لە پەیوەندیەکی دەرەکیدا دەدۆزرێتەوە.

ئـــەو ئەگەرانـــەی واتای بوون لەودیـــو بوونەوە دیاریدەکـــەن لەنێو—خۆیاندا دەکەونـــە ئەودیو بوونەوە، لەبەرئەمە ئەوان هیچن. ناوەڕۆکی شوشە مەرەکەبەکە دروســـتکراوە و ئەگەرێکە لە پەیوەندی ڕەتدانەوەی بوون—بۆ—خۆدا پەیدا بووە. بـــەڵام ناوەڕۆکەکە شوشەمەرەکەبەکـــە یان بوون نییە. مادامەکـــی ناوەڕۆکەکە بوون—لەنێو—خۆیە و لـــە ڕەتدانەوەکەوە پەیدا بووە، ئەوا هیچە. بوون—بۆ—خۆ بوونـــی شوشەمەرەکەبەکە، وەکو شەشەمەرەکەب دەردەخات. ئەم دەرخستنەش لەودیـــو بوونی شەشەمەرەکەبەکەوەیە و داهاتووشی نییە. هەموو ئەو ئەگەرانەی لە زەمینە هەمیشـــەییەکەوە دەبن بە ئەگەری شتێکی ناســـراو ئەوانەن، کە هیچ بوونێـــک بەبێ ئەوان ناتوانێت پەیدابێت. لێـــرەدا، دیسانەوە دەڵێین، زانین هیچ شتێک بۆ بوون کەم و زیاد ناکات. زانین بوون بە هیچ خەسڵەتێک ئارایش ناکات و نایڕازێنێتەوە.

زانیـــن بوون—لەوێدا—تێدەپەڕێنێت، ڕوو لە نەبوون دەکـــات و پەیوەندیەکی ڕەتدانەوەی دەرەکی لەگەڵدا هەڵدەبەستێت. ئەم نەبوونە ڕووتە لەنێو ئەگەرەکاندا دەبێت بە هاندەر بۆ زانستەکـــان تاکو پەیوەندی دەرەکی نێوان شتەکان ببینین و خۆیـــان بەودیو نـــاوەڕۆک و ئەگەرەکان بگەیەنن. بەڵام، لـــە ڕوویەکی دیکەوە پێویستی ئەگەرەکان، وەکو بونیادی واتابەخشـــی هەســـتکردن بە جۆرێک خۆی ئاشکرا دەکات، کـــە ئێمە لەوە زۆرتر نامانەوێت باســـیبکەین. زانینی زانستانە، لـــە ڕاســـتیدا، ناتوانێت بونیادی ئەگەرەکانی هەســـتکردن تێپەڕبکات و خۆی بە ئەودیـــو بگەیەنێـــت. بەپێچەوانەوە، زانســـت خۆی بەو بونیـــادەوە گرێدەدات و لەسەری ڕادەوەســـتێت. ئێمە ڕوونمان کردەوە چۆن ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ لەبـــەردەم بووندا بـــوون، وەکو شتێک دەردەخـــات و لایەنەکانی بونیادی (شت) یشمان باسکرد: شتەکە، بوونی لە شوێندا؛ بەردەوامی، ناوەڕۆک و ئەگەرەکانمان ڕوونکردەوە. بەهەرحاڵ، ڕیزکردنی ئەم لایەنانە بەمجۆرە ئەوە ناگەیەنێت یەکێک لەوانی دیکە لەپێشترە. ئامادەبوونی بوون—بۆ—خۆ بۆ بونێک[لە ئەزمونەکەیدا] هەموو لایەنەکانی بونیادی ئەوشتە پێکەوە دەردەخات. لەسەرو ئەمەشەوە، هیچ لایەنێکی ئەم بونیادە بە تەنیا و دابڕاو لە لایەنەکانی دیکە ناتوانێت ڕاوەســـتێت. تەنانەت (ئەو) شتە لۆجیکمەندانەش پێش ناوەڕۆک ناکەوێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە. ئەوشتە پێویستی بە ناوەڕۆکەکەیەتی و لەسەر ناوەڕۆکی ڕادەوەستێت. هەروەها ناوەڕۆکەکـــەش دەبێت بە ناوەڕۆکی (ئەو) شتە. بە هەمانشـــێوەش، (ئەو) شتە،

وەکو بوونێکی خاوەن چۆنیەتـــی لەنێو زەمینەی جیهانەوە دەردەکەوێت؛ جیهان کـــۆی شتەکانـــە. پەیوەندی هەڵوەشاوی نێوان شتەکـــان و جیهان یان جیهان و شتەکان دەبێت بە شوێن. کەوابوو، هیچ یەکێتییەکی بنەڕەتی لەنێوان دیاردەکاندا نییە. هەریەکێک لە دیاردەکان ڕاســـتەوخۆ و بێ پشـــت بەســـتن بە دیاردەیەکی دیکەوە دەردەکەوێت. لەبەرئەمـــە بە هەڵەدا دەچین ئەگەر باوەڕ بە[بنەڕەتێکی] لەپێشتر بکەین. خۆمان لەم هەڵەیەش دووردەخەینەوە ئەگەر بڵێین، جیهان لەنێو خولـــەی دەرووندا خۆی دەردەخات. لێرەدا بوون—بۆ—خۆ خۆی لە خودی خۆی جیادەکاتەوە یان هایدیگەر گوتەنی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، بەو شێوەیەی هەیە، خۆی دەناسێت.

ئـــەم پرۆژەیەی بوون-بۆ—خۆ لە ڕووکردنە خۆکـــەدا، کە (خۆ) پێکدەهێنێت، دڵنیابونێکی تێرامانانـــە نییە. بەڵکو کەمییە. کەمییەکەش دراو نییە. کەمییەکە لەنێو بوونیدا. لە باسەکەی پێشودا ڕوونمانکردەوە، چۆن کەمی لە بوون—لەنێو-خـــۆدا لەنێو جیهانـــی دەرەوەدا لەناودەچێت. بەڵام ئەو بوونـــەی بە کەمییەوە پەیدا بووە و کەمی لە بوونیدایە لەســـەر ئەو کەمییە بوونی خۆی دەسەلمێنێت. بەکورتییەکەی لەو کەمییـــەوە بەردەوام خۆی بەو بوونە دەگەیەنێت، کە نییەتی و پەیدانەبووە.

ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لەو کاتەدا کەمی بوونی خۆی ڕەتدەداتەوە و دەبێت بە کەمی بۆ بوونی خۆی. لەڕاستیدا، تاکو ئەو ڕادەیەی ئەو بوونەی کەمە ئـــەوە نییە، کە کەمییەکەیە دەبێت بە خاوەنی ڕەتدانەوە. ئەگەر ڕەتدانەوەکەش نەبێـــت بە دەرەکی ئـــەوا بناخەیەکـــی پێویستی بۆ کەمییەکـــە هەیە. بناخەی ڕەتدانەوەکەشـــی دەبێت بـــە ڕەتدانەوەی ڕەتدانەوە. ئـــەم بناخەیەی ڕەتدانەوە بێجگـــە لە کەمییەکـــە، کە بنەڕەتییە، شتێکی پێدراو نییـــە. بوون—بۆ—خۆ لە یەکیتییەکەی بوونیدا و لەســـەر تێرامانـــی تێرامانەکەی خۆی بە کەمی دەبینێت؛ بـــەرەو کەمییەکەی خۆی دەڕوات و ڕەتی دەداتەوە. تەنیا لەم ڕووەوە لەو کاتەدا کەمی ڕەتدەدرێتەوە و ڕەتدەکرێت، کەمییەکە دەبێت بە لایەنێکی ناوەوەی بوون—بۆ—خۆ . بوون—بۆ—خۆش تاکو کەمی تێدانەبێت نازانێ کەمی هەیە. لەبەرئەمە، پەیوەندی بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ بونیادی بوونیدا نەگۆڕ یان ســـتاتیکی و پێدراو نییـــە. داهاتـــووی بوون—بۆ—خۆ بە ئێستای دەگات تاکـــو خۆی بسەلمێنیت و ڕانەبـــردووی ڕەتبکـــات. بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ خەفەکردنـــی کەمییدا دەبێت بە کەمی و خەفەکردنەکەشی شێـــوازی نە-بوونی هەیە. ئەم پەیوەندییەش ڕێگە بە ســـەرهەڵدانی کەمییەکی هەندەکی، وەکو کەمییەکی بەردەوام دەدات. بەگشتی، بناخەی کارتێکردنە؛ ئەمەش لە زانستی دەروونناسیدا بە هاندەر و ئارەزوو ناوزەد دەکرێت. ئەم هاندەرانە بە تەنیا واتابەخش نین و دەروونناســـەکان دایانهێناون.

ئێمــە لەو کاتەدا لـــە واتاکانیان تێدەگەین، کە دەبن بە پرۆژە و پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ بوونی خۆیدا دەردەخات. ئەم پرۆژەیەش کەمییە.

بەڵام ئەم کەمییە بەبێ بیرلێکردنەوە ناناسرێت. تێڕامان دەتوانێت بیدۆزێتەوە. لە حاڵەتـــی ئاگاییمان لە جیهانەوە کەمییەکە دەبێـــت بە پرۆژە و شتێکی بەرز یـــان هەڵوێستێکی ئایدیالیستانە. لەوێدا، کـــە کەمی لە ئێستای بوون—بۆ—خۆدا ئامـــاژە بۆ بوون—بۆ—خۆ لەودیو بوونی خۆیەوە دەکـــات، بوون لەودیو بوونەوە کەمییەکە نیشاندەدات. کەوابوو، جیهان بە نەبوونییەوە خۆی بۆ ئێمە دەردەخات. نەبوونییەکـــان لە ئەگەرەکـــان جیانابنەوە. هەر نەبوونییـــەش ئاماژە بۆ شتێک دەکـــات و شتەکانیش ئاماژە بۆ نەبوونی دەکـــەن. مادامەکی هەموو نەبوونییەک یان ئامادەنەبوونێـــک بوونە لەودیو بوونەوە، بۆنموونە ئامادەنەبوون ئاماژەکردنە بۆ بوونێکی ئامادەنەبوو، هەریەکێک لە شتەکان بەرەو بوونێکی دیکەمان دەبات. هەموو ئاماژەکردنەکان لەنێو زەردەخەنەی بەردینی چاوە بەتاڵەکانی پەیکەرێکدا خۆیان دەچەقێنن و ڕیزدەبن.

ئـــەو ئامادەنەبوونەی لەودیو بوونی شتەکانەوە هەن بوونی شتەکان ئامادەیان ناکات. تەنانەت ناتوانین بڵێین خۆیان دەرخستوە تاکو من بیانناســـم چونکە من بونیادێکـــم هەیە، کە دەتوانێت لە بوونی خۆیـــەوە دەرچێت و ئاگامەندە. ئەوان بۆشاییـــن و داوای پڕکردنمان لێدەکەن. داوا ئەکـــەن بوون—بۆ—خۆ پڕیانکات. ئەوان ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئامادەبوونی کەسێکدا دەردەکەون. ئەوان پێویستییان بە هەســـتانی کار هەیە و جیهانیش بە کارهەستانە. لەم پەیوەندییەدا (ئەو) شتەی ئامـــاژەی بۆ دەکەین، دەبێت بەو شتەی کارهەســـتانەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت. ئەمەش ناودەنێین پەیوەندی نێوان مەبەست و کۆتایی.

تاکو ئەو ڕادەیەی (شتێک) لەســـەر زەمینەی لەجیاوازیبەدەر، ڕادەوەســـتێت و هاوکات ئامـــاژە بۆ بوونێکی دیاریکراوی بەکارهەســـتاو دەکات، ئەوا بە ئامێر یـــان کەلوپەل دادەنرێـــت. پەیوەندی نێوان شتەکان لەســـەر بناخەی چەندەکی دەبێـــت بە پەیوەندییەکی نێوان ئامێرەکان. بوون بە ئامێریش پێش ئەو بونیادە ســـەرهەڵنادات، کـــە ئاماژەمان بۆ کرد؛ لە ڕوویەکەوە ئـــەو بونیادە پێش بوونی ئامێرەکان دەکەوێـــت؛ لە ڕوویەکی دیکەشەوە دەردەکەوێت ئامێرەکان بونیادەکە دەهێننەکایەوە. شتێک لەپێشـــدا شت نییە و دوایی دەبێت بە ئامێر؛ هەروەها بۆ ئەوەی، وەکو شت بناسرێت بە ئامێر دانانرێت. بەڵکو ئامێرە-شتە.

دروستە، لێکۆڵینەوەی زانستانە بوونی ئەوشتە، وەکو شتێکی ڕووت دەردەخات و خەســـڵەتی بوونبەئامێری لێدادەماڵێت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە زانست خۆی بە پەیوەندییـــە دەرەکییەکانەوە ماندو دەکات. لێـــرەدا دەبینین چەند پێویستە پێناسەکەی هایدیگەر بگۆڕین.

بــە دڵنیاییەوە جیهـــان لەنێو خولەی دەروونـــدا دەردەکەوێت، بەڵام خولەی دەروون هەمیشە لەسەر تێڕامان خۆی ڕاناگرێت. خۆناساندنی منیش بەهەمانشێوە بە تێڕامانەوە گرێنەدراوە. بوون لەنێو جیهان دەرچوون، لە جیهانەوە و ڕووکردن لە (خۆ) نییە، بەڵکو ڕاکردنە لە جیهانەوە بەرەو ئەودیو جیهان یان بەرەو داهاتوو لـــە جیهاندا. ئەوەی جیهان بـــۆ منی ئاشکرا دەکات بـــە جیهانبوونی ئەوە. لەو بۆچوونـــەوە، ئەگەر ئاماژەکردنە نەبڕاوەکانمان بۆ هەموو ئامێرەکان پەیوەندییان بە بوون—بۆ—خۆوە نەبێت، کە ئەو بوونە (من)ە، ئەوا هەمووی ئامێرەکان دەبێت بە پەیوەندی نێوان ئەگەرەکانم؛ لەبەر ئەوەی بوونی منیش ئەگەرەکانە، ڕیزبوونی ئامێرەکـــان لەنێـــو جیهاندا و لە ناخی بوون—لەنێو—خـــۆدا دەبێت بە وێنەیەکی ئەندێشـــاوی پرۆژەی بوونم؛ وێنەیەکی ئەندێشـــاوی بوونی من. بەڵام هەرگیز من ناتوانم ڕێگەچارەیەک بۆ ئەم وێنە ئەندێشـــاوییەی جیهان بدۆزمەوە. هەوڵدەدەم خـــۆم لەگەڵیدا بگونجێنـــم و هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەم. هەروەها تێڕامانیشـــم پێویستە تاکو خودی خۆم بکەم بە بابەتی بیرکردنەوە.

کەوابـــوو، خۆ ونکردن لەنێو جیهاندا نارەســـەنی نییە. بـــوون لەنێو جیهاندا بۆ ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی واتای خۆ ونکردن لەنێو جیاندا دەبەخشـــێت چونکە هەمیشـــە ئامـــاژە بۆ جیهان دەکەیـــن. کارێکی بێهودەشە دژی ئەو کێشـــانەی، وەکو (بۆچی) یان (بۆ کێ) ڕاوەستین. بێگومان، بۆچی و بۆ کێ ئاماژە بۆ بونیادێک دەکەن، کە هێشتا باسمان نەکردوە؛ ئەویش بوونە-بۆ—ئەوان. (بۆ کێ) هەمیشە لەودیـــو ئامێرەکانەوە دەردەکەوێت. بەڵام ئەم (بۆ کێ)یە پێکهاتەکەی لە (بۆچی) یەوە جیاوازە و زنجیـــرەی پەیوەندییەکانی ناپچڕێت. یەکێکە لە پەیوەندییەکان؛ بەتایبەتـــی لە کاتێکدا، کە وەکو ئامێرێـــک دەبینرێت و ناتوانێت لە بوونی خۆی ڕابکات. دڵنیام ئـــەو جلوبەرگانە بۆ کرێکارەکە دانراوە. بۆ کرێکارەکەیە تاکو لە چاکردنەوەی ســـەربانەکەدا لەبەریانبکات و لەشی تـــۆزاوی نەبێت. بۆچی لەشی تـــۆزاوی نەبێت؟ بۆ ئـــەوەی زۆربەی پارەکەی بە جلوبەرگ نـــەدات. ئەو پارەیە چەندەکییەکـــە بـــۆ گوزەرانی ژیانی دانـــراوە. گوزەرانی ژیانیشـــی بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی تەوانایەتی.

کەوابـــوو، ڕەتدانەوە، کە بوونی منە و (ئەو)شتەش بۆ من دەردەخات، دەبێت لە شێوازی (هەبوو) دابێت. ئەو ڕەتدانەوە ڕووتەی ڕانەبردوویەکی ســـادەیە بوونی لەپشـــت خۆیەوەیە و بووە بە فاکتۆرێکی نێو ڕابردوو. لێرەشەوە ئێمە ڕەتدانەوە بەبێ ڕەگوڕیشـــە نادۆزینەوە. ڕەتدانەوە خەسڵەتی هەیە و بوونی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشـــێ. ئەوەشە، کە هێشـــتا پەیدانەبووە. ڕەتدانەوە لـــە پێناوی بوونێکدا سەرهەڵدەدات و کاردەکاتە سەری. ڕەتدانەوە لە ئاستی (ئەو)شتەدا سەرهەڵدەدات و هەمانکات، لەگەڵ سەرهەلدانەکەیدا لە ڕابردووی خۆی هەڵدێت و ڕوو لە داهاتوو

دەکات. ئەمـــەش ناودەنێین (بۆچوون) و بەرانبەر (فاکتـــۆر) دایدەنێین. ڕابردوو ڕەهەندێکـــی ڕەتدانەوەیـــە. هەروەها، من لە داهاتوودا ئێستـــای خۆم نادۆزمەوە چونکـــە داهاتوو پەیوەندی بەو ئاگاییەوە هەیە، کە ســـەرهەڵدەدات. ڕابردووم لە بوون—لەنێو-خۆیدا خۆی دەردەخات و شتێکە لەنێو جیهاندا. بێگومان، ئەم بوونە، هەمانکات بەئاگاشە و بوون—بۆ—خۆیـــە. بەڵام ئەو بوون-بۆ—خۆیەیە، کە لەنێو بوون—لەنێو-خۆدا گیریخواردوە. واتای ڕیالیزم و ســـروشتگەرایەتی و ماتەریالیزم لەنێو ڕابردوودایە؛ ئەمجۆرە فەلسەفانە تەفسیری ڕابردوو، وەکو شتێکی ڕانەبردوو دەکەن.

کەوابوو، هەڵهاتنی بوون—بۆ—خۆ لەنێو جیهاندا دوولایەنییە؛ ئەو لە ئێستای بوونـــی خۆی لەنێـــو جیهاندا ڕادەکات. ڕاکردنەکەشی بـــەرەو شتێکی دەرەکی و بـــەرزی نەبوو نییە. هەمیشـــە بەرەو شتێکی هەبووە. بـــۆ ئەمەش نموونەی ئەو کەرە دەهێنمەوە گالیسکەیەکی بە پشتەوە بەستراوە و لە پێشەوەش بە دارێکەوە گوێزەرێکی بۆدانراوە. ئەو دەیەوێت دەمی بە گوێزەرەکە بگەیەنێت و هەوڵدانەکەشی دەبێتە هۆکاری ڕاکێشـــانی گالیسکەکە بەدوای خۆیـــدا. ئێمە شوێن ئەگەرەکان دەکەویـــن، کـــە بێجگە لـــە شوێنکەوتنەکەمان چی دیکە نیـــن. ئێمە بێ ئەوەی بەخۆمان بگەین، بە شوێن خۆماندا ڕادەکەین. لەلایەکەوە شوێنکەوتنەکەمان هیچ واتایەکی نییە چونکە هەرگیز بەشوێنی مەبەست ناگەین کەچی شوێنکەوتنەکەمان پرۆژەیەکـــی داهێنراوی بوونیشـــمانە. ئێمە ناتوانین دەســـتبەرداری بین و واتا بەبوونمان دەبەخشێت. کەوابوو، هەڵهاتنەکەمان واتای هەیە و نییە.

هەڵهاتنم لە ڕابردوو شوێنکەوتنمە بـــەدوای داهاتوودا. داهاتووشم پەیوەندی بە ڕابردوومەوە هەیە و واتاکەشی لەوێوە ســـەرهەڵدەدات. داهاتوو ڕانەبردوویەکە لـــە دەرەوەدا، کە دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ و بناخـــەی بوونی خۆیان دەبێت بـــەو بوونەی، کە (من)ە. ئەگەری بوونی دۆزینەوەی ڕابردوومە چونکە دۆزینەوەی بناخەیە. من لە دەســـت بوونێکی بێ بناخە ڕادەکەم. ئەو بوونە خۆمم و منیش ئەوەم، کە لە داهاتوودا دەیگەمێ.

ئەگەرەکان لە بوون—بۆ—خۆدا کەمیـــن؛ کەمی ڕەتدانەوەیەکی دیاریکراون لە ئێستـــادا. ئەگەرەکان دیاریکراون نەک لەبـــەر ئەوەی هەن، بەڵکو لەنێو ڕەهەندە دیاریکراوەکانیـــدا دۆزینەوەی بوون—بۆ—خۆن. تینوێتی، بۆنموونە، ســـێ لایەنی هەیـــە: ڕاکردنە لە حاڵەتی کەمی لەنێـــو ئێستادا، کە ئەو کەمییە لە بوون—بۆ—خۆدایە. ئەو ڕاکردنە جەخت لەسەر بوونی کەمییەکە دەکات. کەمی لەنێو ڕابردوودا نابێت بە کەمی، چونکە ئەو شتەی کەمە لەوێدا دەبێت بە کەمی ئێمە بەرەوبوونی بڕۆیـــن و ئەو بوونەی ڕوویتێدەکات دەبێت بوونێکی بەرزی هەبێت. هەڵهاتنەکەش هەمیشە ڕوو لە شتێک دەکات. ڕووتێکردن واتا بە هەڵهاتن دەبەخشێت. هەڵهاتن،

لەخۆیدا، کەمییە و خۆیدەکات بەوەی هەیە. دەبێت لایەنێکی هێزەکی هەبێت، کە بە ڕابردووەوە بەستراوە. دۆزینەوەی بوون—بۆ—خۆ، ئەو بوونەی لە شێوازی کەمییدا خۆی وەکو تێڕامان یان ئاگایی لە کەمییەکە دەردەخات، پێویستە. دواجاریش، ئەو شتەی کەمییەکە ڕوویتێدەکات دەبێ هەبێت. ئەگەرەکان ئاماژە بۆ تێری دەکەن؛ بەها، وەکو ئەو بوونەیە دەچێتە نێو بوون—بۆ—خۆوە. دەبینین ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ تێربوون دەکەین، کە خۆی وەکو تینوێتی دەردەخات. پەیوەندی ڕابردوو—ڕانەبردوو فۆرمی ئەو تێربوونە لەسەر بوونیادی تینوێتی دادەمەزرێنێت. منیش یان ئەو ئەگەرە چارەنوسی خۆمی لێوە دیاریدەکەم و تێیدەڕوانم. ئامادەبوونم لەبەردەم شتێکدا بوونی شتەکە دەسەلمێنێت و ڕەتدانەوەی (ئەو) شتەشە، تاکو ئەو ڕادەیەی من لە تەنیشت شتەکەوە بە کەمییەوە ڕادەوەستم. ئەگەری بوونم وەستانە لەودیو بوونەوە. ئەگەری بوونم بوونێک لەودیو بوونەوە، وەکو ئەو بوونە ئێستای پەیوەندی بەو تێرییەوە هەیە، کە سەرهەڵدەدات، نیشاندەدات. ئامادەنەبوونیش لەنێو جیهاندا لەگەڵ ئەو وونەدا دەناسرێتەوە، کە بوونی (من)ە و بە کەمییەوە پەیدابووە. پەرداخە ئاوەکە وادەردەکەوێت، کە دەبێت بخورێتەوە. ئەمەش پەیوەندی بە داهاتووی جیهانەوە هەیە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵەش پێویستە لەسەر کاتی جیهان بدوێین. کاتی جیهانیش خۆی بۆ ئاگامەندی لە ڕێگەی ڕەتدانەوەی بنەڕەتییەوە دەردەخات.

## ٤. کاتی جیهان

کاتی جیهان لە ڕێگەی بوون—بۆ—خۆوە سەرهەڵدەدات. بوون—لەنێو—خۆ کات ناهێنێتەکایەوە چونکە کات یەکێتی ئەو بوونەیە بەردەوام لە دەرەوەی بوونی خۆی ڕادەوەستێت. بوون—بۆ—خۆ کاتییە، بەڵام ئاگای لەو کاتییەتە نییە ئەگەر خۆی لە پەیوەندییەکەی نێو تێڕاماندا نەبینێت. لەو حاڵەتەدا، کە ئەم بوونە تێڕامانەکەی ناخاتەگەر کات لە بووندا یان لە دەرەوەدا دەدۆزێتەوە و کاتەکەی دەرەکییە.

### ئەلف. ڕابردوو

(ئەو) شتە ڕانەبردوو نییە تاکو دوایی ببێت بە ڕابردوو. لەپێشتریش داهاتوو نەبووە. ئەو کاتەی هەست بە بوونی شوشەمەرەکەبەکە دەکەم، هەرسێ ڕەهەندەکانی کاتی تێدا دەدۆزمەوە. هەروەها، ئەگەر هەردووکمان لەجیهاندا نەبین هەست بە بوونی ناکەم. لەم ڕووەوە بڕوانامەیەکی تێهەڵکێشراو نییە ئەگەر

مەبەستمان لەمە ناسینەوەی ساتەکانی ئێستا و بەردەوامی بێت. بوون-بۆ-خۆ بێ کۆتایی و بەردەوام لە کاتییەتی خۆیەوە ڕوودەکاتە هەموو بوون-لەنێو-خۆیەک. من ئەو ڕەتدانەوە بنەڕەتییەم لە شێوازی بوونێکی هێشتا پەیدانەبوودا لە تەنیشت ئەو بوونانەوە ڕادەوەستم، کە هەن. ئەگەر لەو باوەڕەدابین جۆرە ئاگامەندییەک لە جیهانێکی نەگۆڕ و وەستاودا هەیە، ئەوا ئەو ئاگامەندییە بە ڕابردوو هەروەها داهاتوویەکی نەگۆڕەوە خۆی دەردەخات. پێویستیشی بە تێهەڵکێشکردنی کارەکانی نابێت و لەگەڵ بوونی خۆیدا یەکدەگرێت. پێویستی کارکردن لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە بوون-بۆ-خۆ ڕابردووی خۆی بهێنێتەکایەوە. بەڵام مادامەکی بوون-لەنێو-خۆ ڕابردوو، هەروەها داهاتووی خۆیەتی، ئەوا خۆدەرخستنی بوون- لەنێو-خۆ دەخرێتە نێو کاتەوە. (ئەو) شتە لەنێو کاتدا خۆی دەردەخات نەک لەبەر ئەوەی واتایەکی ناوەکی لەپێشتری هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە، کە خۆ دەرخستنەکەی بۆ بوونیکی کاتییە.

لەگەڵ ئەوەشدا خەسڵەتی لە کات بەدەری بوون لەو خۆدەرخستنەدا دەردەکەوێت. بوون-لەنێو-خۆ ئەوشتەیە هەیە، وەکو هەبوویەکی کاتی نییە. ئەو تەنیا وا دەردەکەوێت کاتی بێت و نابێت بە بناخەی کات بۆ خۆی و پەیوەندییەکەشی بە کاتەوە دەرەکییە. (بەردەوامی) ڕێکەوتنە لەنێوان ناسنامەیەکی لەکات بەدەر و یەکێتیی ڕەهەندەکانی کات؛ دەبێت بە خلیسکانی دیاردە تاک و هەندەکییەکانی بوون-لەنێو-خۆ، کە جیاوازییەکانیان زۆر بچوک دەردەکەون و یەکگرتنەکەشیان دەرەکی و ڕووکەشی دەبینرێت. ئەمەش فۆرمێکی وەستاو یان لە کات بەدەری بۆ دەڕازێنێتەوە. دروست نییە بڵێین لە کات بەدەری بوون لەژێر دەستی ئێمە ڕادەکات؛ بەپێچەوانەوە، ئەو لەنێو کاتدا دراوە و دەبێت بە بناخەی فۆرمی کاتی جیهانی بۆ بوون.

بەو ڕادەیەی بوون-بۆ-خۆ لە ڕابردوودا ئەوە بوو، کە هەیە، ئامێریش بۆ ئەم بوونە لەنێو جهاندا خۆی دەردەخات. بوون- بۆ-خۆ دەتوانێت لەبەردەم (ئەو) شتەدا ئامادەبێت؛ هەستکردن لە-نێو- خۆیە، لە کارکردن بەدەرە و بیرهاتنەوەیە. ئەوەی لەنێو یەکێتی سێ ڕەهەندەکەی کاتدا[ڕابردوو، ڕانەبردوو هەروەها داهاتوو] خۆی دەردەخات، بوونێکە بە ناسنامەوە. ئەمەش ئەو بوونە نییە لە ڕابردوودا یان ئێستا بینیومانە، بەڵکو ئەو بوونەیە، کە هەیە. کات دەبێت بە ئامێرێک بۆ بینینی ئەم بوونە. هەمانکات، ئەوشتە ئەوەیە لە ڕابردووشدا هەبوو. لەبەر ئەمە شتەکە وادەردەکەوێت، کە ڕابردووی هەبێت. بەڵام نابێت بە ڕابردوو ئەو تەنیا شتێکە خاوەنی ڕابردووە. کاتێکی دەرەکی و بابەتگەری خەیاڵییە؛ خۆی وەکو کاتی بوون-بۆ-خۆ یان بوون-لەنێو-خۆ نیشان نادات. هەمانکات، ڕابردووی بەرز، لەبەر ئەوەی لەنێو-خۆیە و بەرزە ناتوانێت بەو جۆرەی ڕابردوو هەیە

ئەویش هەبێت؛ ڕابردوو ســـەربەخۆییەکی خەیاڵی هەیە. هەریەکێک لە ساتەکانی ڕابـــردووش ڕانەبردوو بـــووە. ئەمەش زۆرتر دابڕان و ســـەربەخۆییەکەی ڕابردوو دەسەپێنیت. لەبەر ئەمە (ئەو)شتەی نەگۆڕە لەنێو بوونێکی بەخەیاڵ دروستکراو خۆی دەردەخـــات و قوتکردنەوەی مێزەکە یان پەرداخـــە ئاوەکە لەبەردەم مندا دەگونجێت. ئەوشتانە بەردەوام نامێننەوە، بەڵکو بەردەوامن و کات بەســـەریاندا دەگوزەرێت.

لەوانەیـــە هەندێک ناڕەزایی دەربـــڕن و بڵێن مـــن گۆڕانکارییەکانم لە بوونی مێزەکـــە یان پەرداخە ئاوەکـــەدا نەبینیوە. ئەمەش بۆچوونێکـــی زانستانە نییە و لەگەڵ هەســـتکردندا ناکۆکە. ســـەبیلی جگەرەکەم، پاندانەکەم لەنێو زەمینەی هەموو شتەکـــان، کە هێشـــتا جیاوازییەکانیان دیارینەکـــراوە لەودیو کاتەوەن. شتێـــک، وەکو (فۆرم) بوونی خۆی دەردەخات. فۆرمیش (هەموو)ی ئەوشتەیە و هێشـــتا نەکەوتۆتە ژێر کاریگەرێتی جیاکردنەوەکە. هەریەکێک لە شتەکان لەژێر یاســـایەکی بووندا خۆی دەردەخات و ئەو یاسایەش حوکم بەسەر بووندا دەدات؛ گۆڕانەکـــان، لە کۆیدا لەناودەچن و چ شتێک هەیە، کە وایان لێدەکات نەبن. ئەم یاسایەی بوون، کە بەردەوامی بەوشتە دەبەخشێت، بونیای بنەڕەتی ئەوە. حوکم بەسەر بوون و نەبووندا دەدات. ئێمە لەدواییدا بۆ سەر ئەم خاڵە دەگەڕێینەوە. کەوابوو، بوون—بۆ—خۆ کات بەســـەر بووندا دەسەپێنێت. ئەو تێڕامانێکی ڕەوانە بە سەربوونەوە بەبێ ئەوەی بوونەکە بگۆڕێت. زانستەکان ئەم خەسڵەتەی کات بە هاوجۆری ناوزەددەکەن. لێرەدا هەریەکێک لە ساتە ڕابردووەکان و ڕانەبردووەکان بوون— لەنێو—خۆن و لە یەکدی دابڕاون. لە دەرەوەشدا لەیەکدی دەچن. هەروەها، لەنێو بوونی یەک شتیشـــدا یەکیانگرتووە. ئـــەم کاتەش بێجگە لە پەرتبون چی دیکـــە نییە و بـــە بەشتێکی پێویست و نەگـــۆڕ دانراوە. ئەم ناکۆکییە لەســـەر زەمینەی دوولایەنی بوون—بۆ—خۆی بوون—لەنێو—خۆ ڕادەوەستێت. لەبەر ئەوەی زانست ئاماژە بۆ پەیوەندییە دەرەکییەکان دەکات، بوونیش بە بەتاڵی دەبینرێت یان ئـــەو هەبووە تاکانەیە بە نێو کاتدا تێدەپەڕن. ناوەڕۆکە فرە لایەنییەکانن لە دەرەوەی یەکدیدا بەرانبەر ڕادەوەســـتن و لەیەکدی دەچن. تاکو ئێرە باسەکەمان بـــۆ کاتی جیهانی لەســـەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە، کـــە هیچ شتێک لە بوونەوە بۆ پاراســـتنی خەســـڵەتە نەگۆر و لە کات بەدەرەکەی پەیدا نابێت. بەڵام شتێک هەر پەیـــدا دەبێت ئێمە ناویدەنێین لە ناوبردن یـــان دێوەزمە. ئەمانەش بابەتی لێکۆڵینەوەی مێتافیزیکیین و سەر بە ئۆنتۆلۆجی نین، چونکە پێویستییەکەیان بە بونیادی بوونی بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خۆوە نەبەستراوەتەوە. بوونی ئەوان هەندەکی و فاکتۆرێکی میتافیزیکییە. ئێمە بە تەواوی نازانین چ جۆرە دێوەزمەیەک لـــە بوونەوە پەیدا دەبێـــت چونکە پەیوەندی بە دیاردەی (ئـــەو)ەوە لەنێو کاتدا

هەیە. لە ئەزموونەکانمانەوە فێردەبین بە چەند ڕێگەیەک (ئەو)شتە لەناودەبرێت. هەستکردنیش بوون—لەنێو- خۆمان پێدەناسێت و ئەوەش ڕادەگەیەنێت هیچ شتێک لە دەرەوەی ئەو بوونەدا نەبێت. لێرەوە بەو ئاکامە دەگەین، کە بوون—لەنێو—خۆ سـەرچاوەی لە ناوبردنەکەش بێت. لەسەرو ئەمەوە، یاسای ناسنامە، کە یاسای بوونـی بوون— لەنێو—خۆیـە پێویستی دامەزراندنـی لەناوبردنەکە لە دەرەوەی بووندا دەسـەلمێنێت، ئەگینا بوون—لەنێو—خۆ دەبێت بەوشتەی لە یەک سـاتدا هەبێت و نەبێت. لەناوبردنەکە ڕووخانی ئەو بوونە لەگەڵ گەیشتن بە کۆتاییەکەی نییـە. تەنیا بوون—بۆ—خۆ ئاگای لە ڕوخانی خۆیەتی چونکە ئەو کۆتایی بوونی خۆیەتی. بوونێک لە دەرەوەی خۆیدا بڕانەوەی دیاریکرابێت کۆتاییەکەشی دەرەکی ڕادەوەسـتێت. لەناوبردنەکەی ئاماژەکردنێکی پێویسـت بۆ (پاشتر) دیاریناکات. (پاش) لە بوون—لەنێو-خۆدا نیمچە ڕاسـتەقینەیە. بوون— لەنێو—خۆ ناتوانێت لەنێوان بوون و نەبووندا ڕاوەسـتێت. لەناوبردنەکەشی جۆریک لە هەوڵدان و خۆ تێهەڵقورتانی ئەم بوونە نییە. ئەم هەوڵدانە لە بوونی بوون—بۆ— خۆدا هەیە؛ لەو بوونـەدا، کە لەناوبردن و هەوڵدان لە ناخیدا دەژین. بوون هەیە و خۆی ناهێنێتە بوونـەوە؛ بوونێکی بێ مندالی و تەمەنی لاوێتییە. ئـەوەی دەردەکەوێت گۆران لەنێو خۆیدا دروسـتناکات؛ لە سەرەتاوە بوونێکە بەبێ پەیوەندی لەگەڵ پێشوی خۆییدا قوتدەبێتـەوە. لێرەدا نیمچە زنجیرەیەک دەدۆزینەوە ئەویش لەپەیوەندی نێوان دیاردەکە و نەبوونی خۆیدا سەرهەڵدەدات.

بۆ ئەوەی ئەو لایەنە دەرەکییە ڕەهایە لەفۆرمی (لەوێدا) بناسـرێت، پێویستە جیهان هەبێت؛ ئەمەش جەخت لەسـەر بوونـی بوون—بۆ—خۆش دەکات. لایەنی دەرەکی بوون—لەنێو-خۆ بەرپرسـە لەوەی ڕێگەنەدا نیمچە لەپێشترە دێوەزمەکە یان نیمچە لەپاشترە لەناوبراوەکە لە نێو پڕی بووندا جێگەی خۆیان بکەنەوە. لەنێو یەکێتی بوونی جیهاندا و لەسەر زەمینەی جیهانەوە (ئەو)شتە خۆی دەردەخات، کە لەپێشتر نەبوو یان پەیوەندییەکەی بە ئامادەنەبوونەوە دەرەکییانە نیشاندەدات. نەبوونی بوون لە ڕێگەی بیرکردنەوەی بوون—بۆ—خۆوە دێتە جیهانەوە. بوون—بۆ—خۆش ئەو بوونەیە، کە نەبوونی خۆیەتی. لەم ڕووەوە، سەرهەڵدان و لەناوبردنی شتێـک دیاردەیەکی ئاڵۆزە. ئەوەی بوون—بۆ—خۆ دەیهێنێتە کایەوە نەبوونێکی ڕووتە، ئەوەیە هێشـتا پەیـدا نەبووە و ئەوەشە پەیدا بـووە و لەناوچووە. ئەو بوونەی باسیدەکەین بناخەی ئەمە نییە. لەلایەکی دیکەوە، هەرچەندە بوون—بۆ— خۆ سـەرهەڵدان دەهێنێتە جیهانەوە، کە بوونی لەپێشتر و لەپاشتری خۆیەتی، دێوەزمەکە، وەکو هەوڵدان دەردەکەوێت. ئێمە هەست بە بوونی (ئەو)شتە دەکەین و ئەویش بوونێکە لەبەردەم ئێمەدا و لەنێو جیهاندا. ئەو لەپێشتر ئامادە نەبووە. کەوابوو، شتێک لەنێو نەبوونەکەی خۆیەوە سـەرهەڵدەدات. ئێمە لێرەدا مامەڵە

لەگەڵ چەمکێکی نێو هۆش ناکەین و مەبەســتمان بونیادی بنەڕەتی هەستکردنە. تاقیکردنەوەکانی فێرگەی گیشــتاڵت بەئاشکرا ڕوونیدەکەنەوە چۆن دێوەزمە یان ئەوەی نەبووە دەبێت بە سەرهەڵدانێکی دینامیکی؛ دیاردە لەسەر بوون لە نەبوونەوە پەیدا دەبێــت. لەلایەکی دیکەوە، ئێمە لێرەدا بنەڕەتی (یاســای هۆکارەکی)مان هەیە. مەبەســت لە هۆکارێکی ڕەتدانەوەی دیاردە نییە بەو شێوەیەی میەرسۆن باسیدەکات. دامەزراندنی پەیوەندییەکی دەرەکی هەمیشەیش لەنێوان دیاردەکاندا نییە. یەکەم هۆکارێکی ناســینەوەی دیاردەیە پێش خۆدەرخستنی وەکو فۆرمێک لەنێو ڕەهەندە کاتییەکانی بووندا دەکەوێت. بەڵام هەوڵدانەکە لەو نەبوونەوە لەنێو هەســتکردندا دەتوێتەوە؛ لەپاشتر و لەپێشتر لەنێو نەبوونی بوون—لەنێو—خۆدا دەچەقن. دیاردەکە لەگەڵ ناســنامە دیارینەکراوەکەیــدا نەبوونی دیاردەکە لەو نموونەیەدا دەبێت بە بوونێکی پڕ. پەیوەندی هۆکارێکی لەنێو پەیوەندی دەرەکی نێــوان شتەکاندا دەتوێتــەوە. ئاڵۆزی لەناوبردن و ســەرهەڵدانی، وەکو جیهان، شوێن، ئامێرگەرێتی و کاتی جیهانی دەبن بە فاکتۆرێکی دروســتکراو. بەردەوام لەنێو پرۆسەی توانەوەدا دەمێننەوە.

ئەمە بۆ ڕابردووی جیهانیش دروستە، ئەمیش لە نموونە هاوجۆرەکان پێکهاتوە. نموونەکانیــش بە پەیوەندییەکی دەرەکییەوە بەیەکدییەوە گرێدراون. بوون—بۆ—خۆ لە ڕێگەی ڕابردووەوە خۆی لەنێو بوون— لەنێو—خۆدا دادەمەزرێنێت. بوون—بۆ—خۆی ڕابــردوو دەبێت بە بوون—لەنێو—خۆ و بە بوونێک لەنێو جیهاندا خۆی دەردەخات: دەبێت بەوەی هەیــە و بەرزێتی خۆی دەدۆڕێنێت. لەبەرئەمە بوونی بووە بە ڕابردوو لەنێو کاتدا. هیچ جیاوازییەک لەنێوان ڕابردووی بوون—بۆ—خۆ و جیهاندا نییە، بێجگە لەوەی بوون—بۆ—خۆ ڕابردووی خۆیەتی. کەوابوو، یەکجۆر ڕابردوو هەیە. ئەویش ئەو ڕابردووەیە منی تێدام. ڕابردووم ڕابردووە لەنێو جیهاندا، ســەر بە هەمووی ڕابردووی بوونی منە و ئەو بوونەیە من لە دەســتی ڕادەکەم. یەکێــک لە ڕەهەندەکانی کات لەنێو من و کاتی جیهانییدا وەکو نەبوونێکی ڕووت پێکەوە ڕیکدەکەون. من لە ڕێگــەی ڕابردوومەوە دەچمە نێو کاتی جیهانەوە؛ لە ڕێگەی ڕانەبردووم و داهاتووشم خۆمی لێ جیادەکەمەوە.

### با. ڕانەبردوو

ڕانەبردووی بوون—بۆ—خۆ ئامادەبوونیەتی لە بووندا، هەروەها شتێکە، کە نییە. بەڵام خۆدەرخستنی بوونە. ئەو بوونەی لە ئامادەبوونەکەدا خۆی دەردەخات بوونە لــە ڕابردوودا. لەبەر ئەمەش ڕانەبردوو بەو شێوەیــەی لە ئەزموونەدا دەردەکەوێت و خۆشــی دەکــات بە پێوەری بــوون چونکە بوون دەبێت بــەوەی ئێستا هەیە؛

پارادۆکسە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، بوون خۆی بە ئەودیو ڕانەبردوو ناگەیەنێت، بەڵکو ئەم خەسڵەتەی بوون لە ڕێگەی ڕابردووەوە، کە هەیە باشتر دەدۆزرێتەوە.

پەرتووکەکەی سەرمێزەکەم لە ڕانەبردوودایە و لە ڕابردووشدا (شتێکە، وەکو خۆی و ناسنامەی هەیە). کەوابوو، ڕانەبردوو لەنێو زەمینەی کاتە بنەڕەتییەکەوە، وەکــو هەبوویەکی هەمەکی خۆی دەردەخات، لەهەمانکاتدا ئەو هیچە؛ یان بێجگە لــە بوون چی دیکە نییە؛ ئــەو ڕابردوویەکی خلیسکاوە لە تەنیشــت بوونەوە و نەبوونێکی ڕووتە.

ســەرنجدانەکەی پێشــومان دەریدەخــات، کە نەبوون لە بوونــەوە دێتە نێو ڕانەبــردووەوە. ئەمەش دەشێ ئەو خاڵەمان لەبیربەرێتەوە، کە بوون لە شێوازی جــوڵان و گۆڕاندا خۆی بۆ بوون—بۆ—خۆ دەردەخــات و هەردوو چەمکی جوڵان و وەســتان پەیوەندییەکی دیالێکتیکییان هەیــە. ئۆنتۆلۆجییانە جوڵان لە بوونی بوون—بۆ—خۆوە یان پەیوەندییەکــەی لەگەڵ بوون— لەنێو—خۆوە پەیدا نەبوە. تەنانــەت لەنێو دیاردەی بوونیشــدا هەڵنەقوڵاوە. ئێمــە دەتوانین بیر لە جیهان بەبێ جوڵان بکەینەوە. بەڵام ناتوانین جیهان بەبێ گۆڕان ببینین. ئەوەش دەبێت بزانیــن، کە گۆڕان نییە. گــۆڕان ئاڵوگۆڕبوونی چۆنیەتی شتێکە؛ بە لەناوچوونی خەسڵەتێکی ڕوودەدات. جوڵان، بەپێچەوانەی گۆڕانەوە، ئاڵوگۆڕبوونی چۆنیەتی ناخاتەگەڕ. ئەگەر شتێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزینەوە و گۆڕانێکی بنەڕەتیش لەم گواستنەوەیەدا بەسەر بوونیدا بێت، ئەوا ئەو گۆڕانکارییە جوڵانەکە ڕەتدەداتەوە و گواســتنەوەکەش بە جوڵان دانانرێت. جوڵان جێگۆڕکێیە و گۆڕان لــە بوونی شتە گوێزاوەکەدا پەیدا ناکات. لەبەرئــەم هۆیەش بوو لە ئۆنتۆلۆجی ئیلیاییەکاندا بوونی جوڵان ڕەتدرایەوە.(٥٢) دێکارتیشــی ناچارکرد لە سیستەمە ئۆنتۆلۆجییەکەیدا پەنا بۆ "پەنجە تەقاندن" بەرێت. جوڵان هەمان بەهای فاکتۆری هەیــە؛ لە بوونی کاتــی شتەکاندا بەشداری دەکات و دەبێت بــە دراو دابنرێت. هەڵبەتە ئێمە بەم زووانە پێویستی بوون—بۆ—خۆ بۆ بوونی جوڵان باســدەکەین، هەروەها دژواریشــە بەتەواوی بیسەلمێنین چی لە جوڵانی ڕووتەوە دێتە بوونەوە. بەڵام گومان لەوەدا نییە لێرەدا بوون—بۆ—خۆ، وەکو لە شوێنەکانی دیکەشدا هیچ شتێکی زیادە ناخاتەسەر بوون.

نەبوونێکی ڕووتە و ئەو زەمینە دادەهێنێت، کە جوڵان تیایدا خۆی دەنوێنێت. لەبەر ئەوەی جوڵان ڕێگەمان پینادات لە پێشەکییەکەوە پێیبگەین، ئەوا پێویستە

٥٢ بیریارانی فێرگەی ئیلیا، وەکو پارمەنیدس و زینۆ باوەڕیان بە جوڵان ، گۆڕان نەبوو. بۆ ئەوان ئەوەی هەیە بوونە و نەبوون نییە. گۆڕانیش جوڵانە لە بوونەوە بۆ نەبوون، یان لەنەبوونەوە بۆ بوون نەک لەبوونەوە بۆ بوون، یان لەنەبوونەوە بۆ نەبوون.(وەرگێڕ)

و دەشگونجێت ئێمە باسی بکەین. ئێمە چین تاکو واتای جوڵان لێکبدەینەوە؟

هەندێـــک لەو باوەڕەدان جوڵان کاریگەرێتییەکی ســـادەی بوونە چونکە پاش جوڵانەکە بوونە جوڵاوەکە، وەکو خۆی دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت. گواستنەوە گۆڕان لە چۆنیەتی شتە گواستراوەکەدا دروست ناکات.

ئەمەش لە بیردۆزەی فیتزگیراڵد لەســـەر "گرژبوونەوە" و ئاینشـــتاین لەسەر "جۆرەکانی تەن"ەوە نزیکە چونکە پەیوەندییان بەو یاســـایەوە هەیە، کە جوڵان لـــە هەبووەکاندا پەیدادەکات. لێرەشەوە یاســـای ڕێژەگەرایەتـــی جوڵان، ئەگەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی بوون ڕاڤە بکات، خۆی دەسەپێنێت. جوڵان دەبێت بە پەیوەنـــدی دەرەکی بۆ بوون. لەم ڕووەوە، جوڵان نە بوونە و نەشێوازێکی بوونە. بەڵکو پەیوەندیەکی نا- بنەڕەتییە. لە ڕاستیدا، شتێکی جوڵاو لە سەرەتا و کۆتایی جوڵانەکەدا وەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئاوی کوڵاو لەنێو مەنجەڵەکەدا و پرۆســـەی کوڵانەکە گۆڕانی بەســـەردا نایەت. پێش کوڵانەکە بە ســـاردی و دوای کۆڵانەکە بـــە گەرمی هەر ئاوە. ئێمە دەتوانین جوڵانەکە بەســـەر چەند قۆناخێکدا دابەش بکەیـــن. لەهەر یەکێک لەو قۆناخانەدا شتە جوڵاوەکـــە وەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئـــەم بۆچوونـــە ماتماتیکییەیە بۆ جوڵان، کە هەندێکـــی گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی شتە جوڵاوەکە هەمانکات وەســـتاوە و پارادۆکســـی بیریارەکانی فێرگەی ئیلیای لەســـەر دامەزراوە. ئێمە ئەم بۆچوونە لەســـەر وەستانی بوونی و سەرهەڵنەدانی گۆڕانـــی لە کاتی جوڵانـــدا بەبێ کێشـــەمان لەگەڵیـــدا و ڕەخنەلێگرتنی تێپەڕ ناکەین. بۆ ڕەخنەگرتنەکەشمان دەچینەوە سەر بیروباوەڕی بیریارە ئیلیاییەکان، بەتایبەتی نموونەکەیان بۆ[هاویشـــتنی]تیری کەوان. ئەوان لەو باوەڕەدان تیرەکە لە خاڵی (ئەلف و با)دا وەســـتاوە و وەکو خۆیەتی و ســـەری لای (ئەلف)و کلکی لای (با)یە. ئەمەش دەیسەلمێنێت، کە جوڵان بە زۆر بەســـەر بووندا ســـەپێنراوە و هیچ شتێک حوکم بەســـەر وەستان و جوڵانی بووندا نادات. واتە، ئەگەر جوڵان ڕوودابێت، ئەوا وەســـتان و جوڵان لە یەکـــدی جیاناکرێنەوە. ئەو ڕەخنانەی لە بۆچوونی بیریارە ئیلیاییەکان گیراون بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە پێشبڕکێکەی ئەخیلـــۆس و کیسەڵەکەوە هەیە ســـود بە ئێمە ناگەتەنـــن. چ پێویست دەکات ئـــەو خاڵە ڕەتبدەینەوە، کـــە گوایە بیریارانی فێرگەی ئیلیا (شوێن)یان بەســـەر خاڵـــە نەبڕاوەکاندا دابەش کردووە و بیریان لـــە دابەشکردنی کات نەکردۆتەوە؟ پرسیارەکە پەیوەندی بە بوونەوە نەک بە حاڵەت و ساتەوە هەیە. ئێمە لە وەڵامدا بە بیریارانی ئیلیـــا دەڵێن، ئەوان مامەڵەیان لەگەڵ شوێن بۆ جوڵان نەک خودی جوڵان کردوە. ئەو پرسیارەی لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە: ئایا بوونی ئەو بوونە جوڵاوە چییە، کـــە چونیەتی ئەو بوونە بە نەگۆڕی گلدەداتەوە لە کاتێکدا بوونە جوڵاوە کە لە بوونە وەستاوەکەوە دوور دەکەوێتەوە؟

بــۆ ڕەخنەگرتن لە بیروڕاکەی زینۆ دەڵێین، کە ئەم بیریارە ڕاڤەی چەمکێکی ســادەی جوڵانی کــردوە. ئێمە لــەو باوەڕەداین تیرەکە بــە خاڵی (ئەلف و با) دا تێدەپەڕێــت و تێپەڕبوونیش مانەوە نییە. هەمانکــات، لەم بۆچوونەدا جۆرە کەموکورتییەکمــان هەیە. ئێمە دەڵێین بابەتە جوڵاوەکــە تەنیا بە (ئەلف و با) دا تێدەپەڕێت، هەروەهــا لەو باوەڕەشداین، کە ئەو بابەتە شتێکە هەیە. تیرەکە کتوپڕ دەردەکەوێت لەنێو خۆیــدا و لەنێو (ئەلف و با)شدا نەبێت. ئەمە بناخەی پارادۆکسی ئیلیاییە. ئایا چۆن لە کاتێکدا تیرەکە لە (ئەلف و با)دایە لەوێش نییە؟ بۆ دوور کەوتنەوەمان لەم پارادۆکسە پێویستە واز لەو بیرۆکەیە بهێنین، کە گوایە بوون لە جوڵاندا بوون— لەنێو—خۆیی خۆی دەپارێزێت. بە کورتییەکەی تێپەڕبوون بە (ئەلف و با)دا بوونێکی تێپەڕبووە. ئایا تێپەڕبوون چ واتایەکی هەیە؟ کتوپڕ لە شوێنێکــدا بێت و لەوێش نەبێت. ناتوانین بڵێین، بوونە تێپەڕبوەکە لێرەیە بەبێ ئەوەی لێرەدا نەوەســتێت. هەروەها ناتوانین بڵێین لێرەش نییە یان لە شوێنێکی دیکەدایــە. پەیوەندییەکەی لەگەڵ شوێنــدا داگیرکردنی شوێن نییە و دەرەکییە. بناخەی شوێن، کەوابوو، ئاڵوگۆڕکردنێکی دەرەکییە و لە ڕێگەی بوون—بۆ—خۆوە بەبێ جیاوازی کردن لە بووندا دێتە جیهانەوە.

لــەو بۆچوونەوە، کە دەڵێین (ئەو)شتە ئەوەیە هەیــە و لەنێو شوێندایە ئەوا بوون—بۆ—خۆ پەیوەندییەکانی بە شتەکانی دیکەشەوە دیاریکردوە. شوێن پەیوەندی نییە، بەڵام بوونێک هەیە لە پەیوەندییەکەی خۆیدا شوێنیش دەکات بە پەیوەندی. تەنانــەت تێپەڕبــوون بە شوێندا نــەک لەنێو شوێندا بوون لــە ڕێگەی بوونەوە دەناســرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە مادام بوون شوێن دادەمەزرێنێت، ئەوا بوون بەتەواوی ناتوانێت شوێنی خۆی بدۆزێتەوە، تەنیا سنورەکانی دیاریدەکات. بوون—بۆ—خۆ ناتوانێت پەیوەندییــە دەرەکییەکانی نێوان شتەکان دامەزرێنێت چونکــە بوون—بۆ—خۆ دەبێت ئــەو پەیوەندییانــە لەســەر (ئەو)شتە هەبووە دیارییبکات. هەروەها، ئەو پەیوەندییانەش لەناوناچن چونکە ئەو بوونەی لەسەری ڕادەوەســتن نەبوونێکی ڕووت نییە. (ئێستا) بۆ ئەوان دەرەکی ڕادەوەســتێت؛ لەگەڵ ئەمەدا کتوپڕ چەند پەیوەندییەکی دیکە بەرجەســتە دەبن و (ئەو)شتەش دەبێــت بە بناخەیان. ئــەم پەیوەندییە دەرەکییە بەردەوامــەی نێو شوێن، کە پێناســەی هەبوویەک لەنێو شوێندا دەکات، لەوێــدا دەبینرێت، کە (ئەو)شتە لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ خودی خۆیدا دەرەکی ببینرێت. لە کاتێکدا دەڵێین (ئەو) شتە بە شوێنــدا تێدەپەڕێت ئەوە دەگەیەنێت، کە (ئەو)شتە لەوێدایە و ئێستاش لەوێ دەرچووە؛ ئەمەش پەیوەندییەکــی دەرەکییە نەک پەیوەندییەکی گرێدرا و بە ڕەهەندەکانی کاتەوە. کەوابوو، تاکو ئەو ڕادەیەی (ئەو) شتە پەیوەندییەکانی بە شتەکانی دیکــەوە دەرەکییە (شوێن)یش هەیە. هەروەها تێپەڕبوونیش بە نێو

شوێنـــدا هەیە چونکە بوون لەنێو پەیوەندییـــە دەرەکییەکەدا گیرینەخواردووە و لـــە دەرەوەی پەیوەندییەکەدایە. لەم ڕوونکردنەوەیـــەوە دەتوانین بڵێین جوڵان بوونی ئەو شتەیە، کە لە دەرەوەی بوونی خۆیەوە بەرانبەر خۆی ڕادەوەســـتێت. ئەمـــەش دەبێت بە بناخـــەی پرســـیارێکی مێتافیزیکی ســـەبارەت جوڵان. ئایا مەبەســـتمان لەمە چییە؟ لە جوڵاندا بوونێک لە (ئەلف)وە دەڕوات بۆ (با) دەبێت بە هیچ. چۆنیەتییەکـــەی، کە ئەو بوونە بۆ بوون—بۆ—خۆ دەردەخات نابێت بە چۆنییەتییەکی دیکە و گۆڕانی بەســـەردا نایـــەت. جوڵان، وەکو پەیدابوون نییە. ناوەڕۆکی چۆنیەتی ناگۆڕیت و چۆنیەتییەکی دیکەش ناهێنێتەکایەوە. لە جوڵاندا چۆنیەتـــی بەردەوام، وەکو خۆی دەمێنێتەوە و تەنیا شێوازی بوونەکە دەگۆڕێت. ئەو تۆپە سورەی لەسەر مێزی یاری بلیاردەکە دەجوڵێت ڕەنگە سورەکەی خۆی فرێنادات. بەڵام ئەو تۆپە لە جوڵاندا ئەوە نییە، کە لەپێشـــتر وەستابوو. ڕەنگە سورەکەی لەنێوان لەناوچوون و مانەوەدا بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە. لەڕاستیدا، تاکـــو ئەو ڕادەیەی ئێستا لە خاڵی (با)دایە، ئەوا پەیوەندییەکەی بەو حاڵەتەوە، کە لەپێشتر لە خاڵی (ئەلفا)بوو دەرەکییە و لەناوچوونی ڕەنگی سوریشی تێدایە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی (با) ڕەتدەکات و خۆی بە (سین) دەگەیەنێت، ئەوا لە دەرەوەی لەناوچوونەکەشدایە. کەوابوو، لە ڕێگەی لەناوچوونەوە لە دەست بوون ڕادەکات و لە ڕێگەی بوونیشـــەوە خۆی لە لەناوچوون دەپارێزێت. کەوابوو، چەمکی (ئەوانە) بە جۆرێک لەنێو جیهاندا خەسڵەتی خۆی دەردەخات، کە هەرگیز بوون بەبێ ئەو نابێت بە نەبوون. تەنیا پەیوەندییەکیش بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ (ئەوانە)دا هەیبێت دەرەکییە. مادامەکی دەرەکی هیچە، ئەوا پێویستە بوونێک هەبێت پەیوەندی لەگەڵ خۆیدا دەرەکی بێت. بە کورتییەکەی، مەحاڵە ئێمە پێناســـەی ئەو بوونە لەنێو خۆیە بەبێ پەیوەندی بکەین، کە خۆی بۆ بوون—بۆ—خۆ ، وەکو شتێکی دەرەکی بەرانبەر خۆی دەردەخات. پەیوەندی دەرەکـــی بوونێکی ئاگامەند دەیدۆزێتەوە، کـــە لە بنەڕەتەوە نەبوونە. مادامەکی پەیوەندی دەرەکی شتێک لەگەل خۆیدا بە ڕەهەندەکانی کاتەوە گرێنەدراوە ئەوا پەیوەندی تەنێکی جوڵان بە بوونی خۆیەوە ڕەوان و بێ جیاوازییە و هەمیشە پێویستی بە تەماشاکەر هەیە.

جـــوڵان لەناوچوونێکـــی تەواونەکراوە. ئـــەم نەبوونەی پێـــوەری پەیوەندییە دەرەکییەکەی لەگەڵ خۆیدا و یەکێتی یەکجۆر لە بوونە. لەو هێڵە خوارە دەچێت لەهەمـــان گۆشـــەدا چەند هێڵێکی خواری تر دەبڕێت. لـــە کاتێکدا (ئەو)شتە لە جوڵان دەکەوێت دەبێت شوێن هەبێت تاکو تیایدا ڕاوەســـتێت؛ ئەو کاتەی شتەکە لە جوڵانیشدایە شوێن سەرهەڵدەدات و پەیدا دەبێت. بەڵام هێڵە خوارەکە هەرگیز نییـــە و هیچە. کتوپڕ لەنێـــو پەیوەندییە دەرەکییەکانـــدا و شوێنە جیاوازەکاندا دەتوێتەوە. جوڵان لەوە زۆرتر نییە؛ بوونێکی نەگەیشـــتو، هەروەها لە ناوچوشی

هەیــە و پڕ وتەواویــش نییە. جولان لە ناخی بوون—لەنێو—خۆدا ســەرهەڵدانی لایەنێکی دەرەکی لە جیاوازی بەدەرە. بوون—بۆ—خۆ لەنێو ڕەهەندە کاتییەکانی خۆیدا هەســتی پێدەکات و ناســنامەکەی دەدۆزێتەوە. ئەم ناسنامەیەش ئاماژە بــۆ هیچ بەرنامەیەک بە تایبەتــی "بڕوایەکی تێهەڵکێشــراو" ناکات چونکە ئەم ناسنامەیە بۆ بوون—بۆ—خۆ تەنیا پەیوەندی بە یەکگرتنی ڕەهەندەکانی ئێستا و ڕابردووەوە هەیە. کەوابوو ناسینەوەی کاتی تەنێکی جولا و لەنێو لایەنە جۆراوجۆرە دەرەکییەکانی هۆکاردا و ڕەتبوونی هێڵە خوارەکەدا، ئاماژە بۆ سەرهەڵدانی شوێن دەکات. بە هۆکاری جولانەوە (شوێن) لەنێو (کات)دا پەیدا دەبێت. جولان هێڵێک لە دەرەوەی خۆیداو بەدوای خۆیدا ڕادەکێشــێت. ئــەو هێڵە لەگەڵ جولانەکەدا، هەمانکات، نامێنیت و لەناودەچێت. ئەم جولانەش لەنێو شوێندایە.

ڕانەبــردووی بوون—بۆ—خــۆ ئامــادە بوونە بۆ بــوون. بەڵام ناســنامەی بەردەوامبوون و هەمیشەیی ڕێگە نادات ئەو بەردەوامییە لەسەر شتەکان ببینرێت چونکــە لەبەردەوام بووندا هیچ شتێک نییە. ئەوەی هەیە و لەوانی جیادەکاتەوە، کــە لەپێش ئەودا هەبوون. ڕانەبردوو لە کاتی جیهانیدا بەبێ جولان ناناســرێت. جولان ڕانەبردووی کاتی جیهانــی دەهێنێتە کایەوە چونکە کاتی جیهانی هەژانە و ڕابردووی هێڵێکی ســڕاوەیە و لە دووکەڵی کەشتیەک دەچێت، کە لەنێو هەوادا وندەبێت و دەتوێتەوە. کاتی جیهانی لە داهاتووش بەدەرە چونکە ناتوانێت خۆی بکات بە پڕۆژە و لە جولانی شەوگەرد بەسەر دیوارەوە دەچێت. بوونی ئەو لەنێو ساتە ئاڵۆز و نەناسروەکاندایە، کە ناتوانین بڵێین هەن یان نین.

کەوابــوو، کاتی جیهانی ڕانەبردووی بوون—بۆ—خۆیە: لایەنی دەرەکی بوونە و ناتوانێت هەبێت یان بگەڕێتەوە بۆ بوون—بۆ-خۆ و لە ئاســتی بوون—لەنێو—خۆدا ببێت بە پڕۆژەی ئەندێشەی ئەو. یان پڕۆژەی ئەو بوونەی، کە دەبێت بەوەی نییە و ئێستاش ئەوە نییە، کە لە داهاتوودا پێیدەگات. جیاوازییەکە لە دابڕانی لایەنە دەرەکییەکــە لــەو بوونەوە دیاریدەکرێت. لە کاتێکدا، بــوون بۆ ئەوەی ببێت بە لایەنێکی دەرەکی بۆ خۆی دەبێت ئەوە نەبێت ئێستا هەیە، بەڵکو ئەو شتە بێت، کە لە داهاتــوودا دەبێت. لە ڕێگەی شتە جولاوەکەوە بوون—بۆ—خۆ ئامادەیی خۆی بۆ خودی خۆی بەرجەســتە دەکــات؛ خۆ—ئامادەبوونێکی کتوپڕ لەبەردەم جولانەکەدا سەقامگیر دەکات؛ جولانێکە، کە تیایدا کاتی جیهانی دەناسێت. لەگەڵ ناســینی جولانەکەشدا هەست بە ئامادەبوونی خۆی دەکات. جولانیش ئاماژە بۆ کاتی جیهانی دەکات. ئەمەش گرنگی بە ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندییە دەرەکییەکەی نێوان ساتەکان دەکات چونکە، شتە جولاوەکە پەیوەندییەکی دەرەکی بە ڕابردووی خۆیەوە هەیە، ئەو پەیوەندییە دەرەکییەش لەگەڵ پەیوەندییەکی دەرەکی دیکەدا دەرەکییە. ساتە نەبڕاوەکانی کات لەسەر ئەم پەیوەندییە دەرەکییە ڕادەوەستن.

## جیم . داهاتوو

بنەڕەتی داهاتوو ئەگەری ئەو ڕانەبردووەیە من دەمەوێت لەودیو ڕاستەقینەی بوون—لەنێو—خۆوە بیگەمێ. داهاتووی منیش پلان بۆ داهاتووی جیهان دادەنێت، وەکو بینیمان، ئەو جیهانە داهاتووەیە خۆی بۆ بوون—بۆ—خۆ دەردەخات و من دەمەوێت بیگەمێ. ئەو داهاتووە ئەگەرە ڕاستەقینەکانی بوون بۆ خۆ نییە چونکە تەنیا تێڕامان دەتوانێت بیانناسێت. مادام واتای ئەگەرەکانم لە بوونی مندایە و لەو دیو بوون—لەنێو—خۆوە سەرهەڵدەدەن، ئەوا داهاتووی بوون—لەنێو—خۆ، کە لەنێو داهاتووی مندا خۆی دەردەخات پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بەو ڕاستەقینەوە هەیە، کە ڕانەبردووی منە. داهاتووی بوون— لەنێو—خۆ ڕانەبردوویەکی گۆڕاوی ئەو بوونەیە چونکە داهاتووی من بێجگە لە ئەگەری ئامادە بوونم لە بوون—لەنێو—خۆدا چی دیکە نییە. منیش ئەو ڕانەبردووەم گۆڕیوە. کەوابوو، داهاتووی جیهان لەنێو داهاتووی مندا دەردەکەوێت. لەسەر ئەگەرەکانی من دامەزراوە. ئەو کاتەی بڕیار لەسەر ناوەڕۆکی شتێک دەدەم، هەستدەکەم ئەوشتە مێزە یان شوشە مەرەکەبە. من لەنێو داهاتوودام؛ چونکە ئەو ناوەڕۆکە بوونێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەگەری داهاتووی مندا هەیە. ئەو ئەگەرەش ئەوەیە، کە من تەنیا ئەو ڕەتدانەوەیە نیم.

دووەمیش خۆدەرخستنی مێزەکە یان شوشە مەرەکەبەکە وەکو ئامێر ئاماژە بۆ بەکارهێنانیان لە داهاتوودا دەکەن. ئێمە لە بەشی پێشوی ئەم نوسراوەدا ئەم کێشەیەمان ڕوونکردەوە، پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە. ئەوەندە دەڵێم، کە هەموو شتێک لەگەڵ خۆدەرخستنەکەیدا ئاماژە بۆ بە ئامێربوونی خۆی لە داهاتوودا دەکات. لەگەڵ دەرکەوتنی جیهان و شتەکاندا داهاتووی جیهانیش دەردەکەوێت. هەمانکات ئەوەشمان باسکرد، کە هەر حاڵەتێکی داهاتوو لە جیهاندا لەسەر زەمینە لەجیاوازی بەدەرەکەی پەیوەندییە دەرەکییەکەدا ناڕێک لەگەڵ جیهاندا ڕادەوەستێت. هەندێک حاڵەتی داهاتوو لەنێو جیهاندا هەن بە ڕێکەوت دادەنرێن و دەبن بەو ئەگەرانەی هێشتا پەیدانەبوون.

هەر یەکێک لەم حاڵەتانە سەر بە شتێک یان چەند شتێکن، بەڵام لە دەرەوەی ئەواندان.

ئایا داهاتووی جیهانی چییە؟ ئێمە بە بەستێنێکی ڕووتکراوەی ساتەکانی دادەنێین، کە هێشتا پەیدانەبوون یان هەموو پەیوەندییە دەرەکییەکانی تێدا کۆدەبنەوە؛ کۆی بوون—لەنێو—خۆکانە، کە هەر یەکێک لە ئەوان بووە بە بوون—لەنێو—خۆ. لەگەڵ ڕوودانی ئەگەردا داهاتووش هەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی داهاتوو لایەنە لەیەکچووەکان و دەرەکییەکانە ولەبەردەم ڕانەبردوودایەو لە ساتەکانی (ئێستا)

پێکهاتووە و تەنیا بە هۆکاری (پێشتر) و (پاشتر) پەیوەندییەکانیان دەدۆزرێتەوە، ئـــەوا ئـــەم داهاتووە زنجیرەیەکە لە بەســـتێنە بەتاڵەکـــان و پەرتوبڵاو بۆتەوە. لـــەم ڕووەوە داهاتـــوو هەڕەشەکەرە چونکە داهاتووی (ئـــەو) شتە بە داهاتووی خۆمەوە دەبەستمەوە. جاریواش هەیە هەڕەشەکە لەنێو پەیوەندییە دەرەکییەکەدا لەناودەچێت. منیش داهاتوو نابینم و دەبێت بە بەســـتێنێکی هاوتەرازی شتەکان لەنێـــو شوێندا و یاســـایەکی دەرەکی فەرمانڕەواییان دەکـــات. هەندێک جاریش داهاتـــوو، وەکو نەبوون دەبینرێت و دەبێت بە پەرتوبڵاوی لەودیو بوونەوە. کات، تاکـــو ئەو ڕادەیەی ڕەهەندەکانی خۆی دیاریدەکات لە هەموو شوێنێکدا لایەنێکی بەرزی هەیە و پاشتر ئاماژە بۆ پێشـــتر و پێشـــتر بۆ پاشتر دەکەت. هەروەها، تاکـــو ئەو ڕادەیەی ئەم بەرزێتییـــە ڕێگە بە خۆی دەدات بناســـرێت ئەوا نییە، بەڵکو دەهێنرێتە بوونەوە. لەسەر تێڕامانی بوون—بۆ—خۆ و جوڵانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ڕادەوەستێت.

ئەگەر (کات) بـــە تەنیا و بەبێ پەیوەندی لەگـــەڵ بوون—بۆ—خۆدا ببینرێت، ئەوا لەنێو ســـاتەکاندا دەتوێتەوە و دەبێت بە لایەنێکـــی لە کاتی بەدەری (ئەو) شتە. خودی کات نەبوونە و لە بوون—بۆ—خۆدا بەرجەســـتە دەبێت. لە ڕاستیدا یەکەم هەنگاومان بۆ ناســـینی کاتێکی بابەتگەریانە لایەنی کردەگی بوونمانە. لەم ڕووەوە کـــات دەبێت بە بـــڕاوە و فۆرمێکی ڕازاوە لەنێو پەرتوبڵاوییەکی نادیاردا. بازدانی کاتیش ئاکامی پەســـتانی کاتە لەنێو پەرتوبڵاوییەکی ڕەهادا. ئێمەش لە ڕێگەی دانانی پرۆژەکانمان هەست بە پەستانەکە دەکەین. پەستانەکە شێوازێکی پەرتوبڵاوی جیابوونەوەیە چونکە ئاماژە بۆ دووری من لە بوونی خۆمەوە دەکات. لەلایەکـــی دیکەشەوە، مادام من ئەگەرەکانم دەکـــەم بە پرۆژەی بوونم ئەوا کات بـــۆ من دەبێت بە فۆرمێکی بابەتی و کاتی. ئـــەم فۆرمەش، وەکو هێڵی خواری کردەوەکانم وایە، کە بە نێو هێڵە خوارەکانی دیکەدا تێدەپەڕێت. کات لە ڕێگەی ئەو هێڵە خوارەوە دەردەکەوێت و لەنێو شوێنی چەقیودا وندەبێت. کەوابوو، هێڵی کات لەگەڵ مردنەکەیـــدا لەناودەچێت. کات لەگەڵ بازدانەکەیدا خۆی وندەکات و لەسەر ڕوخساری بوونێکی لە کات—بەدەر دەبێت بە نەبوونێکی درەوشاوە.

## دال. زانین

ئەم باســـکردنە خێرایەی خۆ دەرخستنی جیهـــان بۆ بوون—بۆ—خۆ بە چەند ئاکامێکمان دەگەیەنێت. ئێمە ڕێگە بە ئایدیالیزم دەدەین بوون—بۆ—خۆ بە زانینی بوون دابنێت، بەڵام لەســـەرو ئەمەوە دەڵێین ئەو زانینە بوونی هەیە. ناسنامەی بوون—بۆ—خۆ و زانین لەســـەر زانین، وەکو پێوەری بـــوون دانەمەزراوە، بەڵکو

بوون—بۆ—خۆ لە ڕێگەی بوون—لەنێو —خۆوە ئەوە دەناسێت، کە هەیە. ئەمەش پەیوەندییە لەگەڵ بووندا. زانین، بێجگە لە ئامادەبوونی بوون لەبەردەم بوون—بۆ—خۆدا چی دیکە نیە. بوون—بۆ—خۆش ئەو نەبوونەیە، کە هەست بەئامادەبوونەکە دەکـــات. کەوابوو، زانیـــن لە بنەڕەتەوە بوونێکی دەرچـــووی هەیە. لەبەر ئەمە، هەندێکجـــار لەگەڵ دەرچوونی بوون—بۆ—خۆدا تێکـــەڵ دەکرێت. بوون—بۆ—خۆ شتێک نییە لەپێشـــدا هەبێت و دوایی زانینی دەســـتکەوێت. ناتوانین بڵێین ئەو لەبەر ئەوەی دەزانێت یان زانراوە بوونی هەیە؛ چونکە توشی زنجیرەیەکی نەبڕاوە و لـــە کۆتایی بەدەری زانینەکان دەبین. زانین ڕووداوێکی ســـەرەتایی و ڕەهایە؛ سەرهەڵدانێکی ڕەهای بوون—بۆ—خۆیە لەنێو هەبووەکاندا و لەودیو بوونیشیانەوە. بە کورتییەکەی، بە هەڵگەڕانەوەی ڕادیکالانەی هەڵوێستی ئایدیالیستانە بەو خاڵە دەگەین، کە زانین لەنێو بووندا دەتوێتەوە. زانین خەسڵەت، هەڵوێست یان ڕووداوی بـــوون نییە؛ بێجگە لە بوون هیچ ڕاســـتییەکی دیکە نییە. لـــەم گۆشەنیگایەوە، وازهێنان لە هەڵوێستی ئایدیالیستانە خۆی دەســـەپێنێت و بەو ئاکامە دەگەین، کـــە پەیوەندی نێوان بوون—بۆ—خۆ و بوون—لەنێو—خـــۆدا ئۆنتۆلۆجییانەیە. لە کۆتایی ئـــەم پەرتووکەشدا بەو بـــاوەڕە دەگەین، کە پەیوەنـــدی نێوان بوون—بۆ—خـــۆ و بوون—لەنێو—خۆ لە جوڵان و گۆڕانە هەمیشـــەییەکەدا هەوڵدانە بۆ گەیشـــتن بە هەمووگیرییەکی ناڕاســـت، کە بە (بوون) نـــاوزەدی دەکەین. لەنێو بەســـتێنی هەمووگیرییەکەدا ســـەرهەڵدانی بوون—بۆ—خۆ تەنیا ڕووداوێکی ڕەها نییە، بەڵکو بۆ بوون—لەنێو—خۆش بەســـەرهاتە. هەرشتێک ڕوودات پەیوەندی بـــە دەســـتەڵاتی لەناوبردنی ئەو بوونـــەوە، وەکو (ئاگایی لـــە شتێکەوە) هەیە. هەڵوێستی بەرزێتی ئەم بوونە خۆدەربازکردنە لە یاساکانی بوون—لەنێو—خۆ، کە لەسەر سەلماندن ڕادەوەســـتێت. بوون—بۆ—خۆ لەگەڵ هەڵوێستی ڕەتدانەوەیدا، بوون—لەنێو—خۆ دەســـەلمێنێت. ئەم هەڵوێستە مەبەستدارەی بوون—بۆ—خۆ لە ســـەلماندنی بوون—لەنێو—خۆدا، وەکو بەدوادا گەڕانەوەی ڕەتدانەوەی ناوەکییە. بوونێک تەواناى سەلماندنی هەیە، کە بناخەی نەبوونی خۆیەتی و خودی خۆشی بوونە ســـەلمێنراوەکە نییە. لەنێو هەمووگیرییە ناڕاســـتەکەدا سەلماندن بەسەر بوون—لەنێو—خۆدا ساخدەبێتەوە؛ ئەوەی دەســـەلمێنرێت بوون—لەنێو—خۆیە و بوون—بۆ—خۆ دەســـەپێنێت. مۆردانانە بەســـەر بوون—لەنێو—خۆوە و گۆڕانیش لـــەو بوونەدا دروســـتناکات. ئەمەش بەجۆرێـــک ڕوودەدات یـــان دەریدەکەوێت بوون—بۆ—خۆ بۆ ســـەلماندنی جیهان ئارەزووی خۆلەناوبردنی هەبێت. بێگومان، سەلماندنیش بۆ بوون— بۆ—خۆ هەیە؛ لەگەڵ بوون— بۆ—خۆدا پەیدا دەبێت و بە نەمانی ئەویش سەلمامدن لەناودەچێت. بەڵام لەنێو بوون— بۆ—خۆدا نییە چونکە ســـەلماندن دەرچوونە. ئەگەر بوون—بۆ—خۆ لایەنێکی بابەتە سەلمێنراوەکە بێت،

ئـــەوا بوون—لەنێو—خۆش دەبێت لەنێو ئەودا بێت. ئەو جیهانەی من دەیدۆزمەوە لە دەرەوەی مندا و لە بووندایە. لەلایەکی دیکەوە، ڕێگە بە ڕیالیزم دەدەین بوون لـــە بەردەم ئاگامەندیـــدا دابنێت و ئەمەش بکات بە ســـەرچاوی زانین. هەروەها ئەوەش بڵێین، کە بوون—بۆ—خۆ، بێجگە لەوەی لەنێو بوون—لەنێو—خۆدایە، هیچ ناخاتە ســـەر ئەم بوونە یان ســـەلماندنەکەی هیچی بۆ زیادناکات. ئێمە لەپێشتر باسمانکرد چۆن جیهان، ئامێرگەری، شوێن، چەندەکی و کاتی جیهانی نەبوونێکی ڕووتن و هیچ لە بوون ناگۆڕن. لەم ڕووەوە، هەموو شتێک دراوە و لەبەردەم مندا ئامادەیە. نەبوونی ئەوەی دەیبینم لە منەوە دەرناچێت؛ هیچ شتێک لە دەرەوەی ئـــەو شتانەدا نییە من دەیانبینم و بە چواردەوری مندا پەرتوبڵاو بونەتەوە. لەوە دەچێت من بتوانم دەستی لێبدەم، بیگرم، بیرۆکەکان داهێنراوی فەیلەسوفەکانن. بـــەڵام من، کە لەو بوونە شتێکی جیاواز نیـــم، هەمانکات من و ئەو (هیچ) جیای کردوینەتـــەوە. ئەم (هیچ)ەش شتێک نییە بتوانم بەســـەریدا تێپەڕم. بوون هەیە چونکـــە مـــن ڕەتدانەوەی بوونـــم؛ هەروەها جیهان، شوێـــن، چەندەکی، ئامێر و کاتیـــش لەگەڵ ڕەتدانەوەکەی مندا بۆ بـــوون دێنەکایەوە. ئەمانە حاڵەتی ڕووتی لەناوبردنـــی ئەوەیە، کە لەوێدایە و هیچ ناخەنە ســـەر بوون؛ تەنیا یاریدەی ئێمە دەدەن ئـــەوەی لەوێدایە بناســـین. ئەم حاڵەتە هیچانـــە ڕادیکاڵانە من لە بوون جیادەکەنەوە. هیچ واتایەک نادەین بە دەســـتەوە ئەگەر بڵێین بوون هەیە، بەڵام تەواوی گۆڕانکارییەکەش دەهێنێتەکایـــەوە چونکە بوون تەنیا بۆ بوون—بۆ—خۆ هەیە. پەیوەندی نێوان بوون و بوون—بۆ—خۆ خەســـڵەتی بوون نییە و شتێکیش نییـــە لەنێو (بوون)دا بێت. لەم بۆچوونـــەوە ئێمە لە ڕێژە گەرایەتییەکەی (کانت) خۆمان دوور دەخەینەوە. بوون، وەکـــو بوونێک لەوێدا پەیوەندی بە بوون—بۆ—خۆوە هەیە چونکە بوون—بۆ—خۆ بە هۆکاری دەستەڵاتی ڕەتدانەوەی ناوەکییەوە ئەوە دەســـەلمێنێت، کە ناسەلمێنرێت و بوون دەناســـێت. ئەمەش ئامادەبوونی ڕاســـتەوخۆی بوون—بۆ—خۆ لە بووندا دەگەیەنێـــت، هەمانکاتیش بوون—بۆ—خۆ بەردەوام بەرانبەر بوون لە دوورەوە ڕادەوەستێت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە زانین لەلایەکەوە بوونێکی زانراوە و لەلایەکی دیکەوە بونیادە بنەڕەتییەکەشی پێویستی بە بوونێکە، کە لەشتە زانراوەکەوە دوور و جیاوازە. جیهان و شوێن و هتد.، ئەم نەبوونە دەخەنە ڕوو. من بوونی خۆم لە هەموو شوینێکدا لەنێوان خودی خۆم و بووندا وەکو نەبوون یان ئەو هیچەی نەبوونە دەبینم.

جیهـــان مرۆڤانەیە. حاڵەتەکانی ئاگایی دەبینین: بوون پەرتوبڵاوە و بەرانبەر من، لە چواردەورم گرانی دەخاتەســـەر بوونـــم و گەمارۆی داوم. منیش بەردەوام لە بوونەوە ئامـــاژە بۆ بوون دەکەم. ئەو مێزەی لەوێدایە بوونە و لەوەزۆرتر چی دیکـــە نییە؛ ئەو بەردە، درەختەکە، دەشتەکە هەمـــوو بوونن. من دەمەوێت ئەو

بوونــە بگرم، بەڵام بێجگە لە خۆم چی دیکە نادۆزمـــەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە زانیـــن، وەکو ناوەندێک لەنێوان بـــوون و نەبووندا، ئەو کاتـــەی دەمەوێت ڕەها بناســـم بۆ بوونی خۆم دەمگەڕێنێتەوە. زانین واتە بوونی ئەوەی هەیە و نییە. بۆ ئەوەی بوون بناســـیت دەبێت ئەو بوونە بیت. بەڵام ئەوەی لەوێدایە هەیە چونکە مـــن ئـــەو بوونە نیم، کە دەمەوێـــت بیزانم. ئەگەر ئەو بوونەش بـــم، ئەوا بوونە زانراوەکە لەناودەچێت و ناتوانین بیریلێبکەینەوە. ئێمە مامەڵە لەگەڵ گومانکاری و ڕیالیزمـــدا ناکەین. زانین ئێمە لەبەردەم ڕەهادا ڕادەگرێت و ڕاســـتی زانینیش هەیە. بەڵام ئەو ڕاســـتییە مرۆڤانەیە. هەڵبەتە بۆ هەندێک جێگەی سەرسوڕمانە ئێمە بەبێ پرســـیارکردن سەبارەت بوونی لەش و هەســـتەکان لە کێشەی زانین دەدوێین. من نامەوێ لە ڕۆڵی لەش کەمبکەمەوە.

بەڵام لە ئۆنتۆلۆجیدا ئەوەی لەپێشـــترە بە گرنگی دادەنێین. ئێستاش، لەش هەرجۆرە کارکردنێکی هەبێت دەردەکەوێت بابەتێکی زانراو بێت. کەوابوو، ناتوانین زانین بۆ لەش بگەڕێنینەوە یان پێش پێناســـەکردنی زانین باســـی لەش بکەین. تەنانەت بونیادی بنەڕەتی زانین لەســـەر لەش دانامەزرێت. لەسەرو ئەمەوە، لەش یان لەشی ئێمە، لە بنەڕەتدا ئەو بوونەیە، کە کەســـانی دیکە هەســـت بە بوونی دەکەن. من لەشی کەسێکی دیکە دەبینم و لە ڕێگەی کەسانی دیکەشەوە بایەخدانم بە لەشی خۆم کەم و زیاد دەکات. کەوابوو، لەشم ئاماژە بۆ کەسانی دیکە دەکات و بوونـــم دەکات بە بوون—بۆ—کەســـانی دیکە. ئەگـــەر بمەوێت پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بوون ڕوونبکەمەوە پێویستە توێژینەوە لەسەر بونیادی ئەم بوونە نوێیە خۆم، وەکو بوون—بۆ—کەســـانی دیکە بکەم. لەم بەستێنەوە ڕاستەقینەی مرۆڤ دەبێت بە بوون—بۆ—خۆ — بۆ کەسانی دیکە.

# بەشی یەکەم

## بوون– بۆ–کەسانی دیکە

### ئەلف. گرفتەکە

ئێمە لە ڕوانگەی هەڵوێستی ڕەتدانەوە و کۆجیتۆوە لە ڕاســتەقینەی مرۆڤانە دواین. لێرەوە بەو ئاکامە گەیشــتین، کە ئەو ڕاستەقینەیە بوون–بۆ–خۆیە. ئایا ئەمە هەموو لایەنەکانی ڕاســتەقینەکەیە؟ بــێ دەرچوونمان لە توێژینەوەکەمان ئێمــە ڕووبەڕووی چەند شێوازێکی ئاگامەندی دەبینەوە، کە ئاماژە بۆ بونیادێکی ڕادیکالــی جیاوازتری ئۆنتۆلۆجییانە دەکەن. ئەو بونیادە ئۆنتۆلۆجییە بوونی منە و پەیوەندی بە منەوە هەیە. من، وەکو کەسێک، کە نیگەرانی خۆی بێت. هاوکات ئــەو نیگەرانییە بۆ بوونی خۆم بوونێکم پێدەناســێنێت، کە منە، بەڵام بۆ خۆم نیم.

بیر لە شەرم، بۆ نموونە بکەوە. ئێمە مامەڵە لەگەڵ جۆرێک ئاگاییدا دەکەین، کە بونیادێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەو شتانەدا هەیە پێشــوتر باســمانکردن. خۆ–ئاگاییەکە دەرنەچووە و ڕووی لە دەرەوە نەکردووە و

ئاگاییــە لە خۆوە. وەکو شــەرم؛ ئەمەش ئەو نموونەیەیــە ئەڵمانییەکان بە ئەزموونــی ژیان ناوزەدیدەکــەن و تێڕامانیش دەتوانێت بیگاتــێ. بێجگە لەمە، بونیادەکەی مەبەســتخوازە؛ تێگەیشــتنێکی شەرمانەیە لە ئاستی شتێکدا و ئەو شتەش بوونی منە. من لە ئاستی بوونی خۆمدا شەرمەزارم. لە شەرمدا لایەنێکی بوونی خۆم دەناسم. هەرچەندە شێوازی ئاڵۆزی بیرکردنەوەی تێدا سەرهەڵدەدات، شەرم لە خۆیدا و لە بنەڕەتەوە دیاردەیەکی تێڕامان نییە. گرنگ نییە کەسێک لە ڕێگەی شەرمەوە، کە کەلتورێکی ئایینی بەسەریا دەسەپێنێت، چ ئاکامێکی هەیە. هەمیشە و لەپێش هەموو شتێکدا شەرمکردن لەبەردەم کەسێکدا سەرهەڵدەدات. مــن ئێستا شتێکی خراپــم کرد یان پۆزێکی ناشرینم لێدا. ئــەم کارە بە بوونی منەوە دەنوسێت؛ من حوکمی بەسەردا نادەم و تاوانباریشی ناکەم، بەڵکو لەگەڵیا دەژیم و هەستی پێدەکەم. کتوپڕ سەرهەڵدەبڕم کەسێک منی بینی. من هەست بە

ناشرینـــی پۆزلێدانەکەم دەکەم و شەرمەزار دەبم. شەرمکردنەکەم تێڕامانانە نییە چونکە بوونی ئەو کەسە لەنێو ئاگایی مندا لە ئاکامی تێڕامانەوە پەیدانەبووە. من تەنیـــا ئاگام لە خۆمـــە و بوونی ئەویش دەبێت بە ناوەندێک لەنێوان من و بوونی خۆمدا. من، بەو شێوەیەی بۆ ئەو دەردەکەوم، شەرمەزارم.

لەگەڵ دەرکەوتنی کەســـێکی دیکەدا من دەکەومـــە نێو بارودۆخێکەوە حوکم بەســـەر بوونی خۆمدا بدەم و خۆم بکەم بە بابەت چونکە لە بەرچاوی ئەو بووم بـــە بابەت. هەروەها ئەم بابەتەی لەبەر چاوی ئەوە شتێک نییە ئەندێشـــەی ئەو هێنابێتیە کایەوە. من لەبەردەم ئەو کەســـەدا، وەکو چـــۆن لەبەردەم وێنەیەکی ناشرینی خۆمدا ڕادەوەســـتم، توشی ناڕازی و توڕەیی دەبم چونکە من بەناشرینی لەنێو چاوی ئەودا دەرکەوتوم. شەرمکردن لە بنەڕەتدا ناسینەوەیە. لەشەرمکردندا، من بەو شێوەیەی ئەو دەمبینێت، خۆم دەناســـم. لێرەدا هیچ بەراوردێک لەنێوان بوونم بەو شێوەیەی خۆم دەیبینم و هەروەها بوونم بەو شێوەیەی ئەو دەیبینێت ڕوونادات. هەســـتدەکەم بوون—بۆ—خۆی من لەگـــەڵ بوونم—بۆ—ئەو یەک شتن. شەرمکردن هەژانێکی کتوپڕە لە تەوقی سەرەوە بۆ بنی پێ بەبێ خۆ ئامادەکردن بۆی. لەســـەرو ئەمەشەوە، بەراوردکردنەکە مەحاڵە چونکە من ناتوانم پەیوەندی ئـــەو بوونەی منم و بۆ—خۆیە و لە خـــۆی دوور نەکەوتۆتەوە لەگەڵ ئەو بوونەدا دروست بکەم، کە بووە بە بابەت بۆ کەسێکی دیکە. هەروەها، چەمکی (سوکایەتی) پێویستی بە ناوەندێک لە پەیوەندییەکەیدا هەیە. کەســـێک بە تەنیا بژی هەست بە ســـوکایەتی ناکات. کەســـەکەی دیکە تەنیا بوونی منی، بەو شێوەیەی هەیە، دەرنەخستـــوە؛ ئەو منی خزانۆتە شێوازێکی نوێی بوونەوە و خەســـڵەتێکی نوێی پێداوم. ئەم شێوازی بوونە لە نەڕەتەوە پێش ئامادەبوونی کەسەکە لە مندا نەبوو. تەنانەت، ئەگەر هێزێک لەشم بۆ دروســـتکات تاکو کەسانی دیکە بیبینن، هێشتا هەســـتکردنم بە ســـوکایەتی و ناشرینی خۆم لەگەڵ ئامادەبوونی کەســـای دیکە سەرهەڵدەدات. بەڵام ئەم بونەی بۆ کەسانی دیکەیە لای ئەوانەوە دەستپێناکات. من بەرپرســـم لەو بوونە. ئەمەش لـــە بەرنامەی پەروەردەدا باشتر دەبینرێت، کە منداڵەکان فێردەکات لە ئاستی ئەو بوونەی هەیانە شەرمەزاربن.

کەوابوو، شەرمکردن، شەرمەزارییە لەبەردەم کەســـێکدا؛ ئەم دوو بونیادە لە یەکدی جیانابنەوە. من بۆ ناسینەوەی بونیادی بوونم پێویستیم بە کەسانی دیکە هەیـــە. بوون—بۆ—خۆ ئاماژە بۆ بوون— بۆ-کەســـانی دیکە دەکات. کەوابوو، بۆ ناسینی هەموو پەیوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ بووندا ڕووتکردنەوەی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ بوون—لەنێو—خۆ بە تەنیا بەس نیی. پێویستە وەڵامی دوو پرسیاری دژوارتر بدەینەوە: یەکەمیان سەبارەت بوونی کەسانی دیکەیە و دووەمیان لەسەر پەیوەندی نێوان من و کەسانی دیکەیە.

## با . تاشەبەردی تاکڕەوی

سەیرە، کە گرفتی بوونی کەسانی دیکە ڕیالیستەکانی پەرێشان نەکردوە.

لەبەر ئەوەی بیریارێکی ڕیالیست هەموو شتێک بەدراو دادەنێت، بوونی کەسانی دیکەش بەمجۆرە دەبینێت. لەنێو هەموو شتە ڕاســتەقینەکاندا چ شتێک هێندەی بوونی کەسانی دیکە ڕاستەقینەیە؟ کەسانی دیکە وەکو من جەوهەرێکی بیرکەرەوەن. جەوهەرێکن بەسەر خەسڵەتە یەکەمەکان و دووەمەکاندا دابەش ناکرێن و بونیادی بنەڕەتیشیان لەنێو بوونی خۆمدا دەدۆزمەوە. هێشتا بیریارێکی ڕیالیست زانین بۆ کاریگەرێتی جیهان بەسەر جەوهەری بیرکەرەوەوە دەگەڕێنێتەوە، باسی پەیوەندی و کاریگەرێتــی ئەم جەوهەرە بیرکەرەوانە بەســەر یەکدییــەوە ناکات. ئەوان لە ڕێگەی ناوەندی جیهانەوە پەیوەندییەکەیان بە یەکدییەوە دروســتدەکەن. لەشم، وەکو شتێک لەنێو جیهاندا و لەشی کەسانی دیکەش دەبن بە ناوەند بۆ پەیوەندی ئاگامەندی من و ئەوان. دەروونی ئەوان لەدەروونی من جیابۆتەوە و دوورییەکەشی یەکەمجار، وەکو دووری دەروونم لە لەشمەوە و دواجاریش دووری لەشی ئەوان لە دەروونیانەوە. ئەگــەر لەم قۆناخەدا ئاشکرا نەبێت و نەزانین، کە پەیوەند نێوان بوون—بۆ—خــۆ و لەشی دەرەکین، پەیوەنــدی دەرەکی نێوان لەشی من و لەشی کەســانی دیکە ئاشکرایە. ئەگەر دەروونەکان بە هۆکــاری لەشەکانەوە لەیەکدی جیابووبێتنەوە ئــەوا دوورییان لە یەکدییەوە لــە دووری شوشە مەرەکەبەکە لە پەرتووکەکەوە دەچێت. ئێمە ناتوانین ئامادەبوونی هەردووکیان لەبەردەم یەکدیدا ڕاســتەوخۆ ببینین. ئەگەر لەو باوەڕەشدابین دەروونی من ڕاســتەوخۆ لە لەشی کەســێکی دیکەدا ئامادەیە، پێویستە بەســەر ڕەقی و پڕی لەشیدا تێپەرم، تاکو بــە دەروونی بگەم و بیگرم. کەوابوو، ئەگەر ڕیالیزم پشــت بە ئامادەبوون لەنێو (کەس)ێکدا و لەنێو کات و شوێنی ئاگامەندیم ببەستێت، ناتوانێت هەمان بەڵگە بۆ ڕاستەقینەی دەروونی کەسانی دیکە دامەزرێنێت چونکە دەرونی کەسانی دیکە بــە من ناگیرێت. دەروونی ئەو ئامادە نییە و لەش بەبێ ئەوەی لەبەردەم ئێمەدا ئامادەی بکات پەنجەی بۆ درێژدەکات. بەکورتییەکەی، ئەو فەلسەفەیەی پەنا بۆ حەدەس دەبات ناتوانێت دەروونی کەسانی دیکە بدۆزێتەوە.

ئەگــەر ئێمە نەمانەوێت یاری بە چەمکەکان بکەین بــەو باوەڕە دەگەین، کە ڕیالیزم هیچ جێگەیەکی بۆ ناســینی کەســانی دیکەی بە حەدەس دیارینەکردوە. لــەو حاڵەتەدا، ئەگەر بڵێین لەشی کەســانی دیکە بە ئێمە دراوە و ئامادەبوونی لەشیش ئامادەبوونی کەســانی دیکەیە لەبەردەم ئێمەدا، ســودی نییە. دروستە، لەش ســەر بەو هەمووگیرییەیە بە ڕاســتەقینەی مرۆڤانە ناوزەدمانکرد. بەڵام بۆ

ئەوەی سەرنجەکەمان وردتر بێت، لەش هەمیشە لەشی مرۆڤێکە تاکو ئەو ڕادەیەی لەنێـــو هەمووگیرییەکەیدا دەمێنێتەوە و بـــزر نابێت. ئەمەش لەو ئەندامەی لەش دەچێت، کە بە لەشەوە نوســـاون. ڕیالیزم، لـــەم هەڵوێستەیدا و بە ئامادەکردنی لەش و گوێنەدانی بە هەمووگیری بوونی مرۆڤەوە یان بە بەستنەوەی بەشێکی بەو هەمووگیرییـــەوە، وەکو بەردێک، درەختێک یان مۆمێک، لەشی کوشتوە. ئەمەش لـــە کاری ئەو نەشتەرگـــەرە دەچێت بە چەقۆکەی پارچەیەکی لەش دەبڕێت و لە بوونـــی زیندەوەرەکەی جیا دەکاتەوە. ئەوەی بۆ بیریارێکـــی ڕیالیست ئامادەیە لەشی کەســـەکە نییە، بەڵکو لەشە بە تەنیا. ئەگەر ناســـینی گیان بۆ بیریارێکی ڕیالیستی گیانەکی لە ناسینی لەش ئاسانتر بێت، هێشتا (بۆ ئێمە) ناسینی لەش لە ناســـینی دەروونی کەســـانی دیکە ئاسانترە. لە ڕاســـتیدا بیریارێکی ڕیالیست بایەخ بەم گرفتە نادات؛ چونکە ئەو لە بوونی کەسانی دیکە دڵنیایە. ئەمەش بۆ بیریارانی ڕیالیست و ســـایکۆلۆجی پۆزەتیێستی سەدەی نۆزدەهەم بوونی کەسانی دیکەیان ڕاســـتەوخۆ وەرگرت و ئەو بوونەش یان ئاگامەندی ئەو بوونەیان لەسەر لـــەش دامەزراند. لەش بوو بە بابەتی توێژینەوەیـــان. هەروەها باشترین ڕێگەش بـــۆ هەڵسەنگاندنی ڕەفتارەکانی لێکچونی ئاگامەندی کەســـانی دیکە و من بوو، کە بە هۆکاری هەڵچون و ســـۆزەوە کاردەکاتەسەر باوردۆخی لەش. ئەم بیریارانە ڕایدەگەیەنـــن، کە لە ڕێگەی لێکچونەوە (ئەنەلۆگی)لە نێوان بارودۆخەکانی لەشی من و ئەواندا بە ئاکامەکان دەگەین. سورهەڵگەڕانی دەموچاوم یان گریان لە کاتی تورەبووندا یان ئەم ئەزمونانە یاریدەی ڕاڤەکردنەکەمان دەدەن. ئێمە سەربەستانە دەڵێین، ئەم پرۆســـەیە زانینێکی گونجاومان دەداتێ و لە چوارچێوەی (ئەگەر)دا دەرناچێت، ناگاتە ئەودیو (لەش)ی کەســـانی دیکەوە. ئەگەر ئاژەڵ ماکینە بێت، ئـــەی بۆچی ئەو مرۆڤەی دەیبینم لە شەقامەکـــە دەپەڕێتەوە، وەکو ئاژەڵەکە بە ماکینە دانەنرێت؟ ئەوەی من بـــە دەموچاوییەوە دەیبینم هۆکردی گرژبوونەوەی ماســـولکەکانییەتی و گرژبوونەوەکـــەش هۆکـــردی تورەبوونەکەیەتـــی، کە من هەســـتی پێدەکەم. بۆچی کۆی ئەم هۆکردانە بۆ کاریگەرییەکی بێ ئاگایی سادە نەگەڕێنینەوە؟ زۆرینەی بیریارانی دەروونناس لەو باوەڕەدان بوونی کەسانی دیکە، وەکو بوونی خۆیان ڕاســـتەقینەیەکی هەمووگرییە. بوونی کەســـانی دیکە بۆ ئەم بیریارانە لە گومان بـــەدەرە و زانینەکەشمان لە بارەی ئەوانەوە گونجاوە. لێرەدا بە هەڵەداچوونی ڕیالیزم دەبینین. لە ڕاســـتیدا، دەبێت چەمکەکانی ئەم کێشەیە ئالۆگۆڕ بکەین و بڵێین، ئەگەر ناسینی کەسێکی دیکە لەسەر زانینمان سەبارەت بە ئەو ڕاوەســـتابێت، ئەو زانینە تەنیا بۆچوونە و گونجاوییەکەشی پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەگرانە هەیە. لێـــرەدا بیریارە ڕیالیستەکە ناچاردەبێت بۆ ئایدیالیزم بگەڕێتەوە. ئەگەر لەش بەســـەر جەوهەری بیرکەرەوەدا کارتێکەر بێت،

ئەوا بوونی کەسانی دیکە دەبێت بە نوێنەر یان بیرۆکە و ناوەڕۆکێکی هەستەکی. بوونی کەسێکی دیکەش لەسەر ئەو زانینە ڕادەوەستێت ئێمە لەبارەی ئەوەوە هەمانە. بیردۆزە نوێکان لەسەر سۆز و بەزەیی یارمەتیمان دەدەن و باشتر ئامادەبوونی کەسانی دیکە ڕاڤە بکەین، بەڵام ئەوان توێژینەوەکە لە زەمینەیەکی دروستەوە دەستپێناکەن: ئەویش دەرکەوتنی کەسانی دیکەیە پێش ناسینی ڕەفتارەکانی. لەگەڵ نەبوونی هەموو جۆرە لێکچونێکدا ئەو بابەتە هەستپێکراوە، وەکو هەمووگیرییەکی مرۆڤانە دەمێنێتەوە. ئەگەر ڕیالیزم بۆ ئایدیالیزم بگەڕێتەوە پێویست ناکات پەنا بۆ ئایدیالیزمی ڕەخنەکاری بەرێت. مادامەکی بوونی کەسانی دیکە "بیرۆکەی منە" ئایا پێویست ناکات ئەم بیرۆکەیە بەو کێشەیەوە گرێبدەین، کە هەموو بوونێک لەسەر بیرۆکەکانی من دادەمەزرێنێت؟ ئێمە داوای یارمەتی لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەی کانت دەکەین. ئەم بیریارانە خۆیان لەگەڵ دامەزراندنی یاسا هەمەکییە خۆگەرییەکاندا ماندوکردوە. ئەم یاسایانە بۆ هەموو کەسێک وەکو یەکن. بەڵام هەرگیز پرسیار لەبارەی کەسەکانەوە ناکەن. ئەوان لەو باوەڕەدان (خۆ) ناوەڕۆکێکی هاوبەشی هەموو کەسەکانە و ناتوانین باسی زۆری و جیاوازی نێوان تاکەکان بکەین. ئەم ناوەڕۆکە هەمەکییەش لە سیستەمی سپینۆزادا بووە بە بوونی کۆنکرێتی بۆ مرۆڤ. لە سەرەتاوە، دەردەکەوێت کانت بوونی کەسانی دیکەی نەخستۆتە نێو بەرنامە ڕەخنەکارییەکەیەوە. با لەم کێشەیە زۆرتر وردبینەوە و بزانین چۆنە. بوونی کەسانی دیکە لەنێو ئەزمونی ئێمەدایە؛ ئەو کەسە بابەتێکی هەندەکییە. کانت ئەو کەسە بە (خۆ)یەکی ڕەوان دادەنێت. هۆکاری ئەمەش پەیوەندی بە دۆزینەوەی بارودۆخێکی گونجاو، نەک تەنیا بۆ بابەتێک بەڵکو هەموو کاتیگۆرییەکانی بابەتەکانەوە هەیە: بۆ نموونە بابەتە هەستەکییەکان، ماتماتیکییەکان، بابەتە جوان و ناشرینەکان و ئەوانەی خەسڵەتی تیلیۆجیشیان تێدایە. ڕەخنە لەسەر ئەم کەموکورتییەی کانت گیراوە. هەندێک بیریار پەیڕەوی (دیڵتی)یان کردوە و هەوڵیانداوە بابەتە مێژووییەکانیش بخەنە بەر ڕۆشنایی توێژینەوە و ڕەخنەکارییەکەیان مێژووش بگرێتەوە. بەهەمانشێوە، ئەگەر ڕاستبێت، کە بوونی کەسانی دیکە بابەتێکی هەندەکییە و ئەزمونی ئێمە دەیدۆزێتەوە، ئەوا لەنێو زەمینەی فەلسەفەی کانتەوە پێویستە بپرسین، چۆن زانینمان سەبارەت ئەو بوونە پەیدا دەبێت؟ ئەمەش پێویستی بارودۆخی گونجاو بۆ ناسینی کەسانی دیکە دەهێنێتە پێش.

لە ڕاستیدا هەڵەیە گرفتی بوونی کەسانی دیکە و ڕاستەقینە نۆمینەکان لە یەک ئاستدا دابنرێن. هەڵبەتە ئەگەر کەسانی دیکە هەبن و بوونیشیان لە بوونی من بچێت، ئەوا پرسیارکردن لە ئەواندا سەبارەت بوونی ئاگامەندییان وەکو پرسیارکردنی من لە بارەی (نۆمینە) لە بوونی خۆمدا سەرهەڵدەدات؛

بەدڵنیاییشـــەوە، وەڵامدانەوەکـــە بـــۆ ئـــەوان و منیش دەگونجێت. ئـــەو بوونە نۆمینەییـــە تەنیا بیری لێدەکرێتەوە و هەســـتی پێناکرێت. بەڵام ئەو کاتەی من ڕۆژانە لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەڵسوکەوت دەکەم، ئەوان نابن بە نۆمینە. منیش نامەوێ و هەوڵێش نادەم لەگەڵ ناســـینەوەی ســـۆز و هەڵچونەکانمان ئەو لایەنە بدۆزمەوە. کەســـێکی دیکە دیاردەیە و ئاماژەش بۆ دیاردەکانی دیکە دەکات؛ بۆ نموونە دیـــاردەی توڕەبوون، کە ئەو بەرانبەر من دەریدەبڕێت یان زنجیرەیەک لە بیرۆکەکانی لەناوەوە هەیەتی. ئەوەی من لە ئەودا دەیبینم شتێکی جیاوازتر نییە لەوەی لە مندا هەیە. بەڵام ئەو دیاردانە ڕادیکاڵانە لە دیاردەکانی دیکەوە دوورن. لە پێش هەموو شتێکدا، دەرکەوتنی کەسێکی دیکە لە ئەزمونی مندا بە هۆکاری بونیادێکی ڕیکخراوی، وەکو پۆزلێدان، دەربڕین، کارکردن و هەڵسوکەوتەوە خۆی بەرجەســـتە دەکات. ئـــەم فۆرمانەش ئاماژە بۆ جـــۆرە یەکێتییەک لە دەرەوەی ئەزمونی مندا دەکەن. توڕەبوونی کەسێک، کە ئەزمونێکی ناوەکی ئەو کەسەیە لە ڕێگەی شێوەی دەموچاوی ئەوەوە لە ئەزمونی مندا دەبێت بە دیاردە. کەســـەکە، وەکو یەکێتییەکی هەموو ئەزمونەکانی خۆی، هەروەها لەگەڵ ویست و ســـۆزییدا ئەزمونەکـــەی من پێکدەهێنێت. ئەمەش پەیوەندی بە بوونی نۆمینەیەکی نەزانراو لەودیو دیاردەکان و لە دەرەوەی ئەزموندا نییە. بەڵکو بەســـتنەوەی دیاردەکانە لـــە چوارچێوەی ئەزمونی مندا لەلایەن کەســـێکەوە، کە (من) نیم. ئەم دیاردانە، بەپێچەوانەی دیاردەکانی دیکەوە، ئاماژە بۆ ئەزمونە ئەگەرییەکان ناکەن، بەڵکو ئاماژە بۆ ئەو ئەزمونانە دەکەن، کە لە دەرەوەی ئەزمونی مندا ڕوودەدەن، سەربە ســـیستەمێکن و دەســـتی من نایگاتێ. بەڵام هاوکات حاڵەتـــی گونجاوی هەموو ئەزمونەکانـــم لەوێدایە، کە ئەو کەســـە دەربڕینەکانی خـــۆی ڕێکدەخات و لەنێو سستەمێکدا سەقامگیریان دەکات. ئێمە لەنێو شتەکاندا ئەوەی خۆمان دایدەنێین. دەیدۆزینەوە. کەسانی دیکە بەبێ ناکۆکی، وەکو ڕێکخەری ئەزمونەکانمان خۆیان بۆ ئێمە دەرناخەن؛ لێرەدا جەختکردن لەسەر سەلماندنی دیاردە خۆی دەسەپێنێت. ئایا لێرەدا هۆگەرایەتی ســـود بە ئێمە دەگەیەنێت؟ ئەم پرسیارە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشـــەی ئاڵۆزی بوونی کەســـانی دیکە لە فەلسەفـــەی کانتدا لە جێگەی خۆیەتی؟ هۆگەرایەتی دیاردەکان بە یەکدییەوە دەبەستێتەوە. بەڵام توڕەبوون لە دەروونی کەسەکەدا یەک دیاردەیە و شێوازی دەربڕینی توڕەبوونەکەش بەرانبەر من دیاردەیەکی دیکەی جیاوازە. ئایا پەیوەندییەکی هۆگەرایانە لەنێوانیاندا هەیە؟

وەڵامـــی ئـــەم پرســـیارە دەبێـــت پەیوەندییەکەیـــان دیاریبکـــات. منیـــش ســـورهەڵگەڕانی دەموچاوی پـــۆڵ بە توڕەبوونەکەیەوە دەبەســـتمەوە. لەلایەکی دیکـــەوە، هۆگەرایەتی لەوێدا واتابەخشـــە، کە دیاردەکانـــی نێو یەکجۆر ئەزمون پێکەوە ببەســـتێتەوە. ئایـــا دەبێت بە پرِی نێوان دووجـــۆر ئەزمونی لە یەکدی

جیاواز؟ ئەو هۆگەرایەتییەی کانت باســـیدەکات ساتە نەگەڕاوەکانی نێو کاتی من پێکەوە دەبەســـتێتەوە. ئایا دەتوانێت ســـاتەکانی من و ساتەکانی کەسانی دیکە پێکەوە ببەســـتێتەوە؟ چ جۆرە پەیوەندییەکی کاتی لەنێـــوان بڕیاردانی ئەو بۆ دەربڕین، کـــە لەنێو ئەزمونیدا دەبێت بە دیاردە و دیاردەکانی نێو ئەزمونی مندا دروستدەکات؟ ئایا کتوپڕییە؟ بەردەوامییە؟ چۆن ساتێکی من لەو کتوپڕییە یان بەردەوامییەدا پەیوەندی بە ســـاتی کەســـێکی دیکەوە هەیە؟ ئەگەر دامەزراندنی هارمۆنیەکی لەپێشتریش (هەرچەندە کانت باسینەکردوە) پەیوەندی لەنێوان دوو ســـاتی نێو دوو کاتی جیاواز دروستبکات هێشتا ئەو دوو جۆر کاتە لە یەکدییەوە جیـــاوازن چونکـــە بناخـــەی یەکگرتنی ســـاتەکانی نێو هەریەکێکیـــان خاوەنی ئەزمەنەکەیـــە. لایەنی هەمەکی کات بۆ کانت بیرۆکەیـــی و چەمکە؛ ئەو جەخت لەســـەر بونیادی کات دەکـــات و ئەو بارودۆخە پێویستـــە کاتییەی بۆ ئەزمونی دادەنێت هەمەکییە. هێشـــتا ئەم بارودۆخە هەمەکی و ناسنامەیە بۆ هەڵبەستنی پەیوەنـــدی نێوان ئەزمونە جیاواز و فرەجۆرەکاندا یاریدەدەر نییە. مادام ناتوانین بیـــر لە پەیوەندی نێوان ئاگامەندییەکان بکەینەوە چەمکی کەســـانی دیکە نابێت بە بنەمایەک بۆ ئاگامەندییمان؛ دەبێت لە ڕیزی چەمکە تیلیۆلۆجییەکان دابنرێت. کەوابوو، کەســـانی دیکە ســـەر بە کاتیگـــۆری "وەکو ئەوە"یە. کەســـانی دیکە گریمانەیەکی لەپێشترە و پێویست بە سەلماندنی ناکات،. خاوەنی یەکێتیەکیشە، کە بەســـەر ئەزمونەکانـــەوە کاریگەرە. گریمانەیەکە، کـــە ناتوانین بەبێ ناکۆکی ســـەرهەڵدان بیـــری لێبکەینەوە. ئێمە دەتوانین کاریگەرێتی کەســـێک بەســـەر هەســـتکردنمانەوە بناســـین، بـــەڵام ناتوانین دیاردەکەی نێـــو ئەزمونی ئەو، کە کاردەکاتە سەر دیاردەی نێو ئەزمونی من بدۆزینەوە. هەرچەندە دەتوانین بڵێین، کە کارتێکردنەکە کتوپڕ لەنێو ئەزمونی مندا دەردەکەوێت، هێشـــتا دژوارە بزانین پەیوەندی نێوان دوو لایەنی دابڕاو یان نەخشـــەی بەرانبەر یەک وەســـتاو، وەکو دوو هێڵی تەریبی بدۆزینەوە. کێشـــەکەمان دۆزینەوەی ئەو چەمکە شێوەکارییە نییە، کە پەیوەندی نێوان ئەزمون و بابەتێکی دەرەکی دیاریدەکات یان کێشەی زەمینەیەکی لەپێشـــتر بۆ ئەزمونەکان نییە. هەستکردن بە بوونی کەسانی دیکە، وەکـــو بابەتێکـــی دەرەکی ئاماژە بۆ ســـیستەمێکی بیرۆکەکـــان دەکات. منیش خاوەنی ئەو ســـیستەمە نیم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بوونی کەسانی دیکە لـــە ئەزمونی مندا دیاردە نییە، بەڵکـــو ئاماژە بۆ دیاردەیەک لە دەرەوەی هەموو ئەزمونەکانـــی من دەکات. بێگومان چەمکی کەســـانی دیکـــە زۆرشت لەنێو ئەو ســـیستەمەدا بۆ من ڕووندەکاتەوە: بۆ نموونە لەگەڵ دیاردەیەکدا من چاوەڕوانی جۆرێـــک لـــە پۆزلێدان یان جوڵانێک دەکـــەم. بەڵام ئەم چەمکـــە وەکو چەمکە زانستییەکـــان نییە یان ئەو ئامێرانە نییە لە تاقیکردنەوەیەکی زانستیدا بەکاردێن

و لـــه ئاكامی تاقیكردنەوەكەدا باســـناكرێن. چەمكی كەســـانی دیكە ئامێر نییە. تەنانـــەت زۆرچەمک هەن، كـــە بوونیان پەیوەندی بە چەمكی كەســـانی دیكەوە هەیە. بوونی سیستەمێكی دیكەی واتاكان و ئەزمونەكان لە دەرەوەی بوونی مندا دیاردە جوڵاوەكانی ئاماژەی بۆ دەكەن. ئەم ســـیستەمە، كە لە بنەڕەتەوە بۆ من دەرەكییە، بەردەوام پڕ دەبێت. من هەرگیز بە تەواوی پەیوەندی نێوان كەســـانی دیكە و خۆم ناناســـم و كەســـانی دیكەش شتێكی پێدراو نین. من لە پرۆسەدا و لەسەرخۆ ئەوانم بۆ دەناســـرێت. ئەوان ئامێرێک نین بۆ پێشبینی لە ئەزمونێكدا بەكاریـــان بهێنم. بەڵام هەندێک ڕوودان لە ئەزمونی مندا هەن، كە دەبن بە ئامێر بۆ پێكهێنانی بوونی كەســـانی دیكە بۆ من. من بەردەوام دەمەوێت هەست و بیر و ویست و ڕەفتاری كەســـانی دیكە بناســـم. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، كە كەسانی دیكـــە تەنیا ئەوە نین مـــن دەیانبینم، ئەوانیش من دەبینـــن. من دەمەوێت ئەو كەســـە بناســـم چونكە ئەو وەكو بابەتێک لەودیو دەســـتەڵاتی منەوە سیستەمی ئەزمونەكانە. بەڵام لەبەر ئەوەی من هەوڵدەدەم ئەو ســـیستەمە بناســـم و منیش بـــۆ ئەو دەبم بە بابەت، ئەوا ڕادیكاڵانە خۆم بەودیو ئەزمونەكانم دەگەیەنم، خۆم بە زنجیرەی ئەو دیاردانەوە ماندوودەكەم، كە ناكەونە بەر ڕۆشنایی حەدەسی من و لـــەم ڕێگەیـــەوە خۆم بەودیو ســـنوری زانینەكەم دەگەیەنـــم. هەوڵدەدەم ئەو ئەزمونانـــە پێكـــەوە گرێبدەم، كـــە ئەزموونی من نین. ئەمـــەش نابێتە هۆكاری پێكهێنـــان و یەكگرتنی ئەزمونەكانی خۆم. لەبەر ئەوەی كەســـانی دیكە ئامادە نیـــن و ڕادەكەن ئەوا بە چەمكێک پێناســـناكرێت. بێگومـــان، هەندێک بیرۆكەی دیكە، وەكو جیهان تاكو ڕادەیەک لە دەســـت من ڕادەكات هەن و دەتوانین تاكو ڕادەیەک واتاكەی دیاریبكەین. كەسی دیكە، بەپێچەوانەوە، لە زۆر ڕووەوە خۆی، وەكـــو ڕەتدانەوەی ئەزمونی من دەردەخات. من بۆ ئەو بكەر یان خۆ نیم، بەڵكو بابەتـــم. كەوابوو، من وەكو خۆیەكی خاوەنـــی زانین ئەو بابەتەم هەوڵدەدەم ئەو خۆیە دیاریبكەم، كە خۆیەتی من ڕەتدەداتەوە و دەمكات بە بابەت. لەم ڕووەوە، بۆ ئایدیالیزم كەســـانی دیكە چەمكێكی دانراو یـــان پێكهاتووی نێو زانین نییە؛ ڕاســـتەقینەیە و پەیوەندییەكەشـــی لەگەڵ مندا دیارینەكراوە. من كەســـی دیكە دەكەم بە بابەت، هێشـــتا ئەو بابەتە ناكەوێتە بەر ڕۆشنایی حەدەسەكەم. من بە (خۆ)ی دادەنێم كەچی بابەتی بیركردنەوەی منیشـــە. لێرەدا، دووجۆر ڕێگەچارە بـــۆ ئایدلیستەكـــان دادەنێن: بەتـــەواوی واز لە چەمكی كەســـی دیكە بهێنن و بیسەلمێنـــن، كە بۆ پێكهێنانی ئەزمونەكانی من دەور نابینن یان باوەڕ بە بوونی ڕاســـتەقینەی كەســـی دیكە بهێنن و پەیوەندی نێوان ئاگامەندییەكان باسبكەن. ڕێگەچارەی یەكەم بە خۆگەری ناســـراوە. هێشـــتا، ئەگـــەر پێكهێنانی ناوەكەی لەســـەر دوورەپەرێـــزی ئۆنتۆلۆجییانەی من بێت، ئەوا دەبێـــت بە گریمانەیەكی

نەســـەلمێنراوی مێتافیزیکییانە چونکە لەوێـــدا، کە دەڵێم لە دەرەوەی بوونی من هیـــچ شتێک نییە پێویستە بچمـــە دەرەوەی خۆم. لەوێشـــدا دەبێت بە شتێکی لۆجیکمەندانـــە ئەگەر تەنیا ڕەتدانەوەی دەرچوون بێت لە زەمینەی دامەزرێنراوی ئەزمونەکان و لەســـەر ئاســـتی بابەتگەرێتی ڕەخنەگرانە دەمێنێتەوە. هەرچەندە دژوەســـتاو بەرانبـــەر بوونی ئێمە خۆی ڕادەگرێت، بەڵام خۆی لەســـەر زەمینەی ناکۆکییەکانی نێو بۆچوونی ئایدیالیستانە دەســـەلمێنێت. زانستی دەروونناسی، وەکـــو فێرگەی ڕەفتارگەری واتسۆن، کە دەیەوێـــت بابەتگەرانە و تەواو بێت، لە ڕاستیدا گریمانەیەکی خۆگەرییە. نکۆڵی لە هەبووە ناوەکی و دەروونییەکانی نێو ئەزمونەکانـــی من ناکات. لـــە ڕوانگەی ئـــەم ڕێگەچارەیەوە کانـــت و زۆرینەی شوێنکەوتوانی کانتیش بوونی کەســـانی دیکە دەســـەلمێنن. پەنا بۆ هەستکردنە هاوبەشەکانمان یان هاندەرە ناوەکییە قوڵەکانیشـــمان دەبەن. شۆبنهاوەر بیریای خۆگەرایەتی بەو "مرۆڤە شێتە دادەنێت، کە چاوەکانی خۆی لە ئاستی خانویەکی بـــەرزی بەرانبـــەری دادەخات." ئێمە، لێرەدا، ڕاســـتەوخۆ بونیـــادی ئایدیالیزم دەڕوخێنیـــن و ڕوو لـــە مێتافیزیکـــی ڕیالیستانە دەکەین. یەکـــەم، ئێمە لەگەڵ دەستنیشـــانکردنی تاقمێک ســـیستەمی داخراو، کە تەنیا لە دەرەوەدا دەتوانین پێیان بگەین، بە نهێنی و لە ناوەوە چەمکی جەوهەر دروستدەکەینەوە. بێگومان ئەو ســـیستەمانە جەوهەر نین، چونکە سیستەمی بیرۆکەکانن. بەڵام پەیوەندییە دەرەکییەکانیـــان لە خۆیاندا دەرەکین؛ نەناســـراون، ئێمـــە کارتێکردنەکەشیان نازانیـــن، چونکە گریمانەی بیریـــارە خۆگەرایەتییەکان لە ئەگەر زۆرتر چی دیکە نییە. تەواناى ئێمە بۆ دەرخستنی ئەو نەبوونە، وەکو فاکتۆرێکی ڕەها ســـنوردار نەکراوە؛ هەروەها پەیوەندی بە زانینی ئێمەوە ســـەبارەت کەسانی دیکەش نییە. کەوابوو، ئەگـــەر ئاگامەندییەکان چەمکێکی ڕووتی بەســـتنەوەی دیاردەکان بن، یاســـای بوونیشـــیان هەســـتکردنی هەســـتکراوەکە بێت، هێشـــتا ئەو ڕاستییە ناشاردرێتـــەوە، کـــە ســـیستەمی پەیوەندییەکان فـــرەن. هـــەر یەکێکیش لەو ســـیستەمانە بـــە تەنیا ڕادەوەســـتێت. ئەگەر من ئاماژە بۆ ئـــەو چەمکە بکەم، ئەزموونی من بۆ توڕەبوونی کەســـێکی دیکە و ئەو چەمکە هەمانکات بەســـتراون بـــە ســـیستەمێکی ناوەکـــی ئەزمونی توڕەبوونەوە. من ســـیستەمێکی ڕاســـتی ئەندێشاوی دادەمەزرێنم، کە کانت هەوڵی لەناوبردنی دەدات. بەدڵنیاییەوە، ئێمە مامەڵـــە لەگەڵ ڕێکەوتن لەنێوان دوو جۆر دیاردەدا دەکەین—توڕەبونێک لەســـەر دەموچاوی کەسەکە دەردەکەوێت و هەســـتی پێدەکرێت، توڕەبوونەکەش، وەکو دیاردەیەکی ڕاســـتەقینەی ناوەوە یان دەروونی کەســـەکەیە. ئەمەش ڕێکەوتنی نێوان دیاردە و ڕاستەقینەیەکی ئەو دیو دیاردەکە نییە. بەڵام کێشەی سەلماندنی ڕاستی لەســـەر ڕێکەوتنی بیرۆکەیەک و بابەتە دەرەکییەکە دەمێنێتەوە. ئەمەش

ڕیکەوتن یان پەیوەندی بیرۆکەکان لەگەڵ یەکدییا ناگرێتەوە. ئێمە ئاماژەکردنمان بۆ (نۆمینە)ســـڕیوەتەوە. دیاردەی توڕەبوونەکـــە پەیوەندی بەو بابەتە دەرەکییە ڕاســـتەوە هەیە، کە لەنێو ئەندێشـــەی ئێمەشدا ســـەریهەڵداوە. کێشەکە لێرەدا نوێنەرایەتیکردنی بەجێی بابەتەکەیە چونکە ڕاســـتی دەرەکی و هەســـتکردن بەو ڕاســـتییە هەن. ئەگەر باســـی توڕەبوونی خۆم بکەم دەمتوانی بەرجەستەبوونە ناوەکییەکەی و گۆڕانکارییەکانی ســـەر دەموچاویشم بە دوو جۆر هۆکردەی یەک هۆکـــار دابنێـــم. ئەگـــەر یەکێک لـــەم دوو جۆرە لـــە بوونی کەســـێکی دیکەدا ســـەرهەڵدات و ئـــەوی دیکەش لـــە مندا بێت، ئـــەوا یەکێک لەوانـــە دەبێت بە ڕاســـتەقینەی ئـــەوی دی و بەپێوەری بیریـــارە ڕیالیستەکانیش ڕاســـتییەکەی دەدۆزێتەوە. لەنێو کێشـــەی بوونی کەســـانی دیکەدا پێشبیرێکی بنەڕەتی هەیە: ئەویش ئەوەیە، کە کەســـی دیکە کەســـی دیکەیە و من نییـــە. ئەم ڕەتدانەوەیە دەبێـــت بـــە بناخەی بونیـــادی بوون—بۆ—کەســـانی دیکە. ئەم پێشـــبیرە لای ئایدیالیـــزم و ڕیالیزمیش هەیە و ڕەتدانەوەیەکی دەرەکییە. کەســـێکی دیکە من نییـــە یان ئەو کەســـەیە، کە (من) ئـــەو نیم. ئەم (نییە)یە ئامـــاژە بۆ نەبوونێک لەنێوان من و ئەودا دەکات و لە یەکدیمان جیادەکاتەوە. ســـەرچاوەی ئەم (نییە) یە من یان کەســـەکەی دیکە نییە، تەنانەت لـــە پەیوەندییەکەشمان بەیەکدییەوە نییە بەڵکو، نەبوونی پەیوەندییە و بنەڕەتی هەموو پەیوەندییەکانیشـــە لەنێوان من و کەســـانی دیکەدا. کەسانی دیکە لە ئەزمونی هەستکردنەکانمدا دەردەکەون. لەشـــی ئـــەوان، وەکـــو بوون—لەنێو—خـــۆ لـــە دەرەوەی لەشی منداییـــە؛ ئەو پەیوەندییەی دەکەوێتە نێوانیانەوە لەنێو (شوێن)دا ســـەرهەڵدەدات و دەرەکییە. بیریارێکـــی ڕیالیستـــی لـــەو باوەڕەدایـــە بە هۆکـــاری لەشەوە کەســـانی دیکە دەدۆزرێتـــەوە و خۆی لەوانیش بە هۆکـــاری لەشەوە جیادەکاتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێـــت، کە واتای ئۆنتۆلۆجی ڕەتدانەوەکە لە دەســـتەواژەکەیدا، "من پۆڵ نیم." هەمان ڕەتدانەوەیە لە دەستەواژەی "مێزەکە کورسی نییە." بەکاریدەهێنین. مادامەکـــی جیاکردنـــەوەی ئاگامەندییەکانیش بـــە جیابوونـــەوەی لەشەکانەوە گرێـــدراون، ئـــەوا جۆرێک شوێن لەنێـــوان ئاگامەنددییە جیاوازەکانیشـــدا دەبێ هەبێـــت؛ ئەمەش بەتـــەواوی جۆرێکـــە لە نەبـــوون و دوورییەکـــی ڕەها لەنێو ئەزمونەکانماندا. ئایدیالیزم لەشی من و کەســـانی دیکە بۆ سیستەمی بیرۆکەکان دەگەڕێنێتەوە، بۆ شۆپنهاوەر لەشم بابەتێکی ڕاســـتەوخۆیە. بەڵام ئەم بۆچوونە خۆی بەودیو دوورییە ڕەهاکەی نێوان ئاگامەندییەکان ناگەیەنێت. ســـیستەمێکی بـــڕی بیرۆکەکان، بۆ نموونە مۆناد، خۆی ســـنوردار دەکات، ناتوانێت پەیوەندی لەگـــەڵ شتێکی جیاواز لە خۆی دامەزرێنێت و خۆیەکی دیکە ســـنوردار بکات و هیچ شتێکی ئەم ســـنوردار نەکـــات. بوونێکی دابڕاوی هەیـــە و (شوێن) لەوانی

دیکـــەی جیادەکاتەوە. کەوابوو، لـــەم بۆچوونەشەوە، شوێـــن ئاگامەندی من و کەســـانی دیکـــە جیادەکاتەوە. ئایدیالیـــزم، بێ ئەوەی هەســـتی پێبکات، پەنا بۆ (کەســـی ســـێیەم) دەبات تاکو ڕەتدانـــەوە دەرەکییەکـــە بسەلمێنیت. ئێمە بینیمـــان، کە پەیوەندی دەرەکـــی داوای گەواهێک بۆ ســـەلماندنی دەکات. لەم ڕووەوە ئایدیالیستەکان و ڕیالیستەکان بەم ئاکامە دەگەن: لەبەر ئەوەی کەسانی دیکە، لەنێو شوێندا خۆیان بۆ ئێمە دەردەخەن ئەوا ئێمە و کەســـانی دیکە لەنێو شوێنی ڕاستەقینە یان ئەندێشاوییدا لە یەکدی جیادەبینەوە.

ئەم پێشـــبیرە چەنـــد ئاکامێکی لەدوایە: ئەگەر پەیوەندییم لەگەڵ کەســـانی دیکە دەرەکی و بێ جیاوازی بێت، ئەوا سەرهەڵدان و لەناوچوونی کەسانی دیکە کارناکەنە ســـەر بوونی من. مادامەکی بوونی کەسانی دیکە کارناکاتە سەر بوونی من تەنیا ڕێگەیەک بۆ خۆناســـینی بە من خۆ دەرخستنە، وەکو بابەتێکی زانین. لێرەدا پێویستە ئـــەوەش بزانین، کە من دەبێ بەوجۆرەی هەموو لایەنە فرەکانی سەرنجەکانم لەنێو یەکێتییەکدا کۆدەکەمەوە، کەسانی دیکەش بەهەمانشێوە لەنێو یەکێتییەکدا دادەنێم: لێرەدا من یەکێتی کەسێکی دیکە پێکدەهێنم. کەوابوو کەسانی دیکە بۆ من تەنیا وێنەیەکی ئەندێشاوییە. کەسی سێیەم یان گەواهێک دەتوانێت بەراورد لە نێوان کەســـانی دیکە و وێنە ئەندێشـــاوییەی من بکات و ڕاستییەکەی ســـاخبکاتەوە. لەســـەرو ئەمەوە، ئەو کەســـەی گەواهی دەدات نابێت پەیوەندی دەرەکی لەگەڵ من و وکەســـانی دیکەدا هەبێت. ئەگەر ئەمکارە نەکات ئەوا من و کەسانی دیکە دەبین بە وێنەیەکی ئەندێشاوی نێو بیری ئەو. ئەو دەبێت لە بوونی مندا و لە بوونی کەســـانی دیکەدا ببێت بە ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی. پەنابردنە بەر خوا، بەو شێوەیـــەی لای لایبنز دەیبینین، پەنا بردنەبەر ڕەتدانەوەی ناوەکییە؛ لەنێو چەمکـــی تیۆلۆجی ئافەریدکردندا دەردەکەوێت: خـــوا، لەهەمانکاتدا من و کەسانی دیکەیە و من و کەسانی دیکەش نییە، چونکە ئافەریدمان دەکات. خوا بۆ ئەوەی من بناسێت، پێویستە من بێت و ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ ناوەندێک پەیوەندی بە منەوە هەبێت. هەروەها، بۆ ئەوەی گەواهییەکەی بێ لایەن بێت، پێویستە من و کەسانی دیکەش نەبێت. وێنەی ئافەریدکردن نموونەیەکی بەجێیە لەبەردەستماندا، چونکـــە لە ئافەریدکردندا تەماشای ناخی شتـــە ئافەریدکراوەکە دەکەین. ئەوەی ئافەریدیدەکەم (مـــن)ە، هاوکات ئافەریدکراوەکە لـــە دەرەوەی مندا بەرانبەر من ڕادەوەســـتێت و دەبێت بە بابەت. لەمحاڵەتەدا (شوێن) لە ئێمە دوورناکەوێتەوە و ڕێگەی هەڵبژاردنمان دەبەستێت: دەبێت پەنا بۆ خوا یان ئەو ئەگەرە بەرین، کە دەرگاکانی خۆگەریمان بۆ ئاوەڵا دەکات. بەڵام ئەم چەمکە لەبەردەم دووڕیانەیەکدا ڕاماندەگرێت: ئەمەش گرفتێک بوو لە کێشـــەی بوونـــی جەوهەرەکاندا بیریارانی پاش—دیکارت باســـیانکرد. ئەگەر خوا من و کەســـانی دیکەش بێت، ئایا (من) چ

جۆره بوونێکم هەیە؟ ئەگەر ئافەریدکردن پرۆســـەیەکی بەردەوام بێت ئەوا منیش لەنێوان بونێکـــی دووری خۆم و یەکانەگی بوون لەگەڵ خوادا دەمێنمەوە. ئەگەر ئافەریدکـــردن بە یەک جـــار تەواو بووبێت و منیش لـــە دەرەوەی خوادا بم ئەوا هیـــچ شتێک بوونی من بە خواوە نابەســـتێتەوە: خوا و بوونی من پەیوەندییەکی دەرەکییـــان دەبێت. ئەمـــەش لە پەیوەندی نێوان هونەرمەندێکی پەیکەرســـاز و پەیکەرە دروســـتکراوەکەی دەچێت. خوا، لەمحاڵەتەدا، بە هۆکاری وێنەکانی نێو ئەندێشەی سەربارەت من، من دەناسێت. لەنێوان ئەم بارودۆخانەدا، چەمکی خوا، کـــە ڕەتدانـــەوەی ناوەکی بۆ ئێمە دەردەخات و دەبێت بـــە تەنیا پەیوەندییەکی گونجاو لەنێوان ئاگامەندییەکاندا، وەکو چەمکێکی بەجێ خۆی ناچەسپێنێت: خوا نابێت بە پێویست یان زەمینەیەک بۆ ســـەلماندنی بوونی کەسانی دیکە. هەروەها خوا، وەکو ناوەندێک لەنێوان بوونی من و کەســـانی دیکەدا لەپێشـــوەختا بوونی کەسانی دیکە و پەیوەندییە ناوەکییەکەی نیشاندەدات، چونکە خوا بەوشێوەیەی هەمـــوو خەســـلەتەکانی (ئاگایی) هەیە، پاراوترین بوونی ئـــەوی دییە. پێویستە بتوانێت پەیوەندی ناوەکی لەگەڵ مندا هەبێت. دەردەکەوێت بیردۆزەی پۆزەتیڤیزم ســـەبارەت بوونی کەســـانی دیکە، خۆی لە خۆگەرایەتی دووردەخاتەوە و واز لە پەنابردنیـــش بۆ خوا دەهێنێت. ئەم کـــارەش، بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لەنێوان من و کەســـانی دیکەدا لەســـەر ڕەتدانەوەی ناوەکی پێویستە؛ ئەوە دەگەیەنێت، ڕەتدانـــەوە جیاوازییە بنەڕەتییەکانی کەســـانی دیکە لەگەڵ مندا، کە بوونی منی پێدەناســـرێت و نێوان من و کەســـانی دیکەش، کە کەسانی دیکەی پێدەناسرێت بەرجەستەدەبێت. دەشێ لەم بۆچوونەوە تەماشای پرسیارەکە بکەین؟

## جیم. هوسرڵ، هیگڵ، هایدیگەر

فەلسەفەی ســـەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم وا بۆ کێشەکە دەچن، کە ئەگەر من و کەســـانی دیکە بە دوو جەوهەری لەیەکدی دابـــڕاو دابنرێین، ئەوا ناتوانین لـــە خۆگەرایەتی ڕزگار بین: یەکگرتنی ئەم دوو جەوهەرە کارێکی مەحاڵە. بەڵام هەرچەندە ئـــەم فەلسەفەیە واز لە ئاکامەکانی ڕەتدانـــەوەی دەرەکی دەهێنێت، هێشـــتا ئاکامێکی گرنگی هەڵگرتۆتەوە و وازیلێنەهێنـــاوە. ئەو ئاکامە گرنگەش ئەوەیـــە، کە پەیوەندی نێوان من و کەســـانی دیکە لەســـەر زانین دادەمەزرێت. کاتێک هوســـرڵ لە (تێڕامانە دێکارتییەکان) و (لۆجیکـــی فۆرمەلیستی و بەرز) هەوڵی ڕەتدانـــەوەی خۆگەرایەتی دەدات، لەوباوەڕەدایـــە ئاماژەکردن بۆ بوونی کەســـانی دیکە،مەرجێکی دانەبڕاوە بۆ پێکهێنانی جیهان. ئێمە لێرەدا بە درێژی

باســی بیردۆزەکەی ناکەین و بۆچوونەکەی بەگشتی ڕووندەکەینەوە. جیهان بەو جــۆرەی خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات، لای هوســرڵ، بووە بە (نێو—مۆنادی). بوونی کەســانی دیکــە لەنێو جیهانــدا تەنیا شتێکی هەندەکــی و کۆنکرێتی و ئەزمونگەری نییە، بەڵکو مەرجێکی پێویستیشــە بۆ یەکێتی و دەوڵەمەندبوونی جیهان. گرنگ نییە من ئەم مێزە، درەختە یان دیوارە ڕووتە بە تەنیا یان پێکەوە ببینم، کەســانی دیکە هەمیشــە، وەکو واتایەکی ئەو شتانەی دەیان بینم لێرەن. بەکورتییەکــەی، ئەو گەرەنتییەکی ڕاســتەقینەی دەرەکــی شتەکانە. مادامەکی دەروونمان لەنێو جیهاندایە و بەشێکە لە جیهان، لەگەڵ جیهانیشدا دەکەوێتە ژێر کەمکردنەوەی فینۆمینۆلۆجییانە، کەسانی دیکەش بۆ پێکهێنانی پێویستن. ئەگەر من گومان لە بوونی پیرۆی هاوڕێم یان کەســانی دیکە بکەم، پێویستە گومان لە بوونــی کۆنکرێتی و داکەوتی ئەزمونەکانم بکەم. من ڕەوایی بەخۆم نادەم: خۆی ئەزمونگەریم و خۆی ئەزمونگەری کەســانی دیکەش لە یەک کاتدا لەنێو جیهاندا بەرجەستە دەبن. واتای گشتی (کەسانی دیکە) بۆ پێکهێنانی هەریەکێک لە (خۆ) یــە تاکەکان پێویستە. بەمجۆرە، هەموو بابەتێــک، بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی (کانت)وە، کە گوایە بابەت لە پەیوەندییا بە خۆوە سەرهەڵدەدات، لەنێو ئەزمونی منــدا چەند لایەنییــە؛ لە بنەڕەتەوە دەردەکەوێت خاوەنی ســیستەمێک بێت بۆ ئــەو شتانەی لە جیهانی پان و بەرینی ئاگامەندییا ئاماژەی بۆ دەکات؛ لەســەر مێزەکە، دیوارەکەیە، کە کەســانی دیکــەش لەوێوە دەردەکەون، هەروەها لەگەڵ خۆدەرخستنی کۆنکرێتی (پیرۆ) و (پۆڵ)یشدایە. بەدڵنیاییەوە ئەم بۆچوونانە جۆرە تێپەڕبوونێک بەســەر هەڵوێستە کۆنەکاندا نیشاندەدەن. نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە شتە بە ئامێرکراوەکە لە یەکەم ساتی دۆزینەوەیەوە ئاماژە بۆ دەستەوتاقمێک لە بوون—بۆ—خۆ دەکات. ئێمە لە دواییدا بۆ سەر ئەم خاڵە دەگەڕێینەوە. ئاشکراشە واتای (کەســانی دیکە) لە ئەزمون یان بیرکردنــەوەی هۆشەکی و ئەنەلۆگییەوە ســەهەڵنادات؛ بەپێچەوانــەوە، لەبەرڕۆشنایی چەمکی کەســانی دیکەدا ئەزمون لێکدەدرێتەوە. ئایا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە چەمکی کەســانی دیکە شتێکی لەپێشــتر بێت؟ وەڵامی ئەم پرســیارە بۆ دوایی هەڵدەگرین. لەگەڵ ئەم لایەنە چاکانەشدا بیردۆزەکەی هوســرڵ لەوەناچێت لە بیردۆزەکەی کانت جیاوازتر بێت. لەبەر ئەوەی خۆی ئەزمونگەری من لە کەسانی دیکە دڵنیا نییە هوسرڵ بۆ خۆی بــەرز دەگەڕێتەوە، کە ڕادیکاڵانە لە (خۆ)وە جیاوازە و لەو خۆیەش دەچێت کانت باســیدەکات. ئەوەی پێویستە بیسەلمێنین ئەو خاڵەیە، کە تەریبی دانانی خۆیە ئەزمونگەرییەکان گومان لەلای کەسەکاندا دروستناکات، بەڵکو گومان لەگەڵ خۆیە بەرزەکاندا دێتە کایەوە. لەم بۆچوونەوە، ئەوەی بەرانبەرم کەسێکی ئەزمونگەری نێو ئەزمونی من نییە، بەڵکو خۆیەکی بەرزە و ئەو کەسەش بە سروشت هەیەتی.

لەڕاســـتیدا، کێشەکە لێرەدا دەبێت بە بەستنەوە یان دانانی پەیوەندی نێوان ئەم خۆیـــە بەرزانەی ئەو دیو ئەزمونەکان. ئەگەر کەســـێک بڵێت، خۆی بەرز ئاماژە بۆ بوونی کەســـانی دیکە بـــە هەمووگەرییەوە دەکات ئێمـــەش دەتوانین بڵێین، ئامـــاژە کردنەکە بۆ واتاکانیانە. لێرەدا، کەســـانی دیکە دەبێت بە کاتیگۆرییەکی تەواوکەر و ڕێگەش بە پێکهێنانی جیهان وەکو بوونێکی نا—ڕاست لەودیو جیهانەوە دەدات. بێگومان کاتیگۆری (کەســـانی دیکە) ئاماژە بۆ بوونی کەســـانی دیکە لە دەرەوەی خۆمانـــدا دەکات، بەڵکو ئەم ئاماژەکردەنە بۆی هەیە بوونێکی لەســـەر ئەگەر وەســـتاو بە کەســـانی دیکە بدات. بەهای بەستنی ناوەڕۆکی هەیە و لەنێو جیهانیشدا دەگونجێت. یاساکانیشـــی بەجیهانەوە پابەندە و کەسانی دیکەش بە ســـروشت لە دەرەوەی جیهاندان. لەسەرو ئەمەوە، هوسرڵ بوون بۆ زنجیرەیەکی ســـادەی کارکردنەکان دەگەڕێنێتەوە و تێگەیشتنی لە چەندبارەبوونەوەی بوونی کەســـانی دیکەی لەناوبردوە. لەوانەیە ڕێگەیەکی چاکتر بۆ پێوانی بوون بە زانین نەدۆزینەوە. لێرەدا، لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەڵێین زانین بەگشتی پێوانە بۆ بوون، بوونی کەســـانی دیکە بەو زانینە دەپێورێت کەســـانی دیکـــە لەبارەی خۆیانەوە هەیانە، نەک بەو زانینەی من لەبارەی ئەوانەوە هەمە. ئەوەی پێویستە من دەستم بکەوێت بوونی کەسانی دیکەیە، نەک بەوشێوەیەی من زانینم لەبارەیانەوە هەیە، بەڵکو بەوشێوەیەی ئەوان خۆیان دەناســـن. ئەمکارەش مەحاڵە چونکە پێویستی بە یەکبوونێکی ناوەکی من و کەســـانی دیکە هەیە. لێردا جیاوازییەک لەنێوان من و کەسانی دیکەدا پەیدادەبێت، کە لەسەر جیاوازی دەرەکی لەشمان ڕانەوەستاوە. بۆ ئەو ڕاســـتییە دەگەڕێتەوە، کە هەریەکێـــک لە ئێمە لە ناوەوەی خۆیدا دەژی. ئەو زانینەی لە ناوەوە دروستدەبێت تەنیا لە ناوەوە دەپێورێت و زانینی کەسانی دیکە، کە لەنێو خۆیاندا هەیانە ناگرێتەوە. هوســـرڵ لەم خاڵە تێگەیشتوە چونکە دەڵێت (کەســـانی دیکە) بەوشێوەیەی لە ئەزمونی کۆنکرێتی ئێمەدا دەردەکەوێت ئامادەنەبوونە.

بەڵام لە فەلسەفەی هوســـرڵدا چۆن ئەم ئامادەنەبوونە دەناســـرێت؟ کەسانی دیکـــە بابەتی تێڕامانـــی بێ ناوەڕۆکـــە و خۆیان بەدەســـتەوەنادەن و هەڵدێن. تەنیا ڕاســـتەقینەیەک لەبەردەممدا بمێنێتەوە تێڕامانەکەی منە؛ کەســـانی دیکە نیۆمایەکـــی بێ ناوەڕۆکن، کە من بەرەو خۆیان دەبەن و دەیانەوێت خۆیان لەنێو ئەزمونەکەمدا دەربخەن. ئـــەوان کردەوە دامەزرێنراوەکان و یەکێتی ئەزمونەکانی منن و دواجاریش دەبن بە چەمکێکی بەرز. هوسرڵ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم بۆچوونە خۆگەرایەتییـــە دەڵێت، دڵنیابوون لە بوونی کەســـانی دیکە، وەکو دڵنیابوونە لە بوونـــی جیهان. بوونی دەروونی و جەســـتەیی منیش دەخاتە نێو ئەم جیهانەوە. بیریارێکـــی خۆگەریش هەمـــان بۆچوونی هەیە؛ ئەو دڵنیایە، بـــەڵام لەوە زۆرتر

دڵنیا نییه. بوونی جیهان، به دیدی ئەو، لەســـەر ئەو زانینە ڕادەوەســـتێت، کە هەیەتی. ئەمە بۆ بوونی کەسانی دیکەش بە دروست دادەنێت. پێشتر وامدەزانی لەگەڵ ڕەتدانەوەی چەمکی خۆی بەرز لای هوســـرڵ لە دەست خۆگەرایەتی ڕزگار دەبـــم.[٥٣] ئەو کاتە لـــەو باوەڕەدابووم مادام هەموو بابەتێکـــم لەنێو ئاگامەندی دەرهێناوە، هیچ شتێک نامێنیتەوە، بەرانبەر بوونی کەســـانی دیکە ڕاوەستێت و خۆی بە سەروەر دابنێت. بەڵام هێشتا، هەرچەندە دەزانم، کە کێشەی خۆی بەرز نا پێویستە و ڕوخێنەرە، وازهێنان لەم چەمکە چارەسەری گرفتەکەمان بۆ بوونی کەسانی دیکە ناکات. ئەگەر لە دەرەوەی خۆی ئەزمونگەری بێجگە لە ئاگایی لەو خۆیەوە هیچی دیکە نەبێت، کە پانتاییەکی بەرزە بەبێ خۆ—ســـەلماندنی بوونی کەســـانی دیکەپێویستی بە پانتاییەکی بەرزە لەودیو جیهانەوە. لە ئاکامدا، تەنیا ڕێگەچارەیەک بۆ دەربازبوون لە خۆگەرایەتی ســـەلماندنی ئاگامەندی بەرزی منە، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەند باربوونەوەی ئاگامەندییەکانی دیکەی وەکو خۆم. هوسرڵ بوونی بۆ زنجیرەی واتاکان گەڕاندۆتەوە. لەڕێگەی زانینیشەوە پەیوەندی من و کەســـانی دیکەی باسکردوە. لەم ڕووەوە هوســـرل، وەکو کانت نەیتوانیوە چارەسەری خۆگەرایەتی بکات. ئەگەر لە جێگەی زنجیرەی سەرهەڵدانی کردەوەکان جۆرێـــک لە دیالێکتیکی ئەودیو کاتەوە دابنێین، دەبینین هیگڵ لە بەشی یەکەمی (فینۆمینۆلۆجی هۆش)دا پێشکەوتنی بەسەر هوسرڵدا وەدەست هێناوە. لێرەدا، دەرکەوتنی کەســـانی دیکە تەنیا بۆ پێکهێنانـــی جیهان و خۆی ئەزمونگەری من مەرجێکی پێویست نییە، بەڵکو خۆ—ئاگایی منیش دەگرێتەوە. خۆ ئاگایی من یان هاوکێشەی (من منم) لەسەر ئەو هۆکارە ڕادەوەستێت. لە سەرەتاوە، خۆ—ئاگایی ڕووتە و شتێکە، وەکو خۆی. لە بوونی خۆی دڵنیایە، بەڵام هیشتا ئەم دڵنیابوونەی هیچ ڕاســـتییەکی لەنێو خۆیدا هەڵنەگرتوە. ڕاستییەکەی لەوێدا دەردەکەوێت، کە بوونی خۆی بەســـەربەخۆ دابنێت. لەم سەرەتایەدا خۆ—ئاگایی پەیوەندی نێوان خـــۆ و بابەتی دەرەکی دەرناخات. بابەتەکەشی تاکو ئێستا[کە خۆیەتی] دەرەکی نییـــە و خۆیەتی. لە پێناوی وەدەســـتهێنانی چەمکەکـــە و ئاگابوونی لە خۆی، دەبێت خۆی لە دەرەوەی بوونی خۆیدا بکات بە بابەتی ئاگاییەکەی و بوونی خۆی بەرجەستەبکات. هەوڵبدات بوونی (من هەم) بکات بە بابەتێکی دەرەکی و پەرە بە خۆی بدات. ئەم هەوڵدانەش لەم قۆناخەدا جوڵێنەرە بۆ پەرەسەندنی ئاگامەندی؛ خۆ—ئاگاییـــە، کە لەلایەن خۆ— ئاگاییەکی دیکە دەناســـرێت و هەمانکات لەگەڵ خـــۆی و خۆ—ئاگاییەکەی دیکەدا هەمان ناســـنامەیان هەیە. ئـــەوەی دەکەوێتە

٥٣ سارتەر لەپێش نوسینی ئەم پەرتووکەدا پەرتووکێکی بە ناوی (بەرزێتی خۆ) لە ساڵی (١٩٣٤)، بڵاوکردۆتەوە تیایدا ڕەخنە لە چەمکی خۆی بەرز لای هوسرڵ دەگرێت و ڕەتی دەداتەوە. (وەرگێڕ)

نێوانیانەوە کەسانی دیکەیە. کەوابوو، ڕاستەقینەکە چەندبوونی ئاگامەندییەکانە. ئـــەم چەندبوونە بووە بە دوولایەنی و جیابوونەوەیـــان. لێرەدا، ئێمە ڕووبەڕووی ئـــەو ڕەتدانەوە ناوەکییە دەبینەوە، کە لەپێشـــتر دەمانویست بیسەلمێنین. هیچ نەبوونێکی دەرەکی ئاگامەندی من و کەســـانی دیکە جیاناکاتەوە. جیابوونەوەی نێوان من و کەســـانی دیکە لەســـەر فاکتۆری بوونی من ڕادەوەســـتێت. کەسانی دیکـــە ئەوەیە، کە بوونی من لە خۆیان جیادەکەنـــەوە و منیش ئەوان لە بوونی خۆم جیادەکەمەوە. ئاگامەندییەکان ڕاســـتەوخۆ پشـــتیوانی یەکتر دەکەن. ئەم بۆچوونە ڕێگەمان دەدات پێناســـی بوونی کەسانی دیکەش بکەین بەو شێوەیەی بۆ من خۆی دەردەخات: کەســـانی دیکە لە منەوە جیـــاوازە و بابەتێکە خاوەنی ڕەتدانەوە. هەروەها بابەتێکی خۆ—ئاگاشە. بۆ من ئەو بابەتەیە خۆی بە ژیانەوە خەریککردوە. منیش بەهەمانشـــێوە بۆ کەســـانی دیکە دەردەکـــەوم: بابەتێکی کۆنکرێتی، هەســـتەکی و ڕاســـتەوخۆم. بۆچوونی هیگڵ لەسەر هاودەنگی من و کەسانی دیکە ڕانەوەستاوە، بەڵکو وابەستە بەو پەیوەندییەوە، کە بە (خۆناسینی کەســـێک لەنێو کەســـێکی دیکەدا) ناوزەدیدەکـــات. لەڕاســـتیدا، لەبەر ئەوەی هەموو کەســـێک دژی ئـــەوی دیکەیە، ئەوا مرۆڤ بەتـــەواوی بوونێکە بۆ خۆی. لە کاتی دژوەســـتان بەرانبەر وی دی و بەرەنگاریکردن لەگەڵیدا تاکڕەوی مرۆڤ دەچەسپێنین. کەوابوو، کۆجیتۆ بە تەنیا نابێت بە سەرەتایەکی فەلسەفی چونکە لە ئاکامی ناســـینی بوونی خۆم، وەکو تاکە کەســـێک ســـەرهەڵدەدات. ناسینی بوونی خۆشم، وەکو تاکە کەس بە بوونی کەســـانی دیکەوە گرێدراوە. کێشـــەی بوونی کەسانی دیکە پەیوەندی بە کۆجیتۆوە نییە؛ بەپێچەوانەوە کۆجیتۆ لەسەر بوونی کەسانی دیکە ڕادەوەستێت. کەوابوو ئەو ساتەی هیگڵ ناویدەنێت بوون بۆ کەســـانی دیکە بۆ گەشەکردنی ئاگایی لە خۆ قۆناخێکی پێویستە؛ ئەو ڕێگایەی بەرەو ناخی خۆمان دەبات لە کەســـانی دیکەوە دەستپێدەکات. بەڵام من ئەوەندە بایەخ بە کەسانی دیکە دەدەم، کە لە منەوە جیاوازن و بابەتێکن بۆ من. هەروەها منیش بۆ ئەوان بەهەمانشێوە دەردەکەوم. منیش بۆ ئەوان دەبم بە بابەت. مادام من لەوێدا و لە ڕێگەی ئەوانەوە دەبم بە بابەت بۆ خۆم، پێویستە داوای بڕوانامە بۆ بوونم لە کەســـانی دیکە بکەم. ئەگەر ئاگامەندییەکی دیکە لەنێوان ئاگامەندی من و خۆیـــدا بیربکاتەوە بوون—بۆ—خۆی ئاگامەندی من، لە ئاکامیشـــدا هەموو بوونم، پێویستی بە کەســـانی دیکە دەبێت. من بەوشێوەیە هەم، کە بۆ کەسانی دیکە دەردەکەوم. لەســـەرو ئەمەشەوە، کەســـانی دیکە بەوشێوەیە هەن، کە بۆ من دەردەکەون و بوونیشـــم پێویستی بە ئەوانـــە؛ بەو شێوەیەی من دەردەکەوم بوونی من دەردەخات. گەشەکردنی ئاگاییم لە بوونی خۆم دەکەوێتە سەر ئەوەی کەســـانی دیکە بۆ من دەردەکەون. گرنگی بڕوا نامەکەی بوونم لەلایەن کەســـانی

دیکەوە لەسەر بڕوانامەی من بۆ بوونی ئەوان ڕادەوەستێت. کەسانی دیکە هەست بـــە بوونی من بـــەو شێوەی بە لەشەوە بەســـتراوە و دەژی دەکەن. من دەبم بە بوونێکی دیکە بۆ خۆم. بۆ ئەوەی بڕوانامەی بوونم لە کەســـانی دیکەش مسۆگەر بکەم، دەبێت ژیانم بخەمە نێو مەترسییەوە. بۆ ئەمەش دەبێت بیسەلمێنم، کە من بەژیانەوە نەبەســـتراوم. هەمانکات مردنی کەسانی دیکە دەخوازم. ئەمەش لەگەڵ کەوتنە نێو مەترسییەوە دژی کەسانی دیکە ڕوودەدات. کەسانی دیکەش، تەنانەت لەوســـاتەشدا، کە ناتوانێت خۆی بە ژیانەوە نەبەســـتێتەوە، دەیەوێت سەربەست بێـــت و بـــژی. لەبەر ئەوە خۆی لە بابەتە دەرەکییەکـــان دادابڕێت و بۆ من و بۆ خۆشی، وەکو شتێکی گرنگ و بنەڕەتی دەرناخات. ئەو دەبێت بە کۆیلە و منیش خاوەنکۆیلـــە؛ من بۆ ئەو دەبم بـــە بوونێکی گرنگ و بنەڕەتی. لێرەدا پەیوەندییە ناودارەکەی نێوان (کۆیلەو خاوەنکۆیلە) دروســـتدەبێت، کە کاریگەرێتییەکی قوڵی کردۆتە سەر بیرکردنەوەی مارکس.

ئێمە زۆر لەســـەر ئەم کێشەیە نادوێین. ئەوەندە بەسە دەریبخەین، کە کۆیلە بۆ خاوەنەکەی ڕاســـتییە. بەڵام بڕوانامەکە دوولایەنـــی نایەکسانی دامەزراندوە. ڕاستییەکە بۆ دڵنیابوونی خاوەن کۆیلە ئاگامەندییەکی بنەڕەتی پەیدای نەکردوە. کەوابوو، خاوەن کۆیلە لە ڕاســـتی بوونی خۆی دڵنیا نییە.[٥٤] بۆ وەدەستهێنانی دڵنیابوونەکەی خاوەن کۆیلە ئەوە بۆ کۆیلەدەکات، کە بۆ خۆی دەکات و ئەمەش دەبێتـــە هۆکاری ســـەرهەڵدانی جۆرێک لە خۆ-ئاگایـــی و لەلایەن خۆ-ئاگاییەکی دیکـــەوە بڕوای پێدەکرێت؛ ئەو خۆ-ئاگاییە لەگەڵ خـــۆی و ئەوی دیکەدا دەبێت بە یەک شت. لە بۆچوونەکەی هیگڵدا بوونی من لەســـەر بوونی کەســـانی دیکە ڕادەوەستێت. من تەتنا لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە دەبم بە بوون-بۆ-خۆ. کەسانی دیکـــە خۆیان دەهاونە ناخی بوونمەوە. تاکو گومان لە بوونی خۆم نەکەم ناتونم گومـــان لە بوونی ئەوانیش بکەم چونکە خۆ--ئاگایی داوای بڕوانامە لە کەســـانی دیکە دەکات. لەم ڕووەوە خۆگەرایەتی بە تەواوی لەناوچووە. توێژینەوەکەمان لە

٥٤ مەبەسی سارتەر ئەوەیە، کە خاوەن کۆیلە لە ئاکامی جەنگەکەیدا بۆ وەدەستهێنانی بڕوانامە بۆ سەروەرییەکەی توشی نائومێدی دەبێت. ئەم بۆچوونەش پەیوەندی بەو خاڵەوە هەیە، کە هیگڵیش جەختی لەسەر کردوە و گوایە خاوەن کۆیلە داوای بڕوانامە لە کەسێکی دیکەی وەکو خۆی دەکات. لە ئاکامی جەنگەکەشدا لە دیالیکتیکی کۆیلە و خاوەن کۆیلەدا، ئەو لایەنەی دەبێت بە خاوەن کۆیلە و سەروەر ناتوانێت بڕوانامەکە مسۆگەر بکات چونکە کەسەکەی دیکەی بە کۆیلە کردوە. ئەو لەلایەن کۆیلەکەوە بڕواناوی پێدراوە. کۆیلەش کەسێکە لە خەسڵەتی بە مرۆڤ بوون و ئاگامەندی نامۆکراوە و بەکەلوپەل کراوە. کۆیلە، وەکو بابەتە بەردەستییەکانی دیکە لە ژیانی خاوەن کۆیلەدا، دادەنرێت؛ بووە بە بابەت. لەبەر ئەمە دیالیکتیکی کۆیلە و خاوەن کۆیلە کۆتاییەکی ناکامی هەیە. من لە پەرتووکەکەمدا لەسەر فەلسەفەی هیگڵ ئەم خاڵەم بە درێژی باسکردوە. بڕوانە: محەمەد کەمال، فەلسەفەی هیگڵ، چاپی دووەم، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩. ل. (وەرگێڕ)

هوسرڵەوە بۆ هیگڵ پێشـــکەوتن دیاریدەکات: ئەو ڕەتدانەوەیەی بوونی کەسانی دیکـــە پێکدەهێنێت بووە بە ڕەتدانەوەیەکی ڕاســـتەوخۆ، ناوەکی و پەیوەندیدار. دووەمیش، جەخت لەسەر بوونی هەردوو ئاگامەندییەکە دەکات. دواجاریش، من لە بوونمدا پشـــت بە بوونی کەسانی دیکە دەبەستم و تەنیا بوونی خۆم بە لایەنێکی دژوەســـتاو بەرانبەر بوونی کەســـانی دیکە دانانێم. بوونی کەسانی دیکە دەبێت بـــە مەرجێکی پێویست بۆ بوونی من. ئایا ئێمـــە، لەگەڵ دەوڵەمەندی بیردۆزەی کۆیلە و خاوەن کۆیلە و ئەو چارەســـەرەی هیگڵ بۆ کێشەکەی دۆزیوەتەوە ڕازی دەبین؟

بەدڵنیاییەوە، هیگڵ پرسیاری لەمەڕ بوونی ئاگامەندی کردووە. توێژینەوەکەی جەخت لەسەر بوون—بۆ—خۆ و بوون—بۆ—کەسانی دیکە دەکات و لەو باوەڕەشدایە هەریەکێـــک لەم لایەنانە لایەنەکەی دیکەشی تێدایـــە. هەمانکات، ئەم توێژینەوە ئۆنتۆلۆجییە لەسەر زەمینەی زانین دامەزراوە. ناکۆکییەکە لەوێوە سەرهەڵدەدات، کە هەریەکێک لە دوولایەنەکە دەیەوێت دڵنیابوونەکەی بکات بە ڕاســـتی. منیش دەزانم ئەو ڕاســـتییە لەوێدا مسۆگەر دەکرێت، کە ئاگامەنییم بۆ کەســـانی دیکە دەبێت بە بابەت؛ ئاگامەندی کەســـانی دیکـــەش دەبێت بە بابەت بۆ من. لێرەدا، ئایدیالیزم دەپرسێت: (چۆن کەسانی دیکە دەبن بە بابەت بۆ من؟) هیگڵیش لەسەر زەمینـــەی ئایدیالیزم دەمێنێتەوە و لە وەڵامی ئەم پرســـیارەدا دەڵێت: ئەگەر لە ڕاستیدا (من) هەبم و کەسانی دیکەش بابەتی من بن، ئەوا لەبەر ئەوەیە، کە منیش بۆ کەسانی دیکە بابەتم. زانین، لەم حاڵەتەدا، دەبێت بە پێوەری بوون. هیگڵ بیر لە بوونی کەسانی دیکە بەبێ کەمکردنەوەیان بۆ بابەت ناکاتەوە. ئەو ئاگامەندییە هەمەکییـــەی لە کۆتایی پرۆســـە دیالیکتیکییەکەیدا دەیگاتێ دەبێت بە (من منم) ێکی ڕووت. هێشتا، هیگڵ دەنوسێت، (ئەم دەستەواژەیە سەبارەت ئاگامەندی بێ ناوەڕۆکە.) لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت، (پرۆســـەیەکی ڕووتکردنەوەی ڕەهایە و هەموو هەبووە ڕاســـتەوخۆکان تێپەڕدەکات و بەڕەتدانەوەیەکی ڕووت دەگات، کە لەگەڵ ئاگامەندییدا دەبێت بەیەک.) لەمەزۆرتر باســـی ئەو ناکۆکییە دیالیکتیکییە و خۆ—ئاگاییە هەمەکییەمان بۆ ناکات. بێجگە لە (من دەزانم کەسانی دیکە، وەکو خۆم من دەناســـن.) نییە. ئەمەش بۆ ئەو خاڵە دەگەڕێتەوە، کە لە ئایدیالیزمدا بوون و زانین یەک شتن. بەڵام ئەم یەکبوونە چی دەهێنێتە کایەوە؟

لە سەرەتاوە دەڵێم، ئەم فۆرمە هەمەکییەی (من منم)، کە خاوەنی ناسنامەیە هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەو ئاگامەندییە کۆنکرێتییەدا نییە لە پێشەکی ئەم نوسراوەدا باسمانکرد. لەوێدا ڕوونمانکردەوە، کە بوونی خۆ-ئاگایی لەسەر بناخەی زانین پێناس ناکرێت. زانین لە تێڕامانەوە دەستپێدەکات، بەڵام تێڕامانی تێڕامان پەیوەندی لەنێوان ئاگایی و بابەتەکەیدا دەرناخات. بوونی ئەویش ناکەوێتە ســـەر

ئاگایــی بەرز؛ بەڵکو ئەو شێوازێکە پرســیار لە بوونی خــۆی دەکات. لە بەشی یەکەمی کەرتی دووەمدا باســمکرد، کە پەیوەندی تێڕامان لەگەڵ خودی تێڕاماندا پەیوەندییەکی خۆیەتی نییە و بۆ (من منم)ی هیگڵیش ناگەڕێتەوە. تێڕامان خۆی ناکــات بە بابەتی خۆی؛ ئێمە لێــرەدا مامەڵە لەگەڵ بوونێکدا دەکەین، کە خۆی لە ناودەبات و بێهودەش دەیەوێت ببێت بەخۆی. ئەگەر ئەم بۆچوونە بۆ ناسینی ئاگامەنــدی تەنیا بۆچوون بێت، ئەوا بەو باوەڕەش دەگەین، کە هیگڵ نەیتوانیوە باسی دوولایەنی (من) لە خۆ-ئاگاییدا بکات. ئێمەش، لە ئاکامدا، خۆمان لە خۆی بەرزی ئاگامەندی ڕزگاردەکەین. پێویست ناکات لەســەربناخەی بوونی خۆیەکی بەرز پێناســی ئاگامەندی بکەین. بەکورتی، ئاگامەندی بوونێکی کۆنکرێتی هەیە و ڕووتکــراوە نییە. ئەو خۆیە نەک بناخە بۆ (ئیگۆ)یەکی بێ ســود. بوونیشــی دەکەوێتە بەر ڕۆشنایی تێڕامانی بەرزەوە و ڕاســتییەکەشی پێویستی بە کەسانی دیکە نییە؛ بەڵکو مادام بوونی ئاگامەندی پشت بە زانین نابەستێت پێش ڕاستی دەکەوێــت. لەم ڕوانگەیەوە، بەو شێوەیەی ڕیالیزمی ســادە بۆی دەچێت، بوون دەبێت بە پێوەری ڕاســتی؛ ڕاستی تێڕامان بە بوون دەپێورێت. ئاگامەندی پێش ناسینی لەوێدا بووە. کەوابوو، ئەگەر لەبەردەم کەسانی دیکەدا بوونی ئاگامەندی بسەلمێنیــن، هۆکارکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناســینەوەی بوونی نەک ئاماژەکردن بۆ ڕاســتییەکی ڕووتکراوە. لەڕاستیدا توشی هەڵە دەبین ئەگەر ناکۆکی نێوان کۆیلە و خــاوەن کۆیلە بۆ بڕوانامەیەکــی ڕووتکراوەی، وەکو (من نیــم) بگەڕێنینەوە. هەروەها جۆرە ناڕاســتییەک لەو ناکۆکییەدا هەیە چونکــە لە ئاکامدا بە ئاگایی هەمەکی، (تێڕامانی خۆ بۆ خودی خۆی) دەگات. لێرەدا، وەکو لە هەموو شوێنێکی دیکەدا کیرکیگارد دژی هیگڵ ڕادەوەســتێت و جەخت لەســەر بوونی تاکە کەس دەکات. تاک دەســتکەوتەکانی بە مایەی تاکەکەسی خۆی دەزانێت و سەلماندنی بوونی خــۆی دەخوازێت. بێگومان مافەکانم، کە لە کەســانی دیکەی داوادەکەم شێوازێکی خۆی هەمەکی دەردەخەن. بەڵام هێشتا بوونی تاکەکەسی و کۆنکرێتی منە، خۆی بەو شێوازە هەمەکییە دەگەیەنێت؛ من بۆ بوونم–لەوێدا داوای مافەکانم دەکەم. لەم ڕووەوە، ئەوەی هەندەکییە دەبێت بە بناخەی هەمەکی؛ واتای هەمەکی لە خزمەتگوزاری هەندەکییدایە.

ئــەم بەیەککردنەی بــوون و زانین کۆمەڵێــک هەڵە و ئاکامــی نەگونجاوی لەدوایە. من لێرەدا لەژێر دوو سەرباســدا ڕیزیان دەکەم؛ ڕەخنەگرتنمان لە هیگڵ ڕووناکبینییەکی دووســەرمان بۆ دیاریدەکات. لەلایەکــەوە دەردەکەوێت، هیگڵ توشــی هەڵەی ڕووناکبینی لە زانیندا بووە. بۆ ئەو ڕاســتی خۆ-ئاگایی لەســەر ڕیکەوتنی بابەتگەرانە دروست دەبێت؛ ئەمەش دەکەوێتە سەر بڕواکردنی کەسانی دیکــە بە بوونی من و بڕواکردنی منیش بە بوونی ئەوان. ئەم بڕوانامەیە دەکرێت

کتوپـــڕ و پەیوەندیداریش بێت: (من دەزانم کەســـانی دیکە، وەکو چۆن خۆیان دەناســـن، من دەناســـن.) ئەمەش لایەنی هەمەکی خۆ-ئاگایی دەردەخات. بەڵام لەڕاســـتیدا گرفتە کۆنکرێتییەکەی بوونی کەســـانی دیکە ڕێگەی گونجاندنی ئەم دەستەواژەیە دەگرێت. ئەگەر کەسانی دیکە بتوانن (من) بۆ بوونی خۆم بگەڕێننەوە ئەوا لە کۆتایی پرۆســـە دیالیکتیکیەکەدا پێویستە پێوەرێکی هاوبەش بۆ بوونی مـــن بۆ ئـــەو، هەروەها بوونی ئەو بۆ من؛ بوونی خـــۆم بۆ خۆم و بوونی ئەویش بۆ خۆی هەبێت. بێگومان ئەم هاوتەرازبوونە لە ســـەرەتاوە سەرهەڵنادات: هیگڵ لەسەر ئەم خاڵە هاوڕایە. پەیوەندی نێوان کۆیلەو خاوەنکۆیلە لەهەردوو لایەنەوە نییە. ئەم پەیوەندییە دوولایەنییە، وەکو هیگڵیش باسیدەکات، لەدواییدا دروست دەبێـــت. لێرەدا جۆرە ئاڵۆزییەک لەنێوان بـــوون، وەکو بابەت و ژیاندا دەهێنێتە پێش. بە دیدی ئەو، کەسانی دیکە بۆ من دەبن بە بابەت. ئێستا ئەو بابەتە منم بۆ کەســـانی دیکە. کاتێک هیگڵ قوڵتر پێناســـی ئەم بە بابەتبوونە دەکات، سێ لایەنی جیاواز دیاریدەکات: **یەکەم**، ئەو ساتەی خۆیەتییەکی ڕووت هەیە. **دووەم**، هەریەکێک لە دوو کەســـەکە، وەکو هەبوویەکی هەندەکی و تاک خۆی دەردەخات و بـــۆ بەرانبەرەکەی دەبێت بە بابەتێکی دەرەکی. **ســـێیەم**، هەریەکێک لە ئەوان بەتەواوی بوونێکە بۆ خۆی و تاکێکە بەرانبەر تاکێکی دیکە ڕاوەستاوە.

دەبینین خۆیەتی ڕووتکراوە بە زانینی کەســـانی دیکەوە بەســـتراوە. لە دوو حاڵەتی نێو هەمووی بونیادەکەدا دەدۆزرێتەوە. بەڵام لە تێهەڵکێشـــکردنەکەیاندا هیگڵ ئەو پرســـیارە ناکات چۆن ئەو ســـێ لایەنە یەکتر ڕەتدەدەنەوە و لایەنێک پێکدەهێنن، کە لەوانەیە نەتوانین شیبکەینەوە. ئەو لە پەرتووکی فینۆمینۆلۆجی هۆشدا بۆچوونەکەی دەخاتەڕوو، لەو باوەڕەدایە لە ســـەرەتاوە بوونی کەســـانی دیکە بنەڕەتیی نییە چونکە ئاگامەندی بە ژیانەوە خۆی ماندوو دەکات. بەڵام ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ پێکەوەژیانی ڕەوان دەکەین. ئەوەندەش بەســـە، کە من یان کەسێکی دیکە، ژیانی دەخاتە مەترسییەوە تاکو جیاوازی نێوان ئاگامەندی و ژیان دیاریبکات: (بەو شێوەیەی کەسانی دیکە بۆ ئاگامەندی ڕادەوەستن، ئاگامەندیش بۆ کەســـانی دیکە ڕادەوەســـتێت؛ هەموو ئاگامەندییەک بە هۆکاری چلاکییەکانی خـــۆی و چالاکییەکانی کەســـانی دیکەش خۆی تەواودەکات. ئـــەو ڕووتکردنەوە ڕەوانـــەی بوون بۆ خۆ... بۆ ئەوەی خۆ-ئاگاییەک، وەکو ڕەتدانەوەی ڕووت خۆی دەربخات دەبێت خۆی بە هیچ جۆرە بوونێکەوە نەبەستێتەوە... بە جۆریک خۆی دەرەخات، کە گوێ بە ژیان نادات.) بێگومان، هیگڵ دواتر دەڵێت، بە خۆفرێدانە نێو مەترســـی و مردنەوە خۆ-ئاگایی تێدەگات ژیانیش بنەڕەتییە. بەڵام ئەمە لە ڕوانگەیەکی دیکەوە بینراوە. هێشـــتا ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە، کە من دەتوانم

بوونی کەسانی دیکە یان خۆ-ئاگاییە ڕووتەکەی لە ژیان جیابکەمەوە. کۆیلە خۆ-ئاگایی خاوەنەکەی دەناسێت؛ ئەو ڕاستی خۆ ئاگاییەکەیە، بەڵام وەکو بینیمان ئەم ڕاستییە ڕەوا نییە.

ئایا ئەو کاتەی دەڵێین کەسانی دیکە، وەکو بابەت بۆ من دەردەکەون هەمان واتای ئەوەی هەیە، کە دەردەکەوێت خۆی بە بوونێکەوە بەستۆتەوە یان لەنێو ژیاندا نوقم بووە؟ ئەگەر لەسەر زەمینەی گریمانەیەکی لۆجیکمەندانەی ڕووت ڕاوەستین، ئەوا کەسانی دیکە وەکو ئاگامەندی لە شێوازی بابەتێکدا دەردەکەوێت بەبێ ئەوەی ئەو بابەتە خۆی بە بوونێکی ڕووداو یان لەشێکی زیندووەوە گریدابێت. لەڕاستیدا ئەزمونەکەمان تەنیا ئاگامەندی تاکە کەسێکی زیندو دەناسێت. لە ڕووی بیردۆزەشەوە پێویستە کەسانی دیکە بە بابەت دابنرێن. ئەو ئەوە، وەکو لەش خۆی دەرناخات؛ ئەگینا ئێمە توشی وەهمی شوێن دەبین، کە لەسەرەوە باسمانکرد. ئەوەی بۆ بوونی کەسانی دیکە گرنگە بابەتگەرییە نەک ژیان. لەسەرو ئەمەشەوە، هیگڵ ئەم سەلماندنە لۆجیکمەندانەیەی بە خاڵی دەرچوون داناوە.

ئەگەر ڕاست بێت، کە پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و ژیان سروشتی حاڵەتی ڕووتکراوەی خۆ-ئاگایی ناشێوێنێت، کە لەوێدا دەمێنێتەوە، دەتوێتەوە و دەدۆزێتەوە، ئایا ئەمە بۆ بابەتگەرێتیش دەگونجێت؟ بە واتایەکی دیکە، مادام دەزانین ئاگامەندی پێش ناسینی هەیە، ئایا ئەو ئاگامەندییە ناسراوە لەگەڵ ناسینەکەدا گۆڕانی بەسەردا نایەت؟ ئایا دەرکەوتن، وەکو بابەت لەبەردەم ئاگامەندییدا ئاگامەندی وەکو خۆی دەهێڵێتەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسانە: بوونی خۆ-ئاگایی بە جۆرێکە، کە بوونی خۆی لادەبێت بە پرسیار؛ واتە ناوەکییەکی ڕووتە و بەردەوام ئاماژە بۆ ناوەوەی خۆی دەکات. بوونی بەمشێوەیە پێناس دەکرێت: بوونێکە لە شیوازی بووندا، کە نییە و ئەو نەبوونەشە، کە هەیە. بوونی، کەوابوو، ڕادیکاڵانە بابەتگەریی لە خۆناگرێت. من ئەوەم، کە بۆ بوونم نابم بە بابەت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت من دەستەڵاتی خۆ جیاکردنەوەم نەبێت یان زانینم سنوردار بێت، بەڵکو لەبەر ئەو هۆکارەیە، کە بابەتگەرێتی پێویستی بە ڕەتدانەوەیەکی دیاریکراو هەیە: من خۆم دەکەم بەو بابەتەی، کە من نییە. هەمانکات من خۆم دەکەم بەوەی دەمەوێت. من لە هەموو شوێنێکدا دوای خۆم دەکەوم، ناتوانم لە خۆم ڕابکەم و خۆم لەپشتەوە دەناسمەوە. تەنانەت ئەگەر خۆشم بکەم بە بابەت من دەبم بە ناوەڕۆکی ئەو بابەتە و ئەو کەسەی لە ناوەوە تەماشای بابەتەکەش دەکات. هیگڵ لەوێدا، کە دەڵێت بوونی کەسانی دیکە بۆ بەبابەتکردنی بوونم پێویستە ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە کردووە. لەبەر ئەوەی بۆ ئەو خۆ-ئاگایی بە دەستەواژەی (من منم) دەردەبڕێ، نەیتوانیوە ئاکامی دەربڕینەکەی هەڵەنجێنێت. ئەو جۆرە

بابەتێکی لەنێو ئاگامەندییدا دەستیشـــان کردوە، کە بەبێ گۆڕان لەلایەن کەسانی دیکـــەوە بتوانێت خۆی بگۆڕێت. بەڵام بۆ ئەوەی ببم بەو بابەتەی، کە بە تەواوی من-نییە، ئەوا فاکتۆری بوون بەبابەت بۆ ئاگامەندی بەو شێوەیەی بۆ کەســـانی دیکـــە دەردەکەوێت، گۆڕانکاری بەســـەر ئاگامەندییدا دەهێنێت. من بە ئاســـانی دەتوانم بیر لە ئاگامەندی کەسێکی دیکە بکەمەوە. لەبەر ئەمە بەو شیوەیەی بۆ من دەردەکەوێت خۆی نیشان دەدات و دەبێت بەوەی بۆ من لەنێو کاتی جیهانیدا دەبێـــت بە دیاردە و لەنێو کاتـــی بوونی خۆیدا دەرناکەوێـــت. تەنیا ئاگامەندی منـــە لەنێو کاتی خۆیدا بۆ من خـــۆی دەردەخات. ئەمەش بە وازهێنان لە هەموو شتێکـــی دەرەکی دێتەکایەوە. بەکورتی، بوون-بۆ-خۆ، وەکو بوون-بۆ-خۆ لەلایەن کەســـێکی دیکەوە ناناســـرێت. ئەو بابەتەی ناوی کەســـێکی دیکەیە و لەبەردەم مندایە لـــە فۆرمێکی دیکەدا بۆ من دەرەکەوێت. بەو شێوەیەی کەســـێکی دیکە بـــۆ من دەردەکەوێت بوونێکی-بۆ-خۆ نییـــە؛ هەروەها منیش بەو شێوەیەی خۆم دەناســـم بۆ کەســـێکی دیکە دەرناکەوم. من ناتوانم بەو شێوەیە خۆم بناسم، کە کەســـێکی دیکە دەمناسێت. کەســـێکی دیکەش بەو شێوەیەی من دەیناسم خۆی ناناســـێت. کەوابوو، چۆن بتوانین چەمکێکی هەمەکی بۆ خۆ-ئاگایی دروستبکەین ئاگاماندی من بۆ بوونم و زانینم لە بارەی کەســـانی دیکەوە و بوونی خۆم لەنێو خۆیدا کۆبکاتەوە؟ هێشتا ئەمەش هەموو شتێک نییە.

بە دیدی هیگڵ، کەســـێکی دیکە بابەتە و منیش دەبم بە بابەت بۆ ئەو. بەڵام یەکێـــک لەمانە دەبێت بە ڕوخێنەری لایەنەکەی دیکە. بۆ ئەوەی من بتوانم خۆم وەکو بابەت بۆ کەسێکی دیکە دەربخەم، پێویستە کەسەکەی دیکە بە ئاگامەندی دابنێم؟ واتە لایەنێکی ناوەکی. بەڵام تاکو ئەو ڕادەیەی کەسەکە بابەتە لەبەردەم منـــدا بەبابەت بوونی من بۆ ئەو لای من ئاشکـــرا نابێت. بێگومان من لە ڕێگەی هەڵسوکەوت و ویستەکانەوە بـــە بابەت بوونی خۆمم لادەردەکەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کەسەکەش بابەتە، ئەوا کەسانی دیکە-وەکو-ئاوێنە بۆ من گەرددەگرێت و هیچ وێنەیەکم نیشانانادات. کردەوە و ویستەکانیش لەنێو جیهاندان و لەنێو کاتی جیهاندا دەدۆزرێنەوە؛ واتاکانیشیان بۆ من دەبن بە بابەت. لەبەر ئەمە من، وەکو خەســـڵەتێکی بەرز بۆ خۆم دەردەکەوم، کە ویست و کردەوەکانی کەسانی دیکە ئامـــاژەی بۆ دەکەن. هەروەها بابەت بوونی کەســـانی دیکە بابەت بوونی من بۆ ئەوان لەناودەبات. لەم حاڵەتەدا خۆم، وەکو (خۆ)یەکی ناوەکی دەناســـم، کە ئەو ویست و کردەوانە ڕووی تێدەکەن. ئەم تێگەیشتنەم لە بوونی خۆم پەیوەندی بە ئاگامەنـــدی ڕووتەوە نەک زانینەوە هەیە. من خۆ ئاگاییم و لە خۆمەوە دەردەچم و کەســـانی دیکـــە دەبینم پەنجە بۆ من ڕادەکێشـــن. لێـــرەدا ڕووناکبینی هیگڵ لەناودەچێـــت: هیچ پێوەرێکی هاوبەش لەنێوان کەســـەکەی دیکە، وەکو بابەت و

منیش، وەکو خۆ یان لەنێوان خۆ-ئاگایی و ئاگایی لە کەســەکەی دیکە نامێنێت. من خۆم لەلای کەســەکەی دیکە ناناســم، ئەگەر ئەو بۆ من بابەت بێت؛ بوونی ڕاســتەقینەی ئەویش، وەکو خۆ نادۆزمەوە. هیچ زانینێکی هەمەکی لە پەیوەندی نێوان ئاگامەندییەکان دەرنایەت. ئێمە ئەمە ناودەنێین دابڕانی ئۆنتۆلۆجییانە.

بــەڵام لای هیــگڵ گەشبینییەکی دیکەی گرنگ و بنەڕەتــی هەیە. دەشێ بە گەشبینی ئۆنتۆلۆجییانە دابنرێت. بۆ هیگڵ ڕاستی هەمووگەرییە. خۆی لە شوێنێکدا دادەنێت، کە ئەو ڕاســتییە یان (هەموو) بناســێت و لەوێــوە دەڕوانێتە گرفتی کەسانی دی. کەوابوو، کاتێک مۆنیزمی هیگڵی پەیوەندی ئاگامەندی ڕەچاودەکات، خۆی ناخاتە نێو هیچ ئاگامەندییەکی هەندەکی[تاکە کەســەوە]. لەوێدا، کە هیگڵ لەبــارەی هەموو ئاگامەندییەکەوە دەنوســێت، مادامەکــی ئاگامەندیش خاوەنی ناســنامەیە و خۆیەتی، ئەوا ئەوی دیکە نییە. ئەو خــۆی لەنێو هەمووەکەدا لە دەرەوەی ئاگامەندی ڕادەگرێت و بەچاوێکی ڕەهاییەوە تەماشایان دەکات. ئاگایی تاکەکەسەکان ســاتن لەنێو هەمووەکەدا، کە سەربەخۆ ناتوانن ڕاوەستن. لێرەدا گەشبینییەکی ئۆنتۆلۆجییانە بەرانبــەر گەشبینییەکی ئەپستمۆلۆجییانە هاتۆتە پێــش؛ پێویستە فرەلایەنی ڕەتبکەین و خۆمان بــە هەموو بگەیەنین. بەڵام ئەو خاڵەی هیگڵ لەبیری چووە باسیبکات ئاگامەندی خۆیەتی؛ ئەو خۆی بە هەمووەکە دادەنێت، دواجاریش ئەگەر بەم ئاسانییە چارەی گرفتی ئاگامەندی تاکەکەسەکان بکات لەبەر ئەوەیە، کە لە سەرەتاوە لە پەیوەندییەکەدا هیچ گرفتێکی نەبینیوە. لە ڕاســتیدا پرسیار لەبارەی پەیوەندی ئاگامەندی خۆی و کەسانی دیکە ناکات. لەگەڵ دابڕانی خۆیدا بە ئاســانی لە پەیوەندی نێوان ئاگامەندی کەســانی دیکە دەدوێــت، بۆ نموونە لە پەیوەندی نێــوان ئاگامەندییەکان دەکۆڵێتەوە، کە بوون بــە بابەت بۆ ئــەو، هەمانکات جۆرێکن لە بابەت، کــە دەتوانین بە خۆ و بابەت دایــان بنێین. ئەم ئاگامەندییانە، لە ڕوانگــەی هەمووگەرایەتییەکەوە، کە هیگڵ پەیڕەوی دەکات، هەرچەندە لە یەکدی پچڕاون و بە یەکێک لە خەســڵەتەکانیان جیادەکرێنەوە، یەکسانن. ئەگەر هیگڵ خۆی لەبیرچووبێت، ئێمە ئەو لەبیرناکەین. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشــێت، کە بۆ کۆجیتۆ دەگەڕێینەوە. لەڕاستیدا، ئەگەر، بەو جۆرەی لەپێشتر سەلماندنمان، بوونی ئاگامەندی من بۆ زانین کەم نەکرێتەوە، ئــەوا ناتوانم بوونی خۆم ڕەتکەم و بــە پەیوەندییەکی هەمەکی بگەم، کە تیایدا بوونی خۆم و کەسانی دیکە یەکسان و بەرانبەر دەبینم.

بەپێچەوانــەی ئەمەوە، من دەبێت لەنێو بوونی خۆمدا ڕاوەســتم و لە بوونی خۆمەوە بڕوانمە گرفتی بوونی کەســانی دیکە. خاڵی دەرچوون دەبێت بە لایەنی ناوەوەی کۆجیتۆ. مەبەســتیش لەم خاڵە ئەوەیە، کە هەریەکێک لە ئێمە دەبێت بتوانێــت لە ناخی خۆیەوە ڕوو لــە دەرەوە بکات و کەســانی دیکە بدۆزێتەوە.

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، کە چەندەکی ئاگامەندییەکان ڕەتناکرێت. من دەتوانم لە ناخی خۆمەوە دەرچم و بە هەموو بگەم. بەڵام مەحاڵە خۆم لەنێو هەمووەکەدا دامەزرێنم تاکو بیر لە بوونی خۆم و کەسانی دیکە بکەمەوە. هیچ گەشبینییەکی لۆجیکانە و ئەپستمۆلۆجییانە فرەجۆری ئاگامەندی تاکەکەسەکان ناشارێتەوە. ئەگەر هیگڵ لەو باوەڕەدابێت ئێمە دەتوانین ئەمکارە بکەین، لەبەر ئەوەیە، کە ئەو لە واتای ڕەهەندی هەندەکی خۆ-ئاگایی تێنەگەیشتوە. کاری ئۆنتۆلۆجی دامەزراندنی ئەو خاڵەیە نەک ڕەتکردنی. دەگونجێت، بەو شێوەیەی لە دواییدا باسیدەکەین، خۆگەرایەتی ڕەتبدەینەوە و بیسەلمێنین، کە بوونی کەسانی دیکە دیار و ئاشکرایە. لەگەڵ سەلماندنی بوونی کەسانی دیکەشدا و بەستنەوەی بە کۆجیتۆوە؛ بۆ نموونە بە بوونی منەوە هێشتا مەحاڵە ئەو بوونە ڕەتبکەین و بە مۆنادێکی گشتگر بگەین. مادامەکی ئاگامەندی هەیە جیابوونەوە و ناکۆکییەکەش بەردەوام دەمێنێتەوە.

ئەم ڕەخنەیە چ دەستکەوتێکی بۆ ئێمە هەیە؟ بە سادەیی ئەمەیە: ئەگەر خۆگەرایەتی ڕەتبدەینەوە، ئەوا پەیوەندییە بنەڕەتییەکەی من لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەبێت بە پەیوەندی بوون لەگەڵ بوونێکی دیکەدا، نەک زانین لەگەڵ زانیندا.

ئێمە سەرنەکەوتنی هوسرڵمان بینی، کە بوونی بە زانین دەپێوا و هەروەها هیگڵیش لەو خاڵەدا، کە بوون و زانینی بەیەک شت دانا. بەڵام ئەوەشمان ڕوونکردەوە، کە هەرچەندە هیگڵ پەنای بۆ ئایدیالیزمی ڕەها بردووە توانیویەتی گرفتەکە بخاتە سەر زەمینەیەکی دروست.

لە (بوون و کات)دا هایدیگەر سودی لەبیریارانی پێش خۆی وەرگرتوە و دوو خاڵی پێویست سەرنجتان ڕاکێشاوە: **یەکەم**، پەیوەندی نێوان ڕاستەقینە مرۆڤایەتییەکان دەبێت پەیوەندی بوون بێت. **دووەم**، ئەم پەیوەندییە ببێتە پشتبەستنی ڕاستەقینە مرۆڤایەتییەکان بەیەکدییەوە. بیردۆزەکەی بەلای کەمەوە توانیویەتی مامەڵە لەگەڵ ئەم دوو خاڵەدا بکات. لە هەڵوێستە شپرزەکەیدا و پچڕانی گرێکانی (گۆردیان) نەک بەستنەوەیان، وەڵامی ئەو پرسیارە سادەیەی سەبارەت پێناسەکردن داوەتەوە. ئەو هەندێک ساتی پێکەوە گرێدراوی دۆزیوەتەوە و بوون-لەنێو-جیهاندا، کە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییانەیە خەسڵەتدار دەکات. ئەم ساتانە ئەمانەن (جیهان)، (لەنێو) هەروەها (بوون)ە. ئەو جیهان، وەکو (ئەو شتەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی دەیناسێ)؛ لەنێو تێگەیشتن و بڕاوە دادەنێت. بەڵام هێشتا دەبێت لە واتای بوون تێبگەین؛ ئەو شێوازەیە، کە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی دەخاتە نێو جیهانەوە. بۆ هایدیگەر، بوون بوونە لەگەڵ کەسانی دیکەدا؛ بوونە-

لەگەڵ. کەوابوو، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی خەسڵەتی بوونی لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەیە. ئەمەش بە ڕێکەوت ڕوونادات، من لەپێشدا پەیدا نابم تاکو لە دواییدا لەگەڵ کەسانی دیکەدا بم. لێرەدا پرسیارکردنەکە لەبارەی بونیادی بوونی منەوەیە. بەڵام ئەم بونیادە لە دەرەوە دروستنەکراوە و پەیوەندی بە (هەموو)ەوە نییە بەو جۆرەی هیگڵ ئاماژەی بۆ کردوە. بە دڵنیاییشەوە، هایدیگەر لە کۆجیتۆوە دەستپێناکات و دێکارتییانە تەماشای ئاگامەندی ناکات. ئەو ڕاستەقینە مرۆڤایەتییەی باسیدەکات و دەیەوێت بونیادێکی بۆ دامەزرێنێت زادەی بیری ئەوە. ئەو دەنوسـێت، (دازاین منم.) من لەگەڵ تێگەیشـتنە پێش-ئۆنتۆلۆجییەکەم لە بوونی خۆم بوون لەگەڵ کەسـانی دیکەدا، وەکو خەسـڵەتێکی بنەڕەتی بوونم دەدۆزمـەوە. وەکو چۆن بوون-لەنێو-جیهانـدا دەبێت بە پێوەری ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتی، لە پەیوەندی بەرزێتیمـدا بوون لەگەڵ کەسـانی دیکەدا دەبێت بە پێکهاتـەی بوونم. لێرەوە، گرفتی کەسانی دیکە دەبێت بە ساختە. کەسێکی دیکە ئەوە نییە، کە من لەنێو جیهانـدا ڕووبـەڕووی دەبمەوە و نەتوانم خۆمی لێڕزگـار بکەم چونکە من پێش ڕووبەڕووبوونەوەکە هەبووم. کەسانی دیکە ئەو لایەنە سنوردارەیە، کە بوونی من پێکدەهێنێن. کەسانی دیکە بوونی من دەخەنە نێو تاقیکردنەوەوە؛ من فڕێدەدەنە دەرەوەی بوونی خۆم و لەنێو بونیادێکدا توندم دەکەن، کە دەبێت بە پێناسـەی بوونم و هاوکات من لێی ڕادەکەم. ئەم تاقیکردنەوەیەیە بوونی کەسـانی دیکە بۆ من دەردەخات.

با ئەو جۆرە پەیوەندییە گۆڕاوەش لەگەڵ کەسانی دیکەدا ببینن. لەگەڵ ڕیالیزم، ئایدیالیزم، هوسـرڵ و هیگڵدا پەیوەندی نێوان ئاگامەندییەکان (بوون-بۆ) بوون؛ کەسانی دیکە بەو شێوەیە دەرکەوتن یان تەنانەت بوونی منیشیان پێکدەهێنا، کە من بۆ ئەوان و ئەوانیش بوونیان بۆ من بوو. گرفتەکە لەسەر بڕواکردن بە یەکدی ڕاگیرا بـوو، بەتاییەتی لەو کاتەدا ئاگامەندییەکـان بەرانبەر یەکدی بەرەنگارانە ڕادەوەستان. بوون-لەگەڵ واتایەکی جیاوازتری هەیە. (لەگەڵ) ئاماژە بۆ پەیوەندی دژوەسـتان و بەرەنگاری ناکـات. بەڵکو واتای هاوکارییەکـی ئۆنتۆلۆجییانە بۆ دەست بەسـەراگرتنی جیهان دەبەخشێت. کەسـانی دیکە، وەکو بوونێک لەنێو کەلوپەلەکاندا خۆی دەرناخات. کەسێکی دیکە بابەت نییە. لە پەیوەندییەکەیدا بە منەوە هەمیشە، وەکو ڕاستەقینەیەکی مرۆڤانە دەمێنێتەوە. بوونی ئەو، کە بوونی من سنوردار دەکات، بوونە لەنێو جیهاندا. ئێمە دەزانین (لەنێو) واتای (جێنیشین) بوونـی هەیە. بوون لەنێـو جیهان واتە، وەکو دێوەزمە لەنێـو جیهاندا بیت. لە ڕێگەی بوون لەنێو جیهانی منیشەوە کەسانی دیکە بوونی من سنوردار دەکەن.

پەیوەندییەکەی نێوانمـان بەرەنگاری نییە، بەڵکو پشتبەسـتنە بە یەکدی. مادامەکی من جیهان، وەکو کەلوپەلی بەردەسـت بۆ گەیشـتن بە مەبەستەکانم

بەکار دەهێنم ئەوا بوونی خۆشم بەو بوونە سنوردار دەکەم، کە ئەویش جیهان بەو کەلوپەلە دادەنێت و بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی بەکاریان دەهێنێت. بون-لەگەڵ پەیوەندییەکی بەستراوی لەچالاکی بەدەر نییە. بۆ هایدیگەر، بوون ئەگەری خۆی هەیە؛ واتە هەموو کەسێک دەبێت خۆی دروستبکات. لەبەر ئەمە خۆ-دروستکردن شێوازێکی بوونە. ئەوەش دروستە بڵێین من بەرانبەر کەسانی دیکە لێپرسراوم چونکە من هەست بە بوونی ئەو دەکەم، گرنگیش نییە بوونێکی ڕەسەن یان ناڕەسەنم هەبێت. من لە تێگەیشتنم بۆ بوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا سەربەستم؛ بۆ نموونە بوونم لەگەڵ کەسانی دیکەدا بە (ئەوان) دادەنێم. ئەگەر پرسیارم لێبکەن چۆن بوونم لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەبێت بە بوون بۆ خۆم، لە وەڵامدا دەڵێم لە ڕێگەی جیهانەوە من دەبم بەوەی هەم. بەتایبەتی لەو حاڵەتەدا، کە من کەسێکی ناڕەسەنم و (ئەوان)م، جیهان، وەکو ڕاستەقینەیەکی نا-کەسانەی ئەگەرە ناڕەسەنەکان و کەلو پەل و ژیانی ڕۆژانە بۆ من، کە کەسێکم، وەکو (ئەوان)،خۆی دەردەخات. جل و بەرگی ئامادەکراو، وەسیلە گشتیەکانی هاتووچۆ، باخچەکان، شوێنە گشتییەکان، کە هەموو کەسێک سودیان لێوەردەگرێت بەکاردەهێنم. لە ڕێگەی بەکارهێنانی کەلوپەلەکانەوە خۆم دەکەم بە یەکێک لە ئەوان. بوونی ناڕەسەنم، تاکو ئەو کاتەی ڕەسەنیەتی خۆم نەدۆزیوەتەوە، بوونم لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەو جۆرە دەرناخات، کە لە کەسایەتییەکی تایبەتمەند لەگەڵ کەسایەتیەکی تایبەتمەندی دیکەدا هەیەتی. پەیوەندییەکە یەکسان و بەرانبەر نییە، کە تاکەکان تیایدا جێگیریان نەبێت، بەڵکو پەیوەندییەکە ئاڵۆگۆڕ تیایدا ئاسانە. من دژی بەرانبەرەکەم ڕاناوەستم لەبەرئەوەی لە پەیوەندییەکەدا من خۆم نیم؛ بەپێچەوانەوە ئێمە لەنێو (ئەوان)دا بووین بە یەک و یەکێتییەکی کۆمەڵایەتیمان هەیە. ڕاوەستان بەرانبەر کەسانی دیکە بۆ دۆزینەوەی (خۆ) بە ڕەسەن بوونی بوون دەست دەکەوێت. من دەبم بە بوونێکی ڕەسەن، ئەگەر ویژدانم بانگمکات و تەنانەت بڕیار لەسەر مردنیش بۆ مسۆگەرکردنی بوونە ڕەسەنەکەم دەدەم. لەم ساتەدا بوونی ڕەسەنم خۆی دەردەخات و بوونی کەسانی دیکەش لەم بوونە ڕەسەنەوە بەجۆرێکی دیکە دەبینم.

ئەو وێنە ئەندێشاوییەی نوێنەرایەتی پەیبردنی هایدیگەر دەکات بەرەنگاری نییە، بەڵکو پێکەوەبوونە. پەیوەندی بنەڕەتی کەسانی دیکە و ئاگامەندییم لە من و تۆدا نییە، هەموومانین. لای هایدیگەر بوون-لەگەڵ هەڵوێستێکی بەرانگاربوونەوە و خۆ جیاکردنەوەی تاکێک لەگەڵ تاکێکی دیکەدا نییە؛ هەروەها بە زانینیشەوە گرێنەدراوە. ژیانێکی بێ دەنگی تاکێکە لەنێو دەستەوتاقمەکەیدا، کە وەکو هاوتەراز بوونی سەوڵێدان و جوڵەی کەشتیەک وایە. لەم پێکەوەژیانەوە تێگەیشتنی کتوپڕ لە بوونم بەرەو مردن دەمخاتە نێو تەنیاییەوە.

لێرەدا ئەوەمان دەســـتکەوتووە، کە بە دواییدا گەڕاوین. ئەویش ئەو بوونەیە، کە بوونی کەســـانی دیکە لەنێو بوونیدا دەردەکەوێت. هێشتا بەم دەستکەوتەش ڕازی نین. **یەکەم**، بیردۆزەکەی هایدیگەر پێشنیاری دۆزینەوەی چارەسەرمان بۆ دەکات، بەڵام چارەســـەرەکەی نەداوە. ئەگەر ئێمە بێ کێشە چەمکەکەی (بوون-لەگــەڵ) وەرگرین و لە جێگەی (بوون-بۆ) دابنێیـــن دۆزینەوەی بناخەکەمان بۆ مسۆگەر ناکات.

بێگومان، ئێمە ڕووبەڕووی هەندێـک حاڵەتی ئەزموونی دەبینەوە، بەتایبەتی ئەو حاڵەتـــەی ئەڵمانییەکـــان بەچەمکـــی (Stimmung)ی بـــۆ دادەنێن و ئێمە ناتوانین بۆ ســـەر زمانەکەی خۆمانی بگۆڕین. ئەم چەمکە پەیوەندی پێکەوەژیان نـــەک بەرەنگاری نێـــوان ئاگامەندی تاکەکان دیاریدەکـــات. پێویستە واتای ئەم پێکەوەژیانـــە ڕوونبکەینەوە. بۆچی دەبێت بەبناخەیەکی تایبەت بۆ بوونی ئێمە؟ بۆچی پەیوەندییەکی بنەڕتی نێوان ئێمە و کەسانی دیکەیە؟ بۆچی هایدیگەر لەم حاڵەتە ئەزموونی و ئۆنتۆکییـــەوە بوون-لەگەڵ دەکات بە بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ لەنێو جیهاندا؟ ئەم پێکەوەژیانە چ شیوازێکی بوونی هەیە؟

ئایا ڕەتدانەوە، کەســـانی دیکە دەکات بە کەســـانی دیکـــە، وەکو شتێکی نا گرنگ دایدەنێت، دەهێڵینـــەوە؟ ئایا ئێمە بەرەو مۆنیزم ناڕۆین، ئەگەر بەتەواوی بیشـــارینەوە؟ ئەگەر بە بونیادێکی گرنگی نێوان من و کەسانی دیکەی دابنێین و لەناوی نەبەین، چ گۆڕانێکی بەســـەردا بهێنین تاکو خسڵەتی بەرەنگاربوونەوەی لێدابماڵیـــن؟ ئایا لێرەوە چۆن بە بوونی کەســـانی دیکـــە بگەین، بەو شێوەیەی لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە کەســـێک لەســـەر شەقامەکە دەبینم پیاسەدەکات؟ بەدڵنیاییەوە، ئارەزووی ئەوەدەکەم خۆم لە دەرەوەی بوونمدا ببینم و سەربەستانە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئەگەرەکانمەوە ڕاستی بناسم. بەڵام ئەم شێوازە توشی کێشەمان دەکات.

لەپێش هەموو شتێکەوە، تێڕوانینە ئۆنتۆلۆجییەکە لەگەڵ بۆچوونی ڕووتکراوەی کانت لەسەر (خۆ) تێهەڵکێش دەکرێت. ئەگەر بڵێین ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی (ئەگەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی منیش بێت) بوون-لەگەڵ و لە بونیادە ئۆنتۆلۆجییەکەشدا بە سروشت (بوون-لەگەڵ)ە، ئەوا ئەم [خەسڵەتە]دەبێت بە تەواناییەکی بنەڕەتی و هەمەکی. ئەگەر ئەمەش بسەلمێنرێت ئێمە ناتوانین حاڵەتێکی کۆنکرێتی بوون-لەگەڵ باســـبکەین. بە واتایەکی دیکە، پێکەوەژیـــان ئۆنتۆلۆجییانە، کە دەبێت بەبونیادی بوون لەنێـــو جیهاندا هەرگیز نابێت بە بناخەی پێکەوەژیانی ئۆنتۆکی بوون-لەگەڵ، وەکو هاوڕێیەتی مـــن لەگەڵ پیرۆ یان پەیوەندی خۆشەویستی من لەگەڵ (ئانی)دا. پێویستە باســـبکەین چۆن بوون-لەگەڵ-پیرۆ یان بوون-لەگەڵ-ئانی بونیادی پێکهاتنی بوونی منە. ئەمەش لەڕوانگەی بۆچوونەکەی هایدیگەرەوە

کارێکی مەحاڵە. بوونی کەسانی دیکە (لەگەڵ) ئەواندا لە ڕووە ئۆنتۆلۆجییەکەوە ناتوانێت حوکم بەســـەر حاڵەتێکی کۆنکرێتیدا بدات، بێجگەلەوەی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی لەبەرانگەرییەکەیدا دەستەڵاتی نییە ببێت بەکەسانی دیکە، بۆ نموونە ببێت بە پیـــرۆ یان ئانی، پەیوەندی (بوون-لەگەڵ) بە هیچ شێوەیەک ســـودمان پێناگەیەنێت و چارەســـەری ســـایکۆلۆجی و کێشەی بڕواکردن بە بوونی کەسانی دیکە ناکات. لێرەدا دوو نهۆمی نەناسراو لەگەڵ دوو گرفتدا دێنەپێش و پێویستە بە جیا چارەسەریان بکەین.

دەشـــێ بوترێت ئەمە لەو گرفتانـــەی هایدیگەر لە ڕەوتەکەیـــدا لە نهۆمێکی ئۆنتۆلۆجییانـــەوە بۆ نهۆمێکی ئۆنتۆکی یـــان دەرچوونی (بوون لەنێو جیهان)ەوە بەرەو پەیوەندییەکی تاکەکەسی و ئامێرەکان و بەرەو بوونی من لە ئاستی مردندا توشی بووە. مردنم یەکێکە لە ئەگەرەکان، کەڕوودەدات. مردنیشـــم (ئۆنتۆک)ییە، کـــە من لەبەرەو ڕووبوونەوەم لەگەڵ ئەم یان ئەو هەبووەدا بە ئەزمون دەناســـم. بـــەڵام ئەم گرفتە دادەپۆشرێـــت چونکە ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بوونی جیهان دەســـەلمێنێت، کە هەڕەشەی مردنی تیادا شاراوەتەوە. باشتریشە بڵێین، ئەگەر جیهـــان هەبێت، دەبێت بەو شێوەیەی برینێک کاتییە و ســـارێژ دەبێت، ئەمیش بڕاوە بێت. بەڵام کێشەی دەرچوون لەنهۆمێکەوە بۆ نهۆمێکی دیکە لەگەڵ بوونی کەسانی دیکەدا زەقتر دەبێت. ئێمە دەڵێین ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بە دەرچوون لە خودی خۆیەوە بەرەو دەرەوە بوونی جیهان دەسەلمینێت. هەمان دەرچوون نابێت بە هۆکار بۆ بوونی کەسانی دیکە. بێگومان من ئەو بوونەم، کە لە ڕێگەی منەوە بوون هەیە. ئایا دەتوانم بڵێم، من ئەو بوونەم، کە لە ڕێگەی منەوە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بوونی کەســـانی دیکە ســـەرهەڵدەدات؟ ئەگەر ئەمە وابێت ئەوا بوونی کەســـانی دیکە دەبێت بە ڕاســـتییەکی سادە. ئەو کاتەی دەڵێم، من ئەو بوونەم، کە لە ڕێگەیەوە بوونی ئەم ڕاستەقینە مرۆڤایەتییە، کە من لەگەڵیا لەنێو-خۆمدام و لەنێو جیهانیشـــدا لەگەڵ خۆمدام؛ بناخەیەکی سەربەســـتی جیهانە. ئایا ئەمە چۆن جیهانی من پێکدەهێنێت؟ ئێمە ناتوانین ناسنامە بۆ جیهان لە (بوون-لەگەڵ) ەوە دروستبکەین. ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی ئەگەرەکانی خۆیەتی. من جیهان بە بڕاوە دادەنێم، بەڵام ناتوانم ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بکەم بە شتێکی کۆنکریتی لە کاتێکدا خودی ڕاســـتەقینەکە خاوەنی ئەگەرەکانـــی خۆی بێت. بوونم لەگەڵ کەسانی دیکەدا لە ڕوانگەی بوونی خۆمەوە ناسراوە؛ پێویستییەکە لە بوونی مندا. بە هیچ شێوەیەک بوونی کەســـانی دیکە ناسەلمێنێت؛ تەنانەت پردێکیش لەنێوان من و کەسانی دیکەدا هەڵنابەستێت.

ئاشکراتر، پەیوەندی ئۆنتۆلۆجی من و کەســـانی دیکەی نەناسراو، کە هەموو پەیوەندییەکی دیاریکراوم بە کەسانی دیکەوە پێناسدەکات، ناتوانێت پەیوەندییەکی

هەندەکی نێوان من و پیرۆ ئاســـان بکات. بەپێچەوانەوە، لە ئەزمونەکاندا نابێتە هۆکاری ســـەرهەڵدانی هیچ پەیوندییەکی کۆنکریتی نێوان من و کەســـانی دیکە. ئەگەر پەیوەندییەکە لەپێشـــتر درابێت ئـــەوا ئەگەری هەموو پەیوەندییەکی من و کەســـانی دیکە لەناودەبات. پەیوەندی ئەزمونی و تاکەکەسی دەبێت بە لایەنێکی ئەو نـــەک حاڵەتێکی هەندەکی. لایەنی یاســـا لەنێو دووجـــۆر بارودۆخدا هەیە: ئەو یاســـایە لە ئەزمونەکانەوە وەرگیراوە و دروســـتکراوە، ئەمەش بەســـەر ئەم کێشـــەیەدا ساخنابێتەوە یان لەپێشتر دانراوە، وەکو چەمکەکان لای کانت دەبێت بـــە بناخە بۆ پەیداکردنی یەکێتی نێوان ئەزمونەکان. لەڕاســـتیدا، لەم حاڵەتەدا بوارەکانـــی بەگوێرەی ئەزمونەکان تەســـک دەبنەوە. من لەنێـــو شتەکاندا تەنیا بە دوای ئەو خەســـڵەتانەدا دەگەڕێم، کە لەبەر ڕۆشنایی ئەم یاســـا لەپێشترەدا دەتوانین بیناســـین. ئێستا بەســـتنەوەی دوو بوون لەنێو جیهاندا بە یەکدییەوە لەســـەر ئەزمونی من ڕاناوەســـتێت و لە چوارچێوەی بوون-لەگەڵدا دەردەچێت. مادامەکی یاســـا دەبێت بە پێکهاتەی بوونی هەموو فاکتۆرێکی ڕاستەقینەی دوور دەســـتەڵاتی خۆی دەخاتە پەراوێزەوە. لەپێشتر بوونی (کات) بۆ هەستکردنم، من لەو کاتە (نۆمینە)یە دادەبڕێت، کە خەســـڵەتی بوونی هەیـــە. کەوابوو، (بوون-لەگەڵ)ێکی ئۆنتۆلۆجییانە و لەپێشـــتر پەیوەندییە (ئۆنتیک)ەکانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی مەحـــاڵ دەکات. بوون-لەگەڵ، وەکو بونیـــادی ئۆنتۆلۆجی بوونم من دوورە پەرێز و تەنیا ڕادەگرێت.

هۆکاری ئەمەش لەوەدایە، کـــە بەرزێتی لای هایدیگەر چەمکێکە لەنێو بڕوای خراپدا: دەیەوێت ئایدیالیزم ڕەتبکات. لەم کارەشدا سەرکەوتوە چونکە ئایدیایزم جەخت لەســـەر ناوەوەی بوونی مرۆڤ دەکات و بە ئەندێشەوە گرێیدەدات. بەڵام ئـــەم ئایدیالیزمـــەی ڕەتکراوە زۆڵـــە ئایدیالیزمە و جۆرێکە لە ســـایکۆلۆجیزمی ئەزمونگەرانـــەی ڕەخنەگرانە. بێگومان بۆ هایدیگەر ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی (لە دەرەوەی خۆیـــدا دەژی) بـــەڵام ئـــەم دەرچوونە بووە بە پێناســـە بۆ (خۆ). لە دەرچوون[ڕێژەن] لای ئەفلاتونیەتی نوێ، کە بوون لە دەرەوەی خۆیدا نامۆدەبێت یان لەتێڕامانی ماڵبرانیش لەسەر بوونی خوا ناچێت. هایدیگەر خۆی لە ئایدیالیزم ڕزگارنەکردووە. دەرچوونی لە (خۆ)وە و دامەزراندنی بونیادێکی لەپێشتر بۆ بوون لەهەوڵدانەکەی کانت بۆ دامەزراندنی بارودۆخی لەپێشتر بۆ ئەزمونەکان دەچێت. ئەوەی (خـــۆ) لە دەرچوونەکەیدا و لە دەرەوە پێیدەگات (خۆ)یەتی. جیهانیش لە دوورەوە لەنێوان ئەم دوو (خۆ)یەدا دەبینرێت.

لە ئاکامدا، بێســـودە لە نێو (بوون و کات)دا بەدوای ڕەتدانەوەی ئایدیالیزم و ڕیالیزم بگەڕێین. هەوڵدانی هایدیگەر بۆ هێنانە دەرەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەنـــاوەوەی خۆیـــەوە توشی ئەو کێشـــەیەمان دەکات، کە لەگـــەڵ ئایدیالیزمدا

سـەرهەڵدەدات. دەردەکەوێـت هایدیگەر خـۆی لە دوورەپەرێزی پاراسـتوە و ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لە دەرەوەدا داناوە. هەندێک جار چوونەدەرەوەکەشی بە چوونەدەرەوە لە خۆوە بەرەوخۆ و یان لەنێو کەسانی دیکەدا داناوە.

بـەڵام دژوارە ئـەم دوو ڕاڤەکردنە هاوتەراز بکەین. ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتی لـە دەرچوونەکەشدا تەنیایە. لێرەدا چەند خاڵیکی نوێ لە تێگەیشـتنەکەمان لە هایدیگەر وەدەست دەهێنین: ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بە تەنیا دەمێنیتەوە چونکە بوونی کەسـانی دیکە هەڵکەوتە و ڕاستییەکیشە وازلێنەهێنراو. ئێمە ڕووبەڕووی کەسـانی دیکە دەبینەوە و لەپێکهێنانی بوونـی ئەواندا بەشداری ناکەین. ئەگەر ئەو ڕاسـتییە پێویستییەکـی ئۆنتۆلۆجییانەش بێت هێشـتا نابێت بە ئەگەری ئەزمونەکانمان. ئەگەر بوونی کەسـانی دیکە پێویستی بێت، ئەوا پێویستییەکی هەڵکەوتووە، وەکو ئەو فاکتۆرە پێویستانەیە بەسەر کۆجیتۆدا سەپێنراون. ئەگەر بوونی کەسـانی دیکە بە ئێمە درابێت، ئەوا ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی هەستکردن بەو بوونەوە دەناسـرێت و بەو شێوەیەی کۆجیتۆ هەمـوو فاکتۆرەکانی دەخاتە نێو بیرکردنەوەوە فاکتۆری بەرەنگاریش خۆی قووتدەکاتەوە.

ئـەم توێژینەوە درێژە بیهودە نییە، ئەگەر ئێمە بتوانین بارودۆخی پێویست بۆ بیردۆزەیەک لەسەر بوونی کەسانی دیکە دابمەزرێنین. یەکەم، بیردۆزەیەک بەمجۆرە بەڵگەمان بۆ سـەلماندنی بوونی کەسـانی دیکە ناداتێ و لەخۆگەرایەتیش چاکتر نابێـت. ڕەتدانەوەی خۆگەرایەتی مەحاڵە چونکە هیچ کەسـێک بەتەواوی خۆگەر نییە. بوونی کەسانی دیکە بەردەوام لەنێو گوماندایە، بەلای کەمەوە بە وشە ئەمە دەردەبڕێت. من دەتوانم بنوسـم (گومان لە بوونم دەکەم.) بەکورتییەکەی، بوونی کەسانی دیکە ئەگەر نییە. ئەگەرەکان پەیوەندییان بە بابەتەکانی نێو ئەزمونمانەوە هەیە، کە کاردەکەنە سـەر شتەکانی دیکە. ئەگەرەکان دەکەونە سەر سەلماندن و نەسـەلماندنی بوونیان. مادام کەسانی دیکە لە دەرەوەی ئەزمونی مندان، ئەگەری ئەو بوونە، وەکو (خۆ)یەکی دیکە نە دەسـەلمێنرێت نە بوونیشی ڕەتدەدرێتەوە و ناپێورێت. کەوابوو، بوونی ئەگەرایەتی خۆی وندەکات و دەبێت بە بیرۆکەیەکی نێو ئەندێشە. بەهەمانشێوە، میم لالاند دەڵێت، ڕاستی و ناڕاستی بیرۆکەی بوونی مرۆڤ لەسـەر مەریخ ناسەلمێنرێت چونکە هیچ بیردۆزەیەکی زانستیمان بەدەستەوە نییە ئەم گریمانەیەی پێتاقیبکەینەوە. ئەگەر کەسـانی دیکە ڕاسـتەوخۆ بۆ من ئامادە نەبـن، بوونی ئەوانیش وەکو بوونی من ئاشکرا نەبێت، هەموو بیرۆکەکانم لەبارەی ئەوانەوە بێ واتا دەردەکەون. ئەگەر هیچ بیرۆکەیەکم نەبێت ئەوا من دان بە بوونیدا دەنێم. بیردۆزە لەسەر بوونی کەسانی دیکە، دەبێت پرسیار لە من لەناو بوونی مندا بکات؛ پێویستە واتای ئەو سـەلماندنە ڕوونبکاتەوە و زەمینەی دڵنیایی بدۆزێتەوە. دێکارت نەیتوانیوە بوونی کەسانی دیکە بسەلمێنێت.

لەڕاســـتیدا، من هەمیشە زانیومە من هەم، هەرگیز وازم لە کۆجیتۆ نەهێناوە. هەروەها، خۆدوورخستنەوەم لە خۆگەرایەتی ئەوە دەگەیەنێت، کە من هەمیشـــە هەســـتم بە بوونی کەســـانی دیکە کردووە. ئەم هەستکردنە تێگەشتنێکی (پێش-ئۆنتۆلۆجییانە)یـــە، کە چاکتر لە هەموو بیردۆزەکان بوونی من و کەســـانی دیکە نیشـــاندەدات. ئەگەر بوونی کەسانی دیکە چەمکێکی بێ ناوەڕۆک و بیرۆکەیەکی ئەندێشـــەیی نەبێت لەبەرئەوەیە، کـــە کۆجیتۆیەک هەیە بایەخ بەو بوونە دەدات. ئێمەش پێویستە باســـی ئەم کۆجیتۆیە بکەین، خەســـڵەت و بوار و یاســـاکانی ڕوونبکەینەوە.

دووەم، لەلایەکی دیکەوە، سەرنەکەوتنی هیگڵ دەریدەخات، کە کۆجیتۆکەی دێکارت تەنیا ســـەرەتایە بۆ گەشتەکەمان. کۆجیتۆ بوونی ئێمە و کەسانی دیکە لەسەر فاکتۆرێکی پێویست ڕادەگرێت.

پاش وردبوونەوە و ســـەرنجدانێکی دیکە، کۆجیتۆ مـــن فڕێدەداتە دەرەوە و لەبەردەم کەســـانی دیکـــە دامدەنێت. بەوجۆرەیە، کە مـــن فڕێدەداتە نێو بوون-لەنێو-خۆوە. ئەمەش لە ڕێگەی ناســـینەوەی بونیادێکی لەپێشـــتر بۆ بوونم نییە تاکو ببێت بە بوونیاد بۆ بوونی کەســـانی دیکە. بەڵکو ، وەکو شتێکی کۆنکرێتی و هەندەکی و لەگومان بەدەر بە دەرخستنی بوونی کەســـانی دیکەیە. دەبێت داوا لە بوون-بۆ-خۆ بکەین بوون-بۆ-ئەوان بخاتە ڕوو. پێویستە لە ناخمدا ئەو ڕاستییە بناسم، کە کەسانی دیکە نەک تەنیا هەن بەڵکو ئەوانیش من نین.

ســـێیەم، نابێت کۆجیتۆ کەسانی دیکە، وەکو بابەت بۆ ئێمە دەربخات. بابەت بەوە دادەنرێت، کە گونجاوە. ئەگەر کەسانی دیکە بۆ من بابەت بن ئەوا دەبن بە شتێکی گونجاو. بەڵام گونجاندن لەسەر بیرۆکەکانی ئێمە بۆ شتە هەڵکەوتوەکانە. بوونی کەسانی دیکە بیرۆکە، ســـیستەمی بیرۆکەکان یان یەکێتییەکی پێویستی بیرۆکەکان نییە. لەبەر ئەمـــە نابن بە گونجاو یان بابەت. کەوابوو، ئەگەر بوونی کەسانی دیکە بوونێک بێت بۆ ئێمە ئەوا نە دەبێت بە پێکهاتەی زانینمان لەبارەی جیهانـــەوە نە زانیـــن لەبارەی خودی خۆمانەوە. بەڵکو بـــەو شتە دەردەکەوێت، کـــە ئـــارەزووی لە بوونمانە، نەک ئەو شتەی لەپێشـــتر لـــە پێکهێنانی بوونمان بەشـــداری دەکات چونکە بەشـــداری کردنەکەی (ئۆنتیـــک)ە و ئەزمونگەرانەیە و لەسەر بارودۆخەکان ڕادەوەستێت.

چوارەم، ئەگەر ئێمە پەیڕەوی دێکارت بکەین. بەو شێوەیەی باســـی (خوا)ی کردوە، ئێمەش لە بوونی کەسانی دیکە بدوێین و بیر لەو بەڵگەیە بکەینەوە، کە پەیوەندی بە تەواوکۆیی ئەو بوونەوە هەیە، ئەوا ناچاردەبین جۆرە ڕەتدانەوەیەک لـــە بوونی ئەواندا باســـنەکەین، کـــە بەڕەتدانـــەوەی دەرەکـــی ناوزەدمانکرد.

بەگوێرەی کۆجیتۆکەمان کەسانی دیکە من نین. ئەم ڕەتدانەوەیە بە دووجۆر لێکدەدرێتەوە:

ڕەتدانەوەیەکی ڕووت و دەرەکییە و بوونی کەسانی دیکە و من، وەکو دوو جەوهەر لەیەکدی جیادەکاتەوە. لەم حاڵەتەدا ئێمە ناتوانین لە بوونی کەسانی دیکە تێبگەین؛ یان ڕەتدانەوەکە ناوەکییە. ئەمەش تێهەڵکێشکردنی ناوەوەی هەردوو لایەنەکە دیاریدەکات. هەریەکێک لە لایەنەکان خۆی لەگەڵ ڕەتدانەوەی لایەنەکەی دیکە پێکدەهێنێت.

ئەم پەیوەندییە، کەوابوو، بەرانبەرەوەستان و ناوەکییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە زۆری ئەوان کەڵەکەکردن نییە و هەمووگەرایەتییە (لەم ڕووەوە هیگڵ دروست بۆ کێشەکە چووە). هەر تاکێک لەنێو تاکێکی دیکەدا خۆی دەبینێت. هەمانکات هەمووگەرایەتییەکە ڕێگە بە ئێمە نادات تێڕوانینێکی هەمووگەرانەمان هەبێت.

ئێمە باسمانکرد هیچ چەمکێکی ڕووتکراوەی ئاگامەندی لە ئاکامی بەراوردکردنی بوونم-بۆ-خۆم و بوونم وەکو بابەت بۆ کەسانی دیکە دروستنابێت. ئەم هەمووگەرایەتییە، وەکو بوون-بۆ-خۆ هەمووگەرایەتییەکی ناهەمووە چونکە بوون-بۆ-ئەوان ڕەتدانەوەیەکی ڕادیکاڵانەی بوونی ئەوانە، هەمووگەرایەتی لە بوونی ئەواندا کارێکی مەحاڵە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕونکردنانەوە ڕەخنە لە پرسیارکردن سەبارەت بوونی کەسانی دیکە دەگرین.

## دال . تەماشاکردن

ئەو ژنەی بەرەو ڕووی من دێت، ئەو پیاوەی لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە، دەنگی سواڵکەرەکەی ژێر پەنجەرەی ژوورەکە بۆ من بابەتن و گومانیان لێناکەم. کەوابوو، ڕاستە بڵێین یەکێک لە شێوەی بوونی کەسانی دیکە دەبێت بە بابەت. ئەوەشمان زانی، کە ئەگەر ئەم پەیوەندییەی بە بابەت بوونە لەنێوان من و کەسانی دیکەدا بنەڕەتی بێت، ئەوا بوونی کەسانی دیکە دبێت بە شتێکی درکپێکراو؛ هەروەها گونجاویش لەوێدا، کە دەزانم دەنگی پیاوەکە گۆرانییەک نییە لە گرامەفۆنێکەوە بێتە دەرێ. ئەو پیاوەی دەیبینم لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە ڕۆبۆت نییە و مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە. ئەم درککردنەم بوونی کەسانی دیکە وەکو ئامادەبوونی کەسەکان دەردەخات. ئەگەر کەسانی دیکە بابەتێکی گونجاو بێت نەک بابەتی نێو خەون، ئەوا بە بابەت بوونی ئەوان پێویستە ئاماژە بۆ تەنیاییەک لەودیو دەستەڵاتی منەوە نەکات؛ بەڵکو ئاماژە بۆ لایەنێکی کەسانی دیکە بکات، کە بەگوێرەی زانینەکەم لەبارەی ئەوانەوە خۆیان نیشان دەدەن. بیردۆزە کلاسیکییەکان لەوێدا دروست بۆ کێشەکە چوون، کە دەڵێن هەموو مرۆڤێکی هەستپێکراو ئاماژە بۆ شتێک دەکات و

ئەو شتەش دەبێت بە بناخەی گونجاندنەکە. نا دروستی بیردۆزەکان لەوێدایە، کە لـــەو باوەڕەدان لەودیو ئاماژەکردنەکەوە ئاگامەندییەکی جیاواز، وەکو نۆمینەکەی کانـــت ئەو شتە دەدۆزێتەوە. ئەم ئاگامەندییە هەبێت یان نەبێت ئەو دەموچاوەی مـــن دەیبینم ئاماژەی بۆ ناکات؛ دەموچاوەکە ئـــەو ئاگامەندییە نییە، کە دەبێت بە ڕاســـتی گونجاندنی بابەتە هەســـتپێکراوەکە. ئاماژەکردنەکە بۆ ئامادەبوونی کەســـانی دیکە، دوو شت پێکەوە ڕادەوەســـتێنێت ئەویش (پێکەوەبوونە لەگەڵ کەسانی دیکەدا). ئەمە لەو حاڵەتەشدا سەرهەڵدەدات ئەگەر بوونی کەسانی دیکە لەودیو زانینی منەوە بەتەواوی خۆی دەرنەخات و لە فۆرمێکدا بێت، کە نەتوانین باسی بکەین. واتە، کێشەی بوونی کەسانی دیکە بەگشتی و بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، کە پەیوەندییە بنەڕەتییەکەی کەسانی دیکە دیاریدەکات بوون بە بابەتکردنی کەسانی دیکەیە؛ کەسانی دیکە ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ هاتونەتە نێو هەستکردنمانەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی هەســـتکردن بە ســـروشت ئامادە بۆ شتێک لە دەرەوەی خۆیـــدا دەکات، زنجیرەی نەبڕاوەی یەکجۆر دیـــاردە و بابەتێکیش نادۆزێتەوە لە دەرەوەی دەستەڵاتی مندا دانرابێت، ئەوا ناوەڕۆکی هەستکردن لە ئامادەکردنی بۆ پەیوەندییەکەی نێوان من و کەسانی دیکەدایە. لەم پەیوەندییەدا بوونی کەسانی دیکە ڕاســـتەوخۆ بە من دراوە و بە پەیوەندیەکەی لەگەڵ مندا گرێدراوە. ئەمەش بوون-بۆ-ئەوانە و پەیوەندییەکی بنەڕەتییە. لەســـەرو ئەمەشەوە، ئاماژەکردنەکە ئەزمونێکی سۆفیگەرانە نیی. لەنێوان ژیانی ڕۆژانەدایە، کە کەسانی دیکەی تیادا بـــۆ ئێمە دەردەکەون. بوونی گونجاوی ئەوان لەنێو ژیانی ڕۆژانەی ئێمەدایە. ئەم کێشەیەش بەکورتییەکەی بەمجۆرەیە: لە ژیانی ڕۆژانەدا پەیوەندییەکی بنەڕەتیمان بە کەســـانی دیکەوە هەیە، کە دەتوانین بەردەوام پەنجەیان بۆ ڕاکێشـــین و لە دەرەوەی شتـــە نەزانراوە ئاییینیەکاندا دەدۆزرێنەوە. بۆ ئەوەی لەم خاڵە تێبگەین پرســـیاری زۆرتر لەبارەی دەرکەوتنی کەســـانی دیکە لەنێو هەســـتکردنەکانمدا دەکەم؛ مادام ئاماژەکردنەکە بە پەیوەندی بنەڕەتییەوە بەستراوە، ئەوا پێویستە پەیوەندییەکە بتوانێت ئەوەی دەمانەوێت بیناسین بۆ ئێمەی ئامادەبکات.

من لە باخی گشـــتیم. لە نزیک مـــن چیمەنێک و لە قەراخ چیمەنەکەش چەند کورســـییەک دانراون. پیاوێک بە لای کورســـییەکاندا تێدەپەڕێت. من ئەو پیاوە دەبینم؛ وەکو بابەتێک و هەمانکات دەیناســـم. ئایا ئەمە ئاماژە بۆ چی دەکات؟ گوتەکەم، ئەو بابەتە پیـــاوە، چ واتایەکی هەیە؟ ئەگەر ئەو بە بووکەشوشەیەک دابنێم، ئەوا پێویستە بەو کاتیگۆریانە باســـی بکەم، کە بۆ بابەتەکانی نێو شوێن و کـــات بەکاریان دەهێنم و دەڵێم نزیک کورســـییەکانە و دوو یارد و بیست ئینج

له چیمەنەکەوە دوورە و قورسایشی خستۆتە سەر زەوی و ...هتد. پەیوەندی بە بابەتەکانی دیکەوە زیادەیـــە؛ واتە دەتوانم لەوێدا لاییەرم بەبێ ئەوەی لابردنەکە کاربکاتە سەر شتەکانی دیکە و بیانگۆڕێت. پەیوەندییەکی نوێ لە ڕێگەی ئەوەوە لەنێـــو جیهاندا ڕوونادات. ناســـینی ئەویش، وەکو پیاو نـــەک بابەت، لەلایەکی دیکەوە، پەیوەندییە زیادەکە لەنێوان ئەو و کورســـییەکاندا ئاشکرا ناکات. هەموو شتەکان بەبێ دیاریکردنی دووری لەنێوانیاندا و لەنێو جیهانی مندا لە چواردەوری خۆی کۆدەکاتەوە. بەدڵنیاییەوە، دووری چیمەنەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام چیمەنەکە دەبێت بە شتێک بـــۆ ئەو. ئەمەش پەیوەندییەکە، دووری چیمەنەکە لـــە ئەوەوە، ڕەتدەکات و لەهەمانکاتدا دەشیهێڵێتەوە. ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ پەیوەندییەکدا دەکەین، کە دابەش ناکرێت، ڕاستەوخۆ دراوە، لە ناوەوەدایە و لە شوێنێکدایە، کە شوێنی من نییە.

لێرەدا لە جێگەی کۆکردنەوەی شتەکان لە چواردەوری خۆمدا شتێک دەدۆزمەوە، کە لەدەســـت من ڕادەکات. بێگومان ئـــەم پەیوەندییەی دابەش ناکرێت و دووری هەڵناگرێت ئەوە نییە من دەمەوێت. **یەکەم**، پەیوەندییەکە بە مرۆڤ و شتەکانەوە بەستراوە. لەسەرو ئەمەشەوە هێشتا بابەتی زانینە؛ دەتوانم باسیبکەم، بۆ نموونە، دەڵێم، ئەو پیاوە چیمەنەکە دەبینێت یان هەرچەندە نوسراوە بەسەر چیمەنەکەدا مەڕۆ ئەو خەریکە بچێتە ســـەرچیمەنەکە. دواجاریش، بە گونجاوی دەمێنێتەوە: یەکەم، لەوێدا، کە ئەو بابەتە دەشێ پیاو بێت، شتێکی گونجاوە. دووەم، لەسەرو ئەو ڕاســـتییەشەوە، کە پیاوە، بینینی چیمەنەکە لەلایەن ئەوەوە، لەو کاتەدا من تەماشای دەکـــەم، گونجاوە. لەوانەشە ئەو کاتـــەی دەڕوانێتە چیمەنەکە بیر لە شتێکی دیکە بکاتەوە؛ یان نابینا بێت.

لەگـــەڵ ئەمەشـــدا، ئەم پەیوەندییە نوێیەی کەســـەکە، وەکـــو بابەت لەگەڵ چیمەنەکەدا، خەســـڵەتێکی تایبەتی هەیە؛ ڕاســـتەوخۆ (هەموو)ی بە من دراوە. بابەتێکـــە من لـــەو جیهانەدا دەیناســـم. (لە ڕاســـتیدا پەیوەندییەکی دەرەکییە و لەوەدەچێـــت، کە دەریدەبـــڕم و دەڵێم؛ پیرۆ ڕوانییە کـــات ژمێرەکە، ژین لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی کرد...هتد). لەهەمانکاتیشـــدا لە من ڕادەکات. ئـــەو مرۆڤەی بووە بەبابـــەت و پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەگـــەڵ مندا هەیە و لە پەیوەندییەکەیدا ڕوو لە من دەکات، لەژێر دەستی من دەردەچێت. من ناتوانم خۆم لە ناوەڕاستی پەیوەندییەکەدا دابنێم. دووری نێوان بابەتەکانی نێو جیهانم وندەبن. من هەست بە ونبوونەکەیان ناکەم؛ بەڵکو لە نێو پەیوەندییەکەدا دەردەکەوێت و دەبێت بە بەستێنی شتەکان. بەستێنێک، کە لە من ڕادەکات و لە دەرەوەی بوونی شتەکانیشەوە بەســـەر شتەکاندا سەپێنراوە. لەم ڕووەوە لەناوچوونی بابەتەکانی ژیانم پەیوەندی بە سەرهەڵدانی کەسانی دیکە لەنێو جیهانەکەمدا هەیە.

کەســـانی دیکە هەڵهاتنی بەردەوامی شتەکانە بەرەو ئاکامێک، کە من دوور لە خـــۆم بە بابەتی دادەنێم. ئەو چەند لـــە دوورەوە خۆی کۆبکاتەوە ئەوەندەش لە دەســـت من ڕادەکات. لەناوچوونەکەش بەگوێرەی پلەکانی لە زیادبووندایە؛ ئەگەر پەیوەندی نێوان ئەو کەسە و چیمەنەکە دووری نەبێت و دووری دروستبکات، ئەوا پەیوەندییەکی پێویستیش لەنێوان کەســـەکە و پەیکەری ناوەڕاستی چیمەنەکە و درەختەکانی ئەملاوئەولای ڕێگاکەش سەرهەڵدەدات. شوێن لە هەموو لایەکەوە لە چوادەوری ئەو کەســـەدا کۆدەبێتەوە. ئـــەو شوێنە لەگەڵ شوێنی مندا پەیدابوە. جۆرە کۆبوونەوەیەک هەیە، کە منیش تیایدا بەشداری دەکەم و لە منیش ڕادەکات. کۆبوونەوەکە لێرەدا ناوەستێت. چیمەنەکەش ئەو گیا سەوزەیە خۆی بۆ کەسەکە دەردەخات و دەبێت بە بابەت بۆ ئەو. گیا سەوزەکە بەو شێوەیەی خۆی نیشانی ئەو دەدات لە دەســـت من ڕادەکات. من پەیوەندی کەســـەکە و گیاکە بە دەرەکی دەبینم، بەڵام ئەو سەوزاییەی کەسەکە هەستیپێدەکات من نایبینم. لێرەدا، کتوپڕ بابەتێـــک دێتە پێش، کە لـــە جیهانی من دزراوە. شتەکـــان وەکو خۆیانن و بۆ مـــن هەن، بـــەڵام بە نهێنی ڕادەکـــەن و دەبن بە بابەتێکی نـــوێ. دەرکەوتنی کەســـانی دیکە لەنێو جیهاندا جیهان بەرەو پەرشوبڵاوی دەبات. ئەو سەنتراڵیەتە لەناودەبات، کە من دامهێناوە.

هێشـــتا کەســـانی دیکە بۆ من بابەتن و پەیوەندییان بە دوورییەکانی منەوە هەیـــە: پیاوەکە لەوێیە، بیست هەنگاو لە منەوە دوورە، ئێستا پشـــتم تێدەکات. دوو یـــارد و بیست ئینچ لە چیمەنەکەوە و شـــەش یارد لە پەیکەرەکەوە دوورە. هەڵوەشاندنەوەی جیهانی من لەنێو ســـنورەکانی ئـــەو جیهانەدا ڕوودیداوە. ئێمە لێرەدا باســـی لەناوچوونـــی جیهان بەرەو نەمان ناکەیـــن. بەڵکو لەوەدەچێت لە ناوەڕاســـتی جیهاندا چاڵێکی گەورە بەرەو ڕۆخانەی ژێرەوە هەبێت و شتەکانیش بـــەردەوام دەکەونە ناوی. جیهان و چاڵەکە و بەرەو ڕۆخانەکەش بوون بە بابەت. هەموو ئەوانە، لای من هەرچەندە بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچن بەشن لە بونیادی جیهـــان. لەوانەیە ســـنوری هەڵوەشاندنەوەکە تەســـکتر ببێتـــەوە. بۆ نموونە، پیاوێـــک لەوێدا پیاســـەدەکات و دەخوێنێتەوە. ئەو پیـــاوە گوێچکەی هەیە، کە نابیستێت و چاویشی هەیە، کە تەنیا پەرتووکەکە دەبینێت. پەیوەندی ئەو لەگەڵ پەرتووکەکەیـــدا، وەکو پەیوەندی نێوان پیاوەکەی نێو چیمەنەکە و گیاکە نکۆڵی لێناکرێت و هیچ ناوەندێک نەکەوتۆتە نێوانیانەوە. بەڵام ئێستا بابەتێکی تەواو بۆ من خۆی دەردەخات. لە ناوەڕاستی جیهاندا بەو شێوەیەی (بەردێکی سارد) هەیە یان (بارانێکی چاک) دەبارێت، دەتوانم بڵێم، (پیاوەکەی دەخوێنێتەوە). هەموویەکی داخراوم لا ئاشکرا دەبێت، کە خوێندنەوە تیایدا دەبێت بە خەسڵەتێکی سەرەکی و لە ئاســـتی شتەکانی دیکەشدا ئەو کەسە کوێر و کەڕە. خەسڵەتی (پیاوەکەی

دەخوێنێتەوە) پەیوەندی نێوان ئەو کەســـە و پەرتووکەکە دەردەخات و درزێکی بچوکیش دەخاتە نێو جیهانی منەوە. لەنێو ئەو فۆرمە ڕەق و بینراوەدا ئەو خۆی دەکـــات بە بۆشاییەکی دیاریکراو. فۆرمەکە بـــە ڕواڵەت گەورەیە، بەڵام واتاکەی لەنێو جیهانی مندا بیست هەنگاو دوور لە منەوە لەنێو ئەو تەنەدا سەرهەڵدەدات و دەیەوێت ڕابکات.

هیچ لەوانە ئێمە بەو قۆناخە ناگەیەنن، کە کەســـانی دیکە تیایدا بابەت نەبن. ئەوپـــەڕی دەتوانیـــن ئەو بابەتە بە جیـــاواز و تایبەتمەند دابنێین، کە هوســـرڵ چەمکی (ئامادەنەنوونی) بۆ داناوە، بەبێ ئەوەی بزانێت ئامادە نەبوونی کەســـانی دیکـــە لەســـەر ئامادەنەبوونی ئاگامەندی لەنێو ئەو لەشـــەی من دەیبینم پێناس ناکرێت و پەیوەندی بە ئامادەنەبوونی ئەو جیهانەوە هەیە من هەســـتی پێدەکەم؛ ئامادەنەبوونێکـــە من لەنێو جیهاندا دەیدۆزمەوە. لەم حالەتەدا (کەســـانی دیکە) بابەتـــن لەنێـــو جیهانـــدا، بابەتێک، کە جیهان پێناســـەی بـــۆ دادەنێت. بەڵام پەیوەندییەکـــەی نێوان من و ئامادەنەبوون و ڕاکردنەکە شتێکی گونجاوە. ئەگەر ئەوە بێت پێناسەی بابەتبوونی کەسانی دیکەمان بۆ بکات ئەوا دەتوانین بپرسین چۆن ئاماژە بۆ ئامادەبوونی کەسانی دیکە دەکات؟ لێرەدا وەڵامی پرسیارەکە بەم جۆرەیە: ئەگەر پێناســـەکردنی کەسانی دیکە وەکو بابەت لەسەر بەستنەوەی بەو جیهانـــەوە بێت، کە من و ئەوان دەیبینین، ئەوا پەیوەندییە بنەڕەتییەکەم لەگەڵ کەســـانی دیکەدا، وەکو خۆ لەســـەر ئەو خاڵە ڕادەوەستێت، کە ئەوان تەواناییان هەیە من ببینن. لە ڕێگەی ئەو زانینەوە، کە من دەبم بە بابەت بۆ کەسانی دیکە ئامادەبوونـــی ئەوان، وەکو خۆ دەدۆزمەوە. بەو جۆرەی کەســـانی دیکە دەبن بە بابـــەت بۆ (خۆ)ی من، منیش دەبم بە بابەت بۆ (خـــۆ)ی ئەوان. ئەمەش لەوێوە هەڵنەقوڵاوە، کە جیهانی من بووە بە بابەتی بابەتبوونی ئەوان. من نابم بە بابەت بـــۆ بابەتێکی دیکە. وەرگێڕانی ڕادیکاڵانەی کەســـانی دیکە، ئەگەر بمانەوێت لە بابەتگەری ڕزگاییکەین، پێویستە. کەوابـــوو، ناتوانم تەماشاکردنەکەی ئەوان بۆ من بە ئەگەری خۆدەرخستنی بابەتێک دابنێم. هەروەها، کەســـەکە بە یەک چاو تەماشای من و چیمەنەکە ناکات. بە بابەتبوونی منیش بەشێک نییە لە بابەتبوونی جیهان. من ئەوەم جیهانی دەرخستوە. کەسێکم، کە نابم بە بات بۆ خۆی.

کەوابوو، ئەو پەیوەندییەی بە (کەســـێکی دیکـــە بینیویەتی) ناودەبەم لەگەڵ بوونی کەسانی دیکەدا، وەکو بابەت پەیدا نابێت و لەگەڵ بوونی منیش، وەکو خۆ نییە. بەپێچەوانەوە، ئەگەر بوونی کەســـانی دیکە، وەکو بابەت واتایەکی هەبێت ئەوە لە ئاکامـــی وەرگێڕانی ئەوان و هەڵبەســـتنی پەیوەندییەکی بنەڕەتییدایە. هەستکردنم بە بوونی ئەو کەسە لەنێو جیهاندا لەسەر ئەوە ڕادەوەستێت، کە ئەو من دەبینێت. ئەوەی لێرەدا ڕوویداوە جێگرتنی بابەتێکە من بەو خۆیە دەیبینم،

که من دەبینێت. ڕاستی (کەسێک تۆببینێت) لەسەر (تۆ کەسێک ببینیت) ڕاوەستاوە.

چەمکی کەسانی دیکە ئاماژە بۆ دوورەپەرێزی و تاکڕەوی شتێک لەودیو ئاگامەندییەوە ناکات، کە نەتوانم بیری لێبکەمەوە. بوونی ئەو کەسە لەپەیوەندییەکەیدا بەمن و جیهانەوە پێناس دەکرێت. ئەو کەسە بابەتێکە لەجیهاندا، کە بڕیار لەسەر ئالۆگۆڕە ناوەکییەکانی جیهان دەدات.

ئەو خوێن لێچونێکی ناوەوەیە. ئەو (خۆ)یە یە لە ئەزمونی بەرەو بابەتکردنی بوونی خۆم دەردەکەوێت.

بەڵام پەیوەندی بنەڕەتیم لەگەڵ کەسانی دیکەدا تەنیا ئامادەنەبوونی ڕاستی نییە؛ پەیوەندییەکی کۆنکریتی ژیانی ڕۆژانەشە. لە هەریەکێک لە ئەزمونەکانی ڕۆژانەمدا کەسانی دیکە تەماشای من دەکەن. بۆ ئێمە ئاسانە لەسەر ئەزمونە کۆنکریتییەکان باسی پەیوەندییەکە بکەین. ئەگەر کەسانی دیکە لە بنەڕەتەوە ئەوانە بن تەماشای من دەکەن، پێویستە بتوانین واتای تەماشاکردنەکە لێکبدەینەوە.

هەموو تەماشاکردنێک، کە بەرەوڕووی من دێت لەنێو هەستکردندا فۆرمێکی هەستەکییە، بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرێت، بە هیچ فۆرمێکی دیاریکراوەوە نەبەستراوە. هەڵبەتە ئەوەی تەماشاکردنەکە بەرجەستە دەکات دوو چاون، کە ڕوو لە من دەکەن. تەماشاکردنیش لەو حاڵەتانەدا ڕوودەدات کاتێک لقی درەختەکان دەلەرێنەوە، دەنگی پێ دێت، دەرگاکە دەکرێتەوە یان پەردەکە دەجوڵێت. لە کاتی هێرش بردندا ئەوان بەڕاکشاوی لەسەر سنگ دەجوڵێن خۆیان لە دوو چاو ناشارنەوە. ئەوان دەیانەوێت خۆیان لە خانوە سپییەکەی سەرگردەکە، کە بەرانبەریانە حەشاربدەن. دەگونجێت کەسێک خۆی لەنێو دارەکاندا شاردبێتەوە و بە دزییەوە تەماشام بکات. بەڵام ئەم گونجاندنە ئێمە ڕاناگرێت؛ من لەدواییدا باسی ئەم خاڵە دەکەم. ئەوەی گرنگە پێناسکردنی تەماشاکردنە. ئێستا ناودارەکان، خانوی سەرگردەکە تەماشاکردن نین؛ ئەوان تەنیا نوێنەرایەتی چاو دەکەن. لە یەکەم جاریشدا چاو، وەکو ئامێرێکی هەستکردن بۆ بینین نابینرێت، بەڵکو بە پشتگری تەماشاکردن دادەنرێت. چاوەکان ئاماژە بۆ چاوی ڕاستەقینەی ئەو کەسە ناکەن لە پشت پەردەکەوە یان لەودیو پەنجەرەی خانوەکەوە دانیشتوە. ئەوان چاون. هەمانکات، تەماشاکردنیش تەنیا خەسڵەت و فۆرمی گشتی بابەتەکە و پەیوەندییەکە نییە. هەستکردنی من بە تەماشاکردنەکە لەسەر ڕوخاندنی چاوەکانە، کە دەڕواننە من. ئەگەر هەست بە تەماشاکردنەکە بکەم چاوەکان نابینم؛ چاوەکان لەوێدا هەن، لەنێو هەستکردنمدا دەمێننەوە، بەڵام بەکاریان ناهێنم. ئەوان بوون بە دوو شتی بێ لایەن؛ لە دەرەوەی کایەکەدان و بەستنەوەیان پچڕاوە.

ئەمـــەش لـــەو کەمکردنەوە فینۆمینۆلۆجییە دەچێت هوسـرڵ باسـیکردوە.
ئـەو کاتەی چاوەکان تەماشای تۆ دەکەن، تۆ جوانـی و ناشرینییان نابینیت و باسـی ڕەنگەکانیان ناکەیت. تەماشاکردنەکە چاوەکان دەشارنەوە، ئەم بۆچوونە ئەندێشـاوییەش لەسەر ئەو فاکتۆرە ڕادەوەسـتێت، کە چاوەکان، وەکو بابەتی هەسـتکردنم لەنێو دوورییەکـەی نێوان من و ئەوانـدا دەمێننەوە (من لەبەردەم چاوەکانـدا بەبێ دووری ئامادەم، بەڵام چاوەکـان لەو شوێنەوە دوورن، کە منی تێدام.) تەماشاکردن دوورییەکە لەناودەبات و هەمانکات منیش لە شوێنی خۆمدا ڕادەگرێت. لێرەدا لێکچونێک لەنێوان تەماشاکردن و بابەتی ئەندێشـەدا هەیە، کە لە شوێنێکی دیکەدا باسـمکردوە. ئێمە ناتوانین لە یەک کاتدا هەسـت بە بوونی [بابەتێکـی دەرەکی] بکەین و لەنێو ئەندێشـەماندا بین. لـە یەک کاتدا یەکێک لەم کارانە هەڵدەسـوڕێنین. من دەمەوێت بڵێم: ئێمە ناتوانین هەسـت بە جیهان بکەیـن و هەمانکاتیش ئاگامان لـەو تەماشاکردنە بێت ڕووی لـە ئێمە کردوە. یەکێک لەم دووانـە لە یەک کاتدا ڕوودەدات چونکە هەسـتکردن تەماشاکردنە. ئاگاییش لە تەماشاکردن هەسـتکردن بە تەماشاکردن، وەکو بابەت لەنێو جیهاندا نییە (مەگەر تەماشاکردنەکە ڕووی لە ئێمە نەکردبێت)؛ بەڵکو ئاگاییە لەو بابەتەی تەماشاکراوە. ئەو تەماشایەی چاوەکان دەری دەبڕن، گرنگ نییە چ جۆرە چاوێک بن، ئاماژە بۆ بوونی دەکەن. ئەوەی ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ جوڵانی لقی درەختەکەدا هەستی پێدەکەم بوونی کەسێکی دیکە نییە؛ بەڵکو ئەوەیە کە بوونی من ناسکە و بە ئاسانی زیانی لێدەکەوێت؛ لەشم ئازاری پێدەگات؛ من لەشوێنێکدام، کە ناتوانم تیایدا بەرگری لە خۆم بکەم. بەکورتییەکەی، من بینراوم. کەوابوو، تەماشاکردن ئەو ناوەندەیە لە منەوە ئاماژە بۆ بوونی من دەکات. ئایا خەسڵەتی ئەم ناوەندە چییە؟ (من بینراوم) چ واتایەک دەبەخشێت؟

بـا بڵێین غیرە و حەزی خوتێهەڵقورتان و خراپی هانم دەدەن گوێ بە دەرگا داخراوەکەوە بنێم و لە کونی کلیلەکەشەوە تەماشای نێو ژوورەکە بکەم. من تەنیام و بیر لە بوونی خۆم ناکەمەوە. ئەمە ئەو واتایە دەبەخشـێت، کە (خۆ)م نەبووە بە بابەتـی ئاگامەندیم و کردەوەکانمی بۆ ناگەڕێنمـەوە. کردەوەکانم نەزانراون. مـن ئاگامەندییەکی ڕووتی شتەکانـم و لەنێو خولەی نێو (خۆ)دام و ئەگەرەکانم دەسەلمێنم. ئەو واتایەش دەبەخشێت، کە لەودیو دەرگاکەوە دیمەنێک هەیە دەبێ ببینرێـت و گفتوگۆیەکیش دەبێ ببیسترێت. دەرگاکـە و کونی کلیلەکە لە یەک کاتدا ئامێر و کۆسـپن بۆ من؛ دەبێت بە نیگەرانییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت؛ لە کونی کلیلەکەوە نزیک و کەم دەڕوانمە ئەو دیوەوە. لەم ساتەدا ئەوە دەکەم، کـە پێویستە بکرێت. هیچ تێڕوانینێکی بەرز کردەوەکەم ناسـەلمێنێت و حوکمی بەسـەردا نادات. ئاگامەندیم بە کردەوەکانمەوە دەنوسـێت و لێیان جیانابێتەوە.

تەنیا ئاکامەکەش حوکم بەســەر کردەوەکانمــدا دەدات. هەڵوێستم، بۆ نموونە، لایەنــی دەرەکی نییــە. هەڵوێستێکە پەیوەندییەکی ڕووتی بــە ئامێرەوە (کونی کلیلەکە) تاکو کۆتایی هەیە، وەکو مەرەکەبەکە لەسەر کاغەزی وشکردنەوەکە خۆ ونکردنــە لەنێو جیهاندا. ئاکامەکەش هەموو ئەم شتانە کۆدەکاتەوە و ڕێگرتنەکە دەســەلمێنێت. هیچ ڕێگرتنێک بەبێ گەیشــتن بە ئاکام و لــە دەرەوەی ئاکامدا نییە.

لەسەرولئەمەوە، کۆکردنەوەکە پەیوەندی بە پرۆژەی ئەگەرەکانی منەوە هەیە. غیرە ئەو ئەگەرەیە، کە منم و ئەو بەئامێربوونە ئاڵۆزە بەخۆ گەیاندن بەودیو خۆی، ڕێکدەخات. بەڵام من غیرەم و هەســتی پێناکەم. ئەگەر من لە جێگای غیرەکردن بیــر لە غیرە بکەمەوە، ئەوا بەئامێربوونــە ئاڵۆزەکەی جیهان فێرم دەکات. ئەم کۆکردنەوەیە لەنێو جیهاندا بە دوو لایەنەوە و خەسڵەتی گۆڕاوە (دیمەنێک لەودیو دەرگاکــەوە هەیە و دەمەوێت ببینم چونکە من غیــرە دەکەم، غیرەکردنەکەشم بێجگە لە لەو بۆچوونەی، کە دیمەنێک لەودیو دەرگاکەوە هەیە، دەبێ ببینرێت چی دیکە نییە)، بە هەڵوێست ناوزەدی دەکەین. ئەم هەڵوێستە ڕاستەوخۆ سەربەستی و لایەنی فاکتۆری بوونم دەردەخات. لەســەر ئەو بونیادە دەرەکییەی نێو جیهان لە چواردەری مندا سەربەســتییەکەم دەکات بەو کارانەی سەربەســتانە ئەنجام دەدرێن. لێرەدا هیچ ناچارییەک نییە چونکە سەربەســتییەکەم لەسەر ئەگەرەکانم دامەزراوە و جیهانیش خۆی گونجانــدوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم بەتەواوی خۆم بــەو بوونە دابنێم، کە لەنێو هەڵوێستیدایە؛ یەکــەم چونکە من ئەو ئاگامەندییە نیم ڕووی لە دەرەوە کردبێت. دووەمیش، من نەبوونی بوونی خۆمم. لەم ڕووەوە، لەبــەر ئەوەی من ئــەوەم، کە نیم و ئەوەش نیم، کە هەم تەنانەت ناتوانم خۆشم بەو بوونە دابنێم، کە گوێی بە دەرگاکەوە ناوە. لەمجۆرە پێناســەکردنە بۆ بوونم ڕادەکــەم. لەوێدا، وەکــو بینیمان بناخەی بروای خــراپ دەدۆزرێتەوە. کەوابوو، نەک بە تەنیا ناتوانم خۆم بناســم بەڵکو بوونیشم ڕادەکات هەرچەندە من هێشتا ڕاکردویەکــم لە بوونی خــۆم و نەبوونێکی ڕەهام. بێجگە لــە نەبوونێکی ڕووت مەبەستەکان گەمارۆدەدات هیچ لەوێدا نییە.

لەپڕێکا گوێم لە دەنگی پێی کەســێک لەنێو ڕاڕەوەکە دەبێت. کەســێک من دەبینێ! ئەمە چ واتایەکی هەیە؟ من کتوپڕ کارکراوەتە ســەر بوونم. ئەم گۆڕانە لەنێو بونیادەکــەدا دێتەکایەوە-گۆڕانەکانیش بە هۆکــاری تێڕامان لە کۆجیتۆدا دەناسرێت.

لەسەروهەموویانەوە، لێرەدا من بۆ ئاگامەندییەکی لە تێڕامان بەدەر هەم.

بەڵام ئەمە دەپچڕێ؛ من خۆم دەبینم چونکە کەسێک من دەبینێ. هێشتا ئەم دەربڕینە تەواو نییە، با بە وریاییەوە بڕوانینە کێشەکە.

چەنــد بوونـ بۆ-خــۆ تەنیا بێت، دەتوانیــن بڵێین، ئاگامەندییــە لە تێڕامان بەدەرەکەی (خــۆ)ی تێــدا جێنشــین نەبووە. (خۆ) وەکو بابــەت دەدرێت و بۆ ئاگامەندییەکــە تێڕامانی دەبێت. ئێستا ئاگامەنــدی لە تێڕامان بەدەر ئاگاییە لە جیهان.

کەوابوو، (خۆ) بۆ ئاگامەندی لە تێڕامان بەدەر بابەتێکە لەنێو جیهاندا. ئەمەش ئاگامەنــدی دەکات بە خاوەنی تێڕامان. ئــەو ئاگامەندییەی تێڕامانی هەیە (خۆ) دەکات بە بابەت. ئاگامەندییەکی لە تێڕامان بەدەر ڕاستەوخۆ کەسەکە ناناسێت. بــوون بە بابــەت بۆ ئاگامەندی، وەکو ئەوە وایە کەســێک تۆ ببینێت؛ واتە، من کتوپڕ خۆم بە ڕاکردوویی لە دەســت خۆم دەبینم، نەک لەو ڕووەوەی من بناخە نەبوونی خۆمم، بەڵکو بناخەکەم لە دەرەوەی بوونی خۆمدا دەدۆزمەوە.

مــن بوونێکم بۆ خۆم ئەگەر بوونم ئاماژە بۆ کەســانی دیکە بکات. پێویست ناکات ئەو ئاکامەش بسەپێنین، کە بابەتەکە کەســانی دیکەیە و (خۆ)ش لەنێو ئاگایــی منــدا بونیادی دووەمە. کەســانی دیکە، لێرەدا، بابــەت نین و نابن بە بابەتیش. ئەم خاڵەشمان لەپێشتر ڕوونکردۆتەوە. من ڕوو لە کەسانی دیکە، بەو جۆرەی ڕوو لە بابەتێک دەکەم، ناکەم. خوشم بە بابەت دانانێم. لەڕاستیدا (خۆ) ی مــن و بوونــم نەبوونێکی پڕنەکــراوە جیایاندەکاتەوە چونکــە من بە (هیچ) دایدەنێم و بۆ کەســانی دیکەش هەیە. من بەو جۆرە ڕووی تێناکەم تاکو ڕۆژێک دەســتم بکەوێت. بەپێچەوانەوە، ئەو بەردەوام لە من دوور دەکەوێتەوە و منیش نایگەمێ و نابم بە خاوەنی. بەهەرحاڵ، من هێشــتا ئەو (خۆ)یەم ڕەتی نادەمەوە، لەبەردەم مندا (خۆ)یەکە نایناســم. لەشەرمکــردن و شانازیکردن و نموونەکانی دیکــەدا دەیدۆزمەوە. شەرمکردن و شانازی تەماشاکردنی کەســانی دیکە بۆ من دەردەخەن و من لە کۆتایــی تەماشاکردنەکەدا دامدەنێن. ئەوان من دەهەژێنن و نایەڵن ئەو حاڵەتە تەماشالێکراوە بناسم. شەرمکردن، بەو شێوەیەی لە سەرەتای ئەم بەشەدا باســمکرد، شەرمکردنی (خۆ)یە. ناســینەوەی حاڵەتێکە من تیایدا لەلایــەن کەســێکی دیکەوە بینراوم و حوکم بەســەر بوونمــدا دراوە. من شەرم دەکەم چونکە سەربەستییەکەم دەدۆڕێنم و دەیکەم بە بابەت. کەوابوو، پەیوەندی نێوان ئاگامەندی لە تیڕامان بەدەرو (خۆ)ی من، کە بینراوە و بە زانین دروســت نەبووە لەســەر بوون دامەزراوە. لەودیو زانینەوە من ئەو (خۆ)یەم کەسێکی دیکە ناسیویەتی. هەروەها، من ئەو (خۆ)یەم لەنێو جیهانێکدا، کە کەسێکی دیکە نامۆی کردووم چونکە تەماشاکردنەکەی کەسەکەی دیکەش دیوارەکان، دەرگاکە و کونی کلیلەکــە کۆدەکاتەوە. هەموو ئەم ئامێرانەی من مامەڵەیان لەگەڵدادەکەم ڕوو لە ئــەو دەکەن. ئەویش ئەو دەموچاوەیە لە من ڕادەکات. من لەنێو جیهاندا (خۆ)مم بۆ ئەو. لەپێشــتر ئەم خوێن ڕشتنەی ناوەوەم بە بابەتکردنی جیهانم بۆ کەسانی

دیکە ناوزەدکرد. تەنانەت دڵۆپێک لەو خوێنە نافەوتێت و لەو بوونەدا دۆزرایەوە، کە من ناتوانم بچمە ناخییەوە. لێرەدا، ڕاکردنەکە بێ سـنورە. جیهان لەدەسـت جیهان و منیش لەدەست خۆم ڕادەکەم. تەماشاکردنی کەسەکە من لەودیو بوونی خۆمـەوە دادەنێت و لەناوەڕاسـتی جیهانێکدا ڕامدەگرێت، کـە ئەم جیهانەیە و جیهانێکیشـە لەودیوەوە. ئایا چ جـۆرە پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەم بوونەی خۆمدا هەیە، کە شەرمکردن بۆ منی دەردەخات؟

یەکەمجار، پەیوەندییە لەگەڵ بووندا. من ئەو بوونەم و ناتوانم نکۆڵی لێبکەم. شەرمکـردن دانپێدانانە بە بوونمدا. لە دواییدا دەکرێت لە ڕێگەی بڕوای خراپەوە شەرمکردنەکە بشـارمەوە. بڕوای خراپیش دانپێدانانـە چونکە لە بڕوای خراپدا من لەدەسـت خۆم ڕادەکەم. بـەڵام من ئەو بوونەم نەبـووە بە خاوەنی شتێک و نە شتێکیشـە هەبووبێت. بوونم خەسـڵەتی دیاریکـراوی هەڵنەگرتوە و هیچ شتێکی لەبارەوە پێشـبین ناکرێت. ئەمەش لە نەناسینی منەوە بۆ کەسانی دیکە سەرهەڵنادات. بەڵکو بە سەربەسـتی کەسانی دیکەوە بەسراوە. بوونی کەسانی دیکە بۆ من ئەگەر نییە و لەنێو سەربەسـتییەکەی منیشـدا نابێت بە پرسـیار. بەپێچەوانەوە، ئەو سەربەسـتییەکەی من سنوردار دەکات. ئەو پشتی شانۆکەیە چونکە باسـی ئەو شتانە دەکەین لەودیـو پەردەکەوە ڕوودەدەن. بۆ من شتێکی گرانە و بەبێ ئەوەی بزانم چییە بەسەر کۆڵما دراوە، تەنانەت نازانم گرانییەکەی چەندە. لە سـێبەرەکەم دەچێت؛ مامەڵە لەگەڵ بوونمـدا دەکات. بوونم دەبێت بەوەی کەسانی دیکە سەربەستانە دەینوسنەوە. هەموو ئەو شتانەی ڕوودەدەن وا خۆیان دەردەخەن نەبوونییەکی ڕادیکاڵانە لە منیان جیادەکاتەوە. ئەو نەبوونییەش سەربەسـتییەکەی کەسانی دیکەیە. کەسانی دیکە بوونی من دەکات بە بوون بۆ خۆی. هەریەکێک لە کردەوە سەربەسـتەکانم لەنێو دەوروبەرێکی نوێدا دامدەنێن؛ لە شوینێکـدا، کە بوونم بە سەربەسـتییە پێشـوەخت نەبینراوەکەی ئەوانەوە گیریخـواردووە. من یەکیتییەکی پتەوی ئاگامەندی دەسـەلمینم، ئەم یەکێتیەش هاودەنگـی مۆنادەکان نییە بۆ یەکێتی بوون دابنرێت چونکە من ڕازیم بەوە یان حەزدەکەم کەسانی دیکە ئەو بوونەم بناسن و بڕوای پێبکەن، کە خۆم دەمەوێت. شەرمکردن بوونی من بەو شتە نیشـاننادات، کە هەبووە یان دەیگاتێ و دەیکات بە بوون-لەنێو-خۆ. کاتێک من تەنیام بیر لە دانیشتنەکەی خۆم ناکەمەوە. ئەوەی لەبارەی خۆمەوە دەتوانم بڵێم ئەوەیە، کە من ئەوەم و ئەوەش نیم. تەماشاکردنی کەسـێک بەسە بۆ ئەوەی ببم بە ئەوەی هەم. بێگومان من هەمیشە بە ئاگاییەوە دەمێنمەوە، بەڵام لە چاوی کەسـەکەدا دەبم بەوەی دانیشـتوە. لێرەدا، جارێکی دیکە بوونە-بۆ-خۆ ڕاکردوەکە دەگیرێت و بوون-لەنێو-خۆ زۆر لە بوون-بۆ-خۆ نزیک دەبێتەوە. ئەم گۆڕانە لە دوورەوە دەخرێتەگەر. من، کە دانیشـتوم بۆ ئەو کەسە

لە شوشەی مەرەکەبی سەرمێزەکە دەچم. ئەو من دەبینێت چەماومەتەوە و چاوم بە کونی کلیلـــی دەرگاکەوە ناوە؛ لەو درەختە دەچم شنەی با شۆڕی دەکاتەوە. من بەرزێتی خۆم لە چاوی ئەودا دۆڕاندوە. ئەمەش بە لەناوبردنی بەرزێتییەکە بە هۆکاری سەپاندنی کاتیگۆرییەوە بەسەرمندا نییە، بەڵکو بوونی ئەو بەرزێتییەکەم لەناودەبات. ئەگەر کەسێک هەبێت، گرنگ نییە کێ و چیی بێت، چ پەیوەندییەکی لەگەڵ مندا هەبێت، چ کاریگەرییەکی بەسەرمنەوە هەبێت، لەگەڵ دەرکەوتنیدا من دەکەومە دەرەوەی بوونی خۆم؛ خۆرســـکێک بۆ من پەیدا دەبێت. یەکەم کەوتنی مـــن لەگەڵ دەرکەوتنی ئەودا ڕوودەدات. شەرم، وەکو شانازی، هەســـتکردنە بەو خۆرســـکە لە بوونمدا هەرچەندە خۆرســـک ناگرمە خۆم و لێی ڕادەکەم. ئەمەش لەوەدا نییە من سەربەستییەکەم بدۆڕێنم بۆ ئەوەی ببم بە (شت)، بەڵکو خۆرسکم لەوەدایە، کە من لە دەرەوە لەودیو ســـنووری سەربەستییەکەمدام، خەسڵەتێکی من هەیە لە-چاوی کەسەکەدا دەبینرێت.

من تەماشاکردنەکەی ئەو لە ناوەڕاستی ئەگەرە نامۆکان و چەقوەستاوەکانمدا دەدۆزمەوە. بە ترس یان دوودڵییەوە دەبینم ئەو ئەگەرانەی، کە بوونی منن و مەرجن بۆ بەرزێتییەکەم بە کەسێکی دیکە دراون. لەگەڵ تەماشاکردنی تەماشاکەرەکەدا بەرزێتییەکـــەی من دەبێت بە بەرزێتی ئەو. بێگومان، من لەنێو ئاگایی ناوەوەمدا و بـــێ بیرکردنەوە لە بوونم ئەگەرەکانم دەپارێزم. بـــەڵام تەماشاکردنەکە لە من نامۆیـــان دەکات. دوای ئەمە، مـــن ئەگەرەکان لەنێو جیهاندا لە شێوازی هێزەکی ئامێرەکاندا دەبینم؛ ســـوچە تاریکەکـــەی کۆتایی ڕاڕەوەکە دەبێت بە شوێنی خۆ شاردنەوە. ئەم خەسڵەتە دەرەکییە بەشێکە لەو ئاڵۆزییەی بە هەڵوێست دامانا. بە دەرکەوتنی کەسەکە ئاڵۆزییەکی جیاوازتر لە دەوروبەری شتەکان کۆدەکاتەوە و بەزۆر دەیسەپێنێت. هەستکردن بە بوونی، وەکو شتێکی بینراو هەستکردنە بە بوونم لەنێو جیهاندا و لە جیهانەوە. تەماشاکردنەکە من لەنێو جیهان دەرناهێنێت؛ ئـــەو لە ناخـــی هەڵوێستەکەمدا بە دوامدا دەگـــەڕێ و دەمدۆزێتەوە و پەیوەندیم بـــە ئامێرەکانەوە دیاریدەکات. ئەگەر من ببینرێم دانیشـــتوم ئـــەوا دەبینرێم لە سەرکورســـیەک دانیشتوم؛ یان بە چەماوەیی دەبینرێم خۆم چەمانۆتەوە و چاوم بە کونی کلیلەکەوە ناوە و هتد. کتوپڕ، نامۆبوونم، بە هۆکاری تەماشاکردنەکەوە ئەو جیهانەش نامۆدەکات، کە من دروستم کردووە. دەمبینن من لەسەر کورسیەکە دانیشـــتوم، کـــە من نەمدەبینی و بۆ من مەحاڵ بـــوو ببینم. کەوابوو، من، وەکو ئەگەرەکانـــی بوونـــی خۆم، ئەوەنیم، کە هەم. من کەســـێکم، کە هەم و ئەوەشم لەنێـــو جیهاندا بەردەوام لەدەســـت خۆم ڕادەکەم. لەبەر ئەمـــە پەیوەندییەکەم لەگـــەڵ بابەتەکان یان لایەنی هێزەکی بابەتەکان لەگەڵ تەماشاکردنی کەســـێکی دیکەدا لەناودەچێت و لەگەڵ ئەگەرەکانی ئەودا تێکەڵ دەبێت. بۆ نموونە دەشێ

سوچە تاریکەکەی نێو ڕاڕەوەکە من بۆ خۆشاردنەوە بیریلێدەکەمەوە بکەوێتە بەر ڕۆشنایی چراکەی دەستی ئەو. ئەم ئەگەرە لەوێدا هەیە. من بەبێ ئەوەی ڕووبدات بیریلێدەکەمەوە؛ دوودڵییەکەم دەمگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە خۆشاردنەوە لەوێدا دەمخاتە مەترسییەوە.

ئەگەرەکانم لەبەردەم ئاگامەندی لە تێڕامان بەدەری مندان، تاکو ئەو ڕادەیەی کەســەکە تەماشام دەکات. ئەگەر ببینم دەیەوێ شتێک بکات؛ دەســتی دەخاتە گیرفانی بۆ ئەوەی چەکێک دەربهێنێت، پەنجە بۆ زەنگەکە دەبات تا پۆلیس ئاگادار بکاتــەوە. ئەوا ئەگەرەکانم لە دەرەوەی بوونی خۆمدا و لە ڕێگەی بوونی ئەوەوە دەناســمەوە. هەمانکات بوونی من ئەو ئەگەرانەیە و بەو جۆرەی بیرۆکەکانمان بە ڕێگــەی زمانەوە دەردەبڕین و دەریان دەهێنین، ئەمانیش لە دەرەوەدا دەبینرێن. هەوڵدانم بــۆ خۆدەربازکردن، دەرچوون لەژێر کاریگەرێتی تەماشاکردنکەی ئەودا یان خۆ ڕزگارکردن لەو چەکەی لولەکەی کراوەتە من سەرهەڵدەدات. کەسەکەش لە هەوڵدانەکەم ئاگادارە و دەیەوێت ڕایگرێت. من دەرچوونە ڕاستەقینەکە نابینم، تەنیــا دەمەوێت خۆم لە نەمانی ئەگەرەکەم ڕزگــار بکەم. ئەگەری خۆشاردنەوە تاکــو ئەم کاتەش لەناو نەچووە؛ تاکو ئەو کاتەی من ئەو ئەگەرەم ئەویش هەیە و ســوچە تاریکەکە وننابێت و پەنجەم بۆ ڕادەکێشــێ. ئەگەر پیناسکردنی ئامێر لەوەدابێــت، کە دەتوانیــن تێپەڕی بکەین ئەوا ئەگەرەکــەم ئامێرگەری بەخۆوە دەگرێت. ئەگەری خۆشاردنەوەکەم لە ســوچە تاریکەکــەدا دەبێت بەو ئامێرەی کەســەکە بتوانێــت تێپەڕی بکات و من بدۆزێتەوە. ئەگەری من کەســێکی دیکە وەکــو هەموو ئامێرەکان، ڕێگــر و ناوەندن. ڕێگرە، چونکــە ناچاریدەکات بڕیار لەســەر کردەوەی جیاواز بدات (بەرەو ڕووی من بێت و چراکە هەڵکات). هەروەها ناوەندیشە چونکە ئەو کاتەی من دەبینێ چاوم بە کونی کلیلەکەوە ناوە دەمگرێت. هەرشتێــک دژی ئــەو بکەم ئەو شتە دەبێــت بە ئامێرێــک و دژی من بەکاری دەهێنێــت. من بە تەواویــش نازانم ئەو چۆن کردەوەکەم دەبینێت و دەترســم. کەســانی دیکە مەرگی نادیاری ئەگەرەکانی منن. تاکو منیش لە ژیاندابم مەرگی ئەگەرەکان بەشاراوەیی لەنێو جیهاندا دەمینێتەوە. پەیوەندی نێوان ئەگەرەکانم و ئامێر لە پەیوەندی نێوان ئامێرەکان دەچێت، کە لە دەرەوە بۆ مەبەستی گەیشتن بە کۆتاییەک ڕێکخراون و لە من ڕادەکەن. خۆشاردنەوەی من و ســوچە تاریکەکە پێش ئەوەی من پەنای بۆ بەرم بوونی کەسەکە و چراکەی دەستی تێپەڕیدەکات. ئەو ڕاچڵەکاندنەی لەگەڵ تەماشاکردنی کەسەکە توشیدەبم لە هەموو ئەگەرەکانم نامۆم دەکات. ئەوان دەبن بە بابەتەکانی

نێو جیهان و دوور لە منەوە ڕادەوەستن. لێرەدا بە دوو ئاکامی گرنگ دەگەین، یەکەم، ئەگەرەکانم لە دەرەوەی بوونی مندا ڕادەوەســتن. کەسێکی دیکە هەستی

پێکردوە و سەربەســتییەک لەناوی بردوون، کە کەســەکە سەرباســتییەکە نییە چونکە خۆی کردووە بە گەواهی ئەوان و لێیان دەکۆڵێتەوە. دواییش، ئەو کاتەی ڕاســتەوخۆ لەبەردەم کەسەکەداین و بە زمان پەیوەندی لەگەڵدا دروستدەکەین و تێدەگەین چۆن بیر لە بوونی ئێمە دەکاتەوە و ســەرنجمان ڕادەکێشێ و ترسیش دەخاتە دڵمانەوە.

"سوێند دەخۆم ئەو کارە دەکەم."

"تۆ وادەڵێیت. حەزدەکەم باوەڕت پێبکەم. دەشێ تۆ ئەو کارە بکەیت."

ئەم دایەلۆگە دەریدەخات کەســێکی دیکە لەبەردەم سەربەســتییەکەی مندا، وەکو ڕاوەســتان لەبەردەم شێکی نادیاردا و ئەگەرەکانمدا ڕاوەســتاوە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە من بوونی خۆم لەوێدا لەبەردەم ئەودا ڕاگرتوە. لە شەرم و ترس و توڕەبووندا بەمشــێوەیە خۆم دەبینم. هێشتا، کوێرانە تەماشای خۆم دەکەم و خۆم بەوە دادەنێم، کە هەیە.

لەلایەکــی دیکەوە کۆکردنەوەی ئەگەرە بــە ئامێربووەکان منی لەبەردەم ئەو ئامیرانــەی نێو جیهاندا ڕاگرت، کە بوونی کەســەکەی دیکە تێپەڕیان دەکات. بە تەماشاکردنی کەسەکەی دیکە هەڵوێستەکەم لەدەستم ڕایکرد، لە زمانی ڕۆژانەدا دەڵێین، من خاوەنی هەڵوێستی خۆم نیم؛ یان من خاوەنی هەڵویستەکەمم، بەڵام هەڵوێستەکەم یەک ڕەهەندی ڕاســتەقینەی بۆ ماوەتەوە، کە لە ڕێگەیەوە لە من ڕادەکات. بێگومان، ئەو کاتەی تەنیام و کارێک دەکەم دەگونجێت ئاکامی کارەکە چاوەڕوان نەکراوبێت و بەگوێرەی حەزی من نەبێت. بۆ نموونە، گوڵدانێکی ناسک لەســەر میزەکە دانراوە و من لایەکی مێزەکە ڕادەکێشم، بەڵام پەیکەرە برۆنزەکە بەسەر گوڵدانەکەدا دەکەوێت و دەیکات بە هەزار پارچەوە. ئەگەر من کەمێک وریا بوومایە ئەم ڕووداوەم پێشبین دەکرد و هیچ شتێک لە دەستی من دەرنەدەچوو. دەرکەتنی کەســەکەی دیکە، بەپێچەوانەی ئەمەوە، من دەخاتە نێو هەڵوێستێکی ناحەزەوە، کە من ناتوانم ببم بەخاوەنی و لە بەر ئەوەی بۆ کەســەکەی دیکەیە لەدەســتی من دەردەچێت. ئەمەیە (ژید)، کە بە (بەشــی شەیتان)ی دادەنێت؛ شتێکە پێشبین ناکرێت و بادانێکی ڕاستەقینەشە. نا پێشبینەکەیە کافکا لە (دادگا و قەڵا)دا باســیدەکات. لە لایەکەوە هەرشتێک (کەی) و ســێرڤیۆر دەیەکن کاری خۆیانە مافی ئەوانیشــە، بەڵام ئەو کاتەی کارەکانیان بە جیهانەوە دەبەستنەوە ئاکامــە چاوەڕوان لێکراوەکان دروســتدەکەن: کارەکانیان ســەرکەوتوو دەبێت. هەمانکات، ڕاستی کارەکان بەردەوام لەدەست ئەوان ڕادەکات. کارەکانیان واتایان هەیە، کە (کەی) و ســێرڤیۆر نایزانن. لێرەدا کافکــا دەیەوێت بەرزێتی بوونێکی پیرۆز دەربڕێت. لەچاوی بوونێکی پیرۆزدا کارەکانی مرۆڤ ڕاســتی هەڵدەگرێت. بەڵام، خوا،[لەم چیرۆکانەدا] چەمکێکە بۆ بوونی کەسێکی دیکە و دوایی دێمەوە

ســـەر ئەو خاڵە و باســـی دەکەم. کەژە خەمناک و تەڵخەکەی دادگا بوونی ئێمە لەنێو جیهان و کەسانی دیکەدا دەردەخات.

بەمشـــێوەیە هەڵوێست بە هۆکاری تێپەڕبوونی بەرەو کەسانی دیکە لە دەوری من، بەو جۆرەی شوێنکەوتوانی فێرگەی گیشـــتاڵت باسیدەکەن، دەبێت بە فۆرم. تێهەڵکێشـــبوونەکەشی لەوێدا دەبێت بە بونیادی من و خەســـڵەتی دەرچوون و بوون-لەنێو-خۆش هەڵدەگرێت. پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئەو کەسانەی دەدوێن و من تەماشایان دەکەم کتوپڕ دەبێت بە دەرەکی و نەناسراو. بەتایبەتی تەماشاکردنەی خۆم و ئەو دوورییەی لەنێوان ئەوان و مندا دەیبینم، لە ناودەچێت و دەبێت بەو تەماشاکردنەی تەماشای دەکرێت. من ئەوان، وەکو بابەت دەبینم؛ پەیوەندییەکەشم لەگـــەڵ ئەواندا هەمان پەیوەندی ئەوانە لەگـــەڵ مندا. کاتێک تەماشایان دەکەم، دەستەڵاتەکەی خۆشم دەپێوم. ئەگەر کەسانی دیکە من ببینن، ئەوا دەستەڵاتەکەم لەناودەچێت و ناتوانم کەســـانی دیکە بکەم بە بابەت، ئەوان بۆ کەسێکی دیکەش دەبـــن بە بابەت. تەماشاکردنەکەم پەیوەندییەک لەنێـــو جیهاندا دەردەخات، کە پەیوەندی بابەتێکە لەگەڵ بابەتێکی تەماشاکراودا. لەلایەکەوە، بابەتەکانی دیکەش لـــە دەوری تەماشاکردنەکە کۆدەبنەوە؛ دووری نێـــوان من و ئەوانەی تەماشایان دەکەم ئێستا دەردەکەوێت، بـــەڵام تەماشاکردنەکە دەوری داوە، کورتیکردۆتەوە و پەســـاندویەتی بە جۆرێک دووری بابەتەکان بـــووە بە زەمینەیەک و تەماشاکە لێیدابڕاوە. لەلایەکی دیکـــەوە، ڕەفتارەکان لە دەوری تەماشاکردنەکە کۆدەبنەوە و دەبن بە داردەســـت بۆ بەردەوامی مانـــەوەی. لێرەدا من دەبم بە پێکهاتەیەکی گشتگر، کە تەماشاکەیە. من وەکو بابەت تەماشاکەم؛ واتە، ئەو ئامێرە ئاڵۆزەیە لایەنـــی ناوەکی پێـــدراوە و دەتوانێت خۆی بە ئاکامەکـــان بگەیەنێت و بابەتێک لە دوورەوە بناســـێت. ئەم دوورییەش بە مـــن دراوە چونکە تەماشام دەکرێت و دەبێت منیش ئەو دوورییە لەناوبەرم. تەماشاکردنی کەســـێک دووری بەسەر مندا دەسەپێنێت. ئەو کاتەی هەســـت بەوەدەکەین تەماشامان دەکرێت خۆمان لەنێو شوێندا دەبینین. تەماشاکردنی کەســـانی دیکە تەنیا لەنێو شوێن دامان نانێت؟ (کات)یشمان بۆ دیاریدەکات. تەماشاکردنی کەسێکی دیکە لەنێو ئەزمونی ژیانمدا ڕوودەدات، کە مەحاڵە من بتوانم لە تەنیاییدا هەستی پێبکەم.

جیهان بۆ تاکێک کتوپر ســـەرهەڵنادات؛ بوونی ئەو هەمیشە ئامادەبوونە لەگەڵ کەســـانی دیکەدا. ئەو بەردەوام لـــە دەرەوەی بوونی خۆیدا و لەنێو جیهاندا ونە و هەموو هەبووەکان بە ئامادەبوونی خۆی بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بەڵام کتوپڕیش بیر لـــە پەیوەندی نێوان دوو هەبووی کاتی دەکاتەوە، کە هیچ پەیوەندییەکی دیکەیان تێـــدا نابینرێت. دوو شت لە پەیوەندییەکەیانـــدا بەیەکدییەوە کتوپڕ نابێت چونکە هەردووکیان ســـەر بە یەک سیستەمن. کتوپڕی، کەوابوو، سەر بە هەبووەکانی نێو

جهان نییە، بەڵکــو پێکەوەبوونی دووجۆر هەبوو دیاردەکــات. ئامادەبوونی پیرۆ و مــن لەنێو جیهانــدا ڕوودەدات. ئەمەش لەوە دەچێت، کە ئــەو پەرداخەی پۆڵ بەکاریدەهێنێــت منیش بەکاریدەهێنم. لێرەدا، بوونی بناخە خۆی دەســەپێنێت و بوونی کەســێکی دیکە و من لەنێو کاتدا دەبێت بە پێویستی. لەبەر ئەوەی بوونی کەســێکی دیکە کاتی خۆی هەیە، هەوڵــدەدات بوونی منیش بخاتە نێو ئەوکاتەوە و من و خۆی لەنێو کاتێکی جیهانیدا دەبینێت. تاکو ئەو ڕادەیەی من هەســت بە تەماشاکردنی کەســێکی دیکە دەکەم، ئەو کەســە ڕەهەندێکــی نوێ بۆ کاتی من دادەنێت. ڕانەبردووم دەبێت بەو ڕانەبردووەی کەســێکی دیکە هەستی پێدەکات و لایەنــی دەرەکی بۆ دیاریدەکرێت. ئەم ڕانەبــردووە لە من نامۆ دەبێت و دەکەوێتە ســەر ڕانەبردووی کەســێکی دیکە. من فرێدەدرێمە نێو ڕانەبردوویەکی جیهانییەوە چونکە کەســێکی دیکەش خۆی دەکات بە ڕانەبردوو بۆ من. بەڵام ئەم ڕانەبردووە جیهانییەی، کە جێگەی خۆمی تێدا دەکەمەوە نامۆبوونی ڕانەبردووی جیهانیی منە. من دەبم بە کاتێکی فیزیایی و ئەو کاتە ڕەهایەی (هیچ) من لە ئەو جیادەکاتەوە.

وەکــو بابەتێکی نێــو شوێن و کات لە جیهاندا، خاوەنــی بونیادێکی کاتی و شوێنی بۆ هەڵوێستم لەنێو جیهاندا، خۆم دەخەمە بەر هەڵسەنگاندنی کەســانی دیکەوە. ئەمەش لە کۆجیتۆدا دەبینرێت. کاتێک تەماشا دەکرێیت، دەبێت هەست بکەیــت، بۆ هەڵسەنگاندنێکی نەزانراو بوویت بە بابەتێکی نەناســراو. کەســانی دیکە حوکمت بەســەردادەدن و بەهات بەسەردا دەسەپێنن. لەهەمانکاتدا، من لە شەرمکردن یان شانازییدا دروستی ئەم حوکمدانانە دەناسمەوە.

من بەو جــۆرەی دەردەکەون لییان تێناگەم، حوکمــدان کردەوەیەکی بەرزی مرۆڤێکی سەربەستە. کەوابوو، بوونی-بینراوی من، وەکو بوونێکی بێ بەرگریکەر لەبەردەم سەربەستییەکدا، کە سەربەســتی من نییە، پێکدەهێنێت. لەم ڕووەوە ئێمە خۆمان لەبەردەم کەسانی دیکەدا بە کۆیلەیی دەبینین. بەڵام ئەم کۆیلایەتییە هۆکردەیەکی مێژوویی نییە و لەنێو فۆرمی ڕووتکراوەی ئاگامەندییدا بەسەریا زاڵ نابین. من بەو ڕادەیە کۆیلەم، کە بوونم لەســەر سەربەستییەک ڕادەوەستێت من خاوەنــی نیم و دەبێت بە پێکهاتەی بوونم. بــەو ڕادەیەی من دەبم بە بابەتێکی حوکــم بەســەردا دراو بەبێ ئەوەی بتوانم کارێکی بەرانبــەر بکەم من دەکات بە کۆیلــە. بەهەمانشــێوە، بەو ڕادەیەی من دەبم بە ئامێرێکــی ئەو ئەگەرانەی من خاوەنیــان نیــم و بوونیان لەژوور منەوەیــە و من لە ئاســتیاندا نەزانم و لەنێو مەترســییدا دەژیم. ئەم مەترســییە ڕووداو نییە، بەڵکو بوونیادێکی هەمیشەیی بوونی منە بۆ کەسانی دی.

ئەمــەش بە کۆتایــی باســەکەمان دەگەیەنێت. پێش ســودوەرگرتن لێی و دۆزینەوەی واتای کەسانی دی، پێویستە بزانین ئەم باسە لەسەر بناخەی کۆجیتۆ

دامەزراوە. ئێمە تەنیا ئەو ڕەتدانەوە ناوەکییانە بۆ تەماشاکردنی کەســانی دیکە، وەکو ترس ڕوونکردۆتەوە (بۆ نموونە هەستکردن بە مەترسی لەبەردەم سەربەستی کەســانی دیکەدا)، شەرمکردن و شانازی (هەستکردن بە بوونی خۆم لە ڕێگەی کەســێکی دیکەوە)و هەستکردن بە کۆیلایەتی (هەستکردن بە نامۆبوون لە هەموو ئەگەرەکانــی خۆم). بــا هەریەکێک لە ئێمە بڕوانێتــە ئەزموونەکانی خۆی. هیچ کەسێک لە ئێمە نییە لە هەڵوێستێکدا توشی سەرسوڕمان نەبووبێت و هەستی بە پەشیمانی نەکردبێت یان ئەو هەڵوێستەی بە سوک دانەنابێت.

من هەست بە تەماشاکردنەکە، وەکو دەرچوون بەرەو بوون دەکەم، کە یەکێک لە چەمکەکانی (من)ە. منیش بوون-بۆ-خۆم، کە ئەوشتەیە نییە و ئەوەش نییە هەیە. چەمکەکەی دیکەش (من)ە، بەڵام لەژێر دەســتی مندا نییە و لە دەرەوەی کردەوە و زانینــی مندایە. ئەم چەمکە، لەبەر ئەوەی بە ئەگــەرە لە کۆتایی بەدەرەکانی سەربەســتی کەسێکی دیکەوە بەســتراوە، کۆمەڵێک خەسڵەتی لە کۆتایی بەدەر و دەرنەکەوتــوە. لەنێو تەماشاکردنی کەســەکەی دیکەدا من، وەکو شتێکی چەق وەستاو لەنێو جیهاندا بە ترسەوە و بەبێ ئومێدی ڕزگاربوون دەژیم. من نازانم خۆم چیم و شوێنم لە نێو جیهاندا چییە و چۆن ڕوو لە کەسانی دیکە دەکەم.

ئێستــا لە واتای ســەرهەڵدانی بوونی کەســانی دیکە لــە تەماشاکردنەکەدا تێدەگەین. کەسانی دیکە، وەکو بابەت بە ئێمە نەدراون. بە بابەتکردنی کەسانی دیکە ئاکامی ڕوخانی ئەوانی، وەکو تەماشاکەر لە دوایە. لەسەرو ئەمەشەوە، بەو جۆرەی بینیمان، تەماشاکردنەکە چاوەکانی کەســەکە، وەکو بابەت لەنێو خۆیدا وندەکــات. بە بابەتکردنی کەســێکی دیکە، دەردەکەوێــت، بەرگریکردن بێت لە بوونی خۆم. ئەو کاتەی من کەســێک بەو بوونە دادەنێم، کە بۆ من هەیە، بوونی خۆم لەو بارودۆخــە ڕزگاردەکەم، کە بوونێکە بۆ ئەو. لە دیاردەی تەماشاکردندا کەســەکەی دیکە نابێت بە بابەت. هەروەها نابێت بە چەمکێکی ســنورداریش بۆ پەیوەنــدی من بە بوونــی خۆمەوە، کە بوونم بەبێ دەرکەوتنی خەســڵەتەکانی بەرجەستە دەکات. کەسەکەی دیکە نابێت بە بابەتی مەبەستەکەم؛ ئەگەر لەگەڵ سەرهەڵدانی تەماشاکردنەکەدا من بڕوانمە تەماشاکردنەکە یان کەسەکە، ئەمە بۆ بابەت دەبێت چونکە مەبەست ڕوو لە بابەتەکان دەکات. پێویست ناکات کەسانی دیکــە بە بارودۆخێکی ڕووتکراوە دابنێین. لەڕاســتیدا، لێرەدا هیچ بابەتێک نییە بیری لێبکرێتەوە و کەسەکەی دیکەش بونیادێکی هەمەکی نییە. کەسێکی دیکە، بە دڵنیاییەوە، بوونی من لەنێو جیهاندا ڕادەوەســتێنێت. لەم ڕووەوە، نە بابەتە و نە بونیــادی هەمەکی، وەکو کاتیگۆرییەکی ڕێکخەر بــۆ ئەزموونەکانی منیش خۆی دەرناخات. ئەو لەبەرەنگارییەکەیدا بەرانبەر بوونی من بەرجەســتە دەبێت. کەوابوو، کەسێکی دیکە چییە؟

پێش هەموو شتێک ئەو بوونێکە، کە من ســەرنجی نادەم. ئەو تەماشای من دەکــات و من تەماشای ناکــەم. ئەو من بەو بوونە دەردەخات، کە خەســڵەتی شــاراوەی هەیە، بەڵام خۆی بەو شیوەیە نیشــانی من نادات. کەســێکە، وەکو بابــەت ڕووی لە من نییە و ئەو لایەنێکی کۆنکرێتی دوور وەســتاوەی نامۆبوونی ئەگەرەکانمــە و بە هۆکاری ئەوەوە جیهان دەبێت بە جیهانێکی دیکە، کە هەموو پەیوەندییەکانــم لەگەڵیدا کورت دەهێنێت. بەڵام ئەو لە گــۆڕان و نامۆبوونەکە جیاواز نییە. ئەو واتایان پێدەبەخشــێت. ئەو گۆرانەکانی من دەچەســپێنیت و دەیانکات بە بەشێکی جیهان. لە شەرمکردندا کەسەکەی دیکە لە هەموو شوێنێکی بووندا دەردەکەوێت و بوونی شەرمەکە دەســەپێنێت؛ ئەو دەبێت بە دروستکەری ئەو ژینگەیەی خەسڵەتە شاراوەکانمی تیدا دەردەکەون.

**یەکــەم،** تەماشاکردنی کەســی دیکــە، وەکو بارودۆخێکــی پێویست بۆ بە بابەتکردنــی مــن لەناوبردنی هەمــوو بابەتکردنێکــە بۆ مــن. تەماشاکردنەکە دەمگرێــت و مــن و جیهان بە تــەواوی دەگۆڕێت. من دەبم بــەو بوونەی لەنێو جیهاندا تەماشاکراوە. تەماشاکردنەکە، بەتایبەتی، کە تەماشاکردنی تەماشاکەرە، نــەک تەماشاکــراو جیاوازییەکانی نێوان بوونی مــن و بابەتەکان ڕەتدەداتەوە و خــۆی دیارییان دەکات. تەماشاکردن دوورییەک لــە جیهاندا و لە ئێستادا پەیدا دەکــات، کە دووری نیی. من دەچمە دواوە، من لە ئامادەبوونەکەم لەنێو جیهاندا ڕووتکراومەتەوە؛ دوورییەکەم لە کەسەکەوە دیاریکراوە. لەوێدا، من پانزە هەنگاو لە دەرگاکەوە و شەش یاردیش لە پەنجەرەکەوە دوورم. بەڵام، کەسەکە دێت و بە دوای منــدا دەگەڕێت و دوورییەکەی نێوانمان دەردەخات. بۆ ئەوەی دوورییەکەی نێوانمــان بە شەش یارد بپێورێت، پێویستە بوونی ئەو بەبێ دووری خۆی بۆ من ئامادە بکات. کەوابوو، لە ئەزموونی دوورییەکەم لە بابەتەکان و لە کەســەکەوە هەست بە دووری کەسەکە لە ئامادەبوونەکەیدا ناکەم، دەگونجێت هەموو کەسێک لەم ڕوونکردنەوەیەدا بە ئامادەبوونی کەســێکی دیکە و تەماشاکردنەکەی توشی شەرم بووبێت. بە واتایەکی دیکە، مادام من هەســتدەکەم تەماشام دەکەن، ئەوا بوونی کەســانی دیکە خۆی دەســەپێنێت. کاتێک کەسەکە تەماشای من دەکات ئــەو لەنێو جیهانەکــەی مندا نییە، بەڵکو لە شوێنێکــی دیکەوە ڕوو لە جیهانی مــن دەکات. بە تەماشاکردنەکەی دووری نێوانمــان لەناودەبات. لەناوبردنەکەش بە هۆکاری بابەتێکی ڕاســتەقینە یان ناڕاســتەقینە یــان شتێکەوە نییە. بەڵکو بە هۆکاری ئەو فاکتۆرەوەیە، کە ئەو کەســێکی دیکەیە. تەماشاکردنی کەسێکی دیکــە دیاردەیەک لەنێو جیهاندا نییە، پەیوەندییەکەی نێوان من و کەســەکەش پەیوەندییەکــی دەرەکی نێو جیهان نییە. بە ڕێگەی تەماشاکردنی کەســەکەوە

من دەیسەلمێنم، کە شتێک لەودیو جیهانەوە هەیە. بوونی کەسێکی دیکە بەبێ دووری و ناوەنـد، وەکو شتێکی بەرز لەبەردەم مندا و بۆ من خۆی دەردەخات. بەڵام ئەم ئامادەبوونە پەیوەندییەکی دوولایەنی دروست ناکات. ئەو ئامادەبوونە پڕ و بەرزەی لەبەردەم مندا قووت بۆتەوە و هیچ ناوەندێکی لەنێوانماندا دانەناوە، من بە خەسڵەتە شاراوەکانەوە دادەنێت، بەرزییەک، کە دوورییەکەی لە منەوە بوونێکی نەبڕاوەی هەیە و لە تەماشاکردنەکەدا من لەنێو جیهان نوقم دەکات.

لەسەرو ئەمەوە، بە وەستانی ئەگەرەکانم، کەسەکە ئەوەم بۆ ئاشکرا دەکات، کە من تەنیا سەربەستی کەسێکی دیکە دەمکات بە بابەت. من نابم بە بابەت بۆ خۆم چونکە من ئەوەم هەم؛ پشت بە تەواناییەکانی خۆم دەبەستم. لە دابڕان لە بوونی خۆم سەرکەوتوو نابم؛ من بەردەوام ئاگام لە خۆمە. هەندێکجار ساکارانە دەڵێم، دەتوانم ببم بە بابەت بۆ بوونی خۆم، بەبێ ئەوەی بیر لە لێپرسینەوەکەی بکەمەوە. لەمحاڵەتەدا لەناوەوە بیر لە بوونی کەسێکی دیکە دەکەمەوە؛ چونکە من، تاکو نەبم بەو کەسەی بابەتەکە دەناسێت، ناتوانم ببم بە بابەت. کەوابوو، پێش هەموو شتێک، کەسێکی دیکە ئەوەیە، کە من دەبم بە بابەت بۆ ئەو؛ لە ڕێگەی ئەوەوە بە بابەت بوونی خۆم دەسەلمێنم. ئەگەر من بتوانم یەکێک لە خەسڵەتەکانیشم وەکو بابەت بناسم ئەوا بوونی کەسێکی دیکە دەبێ هەبێت. ئەو کەسەش دەبێت (خۆ)یەکی ڕووت بێت. ئەم خۆیە ڕووتە، کە من ناتوانم بیناسم، بۆن موونە نابێت بە بابەت. هەر کاتێک بمەوێت بیکەم بە بابەت، لە دەرەوەی دەستەڵاتم ڕادەوەستێت. لەگەڵ هەستکردن بە تەماشاکردنەکە و ناسینی خۆم، وەکو بابەتێکی شاراوە بوونی کەسەکەی دیکە، وەکو خۆیەکی هێشتا نەناسراو لەگەڵ بوونی خۆمدا ڕاستەوخۆ دەدۆزمەوە.

هەمانکات، من هەست بە سەربەستی لە سنوربەدەری کەسێکی دیکە دەکەم. تەنیا سەربەستییەکەی ئەو دەتوانێت ئەگەرەکانی من ڕاگرێت و سنورداریان بکات. ڕێگرێکی ئەستویی ئەگەرەکانم ڕاناگرێت. نەچوونە دەرەوەم لە ماڵەوە لەبەر بارانبارین یـان ڕێگەمپێنەدراوە، دوو شتی جیاوازن. لە حاڵەتی یەکەمدا من بڕیار لەسەر نەچوونـە دەرەوە دەدەم. لەحاڵەتی دووەمدا ئەگەرەکانی چوونەدەرەوەم چەقیون و سەربەستییەک ڕێگەی لە من گرتووە و چوونەدەرەوەی لێ قەدەغە کردووم. ئارەزوویەکی ئاسایی و کتوپڕ پاڵ بە ئێمەوە نانێت بەبێ توڕەبوون و هەڵچون فەرمانی بەرانبەرەکەمان وەرگرین، بەڵکو هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئێمە فەرمان و قەدەغەکردنەکەی ئەو کەسە لەسەربەستییەکەیدا لەنێو بەکۆیلەکردنی خۆمان دەدۆزینەوە. لەناوچوونی ئەگەرەکانی خۆم لەنێو هەستکردن بە سەربەستی کەسەکەی دیکەدا دەبینم. لەناوچوونەکە لە ناخی سەربەستییەکەی ئەودایە. من دەبم بەوەی خۆمم و دەستیشم ناگاتە ناخی خۆم؛ فڕێدراومەتە ئێرە و لەنێو

سەربەستییەکەی ئەودا وازملێهێنراوە. لەم ئەزموونەدا پەیوەندییەکەم بە کاتی جیهانییەوە بۆ من دەبێت بە جۆرە کاتێکی سەربەخۆ؛ تەنیا ئەو بوون-بۆ-خۆیەی کات بۆ خۆی پێکدەهێنێت دەتوانێت من فڕی بداتە نێو کاتەوە.

کەوابوو، لە تەماشاکردندا هەست بە بوونی کۆنکرێتی سەبەستی و ئاگایی کەسێکی دیکە دەکەم، کە لەنێو کاتی بوونی خۆیدا ڕوو لە ئەگەرەکانی دەکات. ئامادەبوونی ڕاستەوخۆی ئەو هەلومەرجێکی پێویستە بۆ تێگەیشتن لە بوونی خۆم. کەسێکی دیکە ئەو(منە)یە، کە هیچ شتێک لە یەکدیمان جیاناکاتەوە و هیچ شتێکیش لەژێر دەستی سەربەستییەکەیدا دەرناچێت.

ئێستا ئێمە تاکوڕادەیەک سەربارەت ئەو بەرەنگارییە دژی بەڵگەکانی خۆ-ویستن فێر بووین. بەرەنگارییەکەش لەسەر ئەو فاکتۆرە ڕادەوەستێت، کە کەسێکی دیکە بۆ من دیاردەیەکی بەڵگەنەویست و ئامادەیە. من هەرگیز ناتوانم لەنێو ئەزمونەکەمدا دەریبهێنم، گومان لە بوونی بکەم یان بیکەم بە بابەتی داماڵینە فینۆمینۆلۆجییەکە.

ئەگەر کەسێک تەماشام بکات من دەبم بە بابەت. ئەم ئاگاییە لەبارەی بوون بە بابەتەوە لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە کەسێکی دیکە هەبێت. لەم ڕووەوە هیگڵ دروست بۆ کێشەکە چووە. بەڵام، ئاگایی و سەربەستی کەسەکە بۆ من دەرنەکەوتووە. ئەگەر هەبن ئەوا دەبێت بناسرێن و ببن بە بابەتی زانین. ئەمەش جارێکی دیکە لە بابەتەوە بۆ بکەرێکی بە ئاگا دەگەڕێنێتەوە. من ناتوانم بیرۆکەی ئەوان لە بوونی خۆمەوە دەربهێنم. یەکەم، چونکە من نایانناسم و هیچ نوێنەرێکیان لای من دروست نەبووە. لەسەرو ئەمەوە، ئەم بەڵگە کۆنکرێتییە بۆ سەربەستی، کە من دەیکەم بە هۆکردیش بەڵگەیە بۆ سەربەستییەکەی من؛ هەموو تێگەیشتنێکی کۆنکرێتی لە ئاگایی، ئاگاییە لە ئاگایی خۆم؛ چەمکی ئاگایی ئاماژەکردنە بۆ ئاگایی خۆم.

بێگومان، ئێمە لە پێشەکی[ئەم نوسراوەدا]سەلماندمان، کە بوونی سەربەستی و ئاگامەندی پێشمەرجن و پێش ناوەڕۆکیش دەکەون؛ لە ئاکامدا، ناوەڕۆکم دەبێت بە نموونەی سەربەستی و ئاگامەندیم. لە جێگەی سێیەمدا، سەربەستی و ئاگامەندی کەسێکی دیکە نابن بە کاتیگۆری بۆ یەکگرتنی ئەزموونەکانم. بەدڵنیاییەوە، بەو شێوەیەی هوسرڵ باسیدەکات، بونیادی ئۆنتۆلۆجی جیهانی (من) داوادەکات ببێت بە جیهان بۆ کەسانی دیکەش. لەوێدا، کە کەسانی دیکە خۆیان بە جۆرێک لە بابەت لەنێو جیهانی مندا دەردەخەن هۆکارەکەی ئەوەیە، کە ئەوان بەو تەوانایەوە لەنێو جیهانی منداندا. ئەگەر لەو باوەڕەدابم (پیرۆ) لەبەردەم مندا دانیشتوە و دەخوێنێتەوە، لەبەردەم پەرتووکەکەدا خۆی، وەکو بابەتێکی دەرەکی دەردەخات.

من ئەم بابەتە دەبینم (هەرچەندە لە من ڕادەکات) و لەگەڵیدا پەیوەندیم

هەیـــە. لەنێو ئەم بارودۆخەدا چەمکی کەســـانی دیکە چەقوەســـتاو ڕادەگرین و دەیکەین بە چەقێکی بێ ناوەڕۆک، وەکو بابەتێکی دەرەکی لەنێو جیهانی خۆمدا دایدەنێـــم. بەڵام ئامادەبوونی کەســـانی دیکە لـــە تەماشاکردنەکەیدا دەبێت بە ڕێبەســـت و بە هۆکاری ئەوەوە جیهان لەژێر دەستی مندا دەردەچێت. دەرچوونی جیهان لەژێر دەستی مندا، لە کاتێکدا پەیوەندیدارە و ڕاکردنە لە بابەتەوە بەرەو بابەتێکـــی دیکـــە، بابەتگەرێتی بەهێزتر دەکات. ڕاکردنـــی جیهان و بوونی خۆم لـــە خۆمەوە بەرەو ئەو سەربەســـتییەی من خاوەنی نیـــم دەبێت بە لەناوچوونی زانینم. جیهان هەڵدەوەشێتەوە تاکو لە شوینێکی دیکەدا دروســـتببێتەوە؛ بەڵام هەڵوەشاندنەوەکە بۆ من نییە و ناتوانم لەبارەیەوە هیچ بزانم یان بیریلێبکەمەوە. ئامادەبوونی کەســـێکی دیکە، وەکو تەماشاکەر زانیـــن و پرۆژەی بوونی من یان کاتیگۆری نییە. شتێکە هەیە و لە منەوە دەرنەچووە. منیش ناتوانم بیخەمە ژێر داماڵینە فینۆمینۆلۆجییەکەوە. لە داماڵینی فینۆمینۆلۆجیدا جیهان دەخەینە نێو کەوانەوە تاکو ئاگایی بەرز، وەکو داکەوتێکی ڕەها بدۆزینەوە. ســـەرکەوتنی ئەم کـــارەش بۆ ئێمە مەبەســـت نییە و نامانەوێ بیدۆزینـــەوە. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە کەســـانی دیکە فەرامۆشناکرێن چونکە تەماشاکردنەکەیان ئەوە دەردەخـــات، کە لە نێو جیهانی مندا نین. من گوتم، لەبەردەم کەســـانی دیکەدا شـــەرم دەکەم. لە داماڵینە فینۆمینۆلۆجییەکـــەدا شەرم بە تەنیا ڕادەگرین تاکو باشتـــر لە واتاکەی تێبگەین. کەســـێکی دیکە بابەتی شەرمەکـــە نییە. بابەتەکە هەڵوێستی من یان حاڵەتێکی منە لەنێو جیهاندا. ئێمە دەتوانین ئەمانە داماڵین. تەنانەت کەسێکی دیکە نابێت بە حاڵەتێکی دەرەکی شەرمکردنەکەشم. هێشتا ئەو بوونی شەرمەکەیە. شەرمکردن دەرخستنی کەسێکی دیکەیە، بەو شێوەیە نا، کە ئاگامەندی بابەتێک دەناسێت بەڵکو بە جۆرێک، کە ساتێکی ئاگامەندی دەبێت بە هاندەر بۆ ساتێکی دیکەی. ئەگەر ئێمە بە هۆکاری کۆجیتۆوە بە ئاگامەندی ڕەوان بگەیـــن، ئەم ئاگامەندییە ڕەوانەش ئاگامەنـــدی بێت لە بوونی شەرم، ئاگامەندی کەســـێکی دیکە دەبێت بە دێوەزمەی و وەکو ئامادەبوونێکی دەستپێنەکراو خۆی لەدەســـت هەموو داماڵینێک دەربازدەکات. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، پێویست نەکات لەنێو جیهاندا بۆ کەسێکی دیکە بگەڕێین بەڵکو لە تەنیشت ئاگامەندیدایە، ئاگامەندییـــەک، کـــە خۆی لە ڕێگەی ئەوەوە دەکات بـــەو شتەی هەیە. چۆن لە کۆجیتۆدا ئاگامەندیم خۆی ناسیوەو بووە بەگەواهی بوونی خۆی، بەهەمانشێوەش جۆرێـــک لە ئاگامەندی، بۆ نموونە (ئاگایـــی لە شەرم) لەنێو کۆجیتۆدا دەبێت بە گەواهی بوونی خۆی و بوونی کەسانی دیکە.

دەشێ هەندێک هاوڕانەبـــن و لەگەڵ ئەو خاڵەدا ناکۆک بن، کە تەماشاکردنی کەســـێکی دیکە واتـــای بە بابەتبوون بە من دەدات. ئەگەر ئەمە دروســـت بێت،

ئـــەوا جارێکی دیکە بـــۆ ڕاڕەوی خۆ-ویستـــی دەگەڕێینەوە. کاتێـــک من لەنێو ســـیستەمی بیرۆکەکاندا دەبم بە بابەت واتای بوون لە دەرەوەی مندا پەیدادەبێت و لەنێو گریمانەی کەســـانی دیکەدا سەرهەڵدەدات. لێرەدا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەبکەین: **یەکـــەم**، بە بابەتکردنی بوونم بۆ خۆم بە هیچ جۆرێک (من منم)ی هیگڵ نییە. ئێمە لەم ئاستەدا مامەڵە لەگەڵ خۆیەتی[ناسنامە] بە ڕواڵەت ناکەین. بوونـــم، وەکو بابەت یان بۆ-کەســـانی-دی جیاوازییەکی گەورەی لەگەڵ بوونی-بۆ-خۆمدا هەیە. لەڕاســـتیدا، چەمکی بابەتی، کە لە بەشی یەکەمی ئەم نوســـراوەدا بینیمـــان، پێویستی بە ڕەتدانەوەیەکی ئاشکرا هەیە. بابەت ئاگامەندی من نییە. ئەمەش بەو ئاکامەمان دەگەیەنێت، کە بابەت خەسڵەتەکانی ئاگامەندی بە خۆوە ناگرێـــت. کەوابوو، منی بە بابەتکراو بۆ خۆم ئـــەو منەیە، کە لە منەوە جیاوازە و خۆم نیم و خەســـڵەتی ئاگامەندی نییە. ئاگامەنییەکی لە ئاســـت دابەزێنراوە. بـــە بابەتکردن گۆڕانکارییەکی ڕادیکالانەیـــە. ئەو کاتەی خۆشم بە بابەت ئاشکرا دەبینم، هێشـــتا ئەو بابەتە نابێت بەو هەبـــووەی نوێنەرایەتی بوونم دەکات، کە ماڵـــرۆ گوتەنی ئەو دێوەیە هەموو کەســـێک دەیەوێت و لەگەڵ هیچ شتێکیشـــدا بەراورد ناکرێت. هەستکردن بە بوونم، وەکو بابەت و بۆ کەسانی دی لە بوونی-بۆ-خۆی منەوە جیاوازە و هەرگیز ئاماژە بۆ بوونم ناکات.

بۆ ئەوەی خۆم وەکو کەســـێکی خراپ ببینم، بۆ نموونە، ئاماژە بۆ بوونم بەو جـــۆرەی بۆ خۆم هەم ناکەم، چونکە من خـــراپ نیم و بۆ خۆشم نابم بە خراپ. ئەمـــەش بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە. لە پێش هەمـــوو شتێکەوە من بەو جۆرەی فەرمانبەرم یان پزیشکم خراپ نیم. لەڕاستیدا شێوازی بوونم بەو جۆرەیە، کە من ئەوە نیم ئێستا هەم. هەروەها بونێکیشم، کە هێشتا نەبووم. لە حاڵەتی دووەمدا، ئەگـــەر بۆ بوونـــی خۆم خراپ بم، ئەوا پێویستە لە شێـــوازی ئەو بوونەدابم، کە دەبێت ئەوشتە بێت و هەســـت بەم شێـــوازی بوونەشم بکەم، کە خراپە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت من دەبێت بوونی خۆم بەوشێوەیە ببینم، کە ویستی ئەوەی هەیە خۆی بە دژی چاکە دابنێ. لێرەدا پێویستە من بەپێچەوانەی حەز و ئارەزوومەوە ڕەفتاربکەم و ڕقم لەو بوونەی خۆم بێت، کە هەیە. ئەگەر لە ئاســـتی بوونی-بۆ-خۆدا من هەســـت بە خراپە بکەم، ئەوا پێویستە خۆم بە کەسێکی خراپ دابنێم، ئەمەش لە ڕێگەی خۆ تاوانبارکردنەوە ڕوودەدات.

دەبینین ســـەرچاوەی چەمکی خراپ لە بوونـــی مندا نییە ئەگەر من خۆم بم. هەرگیز ناتوانم خراپە بەســـەر خۆمدا بسەپێنم یان بیبەســـتم بە بوونمەوە ئەگەر فـــڕێ بدرێمە دەرەوەی بوونـــم. ئەمەش لەبەر ئەوەیە من لـــە کاتی فڕێدانەکەدا خۆمـــم. من نەبوونی خۆمم؛ چونکە من ناوەنـــدم لەنێوان بوونی خۆم و خۆمدا و هەمـــوو بە بابەت بوونێک لەناودەچێت. من نابم بـــەو نەبوونەی بوونم، کە وەکو

بابەت من جیادەکاتەوە. لەم حاڵەتەدا دەبێت شتێک نوێنەرایەتی من، وەکو بابەت بکات. کەوابوو، ناتوانم دان بە بوونی خەسڵەتێک یان هێزێکی دەرەکییدا بنێم، کە ئەو هێزە لە بوونی مندا نەبێت و نەتوانم خۆم بکەم بە خاوەنی. بێگومان، ئەم خاڵە لەپێش ئێمەدا باسکراوە. لە کۆنەوە گوتراوە کەسانی دیکە فێرم دەکەن من کێم. بەڵام ئەوانەی ئەم گوتەیە دەخەنە بەردەممان، لە هەمانکاتدا لەو بڕوایەشدان، کە من چەمکی کەسانی دی لە خۆمەوە بە هێزی خۆم و لە پرۆژەکانی بوونمەوە دادەتاشم یان دەکەوێتەسەر بەراوردکردن و لێکچون. کەوابوو، لەنێو بازنەیەکی سنورداری سەختدا دەمێننەوە و لێوەی دەرناچن. کەسانی دی نابن بە واتا بۆ بەبابەتکردنی بوونم، بەڵکو حاڵەتێکی کۆنکرێتی و بەرزن بۆی. هەموو خەسڵەتەکانی، وەکو خراپ، غیرە، بەزەیی و دڕبوون و زۆری تریش، لەنێو ئەندێشەدا نین. کاتێک دەیانبەستم بە بوونی کەسێکەوە دڵنیام لەوەی دەمەوێت من هەست بە بوونی کەسەکە بکەم. هەمانکات، نابن بە ڕاستەقینەی بوونی من. ئەو کاتەی کەسێک ئەم خەسڵەتانەم بۆ دادەنێت من هێشتا بوون-بۆ-خۆم. هەروەها خۆم ناناسمەوە و لەگەڵ ئەمەشدا دەزانم، کە ئەو بوونەی باسی دەکات منم. من لێپرسینەوەی ئەو کەسە بێگانەیەی خۆی بە من ناساندوە هەڵدەگرم، بەڵام ئەو هەمیشە بە بێگانەیی دەمێنیتەوە. ئەو نەیتوانیوە لەگەڵ بە بابەتبوونی مندا یەکبگرێت و ئەو بوونەش نییە،

که منم له شێوازی (من منم)دا. من وێنەیەکی نێو ئەندێشەی ئەویش نیم، تاکو تەنیا بۆ ئەو هەبم و بەرپرس بێت لە بوونم. ئەم (من)ە لەگەڵ ئەو منەدا، کە هەیە بەراورد ناکرێت و گۆڕانکاری تێدا ڕوودراوە. ئەو منە بوونی منە، بەڵام ڕەهەند و شێوازی نوێی هەیە.

من بە هۆکاری نەبوونێکی لەچارەبەدەر لە بوونی خۆم جیاکراومەتەوە. من خۆمم، بەڵام ئەو نەبوونیە نیم، کە جیایکردوومەتەوە. بوونم بۆ کەسانی دیکە کەوتنە نێو بابەتگەراییە لە بۆشاییەکی ڕەهاوە. مادام ئەم کەوتنەخوارەوەیە نامۆییە ئەوا بوونم دەکەم بە بابەت بۆ خۆم؛ من ناتوانم بوونم لە خۆم نامۆ بکەم.

**دووەم**، لەسەرو ئەمەوە، کەسانی دیکە من ناکەن بە بابەت بۆ خۆم، بەڵکو دەیکەن بە بابەت بۆ خۆیان. کەسێکی دیکە ناتوانێت ئەو زانیارییەی دەستبکەوێت من لەبارەی بوونمەوە هەمە. کەوابوو، بوونی کەسێکی دیکە نابێت بە هۆکار بۆ دەرکەوتنی من وەکو بوون-بە-بابەت. من بێجگە لە هەڵهاتن هەست بە هیچی دیکە ناکەم. ئەو کاتەی لە ڕێگەی زمانەوە بۆم دەرکەوێت کەسەکە من بە خراپ یان غیرەکەر دادەنێت هەرگیز درک بەو خراپەیە یان غیرەیە ناکەم و هەوڵدەدەم لێیان ڕابکەم و خۆم لە ترس و شەرمکردن دووربخەمەوە. کەوابوو، بوون-بە-بابەتی من زانین و یەکێتی زانینیش نییە، بەڵکو سەختییە و دوورکەوتنەوەیە لە بوون-بۆ-

خۆ؛ سنورداریيەکە من پێیناگەم و کەچی من ئەویشم. کەسەکەی دیکەش، کە ئەم بوونەی من بۆ من دەردەخات، زانین یان کاتیگۆری نییە، بەڵکو ئامادەبوونی سەربەستییەکی بێگانەیە. لەڕاستیدا دوورکەوتنەوە لەبوونی خۆم و سەرهەڵدانی سەربەستییە بێگانەکە یەک شتن. بۆ من دەبن بە دامەزراو و بەبێ یەکدی نادۆزرێنەوە. لەناخەوە هەست بە بوونی کەسێکی دیکە دەکەم و توشی سەختیم دەکات. بوونی ئەو لە تەماشاکردنێکی کورتی مندا بەردەوام من لە جیهاندا دخاتە نێو مەترسییەوە. ئەو بەو شێوەیە دەرناکەوێت، کە ئێستا سەریهەڵداوە و دوایی بەرەنگاریم دەکات، بەڵکو ئەو بوونەیە، کە پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەگەڵ بوونی مندا هەیە و بوونی ئەو، کە چەسپاوە و فاکتۆرێکی پێویستە لە ئاگامەندی مندایە.

لێرەدا چەند گرفتێک دەمێننەوە و ڕوومانتێدەکەن. بەتایبەتی، لە حاڵەتی شەرمکردندا ئامادەبوونی کەسێکی دیکە گومانی لێناکرێت. بەو شێوەیەی بینیمان، دەگونجێت کەسێک تەماشای من بکات. کێڵگەی سەر گردەکە دەڕوانێتە جەنگاوەرەکان. دڵنیاین لەوەی خانوەکەی ناوی پڕە لە دوژمن. بەڵام ئێمە نازانین ئێستا سەربازە دوژمنەکان لە پەنجەرەکانەوە دەڕواننە دەرەوە. دڵنیانیم ئەو کەسەی گوێم لە دەنگی پێیەتی لەپشتەوە تەماشای من دەکات، دەشێ ڕووی لە شونێکی دیکە بێت، تەماشای زەوییەکە یان پەرتووکێک بکات. دواجاریش، بەگشتی، دڵنیانیم لەوەی ئەو چاوانەی دەڕواننە من چاو بن. دەشێ چاوی ڕاستی نەبن. بەکورتی، پێویست ناکات بڵێم تەماشکردنەکە دەبێت بە ڕووداوێکی گونجاو چونکە من بەردەوام بەبێ ئەوەی تەماشابکریم هەستدەکەم تەماشا دەکرێم! ئایا بوونی کەسانی دیکە نابێت بە گریمانە؟ ئێمە دەتوانین گرفتەکان بەمجۆرە باسبکەین: لەحاڵەتی ئامادەبوونێک لەنێو جیهاندا، کە بۆ من تەماشاکردن بەرجەستە دەکات، بەدڵنیاییەوە من هەست بەوە دەکەم، کە تەماشام دەکرێت. ئەمەش لەنێو بونیادەکەیدا بوونی کەسێکی دیکە دەردەخات. بەڵام دەشێ من هەڵە بم و ئەو بابەتانەی بە چاو دامەدنان چاو نەبن. دەشێ با لقی درەختەکانی لە پشت منەوە جوڵاندبێ. بەکورتییەکەی، دەشێ ئەو بابەتانە تەماشاکردن دروست نەکەن. لەمحاڵەتەدا، چ شتێک من دڵنیادەکات لەوەی تەماشام کراوە؟ شەرمکردنەکەم وەستانە لەبەردەم کەسێکدا. بەڵام لەمحالەتەدا کەس لێرە نییە. ئایا ئەمە شەرمکردن لەبەردەم هیچ کەسدا نییە؟ ئایا ئەمە نابێت بەشەرمکردنێکی ناڕادت؟

نابێت ئەم گرفتە ڕێگربێت لە ئاستی توێژینەوەکەمان و پێویستیش ناکات باسیبکەین، مەگەر لە شیکردنەوەکەمان بۆ بوونێ-بۆ-کەسانی دی سودی لێوەرگرین. لێرەدا ئاڵۆزی لەنێوان دوو جۆر زانین و بووندا پەیدا دەبێت و بەراوردیش ناکرێن. ئێمە هەمیشە زانیومانە بابەتێکی نێو جیهان گونجاوە. ئەمەش وابەستە بە

خەسڵەتی ئەو شتەوە، وەکو بابەت. دەگونجێت ئەوەی بە لامدا تێدەپەڕێت مرۆڤ بێت و ئەویش تەماشای من بکات؛ ڕاســـتەوخۆ هەســـتدەکەم تەماشام کراوە. من ئەم دڵنیابوونەم بە بوونی کەسەکەوە، وەکو بابەت نابەستمەوە. لەڕاستیدا بوونی کەسەکە، وەکو بکەر بۆ من دەردەخات.

لـــە هەموو حاڵەتەکاندا دڵنیابوونەکەم بوونی کەســـەکە لە بکەرەوە بۆ بابەت ناگۆڕێت. زەمینەی تەماشاکردنەکە بابەتە بەرجەستەبووەکە هەڵدەوەشێتنێتەوە. ئەگەر ئەو کەسە ناشرینەی بە لای مندا تێیدەڕێ لە پڕ تەماشام بکات ناشرینییەکەی نامێنێتەوە. لەو کاتەدا هەست بە تەماشاکردنەکەی دەکەم و دەبێت بە ناوەندێکی سەربەست لەنێوان خۆم و مندا. ڕاستەقینەی ئەو بوونەی تەماشایکراوە پشت بەو بابەتە نابەستێت، کە تەماشاکردنەکەی لێوە پەیدا دەبێت. مادام شەرمکردنەکەم، وەکو ئەزمونی ژیان گەواهی لەسەر بوونی کەسێکی دیکە دەدات، بەهەمانشێوەش دەبێـــت بە گەواهی بوونـــی خۆی و من گومانی لێناکـــەم. گومانکردن لە ئەو لە گومانکردن لە بوونی خۆم دەچێت. هەستکردن بە بوونی خۆم (لەکاتێکدا تەماشای دەســـتەکانم دەکەم) توشی هەڵەکردن دەبێت. کەوابوو، ڕاستەقینەی ئەو بوونەی تەماشاکـــراوە، وەکو فۆرمێکی ڕووت بە لەشی تەماشاکەرەکەوە نەبەســـتراوە و پەیوەندی بە کۆجیتۆی ڕووتی ئاگامەندیشەوە نییە. ئێمە دەبێت لە سەرهەڵدانی بابەتێکـــی تایبەت لەنێـــو ئەزمونەکانمدا، ئەو کاتەی چاوکانی کەســـەکە ڕوو لە من دەکـــەن، ئاگادارم دەکەنەوە و منیش هەســـت بەوەدەکـــەم تەماشامکراوە. شوێنکەوتوانـــی فەلسەفـــەی ئەفلاتونیش لە ڕێگـــەی ناکۆکییەکانی نێو جیهانی هەســـتەکییەوە باوەڕە فەلسەفییەکەیان بە شوێنێکی دیکە دەگەیەنن. ئەوەی بۆ من ئاشکرایە ئەو ڕاستییەیە، کە تەماشامکراوە، تەماشاکردنەکەش پەیوەندی بە ئامادەبوونەوە هەیە. ئەوەی جێگەی سەرســـوڕمانیش نییە ئەو خاڵەیە، کە نەک چاوەکان، بەڵکو کەسەکە، وەکو بکەر ئێمە دەبینێت.

لەســـەرو ئەمەوە، دەشێ کەســـێک بڵێت، مـــن دەتوانم بیدۆزمـــەوە، کە بە هەڵەداچووم. من لە کونی کلیلەکەوە تەماشای ژوورەوە دەکەم و لە پڕێکدا گوێم لە دەنگی پێ دەبێت. هەستدەکەم، لە شەرما توشی دڵە لەرزە بووم. بەڵام کەس نابینم، تێدەگەم هەڵە بووم و هەناســـەیەک هەڵدەکێشم. ئایا ئەم ئەزموونە خۆ-ڕووخێنەر نییە؟ با زۆرتر لەم کێشەیە ورد ببینەوە. ئایا بوونی منە، وەکو بابەت بۆ کەســـەکە بە هەڵە بەرجەســـتە بووە؟ هەڵبەتە. هەڵەکەی من دەتوانێت کۆڵم پێبدات و پرۆژەکەم بوەستێنم. ئەگەر لەسەریشی بەردەوام بم دەبێ دڵە لەرزەکەم خێراتـــر بێت و گوێم لە نزمترین دەنگی ســـەر پلیکانەکان بێـــت. لەگەڵ ئاگادار بوونەوەکەمدا هەســـت بە بوونی کەسەکە لە هەموو شوێنێکدا بکەم؛ لەخوارەوە، لەسەرەوە، لەنێو هەموو ژوورەکاندا و هەستیش دەکەم بوونم بۆ ئەوە. لەوانەشە

شەرمکردنەکەم نەڕوات و لەو کاتەدا چاوم بە کونی کلیلەکەوە ناوە ڕەنگم ســـور هەڵگەڕێت. ئەزموونی بوون-بۆ-کەســـێکی دیکەم ناوەستێت؛ ئەگەرەکانم نامرن و دووری پلیکانەکانیش لەناوناچێت و سوچە تاریکەکەش بۆ خۆشاردنەوەی کەسێک دەمێنێتەوە. ئەگەر لەگەڵ هەموو دەنگێکدا لەشم بلەرزێت و منیش هەست بەوەبکەم کەســـێک دەمبینێ لەبەر ئەوەیە من لە حاڵەتی ئەو بوونەدام تەماشای دەکرێت. کەوابوو، هەڵەکە یان ئەزموونە خۆ-ڕووخێنەرەکە چییە؟ بوونی کەسەکەی دیکە، وەکو بکەر و ئامادەبوونەکەی نییە. ڕاســـتەقینەی کەسەکە و پەیوەندی بوونی و بابەتەکەیە لەنێو جیهانی مندا. ئەوەی گومانی لێدەکرێت بوونی کەسەکە نییە، بەڵکـــو بونێتی لەوێ، بۆ نموونە، بوونێکی کۆنکرێتی یان ڕوداوێکی مێژوویی، کە لە دەستەواژەی (کەسێک لەنێو ژوورەکەدایە) دەریدەبڕین.

لەم ڕوونکردنەوەیەوە گەشتەکەمان زۆرتر بەرێدەخەین. ئامادەبوونی کەســـی دیکـــە لەنێو جهاندا لـــە شیکردنەوەی ئامادەبوونی کەســـێک، وەکو بکەر بۆ من دەرناکەوێت چونکە ئامادەبوونەکە بەرزێتییە، بۆ نموونە بوونێکە لەودیو جیهانەوە. من لەو باوەڕەدابووم کەســـێک لەنێو ژوورەکەدایە، بەڵام هەڵەبووم. کەس لەنێو ژوورەکەدا نەبوو. ئەو ئامادە نەبوو. ئامادەنەبوون چییە؟

ئەگەر لەبـــەر ڕۆشنایی ئەزمونەکانـــی ڕۆژانەمان تەماشـــای چەمکی (ئامادە نەبوون) بکەین دەردەکەوێت واتای هەموو (لەوێدا نییە)یەک نابەخشـــێت. ئەگەر مـــن کیسەی تووتنەکە لە جێگـــای خۆیدا نەبینم، ناڵێم کیسەکـــە ئامادە نییە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە شوێنی بابەتێکی ئەســـتویی یان ئامێرێک لە سروشتی بابەتەکەوە ســـەرهەڵنادات. سروشتەکەش لەســـەر شوێنەکە ڕاناوەستێت، بەڵکو مـــن شوێن بۆ بابەت و ئامێرەکان دیاریدەکەم. ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی شوێنی بابەتەکـــان دەهێنێتە کایەوە. هەمانکات ناڵێم ئاغاخان یان ســـوڵتانی مەراکیش لەنێـــو خانوەکـــەدا نییە، بەڵام دەڵێم پیـــرۆ، کە لـــەوێ دەژی نزیکەی چارەکە کاتژمێرێکـــە لێـــرە نییە[55] بەکورتـــی، ئامادە نەبوون شێوازێکی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییـــە و پەیوەندی بـــەو شوێنانەوە هەیە، کە ئەو ڕاســـتەقینەیەی تێدا ئامادە دەبێت. ئامادەنەبوون پەیوەندی نەبوون بە شوێنەوە نییە، بەپێچەوانەوە، مـــن پەیوەندی پیرۆ بە شوێنەوە، لـــە کاتێکدا دەڵێم لەوێ نییـــە دیاریدەکەم. دواجاریش، پەیوەندییەکەی پیرۆ بە شوێنی سروشتییەوە نییە. هەروەها، دەتوانم

---

٥٥ ئاغاخان ئیمام و پێشەوای دەستەی شیعەی ئیسماعیلی نیزارییە. شوێنکەوتوانی ئەم دەستەیە بەشێک بوون لە فاتمییەکانی میسر و سەر بە (نیزار) کوڕی ئەلموستەنسیر (١٠٩٤ مردووە) خەلیفەی هەشتەمی فاتمییەکانن. لەوباوەڕەدان نیزار پاش مردنی باوکی دەبێت ئیمامەت و خەلافەت بگرێتە دەست. ناوی ئاغاخان بۆ ئیمامی ئەم دەستە شیعەیە یەکەمجار حەسەن عەلی شا لە ساڵی ١٨٤٥، کە لە ئێرانەوە چوو بۆ هیند بەکاری هێنا و لەو ڕۆژەوە ئەم دەستەیە بە ئاغاخانی ناسراون. زۆربەیان لە وڵاتی هیند و پاکستان و ئەفریقا دەژین. (وەرگێڕ)

بڵێم پیرۆ بۆ ســـەیرانەکە لە شوێنێک لـــە دەرەوەی شار، کە هەرگیز نەیبینیوە، نەهـــات. ئامادەنەبوونی پیرۆ بە پەیوەندییەکەی بـــە شوێنەوە پێناس دەکرێت. ئەو شوێنەش لەســـەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ڕادەوەستێت. ئامادەنەبوونی پیرۆ لەنێو ئەزموونی کەســـەکاندایە. ئامادەنەبوونەکـــەی شێوازێکی کۆنکرێتی بوونی پیرۆیە بۆ تێرێسا؛ پەیوەندییە لەنێوان ڕاستەقینە مرۆڤایەتییەکاندا، نەک لەنێوان ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی و جیهاندا. لە پەیوەندییەکەی نێوان تێرێسا و پیرۆدا پیرۆ ئامادە نییە. ئامادە نەبوون پەیوەندییە لەنێوان دوو یان چەند ڕاســـتەقینەیەکی مرۆڤایەتی، کە جەخت لەسەر ئامادەبوونی ئەو ڕاستەقینانە دەکات.

ئامادەنەبوونـــی پیـــرۆ لـــە پەیوەندییەکەیدا لەگـــەڵ تێرێســـا پەیوەندی بە ئامادەبوونییەوە هەیە. ئامادەنەبوونەکەش لەنێو پەیوەندی نێوان پیرۆ و تێرێسادا واتا دەبەخشـــێت. پیرۆ تێرێسای خۆشدەوێت، هاوسەری ئەوە، پشتگیری دەکات و هتـــد. ئامادەنەبوون، بوونی پیـــرۆ دەردەخات؛ بەڵام مردن ئامادەنەبوون نییە. دووری لەنێـــوان پیرۆ و تێرێسادا گۆڕان بەســـەر ئامادەبوونیاندا ناهێنێت. ئەگەر لە چـــاوی پیرۆوە بڕوانینـــە پەیوەندییەکە تێرێسا لەنێو جیهانـــدا، وەکو بابەت دەبینین یان پیرۆ هەست بە بوونی خۆی بەرانبەر تێرێسا، وەکو بکەر دەکات. لە حاڵەتـــی یەکەمدا، دوورییەکە ڕیکەوتە و واتاش لە پەیوەندییە بنەڕەتییەکەیاندا، بەو شێوەیـــەی پیرۆ خۆی لەنێو جیهاندا ئامادەدەکات نابەخشـــێت. لە حاڵەتی دووەمدا، پیرۆ هەســـتدەکات بوونـــی بۆ تێرێسا بەبـــێ دووری هەیە؛ تێرێساش دووری نێوانیانـــی لە ناوبـــردوە. دووری نێوانیان بەقـــەد پانتایی جیهانە، بەڵام بـــۆ تێرێسا پیرۆ دوور نییە، بووە بە بابەتێـــک لەنێو جیهانی ئەودا. بەهەرحاڵ، لەهەردوو حاڵەتەکـــەدا لابردن پەیوەندییە بنەڕەتییەکـــان ناگۆڕێت. گرنگ نییە نێوانی پیرۆی بکەر و تێرێسای بابەت، پیرۆی بابەت و تێرێسای بکەر گەورە یان بچوک بێت، چارەنووســـەکانی جیهان نەبڕاوەن. هیچ جیاوازییەک لەنێوان پیرۆی بابـــەت و تێرێســـای بکەر و تێرێسای بابەت و پیرۆی بکـــەردا نامێنێت. چەمکی ئەزمونگەراییەکانـــی ئامادەبوون و ئامادەنەبـــوون، ئامادەبوونی دیاریکراوی پیرۆ و تێرێســـا و تێرێسا و پیرۆن. ئەمانـــە ڕێگەی جیاوازی دەربڕینی ئامادەبونن. لە لەنـــدەن، ئیندیسی ڕۆژهەڵات، ئەمەریکا، لە بیاباندا پیـــرۆ بۆ تێرێسا ئامادەیە. پیرۆ تەنیا بـــە مردن ئامادەبوونەکەی خۆی لەناودەبـــات. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کـــە بوون بەگوێـــرەی درێژی و پانایـــی پەیوەندی بە شوێنەوە نییە. کەســـێک لەنێوان (ڕێگای گێرمەنتیس)م (ڕێگای سوان) دەکەونە نێو شوێنێکی-مرۆڤانەوە. ئامادەبوونی سوان و میرخانمی گێرمەنتیسە ئاماژە بۆ ئەم شوێنە دەکەن. ئێستا ئەم ئامادەبوونە لەگەڵ خۆیدا بەرزێتی شوێنیش پەیدا دەکات: ئامادەبوونی من و ئامۆزاکەم لە مەراکیش ڕێگایەک لەنێوانماندا دیاریدەکات و منیش لەنێو شوێنیکدا

دادەنێـــت، کـــە دەتوانم بە ڕێگا بەرەو مەراکیش نـــاوزەدی بکەم. ئەم ڕیگەیەش بێجگە لە دووری لەنێوان ئەوی دیَ وەکوَ بابەت و هەروەها وەکو (خۆ)ش، کە بۆ من بەبێ دووری ئامادەیە، چی دیکە نییە. کەوابوو، من خراومەتە نێو فرەڕێگای نەبـــڕاوە، کە بەرەو ئەو بابەتەم دەبات، لەنێو جیهانـــی مندایە و هەمانکات ئەو بابەتەش (خۆ)یەکی ئامادەبوونی ڕاستەوخۆ و بەرزە.

لەبەرئـــەوەی جیهان بە هەموو هەبووەکانەوە خۆی بۆ من دەردەخات، ئەوا ئەم ڕێگایانە دەبن بە کۆمەڵێک ئامێری ئاڵۆز، کە من بە هۆیانەوە دەتوانم ئەو کەسەی، وەکو بابەت دەردەکەوێت بەو (خۆ)یە ببینم، کە لەوێدایە. دەتوانین ئەم بۆچوونانەش بکەین بەگشتی؛ تەنیا پیرۆ، ڕێنە، لوسیان لە پەیوەندییەکەیان لەگەڵ مندا ئامادە یـــان ئامادە نین. ئەوان تەنیا کەســـێک نین شوێنی من دیـــاری بکەن؛ من، وەکو ئەوروپییەک پەیوەندییم بە مرۆڤە ئاســـیاوی و پێست ڕەشەکانیشەوە هەیە؛ وەکو پیاوێکی پیر لەگەڵ لاوێکدا، دادوەر لەگەڵ تاوانکاردا، بورژوا لەگەڵ کرێکاردا هەیە. بەتێکڕا شوێن و ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، پەیوەندی بە ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی هەمـــوو مرۆڤیکی زیندووەوە لەنێو بەســـتێنی ئامادەبوونـــە بنەڕەتییەکەوە هەیە. ئامادەبوونـــی بنەڕەتی لەوێدا واتابەخشـــە کە بوونێک بێـــت تەماشای کرابێت یان تەماشا بکات؛ ئەمەش دەکەوێتە ســـەر ئەوەیَ کەسانی دیکە بۆ من ببن بە بابەت، یان من بۆ کەســـانی دیکە دەبم بە بابەت. بوونَ بۆَ ئـــەوان فاکتۆرێکی بەردەوامی ڕاستەقینەی مرۆڤانەیە؛ من لەگەڵ هەموو بیرکردنەوەیەکدا هەست بە بوونی دەکەم. بـــۆ هـــەرچ شوێنێک بڕۆم، هەرچ کارێـــک بکەم من تەنیا لە گۆڕانـــی دوورییەکەم لە کەســـانی دیکەوە ســـەردەکەوم؛ ئەو ڕێگایانەم بـــۆ دەردەکەوێت، کە بە ئەوانم دەگەیەنێت. بۆ ئەوەی کەســـانی دیکە، وەکو بابـــەت بدۆزمەوە یان دووربخەمەوە، پێویستیم بەو ئەزموونانە هەیە من، وەکو بوون بۆ ئەوان دەردەخەن. کەسانی دیکە لە هەموو شوێنێکدا بۆمان ئامادەن و من دەکەن بە بابەت بۆ خۆیان. لەم ڕووەوە من لەو خاڵەدا بە هەڵەدا دەڕۆم، ئەگەر بڵێم ئەزموونەکەم ئەوان بە بابەت دەردەخات. من ئەزانم ئەو کەسەی بەرەولای من دێت (ئانی)یە و کەسێکی نەناسراویشە. لێرەدا، ئامادەبوونەکەی (ئانـــی) بۆ من گۆڕانی تێدا ڕوونـــادات. بێگومان، من دەگەمە ئەو باوەڕەی کەســـێک لە ســـوچە تاریکەکەوە تەماشای من دەکـــەت یان ئەوەی من بەکەسێکم دادەنا لقی درەختەکە بوو؛ ئامادەبوونی بنەڕەتی من بۆ هەموو کەسێک و ئامادەبوونی بنەڕەتی هەموو کەسێکیش بۆ من لەم حاڵەتانەدا ناگۆڕێت. دەرکەوتنی کەســـانی دیکە لە ئەزموونەکانی ڕۆژانەمدا بوونی ئەوان ناسەلمێنێت. دڵنیابوونم لە بوونـــی ئەوان لەودیو ئەزموونەکانەوەیە، بەڵکـــو بەپێچەوانەوە، بوونی ئەوانە، کە ئەزموونەکانی من دەهێننە کایەوە.

ئـــەوەی من توشی هەڵەکردن دەکات، ئەو ڕاســـتەقینەیە یان پەیوەندییەکەی

نێوان مـــن و ئەو نییە؛ (ئەو)ەیە، کـــە نوێنەرایەتی مرۆڤ-وەکـــو بابەت دەکات و نایکات. ئەوەی هەیە دووری و نزیکی کەســـەکەیە؛ ئەمەش خەســـڵەتی وەکو بابـــەت و پەیوەندییەکەی بە جیهانـــەوە دەردەخات. بە بابەتبوونی ئەویش لەنێو جیهاندا لەبەر ئەوەی لە شوێنێکی دیکەیە دەکرێتەوە. بە بابەتبوونی ئەو، لەگەڵ ســـەرهەڵدانی خۆیەتی مندا ســـەرهەڵدەدات، بەڵام من هەرگیـــز دڵنیانیم لەوەی ئەو کەســـە ئەو بابەتەیە. بوونی منیش بۆ ئەو بەهەمانشـــێوە خۆی دەردەخات. بێگومان من ئێستا بۆ هەندێک ئەڵمانی بابەتم. بەڵام ئایا بوونی من فەرەنسی یان پاریسییە، یان (ئەو) پاریسییەیە هەموو فاکتۆرەکان سەبارەت پاریس و فەرەنسا لە دەوری خۆیدا کۆدەکاتەوە؟

ئێستا دەتوانین لە ناوەڕۆکی تەماشاکردن تێبگەین. لە هەموو تەماشاکردنێکدا کەســـانی دیکە، وەکو بابەت یان ئامادەبوونێکی کۆنکرێتی لەنێو بەســـتێنێکەوە دەردەکـــەون؛ لە هەڵوێستێکی ناســـراوی کەســـانی دیکەشـــەوە، کە من توشی شەرمکـــردن یان دوودڵی دەکات، چۆنیەتی بوونـــی خۆم دیاریدەکەم و دەبم بەو بوونەی تەماشای دەکرێت. ئەمەش من دەکات بە (ئەو)شتە کۆنکرێتییەی تەماشای دەکرێت و بوونی کەســـانی دیکە بەرجەســـتە دەکات. منیش دەکات بە بوون بۆ ئەوان. ســـەلماندنی ئەم بارودۆخەی من یان ئەو مرۆڤەی بوو بە بابەت بۆ هەموو مرۆڤە زیندووەکان و فڕێدراوەتە بەر تەماشای ملیۆنێک لە ئەوان، ڕاکردنی منیش ڕۆژانـــە لە تەماشاکردنەکانیان، هەمانکات ســـەلماندنی بە بابەتبوونی منە. ئێمە هەموو ئەم لایەنانە لەنێو تەماشاکردندا کۆدەکەینەوە. هەموو تەماشاکردنێک ئەوە دەســـەلمێنێت، کە ئێمە بۆ مرۆڤە زیندووەکان هەین؛ ئێمە لەبەردەم (ئاگامەندی) ئەواندایین. ئەمەش فرەلایەنی دروســـت ناکات. فرەلایەنی بە بابەتەکانەوەیە. ئەو بوونـــەی لەلایەن (خۆ)یەکەوە تەماشای دەکرێت و (خۆ)کەش بۆ ئێمە دەردەخات لەبەردەم ڕاستەقینەیەکی یەک لایەنییدا ڕامان دەگرێت. لە کاتێکدا تەماشای ئەو کەســـانە دەکەم، کە تەماشای من دەکـــەن (ئاگامەندی) ئەوان لەنێو فرەلایەنیدا دادەنرێن. ئەگەر بمەوێت ئاوەڕ لە تەماشاکردنەکە نەدەمەوە و گوێ بە ئامادەبوونی کەســـانی دیکە نەدەم، ئەوا خۆم بـــە زنجیرەیەک ئەزمونی شاراوەی ئامادەبوونی ئەوان دەبەستمەوە و خۆم لەبەردەم خوایەکی خاوەنی دەسەڵاتی ڕەها و خۆیەکی نەبڕاوەدا دەدۆزمەوە. بەڵام ئەم دوو بە بابەتکردنە سەلماندنیان دژوارە.

ئەم بۆچوونە لەگەڵ نموونەیەکی ڕۆژانەی ژیانماندا چاکتر واتاکەی دەردەکەوێت: ئەگەر لە شوینێکی گشتیدا دەرکەوین یان لەسەر شانۆ دەورێک ببینین، وانەیەک بڵێینەوە هەرگیز ئەو ڕاستییەمان لا وون نابێت، کە تەماشادەکرێین و کارەکانمان لەبـــەردەم تەماشاکردنەکەدا بەڕێوەدەبەین. کاتێک لەســـەر باســـێک دەدوێین و بۆچوونەکانمان دەردەبڕین، ئامادەبوونی ئەو کەســـانەی دیکە نەناسراو دەبێت.

ئـــەوان بە پۆل یان گوێگران دانانرێن؛ تەنانەت تاکە کەســـەکانیش ناناســـینەوە. هەروەها بایەخ بە تەماشاکردنەکانیشـــیان نادەیـــن. ئەگەر بمەوێت بزانم ئەوان لە بۆچوونەکانی من تێگەیشتون و تەماشای بیسەران بکەم ئەوەی دەیبینم ڕووخساریانە بـــۆ من دەردەکەون. تەماشاکردنەکە وون دەبێـــت. لەبەرئەمە چەمکی (ئەوان) بۆ بارودۆخی نارەسەنی بوونی مرۆڤ بەکاردەهێنین. من لە هەرچ شوێنێک بم، ئەوان تەماشای من دەکەن. (ئەوان) هەرگیز نابن بە بابەت چونکە زوو هەڵدەوەشێنەوە. کەوابوو، تەماشاکردن ئێمـــە دەکات بە بوون-بۆ-ئەوان و بوونی ئەوانیش بۆ ئێمە دەسەلمێنێت. بەڵام لەمە زۆرتر بەرەو هیچ شوێنێکی دیکەمان نابات. ئەوەی گرنگە لێی بکۆڵینەوە پەیوەندی بنەڕەتی نێوان من و کەســـانی دیکەیە. یان باشترە ئەو پرسیارە بکەین، کە ئایا بوونی ئەو بوونەی بۆ کەسانی دیکەیە چییە؟

لە ڕوونکردنەوەی پێشـــتردا خاڵێک هەبوو پێویستـــە ڕەچاوبکرێت و لەوانەیە یارمەتـــی ئێمەش لە تێگەیشـــتنەکەماندا بدات. ئەمەش ئـــەو خاڵەیە، کە بوون-بۆ-کەســـانی دیکە لەنێو بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆدا نییە. ئیمە ناتوانین بوون-بۆ-کەســـانی دیکە لە بوون-بۆ-خۆوە و بوون-بۆ-خۆش لە بوون-بۆ-کەسانی دیکەوە دەربهێنین. بێگومان ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتیمان لەیەککاتدا بون-بۆ-خۆ و بوون-بۆ-کەســـانی دیکەیە، بەڵام توێژینەوەکەمان نایەوێـــت ئەنترۆپۆلۆجیش دابمەزرێنێـــت، مەحاڵیش نییە بوون-بۆ-خۆ بە جۆرێک ببینین خۆی لەکەســـانی دیکە ڕزگارکردبێت و ڕێگەنەدات کەس بیکات بە بابەت. بەڵام ئەم بوون-بۆ-خۆیە نابێـــت بە "مرۆڤ". کۆجیتۆ تەنیا فاکتۆرێکـــی پێویستیمان بۆ دەردەخات. ئەو فاکتۆرەش دۆزراوەتەوە و لەگومان بەدەرە؛ ئەوەیە، کە بوونمان لەگەڵ ئەودا، کە بوون-بۆ-خۆیە، بوونیشە-بۆ-کەسانی دیکە.

ئەو بوونەی تێڕامانی ئاگامەندی دەیناســـێت بوونێکی-بۆ-خۆی-بۆ-کەســـانی دیکەیە. کۆجیتۆکەی دیکارت ڕەهایەتی یەک فاکتۆر دادەمەزرێنێت، ئەویش بوونی منـــە. ئەگەر کۆجیتۆ درێژبکەینەوە بەمجۆرەی ئێمە کردوومانە، بوونی کەســـانی دیکەشمان بۆ دەدۆزرێتەوە. هەروەها دروستیشە بڵێین، بوونم-بۆ-کەسانی دیکە، کە لە ئاکامی دەرچوونی ئاگامەندیمدا دەیدۆزمەوە خەســـڵەتی ڕوودانێکی ڕەهای هەڵگرتوە. مادام ئەم ڕووداوەش مێژووییە چونکە بوونی کاتیی خۆم بۆ کەســـانی دیکـــە ئامادە دەکەم، ئەوا پێویستە بـــە ڕووداوێکی پێش مێژووی بە مێژووکردن ناوزەدی بکەین. مەبەســـت لە (پێش مێژوو) واتای پێش سەرهەڵدانی مێژوو لەنێو کاتـــدا نییە، کە هیچ واتایەک نابەخشـــێت، بەڵکو بەشێکە لـــەو بە کاتییکردنە بنەڕەتییەی خۆی دەکات بە مێژوو. لەهەمانکاتیشدا مێژوو پێکدەهێنێت. ئەمەش فاکتۆرێکی ســـەرەکی و بەردەوامە، کە وا لە ئێمە ناکات تێگەیشتن لە بوون-بۆ-کەسانی دیکە بە ناوەڕۆکێکی پێویست دابنێین.

ئێمە لەپێشتر باســـی جیاوازییەکانی نێوان ڕەتدانەوەی ناوەکی و دەرەکیمان کـــرد. بەتایبەتـــی لەوە دواین، کـــە بنەڕەتی هەموو زانینێک لـــەو پەیوەندییەدا دامەزراوە، کە بوون-بۆ-خۆ شتە زانراوەکە نییە. ئەم ڕەتدانەوەیە ناوەکییە؛ بوون-بۆ-خۆ لەنێو سەربەســـتییەکەیدا دەیدۆزێتەوە. باشترە بڵێین، تاکو ئەو ڕادەیەی بوون-بۆ-خۆ براوەیە ئەم ڕەتدانەوەیە. بەڵام ڕەتدانەوە بوون-بۆ-خۆ بەو بابەتەوە بە توندی گرێدەدات، کە ڕەتدراوەتەوە. ئێمەش لەم پەیوەندییەوە گوتمان، بوون-بۆ-خۆ ئەو بوونەش لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت، کە لەوەوە جیاوازە و بوونیشی ئەو بوونە ڕەتدراوە نییە.

ئەم پەیوەندییە بەبێ گۆڕان بەســـەر بوون-بۆ-خۆ و بوون-بۆ-کەسانی دیکەدا دەســـەپێنرێت. ئەگەر کەسانی دیکە، بەگشتی، هەبن، ئەوا پێویستە من کەسانی دیکە نەبم. ئەم ڕەتدانەوەیە بوونی من و بوونی کەســـانی دیکە، وەکو دوو شتی جیاواز بەرجەستەدەکات. ئەو ڕەتدانەوەیەی بوونی من پێکدەهێنیت، هیگڵ گوتەنی، بوونم بەرانبەر کەسانی دیکە دژوەســـتاو ڕادەگرێت و (خۆ)ی من دادەمەزرێنێت. با لەمەش وا تێنەگەین، کە (خۆ) دێتە نێو ئاگامەندیمانەوە و جێنشـــین دەبێت؛ بەڵکو (خۆ) لە ئاکامی ڕەتدانەوەی خۆیەکی دیکەدا ســـەرهەڵدەدات. ئەمەش خۆ هەڵبژاردنـــی خۆیە، کە دەیەوێت بەردەوام خۆی بێـــت. بوون-بۆ-خۆیەکیش، کە خۆیە بەبێ ئەوەی خۆی بێت دەدۆزرێتەوە.

ئـــەو بوون-بۆ-خۆیەی منم لە ڕەتدانەوەی کەســـانی دیکەدا دەبێت بە خۆی. ئـــەو پێوەرەی بۆ زانینمان دانا و وتمان شتە زانراوەکە (من) نییە، لێرەدا بەکاری دەهێنین. بوون-بۆ-خۆ لە بوونیدا بوون-بۆ-کەسانی دیکەی هەڵگرتوە و هەمانکات ئەوانیش نییە. بۆ ئەوەی بوونی ئاگامەندی نەبێت بە ئەوان و کەســـانی دیکەش هەبـــن و ببن بـــە مەرج بۆ بوونی خۆ پێویستیمان بە (کەســـی ســـێیەم)، وەکو گەواهێک دەبێت. لێرەدا پێویستە دوو شت بزانین؛ دەبێت ئاگامەندی خۆی بێت و ئەو شتەش بێت، کە نییە؛ دەبێت ئاگامەندی سەربەســـتانە خۆی لە کەســـانی دیکە جیا بکاتەوە و خۆی بەو شتە دابنێت، کە نییە و لەگەڵ خۆیدا یەکبگرێتەوە. ئـــەم جیاکردنەوەیە بوونی ئەوە و دەبێتە هۆکاری بوونی کەســـانی دیکە لەوێدا. ئەمەش ئـــەوە ناگەیەنێت، کە ئاگامەندی بوونی کەســـانی دیکە دێنێتە کایەوە، بەڵکو بوونی کەسانی دیکە، وەکو دۆخێکی (لەوێدا) دەدۆزێتەوە. شێوازی بوونی ئـــەوەی، کە بوون-بۆ-خۆ-ئەو-شتە نییە بە کەســـانی دیکە ناســـراوە لە ڕێگەی نەبوونـــەوە توشی ئیفلیجـــی دەبێت. بوون-بۆ-خۆ کەســـانی-دیکە نییە. ئەمەش ڕاستەوخۆ نەدراوە و بوون-بۆ-خۆ بەردەوام هەڵی دەبژێرێت؛ زیندووبوونەوەیەکی بەردەوامـــە: ئاگامەندی ناتوانێت ئەوان بێت چونکە ئاگاییە لە (خۆ). ڕەتدانەوەی ناوەکـــی لەگەڵ ئامادەبوون لە جیهاندا دەبێت بە یەکێتییەک و بوون دەردەخات.

پێویستە کەســـانی دیکە لەبەردەم ئاگامەندییـــدا ئامادەبن و بچنە ناوەوەی تاکو ئاگامەندی نەبوونیەکەی خۆی بناســـێتەوە و لەدەســـت ئەوان خۆی ڕزگار بکات. ئەگـــەر ئاگامەندی[ئەو نەبوونە نەبێت]و شتێک بێت، ئەوا جیاوازی لەنێوان خۆ و کەسانی دیکەدا نامێنیت.

ئێمە خاڵێکی دیکەش دەخەینە ســـەر باسەکەمان. ئاگامەندی دەزانێت ئەوشتە نییە و ئەم پەیوەندییەی ڕەتدانەوەش دوو لایەنی نییە. ئەوشتەی بەرانبەر ئاگامەندی ئامادەیە هەســـت بە بوونی خۆی، وەکو شتێکی لـــە ئاگامەندی بەدەر ناکات. ئەو شتێکە بەبێ ئاگامەندی. پەیوەندییەکەی بە ئاگامەندییەوە دەرەکییە چونکە بوونی-لەنێو-خۆیـــە و بەو جۆرەش بۆ ئاگامەندی خـــۆی دەردەخات. بەڵام، بەپێچەوانەی ئەمەوە، ڕەتدانەوەکەی نێوان خۆ و کەسانی دیکە ناوەکی و دوولایەنییە. ئەو بوونەی ئاگامەندی بە جیاواز لە خۆی دادەنێت ئەو بوونەیە، کە (ئەم) ئاگامەندییە نییە. لە کاتێکدا بوونی کەسانی دیکە دەردەکەوێت ئاگامەندی تێدەگات، کە شێوازی بوونی لەگەڵ کەسانی دیکەدا جیاواز نییە. کەسانی دیکەش ئاگامەندین. کەسێکی دیکە، وەکـــو ئەو بوونی-بۆ-خۆیە و ئاماژەش بۆ ئەگەرەکانـــی ئەو دەکات. دژایەتییەکەی نێوانیشـــیان ناکەوێتە سەر ئەوەی چەند ئاگامەندی لەوێدا هەن. کەسانی دیکە بۆ خۆ، وەکو ڕەتدانەوە هەن. لەبەر ئەوەی کەســـێکی دیکە (خۆ)یە، ئەوا هەردووکمان ڕەتـــی یەکدی دەدەینەوە. ئاگامەندییەک ناناســـم، کە ئەویش من نەناســـێت. ئەو ئاگامەندییەی من نەناســـێت ئاگامەندییەکە لـــە دەرەوەی جیهاندا و تەنیا دەژی؛ ئەویش ئاگامەندی خۆمە. کەوابوو، ئەو کەسەی من دەیناسم و نامەوێت ببم بە ئەو بوونێکە، کە من بۆ ئەو هەم. من تەنیا هەوڵنادەم نەبم بە هۆکاری ڕەتدانەوەکە و نەبم بە ئەو، هەروەها نامەوێت ئەو بوونەش بم، کە من نییە.

ئـــەم دووجۆرە ڕەتدانەوەیـــە لە ڕوویەکەوە خۆ لەناوبردنـــە. یەکێک لەم دوو ڕووداوانەی لەدوایە: من خـــۆم ناکەم بە بوونێکی دیاریکراو. من نابم بەبابەت بۆ ئەو، ئەویش بە بابەت بۆ من. لەم حاڵەتەدا، کەسەکەی دیکە نابێت بەو کەسەی منە، یان ئەو خۆیەی لەبەر ئەوەی نایەوێت ببێت بە من، من دەکات بە بابەت. یان ئەو بوونە کەســـێکی دیکەیە و نایەوێت خۆی بکات بە من. لەهەردوو حاڵەتەکەدا من بۆ ئەو دەبم بە بابەت و ئەویش بوونی-بە بابەتبوونی خۆی لەناودەبات.

لە بنەڕەتەوە کەســـەکەی دیکە من و بابەت نییە. ئەوەی من ڕەتی دەدەمەوە ئەو(من)ەیـــە، کـــە کەســـەکە دەیەوێت بیکات بـــە بابەت بۆ خـــۆی. من خۆم ڕەتدەدەمەوە. لەم ڕەتدانەوەیـــە بوونی ڕەتدراوەی خۆم دادەمەزرێنم. لێرەدا من تەنیا بوونی کەســـانی دیکە ناناســـمەوە. بوونە ڕەتدراوەکەش؛ کە بوونی-من-بۆ-کەسانی دیکەیە دەناسم. وونبونی منێکی نامۆ دەبێتە هۆکاری وونبوونی کەسانی دیکـــە لە ڕێگەی لەناوچوونی منەوە. من لە کەســـانی دیکـــەوە بە ڕێگەی دانانی

منێکی نامۆ لەبەردەستیاندا، ڕادەکەم. بەڵام، لەگەڵ ئەم کارەدا بوونێکی دابڕاوی خۆم لە کەسانی دیکە هەڵدەبژێرم. منە نامۆکە بە بوونی خۆم دادەنێم. دابڕانم لە کەســـانی دیکە لەسەر ئەو بناخەیە دامەزراوە، کە ئەو (من)ە خودی خۆمم، بەڵام کەسانی دیکە ڕێگە نادەن ئەم ئاگاییەم هەبێت.

ئەو (من)ەی نامـــۆ بووە و ڕەتدراوەتەوە کتوپڕ پەیدادەبێت من بە کەســـانی دیکەوە دەبەستێتەوە و هێمای جیابوونەوەیەکی ڕەهاشە لە نێوانماندا. لەڕاستیدا، بەو جۆرەی خۆم، وەکو بابەتێک دەبینم جیابوونەوەی من و کەسانی دیکە هەرگیز ڕوونادات. منیش بەرانبەر ئەمە بەرپرســـم. بەڵام مادامەکی کەســـانی دیکەش لە بەرپرسییەکەدا هاوبەشن، ئەوا ئەم (من)ە لە دەستم ڕادەکات چونکە ئەوەیە، کە کەســـانی دیکە دەیانەوێت. من خۆم بە خاوەنی دادەنێم، کەچی لە من ڕادەکات. مادام من نامەوێت ببم بە کەسانی دیکە، کەواتە دیسانەوە ئەوەی لە من ڕادەکات خۆمم. لەڕاســـتیدا ، ئەو منەی بووە بـــە بابەت و لە من ڕادەکات نابێت ببێت بە خۆیەکی ڕووت بۆ من و نابێت خۆم بەخاوەنی دابنێم.

کەوابوو، بوونم-بۆ-کەســـانی دیکە، بۆ نموونـــە، بوونم وەکو بابەت، بوونێکی ئەندێشـــاوی نییە لە منەوە دەرچووبێت و لەنێـــو ئاگامەندییەکی بێگانەدا خۆی دامەزرێنێت. بوونێکی ڕاســـتەقینەیە، حاڵەتی بوونی منە لـــە بەرەنگارییەکەیدا لەگەڵ کەســـانی دیکـــەدا و ئەوانیش لەگەڵ مندا. بوونی منـــە لە دەرەوەدا. من کاتێک دەتوانم بڵێم، کە کەســـێکی دیکە من نییە، ئەگەر ئەو کەســـە (خۆ) بێت. ئەگەر من بوونی کەســـێکی دیکـــە، وەکو بابەتێک لەنێو جیهانـــدا ڕەتبدەمەوە، ئەوا بوونـــی بابەتێکم ڕەتداوەتەوە نەک خۆ. من بـــێ بەرگریکردن لەخۆم لەنێو سنورەکانی (خۆیەتی) ئەودا دەمێنمەوە، کە هەمانکات سنوری منیشە. ئەمەش لە منەوە تەنانەت لە بیرکردنەوەمەوە دەرناچێت چونکە ناتوانم بوونی خۆم سنوردار بکەم، ئەگینا دەبووم بە هەموویەکی براوە. لەلایەکی دیکەوە، ســـپینۆزا گوتەنی، ئەوەی بیر ســـنوردارەدەکات، بیرێکی دیکەیە. ئاگامەندی لـــە ڕێگەی ئاگامەندی منەوە، سنوردار دەبێت.

ئێستا لە ســـروشتی بوونم، وەکو بابەت تێدەگەم، ســـنوردارێتییە لەنێو دوو ئاگامەندییدا. ســـنوردارێتیش دوو واتای هەیە، لەلایەکەوە ئەو قاڵبەیە منی تێدا پەســـتراوم و لەلایەکـــی دیکەوە ئەو زنجیرە ماتماتیکییەیـــە، کە بڕانەوەی نییە. هەموو بوونێک من دەمەوێـــت بیگەمێ لە هێڵێکی چەماوە دەچێت. کەوابوو، من هەموویەکم هێشـــتا پەیدانەبووم و خۆم دیارینەکردووە و بە بڕاوەیی ماومەتەوە. من لە دەرەوەی بوونی خۆمدا ڕاوەستاوم. باشترین بەراوردکردن بۆ تێگەیشتن لە بوونی خۆم و هەوڵدانە بێهودەکەشی لە باســـەکەی (پۆنیکێر)دایە سەبارەت پلەی گەرما؛ ئەگەر لە چەقەوە دوورکەوینەوە پلەی گەرما کەمدەبێتەوە. زیندەوەرەکان

له چەق دووردەکەونەوە و بەرەو سەرەوە دەڕۆن. کەمبوونەوەی گەرماییش تیایاندا بەردەوام گرژبوونەوەیان زیاددەکات. دەیانەوێت تەخت بن و بە مەبەستەکەیان بگەن، بەڵام له ڕووبەرەکەدا دوورییەکی نەبڕاوە له یەکدییان جیادەکاتەوە. هێشتا، ئەم بڕانەوەیە، کە لەودیو دەستەڵاتەوەیە، ئەو خۆیەی بووە بە بابەت بەرهەمی ئەندێشە نییە و بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە. ئەم بوونەش شتێکی لەنێو-خۆیە چونکە دەرەکی نییە. هەمانکات بوون-بۆ-خۆش نییە چونکە ئەو بوونە نییە من لە ڕێگەی ڕەتدانەوەی ناوەکییەوە دەمەوێت بیگەمێ. بوونێکە بۆ-کەسانی دیکە و لەنێوان دووجۆر ڕەتدانەوەدا دابەشکراوە و بەشەکانی واتای جیاوازیان هەیە. کەسێکی دیکە ئەم (من)ە نییە، کە دەیبینێ و منیش ئەم خۆیەی خۆم نابینم، کە ئێستا من پێکدەهێنێت. ئەم (من)ەی کەسەکە هێناویەتەکایەوە و ڕاستەقینەیەکە لەسەر جیابوونەوەی ئەو دوو بوونە ڕادەوەستێت بەتەواوی لە یەکدی دەچن. مادام ئاگامەندی دەتوانێت ئاگامەندییەکی دیکە سنورداربکات، ئەوا هیچی دیکە ناکەوێتە نێوانیانەوە.

لەو بۆچوونەوە، کە کەسێکی دیکە وەکو (خۆ) بۆ من خۆی دەردەخات و منیش دەبم بە بابەت بۆ ئەو، دەردەکەوێت بە بابەتکردنی ئەو کەسە لەلایەن منەوە لە پەیوەندییەکەی نێواماندا دووەم هەنگاوە. ئامادەبوونی کەسەکە پێش ئەوەی سنورداریێتییەکەی بوونم بۆ دەرکەوێت هانمدەدات سەربەستییەکەم و خۆم بەو کەسە دانەنێم و ئەویش بە کەسێکی دیکە دەبینم؛ وەکو (خۆ)یەک دوور لە دەستەڵاتی من و هەمانکات دەتوانێت بوونیشم سنوردار بکات. بێجگە لە کەسەکە هیچی دیکە من سنوردار ناکات. کەوابوو، ئەو لەگەڵ سەربەستییەکەیدا و دانانی پرۆژەکانی بوونی من دەخاتە دەرەوەی کایەکەوە و بەو دەرکردنە لە بەرزیتییەکەم ڕووتدەکاتەوە. یەکەمجار دەبێت یەکێک لەو دوو ڕەتدانەوانە هەڵبژێرم، کە من بەرپرسی نیم و لە بوونی منیشەوە دەرناچێت. بەڵام، لەگەڵ هەستکردن بەم ڕەتدانەوەیە ئاگامەندییەک سەبارەت بوونی خۆم، وەکو خۆم دێتەکایەوە؛ کە لەسەر ئەو بیرۆکەیە ڕاوەستاوە من بەوڕادەیە ئاگام لە خۆمە و خۆم لە ئاستی ڕەتدانەوەکەی کەسێکی دیکەدا بەرپرسم چونکە ئەوە ئەگەرێکی منە. ئەمەش دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی ڕەتدانەوەی دووەم. ئەو ڕەتدانەوەیەی لە منەوە بەرانبەر کەسێکی دیکە دەردەچێت. لەڕاستیدا ئەم ڕەتدانەوەیە بە شاراوەیی لەگەڵ ڕەتدانەوەی یەکەمدا هەبووە. بەڵام یەکەمیان بە هۆکار بۆ دووەمیان دادەنێین. ئەگەر کەسێک هەبێت ڕێگەنەدات من بەشداری کایەکە بکەم لەبەر ئەوەیە، کە من لەگەڵ هەستکردن بە سنورداریێتییەکەی بوونم خۆم لەو کەسە دووردەخەمەوە. ئاگاییم لەم خۆ دوورخستنەوەیە ئاگاییمە لە سەربەستییەکەم. لەگەڵ دوورکەوتنەوەکەدا، کە کەسەکەی دیکەی کردووە بە خاوەنی سنورداریێتی

بوونم، منیش کەســـەکە دەخەمە دەرەوەی کایەکەم. کەوابوو، تاکو ئەو ڕادەیەی مـــن لە بوونی خۆم و ئەگەری سەربەســـتییەکەم بە ئاگـــام و بەرەو بوونی خۆم پڕۆژەکانم دەخەمەگەڕ بۆ ئەوەی خۆم بناســـم بەرانبەر بوونی کەسەکەی دیکەش بەرپرســـم. من، لەگەڵ جەختکردن لەسەر سەربەســـتییەکەم، دەبم بە هۆکار بۆ بوونی کەســـێکی دیکە. کەسێکی دیکە خۆی لە دەرەوەی کایەکەدا دەبینێت؛ ئەو بـــۆ ئەوەی ببێت بەوەی نییە پەنا بۆ من دەبـــات. بەرزێتییەکەش ئەو بەرزێتییە نییـــە، کە من ڕەتدەکات و ڕوو لەودەکات، بەڵکو بەرزێتییەکە لەنێو بیرکردنەوەدا و سوڕانەوەی خۆیە. مادام من هەردوو جۆرەکانی ڕەتدانەوە لە یەک کاتدا نابینم، ڕەتدانەوە نوێکـــە هەرچەندە لە ڕەتدانەوە کۆنەکەوە ســـەرهەڵدەدات بە ئاشکرا خۆی دەرناخات. ئامادەبوونی کەسەکەی دیکەش بە کەمییەوە دەردەکەوێت.

لـــەم حاڵەتەدا، من لـــەو پڕۆژەیەی بوونمدا جەخت لەســـەر ئـــەوە دەکەم، من کەســـەکەی دیکە نیم و بوونی کەســـێکی دیکە ســـنوردار دەکەم. هاندەری ئەمـــەش کاریگەرێتی خۆی دەخاتەگەڕ، ئـــەم کاریگەرێتییەش بۆچوونەکانی من دەگۆڕێت. بەڵام هەســـتکردنەکانم (وەکو ترس، شەرم، خۆ بەگەورەدانان) ئاماژە بـــۆ ئەزموونەکانی بوونم لەگەڵ کەســـانی دیکەدا دەکەن. ترس ئەوە دەردەخات، کـــە بوونم لەنێو جیهاندا دەبێتە هۆکاری ســـەرهەڵدانی هەڕەشەکردن لە من. من دەبم بەو بابەتەی لەنێو مەترسیدا دەژی. ترس بوونی من وەکو بابەت و بوونێکی لەنێـــو پانتایـــی بینینی مندا دەردەخات. منیش بۆ ئـــەوەی لەم حاڵەتە دەربچم و لـــە ترس ڕابکەم، بە بابەتبوونی خۆم بـــە بنەڕەتی دانانێم. ئەمەش بە دانانی خۆم بەو کەسەی لە بوونی کەســـێکی دیکە بەرپرسە دێتەکایەوە. کەسی دیکە، کەوابـــوو، دەبێت بەوەی من نامەوێت ببم و خۆم ناکەم بە خاوەنی ئەگەرەکانی و بە مردوو دایان دەنێم. من بە تێپەڕکردنی ئەگەرەکانی کەســـانی دیکەش دەتوانم ئەگەرەکانی خۆم تێپەڕبکـــەم. هەروەها ئەمەش لەوێدا ڕوودەدات، کە من بگەمە ئەو باوەڕەی ئەگەرەکان خەســـڵەتی ئەو کەســـەن، کـــە ئامادەبووونی من ئەوی کردووە بە کەســـێکی دیکە. من ئەگەرەکانی ئـــەو تێپەڕدەکەم چونکە ئەوانیش مـــن تێپەڕدەکەن و لەوێوە من بەرەو ئەگەری نوێتر دەڕۆم. لێرەدا خۆ-ئاگاییی بە دەست دەهێنم و لە ڕێگەی دانانی ئەگەرەکانی کەسێکی دیکە بە مردوو بەردەوام خۆم لە ئاســـتی ئەگەرە نوێکانی بوونمدا دەدۆزمەوە. شەرمکردن هەستکردنە بە بوونی خۆم لە دەرەوەدا و مامەڵەکردنە لەگەڵ کەســـێکی دیکەدا، کە خۆم تیایدا بێ بەرگری دەبینم و دەکەومە بـــەر ئەو ڕۆشناییەی لە (خۆ)یەکەوە دەردەچێت. شەرم هەســـتکردنە بـــەو بوونەی، کە بەبێ گۆڕان هەبـــووم: "لە چاوەڕوانیدا"، لەشێـــوازی بوونێکدام، کە هێشـــتا نەبووە یان ئەو بوونەیـــە "تێپەڕیوە". شەرم هەستێکی ڕووت بەرانبەر تاوانکردن نییە، بەڵکو هەستکردنە بە بابەتبوونی خۆم.

هەستکردنە بە دابەزینی پلەی بوونم و چەق وەستانی لە ئاستی کەسێکی دیکەدا.
شەرمکردنی بنەڕەتی پەیوەندی بە ڕووداوێکی دیاریکراوەوە نییە، بەستراوە بە بوونی منەوە لەنێو جیهاندا و پێویستی بوونی کەسانی دیکەیە بۆ من تاکو لە بوونی خۆم دڵنیابم. خۆنەویستی و ئەو ترسەی لە کەسێکی ڕووتدا هەیە و لەوەی دەبینرێت نموونەیەکی هێماین بۆ شەرمکردن. لێرەدا، لەش دەبێت بە بابەتێکی بێ بەرگری. جل لەبەرکردنیش شاردنەوەی ئەو حاڵەتی بە بابەتبوونەیە؛ دانانی مافی تەماشاکردنە، بەبێ ئەوەی ببینرێت و بوونت بە (خۆ) دادەنێت. ئەمەش لە (تەورات)دا ئامـاژەی بۆکراوە، ئەو کاتەی ئادەم و حەوا تاوانەکە دەکەن تێدەگەن، کە (ڕووتن). شەرمکردن حاڵەتی هەستکردنە بە بوون، وەکو بابەت.

لەڕاستیدا، لە یەکەم ساتی سەرهەڵدانی کەسێکی دیکەدا، وەکو بابەت (خۆ) یەتی ئەو دەبێت بە خەسڵەتێکی سادەی ئەو بابەتە. بوونی ئەو لە ئاستی خۆیدا دادەبەزێت و دەبێت بە بابەتێکی چەندلایەنی بۆ من. ئەو، وەکو کەسێکی دیکە و بابەتێک لەنێویدا (خۆ)یەتی هەڵگرتووە. ئەمەش لەو سندوقە دەچێت، کە ناوەکەی هیچی تێدا نییە. لێرەدا من بوونی خۆم دەدۆزمەوە چونکە نابم بە بابەت بۆ بابەتێکی دیکە. نکۆڵی لە پەیوەندییەکەشم لەگەڵ کەسەکەی دیکەدا ناکەم. بەڵام ئاگایی ئەو لە بوونی من، لەبەر ئەوەی ئاگایی بابەتە، ئاگاییەکی ناوەکی ڕووت و بێ کاریگەرێتییە. یەکێکە لەو خەسڵەتانەی لە ناوەوە هەیەتی و لە بوونی کامێرا دەچێت. بەو ڕادەیەی من بوونی کەسێکی دیکە لەوێدا پەیدادەکەم خۆم بە سەرچاوەیەکی سەربەستی ئەو زانینە دادەنێم، کە کەسەکەی دیکە لەبارەی منەوە هەیەتی. بوونی ئەو کەسەش بۆ من وادەردەکەوێت، کە ئەو زانینە کاریتێکردوە. ئەم زانینە خەسڵەتی خۆیەتی پەیوەندییەکی نوێیە. لەنێو ئەو خۆیە-بابەتییەدا دەمێنێتەوە و خەسڵەتێکە پەیوندی بە کەسێکی دیکەوە هەیە، کە من کارم تێکردوە. ئەو زانینەش کارناکاتە من چونکە وێنەی منە لەنێو ئەودا. کەوابوو، خۆیەتی کراوە بە شتێکی ناوەکی و ئاگامەندیش بە ئامادەنەبوونی بنەماکان و ئەگەرەکانیش بە خەسڵەتەکان. زانینی کەسەکەی دیکەش لە بارەی منەوە بووە بە وێنەیەکی ڕووتی من لەنێو ئاگامەندی کەسەکەدا. شەرمکردن داوای تێپەڕبوون دەکات چونکە من بۆ کەسێکی دیکە بووم بە بابەت. ئەمەش ئاگاییە لە بوونی خۆم. لە کاتێکدا شەرم دەردەبڕین و دەڵێین (من شەرم لە خۆم دەکەم) بوونی خۆم، وەکو بابەت بۆ کەسێکی دیکە دەبینم. لەهەمانکاتیشدا بوونی من کەسە شەرمنەکە بەرجەستەدەکات. لەم ڕووەوە، شەمکردن یەکێتییەکی سێ ڕەهەندییە: "من لە ئاستی کەسێکی دیکەدا شەرم لە بووی خۆم دەکەم". بەلابردنی یەکێک لەم ڕەهەندانە شەرمکردنیش لەناودەچێت.

ئەگەر من لەبەردەم (ئەوان)دا هەست بە شەرمکردن بکەم، تاکو ئەوان لە

یەکدی جیانەکەمەوە و نەیانکەم بە تاکەکان نابن بە بابەت بۆ من. ئەگەر (ئەوان) پێکەوە یەکێتییەکی ڕەهایان بدەمێ و بە (خۆ) دایان بنێم و نەکرێن بە بابەت ئەوا من خۆم دەکەم بە بابەتێکی هەمیشـــەیی و شەرمکردنەکەشم بە هەســـتکردنێکی بەردەوام. ئەمەش شەرمکردنە لەبەردەم خوادا؛ هەستکردن بە شەرم لەبەردەم (خۆ) یەکدایە، کە هەرگیز ناکرێت بە بابەت. من لەبەردەم خوادا هەمیشـــە خۆم وەکو بابـــەت دەبینم. بوونێکی نامۆم لە دەرەوەی خۆمدا. ئەمەش بنەڕەتی ترســـە لە خـــوا. کۆمەڵـــەی ڕەش، پەیوەندیکردن بە خێـــوەوە و زۆر نەریتی دیکەش هەن خۆدانانن بە بابەت لە ئاســـتی خۆیەکـــی ڕەهادا. لەکاتێکدا شوێن خراپە دەکەوم بیر لە بوونی بەرزی خوا دەکەمەوە. هەوڵدەدەم خوا توشی ئازارچێشتن بکەم یان تـــوڕەی کەم. ئەم هەوڵدانانـــە باوەڕکردنە بە بوونی خوا، وەکو خۆ، کە ناتوانین بیکەین بە بابەت و ناکۆکییان تێدایە و ســـەرکەوتوو نین. شانازیکردن پەیوەندی بە شەمکردنی بنەڕەتییەوە هەیە. لەڕاســـتیدا شانازی لەسەر بناخەی شەرم یان شەرمکردن لەوەی بووبێت بە بابەت دادەمەزرێت. هەروەها هەستکردنێکی ئاڵۆزە. لە شانازیکردندا هەســـت بە بوونی کەســـانی دیکە دەکەم، وەکو خۆ و لە ڕێگەی ئەوانەوە من بە بابەت دەکرێم. خۆم بەرپرسیش لە ئاستی بە بابەت-بوونی خۆمدا دادەنێم. شانازی لەلایەکەوە جەختکردنە لەســـەر ئـــەو شێوازی بوونەی هەمە و دەمەوێت بەو شێوەیە بمێنمـــەوە. کەوابوو، ئێمە مامەڵە لەگەڵ شەرمدا دەکەین و بەرەنگاری ڕاکردن لەو حاڵەتە و بڕوای خراپیش دەکەین و بەردەوام کەســـانی دیکەش بە (خۆ)دادەنێین. دەمەوێت کاریگەرێتی بە بابەت-بوونی خۆشم بەســـەر ئەوانەوە ببینم. بەکورتییەکەی دوو جۆر هەڵوێستی ڕەســـەنانە هەیە: یەکەمیان ئەوەیە من هەســـت بە بوونی کەســـانی دیکە وەکو (خۆ)دەکەم و ئەوان دەمکەن بـــە بابەت، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ســـەرهەڵدانی شەرمکردن؛ دووەمیان، خۆم بە بابەتێکی سەربەســـت دادەنێم، کە بڕیار لەسەر شێوازی بوونی کەسانی دیکە دەدات. ئەمەش خۆبەزلدانانە یان جەختکردنە لەسەر سەربەستییەکەم لە ئاستی بە بابەتبوونی کەسانی دیکەدا. بەڵام شانازی هەستکردنێکە هیچ لایەنێک هاوشانی ڕاناوەســـتێت و لەنێو بـــڕوای خراپدایە. لە شانازیکردندا منـــی بابەت دەمەوێت کاربکەمە ســـەر کەسانی دیکە. جوانی، هێز یان زیرەکییەکەم، کە کەسێکی دیکە دەیبینێـــت، بەو ڕادەیەی من دەکات بە بابەت، هەوڵدەدەم ســـودی لێوەربگرم و بەهۆیەوە کاربکەمە ســـەر ئەو کەسەی لە مندا دۆزیویەتییەوە. کارێک بکەم ئەو منی خۆشبوێت یان پەســـەندم بکات. هاوکات من داوا لە کەســـەکە دەکەم منی بابەت بە سەربەســـت دابنێ. ئەمە تەنیـــا ڕێگەیەکە من بەو جوانییە یان هێزەوە ڕابگرێـــت. کەوابوو، داواکارییەکەی من جـــۆرە ناکۆکییەکی تێدایە. من دەمەوێت کار بکەمە ســـەر کەســـەکە و ئەویش لەهەمانکاتدا سەربەســـتە. ئەم داواکارییە

دەچێتـــە شێوازی بڕوای خراپەوە و بـــەرەو لەناوچوونیش دەڕوات. من پێویستیم بە کەسێکی دیکەیە تاکو نهێنی بوونم ئاشکرا بکات. من لە شانازیکردندا دەچمە ناخی کەســـەکەی دیکەوە، کە بووە بە بابـــەت بۆ من و لەو بابەتەوە بابەتبوونی خۆم دەدۆزمەوە. ئەمەش ئەو مریشکە دەکوژێت، کە هێلکەی زێڕمان بۆ دەکات. لەگەڵ بە بابەتکردنی کەســـەکەدا من خۆم دەکەم بە وێنەیەکی نێو ئەندێشـــەی ئەو بابەتە. من لەنێو ئەو وێنەیەدا خۆم ناناســـەمەوە و بە خەسڵەتێکی نێو (خۆ) ی ئەوی دادەنێم و بە تەنیا بەرانبەر بوونی بە بابەتبوونی ئەو بەبێ ناســـینەوەی خۆم ڕادەوەســـتم. شەرمکردن، ترس، شانازی کاردانەوەی بنەڕەتی منن: ڕێگەی جیاوازن بۆ گەیشتن بە بوونی کەسانی دیکە و ناسینەوەی بوونی خۆمە لە ئەواندا و هەمانکات بە بابەتکردنی ئەوانیشـــە. کەسێکی دیکە، کە کتوپڕ وەکو بابەتێک بـــۆ من ســـەرهەڵدەدات بابەتێکی ڕووتکراوە نییە. ئەو بـــە واتاوە لەبەردەم مندا قووتدەبێتەوە. ئەو تەنیا بابەتێکی سەربەســـت یان بەرزێتی نییە، بەڵکو (تورە) ش دەبێت، دڵی خۆش دەبێت و گوێگریشە؛ ڕووخۆشە، ناڕازە یان چڵێسە و زوو هەڵدەچێت...هتد. ئەمانە کەسێکی دیکە بۆ (خۆ)ی من دەکات بەو بابەتەی لەنێو جیهاندایە. من بەرزییەتییەکەی ئەو دەناســـمەوە، بەڵام بە بەرزێتییەکی بەرزێتی دانانێـــم. ئەوە، وەکو کۆمەڵێـــک ئامێر دەردەکەوێت، کە من لە پڕۆژەکانمدا خۆم دەگەیەنمە ئەودیویان. ئەمەش لەبەر ئەوەیە من هەرگیز خۆم بە ئەگەرێکی ڕووت دانانێـــم و بوونێکی کۆنکرێتیم لەنێو پڕۆژە دیاریکراوەکانمدا هەیە و دەمەوێت بە کۆتاییان بگەم.

بوونـــی ئاگامەندانە بەردەوام خۆی بەم پڕۆژانـــەوە خەریک دەکات. کەوابوو، من بە خۆخەریکردنم بە پرۆژە دیاریکراوەکانمەوە هەســـت بە بابەتبوونی کەسانی دیکە دەکەم. خۆ خەریکردنی کەسانی دیکەش، کە شێوازی بوونیان دیاریدەکات، بـــۆ من دەبێت بەو بەرزێتییەی بەرزێتـــی بوونی من تێپەڕ دەکات، دەبێت بە خۆ خەریکردنێکی ڕاســـتەقینە. بەو ڕادەیەی من هەم و خـــۆم خەریکردوە، ئەم خۆ خەریکردنە دەبێت خۆ خەریکردن بێت لەگەڵ کەســـێکدا، قەرزدانەوەیەک بێت... هتد. ئەمەیە کەســـێکی دیکە بە (خۆ) دادەنێـــت و دەیکات بە خۆیەکی دیکەی، وەکو من. کاتێک بوونی کەسێکی دیکە دەبێت بە بابەت، خۆخەریکردنەکەی کەم دەبێتەوە و دەبێت بە بابەتێکی خۆخەریککەر، بەو جۆرەی دەڵێین، "چەقۆکە بە قوڵـــی چووە نێو برینەکەوە." یان "لەشکرەکە لە دۆڵێکی تەســـکدا هێرش کرایە سەری." پێویتسە بزانین دانانی کەسانی دیکە لەنێو جیهاندا، کە لە ڕێگەی بوونی منەوە دادەمەزرێت بوونێکی ڕاســـتەقینەیە. هەمانکـــات، من لەنێو ئەو جیهانەدا ونـــی دەکەم، کـــە جیهانی منە چونکە بوونی ئەو بۆ منـــە و من نامەوێ بۆ ئەو بـــم و لە دەرەوەی بوونی خۆمدا دایدەنێـــم. کەوابوو، بابەتگەری تێڕامانی ڕووتی

من بۆ بوونی کەسـێکی دیکە نییە؛ دیاریکردنێکە لە منەوە بەرەو کەسانی دیکە دردەچێت. من [بەم هەڵوێستەم] بوونی کەسانی دیکە لەنێو جیهاندا دادەنێم.

ئـەوەی مـن دەیبینم بوونـی کەسـانی دیکەیە-لەنێو-هەڵوێستـدا. من ئەو لەنێـو جیهاندا بەو شێوەیـە دەبینم، کە جیهان لـە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. لە نیوەی دووەمی ئەم نوسـراوەدا باسـی هەموویەتی ئامێرەکان و پەیوەندییان بـە ئەگەرەکانمەوە دەکەم. مادام من ئەگەرەکانـم، ڕیزکردنی ئامێرەکان لەنێو جیهاندا دەبێت بە وێنەی نێو ئەگەرەکانی من، کە بوون بە پرۆژە و ڕوو لە بوون-لەنێو-خـۆ دەکەن. ئەم وێنەیـەش بوونی من دەردخات و لە ڕێگەی کارەکانمەوە خۆمی لەگەڵدا دەگونجێنم. کەسـێکی دیکەش لەبـەر ئەوەی (خۆ)یە بە وێنەی بوونییەوە خۆی خەریکدەکات. کاتێک من وەکو بابەت دەیبینم دەبێت بە ئامێرێک و پێناسـەکەشی دەکەوێتە سـەر پەیوەندییەکەی بـە ئامێرەکانی دیکەوە. ئەو ئامێرێکە لەنێو سیستەمی ئامێرەکانی مندا. دۆزینەوەی بوونی کەسەکە دەکەوێتە سـەر ئەم سـیستەمە و ئامادەنەبوونی دیوی "ناوەوە"ی. ئەم ئامادەنەبوونەش سەرهەڵدانێکی بەردەوامی بابەتەکانە لەنێو جهانی مندا. واتای ئەم سەرهەڵدانەش ئامێرەکان دەستنیشـانی دەکەن. هەمووی جیهان بوونی کەسـانی دیکە بۆ من دەردەخات. بەدڵنیاییشـەوە، ئەم دەرخستنە ئاشکرا نییە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بـۆ ئەوەی مـن هەموویەکی دیاریکراو نابینم خۆی لەسـەر بونیادێکی ناسـراو دامەزراندبێت.

ئەگـەر من بتوانم هەموو ئامێرە ئاڵۆزەکان لە بەرەو ڕووکردنەوەی کەسـێکی دیکـەدا دەربخەم (ئەگەر بتوانم نەک تەنیا شوێنـی چەکوش و مێخەکان بەڵکو شەقام و شار و گەلەکەش ...هتد بناسم)، ئەوا هەمانکات دەتوانم پێناسەی (خۆ) ی کەسێکی دیکەش بکەم. ئەگەر لە ئاستی بۆچوونێکی ئەودا هەڵە بم، هۆکاری ئەوە نییە من ئەو بۆچوونە بۆ خۆیەکی ناوەوەی شاراوە دەگەڕێنمەوە، بەڵکو ئەو خۆیە هیچ خەسـڵەتێکی هاوبەشی لەگەڵ بۆچوونەکەدا نییە و بەرزە. من لەوێدا توشی هەڵە دەبم، کە هەموو جیهان جیاواز لە دەوری بۆچوونەکەدا کۆدەکەمەوە. هەرچەندە کەسێکی دیکە دەبێت بە بابەت بۆ من، هێشتا بوونێکی سەرتاپاگیری هەیە و لەنێو هەموو جیهاندا هێزی بەسـتنەوەیە. جیاوازی نێوان کەسێکی دیکە وەکـو بابەت و خۆ، جیـاوازی نێوان بەش و هەموو یان ناوەکی و دەرەکی نییە. کەسـێکی دیکە وەکو بابەت لـە بنەڕەتدا لە بوونی (خـۆ)ی جیانابێتەوە؛ هیچ لایەنێکی شاراوەی نییە چونکە هەموو بابەتێک بە بابەتێکی دیکەوە بەسـتراوە. منیش دەتوانم بەردەوام لەسـەر پەیوەندییەکەی بـە ئامێرەکانی دیکەوە زانینم لەسـەر بوونی ئەو، وەکو بابەت زۆرتر بکەم. زانینـم لەبارەی ئەوەوە دەکەوێتە سەر دەرکەوتنی جیهان.

جیاوای بنەڕەتی لەنێوان کەسێکی دیکە، وەکو بابەت و خۆ دەکەوێتە سەر ئەو فاکتۆرەی، کە کەسێکی دیکە، وەکو خۆ بە هیچ شێوەیەک ناناسرێت. بابەتەکانی نێــو جیهانیش ئاماژە بۆ ئەو (خۆ)یە ناکەن؛ تەنیا پەیوەندییان بە ئەوەوە، وەکو بابــەت هەیە. ئامادەبوونی کەســێکی دیکە بۆ من، کە مــن دەکات بە بابەت لە ئەزموونی مندا بووە بە خۆیەکی سەرتاپاگیر. کاتێک من ڕوو لەو دەکەم و جارێکی دیکە ســەرتاپاگیرییەکەی خۆی دەســەپێنێت: دەبێت بە بابەتێکی سەرتاپاگیر لەنێــو جیهاندا. ئەم هەســتکردنەش کتوپڕ ڕوودەدات و هەمیشــە پەیوەندی بە هەڵوێستێکی تاک یان هێمایەکی دیاریکراوەوە هەیە. لە چواردەوری ئەو مرۆڤەدا، کە من نایناسم و لەوێدا دانیشتوە ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە هەموو جیهان دەردەکەوێت. مــن تەنیا لەشی ئەو وەکو بابەت نابینم؛ کارتی ناســنامەکەی، ئەلقەی پەنجەی یان ئەو شەمەندەفەرەی ســواری دەبێت ئەوم پێدەناســێنن. ئەمەش لە ئاکامی ناســینی ئەو هێمایانــە نییە، کە ئاماژە بۆ چییەتی ئــەو دەکەن. چەمکی هێما لێــرەدا ئێمە بەرەو (خۆیەتی)دەبات، کە تەنانەت نازانین چییە و لەم ڕووەوە ئەو هیچــە. دەتوانم بڵێم ئەو شتێکە، کە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە. ئەگەر بزانم ئــەو لەنێو جیهاندایە، لە فەرەنسا یان لە پاریســە، دەخوێنێتەوە، بەبێ ئەوەی کارتی ناســنامەکەی ببینم، دەڵێم بێگانەیە (واتــە ئەمەش: خۆیەکە پەیوەندی جیاوازتــری هەیــە، من دەبێت بە زمانی هۆڵەندی یــان ئیتالی لەگەڵیدا بدوێم و نامەکانیشی لەدەرەوەی وڵات بۆ دێت و هتد.) کارتی ناسنامەکەی لەنێو شتەکانی جیهاندا ســەرهەڵدەدات. لــەو ڕۆژەوە کارتەکەی بۆ دروســتکراوە ئەو کارتە لە من ڕاناکات؛ ئەو بۆیە دروســتکراوە تاکو من ببینــم. منیش بۆ بنینی کارتەکە دەبێت ئامادەبوونی خۆم لەنێو هەموو شتەکانی جیهاندا بگۆڕم. بەهەمانشێوەش، تووڕەبوونی کەسەکە، وەکو بابەت لەو کاتەدا هاواریکرد و پوولەکەی لەسەر زەرفی نامەکــە دانا، هەڕەشەکردنەکەی ئاماژە بۆ خۆیەتــی یان تووڕەبوونێکی شاراوەی کەســەکە ناکەن، بەڵکو بەســتراوە بە تووڕەبوون و هاوارکردنی دیکەوە. ئەمانە کەســەکە، وەکو کەسێکی دیکە پیناسدەکەن. لەوانەیە من بە هەڵە بێزارییەکەی ئەو بە تووڕەبوون دابنێم، هێشتا ئەم تووڕەبونەش پەیوەندی بە لایەنەکانی دیکەی خۆدەربڕینــی کەســەکەوە هەیە، کە دەشێ من بە هەڵــە لێیان تێبگەم. دەشێ من بە هەڵە بەرزکردنەوەی دەســتی بە دەســتوەشان دابنێــم. بەکورتییەکەی، ئــەو تووڕەبوونەی دەردەبڕێــت ئامادەبوونی جیهانە لــە دەوری هەموو ئەوانەی ئامادەش نین. ئایا ئەمە بۆچوونی زانایانی ڕەفتارگەری ســاخدەکاتەوە؟ بێگومان نــا. هەرچەندە ڕەفتارگەرییەکان بوونی مرۆڤ بــۆ هەڵوێستەکانی دەگەڕێننەوە، ئامــاژە بۆ لایەنــی بەرزی ناکەن. ئەگەر بوونی کەســێکی دیکــە بابەت بێت و خۆشــی نەتوانێت ســنورداری بکات، ئەوا دەبێت بەو بابەتــەی، کە بە هۆکاری

ئاکامەکانییەوە دەناسرێت. تێگەیشتن لە بوونی چەکوش و مشار جیاواز نییە. لە ڕێگەی کارەکانیانەوە یان کۆتاییەکانیانەوە دەناسرێن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت. بەراوردکردنی بوونی کەسێکی دیکە لەگەڵ مەکینەیەکدا دەکەوێتە سەر ئەو خاڵەی، کە ماکینە فاکتۆرێکی مرۆڤانەی هەیە و ئامادەبوونی بەرزێتی تێدایە. بۆچوونـــی ڕەفتارگەرییەکان پێویستـــی بەهەڵگێرانەوە هەیە و هەڵگێڕانەوەکـــەش بوونی کەســـانی دیکە، وەکو بابـــەت دەپارێزێت. هەرشتێک بابەتگـــەری بێـــت لای دەروونناســـە فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکـــان دەبێت بە ئاماژەکردن. بۆ فینۆمینۆلۆجیستەکان مەبەســـتدار و بۆ هایدیگەر بەرزێتی و لای فێرگەی گشـــتاڵتیش دەبێت بە فۆرم. ئەمانە ئەوە دەردەخەن، کە پێناسەکردنی کەســـانی دیکە لەنێو بەستێنی سەرتاپاگیری جیهانەوە سەرهەڵدەدات. ئەگەر من بۆ پێناسەکردنەکە لە جیهانەوە بۆ کەسێکی دیکە بگەڕێمەوە لەبەر ئەوە نییە، کە جیهان یاریدەی من دەدات لە بوونی کەسانی دیکە تێبگەم، بەڵکو بوونی کەسانی دیکە، وەکو بابەت لە ناوەڕاستی جیهانی مندا وەستاوە.

ئەو ترســـەی لە ئاکامی هەســـتکردن بە بوونی کەســـانی دیکە، وەکو بابەت سەرهەڵدەدات ترســـێکی دەروونی نییە. لێرەدا ترسەکە ڕاکردنە؛ لە هۆش چوونە. ئـــەم دیاردانە بە ڕووتی و لە خۆیانـــەوە دەرناکەون و پەیوەندییان بە بەرزێتییەوە هەیە: ڕاکردن و لە هۆش چوون ڕاکردن و کەوتن بەســـەر بەردەکانی ســـەر ڕێگاکە نییە؛ بەڵکو دەرکەوتنی ئەو بوونیادەیە، کە کەسانی دیکە دەبن بە بنکەکەی. ئەو ســـەربازەی ڕادەکات کەسێکی دیکەی، وەکو دوژمن بینیوە، کە لولەی تفەنگەکەی تێکـــردوە. دووری نێوانیان لە خێرایی گولەکەدایە. ئێستا ســـەربازەکە تفەنگەکەی فڕێدەداتـــە چاڵێکەوە و خۆی ڕزگـــار دەکات. لەم حاڵەتـــەدا کتوپڕ ئامادەبوونی دوژمنەکـــەی لە چـــواردەوری ئەودا دەگۆڕێـــت؛ دوورییەکەی بـــە خێرایی گولەکە ناپێورێـــت. پانتایی زەوییەکەش بۆ ئەو خۆی دەکاتەوە و دەبێت بە پەناگا. ئەمانە فاکتۆری ڕاستەقینەن لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا و ترس تیایاندا پەیدا دەبێت. ترس هەڵوێستێکـــی جادوگەرانەیە و هەوڵدەدات بابەتە لێترســـاوەکە، کە ئێمە ناتوانین دووری خەینەوە خەفە بکات. ئەمەیە ترس دروســـتدەکات؛ وەکو خوێن بەربوونێکی ناوەوەیە لە جیهاندا و ئامادەبوونی لە جیهاندا جادوگەرانە دەگۆڕێت.

نابێت ئەو خاڵەمان لەبیربچێت، کە بەو ڕادەیەی کەسێکی دیکە بۆ من دەبێت بە بابەت منیش بۆ ئەو دەبم بە بابەت. کەوابوو، ئەو لەنێو (ئەوان) دەردەهێنم و دەیکەم بە بابەت، بە تاکی دادەنێم و دەڵێم ئەو کەسەیە. ئەگەر ئامادەش نەبێت، دەڵێـــم ئەو کەســـەی لێرە نییە. ئەوەی ڕێگە بە مـــن دەدات ئەو بکەم بە بابەت ئامادەبوونی هەردووکمانە لەنێو جیهاندا. ئەمەش فاکتۆرەکانی بوونی هەردووکمان دیاریدەکات. فاکتۆری بوونی هەردووکمانە ڕێگە بە من دەدات ئەو ببینم و ئەویش

من ببینێت. بەڵام کێشـــەی فاکتۆر لەژوور ئەم توێژینەوەیەمانەوەیە و دوای ئەم بەشە باسیدەکەین.

کەوابوو، لە ڕێگەی بە بابەتبوونم بۆ کەســـانی دیکە دەتوانم بوونی کەســـانی دیکە بسەلمێنم و لەوێشەوە ئاماژە بۆ بوونی تاکەکەسەکان بکەم. کاتێک دەمەوێت نەبم بە بابەت بۆ کەســـانی دیکە، وەکو ئەو یان ئەم کەســـە خۆی دەردەخات و وەکو ئەو-کەسە دەیبینم. بوونی کەسانی دیکە بەگشتی دەبێت بە بابەتێک بەبێ ئەوەی (خۆ)یەک تیایدا دەرکەوێت. پەیوەندی نێوان کەسێکی دیکە، وەکو بابەت و هەروەها، وەکو خۆ لە پەیوندی نێوان بابەتێکی ئەستویی و بابەتی هەستکردندا نییە. کەســـێکی دیکە، وەکو بابەت بەو جـــۆرەی هەیە خۆی بۆ من دەردەخات. تەنانەت ناتوانم ئەو زانینەی لەبارەی ئەوەوە لە ڕێگەی تەماشاکردنەوە دەســـتم دەکەوێـــت بۆ لایەنی ناوەوەی ئەو بگەڕێنمەوە. کەســـێکی دیکـــە، وەکو بابەت تەنیا بابەتە بەڵام تێگەیشـــتنم لە بوونی ئەو بەو ڕاســـتییەم دەگەیەنێت، کە لەم ئەزموونەمـــدا منیش بە جۆرێکی دیکە دەبینرێم. من بـــە هۆکاری ئەزموونەکانی ڕابردوومـــەوە ئەم ڕاســـتییە دەناســـمەوە و پەیوەندی دیالیکتیکـــی نێوان من و کەسێکی دیکە دەردەخەن. ئێستا، کەسەکەی دیکە ئەوەیە من دەمەوێت بیگەمێ. بەڵام بۆ ســـاتێکیش لە دەستی ڕابکەم و خۆم بشارمەوە ئەو بەردەوام بەو بوونە دەمێنێتەوە، کە کەســـێکی دیکەیە. ئەمەش لەهەمانکاتدا دژوارە بیریلێبکەینەوە چونکە: یەکەم، مـــن ناتوانم بیر لە ئەگەرێک بکەمەوە، کە ئەگەری من نییە یان بیر لە بەرزێتییەک بکەمەوە، کە نەتوانم تێپەڕیبکەم. دووەم، ئەگەرەکان نابن بە ئەگەری کەسانی دیکەی بە بابەتکراو. ئەم ئەگەرانە مردوون. ئەگەری بوونی من، وەکو بابەت دەکەوێتە سەر ئامادەبوونی کەسەکە، وەکو خۆ.

کەوابـــوو، بە بابەتبوونی کەســـێکی دیکە ئەو ئامێرەیە مـــن بە نیگەرانییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵـــدا دەکەم چونکە دەبینم ئەو دەتوانێـــت ئەزموونەکانی من بگۆڕێ و توشی نامۆبوونم بکـــات. دەبێت بەردەوام لەو شێوازی بە بابەتبوونەدا بیهێڵمەوە. بەڵام تەماشاکردنێکی ئەو هەوڵدانەکەی من لەناودەبات. شێوازی بوونی من دەگۆڕێت. هێشتا لەم کارتێکردنەدا سەرکەوتوو نابێت چونکە ئەوەی هەمیشە، وەکـــو بابـــەت دەمێنێتەوە و هەرگیز نابێت بە خۆ شتێکی مردوە. ئەو کەســـەی دەمرێت خۆی، وەکو بابەت لەنێو جیهاندا وون ناکات. مردووەکان بەردەوام لەنێو جیهاندا و لە چواردەوری ئێمەن. لەگەڵ مردندا مرۆڤ ئەگەری دەرخستنی بوونی، وەکو (خۆ) بۆ کەسانی دیکە دەدۆڕێنێت.

لەم توێژینەوەیەدا بونیادی بوون-بۆ-کەســـانی دیکەمـــان ڕوونکردەوە. لێرەدا پرســـیارێکی میتافیزیکییانە دێتـــە پێش: "بۆچی کەســـانی دیکە هەن؟" وەکو بینیمان، بوونی کەسانی دیکە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆوە دەرناچێت.

ڕووداوێکی بنەڕەتییە و بە دڵنیاییشەوە، داواکارییەکی مێتافیزیکییانەیە: واتە لە پێکهاتەی بوونەوە سەرهەڵدەدات. هەروەها چەمکی (بۆچی) پەیوەندی بەو بوونە مێتافیزیکییانەوە هەیە.

ئێمە دەزانین وەڵامی (بۆچی) بـــۆ بنەڕەتی پێکهاتەکەمان دەگەڕێتەوە. بەڵام پێویستە بیسەلمێنین، کە ئەو دیاردە مێتافیزیکییانەی مەبەستمانن کەم ناکرێنەوە. لەم بۆچوونەوە ئۆنتۆلۆجی دەبێت بە بونیادێکی گشـــتگر بۆ بوون. مێتافیزیکیش پرسیار لەبارەی بوونی بوونەوە دەکات.

ئایا دەتوانین پرســـیار لەبارەی بوونی کەسانی دیکەوە بکەین؟ ئایا ئەم بوونە شتێکـــە، کە کەمناکرێتەوە یان لە پێکهاتەیەکی بنەڕەتییەوە دەردەچێت؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن سەبارەت بوونی کەسانی دیکە لە زانا میتافیزیکییەکانی دەکەین. با لە نزیکەوە تەماشای ئەم پرسیارانە بکەین. ئەوەی دەردەکەوێت بوونی کەسانی دیکەیە، وەکو ڕەهەندی ســـێیەمی بوونـ بۆ ـخـــۆ. ڕەهەندی یەکەم، بێگومان ئەو ســـێ لایەنەن لە پرۆژەی بوونـ بۆ ـخۆدا بەرەو ئەو بوونە شێوازی نەبوونی هەیە. یەکەم، کەلێن لـــەم بوونەدا دەردەخات. دووەم، ڕەهەنـــد تێڕامانی ئەم بوونەیە بۆ خۆکردنـــەوەی بوونی. ئەمەش ناکۆکییەکی ئاشکرایە: بۆ ئەوەی هەســـت بە بەرزێتی خۆم بکەم دەبێت بەســـەر بەرزێتیدا تێپەڕم. بـــەڵام من بەرزێتییەکەی خۆمم و ناتوانم بەکاری بهێنم و بیکەم بە بەرزێتیـ بەرزێتییەکەم. من حوکمدراوە بەسەرمدا، کە بەردەوام خۆم لەناوبەرم.

ئەو تێڕامانەی خۆی لەناودەبات بۆ بوونـ بۆ ـخۆ دەبێت بە خۆـ ئاگاییەکی سادە. لە خۆئاگاییدا دوو لایەنەکەی تێڕامانی تێڕامان لەیەکدی جیانابنەوە و هەریەکێک لەو دوولایەنە ئـــەوی دیکەیە. بەڵام تێڕامان و ئـــەوەی تێڕامانیش ڕوویتێدەکات خۆیان بە دوو شتی جیاواز و سەربەخۆ دەردەخەن. ئەو نەبوونییەی بوونـ بۆ ـخۆ هەیەتـــی لەیەکدیان جیادەکاتەوە ئەو نەبوونییەش ناشاردرێتەوە. ئەگینا تێڕامان دەبێـــت بە چالاکی و ڕوو لـــە بابەتەکەی دەکـــات و پەیوەندییەکەشی لەگەڵیدا لەســـەر ڕەتدانەوەی دەرەکی ڕادەوەســـتێت و ئەمەش دەبێت بە بارودۆخێک، کە ڕەتدانەوەی ناوەکی تیایدا، بەبێ ئەو بوونەی دەبێت بە ســـەرچاوەی نەبوون بۆ خۆی، پەیدادەبێت.

کەوابوو، دەرچوونی تێڕامـــان ڕێگایەکی ڕادیکاڵی زۆرتر دەگرێتەبەر و ڕوو لە بوونـ بۆ ـکەسانی دیکە دەکات. دوای چەمکی لەناوچونیش دەبێت بە ڕەتدانەوەی دەرەکـــی، کە لەســـەر شوێنی دەرەکـــی ڕادەوەســـتێت. لەبـــەر ڕۆشنایی ئەم ڕەتدانەوەیەدا سێ ڕەهەندەکەش بەوجۆرەی سەرەوە ڕیزدەکەین، کەباسمانکردن. بوونـ بۆ ـخۆ بۆ ئەوەی بوونـ بۆ ـخۆیی خۆی لەدەست نەدات، لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ هەرجۆرێکی هەبووەکاندا، ناتوانێت بە تەنیا خۆی ببینێت و خۆی بە بوونـ

لەنێو-خۆ دابنێت. لێرەدا، ئەو ڕەتدانەوەیەی بوونی-کەسانی-دیکە پێکدەهێنێت ناوەکییە؛ ئەو لەناوچوونەیە بوون-بۆ-خۆ هەیەتی و لە لەناوچوونی تێڕامان دەچێت. ڕەتدانەوەکەش دەبێت بە دوو ڕەتدانەوەی ناوەکی بەرانبەر یەکدی وەستاو. لەهەمانکتدا ڕەتدانەوییەکی دەرەکی شاراوەش لە یەکدییان جیادەکاتەوە. لەبەر ئەوەی هەریەکێک لە ئەوان لە نکۆڵی کردنەکەیدا، کە ئەو بوون-بۆ-خۆیە کەسەکەی دیکەیە ماندوو بووە، هەروەها لەگەڵ ئەو بوونەدا مامەلەدەکات، کە پێویستە ببێت، ئەوا دەستەڵاتی بەسەر خۆیدا نییە و ناتوانێت ڕەتدانەوەکەی بەرانبەری ڕەتبداتەوە. لەمحاڵەتەدا کتوپڕ شتێک پەیدا دەبێت، نەک، وەکو ناسنامە و بوون بە بوون-لەنێو-خۆ، بەڵکو لە ئاکامی سەرهەڵدانی لایەنێکی دەرەکی، کە هیچ کام لە دوو ڕەتدانەوانە نییە و لەیەکدیشیان جیادەکاتەوە.

ئێمە لەگەڵ ئەو بوونەدا، کە خاوەنی تێڕامانە ئەم وەرگەڕانەمان بینی. بوونێکی خاوەن تێڕامان، وەکو گەواهێک، تێڕامانەکەی کاردەکاتە سەر بوونی. لە ئاکامدا بەو ڕادەیەی خۆی بەو بوونە دادەنێت، کە تێڕامانی هەیە و ڕوو لە دەرەوە دەکات، ئامانجی گەیشتنی بەو بوونە نییە، کە تێڕامانەکە ڕووی تێکردووە. ئەوەی تێڕامانەکە ڕووی تێدەکات بوونێکی خۆ-ئاگایە و دەزانێت تەماشای دەکرێت. لێرەدا تێڕامان دەیەوێت بەرەو بوونێک بڕوات، کە دەکرێت. بەڵام نابێت لەبیرمان بچێت، کە هەموو تێڕامانێک بابەتی هەیە و هەموو بابەتێکی تێڕامانیش تێڕامانی هەیە. ڕەتدانەوەی دووانی[لەمحاڵەتەدا] لەناودەچێت.

لە ڕەهەندی سێیەمدا تێڕامان بەرەو پێشتر دەڕوات. ئاکامەکەی جێگای سەرسوڕمانە: لەلایەکەوە، مادام ڕەتدانەوەکان کاریگەرێتی ناوەکییان هەیە، ئەوا من و کەسانی دیکە لە دەرەوەدا بە یەکدی ناگەین. پێویستە من و کەسانی دیکە هەبن تاکو بەرانبەر یەکدی ڕاوەستین و پەیوەندیمان هەبێت. ئەم بوونەش، کە (من و کەسانی دیکەیە) تێڕامان و بابەتی تێڕامانەکەیە و بوونێکە پێویستە ببێت بە سەرچاوەی نەبوونی خۆی؛ تیایدا بوونی من و کەسانی دیکە لەنێو یەک بونیادی گشتگردا دابمەزرێنێت.

لەمڕووەوە هیگڵ دروست بۆ کێشەکە چووە: هەر گشتگرییەک هەبێت سەر بە بوونە و ئەوەش بۆچوونێکی ڕاستە. بوونی کەسانی دیکە وادەردەکەوێت، کە درێژەپێدانی تێڕامانەکە بێت. هەموو هەوڵدانێک بۆ بینینی گشتگری لای خۆ-ئاگایی لە بوونی بوون-بۆ-خۆدا پەیوەندی بەو پێکهاتەیەوە هەیە، کە خۆ-ئاگایی نایەوێ ببێت بەوەی بەرانبەری و بە ئاگاشە. بەپێچەوانەشەوە، ئەو خۆیەی بووە بە بابەت بۆ ئەوەی هەبێت، دەبێت خۆی بەو هەبووە دابنێت، کە دروستکراوە و لەبەردەم ئاگامەندییدا ڕاوەستاوە. بەمجۆرە دووبەرەکی لە بوونی کەسانی دیکەدا دێتەکایەوە و بەردەوام بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە تاکو ئاگامەندییە

جــۆراو جۆرەکان پێکبهێنێت. لە ئاکامدا "ژمارەیەکی زۆر لە کەســانی دیکە" لە ئاکامــی ســەرنەکەوتنی گەڕانەوەی تێرامان بەرەو خۆی پەیــدا دەبن. ئەگەر لە تیڕاماندا نەتوانــم خۆم، وەکو بابەت ببینم و تەنیا خۆم بە نیمچە-بابەت دابنێم، لەبــەر ئەوەیە، کە خودی من ئــەو بابەتەیە دەمەوێت بیگەمێ! بۆ جیاکردنەوەی خــۆم لە بوونی خۆمەوە دەبێت ببم بە نەبوون. مــن ناتوانم لە ڕێگەی بۆچوونم لەبــارەی خۆمەوە یان خۆم بەو بوونە دابنێم، کە لەوێدایە، لە بوونم ڕادەکات. لە حاڵەتی بوون-بۆ-کەسانی دیکە کێشــەکە بەپێچەوانەوەیە؛ تێڕامان و بابەتەکەی لە یەکدییەوە دوورن، لەبەر ئــەوە بابەتەکە لە دەرەوەی تێراماندایە. ئەمەش بە ڕادەیەک ســەرکەوتوو نییە چونکە ئەوەی چارەی کێشەکە دەکات ئەوە نییە، کە چاک دەبێتەوە. ئەو هەمووە یان گشتگرییەی ئەوە نییە، کە هەیە و ئەوەشە، کە نییــە. لە ئاکامی دابڕانەکەی لــە بوونی خۆیەوە، لە هەموو شوێنێکدا بە جۆرێک خۆی بەرجەســتە دەکات، کە لە شوێنێکی دیکەشدا هەیــە. بوون-لەنێو-خۆ بە هەموو شوینێکدا پەرش و بڵاو بۆتەوە و هەمیشــە لەوێیە و هەرگیز لەنێو خۆیدا نییە. تەقینەوەکەی بە هەمووڵایەکدا بەردەوام دەیهێڵێتەوە. ئەمەش، وەکو بوونی کەسانی دیکە و منیش وایە.

لــە لایەکی دیکەوە، ڕاســتەوخۆ لەگەڵ ڕەتدانەوەکەی منــدا بۆ بوونی خۆم کەســانی دیکەش بوونی خۆیان بە من دانانێــن. ئەم دوو ڕەتدانەوەیە لە یەکدی جیانابنەوە و هەمانکات هیچ تێهەڵکێشەیەکیش بە یەکدیان نابەستێتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە نەبوونێکی دەرەکی لە ســەرەتاوە لە یەکدیان جیادەکاتەوە، بەڵکــو لەبەر ئەوەیــە، کە بوون-لەنێو-خۆ لەســەر بنەمای ئــەو پەیوەندییەی هەیانــە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاســتییەی، کە هەر یەکێک لــە ئەوان ئەوی دیکە نییە، کۆیان دەکاتەوە. لێرەدا بوون-بۆ-خۆ جۆرە ســنوورداریێتییەکی تێدا دروست دەبێــت. جۆرێک لە فاکتــۆری تێدا دەدۆزینــەوە و ناتوانیــن بزانین چۆن ئەو گشــتگرییەی لەپێشــتر باســمانکرد و لە بووندا نەبوونیش دێنێتەکایەوە، پەیدا دەبێــت. لەوەدەچێت ئەم نەبوونە خۆی خزانبێتە نێو بوونە گشــتگرەکەوە بەو شێوەیەیە نەبوون لەلای فێرگەی ئەتۆمیزمی لیوسیپۆس خۆی دەهاوێتە نێو بوونە گشتگرەکەی پارمەنیدسەوە و بوونەکە دەتەقێنێتەوە و ئەتۆمەکان پێکدەهێنێت. کەوابوو، دەبێت بە نوێنەری ڕەتدانەوە لە تێهەڵکێشەیەکی گشتگردا و لەوێوە لە واتــای فرەجۆری ئاگامەندییەکان تێدەگەیــن. بێگومان، ئەمەش نازانرێت چونکە کەســانی دیکە و من یان شتێک لەنێوانماندا دروستی ناکات. ئێمە ئەو خاڵەمان ڕوونکردەوە، کە ئاگامەندییەکان بەبێ ناوەند بە یەکدی دەگەن. کاتێک دەڕوانینە شوێنێک، ئێمە بابەتێک دەبینین، کە لە باسکردنیدا ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی سادە دەردەکەوێت. بەڵام هێشــتا لەوێدا دووجۆر ڕەتدانــەوە هەیە. ئەمەش نابێت بە

بناخەی فرەجۆرەکانی ئاگامەندی چونکــە ئەگەر لەپێش فرەجۆرییەکەدا هەبێت ئەوا بوونی کەسانی دیکە مەحاڵ دەردەچێت. بەپێچەوانەوە، دەبێت لە دەربڕینی فرەجۆرەییەکەدا پەیدا بێت. بەڵام، مادام هیچ شتێک دانامەزرێنێت ئەوا ئاگامەندی تاکە کەسێک و تەقینەوەی هەبووە گشتگیرییەکەش بۆ ئاگامەندییە فرەجۆرەکان نابێت بە پێکهاتەیەکی ڕووت. تەنانەت نکۆڵیکردن لەوەی من کەسەکەی دیکە نیم بۆ بوونی کەسەکە بەس نییە. دەبێت ئەو کەسە هەمانکات لەگەڵ ڕەتدانەوەکەی منــدا نکۆڵی لــەوە بکات، کە ئەو مــن نییە. ئەمە فاکتۆری بوون-بۆ-کەســانی دیکەیە.

ئێمە، لێرەدا، بەم ئاکامە ناکۆکە دەگەین: بوون-بۆ-کەسانی دیکە لە گشتگرییەکی ونبوودا دروســت دەکرێت. لەلایەکی دیکەوە، بوون-بۆ-کەسانی دیکە لەسەر ئەو بوونە دەرەکییە ڕادەوەســتێت، کە هیچ گشتگرییەک و بیرکردنەوەیەک دروستی ناکات. لەلایەکەوە بوونی فرەجۆری ئاگامەندییەکان نابێت بە ڕاستییەکی بنەڕەتی و ئامــاژە بۆ دابڕانی خۆ لە خۆوە دەکات، کە ئەویــش فاکتۆری بیرکردنەوەیە. کەوابوو، پرســیارەکەمان "بۆچی ئاگامەندییە فرەجۆرەکان هەن؟" پێویستی بە وەڵامدانەوە هەیە. لەلایەکی دیکەوە فاکتۆری ئەم فرەجۆرییە کەمناکرێتەوە. ئەگەر بیــر لە هۆش لە ڕوانگەی فاکتۆری فرەجۆرییەکــە بکەینەوە، ئەوا لەناودەچێت. لــەم ڕووەوە پرســیارە مێتافیزیکییەکە بێ واتایە و دەتوانیــن بۆ وەڵامدانەوەی بڵێین "ئەوها، وایە." دەرچوونە بنەڕەتییەکە قوڵتر دەبێت؛ دەردەکەوێت بەشێک لــە نەبوون نەبێت. بوون-بۆ-خۆ بەو بوونــە دەردەکەوێت، کە ئەوە نییە هەیە و ئەوەشە، کە نییە. دەرچوونە گشتگرییەکەی هۆش گشتگرییەکی کەمکراوە نییە. ئەو بوونەیە، کە ئێمە ناتوانین بڵێین هەیە یان نییە. ئەم باســکردنە بەڕادەیەک بۆ بیردۆزەکەمان ســەبارەت بوونی کەسانی دیکە لە جێگەی خۆیەتی. فرەجۆری ئاگامەندییەکان بۆ ئێمە تێهەڵکێشــەیە نەک کۆکردنەوە. هەمانکات گشتگری ئەم تێهەڵکێشەیەیە ناناسرێت.

ئایا خەسڵەتی دژوەستانی گشتگرییەکە کەم ناکرێتەوە؟ ئایا دەتوانین لەناوی بەریــن؟ ئایا دەتوانیــن بڵێین هۆش، بەو شێوەیەی باســی بوون-بۆ-خۆمانکرد، ئەوەیە، کە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە؟ پرســیارەکە بێ واتایە. دەریدەخات ئێمە بتوانین تەماشای گشتگرییەکە بکەین و لە دەرەوە ببینین. ئەمەش ناگونجێت چونکە من بەشێکم لەو گشــتگرییە و لە ناویدام. هیــچ ئاگامەندییەک، تەنانەت خواش، ناتوانێت ئەو گشتگرییە بناسێت. ئەگەر خوا ئاگامەندی بێت، ئەوا پێویستە بەشێک بێت لە گشتگرییەکە. ئەگەر سروشت بێت، ئەوا لە دەرەوەی ئاگامەندییدایە (بوون-لەنێو-خۆیە)و گشتگرییەکە بۆ ئەو دەبێت بە بابەت (لەمحاڵەتەدا ناتوانێت لــە ناوەوەیدا بێت)، مادام خوا (خۆ) نییە و [ســروشتە] ئەوا ناتوانێت ئەزموونی

هەبێت و بیناســێت. لەبەر ئەمە، گشتگرییەکە لە هیچ ڕوانگەیەکەوە ناناسرێت و ئەویش دەرەوەی نییە.

لێرەدا بە کۆتایی توێژینەوەکەمان گەیشــتین. فێربووین، کە بوونی کەســانی دیکە لەسەر فاکتۆری بە بابەتبوونی من ڕادەوەستێت. تێگەیشتین، کە هەڵوێستمە لــە ڕەتدانــەوەی نامۆبوونم، پەیوەندی بە بابەتکردنی کەســانی دیکەوە هەبوو. بەکورتییەکەی، کەسانی دیکە بە دوو شێوە بۆ ئێمە هەن: ئەگەر بە بەڵگەوە ئەو بناســم لە ناسینی ئەودا ســەرکەوتوو نابم. ئەگەر بیناسم، هەڵوێستم بەرانبەری هەبێت تەنیا لە ڕێگەی بوونی ئەوەوەیە، وەکو بابەت لەنێو جیهاندا.

ئــەم دوو شێوەیەش تێهەڵکێش ناکرێن. بەڵام توێژینەوەکەمان لێرەدا کۆتایی نایەت. ئەو بابەتەی بە کەســێکی دیکە نــاوزەدی دەکەین و منیش، کە دەبم بە بابــەت بۆ ئەو خاوەنی لەشین. کەوابوو لەش چییە؟ یان لەشی کەســێکی دیکە چییە؟

# بەشی دووەم

## لەش

گرفتی لەش و پەیوەندییەکانی بە ئاگامەندییەوە ئاشکرا باس نەکراون. لەکاتێکدا لەش بەوشـــتە دانراوە، کە یاسای خۆی هەبێت و ئێمەش بتوانین پێناسەیەکی لە دەرەوەدا بۆ بکەین، گەیشـــتنمان بە ئاگامەندی لەناوەوە لە ڕێگەی حەدەســـەوە ڕوودەدات. ئەگـــەر من بتوانم ئاگامەندیم لەو شـــێوازە ڕەها و ناوەکییەدا بناســـم و زنجیـــرەی تێڕامانەکانی بدۆزمەوە، هەوڵیـــش دەدەم جۆرە یەکێتییەکی بوونی، وەکو بابەتێکی زیندووی پێکهاتوو لە سیســـتەمی دەمارە هەستکەرەکان، مێشک، گلاندەکان، هەرەسکردن، هەناسەدان و هەموو ئەوانەی لە ئەتۆمەکانی هایدرۆجین و کاربۆن و ناتیرۆجین و فســـفۆر... هتد پێکهاتـــوون، بۆ دابنێم. بەڵام ئەم کارە لـــە گرفت بەدەر نییە. ئەم گرفتانەش لە هەوڵدانەکەی من لە دامەزراندنی یەکێتی نێوان ئاگامەندی من و لەشـــی کەسانی دیکەدا ســـەرهەڵدەدات. لەڕاستیدا، لەشم ئەوە نییە، کە بۆ منە. من مێشکی خۆم یان گلاندی ئیندۆکرینم نەدیوە و ناتوانم بیانبینم. لەبەر ئەوەی من لاشەی مردووم بینیوە یان منسیۆلۆجیم خوێندوە، بەو باوەڕەدەگەم، کە لەشـــی منیش لەناوەوە لە لەشـــی مردووەکە یان وێنەکانی نێو پەرتووکەکە دەچێت. هەڵبەتە ئەو پزیشـــکانەی نەشـــتەرکاری لەسەر لەشی من دەکەن ڕاســـتەوخۆ ئەو لایەنەی لەشـــم دەبینین، کە خۆم نایبینم. من لەگەڵیاندا ناکۆک نیم. هەروەها ناتوانم بڵێم من مێشـــک، گەدە یان دڵم نییە. پزیشکەکانیش ئەزمونی لەشـــی منیان لەنێو جیهانـــدا هەبوو. لە ئەزمونی خۆمدا لەشـــم لەنێو جیهاندا دەرناکەوێت. بێگومان لە ئامێری ڕادیۆســـکۆپەکەدا توانیم وێنەی بڕبڕەی پشـــتم ببینم. بەڵام لەمحاڵەتەدا من لە دەرەوەی ئەودا و لەنێو جیهاندا بووم. من هەســـتم بە بابەتێک لەنێو بابەتەکانی دیکەدا کرد و تەنیا بە هۆی بیرکردنەوەوە ئەو وێنەیەم بە بەشێک لە لەشی خۆم دانا و بوو بە خەسڵەتێک نەک بوونی من.

دروستە دەتوانم دەست لە قاچ و دەستەکانم بدەم. هیچ شتێک ڕێگەم لێناگرێت هەســـتەکانم بە ڕێکی بەرەو جیهان بەرم، بۆ نموونە بە چاوەکانم تەماشابکەم. با ئەوەشـــمان لەبیر نەچێت لەمحاڵەتەدا من بۆ چاوەکانم دەبم بە کەســـێکی دیکە و وەکو ئەندامی هەستکردن لەنێو جیهاندا دایاندەنێم. لەوکاتەدا چاوەکانم لایەنێکی

جیهانم نیشـــاندەدەن من "بینین نابینم". بینین دەبێت شـــتێک بێت لەنێو ئەوانی دیکەدا یان ئەوە بێت شـــتەکانم بۆ دەردەخـــات. لە یەک کاتدا هەردووکیان نییە. بەهەمانشێوە، دەستم دەبینم شتەکان دەگرێت، بەڵام دەستگرتنەکە نازانم چۆنە. لەبەر ئەم هۆیەشـــە بیرۆکەکەی ماین دی بیران لەسەر "هەستکردن بۆ هەوڵدان" نییە. دەســـتم بەرگریکردنی، ڕەقی و نەرمی بابەتەکانم بۆ دەردەخات نەک خۆی. من دەســـتم، وەکو شوشـــە مەرەکەبەکە دەبینم. هەست بە دوورییەک لەنێونماندا دەکەم. ئەو کاتەی پزیشکەکە قاچە برینداڕەکەم بەرزدەکاتەوە و تەماشای برینەکەم دەکات منیش خۆم بەرزدەکەمـــەوە تاکو ببینم هیچ جیاوازییەک لەنێوان بینینی لەشـــی پزیشکەکە لای من و قاچی خۆمدا نییە. جیاوازییەکەیان تەنیا لە بونیادی هەســـتکردنەکەدایە. ئەو کاتەی دەست لە قاچم دەدەم هەستدەکەم قاچم دەستی لێدەدرێت. بەڵام دیاردەی ئەم دوو جۆر هەســـتکردنە بنەڕەتی نییە: ســـەرما یان دەرزییەکی مۆرفین لە ناوی دەبات. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە ئێمە مامەڵە لەگەڵ دوو ڕاســـتەقینەی جیاوازدا دەکەین؛ دەســـتلێدان و هەروەها دەستلێدراو. هەســـت بەوەبکەیت، کە دەســـت لە شتێک دەدەیت، هەســـتیش بکەیت دەستت لێدەدەن. ئەمانـــە دوو جۆری جیاوازن و ناکرێـــت هەردووکیان بە ناوی (دووجۆر هەستکردن) کۆبکەینەوە.

لەڕاســـتیدا، جیاوازی بنەڕەتییان هەیە و بە یەکـــدی ناگەن. بێجگە لەمە، کە دەســـت لە قاچم دەدەم یان دەیبینم بە ســـەریا تێدەپەڕم و بە ئەگەرەکانی خۆم دەگەم. بۆ نموونە، دەمەوێت پانتۆڵەکەم لەپێبکەم یان پەڕۆی سەر برینەکە بگۆڕم. هەروەها دەتوانم قاچم بە جۆرێک دانێم تاکو بە ئاســـانی کارەکەم بکەم. ئەمەش ئەو بەرزێتییەی من ناگۆڕێت، کە ڕوو لە ئەگەرێک بەرەو چاکبوونەوەم دەکات. من لەبەردەم ئەودا بەبێ ئەوەی ئەو بم یان ئەو من بێت ئامادە دەبم. ئەوەی من لێرەدا هەســـتی پێدەکەم قاچمە، وەکو شـــتێک؛ ئەو قاچە نییە، کە ئەگەرە بۆ ڕۆیشتن، ڕاکردن یان یاریکردنی تۆپێن بۆ من.

بەو ڕادەیەی لەش ئەگەرەکانی بوونم لەنێو جیهاندا دیاریدەکات، دەســـتدان لە لەشم ئەگەرەکان دەمرێنێت. ئەم گۆڕانکارییە بە تەواوی پەیوەندی بە بوونی لەشەوە هەیـــە، وەکو ئەگەرێکی زیندوو بۆ ڕاکردن، ســـەماکردن و زۆری تریش. بێگومان، هەســـتکردن بە بابەتبوونی لەشم هەستکردنە بە بوون، بەڵام ئەو بوونەی هەستی پێدەکەم بوونە بۆ کەســـانی دیکەش. ئەم ئاڵۆزییە دەتوانێت بەرەو بێهودەییمان بەرێت و پەیوەندی بە کێشـــەی (بینینی پێچەوانەکراو)ەوە هەیە. ئێمە پرســـیاری زانایانـــی فزیۆلۆجی دەزانین، کە دەڵێن: ئێمە چـــۆن بتوانین بابەتەکان بە ڕێکی ڕیزبکەین لە کاتێکدا لە پشـــتی چاوەوە ســـەرەوخوار دەبینرێن؟ هەوەها وەڵامی فەیلەســـوفەکانیش دەزانین. کە دەڵێن، هیچ گرفتێکی تێدا نییە بابەتێک بەرانبەر

جیهان بە هەڵگــەڕاوی دابنرێت. ئەگەر هەموو جیهانیش بــە هەڵگەڕاوی ببینین هیچ واتایەک نادات چونکە هەڵگەڕانەوەکەی پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە. ئەوەی سەرنجی ئێمە بەرەو بنەڕەتی ئەم کێشە نادروستە دەبات ئەوەیە، کە کەسانی دیکە دەیانەوێت لەشــی کەسێکی دیکەش بە یەکێک لە بابەتەکانی ئاگامەندیم دابنێین. لێرەدا مۆمێک، لە پشــتی چاومەوە بە هەڵەوگێڕاوی دانراوە. پشــتی چاویش بە شێکە لە سیستەمی فیزیکی: پەردەیەکی پشتی چاوە و هیچی تر، بلورەکە بلورە و هیچی تر؛ بوونی هەردووکیان لەگەڵ مۆمەکەشدا و سیستەمەکەش لەیەکدی دەچن. لێرەدا، بە مەبەستەوە بۆچوونێکی فیزیاییمان هەڵبژاردوە، کە دەرەکییە. بۆ ئەوەی لە گرفتی (بینین) بکۆڵینەوە دەبێت چاوێکی مردوو لەنێو جیهاندا بدۆزینەوە. ئەگینا چــۆن ئەو کاتەی ئاگامەندی، کە ناوەکییەکــی ڕەهایە ڕەتی پەیوەندییەکەی بەم بابەتەوە دەدات، توشی سەرسوڕمان دەبین؟ ئەو پەیوەندییەی من لەنێوان لەشی کەسانی دیکە و بابەتێکدا دروســتی دەکەم پەیوەندییەکی هەبووە. لە سەرەتاوە لەســەر بوونی کەسانی دیکە، وەکو بابەت ڕادەوەستێت. ئەگەر ئاوەڕ لە سروشتی لەش بدەینەوە، پێویســتە ڕێکبوونێک بۆ تەماشــاکردنەکانمان دروستبکەین، کە لەسەر ڕیکبوونی بوون دادەمەزرێت: نابێت نهۆمە ئۆنتۆلۆجییەکان تێکەڵ بکەین. پێویستە لە ســەرەتاوە لەش، وەکو بوون-بۆ-خۆ بناســین و دوایی بە بوون-بۆ-کەســانی دیکەی دابنێین. بۆ دوورخســتنەوەی بێهودەیی (بینینی پێچەوانەکراو) دەبێــت بەردەوام ئاگاداری ئەو خاڵە بین، کە ئــەم دوو لایەنەی لەش جیاوازن و نابن بە یەک. بوون-بۆ-خۆ دەبێت لەش و ئاگامەندیش بێت؛ شــتێک نییە لەگەڵ لەشــدا یەکیان گرتبێت. بەهەمانشێوەش بوون-بۆ-کەســانی-دیکە لەشە؛ دیاردە ســایکۆلۆجییەکان نییە لەگەڵ لەشدا یەکیان گرتبێت. هیچ شتێک لەودیو لەشەوە نییە. بەڵام لەش بەگشتی بوونێکی سایکۆلۆجی هەیە. ئێمە لێرەوە باسی ئەم دوو شێوازەی بوونی لەش دەکەین.

## ١- لەش وەکو بوون-بۆ-خۆ : فاکتۆر

دەردەکەوێت سەرنجەکانی پێشومان دژی ئەو زانینە ڕادەوەستێت لە کۆجیتۆکەی دیکارتدا دەســتمان دەکەوێت. دێکارت دەڵێت، "ناسینی دەروون لە ناسینی لەش ئاســانترە." لێرەدا [ئــەم بیریارە] فاکتۆرەکانی بیرکردنەوە و لەشــی لە یەکدی جیاکردۆتەوە و یەکەمیان بە ســەرچاوەیەکی پیرۆزەوە دەبەستێتەوە. ئەمەش لە سەرەتاوە ئەوە دەرەخات، کە تێڕامان فاکتۆرەکانی ئاگامەندییمان بۆ دەدۆزێتەوە. بێگومان لەم قۆناخەدا تۆش ئەو دیاردانە دەبینی، کە لەنێو خۆیاندا پەیوەندییان بە لەشــەوە هەیە؛ بۆ نموونە ئازادی لەش، خۆشــی و ناخۆشی و هتد. بەڵام ئەم

دیاردانە فاکتۆری ڕووتی نێو ئاگامەندی نین. ئێمە دەتوانین هێمایان لێدروستبکەین، کە کاریگەرێتیان بەســـەر لەشـــەوە هەیە بەبێ ئەوەی لەنێو ئاگامەندییدا دەریان بهێنێن. ئەمەش سەرەتا و خاڵی دەرچوونمان نییە بەڵکو پەیوەندیەکی سەرەتاییە لەگەڵ بوون-لەنێو-خۆدا: بوون-لەنێو-جیهاندا. ئێمە دەزانین بوون-بۆ-خۆ و جیهان دوو شـــتی لە یەکدی دابڕاو نین. بوون-بۆ-خۆ پەیوەندییە بە جیهانەوە. بوون-بۆ-خۆ، لەو حاڵەتادا، کە دەڵێین نییە، بوونی جیهان دەســـەلمێنیت. هەروەها لەگەڵ ڕەتدانەوە و دەرچوونی بەرەو ئەگەرەکانی بوونی ئامیرەکان دەردەخات.

کاتێـــک دەڵێین بوون-بۆ-خۆ-لەنێو-جیهاندایـــە، ئاگامەندی ئاگاییە لە جیهان، پێویستە لە بیرمان نەچێت، کە فرەلایەنی لەبن نەهاتووی جیهان بەرانبەر ئاگامەندی ڕادەوەســـتێت و پەیونـــدی فرەلایەنی لەگەڵدا دروســـت دەکات. ئاگامەندیش بێ حوکمدان تەماشایان دەکات. بۆ من ئەم پەرداخە لای چەپی بوتڵەکەوە و کەمێک لەدوایەوە دانراوە؛ بۆ پیرۆ کەوتۆتە لای ڕاستەوە و کەمێک لەپێشەوەیە. ئاگامەندی ناتوانێت لەیەک کاتدا پەرداخەکە لای چەپ و ڕاســـت ببینێت. کەمێک لە پشتەوە و کەمێک لە پێشـــەوە ببینێت. ئەمەش پەیوەندی بە یاسای ناسنامە (خۆیەتی)وە نییە چونکە تێهەڵکێشـــکردنی پێشەوە و پشتەوە، چەپ و ڕاست دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی (ئەوان). ئەگەر بنی مێزەکە نەخشـــی فەرشـــەکە لە من بشارێتەوە و نەیبینم پەیوەندی بە ســـنوردارێتی بینینم یان کزی چاومەوە نییە. لەبەر ئەوەیە، کە فەرشـــەکەی مێزەکە نەیشـــاردۆتەوە، لەژێر، لەســـەر مێزەکە یان لە تەنیشت مێزەکـــەوە نییە و ناکەوێتە نێو ئەو جیهانـــەی مێزەکەی تێدایە. ئەو بوون-لەنێو-خۆیەی، وەکو (ئەو)شتە خۆی دەردەخات دەکەوێتەوە نێو ناسنامەیەکی نادیارەوە. تەنانەت شوێن، وەکو پەیوەندییەکی دەرەکی دیارنامێنێت. پێکهاتەی شوێن، وەکو پەیوەندییە فرەلایەنەکان تەنیا لە بۆچوونێکی زانستانەوە کاریگەر دەبێت؛ شتێکە ناژی و تەنانەت نوێنەرایەتیشی ناکرێت. ئەو سێ گۆشەیەی لەسەر تەختەڕەشەکە کـــراوە و یارمەتیم دەدات خـــۆم بە بیرکاریەکی ڕووتکـــراوەوە ماندووبکەم بوونی لەسەر تەختەکە پێویستە. منیش هەوڵدەدەم خۆم بگەینمە ئەودیو خەسڵەتەکانی ئەو شـــێوەیەی بە تەباشیر دروستکراوە بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکەی بە بوونمەوە دیارییبکەم. تەنیا قەوارەی لاکان و خراپی وێنەکێشانەکەی دەبینم.

لەسەر ئەو ڕاستییەی جیهان هەیە، جیهان بەبێ پەیوەندی بە بوونی منەوە نییە. ســـوربوونی ئایدیالیزم لەسەر ئەو خاڵەی پەیوەندی جیهان پێکدەهێنێت دروستە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئایدیالیزم لەســـەر زەمینەی زانستی نیوتن ڕادەوەستێت، ئەم پەیوەندییـــە بە گۆڕینەوە دادەنێت و چەمکی ڕووتکراوەی دەرەکی نێوان کارتێکەر و کارتێکراو وەدەســـت دەهێنێت. سنوری بابەتگەری ڕەها تەسک دەکاتەوە. ئەم چەمکـــەش وەکو ئـــەو جهانەیە، کە لـــە بیابان دەچێت یان ئـــەو جیهانەیە هیچ

کەسـێکی تێدا ناژی. ئەمـەش ناکۆکە چونکە جیهان بە هۆکاری ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتییـەوە هەیە. چەمکی بابەتگەری، کە دەیەوێت ڕاسـتی بوون-لەنێو-خۆ لابەرێت و پەیوەندییە ئاڵۆگۆڕکـراوەکان لەنێوان بیرۆکەکاندا دامەزرێنێت، ئەگەر سنورەکانی تەسک بکرێنەوە، خۆ-بەزێنە.

هەروەها، پێشکەوتنی زانسـت چەمکی بابەتگەری ڕەها ڕەتدەداتەوە. ئەوەی برۆکلـی بە (ئەزمون) ناوزەدیدەکات سیسـتەمی پەیوەندییە هاودەنگییەکانە، کە تەماشاکەرەکەشی تێدایە. دانانی تەماشـاکەر لەنێو سیستەمی زانستیدا لەلایەن مایکرۆفیزیاوە بۆ خۆگەرییەتی ڕووت ناگەڕێتەوە. ئەم چەمکە بێجگە لە بابەتگەری ڕووت چـی دیکە نییە. بەڵام، وەکو پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەگەڵ جیهاندا، وەکو شوێن یان ئەوەیە هەموو پەیوەندییەکانی تێدا بەرجەستە دەبێت. بۆ نموونە، یاسای سەربەسـتی هیسنبرگ سەلماندن و نەسەلماندنی لە ناچارەکییەوە سەرهەڵنادات. لەڕاسـتیدا پەیوەندی نێوان شتەکانە؛ پەیوەندی بنەڕەتی نێوان شتەکان و مرۆڤە و جێگەی مرۆڤە لەنێو جیهاندا. ئەمەش دەتوانین بسـەلمێنین، بۆ نموونە، ئێمە ناتوانیـن بەبێ گۆڕان لـە خێراییدا ڕێژەی زیادبوونـی ڕەهەندی تەنە جوڵاوەکان بدۆزینـەوە. ئەگەر بڕوانمـە جوڵانی تەنێک بەرەو تەنێکی دیکـە، بە چاوەکانی خۆم، دواییش بە مایکرۆسـکۆپ، لە حاڵەتی دووەمدا خێراییەکەی سەدجار زۆرتر دەبینم. لەمڕووەوە، چەمکی خێرایی پەیوەندی بە ڕەهەندەکانی تەنە جوڵاوەکەوە هەیە. ئێمەش بڕیار لەسـەر ڕەهەندەکان بە ئامادەبوونمان لەنێو جیهاندا دەدەین. ئـەوان بەبێ بوونی ئێمە نین. کەوابوو، تەنیا پەیوەندییان بەو زانینەوە نییە ئێمە دەستمان دەکەوێت بەڵکو بە بوونی ئێمەوە لەنێو جیهاندا هەیە.

ئەم ڕاسـتییە ئاشـکرا لە بیردۆزەی ڕێژەگەرییدا باسکراوە: ئەو کەسەی لەنێو سیسـتەمێکدا دانراوە ناتوانێت حوکم بەسـەر وەستان و جوڵانی سیستەمەکە بە ئەزمـوون بدات. ئەم ڕێژەییە (ڕێژەگەرایەتـی) نییە؛ مامەڵە لەگەڵ زانیندا ناکات؛ بەڵام لەو دۆگما پێشمەرجییەوە دەکەوێتەگەر، کە دەڵێت، زانین ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کـە هەیە. مـرۆڤ و جیهان دوو بوونی ڕیژەیین و پەیوەندییش دەبێت بە بناخەی بوونیان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە یەکەم، پەیوەندی لە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییەوە بۆ جیهان بەڕێدەکەوێت. بۆ من، هاتنەبوونەوە دیاریکردنی دووری و نزیکییە لە شتەکانەوە و دانانی بوونی شتەکانیشە لە (ئەوێ)دا.

شـتەکان دەبن بەو هەبووانەی-دوور-لەمن-هەن. کەوابوو، جیهان ئاماژە بۆ ئەو پەیوەندییەی بوونم دەکات، کە بە هۆیەوە بوونی خۆم ئاشکرا دەکەم.

زانینـی ڕووت لەخۆیدا ناکۆکە؛ هیچ زانینێـک بەبێ ئاماژەکردن نییە. ئەمەش لەوەدەچێت، بڵێین زانین و کردەوە دوولایەنی ڕووتکراوەی پەیوەندی کۆنکرێتیین. شـوێنی ڕاستەقینەی نێو جیهان ئەوەیە لوین ناوی دەنێت "هۆدۆلۆجیک". زانینی

ڕووت زانینێکە بێ بۆچوون؛ کەوابوو، زانینێکە لە بارەی جیهانەوە، کە لە دەرەوەی جیهاندایە. ئەمەش هیچ واتایەک نابەخشێت. زانەر لەوێدا زانینی دەستدەکەوێت، کە لەسەر بابەتە زانراوەکەی پێناسبکرێت. زانین خۆ خەریککردنە و بۆچوونی کەسەکەیە، کە دەیەوێت بزانێت. بۆ ئەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی هەبێت، دەبێت لە (ئەوێ)دا بێت؛ لەوێدا لەسەر کورسییەکە، لای مێزەکەوە، لەسەر لوتکەی چیاکە و لەم ڕەهەندانەدا و هتد. ئەمە پێویستییەکی ئۆنتۆلۆجییە.

دەبێت لەمخاڵە تێبگەین. ئەم پێویستییە لەنێوان دوو هەبووی هەڵکەوت ڕوودەدات؛ لەلایەکەوە، پێویستە من لەوێدا هەبم، ئەمەش هەڵکەوتە چونکە من نابم بە بناخە بۆ بوونی خۆم. لەلایەکی دیکەوە، هەرچەندە پێویستە بۆچوونم لەسەر ئەم و ئەو شتە هەبێت، بۆچوونەکەشم بۆ ئەم شتە، کە لە هەموو بۆچوونەکانی دیکە دادەبڕێت هەڵکەوتە. ئەم هەڵکەوتە دوولایەنییە. باوەش بە (پێویستیی) فاکتۆری بوون-بۆ-خۆدا دەکات. ئێمە لەنیوەی دووەمدا باسمانکردوە. لێرەدا هەڵکەوتنێکی بەردەوام پشتگیری بوون-بۆ-خۆ دەکات و بەرپرسی دەبێت بەبێ ئەوەی بتوانێت تێپەڕیبکات. بوون-بۆ-خۆ هەڵکەوتنەکە لەنێو خۆیدا نادۆزێتەوە؛ نازانێ چۆنە، تەنانەت تێڕامانی کۆجیتۆییش بۆ دۆزینەوەی یاریدەی نادات. بوون بۆ خۆ بەردەوام بەرەو ئەگەرەکانی دەچێت و توشی هەڵکەوتن دەبێت؛ ڕوو لە نەبوونەکەی خۆی دەکات. ئەو نەبوونە دەیکات بەوەی هەیە. هێشتا ناتوانین بڵێین، فاکتۆرەکان نابن بە دێوەزمەی بوون-بۆ-خۆ یان فاکتۆرەکانە دەبن بە هۆکاری هەستکردن بە لێپرسینەوە بەرانبەر بوونم و شتێکیشە، کە ناسەلمێنرێت. بەڵام، جیهان بۆ من ئاماژە بۆ فۆرمی یەکگرتووی تێهەڵکێشراوی پەیوەندییەکان دەکات، کە ناسەلمێنرێن. پێویستە جیهان بە ڕیزکراوی خۆی بۆ من دەربخات. لەمڕووەوە، من دەبم بە ڕیزکردنەکە؛ وێنەی من بوو، کە لەدوا بەشی نیوەی دووەمی باسەکەماندا نیشانماندا. دەردەکەوێت ڕیزکردنەکە پێویست بێت، بەڵام نەسەلمێنراویشە. ئەم پێویستە ڕەهایە و نەسەلماندنی ڕیزکردنی شتەکان لەنێو جیهاندا، ئەو ڕیزکردنەی، کە منە لەبەر ئەوەی من بناخەی بوونی خۆم نیم و نابم بە بناخەی بوونێکی هەندەکیش، ئەوا ڕیزکردنەکە لە ئاستی بوون-بۆ-خۆدا، وەکو لەشە. ئێمە دەتوانین لەش بەو فۆرمە هەڵکەوتووە دابنێین، کە لەسەر بوونی هەڵکەوت و پێویستی من دادەنرێت. لەش، بێجگە لە بوون-بۆ-خۆ چی دیکە نییە؛ بوون-لەنێو-خۆ لەنێو بوون-بۆ-خۆدا نییە. لەو ڕاستییەوە کە بوون-بۆ-خۆ بناخەی بوونی خۆی نییە لە پێویستبوونی خۆ خەریککرنەکەی وەکو هەبوویەکی هەڵکەوتوو لەنێو هەبووە هەڵکەوتووەکانی دیکەدا دیاریدەکات. لەش لە هەڵوێستی بوون-بۆ-خۆوە دوورەپەرێز ڕاناوەستێت چونکە بوونی بوون-بۆ-خۆ و هەڵوێست یەک شتن. لەلایەکی دیکەوە. مادام جیهان (هەمووی) هەڵوێستەکانی بوون-بۆ-

خۆیە و پێوەری بوونیەتی، ئەوا لەش بە (هەمووی) جیهان دادەنرێت.

هەڵوێست هەڵکەوتێکی ڕووت نییە. بەپێچەوانەوە، لەگەڵ دەرچوونی بوون-بۆ-خـــۆ بەرەوخۆی و ڕەتکردنیەوە پەیدادەبێت. لـــە ئاکامدا، لەش-بۆ-خۆ ئەو بابەتە دراوە نییە، کە من دەتوانم بیناســـم. شتێکە لەوێدا و تێپەڕکراوە. ئەو کاتە هەیە، کـــە من دەمەوێ لە ڕێگەی لەناوبردنی خۆمەوە لە دەســـتی هەڵبێم. لەش ئەوەیە من لە ناوی دەبەم. ئەو بوون-لەنێو- خۆیەیە، کە بوون-بۆ-خۆی لەناوچوو تێپەڕی دەکات و لەم تێپەڕکردنەدا جارێکی دی بە بوون-بۆ-خۆ دەکات. لەڕاســـتیدا بەبێ ئـــەوەی ببم بە بناخەی بوونم، من دەبم بـــە هاندەرەکانی خۆم. من بەبێ ئەوەی ببم بەوەی هەم، هیچم؛ هەروەها هێشتا نەبووم بەوەی دەمەوێ بیگەمێ. کەوابوو، لەلایەکەوە، لەش خەسڵەتێکی پێویستی بوون-بۆ-خۆیە؛ لەش بەرهەمی ئافەریدکەر نییـــە یان یەکگرتنـــی لەش و دەروون هەڵکەوتێک نییـــە دوو جەوهەری جیاوازی پێکـــەوە گرێدابێت. لەلایەکی دیکەوە، لەش بەرجەســـتەبوونی هەڵکەوتی بوونمە؛ دەتوانین بڵێین تەنیـــا ئەم هەڵکەوتەیە. بیریارە هۆشـــەکییە دێکارتییەکان ئەم خەسڵەتەیان پەسەندکردووە؛ نوێنەرایەتی تاکە کەسێکی من لەخۆخەریکردنم لەنێو جیهانـــدا دەکات. تەنانەت ئەفلاتونیش بە دانانـــی لەش بەوەی تاکبوونی دەروون دەردەخـــات، بەهەڵەدانەچووە. بـــەڵام بێهودەیە باوەڕ بەوە بکەین، کە دەروون بە جیابوونەوەی لە لـــەش خۆی لەم تاکبوونییە دووردەخاتەوە دەروون بەو ڕادەیەی بوون-بۆ-خۆ تاکە، لەشە.

ئێمە باشـــتر لەم خاڵانە دەگەین ئەگەر بەســـەر کێشـــەی زانینی هەستەکییدا ساخیان بکەینەوە. کێشـــەی زانینی هەستەکی لەنێو جیهاندا لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو بابەتانەدا پەیدادەبێت، کە بە هەستکردن ناوزەدیان دەکەین. لە سەرەتاوە باس لەوە دەکەین، کە کەســـانی دیکە چاویان هەیە. دواییش، وەکو زانایانی فزیۆلۆجی بونیادی ئەم بابەتانـــە و جیاوازییەکانی نێوان ڕێتیناو بیلبیلەی چاو دەدۆزینەوە. ئەم زانایانە ئەو یاسایانەشیان بەسەر ئەم بەشەدا دەسەپێنن، کە پەیوەندییان بە چاویلکەسازییەوە هەیە. لەگەڵ پێشکەوتنی نەشتەرسازیشدا فێربووین، کە کۆمەڵێ ڕەگ ڕێتینا بە مێشکەوە دەبەستنەوە. لەژێر مایکرۆسکۆبدا دەبینین لە کوێدا ئەم ڕەگانە دەســـتپێدەکەن و تەواو دەبن. هەموو ئەم زانیارییانە ســـەبارەت بابەتێکی نێو شـــوێنە، کە بە چاو ناوزەد دەکرێت. لەســـەرو ئەمانەوە، زانایان بانگەشـــەی ئەوەیانکرد، ئێمە دەتوانین ئەم چاوە ببینین و دەستی لێبدەین؛ دەتوانین بۆچوونی هەستەکییمان لەسەر شتەکان هەبێت. دواجاریش هەموو زانیارییە زانستییەکەمان دەکەوێتە نێوان ئەو زانینەی ســـەبارەت بە چاو هەمانە. بەکورتییەکەی، لەنێوان من و ئەو چاوەدا ئەو جیهانە دەردەکەوێت، کە بوونی من تیایدا خۆی بەرجەستە دەکات. لەدواییدا دەتوانین زۆرتر لێی بکۆڵێتەوە و لە سەرەتا و کۆتایی ڕەگەکان

لەنێو لەشــی خۆماندا تێبگەین. لێرەدا خۆمان لە ئاستی دوو بابەت لەنێو جیهاندا ڕادەگریــن: لەلایەکەوە، هاندەرەکە و لەلاکەی دیکەوە ئەو شــانە هەســتیارە یان ڕەگەیــە کۆتایــی بە هاندەرەکەی ئێمــە دێنێت. هاندەرەکــە بابەتێکی فیزیکی- کیمیاییە، شــەپۆلە کارەباییەکانە یان توخمێکی کیمیاوییە، کە خەســڵەتەکانی دەزانیــن. ئێمەش دەتوانین کەم و زۆری بکەین و درێژە بە بەردەوام بوونییەکەی بە شێوەیەکی دیاریکراو بدەین. کەوابوو، ئێمە مامەڵە لەگەڵ دوو بابەتی ئاساییدا دەکەین. هەستکردنیشمان پەیوەندی نێوانیان دادەمەزرێنێت. زانیاریشمان لەبارەی پەیوەندییەکەوە بەستراوە بە سیستەمی زانستی و شارەزایی ئێمە، کە لەسەر بوونی جیهان و سەرهەڵدانی ئێمە لەنێوجیهاندا پەیدا دەبێت. زانیارییە هەستەکییەکەمان یارمەتمان دەدات پەیوەندی نێوان ناوەوەی کەسانی دیکە، وەکو بابەت و پێکهاتە دەرەکییەکان ببینین. فێردەبین چۆن کارکردن لەســەر هەســتکردنەکان ڕێگەمان دەدات بیرکردنەوەی کەســانی دیکە بگۆڕین. ئەمەش بە هۆکاری زمان و دەربڕینی کەســانی دیکەوە لە بەرەنگارییەکانیاندا دەردەکەوێت. بابەتێکی فیزیایی (هاندەر) ە ، بابەتێکی فزیۆلۆجی (هەســت)ە، بابەتێکی سایکۆلۆجی (کەســێکی دیکە)یە، ســەرهەڵدانی واتاکانیش (زمان)ە. ئەمانە چەمکەکانی پەیوەندییە دەرەکییەکانە ئێمە دەمانەوێت دروســتی بکەین. بەڵام هیــچ کامیان ڕێگە بۆ ئێمە خۆش ناکەن تاکو لەنێو جیهانی بابەتەکان بچینە دەرەوە.

هەندێکجــار من دەبم بە بابەتێکــی توێژینەوە بۆ زانایانی ســایکۆلۆجی یان فزیۆلۆجی. ئەگەر خۆبەخشانە بەشداری لە تاقیکردنەوەکانیاندا بکەم، ئەوا کتوپڕ خۆم لە تاقیگەیەکدا و لە پشــتی شاشــەیەکەوە دەبینم یان هەست بە ڕەتبوونی شــەپۆلی کارەبا بەناولەشــمدا دەکەم، دەرمانێکم دەدەنێ، کە نازانم چییە، بەڵام هەمــوو ئەمانــە لەنێو جیهاندا بەرانبەر من ئامادەبوون. بۆ ســاتێک جیهانیان لە من دانەبڕاند؛ هەموو ئەمانە لە تاقیگەیەکدا لە ناوەڕاســتی شــاری پاریســدا لە خانویەکی بەشی باشوری ســۆربۆن ڕوویاندا. من لە لەگەڵ ئامادەبوونی کەسانی دیکــەدا مامەوە. تاقیکردنەوەکەش زۆری لێکردم بــە زمان ڕاگەیاندنکەی لەگەڵدا بخەمەگەر. ئەو کەســەی تاقیکردنەوەکەی دەکرد چەندجارێک پرسیاری لێکردم، کە ئایا شاشەکە بە باشی دەبینم یان نا. پاڵەپەستۆکەش لەسەر دەستم گرانی و ســوکی بۆ دەردەخستم و لەوەڵامدا دەمگوت؛ وایە. زانیارییەکی بابەتانەم لەبارەی ئەو شــتانەی لەنێو جیهاندا دەردەکەن، دەگەیاندا. کەسەکە هەندێکجار دەیپرسی؛ ڕووناکییەکە لەســەر چاوم بەهێزە یان نا. مادام من لە جیهاندا لەنێو بابەتەکاندام پرســیرکردنەکەی هیچ واتایەکی نە دەبەخشــی ئەگەر من نەمزانیایە (هەستکردن بە ڕووناکی) چییە. لەبەر ئەمــە وەڵامەکەی من بەم جۆرەبوو؛ ڕووناکییەکە کزە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە شاشەکە زۆر ڕووناک نییە. مادام من شاشەکە

بە کزی دەبینم، نیوەڕســـتەی (بە بۆچوونی من) ئاماژە بۆ هیچ شتێکی ڕاستەقینە ناکات. تەنیا نەیەڵێت بابەتگەرێتی جیهان بۆ من ببێت بە شـــتێکی ئاڵۆز. ئەوەی من دەیزانم لەم تاقیکردنەوەیەدا ئەو بابەتانەن کەسەکەش دەیانبینێت. لە کۆتایی تاقیکردنەوەکـــەدا پەیوەنـــدی نێوان دوو دەســـتە بابەتمان بۆ ئاشـــکار دەبێت: ئەوانەی لە تاقیکردنەوەکەدا پەیوەندییان بە منەوە هەیە و ئەواەی بۆ کەســـەکەی تاقیکردنەوەکە دەکات لە تاقیکردنەوەکەدا خۆیان دەرخســـت. ڕووناکی شاشەکە سەر بە جیهانی منە؛ چاوەکانم، وەکو بابەت سەر بە جیهانی کەسەکەن. پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەســـتە بابەتەش پردێکە لەنێـــوان دوو جیهاندا؛ کە بە پەیوەندی نێوان لایەنەکانی ناوەوە و دەرەوە دانانرێن.

بۆ چی چەمکی (خۆیەتی) بۆ ڕووناکی و گرانی و بۆنی ئەو بابەتانە بەکاربهێنین، کە لەتاقیکردنەوەکەدا، لە نیو تاقیگاکەدا لە پاریس و مانگی دوو پێکهاتن؟ ئەگەر بـــە پێکهاتەیەکی خۆیەتی دایبنێین بۆ چی بابەتەکان بخەینە نێو سیســـتەمێکی دەرەکییەوە، کە لە تاقیگاکەدا بۆ کەسەکە سەریان هەڵدا؟ لێرەدا دووجۆر کێشان و پێوەرمان نییە. هیچ شتێک لە هیچ شوێنێکدا بەبێ بابەتگەری نییە من هەستی پێبکەم. من، وەکو جاران، لەم تاقیکردنەوەیەشـــدا ئاگام لە بوونی جیهانە و لەم زەمینەوە هەســـت بە بوونی چەند بابەتێکی دەرەکی دەکەم. وەکو جارانیش، ئەو بابەتانـــە ڕەتدەکـــەم و ڕوو لەو بوونە دەکەم، کە دەمەوێـــت بیگەمێ، بۆنموونە، دەمەوێت بە دروستی وەڵامی پرسیارەکانی کەسەکە بدەمەوە تاکو تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو بێت. بێگومان ئەم بەراوردکردنانە ئەنجامێکی بابەتگەرانەمان دەداتێ. من دەتوانم بڵێم ئاوە، ئاوە گەرمەکە ساردە، پاش ئەوەی دەستم لەنێو ئاوی گەرمدا دادەنێم. بەڵام ئەم ئەنجامە، کە بە (یاسای ڕێژەگەری هەستکردن) ناوزەدی دەکەین هیچ پەیوەندییەکی بە هەستکردنەوە نییە. لەڕاستیدا ئێمە مامەڵە لەگەڵ خەسڵەتی ئـــەو بابەتەدا دەکەین، کە خۆی دەردەخات. کاتێک دەســـتی گەرمم دەخەمە نێو ئاوە گەرمەکەوە هەســـتدەکەم ساردە. بەراوردکردنیش لەنێوان زانیارییەکەی من و گەرمیپێودا بۆ ئاوەکە توشـــی ناکۆکیمان دەکات. ناکۆکییەکەش دەبێتە هاندەرێک بۆ هەڵبژاردنێکی سەربەســـت. پێویســـتە من ناوی خۆیەتی لەو شـــتە دەرەکییە بنێم، کە هەڵمنەبژاردوە. وردبوونەوەی زۆرتریش لە (یاسای ڕێژەگەری هەستکردن) بونیادێکی بابەتگەری تێهەڵکێشـــکراو بۆ من دەردەخات، کە بە فۆرم (گیشتاڵت) ناوزەدیدەکەم. وێنە ئەندێشاوییەکەی میولەرلایەرس یان ڕێژەگەرایەتی هەستکردن ناوی جیاوازن بۆ یاســـا دەرەکییەکانی بونیادی ئەم فۆرمانە. ئەم یاســـایانە هیچ شـــتێکمان لە بارەی دیاردەکانـــەوە پێناگەیەنن و تەنیا مامەڵـــە لەگەڵ بونیادە تێهەڵکێشراوەکەدا دەکەن. بەم شێوەیە بونیادەکە، وەکو فۆرم خۆی دەردەخات.

بابەتگەرایەتی زانســـتانە بونیادەکان لە (هەموو) جیادەکاتەوە و خەســـڵەتیان

پێــدەدات. بەڵام لــە هیچ حاڵەتێکدا ئێمــە ناتوانین خۆمان لــە جیهان دابڕین. هەندێــک بیریار لــەو باوەڕەدان پەیوەنــدی دەرەکی نێوان هانــدەر و ئەندامانی هەســتکردن دەبێت بە پەیوەنــدی نێوان هاندەرێکی دەرەکی و هەســتکردنێکی ناوەکی. پێناســەکردنی لایەنە ناوەکییەکەش دەکەوێتە سەر کارکردنی هاندەرەکە لەسەر ئەندامانی هەســتکردن. هاندەرەکە کاردەکاتە سەر ئەندامانی هەستکردن؛ پرۆتۆپلازم و گۆڕانکارییە فیزیایی و کیمیاییەکان، کە لە هەســتکردندا ڕوودەدەن، ئەندامی هەســتکردنەکە دروســتیان ناکات و لە دەرەوەی ئەودا دێنە کایەوە. بۆ ئەوەی واز لە یاسای هێزی بەردەوامی نەهێنین، کە هەموو سروشت، وەکو دەرەکی پێکدەهێنێــت، باوەڕ بەم بۆچوونە دەکەین. کەوابوو، ئەو کاتەی پەیوەندی نێوان سیســتەمێکی دەرەکی (هاندەری ئەندامە هەســتەکییەکان)، کە ئێستا هەستیان پێدەکەیــن و سیســتەمێکی ناوەکی، کە خەســڵەتەکانی بابەتەکە پێکدەهێنێت، باســەکەین، دەبێت بە زۆر خۆمان بگەیەنینە ئەو باوەڕەی شــێوازە ناوەکییەکەی وابەســتە بە هاندەری هەستکردنەوە و شتێکی دیکە بێجگە لە خۆی پەیدایکردوە. ئەگەر کتوپڕ لە خۆیەوە پەیدابێت هیچ پەیوەندییەکی بە ئەندامی هەســتکردنەوە نابێــت یان پەیوەندییەکەیــان دەبێت بە شــتێکی جیاواز. کەوابوو، پێویســتە یەکێتییەکــی دەرەکی هەبێت، بۆ بچوکترین و کورتترین هاندەرێکی هەســتپێکراو دابنرێت و ئێمەش بە هەستکردن ناوزەدی بکەین. ئەم یەکێتییەش دەبێت هێزێکی بــەردەوام بێت؛ لایەنێکی دەرەکــی ڕووت بێت چونکە بە (ئەو) شــتە دادەنرێت و بەشــداری لە پیکهێنانی لایەنــی دەرەکی بوونێ-لەنێو-خــۆ دەکات. ئەو لایەنە دەرەکییەی لە هەســتکردندا دەبینرێت سەر بە بوونی هەستکردنە؛ هۆکاری بوونی هەستکردن لە دەرەوەی هەستکردندایە. بەڵام بۆ ئەوەی بوونی هەستکردن چاکتر دەربخەین لەنێو بەســتێنێکی دیاریکراودا دایدەنێین. من ئەو بەســتێنە ناودەنێم هۆش یان ئاگامەندی هەروەها ئەم ئاگامەندییە، وەکو شــتێکی دیکە یان بابەتێک دەبینم. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەر ئەوەی دەمەوێت پەیوەندییەکان لەنێوان ئەندامانی هەســتکردن و هەستکردندا بە هەمەکی دابنێم، ئەوا دەبێت ئاگامەندییەکە سەر بە من بێت و بوونیشی بۆ-خۆی-نەک بۆ کەسانی دیکە بێت. لەمڕووەوە من شوێنێکی ناوەکیم داناوە، کە تیایدا وێنەکان پاش هەســتکردن لە ڕێگەی هاندەرەکانیانەوە پەیدادەبن. مادام ئەم شوێنە تەنیا وێنەکان وەردەگرێت ئەوا لایەنێکی چالاک نییە. هەمانکات من ڕوانینــە بایەلۆجییەکەش کارم تێدەکات، کە پەیوەندی بە چەمکی بوونی دەرەکی ئەندامانی هەســتکردنەوە هەیە. لەبەر ئەوە ئەو شــوێنە ناوەکییە لەنێو هەستکردندایە. کەوابوو، ژیان پەیوەندییەکی جادوگەرانەیە، کە من لەنێوان بەستینێکی ناچالاک و شیوازی ناچالاکی ئەم بەستێنەوە دروستیدەکەم. (هۆش) هەســتکردن دروست ناکات و هەســتکردن دەرەکییە. لەلایەکی دیکەشەوە، هۆش

هەســـتکردنەکان لە ئامێز دەگرێت و دەیانژیەنێت. یەکبوونی ئەوەی دەژی و ژیان نە لەنێو شـــوێندایە نە پەیوەندییەکیشە لە نێوان شـــوێن و شتێکی نێو شوێندا؛ ئامادەبوونێکی جادوگەرانەیە. هۆش هەستکردنەکانی خۆیەتی و لەوانیشەوە دوورە. هەستکردن، لەم بۆچوونەوە، دەبێت بە بابەتێکی تایبەتی، کە نەجوڵاوە و ناچالاک دەژی. ئێمەش بە (خۆیەکی) دادەنێین.

پێویستە بە دروستی لە چەمکی (خۆیەتی) بگەین. مەبەستمان ئەو شتە نییە، کە ســـەر بە (خۆ)یە؛ بۆ نموونە دەروون، کە بەردەوام دەبێت بە هاندەر بۆ بوونی خۆی. ئەو خۆیەتییەی دەروونناســـەکان ئاماژەی بـــۆ دەکەن لە ئەمەوە جیاوازە؛ بەپێچەوانـــەی خۆیەتییەکەی ئەوانەوە، هێزە بەردەوامەکە و ئامادەنەبوونی هەموو لایەنە بەرزەکان دەردەخات. ئەمـــەش ئەو جۆرە خۆیەتییەیە، کە ناتوانێت خۆی بگەیەنێتە دەرەوە. بەو ڕادەیەی هەســـتکردن لایەنێکی دەرەکی ڕووتە ئەوا تەنیا دەبێت بە مۆر بەســـەر هۆشـــەوە خۆیەکییە چونکە نـــە ئامادەبوونی هەیە و نە نوێنەرایەتـــی دەکات. خەســـڵەتی خۆیەکی ئەوی دی، وەکـــو بابەت قوتووییەکی داخراوە و هەســـتکردنیش لەنێو قوتووەکەدایە. ئەمە واتای هەســـتکردنە. لێرەوە بێهودەییەکـــەی دەبینین. لە پێش هەموو شـــتێکدا، چیرۆکێکی ڕووتە. ســـەر بە هیچ ئەزموونێکی ناوەوەی من نییە و پەیوەندی بەوی دیشـــەوە نییە. ئێمە تەنیا جیهانێکی دەرەکی دەبینین، مەبەســـتەکانمان بوونی ئـــەو جیهانە دەردەخەن و پەیوەندییەکەمانی لەگەڵدا دیاریدەکەین. هەستکردنیش بوونی مرۆڤ لەنێو جیهاندا دەردەخات چونکە مرۆڤ خاوەنی ئەندامی هەستکردنە و لەبەردەم پەیوەندییەکەی بە جیهانەوە ڕاوەســـتاوە. خۆیەتی مرۆڤ بـــۆ دامەزراندنی پەیوەندییە بەرزەکانی پێویستە. لەبەر ئەم هۆکارەیە ڕووبەڕووی ئەم سێ خاڵە دەبینەوە:

یەکەم، بۆ دامەزراندنی هەستکردن پێویستە ڕوو لە جۆرێک ڕیالیزم بکەین. ئێمە هەســـتکردنمان بە بوونی کەسانی دیکە و ئەندامانی هەستکردنی کەسانی دیکە و ئامێرەکان بە دروست دادەنێین.

دووەم، بـــەڵام، لە زەمینەی هەســـتکردندا ئەمجۆرە ڕیالیزمـــە لەناودەچێت. هەستکردن تەنیا زانیاریمان لە بارەی بوونی خۆمانەوە دەداتێ و سەربەو بوونەیە، کە دەژی.

ســـێیەم، لەگەڵ ئەمەشدا، بە هۆکاری هەستکردنەوە جیهانی دەرەکی دەناسم. ئەم ناســـینەش نابێت بە بناخەی پەیوەندییەکی بنەڕەتیم بە شتەکانەوە؛ بونیادی مەبەستەکانی هۆش نادۆزێتەوە.

ئێمە چەمکی (بابەتگەری) بۆ پەیوەندی ڕاســـتەوخۆ بە بوونەوە بەکارناهێنین، بەڵکو بەســـتنەوەی هەســـتکردنەکانە، کـــە زۆرتر دەمێنێتـــەوە و بەرێکوپێکی دەردەکەون. بەتایبەتی ئەوەیە، کە ئێمە بۆ پێناســـەی هەستکردنمان بە وی دی،

ئەندامانی هەســـتکردنی ئەوی دی و ئامێـــرەکان دایدەنێین. لەمحاڵەتەدا ناتوانین پرســـیار لە بارەی هەســـتکردنی من بە ڕێگەی ئەندامی هەســـتکردنمەوە بکەین؛ تەنانەت بەپێچەوانەوە، من ئەندامی هەستکردن بە هەستکردنمەوە دەبەستمەوە.

ئەمەش لە ســـوڕانەوەی بازنەیی دەچێت. هەستکردنم بە هەستەکانی کەسێکی دیکە یاریدەم دەدات چۆن باســـی هەســـتکردن بکەم، بەتایبەتی هەستکردنەکانی خۆم. بەڵام هەســـتکردنەکەی من ڕاستەقینەی هەستکردنم لە ئاستی هەستەکانی ئەو کەســـەدا پێکدەهێنێت. لەم سوڕانەوەیەدا بابەتەکە، کە ئەندامی هەستکردنی کەســـەکەیە، بەردەوام سروشـــتی خۆی و دیاردەکەشـــی ناپارێزێت و وەکو خۆی نامێنێتەوە. لە سەرەتاوە، ڕاستەقینەیە، ئەنجا لەبەر ئەوەی ڕاستەقینەیە ڕاڕەوێکی ناکۆک دژ بە خـــۆی دادەمەزرێنێت. دەردەکەوێت، لەڕاســـتیدا، بونیادی بیردۆزە کلاسیکییەکە سەبارەت هەستکردنەوە لە بەڵگەی درۆکەرەکە بچێت، کە ڕواقییەکان بانگەشـــەیان بۆ کردووە. لێرەدا، کرتیان ئەو ڕاستییە دەڵێت، کە درۆیە. لەسەرو ئەمەشەوە، بەو شێوەیەی بینیمان، هەستکردن خۆیەتییەتی ڕووتە. ئایا چۆن بوونی بابەتێک لەســـەر خۆیەتی دابمەزرێنین؟ ئەگەر هەســـت بە بابەتێک لەنێو جیهاندا بکرێت، پێویســـتە لەو کاتەوە ئێمـــە پەیدادەبین لەنێو جیهان و لەنێو بابەتەکاندا ئامادەبین. هەستکردن، دەکەوێتە نێوان بابەتگەری و خۆگەرییەوە. لە بابەتەکەوە سەرهەڵدەدات و بەرەو خۆ دەڕوات؛ بوونێکی هەیە، کە ناتوانین بڵێین ڕاستەقینەیە یان بیردۆزەیی. هەســـتکردن خەونی ڕۆژانەی ڕووتی زانایانی دەروونناســـە. هەر بیردۆزەیەکـــی پتەو لەبارەی پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و جیهانەوە هەبێت ڕەتی دەداتەوە.

ئەگەر هەســـتکردن تەنیا وشە بێت، ئەی هەستەکان چین؟ بێگومان، کەسێک دەتوانێت جەخت لەســـەر ئەو خاڵە بکات، کە لە ناوەوە ڕووبەڕووی هەســـتکردن نابینـــەوە. ئێمـــە تەنیا ڕەنگی ســـەوزی دەفتەرەکە یان گەڵاکـــە دەبینین، نەک هەستکردن بە (سەوز) یان ئەو ڕەنگە نا-ڕاستە سەوزەی هوسرڵ لەنێوان بابەتەکە و مەبەستی[ئاگامەندیدا] دایدەنێت. هوسرڵ دەگاتە ئەو باوەڕەی لەگەڵ کەمکردنەوەی فینۆمینۆلۆجیانەشدا بابەتەکە دەخرێتە نێوان دوو کەوانەوە و ڕووبەڕووی دەبینەوە. بەڵام مۆری بابەتەکە لە ناخماندا نادۆزرێتەوە. هێشـــتا دروستە بڵێین هەستکردن هەیە. من ڕەنگی سەوز دەبینم، هەست بە ساردی ئەو تەنە دەکەم و دەزانم بەردە مەڕمەڕەکە چەورکراوە. ڕووداوێکیش دەتوانێت هەموو هەستەکانم لەناوبەرێت؛ کوێر و کەڕ دەبم و هتد. کەوابوو، هەست، کە هەستکردنمان ناداتێ چییە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئاســـانە. با لە سەرەتاوە بڵێین، هەســـتەکان لە هەموو شوێنێکدا هەن و لە هیچ شوێنێکیشـــدا نادۆزرێنەوە. من ڕاســـتەوخۆ شوشە مەرەکەبەکە لەسەر مێزەکە، وەکو شتێک دەبینم،. ئەمەش بە هۆکاری ڕووناکییەوە ڕوودەدات. ئەوەی

دەردەکەوێت شتێکی بینراوە و منیش ئاگام لەو شتە دەرکەوتوەیە؛ من دەزانم، کە دەیبینم. هەمانکات، هەرچەندە بینینەکە سەبارەت شوشە مەرەکەبەکە زانینە، بینین لەژێر دەستی زانیندا ڕادەکات؛ زانینمان لەبارەی بینینەوە نییە. تەنانەت تێڕامانیش ئەم زانینەمان ناداتێ.

تێڕامان دەتوانێت زانینم لەبارەی شوشە مەرەکەبەکەوە بداتێ، کە دەبینرێت، بەڵام ئەو زانینە سەبارەت بینینەکە یان چالاکی بینین نییە. لێرەدا گوتە بەناوبانگەکەی ئۆگوست کۆمت بە نموونە دەهێنینەوە، کە دەڵێت؛ "چاو خۆی نابینێت." بێگومان چاوێکی دیکە دەتوانێت لەو کاتەدا تەماشادەکەین چاوەکانی ئێمە ببینێت. ئایا من ناتوانم دەستی خۆم ببینم یان لەوکاتەدا شتێک دەگرم دەست لە دەستم بدەم؟ لێرەدا، چاوەکان، وەکو بابەت دەبینم؛ ناتوانم بیان بینم؛ ناتوانم دەستگرتنی دەستم بگرم. کەوابوو، هەر هەستێک بۆ من بێت دۆزینەوەی مەحاڵە. هەروەها، مادام بەردەوام ڕووبەڕووی بابەتەکان دەبمەوە هەستکردن نابێت بە کۆی هەستکردنە لە کۆتایی بەدەرەکان. لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر بە ناخمدا شۆڕببمەوە و بڕوانمە ئاگاییم، ئەوا ڕووبەڕووی ئاگاییم لەم و لەو شتەی نێو جیهان دەبمەوە نەک بینین یان هەستەکانی دیکە. ئەگەر هەست بە ئەندامانی هەستکردنم بکەم و دەستیان لێبدەم ئەوا ئەو ئەندامانە، وەکو بابەت لەنێو جیهاندا دەردەکەون. هێشتا دەتوانین بڵێین هەستکردن هەیە؛ دەبینین، دەبیستین و بە دەست شتەکان دەگرین.

ئەگەر بیر لە سیستەمی بینینی بابەتەکان بکەمەوە بۆم دەردەکەوێت بە ڕێکی بۆ من دانەمەزراوە؛ بەڵکو بینینەکان ئاڕاستەکراون. مادام هەست لەسەر بنەمای کردەوە ناسراوەکان و بەردەوامی حاڵەتەکانی ژیان پیناسە ناکرێت، ئێمە هەوڵدەدەین لە ڕێگەی بابەتەکەیەوە پێناسەی بکەین. ئەگەر بینین کۆی ئەو هەستکردنانە نەبێت، کە دەبینن، ئایا نابێت بە سیستەمی بابەتە بینراوەکان؟ ئایا پێویستە بۆ بیرۆکەی پێشومان لەسەر ئاڕاستەکردن بگەڕێینەوە؟

لە سەرەتاوە پێویستە بزانین، کە ئاڕاستەکردن بونیادێکی پێکهاتووی شتە. بابەتێک لەنێو جیهانەوە خۆی دەردەخات و پەیوەندییە دەرەکییەکەش بە شتەکانی دیکەوە بەرجەستە دەبێت. خۆدەرخستنەکەی زەمینەیەکی پێکهاتووی دیارینەکراو بۆ هەموو هەستپێکراوەکان لە جیهاندا دادەمەزرێنێت. بونیادی شێوەکاری ئەم پەیوەندییە بە زەمینەکەوە پێویستە؛ واتە زەمینەی شتە بینراوەکان یان بیستراوەکان دەبێت هەبێت. بێدەنگی، بۆنموونە، زەمینەیەکی دەنگدارە بۆ هەموو دەنگە نەبیستراوەکان، کە دەنگێک تیایدا بۆ ئێمە سەرهەڵدەدات. بەڵام پەیوەندی نێوان بابەتێکی تاک بەم زەمینەیەوە لەهامانکاتدا دراوە و هەڵبژێردراویشە. هەڵبژێردراوە چونکە بوون-بۆ-خۆ ئامادە دەبێت و ڕەتدانەوەی ناوەکیشی بەرانبەر ئەو بابەتە

لەنێو جیهاندا هەڵگرتوە. من دەڕوانمە شوشە مەرەکەبەکە یان پیاڵەکە. ئەمانە بە من دراون. هەروەها، پەرتووکەکە لەلای ڕاست یان چەپی مێزەکەوە دەردەکەوێت. دەرکەوتنی مێزەکە لای چەپەوە پێویســـت نییە. من لێرەدا سەربەستم تەماشای پەرتووکەکە لەسەر مێزەکە یان مێزەکە لای پەرتووکەکەوە ببینم. ئەم هەڵکەوتنەیە لەنێوان پێویست و سەربەستی هەڵبژاردنەکەمدا بە هەست ناوزەدیدەکەین. ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت، کە بابەتێک پێویســـتە بۆ من ڕاســـتەوخۆ دەردەکەوێت، ئەو بابەتە شوشـــە مەرەکەب یان پیاڵەکەیە من دەیبینم. ئەم دەرکەوتنەش هەمیشە لەنێو بۆچوونێکدا دێتەکایەوە، کە پەیوەندییەکەی بە جیهان و شـــتەکانی دیکەوە دیاریدەکات. من دەنگی کەمانەکە بەگوێرەی نۆتەکە دەبیستم؛ بەڵام دەبێت دەنگەکە لە دەرگاکەوە یان لە پەنجەرەکراوەکەوە یان لەنێو هۆڵەکەوە بە من بگات، ئەگینا بوونی لەنێو جیهاندا بەرجەستە نابێت.

لەلایەکی دیکەوە ئەوەش دروســـتە، کە هەندێک بابەت لەخۆوە لەنێو جیهاندا پەیدا نابن و لە ئاکامی تێهەڵکێشـــکردنیان لەگەڵ بابەتەکانی دیکەدا دێنەکایەوە. دەتوانین بڵێین هەریەکێک لەو بابەتانە لەیەک کاتدا بەیەک شـــێوە خۆیدەردەخات هەرچەندە شـــێوازی خۆدەرخستنی دیکەشی هەیە. یاساکانی خۆدەرخستنەکەشی ناوەکی یان سایکۆلۆجییانە نین. ئەو یاسایانە دەرەکین و لە سروشتی شتەکانەوە دەرچوون. ئەگەر شوشـــەی مەرەکەبەکە بەشـــێکی مێزەکە لە من بشـــارێتەوە و ڕێگەنەدات ببینم، پەیوەندی بە خەسڵەتی هەستکردنی منەوە نییە و بەستراوە بە سروشتی شوشە مەرەکەبەکە و ڕووناکییەوە. لەکاتێکدا بابەتەکە دوور دەخەینەوە و بچوک دەبێتەوە نابێت بەشتێکی دەروونی دروستکراو، بەڵکو دیسانەوە بۆ یاسای دەرەکی ڕوانین دەگەڕێتەوە. ئەم یاسا دەرەکییانە بنکەیەکی دەرەکی ئاماژەبۆکراو پێناســـدەکەن. بۆنموونە، لە ڕوانیندا چاو دەڕوانێتە هێڵە دەرەکییەکان. زەمینەی ڕوانینەکە ئاماژە بۆ بنکەیەکی دەرەکی دەکات، کە چواردەوری ئێمەی داوە. ئێمە ئـــەو بنکەیە، وەکو بونیادی ڕوانیننەکە نابینیـــن؛ ئێمە خودی خۆمان بنکەکەین. ڕیزکردنی شـــتەکان لەنێو جیهاندا بەردەوام لای ئێمە ئاماژە بۆ بیرۆکەی بابەتێک دەکات، کە بۆ ئێمە نابێت بە بابەت چونکە ئەو بابەتە ئێمە نین. بونیادی جیهان داوامان لێدەکات بەبێ بەرجەســـتە بوونمان هیچ نەبینین. بابەتێک لەنێو جیهاندا دەردەکەوێـــت و هەمانکات خـــودی بابەتەکەش جیهانە. ئەو بابەتە هەمیشـــە بە شتەکانی دیکەوە بەستراوە و بێ بڕانەوە ئاماژەیان بۆ دەکات. بەڵام، لەمحاڵەتەدا بابەتەکـــە بۆ ئێمە دەبێت بـــە ئاماژەکردنێکی ڕووتکـــراوە. بابەتێکە، کە هەموو شتەکانی دیکە ئاماژەی بۆ دەکەن و منیش ناتوانم تێیبگەم چونکە بابەتەکە منم. لەڕاستیدا، من نابم بە بابەت بۆ خۆم. ئەو بابەتەی شتەکانی نێو جیهان ئاماژەی بـــۆ دەکەن بوونێ-بۆ-خۆیە و بابەت نییە. ســـەرهەڵدانی بوونم، لەگەڵ لەناوبردنی

دوورییەکانەوە، خۆم دەکەم بەو بابەتەی لە جیهاندا ئاماژەی بۆ دەکرێت. هەروەها، من ئەو بابەتە نابینم چونکە بابەتەکە خودی منە.

من وەکو ئەو بوونەی نەبوونی خۆی هەڵگرتووە لەبەردەم خۆمدا ئامادە دەبم. کەوابوو، بوونم لەنێو جیهاندا، لەســـەر ئەو فاکتۆرەی، کە جیهان دەناسێت، خۆی بەرجەســـتە دەکات بۆ ئەوەی، وەکو بابەتێک لەنێو شـــتەکانی جیهاندا و جیهان ئاماژەی بۆ بـــکات. ئەمەش بەپێچەوانەوە مەحاڵە، چونکە بوونم هیچ ڕێگەیەکی دیکەی پەیوەندی بەســـتنی لەگەڵ جیهاندا نییە. پێویستە من لەنێو جیهاندا خۆم داڵدە بدەم تاکو لەنێو جیهاندا بم و خۆم بەبەرزێتی بگەیەنم.

مەبەست لە هاتنە نێو جیهانەوە ئەوەیە، کە جیهان هەیە یان من لەشم هەیە. ئەم دوو گوتەیە یەکشـــتن. لەشم لەنێو جیهاندا لە هەموو شوێنێکدایە. ئەمەش لە ڕاســـتی ئەو بنمیچە دەچێت لەژوور پەنجەرەکانەوە شەش پێ بەرزە، ئوتۆمبیلەکە لە پشـــت لۆرییەکەوە دەیەوێت بەلای چەپدا دەرچێت یان ئەو ژنەی لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە لەو پیاوەی لەبەردەم قاوەخانەکە دانیشتوە بچوکتر دەردەکەوێت. لەشم لەگەڵ جیهاندا درێژ دەبێتەوە، لەگەڵ شـــتەکاندا بڵاودەبێتەوە و لەهەمانکاتیشدا لەنێو ئەو چەقەدا کۆبۆتەوە، کە هەموو شـــتەکان ئاماژەی بۆ دەکەن و منم بەبێ ئەوەی بزانم. ئەم ڕوونکردنەوەیە یارمەتیمان دەدات لە هەستکردنیش تێبگەین.

هەســـت لە پێش بابەتـــە هەســـتەکییەکانەوە نایەت و لە پاش ئەوانیشـــەوە ســـەرهەڵنادات. هەستەکان و بابەتەکان هاوتەمەنن؛ هەستەکان ئەو شتانەن لەنێو کەسەکەدا، کە لە هەستکردندا بەرجەستە دەبن. ئەوان نوێنەری یاسایەکی دەرەکی بەرجەســـتەبوونەکەن. بینین وێنە هەستەکییەکان دروستناکات و ڕووناکیش کاری تێناکات، بەڵکو کۆی هەموو بابەتە بینراوەکانە بەو ڕادەیەی هەموویان لە ڕوانینێکدا ئامادەدەبن. لەمڕووەوە هەستەکان ناوەکی نین. لەڕاستیدا جیاوازی نێوان بینینەکان دەرەکین. تەنانەت چاوداخســـتن بارودۆخێکـــی دەرەکییە. پێڵوی چاو یەکێکە لە بابەتە دەرەکییەکان و ئەو بابەتەیە، کە بابەتەکانی دیکەم لێدەشـــارێتەوە. کاتێک دەمەوێـــت پـــەردەی نێو چاوم ببینم و چاو دادەخـــەم، بابەتەکانی نێو ژوورەکەم نابینم. بەهەمانشـــێوەش ئەگەر دەستکێشەکانم لەسەر مێزەکە دابنێم ئەو بەشەی مێزەکە نابینم، کە دەستکێشەکانم دەیانشارنەوە. ئەو ڕووداوانەی کاردەکەنە سەر هەســـتەکان ســـەر بە جیهانی بابتەکانن. "من ڕەنگی زەرد دەبینم" چونکە توشی نەخۆشی زەردوویی بووم یان چاویلکەیەکی شوشە زەردم لەچاوانە. لەم نموونانەدا هۆکاری دیاردەکان ناوەکی نییـــە و پەیوەندییەکی دەرەکی نێوان بابەتەکانی نێو جیهانـــە. لە هەریەکێک لەم نموونانەدا من لەناوەندێکـــەوە دەڕوانمە بابەتەکان و ڕاســـتی بینینەکەشـــم دەرەکییە. دواجار، ئەگەر لەلایەکەوە یـــان چەندلایەکەوە بنکەکە بڕوخێت (ڕوخانیش لە ئاکامی پێشـــکەوتنی جیهان بەگوێرەی یاســـاکانی

ڕوودەدات، بۆنموونـــە دەربڕینی فاکتۆری بوونی من لە یەکێک لە شـــێوازەکاندا)، بابەتـــە بینراوەکان بەهەمانشـــێوە بەرەو نەمان ناڕۆن. بـــەردەوام بۆ من ، بەڵام بەبـــێ بنکە و بەبێ بابەتێکی ئاماژەبۆکـــراوی هەندەکی دەمێننەوە؛ واتە دەبن بە کۆیەکی ڕەهای پەیوەندییەکانی نێو یەکدی. کەوابوو، ســـەرهەڵدانی بوونێ-بۆ-خۆ دەبێتـــە هۆکاری بەرجەســـتەبوونی دەرەکی جیهان و هەســـتەکان و ئامادەبوونی خەسڵەتی بابەتەکان. پەیوەندی من لەگەڵ جیهاندا دەبێت بە بنەرەتی، جیهان و هەستەکانیش بە گوێرەی بۆچوونەکەم پێناسدەکات. کوێری، ڕەنگ کوێری و کورت بینی شێوازی بینیی منن بۆ جیهان. بینینی من پێناسدەکەن و دەبن بە فاکتۆری بەرجەســـتە بوونەکەم. لەبەر ئەمەش دەتوانم هەستەکانم بناسم. هەروەها گرنگە پەیوەندییەکەم بە جیهانەوە و بیرۆکە هەمەکییەکانم بەردەوامی بە بوونی شتەکان بدات، کە هەســـتیانپێدەکەم و هەســـتەکانم دابمەزرێنێت و مێژووی کەسایەتیمی تێدا دروســـت بێت. بەڵام لەمحاڵەتەدا من جیهانم لەسەر زەمینەیەکی هۆشەکی بە دابڕانـــی خۆم و بیرەوە لە جیهـــان دادەمەزرێنم. بە جیهاندا دەگەڕێم بەبێ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵدا دروســـت بکەم؛ خۆم لەنێو هەڵوێســـتی بابەتگەرییەکی ڕەهادا دادەنێم، هەریەکێک لە هەستەکان دەبێت بە بابەتێکی نێو بابەتەکان و بنکەیەکی ڕێژەگەرانەی ئاماژەکردن. لەنێو بیرکردنەوەدا بنکەیەکی یەکسان و ڕەها بۆ هەموو ئاماژەکردنەکان ســـەرهەڵدەدات. ئەگەر من باســـی ڕۆڵی نێوان کردەوە و لەشـــم لەبەر ڕۆشـــنایی زانینمدا سەبارەت لەشـــی کەسێکی دیکە بکەم، ئەوا من دەتوانم بیـــر لـــە فرێدانی ئامێرێک بە ویســـتی خۆم بۆ مەبەســـت و کۆتاییەک بکەمەوە. کەوابـــوو، ئێمە جارێکـــی دیکە بۆ جیاکردنەوە کلاســـیکییەکەی نێوان دەروون و لەش دەگەڕێینـــەوە. دەروون، وەکو ئامێر لـــەش بەکاردەهێنێت. دانانی ئەمەش بۆ بیردۆزەی هەســـتەکان تەواو دەردەچێت. ئێمە دەزانین ئەم بیردۆزەیە لەســـەر زانینمان بۆ هەســـتەکانی کەسێکی دیکە دامەزراوە و منی گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی هەســـتەکانی منیش لە هەســـتەکانی کەســـەکەی دیکە دەچێت. ئێمە گرفتەکانی ئەم بیردۆزەیەش دەزانین؛ من جیهان و هەســـتەکانی کەســـێکی دیکە بە ڕێگەی هەستەکانم دەناسم. هەستەکانیشـــم بە تەنیا هیچ زانیارییەکم نادەنێ. بیردۆزەی کارکردنیـــش، کە بونیادەکەی لە بونیادی بیردۆزەی هەســـتەکان دەچێت، هەمان گرفتی لەدوایە. لەڕاســـتیدا، ئەگەر من لە لەشـــی کەسێکی دیکەوە بکەومەگەر و بە ئامێری دابنێم ئەوا بۆ گەیشـــتن بە ئاکامێک بە کاری دەهێنم، کە من بە تەنیا ناتوانـــم بیگەمێ. من فەرمان بەســـەر کردەوەکانیدا دەدەم و بە کردەوەکانیشـــم کردەوەکانی ئەو دەوروژێنم. هەمانکات دەبێت بزانم ئامێر ناســـکە و بەکارهێنانی مەترســـی تێدایە. پەیوەندییەکەم لەگەڵیدا لە پەیوەندییەکی ئاڵۆزی نێوان کرێکار و مەکینەیەک دەچێت. کرێکارەکە مەکینەکە دەخاتە کار و خۆشـــی لێدەپارێزێت.

بۆ بەکارهێنانی ئامێری لەشـــی کەســـەکەی دیکە پێویستیم بە ئامێرێکی دیکەش هەیە. ئەو ئامێرە لەشی خۆمە چونکە بۆ ناسینی هەستی کەسێکی دیکە پێویستم بە هەســـتی خۆمە. کەوابوو، ئەگەر لەشـــم، وەکو لەشی کەســـێکی دیکە ببینم، دەبێت بە ئامێرێک لەنێو جهاندا و بە ناســـکی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم و دەبێت بە کلیلیش بۆ مامەڵەکردنم لەگەڵ لەشـــی کەسانی دیکەدا. بەڵام مامەڵەکردنەکەم تەکنیکییە. من بێ برانەوە بۆ مامەڵەکردنم لەگەڵ ئامێرێکدا پێویستم بە ئامێرێکی دیکە هەیە. ئەگەر من ئەندامەکانی هەســـتکردنم، وەکو ئەندامەکانی هەستکردنی کەسێکی دیکە دابنێم پێویستیم بە ئەندامی هەستکردن بۆ ناسینیان هەیە. ئەگەر لەشم، وەکو لەشی کەسێکی دیکە ئامێر بێت پێویستە ئامیرێکی دیکە هەبێت تاکو مامەڵەی لەگەڵدا بکات. ئەگەر ئەم پێویستییە بە بەردەوامییەکی نەبڕاوە دانەنێین دەگەینە پارادۆکسی مامەڵەکردن لەنێوان لەش و دەرووندا. بابزانین دەتوانن باسی سروشـــتی لەش-بۆ-ئێمە بکەن. بابەتەکان خۆیان لەنێـــو زەمینەیەکی ئاڵۆزی بە ئامێربوون بۆ ئێمە بەرجەستەدەکەن و هەریەکێک لەئەوان شوێنێکی داگیرکردوە. ئەو شوێنەش بە ئاماژەکردنەوە بەستراوە، "پەرداخەکە لەسەر مێزەکەیە." ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لە جوڵانی مێزەکەدا ئاگامان لە پەرداخەکە بێت. پاکەتی تووتنەکە لەسەر پاڵتۆکەیە واتە بۆ ئەوەی تووتنەکە بهێنین دەبێت سێ یارد ببڕین و بەسەر چەند شتێکیشـــدا تێپەڕین، کە لەنێوان مێزەکـــە و پاڵتۆکەدا دانراون. لەمڕووەوە هەستکردن لە هەڵوێســـتی پراکتیکی لەنێو جیهاندا جیاناکرێتەوە. هەریەکێک لە ئامێرەکان ئاماژە بـــۆ ئەوانی دیکە دەکات ئاماژەکردنەکـــەش لەبیرکردنەوەیەکی رووتـــدا دەرناکەوێت. لـــە بیرکردنەوەی رووتدا چەکوش ئامـــاژە بۆ مێخ ناکات و لە تەنیشـــتی دادەنرێت. چەمکی (تەنیشت) واتاکانی دیاریناکات، ئەگەر پەیوەندی نێوان چەکوش و مێخ نەدۆزرێتەوە. ئەو شوێنە بنەڕەتییەی خۆی بۆ من دەردەخات شوێنێکی (هۆدۆلۆجییە)؛[٥٦] بە تووڵەڕێ و شەقامەکان پڕبۆتەوە و ئامێری شوێنە. لەمڕووەوە، لەگەڵ سەرهەڵدانی مندا جیهان ئاماژە بۆ کۆمەڵێک کردەوە دەکات و ئەم کردەوانەش بۆ کردەوەی دیکە و هتد.

ئەگـــەر لەم ڕوانگەیەوە کردەوەکان و هەســـتکردن لە یەکـــدی جیانەکرێنەوە کردەوە بە کاریگەرێتییەکی داهاتوو دەبینرێت و بابەتە هەستپێکراوەکە ڕەتدەکات. مادام هەســـتپێکراوەکە ئەو بابەتەیە مـــن لەبەردەمیدا ئامادە دەبم ئەوا دەبێت بە هاو-ئامدەبوونم و پەیوەندییەکی ڕاســـتەوخۆی بە بوونی منەوە هەیە. خۆشـــی بە جۆرێک نیشان دەدات، کە من ئێستا نەتوانم تێیبگەم. هەستپێکراو پڕە لە بەڵێن و

٥٦ هۆدۆلۆجی زاراوەیەکی یۆنانییە لە دوو بەش پیکهاتووە: (هۆدۆ) واتە ڕێگا و (لۆجی) زانست. هەردوو بەشەکە پێکەوە واتای زانستی ڕێگا یان ڕێگا ناسین دەبەخشێت.(وەرگێڕ)

هەرخەسـڵەتێکی، کە من هەستی پێدەکەم و هەریەکێک لە ئاماژەکردنە پڕواتاکان بە داهاتووەوە گرێم دەدات.

کەوابوو، مـن لەبەردەم ئەو شـتانەدا ئامـادەم بەڵێنی گەیشـتنم بەو دیو ئامادەبوونەکەم دەدەن، کە من هێشـتا پێی نەگەیشتوم و بوونێکی ڕووتە لەوێدا. پیاڵەکە لەسـەر ژێرەکـەی دانراوە، هەردووکیان لەوێدا و بـۆ من ئامادەن، بەڵام لەوانەیە من نەیانبینم. ئەگەر بمەوێت ژێری پیاڵەکە ببینم دەبێت دەسـت بدەمە پیاڵەکە و بەرزیکەمەوە. ژێری پیاڵەکە لەدوای پرۆژەکانی منەوەیە. خۆدەرخستنی جیهان لەگەڵ سەرهەڵدانی مندا تەنیا هێڵکاری نەخشەی کردەوەکانم نیشاندەدات. هەسـتکردنەکەش بە سروشـت ڕوو لە کردەوەکانم دەکات و بە هۆکاری پڕۆژەی کردەوەکانمـەوە دەناسـرێت. جیهانیش هەمیشـە، وەکـو کەلەبەرێکی داهاتوو دەبینرێـت و ئێمەش ئەو داهاتووەین. پێویسـتە ئەوخاڵـە بزانین، کە داهاتووی جیهـان دەرەکییـە. ئامێرەکان ئاماژە بـۆ ئامێری دیکە یان ڕێگـە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا بۆ بەکارهێنانیان دەکەن؛ مێخ ئاماژە بۆ داکوتان و چەکوش بۆ گرتن و پیاڵەش بۆ بەرزکردنەوە دەکەن. ئەم خەسڵەتانە ڕاستەوخۆ خۆیان دەردەخەن. بێگومان پەیوەندییان بە بوونی ئێمەوە هەیە، بەڵام بونیادی جیهانن و ئەگەرەکان و ئامادەنەبوون و ئامێرەکانن. دەبینین جیهان خۆی، وەکو پیکهاتەیەکی دەرەکی دەردەخـات. ئاماژە بۆ لایەنێکی ناوەکی داهێنـەر ناکات، بەڵکو ئاماژەکردنەکەی بەردەوام بونیادی ئاڵۆزی نەبڕاوەی ئامیرەکانە.

ئاماژەکردنی ئامێرەکانیش بۆ یەکدی لەگەڵ دۆزینەوەی ئەو ئامێرەی دەبێت بە کلیل بۆ هەموویان کۆتایی دێت.

ئەم بنکەیە بۆ ئاماژەکردنەکان پێویستە هەبێت، ئەگینا هەموو ئامێرەکان یەکشان ڕادەوەستن و جیهانیش بێ ناسینی پەیوەندییەکان دەبێت بە کۆی ئامادەکردنەکان. (کارتیج) بۆ ڕۆمییەکان (وێران)کراوە و بۆ دانیشتوانی شارەکەش (پارێزراو)ە.[٥٧] کارتیج بێ ئاماژەکردن بۆ بنکەکەی هیچە. لەگەڵ ئەمەشدا کلیلەکە بە من نەدراوە، وەکـو کەڵێنێک دەردەکەوێت. ئەوەی من لـە جیهانی دەردەوە لە کردەوەکانمدا دەیناسم جیهانی ئامێرەکانە بەسەریەکدا کەوتون. منیش لە کردەوەکەمدا مامەڵە لەگەڵیاندا دەکـەم، ڕەتیاندەکەم و خۆم بە ئامێرێکی دیکـە دەگەیەنم. مێخەکە ئاماژە بۆ چەکوش و چەکوشـیش ئاماژە بۆ ئەو دەسـتە دەکات بەکاریدەهێنێت. ئەمەش لەو حاڵەتەدا ڕوودەدات، ئەگەر کەسێک مێخ و چەکوشەکە بەکاربهێنێت. دەسـتی کەسەکەش ئامێرە، کە ئاماژە بۆ گەلێک ئامێری دیکە دەکات (بۆ نموونە هەڕەشـەکردن، بەڵێن یان موچەدان و هتد). یەکەم چەمک لە هەموو شـوێنێکدا

٥٧ کارتیج شارێکی کۆنی باکوری ئەفریقیا نزیک تونس بووە، ڕۆمییەکان لە ساڵی 146 ی پێش زایینی وێرانیان کردووە. (وەرگێڕ)

هەیە، بەڵام تەنیا ئاماژەی بۆکراوە. من لە کاتی نوسیندا هەست بە دەستم ناکەم تەنیـــا پاندانەکەم دەبینم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مـــن پاندانەکە بۆ پێکێنانی پیتەکان بەکاردەهێنم نەک دەســـتم. دەستم بۆ گرتنی پاندانەکەیە. بەو شێوەیەی پەیوەندیم بە پاندانەکەوەیە، پەیوەندیم بە دەســـتمەوە نییە؛ دەســـتم و هەموو ئاماژەکردنەکان دەوەســـتێنێت. دەســـتم تەنیا بۆ بەکارهێنانـــی پاندانەکە داناوە. لەمحاڵەتەدا، دەســـتم چەمکێکی نەناســـراو و بەکارنەهێنراوە و دوا ئامێرە لەنێو ئامێرەکانی، وەکو پەرتووک بۆ خوێندنەوە، وشەی سەرلاپەڕەکان کە بە پاندانەکە نوسراون. هەروەها لەنێو ئەم زنجیرەیەشدا پەرتووک ئاماژە بۆ دەست دەکات.

لە نوســـیندا من تەماشای نوکی پاندانەکە دەکەم، کە هێڵ و پیتەکان دەخاتە ســـەر لاپەڕەکە و دەستم نابینم. دەستم لەنێو ئاڵۆزی ئامێرەکاندا وندەبێت، تاکو بوون و واتا بەو سیستەمە ببخشێت.

دەردەکەوێت لەبەردەم دوو جۆر پێویستی ناکۆکدا ڕاوەستاوین: مادام هەریەکێک لـــە ئامێرەکان لە ڕێگەی ئامێرێکی دیکەوە دەناســـرێت و بەکاردێت، ئەوا جیهان ئاماژەکردنێکـــی نەبڕاوەیە لە ئامێرێکەوە بۆ ئامێرێکـــی دیکە. ئێمەش لە ڕێگەی بەئامێرکردنی بوونی خۆمانەوە دەچینە نێو جیهانەوە و ناتوانین کار لەسەر جیهان بکەین ئەگەر کارمان لەســـەر نەکرێت. لەهەمانکاتدا واتای سیستەمە ئاڵۆزەکە لە کردوەکاندا ئاشکرادەبێت، بۆنموونە داکۆتانی مێخەکە و چاندنی تۆو. سیستەمەکەش ئاماژە بۆ بنکەکەی دەکات. بنکەش ئامێرێکە و لەنێو سیســـتەمەکەدا ئامێرەکانی دیکـــە ئاماژەی بۆ دەکەن و ئەو ئامێرەیە ناتوانین بەکاریبهێنین. ئێمە ئەو ئامێرە بەکارناهێنین چونکە خودی بوونـــی ئێمەیە. من خۆم لەگەڵیدا ڕاناهێنم و دەبێت بـــە خۆڕاهێنانم لەگـــەڵ ئامێرەکانی دیکەدا؛ ڕاهێنانێک، کە لەســـەر بوونی خۆم ڕاوەستاوە.

لەبەر ئەم هۆیەشە لەگەڵ بەراوردکردنی لەشم و لەشی کەسانی دیکەدا دووجۆر تێگەیشتن ســـەرهەڵدەدەن: یەکەم، لەش ناسراوە و بابەتگەرانە پێناسدەکردێت، بەڵام پوچەڵە چونکە بۆ ئەم تێگەیشـــتنە بیرۆکە هۆشەکییەکەی من، وەکو ئامێر دەبینێت لەسەر ئەو ئامێرانە ڕاوەستاوە بەکاریان دەهێنم. لێرەدا، ئەو ئامێرەی لە هەموویان زۆرتر بنەڕەتییە دەبێت بە بنکەیەکی ناســـرەکی و پەنا بۆ ئامێرەکانی دیکـــە دەبات تاکو ئاماژەی بۆ بکەن و بـــەکاری بهێنن. لەم ڕووەوە بەئامێربوونی جیهان لەناودەچێت و بۆ خودەرخستنەکەی پێویستی بەئاماژەکردن بۆ بنکەیەکی بنەڕەتی دەبێت؛ جیهانی کردەوەکان دەبێت بەو جیهانەی لای زانســـتی کلاسیکی کاری لەســـەر دەکرێت؛ ئاگامەندی لە دەرەوەدا لـــە جیهان دەکۆڵێتەوە و ناچێتە ناوی. دووەم، لەش بابەتێکی کۆنکریتی و پڕە و لە ڕێکخستنی بابەتەکان دەچێت. بۆ گەیشـــتن بە ڕێکخستنێکی نوێ بوون-بۆ-خۆ تێپەڕی دەکات. لەم بارەدا، لەش

بەبــێ ئەوەی ببینرێت لە هەموو کردەیەکدا ئامادەیە. کردەوە چەکوش و مێخەکە یان برێک و گۆڕانی خێرایی دەردەخات نەک ئەو دەستەی چەکوشەکە دەگرێت یان ئەو پێیەی لەسەر برێکەکەیە. لەش دەژی بەڵام ناناسرێت. ئەمەش وەڵامدانەوەکەی مانێ دی بیران بۆ ســایکۆلۆجی هیوم لە گوتەکەیدا (هەســتکردنی هەوڵدان)، کە بەئەفسانەی دادەنا ڕووندەکاتەوە. ئێمە هەستکردنی هەوڵدانمان نییە و هەستیش بە ماسولکە و ئێسقان و پێست ناکەین. ئێمە هەست بە بەرەنگاریکردنی شتەکان دەکەین. لە کاتێکدا پەرداخەکە بەرەو لێوم بەرزدەکەمەوە هەست بە هەوڵدانەکەم ناکەم بەڵکــو گرانی پەرداخەکەم بۆ دەردەکەوێت و لە بەشــداری کردنیدا لەنێو سیســتەمی ئامێرەکانم لەنێــو جیهاندا بەرەنگاری دەکات. باکیلارد بە دروســتی لەسەر کیشەی (لێکدانی لایەنە دژوەستاوەکان) ڕەخنە لە فینۆمینۆلۆجی دەگرێت و بە کورتبینی دادەنێت. ئەم ڕەخنەیە هزری بەرزێتی هایدیگەر و مەبەســتدارێتی هوسرلێش دەگرێتەوە. بەڵام گرنگە بزانین بە ئامێربوون بنەڕەتییە. لەسەر پەیوەندی بە ئامێرە بنەڕەتییە ئاڵۆزەکەوە بابەتەکان بەرەنگاری و دژایەتی خۆیان دەردەخەن. بورغووەکە خۆی دەردەخات بۆ جەڕەکە گەورەبێت و ناچێتە ناوی، بناخەکە بێهێزە و ئەو بابەتە ڕاناگرێت، کە لەســەری دادەنێین، بەردەکە گرانە و ناتوانین بۆ سەر دیوارەکە بەرزیکەینەوە و هتد. بابەتەکانی دیکەش هەڕەشــە لە ئامێربوونە ئاڵۆزە هەڵبەستراوەکە دەکەن. زریان و تەرزەکە زیان بە دورێنە و فیلۆکسیرا بە شەراب و ئاگرەکەش بە خانووەکە دەگەیەنێت. هێدی هەرەشــەکردنەکە ڕوو لە بنکەکەش دەکات. هەموو بە ئامێربوونە ئاڵۆزەکان و ڕوخێنەرەکان ئاماژە بۆ لەشم دەکەن.

لەشــم لە هەموو شــوێنێکدایە و بەردەوامیش لەنێو مەترســیدایە. بۆمباکەی خانوەکــە دەڕوخێنێت لەشیشــم وێران دەکات چونکە خانوەکە ئاماژە بۆ لەشــم دەکات. لەبەرئەمەیە[دەڵێین] لەش هەمیشە ڕوو لەو ئامێرانە دەکات، کە دەیەوێت بەکاریان بهێنیت: ئەو لەســەر دارەکەیە و لە ژوور زەمینەوە ڕاوەستاوە، لە پشت تەلیسکۆبەکەوەیە و ئەستێرەکانم نیشاندەدات؛ لەسەر کورسییەکە دانیشتوە و لە ماڵەوەیە، من [بە هۆکاری لەشمەوە] خۆم لەگەڵ ئەم ئامێرانەدا دەگونجێنم.

لە کۆتایی توێژینەوەکاماندا هەســتکردن و کارکردن یەکدەگرن. ئێمە پەیڕەوی ئەو بۆچوونە ناکەین، گوایە لەپێشدا لەشمان پێدەدرێ و دوایی لە ڕێگەی لەشەوە مامەڵە لەگەڵ جیهاندا دەکەین. بەڵکو لەشــمان بە ڕێگەی مامەڵەکردنمان لەگەڵ جیهان و هەبووەکاندا دۆزییەوە. لەش ئەو هەبووە نییە شتەکان بۆ ئێمە دەربخات. ئێمــە بە هۆکاری بە ئامێربوونی شــتەکانەوە، کە ئاماژە بــۆ لەش دەکەن لەش دەناسین. لەش پەردەیەک لەنێوان ئێمە و شتەکاندا نییە و تاکە کەسی و هەڵکەوتنی پەیوەندییەکانمان بە ئامێرەکانەوە دیاریدەکات. لەم بەستێنەوە ئێمە هەستەکان و ئەندامەکانی هەستکردنمان بە بوونـ‌لەنێوـ‌جیهاندا دانا. بەهەمانشێوەش کردەوەش

بەمجــۆرە پێناس دەکەین. بەڵام، ئەگەر من لەنێو شــتەکاندابم لەبەر ئەوەیە من جیهانم لەوێدا لەگەڵ بەرزێتییەکەمدا و گەشتەکەم بەرەو بوونی خۆم پەیداکردوە. ئەگەر منیش ئامیرێکی نێو جیهان بم لەبەر ئەوەیە من لە دانانی پرۆژەی بوونمدا ئامێرەکانی دیکەم هێناوەتەکایەوە. تەنیا لەنێو ئەو جیهانەدا، کە لەشی تێدایە بۆ ئەوەی بوونی جیهان بسەلمێنین دەبێت پەیوەندی پێویست هەبێت. لەڕوویەکەوە، لەش ڕاســتەوخۆ منە. لەڕوویەکی دیکەشـــەوە، چڕی و پڕی جیهان من لە لەشم جیادەکاتەوە. کشانەوەی جیهان بەرەو فاکتۆرەکانی بوونم لەش لە من نزیکدەکاتەوە. ئەم کشانەوەیەش تێپەڕبوونێکی بەردەوامی بوونی منە.

لێــرەدا دەتوانیـــن پێناســـەی لـــەش، وەکــو سروشـــت-بۆ-ئێمە بکەیـــن. ڕوونکردنەوەکەشـــمان ئەوە دەردەخات، کە لەش تێپەڕبوونێکی بەردەوامە. لەش، وەکو بنکەی هەستکردن بۆ ئاماژەکردن ئەوەیە، کە من دەکەومە ئەودیوی چونکە من ڕاســـتەوخۆ لەبەردەم پەرداخەکە، مێزەکە یان ئەو درەختەی دەیبینم ئامادەم. هەستکردن دووری لەنێوان بابەتەکە و هەستکەرە لەناودەبات. لەهەمانکاتدا، لەبەر ئەوەی هەستکەرەکە لەشە دوورییەکەش دەمێنیتەوە. لەش، کە بنکەی ئامێرەکانە بەســـەریدا تێدەپەڕین؛ من دەتوانم بۆ گەیشن بە پێکهێنانی ئاڵۆزی دیکە تێپەڕی بکـــەم. لەگەڵ ئەمەشـــدا هەموو پێکهێنانێکی نوێ ئامـــاژە بۆ لەش وەکو بنکەی ئاماژەکردنـــەکان دەکات. کەوابـــوو، لەش، لەبەر ئـــەوەی تێپەدەکرێت ڕابردووە. بـــەڵام، ئامادەبوونێکی ڕاســـتەوخۆی هەستەکانی (بوون-بۆ-خۆ)شـــە و ئاماژە بۆ بنکـــەی ئاماژەکردنەکان دەکات، کە ڕووی لە پێکهێنانێکی نوێ کردوە. لە هەموو پرۆژەیەکی بوون-بۆ-خۆوە دەگاتە ئەو ئێستایەی، کە لێی ڕادەکات. لە یەک کاتدا خاڵی دەســـتپێکردن و دەرچوونیشە. خاڵی دەســـتپێکردن و دەرچوونیش منم و دەمەوێت ئەو بوونەی خۆم ڕەتبکەم، کە هەمە.

ئـــەم بۆچوونە بەردەوام ڕەتی دەکەین و لە دایکیش دەبێتەوە خاڵی دەرچوونە و ناتوانم لێوەی دەســـتپێنەکەم و (پێویســـتی) هەڵکەوتنی منە. لە دوو سەرەوە پێویستییە. لەسەرێکەوە ناسینەوەیەکی بەردەوامی بوون-بۆ-خۆیە لەلایەن بوون-لەنێو-خۆوە و ئەو فاکتۆرە ئۆنتۆلۆجییەیە، کە ڕایدەگەیەنێت بوون-بۆ-خۆ بوونێکە ناتوانێت ببێت بە بناخەی خۆی. بوونی لەش ئەو ڕاستییە دەگەیەنێت ئەو هەبووە بناخەی نەبوون نەک بوونی خۆیەتی؛ من بەو ڕادەیەی خۆمم[هەمانکات]لەشی خۆمم. بەو ڕادەیەی ئەوە نیم، کە هەم نابم بە لەشی خۆم. من بە هۆکاری لەناوچوونییەوە لێی ڕادەکەم. بەڵام هیچ بابەتێکی لێپێک ناهێنم چونکە ئەوەی بەردەوام ڕادەکات منم. لەش لە سەرێکی دیکەشەوە پێویســـتییە؛ ڕێگرێکە لەنێو جیهاندا لەبەردەم تێپەڕبوونەکەدا. لەم ڕووەوە هیچ جیاوازییەکی لەڕیزکردنی شتەکانی نێو جیهان، بۆ ڕێگرتن نییە. ئێمە دەتوانین ئەم دوو پێویستییە پێکەوە گرێبدەین و یەکێتییەک لە

نێوانیاندا دروست بکەین: بوون-بۆ-خۆ جیهان تێپەڕدەکات و بەو تێپەڕبوونە جیهان دەهێنێتە کایەوە. تێپەڕبوونی توێژینەوەی جیهان نییە، بەڵکو مامەڵەکردنە لەگەڵیدا تاکــو بتوانێت لێیدەرچێت. هەروەها گرنگە بۆچوونێکـــی هەندەکی تێپەڕبوونەکە کاریگەر بێت. لێرەدا هەبوویەکی بڕاوە دەبێت بە بارودۆخێکی پێویست بۆ پرۆژەی ڕەسەنی بوون-بۆ-خۆ. بارودۆخێکی پێویست بۆ من، کە لەودیو ئەو جیهانەوەی من پێکم هێناوە ببم بەوەی نیم یان نەبم بەوەی هەم. ئەم بارودۆخە لە ناخی هەوڵدانە لە کۆتایی بەدەرەکەمدایە. ئەو شــتەی، کە منە و هێشتا پێی نەگەیشتوم، بێجگە لە شــێوازی نەبووندا، ناناســرێت و ناگیرێت. لە هەموو شــوێنێکدا هەیە و خۆی تێپەڕدەکات و بۆ دامەزراندنی پرۆژەکانم دێتە پێشەوە. هەموو شتەکان ئاماژەی بۆ دەکەن و بوونی بۆ من دەردەخەن بەبێ ئەوەی ئاوڕیان لێبدەمەوە چونکە ئەوەی ئاماژەی بۆ دەکات خودی بوونمە.

نابێت واتێبگەین ئاماژەکەرەکە بنکەیەکی ڕووتکراوە و چەق وەستاوەی ئامێرەکاتە. بەپێچەوانەوە، دینامیکییەتی بنکەکە، گرنگ نییە لەسەر کردەوە دامەزرابێت یان نا، بەگوێرەی گۆڕانکارییەکان و ناسنامەکەشی پێناسەی بۆ دادەنرێت. ئەم ڕاستییەش بەپێچەوانەوە ناناســرێت چونکە ئەوەی جیهان پێکدەهێنێت و لەگۆشەنیگایەکەوە دەڕوانێتە ڕابردوو؛ بۆنموونە لە پرۆژەکانمدا بوون ڕەتدەکەم، منم. دەتوانم نکۆڵی لەوەبکەم، کە من ئەم یان ئەو شــتە نیم. لەم ڕووەوە لەش، بۆ نموونە ئەم شــتە دراوە نەناسراوە و بارودۆخێکی پێویستە بۆ کردەوەکانم.

ئەگەر خواســت و نیاز بۆ گەیشتن بە ئاکامێک بەس بوونایە و یاساکانیش بۆ بەکارهێنانی ئامێرەکان پێویست نەبوونایە ئەوا نەمدەتوانی جیاوازی نێوان ویست و ئارەزوو، خەون و کردەوە، ناڕاســت و ئەوەی لەنێــو داکەوتایە بدۆزمەوە. هیچ پرۆژەیەکم نەدەهاتە نێو جیهاتەوە چونکە بوونی لەنێو بیرکردنەوەدا بەس بوو. لە ئاکامیشــدا بوون-بۆ-خۆم لەگەڵ جیانەکردنەوەی داهاتوو و ڕابردوودا لەناودەچوو. فینۆمینۆلۆجــی کــردەوە دابەشــکردنی بەردەوامی کــردەوەکان دادەمەزرێنێت. هەمەکــی و بیرۆکە ڕووتکــراوەکان وەکو (کابرێتەرەکە نابێــت بگیرێ)، بیرۆکەی تەکنیکــی و کۆنکرێتی بۆ کابرێتەرەکە بە کاردێن لەنێو ئەو بەســتێنە ڕەهایەوە لەیەکــدی جیادەکاتەوە. بارودۆخی بیرۆکە تەکنیکییەکە بەو جۆرەی لە کردەوەکە جیانابێتەوە فاکتۆری بوونی بڕاوەی منە. ئێســتا، بۆ ئەوەی کێشــەکە بەتەواوی ڕوونبکەینەوە، من، کە خاوەنی ڕابردووم، لەسەر ئەو لەناوچوونەی لە منداڵییەوە توشــم دەبێت، ڕابردوو ئاماژە بۆ بوون-لەنێو-خۆ دەکات. کەوابوو، لەش فاکتۆری ڕابــردووە و ئاماژە بۆ لەدایکبوون دەکات: ئەمەش ئــەو لەناوچوونەیە دەبێت بە هۆکار بۆ دەرچوونی من لە بوون-لەنێو-خۆوە، کە بوونی منە و منیش نامەوێ ئەو بم. لە دایکبوون، ڕابردوو، هەڵکەوت پێویستی بۆچوون و مەرجە فاکتۆرییەکان بۆ

کردەوەکانم لەنێــو جیهاندا-وەکو لەش هەموویان بۆ منن. ئەمانە بە هیچ جۆرێک بارودۆخێکی هەڵکەوتووی دەروونم نین، بەڵکو بویناددێکی هەمیشەیی ئەگەرەکانی ئاگامەندیمن. ئاگامەندیشم ئاگاییە لە جیهان و پرۆژەیەکی بەرزە و ڕوو لە داهاتووم دەکات.

لەم بۆچوونەوە پێویستە دوو شت بناسینەوە؛ هەردووکیان پێکەوە هەڵکەوتن و لە واتا بەدەریشن؛[وەکو دەلێێن] من ئیفلیجم، کوڕی فەرمانبەرێکم یان کرێکارێکم، تەمەڵم، هەمانکات پێویســتە شــتێکی دیکەش بم؛ فەرەنسی، ئەڵمانی، ئینگلیز؛ پرۆلیتــار، بورژوا، ئەرســتۆکرات، هتــد. یان زەبون و نەخــۆش بم چونکە بەبێ شاردنەوەی جیهان ناتوانم لە جیهان بکۆڵمەوە. لەدایکبوونم مەرج بۆ ئەو بابەتانە دادەنێت خۆیان بۆ من دەردەخەن (وەکو بابەتی خۆشــگوزەرانی پێویستییەکانی ژیان و ڕاســتەقینە قەدەخەکراوە کۆمەڵایەتییەکان و سنورداریّتی شوێن)؛ ڕەگەزم بەوجۆرەی کەســانی دیکــە دەیبینن و چینەکەم بەگوێــرەی ژیانی کۆمەڵایەتی؛ نەتەوەکەم و بونیادی دەروونیم؛ هەڵویســتم، ڕابــردووم؛ هەموویان پێکەوە، کە من دەمەوێت تێپەڕیان بکەم وەکو بارودۆخی پێویســت بۆ بوونی جیهان دەبن بە یەکێتییەکی تێهەڵکێشراو بۆ بوونم لەنێو جیهاندا و هەروەها بۆ لەشم.

لێرەوە واتای پێناســەکەمان بۆ لەش چاکتر ئاشــکرا دەبێت: لەش فۆرمێکی پێویستی بوونی هەڵکەوتووی منە. هەڵکەوتنەکە لەوێدا دەردەکەوێت، کە تێدەگەین لــەش بۆ ئێمەیە؛ ئێمە هەڵبژاردنین؛ بوون هەڵبژاردنە. تەنانەت ئیفلیجییەکەشــم لەبــەر ئەوەی دەمەوێ بژیم هەڵمبژاردووە و بــە دانانی پرۆژەکانم تێپەڕی دەکەم یان دەیکەم بە ڕێگرێکی پێویســت بۆ بوونم. من ئیفلیج نیم، ئەگەر خۆم ئیفلیجی هەڵنەبژێرم. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەو ڕێگەیە دەگرمەبەر من تیایدا بە ئیفلیجی دەردەکەوم، (دەڵێم بەرگەیناگرم، شەرمەزارم، دەیشارمەوە، بە هەموو کەسێک دەڵێم و شانازی پێوە دەکەم یان بە هۆکاری سەرنەکەوتنەکەمی دادەنێم.) لەش پێویســتییەکە بــۆ هەڵبژاردن و دەبێت بە مەرجیش بۆ سەربەســتییەکەم؛ سەربەستی بێ هەڵبژاردن نییە. دەبێت بە واتای چەمکی لەش بۆ من بگەین چونکە لەش ناناســرێت و یەکێکیش لە بابەتەکانی نێو جیهان نییە، کە من دەیانناسم و بەکاریــان دەهێنم. من بەبێ ئاگایی لە بوونی خۆم هیچ نیم، کەوابوو دەبێت لەش بخرێتــە نێو ئاگاییەوە. لەلایەکەوە، لەش، وەکــو ئامێرێک دەتوانم بیگرم و بەبێ ئەوەی بزانم چ جۆرە ئامێرێکە بیناسم.

ئەگــەر خۆمان بــەم ڕوانینەوە ببەســتینەوە هیچ جیاوازییــەک لەنێوان ئەو تەلیسکۆپەی زانایەک تەماشای ئەستێرەکانی پێدەکات لەگەڵ لەشمدا نادۆزینەوە. لەڕاســتیدا، ئەگەر پێناسەی لەش، وەکو بۆچوونێکی هەڵکەوتوو بۆ جیهان بکەین دەبێــت بزانین چەمکی بۆچوون دووجۆر پەیوەنــدی دیاریدەکات: پەیوەندی بەو

بابەتانەوە هەیە لەش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و پەیوەندیشـــی بەو هەبوەشەوە هەیە، کـــە خاوەنی لەش و بۆچوونەکەیە. کاتێک مامەڵە لەگەڵ لەش-وەک-بۆچوون دەکەیـــن پەیوەندی دووەم ڕادیکالانە لە یەکەم جیادەبێتـــەوە. ئەم جیاوازییە لە بۆچوونەوە بەرانبەر جیهان ڕادیکالانە دەرناکەوێت (بۆنموونە تەماشاکردن، ڕوانگە یان دووربین)، کە ئامێری دەرەکین و لەش نین. گەشتیارێک لە هاوینەهەوارەکەیەوە تەماشـــای دەشـــت و دەر دەکات: ئەو هاوینەهەوار و دەشت و دەرە، درەختەکان و بنمیچی هاوینەهەوارەکەش، کە ئاســـمانی شـــاردۆتەوە دەبینێت. دووری نێوان هاوینەهەوارەکە و کەسەکە لە دووری نێوان چاوەکانی دیمەنی پان و بەرینی دەشت و دەرەکە کەمترە.

بۆچوون دەتوانێت لەش لەنێو خۆیدا ون بکات. چاویلکە یان دووربین دەبن بە شتێکی زیادکراو بۆ ئەندامەکانی هەستکردن. لەحاڵەتی بۆچوونی ڕەهاشدا جیاوازی نێوان بۆچوونەکە و کەســـەکە نامێنێت. کەسەکە ناتوانێت دوورەپەرێز ڕاوەستێت و بۆچوونێکی نوێ بەرانبەر ئەو بۆچوونە دروســـتبکات. ئەم فاکتۆرەشە دەبێت بە خەسڵەتی لەش. لەش ئەو ئامێرەیە، کە من ناتوانم وەکو ئامێرەکانی دیکە بەکاری بهێنم و ئەو بۆچوونەیە، کە بۆچوونێکی دیکەی لەسەر دروستنابێت. لەبەرئەمەیە لەســـەر گردەکەوە، کە بـــە ڕوانگەیەکی چاکی دادەنێم لەو کاتەدا تەماشـــای نێو دۆڵەکـــە دەکەم بۆچوونم دیاریدەکەم و ئەم بۆچوونەشـــم لەشـــمە. بەڵام ناتوانم تەماشای لەشم بەبێ ئاماژەکردن بۆ شتە بڕاوەکان بکەم. کەوابوو، لەش بە زانراوی و بەرزییەوە بۆ من نییە: ئاگامەندی ڕاستەوخۆ ئاگایی لە لەش نییە.

باشـــترە بڵێین ئاگامەندی بوونێکی (لەش)یی هەیە. لێرەوە پەیوەندی نێوان لەش-وەکو بۆچوون و شـــتەکان دەبێت بە دەرەکی و پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و لەشـــیش بە پەیوەندییەکی بوونگەرانە. ئایا مەبەســـت لە پەیوەندی بونگەرانە چییە؟

یەکەم، ئاشکرایە ئاگامەندی دەتوانێت، وەکو ئاگامەندی لەش هەبێت. کەوابوو، لەشم بونیادێکی ئاگاییانەی ئاگامەندیمە. لەبەرئەوەی لەش بۆچوون یان گۆشەنیگایە، کە لەسەر ئەو بۆچوونە دانامەزرێت، ئەوا لەسەر ئاستی ئاگامەندییەک، کە خاوەنی تێڕامان نییە، ئاگامەندی لەش پەیدا نابێت. لەش سەربەخۆ-ئاگاییەکی لە تێڕامان بـــەدەرە. ئایا دەتوانین لەگەڵ هەمووجۆرە ئاگاییەکی لە تێڕامان بەدەر داینێین؟ ئەمەش کارێکی مەحاڵە، چونکە ئاگایی لە تێڕامان بەدەر خۆ-ئاگاییە و پڕۆژەیەکە سەربەستانە ڕوو لە خۆی دەکات و بناخەی نەبوونی خۆیەتی.

ئاگامەندییـــەک ڕوو لە دەرەوە نەکات ئاگاییە لە لەش؛ ئەو بوونەیە بەزاڵبوون بەسەریدا و لەناوبردن خۆی دەکات بە ئاگامەندی. بوونێکە ئاگامەندی بەبێ ئەوەی پێویست بکات ئەو بێت خۆی بەو دەکات و هەمانکات بۆ ئەوەی خۆی بەوەبگەیەنێت،

کە هێشـــتا نییەتی، تێپەڕی دەکات. بەکورتییەکـــەی، ئاگایی لە لەش لابەلایی و ئاوڕدانەوەیە. ئەو شـــتەیە پشتگوێ دەخرێت و بەبێ دەنگ تێپەڕ دەکرێت. لەگەڵ ئەمەشـــدا، لەش ئاگامەندییە؛ ئاگامەنـــدی بێجگە لە لەش چی دیکە نییە. ئەوەی لەودیـــو ئەوەوە هەیە هیچـــە و بێدەنگییە. ئاگامەندی لەش لـــە ئاگامەندی هێما دەچێت. هێماش لەسەر لەشەو یەکێکە لە بنەڕەتەکانی بونیادی لەش. ئاگایشی لە هێما هەیە، ئەگینا ئێمە ناتوانین لە واتاکەی تێبگەین. بەڵام هێما بۆ تێگەیشتن لە واتاکەی تێپەڕدەکرێت و لەپێناوی گەیشتن بە واتا پشت گوێ دەخرێت و بە تەنیا نابینرێت. تەماشا هەمیشە دەڕوانێتە شتێک، کە لەودیو هێماوەیە.

ئاگامەندی لەشـــیش لابەلا و ئاوەردانەوەیە لەوەی، کە ئاگامەندی پێکهێناوە. بەبی ئەوەی پێویســـت بـــکات ئەو ئاگامەندی بێت. ئەمـــەش ئاگامەندی دەکات بە ئاگاییەکـــی لە بیردۆزە بەدەری ئەو هەڵوێســـتەی کاریگەرە. ئاگامەندی لەش زۆرجار لەگەڵ کاریگەریێتییە بنەڕەتییەکەدا تێکەڵدەکرێت. گرنگە واتای کاریگەرێتی بزانین.

بۆ ئەم مەبەستە دەبێت زۆرتر لە جیاوازی بدوێین. کاریگەرێتی، وەکو تێڕامان کاریگەرێتییەکـــی پێکهاتوو بە ئێمە دەناســـێنێت و ئاگاییە لە جیهان. هەموو ڕق و کینەیەک ڕەق و کینەیە بەرانبەر شـــتێک؛ توڕەیی هەســـتکردنە بە ئامادەبوونی شـــتێک ڕقمان لێیەتی، کە دادوەرانە نییە یـــان هەڵەیە؛ بەزەیی بەزەیی هاتنە بە کەســـێک و هتد. لەم نموونانەدا مەبەســـتە بەرزەکەمان ڕووی لەجیهان کردووە و هەســـتی پێدەکات. جۆرە ڕەتکردن و ڕەتدانەوەی ناوەکییان تێدایە. ئێمە خۆمان لەســـەر زەمینەی هەڵبژاردن و بەرزێتی دەدۆزینەوە. بەڵام، شیلەر سەلماندویەتی، کە "مەبەســـت" لە خەسڵەتە کاریگەرە ڕەوانەکان جیادەبێتەوە. بۆنموونە، ئەگەر من توشـــی ژانەســـەر بم، ئەوا لەنێو خودی خۆمدا کاریگەرێتییەکی مەبەســـتدار، کـــە ڕوو لە ژانەکە دەکات دەدۆزمەوە و دەبێت بڕیار لەســـەر بەرگەگرتنی ژانەکە بدەم یان لەناوییبەرم. لێرەدا مەبەســـتەکە کاریگەرێتییەکەیە؛ کردەوەیەکی ڕەوان و پڕۆژەیە. ئاگامەندییەکی ڕوانە لە شـــتێک. ئەمە ئاگایی نییە لە لەش، کە ئێمە دەمانەوێت باســـیبکەین. لەڕاستیدا، مەبەستەکە نابێت بە هەموو کاریگەرێتییەکە. کاریگەرێتی تێپەڕکردنە و تێپەرکردنەکەش پێشبین دەکات. ئەمە بە ڕێگەی بوونی ئەو (ســـۆزە ڕووتکراوانەوە) دەســـەلمێنین، کە بۆڵدوین بە هەڵـــە ناوییبردوون. بە بۆچوونی بۆڵدوین، ئێمە بەبێ ئەوەی هەستکردنێکی کۆنکرێتیمان هەبێت دەتوانین لەنێو خۆماندا جۆرە ســـۆزێک بدۆزینەوە. ئەگەر کەسێک باسی جۆرێک ئازارم بۆ بکات، کە ژیانی پیرۆی تاڵکردوە، من بیردەکەمەوە، کە پیرۆ چەند ئازاری چێشتوە. من نازانم ئەو چەند ئازاری چێشـــتوە و هەســـتیش بە ئازارەکەی ناکەم. ئەمجۆرە هەســـتکردنانە دەکەونە نێـــوان زانین و کاریگەرێتی ڕاســـتەوخۆوە و لای بۆڵدین

ڕووتکـــراوەن. بەڵام میکانیزمی ڕووتکردنەوەکە نادیارە. ئایا کێ ڕووتیاندەکاتەوە؟ ئەگەر پەیڕەوی پێناســـەکەی لاپۆرت بکەین دەبێت لە ڕووتکردنەوەدا بیر لە چەند بوونیادێکی دوور وەستاو بکەینەوە، کە بەبێ یەکدی ناتوانن هەبن. پێویستە سۆزە ڕووتکـــراوەکان بە چەمکە ڕووتکراوە ڕەوانەکان دابنێین یان بڵێین ئەم ڕووتکراوانە جۆرێکن لە شێوازەکانی ئاگامەندی.

ڕوانینمان بۆ ســـۆزە ڕووتکراوەکان دەریدەخات، کە مەبەست و پرۆژەی ڕەوانی سۆزن. ئێمە ڕوو لە ئازار و شەرم دەکەین، خۆمان لێیان دەپارێزین و ئاگامەندی خۆی ڕەتدەکات، بەڵام بە چۆڵی. خەم لەوێدا هەیەو بابەتی و بەرزە بەبێ ئەوەی بوونێکی کۆنکرێتی هەبێت. باشـــترە چەمکی کاریگەرێتی ئەندێشـــاوی بۆ ئەمانە دابنێین. بێگومان نکۆڵی لە گرنگیان بۆ داهێنانی هونەری و توێژینەوەی ســـایکۆلۆجییانە ناکرێت. ئەوەی لە شەرمکردنی ڕاستەقینە، بۆنموونە، جیایاندەکاتەوە ژیانە. کەوابوو، خەسڵەتی کاریگەرێتی ڕەوان هەیە، کە پرۆژەی کاریگەرێتی تێپەڕیدەکات. ئێمەش، وەکو شـــیلەر مامەڵەی لەگەڵدا ناکەین و بەجۆرێک (هیۆلی) نێو تەوژم و جوڵانی ئاگامەندی دانانێین. بۆ ئێمە ئەو ڕێگەیەیە ئاگامەندی تێدایە و هەڵکەوتەکانی تێدا دادەمەزرێت. ئەو ڕووکەشە ئاگامەندییە، کە ئاگامەندی بۆ گەیشتن بە ئەگەرەکانی تێپەڕیدەکات و دەبێت بە خۆدەرخستنی ڕاستەوخۆی ئاگامەندی بەبێ ئەوەی پەنا بۆ بیردۆزە بەرێت. دەشـــێ خەمێک ڕەوان بێت، بەڵام لەوانەیە مەزاجیش بێت یان کاریگەرێتی، ڕازیبوون و ڕازینەبوونێکی ڕەوان بێت.

بەگشـــتی ئەمە بە (هەســـتکردنی هاوبەش) ناوزەددەکرێـــت.[58] زۆرکەم ئەم هەســـتکردنە دەردەکەوێت. ئێمە لە ڕێگەی پرۆژەکانمانەوە بەرەو جیهان تێپەڕی دەکەین. لەبەرئەمە دژوارە بە تەنیا و دابڕاوی لەســـەری بکۆڵینەوە. هێشتا چەند ئەزمونێکـــی تایبەت هەن بـــە ڕەوانی لێیان تێدەگەیـــن، بەتایبەتی ئازاری لەش. کەوابوو، بۆ ئەوەی چاو ببڕینە سەر بونیادی ئاگامەندی لەش دەبێت لەم ئەزموونە بکۆڵینەوە.

من چاوەکانم دێشـــێن، بەڵام پێویســـتە پەرتووکە فەلسەفییەکە ئەم ئێوارەیە بەتەواوی بخۆێنمەوە. پرۆژەی ئاگامەندیم پەرتووکەکە و ڕاستییەکانە لەودیو بوونی پەرتووکەکەوە. لەشـــم خۆی دەرناخات و بەڵکو خاڵی دەرچوون و بۆچوونی منە. وشەکان یەک لە دوای یەک دێن و دەڕۆن؛ دەیانخوێنمەوە، وشەکانی خوارەوەش، کەهێشتا نەم خوێندوونەتەوە سەر بە زەمینەیەکی ڕێژەیین یان لەنێو لاپەڕەکەدان، کـــە لەنێو زەمینەی پەرتووکەکەدان و پەرتووکەکـــەش لەنێو زەمینەیەکی ڕەهایە

58 لێرەدا سارتەر چەمکی یۆنانی (کۆنیەیستیسس)ی بەکارهێناوە. ئەم چەمکە وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە: (کۆنیۆس)، واتە هاوبەش و (ئەیستیسس)،واتە هەستکردن. چەمکەکە هەستکردنی تێکڕایی یان هاوبەشی نێوان هەموو هەستەکانی لەش دەردەبڕێت. (وەرگێڕ)

بەناوی جیهانەوە. ئەوان لەنێو زەمینەکەیانەوە، کە جیاوازییەکەی دیار نییە، بانگم دەکەن و لەنێو هەموویەکی ناسکدا خۆیان کۆدەکەنەوە؛ خۆیان دەخەنە بەرچاوم. لەنێو ئەم هەموو ڕووداوانەدا لەشـــم بەشـــاراوەیی دەمێنێتەوە و جوڵانی چاوەکانم دەبێت بەسەرنجی بینەر. ئەوەی بۆ من هەیە و خۆی دەردەخات وشە ڕیزکراوەکانە. ڕیزکردنـــی وشـــەکانیش لەنێو کاتێکی دەرەکییدا پەیوەندی بـــە کاتبوونی منەوە هەیە. جوڵانی ڕســـتە وەســـتاوەکانیان لەنێو جوڵانی ئاگامەندی مندایە. جوڵانی ئاگامەندیشم، کە میتافۆرێکە بۆ پێشکەوتن، جوڵانی چاومە. دژوارە جوڵانی چاوم لە پێشـــکەوتنی حاڵەتی ئاگامەندیم جیابکەمەوە. بەڵام لە هەموو ســـاتێکدا، کە دەخوێنمەوە چاوەکانم دەیەشێن. گریمان بابەتەکانی نێو جیهان ئاماژە بۆ ئازارەکە دەکەن؛ بۆنموونە، پەرتووکەکەی دەیخوێنمەوە. دژواریشـــە وشەکان لەو زەمینەوە جیابکەینەوە، کە لەسەری پێکدێن. دەشێ لەبەر چاوم بلەرزن یان بیر لە واتاکانیان بکەمەوە، دووجار ڕستەیەک بخوێنمەوە یان بە سێ جاریش لە واتاکەی تێنەگەم. دەشـــێ ئەمانە لەگەڵ قوڵبوونەوەم لە خوێندنەوەکـــەدا کەمببنەوە و منیش چاو ئێشەکەم لەبیربچێتەوە. بەڵام ئەمە مەبەستی ئێمە نییە. بەڵکو بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕێیین ئاگامەندی ئازارەکەی تێدابێت. لەسەرەتاشەوە لەوانەیە کەسێک بپرسێت چۆن ئەو ئازارە دەبێت بە ئازاری چاو؟

ئایـــا ئاماژەکردن بـــۆ بابەتێکی بەرز ناکەین یان بۆ لـــەش ناکەین، کە لە نێو جیهانـــدا هەیە؟ بێگومان ئازار زانیاری لەبارەی خۆیەوە دەگەیەنێت. مەحاڵیشـــە ئـــازاری چاو، پەنجە یان ســـک تێکەڵ بکەین و جیاوازیەکانیـــان نەزانین. لەگەڵ ئەمەشدا ئازار مەبەستدار نییە. هیچ هێمایەکی شاراوە یان زانینێک لە چاوئێشەدا نییـــە. مادام ئاگامەندی هەیە ئەوا ئازارەکە خودی چاوە و لە ئازارەکانی دیکە بە بوونیدا جیادەکرێتەوە. چاوئێشەش پێویستی بە هەموو ئەو کارانە هەیە لەپێشتر باسمانکردن. بەڵام ئێستا پێویســـت ناکات باسیان بکەین. ئازار بیرکردنەوەیەکی تێڕامانانە نییە و ئاماژە بۆ لەش، وەکو بوونێک بۆ کەسانی دیکە ناکات. چاوەکان توشـــی ئازار بـــوون و ئێمەش بۆ ڕوونکردنـــەوەی ناوی چاوئێشـــەمان بۆداناوە. چاوئێشـــە بەبێ دەربڕین لە ئازارەکانـــی دیکە جیادەکرێتەوە و ئەمەش پەیوەندی بە بوونیەوە هەیە. ئەم ئازارە لە هیچ شوێنیکی جیهاندا لەگەڵ هەبووەکاندا نییە. نەکەوتۆتـــە لای چەپ و ڕاســـتی پەڕتووکەکەوە، لەناوەڕاســـتەکەیدا نییە، کە لە ئاکامـــی خوێندنەوەکەم دەردەکەون و لەنێو لەشـــمدا، وەکو بابەت (ئەو بابەتەی کەســـانی دیکە دەیبینن و دەســـتی لێدەدەن) نییە. لەنێو ئەو لەشەشـــدا نییە، کە بنکەی بۆچوونە. ناتوانین بڵێین ئازارەکە[لەدەرەوە]خۆی ســـەپاندوە. ئەمانە وێنەی ئەندێشـــاوین و لە واتا بەدەرن. کەوابوو، ئازار لەنێو شوێندا نییە. هەروەها ناکەوێتـــە نێو کاتی دەرەکیشـــەوە؛ بەڵکو خۆی دەکات بە شـــتێکی کاتی و لەم

خۆبەکاتیکردنەوە کاتی جیهانیش دەردەخات. ئایا ئازار چییە؟ بەئاسانی دەڵێین، بابەتێکی ڕوونی ئاگامەندییە و بوونیشی لەوێدا خۆ نوسانێتی بە جیهانەوە، کە لە خوێندنەوەکەمدا بەرجەستە دەبێت. ئازار لەودیو هەموو مەبەست و زانینێکەوەیە، چونکە خۆی دەهاوێتە نێو هەموو کارێکی مەبەســتدار و زانینێکەوە. کارێکە، کە نابێت بە بناخە بۆ بوونی خۆی.

هێشتا لەسەر زەمینەی بوونی ڕەوانەوە ئازار، وەکو خۆبەستنەوەیەکی هەڵکەوتوو بەجیهانەوە دەتوانێت بێ بیرکردنەوە لەنێو ئاگامەندییدا هەبێت و تێپەڕیش بکرێت. ئاگایـــی لە ئازار ڕەتدانەوەیەکی ناوەکییە بەرانبەر جیهان. لەهەمانکاتدا لەنێو ئازار یـــان لەنێو خۆیدایە. ئازاری ڕەوان نییە، ســـەر بەو کاتیگۆرییانەیە پێناس ناکرێن و باســـیان ناکرێت. بەڵام ئاگایی لە ئازار پرۆژەیە بەرەو ئاگایی دیکە، کە لە ئازار بەدەرە. ئەم ڕاکردنەی ئاگامەندی بابەتێکی دەروونی نییە و پرۆژەیەکە ئاگامەندی بێ بیرکردنەوە دەیگرێتەبەر. ئەمەش، وەکو دەرکەوتنی پەرتووکەکەیە، کە ئێستا بە پەلە دەخوێنرێتەوە و وشەکانی لەتەنیشت یەکدی ڕادەوەستن یان هەموو جیهان بە دوودڵی کونکراوە. ئەمە خەسڵەتێکی تایبەتمەندی هەبوویەکی لەشدارە، کە دەمانەوێت لێیڕابکەین. ئەمە ئەو ئاگامەندییە پێکدەهێنێت و ئاگامەندیش تێپەڕیدەکات.

گریمـــان، کەســـێک دەڵێت، تۆ کاتێـــک گرانییەکە بە تـــەرازوو دەپێویت، کە ئازارەکە لەنێو یەکێک لە ئەندامەکانی لەشـــدا کاری خۆی دەکات. ئازاری چاو لە کاتـــی بینیندا دەدۆزیتەوە. کەچی من لە کاتی خوێندنەوەکەدا هەســـت بە ئازاری پەنجە بڕاوەکەشم دەکەم. ئەم ئازارە ناکەوێتە سەر خوێندنەوەکە. گرنگ نییە من چەند بەناو خوێندنەوەکەدا قووڵببمەوە، جیهان هەرگیز ون نابێت. خوێندنەوەکەم ئاماژە بۆ جیهان دەکات و بە زەمینەیەکی پێویســـتی دادەنێت. ئەم دڵنیابوونەش کەم ئاگاییم لە جیهان ناســـەلمێنێت، بەڵکو جیهان بە زەمینە دادەنێت. ڕەنگەکان لەبەر چاون، نارۆن، جوڵانی شـــتەکانی دەوروبەرم و دەنگەکان دەمێننەوە. بەڵام بە جیاوازییەکانیانەوە دەکەونە بەســـتێنی پشت خوێندنەوەکەم. لەشم نابێت بەو بۆچوونە گشـــتگرەی جیهان ئامـــاژەی بۆ دەکات. لەهەمانکاتدا گشـــتگرییەکەی خـــۆی نادۆڕێنێت چونکە هەموو پێکهاتەکانی ئاگامەندیم لەودا کۆدەبنەوە. لەگەڵ خوێندنەوەکـــەدا بەو ڕادەیەی من هەم ڕوانینەکان تێپەڕدەکەم یان چاوەکانم دەبن بە شێوە و دەکەونە پشت بەستێنی هەموو لەشەوە. لەسەر ئەم زەمینە چاوەکانم ئەو ئەندامی بینینانە نین کەســـانی دیکە دەیان بینن. بینینم بەشێکە لە بونیادی هەمـــووی ئاگامەندیم لە جیهـــان. ئاگامەندی ئاگاییە لە جیهـــان؛ جیهان و لەش بەردەوام بە شێوازی جیاواز خۆیان ئامادەی ئاگامەندیم دەکەن. ئاگاییم لە هەمووی جیهانیش زەمینەیە بۆ خۆدەرخســـتنی شـــتێکی هەندەکی و تـــاک، وەکو (ئەو). کاتێک دەخوێنمەوە، من ئەو لەشـــەم لەسەر کورسییەکە دانیشتوم و سێ یارد لە

پەنجەرەکەوە دوورم، ژوورەکەش پلەی گەرمای خۆی هەیە. من نابم بە شــتێکی دیکە. تاکو هەموو لەشـــم لەناونەچێت ئازاری پەنجە براوەکەم لەناوناچێت. بەڵام بەو شــێوەیەی هەم ئازارەکە لەنێو زەمینەی بەســتێنی هەموو لەشــمەوە خۆی دەشارێتەوە. ئازارەکە ناڕوات، منیش لێی بێ ئاگانیم و لە منەوە دوور نیی. ئەگەر بمەوێــت لاپەڕەی پەرتووکەکە بە پەنجە بگۆڕم ئازاری پەنجەم بەبێ ئەوەی پێیی بزانم جارێکی دیکە دەبێت بە هەڵکەوت و لەسەر زەمینەی هەڵکەوتەکانی دیکەی لەشم خۆی دەردەخاتەوە. بێجگەلەمە، ئەم بۆچوونە لەگەڵ ڕوانینی ئەزمونگەرییدا کۆکــە، کــە گوایە خوێندنەوەکە زۆرتر بە ئازاری پەنجە یان پشــت ئێشــە تێک دەچێت، نەک ئازاری چاو. ئازاری چاو ڕاســتەوخۆ پەیوەندییان بە خوێندنەوەوە هەیە. وشــەکان لە هەموو حاڵەتێکدا بەرەو ئازارەکەم دەبەن. ئازاری پەنجە یان پشت ئێشە ناسینەوەی جیهانە، وەکو زەمینە و ئاماژەکردنە بۆ بەشێکی تایبەتی بونیادەکەی لەش و لەوێشەوە بۆ جیهان.

گریمــان مــن خوێندنەوەکەم دەبڕم و بیر لە ئازارەکــە دەکەمەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێــت من تێڕامانی ئاگامەندیم بۆ ئامادەبوونێکی ئاگامەندانەم دەگوێزمەوە. شێوازێکی تێڕامانی ئاگامەندیم لەسەر ئازارەکە ناسییەوە و بەرەو ڕووی بابەتێکی دیکەم دانــا. دەبێت بۆچوونەکەی پێشــومان لەســەر تێڕامــان بیربکەوێتەوە: تێگەیشتنێکی گشتگرانەیە بەبێ بۆچوون؛ زانینێکە دەیەوێت خۆی تێرکات و ببێت بە بابەتی و شتەزانراوەکەش لە دوورەوە دانێت و بیری لێبکاتەوە. یەکەم جوڵانی تێرامان، کەوابوو، تێپەڕکردنی خەســڵەتی ڕەوانی  ئاگامەندییە لە نێو ئازارەکەدا و ڕووکردنە لــە ئازارەکە تاکو بیکات بە بابەتی بیرکردنەوە. ئەگەر تێڕامان تەنیا هاریکارکەربێت ئەوا ئازارەکە دەبێت بە بابەتێکی دەروونی.

بابەتێکی دەروونی ناســراو لە ڕێگەی ئازارەوە نەخۆشــییە. ئەم بابەتە هەموو خەسڵەتەکانی ئازاری تێدایە، بەڵام بابەتێکی بەرز و ناچالاکە. ڕاستەقینەیەکە سەر بــە کاتی جیهان و ئاگامەندی نییە و خاوەنــی کاتی دەروونی خۆیەتی. کەوابوو، دەکرێت بە پێوەر و سنوور بۆ زۆرشتیش دادەنرێت. هەرچەندە لەنێو ئاگامەندییدا خۆی دەردەخات لەوێشەوە جیاوازە. لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ئاگامەندیدا بەردەوام دەمێنێتــەوە. مانەوەکــەی دەبێت بە تەڵخی و تەمەڵی نەخۆشــییەکە. لەلایەکی دیکەوە؛ نەخۆشــییەکە خاوەنــی یەکێتی و ناوەوە و کتوپڕییــە، کە ئاگامەندی هەیەتــی، بــەڵام پلــەی خاوەنییەتییەکەی دەگۆڕێــت و کەمترە. لەســەرەتاوە نەخۆشییەکە یەکێتییەکی تەواوە، دابەشنابێت و بەردەوامی خۆی هەیە چونکە لە دەرەوەی ئاگامەندییە و خاوەنی ڕابردوو و داهاتوشە. بەردەوامییەکە پرۆژەی کاتە بنەڕەتییەکەیە و بە شــێوازی جیاواز ڕاڤەی بۆ دەکرێت و دەڵێین، نەخۆشــییەکە "دەچێتەنێوە" ،"توشدەبێت" و هتد. ئەمانە باسی خەسڵەتەکانی نەخۆشییەکە لە

بەردەوامییەکەیدا دەکەن. خەسڵەتێکن لە ئاهەنگی دڵنەوازی دەچن. ئەو ئازارە کورتەی کتوپڕ سەرهەڵدەدات و نامێنێت تێڕامان بە گۆڕانی ئاگامەندییەکی ئازاراوی و ئۆقرەگری دانانێت. ئەم ئازارە کورتانە، وەکو بێدەنگی لە ئاهەنگی دڵنەوازییدا بەشێکن لە نەخۆشییەکە. پێکەوە بوونیان ئاهەنگ و ڕەفتاری نەخۆشییەکەیە. وەکو کتوپڕییەکەی ناچالاک و جادوگەرانەیە؛ خۆی تەمەن درێژ دەکات و دەبێت بە خاوەنی کاتی خۆی. لەشێوازی جۆراوجۆردا دەردەکەوێت و خۆشی دەشارێتەوە. لەم ڕەفتارەدا لە بابەتەکانی نێو کات و شوێن ناچێت. ئەو کاتەی مێژەکە نابینم لەبەرئەوەیە، کە ڕووم لە شوێنێکی دیکەکردوە. بەڵام هۆکاری هەستنەکردن بە نەخۆشییەکە لاچوونی نەخۆشییەکەیە. لەڕاستیدا، لێرەدا جۆرە دیاردەیەک سەرهەڵدەدات و لەو فۆرمە دەچێت، کە دەروونناسەکان ناویدەنێن (وەهمی سترۆبۆسکۆپی). لاچوونی نەخۆشییەکە پاشگەز بوونەوەیە. نەخۆشییەکە جۆرە زیندەوەرێکە فۆرم، بەردەوامی و ڕەفتاری هەیە. نەخۆشەکەش جۆرێک نزیکبوونەوەی لەگەڵدا پەیدادەکات. وەکو دیاردەیەکی نوێ سەرهەڵدەدات. ئەو کاتەی نەخۆشەکە توشی دەبێت دەڵێت، ئەمە قەیرانی پاش نیوەڕۆمە. تێڕامان بەشداری ئەم قەیرانە ناکات، بەڵام بە درێژایی ڕۆژەکە ئەزمونەکان پێکەوە گرێدەدات. ئەم تێهەڵکێشکردنی ناسینەوانە خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە؛ نایەوێت بابەتێک پێکبهێنێت، کە بە ئامادەنەبوونی ئاگامەندیش بەردەوام بمێنێتەوە (بەو شێوەیەی ڕق و کینە لەودیو ئاگامەندییەوە خۆی حەشاردەدات). ئەو کاتەی نەخۆشییەکە دەڕوات بۆ هەمیشە لەناودەچێت. هیچ بەشێکی لە پاش خۆی جێناهێڵێت. ئەگەر جارێکی دیکە سەرهەڵبدات جوڵانەکەی ناچالاکانە و کتوپڕ دەردەکەوێت. هەست بە نیشانەکانی سەرهەڵدانەکەی دەکەین؛[دەڵێین] جارێکی دیکە توشی دەبم یان توشی بووم و دەزانم ئەو نەخۆشییەم گرتۆتەوە. ئازارەکان لەسەرەتای هەڵدانی نەخۆشییەکەوە ئەو شێوازە ناسراوانە نین ئاگامەندی بە وردی سەرنجیان بدات، بەڵکو بانگەوازن بۆ سەرهەڵدانی لەسەرخۆی نەخۆشییەکە. لەلایەکی دیکەوە، گرنگە ئەوە بزانین، کە من نەخۆشییەکە بە ئازارەکەوە دەبەستمەوە. ئەمەش نەخۆشییەکە ناکات بە هۆکاری ئازارەکان بەڵکو هەر یەکێک لەو ئازارانە بە نۆتێکی نێو ئاهەنگەکە دادەنێم. کتوپڕ دەبن بە هەموو ئاهەنگەکە و بەشێکی ئەویش. لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر یەکێک لە ئەوان، من هەست بە هەموو نەخۆشییەکە دەکەم و لەهەمانکاتدا هەر ئازارەش لەودیو نەخۆشییەکەوەیە چونکە نەخۆشییەکە تێهەڵکێشراوی هەموو ئازارەکانە و لە ڕێگەی ئەوانیشەوە خۆی پێشدەخات. هێشتا نەخۆشی لە ئاهەنگ ناچێت. نەخۆشی ئەزمونێکە زیاناوی؛ دووری لەنێوان ئازار و ئاگامەندییەدا نییە، کە بیر لە ئازارەکە دەکاتەوە. نەخۆشی شتێکی بەرزە، بەڵام دوور نییە. وەکو تێهەڵکێشەیەکی گشتی لە دەرەوەی ئاگامەندیدایە و لە شوێنێکی

دیکەشدا لە بوونەوە نزیکە. هەروەها لەنێو ئاگامەندیشمدایە و بە هەموو دانەکانی گازی لێدەگرێت و خۆی دەخزێنێتە ناوی و هەموو نۆتەکانی بۆ دادەنێت. نۆتەکان و دانەکانی ئاگامەندی منن. ئایا لەم ئاستەوە چی بەسەر لەشدا دێت؟ ئێمە باسمانکرد، کە جۆرە دابڕانێک لەگەڵ یەکەم ساتی پرۆژەی تێڕامانەوە دێتە پێش. بۆ ئاگامەندی لـــە تێڕامان بەدەر ئازاری لەش بوو؛ بۆ ئاگامەندی تێڕامانیش نەخۆشـــی و لەش دوو شـــتی جیاوازن. نەخۆشـــی فۆرمی خۆی هەیە و پەیدادەبێت و لەناودەچێت. لە تێڕاماندا ئێمە ڕوو لە بابەتەکە دەکەین، بۆنموونە پێش ئامادەبوونی کەســـانی دیکە لەش، وەکو بابەتێکی بیرکردنەوە لەبەردەم ئاگامەندیدا ڕاناوەستێت. تێڕامانی ئاگامەندی ڕوو لە نەخۆشییەکەدەکات. مادام نەخۆشی فۆرمی تایبەتی خۆی هەیە، وەکـــو ئاهەنگەکە بوونێکی تاک و بەرزی هەیە، ئەوا بۆ بوون-بۆ-خۆ دەگەڕێتەوە. لە ڕێگەی ئازارەکانیشـــەوە خۆی دەردەخات و دەبێت بە بناخەی یەکێتی هەموو ئازارەکان. بەو ڕادەیەی من کەرەســـە بە نەخۆشییەکە دەدەم نەخۆشییەکە سەر بە بوونی منە. من مانەوە و گەشەکردنی لەسەر جۆرێک ژینگەی سست و ناچالاک دەخەمەگەر و فاکتۆری ئازارەکانی بە پرۆژە دادەنێم. ئەمەش سســـتی و ناچالاکی بوونی منە. نەخۆشـــییەکە لەسەر ئەم سیســـتی و ناچالاکییەم دەخوات و خۆی تێردەکات. جادوگەرانە هەموو هێز و تەوانای خۆی لەوێوە دێنێت و لە (ئەنتیۆس) دەچێت، کە بە خاک خۆی دەژیاند.[59] لەشی من خۆی لە شێوازێکی دیکەی بووندا دەدۆزێتەوە و ئەمەش بە (لەشێکی دەروونی) دادەنێم. بەڵام بەتەواوی نازانین چییە چونکە ئەو تێڕامانەی دەیەوێت ئاگایی لە ئازار بێت نەبووە بە ســـەرچاوەی زانین. ئەو نەخۆشـــییەکە، وەکو بابەت دەناسێت و ئەو بابەتەش کارتێکەرە. لەسەرەتاوە کەســـەکەی ئازاری هەیە ڕقی لـــە ئازار دەبێتەوە. هەندێکجـــار ناتوانێت بەرگەی بگرێـــت یان حەزلێبکات و بەهای بۆ دابنێت. لەبەر ئەمە، نەخۆشـــی نەزانراوە و ئێمە تەنیا توشـــی دەبین. لەشـــیش لە نەخۆشییەکەدا بوونی بەرجەستەدەکات و بە هۆکاری ئاگامەندیشـــەوە ناخۆشی دەچێژێت. بۆ ئەوەی بونیادی زانین بۆ لەش پێکبهێنین بەو شێوەیەی تێڕامان هەیەتی، دەبێت لەش لەبەردەم کەسانی دیکەدا ڕاوەستێنین. ئێمە لێرەدا ئەم خاڵە ڕووناکەینەوە، چونکە دەبێت بونیادی بوونی لەش-بۆ-ئەوان باس بکەین.

---

59 ئەنتیۆس پاڵەوانێکی نێو ئەفسانەی یۆنانە. باوکی ناوی پۆسیدۆن و دایکیشی زەمین بووە. کەسێکی ئازا و زۆرانباز بووە. لەگەڵ هەرچ کەسێکدا زۆرانبازی کردبێت کوشتویەتی و سەرەکەی بۆ دروستکردنی پەرستگایەک بۆ باوکی هەڵگرتوە. لەبەرئەوەی دایکی زەمین بووە ئەم پاڵەوانە چەند لە خاکەوە نزیک بووبێت و لەسەر خاک بووبێت بەهێزتر بووە. بەهەڵگرتن و بەرزکردنەوەشی یان دابڕانی لە زەمینەوە لاوازبووە.(وەرگێڕ)

ئێستا، دەبینین ئەم لەشە دەروونییە، کە پرۆژەیەکی ئاگامەندییە لەسەر بوون-لەنێو-خۆ، سەرچاوەی هەموو دیاردە دەروونییەکانە و کینە و خۆشەویستی یان کردەوەکان کاریتێدەکەن. بەو ڕادەیەی لەشێکە بە ئاگا ئەوا دەبێت بە گرتنی بوون-لەنێو-خۆ لەلایەن ئاگامەندییەوە؛ بەو ڕادەیەی بە دەست نەخۆشییەوە یان ڕق و کینە و تێڕامانەوە دەناڵێنێت ئەوا پرۆژەیەکە لەسەر بوون لەنێو خۆ. لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانێت ببێت بە نوێنەری هەر یەکێک لە دیاردە دەروونییەکان و ئەو هێزە جادوگەرەی پێکەوە دەیانبەستێتەوە. کەوابوو، پانتاییەکی ناوەوەیە، کە تیایدا لایەنی دەروونی بەردەوام دەمێنێتەوە. پانتاییەکەش لایەنی بەرز و نزم یان ڕاست و چەپی نییە؛ دابەش ناکرێت. ئەمەش خەسڵەتی ڕاستەقینەی لایەنی دەروونییە. مەبەستمان لەم خاڵەش ئەوە نییە، کە دەروون بە لەشەوە نوساوە، بەڵکو لەش جەوهەری ڕیکخراوە دەروونییەکەیە و مەرجیشە بۆ بەردەوامبوونی. ئەمەیە دەبێت بە بنەمای هەموو میتافۆرە میکانیکی و کیمیاوییەکان و ڕوونکردنەوەی ڕووداوە دەروونییەکان. دەمانەوێت لەمە تێبگەین، لەنێو ئەندێشەماندا وێنەکەی پێکبهێنین و لە ڕێگەیەوە ئەو هەستانە بهێنینەکایەوە، کە پەیدانەبوون. دواجاریش، ئەمەیە هانماندەدات و بەڕادەیەکیش بیردۆزە سایکۆلۆجییەکان، وەکو ئەودیو ئاگامەندی و بیرەوەری دەسەلمێنێت. ئێمە ئازارمان بە نموونە هێنایەوە ئەگینا نموونەی دیکەش هەن دەتوانین باسیان بکەین. پێویستە ئەوەش بزانین کاتێک ئازارمان نییە یان ڕازیبوون و ڕازینەبوونێکی دیاریکراو نادۆزینەوە بوون-بۆ-خۆ لە پرۆژەکردنی خۆی لەودیو هەڵکەوتە ڕەوانەکانەوە ناوەستێت و واز لە لەشیش ناهێنێت. چالاکییەکانی (کۆینس تێتیک)، کەوابوو، ڕەوانە و ڕوو لەدەر نیە و بێ ڕەنگە و ناسینەوەیەکی ڕووتی دەروونە. ئەم چێژوەرگرتنە بێ تامەی بوون-بۆ-خۆیە لە نوسراوێکی دیکەدا بە هێلنجدان ناوزەدمانکرد.[٦٠]

هێڵنجدان لەشم لەبەردەم ئاگامەدیمدا بەرجەستەدەکات. هەندێکجار بۆ دەربازبوون لە هێڵنجدان پەنا بۆ خۆشی یان ناخۆشی دەبەین. بەڵام ئەو کاتەی ئازار یان خۆشییەک سەرهەڵدەدات خۆی، وەکو فاکتۆر دەردەخات و لەسەر زەمینەی هێڵنجدانەکەوە پەیدادەبێت.

ئێمە هێڵنجدان بە میتافۆر دانانێین. بەپێچەوانەوە، لەسەر بناخەی ئەم هێڵنجدانەیە هەموو هێڵنجدانێکی کۆنکرێتی و ئەزمونی (وەکو هێڵنجدان لە ڕێگەی خواردنی گۆشتی خراپ، خوێن و پیسایی و...هتد) دروستدەبن و ئێمە توشی ڕشانەوە دەکەن.

---

٦٠ سارتەر ئاماژە بۆ ڕۆمانەکەی بەناوی (نۆسیا)یان هێڵنجدان دەکات. ئەم ڕۆمانە لە ساڵی (١٩٣٨) بڵاوکرایەوە، بە یەکێک لە ڕۆمانە فەلسەفییەکان دادەنرێت، سارتەر تیایدا باسی گۆڕانی بێهودەیی ژیان لە ڕیگەی پرۆژەی نوسینەوە دەکات. ڕۆکانتان، پاڵەوانی ڕۆمانەکە بە پرۆژەدانان واتا بە ژیان دەبەخشیت.(وەرگێڕ)

## ٢ — لەش-بۆ-کەسانی دی

ئێمە باسی بوونی لەشـــمان بۆ خۆمانکرد. لەسەر ئەم زەمینە ئۆنتۆلۆجییەوە لـــەش تەنیا ئەمەیە و بەدوای ئەندامی لەش و خانەکانیدا ناگەڕێین. ئەو بنکەیەیە هەمـــوو ئامێرە-بابەتەکانی جیهان ئاماژەی بۆ دەکەن یان ئەو بوونە هەڵکەوتوەیە بوون- بۆ-خۆ لەسەری ڕادەوەستێت. ئەم دوو شێوازەی بوون تەواوکەری یەکدیین. بەڵام لەش دەزانێت، وەکو بوون-بۆ-خۆ ڕەهەندی دیکەی هەیە؛ زەمینەی دیکەشی لەســـەری ڕادەوەستێت. ئەویش بوونێتی بۆ کەســـانی دی. پێویستە ئەم لایەنەی لـــەش لەم بۆچوونـــە ئۆنتۆلۆجییەوە ڕوونبکەینەوە و بزانین چۆن لەشـــی من بۆ کەســـانی دیکە و لەشی کەسانی دیکەش بۆ من دەردەکەوێت. لەپێشتر ئەوەشمان سەلماند، کە بونیادی بوونم-بۆ-کەسانی دیکە لە بونیادی بوونی-کەسانی-دیکە بۆ من دەچێت. بۆ کارئاســـانی، لە ڕوانگەی بوونی کەسانی دیکەوە بۆ من دەڕوانینە سروشتی لەشی-کەسانی دیکە. لە بەشی پێشوی ئەم نوسراوەشدا ڕوونمانکردەوە، کە لەش ئەوە نییە لەپێشـــدا بوونی کەسێکی دیکە بۆ من دەردەخات. لەڕاستیدا، پەیوەندی بنەڕەتی نێوان من و کەسانی دیکە پەیوەندییەکی دەرەکی نێوان لەشمانە. بـــەڵام ئەگەر ڕەتدانەوەی ناوەکی لەگەڵـــدا نەبێت لە پەیوەندییەکە تێناگەین. من دەبێت بەوجۆرە هەســـت بە کەســـێکی دیکە بکەم، کە من بۆ ئەو دەبم بە بابەت. کەوابوو، دەرکەوتنی کەســـەکە لەسەرەتاوە بەرەنگاریکردن نییە، بەڵکو بەشێکی زنجیرەی پەیوەندییەکانمە لەگەڵیدا. بەتایبەتی لەوێدا، کە گوتمان کەسەکەش بۆ من دەبێت بە بابەت یان ئەگەر حەز بکەین دەڵێم، کەسەکە لەپێشدا سەرهەڵدەدات و ئینجا لەدواییدا لەشی دەناسم. لەشی کەسانی دیکە بونیادی دووەمە. لە دیاردەی بە بابەتکردنی کەســـێکی دیکەدا، کەسەکە، وەکو بابەتێکی بەرزی-بەرزێتی خۆی دەردەخات. منیش بە دانانی پرۆژەکانی بەرزێتییەکەی ئەو تێپەڕدەکەم و خۆم بە ئەگەرەکان دەگەیەنـــم. بەرزێتییەکەی لەنێو کایەکردنەکەدا دەردەهێنم؛ ئەو وەکو بابەت بەرزێتییە و لەنێو جیهاندا دەیناسم. لە بنەڕەتەوە، وەکو ڕیزکردنی ئامێرەکان لەنێو جیهانی مندا دەرەکەوێت و دەبێت بە بنکەی دووەمی ئاماژکردنەکان. دەزانم، کـــە ئەو بنکەیە من نییە. ئەم نیشـــانانە، کە من دەرناخـــەن، نابن بە پێکهاتەی شـــتەکان و خەســـڵەتی لابەلان. کەســـێکی دیکە، بەوجۆرەی بینیمان، نابێت بە چەمکی پێکهێنانی جیهان. نیشـــانەکان هەڵکەوت و خەســـڵەت و ڕووداوی خۆیان هەیـــە. بنکەی ئاماژەکردنەکەشـــیان بوونی بەرزی کەســـەکەی دیکەیە، کە بیری لێدەکرێتەوە یان تێپەڕدەکرێت. ڕیزکردنی دووەمی بابەتەکان کەســـەکەی دیکە بۆ مـــن، وەکو ڕێکخەری ڕیزکردنەکە دەردەخات. کەســـەکە بەو ئامێرە دادەنێت، کە

خۆشی ئامێر دروستدەکات. بەڵام من دەتوانم تێپەڕیبکەم و لەنێو هەموو شتەکانی جیهاندا بۆ مەبەستی خۆم بەکاری بهێنم. کەوابوو، لەپێشدا، کەسێکی دیکە لەناو شـــتەکاندا وەکو ئامێر دەبینرێت. شتەکاندا منیش، وەکو ئامێر دەردەکەوم و ئەو لەشـــەم ئاماژەی بۆ دەکرێت. کەوابوو، لەشـــی کەسانی دیکەیە لابەلا ئاماژەی بۆ دەکرێت و لەنێو شتەکاندا دەردەکەوێت.

لەڕاســـتیدا بۆچوونم لەســـەر لەش ڕاناوەســـتێت چونکە بەکارهێنانی لەشم لە بەکارهێنانی ئامێرەکانی دیکە ناچێت. من هەوڵمدا لە ڕێگەی بیرکردنەوەوە لەشـــم لەنێو جیهاندا بە ئامێرێکی ڕەوان دابنێم. ئاکامی ئەم کارەش ڕووخانی جیهان بوو. لەلایەکی دیکەوە، لەبەر ئەوەی من کەســـانی دیکە نیم، لەشـــی کەسانی دیکە بۆ من دەبن بەو بنکەیەی بۆچوونی خۆمی لەســـەر دامەزرێنم و ئەو ئامێرەی لەگەڵ ئامێرەکانی دیکەدا بەکاری بهێنم. هەموو ئامێرەکان ئاماژە بۆ لەشی کەسێکی دیکە دەکەن. ئەویش ئاماژە بۆ بابەت گەلێکی دیکە دەکات. کەوابوو، لەنێو جیهانی مندا خۆی ڕاگرتوە و ئاماژە بۆ لەشی منیش دەکات. لەشی کەسێکی دیکە ڕادیکالانەش لە لەشـــی منەوە جیاوازە. ئەو ئامێرەیە، کە نابێت بە من و هەمانکات بەکاریشی دەهێنم. لەشی کەسێکی دیکە کەسەکەیە و ئامیرێکی بەرزێتییە.

ئەم ئاکامانە بۆ ئەندامی هەســـتکردنی کەســـەکەش، وەکو تێهەڵکێشـــەیەکی دامەزرێنراو، دروســـتە. ئێمە ئەگەری ناســـینیمان لای ئەو لە ڕێگەی لەشـــییەوە نادۆزینەوە. ناســـینەکە لەسەر بە بابەتبوونی من بۆ کەسەکە دێتەکایەوە. ئەمەش پەیوەندییەکی بنەڕەتی منە لەگەڵ کەســـەکەدا. لەم پەیوەندییەدا جیهانی منیش بەرەو لای ئەو دەڕوات. بە ناســـینەوەی خۆشـــم جارێکی دیکە بەرزێتییەکەی ئەو تێپەڕدەکەم و ڕوو لە ئامانجەکانم دەکەم. ئەمەش لەسەر ئەو ڕاستییە دامەزراوە، کە من "لەوێدام" و ئەو زانینەی کەسەکە لەبارەی من و جیهانەوە هەیەتی دەبێت بە زانین، وەکو بابەت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، زانینەکە دەبێت بە خەسلەتێکی کەســـەکەی دیکە. خەســـڵەتێک منیش دەتوانم [لە ڕێگەی ئەوەوە] بیناسم. ئەم زانینەش بە بەتاڵی دەمێنێتەوە چونکە من پرۆســـەی زانینەکەی ئەو نادۆزمەوە و پرۆســـەیەکی بەرزێتی ڕەوانە و دەبێت لەناوەوە بیناسیت و لەنێویدا بیت. ئەوەی مـــن دەیزانم ئەو زانینەیە لەوێدا یان بوونی زانینێکە لەوێدا. ئەم ڕێژەگەرایەتییەی ئەندامی هەســـتکردن، کە خۆی بۆ من دەســـەلمێنێت و ناتوانم بیری لێبکەمەوە، یەکەمجـــار ئەو کاتە هەســـتی پێدەکەم، کە کەســـەکە بۆ من دەبێـــت بەبابەت. هەســـتکردنەکە لە مەترســـی بەدەرە چونکە کەسەکە بەشـــێکە لە جیهانی من و ڕێژەگەرایەتییەکەی نابێتە هۆکاری ڕووخاندنی جیهانم. هەســـتکردنی کەســـەکەی دیکە وەکو زانین ناسراوە.

لێـــرەدا هەڵـــەی زانایانی ســـایکۆلۆجیمان بـــۆ ڕووندەبێتەوە، کە پێناســـی

هەستکردنەکانی من بە هەستکردنی کەسانی دیکەوە دەبەستنەوە و ڕێژەگەریش بۆ هەستکردن لەسەر بوونی بۆ کەسانی دیکە دادەمەزرێنن. دەبینین چۆن ئەم هەڵەیە دەبێت بە ڕاســـت لە کاتێکدا لەسەر نهۆمێکی دروســـت دایدەنێین و ڕاستەقینەی بوون و زانین دەستنیشـــان دەکەیـــن. بابەتەکانی نێو جیهانی من لابەلا ئاماژە بۆ بنکـــەی ئاماژەکردنی بابەتەکان دەکات، کە بوونی کەســـێکی دیکەیە. بەڵام ئەو بنکەیە بۆ من لە بۆچوونێکی-لە بۆچوون بەدەرەوە، کە بوونی منە یان لەشـــمە. بەکورتییەکەی دەتوانم بڵێم، هەرچەندە دروســـتیش نییە، من کەسەکەی دیکە بە ڕێگەی هەستەکانم دەناسم. بەوجۆرەی کەسێکی دیکە ئامێرە و من بەکاریدەهێنم کۆی ئەندامی هەستکردنەکانیشـــە، کە خۆی بۆ زانینی هەستەکی من بەرجەستە دەکات؛ ئـــەو فاکتۆرێکە لەبەردەم فاکتۆرێکی دیکەدا خۆی دەردەخات. لەســـەر بنەمای بوون و زانین دەتوانین توێژینەوە لەســـەر ئەندامی هەســـتکردنی کەسانی دیکە بەو شێوەیەی هەستەکانی من دەیانناسێت بکەین. توێژینەوەکە بۆ کارکردنی ئەندامانی هاستکردن گرنگە.

بەڵام زانینەکە بۆ من دەبێت بە بابەتێکی ڕەوان. لێرەدا بۆنموونە، کێشەی (بینینی پێچەوانەکراو) ســـەرهەڵدەدات. لەڕاستیدا، ئەندامی هەستکردنی کەسانی دیکە بە هیچ شـــێوەیەک نابێت بە ئامێری هەســـتکردن بۆ ئەوان؛ بەڵکو زانینە بۆ ئەوان؛ بەو ڕادەیەی زانینەکە لە شێوازی بابەتدا لەنێو جیهانی مندا هەیە، کارێکی زانینی ڕەوانە.

بێجگە لەمە، ئێمە لەشی کەسێکی دیکەمان لەسەر ئاماژەکردنێکی لابەلا لەنێو ئامێرەکانی نێو جیهاندا پێناسکرد. لەڕاستیدا ئەم پێناسەیە بوونی کەسانی دیکەمان لەوێدا و لەنێو گۆشت و ئێسک بۆ ناسەلمێنێت. بەدڵنیاییەوە، لەشی کەسانی دیکە لە هەمـــوو ئاماژەکردنێکدا ئامادەیە چونکە ئەوان ئامێـــرەکان بەکاردەهێنن. ئەم ژوورەی من تیایدا دانیشتوم و چاوەڕێی خاوەنی ماڵەکەم لەشی خاوەنی ماڵەکەم بۆ دەردەخات. ئەو کورســـییە شـــوێنی دانیشـــتنەکەیەتی و لە پەنجەرەکەشەوە ڕووناکـــی بۆ ناو ژوورەکە دێـــت و ئەو دەتوانێت کەلوپەلەکانـــی ببینێت. ئەمانە هەموویان ئاماژە بۆ بابەتێک دەکەن، کە کتوپڕ دێت و ناوەڕۆکێکی پڕ بە هەموویان دەبەخشـــێت. بەڵام هێشتا خاوەن ماڵەکە نەهاتووە، ئامادەنەبووە و لە شوێنێکی دیکەیە.

دەبینین ئامادەنەبوون دەبێت بە بونیادی بوون-لەوێ. ئامادەنەبوون ئامادەبوونە-لە شـــوێنێکی دیکە-لەنێو-جیهاندا؛ بە منیـــش دراوە. کاتێک نامەی ئامۆزاکەم لە ئەفریقاوە دەگاتە دەســـتم بوونی ئەو-لە شوێنێکی دیکەدا بە من دەدرێت. نامەکە ئاماژە بۆ ئامادەبوونەکەی دەکات. بوون-لە شـــوێنێکی دیکەدا بوونە لە شـــوێندا؛ ئامادەبوونەکەشـــی بە لەشـــە. هیچ ڕێگەیەکی دیکە نادۆزینەوە تاکو کاریگەرێتی

نامەی ژنێک بەســـەر خۆشەویستەکەیەوە باسبکەین. لەشی دڵدارەکە لە نامەکەدا ئامادەش نییە. مادام بوون-لە شوێنێکدا بوونە-لەوێ و لەنێو ڕێکخراوی ئامێرەکاندایە و حالەتێکـــی کۆنکرێتییە ئەوا فاکتۆر و هەڵکەوتیشـــە. چاوپێکەوتنەکەی دوێنێ لەگەڵ پیرۆدا تەنیا حاڵەتێک نییە هەڵکەوتنی بوونی هەردووکمان پێناســـبکات. ئامادەنەبوونەکەشی دەبێتە سەرچاوەی پێناسەکردنەکە. فاکتۆری ئامادەنەبوونەکە بە شـــاراوەیی لەنێو ئامێرەکاندایە؛ دەرکەوتنی ئەو کتوپڕ هیچ ناخاتە ســـەریان. کەوابوو، لەشی کەسانی دیکە فاکتۆرە، وەکو ئامێر و کۆی ئەندامی هەستکردنەکان لەبەردەم فاکتۆری بوونی مندا خۆی قوتدەکاتەوە. ئەو کاتەی کەسانی دیکە لەنێو جیهاندا پەیدا دەبن بە من دەدرێن. ئامادەبوون و ئامادەنەبوونیان هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت.

بڕوانە، ئێســـتا پیرۆ پەیدادەبێت و دێتەژوورەوە. دەرکەوتنەکەی هیچ گۆڕانێک لە بونیادی پەیوەندییەکەی نێوان دروســـت نـــاکات؛ ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی هەڵکەوتـــن. بابەتەکان ئاماژە بۆ ئەو دەکەن؛ ئەو کاتەی پاڵ بەدەرگاکەوە دەنێت و دەیکاتەوە دەرگاکە ئاماژە بۆ ئەو دەکات، کورسییەکەی لەسەری دادەنیشێت و هەموو شتەکانی دیکە بەمجۆرە ئاماژەی بۆ دەکەن.

کاتێک پیرۆ لە ژوورەکەدا نەبوو ئەم بابەتانە بەهەمان شێوە ئاماژەیان بۆ بوونی ئەو دەکرد. بێگومان، من بۆ ئەو هەم و لەگەڵیدا دەدوێم. بەڵام دوێنێش ئەو کاتەی تەلەگرافەکەی بۆ ناردم و ئێستا لەسەر مێزەکەم دامناوە و باسی هاتنەکەی دەکات، مـــن هەبووم. ئەوەی تازەیە و ڕوودەدات دەرکەوتن و ئامادەبوونێتی لەنێو جیهاندا و من تەماشـــای دەکـــەم. ئەمە چ واتایەکی هەیە؟ پێش هەمووشـــتێک فاکتۆری بوونی کەسێکی دیکە، کە هەڵکەوتنی بوونێتی ئێستا ئاشکرایە و نادیار نییە. ئەم فاکتۆرە بوونی کەســـێکی دیکەیە، وەکو بوون-بۆ-خـــۆ. ژیانێکی بەردەوامی ئەوە لەنێو هەســـتکردنی بە هێڵنجدان و ناسینی فاکتۆری بوونی خۆی. بەکورتییەکەی ئەمە (کۆنیەستیســـیا)ی ئەوە. دەرکەوتنی کەســـێکی دیکە ئاشـــکراکردنی تام و چێژێتی بۆ بوون.

بـــەڵام من هەســـت بە تام و چێژی ئەو ناکەم. هێڵنجـــدان بۆ ئەو زانین نییە؛ هەستکردنێکی پێش بیرکردنەوە و بیردۆزەیە سەبارەت شێوازی بوونی. تێۆەڕبوونی هەڵکەوتنەکەیە بەرەو ئەگەرەکانی بوون-بۆ-خۆ. هەڵکەوتنێکی بوونە، کە سەپێنراوە و ڕەتیش دەدرێتەوە.

ئـــەم هەڵکەوتنەیە من دەیناســـم و دەزانم، کە من ئەو نیـــم. لەگەڵ ڕووکردنم بـــەرەو ئەگەرەکانی بوونـــم تێپەڕیدەکەم. تێپەڕکردنەکەش بەرزێتی کەســـەکەی دیکە دیاریدەکات. بوون-بۆ-خۆی کەســـێکی دیکە بـــەردەوام خۆی لێدادەبڕێت و تێپەڕیـــدەکات. بەڵام، مادام من بەرزێتی کەســـەکە تێپەردەکەم، ئەوا هەڵکەوتنی

بوونی دەچەقێنم و ڕێگەی نادەمێ دژایەتی لەگەڵ فاکتۆری بوونیدا بکات و دەیکەم بە بەشیک لەو. کەوابوو، هیچ دیوارێک لەنێوان هەڵکەوتنی ڕەوانی بوونی کەسێکی دیکە، وەکو تامکردنی بوونی خۆی و ئاگامەندی مندا ڕاناوەستێت. بێگومان، من تامکردنەکە بە هەبوو دادەنێم.

لەبەر ئەوەی من لەدەرەوەی تامکردنەکەدام ئەوەندە دەزانم، کە لەنێو جیهاندا هەیە. لەشی کەسێکی دیکە بۆ من بوون-لەنێو-خۆی ئەوە؛ بوون-لەنێو-خۆیەکە لەگەڵ بوون-لەنێو-خۆیەکانی دیکەدا و منیش بۆ ئەوەی بە ئەگەرەکانم بگەم تێپەڕیدەکەم. لەشی کەسێکی دیکە، کەوابوو، بە دوو خەسڵەتەوە خۆی دەردەخات: لێرەیە و دەتوانێت لە شوێنی دیکەش بێت؛ بە ئامێربوونی لە بەستێنێکی دیکەشدا دادەمەزرێت.

دووری نێوان لەش و کورسییەکە دەشێ بگۆڕێت. لەشەکە بەم شێوەیەیە و دەشێ بەشێوەیەکی دیکەش دەرکەوێت. لە داکەوتدا، ئەم دوو خەسڵەتە یەک شتن. دووەمیان دەبێتە هۆکاری ئامادەبوونی یەکەم. لەشی کەسێکی دیکە فاکتۆرێکی ڕووتی ئامادەبوونی ئەوە لەنێو جیهانی مندا. بوونێکە لەوێدا و ئەو شتەیە. بوونی کەسێکی دیکە، وەکو کەسێک-بۆ-من ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو ئامێرێکە خاوەنی زانینە. ئەم خەسڵەتەش وابەستە بە بوونێکی بابەتییەوە. ئەمەش بە پێویستی بوونی کەسێکی دیکە دادەنێین، کە دەبێت بە هەڵکەوت بۆ من.

لەوساتەوە کەسێکی دیکە پەیدا دەبێت دەبێ بزانین، کە ئەو ئامێرێکە و خاوەنی ئەندامەکانی هەستکردنە. ئەمەش تەنیا لەوێدا خزمەتگوزارە تاکو ببێتە پێویستییەکی ڕووتکراوەی ئەو بۆ لەشی. لەشی ئەو بۆ من لەگەڵ ڕووبەڕوو بوونەوەم لەگەڵیدا دەبێت بە بابەتێک بۆ من. هەموو کەسێک ئەندامەکانی هەستکردنی هەیە، بەڵام پێویست ناکات ئەم ئەندامە هەستکردنانە بن یان دەموچاوێکی ناسراو یان ئەم دەموچاوە بێت. دەموچاو، ئەندامەکانی هەستکردن و ئامادەبوون شێوازی هەڵکەوتوی پێویستی بوونی ئەوە، کە سەر بە ڕەگەز، چینێکی کۆمەڵ یان ژینگەیەکن. تامکردنەکەی بوون بۆ ئەو دەبێت بە لەشی کەسەکە بۆ من. لەش هەڵکەوتنێکی ڕەوانی ئامادەبوونە. بەگشتی، لەنێو کاڵا و جلوبەرگدا پێچراوەتەوە، ماکیاج کراوە، قژی بڕاوە یان ڕیشی کورتکردۆتەوە و هتد. بەڵام پاش ماوەیەک، کەسەکە دەناسم چەند ناروداوخێک دێنە پێش و تیایاندا شاردنەوە و داپۆشینی لەش لەناودەچێت. منیش ئامادەبوونی خۆم لەبەردەم ئامادەبوونی هەڵکەوتووی ڕەوانی ئەودا دەبینم. لەمحاڵەتەدا، من دەتوانم بەشەکانی دیکەی لەش ببینم. ئەم بینینە تەنیا زانین نییە؛ ناسینی هەڵکەوتنێکی ڕەهایە و ناسینەکەش جۆرێکە لە هێڵنجدان.

لەشی کەسانی دیکە، کەوابوو، فاکتۆری بەرزێتییە و ئاماژە بۆ فاکتۆری

بوونـــی من دەکات. بەڵام لەشـــەکە بەجۆرێـــک نابینین، کە تەنیا ڕاوەســـتێت و پەیوەندییەکی دەرەکی لەگەڵ شتەکاندا هەبێت. ئەمجۆرە وەستانە بەسەر لەشێکی مردوودا دەچەســـپێت. لەشی زیندووی کەســـانی دیکە بنکەی ئاماژەکردنەکانە و تێهەڵکێشەی هەموویانە. لەبارودۆخەکان جیانابێتەوە. لەبەرئەم هۆیەشە پێویستە نەپرســـین چۆن لەشی کەسێکی دیکە لەپێشـــدا، وەکو لەش خۆی دەردەخات و دوایی بەبارودۆخەکانەوە گرێدەدریت. لەپێشـــدا لەش و دوایی کردەوە نییە. لەش هەڵکەوتنێکی دەرەکی کردەوەکانی کەسانی دیکەیە. جارێکی دیکە لە بەستێنێکی دیکەوە پێویســـتییەکی ئۆنتۆلۆجی دەدۆزینەوە. ئێمەش لەگەڵ باسەکەمان لەسەر بوونی لەشـــم بۆ من ڕوونمانکـــردەوە. هەڵکەوتنی بوون-بۆ-خـــۆ تەنیا لە ڕێگەی بەرزێتییەوە هەیە. ئەو تێگەیشـــتنەی بـــەردەوام ڕەتدەکرێت و پیایدا دەچینەوە. تێگەیشتنی بوون-بۆ-خۆیە لە بوون-لەنێو-خۆ لەسەر زەمینەی سەرەکی لەناوچوون. بەهەمانشێوە، لەشی کەسێکی دیکە ناخرێتە نێو بارودۆخێکەوە تاکو پێناسبکرێت. لەشەکە ئەوەیە، کە بارودۆخەکە دەهێنێتەکایەوە. هەروەها، لە ڕێگەی بەرزیتییەوە هەیە. هەرچەندە ئەو بەرزێتییە لە ســـەرەتاوە تێپەڕدەکرێت؛ لەهەمانکاتدا بابەتە. لەشـــی پیرۆ، یەکجار، ئەو دەســـتە نییە پەرداخەکـــە هەڵدەگرێت؛ ئەم چەمکە هەوڵدەدا لاشـــەمان بە لەشـــێکی زیندوو بخاتە بەرچاو. لەشی ئەو تێکەڵاوییەکی دەست و پەرداخە. دەستیشی بنەڕەتی هەڵکەوتنی تێکەڵاوییەکەیە.

دوور لە پەیوەندی نێوان لەش و ئەو بابەتانەی توشی گرفتمان دەکەن هەرگیز لەش لە دەرەوەیاندا نادۆزینەوە. کەوابوو، لەشـــی کەســـانی دیکە واتابەخشـــن. واتاکەشـــی بێجگە لە جوڵانی بەرزێتی چی دیکە نییە. لەش ئەو پارچە گۆشتەیە لای مێزەکەوە دەبینرێت، لەســـەر کورسییەکە دانیشـــتوە یان لەسەر شۆستەکە پیاسەدەکات و هتد. لەش کۆی واتاکانی پەیوەندییەکانە لەگەڵ جیهاندا. هەروەها دەکرێت بە ئاماژەکردنیش بۆ هەوای هەناســـەدان، ئاو بۆ خواردنەوە و خۆراک بۆ خواردن پێناســـبکرێت. لەش بەبێ هێشـــتنەوەی پەیوەندییەکانی ناتوانێت خۆی دەربخات. وەکـــو کردەوە ژیان واتای بەرزێتی بەرزێتییە. لە سروشـــتدا جیاوازی لەنێوان کردەوە و ژیاندا نییە. ژیان کۆی واتاکانە، کە ڕوو لە بابەتەکان دەکات و لەلایەن جیهانەوە ئامادە نەکراوە.

ژیان شـــێوەی لەشی کەسەکەی دیکە نییە بەڵکو زەمینەیەکە منیش دەتوانم بیناســـم. لەشـــی ئەو، وەکو شێوەیەکی پڕ واتا لەنێو بەســـتێنی جیهانەوە خۆی دەردەخات و بەردەوام دەبێت بە زەمینەش بۆ بوونی کەسەکە.

لێرەدا پێویستە باســـی جیاوازییەکی گرنگیش بکەین: لەشی کەسەکەی دیکە خۆی بۆ (لەشی من) دەردەخات. ئەمەش ئەو خاڵە دەستنیشان دەکات، کە جۆرە فاکتۆرێک لـــە بۆچوونی مندا بەرانبەر ئەو هەیە. ئێمە تاکو (هەموو)ی لەشـــەکە

نەناسـین لە واتای ژیانیشـی تێناگەین. دەشـی ئەو کاتەی تەماشـای دەستی دەکەیـن، زەمینەکەش بەتەواوی خۆی دەربخـات. ئاکامی ئەمەش لەو خاڵەدایە، کە لەشی کەسەکەی دیکە بۆ من هەموویەکی تێهەڵکێشراوە. ئەمەش ئەم واتایانە دەگەیەنێت.

١-من هەرگیز بەبێ ئەم (هەموو)ە لەشی کەسێکی دیکە ناناسم.

٢- هیـچ ئەندامێکی لەش بەتەنیا و بەبی ئەو نابینم. ئەندامەکانی لەش ئاماژە بۆ (هەمووی) لەش و ژیانی ئەو دەکەن. لەم ڕووەوە، ڕوانینم بۆ لەشـی کەسێکی دیکە ڕادیکاڵانە لەڕوانینم بۆ شتەکان جیاوازە.

١-کەسـێکی دیکە لەنێو سـنوری خۆیدا دەجوڵێت. جوڵانەکەشی ڕاستەوخۆ بەوچەمکانـەوە گرێدراوە، کە من ئاماژەیان بۆ دەکەم. سـنورداریێتی جوڵانەکانی پەیوەندییـان بەکات و شـوێنەوە هەیە. لەڕووی شـوێنەوە دەڵێم پەرداخەکە لە پیرۆوە دوورە، ئەمەش جوڵانی ئەو [بەرەو پەرداخەکە] دیاریدەکات. سـەرجەمی ڕیزکردنەکەش (مێز-پەرداخ-شوشـە و هتد) لە هەسـتکردنی مندایە. تەماشـای جوڵانی دەسـتەکە دەکەم و دەمەوێت لە واتاکەی تێبگەم. ئەگەر دەسـتی پیرۆ دیاربێت و پەرداخەکە دیارنەبێت جوڵانی پیرۆ بۆ من دەبێت بە بیرۆکەیەکی ڕووتی بارودۆخەکە و بێ مەبەسـت، کە بوونی پەرداخەکە لە من دەشـارێتەوە. ئەمەش واتای نیشانەیە.

نیشانەی پیرۆ بۆ من ئاشکرابووە. منیش بە هۆکاری واتای نیشانەکەوە هەست بە ئامادەبوونی لەشی دەکەم. ئێمە هیچ لە سایکۆلۆجی هەستکردنی لەشی کەسانی دیکە تێناگەین، ئەگەر لەپێشدا ئەو ڕاستییە نەناسین، کە لەشی کەسانی دیکە بە جۆرێکی جیاوازتر لە تەنەکانی دیکە دەبینرێت. بۆ ناسـینی هەمیشە لەدەرەوەدا ڕووی تێدەکەین، ئەویش لەنێو شوێن و کاتدایە و نیشانەی هەیە. ناسینی کەسێکی دیکە لەسەر بوونی ڕادەوەستێت.

٢- هیچ کاتێک دەسـتێکی جوڵاو بە لەشـێکی نەجوڵاوەوە نابینین. من پیرۆ دەبینم دەسـتی بەرزدەکاتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت جوڵانی دەسـتەکە بەو ئاگامەندییـەوە دەبەسـتمەوە، کە لێیدەکۆڵێتەوە. من جوڵانی دەسـتەکە، وەکو جوڵانێکی کاتی هەموو لەش دەبینم. جوڵانی هەموو لەشـە جوڵان لە بەشـێکدا دەهێنێتەکایەوە. بۆ سـەلماندنی ئەم خاڵەش مامەڵە لەگەڵ هەسـتکردنی لەشی کەسـانی دیکە دەکەین. ئەوکاتەی دەسـتێک بەبێ لەش دەبینین دەترسین؛ یان کتوپڕ دەسـتێک دەبینین، کە قۆڵی شـاراوەتەوە و دەستەکە، وەکو جاڵجاڵۆکە دەجوڵێت. لەم نموونانەدا هەسـت بە لەناوچوونی لەش دەکەین. لەناوجوونەکەش ڕووداوێکی نائاساییە. سـەرباری ئەمە، سەلماندنەکانی سایکۆلۆجی جیشتاڵتیش دەزانیـن. جێگەی سەرسـوڕمانە ئەو کاتەی وێنەی دەسـتی پیـرۆ بە گەورەیی

دەبینین (کامێــر لە ڕەهەندێکی جیاوازەوە شــتەکان دەبینێت و هەموو لەشــەکە ناناســێت). لە چاوەکانی ئێمەدا دەستەکە ئەوەندە گەورە نییە. لەبەر ئەمە، لەش لەنێو بارودۆخی ســنورداردا، وەکو هەموویەکی تێهەڵکێشراوی ژیان و کردەوەکان بەرجەستە دەبێت.

لــەم بۆچوونانــەوە، ڕووندەبێتەوە، کە لەشــی پیرۆ لە بوونــی پیرۆ-بۆ-من جیانابێتەوە. لەشی کەسانی دیکە بە واتا جۆراوجۆرەکانیەوە بوونە-بۆ-من: بوون-بەبابەت-بۆ کەســانی دیکە یان بوون-بەلەش دوو شــێوازی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-کەســانی دیکەیە لــە بوون-بۆ-خۆدا. ئەم بوونەش ئاماژە بۆ لایەنێکی شــاراوەی دەروونی ناکات. لەولایەنــەوە دەروونییە، کە بەرزێتی بەرزێتییە. هەڵبەتە لایەنی دەروونــی نادیار یان دیاردەی دەروونی شــاراوە هەیە. بــەڵام ئەمەش ئەو واتایە نابەخشــێت ئێمە ئاماژە بۆ شتێک لەودیو بوونی لەشەوە دەکەین. ئاماژەکردنەکە تەینا ڕوو لە جیهان و لەشــەکە دەکات. بەتایبەتی بەرجەســتەبوونی ســۆزەکان یان دیاردە دەربڕاوەکان لایەنێکی شــاراوە دیارنیاکەن. ڕوگرژی، ســورهەڵگەڕان، تەتەڵەکردن و لەرزەی دەســت، سەرشــۆڕکردنەوە، کە هەمــوو پێکەوە دەبن بە هەڕەشە تورەبوون دەرنابڕن: خودی ئەمانە تووڕەبوونە. پێویستە چاکتر لەم خاڵە تێبگەین. مشتپێدادان بەتەنیا هیچ واتایەک نابەخشێت و ئێمەش بەتەنیا نایبینین. کەسێک دەبینین لە حاڵەتی مشتهاویشتندایە. ئەم کردەوە پڕواتایە، بە ڕابردووەوە و ئەگەرەکانەوە بەســتراوە، لەنێو بەســتێنی هەموویەکی تێهەڵکێشراوی (لەش لەحاڵەتــدا) دەرکەوتوە و بووە بە تورەیــی. ئاماژە بۆ کردەوەیەک لەنێو جیهاندا دەکات (دەیەوێت خۆی بە کەسێکدا بدات، ئازارێک دروست بکات ...هتد.)؛ ئەمەش واتایەکی نوێ بەلەش دەبەخشێت. ئەم بابەتە دەروونییە خۆی نیشانی هەستکردنی داوە و بەبێ لەش ناتوانێت هەبێت.

ئەگەر بیر لەم فاکتۆرە نەکرابێتەوە یان کەســانێک ئەوانەی لەگەڵیدا هاوڕان، وەکو شــوێنکەوتوانی فێرگەی ڕەفتارگەری، لە بانگەشــەکانی خۆیان تێناگەن و جیهانیان بە بانگەشــەکانیان پڕکردوە، لەبەر ئەوەی هەموو کەســێک واتێدەگات هەســتکردنەکانمان وەکو یەکن. لەڕاستیدا هەســتکردن ڕاستەوخۆ شوین و کاتی بابەت دەردەخات. بونیادی بنەڕەتیش ڕەتدانەوەی ناوەکییە و بابەتەکەشی بۆ من، وەکو خۆی نەک شێوازی ڕاستەقینەیەکی دوور نیشاندەدات. لێرەدا بونیادی نوێی هەستکردن وابەستە بە داکەوتەوە. لەش بابەتێکی دەروونییە.

بەڵام ئەگەر لەوباوەڕەشــدابین بەرزێتی بەرزێتییە، ئەوا هەســتکردن بە لەش لە ڕیزی هەســتکردن بەبابەتەکان دانانرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت هەستکردن بــەردەوام خۆی پڕو تــەواو دەکات، بەڵکو بونیادێکی جیــاوازی هەیە. لێرەدا بۆ تێگەیشتن لە هەڵوێســتێکی دەربڕاو پێویست ناکات پەنا بۆ نەریت یان هۆش لە

ڕێگەی لێچونەوە بەرین چونکە هەســـتکردن ئەو هەڵوێســـتە دەناسێت؛ واتاکەی بەشـــێکە لە ڕەنگی لاپەڕەکە یان بوونی کاغەزەکە. هەروەها پێویســـت ناکات بۆ ئەم تێگەیشتنە پەنا بۆ هەڵوێستی دیکە بەرین تاکو لە ڕەنگی کاگەزەکە یان ئەو فایلەی بەردەممان تێبگەین.

لەشـــی کەسانی دیکە، بەو جۆرەی ئەوان هەن، ڕاستەوخۆ بە ئێمە دراوە. ئەو شتەیە بەردەوام لە ڕێگەی واتایەکی تایبەتییەوە ڕوو لە مەبەست و کۆتاییەک دەکات. بۆنموونە، ئەو کەسەی پیاسەدەکات. لەسەرەتاوە پیاسەکردنەکەی لەنێو بەستێنی شوێن و کاتدا دەبینم (لە کۆڵان و سەرشەقام، بەردەم دوکان و ئۆتۆمۆبیلەکاندایە). لەم بەســـتێنەوە جۆرە بونیادێکی واتای پیاسەکردن سەرهەڵدەدات. من هەست بە پیاســـەکردنەکە لەگەڵ گەڕانەوەم لە داهاتووەوە بەرەو ئێستا دەکەم. هەرچەندە داهاتـــوو، کە پرســـیارکردن تیایدا خـــۆی بە کاتی جیهانییەوە دەبەســـتێتەوە و ئەو (ئێستا) ڕەوانەیە، کە هێشتا پەیدا نەبووە. خودی پیاسەکردنەکە، وەکو شتێکی نەناســـراو یان لەناوچوو دەبێت بە ئێستا. بەڵام ئێســـتا خۆی بەرەو داهاتوو یان مەبەستێک لەداهاتوودا تێپەڕدەکات. لەودیو جوڵانی دەست و ئێستا نەناسراوەکەوە دمانەوێت ناوەڕۆکی جوڵانەکە بناسین. ئێمە هەرگیز ئەم ناوەڕۆکە ناناسین ئەگەر بە لەشەوە نەبێت. هەمانکات ڕابردووش ڕەتدەکات. من، کە باسی دەستێکی جوڵاو دەکەم ئەوا دەستەکە، وەکو جەوهەرێک لە چەقێکی وەستاوی نێو جوڵانەکەدایە. ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم نوسراوەدا باسمانکرد، کە پشتگیری ئەم خاڵە ناکەین. دەستە وەســـتاوەکە نابێت بە شـــتێکی جوڵاو؛ جوڵان تێکچوونی بوونە. ئەوەش ڕاســـتە بڵێین جوڵانی دەروونی دوو لایەنی سنورداری هەیە: داهاتوو مەبەستەکان و ڕابردووش ئەو ئەندامە وەســـتاوانەی تێپەڕ دەکرێن و گۆڕانیان بەســـەردا دێت لەناودەبەن. دەستە جوڵاوەکە ئاماژەکردنێکی بەردەوام و نەناسراوە بۆ هەبوویەکی ڕابردوو. ئـــەم هەبووە ڕابردووە (وەکو قۆڵ، قاچ، هەموولەش لەکاتی وەســـتاندا) نابینم. تەنیا لە ڕێگەی ئەو جوڵانەوە، کە تێپەڕی دەکات دەتوانم بیناسم. ئەم شتە نەناســـراوەش فاکتۆرە، گۆشتێکی ڕووتە، ڕابردووی بەرزێتی بەرزێتییە و بەردەوام دەبێت بەڕابردوو.

ئەم بوونـ-لەنێو-خۆ ڕەوانە بەردەوام تێپەڕدەکرێت. ئەگەر نەتوانێ بەردەوامیش لە ڕیگەی بەرزێتییەوە خۆی دەربخات و خۆی بشـــارێتەوە، دەبێت بە لاشە. وەکو لاشـــە؛ بۆنموونە ڕابردوویەکی تەواوی ژیان، لەوڕووە، کە لەوە زۆرتر تێپەڕناکرێت لێـــی تێناگەین. لەلایەکی دیکەوە بەوجۆرەی ئێســـتا، وەکو بوونـ-لەنێو-خۆیەکی ڕەوان دەردەکەوێت لە پەیوەندییەکی دەرەکی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەژی. لاشـــە لەوە زۆرتر لەنێو بارودۆخدا نییە. دەکەوێتە نێو بوونی خۆیەوە و لایەنەکانی خۆی دەپارێزێت. هەریەکێک لەو لایەنانەی بوونی پەیوەندییەکی دەرەکی بە شـــتەکانی

دیکەوە هەیە. ئەو توێژینەوەیەی پەیوەندییە دەرەکییەکە دەناسێت و مامەڵە لەگەڵ فاکتۆری لاشەدا دەکات زانستی لەشناسییە. پێکهاتە تێهەڵکێشراوەکەی کەسێکی زیندوو لە ڕوانگەی لاشـــەکەوە دەناسێت فســـیۆلۆجییە. وادەبینرێت فسیۆلۆجی لەبـــارەی ژیانـــەوە زانینمان نەداتێ چونکە ژیان بە شـــێوازێکی مردن دادەنێت و لاشەکە بەسەر ئەنداماکانیدا دابەشدەکات. لە پێکهاتە یەکگرتووەکەی (تێپەڕبوون بـــەرەو) تێناگات. تەنانەت توێژینەوە لەســـەر ژیانی تاکەکەســـێکیش یان ژیانی پرۆتۆپلازمەیـــەک، کۆرپەیەک یان هێلکە ژیان نادۆزێتەوە. ئەو ئەندامانە دەخرێنە بەر لێکۆڵینـــەوە زیندوون، بەڵام پێکهاتەیەکی یەکگرتـــووی ژیان نییە. کەوابوو، هەڵەیە لەش کەســـێکی دیکە، ئەو لەشەی خۆی بۆ ئێمە دەردەخات، بەبابەتێکی لەشناسی-فسیۆلۆجی دابنرێت. ئەمەش ئەوەندەی دانانی هەستەکانمان بە ئەندامی هەســـتکردنی کەســـانی کە هەڵەیە. لەشی کەســـانی دیکە فاکتۆری بەرزێتییە و لەدایکبوونێکـــی بەردەوامە و ئامارژە بـــۆ پەیوەندییەکی دەرەکی بوون-لەنێو-خۆی تێپەڕکراو دەکات.

ئەم بیرۆکانە (کەســـایەتیش) بە ئێمە دەناســـێنن. پێویســـتە ئەوەش بزانرێت کەســـایەتی تەنیا، وەکو بابەتێکی زانین بۆ کەسانی دیکە بوونێکی دووری هەیە. ئاگامەندیش کەسایەتی خۆی نابینێت، تاکو لەدەرەوەدا تەماشای نەکات. لەبەرئەەش باسکردنێکی رووت و لەناوەوە کەساتەتییەکە نا ناسینێت. پاڵەوانی[چیرۆکەکانی] پرۆست ڕاستەوخۆ ناتوانێت زانینی لەبارەی کەسایەتییەکەوە هەبێت. ئەو لەپێشەوە ئـــاگای لەبوونی خۆیەتـــی و خۆی بە پێکهاتـــەی ڕەتدانەوەکان، کـــە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە دەبنێنێت. ڕەتدانەوەکانیش میکانیزمی ســـۆز و هەڵچونی دەروونی و یادەوەرییەکانە..هتد، کە هەموو تاکە کەســـێک خۆی تیایاندا دەدۆزێتەوە. ئەم ڕەتدانەوانە گشتین و سەر بە سروشتی دەروونن.

ئەگەر (بەوجۆرە ئیبراهیم لە پەرتووکەکەیدا هەوڵی تێگەیشتینی پرۆستی داوە) ئێمەش لە ناســـینی کەسایەتییەکەی پرۆستدا سەرکەوتووبین، (بۆنموونە لاوازی و کەمتەرخەمی و ڕێگە تایبەتییەکەی بۆ بەستنەوەی خۆشەویستی بە بیرکەوتنەوە ببەســـتینەوە) لەبەرئەوەیـــە ئەم شـــتە پێدراوانە ڕاڤەدەکەین و لـــە دەرەوەیاندا تەماشایان دەکەین؛ بەراوردیان دەکەین و لە پەیوەندییە دەرەکییەکانیان دادەبڕین. بەو ڕادەیەی خوێنەر چاویلکەیەکی گشتی بۆ خۆێندەوەکە بەکاردەهێنێت خۆی بە پاڵەوانەکە دادەنێت و کەســـایەتی (مارسێل) نابینێت یان ئەو کەسایەتییە لەلای ئامادە نابێت.

کەســـایەتییەکە لەگەڵ دابڕانی من و نوسەرەکەدا سەرهەڵدەدات. لەوێدا، کە من موتمانە بە پەرتووکەکە بکەم و بە دەقێکی نوســـراوی دابنێم. کەساتەتییەکە، کەوابوو، لەســـەر زەمینەی بوون-بۆ-کەســـانی دیکە دێتە کایەوە. لەبەر ئەمەشە

ڕاڤەکردن و وانەگوتنەوە لەسەر (ڕاســـتەقینە سایکۆلۆجییەکانە)؛ ئەوانەی نوسەرە فەرەنسییەکان بە دەرەکی و سایکۆلۆجی-کۆمەڵایەتی دادەنێن، هەرگیز لە ئەزموونی ژیانی (خۆ)دا نادۆزرێنەوە.

ئەگـــەر لەبنەڕەتدا کەســـایەتی بوونێک بێت بۆ-کەســـانی دیکـــە ئەوا لە لەش جیاناکرێتەوە. گریمان، بۆنموونە، مەزاج هۆکارە بۆ شێوازی کەسایەتییەکە؛ مەزاجێکی تـــوڕە دەکەین بە ســـەرچاوەی هەڵچوون لەباری دەروونی کەســـایەتییەکدا؛ ئەمە لایەنێکی دەرەکی و ناوەکی کەسەکە دەردەخات. هەڵچونەکە لە دەرەوەدا ناسراوە. بەرزێتییەکەی منیش بەرزێتی ئەوی تێپەڕکردووە. لەمحاڵەتەدا هەڵچوون و مەزاجە توڕەکە لە یەکدی جیا ناکرێنەوە. لە هەردووکیاندا ســـورهەڵگەڕانی لەش دەبینین، بەڵام بەگوێرەی پڕۆژەکەمان دەیخوێنینەوە. ئەگەر سوربوونەوەکەی لەش بە زەمینە دابنێین، ئەوا مامەڵە لەگەڵ مەزاجدا دەکەین. ئەمەش دەکەوێتەسەر دابڕانی هەموو ئەو پەیوەندییانەی لەحاڵەتەکەدا هەن. ئەگەر، وەکو لاشەش تەماشای بکەین، ئەوا دەتوانین توێژینەوەی پزیشکی و فسیۆلۆجی لەسەربکەین. بەپێچەوانەشەوە، ئەگەر بە حاڵەتێکی ئاسایی و جیهانی دابنێین، دەبێت بە خودی توڕەبوون یان بەڵێنێک بۆ توڕەبوون. ئەمەش دیاریکردنی پەیوەندییەکی بەردەوامە لەگەڵ شتێکی بە ئامێرکراو یان هێزەکیدا. تەنیا جیاوازییەکی پرنسیپاڵی لەنێوان مەزاج و کەسایەتییەکەدا هەیە و لە لەشیش جیانابێتەوە. ئەمەش زەمینە بۆ زانایانی دەمارناس خۆش دەکات تاکو لە ڕێگەی توێژینەوەیان لەسەر کەسایەتییەکە و لەش باسی (فسیۆگینۆمی) بکەن[٦١] لەم بوارەدا بەتایبەتی ئاماژە بۆ توێژینەوەکەی (کرێشـــمەر) لەســـەر کەسایەتی و بونیادی لەش دەکەین. کەســـایەتی کەســـێکی دیکە، لەڕاستیدا، ڕاستەوخۆ، وەکو تیەهەڵکێشەیەکی دامەزراو بە تێڕوانین دراوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئێمە بتوانین ڕاستەوخۆ لێی بدوێین. دەرکەوتنی بونیادە جیاوازەکەی کاتی دەوێت. دەتوانین پەنا بۆ زانیاری گشـــتی (وەکو ئەو یاسا ئەزمونگەریانەی بە هۆکاری ئامارەوە دەستمان کەوتووە) بەرین و هەوڵبدەین ڕاڤەی بابەتە بینراوەکە بکەین. بەڵام هێشتا گرفتەکە لەوێدایە ئێمە پێشبینیکردن و کردەوەکە لەنێو تێڕوانینەکەماندا کۆبکەینەوە. ئەمەش هەندێ کەسی گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی بڵێین (یەکەم بینین هەڵە ناکات.) ئەوکاتەی ڕووبەڕووی کەســـێک بۆ یەکەمجار دەبینەوە ئەو کەســـە ڕاستەوخۆ و بەبێ ئەوەی بتوانێت خۆی بشارێتەوە دەکەوێتە نێو تێڕامانی ئێمەوە. لێرەدا فێربوون دەبێت بە تێگەیشتن، پێشکەوتن و پێزانین.

ســـەرەڕای ئەمە، لەگەڵ ئەوەشدا کەســـێکی دیکە بەوجۆرە خۆی دەردەخات

٦١ فسیۆگینۆمی جۆرە زانستێکە لە ڕێگەی شێوەی ڕوخسار و قەوارەی ئەندامەکانی، وەکو ناوچەوان، لوت، لێو و چەناگە و هتد کەسایەتییەکە دەخوێنێتەوە.(وەرگێڕ)

دراوە، کــە هەیە. کەســـایەتی و فاکتۆر جــودا نین و هەردووکیـــان لە بنەڕەتی بوونی هەڵکەوتوی کەســـەکەدایە. ئێمە کەســـێکی دیکە بە سەربەست دادەنێین، لەپێشتر ئەوەشـــمان سەلماند، کە سەربەستی خەســـڵەتێکی بابەتانەی کەسانی دیکەیە و هێزێکی بێ ســـنورە بۆ گۆڕانی بارودۆخەکان. ئەم هێزەش لە پێکهێنانی بوونی کەسانی دیکە و داهێنانی بارودۆخەکان بەگشتی جیانابێتەوە. دروستکردنی گۆڕانکاری لە بارودۆخەکاندا داهێنانیانە. سەربەســـتی بابەتانەی کەســـانی دیکە بەرزێتییەکی بەرزێتییە؛ سەربەســـتییە، وەکو بابـــەت. لەمڕووەوە، دەبێت بوونی کەسێکی دیکە بەو هەڵوێســـتە دابنێین، کە بەردەوام بارودۆخەکانی بوونی خۆی دەگۆڕێت. لەبەرئەمەیە، لەشی هەمیشە دەکەوێتە ڕابردووەوە و کەسایەتییەکەشی تێپەڕکردوە. تەنانەت سوربوونەوەکەشـــی، کە توڕەبوونەکە دەردەخات بەردەوام تێپەڕدەکرێت. کەوابوو، کەســـایەتی کەسێکی دیکە ئەو فاکتۆرەیە لەبەردەم مندا قوتدەبێتەوە، بەڵام تێپەڕدەکرێت. ئەوکاتەی کەسێک توڕە دەبێت سوربوونەوەکەی خۆی تێپەڕکردوە چونکە دەیەوێت واتای بداتێ. توڕەبوون لە ڕێگەی سەربەستییەوە- وەکو بابەت دەبێت بە ســـەرهەڵدانی ســـورهەڵگەڕانەکە. ئەمەش ئاماژەکردن بۆ لایەنی ناوەکی نییە، بەڵکو ئەوەی ئێمە تێپەڕی دەکەین تەنیا فاکتۆری کەســـانی دیکە نییە و بەرزێتییەکەشـــە؛ بوونیان نییە (بۆنموونە ڕابردوویان) بەڵکو ئێستا و داهاتووشیانە.

هەڵبەتە توڕەبوونی کەسێکی دیکە بۆ من هەمیشە توڕەبوونێکی سەربەستانەیە (من دەتوانم حوکمی بەسەردابدەم) بەڵام من تێپەڕیدەکەم؛ زۆرتر یان کەمتری دەکەم. منیش لەم تێپەڕکردنەدا دەیناســـم. مادام لەش فاکتۆری بەرزێتی بەرزێتییە ئەوا هەمیشە ئاماژە بۆ شتێک لەودیو خۆیەوە دەکات. ڕاستەوخۆ لەنێو شوێندایە (لەنێو بارودۆخدایە) و لەنێو کاتدایە (بابەتێکی سەربەستە). لەشی کەسانی دیکە بابەتێکی جادوگەرانـــەی تەواوە و لەشـــێکە لە لەش زۆرترە چونکە کەســـانی دیکە بۆ من ئەو فاکتۆرەیە ڕاســـتەوخۆ لەبەردەممدایە و بەردەوامیش خۆی تێپەڕدەکات. بەڵام تێپەربوونەکە من بۆ لایەنی (خۆیەتی) نابات. هەروەها، ئەوەش ڕاستە لەش گرنگ نییـــە ئەندامەکان، کەســـایەتییەکە یان ئامێر بێت، بەبـــێ دەوروبەر بۆ من خۆی دەرناخات. دەوروبەرەکەشـــی کاردەکاتە ســـەری. نابێت لەشـــی کەسانی دیکە و بابەتگەری تێکەڵبکرێن. بابەتگەرێتی کەســـانی دیکە بەرزێتی بەرزێتییە. لەشیش دەبێت بە فاکتۆری بەرزێتییەکە. هەمانکات، لەشـــی کەسانی دیکە و بابەتگەرێتی بە هیچ جۆرێک جیاواز نین.

### ٣- ڕەهەندی سێیەمی ئۆنتۆلۆجییانەی لەش

من بە لەش هەم: ئەمە یەکەم ڕەهەندی بوونە. کەسانی دیکەش لەشم دەناسن و بەکاریدەهێنن: ئەمە دووەم ڕەهەندێتی. بەو ڕادەیەی بوونم بۆ کەسانی دیکەیە، کەسانی دیکە بۆ من ئەو (خۆ)یەن، کە من بۆیان دەبم بەبابەت. تەنانەت پرسیاریش لەسەر پەیوەندی بنەڕەتیم لەگەڵ کەسانی دیکەدا، وەکو بینیمان، سەرهەڵدەدات. کەوابوو، من بەو جۆرەی کەسانی دیکە دەیناسێت بەتایبەتی-هەم. من بۆ خۆم، وەکو لەش هەم، کە کەسانی دیکە دەیناسن. ئەمە ڕەهەندی سێیەمی لەشە. ئێمە لێرەدا لەسەرئەم ڕەهەندە دەدوێین و هەوڵدەدەین وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت شێوازی لەش لە بووندا بدەینەوە. لەگەڵ تەماشاکردنی کەسێکدا من بوونی خۆم، وەکو بابەت لادەردەکەوێت؛ ئەمەش بەرزێتییەکەی من تێپەڕدەکات. من بە هەموو لێپرسینەوەیەکەوە دەبم بە بابەتی بوونێکی نەزانراو لەبەردەم کەسانی دیکەدا. بەڵام من ئەم (خۆ)یەم ناناسم و هیچ لەبارەی شێوازی بونیادەکەشییەوە نازانم. هەستدەکەم کەسانی دیکە فاکتۆری بوونمیان دۆزیوەتەوە. من بەرانبەر ئەو بوونەی لەوێدا بۆ کەسانی دیکەیە بەرپرسم. ئەو بوونە لەوێدا لەشە. کەوابوو، ڕووبەڕوو بوونەوەم لەگەڵە کەسانی دیکەدا فاکتۆری بوونم تەنیا بەرزێتییەکەم ناخاتە بەردەستی ئەوان. منیش لە فاکتۆری بوونم بە ئاگا دێمەوە و خۆم بەو بوونە لەنێوان شتەکانی جیهاندا دەبینم.

ڕووبەڕووبوونەوەکە دەمهەژێنێت چونکە لەشم لەدەرەوە، وەکو بوونێکی-لەنێو-خۆ بۆ کەسانی دیکە دەردەخات. لەشم بە زیندوویی نامێنێتەوە. ئەم تەنە زیندووە دەبێت بە فاکتۆرێکی ڕەها بۆ کەسانی دیکە و لەدەرەوەدا لەو ڕەهەندەدا، کە لە دەستی من دەردەچێت، دادەنرێت. لەشم بەردەوام دەبێت بەم لایەنە دەرەکییەی لایەنی ناوەوەم. مادام ئامادەبوونی هەمیشەیی کەسانی دیکە فاکتۆرێکی بنەڕەتییە، ئەوا بوون بەبابەت لەوێدا ڕەهەندێکی هەمیشەیی فاکتۆری منە.

لەشم لەوێدایە نەک لەبەرئەوەی بنکەیەکە بۆ ئاماژەکردن، کە بوونی من دیاریدەکات، بەڵکو ئەو بنکەیەشە، کە بۆچوون و ئاماژەکردنی بۆ دەکرێت و من ناتوانم خۆم بەخاوەنی بکەم. لەشم لە هەموو لایەکەوە لە دەستم ڕادەکات. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشیت، کە پێکهاتەکانی هەستەکان، کە بەتەنیا هەستیان پێناکرێت، لە شوێنێکی دیکە و کەسانی دیکە دەیناسن. ئەم ناسینەوەیە بنەمایەکی

ئۆنتۆلۆجی پێویستی نییە. مادام فاکتۆری بوونم هەڵکەوتێکی ڕووتە و ڕاستەوخۆش من دەیناسم بوونی-کەسانی دیکە هەڵکەوتنی فاکتۆرەکەم زۆرتر دەکات و لەگەڵ ئەمەشدا فاکتۆرەکەم لە من هەڵدێ و ڕادەکات و دەبێت بە هەڵکەوتێکی نەبڕاوە. لەو کاتەوە من لەناوەوە هەست بە هەستەکانم دەکەم و هەستەکانم نابن بە بنکەی بۆچوونەکان ئامادەبوونی کەسانی دیکە دەبێت بە دێوەزمە. هەستەکانم بۆ ئەوان دەبێت بەو مێز و درەختەی من دەیانبینم. ئەوانە لەنێو جیهاندا و لە بەردەم کەسانی دیکەدان. پەیوەندییەکانی هەستکردنم، کە بەبێ ڕووخانی جیهانەکەم ناتوانم باسیان بکەم، بەردەوام جارێکی دیکە لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە بۆ من ئامادە دەبن.

بەهەمانشێوە، لەشم ئەو ئامێرەیە، کە منم و ئامێرێکی دیکە ناتوانێت سودی لێوەرگرێت. بەوڕادەیەی کەسانی دیکە لە ڕووبەڕووبونەوەکەیاندا بوونم-لەوێدا بەرەو ئەگەرەکانی خۆیان دەبەن، ئەو ئامێرە، کە منم بۆ من دەبێت بە ئامێر و لەنێو زنجیرەی نەبڕاوەی سەرهەڵدانی ئامێرەکاندا ژێر دەکەوێت. لەشم بەم نامۆییەوە دەبێت بە ئامێرێک لەنێو ئامێرەکاندا یان ئەو ئەندامە هەستەکییانەی ئەندامە هەستەکییەکانی دیکە دەیانناسن. ئەمەش نامۆبوون و ڕوخانی جیهانی منی تێدا ڕوودەدات و کەسانی دیکە خۆیان بە خاوەنی دەکەن. لەکاتێکدا، بۆنموونە، پزیشکەکە گوێ لە هەناسەدانم دەگرێت من گوێی دەبینم. من بۆ بابەتەکان بنکەی ئاماژەکردنەکانم. بینینی گوێکە جۆرە فۆرم و بونیادێک نیشاندەدات، کە من وەکو زەمینە بۆی دەبم بە لەش. بونیادەکە، لەگەڵ بوونی مندا سەر بە تەنێکی زیندووە. من دەتوانم پەیدایبکەم و لەناویشی بەرم. ئەمە یەکەم پەیوەندییە لەگەڵ ژیاندا. بەڵام لەودیو گوێکەوە پزیشکەکە دەبینم دەنگی لەشم دەبیسێت. بە لەشی هەست بە لەشی من دەکات. کتوپڕ، ئەو تەنە زیندووەم دەبێت بە شتێک لەدەوەی مندا و لەنێو کەلوپەلەکانی جیهاندا، کە من خاوەنی نیم. لەشم دەبێت بە شتێکی نامۆ و دامەزراو.

نامۆبوونەکەم لە چەند شێوازێکدا دەردەکەوێت، بۆنموونە لە شەرمکردندا؛ کاتێک سورهەڵدەگەڕێین و لە شەرما ئارەق دەردەدەین و هتد. ئەمانە دەربڕینێکی ناجۆرن بۆ شەرمکردنەکە. واتای تەواوی شەرمکردن لەوێدایە، کە کەسێک دەزانێت بەردەوام لەشی دەبینرێت. ئەم بەردەوامبوونە نائاساییە هەستکردنە بە نامۆیی لەش و پەیدانەکردنی ڕێگەچارە بۆی. دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی حاڵەتی دەروونی، وەکو ئیریۆفۆبیا (حالەتی سوربوونەوە لەگەڵ ترسدا)؛ ئەمەش ئەو ترسە مێتافیزیکییەیە لە ئاکامی ئامادەبوونی لەشم بۆ کەسانی دیکە دێتە پێش. زۆرجار ئێمە دەڵێین، کەسێک لەبەر لەشی شەرمدەکات. لەڕاستیدا ئەم شێوازی دەربڕینە نادروستە. من شەرم لەشێوازی لەشم، کە هەمە ناکەم. بەڵکو لەشم بەو شێوەیەی

کەسانی دیکە دەیبنن توشی شەرمم دەکات. هێشتا ئەم دەربڕینەش کێشەی تێدایە. ئەوەی توشـــی شەرمم دەکات شـــتێکی کۆنکرێتی ئامادەبوونی نێو جیهانی منە. ئەو شـــتەش ڕێگە بە من نادات ئامێرەکان بەکاربهێنم. لەمحاڵەتەدا شەرمکردنەکە باشتر دادەمەزرێت چونکە ئامادە نەبوون من تەوقدەکات. هەرگیز بوونی لەشم بۆ کەسانی دیکە بە ڕێگر دانانێم و بەپێچەوانەوە، لەبەرئەوەیە، کە لەش، لەوێدا نییە، ناناســـرێت و تەوقدەکرێت. من دەمەوی بیگەمێ، داگیرییکەم و وەکو ئامێر سودی لێوەرگرم. بەڵام لەش لەبنەڕەتدا لەژێر دەستی مندا نییە. هەموو هەوڵدانەکانم بۆ گرتنی بێ ئاکامە چونکە لەشم بۆ کەسانی دیکەشە. کەوابوو، من بەردەوام تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێم. لەبەرئەمەشـــە کەســـێکی شـــەرمن خۆزگەکەی بۆ نەبوونی لەشی یان لەشێکی نەبینراو نایەتەدی. ئەو نایەوێت لەشی خۆی بەو شێوەیەی ئەو دەیناسێت لەناوبەرێت، بەڵکو دژی ڕەهەندی نامۆبوونی لەشێتی.

ئەم توێژینەوەیە جۆرە ڕاســـتەقینەیەک بەو شێوەیەی بە لەش-بۆ-خۆمان داوە بە لەش-بۆ-کەســـانی دیکەش دەدات. لەش-بۆ-کەسانی دیکە هەمانکات لەشە-بۆ-خۆمان، بەڵام نامۆکراوە. وادەردەکەوێت کەسانی دیکە ئەو کارەمان بۆ تەواوبکەن، کە بە ئێمە هەڵناسورێت؛ ئەویش بینینی بوونی خۆمانە بەو شێوەیەی هەین.

زمان بنەمای بونیادی لەشمان-بۆ-کەســـانی دیکە بە ڕووتکراوەیی بەرجەســـتە دەکات (هەرچەندە لەش بە وشـــە باس ناکرێت). زۆرمان لێدەکات لەشمان بخەینە بەردەســـتی ئەوان. دەمانەوێت خۆمان لە چاوی کەسانی دیکەدا ببینین؛ ئەمەش واتە ئێمە بە ڕێگەی زمانەوە لە بوونی خۆمان تێدەگەین. لێرەدا سیستەمێکی وشە سەرهەڵدەدات، ئێمە بە هۆکاری ئەم سیستەمەوە خۆمان لەبەردەم کەسانی دیکەدا دادەمەزرێنین و دەناســـین. هەروەها دەتوانین لێکچونەکانی نێوان لەشی کەسانی دیکە و خۆمان دیاریبکەین. ئەگەر لەشـــم بۆ کەســـانی دیکە و لەشی ئەوانیش بۆ من بێت، کەســـانی دیکـــە دەبن بەو (خۆ)یە بە بابەتکـــراوە و دواییش بە بابەت. ئەگەر حوکم بەســـەر لەشـــی کەســـانی دیکەدا بدەم و بڵێم لە لەشی من دەچێت گرنگە کەسانی دیکە، وەکو بابەت خۆیان بۆ من دەربخەن. لێکچون و بەراوردکردن لە ســـەرەتادا لەشـــی کەســـانی دیکە، وەکو بابەت و بەبابەتبوونی لەشی منیش پێکناهێنێت. بەپێچەوانەوە، ئەم دوو حاڵەتی بابەتانە دەبێت لەپێشوەختدا هەبن، تاکو بەراوردبکرێن. کەوابوو، زمانە ســـەبارەت بونیادی لەشەوە بۆ کەسانی دیکە من فێردەکات. لەسەرو ئەمەوە، پێویستە بزانین زمان لەسەر زەمینەی بیرکردنەوە واتاکەی لەنێوان لەشم و ئاگامەندیمدا دەهێنێتەکایەوە. ئەگەر زەمینەکە تێڕامانانە نەبێت نامۆبوونی لەش لەبەردەم کەسانی دیکەدا و ڕەهەندی سێیەمی بوونی دەبێت بە ئەزموونێکی لە ناوەڕۆک بـــەدەر؛ دەبێت بە درێژبوونەوەی فاکتۆرێکی زیندوو. هیچ چەمک و زانینێکی ڕاســـتەوخۆ هەڵیناگرێت. حاڵەتی بەبابەتبوونی لەشـــم بۆ

کەسانی دیکە بابەت نییە بۆ من. هەروەها، وەکو بابەت نابێت بە پێکهاتەی لەشم. تەنیا ئەزمونێکی ڕاکردوی لەشـــی منە. بۆ ئەوەی زانینی کەسانی دیکە سەبارەت لەشـــی من و دەربڕینی لە ڕێگەی زمانەوە بونیادی لەشـــی خۆمـــم بداتێ گرنگە ئەو زانینە بەســـەر بابەتێکدا ســـاخبکرێتەوە و هەمانکات بابەتەکە بۆ من شتێک بێ، کە هەیە. کەوابوو، لەســـەر زەمینەی تێڕامانێکی ئاگامەندانە زانینی کەسانی دیکە دەکەوێتەگەر. ئەم زەمینەیـــەی بە چەمککردنەیە لەنێوان نیمچە-بابەتێک و تێڕامانی ئاگامەندانەدا دەتوانێت بابەتێکی دەروونی نیمچە-لەشـــی دروســـتبکات. تێڕامان، بەوجۆرەی بینیمان، فاکتۆر دەناسێتەوە و بەرەو شتێکی نا-ڕاستەقینەش تێپەڕیدەکات، کە ناوەڕۆکەکەی بابەتێکی هەســـتپێکراوی ڕووتە و کەســـانی دیکە دەیکەن بە لەشـــێکی ســـایکۆلۆجییانە. بە کورتییەکەی، ئێمە لەشـــی خۆمان بە تێڕامان دەکەین بـــە نیمچە-بابەتێک و دەروانینە بوونی خۆمان. بەڵام ئەو کاتەی ڕاســـتەوخۆ لەش دەبینین و دەیناســـین، ئێمە بە هۆکاری ناسینە ڕاستەوخۆکە و زانینی کەســـانی دیکەوە، (کە ئێمە ناتوانین بەبێ ئەوان ئەم زانینەمان هەبێت)، پێکی دەهێنین. بونیادی زانینی لەشـــە ســـایکۆلۆجییەکەمان، کەوابوو بەردەوام ئاماژە بۆ نامۆبوونێکی لە ناوەڕۆک بەدەردەکات.

بۆ ئـــەوەی لەنێو نامۆبوونە لە نـــاوەڕۆک بەدەرەکەدا نەژیـــن، ئێمە فاکتۆرە زیندووەکانمـــان تێپەڕ دەکەیـــن و ڕوو دەکەینە ئەم نیمچە-بابەتە، کە لەشـــێکی ســـایکۆلۆجییانەیە. لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆنموونەی ئـــازاری لەش. زانیمان چۆن تێڕامان بە ئازاری لەش نەخۆشی پێکهێنا. بەڵام پێویست بوو لەنیوەی باسەکەماندا ڕاوەستین چونکە ڕێگەیەکمان نەبوو لەسەری بەردەوام بین. ئێستا دەتوانین لەسەر ئەم خاڵە زۆرتر بڕۆین. ئەو نەخۆشـــییەی گرتومە بوون-لەنێو-خۆیە؛ واتە، شتێکە بۆ کەسانی دیکەشە. من ئەمە دەزانم، لەو ڕەهەندی بوونەشەوە تەماشایدەکەم، کە لە من ڕادەکات و ڕوو لە کەسانی دیکە دەکات. من دەتوانم چەمکەکان بەکاربهێنم. ئەم چەمکانە لەکەســـانی دیکەوە بە من گەیشـــتون و من بەتەنیا ناتوانم پێکیان بهێنم و بۆ لەشـــم ســـودیان لێوەرگرم. من لە ڕێگەی چەمکـــە بەکارهێنراوەکانی کەســـانی دیکەوە لەشـــم دەناسم. تەنانەت لە تێڕامانیشـــمدا کەسانی دیکە دەور دەبینن. کاتێک تەماشای لەشـــم دەکەم، دەڵێیت من کەسانی دیکەم و تەماشای ئەو بابەتە دەکەم. من لە پەیوەندییەکەم بە ئەوانەوە دەڕوانمە لەشـــم. ئاشکرایە، ئەو کاتیگۆریانەی بۆ نەخۆشـــییەکەم دایاندەنێم ئەو بابەتە بە ڕووتی پێکدەهێنن؛ ئەمـــەش لەو ڕەهەندەدایە، کە لە دەســـتی من ڕادەکات. کەوابوو، بۆچی باســـی زانینی ڕاســـتەوخۆ بکەین؟ هۆکارەکـــەی دەگەڕێتەوە بۆ لەش، کە بووە بە چەقی ئـــەو نامۆبوونـــەی تێپەڕیدەکات. لەش نەخۆشـــییە ڕاکردووەکەیـــە لە من بەرەو هەندێک خەسڵەتی نوێ، کە من بۆ سنووردارکردنی دایاندەمەزرێنم. بۆنموونە، ئەو

نەخۆشییەی بۆ من دەروونییە دەبێت بە نەخۆشی لەنێو گەدەمدا. ئازاری نێو گەدە ئەزمونێکی زیندوی ئازاراوی گەدەیە.

پێش ســـەرهەڵدانی نامۆبوونەکە یان زانینەکە ئازارەکە نیشـــانەیەکی ناوەوە یان ناســـینەوەی [نەخۆشییەکە] نییە. سوتانەوەی گەدە بۆ ئاگامەندی دەبێت بە ئازارێکی ڕووت. بەڵام نەخۆشییەکە لە ئازارەکان و نەخۆشییەکانی دیکەوە جیاوازە. لەم ئاستەدا، ئێمە لەبارەی گەدەوە هیچ دەربڕین و بیریشی لێناکەینەوە. زانینە هەستەکییەکەشـــمان سەبارەت نەخۆشـــییەکە، کە ناوی گەدەمان بۆ دانا، زانینە لەبارەی سروشـــتێکی دەرەکی گەدە. مـــن دەزانم گەدە لە تورەکە دەچێت، چەند شلەیەک دەردەکات، ئەنزیمی تێدایە، ماسولکە چواردەوری داوە و هتد. هەروەها، دەزانم یان لە پزیشـــکم بیســـتوە، کە گـــەدە لەناوەوە برینـــدار دەبێت و وێنەی برینداربوونەکە لە بیرمدا جێگەی خۆی گرتوە. لەوانەیە سوربوونەوە و گەنین بێت؛ لەگەڵ دومەڵ و قنچکە و چڵکی برین بەراوردیدەکەم. من ئەم زانیارییەم لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە دەستکەوتوە. لەوانەیە هەموویان نەخۆشییەکەم پێکبهێنن، کە لە من ڕادەکات. گەدە و برینەکەی ناوی دەبن بە ڕەهەندی ڕاکردنەکە و نامۆبوونەکە لەو بابەتەی من هەمە.

لێرەدا، بەشـــێکی نوێی بـــوون دەردەکەوێت: ئێمە لە ئەزموونـــی ئازارەکەوە بە نەخۆشـــی گەیشتوین. لە نەخۆشییەکەشـــەوە بە دەرد دەگەین،[٦٢] ئەزمونی دەروونی دەرد لەو دەردەوە جیاوازە، کە پزیشـــکەکە باسیدەکات؛ دەرد حاڵەتە. ئێمە[لەم ئەزموونەدا] باسی بەکتریا و لەناوچوونی چەند خانەیەکی لەش ناکەین، بەڵکو لە تێکشکانێکی پیکهاتوو دەدوێین. ئەمشێوەیە لە بنەڕەتدا لە من ڕادەکات. هەندێکجاریش لە ڕێگەی ژانێکی کورت و تیژەوە خۆی بۆ کەسانی دیکە دەردەخات. زۆربـــەی کاتیش دوورەپەرێز بێ ئەوەی کەس بیگاتێ بە شـــاراوەیی دەمێنیتەوە. کەوابوو، کەســـانی دیکە دەتوانن هەســـت بە بوونی بکەن و منیـــش لەبارەیەوە ئاگادار بکەن یان چارەســـەری بکەن. تەنانـــەت ئەو کاتەی منیش لە ئەو بێئاگام کەســـانی دیکە دەتوانن بیناسن. بوونی ئەو بوونێکە-بۆ-کەسانی دیکە. ئەو کاتەی ئازارم نییە، لەبارەیەوە دەدوێم، وەکو بابەتێک باسیدەکەم و لە بابەتێکی دەرەکی دوورەپەرێز دەکات، کە کەسانی دیکە دایاننابێت.

---

٦٢ سارتەر دوو چەمک بۆ(نەخۆشی) دادەنێت. بۆ جیاکردنەوەیان، کە لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزیدا ئاسانە و لە کوردیدا گرانە من چەمکی (دەرد)م بۆ دووەمیان داناوە. بەڵام هەردوو چەمکەکە یەک واتایان هەیە. ئازار دیاردەیەکی نەخۆشییەکەمە و هەموو ئازارەکان (نەخۆشی)یەکە پێک دەهێنن و دیاردەکانی دیکەی نەخۆشییەکە و ئازارەکانیشی پیکەوە دەبن بە (دەرد). دیاردەی نەخۆشی تەنیا ئازار نییە، بۆنموونە لاوازی و کەم خواردن و گۆڕانی گەرمایی لەشیشە.(وەرگێڕ)

کاتێک توشی نەخۆشی جگەر دەبم، شەراب ناخۆم تاکو ئازارم نەبێت.

بەڵام ئامانجی تەواوی من لەمکارەدا تەنیا قەدەغەکردنی ئازارەکە نییە. بەستراوە بە ئامانجەکانی دیکەشەوە، وەکو گوێگرتن لەو پزیشکەی نەخۆشییەکەمی دۆزییەوە و ئاگاداری کردم. کەوابوو، کەسێکی دیکەش لە ئاستی نەخۆشییەکەمدا بەرپرسە. هێشتا ئەو بابەتەی لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە بە من دەگات، خەسڵەتێکی هەیە، کە لە کتوپڕییەکەی کەمدەکاتەوە و منیش لەسەر زەمینەی نەخۆشییەکەوە هەستی پێدەکەم. باســکردنی ئەم بابەتەش مەبەست نییە و نامانەوێت خەسڵەتەکانیشی دیاری بکەین یان ئاماژە بۆ ســەرهەڵدانە کتوپڕییە جادوگەرانەکەی، دەســتەڵاتە ڕوخێنەرەکەی و ئاشــنابوونی لەگەڵ مندا، وەکو دەردێک توشی من بووە ناکەم. ئەوەندە دەڵێم، کە لەنەخۆشیدا لەش دەردەکەوێت: دەبێت بە زەمینە بۆ دەردەکە و زیانی پێدەگات. دەردەکەش دەستەڵاتی ڕوخێنەری خۆی بەسەر ئەودا دەسەپێنێت. گەدەی نەخۆشەکە توشی برین بووە. گەدە شتێکە لەوێدیە؛ من ڕاستەوخۆ هەستی پێدەکەم و بە هۆکاری ئازارەکەوە دەیناســم. من دەزانم ئەو خواردن هەرسدەکات و لە تورەکە دەچێت..هتد. نایبینم، بەڵام دەزانم ئازارەکەم لەوێدایە. هەروەها ئەو دیاردانەش، کە بە هەڵە ناوی (ئیندۆســکۆبی)یان لێدەنێین دەزانم. لەڕاســتیدا، ئازارەکە هیچم ســەبارەت گــەدە پێناڵێت. ئەمەش بەپێچەوانــەی بۆچوونەکەی (سۆلیەر)ەوەیە. بەڵام بە هۆکاری ئازارەکەوە ئەو زانینە دەستکەوتوەم دەیکات بە گەدەیەک-بۆ-کەسانی دیکە و بۆ منیش شێیکی ئامادەنەبووی کۆنکرێتییە. لەسەر ئەو بنەمایەی باســمانکرد، بابەتەکە شــێیکی نامۆیە لە ئازارەکە. لەسەر بنەمای بوونی من، کە ئەو نیم، ناتوانم بەرەو شــتێکی دیکەش تێپەڕیبکەم. بەوشێوەیەی بوون-بۆ-کەسانی دیکە دەبێت بە دێوەزمەی فاکتۆرەکانم. بوون-بەبابەت-بۆ کەسانی دیکەش دەبێت بە دێوەزمەی ڕەهەندی لایەنی ســایکۆلۆجی لەشم. بەهەمانشێوە هێڵنجدانێکــی ڕووت تێپەڕدەکرێت و دەخرێتە ڕەهەندی نامۆبوونەوە. لەشــم، کە بۆ کەســانی دیکەیە بۆ منیش بە فۆرمەکە و ئۆقرەگرتنەکەیەوە ئامادەدەکات. بە دەموچاوێکی قێزاوییەوە، گۆشتە سپییەکەم و دەربڕینەکەمەوە خۆی قوتدەکاتەوە. بــەڵام دەبێت چەمکەکان ئاوەژو دابنێین. هێڵنجدان ئەوەیە و بێ بیرکردنەوە لێی هەبوو. زانینەکەشــم بە کەسانی دیکەی دەگەیەنێت. کەسانی دیکە هێڵنجدانەکەم دەناسن و بە لەشمەوە دەیبینن.

لەگەڵ ئەم تێڕوانینانەدا، باسەکەمان لەسەر خۆدەرخستنەکانی لەشم بە ئاکام دەگات. ئەوەی باســنەکراوە شــێوازی لادەری دەرخســتنەکەیە. من دەستەکانم دەبینم، دەســت لەپشتم دەدەم و بۆنی شیرینییەکەی لەشم دەکەم. لەمحاڵەتەدا، دەســتەکانم بۆ من لەنێو بابەتەکانی دیکەدا دەبن بەبابەت و لەنێو دەوروبەرەکەدا

نابن بە بنکەی ئاماژەکردن. لەگەڵ دەوروبەرەکەدا خۆیان کۆککردوە و ئاماژە بۆ لەشـــم، وەکو بنکەی ئاماژەکردن دەکەن. لەشـــم دەبێت بە بەشێک لە جیهان و دەستەکانیشـــم بە ئامێر. دەتوانم گوێزێک یان بادەمێک بە دەستی چەپ هەڵگرم و بیدەم بە دەســـتی ڕاســـت. دەستم دەبێت بە بەشـــێک لەو ئامێرانەی بەردەوام بەکاریان دەهێنم. هیچ شـــێوازێکی لادەر لەم خۆدەرخســـتنەی لەشمدا نییە، تاکو ئێمە نیگـــەران بکات. دەبێت بزانین ئەمجۆرە تێڕوانینەمان بۆ لەش، لەش دەکات بـــە فاکتۆرێکی ڕووت و هەڵکەوتنێکی ڕەها. ناتوانین لەســـەر بنەمای پێویســـتی لەلایەن بوون-بۆ-خۆوە، کە لەشی هەیە یان لە بونیادی فاکتۆری لەش-بۆ-کەسانی دیکەوە بەرجەســـتەی بکەین. کەسێک دەتوانێت لەشەکان، بەبێ تەماشاکردنی بۆ بوونی خۆی، بناسێت. ئەمە بەسەر مێروەکانیشدا دەسەپێت. هەرچەندە سیستەمی دەماریان جیاوازە و ئەندامی هەستکردنی جیاوازیان هەیە. ئەم سیستەم و ئەندامانە بۆ ناســـینی یەکدی بەکارناهێنن. کەوابوو، ئێمە مامەڵە لەگەڵ بونیادێکی تایبەتدا دەکەین، کە پێویســـتە بەبێ دەرهێنانی بە شێوەیەکی لۆجیکمەندانە، باسبکرێت. هەبوونی دەســـتەکان و هەســـتکردن بە لەشـــی یەکدی بە هۆکاری دەستلێدانەوە دوو فاکتۆرن لەســـەر یەک زەمینەی هەڵکەوتن ڕادەوەستن و دەکەونەبەر ڕۆشنایی مێتافیزیکـــەوە یان ئەنەتۆمییەوە. ئێمە بۆ توێژینەوەکەمان لەســـەر بوونی لەش وەریان ناگرین.

پێویستە ئەوەش بزانین، ئەم خۆدەرخستنەی لەش کردەوە و هەست-کردنەکانی لەش نیشانادەن. تەنیا لەش لەحاڵەتی هەستانی بە کردەوەکە یان هەستکردنەکە دەخاتەڕوو. بەکورتییەکەی، ئێمە لە ســـەرەتای ئەم بەشەدا باسمانکرد، دەکرێت سیســـتەمی بینینێک بناســـین، کە چاوێک دەتوانێت لە ڕێگەیەوە کەسانی دیکە ببینێت. بەڵام چاوە بینەرەکە دەبێت بە شـــت نـــەک بوونێک بۆ ئاماژەکردنەکە. بەهەمانشێوەش، کاتێک دەســـتێکم بە دەستەکەی دیکەم دەگرم ئەوا دەستەکەم ئەوە نییە، کە (دەگرێ)، بەڵکو دەبێت بە بابەتێکی ناســـراو. سروشـــتی لەشمان لەوێدایە، کە لە ئێمە ڕادەکات و ئێمەش دەتوانین بۆچوونی کەسانی دیکەی لەسەر ببینین. لەسەروئەمەوە، پێویستە ئەو خاڵەمان لا ڕوون بێت، کە کاتێک ڕێکخستنی ئەندامەکانی هەستکردن یاریدەمان دەدەن لەشێک بەو شێوەیەی بۆ کەسانی دیکە دەردەکەوێت ببینین، ئەم دەرکەوتنی لەشە، وەکو ئامێر لە تەمەنی دوایی منداڵییدا ســـەرهەڵدەدات. بە هەرشێوەیەک بێت، درەنگترە لە ئاگاییەتی دروست لە لەش و جیهان، وەکو ئامێرە ئاڵۆزەکان؛ درەنگترە لە هەستکردن بە لەشی کەسانی دیکە. منداڵ زوو فێری شتگرتن دەبێت و بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێت یان پاڵیپێوەدەنێت. پێش هەڵگرتنی شتێک و تەماشاکردنی فێردەبێت بیگرێت. دەرکەوتوە منداڵی دوو مانگان دەستی خۆی، وەکو دەست نابینێت. ئەو تەماشای دەستی دەکات و سەری

بەلایـــدا دەجولێنێت و بەبێ ئەوەی بزانێت، کە دەتوانێت دەســـتی لە خۆی نزیک بکاتەوە. پاش زنجیرەیەک کردەوەی دەروونی و تێهەڵکێشـــکردنیان و ناســـینەوە منداڵ فێردەبێت پەیوەندی لەنێوان لەشی خۆی و لەشە بینراوەکەدا هەڵبەستێت. دووبارە پێویســـتە منداڵ لەڕێگەی لەشی کەسانی دیکەوە پرۆسەی فێربوونەکەی دەستپێبکات. کەوابوو، هەستکردن بە لەشم لەنێو کاتدا دەخرێتە پاش هەستکردن بە لەشی کەسانی دیکە.

لەگەڵ ڕەچاوکردنی شوێن و کاتی گونجاوی هەڵکەوتنەکەدا، خۆدەرخستنەکەی لەش گرفتمان بۆ پەیداناکات. لەش ئەو ئامێرەیە، کە منم؛ فاکتۆری بوونی منە لەنێو هەموو شتەکانی جیهاندا. منیش بەرەو جیهان ئەم فاکتۆرە تێپەڕدەکەم. هەڵبەتە ناتوانم ڕادیکاڵانە بۆچوونێکی جیهانگیریم لەســـەر فاکتۆرەکە هەبێت. لەمحاڵەتەدا دەبێـــت من لەش نەبم. بەڵام بۆچی جێگەی سەرســـوڕمان بێت ئەگەر بونیادێکی دیاریکراوی لەشم، بەبێ ئەوەی شوێنی خۆی، وەکو بنکەی ئاماژەکردن بۆ بابەتەکانی نێو جیهان بدۆزێنێت، لە بۆچوونێکی ڕادیکاڵانەوە دەردەچێت؟ بە سروشت مەحاڵە چاوم خۆی ببینێت. بۆچی جێگەی سەرســـوڕمان بێت، کە دەســـتم بەرچاوەکانم دەکەوێت؟ سەرســـوڕمانەکەمان هۆکاری ئەوەیە، کە ڕیگەیەکی پێویســـتیمان بۆ بوون-بۆ-خۆ دۆزیوەتەوە تاکـــو بۆچوونێکی کۆنکرێتی بۆ جیهان هەبێت. ئەمەش پێویستی و هەڵکەوتنی بابەتێک لەنێو جیهان بە ئێمە دەناسێنێت.

# بەشی سێیەم

## پەیوەندییە کۆنکرێتییەکان لەگەڵ کەسانی دیکە

تاکو ئێرە باســـی پەیوەندییەکی بنەڕەتیمان لەگەڵ کەســـانی دیکەدا کردوە. ئەم پەیوەندییەش سێ ڕەهەندی بوونی لەشمانی بۆ دەرخستین. مادام پەیوەندی بنەڕەتـــی لەگەڵ کەســـانی دیکـــەدا یەکەمجار، لە پەیوەندی نێوان لەشـــی من و لەشی ئەواندا ســـەرهەڵدەدات، ئەوا زانیم لەبارەی سروشتی لەشمەوە بۆ ناسینی پەیوەندییە تایبەتییەکانم لەگەڵ کەســـانی دیکەدا پێویســـت بـــوو. پەیوەندییە تایبەتییەکان لە هەردوو سەرەوە لەسەر زەمینەی فاکتۆرێکی لەپێشتر ڕادەوەستن؛ واتە بوونی ئێمە وەکو لەشـــەکان لەنێو جیهاندا. ئەمەش ئەو واتەیە نابەخشـــێت، کە لەشـــم ئامێرە و بۆ پەیوەندییەکانم لەگەڵ کەســـانی دیکەدا دەبێت بە هۆکار. بەڵکو لەش واتاکانیان پێدەبەخشـــێت و سنورداریشیان دەکان. بە هۆکاری لەش لەنێو بارودۆخدا هەســـت بە بەرزێتییەکەی کەســـانی دیکە و نامۆبوونی خۆشم بۆ بەرژەوەندی ئـــەوان دەکەم. پاش ئەوەی دەزانین لـــەش چییە کاتی ئەوە هاتوە لەم پەیوەندییە کۆنکرێتییانە بکۆڵینەوە. ئەمانەش خەســـڵەتی ســـادە و ساکاری پەیوەندییە بنەڕەتییەکان نین. هەڵبەتە هەر یەکێک لەم پەیوەندییانە لەنێو خۆیدا پەیوەنـــدی بنەڕەتی لەگەڵ کەســـانی دیکەدا، وەکو بناخـــە هەڵدەگرێت، بەڵام بۆ بوون-بۆ-خۆ شـــێوازی نوێی بوونن. هەڵوێســـتی جیـــاوازی بوون-بۆ-خۆ لەنێو ئەو جیهانەدا دەردەخەن، کە کەســـانی دیکەشـــی تێدان. کەوابوو، هەریەکێک لە پەیوەندییەکان دوولایەنییە: بۆ-خۆ-بۆ-کەســـانی دیکە و لەنێو-خۆشیدایە. ئەگەر ئێمە بتوانین پەیوەندییە ســـەرەتاییەکانمان لەگەڵ کەســـانی دیکە لەنێو جیهاندا ئاشـــکرا باســـبکەین بە ئاکامی کارەکەمان دەگەین. لەسەرەتای ئەم نوسراوەشدا ئەو پرســـیارەمان کرد، ئایا پەیوەندییەکانی بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ بوون-لەنێو-خۆدا چین؟ لێرەدا، دەبینین کێشـــەکەمان ئاڵۆزترە. پەیوەندییەکی بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ بوون-لەنێو-خۆدا هەیە، کە بە ئامادەبوونی کەسانی دیکەوە بەستراوە. کاتێک ئێمە ئەم فاکتۆرە کۆنکرێتییە ڕووندەکەینەوە، بە ئاکامەکانیش ســـەبارەت پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی سێ شـــێوازی بوون و بیردۆزەیەکی مێتافیزیکی بۆ بوون بەگشتی دەگەین.

بوونـ بۆـ خۆ، وەکو دەستەلاّتی لەناوبردنی بوونـ لەنێوـ خۆ بوونی خۆی بە (کاتی) دەبینێت و بەرەوپێش ڕەوتدەکات. لەڕاســتیدا، فاکتۆری بوونی خۆی (بۆنموونە، دەبێت شــتێکی دراو، ڕابردوو یان لەش بێت) بەرەو بوونـ لەنێوـ خۆ تێپەڕدەکات. دەتوانیــن ئەمەش بە شــێوەیەکی دیکە و ســایکۆلۆجییانە، هەرچەندە واتاکەی تەواو نابەخشــێت، دەربڕین؛ بڵێین، بوونـ بۆـ خۆ لە دەست ئەم بوونە فاکتۆرییە ڕادەکات (بۆنموونــە، بوونی ئەو لێرەدا بووە بــە بوونـ لەنێوـ خۆ و بناخەی خۆی نییــە). ڕاکردنەکەش ڕوو لە داهاتوویەکــی مەحاڵ دەکات، کە بەردەوام بوونـ بۆـ خۆ دەکات بــە بوونـ لەنێوـ خۆیـ بوونـ بۆـ خۆ. کەوابــوو، بوونـ بۆـ خۆ هەلاّتن و بە دوکەوتنیشــە؛ ئەو لە بوونـ لەنێوـ خۆ هەڵدێت و هەمانکات دوشــی دەکەوێت. بوونـ بۆـ خۆ دوکەوتنیـ وەدوکەوتنە. بۆ ئەوەی مەترسی ڕاڤەکردنی سایکۆلۆجییانە کــەم بکەینەوە، ئاماژە بۆ ئەو خاڵــە دەکەین، کە بوونـ بۆـ خۆ یەکەم، بۆ ئەوەی دووەمــی هەبێت پەنا بۆ بوون نابات. هەروەهــا نابێت بەو هەبووەی دابنێین، کە وەکو پەرداخەکە خەســڵەتی تایبەتی هەیە. هەڵهاتنی وەدوکەوتنەکە نەخراوەتە ســەر بوونی بوونـ بۆـ خــۆ. بوونـ بۆـ خۆ خودی هەڵهاتنەکەیــە و لە ڕەتدانەوەی بنەڕەتی جیانابێتەوە. مەبەســت لە بوونـ بۆـ خۆ، وەکــو وەدوکەوتنیـ وەدوکەوت ئەوەیــە، کە ئەم بوونە ئەو شــتە نییــە، کە هەیە. ئەوەیە، کــە نییە. ئەم دوو دەســتەواژەیە یەک واتایان هەیە. بوونـ بۆـ خۆ بوونـ لەنێوـ خۆ نییە و بە ئەویش نابێت. بەلاّم پەیوەندی بە بوونـ لەنێوـ خۆوە هەیە. لە هەموو لایەکەوە بوونـ لەنێوـ خــۆ گەمارۆیداوە و ناتوانێت ڕزگاری بێــت، چونکە بوونـ بۆـ خۆ هیچە و هیچیش لە بوونـ لەنێوـ خــۆی جیادەکاتەوە. بوونـ بۆـ خۆ بناخــەی هەموو ڕەتدانەوەکان و پەیوەندییەکانە. بوونـ بۆـ خۆ پەیوەندییە. ســەرهەڵدانی کەســانی دیکە ناخی بوونـ بۆـ خــۆ دەپێکێت. ئەوان وەدوکەوتــن و هەڵهاتنەکەی لەنێو بوونـ بۆـ خۆدا دەچەقێنن. بوونـ لەنێوـ خۆ [وەکو باســمانکرد] لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیداوە و ئەمیش ڕادیکالانە ڕەتیدەداتەوە و بەهاکانی خۆی دەسەپێنێت، کەچی هێشتا لەنێو فاکتۆرەکاندا ئیفلیج ڕادەوەستێت.

بــەلاّم، بەلای کەمەوە دەتوانێت بە هۆکاری بە کاتبوونی بوونییەوە هەڵبێت. (هەمــوو)ی کەســایەتییەکەی مەحاڵە و بەردەوامیش خۆی بە شــوێنیکی دیکە دەگەیەنێت. ئێستا، ئەم (هەمووە)یە کەسانی دیکە دەیانەوێت نیشانی ئەوی بدەن. ئەویش لەگەڵ ڕووکردنەکەی بەرەو شــوێنیکی دیکە تێپەڕیدەکات. ئەم هەمووەیە بــە هەمووکراوە. من، بۆ کەســانی دیکە، ئەوەم، کە هەم و سەربەستییەکەشــم بووە بە خەســڵەتێکی بوونم. لەمــڕووەوە، بوونـ لەنێوـ خۆ من دەگرێتەوە، لەنێو داهاتوودا ڕامدەگرێت و هەڵهاتنەکەشم دەبێت بە شتێکی بینراو یان دراو. من ئەم هەڵهاتنە ڕاگیراوە نیم، کە لەدەرەوەی بوونی مندا حوکمی بەسەردا دراوە. لایەنی

دەرەکی هەڵهاتنەکەم، بەو شـــێوەیەی من هەســـتیپێدەکەم نامۆبوونێکە، کە من ناتوانم بیناسم و تێپەڕیبکەم. لەگەڵ ئەمەشدا، لەبەرئەوەی لەنێو ئەزمونی مندایە و ئەو بوون-لەنێو-خۆیەش دیاریدەکات، کە لێی هەڵدێم پێویستە ئاوەڕی لێبدەمەوە و هەڵوێستی بەرانبەر وەرگرم.

ئەمە بنەڕەتـــی پەیوەندییە کۆنکرێتییەکانمە لەگەڵ کەســـانی دیکەدا؛ ئەوان بەتەواوی بە هەڵوێستەکانی منەوە بەرانبەر ئەو بابەتەوە بەستراون، کە منە و بۆ ئەوانە.

مادام بوونی کەسانی دیکە بوونی من دەکات بەوەی نەتوانم هەمبێت و تەنانەت تێی بگەم، ئەم بوونە دەبێتە سەرچاوەی دووهاندەر: یەکەم، کەسێک تەماشای من دەکات و نهێنی بوونـــم دەدۆزێتەوە. ئەو دەزانێت من چیم. کەوابوو، واتای بوونم لەدەرەوەی مندایە و لەنێو ئامادەنەبووندا گیریخواردووە. کەســـەکە دەستی باڵای لەسەر من هەیە.

کەوابـــوو، بەو ڕادەیەی مـــن لەو بوون-لەنێو-خۆیە هەڵدێـــم، کە بوونی خۆمە و دامنەمەزرانـــدووە دەتوانم نکۆڵی بکەم. منیش دەتوانم ڕوو لە کەســـەکە بکەم و بیکـــەم بەبابـــەت. بەبابەتکردنی ئەو بەبابەتبوونی من لـــەلای ئەو لەناودەبات. لەلایەکی دیکەوە، مادام سەربەســـتی ئـــەو بناخەی بوون-لەنێو-خۆی منە دەتوانم سەربەســـتییەکەم بدۆزمەوە و منیش بەکاری بهێنم. ئەگەر من سەربەســـتییەکەم بدۆزمـــەوە دەتوانـــم ببم بە بناخەی بوونی خۆم. تێپەڕکردنی بەرزێتی کەســـێکی دیکە یان بەپێچەوانەوە تێهەڵکێشـــکردنی بەرزێتییەکە لەگەڵ بوونی خۆمدا، دوو هەڵوێستی ئەرێ بەرانبەر کەسەکە دیاریدەکات.

لێرەدا، پێویســـتە واتای تەواوی ئەم چەمکانە تێبگەین. ڕاست نییە بڵێین، من یەکەمجار هەم و لەدواییدا هەوڵدەدەم کەسەکە بکەم بەبابەت: سەرهەڵدانی بوونی من لەگەڵ ســـەرهەڵدانی بوونی کەســـانی دیکەدایە. من، لە ڕەگوڕیشەی بوونمدا، پرۆژەی بەبابەتکردنی کەســـانی دیکەم هەڵگرتوە. مـــن بەڵگەم بۆ بوونی ئەوان. ئەم بەڵگەیەش هەڵوێســـتە بەرانبەر کەسانی دیکە. من ناتوانم لەبەردەم کەسانی دیکەدا ئامادەبم، ئەگەر ئامادەبوونەکەم لەبەردەم ئەواندا نەبێت. ئەمەش بونیادی بوون-بۆ-خۆ دەردەخات. هەرچەندە ئامادەبوونی کەسانی دیکە لەنێو جیهاندا ڕەها و بەڵگە نەویستە، هێشتا فاکتۆرێکی هەڵکەوتووە. فاکتۆرێکە مەحاڵە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆوە دەربێت.

ئـــەم دوو هەوڵدانەی، کە منن، دژانە بەرانبەر یەکدی ڕادەوەســـتن. هەریەکێک لـــە ئەوان مەرگی ئەوی دیکەیە. ســـەرنەکەوتنی یەکێکیـــان دەبێت بە هاندەر بۆ ســـەرهەڵدانی دووەمیـــان. کەوابوو، لە پەیوەندییەکەمدا لەگەڵ کەســـانی دیکەدا دیالێکتیـــک نییە. هەرچەندە نەمانی یەکێکیان ئـــەوی دیکە دەوڵەمەندتر دەکات،

بـــەڵام [جولانەکە] خولانەوەیە. لەبەرئەمە دەبێـــت هەریەکێک لە هەوڵدانەکان بە تەنیا بناسین.

لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئەو خاڵە ڕەچاونەکەین، کە لە ناخی هەریەکێک لەم دوو هەڵوێســـتەدا ئەوی دیکەش ئامادەیە. هیچ کامیان بەبێ ناکۆکی نییە. هەریەکێک لـــە ئەوان لەنێو ئەوی دیکەدایە و کۆتایی بە بوونی دەهێنێت. کەوابوو، لەنێو ئەم خولانەوەیە دەرناچین. نابێت لە توێژینەوەکەماندا لەســـەر هەڵوێستی بنەڕەتیمان بەرانبەر کەسانی دیکە، ئەم خاڵانە فەرامۆش بکەین.

مادام ئەم هەڵوێستانە لەنێو خولانەوەکەدا پەیدادەبن و دەفەوتێن، دەگونجێت لە یەکێکیانەوە دەستپێبکەین. مادام دەبێت یەکێکیان بۆ دەستپێکردنەکە هەڵبژێرێن، لەو هەڵوێســـتەوە دەکەوینە ڕێ، کە بوون-بۆ-خۆ تیایدا سەربەستی کەسانی دیکە دەچوێنێ.

## ١- یەکەم هەڵوێست بەرانبەر کەسانی دیکە: خۆشەویستی، زمان و ماسۆچیزم

هەرشـــتێک لەبارەی منەوە لە پەیوەندییەکەمدا لەگەڵ کەسێکی دیکە بگوترێت لەبارەی ئەویشەوەیە. کاتێک خۆم لە دەستی کەسێکی دیکە ڕزگاردەکەم، ئەویش دەیەوێت خۆی لە من ڕزگاربکات؛ ئەو کاتەی دەمەوێت داگیریبکەم ئەویش دەیەوێت مـــن داگیربکات. هەردووکمان پێکەوە مامەڵە لەگەڵ بابەتێک لەنێو-خۆدا دەکەین؛ بـــەڵام مامەڵە کردنەکـــە لەهەردوو لاوەیە. ئەم ڕوونکردنەوەیەی بۆ هەڵوێســـت و ڕەفتاری کۆنکرێتی دەیکەین پێویستە بخرێتە بەر ڕۆشنایی بەرەنگاری. بەرەنگاری واتای بنەڕەتی بوون-بۆ-خۆیە.

ئەگەر لەو خاڵەوە دەســـتپێبکەین، کە گوتمان کەسانی دیکە لە تەماشاکردندا دەردەکەون، دەبێت بزانین بوونی خۆمان لە شێوازی خاوەنێتیدا دەکەین بە بوون-بۆ-کەسانی دیکە. ئەوان دەبن بە خاوەنی بوونی من؛ تەماشاکردنی کەسەکە لەشم بە ڕووتی دەبینێت. ئامادەیی پێدەدات، دەیکات بە پەیکەر و بەوەی، کە هەیە؛ بەو شێوەیە دەیبینێت، کە من هەرگیز ناتوانم بیبینم. کەسەکە نهێنییەکی لایە و ئەو نهێنییە منم، کە بەو شێوەیە هەم. ئەو من دەکات بەوەی هەم و داگیرم دەکات.

ئەم خاوەنێتییەش ئاگاییە لەوەی، کە ئەو خاوەنی منە. من، لەحاڵەتی بوون-بەبابەتدا ئاگاییەکەی ئەو دەسەلمێنم. ئاگاییەکەی ئەو بوونی من ڕووتدەکاتەوە و لە منی دەدزێ. بوونێک 'لەوێدا' دەهێنێتەکایەوە، کە بوونی منە. من لەم بونیادە ئۆنتۆلۆجییە تێدەگەم: من لە ئاســـتی بوونمدا-بۆ-کەســـانی دیکە بەرپرسم، بەڵام بناخەی نیم. کەســـێکی دیکە بوونی من 'لێرەدا' بەو شێوەیەی هەیە دەدۆزێتەوە.

بـــەڵام ئەو هەرچەندە  دۆزیوێتییەوە، لە بوونی مـــن بەرپرس نییە. کەوابوو، بەو ڕادەیەی من دەیزانم لە بوونم بەرپرســـم و من خۆم دەکەم بە خاوەنی ئەو بوونە. دەمەوێت بیدۆزمەوە یان دۆزینەوەکە بکەم بە پرۆژە. دەمەوێت دەســـت درێژکەم، وەکو خواردنی ئێوارەی (تەنتالۆس) بیگرم و بەلای خۆمدا ڕایکێشـــم.[٦٣] دەمەوێت سەربەستانە بیدۆزمەوە.

ئەگەر بوونم وەکو بابەت هەڵکەوتێکی تاڵ و داگیرکردنێکی تەواو بێت، هێشتا ئەم بوونەم ئاماژە بۆ دۆزینەوەی ئەو بوونەم دەکات، کە دەبێت بە بناخە بۆ خۆی. ئەمەش لەگەڵ وێچواندنی سەربەســـتی کەســـانی دیکەدا دێتە پێش. پرۆژەی خۆ دۆزینەوەکەم، کەوابوو، لەبنەڕەتەوە پرۆژەی توانەوەی کەســـانی دیکەیە. لەسەرو ئەمەشەوە، دەبێت بوونی کەسانی دیکە بپارێزرێت. ئەمەش دوو ئاکامی لەدوایە:

یەکەم، من بەردەوام بۆ جەختکردن لەســـەر بوونی کەسانی دیکە دەمێنمەوە و خۆم بە ئەوان دانانێم. مادەم کەســـانی دیکە بناخەی بوونی منن بەبێ لەناوبردنی بوونم-بۆ-کەسانی دیکە ئەوانیش گوم نابن. کەوابوو، ئەگەر دەست بدەمە پرۆژەی یەکگرتنم لەگەڵ کەسانی دیکەدا ئەوا دەبێت وێچواندنی خۆم لەنێو ئەواندا، وەکو کەســـانی دیکە بکەم بە ئەگەرێکی خۆم. لەڕاســـتیدا، کێشەکە بۆ من لەوێدایە من بوونم بەرجەســـتە بکەم و بۆچوونی کەســـێکی دیکەش بۆ خۆم بکەم بە ئەگەر. ئەمەش وەدەســـتهێنانی تەواناییەکی ڕووت و ڕەوانی زانین نییە. کاتیگۆری ڕووتی کەسانی دیکە نییە، کە من لە پرۆژەکەمدا بەکاریدەهێنم. ئەم کاتیگۆرییە ناناسرێت. لەسەر زەمینەی ئەزمونە کۆنکرێتییەکان لەگەڵ کەسانی دیکەدا، ئەوان ئەو لایەنە کۆنکرێتییەن دەبن بە داکەوتێکی ڕەها. منیش دەمەوێت بیخەمەسەر بوونی خۆم.

دووەم، ئەو کەســـەی دەمەوێت بیخەمە سەر بوونم، وەکو بابەت نییە. پرۆژەی گەڕانەوە بۆ بوونم لە بابەتەوە لەســـەر بەبابەتکردنی کەسانی دیکە ڕاناوەستێت. بەپێچەوانـــەوە، مـــن دەمەوێـــت ئەو-کەسەی-تەماشـــای-من دەکات بخەمە نێو وێچواندنەکـــە. ئەمـــەش ئاماژە بۆ بوونم بەو شـــێوەیەی تەماشـــایکراوە دەکات. بەکورتییەکەی، بۆ مەبەســـتی هێشتنەوەی سەربەستی کەسەکەی تەماشامدەکات بوونم بەوەدادەنێم، کە تەماشاکراوە. مادام بوون-بەبابەت تەنیا ڕێگەیەکی گونجاوە بۆ پەیوەندی نێوان من و کەسێکی دیکە ئەوا ئەم بوونەشە، وەکو بابەت وێچواندنی سەربەستی کەسەکەم لا دەگونجێنێت.

وەکو وەڵامدانەوەیەک بۆ ســـەرنەکەوتنم لە دەرچوونی ســـێیەمدا، بوون-بۆ-خۆ

٦٣  تەنتالۆس لە ئەفسانەی یۆناندا یەکێکە لەوانەی، وەکو (ئیکسیۆن، سێزیف، تیتیۆس) خواکان بۆ هەمیشە سزایان داون. گوایە تەنتالۆس لە خواکانەوە نزیک بووە و لەگەڵیاندا ئێواران خواردنی (خوایانە)ی خواردووە. پاش ئەوەی لەو خواردنە بەشێکی بۆ مرۆڤ دزیوە. خواکان دەریانکردووە و بۆ هەمیشە لە دۆزەخ دانراوە. (وەرگێڕ)

دەیەوێت خۆی بە سەربەستی کەسەکە و بناخەی بوون-لەنێو-خۆی دابنێت. بوون بە کەسێکی دیکە، کە هەمیشە دەیەوێت ببێت بە کەسێکی کۆنکریتی-بەهای پەیوەندییەکەم لەگەڵ کەسێکی دیکەدا. واتە، بوونێکی ڕەها، کە دەبێت وەکو خۆی و کەسانی دیکەش بێت، بووە بە دێوەزمەی بوونم-بۆ-کەسانی دیکە. ئەمەش، وەکو بەڵگەی ئۆنتۆلۆجییە بۆ بوونی خوا. ئەم کێشە بیرۆکەییە بەبێ دەرچوونم بەرەو کەسانی دیکە و پەیوەندیم لەگەڵیاندا نایەتە نێو داکەوتەوە. ئەم ڕاسییەش ڕەچاوناکرێت. ڕاستییەکە بەستراوە بە پەیوەندییەکانم بە کەسێکی دیکەوە. ئەمەش لە پەیوەندی نێوان لەشم و جیهان دەچێت. یەکگرتن لەگەڵ کەسێکی دیکەدا، کەوابوو، نازانرێت. تەنانەت لەنێو بیردۆزەشدا نییە چونکە توانەوەی بوون-بۆ-خۆ و کەسێکی دیکە لەنێو یەک بەرزێتیدا دەبێتە هۆکاری لەناوبردنی خەسڵەتەکانی لایەنە بێگانەکە لەنێو کەسەکەدا. ئەو مەرجەی لەیەکچوونی کەسێکی دیکە و خۆمی پێڕادەگرم ئەوەیە، کە من لەگەڵ نکۆڵی کردنەکەم لەوەی من کەسەکەم، دەمێنمەوە. لەکۆتاییدا، پڕۆژەکەم بۆ یەکگرتن دەبێت بەسەرچاوەی بەرەنگاری. گرنگیشە، مادام بوون-بۆ-کەسانی دیکە دوو ڕەتدانەوەی تێدایە، ڕەتدانەوەی ناوەکی بکەوێتەگەڕ و کەسەکە بە بەرزێتییەکەی خۆی بەرزێتییەکەی من ڕەتبکات. من بکات بە بوونێک بۆ ئەوان؛ لەسەر سەربەستی ئەوان کاربکات. ئەم بیرۆکەیەی پڕۆژەکەم لەبەردەم ئەواندا خۆشەویستی نییە. خۆشەویستی پڕۆژەیە؛ بۆنموونە دامەزراندنێکی ئۆرگانێکی پڕۆژەکانمە بەرەو ئەگەرەکانم. بەڵام خۆشەویستییەکی بیرۆکەییە. هاندەر و کۆتاییەکەی و بەهاکەشی بیرۆکەییە. خۆشەویستی، وەکو پەیوندییەکی سەرەتایی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بۆ ناسینەوەی ئەم بەهایە دامەزراندنی پڕۆژەکانە. پڕۆژەکان ڕاستەوخۆ بەرانبەر سەربەستی کەسانی دیکە ڕامدەوەستێنن. لەم ڕووەوە خۆشەویستی دەبێت بە بەرەنگاری. ئێمە زانیمان، کە سەربەستی کەسانی دیکە بوو بە بناخەی بوونم. بەڵام مادام بوونم لەسەر سەربەستی کەسانی دیکە دادەمەزرێت ئەوا بێ ئاسودەیی دەژیم؛ بوونم لەمەترسیدایە. سەربەستییەکە شێوەی بوونم لە قاڵب دەگرێت و دەمکات بەوەی هەم؛ بەهاکان بە سەرما دەسەپێنێت، لایان دەبات؛ منیش بەردەوام لەدەست ئەو بوونەی خۆم ڕادەکەم. ئەم سەربەستییە بێ دەربەستە، دوورەو لەنێو هەزار شێوازی بووندا ڕامدەگرێت. پڕۆژەی خۆ دۆزینەوەکەم لەوێدایە من ئەو سەربەستییە بگرم و بەرانبەر سەربەستییەکەی خۆم دایبنێم. هاوکات ئەمە تەنیا ڕێگەیەکە من بتوانم بە هۆکاری ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی سەربەستانە ئەو بوونەی خۆم ڕەتبدەمەوە، کە کەسانی دیکە بەبابەتیان کردوە. ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی لێکچونەکانی نێوان من و کەسانی دیکە لە داهاتوودا. ئەمەش چاکتر ڕووندەبێتەوە ئەگەر سایکۆلۆجییانە لێی بکۆڵینەوە.

بۆچی دلدارێک دەیەوێت بەرانبەرەکەی خۆشیبوێت؟ ئەگەر خۆشەویستی

ئارەزوویەکی ڕووت بۆ داگیرکردنی لەش بێت، بە ئاسانی دەتوانێت خۆی تێربکات. پاڵەوانی پرۆسـت، بۆنموونە، خۆشەویسـتەکەی لە ماڵەوە دادەنێت و هەرکاتێک یان ڕۆژێـک بیەوێت دەیبینێ و داگیریدەکات. ئەو بەتەواوی لە ڕووی ئابوورییەوە پشـت بە[پاڵەوانەکە] دەبەستێت و لەملایەنەوە بێخەمە. بەپێچەوانەی ئەویشەوە، پاڵەوانەکە بەردەوام دوودڵە. لە ڕێگەی بیرکردنەوەوە ئەو کاتانەی بەرانبەر یەکدیش دانیشتون ئەلبێرتین دەتوانێت لە مارسێل رابکات. لەبەر ئەمەیە ئەو کاتە [مارسێل] دڵخۆشـە، کە [ئەلبێرتین] دەخەوێت و ئەمیش تەماشـای دەکات. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی، کە دڵدار دەیەوێت بیرکردنەوەی خۆشەویستەکەشی داگیربکات. بۆچی ئەمەی دەوێت؟ چۆن دەتوانێت ئەم کارە بکات؟

چەمکی 'خاوەنێتی'، کە زۆرجار واتای خۆشەویستی پێڕووندەکەینەوە، لەڕاستیدا سـەرەکی نییە. بۆچی من بوونی کەسانی دیکە داگیربکەم، ئەگەر کەسانی دیکە نەیانەوێـت من ئـەم کارەبکەم؟ بەڵام ئەمە جۆرێک لە داگیرکردن نیشـاندەدات؛ ئێمە دەمانەوێت سەربەستی ئەوان داگیربکەین. ئەمەش ئارەزوومەندی دەستەڵات نییە. دیکتاتۆر قێز لە خۆشەویسـتی دەکاتەوە و بە ترس ڕازییە. بۆ مەبەستێکی ڕامیاری دەیەوێت خۆشەویستی کەسانی ژێر دەستی مسۆگەر بکات. ئەگەر ڕێگەی ئابـووری زۆرتر بۆ داگیرکردنیـان بدۆزێتەوە بێوەسـتان دەیگرێتەبەر. لەلایەکی دیکەوە، دڵدار نایەوێت خۆشەویستەکەی بە کۆیلە بکات . ئەو نایەوێت ماکینەیەک داگیربکات. کاتێکیش بمانەوێت شـەرمەزاری بکەین دەڵێن، کە خۆشەویستەکەی لەژێر کاریگەرێتییەکی سـایکۆلۆجیدا خۆشـیدەوێت و ناچارە. لێرەدا، دڵدارەکە هەستدەکات، کە بوونی و خۆشەویستییەکەشی نزمکراونەتەوە. ئەگەر (ترستین) و (ئیسۆدە) شێتانە یەکدییان لەبەر خۆشەویستی خۆشبوێت، ئەوەندە سەرنجڕاکێش نابن. بەکۆیلەکردنێکی تەواوی خۆشەویستەکە خۆشەویستی لەناودەبات. کۆتایی بە خۆشەویستییەکە دهێنێت. ئەگەر خۆشەویستەکە ببێت بە مەکینە دڵدارەکە تەنیا دەمێنێتەوە. لەبەرئەم هۆکارە دڵدارەکە نایەوێت بەوجۆرەی شـتێک داگیردەکات دەست بەسەر خۆشەویستەکەیدا بگرێت؛ داگیرکردنەکە شێوازێکی جیاوازی هەیە. ئەو دەیەوێت سەربەستی، وەکو سەربەستی داگیربکات.

لەلایەکی دیکەوە، دڵدارەکە بە سەربەستییەکی بەرزتر و پەیوەندییە بەربڵاوەکان ڕازی نییە. کێ بە سـوێندخواردن بۆ وەفادارییەکـی ڕووت ڕازییە؟ کێ دڵی بەو وشـانە خۆش دەبێت، کە دەڵێت، "من سەربەستانە تۆم خۆشدەوێت و لە بەڵێنم پەشیمان نابمەوە." دڵدارەکە داوای بەڵێن دەکات و پێشی ناخۆشە. ئەو دەیەوێت سەربەسـتانە خۆشـیبوێت، بەڵام لەگەڵ داواکارییەکەدا دەیەوێت سەربەستییەکە سەربەسـت نەبێت. ئەو دەیەوێت سەربەستیی کەسـەکە ببێت بە خۆشەویستی. ئەمەش تەنیا لەسەرەتادا ڕوونادات و هەمووساتێک سەرهەڵدات. هەروەها دەیەوێت

سەربەستییەکە، وەکو لەشێتییدا یان لەنێو خەوبینیندا خۆی بگرێت. خۆگرتنەکەش بڕیاردانێک بێت سەربەستانە و ناسەربەستانەش. لە خۆشەویستیدا سۆزفەرمانڕەوایی ناکات و داوای سەربەستییەکی دوور ناکات؛ بەڵکو ئەو سەربەستییەمان دەوێت، کە دەستمان دەیگاتێ و دەبێت بە بناخەش بۆ فەرمانڕەواییکردنی سۆز. دڵدارەکەش نایەوێت لە سەربەستییەکەدا ببێت بە هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە، بەڵکو خاوەن شوێنێکی تایبەت.

لە خۆشەویستیدا دڵدار دەیەوێت بۆ خۆشەویستەکەی ببێت بە "هەموو جیهان". ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو واتا و هێماکان بۆ جیهان دادەنێت. دڵدارەکە (ئەو)ەیە، کە هەموو ئەوەکانی دیکەی تێدایە. ئەو ئەوەیە و ڕازیش بووە ببێت بە بابەت. هەمانکات دەیەوێت ئەو بابەتە بێت، کە کەسەکەی دیکە سەربەستییەکەی خۆی لەسەر دەدۆڕێنێت. بابەتێک، کە کەسەکەی دیکە پێی ڕازی بێت و فاکتۆری خۆی تێدا بدۆزێتەوە، لە هەموو شوێنێکدا حەزی لە سەربەستییەکەی ئەوە. لە هەڵبژاردنی کۆتاییەکدا دڵدارەکە حەزدەکات کۆتایی هەڵبژێرێت. ئەمە داواکارییەکەی دڵدار لە خۆشەویستەکەیەوە ڕووندەکاتەوە. ئەو نایەوێت کار لەسەر سەربەستی خۆشەویستەکەی بکات، بەڵکو بوونێکی لەپێشتری بۆ سنوردارکردنی سەربەستییەکە هەبێت. ئەوەی دڵدارەکە داوایدەکات کەمکردنەوە و چەسپاندنی سەربەستییەکەیە بە دەستی خۆی. سنوردارێتی بونیادی سەربەستییەکە شتێکی دراوە. لەنێو ئەو بونیادەدا سەربەستییەکە ڕێگەی دەرچوون لە خۆی دەگرێت. دڵدارەکەش ڕێگەگرتنەکە دەبینێت و هەستی پێدەکات و ڕازیش دەبێت.

ئێستا، لە واتای داواکارییەکە تێدەگەین: فاکتۆرە سنوردارەکەی بۆ کەسانی دیکەیە و لە داواکارییەکەی مندا خۆشەویستییە لە کەسانی دیکە. بەو ڕادەیەی من ئەو بابەتەم کەسانی دیکە دەیهێننەکایەوە، ئەوا منیش سنورداریتی بەرزێتی ئەوانم تێدایە. کەوابوو، سەرهەڵدانی کەسەکەی دیکە من دەکات بە ڕەها و تێنەپەڕکراو؛ نەک وەکو بوونـ بۆـ خۆیەکی ڕووخێنەر بەڵکو بوونـ بۆـ کەسانی دیکەـ لەنێوـ جیهاندا. کاتێک داوای خۆشەویستی لە کەسانی دیکە دەکەین، توشی فاکتۆری بوونی خۆیان دەبن؛ زۆریان لێدەکرێت ئێمە بەردەوام بکەن بە مەرج بۆ سەربەستییەک، کە خۆی سنوردار دەکات. حەزێک، کە سەربەستی لەسەر فاکتۆر و فاکتۆریش بەسەر سەربەستییەوە دەچەسپێنێت. ئەگەر بەم کۆتاییە بگەین ئەوا بوونی من لەنێو بیرکردنەوەی کەسەکەی دیکەدا دەپارێزرێت. یەکەم، چونکە هاندەری شەرمکردنەکەم و بێ ئارامییەکەم لەوەدایە من هەست بە بوونم، وەکو بوونـ بۆـ کەسانی دیکە دەکەم و ئەوان دەیگەنێ؛ حوکمی بەسەردا دەدەن و دەیکەن بە ئامێر. هۆکاری بێ ئارامییەکەم سەربەستییە بێ سنورەکەی ئەوانە، کە من دەکات بەوەی هەم. "خوا دەزانێت من بۆ ئەو چۆنم! خوا خۆی دەزانێت

چـــۆن بیر لە من دەکاتەوە.“ واتە، “خوا خۆی دەزانێت من بەچی بکات.“ من لەو بوونە دەترسم ڕۆژێک بەرەوڕووی ببمەوە، بوونێک، کە بۆ من بێگانەیە و هەمانکات بوونی منیشە.

بەڵام ئەگەر کەسێک منی خۆشبوێت ئەوا من دەبم بەو بوونەی تێپەڕناکرێم؛ واتە دەبـــم بە کۆتاییەکی ڕەها. لەمحاڵەتەدا من ناکرێم بە ئامێر. بوونم لە نێو جیهاندا دەبێت بە پەیوەندی بەرزێتی بە خۆمەوە چونکە ســــەربەخۆییەکەم پارێزراوە. من بۆ کەسەکە دەبم بە بابەتێکی بەرز و بنەکەی ئاماژەکردنەکان و هەموو ئامێرەکانی دیکە لەدەوریدا کۆدەبنەوە. هەمانکات، وەکو سنورداریێتییەکی ڕەهای سەربەستی، بۆنموونە، وەکو سەرچاوەیەکی ڕەهای بەهاکان، من بەرانبەر لەناوبردنی بەهاکاندا پارێزراوم. من دەبم بە بەهایەکی ڕەها. من خۆم بۆ کەسەکەی دیکەی ئامادەدەکەم و دەبم بە بەها. کەوابوو، لەگەڵ داواکردنی خۆشەویســـتی دەمەوێت خۆم بەودیو سیســـتەمی بەهاکان بگەیەنم، کە کەسێکی دیکە دایدەنێت. من دەبم بە مەرج بۆ هەموو بناخەیەکی دەرەکی بەهاکان. ئەم داواکارییە ناوەڕۆکی باســـکردنە لەنێوان دوو خۆشەویستدا. لە La Porte Etroite ئەو ژنەی دەیەوێت کەسێک خۆشیبوێت، خۆی بە خاوەن ڕەوشتێکی سادە دادەنێت. لەسەرو ئەمەوە دەیەوێت شتێکی زۆرتر ڕوویدات و خۆشەیســـتەکەی بۆ ئەو قوربانی بە ڕەوشتە کۆنەکانی بدات. دەیەوێت بزانێت، کە خۆشەویستەکەی بۆ ئەو خیانەت لە هاوڕێکانی دەکات، دزی بۆ دەکات یان کەسێکی بۆ دەکوژێت...هتد.

لەم بۆچوونەوە، پێویســـتە خۆم لە تەماشاکردنی خۆشەویستەکەم دەربازبکەم یان ببـــم بە بابەتێک لەنێو بونیادێکی جیاوازتردا. نامەوێت، وەکو شـــتێک لەنێو شـــتەکانی دیکەی نێو جیهان ببینرێم و جیهان لەسەر بوونی من خۆی دەربخات. مادام بەرجەستەبوونی سەربەستی جیهان پەیدا دەکات، پێویستە من ببم بە مەرج و ســـنورداریێتی بەرجەســـتەبوونەکە. من ببم بە سەرچاوە بۆ بوونی درەختەکان و ئاو، شـــار و دەشتەکان و بیاندەم بە کەسەکەی دیکە تاکو ئەویش لەنێو جیهاندا ڕیزیان بکات. ئەمەش لەوەدەچێت، کە ناوی خێزان لە کۆمەڵگای ژن سالارییدا بۆ ناوی دایکەکان دەگەڕایـــەوە و ئەوانیش بە منداڵەکانیان دەدا. لەلایەکەوە، ئەگەر بمەوێت کەســـێک منی خۆشـــبوێت، دەبم بەو بابەتەی بە هۆکاری ئەوەوە جیهان بۆ کەســـەکەی دیکە هەیە، لەلاکەی دیکەوە، من جیهانم. لە جێگەی ئەوەی (ئەو) شـــتە بم و لە جیهان دابڕێم، دەبم بەو بابەتە بناخەییەی جیهان لەســـەری خۆی لە شـــتەکانی دیکە جیادەکاتەوە. کەوابوو، من بەخۆمدا دەچمەوە؛ تەماشاکردنی کەســـەکەی دی من ســـنوردار و ئیفلیج ناکات. بوونم لەنێو چییەتییەکی نەگۆڕدا ناچەقێنێت. بە ناشرین نابینرێم، بچوک نیم، ترسنۆک نیم، چونکە ئەم خەسڵەتانە فاکتۆرن و بوونم سنوردار دەکەن. ئەگەرەکانم دەبن بە ئەگەری بەرز، مردو: بەڵام

من خاوەنی هەموویانم. من هەموو ئەگەرە مردووەکانم لەنێو جیهاندا؛ هەروەها ئەو بوونەش نیم کەسانی دیکە دەیبینن و تێیدەگەن.

لەو خۆشەویستییەدا، کە من دەمەوێت، دەبم بە هەموویەکی ڕەها و سەرچاوەی تێگەیشـــتن لەهەموو هەڵوێســـت و کردەوەیەک. کەســـێک دەتوانێت گوتەیەکی ڕواقییەکان بگۆڕێت و بڵێت، "خۆشەویستەکە لە سێ ڕووەوە سەرکەوتن وەدەست ناهێنێت." بیرۆکەی "وەلی"یەک و پیاوێک، کە داوای خۆشەویستی دەکەن لەوێدا یەک دەگرنەوە، کە هەردووکیان دەیانەوێت ببن بەو بابەتە گشـــتگرەی ئیدراکێکی جیانـــی دەیگاتێ و هەڵوێســـت و کردەوەی دڵدارەکە یـــان 'وەلی' یەکەش لە نێو جیهاندا بە بەشێک لە بونیادی هەموو ڕاڤەکردنەکە دادەنێت. وەکو چۆن گۆڕانکاری داوای زانایی دەکات، سەربەســـتی کەسەکەی دیکەش دەبێت بگۆڕێ تاکو من بەو حاڵەتە بگەم، کە تیایدا کەسەکە منی خۆش دەوێت.

تاکو ئەم جێگەیە باسکردنەکەمان لە بۆچوونی هیگڵەوە لەسەر پەیوەندی نێوان کۆیلە و خاوەنکۆیلە نزیکە. پەیوەندی نێوان خاوەنکۆیلە و کۆیلەکە لە لای هیگڵ لـــە پەیوەندی نێوان دڵدار و خۆشەویســـتەکەی دەچێت. بەڵام لێکچونەکە لێرەوە زۆرتر نـــاڕوات چونکە بۆ هیگڵ خاوەنکۆیلەکە لابەلا داوای سەربەســـتی کۆیلەکە دەکات. دڵدارەکە، بەپێچەوانەوە، داوای هەموو سەربەستییەکی خۆشەویستەکەی دەکات. ئەگەر بمەوێت کەسێک منی خۆشبوێت ئەوا من سەربەستانە هەڵیدەبژێرم و دەمەوێـــت ببم بە خۆشەویســـت. هەموو دەزانین، لە زمانی خۆشەویســـتیدا بە خۆشەویســـتەکە دەڵێین ئەو کەسەی هەڵبژێردراوە. نابێت ئەم هەڵبژاردنە ڕێژەیی و هەڵکەوت بێت. دڵدارەکە دڵگران دەبێت و هەست بەکەمی دەکات ئەگەر بزانێت لەنێو چەند کەســـێکدا ئەویان هەڵبـــژاردوە [بۆنموونە]دەڵێین، "ئەگەر من بۆ ئەم شـــارە و ماڵی فڵانەکەس نەهاتمایە تۆ منت نەدەناسی و منت خۆشنەدەویست." ئەمە خۆشەویســـتەکە خەمباردەکات. خۆشویســـتییەکەی دەبێت بە شتێک لەنێو ئەوانی دیکەدا. ڕووداوەکە خۆی و فاکتۆری خۆشەویســـتەکەی ســـنورداردەکات. دەبێت بە خۆشەویستی لەنێو جیهاندا، بابەتێک، کە لەسەربوونی لەپێشتری جیهان ڕادەوەستێت. خۆشەویستییەکە بۆ ئەوان هەیە.

ئەوەی خۆشەویستەکە دەیەوێت و باسیدەکات لە چەمکی (چارەنوس)دا واتاکەی دەردەکەوێت. ئەو دەڵێت، "ئێمە بۆ یەکدی دروستکراوین." با واتای ئەمە ڕوونبکەینەوە. ئەو دەزانێت "ئێمە بۆ یەکدی دروســـتکراوین" ئاماژە بۆ هەڵبژاردن دەکات. دەشـــێ هەڵبژاردنی خوا بێت چونکە خوا خاوەنی هەڵبژاردنی ڕەهایە. بەڵام خوا نوێنەرایەتی ســـنوردارکردنێکی دووری داواکارییەکە دەکات. لەڕاســـتیدا، ئەوەی خۆشەویستەکە دەیەوێت ئەوەیە، کە دڵدارەکە بە هەڵبژاردنێکی تەواو یان ڕەهاوە ئەوی بوێت. ئەمەش واتە، بوونی خۆشەویستەکە لەنێو جیهاندا دەبێت بە بوونێکی حەزلێکراو.

سەرهەڵدانی خۆشەویستەکە پێویستە هەڵبژاردنێکی سەربەستی دڵدارەکەبێت. مادام کەسانی دیکە بوونی-من-وەکو بابەت دەردەخەن، ئەوا داوا لە خۆشەویستەکەم دەکەم سەربەستانە بوونی من، وەکو کۆتاییەکی ڕەها هەڵبژێرێت.

کەوابوو، بە فاکتۆربوونم پارێزراوە. من ئەو بوونە، لەودیو بیرکردنەوەیەوە نیم، کە ڕادەکەم. بەڵکو ئەوەیە، کە کەسێکی دیکە سەربەستانە بەرجەستەیدەکات. کۆتاییەکەی بە خودی خۆی بەخشیوە. منیش بوونی ئەوم بە فاکتۆری خۆم پێکاوە. ئەویش سەربەستانە بۆ منی دەگەڕێنێتەوە. ئەو بناخە و کۆتاییەتی. لەبەر ڕۆشنایی خۆشەویستیدا جیاوازتر لە واتای نامۆبوونم و فاکتۆرم تێدەگەم. فاکتۆرەکەم لەبەردەم کەسێکی دیکەدا دەبێت بە ماف. من هەم چونکە ناوم بۆ دانراوە. من هەم چونکە من خۆم ڕێگە دادەنێم. دەمارەکانی خۆشەویستی لەناودەستمدا سودبەخشانە هەن. چەند باشە چاو، برۆ، قژم هەیە و بێ ماندووبون بۆ ئەو حەز و ئارەزووە ماندوونەبووەی کەسەکەی دیکە پەرش و بڵاویان دەکەمەوە. پێش خۆشەویستییەکە لە ئاستی هەموویاندا نائاسایی بووین. ئێستا لەو سەربەستییە ڕەهایەوە هەست بە بچوکترین بەشیدەکەین، کە بوونمان هەمانکات سنورداری دەکات. ئەمە بناخەی خۆشییە، کە لە خۆشەویستییدا پەیدادەبێت. لەگەڵ ئەو خۆشییەدا هەست بە بوونی خۆمان دەکەین. بەهەمانشێوە، ئەگەر خۆشەویستەکەمان ئێمەی خۆشبوێت، ئامادەیە لەنێو سەربەستییەکەمان بتوێتەوە؛ چونکە ئەو بوونە حەزلێکراوەی ئێمە دەمانەوێت بەڵگەیەکی ئۆنتۆلۆجییە بۆ بوون-بۆ-کەسانی دیکە. بوونی دەرەکیمان بوونی ئەوان دەسەلمێنێت. سەربەستی ئەوانیش ئێمە دەدۆزێتەوە. ئەگەر سەرکەوتوانە هەموو سیستەمەکە لەناوەوە هەڵگرین ئەوا دەبین بەبناخە بۆ بوونی خۆمان. ئەمە ئامانجی تەواوی دڵدارەکەیە؛بۆ ئەو خۆشەویستی پڕۆژەیە، بۆنموونە، پڕۆژەی خۆیەتی. پڕۆژەکەش دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی بەرەنگاری. دڵدارەکە خۆشەویستەکەی، وەکو کەسێکی بەبابەتکراو لەنێو کەسانی دیکەدا دەبینێت. لەنێو بەستێنی جیهاندا دایدەنێت و دەیەوێت تێپەریبکات و بەکاریبهێنێت. خۆشەویستەکەی تەماشاکردنە. ئەو ناتوانێت بە بەرزێتییەکەی خۆی ئەو سنوردار بکات و سەربەستییەکەشی نایگرێت. خۆشەویستەکە ناتوانێت ویستی خۆشەویستی هەبێت. دڵدارەکەی دەبێت ئارەزووی بوروژێنێت. لە ئارەزوو وروژاندندا من لایەنی ناوەوەی خۆم بۆ کەسەکە دەرناخەم. لەسەروئەمەشەوە، بە تەماشاکردن کارەکەم دەکەم و لایەنی (خۆ)یی کەسەکە لەناودەبەم. ئەمەیە من دەمەوێت تیایدا بتوێمەوە.

ئارەزوو وروژاندن من دەکات بە حاڵەتێکی بابەتی لەبەردەم کەسانی دیکەدا؛ دەمخاتە بەر تەماشاکردنەکەی و ئەویش دەڕوانێتە من. من فرێدەداتە نێو مەترسی بینینەوە. منیش ئەو حاڵەتە ڕەتدەدەمەوە، کە بوون بەبابەتی من دەسەلمێنێت.

لەنێو ئەم حاڵەتەدایە بۆ ئەوەی خۆم بە بابەتێکی سەرنج ڕاکێش بکەم، جەنگەکە ڕوودەدات. ئێمە لە بەشـــی دووەمی[ئەم نوسراوەدا] ئەم خاڵەمان ڕوونکردۆتەوە. ئارەزوو وروژاندن لە کەســـەکەی دیکەدا حاڵەتی ئاگایی دروســـتدەکات، کە هیچ یان نەبوونـــە، چونکە ئەو ڕووبەڕووی بابەتێکی ئـــارەزوو وروژاندن دەبێتەوە. لە ئارەزوو وروژاندا من دەمەوێت بوونێکی پڕ بە خۆم بدەم و کەسەکەی بەرانبەریشم بەمشـــێوەیە بمناسێت. بۆ گەیشـــتن بەم ئامانجەش خۆم، وەکو بابەتێکی پڕواتا دەردەخەم. کردەوەکانیشم ڕوو لە دوو شوێن دەکەن: لەلایەکەوە، ڕوو لەوە دەکەن، کە بە هەڵە بە خۆیەتی دانراوە، بەڵام لە قوڵایی بابەتێتی و بوونێکی شاراوەدایە؛ هەروەها مەبەســـتی کردەوەکانم بۆ خۆیان نییە، بەڵکو ڕوو لە شـــتێکی نەبڕاوە و دەســـتەیی ڕاستەقینە و ئەگەرەکان دەکەن. منیش بۆ پێکهێنانی لایەنی بابەتی و شاراوەی بوونم دەیانهێنمە کایەوە.

کەوابـــوو، من دەبم بە ڕێگە نیشـــاندەری بەرزێتییەک، کـــە من تێپەڕدەکات و ئامـــاژە بۆ لایەنی بڕاوەی ئەگەرە مردوەکانم دەکات، تاکو نەتوانرێت تێپەڕبکرێت. لەلایەکـــی دیکەوە، هەریەکێک لـــە کردەوەکانم ئاماژە بۆ پـــڕی جیهان دەکات و منیش بە بەشێکی جیهانەوە دەبەستێتەوە. هەمانکات، من جیهان دەخەمە بەردەم خۆشەویســـتەکەم و خۆم بە ناوەندێکی پێویست لەنێوان جیهان و ئەودا دادەنێم. بـــەردەوام کردەوەکانم بە (هێز)ەوە لەژوور جیهانـــەوە دەردەخەم (بۆنموونە پارە، شـــوێنم لەنێو کۆمەڵدا، ئەو کەسە بە دەســـتەڵاتانەی من دەیانناسم باسدەکەم.) لەحاڵەتـــی یەکەمدا، من خۆم بە قووڵ و نەبڕاوە دەردەخەم و لەحاڵەتی دووەمدا، خۆم، وەکو جیهان بە[خۆشەویســـتەکەم] دەناسێنم. لە ڕیگەی ئەمانەوە خۆم بە بوونێکـــی تێپەڕنەکراو دادەنێم. بەڵام ئەمە بەس نییـــە چونکە تەنیا گەمارۆدانی کەسەکەیە. بەبێ ڕازیبوونێکی سەربەستانە لەو کەسەوە نابێت بە بەها. پێویستە من ئەو سەربەســـتییە بگرم، وای لێبکەم خۆی لە ئاســـتی بوونە پڕەکەی مندا بە هیچ دابنێت.

دەشـــێ هەندێک لەو باوەڕەدابن ئەم کردەوانە پێویستیان بە بەکارهێنانی زمان هەیـــە. ئێمە لەگەڵ ئەم ڕایەدا ناکۆک نین. بەڵام دەڵێین خودی کردەوەکان زمانن یان شـــێوازێکی بنەڕەتـــی زمانن. زمان دیاردەیەک نییە خرابێتە ســـەر بوونَ-بۆ-خـــۆ. لەبنەڕەتەوە بوونی ئەوە؛ ئەزمونی خۆیەتی خۆکان، وەکو بابەت بۆ یەکدی دەســـەلمینێت. لەنێو جیهانێکدا، کە تەنیا بابەتەکانی تێدا بن زمان دروست نابێت چونکە زمان پێویســـتی بە پەیوەندی نێوان (خۆ)کانە. پێویســـتیش ناکات زمان دروســـتبکرێت، چونکە زمان هەیە. من زمانم. هەموو کردەوەکانم و پرۆژەکانم، کە ڕوو لە ئەگەرەکانم دەکەن، لە دەرەوەی مندا واتا بەخشن، کە لە من ڕادەکەن.

لەم لایەنەوەیە هایدیگەر بە دروستی بۆ کێشە دەچێت و دەڵێت؛ من ئەوەم، کە

دەڵێم.[٦٤] زمان سروشتییانە نییە و ئێمەش (وەکو خۆ) دامان نەهێناوە؛ بۆ لایەنی ڕەوانی بوونی-خۆ-لەدەرەوەی دازایندا ناگەڕێتەوە. بەشێکی بارودۆخی مرۆڤ پێکدەهێنێت. بەڵگەی بوون-بۆ-خۆیە بۆ سەلماندنی بوون-بۆ-کەسانی دیکە. بەکارهێنان و تێپەڕکردنی ئەم بەڵگەیەیە لە بۆچوونەکەمدا بەرەو ئەگەرەکانمدەستنیشان دەکات. زمان، کەوابوو لە ناسینەوەی بوونی-کەسانی دیکەوە دوور نییە. سەرهەڵدانی کەسانی دیکە و تەماشاکردنەکەیان، وەکو مەرجێک بۆ بوونم دەبێتە هۆکاری ئامادەبوونی زمان. پێویست ناکات ئەم زمانە سەرەتاییە ئارەزوو وروژاندن بێت؛ شێوازی دیکەشمان بۆ ئەمە هەیە. ئێمە باسی ئەوەشمانکرد، کە هەڵوێستی سەرەتایی دیکەش بۆ ناسینەوەی بوونی کەسانی دیکە هەیە. ئەم دوو هەڵوێستە لەنێو خولانەوەیەکی بازنەییدا شوێن یەکدی دەکەون. بەپێچەوانەشەوە، ئارەزوو وروژاندن پێویستی بە زمانێکی لەپێشتر نییە. واتە، زمان لەگەڵ ئارەزوو وروژانندا کتوپڕ وەکو شێوازێکی سەرەتایی دەربڕین خۆی بەرجەستە دەکات. بێگومان مەبەستمان لە زمانیش هەموو دیاردەکانی دەربڕینە نەک بە تەنیا پێکهێنانی وشە، کە لە قۆناخی دووەمدا پەیدا دەبێت و مێژووییە. بەتایبەتی، لە ئارەزوو وروژانندا زمان نایەوێت بناسرێ بەڵکو ئەزمونەکە پێکدەهێنێت.

یەکەمجار بۆ دۆزینەوەی زمانێکی سەرنجڕاکێش کوێرانە هەنگاودەنێم، چونکە فۆرمێکی ڕووتی بوونم، کە بووە بە بابەت بۆ کەسەکە و دەبێت بەهاندەری. تەنانەت نازانم هەڵوێست و جوڵانەکانم چ ئاکامێکیان لەدوایە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەربەستی [کەسەکەی بەرانبەرم] تێپەڕیان دەکات و ئەو سەربەستییەش واتایان پێدەبەخشێت. کەوابوو، 'واتا'ی دەربڕینەکەم لەژێر دەستی مندا نییە. من هەرگیز نازانم ئەوەی دەریدەبڕم ئەوەیە دەمەوێت یان نا یان هیچ واتایەکی هەیە. کەمی زانین لە دەربڕینەکەمدا بۆ کەسەکە زمانەکەم لەدەرەوەی بوونی مندا دەکات بە دیاردەیەکی ڕاکردووی ناتەواو. کاتێک شتێک دەردەبڕم واتای تەواوی نازانم؛ نازانم من چیم چونکە من و دەربڕینەکەم دەبین بەیەک. کەسەکەی دیکە بەردەوام لەوێدایە و واتا بە زمان دەدات. هەموو دەربڕینێک، جوڵانێک و وشەیەک لەلایەن منەوە ڕاستەقینەی بوونی کەسێکی دیکەی جیاواز دەسەلمێنێت. تەنیا گەمژە دەڵێت، "کەسێکی دیکە بیرۆکەکەی دزیوم". بیرۆکە بۆ ئەوەی ببێت بە بابەت پێویستی بە هاوکاری سەربەستییەکی نامۆبوون هەیە. لەبەرئەمەشە یەکەم لایەنی زمان-بەوڕادەیەی من لەگەڵ کەسێکی دیکە بەکاریدەهێنم-پیرۆزە. بابەتێکی پیرۆز شتێکە لەنێو جیهاندا و ئاماژە بۆ شتێکی بەرز لەودیو جیهانەوە دەکات. زمان سەربەستی کەسێکم بۆ بەرجەستە دەکات، کە بەبێ دەنگی گوێ لە من دەگرێت.

---

٦٤ ئەم گوتەیەی هایدیگەر لە نوسراوێکیدا بەناوی (هۆڵدەرلن و ناوەڕۆکی شیعر) دەرهێنراوە.(وەرگێڕ)

هەمانکات، من بۆ کەسەکە وەکو هەمیشە بابەتێکی پڕ واتام. هیچ ڕێگەیەک من لە حاڵەتی بەبابەت بوون بەرەو کەسەکە لەبەرزێتییەکەمەوە ناگەیەنێت.

هەڵویســـتەکان، دەربڕینەکان و وشەکانم هەڵوێست و دەربڕین و وشەی دیکە نیشـــان ئەو دەدەن. زمان، بۆ ئەو، دەبێت بە خەســـڵەتێکی ســـادەی بابەتێکی جادوگەرانە.

کردەوەیەکی دوورەپەرێزە و کەسەکە کاریگەرێتییەکەی دەزانێت. کەوابوو، وشە ئەو کاتەی بەکاریدەهێنم پیرۆزە و جادوگەرانەشـــە، کە کەسەکە دەیبیستێت. من ئەوەندەی لەشـــم بۆ کەســـەکە دەبینم زمانەکەم ناناسم. من گوێم لە دەنگی خۆم نابێت و زەردەخەنەکەی سەرلێویشم نابینم. کێشەی زمان و لەش لەیەکدی دەچن و باسکردنیشیان وەکو یەکە.

خولیابوون، بەهەرحاڵ، حاڵەتی خولیایی لە کەسێکی دیکەشدا دروستدەکات و بەتەنیاش نابێت بەسەرچاوەی خۆشەویستی. ئێمە خولیای گوتاربێژێک، ئەکتەرێک یان کەسێک بەسەر پەتێکدا دەڕوا دەبینین و سەرنجمان ڕادەکێشێت، بەڵام خۆشمان ناوێت. ئێمە بۆ ساتێکیش ڕوو لە شوێنێکی دیکە ناکەین، بەڵام ئەو لەسەر زەمین نییە و خولیابوونەکەمان ئەو نـــاکات بە دوا بابەتێکی خولیابوون. بەپێچەوانەوە، خولیابوون بەرزێتییە. کەوابوو، کەی دڵدارێک دەبێت بە خۆشەویســـت؟ وەڵامی ئەم پرســـیارە ئاسانە: کاتێک خۆشەویستەکە پڕۆژەی حەزلێکردن دەخاتەگەر ئەو بەتەنیا ناتوانێت بڕیار لەســـەر پڕۆژەی خۆشەویســـتی بدات. ئەگەر خۆشەویستی پێویســـتی بە کەســـێکی دیکە بێت (وەکو خۆیەک بڕوانێتە بابەت)، ئەوا نموونەی خۆشەویســـتییەکە لەوێدایە من ڕووبەڕووی کەســـێکی دیکە ببمـــەوە، کە (خۆ)یە نەک بابەت. ئەگەر کەســـەکەی بەرانبەرم، وەکـــو حاڵەتی بەبابەت بوونی بیەوێت ئارەزووی مـــن بوروژێنێت، ئەو ئارەزووە بۆ بابەتێـــک دەبێت، کە داگیردەکرێت. هەڵبەتـــە ئارەزوو وروژاندن هانمدەدات ئەو، وەکو بابەت داگیربکەم، بەڵام حەز بۆ داگیرکردنی بابەتێک لەنێو جیهاندا خۆشەویستی نییە. کەوابوو، خۆشەویستی لای دڵدارەکە لەوێدا ســـەرهەڵدەدات، کە بیسەلمێنێت لە کەسە حەزلێکراوەکە جیایە، نامۆبـــووە و بەرەو ئەویش ڕادەکات. کەســـە حەزلێکراوەکـــەش تەنیا لە پڕۆژەی حەزلێکردنەکەدا دەبێت بە خۆشەویســـت. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەو نایەوێت بەسەر لەشی خۆشەویستەکەیدا تێپەڕێت، بەڵکو مەبەستی لایەنی (خۆ) یەتی ئەوە. لەڕاستیدا، تەنیا ڕێگەیەک بۆ هەستکردن بە وەدەستهێنانەکە پەیدا بێت لەوێدایە، کە ئەو بزانێت کەسەکە خۆشیدەوێت. لێرەدا ئەم ناکۆکی و بەرەنگارییە نوێیە ســـەرهەڵدەدات؛ هەریەکێک لە دوو خۆشەویستەکە دەبێت بە دیل بۆ ئەوی دی چونکە هەریەکەیان دەیەوێت تەنیا ئەوی دیکە خۆشیبوێت. هەریەکەیان داوای خۆشەویستییەک دەکات، کە نابێت بە پڕۆژەی بوونێکی حەزلێکراو. ئەو دەیەوێت

کەســـەکەی بەرانبەری بێ داواکردنی خۆشەویســـتی ئەم بە سنورێکی دەرەکی بۆ سەربەســـتییەکەی و بەهایەکی بەرز دابنێت. خۆشەویســـتی، لەم ڕووەوە، داوای هیچ لە بەرانبەرەکەی ناکات؛ خۆ خەریکردنێکی ڕەوانە بەبێ گۆڕینەوە. هێشـــتا، ئەم خۆشەویســـتییە بێجگە لـــە داواکاری لەلایەن دڵدارەکـــەوە. چی دیکە نییە. خۆشەویســـتەکە بەتەواوی و جیـــاواز گیراوە. گیـــراوی داواکارییەکەیەتی چونکە خۆشەویســـتی داواکارییە بۆ حەزلێکردن. ئەو، سەربەســـتە لەوەدا، کە دەیەوێت لەش بێت و داوا کارییەکەشـــی ڕوو لە دەرەوە دەکات. سەربەســـتییەکە دەیەوێت بگاتە کەسەکەی دیکە، سەربەســـتییەکە دەبێت بە سەرچاوەی نامۆبوونی خۆی. سەربەســـتی دڵدارەکە، بەو ڕادەیەی دەیەوێت ببێت بـــە بابەتێکی حەزلێکراو بۆ کەســـێکی دیکە، ئـــەو کاتەی دەبێت بە لـــەش بۆ ئەو نامۆدەبێـــت. ئەو دەبێت بە بوونێک، کە بەرەو کەســـانی دیکە ڕادەکات. ڕەتدانەوەیەکی بەردەوامی بوونی خۆیەتی، وەکو خۆیەکی ڕووت چونکە لەم ڕەتدانەوەیەدا تەماشـــاکردنی کەسانی دیکە و بەبابەت بوونیشـــیان لەناو دەچن. خۆشەویســـتیش مەحاڵ دەبێت. لێرەدا دەردەکەوێت سەربەستی پێویستی بە کەسانی دیکە هەیە. کەسانی دیکەش، وەکو لایەنی خۆیەتی ڕەتناکرێن. مادام ئەوان کلیلی بوونی ئەویان پێیە ئەوا سەربەستی و ئامانج و کۆتایی بوون-بۆ-خۆ سنورداردەکەن. لەم حاڵەتەدا ڕووبەڕووی نموونەی پرۆژەی خۆشەویستی دەبینەوە: ئەویش سەربەستییەکی نامۆکراوە. ئەوەی بیەوێت کەسێک خۆشیبوێت سەربەستییەکەی خۆی نامۆدەکات. سەربەستییەکەم لەبەردەم ئامادەبوونی کەسێکی دیکەدا، کە خۆیەتییەکی ڕووتە و من دەکات بە بابەت، نامۆ دەبێت. هەرگیز لەبەردەم کەسێکی بەبابەتکراو نامۆ نابێت. لەم حاڵەتەدا، نامۆبوونی کەسە حەزلێکراوەکە، کە حەزلێکەرەکە خەونی پێوە دەبینێت شتێکی ناکۆکە چونکە حەزلێکراوەکە تەنیا بوونی حەزلێکەرەکە بۆ ئەو مەبەستە دادەمەزرێنێت تاکو لەوێوە خۆی بە بابەتەکانی دیکەی نێو جیهان بگەیەنێت. کەوابوو، ئەم تێپەڕکردنە بابەتێک پێکدەهێنێت، کە هەموو بابەتەکان ڕەتدەکات. هەریەکێک لە دوو خۆشەویســـتەکە دەیەوێت لە هەســـتکردنەکەیدا ببێت بە بابەتی سەربەستییە نامۆکەی ئەوەی دی. ئەم هەســـتکردنە، کە خۆشەویستییەکی ڕاســـتەقینەیە، وێنەیەکی ناکۆکی بوون-بۆ-خۆیـــە. هەریەکێک لە ئەوان بەقەد داواکارییەکەی لە نامۆکردنی بەرانبەرەکەیدا خۆشی نامۆدەکات. هەریەکێک لە ئەوان دەیەوێت بەرانبەرەکەی حەزیلێبکات بەبێ ئەوەی بزانێت، کە خۆشەویستی لە هەردوو لاوەیە. پەیوەندییەکانی خۆشەویستی سیسیەمێکی نادیاری ئاماژەکردنەو لە تێڕامانی تێڕامان لەنێو ئاگامەندییدا دەچێت. هەریەکێک لەلایەنەکان [لەم پەیوەندییەدا] بۆ ئەوەی کەســـەکەی دیکە بدۆزێتەوە دەبێـــت خۆی بکات بە بابـــەت. هۆکاری ئەمەش لەوەدایە، کـــە نەبوونێکی لەبن نەهاتوو ئاگامەندییەکانی لە یەکدی جیاکردۆتەوە. ئەم نەبوونییەش ڕەتدانەوەیەکی

ناوەکیـــی یەکێکیانە دژی بەرانبەرەکەی و ڕەتدانەویەکی فاکتۆریشـــە لەنێوان دوو ڕەتدانەوەی ناوەکییدا. خۆشەویستی هەوڵدانێکی ناکۆکە بۆ لەناوبردنی ڕەتدانەوە فاکتۆرییەکە و هێشـــتنەوەی ڕەتدانـــەوە ناوەکییەکە. من دەمەوێت کەســـەکەی بەرانبـــەرم حەزملێبکات و هەموو هەوڵێک دەدەم ئەم پرۆژەیە بەئەنجام بگەیەنم؛ بەڵام ئەگەر کەســـەکە منی خۆشـــبوێت ئەوا ڕادیکاڵانە بە خۆشەویستییەکەی من هەڵدەخەڵەتێنـــێ. داوا لەو دەکەم، وەکو خۆیەکـــی ڕووت من بکات بە بابەتێکی گرنـــگ و تایبەت بۆ خۆی. کاتێـــک حەزملێدەکات من، وەکو خـــۆ دەبینێت، کە لەنێـــو بوونی بەبابەتکراوی ئـــەودا نوقم بووم. ئەو خـــۆی بەرانبەر بوونی (خۆ) یەتی من دەدۆزێتەوە. گرفتی بوونم-بۆ-کەسانی دیکە بێچارەیە. هەریەکێک لە دوو خۆشەویســـتەکە بۆ خۆیان، وەکو (خۆ) دەمێنێتەوە: هیچ شتێک نییە ئەم حاڵەتە بگۆڕێت؛ پێکهاتەکەیان لەناوبەرێت، تەنانەت بە فاکتۆریش دەکرێن. بەلای کەمەوە هەریەکێک لە ئەوان توانیویەتی خۆی لە مەترسی سەربەستی بەرانبەرەکەی ڕزگار بکات، بەڵام چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد. ئەو لەدەست ئەوە ڕاناکات کەسەکە ئەم دەکات بە بابەت و ســـنورداریدەکات. هۆکاری ڕاکردنەکەی ئەوەیە، کە کەســـەکە ئەم، وەک (خۆ) دەبینێت و داوای لێدەکات بەمشێوەیەش بمێنیتەوە. لەسەرەتادا، هەریەکێک لە ئاگامەندییەکان خۆی لە زنجیرەکە ڕزگاردەکات و بەرانبەرەکەی دەکات بەبابەت. لە پڕدا، تەلیســـمەکە دەشکێنێت؛ بەرانبەرەکەی دەبێت بە داردەستێک لەنێو داردەســـتەکانی دیکەدا. ڕاستەقینەی خۆشەویستی لەنێو کایەی ئاوێنەکاندا دەبێت بە وێنەیەکی ئەندێشـــاوی. دوایی، دوو خۆشەویســـتەکە لە ئەزمونەکەیاندا دەیانەوێت بوونی خۆیان بۆ یەکدی لە نێو سەربەســـتی یەکدیدا بپارێزن. ئەمەش داوادەکات، کەســـەکەی دیکـــە لەو دیو جیهانەوە بە (خۆ) و ســـەرچاویەکی ڕەها دابنرێت، کە جیهان دەهێنێتەکایەوە. لێرەدا دەبێت کەســـی ســـێیەم تەماشـــای ئەم دوو خۆشەویســـتە بکات تاکو بتوانن یەکدی، وەکو بابەت ببینن. ڕاســـتەوخۆ دەردەکەوێت کەســـەکەی بەرانبەرم بەرزێتییەکی ڕەها نییە؛ بەڵکو بەرزێتییەکی-بەرزێتییە و کەسێکی دیکە، بێجگە لە من دۆزیویەتییەوە. پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵیدا دەبێت بە ئەگەرێکی مردوو نەک پەیوەندییەک لەنێوان بابەتێکی سنورداری بەرزێتییەکان و سەربەســـتییەکە. خۆشەویستییەکە دەبێت بە بابەتێک نامۆ و ڕوو لە کەسی سێیەم دەکات. لەبەر ئەمەیە دڵدارەکان حەزیان لە تەنیاییە. دەرکەوتنی کەسی سێیەم، گرنگ نییە هەرکەسێک بێت، ڕووخاندنی خۆشەویستییەکەیانە. بەڵام تەنیایی فاکتۆری (بۆنموونە من تەنیا لەژوورەکەمدا دانیشتوم) تەنیایی بیردۆزەیی نییە. ئەگەر کەســـیش من نەبینێت هێشتا بۆ هەموو کەسێکین و ئێمەش ئاگامان لە بوونی ئەوانە. لەم حاڵەتەدا، خۆشەویستی، کە شێوازی بوونە بۆ کەسانی دیکە تۆوی لەناوبردنی خۆی هەڵدەگرێت.

ئێمە، لێرەدا، پێناسـەی ڕووخاندنی سێ لایەنی خۆشەویستیمان کرد: یەکەم، لە ناوەڕۆکدا [خۆشەویستی] فریودانە و ئاماژەکردنە بۆ شتێکی لە کۆتایی بەدەر، چونکە لە خۆشەویستیدا کەسەکە دەیەوێت حەزیلێبکرێت. کەوابوو، ئەمەش حەزە لەوەی، کە بەرانبەرەکەی حەزیلێبکات. تێگەیشـتنێکی پێش-ئۆنتۆلۆجییانە لەم فریودانە لە خۆشەویسـتیدا هەیە، ئەویش تێرنەبوونێکی بەردەوامە لای دڵدارەکە. ئەم تێگەیشـتنە لە ئاکامی هەسـتکردن بە کەمی لە ئاستی خۆشەویستییەکەدا نییـە، بەڵکو لەوەدایە، کە ئـەوەی دڵدارەکە دەیەوێت پێی نەگەیشـتوە. چەند کەسەکە منی خۆشـبوێت ئەوەندەش بوونی خۆم وندەکەم و فرێدەدرێمە بەردەم لێپرسینەوەکەم و بەجێ دەمێنم.

دووەمیـش، بە ئاگاهاتنەوەی خۆشەویسـتەکەم هەرکاتێک بێـت ڕوودەدات. ئەو دەتوانێت من بکات بە بابەت. ئەمەش نامسـۆگەرییەکی بەردەوامە. سـێیەم، خۆشەویسـتی ڕەهایە و کەسەکەی بەرانبەرم دەیکات بە شتێکی پەیوەندیدار یان ڕێژەیی. لەحاڵەتێکدا من و خۆشەویسـتەکەم هەمیشـە لەنێو جیهاندا تەنیا بژین دەتوانین خۆشەویسـتی بە ڕەهایی بهێڵینەوە. ئەمەش بەردەوام دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی شەرمەزاربوون یان شانازی لای دڵدارەکە. هەوڵدانەکەم بۆ توانەوەی بوونم لەنێو بابەتگەرێتییدا بێهودەیە. سـۆز و عاتیفەم دەسـتکەوتیان تێدا نییە. کەسـەکەی دیکە ئاماژەی بۆ خۆیەتی من کردووە، کە سەلماندنی دژوارە. ئەمەش دەبێتە هۆکاری خەم و پەژارە و هەوڵدان بۆ دروسـتکردنی یەک ناسنامە بۆ خۆم و کەسەکەی دیکە. پرۆژەی توانەوەی بوونم لە ئەودا بە لەناوبردنی خۆیەتییەکەم دەگرمەبەر تاکو خۆم لەناوبەرم. ئەم پرۆژەیە هەڵوێسـتێکی ماسـۆچیزمە. مادام کەسـەکە بناخەی بوونمە-بۆ-کەسـانی دیکە، ئەگەر بۆ بوونم پشت بەو ببەستم، ئەوا دەبم بە بوونێکی-لەنێو-خۆی بە سەربەسـتی دۆزراوە. لێرەدا خۆیەتییەکەی من لە ئاستی کردەوەی کەسەکەدا بۆ دۆزینەوەی بوونم بە ڕێگرێک دەبینرێت. ئەم خۆیەتییە ڕێگرەش پێویستە سەربەسـتانە ڕەتبدەمەوە؛ خۆم بکەم بەبابەت. من دەمەوێت تەنیا بابەت بم. پشـت بە کەسەکەی دیکە دەبەستم. مادام ئەم بوونەی خۆشم شەرمەزارمدەکات، ئەوا حەز لە شەرمەزارییەکەشم دەکەم چونکە دەبێت بە ئاماژەکردن بۆ بەبابەت بوونی بوونم. مادام کەسەکە دەیەوێت ببم بەبابەتی حەز و ئارەزووی ئەوا منیش دەمەوێت حەزم لێبکرێت و بە شەرمەوە خۆم دەکەم بە بابەتی حـەز و ئارەزووەکەی ئەو. لێرەدا نکۆڵی لـە بەرزێتییەکەم دەکرێت. من نامەوێت سەربەستییەکەی ئەو بگرم، بەپێچەوانەوە، دەمەوێت سەربەستییەکەی ڕادیکاڵانە بەربڵاو بێت. چەند هەسـت بە داگیرکردنی خۆم لە گەیشـتن بە ئامانجەکانی ئەو بکەم ئەوەندەش چێژ و خۆشـی لە ناوبردنی بەرزێتییەکە وەردەگرم. دواجاریش، خـۆم تەنیا، وەکو بابەت دەبینم؛ ڕادیکاڵانە، وەکو بوون-لەنێو-خۆ. ماسـۆچیزم،

وەکو سـادیزم، هەسـت بە تاوانکردنـی لەدوایە. کاتێک خـۆم بەبابەت دادەنێم بەرانبەر بوونم هەسـت بە تاوان دەکەم چونکە بـە نامۆبوونێکی ڕەها ڕازیبووم. لە ئاسـتی کەسەکەی بەرانبەریشم هەسـت بەتاوان دەکەم چونکە دەبمە هۆکاری هەسـتکردن بە تاوان لەودا. ئەوی نکۆڵی لە سەربەستییەکەم دەکات. ماسۆچیزم ئەوەنییە کەسەکەی بەرانبەرم لەگەڵ بەبابەتبوونی خۆم سەرسام بکەم. ماسۆچیزم سەرچاوەی گێژبوونە. گێژبوونێک، نەک لە ئاستی زەمین یان تاشەبەردێکدا، بەڵکو لە ئاستی خۆیەتی کەسانی دیکەدا.

بەڵام ماسـۆچیزم خۆ بەزێنە و سەرکەوتو نییە. بۆ ئەوەی خۆم لە ئاستی بە بابەتکردنی بوونمدا سەرسـام بکەم، دەبێت هەست بەو بوونە بکەم بۆ کەسەکەی دیکـە بووە بە بابەت. ئەمەش مەحـاڵ نییە. کەوابوو،، من دەتوانم لەبەردەم ئەو بوونەی خۆمدا سەرسـام نەبم. پێویست ناکات یان بێهودەیە ماسۆچییەک لەسەر ئەژنۆ دانیشێ و خۆی بخاتە حاڵەتێکی نا ئاساییەوە، تاکو وەکو ئامێرێکی مردوو بەکاربێت. ئەو بۆ کەسەکەی دیکە ناچالاکە! بۆ ئەو خۆی دەخاتە نێو ئەمحاڵەتەوە. بەڵام بوونی حوکمی بەسەردا دراوە بۆ خۆی بێت. لە بەرزێتییەکەی خۆیەوە دەبێت بـە بوونێک بۆ بەرزێتی. چەند تامی بەبابەتبوونـی خۆی بکات ئەوەندەش لەنێو ئاگامەندی خۆیدا نوقم دەبێت و دوودڵیش دەبێت. ئەو پیاوە ماسـۆچییەی پارە بـە ژن دەدات تاکـو بە قامچی لێیبدات ژنەکە، وەکو ئامێـر بەکاردەهێنێت. لەم پەیوەندییـەدا خۆی بە بەرزێتی دادەنێت. لە ئاکامدا، بۆ ماسـۆچی کەسـەکەی دیکـە بابەتە و تێپەڕیدەکات تاکو بە بوونـی خۆی، وەکو بابەت بگات. با بیر لە ئەشکەنجەی (ساشـەر مۆش) بکەینەوە. بۆ ئەوەی قێز لە خۆی بکاتەوە، جنێوی پێبدرێت و شـەرمەزار بێت ئەو ژنەی بەکاردەهێنا، کە خۆشـی دەویسـت. ئەو دەیویست بەو شێوەیەی ژنەکان خۆیان دەکەن بە بابەت و هەستیان بە بابەتکردنی خۆیان دەکرد بیان بینێت. بەمشێوەیە، لەهەموولایەکەوە ئەو بابەتەی ماسۆچییەک دەیەوێـت ڕادەکات و ناگیرێ. هەروەها دەشـێ ڕووبدات یان بە ڕاسـتی کاتێک ڕوودەدات ئەو بۆ سـەلماندنی بەبابەیبوونی خۆی بەبابەتبوونی کەسـەکەی دیکە دەدۆزێتەوە. لەمڕووەوە ماسۆچیزم خۆبەزێنە. جێگەی سەرسوڕمانیش نییە ئەگەر ماسـۆچیزم بە ئامێرێک و ئەو ئامێرەش بەسـەرنەکەوتو دابنێیـن. بەڵام لێرەدا باسـی بونیادی سەرکەوتنەکە ناکەین بەڵکو ئەوەندە بەسە بڵێین، کە ماسۆچیزم هەوڵدانێکـی بەردەوامە بۆ لەناوبردنی خۆیەتی خۆ بە هـۆکاری توانەوەی لەنێو کەسێکی دیکەدا؛ بەڵام ئەمە هەوڵدانێکی سەرنەکەوتوە.

## ٢- هەڵوێستی دووەم لە ئاستی کەسانی دیکەدا: گوێنەدان، ئارەزوو، ڕق و سادیزم

سەرنەکەوتنی هەڵوێستی یەکەم لە ئاستی کەسانی دیکەدا بەرەو هەڵوێستێکی دیکەمان پەلکێشدەکات. بەڵام هیچ کام لەم دوانە یەکەم نییە. هەردووکیان هەڵوێستی گرنگن بۆ بوون-بۆ کەسانی دیکە و بنەڕەتین. دەشێ ئەو کاتەی نەتوانم خۆم بکەم بە ئاگایی کەسەکەی دیکە و یەک ناسنامە بۆ هەردووکمان دروست بکەم بە مەبەستەوە ڕووی تێبکەم و تەماشای بکەم ڕووبدات. تەماشاکردنی تەماشای کەسەکە دامەزراندنی سەربەستییەکەی خۆمە. دەمەوێت بە سەربەستییەوە بەرەنگاری سەربەستییەکەی ئەو بکەم. واتای بەرەنگاری بە سەرهەڵدانی ئەم دوو سەربەستییە بەرابنەر یەکدی بەرجەستە دەبێت. بەڵام ئەم هەوڵدان و مەبەستە توشی نائومێدی دەبن چونکە کاتێک بە سەربەستییەوە ڕووبەڕووی کەسەکە دەبمەوە، من ئەو دەکەم بە بابەت. ئێمە لەم سەرنەکەوتنە دەکۆڵینەوە و دەمانەوێت لە خەسلەتەکانی تێبگەین. من تەماشای کەسەکە دەکەم، کە تەماشام دەکات، بەڵام تەماشای تەماشاکردن ناکرێت. تەماشاکردنەکەی ئەو بە تەماشاکردنی من وندەبێت و بێجگە لە چاوەکانی ئەو چی دیکە نابینم. لێرەدا، کەسەکە دەبێت بەو هەبووەی من خاوەنیم. ئەویش بڕوا بە سەربەستییەکەم دەکات. ئەمەش من دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی ئامانجەکەمم وەدەست کەوتبێت چونکە بووم بە خاوەنی ئەو هەبووەی کلیلی بەبابەتبوونی منی هەڵگرتوە و دەتوانێت بە هەزار ڕێگە سەربەستییەکەم بسەلمێنێت. بەڵام، لەڕاستیدا هەموو بونیادەکە هەرەسی هێناوە. ئەو بوونەی من خاوەنیم کەسەکەیە، وەکو بابەت. ئەویش وێنەیەکی سادەی منی لە لا دروست بووە، کە ناتوانێت بمگرێت. ئەگەر کاریگەرێتییەکانی سەربەستییەکەم بناسێت و منیش بە هەزار ڕێگە کار لەسەر بوونی بکەم، ئەگەرەکانی بوونی بە هۆکاری ئەگەرەکانی بوونمەوە تێپەڕبکەم لەبەرئەوەیە، کە ئەو بابەتێکە لەنێو جیهاندا و لەدەرەوەی سەلماندنی سەربەستییەکەمدایە. نائومێدبوونەکەم زۆرتر سەقامگیر دەبێت ئەگەر هەوڵبدەم جارێکی دیکە سەربەستییەکەی ئەو لەنێو بابەتەکاندا بدۆزمەوە. بەڕێگەی داگیرکردنی لەشییەوە ئەو هەڵوێستانە دیاریبکەم سەربەستییەکەی ئەوی تێدان. هەموو ئەم هەوڵدانانە، کە هەموو کەسێک چاوەڕوانیانە سەرنەکەوتوون. ڕوودەدات "تەماشاکردنی تەماشاکە" ڕووبەڕووبوونەوەی بوون-بۆ-کەسانی دیکە بێت. واتە، لەگەڵ ئامادەبوونم لەنێو جیهاندا دەتوانم هەڵبژێرم تەماشای تەماشاکردنی کەسانی دیکە بکەم؛ خۆیەتی بوونم لەسەر خۆیەتی ڕووخاوی ئەوان دامەزرێنم. ئەم هەڵوێستە بە 'گوێنەدان' ناوزەد دەکەین. ئێمە مامەڵە لەگەڵ جۆرێک نابینا لە ئاستی کەسانی

دیکەدا دەکەین. بەڵام چەمکی 'نابینا' نابێ توشی ونبوونمان بکات. نابینابوون حاڵەت نییە؛ من لە ئاستی کەسانی دیکەدا نابینام. نابیناییەکەشم لەناوەوە تێگەیشتنمە لە بوون-بۆ-ئەوان؛ لە بوونی ئەوان، وەکو تەماشاکردن. تێگەیشتنەکەش دەبێت بە هاندەر بۆ خۆشاردنەوەم. کەوابوو، توشی سۆلیپسیزمێکی فاکتۆری دەبم؛ کەسانی دیکە ئەو فۆرمانەن لەسەر شەقامەکە هاتوچۆ دەکەن، ئەو بابەتە جادوگەرانەن لە دوورەوە کاردەکەنە سـەر من و کردەوەکانیشم. من بەترسەوە هەستیان پێدەکەم؛ بـە جۆرێک هەڵسـوکەوت دەکەم، کـە بە تەنیا بژیم، وەکو چۆن فلّچە بەسـەر دیوارەکەدا دەهێنم، فلّچە بەسـەر ئەوانیشـدا دەدەم. خۆم دوورەپەرێز ڕادەگرم. سەربەسـتییەکەیان، وەکو بابەت دەبێت بە ڕێژەیەکی نەگۆڕی دژوەستان بۆ من. تەنانەت بیر لە تەماشاکردنەکەشیان ناکەمەوە. بەدڵنیاییەوە، ئەوان شتێک لەبارەی منەوە دەزانن، بەڵام زانینەکەیان دەست لە بوونم نادات. ئەوان باسی بوونی خۆیان بـەو جۆرەی هەن نەک بـەو جۆرەی من هەم دەکەن. ئەم 'کەسـانە' کارکردنن: بلیتفرۆشەکە تەنیا بلیت دەفرۆشـێت؛ خزمەتکاری قاوەخانەکە خزمەتدەکات. بۆ من زانینی کلیل و ئەو چەمکە گرنگانەی کارکردنەکانیان دەناسـێنێت سودبەخش دەبێت. کەوابوو، ئەمەیە سایکۆلۆجی ڕیالیستی سەدەی هەڤدەهەم لە فەرەنسا بە ئێمەی داوە: هەروەها نوسراوەکانی سەدەی هەژدەهەم، وەکو نوسراوەکەی بیرۆڵد دی ڤێرڤیل (چۆن سـەرکەوتوو دەبێت)، (پەیوەندییە ترسـناکەکانی) لاکلۆس، (نوسـراوێک لەسەر چڵێسـی) لەلایەن هێرۆڵت دی شێڵێش، هەموویان زانینێکی کردەکی سـەبارەت کەسـانی دیکە بە ئێمە دەدەن. لە نابیناییەکەدا، من بوونی کەسـەکەی دیکە، وەکو خۆیەتییەکی ڕەها و بناخەی بوونم-بۆ-لەنێو خۆ و بوونم-بۆ-ئەوان و بەتایبەتی لەشم-بۆ-ئەوان پشتگوێ دەخەم.

دڵنیـام لەوەی من، کە نازانم تەماشـاکردنی کەسـەکە ئەگەرەکان و لەشـم چەقوەسـتاو دادەنێت. من لەنێو حاڵەتێکدام بەپێچەوانەی شـەرم و ترسەوەیە. لەمحاڵەتەدا هەسـت بە بارسـوکی دەکەم؛ شەرم لە خۆم ناکەم چونکە لەدەرەوە نیـم و نامۆ نیـم. ئەمحاڵەتی نابینایە دەکرێت تاکو ئـەو ڕادەیەی بڕوای خراپ ئارەزومەندێتی درێژخایەن بێت و چەندساڵێک بخایەنێت یان هەموو ژیان بگرێتەوە. هەندێک کەس بەم نابیناییەوە دەمرن و بۆ سـاتێک ڕۆشنایی بە چاویان نابینن و نازانن کەسانی دیکە چین.

تەنانەت، ئەگەر کەسـێک لەمحاڵەتەشـدا بتوێتـەوە، ناجـۆری ئەزمونەکە لەبیرناکات. ئەمیش، وەکو هەمـوو حاڵەتەکانی دیکەی بڕوای خراپ هانماندەدات خۆمـان دەربازبکەین. نابینایی، کە پەیوەندی بە کەسـانی دیکەوە هەیە، هەموو ئەزمونێکی زیندووی بە بابەتبوونی خۆم دەشارێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، کەسەکەی دیکە بە سەربەسـتییەکەیەوە و بابەتێتی منیش بـە نامۆبوونەکەیەوە لەوێدان و

هەســـتیان پێنەکراوە. بەڵام لە تێگەیشـــتنەکەم بۆ جیهان و بوونم لەنێو جیهاندا ئامادەبوون. بلیتفرۆشـــەکە، کە کردەوەیە، بەو کردەوەیەی خۆی بۆ من لەدەرەوە دەردەخات، ئەگەرچی لە کردەوەکەش تێنەگەین.

ئەمەش هەســـتکردنێکی بەردەوامە بە نەبوونی و نائاســـایی. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو فاقی پەیوەندییەکەم لەگەڵ کەسانی دیکەدا:

یەکەم، گرفتی خۆپاراســـتنم لەو مەترســـییەی لە ئاکامـــی بوونم-لەدەرەوە-لەبەردەم سەربەسستی کەسانی دیکەدا سەرهەڵدەدات. دووەم، گرفتی بەکارهێنانی کەسەکەی دیکە تاکو هەمووی ئەو بوونە کەمە پێکبێت، کە منە، دێتە پێش. من دەمەوێت بازنەکراوەکە دابخەم و ببم بە بناخەی بوونم. بەڵام لەناوچوونی کەسەکەی تەماشام دەکات من فڕێدەداتەوە نێو خۆگەرایەتییەکی نەسەلمێنراو. بوونم دەکات بەو هەوڵدانە بەردەوامە بەرەوتێگەیشتن لە بوونێکی-لەنێو-خۆی-بۆ-خۆ. من بەبێ کەســـەکە بە تەواوی و ڕووتی لەم پێویستییە ترســـناکەی سەربەستی تێدەگەم. دەزانم، کە ناتوانم لە ئاســـتی خۆ دروســـتکردنەکەمدا نکۆڵی لە لێپرسینەوەکەم بکەم یان بیخەمە ئەستۆی کەسێکی دیکە هەرچەندە من ئەوەم هەڵنەبژاردبێت یان لەدایکیش نەبووبێتم. لەلایەکەوە، نابینا لە ئاستی کەسانی دیکەدا بە ڕادەیەک من لە مەترسیی سەربەستییەکەی ئەوان ڕزگاردەکات. بەڵام لەنێو خۆیدا و بەشاراوەیی ناســـینەوەی سەربەستییەکەی تیدایە. لەبەر ئەم هۆکارە، لەو کاتەوە من خۆم بە خۆیەکـــی تایبەت و ڕەها دادەنێم چونکە من بینراوم، هەســـتی پێناکەم و ناتوانم خۆشـــم لەو بیننە بپارێـــزم و دەمخاتە نێو بابەتگەرێتییەکـــی توندڕەوانەوە. من بەبـــێ ئەوەی بتوانم ڕوو لـــە خاوەنەکەم بکەم بووم بە خاوەنێتی کەســـەکە. بۆ سەلماندنی ڕاســـتەوخۆی تەماشاکردنی کەسەکە و بەرگریکردن لە خۆم، کەسەکە دەخەمە بەر تاقیکردنەوە و دەبێت بیکەم بە بابەت. ئەگەر کەســـەکە، ئەو کاتەی تەماشـــامدەکات، بیکەم بە بابەت بۆ خۆم، ئەوا من بەبێ ئەوەی بزانم کەوتومەتە مەترســـییەوە. نابیناییەکەم، کەوابوو، دوودڵییە چونکـــە لەگەڵ خۆیدا ئاگایی و هەســـتکردنی "سەرسوڕمان و تێنەگەیشتنی" تەماشـــاکردنی هەڵگرتووە. منیش لەنێو مەترســـی نامۆبوونم لەپشت خۆمەوە ڕادەوەستم. ئەم بارودۆخە نا ئاساییە بوارێکی دیکە بۆ داگیرکردنی سەربەســـتی کەسەکەی دیکە نیشاندەدات. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە من واز لە کەسەکە، وەکو بابەت، ئەو کەسەی دەیەوێت بوونم بســـڕێتەوە بهێنم و بیکەم بە ئامێر تاکو سەربەستییەکەی بگرم. مادام من ڕوو لەو بابەتە دەکەم ناتوانم لە ئاســـتی بەرزێتییەکەیدا بەرپرســـی بکەم. مادام منیش لەو ئاســـتەدا، کە ئەو دەکەم بە بابەت، خۆمم، بیر لەو شتەش ناکەمەوە، کە حەزدەکەم دەستم بکەوێت.

کەوابـــوو، من لەنێـــو بارودۆخی هەڵچون و هەڵوێســـتێکی ناکۆکـــدا بەرانبەر

بابەتەکە دەژیم: نەک تەنیا ناتوانم ئەوەی لەوم دەوێت وەدەســـتی بهێنم، لەسەرو ئەم کارەمەوە زانینە بەکردەوەکەشـــم لەبارەی ئەوەی حەزدەکەم دەســـتم کەوێت دەشاردرێتەوە. خۆم دەخەمە نێو گەڕانێکی بێچارە بەدوای سەربەستی کەسەکەی دیکـــەدا و لەنیوەی ڕێگە تێدەگەم گەڕانەکەم هیچ واتایەکی نییە. هەوڵدانەکانم بۆ پەیداکردنـــی واتاش ئەوەندە زۆرتر لە واتا دوورم دەخەنەوە و پەرێشـــانم دەکەن. ئەمەش لەوە دەچێت من هەوڵبدەم خەونێکم بیربکەوێتەوە و پەنا بۆ بیرکەوتنەوە بەرم. بەڵام ناوەڕۆکی خەونەکەم بەتەواوی لەبیردەچێت و بەهەڵە وێنەکانی دێنەوە بەرچاوم و ناوەڕۆکەکە وندەبێت.

هەوڵدانی بنەڕەتیم بۆ گرتنی سەربەســـتی خۆیەتی کەســـێکی دیکە لە ڕێگەی بەبابەتکردنییەوە لە ئارەزووی سێکســـیدا بەرجەســـتە دەبێت. هەڵبەتە جێگەی سەرســـوڕمانە ببینین دیاردەیەک، کە بەگشتی بە ”ڕەتدانەوەی سایکۆفزیۆلۆجی“ دادەنرێت ئێمە بە هەڵوێســـتی بنەڕەتی لەگەڵ بوونمان-بۆ-کەسانی دیکە پێناسی دەکەین. بۆ زۆرینـــەی زانایانی دەروونناس ئارەزوو، وەکو فاکتۆرێکی ئاگامەندی، بە توندی پەیوەندی بە سروشتی ئەندامانی سێکسییەوە هەیە. لە ڕێگەی خوێندی ئـــەم ئەندامانەوە لە ئارەزووی سێکســـیش تێدەگەین. بەڵام مـــادام بونیادەکانی لەش (شیردەر، منداڵبوون، هتد) جیاوازن، بونیادێکی تایبەتی سێکسیش (منداڵدان، بۆڕی هێلکە، هێلکەدان، هتد) هەڵکەوتێکی ڕەهان و سەربە ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندی یان 'دازاین' نین، ئەوا بۆ ئارەزووی سیکسیش دروستن. ئارەزووی سێکس، وەکو ئەم ئەندامانە ســـایکۆلۆجی ئەزمونگەری لەســـەر بناخەی بایۆلۆجی دەیانناسێت. ئەمەش لە چەمکی ویســـتی سروشـــتیدا، کـــە بۆ ئـــارەزووی دەروونی بەکاردێت دەردەکەوێت. ویســـتی سروشتی جۆرە پێکهاتەیەکی ژیانی ناوەوەیە، کە دووجۆر خەســـڵەتی هەیە. لەبەر ئەم هۆیە فەیلەســـوفە بوونگەرییەکان لەو باوەڕەدابوون پێویست نەکات خۆیان بە سێکسگەرایەتییەوە ماندوو بکەن. هایدیگەر، بەتایبەتی هیچ لەبارەی سێکسەوە لە شیکردنەوە بوونگەرایەتییەکەی بوونی دازایندا باسناکات. بێگومان، دەشێ بڵێین، کە 'مێینە' و 'نێرینە' لە بوونی مرۆڤدا هەڵکەتە و جیاوازی سێکسی پەیوەندی بە بوونەوە نییە چونکە ژن و پیاو هەردووکیان بەبێ جیاوازی لە بووندا هەن.

ئەم هۆکارانە ســـەلمێنەر نین. جیاوازی سێکســـی دەگەڕێتـــەوە بۆ ئەو لایەنە فاکتـــۆرەی ئێمە پەســـەندی دەکەین. بەڵام ئایا بوون-بۆ-خـــۆ بە ڕێکەوت، لەبەر لەشی بوونێکی سیکســـییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین ژیانی سێکسی شتێکی زیادەیە و خراوەتەســـەر بارودۆخی بە مرۆڤبوون؟ هەمانکات، لە ســـەرەتاوە دەردەکەوێت ئارەزوو لەگەڵ دژەکەیدا و هاندەرە سێکســـێیەکان بونیادی بنەڕەتی بوون-بۆ-خۆ بن. ئاشکرایە، ئەگەر حاڵەتی سێکسی مرۆڤ لە بنەمای سێکسی، وەکو لایەنێکی

فزیۆلۆجییەوە پەیدابوو‌بێت ئەوا لە بوون-بۆ-کەسانی دیکە جیانابێتەوە. بەڵام ئایا مافمان نییە ئەو پرسیارە بکەین، کە گرفتەکە، وەکو گرفتی هەستکردن و ئەندامانی هەستکردنە یان نا؟ دەڵێن، مرۆڤ بوونەوەرێکی سێکسییە چونکە خاوەنی سێکسە. ئەگەر پێچەوانەی ئەمە ڕاســت بێت، ئەگەر سێکس تەنیا ئامێرێک و بیرۆکەیەکی سێکســییکەری بێت، ئایا مرۆڤ لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی سێکسییە خاوەنی سێکسە، وەکو بوونێک لەنێو جیهاندا هەیەو پەیوەندی بە کەسانی دیکەوە هەبێت؟ ســێکس لە منداڵییدا پێش گەشەکردنی ئەندامەکانی سێکس لەنێو لەشدا دەرکەوێت. پیاوە خەساوەکانیش ئارەزوویان دەمێنێتەوە. تەنانەت پیاوی پیریش حەزی [سێکسی] هەیە. بەکارهێنانی ئەندامەکانی سێکس بۆ چێژوەرگرتن ڕوویەکی ژیانی سێکســی مرۆڤە. "لەگەڵ ئەگەری تێربووندا" یەک شێوازی سێکسی هەیە. سێکسی گەشــە پێدراویش نوێنەرایەتی ئەم ئەگەرە دەکات و دەیکات بە شتێکی کۆنکرێتی.

هێشتا شێوازی دیکەی سێکسیش هەیە، کە بە تێربوون ناگات. ئەگەر باس لەم شــێوازانە بکرێت تێدەگەین، کە ژیانی سێکسی لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤدا دەست پێدەکات و بە مردنی کۆتایی دێت. بێجگە لەمە، نە هەســتانی ئەندامی نێرینەی پیــاو یان ئەندامێکی لەش تەفســیری وروژاندنی ئارەزووی سێکســی دەکات، نە کشــانی گلێنەی چاویش دەتوانێت وروژاندنی ترسمان بۆ ئاشکرا بکات. لە هەموو حاڵەتەکانــدا لەش ڕۆڵێکــی گرنگ دەبینێت. بۆ تێگەیشــتنمان ئاماژە بۆ بوون-لەنێو-جیهان و بوون-بۆ-کەســانی دیکە دەکات. من حەز لە کەســێک نەک مێرو یان گوێماســییەک دەکەم. هەروەها بەو جــۆرەی هەیە و بەو جۆرەی منیش لە حاڵەتێکدا لەنێو جیهاندام حەزی لێدەکەم. ئەو بۆ من کەسێکی دیکە و منیش بۆ ئەو کەسێکی دیکەم.

گرفتی ســەرەکی سێکسگەرایەتی بەم شێوەیە دەبینرێت: ئایا سێکس ڕووداوە و بەســتراوە بە سروشتی ئەندامەکانی لەشەوە یان بونیادێکی پێویستی بوون-بۆ-خۆی بوون-بۆ-کەســانی-دیکەیە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرســیارە بۆ ئۆنتۆلۆجی دەگەڕێینەوە. ئۆنتۆلۆجیش لەگەڵ دۆزینەوەی واتای بوونی سێکسی بوون-بۆ-خۆ وەڵامەکەمان بۆ ئامادەدەکات. بە گوێرەی باســەکە لەســەر لەش بوونی سێکس واتە من، وەکو بوونەوەرێکی خاوەن ســێکس بۆ کەســێکی دیکە و ئەویش بۆ من هەبێت. دەبێت ئەوەش بزانین، پێویســت نییە تەنیا ئەو کەســە بۆ من یان من بۆ ئەو بــم بەوجۆرەی پەیوەندییەکە لەنێوان دوو سێکســی جیاوازدا دەبینرێت. یەکەم، تێگەیشــتنم لە بوونی کەسەکەی دیکە، بەو جۆرەی خاوەنی سێکسە، بە هۆکاری بینینی پەرش و بڵاوی پرچی، زبر دەستی، دەنگی و ماسولکە بەهێزەکانی لەشــییەوە نییە. ئیمە لەوێــدا مامەڵە لەگەڵ ئاکامێکدا دەکەیــن، کە ئاماژە بۆ

حاڵەتێکی لەپێشـــتر دەکات. یەکەم تێگەیشـــتنی من بۆ کەسەکە دەکەوێتە سەر ئارەزووم. لە ڕێگەی ئارەزووەکەمەوە ئەو دەبێت بە کەســـێکی سێکسی. ئارەزوو کتوپڕ بە سێکســـی بوونی من و ئەو، لەشـــی من و لەشی ئەو بەرجەستەدەکات. کەوابوو، بۆ ئەوەی پێگە ئۆنتۆلۆجییەکە بۆ توێژینەوەکەمان لەسەر سێکس دیاری بکەین پێویستە لە ئارەزوو بکۆڵێنەوە. ئایا ئارەزوو چییە؟ هەروەها، لە سەرەتاوە بپرسین؛ ئارەزووی چی دەکەین؟

پێویســـتە بیرۆکەی ئارەزوو لە چێژوەرگرتن یان ئارەزوو لە کەمکردنەوەی ئازار جیابکەینەوە چونکـــە نازانین چۆن لەمحاڵەتەدا ئارەزوو خـــۆی بە بابەتەکەیەوە دەبەســـتێتەوە. هەموو ئەو بیردۆزانەی لەسەر زەمینەیەکی خۆگەرایەتی دامەزراون ناتوانـــن باس لـــەوە بکەن چۆن ئێمـــە بەتایبەتی حەز لـــە ئافرەتێک دەکەین و حەزەکەشـــمان تەنیا تێربوونێکی سێکسی نییە. لێرەدا باشترە بە هۆکاری بابەتە بەرزەکەیەوە پێناسەی ئارەزوو بکەین. لەگەڵ ئەمەشدا ناگونجێت بڵێین ئارەزوو بۆ داگیرکردنی بابەتێکی ئەستویی حەزلێکراوە ئەگەر مەبەست لە داگیرکردن جوتبوونی سێکســـی بێت. هەڵبەتە جوتبوونی سێکســـی ئارەزووەکەمـــان دادەمرکێنێتەوە، بەتایبەتـــی لەوحاڵەتەدا، کە ئارەزووەکە بە ئازارە و ماندووبوونی لەگەڵدایە. بەڵام لێـــرەدا ئارەزووەکە دەبێت بە بابەتەکە و دەبێت تێپەربکرێت. ئەمەش بە هۆکاری تێڕامانێکی ئاگامەندانەوە ڕوودەدات. خودی ئارەزوو تێڕامانی نییە و ناتوانێت خۆی بکات بە بابەتی بیرکردنەوە و تێپەڕیبکات. تەنیا کەسێکی داوێن پیس خۆی، وەکو ئارەزوو دەبینێت؛ مامەڵە لەگەڵ بوونی خۆی، وەکو بابەت دەکات، دەیوروژێنێت و دایدەمرکێنێتەوە. پێویستە ئەوەش ببینین، کە ئارەزوو دەبێت بە ئارەزوولێکراو.

هەڵەکەش، لێرەدا، لەوەدایە ئێمە واتێگەیشـــتوین جوتبوونی سێکسی ئارەزوو خەفـــەدەکات. لەبەر ئەمە چێژمان بە تێربوونی ئـــارەزوو داناوە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتـــەوە بۆ چەند لایەنێکی دەرەکی (وەکـــو زاوزێ، پیرۆزی منداڵبوون، هێز و توانـــا لـــە تەواوبووندا و هەموو ئەو هێمایانەی بۆ ســـێکس دانـــراون و هتد). لەم ڕووەوە، پیاوە ســـادەکان تەواوبوون دەکەن بە تەنیا ئامانجی ئارەزووەکەیان. ئەمەش بووە بە بنەمای تێگەیشـــتن لە ئارەزوو، وەکو ویســـتێکی سروشتی، کە بناخە و کۆتاییەکەی بە ئەندامەکانی لەشـــی مرۆڤەوە گرێدراون. بۆنموونە، دەبێتە هـــۆکاری وروژاندن و تەواوبوون [لە جوتبووندا]. بـــەڵام خودی ئارەزوو جوتبوون نییە و داواشـــی ناکات. ئەمەش لە منداڵدا یان لەو کەسانەشـــدا دەردەکەوێت، کە نازانن چۆن سێکس بکەن. ئارەزوو، بەهەمانشێوە، ئارەزووکردنی کارێکی شەیدایی نییە؛ فرەجۆری کردەوە سێکسییەکانیش ئەمە دەسەلمێنن، کە لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە دەگۆڕێن. بەگشتی، ئارەزوو ئارەزووی کردەوە نییە. کردەوە پاش ڕووداو دەکەوێت. لە دەرەوەدا دەخرێتە سەر ئارەزوو. لەگەڵ ئەمەشدا گرنگی کاتی

دەســـتگیرانی دەردەخات. تەکنیکی جیاواز بۆ شەیدابوون هەیە. هەر تەکنیکەش ئامێر و کۆتایی خۆی هەیە. مادام ئارەزوو خۆی خەفە ناکات و لە کردەوەکەشـــدا نابێت بە دوا ئامانج، ئەوا ئارەزوو دەبێت ڕوو لە بابەتێکی دەرەکی بکات. ئەمەش مەبەستدارێتی ئارەزووە، لەپێشتر لەسەر بۆچوونەکانی شیلەر و هوسرڵ ئاماژەمان بۆ کرد.

ئایا بابەتی ئارەزوو چییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین ئارەزوو ئارەزووکردنە بۆ لەش؟ لەڕوویەکەوە نکۆڵی لەمە ناکرێت. بەڵام پێویســـتە بە هەڵە لە واتاکەی تێنەگەین. بەدڵنیاییەوە لەش: قۆڵێکی ڕووت یان دەرکەوتنی نیوەی مەمک یان ڕان توشـــی پەرێشانیمان دەکات. با لە سەرەتاوە ئەو خاڵەش لەبیرنەکەین، کە ئێمە قۆڵ یان لایەکی مەمکە ڕووتەکە بە ئامادەبوونی هەموو لەشـــی کەسەکەوە دەبەستینەوە. لەشـــەکە بەگشتی لەوانەیە دەرنەکەوێت، من تەنیا قۆڵەکە دەبینم، بەڵام لەشەکە لەوێدایە. بە هۆکاری ئامادەبوونی لەشەکەوە من دەتوانم قۆڵەکەش ببینم. لەشەکە، وەکو قۆڵەکە ئامادەیە. ئەمەش لە نەخشـــی ئەو مافورە دەچێت، کە لەوێدا هەیە و مێزەکـــە لە منی شـــاردۆتەوە. هەروەها ئارەزووەکەم هەڵـــە ناکات؛ ئەو ڕوو لە کۆی ئەندامانی لەش و توخمەکانی ناکات. فۆرمەکەی بەگشتی دەوێت، باشتروایە بڵێین ئەو فۆرمەی لەو هەڵوێســـتەدا دەوێت. حاڵەتێکـــی تایبەتی، کە لەدواییدا ڕوونی دەکەمەوە، دەبێتە هۆکاری وروژاندنی ئارەزوو. لەگەڵ ئەمحاڵەتە تایبەتییەدا چـــواردەور و جهانیش ئامادە دەبن. کەچی لێرەدا کتوپـــڕ لەگەڵ لایەنە دژەکەدا لەوبەرەوە لەســـەر زەمینەیەکی فزیۆلۆجی ڕادەوەســـتین؟ ئارەزوو لەنێو جیهاندا حەز لە لەشەکە لەنێو بەســـتێنی جیهانەوە و دەستە جوانەکەش لەنێو بەستێنی لەشەکەوە دەکات. ئەمەش لەو خاڵە دەچێت لە بەشەکەی پێشودا ڕوونمانکردەوە چۆن لەشـــی کەســـێکی دیکە بە هەڵوێســـتەوە لەنێو جیهاندا خۆی دەردەخات. ئەمە بۆ ئێمە جێگەی سەرســـوڕمان نییە چونکە ئارەزوو لەگەڵ دەرکەوتنی لەشی کەســـێکی دیکەدا بەرجەستە دەبێت. لەبەرئەم هۆیەشـــە ئێمە حەز لە لەشەکە، وەکـــو بابەتێکی ماتەری ناکەین؛ بابەتێکی ماتەری ڕووت بە هەڵوێســـتەوە ناژی. کەوابوو ئەو هەمووە ئۆرگانیکییەی کتوپڕ بۆ ئارەزوو ئامادە دەبێت لەوێدا دەبێت بـــە بابەتێکی حەزلێکراو، کە ئامادەبونەکـــەی بە تەنیا لایەنێکی زیندووی نەبێت، بەڵکـــو خاوەنی ئاگامەندیش بێت. لەبەر ئەمە بەرجەســـتەبوونی کەســـانی دیکە لەنێو هەڵوێســـتدا، کە ئارەزوو دەیدۆزێتەوە فۆرمێکـــی بنەڕەتییە. بێجگە لەمە، ئەو ئاگامەندییەی باسیدەکەین لایەنێکی بوونی بابەتە حەزلێکراوەکەیە؛ وێنەیەکی جوڵاوی بابەتەکەمان لەنێو جیهاندا دەداتێ، کە دەبێت بە بەشـــێک لەنێو جیهانی مندا. بێگومان، کەسێک دەتوانێت ئارەزووی ژنێکی خەوتو بکات. کەسەکە خەوتنی ژنەکە بە ئاگامەندییەکەیەوە دەبەستێتەوە و لەنێو ڕەهەندی حەزلێکردن لە لەشی

دەمێنیتەوە. واتا بۆ هەموو لەشی پەیدادەکات. لەشێکی زیندو، وەکو هەموویەکی ئۆرگانیکی لەنێو هەڵوێستدا ئاگامەندانەیە؛ ئەم بابەتەیە ئارەزوو دەیەوێت بیگاتێ. ئایا ئارەزوو چی لەم بابەتە دەوێت؟ ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەست ناکەوێت تاکو پرسیارێکی لەپێشتر وەڵام نەدەینەوە: ئایا ئەو کەسەی ئارەزوومەندە کێیە؟ وەڵامەکە ئاشکرایە. ئەو کەسە (من)م. ئارەزووش شێوازێکی خۆیەتی منە. هەروەها ئارەزوو ئاگاییە چونکە دەتوانێت خۆی بناسێت. لەسەرو ئەمەشەوە پێویست ناکات ئەم جۆرە ئاگاییە لەو ئاگاییەوە جیابکەینەوە، کە دەبێتە سەرچاوەی زانین. بوون-بۆ-خۆ ئەو کاتەی خۆی، وەکو ئارەزوو هەڵدەبژێرێت، بەپێچەوانەی (هۆکار) ی ڕواقییەکان، کە هۆکرد پەیدادەکات، ئەم ئارەزوو دروستناکات. بوون-بۆ-خۆ خۆی دەخاتە سەر زەمینەی شێوازێکی بوونی، کە لە شێوازەکانی دیکەوە، بۆنموونە شێوازێکی بوونی مێتافیزیکییەوە، جیاوازە. هەموو ئاگاییەک، بەو جۆرەی لەپێشتر بینیمان، پشتگیری پەیوەندییەکی خۆی لەگەڵ فاکتۆرێکدا دەکات. ئەم پەیوەندییەش بەگوێرەی شێوازی ئاگاییەکە دەگۆڕێت. فاکتۆری ئازار لە ئاگامەندییدا لە کاتی ڕاکردنێکی بەردەوامدا دەردەکەوێت. ئەمەش بۆ فاکتۆری ئارەزوو دروست نییە. ئەو مرۆڤەی ئارەزوومەندە بوونی لەش لە شێوازێکی تایبەتدا نیشاندەدات. هەموومان لەو باوەڕەشدایین، کە ئارەزوو (شەوق) نییە. ئارەزوو، بەگوێرەی پێناسەکەی گرفتە. چەمکی (گرفت) باشتر واتای ئارەزوومان پێدەدات. ئێمە ئاوێکی پەنگخواردوو لەگەڵ ئاوێکی ڕووندا دژوەستاو دادەنێین و بە ئاشکرا لە یەکدییان جیادەکەینەوە. ئاوە پەنگخواردووەکە هەر ئاوە؛ جوڵانی ئاوەکە و ئەم خەسڵەتە بنەڕەتییەی ڕاگرتوە؛ ڕوونییەکەی توشی گرفت بووە. ئێمە دەتوانین گرفتەکە بە هۆکاری وردیلە ڕەقەکانی سەر ئاوەکە ڕوونبکەینەوە، بەڵام ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی زانستانەیە. تێگەیشتنی بنەڕەتی ئێمە لە ئاوە گیرخواردووەکە لە گۆڕانی ئامادەبوونی شتێکی نادیاردایە، کە وەکو فاکتۆرێکی بەرگریکەر خۆی ڕاگرتوە. گرفت و ئاست تەنگی ئاگامەندی ئارەزووش لە ئاوپەنگخواردووەکە دەچێت.

بۆ ئەوەی لەم لێکچونە باشتر تێبگەین، پێویستە ئارەزووی سێکسی لەگەڵ برسێتیدا بەراوردبکەین. برسێتی، وەکو ئارەزووی سێکسی، ئاماژە بۆ حاڵەتێکی لەش، کە لێرەدا بە کەمی خوێن و ئاوکردنی نێو دەم و گرژبوونەوەی گەدە و هتد دەکات. ئەم دیاردانە بۆ بوون-بۆ-خۆ فاکتۆری ڕووتن و دەیەوێت لە دەستیان ڕابکات و ڕوو لە ئەگەرەکانی بکات؛ دەیەوێت تێر بێت بەو شێوەیەی لە بەشی دووەمی ئەم نوسراوەدا باسمانکرد. کەوابوو، برسێتی تێپەڕکردنی فاکتۆرەکانی لەشە. ئاگامەندیش بەبێ تێڕامان لەم فاکتۆرانە بە ئاگایە. لەش لێرەدا دەبێت بە ڕابردوو، هەروەها شتێکی تێپەڕکراو. لەئارەزوی سێکسیدا، بەدڵنیاییەوە،

بونیادێکـــی هاوبەش بۆ هەمـــوو تامەزۆکردنەکان-حاڵەتەکانی لەش پەیدادەکەین. کەســـەکەی بەرانبەریشمان گۆڕانکارییەکانی ئەندامانی لەشمان (هەستانی ئەندامی نێرینە، ڕەقبوونی گۆی مەمک، ســـوڕانەوەی خوێن، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش و هتد) دەبینێت. ئاگامەندییە ئارەزوومەندەکە ئەم فاکتۆرە دەهێنێتەکایەوە. بـــە هۆکاری ئەم فاکتۆرەوەیە ئێمەش دەڵێین، لەشـــەکە خـــۆی وەکو حەزلێکراو دەردەخات. بەڵام ئەم تێگەیشـــتنە ئارەزووی سێکســـی دوور دادەنێت. دەبێت بە ڕاکردنێکی ڕووت لە فاکتۆر و ڕووکردن بەرەو ئەگەرە جیاوازەکان. هەموو کەسێک دەزانێت، کە بۆشـــاییەکی گەورە لەنێوان ئارەزووی سێکسی و تامەزۆکردندا هەیە. هەمووومان ئەو گوتەیەمان لە یادە، کە دەڵێت "وەکو چۆن زۆر تینوتە و پەرداخێک ئاوی ســـارد دەخۆیتەوە، ئەو کاتەش لەگـــەڵ ژنێکی جواندا جووت بە، کە حەزی لێدەکەیت." ئەم گوتەیەش بیرکردنەوە لەسەری ڕازی نابێت، چونکە ئێمە ئەو کاتەی ئارەزوومەندی ژنەکەین خۆمان لە دەرەوەی ئارەزووکردنەکەدا نابینین. ئارەزوو من توشی سازشـــکردن دەکات. من تەواوکەری ئارەزووەکەمم. با هەموو کەسێک بیر لە ئەزموونـــی خۆی بکاتەوە؛ ئەو تێدەگات چۆن ئارەزووی سێکســـی ئاگامەندی تەوقدەکات؛ فاکتۆر داگیریدەکات و ناتوانێت لە دەستی ڕابکات. دواجاریش بێدەنگ خۆی دەخاتە بەردەستی ئارەزووەکەی. لەحاڵەتەکانی دیکەدا، دەردەکەوێت فاکتۆر ئاگامەندی داگیردەکات و دەیئاوسێنێت.

بەوجۆرەی باسی ئارەزوومانکرد خەسڵەتەکەی دیاریدەکات. ئێمە گوتمان، کە ئارەزوو تۆ دەگرێت و ئیفلیجت دەکات. ئایا دەتوانرێت بەمجۆرە باســـی برســـێتی بکرێت؟ ئایا برســـێتی زۆر بۆ کەسێک دەهێنێت؟ لەڕاستیدا ئەمحاڵەتە لەوێدا واتا بەخشـــە، کە چەمکی بۆشایی هەبێت. بەپێچەوانەشەوە، تەنانەت ئارەزووکردنێکی کەمیش زۆر بۆ کەسەکە دەهێنێت. کەسێک ناتوانێت بەو جۆرەی لە برسێتییەکەی ڕادەگرێت و بیر لەشـــتێکی دیکە دەکاتەوە، ئارەزووەکەی دوور ڕابگرێت. ئارەزوو ڕازیکردنـــی ئارەزووە. کتوپڕ ئەو مرۆڤەی ئارەزوومەندە دبێت بە ئارامییەکی گران و ترسناک. چاوەکانی دەچەقن و بە نیوە داخراوی دەمێننەوە. جوڵانەکانی لەشی مۆری گرانی و شیرینییان پێوە دەلکێت؛ هەندێک لەم مرۆڤانە لەوەدەچێت خەواڵوبن. کاتێک "دژی ئارەزووش ڕادەوەســـتیت"، بەرەنگاری ئەم حاڵەتە دەکەیت. ئەگەر کەسێک بەرگری بکات پێش لەناوچونی ئارەزووەکە وەکو برسێتی دوور دەکەوێتەوە و کەسەکە لەخەو ڕادەچڵەکێت. بە سەرێکی گران و خێرالێدانی دڵییەوە هەست بە شلبوونی خۆی دەکات. هەڵبەتە ئەم باسکردنە تەوا نییە: ئەو ڕێگایانە نیشاندەدەن ئێمە بە هۆیانەوە ڕاڤەی ئارەزوو دەکەین. بەهەرحاڵ، فاکتۆری ســـەرەکی ئارەزوو دەردەخـــەن: ئاگامەندی لە ئارەزووکردندا لـــە زەمینەیەکی دیکەدا فاکتۆری خۆی دەدۆزێتەوە. ئەو لە دەســـتی ڕانـــاکات و دەیەوێت خۆی بخاتە ژێر دەســـتەڵاتی

هەڵکەوتی خۆیەوە، بۆنموونە، لەو کاتەدا لەشی کەسێکی دیکە دەبینێت و حەزی لێدەکات. بەگوێرەی ئەم واتایە ئارەزوو تەنیا ئاشـــکراکردنی لەشی کەسێکی دیکە نییە، بەڵکو بەرجەســـتەکردنی لەشـــی منیشـــە. ئەمەش، لەوێدا، کە ئەم لەشە نـــەک ئامێرە و بنکەی بۆچوونە بەڵکو فاکتۆرێکـــی ڕووتە؛ فۆرمێکی هەڵکەوتوی هەڵکەوتنی پێویســـتی بوونی منە. هەست بە هەناسەدان و ماسولکەکانم دەکەم. نەک بـــۆ ئەوەی تێپەڕیان بکەم بەو جۆرەی لەســـۆز و تامەزرۆکردندا ڕوودەدات. ئـــەوان ژیانی من و ڕاســـتییە نەجوڵاوەکانمن. لە ڕێگـــەی ئەوانەوە خۆم دەخەمە نێو مەترســـییەکانی جیهانەوە. بوون-بۆ-خۆ ئـــەم هەڵکەوتە نییە. ئەو لە بوونیدا بەردەوامە و هەســـت بە لەشی خۆی دەکات یان ئەگەر بتەوێت، دەتوانین بڵێین، ئەو سەرســـوڕمانە شێوازی بوونی لەشێتی. ئاگامەندی بەبێ تێڕامان بەسەر لەشدا دەگوزەرێـــت، . حەزدەکات ببێت بە لەش و تەنیا لـــەش بێت. لە ئارەزوودا، لەش لـــە بری ئەوەی ببێت بە هەڵکەوتەی بوون-بۆ-خۆ دەیەوێت لە دەســـتی ڕابکات و خۆی بە ئەگەرەکان بگەیەنێت. ئارەزوو تەنیا ڕوو لە لەشی کەسێکی دیکە ناکات؛ ئەو یەکێتییەکی کردەوەیە پرۆژەیەکی ئاوســـاوی لە تێڕمان بەدەرە لەنێو لەشدا. کەوابوو، بورانەوە دوا قوناخی ئارەزووی سێکسییە بۆ ڕازیکردنی لەش. لەم ڕووەوە دەتوانین ئارەزوو بە ئارەزووکردنی لەشـــێک بۆ لەشێکی دیکە دابنێین و دەبێت بە تامەزرۆکردنی لەشی کەسێکی دیکە. بوون-بۆ-خۆش بە سەرسوڕمانەوە لەبەردەم لەشـــی خۆیدا ڕادەگرێت. ئەو بوونە ئارەزوومەنـــدە ئاگاییە، کە خۆی دەکات بە لەش.

گریمان ئارەزوو ئاگامەندییە و بۆ گەیشـــتن بە لەشـــی کەسەکەی دیکە خۆی دەکات بـــە لەش، ئایـــا واتای ئارەزوو چییە؟ بۆچـــی ئاگامەندی خۆی دەکات بە لەش؟ چی لـــە بابەتە حەزلێکراوەکە دەوێت؟ ئەگەر لەوەتێبگەین، کە ئارەزوو بۆ گەیشـــتن بە لەشی کەسێکی دیکە خۆی دەکات بە لەش وەڵامی ئەم پرسیارانەش ئاسان دەست دەکەون. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە من دەمەوێت شانی ئەو بگرم یان دەست لە لاقی بدەم و لەشم بە لەشییەوە بنوسێنم. گرنگە من ئەوانە بە ئامێرێکەوە گرێبدەم، کە لەشی ئەوە و ئاگامەندی تەوقدەکات. لە کاتێکدا دەست لە شـــانی دەدەم بە تەنیا شانی ئەو نادۆزمەوە لەشی خۆشم لەگەڵیدا بەرجەستە دەبێت، دەبێتە فاکتۆرێک و بوونم، وەکو گۆشـــت قوتدەکاتەوە. کەوابوو، ئارەزوو ئارەزووکردنە لە بوون بە خاوەنی لەشـــێک، کە من بە هۆیەوە لەشی خۆم، وەکو گۆشـــت دەبینم. بەڵام ئەو لەشەی من دەمەوێت ببم بەخاوەنی دەبێ گۆشت بێت. لە سەرەتادا لەشی کەسەکە بەم شێوەیە خۆی بۆ من دەرناخات؛ ئەو تێهەلکێشەی کردەوەکانە. وەکو گۆشت نایبینین. هەروەها، لەشەکە لەنێو هەڵوێستدایە. گۆشت، بەپێچەوانەوە، هەڵکەوتێکی ڕووتـــی ئامادەبوونە و خۆی بە مکیاج و جلوبەرگ و

هتد، لەســەر و ئەمانەشــەوە بە جولانەکەی خۆی شاردۆتەوە. ئارەزوو دەیەوێت جوڵانەکان و جلەکان لە لەش دامالێت و ڕووتی کاتەوە؛ ئەمەش هەوڵدانێکە بۆ دانانی کەسەکە لەنێو گۆشتدا. لەم لایەنەوە، دەست لەملکردن دەبێت بە بە خاوەنبوونی لەشی کەسەکەی دیکە. ئەگەر دەست لەملکردنەکە تەنیا ڕووکەشی بێت پەیوەندی دروستناکات و ئارەزووەکەش تیرناکات: وەکو تەماشاکردن لە دەرەوە دەمێنێتەوە و منیش ناکات بە خاوەنی کەســەکەی دیکە. ئێمــە دەزانین واتای ئەو گوتەیە، "پێست بەر پێست دەکەوێت" چییە. دەست لەملکردنەکە تەنیا دەست بەر یەکدی کەوتنە. ئەو کاتەی تەنیا بە دەســت لێدان دادەنرێت واتاکەشی وندەبێت. دەست لەملکردن دەست لێدانێکی ڕووت نییە. لەشی کەسەکەی دیکە، وەکو گۆشت لەگەڵ دەســت لەملکردنەکەدا لەژێر پەنجەکانی مندا لە دایکدەبێت. دەست لەملکردنەکە دامەزراندنی ئەو نەریتانەیە، کە کەســەکە دەخاتە نێو لاشەوە. دەشێ لەسەر ئەم خاڵە ڕەخنەمان لێبگرن و ئەو پرســیارەش بکرێت، کە ئایا کەسەکە لەنێو لاشەدا نەبوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەوردی نەرێیە. مادام من کەسەکەم لەنێو هەڵوێستدا بینیوە لەشی ئەو، وەکو گۆشت بۆ من ئاشکرا نابێت. تەنانەت بۆ ئەویش بەو شێوەیە دەرنەدەکەوت چونکە ئەو بۆ ڕووکردن لە ئەگەرەکانی، لەشــی خۆی تێپەردەکرد. دەستلەملکردنەکە ئەوی، وەکو گۆشت هێنایە بوونەوە. مەبەست لە گۆشت و پێست و خانەی لەش نییە. بەڵکو داماڵینی لەشە لە کردەوە و ئەگەرەکانی. پەردەلادانە لەســەر تۆڕێکی نەبزێو لەودیو کردەوەکانەوە و مانــەوەی بوونێکی ڕووتە لەوێدا. کاتێک دەســتی کەســەکە دەگرم و دەیگوشم هەســت بە گۆشت و ئێسقانەکانی لەنێو دەســتمدا دەکەم. بەهەمانشێوەش تەماشــاکردنەکەم لەودیو بازدان و لاقی سەماکەرەکەوە چرچی ڕانیم بۆ دەردەخات. کەوابوو، دەستلەملکردنەکە و ئارەزوو یەک شــتن. ئارەزوو لە دەســتلەملکردنەکەدا، وەکو بیرۆکە بە زمان، دەردەبڕێت. دەســتلەملکردن کەسەکە و من بۆ کەســەکەش، وەکو گۆشت بەرجەستەدەکات. بەڵام بەرجەســتەبوونەکە بەشێوەیەکی تایبەتییە. کەســەکە دەکات بە نەبزێو و بەرزێتییەکی بەرزێتی ناچالاک. بەڵام مەبەســت لە دەستملکردنەکە ئەمە نییە. لە دەســتملکردندا لەشی من تێهەڵکێشەی کردەوەکان نییە؛ بووە بە گۆشت و بوونی کەسەکەش، وەکو گۆشت دەهێنێتەکایەوە. دەستلەملکردنە بەوجۆرە دانراوە تاکو لەشی کەســەکە لەنێو چێژوەرگرتندا دروستبکات. لەشــی هەردووکمان دەبن بە دوو شــتی ناچالاک و بەر یەکدی دەکەون. لەبەر ئەمەشە، شەیدایی و دیاردەکانی زمانی خۆیان هەیە و پێویســتە لەســەری بکۆڵینەوە. لەوانەیە دەســتی خۆم بە بابەتێکی بێ ژیان دابنێم کاتێک بەرزی دەکەمەوە و لەتەنیشت ژنەکەوە، کە خۆشم دەوێت دایدەنێم. پەنجەکانم بەسەر قۆڵییەوە لە کۆتایی دەستمدا دەبن بە نەبزێو. بەمجۆرە، ئاشــکرابوونی گۆشتی لەشی کەســەکە ئاشکرا بە بوونی گۆشی لەشی

منەوە بەســـتراوە. لە ئارەزووکردن و دەستلەملکردنیشـــدا، کە ئارەزووەکەی لێوە دەردەکەوێت، بۆ ئەوەی کەسەکە لەنێو لەشدا ببینم دەبێت لەشی خۆمم لا ئاشکرا بێـــت. بوونی خۆم لە پێناوی بوونی ئەودا دەکەم بە گۆشـــت و ئەویش بەوجۆرە خۆی بۆ من نیشاندەدات. ڕێگەی پێدەدەم بە هۆکاری لەشییەوە چێژ لە لەشی من وەرگرێت و لەشـــی خۆشی بناسێت. خاوەنێتی[کەسەکەی دیکە] لەم دوو لایەنەی چوونە نێو لەشەوەیە. ئارەزوو دەیەوێت ئاگامەندی بچێتە نێو لەشەوە تاکو لەشی کەسەکەی دیکە بەرجەستەبکات.

پێویســـتە هاندەری ئارەزوو بناســـین یان لە واتاکەی تێبگەین. هەرکەسێک لە توێژینەوەکان تێبگات ئەو خاڵەی بۆ دەردەکەوێت، کە بوون-بۆ-خۆ، بۆ ئەوەی هەبێت، شـــێوازی بوونی لەســـەر زەمینەی ڕەهای هەڵکەوتنی بونی-لەوێدا، هەڵدەبژێرێت. ئارەزووش بەو جۆرەی ئاگر ڕوو لە پارچەیەک ئاسن دەکات و گەرمی دەکات، ڕوو لە ئاگامەندی ناکات. ئاگامەندی بوونی خۆی، وەکو ئارەزوو هەڵدەبژێرێت. هەڵبەتە پێویســـتی بە هاندەریش بۆ ئەم مەبەســـتە هەیە؛ من لە خۆڕا و هەموو کاتێکیش ئارەزوومەند نیم. ئێمە لە بەشی یەکەمی ئەم پەرتووکەدا باسمانکرد چۆن ئاگامەندی ڕوو لە هاندەرەکانی ڕابـــردوو دەکات و گرانی و بەهاکانیان دیاریدەکات. کەوابوو، جیـــاوازی لەنێوان هەڵبژاردنی هاندەرێکی ئارەزوو لەگەڵ واتای شـــاڵاوکردنەکەیدا لەنێو هەر ســـێ ڕەهەندەکەی کاتدا نییە. ئارەزوو، وەکو هەموولایەنەکانی سۆز و ئەندێشە و هەڵوێســـتەکانی بوون-بۆ-خۆ خاوەنی واتایەکە، کە پێکی دەهێنێت و تێپەریشـــی دەکات. ئەم ڕوونکردنەوەیەش ئەگەر ڕووبەڕووی پرســـیاری دیکەمان نەکاتەوە بێ کەڵکە. لەبەر ئەمە پێویســـتە بپرسین، بۆچی ئاگامەندی لە شیوازی ئارەزوودا خۆی لەناودەبات؟ یەک دوو ســـەرنجی سەرەتایی یاریدەی تێگەیشتنمان لەم پرســـیارە دەدەن. پێویســـتە بزانین ئاگامەندی ئارەزووکەرەکە ئارەزوومەندی بابەتێک لەنێو جیهانێکی نەگۆڕدا ناکات. ئەمە بۆ ســـۆزیش دروستە. لە شوێنێکی دیکەشـــدا ئەو خاڵەمان باسکرد، کە ســـۆز خاوەنێتی بابەتەکەی لەنێو جیهانێکی نەگۆڕدا ناکات. مادام داوای پەیوەندی بە جیهانەوە دەکات، دەیەوێت ڕادیکاڵانەش بیگۆڕێت. بەهەمانشـــێوە، ئارەزووی سێکسی گۆڕانکارییەکی ڕادیکاڵە لە بوون-بۆ-خۆدایە. بوون-بۆ-خۆ لەم ئارەزووکردنەدا خۆی لەســـەر زەمینەیەکی دیکەی بوون ڕادەگرێت؛ بوونی لەشـــی بە شێوەیەکی جیاواز دەردەخات و خۆی لەنێو فاکتۆردا گیرخـــواردوو دەکات. هەروەها، جیهانیش بۆ بوون-بۆ-خۆ بە شـــێوەیەکی جیاواز دەردەکەوێـــت و دەبێت بە جیهانی ئارەزوو. ئەگەر لەشـــم ئەو ئامێرە نەبێت هیچ ئامێریکی دیکە سودی لێوەرگرێت، بۆنموونە تەنیا تێهەڵکێشەی کردەوەکانم بێت، وەکو گۆشـــت هەبێت ئەوا بەو بابەتەی دادەنێم، کە لەنێو جیهاندا دەیناسم. واتە، لەشم بە ناچاک و نەبزێو لە پەیوەندییەکەیدا بە بابەتەکانەوە دەبینم. بابەتەکانیش

خۆیـــان بۆ بۆچوونی ئەم بنکـــە نەبزێوە دەردەخەن. دەبن بە دامەزراوێکی بەرز و بوونی من لەنێو لەشدا دیاریدەکەن. هەموو پەیوەندییەک لەگەڵیاندا دەستلەملکردنە؛ هەستکردنەکەم نابێتە سەرچاوەی سودوەرگرتن لە بابەتەکان و تێپەڕکردنی ئێستا. هەســـتکردن بە بابەتێک، ئـــەو کاتەی من ئارەزوومەندم، دەســـتلەملکردنی من و بابەتەکەیە. کەوابوو، من گوێنادەمە فۆرم و شێوەی بە ئامێربوونی بابەتەکە و ئەو توخمانەی دروستیانکردوە. لە هەستکردنی ئارەزووەکەمدا لەش و گۆشتی بابەتەکان دەدۆزمەوە. کراســـەکە بە پێستمەوە نوساوە و دەجوڵێت و هەستی پێدەکەم. ئەو بابەتەی دوورە ڕاستەوخۆ هەستی پێدەکەم؛ گەرمی هەواکە، جوڵەی باکە، تیشکی ڕۆژ، هتد: لە شـــێوازێکدا بۆ من هەن، دوورییەکەیان نەماوە و لە ڕێگەی لەشـــی خۆیانەوە لەشـــم دەردەخەن. لەبەر ئەمە، ئارەزوو تەنیـــا تەوقکردنی ئاگامەندی بـــە فاکتۆر نییە. لە پەیوەندییەکەیدا لەشـــم دەخاتە نێو تۆڕی جیهانەوە. جیهان دەبێت بە تۆڕ: ئاگامەندیش لەنێو لەشدا و لەشیش لەنێو جیهاندا گەمارۆ دەدرێت. ئەو شێوازی بوونەی لێرەدا دەمانەوێت، بوونە-لەنێوان-هەموو بابەتەکانی جیهاندا. بوون-بۆ-خۆ دەیەوێت لەم بوونە، وەکو دوا پرۆژەی لەنێو جیهاندا بناسێت. لەبەر ئەمەشـــە، زۆرجار، چێژی هەســـتەکی بە مردنەوە دەبەسترێتەوە و بە گۆرانکاری یان بوون-لەنێوان-جیهاندا دادەنرێت. لە ئەدەبدا جۆرە مردنێکی ســـاختە بەردەوام باســـدەکرێت. بەڵام، ئارەزوو پێش هەموو شـــتێکە و لە سەرەتاشەوە پەیوەندی بـــە جیهانەوە نییە. جیهـــان، وەکو زەمینە بۆ پەیوەندییەکە لەگەڵ کەســـەکەی دیکەدا دەبینرێت. ئامادەبوونی کەســـەکە جیهان، وەکـــو زەمینەیەک بۆ ئارەزوو دێنێتەکایەوە. وەکو کەلوپەل، لەگەڵ ئامادەنەبوونی کەسەکەی ئێمە مەبەستمانە یان هەموو ئەوانی دیکە خۆی بەرجەستەدەکات. ئێمە ڕوونمانکردەوە ئامادەنەبوون پەیوەندییەکی بوونگەرانە و کۆنکرێتی نێوان من و کەسانی دیکەیە. بێگومان، من دەتوانم، ئەو کاتەی تەنیاشم، لەشی خۆم ببینم، هەست بە گۆشتی بکەم، ئارەزووە خنکاوەکانم و جیهانش بە خنکاوی ببینم. بەڵام ئارەزووەی تەنیایی ئارەزووکردنە بۆ کەسێکی تایبەت یان بۆ کەسێکی دیارینەکراوە.

من ئارەزوودەکەم بوونم ببێت بە گۆشـــت بۆ گۆشتێکی دیکە. دەمەوێت جادو لە کەســـەکەی دیکە بکەم و خۆی بۆ من لە شوێنێکی تایبەتدا دەربخات. ئارەزوو ڕووداوێکی فزیۆلۆجـــی نییە، خواردنی لەش نییە. بەپێچەوانەوە، بۆ ئەوەی من و کەســـەکە بۆ یەکدی ببین بە گۆشت پێویستە ئاگامەندی خۆی بخاتە نێو فۆرمی ئارەزووکردنەوە. ئارەزوو شێوازێکی سەرەتایی پەیوندی نێوان من و کەسانی دیکەیە؛ کەسانی دیکە لەنێو جیهانی ئارەزوودا دەکات بە لەشێکی حەزلێکراو. لێرەدا، ئێمە دەتوانین واتای ئارەزوو ئاشکرا بکەین. لە ئاستی تەماشاکردنی کەسانی دیکەدا من خۆم، وەکو تەماشا پێکدەهێنم. بۆ ئەوەی خۆم لە سەربەستییەکەی کەسانی دیکە

بپارێزم و ڕەتیبکەم، تەماشـــایدەکەم. سەربەستی و تەماشاکردنەکەی دەڕوخێنم. ئەویش من دەڕوخێنێت. لەمحاڵەتەدا پێویســـتە سەربەســـتییەکەی داگیربکەم و ببـــم بە خاوەنی یان بـــەلای کەمەوە زۆر لە سەربەســـتییەکەی ئەو بکەم بڕوا بە سەربەســـتییەکەی من بهێنێت. بەڵام ئەم سەربەستییە مردنە؛ لەنێو ئەو جیهانەدا نییە، کە من تیایدا دەژیم و کەسەکەی دیکەش لەنێویدا بووە بەبابەت. یەکێک لە خەســـڵەتەکانی کەسانی دیکە ئەوەیە جیهان ڕەتبکات. بەدڵنیاییەوە، من دەتوانم کەسەکە بگرم و بیدەم بە زەوییدا. ئەگەر لەو بەهێزتربم زۆری لێدەکەم ئەم یان ئەو کارەشـــم بۆ بکات یان بە دڵی من بدوێت. لەسەرو ئەمانەوە من دەمەوێت کەسێک داگیر بکەم بتوانێت ڕابکات و تەنیا چاکەتەکەی بە دەســـتمەوە جێبمێنێ. منیش ئەوەم دەبم بە خاوەنی چاکەتەکەی. هەرگیز ناتوانم بێجگە لە لەش لەنێو جیهاندا شتێکی دیکە داگیربکەم. هەڵبەتە هەموو کردەوە و ڕەفتارێکی ئەو لەشە پەیوەندی بە سەربەســـتییەوە هەیە، بەڵام کلیلی ڕاڤەکردنەکەم بۆ بەستێنی سەربەستییان وونکردوە. من تەنیا کار لەســـەر فاکتۆر دەکەم. هەروەها، ئاگاییەکەشم دەگۆڕێت. تێگەیشتنم لە بوونێکی تەماشاکراو، کە تەنیا ڕێگەیەکە بۆ سەلماندنی سەربەستی کەســـانی دیکە، لەناودەچێت. کەوابوو، من خۆم لەگەڵ پرۆژەیەکدا ماندوودەکەم بەبێ ئەوەی واتاکەیم لەبیر بێت. من کەســـەکەم گرتووە و دەستی لێدەدەم، بەڵام نازانم چی لێبکەم. ئێستا، لەمحاڵەتەدا، خۆم دەکەم بە ئارەزوو. ئامانجی ئارەزوو سەرنج ڕاکێشانە. مادام من کەسەکە، وەکو فاکتۆرێکی بابەتی دەگرم، دۆزینەوەی سەربەســـتییەکەی لەنێو فاکتۆرەکەدا دەبێت بە کێشە. پێویستە گرتنەکە، وەکو گرتنی سەرتوێژی ماست بێت. بوون-بۆ-خۆی کەسەکە بێتە سەرەوە و منیش بتوانم بە گرتنی لەشی دەست لە سەربەستییەکەی بدەم. ئەمە واتای تەواوی خۆیەتییە. دروســـت من دەمەوێت لەشی کەســـەکەی دیکە داگیربکەم، بەڵام دەمەوێت لەشی لە ئاگامەندی ئەو جیانەبێتەوە. ئەمەش وێنەیەکی مەحاڵی ئارەزووە: داگیرکردنی کەسێکی دیکە، وەکو بەرزێتییەکی ڕووت و لەش کەمکردنەوەیەتی بۆ فاکتۆر چونکە ئەو لەنێو شتەکانی جیهاندا دادەنرێت و بەرزێتییەکەشی بەردەوام لەناودەچێت.

لەڕاســـتیدا، بەبـــێ گۆڕانکاری لە بوونـــی خۆمدا ناتوانم لـــە فاکتۆری بوونی کەسەکە تێبگەم. بەو ڕادەیەی من فاکتۆری بوونم ڕەتدەکەم و ڕوو لە ئەگەرەکانم دەکەم، هەڵدێم و من فاکتۆری بوونی کەســـەکە و شـــتەکانیش جێدەهێڵم. لەگەڵ سەرهەڵدانەکەی بوونمدا ئەوانیش دەبن بە ئامێر و دەردەکەون؛ بوونە سادەکەیان لەودیو تۆڕە ئاڵۆزەکەی بە ئامێربوونیان دادەپۆشرێت. هەڵگرتنی پاندانەکە ئاماژە بۆ دەرچوونم بەرەو ئەگەری نوســـین دەکات؛ هەمانکات تێپەڕکردنی پاندانەکەشە، وەکو هەبوویەکی سادە و خاوەنی لایەنی هێزەکی خۆی. من ئەم لایەنە هێزەکییەشی بـــەرەو هەبوویەکی داهاتوو، کە (ئەو وشـــانەیە خەریکە دەنوســـرێن) ڕەتدەکەم.

دواجاریش ئەگەرەکـــەم دەبێت بەو (پەرتووکەی خەریکە بنوســـرێت.) لەبەر ئەم هۆیەشـــە بوونی هەبووەکان لەژێر هەڵسوکەوتەکاندا شاراونەتەوە. ئەمە بۆ بوونی کەســـانی دیکەش دروستە. ئەگەر کەســـەکەی دیکە نۆکەر بێت یان کەسێک بێت خۆمی لێبشـــارمەوە، ئەو دەنگە بێت لە ژوورەکەی دیکەوە دێت و دەمەوێ تێیی بگەم (یان ئەو دەستە بێت دەمەوێت لەبیر خۆمی بەرمەوە چونکە نایەڵێت بخەوم)، تەنیـــا بەرزێتی ئەو نییە لە دەســـت مـــن ڕادەکات، بەڵکو (بوونی-لەوێدا)، وەکو هەڵکەوت لەنێو شـــتەکانی جیهانیشدا خۆی لە من دەپارێزێت. من چۆن فاکتۆری بوونم ڕەتدەکەم و لەناوی دەبەم، لە مامەڵەکردنەکەمدا لەگەڵ کەســـەکە و دانانی بە نۆکەر یان فەرمانبەر فاکتۆرەکانی ئەویش تێپەڕدەکەم.

ئەگەر بمەوێت بۆ ئامادەبوونە ســـادەکەی بگەڕێمەوە و تامی بکەم، پێویســـتە بوونی خۆشـــم بخەمە ئاستی ئامادەبوونی ســـادەوە. لەگەڵ هەموو تێپەڕبوونێکی بوونم-لەوێدا بوونی کەســـەکەش-لەوێدا تێپەڕدەکەم. ئەگەر جیهان لە چواردەورم بێت و هەڵوێســـتی خۆمی تێدا دیاریبکەم، کەســـەکەی دیکەش، وەکو هەڵوێست دەبینم و دەبێت بە بنکەی ئاماژەکردنەکان.

بێگومان کەســـە حەزلێکراوەکەش دەبێ وەکو هەڵوێســـت بناسرێت: من حەزم لە ژنێکە لەنێو جیهاندایە، نزیک مێزەکە ڕاوەســـتاوە، بە ڕووتی لەســـەر جێگاکە ڕاکشـــاوە یان لە تەنیشتمەوە دانیشـــتوە. ئەگەر ئارەزوو لە هەڵوێستەوە ڕوو لەو بوونە بکات، کە لەنێو هەڵوێســـتدایە ئەوا بۆ لە ناوبردنی هەڵوێستەکە و ڕاگرتنی پەیوەندی کەسەکەیە بە جیهانەوە. جوڵانی ئارەزوو لە (ژینگەی) دەروبەرەوە بەرەو کەســـە حەزلێکراوەکە جوڵانێکی دابڕاوە و دەوروبەرەکـــەش لەناودەبات. ئەمەش لەوێدا ڕوودەدات، کە هەموو ئەو بابەتانەی ئاماژە بۆ کەسەکە دەکەن هەڵکەوتێکی نەگۆڕ بن و کەسەکەش بۆ من دەربخەن. ئەمجۆرە گەڕانەوەیەش بۆ بوونی کەسەکە گەڕانەوەیە بۆ بوونی من-لەوێدا. من بۆ لەناوبردنی ئەگەرەکانی جیهان و دامەزراندنی جیهانـــی ئارەزووەکانم ئەگەرەکانی خـــۆم لەناودەبەم؛ بوونیادی جیهان دەگۆڕم و واتاکەی دەڕوخێنم. مادام بوون-بۆ-خۆش هەڵبژردنە، دەبێت من پرۆژە دابمەزرێنم و ڕوو لە ئەگەرە نوێکانم بکەم؛ لەشم، وەکو کاغەزەکە مەرەکەب هەڵدەمژێت، لەشم دەبێت بە بوون-لەوێدا. ئەم پرۆژەیە، لەبەر ئەوەی پێویستی بە ئەزمونی ژیانە لە گرفت بەدەر نییە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت من بۆ دۆزینەوەی بوونی کەسانی دیکە لەوێدا بە مەبەســـتەوە خۆم توشی گرفت بکەم. ئارەزوو ئەزموونی ژیانە پێویستی بە مەبەست بۆ ڕاڤەکردنی واتاکەی نییە.

کاتێـــک لەبەردەم فاکتۆری بوونی کەســـەکەدا ڕادەوەســـتم و حەزدەکەم کردار و ڕەفتارەکانی بخەمەلاوە، دەســـتی لێبدەم و بیگرم، پێویســـتە لەنێو لەشـــدابم. لەگـــەڵ بینینی ئەو لەنێو لەشـــدا دەبێت خۆشـــم لەنێو لەشـــدا ببینم. تەنانەت

ئارەزوویەکی پوچەڵیش (کاتێک بە نەزانی لە تەماشاکردنێکدا ژنێک بە ڕووتی دێتە بەرچاومان) گرفتێکی پوچەڵـــی لەدوایە، چونکە ئارەزووم لە گرفت بەدەر نییە و بەبێ ڕووتکردنەوەی خۆم ناتوانم کەســـەکەی دیکە ڕووتبکەمەوە. کە لەشی خۆم بینی لەشی کەسەکەش دەبینم. بینینی خۆم لەنێو لەشدا تەنیا مەرجیش بۆ بنینی لەشـــی کەســـەکەی دیکە نییە. من دەمەوێت ئەویش خۆی لەنێو لەشیدا ببینێت. گرنگە ئەو بەرەو فاکتۆری بوونی خۆی ڕاکێشم و خۆی بە لەش یان گۆشت دابنێت. کەوابـــوو، دەبێ لە ئەگەرە بەردەوامەکانی ئـــەو بەرزێتییە دڵنیابم، کە لە هەموو حاڵەتێکدا و لە هەموو لایەکەوە دەتوانێت من ڕەتبکات.

بەرزێتییەکەش تەنیا ئەمەیە: لەنێو سنوری بابەتێتی خۆیدا دەمێنیتەوە، لەبەر ئەمە دەتوانم بیگرم، هەستی پێبکەم و داگیربیکەم. واتایەکی دیکەی بوونم لەنێو لەشدا یان گرفتەکە ئەوەیە، کە زمانێکی جادوگەرانەی هەیە. بۆ ئەوەی کەسەکەی دیکە سەرســـام بکەم، خۆم بە ڕووتی، وەکـــو لەش ڕادەگرم چونکە ئارەزووەکەی ئەویش پێویســـتی بەمجـــۆرە دەرکەوتنەی بوونی ئەوە. ئـــارەزوو بانگی ئارەزوو دەکات. لەشی من دەزانێت ڕێگەیەک بدۆزێتەوە و خۆی بە لەشی کەسەکەی دیکە بگەیەنێت. لەشـــم بە لەشییەوە دەنوســـێنم و داوای لێدەکەم لە واتاکەی تێبگات. ئەو کاتەی لە دەســـتلەملکردندا دەســـتم دەخەمە ســـەر قۆڵی کەسەکە دەمەوێت قۆڵی ئەو هەست بە گۆشتی دەستم بکات، ئەمەش لەوێدا ڕوودەدات ئەگەر دەستم لەســـەر قۆڵی دانێم و نەیجوڵێنم. تەزووی خۆشـــییە هەستپێکراوەکە ئاگامەندی، وەکو گۆشت بەرجەستە دەکات. ئەگەر دەستم بجوڵێنم یان لای بەرم ئەوا دەبێت بە لەش لەنێو کردەوەدا. بەهەمانشـــێوەش دەتوانم دەستم بە گۆشتی نەهێڵمەوە و لەناوی بەرم. بەســـەر لەشـــی ئەوەوە ڕەهەندێکی دیکـــەی بدەمێ و بیکەم بە دەستێکی زبر یان نەرم. لەمساتەدا تێکەڵبوونی ئارەزووەکان دەناسرێت: هەریەکێک لە ئاگامەندییەکان بە خۆدەرخستنی لەنێو لەشدا، لەشی بەرانبەرەکەشی دەبینێت، هەریەکێک لە گرفتەکان ئەوی دیکەش دەناســـێت و یەکـــدی دەوڵەمەند دەکەن. لەگەڵ دەســـتلەملکردنەکەدا هەســـت بە بوونی لەشـــی خۆم و لەشی کەسەکەش دەکەم. دەگەمە ئەو ئاگاییەی ئەو لەشـــەی لە ڕێگەی لەشمەوە هەستی پێدەکەم و بووم بە خاوەنی، لەشـــێکە کەسەکەش هەستی پێدەکات. بەڵام پێکەوەنوسانی هەردوو لەشەکە ئامانجی ڕاستەقینەی ئارەزووکردنە.

لەســـەرو ئەمەوە، ئارەزوو شکســـت دەهێنێت. وەکو بینیمان، جوتبوون، کە دەبێتە هۆکاری لەناوبردنی ئارەزوو ئامانجی بنەڕەتیی ئارەزوو نییە. بەدڵنیاییەوە، هەندێک بونیادی سێکسی ئێمە دەبنە زەمینە بۆ دەربڕینی ئارەزووەکان، بەتایبەتی لـــە دیاردەی ئەندامی نێرینە یان قیتکەی مێینەدا. ئەمەش بێجگە لە بەرجەســـتە بوونی پارچە گۆشـــتێک چی دیکە نییە. بەڵام ئێمـــە مامەڵە لەگەڵ دیاردەیەکی

بایۆلۆجیدا دەکەین، کە بە ئاگامەندییەوە لەنێو لەشدا بەستراوە. پێویستە بزانین، کە هیچ ئەندامێکی ماسولکەداری سێکسی سێکسی نییە. ئەگەر سێکس ئەندامە سێکسییەکان بێت ژیان دەبێت بە دیاردەیەکی ڕووەکی. بەڵام هەڵکەوتن لەگەڵ بوونی سێکسەکاندا پەیدا دەبێتەوە. بیر لە چوونە نێو ئەندامی نێرینەی پیاو بۆ نێو لەشی ژن بکەوە. ئەمە بەڵگەی خواستی ڕادیکالانەی ئارەزووە بۆ بەرجەستە بوونی لەنێو لەشدا.(ئێمە لایەنی نەبزێوی ئەندامانی سێکس لە جوتبووندا دەبینین، هەموو لەش تەکان دەدات و کارەسێکسییەکە ئەنجام دەدات. دەست یارمەتی ئەندامی نێرینەی پیاو دەدات، بەڵام ئەندامی نێرینەکە ئامێرە و بۆچوونە ناوەوە بەکاردێت. بەهەمانشێوەش کردنەوەی ئەندامی مێینەی ژن لە خۆوە دەست ناکەوێت.) لەگەڵ ئەمەشدا جوتبوون هەڵکەوتێکی ژیانی سێکسیمانە. لەڕاستیدا بوونی ئاگامەندی لەنێو لەشدا ئاکامی خۆی لەدوایە، ئەویش جۆرێکە لەوەی ، کە ئاگامەندی ئاگامەندییە لە لەش و تێڕامانە لەسەر لەش.

چێژ، وەکو ئازار، ئاگامەندی دەوروژێنێ و دەیکات بە ئاوەڕدانەوە لەچێژ. بەڵام، چێژ مردنی ئارەزووە و توشی شکستی دەهێنێت. مردنی ئارەزووە، چونکە چێژ لەخۆیدا سنوور و کۆتاییە. ئەمەش تەنیا هەڵکەوتنێکە پەیوەندی بە ئەندامەکانی لەشەوە هەیە. هەندێکجار بەرجەستەبوونی لەش لەگەڵ ڕەقبوونی ئەندامی نێرینەوە دواجاریش ڕەقبوونەکە بەفرێدان تەواو دەبێت. لەگەڵ ئەمەشدا، چێژ بواری ئارەزوو بەرجەستە دەکا، چونکە دەبێتە ڕێخۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی تێڕامانی ئاگامەندی بۆ چێژ، کە ئامانجەکەی هەستکردن بە خۆشییە لە تێڕامانەکەدا. لەم ئاوەڕدانەوەیەدا لە بوونی بوون-بۆ-خۆ لەنێو لەشدا بوونی کەسەکەی دیکەی لەنێو لەشدا فەرامۆش دەکرێت.

لەمحاڵەتەدا ئێمە لەسەر زەمینەی هەڵکەوت ڕاناوەستین. ئاگامەندی بە بینینی خۆی لەنێو لەشدا کەسەکەی دیکەی لەبەرچاو نامێنێت. ئەوەندەش دەڕوانێتە خۆی، کە خۆی دەکات بە دوا ئامانجی ئەزمونەکەی. ئەمەش چێژوەرگرتن لە دەستلەملکردنەکە دەگۆڕێت بۆ چێژوەرگرتن لەوەی دەستی لە ملکراوە. داواکارییەکە بوون-بۆ-خۆ دەگەیەنێتە خاڵی هێڵنجدان. دابڕانێکی کتوپڕ ڕوودەدات و ئارەزووش ئامانجەکەی خۆی وندەکات. هەندێکجار ئەم سەرنەکەوتنەی ئارەزوو دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی ماسۆچیزم: ئاگامەندی خۆی، وەکو فاکتۆر دەبینێت و داوا دەکات، وەکو لەش بۆ کەسەکەی دیکە بناسرێت و تێپەڕیش بکرێت. بەمشێوەیە، کەسەکەی دیکە، وەکو بابەت نامێنیتەوە، دەبێت بە تەماشاکەر، ئاگامەندی منیش لەنێو لەشمدا و لەبەردەم تەماشاکردنی کەسەکەدا لەهۆش خۆی دەچێت.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئارەزوو لەبەردەم بناخەی شکست هێنانی خۆیدا ڕادەوستێت. ئەوەندەش بەس نییە بڵێین گرفتەکە بوونی کەسەکەی دیکەش لەنێو لەشدا

دەگرێتەوە. ئارەزوو دەیەوێت ئەو ئاگامەندییەی لەنێو لەشەکەدایە بگرێت. کەوابوو، ئارەزوو بە سروشـــت نەک لە دەستلەملکردندا یان جوتبوون، بەردەوامە. ئامانجی دەستلەملکردنەکە پڕکردنی لەشی کەســـەکەیە بە ئاگایی و سەربەستییەکەیەوە. لەبەر ئەمە پێویستە ئەو لەشە بگیرێت و بچینە ناوی.

بەڵام ئەو کاتەی دەمەوێت لەشـــەکە بگرم، لـــە خۆمی نزیک بکەمەوە و گازی لێبگرم لەشـــم بە گۆشـــتی نامێنیتەوە و دەبێت بە تێهەڵکێشـــەی ئەو ئامێرانەی من پێکدەهێنن. کەســـەکەش لەنێو لەشدا نابینرێت و دەبێتەوە بە ئامێرێک لەنێو جیهاندا. ئاگامانەی ئەویش، کە من ویســـتم بە ڕێگەی لەشم تامی بکەم لە ئاستی تەماشـــاکردنمدا وندەبێت. ئەو دەیەوێت بە وێنەی بابەتێک لەنێو خۆیدا. گرفت و پەرێشانبوونی منیش لەناودەچێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ئارەزووم نامێنیت، بەڵکـــو ئارەزوو بابەتەکەی وندەکات و دەبێـــت بە بابەتێکی ڕووت. ئارەزووەکەش دەبێت بە ئارەزووکردن لە هەڵسوڕان و وەدەستهێنان. من لەسەر داگیرکردنی لەشی کەسەکەی دیکە سوردەبم. بەڵام سوربوونەکە من لەنێو لەشمدا ناهێڵێتەوە. من لەشم ڕەتدەکەم و ڕوو لە ئەگەرەکانم دەکەم (ئەگەرەکەشـــم ئەگەری وەدەستکەوتنە). لەشی کەسەکەی دیکەش لە تێپەڕکردنەکەدا لەگۆشتەوە دەبێت بە بابەتێکی ڕووت. لەمحاڵەتەدا دابڕانێک لە پرۆسەی بەرجەستەبوونەکە لەنێو لەشدا دێنێتە پێش، کە ئامانجی ئارەزووکردنەکە بوو. کەسەکەی دیکە لەنێو گرفتەکەدا دەمێنێتەوە، خۆی بە گۆشت دەبینێت. من لەم شێوازەی بوونی تێدەگەم. بەڵام ئەو گۆشتێکە، کە من لە ڕێگەی گۆشتی لەشمەوە نایدۆزمەوە. ئەو بووە بە بابەت نەک ئاگامەنییەکی نێو لەش. بەمجۆرە، من لەشـــم (تێهەڵکێشکردنی هەموولایەنەکانم لەنێو هەڵوێستدا) و ڕووبەڕووی لەش دەبمەوە. خۆم لەهەمانحاڵەتدا دەبینم، کە ویســـتم بە هۆکاری ئارەزووەوە لێی ڕابکەم: دەمەوێت کەسەکە، ئەو بابەتەی لەبەردەم مندایە خۆی بە بەرز دابنێت و لە من هەڵبێت. لێرەدا من بە دوای ئەودا دەگەرێم و دەمەوێت دەستم بکەوێت بەبێ ئەوەی بڵێم چیم دەوێت. لەنێو گرفتەکەی خۆمدا ئارەزووەکەم لە من ڕادەکات. من لەو کەســـە دەچم خەوی لێکەوتوە، دەڕوات و لەخەو ڕادەچڵەکێت، خۆی لە قەراخی جێگەکەی دەبینێتەوە و نازانێت چی ڕویداوە. ئەمحاڵەتەیە لەنێو بنەڕەتی سادیزمدا دادەنرێت.

سادیزم سۆزە، نەزۆکی و چەســـپاندنە. چەسپاندنە چونکە حاڵەتی بوون-بۆ-خۆیە بەبێ ئەوەی بزانێت چی دەکات و بۆچی ئەوە دەکات یان ئامانجێکی هەبێت بەهایەکی بۆ کردەوەکەی دامەزراندوە. نەزۆکیشـــە چونکە دەردەکەوێت ئارەزوو لە گرفتەکەی ڕزگاری بووبێت. سادی لەشی خۆی وەکو تیهەڵکێشە و چەقی کردەوەکانی دەبینێتەوە. دەیەوێت بەردەوام لە فاکتۆری بوونی ڕابکات. لەبەردەم کەســـەکەی بەرانبـــەری خۆی بە بەرزێتییەکی ڕووت دەبینێت. لە گرفتەکانی دەترســـێت و لە

ئاســـتیاندا خۆی بە شەرمەزار دادەنێت. لەوانەشە لەمحاڵەتەی خۆی تێنەگات. بە ساردییەوە جەخت لەسەر نەزۆکی و چەسپاندنەکەی دەکات و خۆشی بە کەسێکی ســـۆزدار دەردەخـــات. ئامانجی ئەو، وەکو ئامانجی ئـــارەزوو، تەنیا داگیرکردن و بەکارهێنانی کەســـەکەی دیکەی نیە، کە بووە بە بابەت. ئەو دەیەوێت کەســـەکە بەرزێتییەکی رووتی نێو لەش بێت. بەڵام لە سادیزمدا جەخت لەسەر بەئامێربوونی کەســـەکە دەکرێت. سادیزم لە سێکسدا لەوەدایە بوون-بۆ-خۆیەکی نێو لەش خۆی ڕەتدەکات تاکو بە بوونی کەســـەکەی دیکە لەنێو لەشـــیدا بگات و خۆی بکات بە خاوەنی. ســـادیزم نایەوێت خۆی لەنێو لەشدا ببینێت و لە فاکتۆرەکان ڕادەکات، هەمانکات دەیەوێت بە فاکتۆرەکانی کەسەکەی دیکە بگات. ئەو لەشی کەسەکە بە ڕێگەی لەشی خۆی نادۆزێتەوە. لەبەر ئەمە هیچ ڕێگەیەکی دیکەی لە مامەڵەکردندا لەگەڵ کەسەکە نییە بێجگە لەوەی کەسەکە بە ئامێر و بابەت دابنێت. ئەو دەیەوێت لەشـــی کەسەکە بکات بە ئامێر و کەســـەکەش بوونی خۆی لەنێو لەشدا ببینێت. سادیزم هەوڵدانێکی توندوتیژە بۆ بەرجەستەبوونی کەسەکەی دیکە لەنێو لەشدا. ئەمەش بە (زەبر) خاوەنێتی و بەکارهێنانی کەســـەکە دەخاتەگەر. سادیزم، وەکو ئارەزوو، کەســـەکە لەو کردەوانە ڕووتدەکاتەوە، کە دایدەپۆشن. دەیەوێت لەشەکە دەربخات بەڵام لەشی خۆی دەشارێتەوە.

ئامانج و بابەتی سادیزمیش خۆیەتییەکی ڕاستەوخۆیە. هەروەها هاوپەیمانییەکە کوێرانەیە چونکە نەک تەنا چێژ لە داگیرکردنی لەشـــی کەســـەکە وەدەگرێت حەز لە شـــاردنەوەی لەشی خۆشـــی دەخات. داوای پەیوەندی دوولایەنی لە سێکسدا ناکات و حەز دەکات خۆی سەربەســـت بێت. لەبەر ئەمەشە مرۆڤێکی سادی لەش لەبەردەم ئاگامەندی کەسەکەی بەرامبەری بە شێوەیەکی جیاواز ئامادەدەکات. لەم ئامادەکردنە جیاوازەدا کەسەکە دەکات بە ئامێر؛ لەنێو ئازاردا دەیهێڵێتەوە. لەنێو ئازاردا فاکتۆر ئاگامەندی داگیردەکات و تێڕامانی ئاگامەندی لە ئاستی ئاگامەندییەکی لە تێڕامان بەدەردا سەرسام ڕادەوەستێت. کەوابوو، ئازار ئامادەبوونە لەنێو لەشدا. ئەو ئازارەش بە هۆی بوون بە ئامێرەوە سەرهەڵدەدات. لەشی بوون-بۆ-خۆ لە کاتی ئەشکەنجەداندا بۆ ئازار دورستکرن دەبێت بە ئامێر. لەسەرەتاوە مرۆڤە سادییەکە خۆی بـــەو باوەڕە (وەهیمە) دەگەیەنێت، کە دەتوانێت لە ڕێگەی بە ئامێرکردنەوە سەربەستی کەسەکەی دیکە داگیر بکات.

ئەوجۆرە ئامادەبوونەی لەنێو لەشدا سادیزم دەیەوێت بە درێو ناوزەد دەکرێت. درێوی جۆری بچوکە لە بوون-بۆ-ئەواندا، کە سەر بە جۆری بێ بەخشندەییە. بەڵام هەموو بێ بەخشـــندەییەک درێێوی نییە. لە بەخشندەییدا لەش، وەکو هەبوویەکی دەروونـــی نێو هەڵوێســـت دەردەکەوێت. لەســـەرو هەموویانـــەوە، بەرزێتییەکەی خۆی لەنێو کردەوەدا نیشـــاندەدات. هەموو جوڵەیەکی لە ئێستادا بە داهاتووەوە

دەبەســـترێتەوە. کردەوەی بەخشـــندە لەلایەکەوە کارەندازی ماکینەیەکی نایاب و لەلایەکـــی دیکەوە کارێکی تەواوی بێ پێشـــبینیکردنی دەروونـــە چونکە دەروون بابەتێکە بۆ کەسانی دیکە پێشبینی ناکرێت.

کەوابوو، هەموو کارێکی بەخشندە بە تەواوی دەناسرێت، چونکە بەسەردەچێت. ئامانجەکەشی ڕووناکی دەخاتە ســـەر هەموو بەشەکانی کارەکە. بەڵام بەشەکانی داهاتووی پێشـــبینی ناکرێن، هەرچەندە سەرهەڵدانیان پێویست بێت و تێپەڕیش بکرێن. ئەم وێنە جوڵاوەی نێوان سەربەستی و پێویستییە (وەکو خەسڵەتی بوونی بە بابەتکراوی ئەوان) بەخشندەیی پێکدەهێنێت. برگسۆن بە جوانی باسیکردووە. لە بەخشندەییدا لەش دەبێت بە ئامێری سەربەستی. کارێکی بەخشندەیی لەش بەو ئامێرە کارەندازە دادەنێت، کە سەربەستی لێوە بەرجەستە دەبێت؛ دەست دەبێت بـــە ئامێر بۆ گرتن و لەســـەرەتاوە خۆی وەکـــو بوونێک-لەپێناوی-گرتندا دەخاتە پێش. بەخشـــندەیی، کەوابوو، وێنەیەکی دەرەکی بوونمان بۆ دروســـتدەکات، کە لەپێناوی شتێکدا دەبێت بە بناخەی بوونی خۆی. فاکتۆر، لەمحاڵەتەدا، بە کاڵای بەخشـــندەیی پێچراوەتەوە. لەش بە ڕووتی ماوەتەوە، بەڵام نابینرێت. گەورەترین بەرهەڵســـتیکردنی بەخشـــندەیی لەوێدایە، کە لەش بە ڕووتی دەربخات و هەموو پۆشاکێکی لەبەرداماڵێت و تەنیا خۆی بە دەورا بپێچێتەوە. لەشێکی بەخشندە ئەو لەشە ڕووتەیە بە کردەوە نادیارەکان داپۆشراوە و لەبەرچاوی بینەرانیش دانراوە.

بێبەخشـــندەیی، بەپێچەوانـــەوە، لەگەڵ لەناوچوونی یەکێـــک لە توخمەکانی بەخشندەییدا ســـەرهەڵدەدات. جوڵانێکە شێوازێکی میکانیکی وەردەگرێت. لێرەدا لەش بەشـــەکانی خۆی دادەمەزرێنێت، بەڵام دەبێت بـــە ئامێر؛ بەرزێتییەکەی و هەڵوێستی وندەبن.

هەروەها دەشێ کردەوەکانیش پچڕ پچڕ و توندوتیژ بن؛ لەمحاڵەتەدا هەڵوێست وەرگرتـــن دەڕوخێت؛ هەڵوێســـت دەمێنێـــت، بەڵام بۆشـــاییەک دەکەوێتە نێوان هەڵوێست و کەسەکانی دیکەوە. کەســـەکانی دیکەش بە سەربەستی دەمێننەوە. سەربەستییەکەشیان بی پێشـــبینیەکی ڕووت دەناسرێت. ئەمەش لە ئەتۆمەکانی ئەبیکۆر دەچێت، کە کورت و سەربەخۆن. کۆتایش وەکو خۆی دەبێت و بەردەوام کەسەکانی دیکە بە داهاتووەوە دەبەستینەوە.

ســـەرنەکەوتن لەخۆگونجانندا ئاکامی هەیە؛ ئەویـــش ڕاڤەکردنی داهاتووە بە شـــێوەیەکی بەرفراوان یان تەسک. ڕاڤەکردنەکە تەنیا نزیکبوونەوەیە. لەبەر ئەمە سەلماندنی هەڵسوکەوت و بوونی کەسانی دیکە بە ناتەواوی دەناسرێت. لەکۆتاییدا، ناهەمـــواری نا ســـەلمێنرێت؛ هەموو فاکتۆرەکانیش دەشـــارێتەوە و لەبەرچاومان هەڵیدەگرێت.

ئەو کاتەی بمانەوێت ڕێگەچارەیەک بۆ هەڵوێستەکە بدۆزینەوە خۆمان لەبەردەم

هەڵکەوتێکی ناهەمــواری نەگونجاو و کتوپڕدا دەبینیــن؛ بوونی خۆمان بەرانبەر بوونێکی دیکە ڕادەگرین.

بێجگەلەمــە، ئەگەر لــەش تەنیا کردەوە بێت، فاکتۆریش نابێت بە گۆشــت. ناشــرینی ئەو کاتە دەردەکەوێت، کە لەش خۆی لــە کردەوەکانی دادەبڕێت و بە گۆشــتی و نەبزێوی خۆی دەخاتە ڕوو. تەماشــاکردنی لەشێکی ڕووت لە پشتەوە ناشــرینی نییە. بەڵام لەنجەولاری پاشەڵەکە ناشــرینە چونکە تەنیا قاچەکان بۆ ئەو کەســە دەجوڵێن. پاشەڵەکە لەو دۆشــەکە دەچێت قاچەکان هەڵیانگرتبێت. هەڵوێستەکە نایسەلمێنێت؛ بەپێچەوانەوە، دەبێت بە ڕوخێنەری هەموو هەڵوێستێک و چالاک نییە. ئەو بۆ ئەوە دروستکراوە لەسەر قاچەکان خۆی ڕاگرێت. کتوپڕیش، وەکو هەڵوێستێکی بێ بەڵگە خۆی قوتدەکاتەوە و دەبێت بە هەڵکەوت. لەولاشەیە جیادەبێتەوە، کە ئێستا پیاسەدەکات؛ هەرچەندە لەنێو جلوبەرگدا پۆشراوە، بەڵام هێشــتا ڕووتە، لە بەرزێتی و کردەوەکانی لەشــەکەدا بەشدارێناکات. جوڵانەکەی تەنیا پەیوەندی بە وەستان و هاوتەرازبوونی خۆیەوە هەیە.

ئــەم ڕوونکردنەوەیــە بۆ ئەو لەشــەش دەبێت، کە وەکو پارچەیەک گۆشــت دەبینرێت. ئەو لەشــەی خــاوە و لەرزۆکە یان شــێوازەکەی بەتەواوی تێکچووە. ئەم لەشــە بۆ ئەو کەسەی حەزلێناکات پارچەیەک گۆشــتی ناشرینە و ئارەزوو ناوروژێنێــت. نەبوونی جۆرێک لە گونجاندن، کە هەڵوێســتەکە لەناودەبات، لەژێر جلەکانەوە نەبزێوی پارچە گۆشــتەکەم بۆ دەردەخات (ئەو کاتەی منیش ئارەزووم بۆی نییە): ناوی دەنێم ناشرینی.

ئێستا لە داواکاری مرۆڤێکی سادی تێدەگەین: بەخشندەیی سەربەستی کەسەکەی دیکە-وەکو بابەت دەردەخــات، وەکو بیردۆزەی بیرکەوتنەوەی ئەفلاتونیش لەنێو جیهانی هەستەکییدا ئاماژە بۆ لایەنێکی بەرز لەودیوەوە دەکات، کە ئێمە بە تەواوی بیرمــان ناکەوێتەوە. بەگۆڕانێکی بنەڕەتی لە بوونماندا پێیدەگەین؛ ئەویش دانانی بوونمانە-بۆ-کەسانی دیکە. بەخشــندەیی بوونی کەسانی دیکە، وەکو پارچەیەک گۆشــت دەردەخات و هەمانکات دەیشــارێتەوە یان، دەتوانیــن بڵێین بۆ ئەوەی گۆشتەکە داپۆشێت، دەریدەخات.

لە بەخشــندەییدا، گۆشت کەسانی دیکەیە، کە ئێمە دەستمان نایگاتێ. مرۆڤە ســادییەکە بۆ ئەوەی بوونی کەســانی دیکە لە تێهەڵکێشــەیەکی نوێدا ببینێت بەخشــندەیی لەناودەبات. ئەو دەیەوێت گۆشتی کەسانی دیکە بە ڕووتی دابنێت. گۆشــتە ڕووتەکەش بەخشــندەیی دەفەوتێنێت و سەربەستی کەسەکانیش لەنێو فاکتۆردا دەتوێتەوە. ئەم توانەوەیە فەوتانێکی تەواو نییە چونکە بۆ مرۆڤی سادی لەشــی کەســانی دیکە بوونی سەربەستی ئەوانە. ناســنامەی ئەوان-وەکو-بابەت لەناوچووە. تەنیا پەیوەندی نێوان گۆشــت و سەربەســتی گۆڕانی بەسەرداهاتوە.

لەبەخشـــندەییدا سەربەســـتی دەپارێزرێت و فاکتۆریش دادەپۆشرێت. بەڵام لەم تێهەڵکێشـــە نوێیەدا فاکتۆر خۆی بەرجەســـتەدەکات و سەربەستی دەشارێتەوە. مرۆڤە ســـادییەکە، کەوابوو، دەیەوێت بە زۆر گۆشتەکە دەربخات. ئەم کارەش بە ڕێگەی خۆیەوە، وەکو پارچەیەک گۆشـــت نـــاکات، بەڵکو خۆی بە لەش دادەنێت و دەیـــکات بـــە ئامێر. داوا لە کەســـەکە دەکات بە جۆرێک خـــۆی دەربخات یان بجوڵێت، کە ناشـــرین بێت. ئەو خۆی بە ئامێری دەهێڵێتەوە و زۆر لە لەشـــەکەی دیکە دەکات ببێت بە گۆشـــت. هەروەها ببێت بە ئامێرێک لەبەردەســـتی ئەمدا. مرۆڤی سادی لەشی کەســـەکە داگیردەکات و خۆی بە سەرشانیدا شۆڕدەکاتەوە. هەمانکات ئامانجی ئەم کارە لە بەکارهێنانەکەدایە: ئەو دەیەوێت لەشـــی کەسەکە بە ئامێری نەهێڵێتەوە و بیکات بە پارچەیەک گۆشت. مرۆڤی سادی ئەو کەسەیە، کە دەیەوێت کەسانی دیکە لەنێو لەشدا بن. ئامانجی ئەویش ئەوەیە کەسەکە ببێت بە گۆشت و بەئامێریش بمێنێتەوە.

نابێ لێردا توشـــی ئەو هەڵەیە ببین و پێویســـتە بزانین، کـــە ئەوەی مرۆڤی سادی دەیەوێت داگیریدەکات و خۆی بەسەریدا شۆڕدەکاتەوە سەربەستی کەسانی دیکەشە. سەربەســـتییەکە لەنێو گۆشـــتەکەدایە. سەربەســـتییەکە گۆشتەکەیە و بـــووە بە فاکتۆری بوونی کەســـانی دیکە. کەوابوو، ئەوەی مرۆڤە ســـادییەکە دەیەوێت، داگیربکات سەربەســـتییە. مرۆڤی ســـادی دەیەوێت دڵنیابێت لەوەی کەسەکەی دیکە بووە بە گۆشت. ئەم دڵنیابوونە بە ڕێگەی ئازار و ئەشکەنجەدانی کەســـەکە دێتە پێش. بەڵام داگیرکردنەکە لەشـــەکە تێپەڕدەکات چونکە دەیەوێت بۆ داگیرکردنی سەربەســـتی کەســـەکە خۆی بکات بە خاوەنی لەشەکە. لەبەرئەم هۆیەشـــە مرۆڤی ســـادی دەیەوێت بـــە بەڵگەوە بەکۆیلەکردنی کەســـانی دیکە و داگیرکردنی سەربەستییەکەی لەنێو گۆشـــتەکەدا دەستکەوێت. ئەو ئەشکەنجەی کەســـەکە دەدات و هەڕەشـــەی لێدەکات تاکو بپاڕێتەوە و داوای لێبوردن بکات، ئەوەی هەیەتی بیدات بە مرۆڤە ســـادییەکە. هەندێک جار دەڵێین، ئەمە تینوێتییە بۆ دەســـەڵات. بەڵام ئەم بۆچوونە ڕوون نییە یان پوچەڵە. پێشـــەکی پێویســـتە بڵێین ئەمە ویستی داگیرکردنە. دەسەڵات بۆ سادی شتێکی لەپێشتر نییە چونکە ئەو بەرانبەر کەســـانی دیکە دەترسێت. لەڕاستیدا، ئەگەر مرۆڤی سادی دڵی بەوە خۆشبێت، کە کەسەکە لەژێر ئەشکەنجەدا نکۆڵی دەکات، ئەوا ئەم بۆچوونە لەبەر چەند هۆکارێک لەو واتایە دەچێت ئێمە بۆ خۆشەویستی لێکماندایەوە. باسمانکرد، کە خۆشەویستی داوای لەناوبردنی سەربەستی کەسەکەی دیکە ناکات، بەڵکو ئەو دەیەوێت سەربەســـتییەکە داگیربکات و خۆشەویستەکەی بە کۆیلە دانێت؛ ئەمەش کۆیلەکردنی سەربەستییە. بەهەمانشێوە، مرۆڤی سادی نایەوێت سەربەستی کەسە ئەشکەنجە دراوەکە خەفەبکات. بەڵکو دەیەوێت زۆر لەو سەربەستییە بکات لەگەڵ

لەشە ئەشـــکەنجەدراوەکەدا ببن بە یەک. لەبەر ئەمەیە مرۆڤە سادییەکە لە کاتی ئەشکەنجەدانەکەدا چێژ لەوە وەردەگرێت کەسەکە خۆی بە سوک و ڕسوا نیشانبدات. گرنگ نییە چ جۆرە زەبرێک دەخرێتە سەر کەسەکە، پەشیمان بوونەوە دەمێنێتەوە و گۆڕانی بەســـەردا نایەت؛ دەبێت بە وەڵامدانەوەیەکی هەڵوێستەکە، بەرهەمێکی کتوپڕ و ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بەرجەستەدەکات. گرنگ نییە کەسەکە تاکو چ ڕادەیەکیش بەرگریدەکات، زۆری پێدەچێت تاکو بپاڕێتەوە و داوای لێبوردن بکات؛ ئەو دەیتوانی دە تا یەک خولە یان یەک چرکە چاوەروان بێت. کاتەکە دیاریدەکات، کە ئەشکەنجەکە لەوە زۆرتر هەڵناگیرێت. بەڵگەش بۆ ئەمە شەرمەزاربوونەکەیەتی لەئاستی پەشیمانبوونەوەکەیدا. لەبەر ئەمە لە هەڵوێستەکەی بەرپرسە. لەلایەکی دیکەوە، مرۆڤە ســـادییەکە خۆی بە هۆکاری ئەم کارە دادەنێت. ئەگەر کەســـەکە بەرگریبکات و نەپاڕێتەوە کایەکە لەلای خۆشتر دەبێت و هەموو کاتێ خۆی لەنێو جهاندا دەبینێت؛ لەسەرخۆ کارەکەی دەکات و پەلە ناکات. ئامێرەکانی خۆی، وەکو تەکنیکییەکی لێزان بەکاردەهێنێت. یەک لەدوای یەک، وەکو ئەو کەسەی کۆمەڵێک کلیلـــی پێیە و هەوڵـــدەدات دەرگاکەیان پێبکاتەوە، ئامێرەکانـــی تاقیدەکاتەوە. خۆشی لە تاقیکردنەوەکە وەردەگرێت. ئەو تەنیا کەسێکە لەنێو هەموو خەسڵەتە هەمەکییەکانـــدا ئامرازەکان بۆ گەیشـــتن بە کۆتاییەکی لەخـــۆوە پەیدابوو، بەو شـــێوەیەی تەماشاکردنی کەسەکە لەگەڵ دۆزینەوەی کلیلەکەی دەرگاکە دەکاتەوە گەشـــدەبێتەوە، بەکاردەهێنێت. گەیشـــتن بەم کۆتاییەش لەگەڵ هاوکاریکردن و سەربەســـتی کەســـەکەدا ڕوودەدات. کەوابوو، تاکو دواســـات کۆتاییەکە دیارە و دیاریش نییە. بۆ مرۆڤە سادییەکە بابەتەکە ئاڵۆز و تەمومژاوییە و ناکۆکە چونکە ئاکامی بەکارهێنانی تەکنیکە دیاریکراوەکە و بەرجەســـتەبوونی سەربەســـتییەکی بێسنورە. دیمەنی بەردەم مرۆڤە سادییەکە سەربەستییەکە دژی پەیدابوونی گۆشت و هەمانکات بەرجەستەبوونێکی سەربەستانەیە لەنێو گۆشتدا. لە کاتی پەشیمانییدا مەبەستەکە وەدەست دەکەوێت: لەشـــەکە دەبێت بە پارچەیەک گۆشتی ناشرین. بەوشێوەیە خۆی دەردەخات، کە مرۆڤە ســـادییەکە بەسەریدا سەپاندوویەتی؛ بە گوریس بەستراوەتەوە، ناجوڵێت و بەو بابەتە خۆی دەرناخات، کە دەتوانێت خۆی بجوڵێنێت. لە پەشیمانیدا سەربەستی و لەش دەبن بە یەک. ئەم لەشە تێکشکاوە و گرانە نموونەی سەربەستییەکی تێکشکاوی و داگیرکراوە.

ئەم تێبینیانە کێشەی سادیزم بەتەواوی دەرناخەن. ئەوەندەمان مەبەست بوو بڵێین، وەکو تۆوی نێو ئارەزووە و سەرنەکەوتنی ئارەزووشە. لەڕاستیدا ئەو کاتەی لە ڕێگەی بەرجەســـتەبوونی خۆم لەنێو لەشدا لەشی کەسێکی دیکە داگیردەکەم، پەیوەندییەکان دەپچڕێنم. لەش ڕەتدەکەم و ڕوو لە ئەگەرەکان و سادیزم دەکەم. سادیزم و ماسۆچیزم، کەوابوو، دوو زنجیرە بەردی کەناری دەریان، کە ئارەزوو

خۆیانی بۆ فڕێدەدات؛ ئینجا ئەگەر من بتوانم گرفت و پەرێشـــانی خۆم ڕەتبکەم، کەســـەکەی دیکە وەکو گۆشـــت داگیربکـــەم یان لەنێو گرفتی خۆمدا مەســـت و ســـەرخۆش بم و تەنیا بیر لە گۆشتی لەشی خۆم بکەمەوە نەک کەسەکە. ئەویش بەو تەماشاکردنە دابنێم، کە من بە لەشی خۆم دەناسێنێت.

ئـــەم ناڕێکییە و هەژانـــە بەردەوامەی ئارەزووە لەنێوان ئـــەم دووانەدا هەموو پەیوەندییەکی ئاسایی سێکسی دەکات بە "سادی-ماسۆچییانە". لەسەرو ئەمەوە، ســـادیزم، وەکو بێ دەربەســـتی و ئارەزوو هۆکاری ســـەرنەکەوتنی لەنێو خۆیدا هەڵگرتوە. یەکەمجار، نایەکسانییەکی تەواو لەنێوان تێگەیشتن لە لەش و گۆشت و بەکارهێنانی، وەکو ئامێر دەدۆزینەوە. ئەگەر من گۆشـــت بکەم بە ئامێر، ئەوا ئەو ئامێـــرە ئاماژە بۆ ئامێرەکان و لایەنە هێزەکییەکانی دیکە دەکات؛ بەکورتییەکەی ئاماژە بۆ داهاتوو دەکات؛ لە لایەکەوە بەو هەڵوێســـتەم بوونی-لەوێدا دەسەلمێنم، کە لە دەوروبەری خۆمدا دروســـتیدەکەم. ئەمەش، وەکو مێخەکان و ئەو تابلۆیەی دەبێـــت مێخەکان بۆ هەڵواســـینی بەکاربێت، ئاماژە بۆ چەکـــوش دەکەن، وایە. ئەو "گۆشـــتە بە ئامێرکراوە" ئاڵۆزەی سادییەکە دروستیکردوە لەناودەچێت. ئەم لەناوچوونە، تاکو گۆشتێک بۆ دەرخستنی گۆشتێکی دیکە، وەکو ئامێر بەکاربێت شاراوە دەمێنێتەوە. بەڵام کاتێک کەسەکە لەنێو لەشدا دەبینرێت و منیش لەشەکە بە هەناســـەبڕکێوە لەبەردەممدا دەبینم نازانم چۆن بەکاری بهێنم. هیچ ئامانجێکی دیاریکراوم لا نییە، چونکە لەشەکە بووە بە هەڵکەوتێکی ڕەها؛ لەوێدایە و بۆ هیچ مەبەستێک دانەنراوە. منیش، وەکو گۆشت ناتوانم بیگرم. بەبێ دانانی، وەکو گۆشت ناخرێتە نێو سیستەمی ئامێرەکانەوە؛ بە گۆشتبوونی ئەو لە دەستم ڕادەکات. من تەنیا بە سەرسوڕمانەوە بیریلێدەکەمەوە یان خۆم لەنێو لەشمدا دەردەخەم و توشی گرفتی خۆدەرخستنی گۆشت بۆ گۆشتێکی دیکە دەبم. کەوابوو، سادیزم ئەو کاتەی دەیەوێت بە ئامانج بگات ئارەزوو دەخاتە لاوە. ســـادیزم ســـەرنەکەوتنی ئارەزووە و ئارەزووش ســـەرنەکەوتنی ســـادیزمە. ڕزگاربوونیش لەنێو ئەم سوڕانەوەیەدا بە ڕێگەی ئەو هەڵوێســـتەوە ڕوودەدات، کە بـــە "داگیرکردنی لەش" ناوزەدیدەکەین. لێرەدا تیهەڵکێشەیەکی نوێی سادیزم و ئارەزوو دروستدەبێت. گەورەبوونی سێکس بوونی کەسەکە لەنێو لەشدا بەرجەســـتەدەکات، فاکتۆری "تێخستن" و "تێخێنراو" هێمان بۆ داگیرکردن لە ســـادیزم و ماســـۆچیزمدا. بەڵام، ئەگەر چێژوەرگرتن لە سوڕانەوەکە دەربازمان بکات لەبەر ئەوەیە، کە ئارەزووەکە و سۆزی سادیزم بەبێ تێرکردنیان دەکوژێت.

هەمانکات، بەشێوەیەکی جیاواتریش سادیزم هاندەرێکی دیکە بۆ سەرنەکەوتنی خۆی دێنێتە پێش. مرۆڤی ســـادی دەیەوێت سەربەســـتییە بەرزەکەی کەســـەکە داگیربکات. بەڵام لە بنەڕەتەوە ئەم سەربەستییە ناگیرێت. چەند مرۆڤە سادییەکە

زۆر لە کەسەکە بکات و بیکات بە ئامێر بۆ خۆی، سەربەستییەکەش ئەوەندە زۆرتر لە دەســـتی ڕادەکات. ئەو تەنیا لە ڕێگەی گۆڕانی سەربەستییەکە بە کەلوپەلێکی دەرەکی، دەتوانێت ببێت بە خاوەنی و داگیریبکات. لێرەدا، سەربەستییەکە دەبێت لەنێو شتەکانی جیهاندا بێت و ڕوو لە ئەگەرە مردووەکانیشی بکات. مادام ئامانجی مرۆڤە سادییەکە زیندوکردنەوەی بوون-بۆ-ئەوانە ئەوا لەسەر بنەمای پرینسیپاڵەکە بۆ سەربەستی، وەدەستی ناهێنێت چونکە ئەو کەسەی مرۆڤە سادییەکە مامەڵەی لەگەڵـــدا دەکات لەنێو جیهاندایە و تەنیا وێنەی مرۆڤە ســـادییەکەی ئەشـــکەنجە دەدات لەنێو بیرکردنەوەیدا چەســـپاوە. مرڤە سادییەکە ئەو کاتە هەڵەکەی خۆی دەناســـێتەوە، کە نێچیرەکەی تەماشایدەکات و نامۆبوونێکی ڕەهای بوونی لەگەڵ سەربەستی ئەودا دەدۆزێتەوە. تێدەگات، کە تەنیا بوونی خۆی لەدەرەدا نەبینیوە، بەڵکو ئەو چالاکییەی بوونی ئەم بەرجەســـتە دەکات بەرزە و لەنێو "سادیزم"دا، وەکو ڕەفتار و خەســـڵەتی ئەگەرە مردووەکان دەبینێت. گۆڕانکارییەکەش بە هۆی بوونی کەســـەکەوە ســـەرهەڵدەدات، کە ئەم دەیەوێت داگیریبکات. کەوابوو، ئەو خاڵـــەی بۆ دەردەکەوێت، کـــە ناتوانێت تەنانەت زۆرکردن لە کەســـێکی دیکە و پاڕانەوەشـــی نابێتە هۆکاری داگیرکردنی سەربەستییەکەی. فۆکنەر بە جوانی لە بەرهەمەکەیدا (ڕووناکی لە مانگی گەلاوێژدا) باسی هێزی تەماشاکردنی نێچیرەکە دەکات. چەند "هاووڵاتییەکی چاک" مرۆڤێکی پێســـت ڕەشـــیان گرتوە، کە ناوی کرسمسە و خەسانویانە و لە سەرەمەرگدایە:

"پیاوەکە لە سەر زەوییەکە کەوتبوو، نەیدەتوانی بجوڵێت.
کەوتبوو، چاوەکانیشی کرابوەوە. بۆ چەند ساتێک بە
هێمنی تەماشای کەسەکانی دەوروبەری دەکرد. ئینجا
دەموچاوی، لەشی هەمووی دەرکەوتن، کە تێکشکاون.
خوێنیش، وەکو موشەیەکی تەقیو لە لەشە زەرد
هەڵگەڕاوەکەیەوە دەهاتە دەرێ. لەوە دەچوو ئەو لەنێو
یادەوەرییەکانیاندا بۆ هەمیشە زیندوو بمێنێتەوە.
نەیاندەویست لە هەرچ دۆڵ و شیوێکی ئارام و تەوژمەکانی
تەمەنی پیریدا یان لە ئاوێنەی دەموچاوی منداڵەکان و
بیرکردنەوەیان لە کارەساتە کۆنەکان و هیوا نوێکاندا،
لەبەر چاویان ونبێت. دەبێت لەوێدا، سەرسوڕهێنەر،
بێدەنگ و چەقیو بمێنێتەوە. نابێت دیمەنەکە کاڵبێتەوە،
یان هەڕەشەکەر بێت. هەروەها، لە شارۆچکەکەوە،
لە دیواری کۆڵانە دەرنەچووەکەوە هاوارێک بەرزبووەوە
و خۆی گەیاندە دنیای بیستن."

تەماشاکردنی کەسەکەی دیکە لە جیهانی مرۆڤی سادییدا ئامانجەکە لەناودەبات. مرۆڤــە ســادییەکە تێدەگات، کە ئەو دەیویســت سەربەســتی داگیربکات و ئەم هەوڵدانەش بێ بــەرە. ئێمە، لێرەدا، جارێکی دیکە لە بوونێکی-تەماشــاکەرەوە ئامــاژە بۆ بوونێکی-تەماشــاکراو دەکەیــن و نەمان توانیوە خۆمــان لەنێو ئەم ســوڕانەوەیە ڕزگار بکەین. لەم ڕوونکردنەوەیەدا گرفتی ســێکس یان هەڵوێست بەرانبەر کەسانی دیکە چارەســەرنەکراوە. ئێمە دەڵێین، کە هەڵوێستی سێکسی لەسەرەتاوە ڕەفتارێکە بەرانبەر کەسانی دیکە دەینوێنین. پەیوەندی بە هەڵکەوتنی بوون-بۆ-کەســانی دیکە و فاکتۆری بوونمانەوە هەیە. ناتوانین بڵێین لەسەرەتاوە فزیۆلۆجی و پێکهاتەیەکی ئەزمونگەرانەیە. هەرکاتێک "لەوێدا" لەش یان کەسێکی دیکــە هەبێت ئێمــە ڕەتدانەوەیەکــی ئارەزوومەندانە لەلامان دروســتدەبێت، کە خۆشەویســتییە. بونیادی فزیۆلۆجیمان دەربڕینێکــی هێمایی هەیە. لەبەر ئەمە، بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ ڕووبەڕووبوونە لەگەڵ کەسانی دیکەدا سێکسییە و بەو جۆرەش دێتە جیهانەوە.

ئێمە ناڵێین هەموو هەڵوێســت و ڕەفتارێک بەرابنەر کەسانی دیکە سێکسییە. ئەگەر بە وردی ســەرنجی ئەمــەش بدەین، بۆ دوو هــۆکار دەگەڕێتەوە: یەکەم، لەلایەکەوە بنەڕەتین و دووەمیش، هەموو هەڵسوکەوتە ئاڵۆزەکانی نێوان مرۆڤەکان دەوڵەمەندکردنی ئەم دوو هەڵوێستەیە (دواییش ڕقە، کە لە پاشاندا باسیدەکەین). بێگومان نموونەی هەڵســوکەوتی کۆنکرێتی (هاوکاریکردن، ناکۆکی، دوژمنایەتی، ململانــێ، بەڵێندان، گوێڕایەڵی و هتد) پێویســتیان بــە لێکۆڵینەوەی ورد هەیە چونکە لەسەر هەڵوێستی مێژوویی و پەیوەندی بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ کەسانی دیکەدا ڕادەوەســتن. بەڵام لەنێو ئێســکی هەموویاندا پەیوەندی سێکسی هەیە. ئەمەش لەسەر بوونی (لبیدۆ) دانەمەزراوە، بەڵکو لە هەموو ئەم هەڵوێستانەدا بوون-بۆ-خۆ مامەڵە لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات و دەیەوێت تێپەڕیبکات.

ئێمە لێرەدا نامانەوێت باســی ئەوەبکەین لە بەزەیــی، دڵگرتن، قێزکردنەوە، حەســودی یان لە سوپاسگوزارییدا چەند خۆشەویستی و ئارەزوو هەن. هەرکەسە دەتوانێت بەگوێرەی ئەزمونی خۆی بیپێوێت. هەروەها ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە ئەم هەڵوێستە جیاوازانە دەمامەی سەر سێکسن، بەڵکو سێکس خۆی لەناویاندا بەرجەستەدەکات. ئەم هەڵوێستانەش، وەکو ئێسکی داپۆشراو بە گۆشت شاراوەن یان بەشاراوەیی دەمێننەوە.

هەڵکەوتنی لەش و بنەمای پرۆژەی بوونم، ئەو مێژووەی من دایدەهێنم هەڵوێستی سێکسی من دیاریدەکەن و لەنێو هەڵسوکەوت و ڕەفتارە ئاڵۆزەکانمدا هەڵیدەگرن. بۆنموونە، کەمجار کەســێک ئارەزووی سێکســی بۆ هاوسێکسەکەی خۆی هەیە. بەڵام ئەم ئارەزووە لە پشت قەدەخەکردنی ڕەوشتی و تابووە کۆمەڵایەتییەکانەوە

به شـــاراوەیی دەمێنێتەوە. بەلای کەمەوە دەبێت بەو گرفتە سێکســـییەی قێزی لێدەکرێتەوە. ئەم پرۆژە سێکســـییە لەودیو ئاگاییمانەوە خۆی ناشارێتەوە. هەموو پرۆژەیەکی بوون-بۆ-خۆ شێوازێکی ئاگاییە. ئەمەیە بیریارانی سایکۆلۆجی شیکاری بۆ ئەو تەختەڕەشـــەی دەگەڕێننەوە، کە مێژووی تاکە کەســـەکان پڕیدەکاتەوە. ئەوەندەش دەڵێین، کە ســـێکس لە یەکەم ساتی سەرهەڵدانیدا لە بوون-بۆ-خۆدا و لەنێو ئەو جیهانەدا کەســـانی دیکەی تێدایە خەســـڵەتەکانی دیارە. ئەوەی دیار نییە و تاکە کەســـەکان دەبێت لە مێژووی ژیانیاندا ئاشکرای بکەن پەیوەندییەکی تایبەتە لەگەڵ کەســـێکی دیکەدا (بۆنموونە حەز و خۆشەویستی یان ماسۆچیزم و ساردیزمە)، کە لەو پەیوەندییە تایبەتییەدا سەرهەڵدەدات.

مادام هەڵوێســـتەکان لەنێو بازنەی پەیوەندییەکانی ئێمەدان لەگەڵ کەســـانی دیکەدا، ئەوا هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتمان بەرانبەریان کۆدەکاتەوە. بەوجۆرەی خۆشەویستی شکست دەخوات و ئارەزووش لە ئاکامی ئەم شکستییەی خۆشەویستیدا ســـەرهەڵدەدات، تاکو خۆی لەناوبەرێت و ڕێگە بۆ خۆشەویستی خۆشبکات، ئەوا هەموو هەڵوێستەکان لە ئاستی کەسە بە بابەتکراوەکەدا لەنێو خۆیاندا بە شاراوەیی ئاماژە بۆ کەســـەکە-وەکو-خۆ دەکەن. ئـــەم ئاماژەکردنەش مەرگی ئەوانە. لەگەڵ مردنی هەڵویستێکی دیاریکراودا بەرانبەر کەسە بە بابەتکراوەکە هەڵوێستێکی نوێ بۆ گرتنی کەسەکە-وەکو-خۆ دێتەکایەوە. ئەمەش هەمانکات بناخەکەی لەقدەکات و ڕێگەش بە لایەنە دژوەستاوەکەی دەدات خۆی بەرجەستەبکات. ئێمە بەردەوام و بە شێوەیەکی نەبڕاوە لە کەسە بە بابەتکراوەکەوە ئاماژە بۆ (خۆ)ی ئەو دەکەین و لە (خۆ)ی ئەویشەوە بۆ بە بابەتبوونی دەگەڕێینەوە.

ئەم جوڵانە بێ وەستانە و بە هەڵگەڕانەوەشی پەیوەندی نێوان ئێمە و کەسانی دیکە دیاریدەکات. لەهەموو حاڵەتێکـــدا تاک لەنێو یەکێک لە پەیوەندییەکاندایە. بـــە یەکێکیان ڕازییە و بەوی دییان نا ڕازییە. درێژخایەنی و مانەوە لەنێو جۆرێک پەیوەندییـــدا بۆ بڕوای خراپ یان بارودۆخیکی تایبەتی مێژووی ئێمە دەگەڕێتەوە. بەڵام هەرگیز لە خۆی ڕازی نییە: پەنجە بەرەو لایەنە دژوەســـتاوەکە ڕادەکێشێت. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئێمە هەرگیز ناتوانین هەڵوێستێکی نەگۆڕمان هەبێت ئەگەر کەســـەکە لەیـــەک کاتدا خۆی وەکو خۆ و بابـــەت دەرنەخات؛ یان بابەتێکـــی بەرزی بەرزێتی و بەرزێتییەکی بەرز نەبێت؛ ئەمەش لەبنەڕەتدا کارێکی ماحاڵە. کەوابوو، ئێمە بەردەوام لەو بوونەوە تەماشـــا دەکات، دەبین بەو بوونەی تەماشایدەکرێت، گرنگیش نییە چۆن خۆمان بگونجێنین و چەندیش پەیوەندییەکەمان ڕاگرین. ئێمە دەمانەوێت شوێن کارێکی مەحاڵ بە ناسینەوەی سەربەستی کەسەکە و بوون بە بابەتی بوونیدا بگەڕێین.

حەزدەکـــەم گوتەیەکی ژان ڤـــاڵ بەکاربهێنم و بڵێم، ئێمە لـــە پەیوەندیماندا

لەگەڵ کەســـانی دیکەدا (هەندێک جار لەحاڵەتی سەرکردنی بەرزێتیدا، ئەو کاتەی کەســـەکە، وەکو بابەت دەناســـین و لەنێو جیهاندا ونیدەکەین)، هەندێک جاریش بـــەو بەرزێتییەی دادەنێین، کە بەرزێتییەکەی ئێمە ڕەتدەکات. بەڵام هیچ کام لەم دوو حاڵەتە بە تەنیا کاری خۆی بە ئاکام ناگەیەنێت. نابێت خۆمان بخەینە ســـەر زەمینەیەکی یەکســـانیش؛ ئەو زەمینەیەی، کە لەسەری ناسینەوە و بڕواکردن بە سەربەستی کەســـەکە و بڕواکردن بە سەربەستی ئێمەش پێکدەهێنێت. کەسێکی دیکـــە، لەبنەڕەتەوە، ناناســـرێت؛ کاتێک دەمەوێ بیناســـم ڕادەکات. ئەو کاتەی منیـــش لە دەســـتی ئەو ڕادەکەم دەمگرێـــت. تەنانەت ئەگـــەر بمەوێت پەیڕەوی بۆچوونە ئاکارییەکانی (کانت)یش بکەم، سەربەستی کەسانی دیکە بە کۆتاییەکی بێمەرج دابنێم، هێشـــتا ئەم سەربەســـتییە بە بەرزێتی دەمێنێتـــەوە و دەبێت بە ئامانجێکی دوور بۆ من. لەلایەکی دیکەوە، دەتوانم بۆ بەرژەوەندی ئەوان کار بکەم و بوونی بە ئامێربوونی ئەوان بۆ سەربەســـتییەکە بەکاربهێنم. لەڕاستیدا پێویستە من کەســـێکی دیکە لە حاڵەتێکدا، وەکو ئامێر ببینم. لەمحاڵەتەدا دەســـتەڵاتم بۆ گۆڕانی پەیوەندییەکەش دەخەمەگەر و کەسەکەش بەحاڵەتەکەوە دەگۆڕم. لێرەدا، من خۆم لەبەردەم ئەو پارادۆکســـەدا دەدۆزمەوە، کە بووە بە ناوەڕۆکی بۆچوونی ڕامیاری لیبراڵەکان و (ڕۆسۆ)ش پێناسەی کردووە و دەڵێت: دەبێت زۆر لە کەسانی دیکە بکەم سەربەســـت بن. ئەگەر زۆرکردنەکە هەمـــوو جارێکیش بەکارنەیەت و نەبێـــت بە زەبر و توندوتیژیش حوکم بەســـەر پەیوەندییەکانـــی نێوان تاکەکاندا دەکات. ئەگەر دڵنەوایی کەســـێک بدەمەوە دڵنیاییبکەم ئەوا دەمەوێت سەربەستی کەســـەکە لە ترس یان خەم دووربخەمەوە. بەڵام دڵنەوایی و دڵنیایی سیســـتەمی ئامێرەکانـــن و بەرەو کۆتاییەکمان دەبەن. بەجۆرێک دانراون تاکو کاربکەنە ســـەر کەســـەکە و لەنێو سیستەمەکەدا بیکەن بە ئامێر. لەسەرو ئەمەوە، دڵنەوایکەرەکە دەبێتـــە هۆکاری جیاکردنەوەی ئەو سەربەسســـتییەی لەگەڵ بەکارهێنانی ژێرییدا و شـــوێن کەوتنی چاکـــەدا بەکاریدەهێنێـــت. هەروەها ئەو (ئەشـــکەنجەیەی) لە ئاکامـــی کارەکەیدا و ناچارییەکی دەروونیدا توشـــی دەبێـــت. کەوابوو، گرفتەکە لە جیاکردنەوەی سەربەســـتی و ئەشـــکەنجەکەدایە. لەبەر ئەوەی دڵنەوایکەرەکە دەتوانێت سەربەستییەکە جیاکاتەوە، هەمانکات ڕەتیدەکات و زەبریش بەرانبەری بەکاردەهێنێت. ئەوا ناتوانێت لەو زەمینەوە، کە لەســـەری ڕاوەستاوە ئەم ڕاستییە بناســـێت: کە ئەو سەربەســـتییەی خۆی دەکات بە ئەشـــکەنجەکە و دوایش بەو کردەوەیەی سەربەستییەکە لە ئەشکەنجەکە بپارێزێت، کارکردنە دژی سەربەستی. ڕێگەنادات ئاکار و لێبوردن باشـــتر ڕێز لە سەربەستی کەسەکەی دیکە بگرن. لەو ســـاتەوەی پەیدادەبم سنوری فاکتۆرەکان بەدەوری سەربەستی کەسەکەی دیکەدا دەکێشـــم. من ئەو ســـنورەم. هەریەکێکیش لە پڕۆژەکانم سنورەکەی دەوری ئەو

ڕەنگڕێــژدەکات. خێرخوازی، لێبوردن پرۆژەی بوونی منن، کە مامەڵەکردنی من و کەســەکە لەگەڵ یەکدییدا دەسەلمێنن. لێبوردن فرێدانێکی بەزۆری کەسەکەیە بۆ نێو جیهانی لێبوردن. لابردنی ئەگەرە سەربەســتەکانی، وەکو ئازایەتی، بەرگری، بەردەوامبوون و خۆ-سەلماندنە، کە ئەو هەڵی بۆ دەرەخسێت لە جیهانی لێنەبوردندا گەشــەیان پێبدات. ئەم فاکتۆرە لەگەڵ گرفتی پەروەردەدا باشــتر دەردەکەوێت: پەروەردەیەکی توندڕەوانە منداڵ بە ئامێر دەکات چونکە بەزۆر بەهاکانی بەسەردا دەســەپێنێت، بەبێ ئەوەی منداڵ بیەوێت. پەروەردەی لیبراڵیش، بۆ بەکارهێنانی ڕێگەگەلێکی دیکە بنەما و بەها لەپێشترەکان بە ناوی منداڵەکەوە بۆ پەروەردەکردنی هەڵدەبژێرێت. فێرکردنی منداڵ بە ڕێگەی ڕازیکردن و نەرمی لە زۆرلێکردن کەمتر نییە. کەوابوو، ڕێزگرتن لە سەربەستی کەسانی دیکە وشەیەکی بێ واتایە: تەنانەت ئەگەر بمانەوێت ڕێز لە پرۆژەی سەربەستیش بگرین، هەریەکێک لەو هەڵوێستانەی هەڵیدەبژێرین لادانە لە سەربەســتییەکە. لێرەدا گوێنەدان بە کەسانی دیکەش بۆ کێشەکە چارەســەر نییە. ئێمە لەنێو جیهاندا فڕێدراوینەتە بەردەم ئەوان. بوونی ئێمە ســنوورداریێتی سەربەستی ئەوانە، تەنانەت خۆکوشــتنیش هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت. هەرچییەک بکەین پێویســتە لەنێو جیهانــدا بە ئاکامیان بگەیەنین، کە کەسانی دیکەشی تێدا دەژین و پەیوەندیمان لەگەڵیاندا هەیە.

لەم تاکە هەڵوێســتەوە هەستکردن بە تاوان یان ئازاری ویژدانی پەیدا دەبێت. من لەئاســتی کەســانی دیکەدا ئازاری ویژدانیم هەیە. من لەنێو ئازاری ویژدانیدام چونکە لەژێر تەماشــاکردنی کەسەکەوە نامۆ دەبم و خۆم بە ڕووتکراوەیی دەبینم، هەســت دەکەم لە بەرزاییەوە کەوتومەتە خوارەوە. ئەمەش واتای دەستەواژەکەی نێو تەورات دەردەخات، کە دەڵێت، "ئەوان دەیانزانی ڕووت بوون." هەروەها، ئەو کاتەی تەماشــای کەسەکە دەکەم توشی ئازاری ویژدانی دەبم چونکە لەگەڵ خۆ-سەلماندنەکەمدا ئەو دەکەم بەبابەت و ئامێر، ئەویش هەست بە نامۆبوون دەکات. کەوابــوو، تاوانی یەکەم ســەرهەڵدانی بوونی منە لەنێو جیهانــدا، ئەو جیهانەی کەســانی دیکەشی تێدایە. هەرچ جۆرە پەیوەندییەکیشم لەگەڵیاندا دروستبێت لە ئازاری ویژدانی دوورناکەوێتەوە.

بەڵام زەبوونی دەبێت بەهاوســەری ئازاری ویژدانیم و هەرگیز ناتوانم خۆمی لێ ڕزگاربکەم. لەهەموو هەوڵدانەکانمدا بۆ ناسینەوەی سەربەستی کەسەکەی دیکە من دەبێت ئەو بەئامێربکەم و سەربەستییەکەشی بە بەرزێتی دابنێم. هەروەها، گرنگ نییە چ جۆرە هێز و زەبرێک بەکاردەهێنم، کەســەکە هەرگیز خۆی لە بەبابەتبوون دەربازناکات. مــن بێجگە لەوەی سەربەســتییەکەی لەحاڵەتێکدا دەردەخەم چی دیکــەم بۆ ناکرێت. ناتوانم زۆرتر یان کەمتری بکەم و بە ئارەزووی خۆم بەڕێوەی بــەرم. کەوابوو، من لە بوونمدا بەرانبەر کەســانی دیکە ئــازاری ویژدانیم هەیە،

چونکـــه ســـەرهەڵدانی بوونم ڕەهەندێکی نوێ بە بوونی ئـــەوان دەدات؛ منیش لە ســـود وەگرتن یان گۆڕانی ئەو ڕەهەندەدا بێ دەستەڵاتم. بوون-بۆ-خۆ لە مێژووی بوونیدا بەم ئەزمونانەدا دەڕوات و بەزانینش سەبارەت هەوڵدانە نەزۆکەکانی پێشوی دەتوانێت دوای مردنی کەسانی دیکە بکەوێت. ئەم بڕیاردانە سەربەستانەیە بە ڕق ناوزەدیدەکەین. ڕقیش ئەم واتایە دەبەخشێت؛ بوون-بۆ-خۆ واز لە داواکارییەکەی بۆ یەکگرتن لەگەڵ کەســـانی دیکەدا دەهێنێت؛ بۆ ئەوەی بوون-لەنێو-خۆی بوونی بدۆزێتەوە کەســـانی دیکە بە ئامێر ناکات. ئەو دەیەوێت سەربەستییەکەی سنوری فاکتۆریی نەبێت و بوونی خۆی-وەکو بابەت-بۆ-کەسانی دیکە لەناوبەرێت. ڕەهەندی نامۆبوونی لەکۆڵبێتـــەوە. ئەمەش لەوەدەچێت پـــڕۆژەی بوونت لەنێو جیهانێکدا دامەزرانبێـــت کەســـی دیکەی تێدا نـــەژی. بوون-بۆ-خۆ، ئـــەو بوونەیە، کە ڕقی لەڕازیبوونێکە تەنیا بۆ خۆی بێت؛ ئەزمونەکانی لە بەکارنەهێنانی بوونی-بۆ-کەسانی دیکە ڕێنمایی دەکەن. دەیەوێت ببێت بە لەناوبەرێکی سەربەســـتی بوونی خۆی و بە ئاکامەکانی بوونی بگات. ئەو کەســـەی ڕقی لە پرۆژەکانە نابێت بە بابەت؛ ڕق سەربەستییەکی ڕەهای بوون-بۆ-خۆ دەخاتە بەردەم کەسانی دیکە. لەبەر ئەمەشە ڕق لە نرخی بابەتەکەی کەمناکاتەوە چونکە ناکۆکییەکە دەخاتە سەر زەمینەیەکی ڕاســـت. ئەوەی من ڕقم لێیەتی ڕوخســـاری کەســـەکە نییە، بەڵکو هەڵەکەی یان کردەوەکەیەتی. ئەوەی ڕقم لێیەتی بوونییەتی بەگشتی، وەکو بەرزێتییەکی-بەرز. ئەمەش وا لە ڕق دەکات بڕوای بە سەربەستی کەسانی دیکە بهێنیت و بیناسێتەوە. بەڵام بڕواکردنەکە نەرێ و ڕووتکراوەیە؛ ڕق تەنیا کەسێک، وەکو-بابەت دەناسێت و ڕووی تێدەکات. ئەو دەیەوێت ئەم بابەتە لەناوبەرێت و بەرزێتییەکەی تێپەڕ بکات. بەرزێتییەکەش بە تەواوی ناناسرێت.

کەوابوو، بوون-بۆ-خۆ تێیناگات؛ هەروەها بەبێ گۆڕانیشـــی بۆ بابەت ئەم کارە ڕوونادات. من بەردەوام بەو هەڵوێستە دەیبینم لە بوونی کەسە بەبابەتکراوەکەدا لە من ڕادەکات و خۆی بەدەستەوە نادات. ئەمەش وا لە ئێمە دەکات ڕقمان لە دەربڕینە دەروونییەکان بێت نەک خودی دەروونەکە. ئەوەی من ڕقم لێیەتی هەمووی ئەو لایەنە دەروونییەیە، کە من بە بەرزێتی کەســـێکی دیکەوە دەبەستێتەوە. من لەڕقدا خۆم ناخەمە ئاستی بابەتێکی تایبەتییەوە. ئەمەش جیاوازی نێوان ڕق و قین دیاریدەکات. ڕقیش لە وەستانمدا لەئاستی شتێکی خراپدا سەرهەڵنادات. بەپێچەوانەوە، لەوانەیە لە چاوەڕوانی سوپاسکردندا و لەگەڵ بەزەییدا دروست بێت. ڕق لە ئاکامی کردەوەی کەسانی دیکە دێتە پێش، کە من دەکات بەبابەتی سەربەستییەکەی. ئەم کردەوەیە توشی شەرمەزارییم دەکات؛ بوونی من وەکو ئامێر دەخاتە بەردەستی سەربەستییەکەی کەسێکی دیکە. منیش بۆ هێشتنەوەی سەربەستییەکەم پێویستە بیروخێنم. ئەمەش نزیکی نێوان ڕق و سوپاسگوزاری نیشاندەدات؛ لە سوپاسگوزاریدا بەرانبەر بەزەیی

یان بەخشندەیی سەربەستی کەســـەکەی چاکەکەی لەگەڵداکردوین دەناسرێتەوە. ئەویش بەرانبەر کردەوەکەی و بەهاکانی بەرپرسە. من ڕێخۆشکەری بووم و بە هۆی منەوە کردەوەکەی هەڵسوڕاندوە.

لە ڕوانگـــەی ئەم بروانامەیـــەوە بوونـ بۆ خۆ پرۆژەی خۆشەویســـتی یان ڕق دەخاتەگەر و ناتوانێت بیر لە بوونی کەســـانی دیکـــە نەکاتەوە. ئاکامی دووەمی بۆچوونەکانمان لەوێدایە، کە ڕق، ڕقە بەرانبەر کەســـانی دیکە لە یەک کەســـدا. ئەوەی من هاندەدات دوای مردنی کەسێک بکەوم بوونی گشتی کەسانی دیکەیە. ئەو کەسەی ڕقم لێیەتی نوێنەرایەتی هەموو کەسانی دیکە دەکات. پرۆژەی تێپەڕبوونم بەسەر ئەودا تێپەڕبوونە بەسەر هەموو کەسانی دیکەدا. لە ڕقدا تێگەیشتن ڕەهەندی نامۆبوونم و بەکۆیلەبوونم لەئاستی کەسانی دیکەدا ڕووندەکاتەوە. تێپەڕکردنی ئەم بەکۆیلەبوونەیـــە دەبێت بە پرۆژە. ئەمەیە ڕق دەکات بە هەســـتکردنێکی تاریک؛ هەســـتکردنێک، کە دەیەوێت کەســـێکی دیکە بەبێ ڕازیبوونـــی خەفە بکات. من ڕازی نیم کەســـێک ڕقی لە کەسێکی دیکە بێت؛ من دەمەوێت تێپەڕیبکەم چونکە هەرچەندە ڕقەکە ڕوو لە من ناکات، بەڵام پەیوەندی بە منەوە هەیە و بەرانبەر منیش بەکاردێت. لەڕاستیدا دەیەوێت من بروخێنێت، نەک لەبەر ئەوەی من خەفەدەکات، بەڵکو لە بنەڕەتدا داوای ڕازیبوونی من ناکات. ڕق دەیەوێت بەرانبەر ڕق ڕاوەستێت. ڕق بڕواکردنێکی نائاساییە بە سەربەستی کەسە ڕقاوییەکە.

ڕقیـــش خۆبەزێنە. پرۆژەی ســـەرەتایی ڕق خەفەکردنی ئاگامەندی کەســـانی دیکەیە. ئەگەر لەم پرۆژەیەدا ســـەرکەوتوش بێت، بۆنموونە، لەم ساتەدا بتوانێت کەســـەکە لەناوبەرێت ناتوانێت ڕێگەی سەرهەڵدانی بوونی کەسەکە لە بنەڕەتەوە بگرێت. ئەگەر سەرکەوتنی ڕق لە تێکشکانی کەسەکەدا بێت، ئەوا ئەمکارە بڕوانامە بە بووبی کەسکە دەدات. ڕاستەوخۆ بوونمـ بۆ کەسانی دیکە، لە خلیسکانمدا بەرەو ڕابردوو، دەبێـــت بە ڕەهەندێکی لە چارەبەدەری بوونم. من هەرگیز ناتوانم خۆمی لێ ڕزگار بکەم. دەشـــێ هەندێک بڵێن من لە ڕابردووم ڕادەکەم و خۆم بە ئێســـتا دەگەیەنم، لە داهاتووشـــدا خۆمی لێ دەربازدەکەم. بەڵام وا نییە. ئەوەی بووە بە بوونـ بۆ کەسانی دیکە، ئەگەر کەسانی دیکەش خەفەکرابن هێشتا بوونی لە هەموو ڕۆژەکـــەدا زەهراوی کراوە. ئەو ناتوانێت بوونی خۆی بەبێ ئەوان ببینێت و بوونە نامۆکراوەکەی بدۆزێتەوە. هەموو ئومێدێکی بۆ کارکردن لەســـەر نامۆبوونەکەشی دۆڕاندووە و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری ناهێنێت چونکە کەسەکەی ئەم دەیەوێت لەناوییەرێـــت کلیلی نامۆبوونەکەی هەڵگرتـــووە و لەگەڵ خۆیدا دەیباتە نێو گۆڕ. من بە مردنی کەسەکە دەبم بە شتێکی نەگۆڕ و بێچارە لەنێو ڕابردوومدا دەچەقم. لەئێستاشدا بەوجۆرە دەمێنمەوە، ئەگەر لە حوکمدان و بۆچوونەکانی ئەودا پرۆژە و شێوازی ژیانم بهێڵمەوە.

مردنی کەسـەکە، وەکو مردنی خۆم، مـن دەکات بە بابەتێکی لە چارەبەدەر. کەوابوو، سـەرکەوتنی ڕق لەگەڵ سـەرهەڵدانیدا ڕوخانی خۆشی پێیە. ڕق ئێمە لە سـوڕانەوەی نێو بازنەکە ڕزگار ناکات. بەڵکو دوا هەوڵدانێکی بێهودەیە. پاش ئـەم ڕوخانە ئەوەی بۆ بوون-بۆ-خـۆ دەمێنێتەوە گەڕانەوەیەتی بۆ نێو بازنەکە و دیوگۆڕانێتی لەنێوان هەردوو هەڵوێستە بنەڕەتییەکاندا.

## ٣ . بوون-لەگەڵ و "ئێمە"

بێگومان کەسـێک دەریدەبڕێت باسـەکەمان ناتەواوە چونکە لـەو ئەزمونە کۆنکرێتییانـە دوایـن، کە پەیوەندی نێوان ئێمە و کەسـانی دیکـە بەرەنگاری دەرناخات. هەروەها دروسـتە هەندێک جار چەمکی "ئێمە" بەکاردەهێنین. بوون و پێویستی ئەم شێوازە ڕێزمانییە ئامژە بۆ ئەزمونی بوون-لەگەڵدا دەکات. دەکرێت "ئێمە" بە بکەر دابنێین و لەم شێوازەدا (کۆ)یە بۆ "من". گومانیش لە پەیوەندی نێوان ڕێزمان و بیرۆکەدا ناکرێت. لەڕاسـتیدا، پێویسـتە بە پرسـیارکردنەکەدا بچینەوە و لە پەیوەندی نێوان زمان و بیرۆکە بکۆڵینەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دروستە بکەری (ئێمە) بەبێ بەستنەوەی بە بیرۆکەی کۆی بکەرەکانەوە، کە خۆیان، وەکو (خۆ) دەناسـنەوە، دەرناکەوێت. ئەگەر ئـەم کارەنەکرێت، ئەوا چەمکی (ئێمە) دەبێت بە هەڵگـری کۆمەڵێک ئەزمونی نەبـڕاوە. ئەزمونەکانیش پێش ئەزمونی منـی بەبابەتکراو بۆ کەسـانی دیکە و ئەوانی بەبابەتکراویـش بۆ من دەکەون و ناکۆک ڕادەوەسـتن. لەنێو (ئێمە)دا کەس بەبابەت نەکـراوە. (ئێمە) هەموو ئەو خۆیانە دەگرێتەوە، کە خۆیەتی خۆیان پاراستوە. هێشتا ئەم پاراستن و بڕواکردنە بە یەکدی بابەتی ئاشـکراکراوی توێژینەوە نییە؛ ئەوەی ئاشـکرایە کارکردنێکی هاوبەش یان هەسـتکردنێکی هاوبەشـە. (ئێمە) بەرگری دەکەین، (ئێمە) هێرش دەبەین، (ئێمە) ئازارە ویژدانییەکە تاوانباردەکەین، (ئێمە) دەڕوانینە ئێرە و ئەوێ. بڕواکردن بە خۆیەتی تاکەکان لەو بڕواکردنە دەچێت، کە ئاگامەندی بەرانبەر بوونی خۆی لە پێش تێڕاماندا هەیبوو. چاکترین نموونە بۆ (ئێمە) بینەرانی شانۆگەرییە، کە بیرکردنەوەیان بۆ تێگەیشـتن لە دیمەنی ئەندێشاوی و داهاتووی ڕووداوەکان و پاڵەوانەکان و خیانەتکەرەکانەوە ماندووکردوە. ئەو بینەرەی نوێنەری ئاگایی بینەر دەکات خـۆی بەو ئاگامەندییە هاو-بینەرەی بینـەران دەرناخات. هەموو دەزانین چۆن بە بینینی کورسـییە چۆڵەکانی نیوەی هۆڵەکە شـەرمەزاردەبین و تامەزرۆ بوونەکەشمان هۆڵەکە پڕدەکات. هەروەها، بوونمان، وەکو خۆ لەنێو ئەزموونەکاندا لە هەموو حاڵەتێکدا سەرهەڵدەدات.

من لەسەرشۆسـتەی بەردەم قاوەخانەکە ڕاوەستاوم؛ تەماشای کەسانی دیکە

دەکەم و دەزانم تەماشادەکریم. لێرەدا، بەرانبەر ئەوان بەرەنگارانە دەوەستم (ئەوان بـۆ من و من بۆ ئــەوان بەبابەت کراوین). بەڵام، کتوپڕ چەند ڕووداوێک لەســەر شەقامەکە دێنە پێش؛ بۆنموونە تەکسییەک و ئۆتۆمۆبیلێکی جیپ بەیەکدا دەدەن. من دەبم بە تەماشاکەر، بوونی خۆم بەبێ تێڕامان دەبینم، کە لەگەڵ 'ئێمە'دا خۆی خەریککردوە. بەرەنگارییەکەی پێشــو دیارنامێنێــت و ئاگامەندییەکەی دەبێت بە بنەمای 'ئێمە' و هەموو کەسەکان دەگرێتەوە: 'ئێمە' دەروانینە ڕووداوەکە، 'ئێمە' بەشداریدەکەین. ئەم نادوژمنکارییەیە، کە ڕۆمانییەکان بە (یەکدابوون) ناوزەدیانکرد. لێرەدا، دەگەڕێینەوە بۆ چەمکی بوونـ لەگەڵی هایدیگەر. ئایا ڕەخنەکەی پێشومان [لەسەر هایدیگەر] ڕەوابوو؟

ئەو خاڵەی لێرەدا دەمانەوێت باسیبکەین ئەوەیە، کە گومان لە ئەزمونی 'ئێمە' ناکەین. تەنیا ئەو لایەنە سنوردارەمان ڕوونکردەوە، کە ئەزمونەکە نابێت بە بنەمای ئاگامەندی ئێمە بۆ کەســانی دیکە. ئاشــکرایە، نابێت بە بنەمای ئۆنتۆلۆجی بۆ ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ؛ ئێمە سەلماندمان، کە بوونی بوونـ بۆـ خۆ لەنێو کەسانی دیکــەدا لە بنەڕەتەوە مێتافیزیکی و فاکتۆرێکــی هەڵکەوتوش بوو. بێجگە لەمە، 'ئێمە' خۆیەکی هاوبەشــی ئاگامەندی نییە. ئەوشتە نوێیەش نییە، کە بەشەکانی تێپەڕیشیان بکات. 'ئێمە' لەنێو ئەزمونی تاکەکەسدایە؛ پێویستیش ناکات هەموو کەسانی نێو قاوەخانەکە ئاگایان لەم ئەزموونە بێت، تاکو من لە 'ئێمە' بەئاگابم. هەموومــان دەزانین واتای ئەم دایەلۆگە لە ژیانــی ڕۆژانەماندا چییە، کە دەڵێێن، "ئیمە ناڕازاین" یان "بەڵام، نا تۆ بە ناوی خۆتەوە بدوێ." ئەمە بوونی 'ئێمە' بە شــێوای دەردەخات. ئەگەر ئەمە دروســت بێت، بۆ ئەوەی ئاگامەندی بگاتە ئەو حاڵەتەی 'ئێمە'ی تێدا بەرجەستە بێت، پێویستە خۆی بخاتە نێو کۆمەڵەوە و بە شــێوەیەکی دیکە خۆی دەربخات؛ واتە، وەکو بەرزێتییەکی بەرز یان بەرزێتییەکی بەرزکراو. 'ئێمە' ئەزمونێکی تایبەت لە حاڵەتی تایبەتی و لەسەر بنەمای بوونـ بۆـ ئەوان بەگشتی دەناسرێت. بوونـ بۆـ کەسانی دیکە پێش بوونـ لەگەڵـ کەسانی دیکە دەکەوێت و دەیهێنێتە کایەوە.

ئەو فەیلەســوفەی لە واتای 'ئێمە' دەکۆڵێتەوە دەبێ وریا بێت و بزانێت باسی چیدەکات. تەنیا ئێمەـ وەکوـ خۆ نییە؛ بە هۆی ڕێزمانەوە فێردەبین، کە ئێمەـ وەکوـ تەواوکــەر و ئێمەـ وەکوـ بابەتیش هەین.[٦٥] تاکو ئێرە هەرچییەکمان باســکردوە

---

٦٥ واتای ئەم دوو جۆرەی 'ئێمە' لە ڕیزمانی کوردییدا دەرناکەوێت. 'ئیمە' بەگوێرەی دانانی لە ڕستەدا، بەپێچەوانەی زمانی ئینگلیزییەوە، ناگۆڕێت. بۆنموونە لەم دوو ڕستەیەدا: (ئێمە نانمان خوارد یان ئەوان نانیان بۆ ئێمە هێنا.) گۆرانی بەسەردا نایەت. لەهەردوو ڕستەکەدا 'ئێمە' نوسراوە، بەڵام دوو جێگە و دۆخی جیاوازیان لە ڕێزماندا هەیە. جیاوازییەکەیان بە نوسین لە زمانی ئینگلیزییدا ئاشکرا دەردەکەوێت.(وەرگێڕ)

ئاشـــکرای دەکات ‘ئێمە’ لە دەستەواژەی “ئێمە تەماشای ئەوان دەکەین” ناخرێتە ســـەر هەمان زەمینەی ئۆنتۆلۆجی ‘ئێمە’ کە لە دەســـتەواژەی “ئەوان تەماشای ئێمـــە دەکەن” دەردەبڕێت. ئەمەش پەیوەندی بە خۆگەرایەتییەکی ڕووتەوە نییە. لەو دەســـتەواژەیەدا، کە دەڵێین، “ئەوان تەماشای من دەکەن” بوونی خۆم، وەکو بابەت بۆ کەســـانی دیکە نیشـــاندەدەم. منی بەرزێتییەکی بەرزێتی نامۆدەکرێم. ئەگەر دەســـتەواژەکە “ئەوان تەماشای ئێمە دەکەن” ئەزمونێکی ڕاستەقینە بێت، ئەوا دەیســـەلمێنم، کە خۆم خســـتۆتە نێو کۆمەڵێکەوە و هەموو (من)ەکان تیایدا نامۆکراون. ‘ئێمە’ هەموو پێکەوە بووین بەبابەت. کەوابوو، دوو شـــێوازی ئەزمونی جیاوازی ‘ئێمە’ هەیە: ئەو دوو شـــێوازەش ئاماژە بۆ بوون-لەنێو-تەماشـــاکردن و بوونێکی تەماشـــاکراو دەکات، کە بنەڕەتـــی پەیوەندییەکانی بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ کەسانی دیکەدا دیاریدەکات. ئێستاش لەم دوو شێوازەی ‘ئێمە’ دەکۆڵێینەوە.

### ئەلف. ئێمەی بابەت

توێژینەوەکەمان بە ئەزمونی دووەم دەستپێدەکەین؛ واتاکەی ئاسانتر ڕووندەبێتەوە و یارمەتیمان دەدات لە بوونی کەســـانی دیکە تێبگەین. یەکەم، پێویستە بزانین، کە ئێمەی بابەت لەنێو جیهاندا ڕاگیردەکات. وەکو نامۆبوونێکی بەردەوام دەکەوێتە نێو ئەزمونی شـــەرمکردنەوە. ئەمەش لەو دیمەنەدا دەردەکەوێت، کە ژنێکی جوان دەچێت زیندانییەک لەســـەر بەلەمەکە دەبینێت و تەماشـــای کارکردن و ژیانی پڕ ئازاری دەکات. زیندانییەکەش خەریکە لە نێو شەرم و توڕە بوونییدا بخنکێت. ئەمە شەرمکردن و نامۆبوونێکی گشتییە.

ئایـــا چۆن تاکێک لەنێو کۆمەڵێکی بە بابەتکراو هەســـت بە بابەتبوونی خۆی دەکات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ خەسڵەتی بنەڕەتیی بوونمان بۆ-کەسانی دیکە دەگەڕێینەوە.

لێرەوە تەماشـــای ئەو حاڵەتە دەکەین من بە تەنیا تیایدا ڕووبەڕووی کەسێک دەبمەوە. هەردووکمان دەڕوانینە یەکدی. من دەمەوێ بەرزێتییەکەی ئەو ڕەتبکەم یان هەســـت بە بەرزێتییەکەی خۆم دەکەم و هەموو ئەگەرەکانیشـــم بە مردوویی دەبینم. من و ئەو دەبین بە دووانە و لەنێو ئەم هەڵوێستەدا پەیوەندی دروستدەکەین. هەڵوێســـتەکەش بوونێکی ڕاســـتەقینەی بۆ من و ئەو هەیە. ڕووبەڕووبوونەوەکە و پەیوەندییەکەمان بە شێوەیەکی دیکە نابینرێت. بەڵام ئەو خاڵەمان باسنەکردووە، کە پەیوەندییەکەمان لەســـەر زەمینەیەکی نەبـــڕاوی پەیوەندییەکانی هەردووکمان لەگەڵ کەســـانی دیکەدا ڕاگیردەکرێت؛ ئـــەوەش ئاگامەندییەکانە، کە بە ڕواڵەت هەموو ئەگەرییان پێکهێناوە. لە ئاکامدا، پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئەم کەســـەدا، کە

لەپێشتر هەســـتمپێکرد و بوو بە بناخە بۆ بوونم-بۆ-کەسانی دیکە یان پەیوەندی ئەو لەگەڵ مندا لە هەموو حاڵەتێک و لەژێر باری هەموو ھاندەرێکدا لەنێو ئەزموندا دەبێت بە بابەت بۆ کەســـانی دیکە. ئەمەش لەگەڵ ئامادەبوونی کەسی سێیەمدا باشتر دەردەکەوێت. گریمان، بۆنموونە، کەسێک دەڕوانێتە من. لەمحاڵەتەدا بوونم بە نامۆیی دەبینم. کەسی سێیەمیش کتوپڕ دەردەکەوێت. ئەگەر ئەویش بڕوانێتە مـــن ئەوا هەردووکیان دەبن بە کۆمەڵ، وەکو 'ئـــەوان' (ئەوانی خۆ) لەڕێگەی بە نامۆبوونـــی منەوە. 'ئەوان' ڕوو لە 'کەســـێک' دەکـــەن، کە تاکێکە و بە (کەس) دانانرێت. ڕاستەقینەی تەماشاکردنەکەش ناگۆڕێت و بنەڕەتی نامۆبوونەکەشم پتەوتر ناکات. ئەگەر کەسی سێیەم تەماشای ئەو کەسە بکات، کە تەماشای من دەکات، کێشـــەکە ئاڵۆزتر دەبێت. من کەسی سێیەم ڕاســـتەوخۆ نابینم، بەڵکو لەڕێگەی کەسەکەوە دەیبینم، کە تەماشایکراوە. کەوابوو، بەرزێتی سێیەم بەرزێتییەکە ئەو بەرزێتییە ڕەتدەکات، کە بەرزێتی منی ڕەتکردوە و هەموو چەکێکی لێدەســـەنێت. لێرەدا زەمینەیەکی چەق وەســـتاو دەبینرێت، کـــە زوو لەناودەچێت و دەفەوتێت. ئەمەش وابەستە بە هەڵوێستی منەوە و بڕیاردانم لەگەڵ کەسی سێیەمدا ڕێکەوم و هەردووکمان بڕوانینە کەسەکەی بەبابەتکراوە.

لەم حاڵەتەدا من هەست بە 'ئێمە'، وەکو خۆ دەکەم، کە لە دواییدا باسیدەکەین. هەروەها دەتوانم تەماشای کەسی سێیەم بکەم و بەرزێتییەکەی ڕەتبکەم. ئەمەش، کەسی سێێەم بەبابەت دەکات و ئەگەرەکانی دەمرێنێت. بەڵام تەماشای کەسەکەش دەکات، کە دەڕوانێتە من. ئەمە ئەو هەڵوێســـتە دێنێتە پێش، کە تیایدا من دەبم بەبابەت بۆ کەســـی دووەم، ئەویش دەبێت بەبابەت بۆ کەســـی ســـێیەم و کەسی سێیەمیش بۆ من دەبێت بەبابەت. سەربەستیش لەسەر بناخەی یەکێک یان دووان لەم پەیوەندییانە بونیاد بۆ هەڵوێستەکە پێکدەهێنێت.

ڕوودەدات کەسی سێیەمیش بڕوانێتە ئەو کەسەی من تەماشای دەکەم. لێرەدا، من دەتوانم تەماشـــای هەردووکیان بکەم و تەماشـــاکردنەکەی کەسی سێیەمیش چەک بکەم. کەســـەکە و کەســـی ســـێیەم بۆ من دەبن بە (ئەوان)ی بەبابەتکراو. بەبێ ئەوەی کەســـی ســـێیەمیش ببینم دەتوانم لەڕێگەی کەسەکەوە، کە هەست دەکات تەماشادەکرێت، تەماشاکردنەی بگرم. ئەمەش ناسینەوەی بەرزێتی سێیەمە لەڕێگەی کەسەکەوە. ئەزمونی سێیەم نامۆ بوونێکی ڕادیکاڵی کەسەکە دەردەخات. کەسەکەش دەیەوێت لەنێو جیهانی مندا خۆی دەربازبکات؛ لەوە زۆرتر من ناتوانم داگیریبکەم؛ بووە بە بابەت بۆ کەســـێکی دیکـــە و بەرزێتییەکی دیکە. کەوابوو، خەسڵەتی خۆی، وەکو بابەت وناکات و تەنیا ئاڵۆزی و تەمومژاوی دەبێت. نەک بە هۆی بەرزێتییەکەیەوە، بەڵکو لەڕێگەی بەرزێتی کەسی سێیەمەوە خۆی لە من ڕزگاردەکات. هەرشـــتێک لەبارەیەوە بزانم ئەو بـــەوی دی دەهێڵێتەوە. بۆ ئەوەی

جارێکی دیکە داگیریبکەم، دەبێت بڕوانمە کەسی سێیەم و بیکەم بەبابەت. ئەمەش، یەکەمجار، ڕوونادات چونکە لەوانەیە کەسانی دیکەش هەبن تەماشای کەسی سێیەم بکەن. بەردەوام کەسانێک هەبن، کە من نایانبینم. ئەمە بناخەی ئەوان-وەکو-بابەت دەلەقێنێت و بوون-بۆ-خۆش بەردەوام هەوڵدەدات ئەوان بەبابەت بکات و داگیریان بکات. لەبەر ئەم هۆیەشە دڵدارەکان پەنا بۆ تەنیایی دەبەن.

ئاشکرایە، دەزانم لەوکاتەدا تەماشای کەسەکە دەکەم کەسی سێیەم تەماشای من دەکات. ئەمەش من نامۆدەکات و نامۆبوونی کەسەکەش دەبینم. ئەگەرەکانی من لە بەکارهێنانی کەسەکەدا، وەکو ئامێر و لەناوبردنی ئەگەرەکانی بوونی، بەرزێتییەکەی من، کە دەیەوێت بەرزێتی ئەو ڕەتبکات و بە ئاکامەکانی بگات دەبێتەوە بە بەرزێتییەکی بەرزکراو. کەسەکە نابێتەوە بە (خۆ)، بەڵام من ئەو ڕاستییەم بۆ دەردەکەوێت، کە ناتوانم ئەو بەبابەتی بهێڵمەوە. ئەو دەبێت بە شتێکی بێ لایەن؛ شتێک لەوێدایە و منیش ناتوانم هیچی لێبکەم. بۆنموونە، لەوحاڵەتە دەچێت، کە دەبینم کەسێک لێدان و ئەشکەنجە دەدرێ و ناتوانم یارمەتی بدەم.

دەرکەوتنی کەسی سێیەم من دەبڕێت. مرۆڤەکە ئەوە نییە لێدان دەخوات یان سوکایەتی پێکراوە؛ بەڵکو هەبوویەکی ڕووتە. لەوە زۆرتر بە چی دیکە نابێت. لەڕێگەی کەسی سێیەمەوە گۆڕانی بەسەردا دێت؛ من لەسەر زاری کەسی سێیەمەوە دەیبستم، کە ئەو نەیتوانیوە بەرگری لە خۆی بکات یان من پێی دەڵێم، (شەرم ناکەیت لە کەسێک دەدەیت، کە ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات؟) حاڵەتی بێ دەستەڵاتی کەسەکە بە ئامادەبوونی کەسی سێیەم دەسەلمێنرێت. نابێت بە بەشێک لە جیهانی من؛ بەڵکو بەشێک لەو جیهانەی من و کەسە بێ دەستەڵاتەکە بۆ کەسی سێیەم تیایدا دەژین.

ئەمەش ئێمە دەخاتە بەردەم ئەو کێشەیەی دەمانەوێت لەسەری بدوێین: من و کەسانی دیکە لەبەرەنگاریدا دەژین. کەسی سێیەمیش سەرهەڵدەدات و هەردووکمان لەنێو تەماشاکردنەکەیدا کۆدەکاتەوە. من نامۆبوون و بوون بەباتی بوونمی پێدەسەلمێنم. بۆ کەسێکی دیکە من دەبم بە بابەتێک لەنێو ئەو جیهانەدا، کە من خاوەنی نیم. بەڵام ئەو کەسەی تەماشام دەکرد یان تەماشای دەکردم هەمان گۆڕانکاری بەسەردا دێت. ئەویش بۆ کەسی سێیەم دەبێ بەبابەت لەنێو جیهاندا. دوو هەڵوێست لەپێش سەرهەڵدانی کەسی سێیەمدا هەبوون؛ یەکەمیان لەنێو دەستەڵاتی کەسەکەدا من بە ئامێر دانراوم، دووەمیش بەپێچەوانەوە ئەویش بۆ من بوو بە ئامێر. لەهەر یەکێک لەم هەڵوێستانەدا مردنی ئەگەرەکانی تێدایە. لەگەڵ سەرهەڵدانی کەسی سێیەمدا من هەست بە نامۆبوونی ئەگەرەکانم دەکەم. بەهەمان شێوەش، ئەگەرەکانی ئەویش دەمرن. هەڵوێستەکە لەناو ناچێت، بەڵکو

لەژێر دەستەڵات و لەنێو جیهانی هەردووکماندا دەردەچێت. دەبێت بە پێکهاتەیەکی دەرەکــی لەنێو جیهانی کەســی ســێیەمدا. لەنێو جیهانی ســێیەمدا دەبینرێت، حوکمی بەســەردا دەدرێت، تێپەڕدەکرێــت یان بەکاردەهێنرێت. بــەڵام بونیادە دامەزرێنراوەکــەی لە بوونی منەوە بۆ کەســەکە یان لە ئــەوەوە بۆ من نامێنێت. هەموو ئەگەرەکانمان لەگەڵ سەرهەڵدانی کەسی سێیەمدا لەناودەچن. من، کتوپڕ، بوونێکی دەرەکی هەڵوێســتەکە لەنێو جیهاندا دەبینم. کە من و کەســەکە یەک دەگرین و دژوەستاو ڕوو لە یەکدی ناکەین. من لەدەرەوە و لەگەڵ کەسەکەدا لەنێو دەڵاقەیەکی دەرەکی ڕادەوەســتین و خۆشــمان ناتوێنینەوە. دەڵاقەکە ئەو لایەنە هەمووگەرییەیە، کە من و کەسەکە تیایدا جیاناکرێنەوە و لەگەڵیدا ڕێدەکەوم. بوونم لەوێدا بۆ کەســی سێیەمە. بەمجۆرەش بیر لە بوونی کەسەکەی دیکە دەکەمەوە. من و کەســەکە لــەدەرەوەی بوونی خۆماندا مامەڵە لەگــەڵ یەکدی دەکەین. من بیرۆکەی مامەڵەکردنەکەم هەڵگرتوە بەبێ ئەوەی لە واتاکەی تێبگەم؛ ناسینەوەی لێپرسینەوەکەم و لێپرسینەوەی کەسەکەشە هەردووکمان بە ئێمەی-بابەت دەکات. کەوابوو، ئێمەی-بابەت، هەرگیز خۆمان ناناســین و ناخرێینە بەر ئەزمون. ئەوەی لەنێو ئەزموندا دەردەکەوێت هەڵوێستی هاوکاریکردنە لەگەڵ کەسەکەدا. بیرۆکەی لێپرسینەوەکەم لەنێو هەڵوێستەکەدا 'ئێمە'ی دەرخست.

مــن دەتوانم، پێش ئامادەبوونی کەســی ســێیەم، بڵێم، (من دژی کەســەکە دەجەنگم) کاتێک کەســی ســێیەم ئامادەدەبێــت ئەگەرەکانی من و کەســەکە لەناودەچن. زۆریشــم لێدەکرێت بیســەلمێنم (ئێمە جەنگ دژی یەکدی دەکەین.) لەڕاســتیدا دەستەواژەی (من لەگەڵ ئەودا دەجەنگم و ئەویش لەگەڵ مندا) دەبێت بە شــتێکی نادروست. ڕاســتییەکەی لەوێدایە، کە من دژی ئەو دەجەنگم چونکە ئەو دژی من دەجەنگێت. پرۆژەی بەرەنگاریبوونەوەکە لەنێو مێشکی هەردووکماندا گەرای داناوە. بۆ کەســی ســێیەمیش یەکیان گرتوە و لە پــرۆژەی ئەوان-وەکو بابەت، کە لە تەماشــاکردنەکەیدا بەرجەستە بوو، سەرهەڵدەدات. من خۆم لەنێو تەماشــاکردنی کەسی سێیەمدا بە بەشێکی دانەبڕاوی 'ئەوان' دەبینم. 'ئەوان'یش خاوەن خۆبوون و کراون بە (ئێمە).

تێڕامانــی ئاگامەنــدی تەوانــای دۆزینەوەی (ئێمــە)ی نییــە. بوون-بۆ-خۆ لەمامەڵەکردنەکــەدا دەردەچێت و خۆی دژی بەرانبەر کەســانی دیکە ڕادەگرێت. پێویستە بزانین هەستکردن بە بەشێک لە ئێمەی بابەت نامۆبوونێکی ڕادیکاڵانەیە چونکە بوون-بۆ-خۆ لەم هەڵویستەدا خۆی نابینێت و بووە بە ئەوان. ئێمەی بابەت، لــەم ڕووەوە، ئەزمونێکی کتوپڕی بارودۆخی مرۆڤانەیە و فاکتۆرێکی دەرەکییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا. هەرچەندە ئێمەی بابەت ڕوودلوێکە هاوکاریکردن دەردەخات واتاکەی ئەو بارودۆخە تایبەتییە ڕەتدەکات، کە ئەزمونەکەی تێدا ڕوودەدات

و منیش هەوڵدەدەم، وەکو بابەت ببم بە بەشێک لە هەمووی مرۆڤایەتی[بەبێ کەسی سێیەم]. کەوابوو، ئەزمونەکە شەرمەزاری و بێ تەوانابیە: ئەو مرۆڤەی هەستدەکات لەگەڵ کەسانی دیکەدا بووە بە (ئێمە) لەنێو تۆڕی بوونێکی سەیر و نەبڕاوەدا گیردەخوات. بەبێ کۆمەک نامۆدەبێت. هەندێک ئەزمون لەوانی دیکە زۆرتر (ئێمە) دەردەخەن. بەتایبەتی لە کارکردنێکی کۆمەڵایەتیدا: کاتێک چەند کەسێک پێکەوە کاردەکەن کەسی سێیەم تەماشایان دەکات بەرهەمەکەیان دەبێت بە بەرهەمی کارکردنی (ئێمە). کارەکانی من دەبەسترێت بە کارەکانی کەسەکەی تەنیشتمەوە و ئەویش بەوەی کەسێکی دیکەوە. ئەمەش بیرۆکەی (ئێمە) پێکدەهێنێت. هەر تاکەمان خۆی وەکو (ئێمە) لە ئاستی بەرهەمە دروستکراوەکەدا دەبینێت. بەرهەمە دروستکراوەکەش مۆری خۆی دەخاتە سەر ئێمە، وەکو ئامێرێک دەرماندەخات، کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو دانراوین.

ئەگەر بوونی (ئێمە) لە هەندێک ئەزموندا باشتر بەرجەستە بێت، پێویستە ئەو خاڵەشمان لەبیر بێت، کە هەموو هەڵوێستێکی مرۆڤانە، مادام مامەڵە لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات، هەرکاتێک کەسی سێیەم ئامادەبێت، (ئێمە)ی تێدا دروست دەبێت. من لەپشت ئەو کەسەوە پیاسەدەکەم و پشتی دەبینم، مامەڵەکردنیشم لەگەڵیدا کەمە. بەڵام کاتێک کەسێکی دیکە تەماشای من و شەقامەکە و ئەو دەکات، من و ئەو دەبین بە (ئێمە)؛ ئێمە لەسەر شەقامی بلۆمێت لە بەیانییەکی مانگی مایسدا پیاسەدەکەین. تەماشاکردنەکەی من و ئەو کۆدەکاتەوە و بە (ئێمە) مان دەکات.

بەپێچەوانەشەوە، بەوجۆرەی تەماشا بەرجەستەبوونێکی کۆنکرێتی ئەزمونی منە بۆ کەسەکە، بەوجۆرەی بوونی خۆم بۆ کەسەکە دەبینم لەدەرەوەی تەماشاکردن دەبینم، ئەوا مەرجیش نییە تەماشاکردنێکی کۆنکرێتی لەناوەوەی ئێمەدا ببێت بە بناخە بۆ هەستکردن بە بوونمان، وەکو (ئێمە)یەکی پێکهاتوو. مادام هەموویەکی پێکەوە نەنوساوی ڕاستەقینەی مرۆڤانە هەیە، دەشێ هەندێک لە تاکەکانیش لە ئەزمونیاندا خۆیان بە (ئێمە) دابنێن. هەندێک لەم تاکانە بە خوێن و گۆشت ئامادەن و هەندێکیان ئامادەنین. کەوابوو، لە ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی کەسی سێیەمدا من خۆم بە خۆیەکی ڕووت دادەنێم و دەبم بە بەشێکی نەپچڕاو لە (ئێمە). ئەمەش شێوازێکی بوونی (ئێمە) دیاریدەکات، بەتایبەتی ئەو شێوازەی بە (ئاگایی چینایەتی) ناوزەدیدەکەین.

ئاشکرایە، ئاگایی چینایەتی شێوازێکی تایبەتی (ئێمە)یە و هەڵوێستێکی هاوبەشە. ئەوەندە گرنگ نییە چۆن ئەم هەڵوێستە پێناسدەکەین؛ ئەوەی بۆ ئێمە مەبەستە چۆنیەتی (ئێمە)یە، کە دەمانەوێت باسیبکەین. ئەگەر کۆمەڵ لە ڕووی ئابووری و ڕامیارییەوە بەسەر چینی چەوساوە و چەوسێنەردا دابەشبووبێت،

هەڵوێســـتی چینی چەوسێنەر وێنەی چینی چەوســـاوە بە جۆرێک نیشاندەدات، کە بەردەوام لەنێو[تەماشـــای] کەســـی ســـێیەمدا بێت و بە سەربەســـتییەکەی بەرزێتییەکەیـــان تێپەڕبـــکات. کارکردنی گران و خراپی شـــێوازی گوزەرانی یان بێبەریبوون نییە، کە چەوســـاوەکان لەنێو چینێکدا کۆدەکاتەوە. هاوکاریکردنە لە کاردا (کە لەدواییـــدا ڕوونیدەکەینەوە) و دەبێت بـــە کارکردنێکی هاوبەش، وەکو ئێمەی-خۆ و سەلماندنی بەرزێتییەکە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو. شێوازی گوزەران پەیوەندیدارە و بەگوێـــرەی بارودۆخەکانیش دەگۆڕێت. بێبەریبوونەکانیش، ئەگەر بەتەنیا تەماشـــایانبکەین، لە ئاکامی دابڕانی کەســـەکاندا دروستدەبن، کە توشی ئازارخواردنـــی کردن، نەک بۆتە هۆکاری یەکگرتنیان و بەگشـــتیش ســـەرچاوەی ناکۆکییە. دواجاریش، بەراوردکردنی شـــێوازی ژیانی ناخۆشـــی چەوســـاوەکان و خۆشگوزەرانی چەوســـێنەرەکان لەلایەن مرۆڤە چەوساوەکانەوە ئاگایی چینایەتی پێکناهێنێت؛ هەڵبەتە تاکەکان توشی حەســـودی یان بەڕادەیەک خەمباردەکات؛ بەڵام بەهەستکردن بە لێپرســـینەوە بە یەکدییەوە گرێیاننادات و یەکیان ناگرێت. بەهەڵەشدا دەچین ئەگەر بڵێین لەسەرەتاوە چینی چەوساوە تێدەگەن ئەم بارودۆخە چینی چەوســـێنەر سەپاندوویەتی. بەپێچەوانەوە، دامەزراندنی بیردۆزەیەک لەسەر چەوساندنەوە کاتێکی درێژخایەنی پێویستە. هەروەها بیردۆزەکەش تەنیا بەهایەکی زەقی دەبێت. ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە ئەندامی کۆمەڵە چەوساوەکە، وەکو تاکێک لەنێو کۆمەڵەکەی خۆیدا و لەگەڵ ئەندامەکانی دیکەدا لەنێو بەرەنگاریدایە (بۆنموونە لە خۆشەویســـتی و ڕق و دوژمنایەتیکردندایە.) بارودۆخی خۆی و ئەندامەکانیش وادەبینێت، کە تەماشـــادەکرین و ئاگامەندییەکیش بیریلێدەکاتەوە، کە لە دەست ئەم ڕادەکات. (خـــاوەن کۆیلە) و (دەرەبەگ)، (بورژوا) و (ســـەرمایەدار)، تەنیا وەکو کەســـانی بەدەستەڵات دەرناکەون، بەڵکو لەسەرو ئەمەوە، کەسی سێیەمن؛ لەدەرەوەی کۆمەڵە چەوساوەکەن و کۆمەڵە چەوساوەکەش بۆ ئەوان هەن. کەوابوو، کۆمەڵە چەوساوەکە بۆ ئەوان و سەربەستییەکەی ئەوان هەیە. ئەوان بەتەماشاکردن دەیهێننەکایەوە. ئەوان بارودۆخی ناسنامەی من و چەوساوەکان دروستدەکەن.

من بۆ ئەوان لەنێو هەڵوێستدا هەم و لەگەڵ کەسانی دیکەدا ڕیزکراوم. ئەگەرە مردووەکانی من و ئەوانەی کەســـانی دیکە هاوتەراز کراون. من بۆ ئەوان کرێکارم لەنێو تەماشاکردنەکەی ئەوانیشدا خۆم بە یەکێک لە ئەندامانی سەربەکەسانی دیکە دەبینم. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لە تەماشاکردنەکەی ئەواندا ئەو (ئێمە) یە دەدۆزمەوە لەدەرەوەی بوونی مندا دەبێت بە (چین)و منیش بە بەشێک لە ئەو. لەم تێڕوانینەوە، کەسی ســـێیەم و ژیانی ناخۆشی ئێمە دەبێت بە خاوەنی بەها؛ ســـەربەخۆیی کەسی سێیەم لە پەیوەندییەکەی بە ئێمەوە دەردەخات. نامۆبوونی ئێمە بە زەقی دەخاتە بەردەممان. لەنێو ئەم ئازار و چەوسانەوەیەدا خۆم بەو بوونە

دەبینم-کە تەماشاکراوە-وەکو شتێکیش مامەڵە لەگەڵ شتەکانی دیکە دەکات. لەبەر ڕۆشـــنایی ئازارخواردنەکەمدا من لەنێو کەسەکاندا و بەرەنگاریم بەرانبەر جیهان و فاکتۆری بارودۆخی ژیانم کەســـی ســـێیەم هەست بە بوونم دەکات. گرنگ نییە چ جۆرە بەرەنگارییەک بەرانبەر جیهان بخەمەگەر، ئەگەر کەسی سێیەم ئامادە نەبێت خۆم ســـەرکەوتوو دەبینم. بەڵام لەگەڵ ئامادەبوونی کەســـی سێیەمدا هەست بە بوونی (خۆمان) وەکو شت دەکەم.

کەوابوو، چینی چەوســـاوە یەکێتییەکەی خۆی لەو زانینەوە وەردەگرێت، کە چینی چەوسێنەر لەبارەیەوە هەیەتی. دەرکەوتنیش لەنێو چەوساوەکاندا و ئاگایی چینایەتی شەرمکردنە بەرانبەر ئێمەی بە بابەتکراو. ئێمە لە بەشی داهاتوودا باسی ئاگایـــی چینایەتی دەکەین و ڕوونیدەکەینەوە چ واتایەکی بۆ تاکێکی چەوســـاوە هەیە.

ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لێرەدا باسمانکردوە ئەزموونی بە بابەتبوونی ئێمەیە، کە بوون-بۆ-کەسانی دیکە دەبێت بە پێشمەرجێکی ئاڵۆز بۆی. هەروەها، دەستەڵاتی لەناوبردنیش هەڵدەگرێت چونکە لەڕێگەی شەرمکردنەوە دەناسرێت. بناخەی (ئێمە) ش ئەو کاتەی تاکێک بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە و سەقامگیری دەکات تەماشای کەسی ســـێیەم دەکات هەرەس دەهێنێت. ئەمەش یەکێکە لەو ڕێگایانەی کۆتایی بە (ئێمە) دەهێنا. بەڵام لە حاڵەتی ئاگایی چینایەتیدا بناخەی (ئێمە) بە گەڕانەوەی تاکە کەســـێک بۆ خودی خۆی ناڕوخێت. دەکەوێتە ســـەر پـــڕۆژەی ڕزگاریکردنی هەمووی (ئێمە) و گۆڕان لە ئێمەی بابەتەوە بۆ ئێمەی خۆ.

لەبنەڕەتەوە ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ پڕۆژە جۆراوجۆرەکان و گۆڕان لەو کەسەدا کردوە، کە تەماشادەکات و تەماشا دەکرێت؛ ئەمانە دوو ڕێگەن بۆ دیاریکردنی بوون-بۆ-کەسانی دیکە. چینی چەوساوە دەتوانین لە پەیوەندییان بە چینی چەوسێنەرەوە خۆیـــان بە (ئێمەی خۆ) دابنێن. ئەمەش ئەو کاتـــە ڕوودەدات، کە ئەوان بکەن بە بابەت. لێرەدا، ئەزمونی ئێمەی بابەت ئاماژە بۆ ئێمەی خۆ دەکات. بەهەمانشیوەش، لە سایکۆلۆجی دەستەوتاقمێکی ئاژاوەچیدا ئارەزووی شێتانە دەبینرێت، کە فۆرمێکی تایبەتی خۆشەویســـتییە. ئەو کەســـەی دەڵێت (ئێمە) لەنێو کۆمەڵەکەدا پڕۆژەی خۆشەویســـتی دەردەبڕێت، بەڵام داوا لە کەسی سێیەم دەکات کۆمەڵەکە بپارێزێ ئەمیش ئامادەیە قوربانی بە سەربەســـتییەکەی بدات خۆشەویستیەکەی دەبیت بە ماسۆچیزم. لەو هەڵوێستەدا ئاشکرا دەردەکەوێت، کە کۆمەڵەکە خۆی بە خزمەتکار دادەنێت و دەیەوێت، وەکو بابەت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. بەڵام کێشە لەگەڵ پڕۆژە جیاوازەکانی تاکەکانی نێو کۆمەڵەکەدا سەرهەڵدەدات. کۆمەڵەکە لە تەماشاکردنی ســـەرۆکەکەدا یـــان گوتەبێژەکە بووە بە کۆمەڵ؛ یەکێتییەکـــی دەرەکی هەیە، کە هەریەکێک لە تاکەکان لەنێو تەماشـــاکردنی کەسی سێیەمدا دەیدۆزنەوە. کەوابوو،

هەرتاکە دەیەوێت بوونی خۆی بسڕێتەوە و بە دەستی سەرۆکەکەوە ببێت بە ئامێر. ئەم ئامێرەش بوونی ئەو بۆ کەسـانی دیکە نییە؛ هەمووی کۆمەڵە بەبابەت کراوە دەرەکییەکەیە. قەوارەی گەورەی کۆمەڵەکە و ڕاسـتەقینە دەرەکییەکەی دەبن بە جێگەی سەرسوڕمان بۆ تاکەکان. هەریەکێک لە ئەوان دەیەوێت لەنێو کۆمەڵەکەدا و بە ڕێگەی تەماشاکردنی سەرۆکەکە بتوێتەوە.

لەم نموونانەدا دەردەکەوێت ئێمەی بابەت لەنێو ڕووداوێکی کۆنکرێتییدا هەمیشە خـۆی لەنێو لایەنێکدا دەتوێنێتەوە و لایەنەکەی دیکـەی هەمووگیری مرۆڤایەتی لەبیـردەکات. ئێمە لەبەردەم ئەواندا و تەماشـاکردنەکەیان دەمانکات بە (ئێمە). ئەمـەش ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکات، کە پرۆژەی ڕووتکراوە و نەناسـراوی بوون-بۆ-خۆ بەرانبەر هەمووگیری خۆ و کەسـانی دیکە دەتوانێت دابنرێت. ئەم کارەش بەبێ بوونی کەسـی سـێیەم ئەنجام نادرێت، کە لەنێو چاوی ئـەودا مرۆڤایەتی دەکرێت بە بابەت. کەسـی سێیەمی نەناسراو بابەتی چەمکی سنورداری کەسانی دیکەیە. ئەو بۆ هەموو دەستەو تاقمەکان دەبێت بە کەسی سێیەم. ئەم چەمکەش لە چەمکی ئەو بوونە تەماشـاکەرە دەچێت، کە کەس تەماشـای ناکات. ئەمەش بیرۆکەی بوونی خوایە. ئەگەر خوا نەبێت ئەوا هەوڵدان بۆ ناسینەوەی مرۆڤایەتی بەردەوام و هەمیشـە لە نـوێ بوونەوە و ڕووخاندندایـە. (ئێمە) مرۆڤانە-ئێمەی بابەت-بـۆ هەریەکێک لە ئاگامەندی تاکەکان وێنەیەکی مەحاڵە. هەرچەندە هەموو خۆیـان لەناویدا دەبینـن. (ئێمە)ی مرۆڤانـە، وەکو چەمکێکی لـە واتا بەدەر دەمێنینەوە. هەرکاتێک بەکاری بهێنین (ئاماژە بۆ ئازار و ئەشکەنجەی مرۆڤایەتی، تاوانی مرۆڤایەتی یان گۆڕانکاریەکانی مێژوو بکەین) باسـی ئەزمونێکی سنورداری کۆنکرێتی لەبەردەم ئامادەبوونی کەسـی سـێیەمی ڕەهـادا دەکەین، کە خوایە. چەمکی سنورداری مرۆڤایەتی (وەکو هەموو ئێمە) و چەمکی سنورداری خوا ئاماژە بۆ یەکدی دەکەن و پەیوەندبەستن.

## با. ئێمەی خۆ

جیهـان ئێمە بە خۆی نێو کۆمەڵ نیشـاندەدات، بەتایبەتـی بوونمان لە نێو جیهانی بابەتە بەرهەمهێنراوەکاندا. ئەم بابەتانە مرۆڤەکان کاریان لەسـەر کردون و بۆ کەسانی دیکە بەبێ دیاریکردنیان یان بۆ (ئەوان) بەرهەم هێنراون. کرێکار بۆ کەسانێکی بەرزی نەناسراو کاردەکات. سەربەستییەکەی خۆی بەسەر بابەتەکەوە لەکارکردنەکـەدا دەخاتەگەر. کرێکارەکە، گرنگ نییە چ تاکێک بێت، بوونی خۆی لەکارکردندا، وەکو ئامێر بۆ کەسانی دیکە دەبینێت. کارکردن، ئەگەر بۆ مەبەست

و ئامانجی خودی کرێکارەکە نەبێت، شێوازێکی نامۆبوونە.

بەرزێتییە نامۆکراوەکە بۆ کرپیارە، کە (ئەوان)ە. هەرکاتێک من بەرهەمێک بەکاربهێنم، بەرزێتی خۆمی تیادا دەدۆزمەوە. جوڵانێک دەردەخات، کە دەبێت من بیخەمەگەر یان پاڵی پێوەنێم. ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ گریمانەدا دەکەین. گریمانەکەش کۆتاییەک بۆ من دیاریدەکات، کە لەنێو جیهاندایە: ئەگەر بمەوێت دابنیشم، سندوقەکە بکەمەوە و هتد. ئەم کۆتاییەش لە پێکهاتەی بەرهەمەکەدایە و بەرزێتییەک دیاریکردوە، بەڵام ئێستا، وەکو لایەنێکی هێزەکی سەر بە بوونی بابەتەکەیە. کەوابوو، دروستە بڵێین، کە بەرهەم بوونی من، وەکو (ئەوان) دەردەخات. بوونم بە شتێکی بەرز دەبینم، لە ئیستگەی (تراکادیرۆ) وە بۆ (سیڤرس-بابیلۆن) دەڕۆم. ئەوان لە (لامۆتە-پیکویت) دادەبەزن. دابەزینەکیان لەسەر نەخشەی ڕێگەوبانەکان پێشبینیکراوە. ئەگەر ڕێگاکەم لە (لامۆتە-پیکویت) بگۆڕم لەگەڵ (ئەوان) دەبێ دابەزم. هەموو کاتێک شەمەندەفەرەکە بەکاردەهێنم خۆم بە جیا دەبینم. کۆتاییەکانیش لەگەڵ تەواوبوونی کردەوەکانمدان. کۆتاییە کتوپڕەکانیشم لەگەڵ کۆتایی (ئەوان) دایە و خۆم بە یەکێک لە دراوسێکانم دادەنێم. لەمحاڵەتەدا، ڕاستەقینەی تاکەکەسی خۆمان وندەکەین چونکە پڕۆژەکانی من دەبن بە پڕۆژەکانی ئەوان. لەنێو ئیستگەی شەمەندەفەرەکەدا یەک پڕۆژە سەرهەڵدەدات، کە لەپێشتر بوونی دیاریکراوە. هەرچەندە بوونی خۆم دەبینم، بەڵام لەوانی دیکەی جیاناکەمەوە. ئەگەر ئەم بەرزێتییە نەناسراوانە پڕۆژەکان بخاتەگەر، هەرجۆرێک بن، ئاماژە بۆ بەرزێتییەکانی دیکە بکات، ئەوا پڕۆژەکانی خۆم لەنێو هەزار پڕۆژەی وەکو یەکدا دەدۆزمەوە. من هەست بە بوونی بەرزێتییە ناجۆرەکان دەکەم و هەموویان ڕوو لە ئاکامێکیش دەکەن، کە منیش ڕووی تێدەکەم. من خۆم دەخەمە نێو شەپۆلێکی گەورەی مرۆڤانە، کە لەگەڵ دروستبوونی ئیستگەکەوە بە نێو ڕاڕەوەکەدا هاتوچۆدەکات. بەڵام پێویستە ئەم خاڵانەش ڕەچاو بکەین:

یەکەم، ئەم ئەزمونە سایکۆلۆجییانەیە و ئۆنتۆلۆجییانە نییە. یەکگرتنێکی ڕاستەقینەی بوونە-بۆ-خۆکان دروست ناکات. لە ئاکامی دوو جۆر تێگەیشتنی بابەتی لە بابەتە بەرزەکە، بەگشتی و لەو لەشانەوەی لە چواردەوری منن پەیدا دەبێت. بەتایبەتی لەو ئەزمونەدایە، کە من لەنێو کەسانی دیکەدا دادەنێت و لە مامەڵەکردنەکەم لەگەڵ ئەواندا بوونی خۆم، وەکو ئێمەی-خۆ دەبینم. ئەمەش لە جوڵەی خۆپیشاندانی سەربازی یان پێکەوە کارکردنی کارمەندەکان دەچێت. دەبێت ئەوەش بزانین، کە هاوسەنگییەکە سەربەستانە لە منەوە دەردەچێت؛ پڕۆژەیەکی بوونی بەرزی منە؛ داهاتوو بە ئێستاوە دەبەستێتەوە و ڕابردووش لەنێو چەندبارەبوونەوەی ڕووداوەکان دادەنێت. من ئەم کەسەم ڕیکخستنەکە دروستدەکات. لەهەمانکاتدا لەنێو ڕێکخستنە گشتییەکەی کارکردنەکە یان

خۆنیشاندانەکەی کۆمەڵەکەی چواردەورم دەتوێتەوە. واتاکەشی لە پەیوەندییەکەی بە ڕیکخســـتنە گشـــتییەکەوە ئاشـــکرا دەبێت. هێشـــتا پێچانەوەی ڕێکخستنە تایبەتییەکەی من لەنێو ڕێکخســـتنە گشتییەکەی ئەواندا لابەلایی دەمێنێتەوە. من ڕیکخســـتنی کۆمەڵەکە، وەکو ئامێر بەکارناهێنم؛ بیریشـــی لێناکەمەوە، بۆنموونە بیر لە سەماکەرەکانی سەرشانۆکە ناکەمەوە. بۆ گەیشتنیش بە ئەگەرەکانی خۆم تێپەڕی ناکەم. بەڵکو لەنێو بەرزێتی خۆمەوە دەخلیســـکێمە نێو ئەو بەرزێتییەوە و دەمەوێت کارێکم بە ئەنجام بگەیەنم یان بە شوێنێک بگەم، کە لە کارو شوێنی ئەوانەوە جیا نییە. کەوابوو، ئەو ڕیکخســـتنەی لە منەوە دەردەچێت لابەلا لەگەڵ ڕێکخسســـتنی کۆمەڵەکەمدا دەمێنێتەوە و لـــەم پەیوەندییەیدا لەدایکدەبێت. بەو ڕادەیەش ڕێکخســـتنی منە، کە دەبێت بە ڕێکخستنی ئەوان و ڕیکخستنی ئەوانیش بەوەی من. ئەمە یان ڕێکخســـتنی ئێمە دەبێت بە هاندەر بۆ هەستکردن بە بوونی ئێمەی خۆ. ئەمە لەوێدا ڕوودەدات، کە من خۆم لەنێو بوونە هاوبەشییەکەدا دانێم و ئامانجـــە تایبەتییەکانی خۆم وازلێبێنم و بیـــر لە کۆمەڵەکە بکەمەوە. کەوابوو، ئێمـــەی خۆ لە ئەزموونی تاکەکەســـدا ســـایکۆلۆجییانە و ڕووداوێکی ناوەکییە لە ئاگامەندی کەســـەکەدا. ئاماژە بۆ گۆرانکاری لە بونیادی ناوەکی ئاگامەندییەکەدا دەکات و لە پەیوەندییەکی کۆنکرێتی و ئۆنتۆلۆجی نێوان بوون-بۆ-خۆ و کەســـانی دیکەدا دەرناکەوێت. بوونی منیش لەگەڵ کەســـانی دیکەدا بەرجەستەناکات. تەنیا پەیوەندی بە هەستی منەوە لەنێو کەسانی دیکەدا هەیە. هەڵبەتە ئەم ئەزمونە بە هێمایـــەک بۆ یەکێتییەکی مێتافیزیکی و ڕەهای هەموو لایەنە بەرزەکان دادەنرێت. وادەردەکەوێـــت بەســـەر ناکۆکییەکاندا بە ڕێگەی هاو ئاڕاســـتە کردنیان زاڵبێت. لەمحاڵەتەدا نموونە بەرزەکەی ئێمەی خۆ دەبێت بەو مرۆڤایەتییەی ئاماژە بۆ ئێمە دەکات و دەبێت بەخاوەنی زەمین. بەڵام (ئێمە)یە لەنێو بەستێنی دەروونیی تاکە کەسدا دەمێنیتەوە و بەردەوامیش بە خولیای گەیشتن بە یەکگرتنی هەموو لایەنە بەرزەکان دەژی. لەڕاستیدا، ئەم تاکە خۆیە ناتوانێت لایەنی خۆیەتی ئەوانی دیکە بناسێت. ئەوان لەدەرەوەی ئەودا دەمێننەوە و ناتوانێت بیانگاتێ. بەڵام لەشی من بەرزێتییەکەی من دەخاتە بەردەست و بەبێ ئەوەی من لە خودی خۆمەوە دەرچم یان ئەوان لە خودی خۆیانەوە دەرچن، لەنێو ئەواندا دامدەنێت. لەنێو جیهاندا خۆم بە بەشێک لە (ئێمە) دادەنێم.

لەبەر ئەم هۆیە ئەزموونی من بۆ ئێمەی خۆ لە ئەزموونی کەسانی دیکە ناکات. ئەمەش زەمینیەکی پتەوەی بۆ دانامەزرێنێت چونکە دەکەوێتە ســـەر ڕێکخستێکی تایبەتی لەنێو جیهاندا. بە نەمانی ڕیکخســـتنەکە ئەویش لەناودەچێت. لەڕاستیدا، دەستەیەک پێکهاتە لەنێو جیهاندا بۆ ئامادەکردنی بوونم وەکو لەش هەیە: لەپێش هەموویانەوە، هەموو ئامێرە پێکهاتووەکان، ئامێرەکانی خانو دروســـتکردن، ئاو،

گاز، بۆڕپییەکان هەروەها باسی ئامێرەکانی هاتوچۆکردن و دوکان و بازاڕ ناکەین، کە لە دەوری منن. جامخانەی دوکانەکان و شوشەکان ئاماژە بۆ بوونی، وەکو بەرزێتییەکی ناجۆر دەکەن. لەسەرو ئەمانەوە پەیوەندی کارکردن و تەکنیکیم لەگەڵ کەسانی دیکەدا، بوونم، وەکو کەسێک بە خۆم دەناسێنن. بۆ سفرەچی چێشتخانەکە من کڕیارم و بۆ بلیت فرۆشەکە من گەشتکەرم. دواجاریش، دانیشتم لەسەر شۆستەی چایخانەکە من دەکات بە تەماشاکەرێک (تەماشاکردنێکی ڕووت، کە ڕوداوی سەرشەقامەکە، وەکو شتێکی دەرەکی بەرجەستەدەکات). تەماشاکەرە نەناسراوەکانیش ئاماژە بۆ ڕووداوی شانۆگەری سەرشەقامەکە، کە من ئامادەی بووم یان پێشانگا هونەرییەکەی بەردەمم دەکەن. بێگومان، کاتێک پێڵاوەکە لەپێدەکەم، سەری شوشەکە دەکەمەوە، سواری دەزگای هەڵگری نێو تەلارەکە دەبم یان لە تەماشاکردنی شانۆگەرییەکەدا پێدەکەنم خۆم دەکەم بە کەسێک. ناسینەوەی بەرزێتییەکەم، وەکو کەسێکی ناجۆر ناوەکییە، ڕووداوێکی هەڵکەوتوە و تەنیا پەیوەندی بە منەوە هەیە. هەندێک بارودۆخی دەرەکی من بە کەسانی دیکەوە گرێدەدات و دەمکات بە بەشێک لە (ئێمە). بەڵام لە هەموو بارودۆخێکدا من مامەڵە لەگەڵ لایەنی ناوەوە  و دەروونی خۆمدا دەکەم.

دووەم، هەستکردن بە بوونی ئێمەی خۆ سەرەکی نییە؛ هەڵوێستی بنەڕەتی بەرانبەر کەسانی دیکە پیکناهێنێت چونکە، بەپێچەوانەوە، بۆ بوونی پێویستی بە دوو جۆر ناسینەوەی لەپێشتری بوونی کەسانی دیکەیە. لەحاڵەتی یەکەمدا، بەرهەمەکان ئاماژە بۆ بەرهەمهێنەر و یاسای بەکارهێنانیان دەکەن، کە بەرهەمهێنەر داینــاوە. لەحاڵەتێکدا لەبەردەم بابەتێکی بەرهەمنەهێنراو ئامادەدەبم، فۆرمەکەی پێدەبەخشم و شێوازی بەکارهێنانی دیاریدەکەم (ئەگەر بەردێک، بۆنموونە، وەکو چەکوش بەکاربهێنم)؛ ئەوا ئاگاییەکی بەبێ تێڕامانم بۆ بوونی خۆم، وەکو کەس هەیە. ئەمەش ئاگاییە لە خودی خۆم و داهێنان و ئەو کۆتاییانەی دەمەوێت بیانگەمێ. یاساکانی بەکارهێنان و میتۆدی بەرهەمهێنانی بابەتە بەرهەمهێنراوەکان دۆگما و (تابوون) و بونیادە بنەڕەتییەکەیان من دەخاتە بەردەم کەسانی دیکە. کەسانی دیکەش مــن، وەکو بەرزێتییەکی ناجۆر دەبینن. بڕوانە هێمای سەرشەقامەکان یان ژوورەکانی چاوەڕوانی لە سەریان نوسراوە (چوونەدەرەوە) یان (چوونەژوورەوە)؛ یان ئەو پەنجەیەی ئاماژە بۆ خانویەک دەکات. لێرەدا ئێمە مامەڵە لەگەڵ گریمانەیەکی پێویست و فەرمانی دەکەین. ئەم فەرمانانە کەسانی دیکە دەردەخەن، کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ مندا دەدوێت. ئەو هێمایانەی بۆ دانراون؛ نوێنەرایەتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نێوان من و ئەوان دەکەن و بۆ من دانراون. ئەگەر من ئامانجی کەسانی دیکە بم، ئەوا من دەبم بە بەرزێتییەکی ناجۆر. کەتێک لەژێر هێمای (چوونەدەرەوە)، کە لەنێو بازاڕەکە دەردەچم، ئەوا لە سەربەستییەکی

ڕەهای پرۆژەی بوونمەوە بەکارم نەهێناوە. من دامنەهێناوە و بوونێکی ئەستوییم نەکردووە بە بەرهەمێکی ڕووکەر لە ئەگەرەکانم. بابەت دەبێت بە مرۆڤانە و ئاماژە بۆ خاوەنێتی مرۆڤ دەکات. هێمای (چوونەدەرەوە) کردنەوەی ڕێگایە بۆ سەر شەقامەکە و لەگەڵ (چوونەژوورەوە) یەکسان دادەنرێت. هەروەها، لەگەڵ بەکارهێنانییدا خۆم ناخەمە ژێر دەستی بابەتەکە، بەڵکو خۆم لەگەڵ فەرمانێکی مرۆڤانەدا دەگونجێنم. چوونەدەرەوەکەم بوونی کەسانی دیکە دەسەلمێنێت و دایەلۆگ لەگەڵیاندا دروستدەکەم.

هایدیگەر ئەم خاڵانەی چاک ڕوونکردۆتەوە. بەڵام ئەو ئاکامەی باسنەکردووە، کە بوونی کەسانی دیکە بۆ سەرهەڵدانی بابەتێک، وەکو بەرهەمێکی دروستکراو پێویستە. ئەگەر تاکێک کەسانی دیکەی نەبینیبێت جیاوازی نێوان بەرهەم و بابەتێکی سروشتی نازانێت. چوونە دەرەوەش لە بازاڕەکە لەژێر هێماکەوە بەبێ ئەوەی هێماکە ببینین یان زمانەکە بزانین لەو بیریارە ڕواقییە شێتە دەچێت، کە بە نیوەڕۆ دەڵێت، (ئێستا ڕۆژە). ئەگەر بەرهەم ئاماژە بۆ کەسانی دیکە و بەرزێتی ناجۆری من بکات لەبەر ئەوەیە، کە من دەزانم کەسانی دیکە هەن. کەوابوو، هەستکردن بە ئێمەی خۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەزمونی بنەڕەتیمان بۆ بوونی کەسانی دیکە و دوای ئەم ئەزمونە دەکەوێت.

لەسەرو ئەمەوە، زانیمان، هەستکردن بە بوونی خۆم، وەکو بەرزێتییەکی ناجۆر یان نموونەی مرۆڤایەتی، هەستکردن نییە بە بەشێکی ئێمەی خۆ.

کەوابوو، پێویستە کەسانی دیکە لە چواردەورمان بن. هەروەها بینیمان، لەم ئەزمونەدا کەسانی دیکە، وەکو خۆ یان بابەت ناناسرێن. تەنانەت خۆیان لەبەردەم ئێمەشدا ئامادەنەکردوە. بێگومان،[ئەزمونەکەم] لەسەر فاکتۆری ئەوان لەنێو جیهان و هەستکردنی منیش بە کردەوەکانیان ڕادەوەستێت.

بەڵام فاکتۆر و کردەوەکانیان بە دانراوی نابینم. ئاگایی من لە لەشی ئەوان بەرانبەر لەشی خۆم لابەلاییە. تەنانەت نازانم، کە کردەوەکانی من کردەوەکانی ئەوان دەهێنێتەکایەوە یان بە پێچەوانەوەیە. وردبوونەوە لە کێشەکە دەریدەخات ئەزمونم بۆ ناسینی (ئێمە) کەسانی دیکە بەو جۆرەی دەبن بە بەشێک لە (ئێمە) لە بنەڕەتەوە سەرکەوتوو نییە، بەڵکو پێویستە شێوازێکی ئاگاییمان بۆ بوونی کەسانی دیکە لەپێشدا لەلا هەبێت تاکو ئەزمونەکە دروست بێت. بوونـ لەگەڵ بەبێ ناسینەوەی چۆنیەتی کەسانی دیکە و ئەو ئاگاییەی دەڵێت، "من لەگەڵ..." مەحاڵە. ئەمە ڕاستە، بەڵام لەگەڵ کێم؟ ئەگەر ئەزمونەکە ئۆنتۆلۆجییانەش لەپێشتر بێت ناکرێت بزانین چۆن کەسێک ڕادیکاڵانە گۆڕانی بەسەردا دەهێنێت. لە ناسینی هەموو کۆمەڵەکەوە بەرەوناسینی تاکە کەسێک دەڕوات. ئەگەر کەسانی دیکە لە شوێنی دیکەدا ئامادە نەبن ئەزمونەکە لە تێکشکاندنەکەیدا دەبێتە ناسینی

بابەتە بەئامێرکراوە ڕووتەکانی نێو جیهان و بەرزێتییەکەشم گەمارۆیان دەدات.

ئەم ڕوونکردنەوانە وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت (ئێمە) مسۆگەر ناکەن. تەنیا ئەو خاڵە نیشـــاندەدەن، کە ئەزمونی ئێمەی خۆ بەهایەکی مێتافیزیکی نییە؛ پشـــت بە فۆرمە جۆراوجۆرەکانی بوونـ‌بۆ‌کەسانی دیکە دەبەستێت و ئەزمونگەرانەیە. ئەمەش خەســـڵەتی گۆڕان بە ئەزمونەکە دەبەخشێت؛ سەرهەڵدەدات، لەناودەچێت و ئێمەش لەبەردەم کەسانی دیکەی بە بابەتکراو یان ئەواندا لەنێو ناکۆکییدا بەبێ چارە ڕادەگرێت. بێهودەش چاوەڕوانـــی ئاگاییەک دەکەین تاکو یەکێتییەکی ناوەکی پێبدات. ئەمەش ناسینەوەی ناکۆکییە لەنێوان لایەنە بەرزەکان لە شێوازی بوونـ‌بۆ‌کەسانی دیکەدا.

ئـــەم فاکتۆرە ئامـــاژە بۆ پارادۆکســـێکی زەق دەکات: مـــادام یەکێتی چینی چەوســـاوە بەســـتراوە بە ئەزمونی ئێمەی بابەتەوە لەبەردەم ئەواندا، کە کەســـی ســـێیەم یان چینی چەوساوەیە، کەسێک خۆی بەو باوەڕە دەگەیەنێت، کە چێنی چەوســـێنەر لە ڕووبەڕووبوونەوەکەیدا خۆی بە ئێمەی خـــۆ دادەنێت. هەرچەندە چینی چەوســـێنەر ئامێری زەبرکردن و تەندوتیژییەکەی بە دەســـتەوەیە، هێشتا، لەناوەوە ئەنارکیستانەیە. بورژوا تەنیا مرۆڤێکی خاوەن دەستەڵات و ئیمتیاز نییە. لەناوەوەش ئاگامەندییەکە، کە خۆی بە ئەندامی چین دانانێت. ئەو نایەوێت بەوجۆرە خۆی ببینێت، کە مامەڵە لەگەڵ ئێمەی بابەتدا دەکات و یەکێکە لە ئەندامانی نێو چینەکەی. ئەزمونی ئێمەی خۆ دەریدەخات ئاگاییەکە لە چەند ئەزمونێکی جیاواز و گـــۆڕاو بەبێ ئەوەی بناخەیەکی مێافیزیکـــی هەبێت پێکهاتوە. مرۆڤی بورژوازی نکۆڵی لە بوونی چین دەکات. بوونی پرۆلیتاریا بە دەستکردی ئاژاوەگێڕان دادەنێت، کە باس لە نادادوەری دەکەن و بەڕادەیەک دەکرێ چاک بکرێت. لەمەڕ پەیوەندی نێوان سەرمایە و کار دەدوێت. لەجێگەی هاریکاری چینایەتی داوای هاریکارییەکی گەورەتر دەکات، کە تیایدا کرێکار و خاوەن کارخانە یەک دەگرن و دەبن بە بوونـ لەگەڵ و ناکۆکییەکانی نێوانیان خەفەدەکەن. لێرەدا، پرســـیارەکە سەبارەت بەو خاڵەیە مرۆڤە چەوسێنەرەکە چەوساوەکان دەبینێت و دەبن بە ئەوانی خۆ بۆ ئەم بەبێ ئەوەی خۆی لەنێو چینەکەی خۆیدا ببینێت. ئەم دوو ئەزمونە سەر بە یەکدی نین. یەکێکیان بەبێ ئەوی دیکەیان لەوانەیە کەسەکە لەبەردەم هەموو چەوساوەکان ڕاگرێت و وەکو ئەوانی خۆ هەســـت بە هەموویان بکات. هەمانکات، بە ئامێردایان بنێت. خۆی بەرانبەریان بکات بە ڕەتدانەوەیەکی ناوەکی دژی هەموویان؛ بۆنموونە دەبێت بە کەسی سێیەمی بێ لایەن. لەوکاتەدا چینی چەوساوە شۆڕش دەکات یان دەســـەڵات دەگرێتەدەست. چەوسێنەرەکان هەست بەبوونی خۆیان، وەکو بوونێک دەکەن، کە تەماشـــایاندەکرێت و دەڵێن (ئێمە). ئـــەم (ئێمەی بە بابەتکراوە) لە ئاکامی ترس و شەرمکردنەوە پەیدا دەبێت.

بەمجۆرە هاولایی لەنێوان سەلماندنی ئێمەی بابەت و ئەزمونی ئێمەی خۆدا نییە.

یەکەمیان ناسینی ڕەهەندێکی ڕاســـتەقینەی بوونە و ئاماژە بۆ سەلماندنی بوونـ بۆـکەسانی دیکە دەکات. دووەمیان ئەزمونێکی دەروونییە و مرۆڤێکی نێو مێژووی ســـەرقاڵی کارکردن لەنێو کۆمەڵدا و سیســـتەمی ئابوورییەکی دیاریکراو هەستی پێدەکات. هیچ شتێکی تایبەتی بەرجەستەناکات: ژیانێکی ڕووتی ناوەکییە.

ئەزمونی ناســـینەوەی (ئێمە) و (خۆمان) هەرچەندە ڕاســـتەقینەیە، ناتوانێت ئاکامەکانـــی توێژینەوەکەی پێشـــومان بگۆڕێت. ئێمەی بابەتیش ڕاســـتەوخۆ بە کەسی سێیەمەوە گرێدراوین، بۆنموونە، لەسەر بوونی منـ بۆـکەسانی دیکە و بوونمـ لەدەرەوەدا بۆ کەسانی دیکە ڕادەوەستێت. هەروەها، ئێمەی خۆ لەنێو ئەزمونێکی دەروونییدا پەیدا دەبین، کە بوونی کەسێکی دیکە بۆ ئێمە دەردەخات. دەرچوونی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی لەم دووڕیانە بێسودە: دەبێت کەسانی دیکە تێپەڕبکەین یان کەســـانی دیکە ئێمە تێپەڕبکەن. ناوەڕۆکـــی پەیوەندی نێوان ئاگامەندییەکان بوونـ لەگەڵ نییە؛ بەڵکو ناکۆکییە. پاش ئەم ڕوونکردنەوە درێژەی پەیوەندییەکانی نێوان بوونـ بۆـ خۆ و کەســـانی دیکە بەم دڵنیاییە گەیشتوین: بوونـ بۆـ خۆ تەنیا ئـــەو بوونە نییە، کـــە بوونـ لەنێوـ خـــۆ لەناودەبات و ڕەتدانـــەوەی ناوەکی ئەم بوونەیە. ڕەتدانەوەکە و لەناوبردنەکە ئەو کاتە دەناســـرێتەوە، کە کەســـانی دیکە ســـەرهەڵدەدەن. کاتێک بوونـ بۆـ خۆ بە تەنیا جیهان تێپەڕدەکات؛ شـــتەکان لە هیچەوە پەیدادەبن. سەرهەڵدانی کەسانی دیکە بوونیـ لەنێوـ خۆـ لەنێوـ جیهاندا بۆ بوونـ بۆـ خۆ دەچەسپێنن. ئەم بە بەردکردنەی بوونـ لەنێوـ خۆ بە هۆی تەماشاکردنی کەســـانی دیکەوە واتایەکی تەوا بە ئەفسانەی مێدوسا دەبەخشێت. (٦٦) کەوابوو، لە توێژینەوەکەماندا پێشـــکەوتنمان وەدەســـت هێناوە: ئێمە ویستمان پەیوەندی بنەڕەتی نێوان بوونـ بۆـ خۆ و بوونـ لەنێوـ خۆ دیاریبکەین. تێگەیشتین بوونـ بۆـ خۆ هێزی لەناوبردن و ڕەتدانەوەی بوونـ لەنێوـ خۆیە؛ لێرەدا ئەوەش دەسەلمێنین، کە لەگەڵ ناسینی کەسانی دیکەدا و بەبێ ناکۆکی بوونیش لە ناوەڕاستیـ بوونـ لەنێوـ خۆدا هەیە. ئەم لایەنەی بوونـ بۆـ خۆ دەرەوەی ئەم بوونە دەردەخات. بوونـ بۆـ خۆ ئەو بوونەیە بە سروشت ناتوانێت خۆی لەگەڵ بوونـ لەنێوـ خۆیدا ڕێکبخات.

ئـــەم بۆچوونانە دەبن بە بناخەی بیردۆزەیەکی گشـــتی بۆ بوون، کە ئامانجی ئێمەیە. بەڵام گەیشتن بەم ئامانجە زووە. نەمانتوانیوە بە تەواوی باسی ئەوە بکەین چۆن بوونـ بۆـ خۆ پرۆژەی ئەگەرەکانی لەودیو بوونـ لەنێوـ خۆوە دەخاتەگەر. ئەم پرۆژەیە بەردەوام گۆڕانکاری لە جیهاندا دێنێتە پێش. ئەگەر هایدیگەر بخوێنینەوە،

٦٦ مێدوسا لە ئەفسانەی یۆناندا یەکێکە لە سێ خوشکەکەی، کە ئەسینای خواوەند سزای دا و لەجێگەی پرچی ماری لەنێو سەریدا ڕواند. گوایە هەرکەسێک مێدوسا ببینێت یان تەماشای بکات دەبێت بە بەرد. (وەرگێڕ)

بۆنموونە، تێدەگەین چۆن ڕاڤەکردنە هێرمینۆتیکییەکەی نادروستە.

بە زمانی ئەو دەڵێین دازاین ئەو بوونەیە هەبووەکان بەرەو بوونیان تێپەڕدەکات. لێرەدا، بوون شێوازی بوونی هەبووەکانە. دروستە بوون-بۆ-خۆ ئەو بوونەیە هەبووەکان خۆیانی بۆ دەردەخەن. بەڵام هایدیگەر بەبێ دەنگ بەسەر ئەو فاکتۆرەدا بازدەدات، کە گوایە بوون-بۆ-خۆ تەنیا لە بوونیدا ئۆنتۆلۆجی هەبووەکان پێکناهێنێت، بەڵکو گۆڕانکارییە ئۆنتۆکییەکانیش دەهێنێتەکایەوە. ئــەم بەردەوامییە لە کارکردندا و گۆڕانکاریکردن لە بوون-لەنێو-خۆدا لە بەستێنی ئۆنتیکی و ماتەرییەوە دەبێت بە خەســڵەتێکی بنەڕەتیی بوون-بۆ-خۆ دابنرێت. پێویستیشـــە ئەم ئەگەرە بناخەی خۆی لەنێو پەیوەندی بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆدا بدۆزێتەوە.

ئەم پەیوەندییەش هێشتا باسنەکراوە. واتای کارکردن چییە؟ بۆچی بوون-بۆ-خۆ کاردەکات؟ چۆن کاردەکات؟ گرنگە وەڵامی ئەم پرســیارانە بدەینەوە. هەموو خاڵەکانی وەڵامدانەوەمان لە بەردەســتدایە: لەناوبردن، فاکتۆر و لەش، بوون-بۆ-کەسانی دیکە و سروشتی تایبەتی بوون-لەنێو-خۆ. پێویستە جارێکی دیکە پرسیار لەبارەیانەوە بکەین.

# هەبوون، کردن و بوون

هەبوون، کردن و بوون کاتیگۆری سـەرەکی ڕسـتەقینەی مرۆڤایەتین. لەبەر ڕۆشنایی ئەماندا هەموو چالاکییەکانی مرۆڤ دەناسرێن. زانین، بۆنموونە، شێوازێکی هەبوونـە. ئەم کاتیگۆرییانەش لەیەکدی نەپچـڕاون و پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. چەند نوسـەرێکیش جەختیان لەسـەر پەیوەندییەکەیان کردوە. دێنس دی ڕۆگیمۆنت ڕۆشنایی خستۆتە سـەر پەیوەندییەکە و لە نوسراوەکەیدا لەسەر دۆن ژوان دەڵێـت، "ئەو نەیدەتوانی هەبێت." هەروەها، هەمان پەیوەندیش لەو بکەرە ڕەوشـتییەدا دەردەکەوێت، کە بۆ خۆی کارێک دەکات یان بەکارێک هەڵدەستێت تاکو بوونی هەبێت.

بەهەرحاڵ، مادام لایەنە دژوەستاوەکەی بەرانبەر بیردۆزەی جەوهەر لە فەلسەفەی نوێـدا براوەیە، زۆرینەی بیریارەکان هەوڵیانداوە لەسـەر زەمینەی چالاکییەکانی مرۆڤ، بەو جۆرەی زانایانی فیزیا پێش ئەوان کردوویانە، لەجێگەی جەوهەر جوڵان دابنێن. بۆ کاتێکی درێژخایەن ئامانجی ڕەوشـت دیاریکردنی شـێوازی بوون بوو بۆ مرۆڤ. ئەم ئامانجە واتای بە ڕەوشـتی ڕواقییەکان و سـپینۆزا بەخشی. بەڵام ئەگەر بوونی مرۆڤ زنجیرەی چالاکییەکانی بێت، ئەوا ئامانجی ڕەوشـت گەیاندنی بوونی مرۆڤ بە پلەیەکی بەرزی ئۆنتۆلۆجی نییە. لەم ڕووەوە، سیستەمی ڕەوشتی (کانـت) دەبێت بە گەورەترین، کە کـردەوە لەجێگەی بوون بە بەهایەکی بەرزی چلاکی دادەنێت. پاڵەوانەکانی (لائیسـپۆر) لەسەر ئاستی کردەوەکانیانن.(مارلۆ) ش ناکۆکی نێوان ئیسـپانییە دیموکراتخوازە کۆنەکان، ئەوانەی دەیانەوێت هەبن و کۆمۆنیسـتەکان، کە ڕەوشتیان بە زنجیرەیەک لێپرسینەوە دانا و هەریەکێک لە لێپرسـینەوەکان پەیوەندی بە کردەوەوە هەیە نیشاندەدات، ئایا کێ ڕاستدەکات؟ ئایا بەهای بەرزی ڕاسـتەقینەی مرۆڤایەتی لە بووندایە یان لە کردەوەدا؟ چ ڕێگە چارەیـەک هەڵبژێرین؟ چـی دەبێت بە هەبوون؟ پێویسـتە ئۆنتۆلۆجی زانینمان سـەبارەت ئەم کێشەیە بداتێ. هەروەها ئەمەش کاری ئۆنتۆلۆجییە چونکە بوون-بۆ-خۆ ئەو بوونەیە کردەوەکانی پێناسـی دەکەن. کەوابوو، بەبێ نەخشەدانانێکی فراوان بۆ توێژینەوە لەسـەر چالاکییەکان بەگشـتی و پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی نێوان کردن، بوون و هەبوون کۆتایی بە باسەکەمان ناهێنین.

# بەشی یەکەم

## بوون و کردن: سەربەستی

### یەکەم، سەربەستی: یەکەم مەرجی چالاکی

جێگەی سەرسوڕمانە فەیلەسوفەکان بەردەوام مشتومڕیان لەسەر کێشەی ناچارەکی و سەربەستی ویست کردوە. نموونەیان بۆ یەکێک لەم لایەنەی بۆچوونەکان بەبێ ئاماژەکردن بۆ بونیادی چالاکی هێناوەتەوە. چەمکی چالاکی، لەڕاستیدا، چەند چەمکێکی دیکە لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت، کە لێرەدا پێویستە ڕیزیان بکەین: کارکردن واتای گۆڕان لەشێوازی جیهاندا دەگرێتەوە؛ بەکارهێنانی وەسیلەیە بۆ گەیشتن بە کۆتایی؛ بەرهەمهێنانی ڕێکخستنی ئامێرێکی ئالۆزە، کە بە هۆیەوە گۆڕانکارییەکە کاریگەر دەبێت و ئامانجەکان پەیدادەکات.

بەڵام، بۆ ئێمە، ئەمە گرنگ نییە. پێویستە بزانین چالاکی، لە پێش هەموو شتێکدا، مەبەستدارە. ئەو جگەرەکێشە بێ دەربەستەی ئاگری جگەرەکەی بوە هۆکاری تەقینەوەکە چالاک نییە. لەلایەکی دیکەوە، کرێکارێک، کە پڕە لە وزەی بزێو، هەروەها پەیڕەوی فەرمانەکانیش دەکات، ئەو کاتەی تەقینەوەکە دەکات، کەسێکی چالاکە. ئەو دەزانێت چی دەکات یان بە ئاگاوە مەبەستی پڕۆژەکەی دیاریدەکات. ئەمەش، بێگومان، ئەوە ناگەیەنێت، کە هەموو کەسێک دەبێت ئاکامی کردەوەکانی بزانێت. کاتێک کۆنستەنتاین بوو بە ئیمراتۆری بێزەنتاین نەیدەزانی مەڵبەندێکی کەلتوری و زمانی یۆنان دادەمەزرێنێت، کە پیاوانی کەنیسەی پێ ڕووگرژ دەبێت و ئیمراتۆرییەتی ڕۆماش لاواز دەکات. بەڵام بەو کارەش هەستا. بەرابەرکردنی مەبەست و ئاکام بۆ ئێمە زەمینە بۆ باسەکەمان لەسەر (کردن) خۆشدەکات. ئەگەر ئەمکارە دروست بێت ئەو ڕاستییە دادەمەزرێنین، کە (خواست) دەبێت بە مەرجێکی پێویست بۆ کردن؛ واتە، نەبوونییەکی دەرەکی یان ڕەتدانەوەیەک سەرهەڵدەدات. مەبەست لە دروستکردنی لایەنێکی نایار بۆ ڕۆم لای کۆنستەنتاین بە هۆکار نەبوونێک یان کەمییەکی دەرەکییەوە دێتە پێش: ڕۆم لایەنی نایاری نییە. بۆ ئەمە دەبێت شارێکی بێ بڕوا دژی مەسیحایەتی هەبێت، تاکو دژی ڕۆم ڕاوەستێت، کە نییە. دامەزراندنی شاری کۆنستەنتیپۆڵ کردنە ئەگەر چەمکی شارێکی نوێ پێش دروستکردنی شارەکە بکەوێت. بەڵام چەمکەکە نوێنەرایەتی

تەواوی شـــارەکە ناکات، بەڵکو زانینە لەبارەی خەسڵەتە سەرەکییەکانییەوە، کە دەمانەوێت و هێشتا پەیدا نەبووە.

ئەمە ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە لە یەکەم ســـاتی کارکردنەکەوە ئاگامەندی توانیویەتی خۆی لە جیهان و بوون دووربخاتەوە تاکو بە نەبوون بگات. بەوجۆرەی بوونی ئاگامەنـــدی دەبینرێت بەردەوام لە بوونەوە ئاماژە بۆ بوون دەکات و لەنێو بونیشـــدا هیچ ماندەرێک بۆ گەیشـــتن بە نەبوون نادۆزێتەوە. ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و ڕژێمە ســـەقامگیرەکەی لە پایتەختەکەیدا کارەکان هەڵدەسوڕێنێت و دەبینرێت. ئایـــا کەس دەڵێت باجەکان خراپ کۆدەکرێنەوە؟ ســـنورەکانی ڕۆم لە پەلاماردان نەپارێزراون؟ شـــوێنی جوگرافی ئەو بۆ ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی سەر بە دەریای ناوەڕاست چاک نییە؟ باربەرییەکان دەتوانن هێرش بکەنە سەری و گەندەڵییەکەشی زیان لە بڵاوبوونەوەی ئایینی مەســـیحایەتی دەدات؟ چۆن نکۆڵی لەوەدەکرێت، کە ئەم بۆچوونانە نەرێن؛ ئاماژە بۆ شـــتێکی نەبوو نەک ئەوەی هەیە دەکەن. ئەگەر بڵێین لەســـەدا شەستی باجەکان کۆکراوەتەوە بۆ شـــتێکی چاک بەکاردێت، ئەوا شتێکە هەیە. بەڵام، ئەو کاتەی دەڵێین خراپ کۆکراونەتەوە ئەوا ئاماژە بۆ شتێک دەکەین، کە نییە.

ئەگەر بڵێین گەندەڵی ڕۆم ڕێگرە بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحایەتی ئەوا باس لەوەناکەین، کە هەیە؛ بۆنموونە، بانگەشەی پیاوە ئاینییەکان سەبارەت دینەکەیان. بەڵکو ئاماژە بۆ تیشکدانەوەیەک دەکەین، کە ناتەواوە و نهێنی نەبوونی هەڵگرتوە. ئەم حاڵەتە سنورداره دەرناکەوێت ئەگەر تەنیا بیر لەو شتانە بکەینەوە، کە هەن. جوانترین کچ لە جیهاندا ئەوەی هەیەتی نیشانی دەدات و لانەوازترین کەسیش یان حاڵەت بە تەنیا دەریدەخات، کە بەبێ نەبوونییەکی نموونەییە.

بەو ڕادەیەی مرۆڤ لەنێو هەڵوێســـتی مێژوویدا دەژی، ناتوانێت لە ڕووخان و کەمییەکانی ڕێکخراوە ڕامیاری و دیاردە ئابوورییەکان تێبگات: ئەمەش بۆ ئەو خاڵە پوچەڵـــە ناگەڕێتەوە، کە گوایە مرۆڤ لەگەڵیـــدا ڕاهاتوە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە لە پڕی بوونەوە دەیەوێت تەماشـــایبکات و تەنانەت بیر لەوە ناکاتەوە، کە دەتوانێت بەجۆریکـــی دیکەش لە بووندا بێت. ئەمە لەســـەر بناخەی ئەوە نییە کێشـــەکە هەڵگێڕینـــەوە و دژوارییەکەی یان ئازارچێشـــتنەکەی دەربخەین، کە هەردووکیان دەبن بە هەندەر بۆ ناسینی حاڵەتێکی جیاوازتر و چاکتر بۆ هەمووان. لەمحاڵەتەدا ڕووناکی دەکەوێتە ســـەر کێشـــەکە و بـــەو باوەڕە دەگەین، کـــە بارێکی گرانمان هەڵگرتوە. ئەگەر موچەی کرێکار لە ســـاڵی ١٨٣٠دا کـــەم بکرایەتەوە، دەیتوانی شورش بکات چونکە تێدەگەیشت شێوازی گوزەرانی ئێستای چاکترە لەو شێوازەی پاش کەمکردنەوەی موچەکەی بەسەریا دەسەپێنرێت.

لێـــرەدا، بیـــر لە ئازاری ژیانی، وەکو بارێکی گـــران ناکاتەوە و خۆی لەگەڵیدا

دەگونجێنێــت. ئەوەندە لەبارەی ژیانییەوە فێرنەبووە و ئاگایی نییە تاکو ئازارەکە لەناوبەرێت. لەئاکامدا، هیچ کارێک بۆ گۆڕانەکە ناکات. کرێکارەکانی کرۆکس-ڕۆسۆ پاش خۆپیشاندانەکەیان و سەرکەوتن چوونە ماڵەوە و نەیانزانی چۆن سەرکەوتنەکە بەکاربهێنن. ســەربازەکانیش بە ئاسانی بەسەریاندا زاڵبوون. ئەم بەدبەختییە بۆ ئەوان 'خوو' نەبوو، بەڵکو 'سروشــتی'بوو؛ بارودۆخی ژیانی کرێکاری پیکدەهێنا؛ دانەبڕاوە، لەبەر ڕووناکی نابینرێت و دواجاریش کرێکارەکە کردوویەتی بە بەشێک لــە بوونی خۆی. ئەو، بەبــێ ئەوەی لە ئازارەکە تێبگات و بەهای بە بەردا بکات، لەنێو ئازاردا دەژی. بوون و ئازارچێشــتن، بۆ ئەو، دەبن بەیەک شــت. ئازارەکەی کارتێکردنی ئاگامەندییەکەیەتی بەبێ تێڕامان، بەڵام بیری لێناکاتەوە. لەبەر ئەمە، ئازارەکــەی نابێت بە هاندەر بــۆ کردەوە. بەپێچەوانەوە، پاش بڕیاردان لەســەر گۆڕانی بارودۆخی ژیانی حاڵەتەکە، وەکو بارێکی گران دەناسێت. دەبێت خۆی لە حاڵەتەکــە دوورە پەرێز ڕابگرێت و دووجــۆر لەناوبردن بەکاربهێنێت: لەلایەکەوە، دەبێــت حاڵەتی نەبوونێکی ڕووت بخاتە بەردەم؛ لەلاکــەی دیکەوە، حاڵەتەکەی تیایدا دەژی بەرانبەر حاڵەتە نەبووەکە بەرانبەر یەکدی دابنێت. ئەو دەبێت بزانێت بەختەوەری چییە، بە چینەکەیەوە بیبەســتێتەوە و لەگەڵ حاڵەتی ئێستای خۆی بەراوردی بکات. لەو نەبوونییەوە بەو باوەڕەبگات، کە بڵێت، "من بەختەوەر نیم." لێرەدا دوو ئاکامی گرنگ وەدەست دەهێنین.

یەکــەم، هیچ حاڵەتێکی فاکتۆری گرنگ (بونیــادی ڕامیاری و ئابووری کۆمەڵ یــان دەروونی و هتــد.) نییە بەتەنیا ببێت بە هاندەر بۆ کردەوە. کردەوە پرۆژەی بوون-بۆ-خۆیــە و ڕوو لەوە دەکات، کە نییە. ئــەوەی هەیە ناتوانێت ئەوەی نییە سنوردار بکات.

دووەم، هیچ حاڵەتێکی فاکتۆری ڕەتدانەوە و کەمی ئاگامەندی سنوردار ناکات و پێناسەشی بۆ دانانێت چونکە گوتەکەی سپینۆزا، کە دەڵێت "هەموو سەلماندنێک ڕەتدانەوەیە." ڕاستە. هەموو کردەوەیەک حاڵەتە کەمییەکە دەدۆزێتەوە. هەمانکات، لــە پێش هەموو شــتێکدا، پێکهاتەی ئەو حاڵەتــەی بیریلێدەکاتەوە دەخاتە نێو سیســتەمێکی جیــاوازەوە. حاڵەتێکی فاکتــۆری لەبەردەممانداــە، گرنگ نییە ڕازیبــوون و ناڕازیبوونمان بۆ هێزی ڕەتدانەوەی بوون-بۆ-خۆ بگەڕێتەوە، ئەو هێزە دوورە پەرێــزی ئێمە لە جیهانەوە ســنورداری ناکات. چەند ئەم بوونە ئاگامەندی بخاتەگەر، چەند لەنێو ئازاردا بێت، هەمیشــە لە بووندایــە. ئەوەی لەناودەبرێت و تێپەڕدەکرێت شــێوازێکی دانراوی بوونی-نێــو ئازاری-کرێکارەکەیە و دەبێت بە پرۆژەی بیرکردنەوەکە. کرێکارەکە بە دەرچوونی لەنێو جیهاندا لە واتای ئازارەکەی دەگات و ئازارەکەش دەبێت بە هاندەر بۆ ســەرهەڵدانی کردەوە شۆڕشگێڕانەکەی. ئەم نموونەیەشە بۆ داپچڕانی بەردەوامی ئاگامەندی لە ڕابردووی خۆی تاکو، وەکو

شـــتێکی نەبوو بیری لێبکاتەوە، واتای بداتێ و بەوەی دابنێت، کە نییەتی. لەژێر هیـــچ بارودۆخێکدا ڕابردوو بەتەنیا کردەوە ناهێنێتە کایەوە. هیگڵ باش لەم خاڵە تێگەیشتوە و دەڵێت، "هۆش نەرێیە." بەڵام ئەو کاتەی ویستی بیردۆزەکەی لەسەر سەربەســـتی و کردن دامەزراند بیری ئەم خاڵەی نەبوو. لەڕاستیدا، هەرکاتێک ئەم خەســـڵەتە نەرێیە بـــە ئاگامەندی بەرانبەر جیهان و خۆی بدرێت و شـــێوازەکانی لەناوبردن ببن بە بەشـــێک لە کۆتایی و ئامانجی کردنەکە، پێویستە تێبگەین، کە سەربەستی بکەرەکە دەبێت بە مەرجێکی بنەڕەتی بۆ کردن.

لەســـەرەتاوە کەموکورتـــی گفتوگۆکانی نێـــوان شـــوێنکەوتوانی ناچارەکی و سەربەســـتی دەبینین. شوێنکەوتوانی سەربەستی بەدوای ئە حاڵەتانەدا دەگەڕێن، کە بڕیاردانەکان لەسەریان هۆکارێکی لەپێشتریان نییە. شوێنکەوتوانی ناچارەکیش لەوباوەڕەدان کردەوە بەبێ هۆکار نییە، بۆنموونە (بەرزکردنەوەی دەســـتی ڕاست لەبری دەستی چەپ و هتد) ئاماژە بۆ هۆکارەکان و هاندەرەکان دەکەن، کە واتای پێدەبەخشن. بێگومان، مادام هەموو کردەوەیەک مەبەستدارە، بۆ چوونەکە ناجۆر نییە. پێویســـتە هەموو کردەوەیەک کۆتاییەکی لەدوا بێت، ئەم کۆتاییەش ئاماژە بۆ هۆکار دەکات. ئەمەش یەکێتییە لەنێوان ســـێ ڕەهەندەکانی کاتدا؛ کۆتایی یان داهاتووی کات دەبێت بە هۆکار یان هاندەر؛ ئاماژەش بۆ ڕابردوو دەکات و ئێستاشم دەبێت بە کاتی سەرهەڵدانی کردەوەکەم. باسکردن لە کردەوە بەبێ هۆکار باسکردنە لە کردەوەیەکی بێ مەبەســـت. لەم ڕووەوە، هەوڵدانی شوێنکەوتوانی سەربەستی بێهودەیە. شـــوێنکەوتوانی ناچارەکیش ســـەنگی تەرازوەکەیان بـــە توێژینەوە و جەختکردن تەنیا لەسەر هۆکار و هاندەر دەوەستێنن. پرسیارەکە لەژوور بونیادی ئاڵۆزی "هۆکار-مەبەســـت-کردن و کۆتایی"ەوەیە؛ پێویســـتە بپرسین چۆن هۆکار پێکدێت؟

ئێســـتا زانیمان ئەگەر کردەوە بێ هۆکار نەبێـــت لەوەدەچێت دیاردەش بەبێ هۆکار نەدۆزینەوە. بۆ ئەوەی هۆکار هەبێت پێویستە بخرێتە بەر ڕۆشنایی ئەزمون. بێگومـــان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە دەبێت بیرۆکەی هۆکارەکەمان لا دروســـت بێت، بەڵکو دەبێت بوون-بۆ-خۆ بتوانێت بەهاکانی خۆی لەسەر دامەزرێنێت، وەکو هۆکار یان هاندەر ببینێت. ئەم پێکهاتەیەی هۆکار ئاماژە بۆ بوونێکی ڕاستەقینە و ئەرێ ناکات؛ بۆنموونە هۆکارێکی لەپێشتر. ئەگینا سروشتی کردنەکە بەوجۆرەی مامەڵە لەگەڵ نە-بووندا بە مەبەستەوە دەکات، لەناودەچێت. هەموو هاندەرێک بە ئامانج و کۆتاییەکەی دەناسرێت، کە نە-بوونە. لەبەرئەمە ڕەتدانەوەیە. ئەگەر من بە موچەیەکی کەم لە ترســـا ڕازی بم، ئەوا ترس دەبێت بە هاندەر. بەڵام ترس لە مردن بە برسێتی لەدەرەوەی خۆیدا و لەو کۆتاییە نموونەییەدا هەیەتی واتابەخشە؛ ئەویش بەردەوامی ژیانە من لەحاڵەتی مەترسیدا دەیناسمەوە. ئەم ترسە پەیوەندی

بە بەهای ژیانەوە هەیە، کە من بەشـــاراوەیی بەسەر ژیاندا دەیسەپێنم. کەوابوو، هاندەر پێکەوە دانانی ئەو شـــتانەیە، کە نین و لە داهاتوودان. بەوجۆرەی داهاتوو بەرەو ئێســـتا و ڕابردوو دەگەڕێتەوە، تاکو واتاکەیان ڕوونبکاتەوە، پێکەوە دانانی پرۆژەکانیشـــم دەگەڕێننـــەوە و بونیادی هاندەرەکە، وەکو هانـــدەر دادەمەزرێنن. لەبەر ئەوەی مـــن بە لەناوبردنی بوونم لەدەســـت بوون-لەنێو-خۆ ڕادەکەم و ڕوو لە ئەگەرەکانم دەکەم، ئەوا لەســـەر بوون-لەنێو-خۆ بەهاکە دەبێت بە هۆکار یان هانـــدەر. واتای هۆکار و هاندەرەکان بەســـتراوە بە پێکەوەدانانی نەبووەکان. ئەم پێکەوەدانانـــەش بوونی منە، وەکو بەرزێتی؛ بوونی منە بەو شـــێوەیەی دەمەوێت لەدەرەوەی بوونی خۆمدا خۆم بم.

ئەگەر ئەو خاڵەمان لەبیربێت، کە گوتمان ناسینەوەی ئەگەری شۆڕش بەهای، وەکـــو هاندەر بە ژیانی پڕ ئازاری کریکارەکە بەخشـــی. بەو ئاکامەش دەگەین بە هەڵهاتن لەو حاڵەتە بەرەو ئەگـــەری گۆڕانکاری حاڵەتەکە لەنێو بونیادی ئاڵۆزی هۆکار و هاندەرەکان دەچەســـپێنن. بـــەو ڕەتدانەوەیەی ئێمە لە پەیوەندییمان بە حاڵەتەکەوە دابڕاو دەکات ئەو ڕەهەندە کاتییانەی هەیە لە پرۆژەکەماندا گۆڕانکاری بەســـەر حاڵەتەکەدا دەهێنین. لەم ڕووەوە، مەحاڵە کردەوە بەبێ هاندەر هەبێت. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشـــێت، کە هاندەر هـــۆکارە بۆ کردن. هاندەر تەواوکەری کردنە. بەهەمانشێوەش، پرۆژەی بڕیاردان بەرەو گۆڕان بەشێکە لەکردن. هاندەر، کردن و کۆتایی پێکەوە لە ســـەرهەڵدانی کردەوەیەکدا یەک دەگرن. هەریەکیک لە بونیادی ئەم سێ لایەنە بە دوو لایەنەکەی دیکەوە بەستراوە و لەو پەیوەندییەدا واتا دەبەخشێت. بەڵام بوونیادە گشتییەکەی هەرسێکیان پێکەوە بۆ یەک لا ناگەڕێتەوە. سەرهەڵدانی کردنیش، وەکو ڕەتدانەوەی بوون-لەنێو-خۆ لەنێو کاتدا سەربەستییە. کردن کۆتایی و هاندەرەکان دیاریدەکات. کردنیش دەربڕینی سەربەســـتییە. ئیمە لەئاستی ئەم ڕوونکردنەوەیەدا ناوەستین. ئەگەر مەرجی بنەڕەتیکردن سەربەستی بێت، پێویستە لەسەر سەربەستی بدوێین. بەڵام لەسەرەتاوە توشی گرفتی گەورە دەبین. باســـکردنی بابەتێک پەیوەندی بە دەستنیشانکردنی بونیادی ناوەڕۆکێکی تایبەتی بابەتەکەوە هەیە. بەڵام سەربەستی لە ناوەڕۆک بەدەرە؛ نابێت بە بابەتی لێکۆڵینەوەی لۆجیکانەش. ئێمە، بەو جۆرەی هایدیگەر سەبارەت دازاینەوە دەڵێت، "بوونی پێش جەوهەری دەکەوێت" باسی سەربەستی دەکەین. خودی سەربەستی کردنە؛ ئێمەش لەگەڵ پێکەوەدانانی هۆکار و هاندەرەکاندا دەستماندەکەوێت.

بـــەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کردنە خاوەنـــی ناوەڕۆکە لە پێکهاتە دەچێت. ئەگەر بمانەوێت بە هێزێکی پێکهاتوو بگەین، پێویستە ئومێدمان بۆ دۆزینەەی ناوەڕۆکی نەبێت. دۆزینەوەی ناوەڕۆک دەکەوێتە سەر پێکهاتوویەکی دیکە و ئەمەش کۆتایی نایەت. چۆن بتوانین پێناسەی هەبوویەک بکەین، کە بەردەوام خۆی پێکدەهێنێت

و خۆی لەنێو یەک پێناسەدا ڕاناگرێت؟ بەکارهێنانی چەمکی 'سەربەستی' ترسناکە ئەگەر ئەم چەمکە، وەکو چەمکەکانی دیکە تاماشابکەین، ئایا سەربەستی بێ ناوە و لەپێناسەبەدەرە؟

پێشتر، لە پێناسەکردنمان بۆ نەبوون و بوونی دیاردە توشی کۆمەڵێ گرفتبووین، بەڵام گرفتەکان کۆڵیان پێنەداین. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێک لە باسکردن، کە بە ناوەڕۆکەوە نەبەستراوە و پەیوندی بە تایبەتمەندێتی هەبووەکەوە هەیە. بەدڵنیاییەوە، من باسی ئەو سەربەستییە باوەی نێوان من و کەسانی دیکە ناکەم؛ لەبەر ئەمەشە پەنا بۆ ناوەڕۆکی نابەم. بەپێچەوانەوە، سەربەستییەکە دەبێت بە بناخەی هەموو ناوەڕۆکێک چونکە مرۆڤ بە ڕێگەی تێپەڕکردنی جیهان و گەیشتن بە ئەگەرەکانی ناوەڕۆکەکان بەرجەستەدەکات. بەڵام پرسیارەکەی ئێمە سەبارەت بە سەربەستییە. کاتێک باسی ئاگامەندیم کرد ئەو سروشتە هاوبەشییەی نێوان تاکەکانم دەستنیشانکردن. تەنیا لەسەر ئاگاماندی خۆم دوام، کە سەربەستییەکە لەودیو ناوەڕۆکەوەیە یان چەندجارێک باسمانکردووە و گوتمان بۆ هەرشتێک بتەوێ ببیت دەبێ هەبووبیت. هەروەها، ئەم ئاگامەندییە بوونی ئەزمونێکی تایبەتی کۆجیتۆیە. هوسرڵ و دێکارت، بەو جۆرەی گەستۆن بێرگەر ڕوونیکردۆتەوە، لەو باوەڕەدان کۆجیتۆ ڕاستی ناوەڕۆک دەردەخات. لەلای دێکارت پەیوەندی نێوان دوو سروشتی سادە باسکراوە؛ لای هوسرڵیش بونیادی ئایدیایی ئاگامەندی دامەزراوە. بەڵام ئەگەر بوونی ئاگامەندی پێش ناوەڕۆکی بکەوێت ئەوا دێکارت و هوسرڵ توشی هەڵەکردن دەبن. ئەوەی ئێمە لە کۆجیتۆی داوا دەکەین دۆزینەوەی پێویستییەکی فاکتۆرییە. هەروەها داوای سەربەستییەکەمانی، وەکو سەربەستی لەسەر پێویستییە فاکتۆرییەکە لێدەکەین؛ یان هەبوویەکی هەڵکەوتوو، کە من بتوانم بە ئەزمون بیناسم. بێگومان من ئەو بوونەم بە کردەوەکانم فێری سەربەستییەکەم دەبم. من بۆ سەربەستی ئاگاییم چونکە بێجگە لەو بوونەی بۆ ئاگامەندی هەیە چی دیکە لەنێو ئاگامەندیدا نییە. کەوابوو، من بەردەوام پرسیار سەبارەت سەربەستی لە بوونمدا دەکەم؛ سەربەستی خەسڵەتێکی پێدراو یان سروشتی نییە؛ بەڵکو بوونی منە و لە بوونی مندایە. پرسیارکردنە، پەیوەندی بە بوونی منەوە هەیە و پێویستە لە واتای سەربەستی تێبگەم. ئەم تێگەیشتنەیە دەمانەوێت ڕوونی بکەینەوە.

لە هەوڵدانەکەماندا بۆ گەیشتن بە ناخی سەربەستی، ئەو خاڵانەی لەسەر (خۆ) ئاماژەمان بۆ کردن یارمەتیدەرن. لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا باسمانکرد، کە ئەگەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ڕەتدانەوە بهێنێتە نێو جیهانەوە، ئەوا پێویستە ئەم بوونە هەست بە پچڕان لەگەڵ جیهان و بوونی خۆشیدا بکات. هەروەها، بەو باوەڕەش گەیشتین، کە ئەگەری بەردەوامی پچڕاندنەکە و سەربەستی لە یەکدی دەچن. هەروەها، ئەوەشمان ڕوونکردەوە، ئەگەر بەردەوامیەکەی بوونم لەشێوازی

"بوونێکی-هەبوو" جۆرێک لە بوونی مرۆڤ دیاریدەکات. لە شیکردنەوەکەماندا، کە بۆ بڕوای خراپیشمانکرد، بەو باوەڕەدەگەین ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی نەبوون بێت بۆ خۆی. بۆ ئەوەی بوون-بۆ-خۆ هەبێت، دەبێت ئەو بوون-لەنێو-خۆیە ڕەتبداتەوە، کە خۆیەتی. لەنێو ئەم بارودۆخەدا سەربەستی بێجگە لەم ڕەتدانەوەیە چی دیکە نییە. بە ڕێگەی ڕەتدانەوە بوون-بۆ-خۆ لەو بوونەی خۆی ڕادەکات، کە ناوەڕۆکی دەداتێ و دەبێت بە شـــتێکی دیکە. لەم ڕووەوە، بوون-بۆ-خۆ لەودیو ئەو خەسڵەتانەوەیە پێیدراون. کاتێک دەڵێین بوون-بۆ-خۆ پێویســـتە ببێـــت بەوەی هەیە، هەمانکات مەبەســـتمان ئەوەیە و ئەوەش نییە، کە ئێستا هەیە. کێشەی پێشخستنی بوون و دواخســـتنی ناوەڕۆک یان هەڵگەڕانەوەی بەو جۆرەی هیگڵ دەڵێت، "بوون ئەوەیە هەیە." یەک واتا دەبەخشـــێت؛ جەخت لەســـەر سەربەستی مرۆڤ دەکات. لەسەر ئەو ڕاستییەی من ئاگام لەو هۆکارانەیە کردەوەکانم دەخەنەگەڕ، هۆکارەکان دەبن بـــە بابەتی بەرز بۆ ئاگاییـــم و لەدەرەوەی بوونی منـــدان. گرتنیان مەحاڵە و لە دەستیان ڕادەکەم. من مەحکوم کراوم و بەردەوامیش دەمەوێت لەودیو ناوەڕۆکمەوە بـــم؛ بوونم لەودیو هـــۆکار و هاندەرەکانی کردنەکەم بێـــت. **من مەحکوم کراوم سەربەســـت بم.** سەربەستییەکەشم بێجگە لە خۆی هیچ شتێک سنورداری ناکات یان ئێمە سەربەست نین بۆ ئەوەی سەربەست نەبین.

هاندەر، بەوجۆرەی، وەکو فاکتۆرێکی دەروونی دەبینرێت، بۆنموونە ڕاستەقینەیەکی پڕ و دراو، لە بۆچوونی ناچارەکییەوە لە بڕیاردان و کردن جیانابێتەوە. ئەم دووانەش بە فاکتۆری دەروونی دادەنرێن. بوون —لەنێو-خۆ خاوەنی ئەم لایەنانەیە. هاندەر، وەکو چۆن هۆکار کاریگەرێتی بەسەر هۆکردەوە هەیە، کردنەکە دەجوڵێنێت. هەموو شتێک پڕ و دەرەکییە. ڕەتدانەوەی سەربەستییەکەش هەوڵدانە بۆ دانانی بوون بە بوون-لەنێو-خۆ؛ جیاوازیان لەنێواندا نییە. دەکرێت پێناسی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەو شـــێوەیە بکەین، کە ئەو بوونەیە سەربەســـتییەکەی بەردەوام لە مەترسیدایە چونکە نایەوێت بیناسێت. لە بۆچوونی دەروونناسیدا ئەم هەڵوێستەمان هەوڵدانە بۆ بەشتکردنی هۆکار و هاندەرەکان و بوونێکی بەردەوامیان دەدەینێ.

لە خۆمانی دەشارینەوە چۆن سروشـــت و سەنگینییەکەیان لە هەمووساتێکدا بۆ ئەو واتایانە دەگەڕێنەوە من پێیان دەبەخشـــم. هەرچەندە لەنێو ئێستاشدان بە نەگۆڕ لەنێو ڕابردوودا دایاندەنێم. باوەڕ بە خۆم دەهێنم، کە هۆکار ئەوەیە هەبوو؛ لە ئاگایی ڕابردوومەوە بە ئێستا دەگات و لەنێو ئاگامەندیمدا دەچەسپێت.

ئەمەش لە ســـەپاندنی ناوەڕۆک بەســـەر بوون-بۆ-خۆ دەچێت. بەهەمانشێوە، هەندێک کەس کۆتایی بە بەرزێتی دادەنێن. هەرچەندە ئەمکارە هەڵە نییە، بەڵام لە جێگەی بینینی ئەو ڕاستییەی بەرزێتییەکە بە بەرزێتی منەوە بەستراوە، ئەوان بەو باوەڕە دەگەن، کە من لە بەرجەستەبوونم لەنێو جیهاندا ڕووبەڕوویان دەبمەوە. لە

خواوە یان لە سروشتەوە، لە سەرشتی (خۆ)مەوە یان لە کۆمەڵەوە بەرەو من دێن. کۆتاییەکان[لەمحاڵەتەدا] دروستکراون و پێش ویستی مرۆڤ دەکەون. کردەوەکانی من، پێش ناسینیان، وەکو هۆکارەکان، پێناسدەکەن.

هـــۆکار، کردن و کۆتایی بەردەوامین. هەوڵدانە ســـەرنەکەوتوەکان دەیانەوێت سەربەســـتی بخەنە ژێـــر باری بوونەوە (لەگەڵ ســـەرهەڵدانی دوودڵی لەئاســـتی سەربەســـتیدا دەڕوخێن) و دەریدەخەن، کە سەربەســـتی لە بنەڕەتەوە هاودەمی نەبوونە و لە بوونی مرۆڤدایە. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی سەربەستە چونکە ناتەواوە و بەردەوام لە خۆی دووردەکەوێتەوە. نەبوون بوونی ئەو لەوەی هەیە و پێی دەگات جیادەکاتەوە. دواجاریش، سەربەستە چونکە بوونی ئێستای لە شێوازی (تێڕامانی- تیڕامان)دا نەبوونە. مرۆڤ سەربەســـتە چونکە خۆی لەبەردەم خۆشیدا ئامادەیە. بوونێکی هەبوو ناتوانێت سەربەست بێت. سەربەستی نەبوونێکی دروستکراوی نێو بوونی مرۆڤە. زەبر لە ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتـــی دەکات لە باتی ئەوەی (هەبێت) خۆی دروستبکات. بەمجۆرە، بۆ ئەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی هەبێت، پێویستە خۆی هەڵبژێرێت؛ هیچ شـــتێک لەدەرەوە و ناوەوەی ئەودا دانەنراوە تاکو تەوانای وەرگرتنـــی هەبێت. بەبێ یارمەتی، هەرجۆریک بێت، لەبەردەم پێویســـتی گرانی دروســـتکردنی خۆیدا جێماوە. **کەوابوو، سەربەستی بوون نییە؛ بەڵکو بوونی مرۆڤە، بۆنموونە، نەبوونی بوونییەتی.** ئەگەر بوونی مرۆڤ پڕ بێت بێســـودە هەوڵبدەین لە بوونیدا بەدوای ئەو ســـاتانە یان دەڤەرە دەروونییانەدا بگەڕێین، کە تییادا سەربەستە. ئێمە بەدوای شوێنی بەتاڵی لێوانێکی پردا ناگەڕێین. هەروەها، مرۆڤ جارێک کۆیلە و جارێکی دیکە سەربەســـت نییە. ئـــەو بەتەواوی بەردەوام سەربەستە یان سەربەست نییە.

ئـــەم تێبینیانە، ئەگـــەر بزانین چۆن بەکاردێن، ئێمە بـــەرەو دۆزینەوەی نوێ دەبەن. یارمەتیمان دەدەن ڕۆشـــنایی بخەینە سەر پەیوەندی نێوان سەربەستی و ئەوەی بە 'ویســـت' ناوزەدی دەکەین. زۆرجار، کردەوەی سەربەست و خۆبەخشانە بە یەک شـــت دادەنرێن تاکو بۆچوونی شـــوێنکەوتوانی ناچارەکی سەبارەت سۆز ســـنوردار بکرێت. بەکورتیەکەی، ئەمە بۆچوونی دێکارت بوو. ویســـتی دێکارتی سەربەستە، بەڵام سۆزەکانی دەروونیش هەن. هەوڵدانەکەی دێکارت[بۆ تێگەیستن] لەم ســـۆزانە لە ڕوویەکی دەروونناســـییەوەیە. شیکردنەوەکەی پرۆست، بۆنموونە لەسەر (غیرە) لایەنی میکانیزمی سۆزەکانمان بۆ ڕووندەکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە گرنگە مرۆڤ بەوجۆرە ببینین، کە کتوپڕ سەربەستە و ناچاریشە. لێرەدا، کێشەکەش بۆ پەیوەندی نێوان سەربەستییە بێسنورەکە و پرۆسە ناچارەکییە دەروونییەکەی لە ژیاندا دەگەڕێتەوە: چۆن ئەو دەبێت بە خاوەنی ســـۆزەکانی و بۆ سودی خۆی بەکاریان دەهێنێت؟

زانایی پێشـــینان، ئەو زانایییەی ڕواقییەکان هەیـــان بوو، فێرمان دەکات چۆن مامەڵە لەگەڵ سۆزەکاندا بکەین و بیانخەینە ژێر دەستەڵاتمانەوە؛ فێرمان دەکات، بـــەو جۆرەی مرۆڤ بایەخ بە سروشـــت دەدات تاکو بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت، ســـودیش لە سۆزەکان وەرگرێت. ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی دەردەکەوێت هێزێکی سەربەست بێت لە هەموولاوە پرۆسە پێکهاتووە ناچارەکییەکان گەمارۆیان دابێت. کەسێک دەتوانێت کردەوە سەربەستەکان و پرۆسە ناچارەکییەکان، ئەوانەی ویســـتی سەربەست دەستەڵاتی بەســـەریاندا هەیە و ئەوانەی لە ویستی مرۆڤیش ڕادەکەن، جیا بکاتەوە.

ئاشـــکرایە لەســـەر ئەم بۆچوونە ڕێک ناکەوین. بەڵام پێویســـتە هۆکارەکانی ڕینەکەوتنەکە بزانین. یەکێک لە هۆکارەکان دیارە و پێویست ناکات خۆمانی پێوە ماندووبکەیـــن؛ ئەویش ئەوەیە، کە دوو لایەنییەکـــی توندوتیژ لەنێو یەکێتییەکی دەروونییـــدا نابینرێت. چۆن یەک بوون هەمانـــکات زنجیرەیەک فاکتۆری پێکەوە گرێدرا و هەڵدەگرێت، کە لە دەرەوەدا جیاوازبن، ئەو بوونەش خۆی سنور بۆ خۆی دیاریبـــکات و خۆی دەربخات؟ چۆن [ئەم بوونـــە] کاردەکات؟ ئایا کارکردنەکەی لەسەر بابەتەکەیە (فاکتۆرە دەروونییە ئامادەبووەکە)؟ چۆن دەتوانێت بوون-لەنێو-خۆیەک بگۆڕێت، کە هەیە و لەوەش زۆرتر بەچی دیکە نابێت؟ ئایا بەگوێرەی یاسای پرۆسەکە کاردەکات؟ ئەمە لەگەڵ خۆیدا ناکۆکە. ئایا لەسەر ئاکامەکانی پرۆسەکە کاردەکات؟ بەڵام کارکردن لەسەر فاکتۆرە دەروونییەکان لە پێناوی گۆڕانکارییەکاندا و کارکردن لەســـەر ئاکامەکانی پرۆســـەکە وەکو یەکن. لە ئاستی هەر یەکێکیاندا توشـــی هەمان مەحاڵ دەبین، کە لەپێشتر باسمانکرد. هەروەها، ئەم سەرهەڵدانە لەخۆڕایە چ ئامێرێکی بەدەســـتەوەیە؟ ئەگەر دەست شـــتێک بگرێت لەبەرئەوەیە توانای گرتنی هەیە. ســـەرهەڵدانی لەخۆڕا، کە بە پێناســـە لەودیو گەیشتنەوەیە توانای گەیشـــتنی نییە؛ تەنیا خودی خۆی بەرجەســـتەدەکات. ئەگەر ئامێرێکیش بەدەستەوە بێت ئەوا دەبێت ئامێرەکە بەشتێک لەنێوان ویستی سەربەست و سۆزە ناچارەکاندا دابنرێت، کە دەبێت بە ڕێگر. لەبەر چەند هۆکارێک ســـۆزەکان ناتوانن دەســـتەڵاتی خۆیان بەسەر ویستدا بســـەپێنن. بێگومان، مەحاڵیشە پرۆسەیەکی ناچار کاربکاتە سەر ســـەرهەڵدانێکی لەخۆڕا. کەوابوو، تێهەڵکێشکردنی ئەم دوو بوونە جیاوازە مەحاڵە؛ لەیەکدی ناچن؛ هەریەکێک لە ئەوان بە جیا و بێ پەیوەندی بەوی دیکەوە دەمێنێتەوە. تەنیا پەیوەندییەکی نێوانیان هەبێت بۆ ئەو ڕەتدانەوە ناوەکییە دەگەڕێتەوە، کە ڕوو لە هەردووکیان دەکات. بەڵام سەرهەڵدانە لەخۆڕاکە بە نکۆڵیکردنی دانانی بوونی بە ســـۆزەکان دەتوانێت هەبێت. لێرەدا، دامەزراندنی ســـۆزەکان بۆ ســـەرهەڵدانە لەخۆڕاکە دەبێت بە بەرزێتییەکـــی ڕووت، دەرەکی و ئەوەی، کە هێشتا نییە. ڕەتدانەوە ناوەکییەکە، کەوابوو، بۆ بە کاریگەرێتییەکەی

هەوڵی توانەوەی ویســـت لەنێو جیهاندا دەدات، چونکە ســـەرهەڵدانێکی لەخۆڕای سەربەســـت ویســـت و ئاگامەندییە. ئەم ڕوونکردنەوەیە دووجۆر چارەڕێگەمان بۆ دیاریدەکات: مرۆڤ بەتەواوی ناچارە (ئەمەش ناپەســـەندە چونکە ئاگامەندییەکی ناچار، بۆنموونە، کە هاندەرێکی دەرەکی هەیە، خۆی دەبێت بە شـــتێکی دەرەکی ڕووت نەک ئاگامەندی) یان مرۆڤ بەتەواوی سەربەستە.

هێشتا ئەم تێبینییانە مەبەستی سەرەکی ئێمە نین و ئاکامێکی نەرێییان لەدوایە. توێژینەوە لەسەر ویست، بەپێچەوانەوە، تێگەیشتنمان لە سەربەستی بەرەوپێشەوە دەبات. لەبەر ئەمەشە ئەو فاکتۆرەی دێتە بەردەممان دەریدەخات ویست سەربەخۆ بێـــت و ئێمەش ناتوانین بە فاکتۆرێکی دەروونی یـــان بوون-لەنێو-خۆی دابنێین. ســـەر بە کاتیگۆری زانایانـــی دەرونیش نییە، کە بـــە "حاڵەتەکانی ئاگامەندی" ناوزەدیدەکەن. لێرەدا، بەوجۆرەی لە هەموو شـــوێنێکی دیکەشدا هەمانە، دەڵێین حاڵەتی ئاگامەندی بتێکی ڕووتی سایکۆلۆجی پۆزەتیڤە. ئەگەر ویست سەربەستی بێت ئەوا پێویستە ڕەتدانەوە و هێزی لەناوبردنیش بێت. بەڵام نازانین بۆچی ویست دەبێت ســـەربەخۆ بێت. لەڕاســـتیدا دژوارە ئەو، کە لە بەرانەی نێو لەناوبردن، کە لەنێو تۆڕی پڕ و ئەســـتوری سۆزەکاندا ســـەرهەڵدەدات بناسرێت. ئەگەر ویست لەناوبردن بێت ئەوا فاکتۆرە دەروونییە دامەزراوەکان دەبێت لەناوبردن بن. ئایا لە کوێوە ئەو بیرۆکەیەمان بۆ هاتوە، کە گوایە 'فاکتۆر'ی سۆز یان ئارەزوویەکی ڕووت و سادە لەناوبردن نییە؟ ئایا سۆز پرۆژە نییە؟ ئایا حاڵەتێکی قبوڵنەکراو دروست نـــاکات؟ ئایا بە زۆر پەیوەندی بە حاڵەتەکەوە نابڕێ و بە خۆ-دوورخســـتنەوە و گەیشـــتن بە کۆتایی، کە نەبوونە، لەناوی نابات؟ ئایا سۆز خاوەنی ئەو کۆتاییانە نییە، کە لە یەکەم ساتەوە لەبەردەم خۆیدا بە نەبوون دایدەنێت؟ ئەگەر لەناوبردن بوونی سەربەســـتی بێت، چۆن ســـەربەخۆیی ســـۆزەکان ڕەتدەکەینەوە تاکو بە ویستی ببەخشـــین؟ ئەمە هەموو شتێک نییە: ویست، کە شتێکی تایبەت نییە و بەرجەســـتەبوونێکی سەروەرانەی سەربەستی نییە، وەکو هەموو ڕووداوێکی بوون-بۆ-خۆ پێویستی بە بناخەی لەپێشتری سەربەستییە بنەڕەتییەکە بۆ بوونی خۆی هەیە. ویســـت بڕیاردانێکی تێرامانانەیە و پەیوەندی بە کۆتاییە دیاریکراوەکانەوە هەیە. بەڵام خۆی کۆتاییەکان دروســـتناکات. دەتوانین لـــە پەیوەندییەکەیدا بەو کۆتاییانەوە دەبێت بە شێوازێکی بوون.

سۆز هەمان پەیوەندی بە کۆتاییەکانەوە هەیە. بۆنموونە، ئەو کاتەی هەڕەشەم لێدەکەن، لە ترســـی مـــردن بە هەموو خێرایی ڕادەکەم. ئەم فاکتۆرەی ســـۆز بە شـــاراوەیی بەهای ژیان دەسەپێنێت. کەسێکی دیکەش، دەزانێت ئەگەر لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە و ســـەنگەرەکە جێ نەهێڵێت ژیانی لە مەترســـیدا دەبێت، بەڵام سەنگەرەکە چۆڵ ناکات. ئەم ئامانجە، کە ئاشکرا دیارە و ئێمەش تێیدەگەین وەکو

ڕەتدانەوەی پڕ سۆزە و میتۆدی گەیشتنەکەش بە ئاسانی دەناسرێت. جیاوازییە بۆ هەڵبژاردنی ڕێگاکان و [وەسیلەکان] ڕادەی تیرامانەکە، نەک کۆتاییەکە دەگەڕێتەوە. هێشـــتا کەسە ڕاکردووەکە بە کەسێکی ســـۆزدار دادەنرێت و بەرگریکەرەکەش بە خۆبەخش ناوزەد دەکەین.

جیاوازی، لەم بۆچوونەوە، پەیوەندی بە هەڵوێستی ناوەوە و کۆتاییە بەرزەکەوە هەیە. بۆ ئەوەی خۆمان لە هەڵەکەی پێشـــو بپارێزیـــن، کۆتاییە بەرزەکانیش بە شـــتێکی پێش-مرۆڤانە و سنورێکی لەپێشتر بۆ بەرزێتییەکەمان دانەنێین، دەبێت بە پرۆژەکانی سەربەســـتی نێو کات بناسرێن. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەدەرەوەی بوونی خۆی یان لەنێو سروشتی ناوەوەیدا کۆتاییەکانی بۆ دانانرێت. ئەو کۆتاییەکان هەڵدەبژێرێت. بەم هەڵبژاردنەش بوونێکی بەرزیان پێدەبەخشێت. لەم ڕووەوە، لەو تێگەیشتنەوە، کە بوونی دازاین پێش ناوەڕۆکی دەکەوێت، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەگەڵ بەرجەســـتە بوونەکەیدا بە کۆتاییەکانی پێناســـەی خۆی دەکات. کەوابوو، کۆتاییەکانم خەســـڵەتەکانی بوونم دیاریدەکەن، کە سەربەستییە و منیش خاوەنی سەربەســـتییەکەم. بەرجەســـتە بوونەکەش بوونە؛ پەیوەندی بە ناوەڕۆکەوە یان خەسڵەتێکی بوونەوە، کە مامەڵە لەگەڵ بیردا دەکات نییە.

مادام سەربەســـتی و بوونی من یەک شـــتن، ئەوەی من دەمەوێ بە ویست یان هەوڵدانە ســـۆزدارەکانم بیگەمێ بناخەی کۆتاییەکانە. کەوابوو، ویستەکان، وەکو سۆزەکان هەڵوێســـتی ناوەکین، کە بە هۆیانەوە بەو ئاکامانە دەگەین سەربەستی بنەڕەتی دایاندەنێت. مەبەست لە سەربەستی بنەڕەتیش سەربەستییەک نییە پێش کردەوە سەربەخۆکان یان سۆزەکان پەیدا بووبێت، بەڵکو بناخەیەکی لەگەڵ کردەوە سەربەخۆکان و سۆزەکاندا هاوکاتییە و هەریەکێکیش لەم سیانە لە شێوازی تایبەتی خۆیدا بەرجەستە دەبێت. ئێمە سەربەستی بە ناکۆک لەگەڵ ویست و سۆز دانانێتین بەوجۆرەی برگسۆن دوو (خۆ)ی بەرانبەر یەکدی دیاریکردوە. بوون-بۆ-خۆ خۆیەکی هەموگیرییـــە و لایەنێکی دیکەی نییە. ئەگەر مەبەســـتمان لە بوونی بونیادێکی بـــەرزی دەروونی نەبێت. بێجگە لە بوونی ویســـت و ســـۆزەکانمان بۆ لەناوبردنی فاکتۆرەکان سەربەستی چی دیکە نییە؛ ئەمەش ئەو بوونە دیاریدەکات، کە لەبوونیدا شـــێوازی هەبوونی هەیە. دوایی بۆ ئەم خاڵە دەگەڕێینەوە و باســـیدەکەین. بەڵام با ئەوەمان لەبیربێت، کـــە کۆتاییەکانی بوون-بۆ-خۆ لە دانانی پرۆژە بەرزەکانیدا ڕووەو ئەگەرەکانی، ویســـت سنوردارەکەن. ئەگەر ئەمە ڕوونەدات، چۆن لە واتای نیاز یان مەبەست تێبگەین، کە لە پەیوەندی بە کۆتاییەکانەوە وەسیلە و ئامێرەکان هەڵدەسەنگێنێت؟

ئەگەر کۆتاییەکان لەپێشـــتر دانرابن، ئەوەی بۆ مـــن دەمێنێتەوە دیاریکردنی ڕێگاکانە بۆ گەیشـــتن بە کۆتاییەکان؛ یان هەڵوێست وەرگرتنە. ئایا من بە ویست

یان بەســۆزەوە دەبێت کارەکــەم بکەم؟ بێجگە لە خۆم کــێ بڕیارم بۆ دەدات؟ ئەگەر لــەو باوەڕەدابین، کە بارودۆخ بڕیارەکــە دەدات (بۆنموونە، کاتێک ڕوو لە مەترسییەک دەکەم بە کارێک هەڵدەستم و ئەگەر ترسەکەش گەورەتر بوو دەکەومە نێو ســۆزەوە)، ئێمە سەربەســتی خەفە دەکەین. لەڕاستیدا بێهودەیە بانگەشەی سەربەخۆیی ویست بکەین و هەمانکات لەو باوەڕەشدابین بارودۆخەکان سنورداری دەکەن. چۆن ویستێکی نەبوو دەتوانێت کتوپڕ زنجیری سۆزەکان بشکێنێت و خۆی لە پێشــیاندا ڕاگرێت؟ لەم حاڵەتەدا ویست، وەکو هێزێک دەبینرێت، جارێک خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات و جارێکی دیکەش بە شاراوەیی دەمێنێتەوە و لە هەردوو حاڵەتەکەشدا خاوەنی خەسڵەتی نەگۆڕ و بوونێ-لەنێو-خۆیە. ئێمە بەم خاڵە ڕازی نین. بۆچوونە باوەکان ژیانی ئاکاری بە زۆرانباری لەنێوان ویســت، وەکو شــت و ناوەڕۆکەکانی ســۆز لێکدەدەنەوە. لێرەدا جۆرە سایکۆلۆجییەکیماینکیزم هەیە، کە بەتەواوی پشتگیری ناکەین.

لەڕاســتیدا خودی ویســتکردن بەس نییە؛ بەڵکو پێویستە ویستی ویستکردن هەبێت. بۆنموونە، لە هەڵوێســتێکدا بە سۆزەوە ڕادەوەستم. لە شوێنێکی دیکەدا ڕوونمانکردەوە، کە سۆز زریانێکی سایکۆلۆجییانە نییە؛ وەڵامدانەوەی هەڵوێستە؛ واتا و شێوەکەشــی بابەتی ئاگامەندییە، کە دەیەوێت بە کۆتاییەکی دیاریکراو لە ڕێگەیەکی دیاریکراوەوە بگات. لە ترسدا، لە هۆشچوون و نوێژکردن بە خەفەکردنی ئاگامەندی ترسەکە دەشارێتەوە. مەبەست دەرچوونی ئاگامەندییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانێکی قەدەغەکراودا، کــە خۆی پەیدایکردوە. بە ڕەفتاری جادوگەرانە ئارەزووەکانمان ڕەزامەنددەکەین. بەپێچەوانەی ئەمەشــەوە، کردەوە سەربەخۆ و هۆشەکییەکان زانستانە دەڕواننە حاڵەتەکە. ڕەفتارە جادوگەرانەکە ڕەتدەدەنەوە؛ دەســتەیەک ئامێری ئاڵۆز بۆ چارەســەرکردنی گرفتەکە بەکاردەهێنن. جیهانێکی تەکنیکی ئاشکرا دەکەن، کە تیایدا هەریەکێک لە دەستە ئامێرە ئاڵۆزەکان ئاماژە بۆ دەســتەیەکی ئاڵۆزتر دەکات و هتد. چی هانی مــن دەدات یەکێک لەم دووانە هەڵبژێرم؟ بە تەنیا جیهان نییە، بوونی جیهان چاوەڕوانە تاکو بدۆزریتەوە. کەوابوو، پێویســتە بوونێ-بۆ-خۆ لە دانانی پڕۆژەیدا ئەو بوونە هەڵبژێرێت بە هۆیەوە جیهان وەکو جادوگەرانە یان هۆشــەکی خۆی دەردەخات. پێویســتە بوونێ-بۆ-خۆ، وەکو پڕۆژەیەکی سەربەست بوونی خۆی جادوگەرانە یان هۆشەکی بەرجەستەبکات. مادام بوونێ-بۆ-خۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، ئەوا لە ئاستی هەردوو لایەنەکەدا بەرپرسە. لەم ڕووەوە، بوونێ-بۆ-خۆ دەبێت بە بناخەیەکی سەربەستی ویست و سۆزەکانی. ترسەکە سەربەســتە و سەربەستییەکەم بەرجەســتەدەکات. من هەموو سەربەستییەکەمم بــە تــرس داوە و خۆم، وەکو ترســنۆک هەڵبژاردوە. لە بارودۆخێکی دیکەشــدا ئازا و نەترســم. هیچ دیاردەیەکی دەروونی لە پەیوەندییەکەیدا بە سەربەستیمەوە

تایبەتمەند نییە. هەموو شێوازەکانی بوونم بە یەکسانی سەربەستی من بەرجەستە دەکەن. هەموویان شێوازی بوونی نەبوونییەکەی منن.

ئەم خاڵە لەنێو باسەکەمان لەسەر "هۆکارەکان و هەندەرەکان" بۆ کردن چاکتر دەردەکەوێت. ئێمە لەپێشــتر بەمجۆرە باسمانکرد؛ ئێستاش دەگەڕێمەوە سەری و زۆرتر ڕوونیدەکەمەوە. ئایا ئێمە نەمانگوت، کە سۆز هاندەری کردنە یان سۆز دەبێت بەهاندەری کردەوە سۆزدارەکان؟ ئایا ویست، وەکو بڕیاردان خۆی دەرناخات، کە بە مەبەستەوە ڕوو لە هۆکارەکان و هاندەرەکان دەکات؟ ئایا هاندەر چییە؟

بەگشتی مەبەست لە هۆکار خستنەبەرچاوی لایەنەکانە، کە کردنەکە دەچەسپێنن. ئەگەر دەوڵەت بڕیار لەسەر گۆڕینەوەی (بۆندەکان) بدات پێویستە هۆکارەکانی بۆ دیاریبکات، دەشــێ بۆ کەمکردنەوەی قەرزی دەوڵــەت و پڕکردنی زەخیرە بێت. بەهەمانشــێوە، لە ڕێگەی هۆکانەوە مێژوونوسان لەسەر کردەوەی پاشا و وەزیران دەنوســن؛ هۆکاری بۆ هەڵگیرسانی جەنگ پەیدادەکەن: دوژمن بوحرانی نێو خۆی هەیە، کاتی ئەوە هاتووە کۆتایی بە گرفتە ئابوورییەکان بهێنرێت.

ئەگەر کلۆڤیس ببێت بە بڕواکەرێکی کاســۆلیکی، ئەوەندەی پاشای باربەریش ئارین، لەبەرئەوەیە، کە کلۆڤیس لایەنی چاک و مەزنی ژیانی کەشیشی دەبینێت، کە لە (گاوڵ) دەستەڵاتی هەیە. لێرەدا دەردەکەوێت هۆکار ناسینەوەی بارودۆخەکە بێت. بە کاسۆلیککردنی کلۆڤیس بۆ باری ڕامیاری و ئایینی دەوڵەتی گاوڵ گەڕایەوە؛ دەستەڵاتی کەشیشی، خاوەنێتی زەوی و کۆمەڵەکە بوو. گۆڕینەوەی بۆندەکانیش قەرزاریی دەوڵەت بوو. ناســینەوەی بارودۆخەکان پێــش کۆتاییەکە دەکەوێت و پرۆژەکەش سنورداریدەکات. بۆ ئەوەی دەستەڵاتی کەشیش بناسرێتەوە و ببێت بە هۆکار بۆ بەکاسۆلیککردنی کلۆڤیس، پێویستە کلۆڤیس داگیرکردنی گاوڵ بکات بە کۆتایی. ئەگەر کلۆڤیس کۆتایی جیاوازتر دەستنیشان بکات، ئەوا لەنێو بارودۆخی کەنیســەدا هۆی دیکە بۆ بــوون بە ئاری دەدۆزێتەوە و بەبــێ بڕوا دەمێنێتەوە. لەوانەیە لەگەڵ ناســینی کەنیسەدا هیچ هۆیەک بۆ کردەوەکەی نەبێت. بارودۆخی بوون بە کەشیش لەلای ئاشکرا نابێت.

هاندەر، بەپێچەوانەوە، بە فاکتۆرێکی ناوەکی دادەنرێت. لە ئارەزووەکان و هەڵچون و سۆزەکان پێکهاتوە، کە هاندەرن بۆ کارەکەم. مێژوونوس کاتێک هاندەر لە باسەکەیدا بەکاردەهێنێت، کە هۆکارەکان بۆ سەرهەڵدانی بارودۆخێک نادۆزێتەوە. فێردیناند لۆت، بۆنموونە، پاش ئەوەی هۆکارەکانی بۆ بەمەسیحیکردنی (کونســتەنتاین) بە ناڕاســت و ناتەواو دانا، دەنوســێت: "پاش ئەوەی ئاشکرا بوو، کە کونستەنتاین هەموو شتێک دەدۆڕێنێت و هیچ ناباتەوە ئەگەر ببێت بە مەسیحی، یەک ئاکام خۆی دەســەپێنیت ئەویش پەنابردنە بەر هاندەرێکی کتوپڕ یان پیرۆزە، ئەگەر تۆ پێت باش بێت." لێرەدا، لۆت باســەکەی لەسەر هۆکارەکان دانامەزرێنێت و کردەوەکە

به هاندەرەوە دەبەستێتەوە. پێویستە بە نێو بارودۆخی دەروونیدا یان بارودۆخی مێشکی بکەرەکەی ناو مێژوودا بۆ باسەکە بگەڕێین. ئەمەش ڕووداوەکە بە شتێکی هەڵکەوتوو دەردەخات چونکە کەسێکی دیکە بە سۆز و ئارەزووی جیاوازەوە هەیە تاکو ئەم کارە نەکات و بەکارێکی دیکە بکات.

بەپێچەوانەی مێژوونوسەوە، دەروونناس بەدوای هاندەردا دەگەڕێت. لەوباوەڕەدایە هاندەر لەنێو ئاگامەندی کەسەکەدا هەیە و بۆ کردنەکە دەور دەبینێت. کارکردنێکی هۆشەکی نموونەیی، کەوابوو پێویستی بە هاندەرەکان نییە و ناسینەوەی بارودۆخەکە کاریتێدەکات. کارکردنێکی لە هۆش بەدەر و سۆزدار بەپێچەوانەی ئەمەوەیە.

ئەوەی دەمێنێتەوە باسیبکەین پەیوەندی نێوان هۆکارەکان و هاندەرەکانە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، کە پێکەوە هەن. بۆنموونە، من دەتوانم بچمە نێو پارتی سۆشیالیستەوە چونکە لەو باوەڕەدام ئەم پارتە بۆ دادوەری خزمەتی کۆمەڵگا کاردەکات یان لە داهاتودا دەبێت بە هێزێکی مێژوویی: ئەمانە هۆن. هەمانکات، من هاندەریشم هەیە: هەستم بەرانبەر چینە چەوساوەکانە، (گید) گوتەنی، شەمکردن لەوەی لەنێو سەنگەرە چاکەکەدام، هەستکردن بە کەمی، سەرسامکردنی کەسوکارم و هتد. ئەو دەستەواژەیە چ واتایەک دەبەخشێت، کە دەڵێم من لەبەر ئەم هۆکار و هاندەرانە چوومەتە نێو پارتی سۆشیالیستەوە؟ دیارە، ئێمە مامەڵە لەگەڵ دوو جۆر واتادا دەکەین. ئایا چۆن بەراوردیان بکەین؟ چۆن ڕۆڵی هەریەکێک لە ئەوان لەسەر بڕیاردانەکەمان بناسین؟ ئەم کێشانە چارەسەر نەکراوە و کەم کەس توانیویانە ببینن. لەژێر ناوێکی دیکەدا لە ناکۆکی نێوان ویست و سۆزەکان دەچێت . ئەگەر بیردۆزە کلاسیکەکە لە ناسینی هاریکاری نێوان هۆکارەکان و هاندەرەکان، هەروەها کاریگەرێتییان بەسەر بارودۆخێکی دیاریکراوەوە سەرکەوتوو نەبێت، کە بڕیارەکە دەهێننەکایەوە ئەوا مەحالە بتوانێت ناکۆکییەکانی نێوانیان باسبکات. کەوابوو، دەبێت لە سەرەتاوە دەستپێبکەین.

بەدڵنیاییەوە، هۆکار دەردەکییە؛ حاڵەتی ئەو شتانەیە هاوبوونن، کە خۆیان بۆ ئاگامەندی دەردەخەن. گەندەڵی کەسە ئەرستۆکراتی و سادەکانی ڕۆم لە سەردەمی کونستەنتاین یان لایەنگرتنی کەنیسە لەو پاشایانەی لە سەردەمی کلۆڤیسدا بۆ سەرکەوتن بەسەر ئارییەکاندا، دەرەکییە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم حاڵەتە تەنیا بۆ بوون-بۆ-خۆ بەرجەستە دەبێت. بوون-بۆ-خۆش ئەو بوونەیە لەبەر ئەم جیهانیش هەیە. باشتریشە بڵێین، بۆ ئەو بوون-بۆ-خۆیە بەرجەستەدەبێت، کە خۆی لەم و لەو شێوازە تایبەتیەدا دادەنێت یان بۆ ئەو بوون-بۆ-خۆیەی تاکە کەسایەتی خۆی دامەزراندوە. پێویستە بوون-بۆ-خۆ لەم و لەو شێوازەدا خۆی وەکو پرۆژە دەربخات تاکو بەئامێربوونی ئامێرەکانی بۆ دەرکەوێت. چەقۆ دەرەکییە، لە دەسک و گوێزان پێکهاتوە. دەتوانم هەڵیگرم و بۆ بڕین بەکاریبهێنم. بەڵام چەقۆ

شـــێکە بە کەمییەوە. من دەتوانم چەقۆکە هەڵگرم و دەسکەکەی بۆ مێخ داکوتان بەکاربهێنم. ئەمەش هێشـــتا دەرەکییە. کاتێک کلۆڤیش هەست بە یارمەتییەکەی کەنیســـە دەکات، لای گرنگ نییە چ کەشیشێک ئامادەیکردووە یان بڕیاری لەسەر دۆســـتایەتی نێوان کەنیسە و پاشـــایەتی داوە. ئەو فاکتۆرە دەرەکییانەی هەموو بوون-بۆ-خۆیەک دەتوانێت بیدۆزێتەوە و دایمەزرێنێت دەســـتەڵاتی کەنیسەیە، کە لە دەســـتەڵاتی دانیشـــتوانی گاوڵ گەورەترە و مەترســـی کەنیسەشە لە گومڕایی ئارییـــەکان. بۆ دامەزراندنی ئەم فاکتۆرانەش بە هۆکار لە باســـەکەدا پێویســـتە لە پێکهاتەکەیان دووربخەینەوە و ئینجا لەناویانبەرین. پێویســـتە بۆ گەیشـــتن بە لایەنێکی هێزەکی دیاریکراو تێپەڕیانبکەین: لایەنی هێزەکی و دەرەکی کەنیسە بۆ کلۆڤیس ئەوەیە، کە کەنیســـە پشتگیری ئەو پاشـــایە دەکات بووە بە مەسیحی. ئەم لایەنە هێزەکییەش ئەو کاتە دەردەکەوێت، کە بارودۆخەکە تێپەڕبکرێت و ڕوو لەوەبکرێت  هێشـــتا پەیدا نەبووە. بەکورتییەکەی، دەبێت ڕوو لە نەبوون بکرێت. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە جیهان وەڵامی کەسێک دەداتەوە پرسیار لە بارەیەوە دەکات. ئەو کەسەی پرسیاریش دەکات مەبەستی گەیشتنی بە کۆتاییەکی دیاریکراو هەیە.

کەوابوو، هۆکار، بێجگە لەوەی (کردن) سنوردار دەکات، لەنێو پڕۆژەی کردندا دەردەکەوێت. لەنێو پڕۆژەی دەســـتەڵات ســـەپاندن بەســـەر (گاوڵ)دا لە ناوچەی ســـەر بە کەنیســـەی ڕۆژئاوایی هۆکارەکە بۆ کلۆڤیس خۆی دەردەخات تاکو ببێت بە مەســـیحی. بەواتایەکی دیکە، ئەو ئاگامەندییەی هۆکارەکە لەنێو پێکهاتەکەدا دەدۆزێتەوە بونیادی خۆی هەیە؛ کۆتاییەکی بۆ خۆی دیاریکردوە و بڕیاری لەسەر پڕۆژەکانی دەدات. ئەم ڕەفتارە لە دامەزراندنی پڕۆژە و ئەگەرەکاندا کاریگەرێتییە. ئەم ڕێکخســـتنە ناوەکییەی ئاگامەندی، کە لە شێوازی خۆ-ئاگاییەکی لە تێڕامان بـــەدەر بە خۆی داوە پەیوەندی بە دۆزینەوەی هـــۆکارەکان لەنێو جیهاندا هەیە. ئێستا، ئەگەر کەسێک بڕوانێتە بابەتێک پێویستە بونیادی ناوەکی خۆی ڕێکبخات تاکـــو لە ڕێگەیەوە بتوانێت لە نێو جیهاندا هۆکارەکان بدۆزێتەوە چونکە کردن لە بەستێنی مێژوویی چەمکەکەوە فاکتۆرێکی ناهۆشەکییە. بێگومان، ئێمە دەتوانین بە هۆشـــەکی لە ســـودی بە مەســـیحیبوونی کلۆڤیس تێبگەین. بەڵام هەمانشت بۆ تێگەیشـــتن لە داگیرکردنی گاوڵ بەکارنایەت. شـــتێت نییـــە حاڵەتی خۆیمان بۆ باســـبکات. ئایا دەتوانین لەســـەر تەماعی کلۆڤیس واتاکەی ڕاڤەبکەین؟ ئەی تەمـــاع، ئەگەر مەبەســـتی داگیرکردنەکە نەبێت، چییە؟ چـــۆن تەماعی کلۆڤیس و پـــڕۆژەی داگیرکردنی گاوڵ لەیەکدی جیادەکرێنەوە؟ کەوابوو، بێســـودە ئەگەر بنەڕەتی پڕۆژەی داگیرکردنەکە، وەکو ئارەزوویەکی پەیدابوو لە ڕێگەی هاندەرێکی لەپێشـــترەوە، کە تەماعە تێبگەین. ئەوەش دروســـتە، کە تەماع هاندەرە چونکە

ناوەکییە. بەڵام لەوێدا، کە لە پڕۆژەی داگیرکردنەکە جیا نابێتەوە، ئێمە دەڵێین، یەکەم پڕۆژەی نێو ئەگەرەکان لەبەر ڕۆشـــنایی دۆزینەوەی هۆکەرەکەی کلۆڤیس بــۆ بوون بە مەســـیحی، بەتەواوی دەبێت بە هاندەر. پاش ئـــەم ڕوونکردنەوەیە، ئێمە پەیوەندییەکانی نێوان ســـێ چەمک ڕووندەکەینەوە: هۆکارەکان، هاندەرەکان و کۆتاییـــەکان. هەروەها مامەڵە لەگەڵ حاڵەتێکی دیاریکراوی بوون-لەنێو-جیهاندا دەکەین: بەوجۆرەی ســـەرهەڵدانی بوون-بۆ-خۆ جیهان پەیدادەکات، لێرەدا بوون-بۆ-خۆ تاکو پڕۆژە بەرەو کۆتایی بێت، بونیادێکی دەرەکی بۆ جیهان دامەزرێنێت، ئەوا هۆکار لەبەر ڕۆشـــنایی کۆتاییدا دەناسین. بوون-بۆ-خۆ، کەوابوو، ئاگاییە لەم هۆکارە. بەڵام ئەم تێڕمانەی ئاگامەندی بەرابنەر هۆکار لە بنەڕەتدا بیردۆزەییانە و پڕۆژەیەک بەرەو کۆتایی نییە. لەم حاڵەتەدا، دەبێت بە هاندەر؛ ڕاســـتەوخۆ بەبێ پڕۆژە لەنێو ئاگامەندییدایە و کەم یان زۆر هەرکاتێک ئاگامەندی هۆکارەکان لەنێو جیهاندا ڕێکبخات، خۆی بە کۆتاییەوە دەبەستێتەوە.

بەوجـــۆرەی ئاگامەنـــدی تێڕامانانە و ئاگامەندی لە تێڕامان بەدەر لە ئاســـتی بابەتێکدا پەیوەندییەکـــی ئۆنتۆلۆجییان هەیە، هۆکار و هاندەریش پەیوەندیدارن. بەوجۆەی ئاگایی لە بابەتێک ئاگاییشـــە لە خۆ، هاندەریش ناســـینەوەی هۆکارە ئەگەر ناسینەوەکە خۆ-ئاگایی بێت. بەڵام، ئاشکراشە، کە هۆکار، هاندەر و کۆتایی سێ چەمکی پێکەوە گرێدراون و ســـەر بە تەوژمی سەربەستانەی ئاگامەندییەکی زینـــدوون، کە بوونی خۆی بەرەو ئەگەرەکانی بە پرۆژە دادەنێت و بە ئەگەرەکانی پێناسدەکرێت.

چـــۆن هاندەر بـــۆ دەروونناس دەبێت بـــە ناوەڕۆکێکی کاریگـــەری فاکتۆری ئاگامەنـــدی لە کاتێکدا ئەم ناوەڕۆکـــە فاکتۆرێکی دیکەی ئاگامەندی یان بڕیاردان ســـنووردەکات؟ ئەمە لەبەر ئەوەیە، کە هانـــدەر، بێجگە لە ئاگامەندییەکی لە تێڕامان بەدەر چی دیکە نییە، بەهەمان ئاگامەندییەوە دەخلیسکێتە نێو ڕابڕدووەوە. هەرکاتێک ئاگامەندی بوو بە ڕابردوو، منیش دەبم بەوەی لە شـــێوازی ئەوبوونەدا هەم، کە هەبووم. کاتێک بۆ ئاگامەندی دوێنێم دەگەڕێمەوە، مەبەست و واتاکەی، وەکو شـــتێکی ناوەکی دەردەکەون. بەوجۆرەی بینیمـــان، ناگۆڕێن و لە دەرەوەدا وەکو شـــتێک دانراون چونکـــە ڕابردوو بوونە-لەنێو-خـــۆدا. هاندەر دەبێت بەوەی ئاگامەندی پێوەیە و بۆ منیش دەبێت بە "زانینی هەستەکی"؛ لەپێشتر بینیمان.

لە "زانینی کردەکیدا" ڕابردوو دەبێت بە دێوەزمەی ڕانەبردوو. هەروەها، دەشێ من ئاوەڕ بۆ دواوە بدەمەوە، جارێکی دیکە بیهێنمە سەرەوە و بۆ زانینەکەی ئەمڕۆ سودی لێوەرگرم. لێرەدا دەبێت بە بابەتی ئاگامەندی؛ لەم ئاگامەندییەدا من بە ئاگام. دەردەکەوێت بە شێوەی بیرەوەرییەکانم، بەرزن و ڕاستەوخۆش من خاوەنیانم. لە ژیانی ڕۆژانەماندا، ئێمە ئەو هاندەرانە گەماڕۆیان داوین، کە بە کاریان ناهێنین. ئێمە

تەنیا بڕیار لەسەر کردنی ئەم یان ئەو پڕۆژەیە نادەین. دەبێت ئەو کارانەش بکەین دوێنێ بڕیارمان لەســەردان یان ئەو پڕۆژانەی ئێستا بەدەستمانەوەیە تەواوبکەین. بەگشــتی، ئاگامەندی هەموو کاتێک مامەڵە لەگەڵ زانینێکی کردەکی هاندەرەکان و تەنانەت تێڕامانی بیردۆزەییانەی هۆکارەکان دەکات. ئاشکراشــە ناســینەوەی هانــدەر ئاماژە بۆ هۆکار دەکات. بەڵام هانــدەر ناوەکی و هۆکار دەرەکییە؛ وەکو دووانە دەبینرێن بەبێ ئەوەی جیاوازییەکــی ئۆنتۆلۆجی لەنێوانیاندا دیاریبکرێت. ئێمە بینیمان، ڕابردوومان لەنێو جیهاندا ونبوو. لەبەر ئەمەشە لە ئاستێکدا ڕیزیان دەکەین و بەو جۆرەی باســی هاندەر و هۆکارەکانی کردنێک دەکەین، وا نیشــانی دەدەین ناکۆکن یان هەردووکیان لە بڕیاردانێکدا ڕێژەیەکی دیاریکراویان هەیە.

لەگەڵ ئەمەشــدا، ئەگەر هاندەر بەرز بێت، هەبوویەکی لەچارەبەدەر بێت، کە بوونی ئێمەیە لە شــێوازی (هەبوو)دا، ئەگەر وەکــو ڕابردوومان نەبوون لە ئێمەی جیاکردبێتەوە، ئەوا ئەو کاتە دەتوانێت کاریگەر بێت، کە جارێکی دیکە بدۆزرێتەوە. لەنێــو خۆیدا و بە تەنیا هیــچ هێزێکی نییە. کەوابوو، لەگەڵ ســەرهەڵدانی خۆ خەریکردنی ئاگامەندییدا بەها بۆ هاندەرەکان و هۆکارە لە پێشــترەکان دادەنرێت. چۆنییەتی ئەوان بە ئاگامەندییەوە نەبەستراوە، بەڵام ئاگامەندی دەبێ ڕایانبگرێت و لەنێــو ڕابردوودا بیانهێڵێتەوە. من حەزم لەو یان ئەو شــتە بوو؛ ئەوەی لێرەدا ماوەتەوە هەرچەندە ناوەڕۆکم پێکدەهێنێت شــتێکی لە چارەبەدەرە. ناوەڕۆکیشم ئەو چییەتییەیە، کە منم. بەڵام واتاکەی لەلای من، کە بەو ئارەزووەوە، ترسەوە، بارودۆخــە دەرەکییــەی نێو جیهانــەوە و پرۆژەکانی ئەمڕۆم بــەرەو داهاتووەوە بەستراوە، پێویستە خۆم بڕیاری لەسەر بدەم. من ئەوان بە کردەوەی پرۆژەدانانم ڕووەو کۆتاییەکانم سنووردار دەکەم.

دۆزینەوەی هاندەرەکانی پێشو، ڕەتدانەوەیان یان تێگەیشتنێکی جیاواز بۆیان لەو پرۆژانە جیانابێتەوە، کە ڕوو لە کۆتایی نوێ دەکەن و لەبەر ڕۆشناییاندا بوونی خۆم وەکو ناســینی هۆکار لەنێو جیهاندا دەناســم. هاندەر و هۆکارەکانی ڕابردوو و ڕانەبردوو لەگەڵ کۆتاییە نوێکاندا لەنێو یەکێتییەکدا، کە سەربەســتییە لەو دیو هەموویانەوە، دادەنرێن.

لەئاکامدا، مەبەســتێکی خۆبەخشــانە خۆ هەڵخەڵەتاندنە. چۆن بتوانم پێش هەموو مەبەســتێک و لە ڕێگــەی هەڵبژاردنەکەی خۆمەوە هــۆکار و هاندەرەکان هەڵسەنگێنم؟ خۆ هەڵخەڵەتاندنەکە لەوێدا ڕوودەدات، کە ئێمە هۆکار و هاندەرەکان بۆ هەموو ئەو شــتە بەرزانە دادەنێین، کە لەسەر دەســتمان ڕامانگرتوون، وەکو پێوان و کەچی پێوانەکەشی خەسڵەتێکی هەمیشەیی ئەوانە. لەلایەکی دیکەشەوە بــە ناوەڕۆکی ئاگامەندی دایاندەنێین، کە ئەمەش لە خۆیدا ناکۆکە. لەڕاســتیدا، هۆکار و هاندەرەکان لەوێدا دەپێورێن و گرانن ئەگەر لە پرۆژەی مندا بن، بۆنموونە

بەرهەمێکی سەربەســـت و ڕوو لە کۆتایی بـــن و کردەوەکەش زانراو بێت. کاتێک کارێک بە مەبەســـتەوە دەکـــەم "پارچەکان دەکەونە خـــوارێ". [٦٧] ئەگەر بگەمە ئاستی کارکردنێک بەئەنقەست لەبەر ئەوەیە، کە بۆ ناسینی هاندەرەکانم بەشێکە لە پرۆژە بنەڕەتییەکەم. لەڕێگەی ئەم کارەوە (نەک لەنێو فۆرمەکانی دیکەی، وەکو ســـۆز بۆنموونە، یان کردن، کە ڕێکخستنی هۆکارەکان و کۆتاییەکان بەو جۆرەی زمـــان ئاگاداری بیرۆکەکانم دەکات، پێکدەهێنێت.) کەوابوو، هەڵبژاردن لە کارێکی پڕ و مەبەســـتدا هەیە و پرۆژەیەکیشـــە خۆمی تێدا دەناســـم. هەڵبژاردن لە کارە مەبەستدارەکەشـــدا هۆکار-هاندەرە و کۆتایی لەنێو خۆیدا سەربەســـتانە و کتوپڕ کۆدەکاتەوە. کاتێکیش ویســـت خۆی فەرز دەکات بڕیاردان دروستدەبێت و بێجگە لە بەهای بانگەشەکردنیش چی دیکە بەخۆوە ناگرێت.

کاری سەربەســـت و بە زۆر ســـەپێنراو لەیەکدییەوە جیـــاوازن. لە دووەمیاندا ئاگامەنـــدی دەڕوانێتە هۆکارەکانی پرۆژەکە. هەروەها، هاندەرەکەشـــی نابێت بە بابەت بۆ خۆی و ئاگامەندی تیایدا دەبێت بە خۆ-ئاگاییەکی ســـادەی بێ تێڕامان. بونیادی کاری سەبەســـت پێویســـتی بـــە تێڕامانیئاگامەندی هەیـــە. هۆکار، کە ئاگامەندی بە نێوانێکی تێڕامانەکەی دەبینێت، جیایە. ئێمە گوتە بە ناوبانگەکەی هوســـرڵ بۆ ئەمە بەکاردەهێنێن و دەڵێن، تێڕامانی سەربەست و سادە لە بونیادی تێڕامانەکەیـــدا هـــۆکار بە هەڵواســـراوی دادەنێت و دەیخاتە نێـــو دوو کەوانەوە. کەوابوو، دەتوانێت مەبەســـتەکە بناســـێت چونکە بەڕەتدانەوە تێڕامانی ئاگامەند لە ئاگامەندی تێڕامان-لەســـەر یان هاندەر جیادەبێتەوە. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ دانانـــی هۆکار لەنێو دووکەوانەدا. بەهەرحاڵ، دەزانین، هەرچەندە تێڕامان میانەی نێـــوان بوون-بۆ-خۆ لەگـــەڵ خۆیدا فراوانتر دەکات، بەڵام هێشـــتا ئەمە بۆ خۆی بە ئامانج نـــاکات. ئامانجی تێڕامان دۆزینەوەی بابەتـــی تێڕامانەکە و پێکهێنانی هەمووە "لەنێوخۆ-بۆ-خۆ" نەناسراوەکەدایە، کە بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ سەرهەڵدانیدا بەهای بۆ دادەمەزرێنێت. ئەگەر ویست لە ناوەڕۆکدا تێڕامانانە بێت، ئامانجەکەشی بڕیاردان لەسەر دەستنیشانکردنی کۆتاییە ناسراوەکە نابێت. مەبەستی ویست زیاتر پەیوەنـــدی دەبێت بەو میتۆدەوە بۆ گەیشـــتن بە کۆتاییەکە دەیخەینەگەر. بوون-بۆ-خۆ لە شێوازی بوونە سەربەســـتەکەیدا دەیەوێت بە بڕیاردان و لەنێو (کردن) ەکەدا خۆی بدۆزێتەوە. ئامانجی ویست ئەوەیە ببێت بە "لەنێو-خۆیەکی بۆ-خۆ" و پرۆژەیەک ڕووەو کۆتایی.

---

٦٧ ئەمە ناوی سیناریۆیەکە سارتەر لە ساڵی ١٩٤٧دا بڵاویکردۆتەوە. هەر لەو ساڵەشدا (ژان دیلانۆ) ی دەرهێنەری سینەمایی کردوویەتی بە فلیم و لە فێستیڤاڵی سینەمایی کان نیشان دراوە. ناوی سیناریۆکە لە گوتەیەکی فەرەنسییەوە وەرگیراوە، کەواتای (گرەوەکە کراوە)دەبەخشێت. (وەرگێڕ)

ئەمەش، ئاشکرایە، کە ئامانجی تێڕامانە و واتای ڕازیبوونە، کە بەو دەستەواژەیەوە، "ئەوەم کرد، کە خۆم حەزم لێبوو" گرێداروە. ئاشکراشە دوولایەنی تێڕامان لەسەر پرۆژە ڕادەوەستێت. پرۆژەیەک، کە لەبەر ئەوەی زاراوەیەکی دیکەمان لەبەردەستدا نەبوو بەشی سێیەمی کەرتی دووەمی ئەم نوسراوە بە هاندەر ناوزەدمانکرد. ئێستا، پاش پێناسەکردنی هۆکار و هاندەر ئەم پرۆژەیەی خاوەنی تێڕامانە بە 'مەبەست' دادەنێین. بەو ڕادەیەی ویســت حاڵەتێکی تێڕامانە ئەوا پێویستی بە مەبەست بۆ بنەڕەتی هەیە.

باسکردنی خۆیەکی هەندەکی لە ناسینەوەی پرۆژەیەکدا و لە شێوازی تێڕامانێکی سەربەســتدا بۆ دەروونناس بەس نییە؛ پێویستە دەروونناس مەبەستی ئەو خۆیە لە پرۆژەکەدا و لەشــێوازی ویســتدا بۆ ئێمە ڕوونبکاتـــەوە. بێجگە لەمە، دەبێت لە شــێوازی ئاگامەندیش تێبگەین، گرنگ نییە چ ناســینێکی لەگەڵ گەیشتن بە کۆتاییەکە وەدەســت هێنابێت. کەوابوو، سەربەستییەکەمان لە ویست گەورەترە. ئەمەش لەوێدا دەردەکەوێت، کە ئێمە خۆمان لە دەروونناسەکان زۆرتر بە دروست دادەنێین و دەپرســین؛ بۆچی؟ ئەوان تەنیا باســی ئاگامەندی لەشێوازی ویستدا دەکەن.

لێکۆڵینەوەیەکی کورت وەڵامی پرسیارەکەمان سەبارەت ویست بۆ ئامادە ناکات؛ بەپێچەوانەوە، باشــترە فینۆمینۆلۆجییانە بڕوانینە ویســت. بەڵام ئەمە ئامانجی ئێمە نییە. تەنیا ئەوەندە باسدەکەین، کە ویست بەرجەستەبوونێکی تایبەتمەندی سەربەستی نییە و ڕووداوێکی دەروونییە. بونیادی خۆی هەیە، کە لەسەر زەمینەی ڕووداوە دەروونییەکانی دیکە دامەزراوە و سەربەســتییە ئۆنتۆلۆجییەکە پشتگیری دەکات.

سەربەســتیش، وەکو هەموویەکی شــینەکراوە خۆی دەردەخات؛ هۆکارەکان، هاندەرەکان و کۆتاییەکان هەروەها شــێوازی ناســینییان لەنێــو یەکێتییەکدا و یەکێتییەکەش لەنێو ڕووگای سەربەســتیدا ڕێکخراون. دەبێت لەم بەستێنەشـــەوە لێیی تێبگەین. ئایا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە سەربەســتی، وەکو ئەتۆمەکانی ئەبیکۆر، لە زنجیرەیەک هەژانی نائاســایی پێکهاتوە؟ ئایا سەربەستیم دەتوانێت حەز لە هەمووشــتێک و هەرشتێک بیەوێت بکات؟ ئایا ئەو ساتەی حەز لە شتێک دەکەم پێویست دەکات لە باسکردنیدا ڕووبەڕووی لایەنی ناهۆشەکی و هەڵبژاردنە هەڵکەوتوەکەی سەربەســتی ببمەوە؟ بەو ڕادەیەی ناسینەوەی سەربەستی چەند ئاکامێکی ترســناکی لە دوایە، کە لەگەڵ ئەزموندا ناکۆک ڕادەوەستن، بیریارەکان وازیــان لە بڕواکردن بە سەربەســتی هێناوە. تەنانەت کەســێک دەتوانێت بڵێت ناچارەکی، بە مەرجێک لەگەڵ چارەنوس تێکەڵنەکرێت، زۆرتر لە بیردۆزەی ویستی سەربەست پەیوندی بە بوونی مرۆڤەوە هەیە. ناچارەکی هۆکردەوەکان دیاریدەکات.

ئەگەر تەنیا دەروونیش بێت و بەدوای بارودۆخی گەردووندا نەگەڕێت، دەریدەخات، کــە خۆمـــان دەبین بە هــۆکاری کردەوەکانمان. ئێمە ئەوەین، کــە کاردەکات و کارەکانیش بەشداری لە دروستبوونی ئێمەدا دەکەن.

با بەوردی ســـەرنجی ئاکامەکانی شــیکردنەوەکەمان بدەین. باســـمانکرد، کە سەربەستی لەگەڵ بوون-بۆ-خۆدایە؛ ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەو ڕادەیەی نەبوونە بۆ خۆی بوونێکی سەربەستی هەیە. پێویستە نەبوون بێت و چەند ڕەهەندێکیشی هەبێت: یەکەم، لەگەڵ بەکاتکردنی بونییدا، بۆنموونە، بە دوور وەســـتان لە بوونی خۆیەوە، کە ڕێگەنادات ڕابردوو بوونی سنوردار بکات و حوکم بەسەر کردەوەکانیدا بدات. دووەم، ڕاوەســـتانێکی ئاگامەندانە لە ئاستی بوونی خۆی و شتەکاندا نەک ئامادەبوون بە تەنیا لەبەردەم خۆیدا، کە ئەوە بگەیەنێت ئاگامەندی هیچ شـــتێک لەنێو ئاگامەندییدا نییە و هیچ شـــتێکی دەرەکیش نابێت بە هاندەری. دواجاریش، بەرزێتییە؛ پرۆژەیەکە، کە کۆتاییەکەی واتای پێدەبەخشێت.

ئێمە باسی هیچ شـــتێک لەخۆڕا ناکەین. بوونێکی، وەکو ئاگامەندی لە هەموو شتەکانەوە جیاوازە چونکە هەمووشتەکان پەیوەندییان لەگەڵیدا هەیە و بۆ ئەون. ئەو بوونەی بڕیار لەســـەر ڕابردووی دەدات و بە نەرێتی دادەنێت، لە بەر ڕۆشنایی داهاتوودا دەیبینێت و ڕێگە نادات ئێســـتای داگیربـــکات. ئەو بوونەی هەبووەکان دەناسێت بە جیاواز دایاندەنێت (بە هۆی ئەو کۆتاییەوە دەیانناسێت، کە هێشتا نییە و لەوسەری جیهانەوە دەیکات بە پرۆژە)، بە بوونێکی سەربەست ناوزەدیدەکەین. سەربەستییەکەی من لە هەستان و دانیشتندا، لە هاتنەژوورەوە دەرچوون یان ڕاکردن و وەســـتان لەبەردەم مەترســـییەکدا نییە ئەگەر واتای سەربەستی بەبێ یاسایی، سوپاسگوزاری یان هەڵکەوتێکی تێنەگەیشتراو دابنرێت. بەدڵنیاییەوە، هەریەکێک لـــە کردەوەکانم، تەنانەت ئـــەوەی لەنێو هەموویاندا بێبایەخە، سەربەســـتانەیە. ئەمـــەش ئـــەوە ناگەیەنێت، کە گرنگ نییـــە کردەوەکانم چی بن یـــان نادیارن. دەشـــێ کەســـێک ڕەخنەمان لێبگرێت و ئەو پرســـیارە بکات، چۆن کردەوەیەکم بارودۆخێکی نێو جیهانی نەبێت و لەبەر ڕۆشنایی ڕابردوومدا نەبینرێت، هەرشتێک بێت سوپاسگوزاری نییە؟ با لە نزیکەوە بڕوانینە ئەم کێشەیە.

بۆچوونە گشـــتییەکە جەخت لەسەر ئەو خاڵە ناکات، کە سەربەستی لەوەدایە خۆت هەڵیبژێری. هەڵبژاردن، ئەگەر شتێک بێت لەخۆی جیاوازتر، سەربەستییە. من لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەچین بۆ سەر چیا. پاش چەند کاتژمێرێک ڕۆیشتن ماندوو دەبیـــن و دواجاریش پامان دێشـــێت. یەکەمجار، گوێی نادەمـــێ و دەڕۆم. بەڵام، کتوپڕ کۆڵدەدەم و لە کەنار ڕیگاکە خۆم بە زەویدا دەدەم و درێژ دەبم. یەکێک لە هاوڕێکانم ڕەخنەم لێدەگرێت و مەبەستی ڕەخنە گرتنەکەشی ئەوە دەردەخات، کە من لە چوونە ســـەر چیا سەربەست بووم، دەمتوانی بەرگری لە ماندوو بوونەکەش

بکەم و زۆرتر بڕۆم. دەمتوانی، وەکو هاوڕێکانم نەوەستم و لەسەر چیاکە دانیشم و پشوبدەم. منیش لەوەڵامدا دەڵێم، ماندووبووم. کێ ڕاست دەکات؟ ئایا گفتوگۆکەمان لە پێگەیەکی نادروســـتەوە نەخراوەتە گەر؟ دروســـتە من دەمتوانی کارێکی دیکە بکەم، بەڵام ئەمە کێشە نییە. باشترە بەم شێوازەدا دەربیبڕین: ئایا دەمتوانی بەبێ گۆڕانکاری لە پڕۆژەکەدا، کە بوونی منە بە کارێکی دیکە هەستم؟ ئایا بەرگریکردنم بـــۆ ماندووبوونەکە لە ڕێگەی گۆڕانی ڕادیکاڵانەی بوونم-لەنێو-جیهاندا، کە ئەگەرە ڕوودەدات؟ بـــە واتایەکی دیکە؛ من دەمتوانی هەڵوێســـتێکی دیکەم هەبێت، بەڵام چەند لەسەر من دەکەوت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرســـیارانە پەنا بۆ بیردۆزە دەبەین. ئاڵۆزی ڕاستەقینەی کۆنکرێتی ڕووندەکەینەوە و باسی ئەوەش دەکەین ئەم ڕاستەقینەیە بەبێ ناکۆکی بەرانبەر ئاکامەکانی بیردۆزەکەمان چۆن دەوڵەمەند دەکات.

با لەپێشـــەوە ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەین، کـــە ماندووبوون بە خۆی کارناکاتە سەر بڕیاردانم. سەبارەت ئازاری لەشیش بینیمان ماندووبوون دەبێت بە ڕێگەیەکی بوونی لەشم. لەسەرەتاوە، بابەتێکی تێڕامان نییە و بەڵکو فاکتۆری ئاگامەندییمە. ئەگەر، لەگەشـــتەکەمدا جیهانی دەوروبەرم بناسم؛ ئەوا[جیهان] دەبێت بە بابەتی ئاگامەندیم. لێرەدا من بە بەرزێتییەوە ڕوو لەو ئەگەرانە دەکەم، کە من خاوەنیانم؛ بۆنموونە ئەگەری گەیشـــتن لە ئێوارەدا بەو شـــوێنەی دامناوە. هێشـــتا دەشت و دەرەکە، هەڵگەڕانی پێکانم بە بەرزاییەکاندا دەبنە هۆی سەرهەڵدان و شاردنەوەی تێڕوانین و ڕێگری نوێ. من، لێرەدا، ئاگامەندییەکی تێڕامانانەم بۆ لەشم نییە، کە حوکم بەســـەر پەیوەندی نێوان من و جیهاندا دەدات. مامەڵە کردنەکەشـــم لەگەڵ جیهاندا بە ماندووبوون دادەنێت. لە ڕوویەکی دەرەکی و لەم پەیوەندییەدا ڕێگاکان خۆیان بـــە بێ کۆتایی و لێژی، هەروەها خۆرەکـــەش گەرمتر دەردەخەن. بەڵام، هێشـــتا بیر لە ماندووبوونەکەم ناکەمەوە؛ بە بابەتێکی نادروســـتی بیرکردنەوەی دادەنێم.

کاتێکیش دێت بیری لێبکەمەوە و بیدۆزمەوە دەبێت ڕاڤەی ئەم بیرلێکردنەوەیە بکەین. بەهەرحاڵ، وەکو خۆی دایدەنێین. بە هیچ جۆرێک تێگەیشتنێکی تێڕامانانە لە ماندووبوون نییە. بەو جۆرەی باسی ئازاریشمان کرد، من بە دەست ماندووبوونەوە دەناڵـــم. واتە، تێڕامانی ئاگامەندی، ڕوویکردۆتـــە ماندووبوونەکەم تاکو تیایدا بژی و بەهای بداتێ. منیش پەیوەندی پراکتیکی لەگەڵدا دەبەســـتم. لەم بەســـتێنەوە ماندووبووم. منیش بۆم دەردەکەوێت بەرگەی بگرم یان نا. ماندووبوون لەخۆیدا هیچ نییە. تێڕامانی بوون-بۆ-خۆ بڕیار لەسەر بەرگەگرتنەکە و ئازارچێشتنەکەی دەدات.

لێرەدا پرســـیارێکی گرنگ ســـەرهەڵدەدات: تەندروستی من و هاوڕێکانم چاکە. هەموومـــان جۆرێک وەرزش دەکەیـــن، هەرچەنـــدە دژوارە ڕووداوە دەروونییەکان

بەراورد بکرێن. بەڵام، پاش بینیی لەشــیان، بە ئاســانی بەو ئاکامە دەگەم، کە ئەوانیش، وەکو من مانــدوون. ئایا چۆن ئەزموونی ماندووبوونی ئەوان جیاوازە؟ لەوانەیە هەندێک بڵێن من شلەشاریم و ئەوان بەهێزن. هەرچەندە ئەم هەڵسەنگاندنە پراکتیکییــە و دەبێت لە دەرچوونێکی دیکەدا بەرەو دەشــت ئاوەڕی لێبدرێتەوە. هێشــتا جێگــەی ڕەزامەندی ئێمە نییــە. زانیمان، کە تەمــاع لەوەدایە پڕۆژەی داگیرکردنی تەخت یان پایەداریت هەبێت؛ ئەوەی پڕۆژەکە هاندەدات شتێکی دراو نییە؛ خودی داگیرکردنەکەیە. شلەشــارێتیش فاکتۆرێکــی دراو نییە و ناوێکە بۆ شێوازی ماندووبوونەکەی من دانراوە. ئەگەر بمەوێت بارودۆخی ماندووبوونە بەرگە نەگیراوەکەم بناسم ئەوا نابێت بە فاکتۆرێکی دراوی دابنێم، کە خۆی دەخاتە بەردەم هەڵبژاردن. پێویستە هەڵبژاردنەکە تاقیبکەمەوە و لەو بەستێنە گەورەیە تێبگەم، کە ئەوی تێدا بەرجەســتە دەبێت. ئەگەر [ســەبارەت ماندووبوون] لە هاوڕێیەکم بپرســم، هەڵبەتە لە وەڵامدا دەڵێت، ئەویش ماندووە. بەڵام ئەو بەوجۆرەی خۆی تەسلیمی بڕوای خراپ دەکات مامەڵەش لەگەڵ ماندووبوونەکەیدا دەکات. بە ئامێرێک بــۆ دۆزینەوەی جیهانی دەرەوروبەری دایدەنێت. دەیەوێت خۆی لەگەڵ ســەختی ڕێــگا بەردەڵانییەکەدا بگونجێنێت و لێژی چیاکە بدۆزێتەوە. گەرمایی خۆرەکە لە پشــتملی و زرنگانەوەی نێو گوێچکەی پەیوەندییە ڕاســتەوخۆکەی لەگەڵ خۆیدا بــۆ دەردەخات. لە کۆتاییدا هەوڵدەدات ماندووبوونەکە ڕەتبکات. ماندووبوونەکەی دەبێت بە سۆز بۆ هەڵگەڕان بە چیاکەدا و سەرکەوتن بەسەر خودی ماندوونەکەدا. ئێمە لە بەشــی داهاتووی [ئەم نوسراوەدا] واتای هەیەتی ڕووندەکەینەوە و باسی ئەوەش دەکەین چۆن کردن دەبێت بە متیۆدی هەبوون.

کەوابوو، ماندووبوونی هاوڕێکەم لەنێو پڕۆژەیەکی فراوانتری بڕواکردن بە سروشت و سۆز تاکو بەتەواوی سەرهەڵدات، دەژی. هەمانکات هەڵوێستێکی شارەزایانە بوو بۆ داگیرکردنی. لەنێو ئەم پڕۆژەیەدا واتای ماندووبوون بۆ ئەو دەردەکەوێت. بەڵام ئەم پڕۆژەیە و واتاکەشــی هێشتا سەربەخۆ و بەس نین. پەیوەندی هاوڕێکەم بە لەشــییەوە، هەروەها بە شــتەکانی دیکەوە پێش ئەوان دەکەوێت. ئاسانە ببینین چەند شێوازی بوونی لەش هەیە. بێگومان هەندێک بوونیادی بنەڕەتی بوونی لەش بۆ بوون-بۆ-خۆ نەگۆڕن و ڕاستەقینەی مرۆڤ پێکدەهێنن. ئێمە لە بەشێکی دیکەدا باســی ئەو بۆچوونە نادروستە سەبارەت پەیوەندی بە شــوێنەوە و دامەزراندنی ڕاستی هەمەکی دەکەین. ئێستا پەیوەندییەکان بە هەزاران ڕووداوی واتابەخشەوە بۆنموونە، ڕێگەیەکی تایبەتی هەڵهاتن لە ئاستی فاکتۆردا، هەڵهاتنێک، کە خۆ لە فاکتۆر دادەبڕێت دەبینین؛ بە کورتییەکەی بە بڕواو و خۆشەویستی دەیدۆزینەوە.

پڕۆژەی دۆزینەوەکەش هەڵبژاردنی بوون-بۆ-خۆیە بۆ خودی خۆی لە ئاســتی کێشــەی بووندا. پڕۆژەیەکی ڕوخێنەرە و ڕوو لە بوون-لەنێو-خۆ دەکات. ئەمەش

بە هەزار شـــێوە لە هەڵوێستی وازهێناندا دەریدەبڕین. کاتێک واز لە ماندووبوون، گەرمایی، برســـێتی و تونێتی دەهێنرێت، کەسەکە لەسەر کورسییەکە یان جێگاکە درێژ دەبێت و دەیەوێت پشـــو بدات، یان مەســـت بێت، وەکو حاڵەتی ماسۆشـــی پێویستی بە کەسانی دیکە نییە. ئەمەش بەئاشکرا ئەو کاتە دەیبینین، کە کەسەکە بە ئامادەبوونی کەســـێکی دیکە بێزاردەبێت. ســـەرەتای پرۆژەکەیان دۆزینەوەی لەشیانە؛ کە هەوڵدانێکە بۆ چارەســـەرکردنی گرفتی ڕەهایەتی (بوون-لەنێو-خۆی بوون-بۆ-خۆ).

ئەم شـــێوازە ســـەرەتاییە لەنێو چوارچێوەی فاکتۆرگەریدا سنوردار دەکرێت؛ پرۆژەی (بە لەش دانانی خۆ) وازهێنان لە هەزاران حاڵەتی بچوکی نەوسنی و هەزاران ئارەزووی بچوک و لاوازیە. لە ڕۆمانی (پۆلیس)ی جۆیسدا، بلوم [پاڵەوانەکە] حەزی سروشـــتیی خۆی بە هەڵمژینی ئەو بۆنە تێـــردەکات، کە لە ژێرییەوە دەردەچێت. هەروەها، دەگونجێت (ئەمە بەسەر هاوڕێکەشـــمدا دەچەسپێت) لەڕێگەی لەشەوە بوون-بۆ-خۆ هەمـــووی ئەو لایەنە بێ-ئاگامەندییە بدۆزێتەوە، کە ئەو جیهانەیە لە کەڵەکەکردنی شتەکان پێکهاتووە. لەمحاڵەتەدا ئارەزووە تێهەڵکێشراوەکەی بوون-لەنێو-خـــۆ و بوون-بۆ-خۆ بە ڕواڵەت دەبێت بە یەکێتـــی نێوانیان، کە لە دواییدا دەدۆزرێتەوە.

لێرەدا، لەش ئامێری تێهەڵکێشکردنەکەیە؛ خۆی لەنێو ماندووبووندا وندەکات، بۆنموونـــە، دەیەوێت بوون-لەنێو-خۆ بە پڕی ســـەرهەڵدات. مادام بوون-بۆ-خۆ بە لەش هەیە، سۆزی لەشی دەبێت بە پرۆژە بۆ دامەزراندنی بوونی بوون-لەنێو-خۆ. پێکهێنانی ئەم هەڵوێســـتە، کە هەڵوێستی یەکێک لە هاوڕێکانم بوو، بە شاراوەیی لەڕێگەی سازشـــکردنەوە دەریدەبڕیـــن و دەڵێین ئەو دەیەوێت بەســـەر چیاکەدا هەڵگەڕێ و دارستانەکە ببڕێت چونکە شتێکن هەن. ئەو دەیەوێت بەم کارە واتایان بداتێ. کەوابوو، ئەو کەسەیە، کە ئەم شتانە بەو شێوەیەی هەن دەدۆزێتەوە.

ئێمە لە بەشـــی داهاتوودا باسی ئەم پەیوەندییەی نێوان بوون-بۆ-خۆ و جیهان دەکەین چونکە هێشـــتا خاڵە پێویســـتەکانمان وەدەست نەهێناوە. بەهەرحاڵ، لە ڕوونکردنەوەکەمانەوە ئاشکرا دەردەکەوێت، کە بەوجۆرەی هاوڕێکەم ئازاردەچێژێت، ماندووبوونەکەی-بەوشـــێوەیەی ئێمە تێیدەگەین- داوای شـــیکردنەوەیەکی گەڕاوە بەرەو دواوەمان بۆ ســـەرەتای پرۆژەکە لێدەکات. ئایا پرۆژەکەی ســـەربەخۆیە؟ بەدڵنیاییەوە، دەتوانین بە ئاســـانی ئەمخاڵەش بســـەلمێنین. لەڕاســـتیدا، لەگەڵ گەڕانەوەمـــان بۆ دواوە ئەو پەیوەندییە دەبینیـــن، کە بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ فاکتۆر و جیهاندا هەڵیدەبژێرێت. پەیوەندییەکـــەش بێجگە لە بوونی بوون-بۆ-خۆ لەنێو-جیهاندا چی دیکە نییە، بە مەرجێک بوون-لەنێو-جیهاندا هەڵبژاردن بێت و بوون-بۆ-خۆ نەبوونی بوونی خۆی بێت. ئێمە ڕاڤەی ئەمەش ناکەین چونکە ڕاڤەکردنەکە،

وەکو سەلماندنەکەی ئیکلیدس، کە پێویستی بەو ڕاستییە هەبوو لە سەلماندنەکەدا پێیبگات، دەبێت لەنێو-جیهاندا بێت.

ئەگـــەر هەمان میتۆد بـــۆ ڕاڤەکردنـــی ماندووبوونەکەم بخەمەگەر پێویســـتە لەســـەرەتاوە گومان لە لەشم بکەم، بۆنموونە، ئارەزوومەندی ئەوە بم پەیوەندییم پێوەی نەبێت و بیری لێنەکەمەوە. ئەمەش شێوازێکی گونجاوە، کە من بە لەشمەوە دەبەستێت. لێکچونێک لەنێوان ئەم گومانکردنە و بێبڕواییەدا لە ئاستی بوون-لەنێو-خۆدا پەیدادەکرێت. پرۆژەی ســـەرەتایی بۆ دۆزینەوەی بوون-لەنێو-خۆ، کە من لە نێوەندی کەسانی دیکەوە ڕەتی دەدەمەوە و بە پرۆژەکانی دیکەوە دەمبەستێتەوە، کە لەپێشتر ئاماژەمان بۆکردن. کەوابوو، ماندووبوونەکەم لەبری ئەوەی بەشێوازی جۆراوجۆر هەستی پێبکرێت، دەگیرێت. دەبێت بەو دیاردەیەی من دەمەوێت خۆمی لێ ڕزگاربکەم. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی ماندووبوونەکە لەنێو لەشم و هەڵکەوتنم لەنێو جیهاندا، کە تیایدا کەســـانی دیکە دەمبینن. مادام ئەم بوونە هەڵبژاردنە منیش بۆ پرۆژە سەرەتاییەکەم یان بوونم-لەنێو-جیهاندا گەڕاومەتەوە.

ئێمـــە نامانەوێت ئەوەش بشـــارینەوە، کە ئەم میتۆدی شـــیکردنەوەیە چەند پەسەنددەکەین. هۆکارەکەش هەمووشتێک لەنێو بوارەکەدا بە وەستاوی ڕادەگرێت. کێشـــەکە، بێگومان، لەوێدایە، کە واتا بۆ کردنەکە دانانرێت و هەروەها گەیشـــتنە بە واتـــای پرتر تاکو بە دوا واتا دەگەین. ئەم ڕەوتە ژوورکێشـــییە دیالێکتیکییە زۆر کەس بەکاریدەهێنێت؛ کەســـێک لە زانینی خۆیدا یان کەســـانی دیکەشدا بۆ ڕاڤەکردن ســـودی لێوەردەگرێت. ئەمەش (جیهانبینی)یە و ئێمە دەیناسین. بەڵام کەس بەشێوەیەکی سیســـتەماتیکی نەیخستۆتەگەر. تەنیا فێرگەیەک، وەکو ئێمە بۆچوونەکەی لەســـەر ئەم دیاردە بنەڕەتییـــە دامەزراندبێت فێرگەی فرۆیدییە. بۆ ئێمە و فرۆید کردن خۆی ســـنوردار ناکات و ئاماژە بۆ بونیادیدەکات. سایکۆلۆجی شـــیکاری دەیەوێت ئەو بونیادە بدۆزێتەوە. فرۆید، وەکو ئێمە، دەپرســـێت: لەژێر باری چ حاڵەتێکدا ئەم کەسە ئەو کارەی کردووە؟ دەیەوێت، وەکو ئێمە، کردەوەکە بە ســـاتەکانی پێشترەوە ببەســـتێتەوە، بۆنموونە، دەیەوێت ڕەهەندی ناچارەکی دەروونی ئاشکرابکات. کردن، بۆ ئەو، هێمایە و ئاماژە بۆ ئارەزوو دەکات، کە لەبەر ڕۆشـــنایی (لبیدۆ)ی خۆکەوە ڕاڤە دەکرێت. فرۆید، بەهەرحاڵ، هەوڵی دامەزراندنی ناچارەکییەکی ســـتونی داوە. لەبەر ئەم بۆچوونەشـــی، ڕاڤەکردنەکەی ئاماژە بۆ ڕابردووی خۆی دەکات.

بـــۆ فرۆید چالاکی لەســـەر بناخەی کردن لە شـــێوازی هانـــدەری دەروونییدا دادەمەزرێت. بەڵام چالاکی لە بنەڕەتدا و لە هەمووماندا تەختەیەکی ڕەشـــی هیچ لەســـەر نوســـراوە. بۆ فرۆید، بارودۆخە دەرونییەکان و مێژووی خۆ بڕیار لەسەر هاندەرەکـــە بۆ بابەتێک دەدات. حاڵەتی خێزانـــی منداڵەکەیە گرێی ئۆدیبی تێدا

دروستدەکات؛ ئەگینا لە کۆمەڵگایەکی دیکەدا، کە خێزان شێوازێکی دیکەی هەیە (بۆنموونە لەنێو کۆمەڵگای ســـەرەتایی دوورگەکانی کوراڵ لە ئۆقیانوسی ئارام)، ئەم جۆرە گرێیە دروست نابێت، هەروەها بارودۆخە دەرەکییەکان بڕیاردەدەن ئەو تاکە لە تەمەنی هەرزەکارییدا واز لە گرێکە بهێنێت یان ژیانی سێکسی داگیربکات. لە ئاکامدا، لەم ناوەندەی مێژووەوە بیرۆکەی ناچارەکی ســـتونی فرۆید لە ئاسۆی ناچارەکییدا دەخولێتەوە.

ســـایکۆلۆجی شـــیکاری ڕەهەندی داهاتووی نییە و بە ڕابردووەوە بەستراوە. مرۆڤ، تیایدا، ڕەهەندێکی کاتی وندەکات.

بۆ ڕاڤەکردنی بوونی بەردەوام بۆ لە ئێستادا بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. بونیادە بنەڕەتییەکانی خۆ، کە کردەوەکانی ئاماژەی بۆ دەکەن، تەنیا بۆ گەواهێکی دەرەکی یان ئەوەی لەســـەری دەکۆڵێتەوە گرنگـــە و واتاکەی دەردەکەوێت. هیچ واتایەکی پێش تێگەیشتنی ئۆنتۆلۆجییانە سەرهەڵنادات. لەجێگەی هەمووشتێک کردەوەکانی دەبن بە ئاکامی ئەو ڕووداوانەی نێو ڕابردوو، کە تاک دەســـتی پێیانناگات. ئێمە میتۆدی سایکۆلۆجی شیکاری تەنیا، وەکو هاندەرێک بۆ مەبەستی توێژینەوەکەمان ســـودی لێوەردەگرین. پێویســـتە هەوڵبدەین واتاکانی کردەوەیەک جیابکەینەوە؛ لەو پرۆســـەیەوە دەســـتپێبکەین، کە هەموو کردەوەیـــەک، ئەگەر گرنگیش نەبن، هۆکردێکی ســـادەی حاڵەتێکی دەروونی لەپێشتر نەبێت. لەسەر هێڵێکی باریک و ڕاســـتی ناچارەکییدا بەڕێ نەکەوێت. بەڵکو بونیادی دووەمی ســـەر بە بونیادێکی بەرفراوانی گەورەترە و دواجاریش سەربەو هەمووەیە، کە بوونی منە. ئەگەر ئەمە نادروســـت بێت، ئەوا دەبێت بوونم، وەکو تەوژمێکی ئاسۆیی دیاردەیەک دابنێم، کـــە هەریەکێک لـــە ڕووداوەکان تیایدا بە حاڵەتێکی دەرەکییەوە بەســـتراوە یان جەوهەرێک پشتیوانی دەکات. هەردوو ئەم چەمکانە سەرمان لێدەشێوێنن و بوون-بۆ-خۆ بە بوون-لەنێو-خۆ دادەنین.

ئەگەر شـــوێن میتۆدی ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بکەوین، کە ئەمە بەدرێژی لە بەشی داهاتوودا باســـدەکەین، پێویستە وەری چەرخێنین. ئێمە هەموو کردەوەیە بـــە دیاردەیەکی زانـــراو دادەنێین. بەپێچەوانەی فرۆیدیشـــەوە، بـــە ڕێکەوتێکی ناچارەکییەوە گرێی نادەین. لەجێگەی تێگەیشـــتنی لەسەر زەمینەی ڕابردوو ئەو ڕووداوە لەنێو داهاتووەوە بۆ ئێستا دەهێنین. هەست بە ماندووبوونم نەبەستراوە بە سەختی و لێژی بەرزاییەکەی پیایدا هەڵدەگەڕێم یان نەخەوتنی دوێنێ شەوم؛ ئەم فاکتۆرانە بەشداری لەسەرهەڵدانی ماندووبوونەکەمدا دەکەن، بەڵام نەک بەوجۆرەی من ماندووم. هەروەها، بۆچوونی شـــاگردەکانی ئەدلەریش ڕەتدەدەینەوە، کە باس لە گرێی هەســـتکردن بە کەمی دەکەن و ئەم گرێیە بە شتێکی لەپێشتر دادەنێن. هەڵبەتە هەندێک لایەنی دەروونی لە ســـەرهەڵدانی ماندووبوونەکەدا پەیوەندییان

بەم گرێیەوە هەیە و نکۆڵییان لێناکەین. بەڵام گرێی هەستکردن بە کەمی پرۆژەی بوون-بۆ-خۆیە لەنێو جیهاندا و لەگەڵ ئامادەبوونی کەســـانی دیکەدا. بەمشێوەیە، هەمیشـــە بەرزێتییە و شـــێوازێکی هەڵبژاردنی بوونی خۆمە. ئەم هەستکردن بە کەمییەی زۆرانی لەگەڵدا دەگرم و هەمانکات هەســـتیپێدەکەم، من هەڵمبژاردووە. ناسینەوەی سەرنەکەوتنی هەڵوێســـتی خۆمە. هەستکردن و خۆ تەسلیمکردن بە ماندوبوون، بۆنموونە، ڕەتکردنی ڕێگاکەیە، وەکو "ڕێگایەک برینی ســـەخت بێت."

دژوارە بەبـــێ دیاریکردنی ئەگەرەکانی داهاتوو هەســـت بەکەمی بکەین. تەنانەت مەحاڵە بەبێ داهاتوو لە واتای دەستەواژەکانی، وەکو"من ناشرینم" و "من گەمژەم" تێبگەین، کە پێشـــبینیکردنن. ئێمە، لێرەدا، مامەڵە لەگەڵ ناشـــرینییەکی ڕووتی دامەزراودا ناکەین، بەڵکو پەیوەندی بە تێگەیشـــتنی بـــەو لایەنە نەیارەوە هەیە، کـــە ژنان یان کۆمەڵ بەرانبەر پرۆژەکانم دەریدەبڕن. ئەمەش لەڕێگەی دۆزینەوەی پرۆژەکانمـــەوە دەناســـرێت. کەوابوو، گرێی هەســـتکردن بە کەمـــی پرۆژەیەکی سەربەســـت و جیهانی بوونی کەمیی منە لەبەردەم کەسانی دیکەدا. ئەو ڕێگەیەیە من خۆمی تێدا بۆ کەسانی دیکە دەردەخەم. پێویستە لە ڕەتدانەوەکانم بۆ گرێکە و سەرنەکەوتنی هەڵوێستەکەشم سەربەستانە، وەکو هەڵبژاردنی بوونی خۆم لەنێو جیهاندا تێبگەم.

بۆ سایکۆلۆجی شیکاری هەموو ڕەتدانەوەیەکی مرۆڤانە تێگەیشتنی لەپێشتری هەیە. ئێمەش ئەم تێگەیشـــتنەیان بۆ ڕاســـتدەکەینەوە. هەموو پرۆژەیەک، وەکو پرۆژە دەبێت بناسرێت و ڕوو لە ئەگەرێک بکات. مادام ناوەڕۆکی هەیە ڕاستەوخۆ تێدەگەین، کە پرۆژەیە. من کیســـەی خەوەکـــە لە کەناری ڕێگاکە ڕادەخەم، تاکو پشوبدەم. ئەمەش ئەگەر و کۆتایی پرۆژەیەکمان بۆ دیاریدەکات، کە من ئامانجمە. دوای ئەمـــە، تێدەگەم ئەگەرەکە ئاماژە بۆ چەند ئەگەرێکی دیکەش دەکات، تاکو هەموویـــان دەبن بەو بوونەی، کە منە. تێگەیشـــتنەکە دوو کاریتێکردنی جیاوازی هەیە: لەڕیگەی وەرچەرخانی سایکۆلۆجی شیکارییدا لە کردەوەکەوە بەرەوژوور بۆ دوائەگەر سەرکەوین؛ بە تێهەڵکێشکردنێکی بەرەوپێشەوەچوونیش لە دوائەگەرەکەوە بەرەو خوار بۆ کردەوەکە دەڕۆین و هەمووی فۆرمەکە دەناسین.

ئەم فۆرمەی ناوی دوائەگەرمان بۆ دانا بەتەنیا یەکێک لە ئەگەرەکان نییە، کە هایدیگەر بە ئەگەری مردن دایدەنێت یان ئەو ئەگەرە نییە "هەســـت بەبوون لەنێو جیهانـــدا نەکرێت." هەریەکێک لە ئەگەرەکان لەنێـــو ئەگەرە کەڵەکەکراوەکاندایە. گرنگـــە دوائەگەر بە یەکێتییەکی تێهەڵکێشـــراوی هەموو ئەگـــەرە پەیدابووەکان دابنرێـــت. هەریەکێـــک لەئەوان خزێنراوەتـــە نێو ئەم یەکێتییـــەوە و چاوەڕوانی بارودۆخێک دەکات تاکو دەری بهێنێت. بێگومان لە بەشی دووەمی[ئەم نوسراوەدا] ڕوونمانکردەوە، کە هەستکردن بە هەربابەتێک لەنێو بەستێنی جیهاندا ڕوودەدات.

مەبەست لەم خاڵەش ئەوەیە، کە ئەوەی دەروونناسەکان بە هەستکردنی دادەنێن تەنیا ئـــەو بابەتانە ناگرێتەوە، کە دەبینرێن یان دەناســـرێن، بەڵکو ئەوانەن لەو ڕوانگەیەوە تەماشایان دەکرێت و ئاماژە بۆ هەموو بوونی لەنێو-خۆ دەکەن. ڕاست نییە بڵێین من پلەبەپلە هەســـت بە مێزەکەی نێو ژوورەکە دەکەم. دوایی بۆ نێو ڕاڕەوەکە دەڕۆم، دەچمە سەر پلیکانەکان و بۆ سەر شەقامەکە دەڕۆم تاکو هەموو جیهانــم بۆ دەرکەوێت. بەپێچەوانەوە، من هەســـت بە هیچ شـــتێک ناکەم ئەگەر لەپێش هەستکردنەکەمدا لەنێو جیهاندا نەبم.

تاکو شـــتەکان هەبن و مرۆڤیش بـــەردەوام مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، ئەوا لەو هەمووە پێکەوەبەســـتراوەوە خۆی بـــە بونیادێکی هەندەکییـــەوە گرێدەدات، کە پەیوەنییەکـــە لەگەڵ هەمووەکەدا دروســـتدەکات. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە، بوونی جیهان لەبەر ســـەرهەڵدانی ئێمەیە لەنێو جیهاندا و لەنێو ئەو هەمووەدا. ئێمە لەو بەشـــەدا، کە باســـی بەرزێتیمانکرد ڕوونمانکردەوە، کە بوون-لەنێو-خۆ ناتوانێت یەکێتی بوونی دامەزرێنێت. سەرهەڵدانەکەشـــمان ســـۆزێکە، کـــە بۆ پەیداکردنی جیهان دەبێتە هـــۆکاری لەناوچوونی خۆمان. یەکەم دیاردەی بوون لەنێو جیهاندا پەیوەندییـــە لەنێوان هەموویەکی پێکهاتـــووی بوون-لەنێو-خۆ یان جیهان لەگەڵ هەموویەکی لەناوچووی بوونی من؛ بوونی خۆم، وەکو هەموو لەنێو هەمووی جیهاندا هەڵدەبژێرم. بەوشـــێوەیەی لە جیهانەوە بەرەو (ئەو) شتە دەڕۆم بەهەمانشێوەش لە هەمووە هەڵوەشاوەکەی بوونمەوە دەچمە سەر یەکێک لە ئەگەرەکانم چونکە لە بەستێنی جیهانەوە و پرۆژەیەکی دیاریکراومەوە دەتوانم (ئەو) شتە بناسم. هەروەها، لە بەستێنی دوا هەموویەکی پێکهاتووی ئەگەرەکانم دەتوانم لە پرۆژە دانانەکانمدا خۆم بگەیەنمە ئەو دیو (ئەو) شتە. دوائەگەری بوونم، وەکو پێکهاتەیەکی بنەڕەتی هەمـــوو ئەگەرەکانی دیکەم و هەمووی جیهانیشـــە، کە لەگـــەڵ بوونی مندا پەیدا دەبێت. دوو چەمکی پێکەوە بەستراون. من لە بەستێنی جیهانەوە هەست بە بوونی چەکوشەکە دەکەم؛ بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، بەکارهێنانی چەکۆشەکە لەنێو زەمینەی هەمووە پێکهاتووەکەی بوونی مندایە.

کەوابوو، کردەوەی بنەڕەتی سەربەستی دۆزراوەتەوە؛ ئەمەش واتا بە کردنێکی هەندەکی دەبەخشـــێت، کە من پێی هەڵدەستم و بەردەوامبوونی کردنەکانیش لە بوونـــی من جیانابێتـــەوە؛ هەڵبژاردنی منە لەنێو جیهاندا و هـــاوکات دۆزینەوەی جیهانە. ئەمەش لەو کەندەڵانە مەترسیدارەی ئەودیو ئاگامەندی ڕزگارمان دەکات، کە زانایانی سایکۆلۆجی شیکاری بۆیدەچن. ئەگەر ئەوەی لەنێو ئاگامەندییدا هەیە تەنیا ئاگامەندیبوون بێـــت، هەندێک ناڕەزایی دەردەبڕن و دەڵێن، ئەو هەڵبژاردنە بنەڕەتییە پێویستە ئاگامەندانە بێت. دەپرسن، ئایا ئەمە لە ماندووبوونیشدا هەیە، لە کاتێکـــدا تۆ ئاگاداری هەموو لایەنەکانی ئـــەم فاکتۆرەیت؟ ئێمەش لە وەڵامدا

دەڵێیــن، بەتەواوی ئاگامــان لێیانە. ئەوەی ئاگامەندی ســنورداردەکات بونیادی خۆیەتی بەگشتی و ئەو هەڵبژاردنەیە بڕیاری لەسەردەدەین.

لــە حاڵەتی دووەمدا، جەخت لەســەر ئــەو خاڵە دەکەین، کە پرســیارەکە ســەربەهەڵبژاردنێکی پڕ مەبەســت نییە. هۆکاری ئەمەش بۆ کەمی و شاراوەیی ئاگامەنــدی ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو بناخەی هەموو مەبەســتەکانە. مەبەســتیش لەبەر ڕۆشــنایی هەڵبژاردن پێویســتە ڕاڤە بکرێت. پێویســتە دژی ئەو بۆچوونە ڕاوەستین، کە سەربەستی لە بەردەم هۆکارەکان و هاندەرەکان دادەنێت و لەوێووە بڕیارەکەوە دەدرێت. کێشەکە بەتەواوی دژی ئەمە ڕادەوەستێت. کاتێک هۆکارەکان و هاندەرەکان دادەنرێن کۆتاییەکەش دەبینرێت و هەڵبژاردنیش شوێنی دەکەوێت. ئەمــەش ئەوە ناگەیەنێــت هەڵبژاردنەکە لەودیــو ئاگامەندییەوەیە، بەڵکو لەگەڵ ئاگامەندییدا یەک شتن. ئەم ئاگاییە، وەکو دەزانین، تێڕامانانە نییە؛ بوونی ئێمەیە و لە ئێمــەوە دوور نییە. مادام بوونی ئێمە هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکەیە، ئاگایی لە هەڵبژاردنەکە خۆ-ئاگاییە، کە ئێمەین. پێویســتە مرۆڤ لە هەڵبژاردندا بەئاگابێت و بۆ ئەوەی بەئاگاش بێت، پێویســتە هەڵبژێرێــت. ئاگامەندی و هەڵبژاردن یەک شتن. هەندێک لە دەروونناسەکان ئەم ڕاستییەیان ناسیوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ تێگەیشــتن لە هەڵبژاردن بۆ ئۆنتۆلۆجی نەگەڕاونەتەوە ئەوا هەڵبژاردنەکەیان بە کارێکی ئاگامەندی داناوە.

دەکرێت ئەم ڕەخنەیە ئاڕاســتەی برگســۆن بکرێت. ئەگەر بســەلمێنرێت، کە ئاگامەنــدی لە ناوچوونە ئەو ئاکامە دێتــە پێش، کە خۆ-ئاگایی و خۆ-هەڵبژاردن دەبــن بەیەک. ئەمــەش کێشــەیەکی دژوارەو بیریارانی ئــاکاری، وەکو گید، لە پێناسەکەیان بۆ هەستکردنێکی ڕەوان توشی بووە. گید دەپرسێت، چ جیاوازییەک لەنێوان هەســتکردن بە ویســت و هەســتکردن بە کردەوە هەیە؟ لەڕاستیدا هیچ جیاوازییەکیان نییە. "ویســتی بۆ خۆشەویســتی" و خۆشەویستیکردن یەک شتن چونکە خۆشەویســتیکردن هەڵبژاردنی بوونی خۆشەویستکەرە و لەگەڵ ئاگایی لە خۆشەویستیدایە. ئەگەر ویست سەربەست بێت، ئەوا هەڵبژاردنە.

ئێمە لەو بەشــەدا لەسەر کات بە باشی ڕوونمانکردەوە، کە پێویستە درێژە بە کۆجیتۆکەی دێکارت بدرێت. لەڕاســتیدا، خۆ-ئاگایی ئاگایی لە ساتێک نییە؛ سات لە بۆچوونێکی ئاگامەندییدایە. ئەگەر ئەویش بێت ئەو کاتەی ئاگامەندی ســاتەکە دەناســێت لە هیچی دیکە بە ئاگا نابێت. ئاگامەندی من ئاگامەندی تاکە کەسێکە مامەڵە لەگەڵ ئەم یان ئەو پڕۆژەیەدا دەکات. چاوەڕوانی ئەم یان ئەو سەرکەوتنەیە، لە ئەم یان ئەو ئاکامە دەترســێت و بە پێکهێنانی چاوڕوانییەکانی هەموو وێنەکە دەهێنێتە بەرچاوی. بێگومان، کاتێک دەنوسم هەست بە بوونی خۆم دەکەم، بەڵام هەستکردنەکە بە جوڵانی دەستمەوە، کە لەسەر کاغەزەکە دەنوسێت نەبەستراوە.

من پێش جوڵانی دەستم دەکەوم و کۆتایی و واتای پەرتووکەکەم دەناسم و چالاکییە فەلسەفییەکانی ژیانم دەبینم. لەنێو چوارچێوەی ئەم پرۆژەیەدایە (لەنێو چوارچێوەی ئـــەو بوونەی هەمە) چەند پرۆژەیەکی دیکە ڕووەو ئەگـــەرە دیاریکراوەکان، وەکو دانانی ئەم یان ئەو بیرۆکەیە و وەســـتان لە نوسین دێنەکایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەڵەیە لەو باوەڕەدابین ئاگامەندییەکی شیکاری و جیاکەرەوە بەرانبەر هەڵبژاردنی جیهانی ڕادەوەستێت. دوا پرۆژە و یەکەم پرۆژەم لایەنەکانی چارەسەرکردنی بوون دیاریدەکەن. چارەســـەرکردنەکەش شتێک نییە لەپێشدا بناسرێت و دوایی بخرێتە گەڕ؛ ئێمە خودی چارەسەرکردنەکەین. ئێمە لەگەڵ مامەڵەکردنمان [بە جیهانەوە] دەیهێنیـــە بوونەوە. لەبـــەر ئەمە لەڕێگەی ژیانمانەوە دەیناســـین. کەوابوو، ئێمە بەردەوام لەگەڵ خۆماندایین؛ بەردەوام ئامادەین و ناتوانین ئاگامەندییەکی شیکاری و جیاکەرەوەمان لە ئاســـتی بوونی خۆماندا هەبێـــت. هەروەها، ئەم ئاگامەندییە بیردۆزەییانە نییە.

لەلایەکـــی دیکـــەوە، جیهان بەوجۆرەی خـــۆی دەردەخات ئامـــاژە بۆ بوونی ئێمـــە بەو شـــێوەیە دەکات، کە ئێمەش خۆمان دەناســـین. لەڕاســـتیدا ئەمەش جێگەی سەرســـوڕمانە. ئێمە جیهان هەڵنابژێرین لەبەر ئەوەی بەســـتێنی بوونـ لەنێو-خۆیـــە، بەڵکو لەڕیگەی هەڵبژاردنی خۆمانەوە واتاکەی دەناســـین. بە هۆی ڕەتدانەوەی ناوەکییەوە، جیاکردنـــەوەی بوونمان لە بوونی جیهانەوە، جیهان بەو جۆرە نیشـــاندەدەین، کە هەیە. ڕەتدانەوەی ناوەکیش تەنیا لەنێو بەپرۆژەکردنی ئەگەرەکاندا دێتەکایەوە. ئەو ڕێگەیەیە من تیایدا باوەڕ بە خۆم دەکەم و خۆم دەدەم بە لەشم، کە لەشم و جیهانی لەژیان بەدەریش بە بەهاکانیانەوە بەرجەستە دەکات. من لێـــرەدا ئاگاییەکی تەواوم لە بوونی خۆم و دانانـــی پرۆژەکەمە. لەمحاڵەتەدا ئاگامەندی تێڕامانانەیە. ئەوەی دەیناســـم دەبێت بە وێنەیەکی بەرزی ئەو منەی، کە هەم. بەها، ڕۆڵی ئامێریی، دووری و نزیکی شـــتەکان وێنەکەی من دەکێشـــن، کـــە هەڵبژاردنی منە. جلوبەرگەکەم (جلی ســـەرکار، قات یان کراســـێکی درێژ)، بایەخی پێبدرێـــت یان نا، کەلوپەلی نێو ژوورەکەم، ئـــەو کۆڵانەی تیایدا دەژیم، شـــارەکەم، پەرتووکەکانی چواردەورم، ئەو شـــتانەی بۆ خۆشی بەکاریاندەهێنم، هەمـــوو ئەوانەی من هەمە، (دواجاریش ئەو جیهانەی بـــەردەوام بیریلێدەکەمەوە) سەبارەت هەڵبژاردنەکەم یان بوونم ئاگادارم دەکەن. ئەمە بونیادی ئاگامەندییەکی تێڕامانانەیـــە و دەتوانم بۆ هەســـتکردنی ناوەکی بۆ بوونـــی خۆمی بگەڕێنمەوە. ئامـــاژەش بەو بابەتانە دەدات من دروســـتیاندەکەم یـــان بەکاریاندەهێنم و بەبێ ئەوەی بزانم چۆن زۆرتر پەیکەرەکەی بوونم دادەتاشـــم. کەوابوو، ئێمە ئاگاییەکی تەواومان لە هەڵبژاردنەکەمان هەیە، کە بوونی خۆمانە. ئەگەر کەســـێکیش لەسەر ئەم خاڵانە لەگەڵماندا هاوڕا نەبوو، پێویســـتە ئاگاداری ئەوە بین، کە ئاگامان لە

هەڵبژاردنەکەمان نییـــە. بەڵام لە هەڵبژاردنی خۆماندا، ئێمە دەڵێین، ئەم ئاگاییە دوودڵی و لێپرسینەوەشی لەگەڵدایە. دوودڵی، وازهێنان و لێپرسینەوە خەسڵەتی ئاگامەندی پێکدەهێنن چونکە ئاگامەندی سەربەستە.

لەپێشتر ئەو پرسیارەمان کرد: من ئەو کاتەی ماندووبووم، بێگومان دەمتوانی هەڵوێســـتیکی جیـــاوازم هەبێت، بەڵام چەند لە ســـەرمدەکەوت؟ ئێســـتا، ئێمە دەتوانین وەڵامی پرســـیارەکە بدەینەوە. شـــیکردنەوەکەمان دەریدەخات، کە ئەم کارە سوپاســـگوزارانە نییە. بەدڵنیاییەوە، لەســـەر باســـکردنی هاندەر و هۆکار، وەکو ناوەرۆکی حاڵەتێکی لەپێشـــتری ئاگامەندی ڕاناوەســـتێت، بەڵکو دەبێت بە پڕۆژەیەکی بنەڕەتی دابنرێت. لێرەدا، ئەوەش ئاشـــکرا دەبێت، کە هەڵوێستەکەش بەبـــێ گۆڕان لە هەڵبژاردنی بوونی خۆمدا ناگۆڕێت. دەرخســـتنی ماندووبوونەکەم بە کەوتن لە کەناری ڕێگاکە دەربڕینی ئازارچێشـــتنی لەشمە و لەنێو بەستێنێکی جیهاندا دادەنرێت، کە لایەنە ســـەختەکان (ئەو لایەنانـــەی لەوە زۆرتر بەرگرییان ناکەم) ســـەرهەڵدەدەن؛ یان مادام هاندەرەکە ئاگامەندییەکی لە تێڕامان بەدەرە و پڕۆژەیەکە بەرەو کۆتاییەکی ڕەها، ئەوا ناســـینی جیهانە (وەکو گەرمە، لە شارەوە دوورە، هەوڵدان تیایدا بێســـودە و هتد)، کە دەبێت بە هۆکار بۆ وەســـتانی من. ئەگەری وەستان، لە ڕووی بیردۆزەییەوە واتا دەبەخشێت لە کاتێکدا لەنێو سیستەمی ئەگەرەکانـــدا، کە بوونی منـــن، دابنرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت من پێویســـتە ڕاوەستم بەڵکو دەتوانم بڕۆم و بوونم-لەنێو-جیهاندا بە شێوەیەکی دیکە دەربخەم؛ گۆڕان بەسەر پڕۆژەکەمدا بهێنم. بەهەرحاڵ، ئەم گۆڕانکارییە دەگونجێت.

ئـــەو دوودڵییەی، لەگەڵ ئەم ئەگـــەرەدا، سەربەســـتییەکەمان بۆ ئاگامەندی بەرجەستەدەکات گەواهی لەســـەر گۆڕانکاری لە پڕۆژە سەرەتاییەکەماندا دەدات. لـــە دوودڵییدا تەنیا ئەوە فێر نابین چۆن ئەو ئەگەرانـــەی بە پڕۆژەیان دادەنێین سەربەستییەکەمان لەناویان دەبات. لەسەرو ئەمەوە، هەڵبژاردنەکەمان دەناسین، بۆنموونـــە لە بوونی خۆمـــان بەئاگا دەبیـــن، کە پاکانەی بـــۆ ناکرێت. ئەمەش ڕێگە نادات ئێمە پەنا بۆ ڕاســـتەقینەیەکی لەپێشـــتر بۆ هەڵبژاردنەکەمان بەرین. پاکانەنەکردن تەنیا ناســـینەوەیەکی ناوەکی هەڵکەوتـــی بوونمان نییە، بەڵکو بە ناوەکیکردنی هەڵکەوتە دۆزراوەکەیە لەســـەر بوونی ئێمە. دەبینین هەڵبژاردن لە هەڵکەوتـــی بوون-لەنێو-خۆوە دەردەچێت، کە ئەو بوونە لەناودەبات و بۆ ســـەر نهۆمی ناچارەکییەکی سوپاســـگوزاری بوون-بۆ-خۆی دەگوێزێتەوە. کەوابوو، ئێمە بـــەردەوام مامەڵـــە لەگەڵ هەڵبژاردن دەکەین و لەو ڕاســـتییەش بـــە ئاگاین، کە بەردەوام هەڵبژاردنەکان دەگۆڕین چونکە لەسەر بوونی خۆمان داهاتوو دەکەین بە پڕۆژە. بەڵام، سەربەستییەکەی بوونمان بەردەوام لەگەڵ خۆناسینمان لە داهاتوودا دەخورێـــت بەبێ ئەوەی داهاتووەکـــە بگیرێت. لەناوبردنی هەڵبـــژاردن بەردەوام

هەرەشـــەمان لێدەکات و داوامان لێدەکات خۆمان هەڵبژێرین. ئەمەش، لەئاکامدا، ئێمە دەکات بە شتێکی جیاواز لەوەی، کە هەین. لەبەر ئەوەی هەڵبژاردن ڕەهایە، شتێکی ناسکیشـــە. لەگەڵ دامەزراندی سەربەستییەکەمان لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە ئـــەو ئەگەرە بەردەوامەش دەردەخەین، کە هەڵبژاردنەکە دەبێت بەوەی (لێرەدا) و (ئێســـتا) دروست بووە! لە پێناوی ئەوەی لەودیوەوە دەمەوێت بیگەمێ چۆتە نێو ڕابردووەوە.

بێجگە لەمە، با ئەوەش تێبگەین، کە هەڵبژاردن هیچ هاندەرێکمان بۆ پەیداناکات تاکو ڕوو لە هەڵبژاردنێکی دیکە بکەین و ئەو بە ڕابردوو دانبێین. لەڕاستیدا، ئەم هەڵبژاردنە بنەڕەتییەیە هەموو هۆکارەکان و هاندەرەکان بۆ کارکردن دادەهێنێت؛ جیهـــان بەگوێرەی واتـــاکان، ئامێرە ئاڵـــۆزەکان و پێکەوەبوونـــی جیاوازییەکان ئامادەدەکات.

ئەوگۆڕانە ڕەهایەی لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونمانەوە تاکو مردن هەرەشـــەمان لێـــدەکات بە نەزانـــراوی و بێ پێشـــبینیکردنی دەمێنێتەوە. ئەگەر هەڵوێســـتی دیکەش بەرانبەریان وەرگرین، هێشـــتا لە دەرەوەدا، وەکو هەڵوێســـتی کەســـانی دیکە دەیانناســـین. ئەگەر بمانەوێت هەڵوێستی خۆمانیان نیشانبدەین، خەسڵەتی خۆیان، وەکو بەرزێتییەکی-بەرزێتی نادۆڕێنین. تێگەیشـــتن لێیان هەڵبژاردنیانە. ئێمە دوایی بۆ سەر ئەم خاڵە دەگەڕێینەوە. هەڵبژاردنی بنەڕەتی لە نموونەیەکەوە بۆ نموونەیەکی دیکە خۆی دروســـت ناکات. ئەمحاڵەتە بـــۆ چەمکی نموونەکانی ئاگامەندیمان دەگەڕێنێتەوە، کە هوسرڵ نەیتوانی خۆی لێ ڕزگاربکات.

مادام، بەپێچەوانەوە، ئاگامەندی خۆی بە بوونێکی کاتی دەبینێت، پێویســـتە هەڵبژاردنی بنەڕەتی لەنێو کاتدا بدۆزینەوە و بەو بوونەی دابنێین لەگەڵ هەرســـێ ڕەهەندەکـــەی کاتدا یەکیان گرتووە. کاتێک خۆمان هەڵدەبژێرین بوونی خۆمان لە ناودەبەین؛ لە داهێنانی داهاتوودا یان ناسینمدا واتاکەی بە ڕابردوو دەدەین. بەوجۆرەی دێکارت باســـیدەکات ڕاست نییە بڵێین نەبوون ســـاتەکان لە یەک جیادەکاتەوە، ئەگینا هەڵبژاردنەکەم لە ساتی (ت)دا کار ناکاتە سەر هەڵبژاردنەکەم لەو ساتەدا. هەڵبژاردن کارتێکردنە لەســـەر پەیداکردن و مامەڵەکـــردن لەگەڵ بەردەوامبوونی حاڵەتـــە کۆنکرێتییە بڕاوەکان، کە من لە ئەگەرە بنەڕەتییەکان جیادەکاتەوە. لەم ڕووەوە، سەربەستی، هەڵبژاردن، لە ناوبردن و کاتیبوون یەک شتن.

هێشتا ســـات داهێنانێکی پوچەڵی فەیلەسوفەکان نییە. بەدڵنیاییەوە، کاتێک مامەڵە لەگەڵ کێشـــەیەکدا دەکەم ساتێکی خۆیی نادۆزمەوە. ئێستا، بۆنموونە من دەنوســـم و دەمەوێت بیرۆکەکانم ڕێکبخەم، سات بۆ من نییە؛ تەنیا بەردەوامی لە بەدوکەوتنی خۆمدا بەرەو کۆتاییەک، کە پێناسەم دەکات، دەبینم. سات، هەمانکات، هەرەشـــەمان لێدەکات؛ واتە هەڵبژاردنە سەربەســـتەکەمان دەکات بەو شـــتە و

دەتوانین بە هۆی ســـاتەوە داپچرانێک لەنێو یەکێتی ڕەهەندەکانی کاتدا دروســـت بکەین. ئایا ســـات چییە؟ لەنێو پرۆسەی بەکاتبووندا سات لە پرۆژەی کۆنکرێتی جیانابێتەوە. ئێمە ئەم خاڵەشـــمان باســـکردووە. هەروەها، چەمکی سەرەتایی و کۆتایی پرۆسەکەش نییە چونکە ئەم دوو چەمکە لە پرۆسەکە دانابڕێن. کەوابوو، هیچ چەمکێک خەسڵەتی ساتی نییە. چەمکی سەرەتایی لە سەرەتادایە و پرۆسەکە لەوێوە دەکەوێتەگەر. لەگەڵ ئەمەشـــدا، نەبوونێک سنووردارییدەکات، کە پێش ئەو دەکەوێت. چەمکی کۆتاییش دوای پرۆسەکە دێت و لەناوییدەبات. ئەویش لە دوای خۆیەوە نەبوونێکی هەیە و کۆتاییەکەی سنورداردەکات. ئەگەر سات هەبێت پێویستە دوو نەبوون ســـنورداری بکات. مەحاڵە لەمەش تێبگەین ئەگەر ســـات بە سەرەتا لەنێو پرۆســـەی بەکاتبوون دابنرێت. بەڵام لەگەڵ پەرەپێدانی پرۆسەکەدا و لەگەڵ لەناوبردنی و سەرهەڵدانی پرۆسەیەکی دیکەدا ساتەکان دەهێننە بوونەوە. لێرەدا، سات دەبێت بە سەرەتا و کۆتاییش. بەکورتییەکەی، ئەگەر کۆتایی پرۆژەیەک بێت و ببێت بە سەرەتا بۆ پرۆژەیەکی دیکە، ڕاستەقینەیەکی ئاڵۆزی کاتی دێتەکایەوە، کە نەبوونێکی لەپێشتر سنورداری دەکات و ئەمەش دەیکات بە سەرەتا. هەروەها نەبوونێکی لەپاشـــتریش ســـنورداری دەکات و دەیکات بە کۆتایـــی. ئەم بونیادە کاتییـــەش لەوێدا دەبێت بە کۆنکرێتی، کە ســـەرەتاکەی، وەکو کۆتایی درابێت و ببێت بە ڕابردوو. ئەو ســـەرەتایەی کۆتایی پرۆژەیەکی لەپێشترە دەبێت بە سات. کەوابوو، ســـات ئەو کاتە هەیە، کە ئێمە لەنێو یەکێتی کردەوەیەکدا ســـەرەتا و کۆتایی خۆمانین.

ئـــەوەی گۆڕانکارییـــە ڕادیکاڵییەکەی پرۆژە بنەڕەتییەکەمان دروســـتیکردووە ئەمەیە. بە هەڵبژاردنی سەربەســـتانەی گۆڕانکارییەکە پرۆژەکە، کە بوونی خۆمان دەخەینە نێو کاتەوە، خۆمان لە داهاتوودا بەو بوونە دەناسین، کە هەڵمانبژاردووە. ئێســـتای ڕووت دەبێت بە سەرەتای کاتە نوێکە و دەڕوانێتە داهاتوو. ئەم ئێستایە بە هۆی داهاتووەوە دەبێت بە ســـەرەتا. کەوابوو، بوونی هەڵبژاردن بەشـــێکە لە هەمووی سەرەتایەکی نوێ. لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێت هەڵبژاردن هیچ پەیوەندییەکی بە ڕابردووەوە نەبێت و ئەو ڕابردووە سنوردارینەکات. هەڵبژاردن هەمانکات بڕیاردانە بۆ ناسینی ئەو ڕابردووەی ئاڵوگۆڕکراوە. ئەوەی لە بێبڕاواییەوە ڕوو لە بڕوا دەکات بڕواکەرێکی سادە نییە. کەســـێکە بێبڕوایی ڕەتداوەتەوە و ڕابردووی خۆی، وەکو بێبڕوا کردووە بە بەشـــێک لە پرۆژەکەی. هەڵبژاردنە نوێکە دەبێت بە سەرەتا بۆ کۆتاییەک و کۆتاییش بۆ ســـەرەتایەکی دیکە؛ دوو ڕەتدانەوە سنورداری دەکات و دابڕانێکیش لە یەکێتی ڕەهەندەکانی بوونی دەردەخات. بەهەرحاڵ، خودی ســـات بە تەنیا هیچ نییە. ڕوو لە هەرچ شوێنێک بکەین بەردەوامی لەنێو کاتدا دەبینین. هەر یەکێک لە هەڵبژاردنەکان لایەنی شـــەێنکەوتنەکە پێناسدەکات و خۆی دەکات

بە دیاردەیەکی نێوی کات. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت بەرجەستەبوونە سەرەتاییەکە پێکدەهێنێت یان شتێک هەیە بە ئاکام گەیشتوە و منیش دەتوانم سودی لێوەرگرم. بەپێچەوانەوە، بەردەوام شوێن لەناوچوونەکە دەکەوین و دواجاریش دۆزینەوەیەکی بەردەوامی سەربەســـتانەی پرۆژەکان دەبێت بە کارێکی پێویست. دۆزینەوەکە لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە ڕوونادات، کە سەربەستانە هەڵبژاردنەکانم دیاریدەکەم. بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە سات نییە. دۆزینەوەکە بە ئاستەم بە پرۆسەکەوە نوساوە و دەردەکەوێت واتایەکی ساتی نەبێت. بەڵام، مادام سەربەستانەیە و بەردەوامیش سەربەستییەکە دەیدۆزێتەوە، ئەوا سەربەســـتییەکەم هەڵبژاردن سنورداردەکات. دێوەزمـــەی ســـات پەلامـــاری دەدات، تاکو من لـــە هەڵبژاردندا بـــەردەوام بم. بەڕابردووکردنی پرۆسەکە لەگەڵ بەردەوامبوونی ئۆنتۆلۆجییانەی ئێستادا هاوشان دەڕوات. پرۆســـە بەڕابردووکراوەکە لەنێو ئێســـتا لەناوچووەکـــەدا دەمێنێتەوە و دەبێـــت بە زانینی کردەکی؛ واتە، ئەو واتایەی ژیاوە چۆتە ناوەوە بەبێ ئەوەی بۆ ئاگامەندی، کە خۆی بۆ کۆتایی دەکات بە پرۆژە، بووبێت بەبابەت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە من سەربەســـتم و ئەگەری ئەوەشـــم هەیە ڕابردووم بکەم بە بابەت. هەرچەندە ئاگامەندیم لەپێشەوە لە ئاستی ڕابردوومدا تێڕامانانە نییە، خۆی، وەکو ڕەتدانەوەی ناوەکی ئێســـتاکان ڕادەگرێت. بە هۆی ناسینی کۆتاییەکان، کە وەکو ئێســـتا و هەڵبژاردنی نوێ دەناســـرێن، واتاکان دەدۆزێتەوە. ڕابرووی خۆی، وەکو بابـــەت دەبینێـــت و دەتوانێت بیری لێبکاتەوە و هەڵیســـەنگێنێت. بەبابەتکردنی ڕابـــردوو، وەکو هەڵبژاردنێکی نوێیە، کە ڕوو لە کۆتاییەکی دیکە دەکات. ســـات، وەکو لەناوبردن و داپچڕان دەهێنێتە نێو کاتەوە.

ئاســـانترە خوێنـــەر لە ئاگامەندی ئەم شـــیکردنەوەیە تێبـــگات ئەگەر لەگەڵ بیردۆزەیەکی دیکە لە سەربەستی بەراوردیان بکەین. بۆنموونە، بیردۆزەکەی لایبنیز. بۆ لایبنیز و ئێمەش، دەگونجا ئادەم دەســـتی لە سێوەکە نەدایە. بەڵام بۆ لایبنیز و ئێمـــە، ئەم ڕەفتارە بە چەند ڕێگەیەک لێکدەدرێتەوە و دوواجاریش دەڵێین، کە دەگونجا ئادەم ســـێوەکەی نەبردایە. ئەمەش لەوە دەچێت، کە ئەگەری ئادەمێکی دیکـــە هەیە. هەڵکەوتنی ئـــادەم، کەوابوو سەربەســـتییەکەیەتی. هەڵکەوتن ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە ژمارەیەکی لەبن نەهاتووی ئادەمە ئەگەرەکان چواردەوری ئادەمی ڕاســـتەقینەیان داوە. هەریەکێک لە ئەوان لە بەراوردکردنیدا لەگەڵ ئادەمە ڕاســـتەقینەکە، گۆڕان لە خەسڵەتەکانیدا و دواییش لە جەوهەریدا دیاریدەکات. بۆ لایبنیز، کەوابوو، سەربەســـتی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لە ڕیزکردنی سێ وشەدایە: مرۆڤ سەربەستە (1) چونکە هۆشەکییانە بڕیار لەسەر کارکردنی دەدات؛ (2) ئەوەی کارەکە دەکات لە کارکردنەکە تێدەگات؛ (3) هەڵکەوتە و بەوشـــێوەیە هەیە، کە دەگونجێت کەسانی دیکە، کە کاری جیاوازتر دەکەن پەیوەندییان بەم هەڵوێستەوە

هەبێت. مادام پەیوەندی پێویست لەنێوان ئەگەرەکاندا هەیە، هەڵوێستێکی دیکەی ئادەمیش بۆ ئادەمێکی دیکە دەبێت بە ئەگەر. بوونی ئادەمێکی دیکە ئاماژەش بۆ بوونی جیهانێکی دیکە دەکات. ئێمە لەگەڵ لایبنیز لەسەر ئەو خاڵە هاوڕاین، کە ئاماژە بۆ کەسایەتی ئادەم و هەڵوێستێکی جیاوازتریش بۆ کەسایەتییەکی جیاوازی ئادەم دەکات. بەڵام کاتێک لایبنیز جەوهەری ئادەم بەسەرچاوەی هەڵوێستەکەی دادەنێت سەربەستی ڕەتدەداتەوە و ڕوو لە پێویستی دەکات. لێرەدا، هەڵوێستی ئادەم وا دەردەکەوێت سەر بە جەوهەری ئادەم بێت و هەڵکەوتنەکەش، کە دەبێتە دامەزرێنەری هەڵوێستەکە لەنێو جەوهەرەکەدا بێت. جەوهەری ئادەمیش خودی ئادەم هەڵینەبژاردووە و خوا ئافەریدی کردوە. دروستە هەڵوێستی ئادەم لەجەوهەرییەوە دەرچووە و پشت بە بوونی ئادەم دەبەستێت، بەڵام ئەمە مەرج بۆ سەربەستی دادەنێت.

جەوهەری ئادەم شتێکی دراوە؛ ئادەم هەڵینەبژاردوە. ئەو هەڵینەبژاردوە ئادەم بێت. لەبەرئەمە لێپرسراو نییە. ئەوەندەش گرنگ نییە، کەسێک لەوباوەڕەدابێت، کە ئادەم کەمێک بەرپرس بێت.

بۆ ئێمە، بەپێچەوانەوە، ئادەم بە جەوهەر پێناس ناکرێت. **جەوهەری ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی پاش بوون دەکەوێت.** هەڵبژاردن بەرەو کۆتاییەکان پێناسی ئادەم دەکەن. هەڵکەوتنی ئادەم شێوازی دەربڕینی هەڵبژاردنی براوەی خۆ دروستکردنی ئادەمە. هێشتا، ئەوەی ئادەمی بە کەس کردووە و دەیناسێت داهاتووە نەک ڕابردوو: لەگەڵ گەیشتن بە کۆتایی پرۆژەکانی خۆی دەناسێت. ئەمەش هەموو تام، حەز و ڕقەکانی دەگرێتەوە. لێرەدا، خۆمان لەو ڕەخنەیە دەپارێزین، کە ئاڕاستەی لایبنیزمان کردو گوتمان، "بەدڵنیاییەوە، ئادەم سێوەکە هەڵدەبژێرێت، بەڵام خۆی هەڵنابژێریت." بۆ ئێمە، بێگومان سەربەستی دەخرێتە سەر ئاستی هەڵبژاردنی ئادەم بۆ بوونی خۆی. ئەمەش سنورداركردنی جەوهەرە لەلایەن بوونەوە. بێجگە لەمە، لەگەڵ لایبنیزدا ئەوەش دەناسین، کە هەڵوێستێکی دیکەی ئادەم دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئادەم و جیهانێکی جیاوازتر. بەڵام مەبەست لە جیهانی جیاواز ڕیزکردنێکی دیاریکراوی ئەگەرەکان، ئەو ئەگەرانەی ئادەمەکەی دیکە لەوێدا دەیاندۆزێتەوە، نییە. بەڵکو دیاریکردنی شێوازێکی دیکەی بوونی ئادەمە لەنێو جیهاندا.

دواجاریش، بۆ لایبنیز، مادام هەڵوێستی ئادەمەکەی دیکە لەنێوجیهانێکی جیاوازتردا دەردەکەوێت، وەکو ئەگەر و ناسینەوەی هەڵکەوتنی ئادەمێکی ڕاستەقینە، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بۆ هەمیشە هەیە. دیسانەوە، لەسەر ئەم خاڵەش جەوهەر پێش بوون دەکەوێت. بۆ ئێمە، بەپێچەوانەوە، ئەگەر ڕەوانە؛ شێوەی وەرنەگرتوە و سەر بە بوونێکی دیکەیە. لەوەوپێش وەکو ئەگەری پرۆژەیەکی نوێی ئادەم بەرەو

ئەگەرە نوێکانی نەبووە. ئەگەر لای لایبنیز هەمیشەیی و رووتکراوبن بۆ ئێمە  تەنیا لــە دامەزراندنیدا دەبێت بە ئەگەر؛ واتە لەگەڵ بانگەشــەکردنی ئادەمدا، کە ئەو بوونەیە. دەبینین بۆ لایبنیز ڕاڤەکردنی سایکۆلۆجی لە ڕابردووەوە بەرەو ڕانەبردوو دەکەوێتەگەر. هەمووشتیک بە وەســتاو لەنێو لۆجیکێکی هەمیشەییدا دادەنرێت. تەنیا هەڵکەوتێک پەیدابکرێت لە یاســادایە؛ ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشــێت، کە تێگەیشتنی خوا پێشمەرجە بۆ ئادەم. بۆ ئێمە، ڕیزکردنی ڕاڤەکردنەکە بەگوێرەی کاتــە؛ لێکدانی لۆجیکانە و لە هۆکارەوە بۆ هۆکرد نییە. ڕاڤەکردنێکە لە ڕوانگەی داهاتووەوە.

دەبێــت جەخت لەســەر ئــەو خاڵە بکەین، کە شــیکردنەوەکەی پێشــومان بیردۆزەییانەیە بەگوێرەی بیردۆزە، دەشــێ ئادەم هەڵویستێکی دیکەی هەبێت و لەنێو ســنوری گشــتگری کۆتاییەکانیدا، کە ئادەم بۆ دروستکردنی خودی خۆی هەڵیاندەبژێرێــت، ببینرێــت. ئێمە بەمجــۆرە باســمانکرد و دەردەکەوێت لەگەڵ شوێنکەوتوانی لایبنیز هاوڕابین و بۆچوونەکەمان بە شێوەیەکی زۆر سادە دەربڕین. هــۆی ئەمەش لەوەدایە، کە ڕاڤەکردن پەیوەندی بــە ڕیزکردنی ڕووداوەکان لەنێو کاتــدا نەک لۆجیکەوە هەیە. تێگەیشــتن لە کۆتایی کردەوەیــەک، کە بوون-بۆ-خۆ سەربەســتانە وەریدەگرێت لەسەر هۆش ڕاناوەستێت. ڕیزکردنی ئەگەرەکانیش لەســەرەوە بۆ خوارەوە پەیوەندی بەو ئەگەرانەوە نییە بە دیدەکشن پێیاندەگەین. لەپێش هەمووشــتێکدا، پەیوەندی نێوان ئەو ئەگەرانەی دەردەچن (گوێ نەدان بە ماندوبوون یان تەســلیم بوونی) و لەگەڵ ئەگەرە بنەڕەتییەکە دیدەکشــنانە نییە. پەیوەندییە لە نێوان بەشــەکان و هەمووی بونیادەکە. لە هەمووی پرۆژەکانەوە لە بونیادێکی هەندەکیش تێدەگەین. بەڵام، فێرگەی گیشــتاڵتش نیشانماندەدات، کە هەمووی فۆرمێک بونیادە بچوکترەکان لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت. من دەتوانم چەند هێڵێکی دیکە بخەمە ســەر وێنەکە یان کەمیان بکەمەوە و خەسڵەتەکەی بگۆڕم. هێڵی دیکەش هەن، کە زیادکردن و کەمکردنی دەبێتە هۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی لە شێوەکەدا و سەرهەڵدانی شــێوەیەکی دیکە. ئەمەش بۆ پەیوەندی نێوان ئەگەرە یەکەم و دووەمەکان دروســتە. واتای ئەگەرە دووەمەکانیش بۆ هەمووی بوونی من دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەگەرەکانی دیکە بەبێ ئەوەی گۆڕان لە هەمووی واتاکە دروست ببێت جێگەی ئەمانە دەگرنەوە.

بەکورتییەکەی، تێگەیشتن ڕاڤەکردنی پەیوەندییە فاکتۆرییەکانە نەک تێگەیشتن لە پێویستی. دەبێت ڕاڤەکردنی سایکۆلۆجییانە بۆ کردەوەکانمان بگەڕێنینەوە بۆ چەمکی 'ناگرنگی' ڕواقییەکان. بۆ ماندوو حەسانەوەم، گرنگ نییە لە کەنار ڕێگاکە دانیشــم یان ســەد هەنگاوی دیکە زۆرتر بڕۆم تاکو لەو کوخەدا پشوبدەم، کە لە دوورەوە دەیبینم. تێگەیشــتن لە ئاڵۆزی و فۆرمە جیهانییەکەی، وەکو ئەگەرێک

هەڵمبـــژاردوە بەس نییە. لێرەدا کارێک نادۆزمەوە هاندەرو هۆکاری نەبێت، بەڵکو مەبەستێکی کتوپڕی هاندەر و هۆکارەکان بڕیاردانەکە دەوڵەمەند دەکات.

بەهەمانشێوەش هەر (ئەمە) دەبێت لەنێو جیهانەوە و لە ڕوانگەی فاکتۆری بوونی منەوە ســـەرهەڵدات. جیهان و فاکتۆری بوونیشم ڕێگەنادەن تێبگەین بۆچی ئێستا دەست بۆ لێوانی ئاوخواردنەوەکە نەک شوشەمەرەکەبەکە دەبەم. سەربەستییەکەمان لە پەیوەندییەکەدا لەگەڵ ناگرنگییەکاندا هەمووە و سنورداریش نییە. هەڵبژاردنی یەکێکیـــان و وازهێنانیـــش لێی بـــۆ هەڵبژاردنی دانەیەکی دیکەیـــان نابێتە هۆی سەرهەڵدانی سات و پچڕان لەبەردەوامییەکەدا؛ هەڵبژاردنە سەربەستەکان پێکەوەن و تەنانـــەت ئەگەر ناکۆکیش بن یەکدی تـــەواو دەکەن و لەنێو یەکێتی پرۆژەکەدا دەمێننەوە. ئەوان هەرچییەک بن بە هۆی پرۆژە بنەڕەتییەکەوە ڕاڤەدەکرێن؛ پرۆژە بنەڕەتییەکە دەوڵەمەنددەکەن و دەیکەن بە پرۆژەیەکی کۆنکرێتی. لەگەڵ خۆیاندا هاندەرەکـــە دەهێنن، کە ئاگاییە لە هۆکارەکە یان تێگەیشـــتنە لە حاڵەتەکە، کە بەمجۆرە و ئەوجۆرەیە.

خاڵێکـــی دیکەی پەیوەندی نێون ئەگەرە یەکەمـــەکان و دووەمەکان ئەوەیە، کە هیچ 'بیرکەرێکی-ئامادە' و لەپێشـــتر نییە تاکو پەیوەندییەکەی بۆ بگەڕێتەوە و سنورداریشـــی بـــکات. بوون-بۆ-خۆ ئەگـــەرە دووەمـــەکان هەڵدەبژێرێت و بە یەکەمەکانەوە گرێیاندەدات. بوون-بۆ-خۆ بە سەربەستییەکەی نەک تەنیا کۆتاییە یەکـــەم و دووەمەکان نادۆزێتەوە؛ سیســـتەمی ڕاڤەکردنیش بۆ پەیوەندییەکەیان دادەهێنێت. لە هەموو حاڵەتێکدا خودی کەسەکە دەبێت پێوەری بۆ دابمەزرێنێت. دواجاریـــش، بوون-بۆ-خۆ دەتوانێت سەربەســـتانە ئەو بڕیارانـــە بدات و لەگەڵ کۆتاییە بنەڕەتەکاندا ناکۆک ڕابوەســـتن. ئەم بڕیارانەش لەبەر ئەوەی تێڕامانانەن سەربەستانە دروست دەبن. لەو هەڵەیەوە سەرهەڵدەدەن، کە بە بڕوایەکی چاکەوە یـــان خراپـــەوە دژی کۆتاییەکان کراوە. هەڵەکەش لەوێـــدا ڕوودەدات ئەگەر ئەو هاندەرانەی بوونیم پێکدەهێنن، لەسەر بابەتێک لەنێو تێڕامانی مندا دۆزراونەتەوە، ئاگامەنـــدی لەتێڕامان بـــەدەر، کە پرۆژەدانانێکی کتوپـــڕە و ڕوو لە ئەگەرەکان دەکات، فێـــڵ لە خۆی نەکات. هەڵوێســـتی تێڕامانانە هەزار ئەگەری هەڵەکردنی تێدایە. مەبەست ئەوە نییە، کە لە هاندەرێکی ڕووت، بۆنموونە ئەو ئاگامەندییەی بیـــری لێدەکرێتەوە و بووە بە بابەتێکی لەپێشـــتر، تێـــدەگات. بەڵکو ئامانجی پێکهێنانـــی بابەتە دەروونییەکانی ئەوبەری ئاگامەندییە، کە بابەتێکی گونجاوە و ئێمەش لە بەشی دووەم و سێیەمی[ئەم نوسراوەدا] باسمانکردوەو تەنانەت دەبن بە بابەتی ساختەش. کەوابوو، دەکرێت من هەڵەکان بە تێڕامانەوە بەسەر خۆمدا بسەپێنم، سەربەستانە پرۆژەیەک بکەم، کە لەگەڵ پرۆژە بنەڕەتییەکەمدا ناکۆکە و دەیگۆڕێت.

ئەگــەر لە پرۆژە بنەڕەتییەکەمدا بوونی خۆم لەنێو کەســانی دیکەدا بە کەمی ببینم (گرێی هەستکردن بەکەمیم هەبێت)، زمان تەتەڵەکردنیش بخرێتە سەر پرۆژە بنەڕەتییەکە، ئــەوا بۆ هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان و تێنەگەیشــتنم لە هەڵبژاردنی بوونــی خۆم، وەکو کەمی، بڕیار دەدەم زمانم چاک بکەم. لەوانەیە لەم کارەشــدا ســەرکەوتووبم، بەڵام هەســتکردن بەکەمی هەر دەمێنێتەوە. لەڕاستیدا، ئاکامی بڕیاردانەکەم بە میتۆدێکی تەکنیکی دەســتدەکەوێت و ئەمەش بە خۆ-چاککردنی سەربەســتانە ناوزەدیدەکەین. لێرەدا ئاکامەکە شوێنی هەستکردن بە کەمییەکەم دەگوێزێتەوە و لەجێگەی ئەو یەکێکی دیکە پەیدادەبێت. ئەم ناتەواوییەی کارێکی سەربەســتانە دەبێتە مایەی سەرســوڕمانمان و هەوڵدەدەین ئەم نموونەیە باشتر ڕوونبکەینەوە.

لەپێش هەمووشتێکدا، پێویســتە ببینین، کە هەڵبژاردنی هەموو کۆتاییەکان، هەرچەندە سەربەستانەیە، هێشــتا پێویست ناکات یان هەندێکجار لەخۆیدا نییە. نابێت پێویســتی هەڵبژاردن و ویستی هێز تێکەڵبکەین. دەگونجێت لە هەڵبژاردندا هەست بە ناخۆشی بکرێت؛ لەوانەیە خۆدەربازکردن یان بڕوای خراپ بێت. تەنانەت دەتوانین هەڵنەبژاردنی خۆمان هەڵبژێریــن. لەم حاڵەتانەدا کۆتاییەکان دەکەونە ئەودیو فاکتۆرەکانەوە و لێپرسینەوەکەش بۆ بوونی ئێمە دەگەڕێتەوە. ئێمە هەرچ جۆرە بوونێکمان هەبێت خۆمان هەڵمانبژاردووە. ئێمە گەورەیی و بچوکی، سەربەرزی و سەرشــۆڕی بۆ خۆمان هەڵدەبژێرین. ئەگەر سەرشــۆڕی هەڵبژێرین هەست بە سەرشــۆڕی بوونمان و کەمی دەکەین. ئێمە، لێرەدا، مامەڵە لەگەڵ شتەدراوەکان و لەمەش زۆرتر لەگەڵ واتادا ناکەین. بەڵام ئەو کەســەی خۆی سەرشۆڕ دادەنێت ڕوو لەو کۆتاییانە دەکات پێکیان دەهێنێت و دەیەوێت بیانگاتێ: سەرشــۆڕبوونە هەڵبژێردراوەکە، بۆنموونە، وەکو ماسۆشیزم دەبێت بەو ئامێرە داهێنراوەی بوون-بۆ-خۆییمان دەگۆڕێت؛ پرۆژەیەکە لەپێناوی کەسانی دیکەدا لەدەست دوودڵییەکەی سەربەستی ڕزگارمان دەکات؛ پرۆژەیە بوون-بۆ-خۆمان دەکات بە بوون-بۆ-کەسانی دیکە. لەنێو هەموویاندا، هەســتکردن بە کەمی لەوێدا ســەرهەڵدەدات، کە بوونی ئێمە بە-تێگەیشتنێکی سەربەستانەوە بووە بە بوون-بۆ-کەسانی دیکە.

بوونی-بۆ-کەســانی دیکە ڕۆڵی هۆکار دەبینێت، بەڵام پێویستە هاندەرەکەش بدۆزرێتــەوە، کە بێجگە لە پرۆژەیەکی سەربەســتانە چی دیکــە نییە. کەوابوو، هەستکردن بە کەمی ئامێرێکە هەڵمانبژاردوە تاکو خۆمان لەئاستی شتدا دابنێین؛ خۆمان لەدەرەوە دەخەینە نێو شــتەکانی جیهانەوە. ئاشکراشە، بەو سروشتەدا، وەکو شەرم، توڕەبوون و ناخۆشی، دەناسرێت، کە بۆی هەڵدەبژێرین. هەڵبژاردنی کەمی ئەوەش ناگەیەنێت بە کەمییەکە دڵخۆش و ڕازی بێت. بەڵکو هەســتکردن بە کەمی دەبێت خەم و یاخیبوون دروســتبکات. هەندێکجار، خۆم لەسەر کارێک

دەهێڵمەوە، کە کەمییەکەمی تێدا دەبینم و لە هەندێ کاری دیکەشدا خۆم دەخەمە ڕیزی هەموو کەســەکانی دیکە. ئەمەش هەوڵدانێکی بێبــەرە من هەڵمبژاردووە. بێبەرە چونکە من دەمەوێت دواکەس بم یان لەنێو ئەواندا ون ببم. دەشێ هۆکەشی ئەوەبێت من گوێنەدان و شەرمم بۆ گەیشتن بە بوون هەڵبژاردوە.

ئاشــکرایە، من دەتوانــم لەنێو کردەوەکانمدا بە کەمی خــۆم دەربخەم ئەگەر هەستبکەم گەورەییش هەیە. ئەو هونەرمەندەی هەست بە کەمی تەوانای هونەری خۆی دەکات دەیەوێت هونەرمەندێکی گەرە بێت؛ ئەگینا ئەو هەست بە کەمی ناکات و خەمیشی بۆ ناخوات. ئەگەر هونەرمەندێک بیەوێت مامناوەندیش بێت دوای کەمی ناکەوێت؛ بەڵکو ئەمە نموونەی هەڵبژاردنی شتێکی بڕاوەیە. هەڵبژاردنی هەستکردن بە کەمی ناسینەوەی بۆشاییەکە لەنێوان ئەو کۆتاییەیە کەسەکە دەیەوێت بیگاتێ و ئەو کۆتاییەی دەســتی کەوتوە. ئــەو هونەرمەندەی دوای گەورەیی دەکەوێت و هەســتکردن بە کەمی هەڵدەبژێرێت بۆشاییەکە دەپارێزێت؛ وەکو پینەڵۆپ ئەوەی بە شــەو دروســتیدەکات بە ڕۆژ دەیڕوخێنێت. ویستی دەبێت بە بڕوای خراپ؛ لە ناســینەوەی کۆتاییەکانی هەڵبژاردنەکەی ڕەتدەکات، کە ئاگامەندی کتوپڕ بڕیاری لەسەرداوە. بابەتی دەروونی ساختە پێکدەهێنێت، دەیکات بە هاندەر و خۆی بەو هاندەرەوە دەبەســتێتەوە (بۆنموونە خۆشەویستی بۆ سەرکەتن یان خۆشەویستی بۆ جوانی، هتد). لێرەدا ویســتەکە بە هیچ جۆرێک دژی هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکە ڕاناوەســتێت؛ بەڵکو لە کۆتاییدا، لەســەر بڕوای خراپ و لە ڕوانگەی هەڵبژاردنی بنەڕەتی هەستکردن بە کەمییەوە لێیتێدەگات.

لە ئاگامەندی تێڕامانانەدا ویســت بابەتە دەروونییە ساختەکان، وەکو هاندەر پێکدەهێنێــت، بەڵام لەلایەکی دیکەوە لەنێو تەوانایــی خۆ-ئاگاییەکی لە تێڕامان بەدەر، لــە بڕوای خراپدا ئاگاییە لە بوون و دواجاریــش ئەو پرۆژە بنەڕەتییەی بوونێ-بۆ-خۆ شوێنی کەوتوە. لەم ڕووەوە، جیاکردنەوەی ئاگامەندییە ویستدارەکە و کتوپڕییەکە لەســەر فاکتۆر دەســتناکەوێت. ئەم دوولایەنــی و جیاکردنەوەیە پێویســتی بە سەربەستی بنەڕەتی هەیە؛ لەنێو یەکێتی پرۆژەکانماندا دەناسرێت، کــە هەڵبژاردنی بوونمانە بە کەمی. جیابوونەوەکــەش ئەوە دەردەخات، کە ئێمە خۆبەخشانە و بە مەبەستەوە لە بڕوای خراپدا لەڕێگەی ئەو کاردانەوانەی ئێمە بە کەمی نیشان نادات، کەمییەکەی خۆمان دەشارینەوە.

شــیکردنەوەکەمان دوو نهــۆم، کە ئەدلەریش بۆ گرێی هەســتکردن بە کەمی داینــاون، دەگرێتــە خــۆی: ئێمە، وەکــو ئەدلەر، هەســتکردن بــە کەمییەکە دەناســین، گرانی و ناتەبایی لە گەشــەکردنی کردەوەکانیشــدا دەبینین و هەموو ئەو دەســتەواژانەی بۆ شاردنەوەی کەمییەکە بەکاریاندەهێنین دەزانین. بەڵام ئەم جیاوازیانەش دەدۆزینەوە: یەکەم، ئێمە ڕێگە نادەین ناسینەوە بنەڕەتییەکە بەبێ

ئـــاگا دابنرێت؛ جیاوازییەکـــە ناخەینە نێوان ئاگایی و ئەودیـــو ئاگاییەوە، بەڵکو لەسەر جیاوازی ئاگامەندییەکی لەتێڕامان بەدەر و ئەو ئاگامەندییەی تێڕامانی هەیە دادەمەزرێنین. دووەم، دەردەکەوێت، بۆ ئێمە، چەمکی بڕوای خراپ، کە لە کەرتی یەکەمی[ئەم نوســـراوەدا] باسمانکرد، لەجێگەی سانســـۆر، خەفەکردن و ئەودیو ئاگایی، کە ئەدلەر بەکاریاندەهێنێت، شـــتی جیاوازتر دابنێت. ســـێیەم، یەکێتی ئاگامەنـــدی، کە خـــۆی بۆ کۆجیتۆ دەردەخات، دژوارییەک بـــۆ ئێمە پەیدادەکات تاکو نەتوانین جیاوازی لەنێوان دوو نهۆمەکەدا دروســـتبکەین. مەگەر یەکێتییەکە جارێکی دیکە ببێت بە تێهەڵکێشـــەیەکی مەبەستدار و لە نهۆمێکەوە بۆ ئەوی دی بڕوات و یەکیان بخات. ئێمەش هەست بە بوونی شتێکی قووڵتر، گرێی هەستکردن بە کەمی دەکەین و ئەم ناسینەوەیەش دەکەین بە هەڵبژاردن. لەم گواستنەوەیەدا، ویست تەنیا کەمییەکە ناشارێتەوە، مەبەستێکی قووڵتر شوێنی دەکەوێت و لاوازی سەلماندنەکان هەڵدەبژێرێت تاکو شەرمەزارییەکە چاکتر نیشاندات و سەرنەکەوتنەکە بەرجەستەبکات. ئەو کەسەی هەست بە کەمی دەکات چەوسێنەری بوونی خۆیەتی. ئەو شـــەرم و ئازاری هەڵبژاردوە، بەڵام ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە هەست بە خۆشی ناکات.

ئەگـــەر ئـــەم ئەگەرە نوێیانـــەی نێو بڕوای خـــراپ و لە نێو ســـنوری پرۆژە ســـەرەتاییەکەماندا ویست هەڵیانبژێرێت، پێویســـتە تاکو ڕادەیەک دژانە بەرانبەر پـــرۆژە ســـەرەتاییەکە دابنرێن. بەو ڕادەیە بن، کە ئێمە حەز بکەین هەســـتکردن بە کەمییەکە لە خۆمان بشـــارینەوە تاکو دروســـتی بکەین. بـــۆ ئەمەش دەبێت هەوڵدانێکـــی سیســـتەمی و تێڕامانانە بۆ شـــاردنەوەی دیاردەکانـــی بدەین. ئەم هەوڵدانەش لەنێو حاڵەتی دەروونی ئەو نەخۆشـــانەدا دەکرێت، کە دێن بۆ بینینی پزیشـــکە دەروونناســـەکان. ئێمە لەلایەکەوە دەمانەوێت دەسکەوتێکمان هەبێت و لەلایەکی دیکەوە دەســـتکەوتەکە ڕەتدەدەینەوە. نەخۆشەکە خۆبەخشانە بۆ لای پزیشـــکەکە دەڕوات، تاکو لەدەســـت ئەو نەخۆشـــییە ڕزگاری بێت، کە ناتوانێت لە خۆی بشـــارێتەوە. بەم هەوڵدانەشـــی خۆی بەرەو چاککردنەوە دەبات. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە، لەبەر ئەوەیە، کە ئەو هەوڵێکی زۆری بۆ چاکردنەوەی خۆی داوە و نەخۆشییەکەی چارەسەرنەکردووە. چارەسەرکردنی پزیشکەکە بە بڕواو ویستێکی خراپەوە وەردەگرێت. هەرچەندە خۆبەخشانە ڕوو لە پرۆژەکە دەکات هەوڵدانەکەی، وەکـــو ئامانجەکەی، ســـەرناکەوێت. ئەمەش لەو نەخۆشـــانە دەچێت، کە ژانێت لەسەریانی کۆڵیوەتەوە و خۆیان توشی نەخۆشیی کردووە و هەوڵی چاکبوونەوەش دەدەن. ئێمە لێرەدا ئاکامەکە دەبینین چۆنە؛ نەخۆشـــەکە باسی ئەوە ناکات، کە خۆی توشکردوە. بە درۆوە خۆی دەتلێنێتەوە و دان بە تاوانەکانیدا ناهێنێت.

لێرەدا، بێسودە باسی زۆرانبازی نێوان ویست و نەخۆشییەکە بکەین. هەوڵدانەکان

لەنێــو ڕەهەندەكانی یەكێتی بڕوای خراپدا و لەو بوونەدا ڕوودەدەن، كە ئەوە نییە هەیە و ئەوەشە، كە نییە. بەهەمانشێوە، كاتێك پزیشكە دەروونییەكە تێگەیشتنی بۆ پرۆژەی نەخۆشەكە نزیك دەبێتەوە، نەخۆشەكە واز لە چارەسەركردنەكە دەهێنێت یان درۆ دەكات. بێسودیشـــە ئەم بەرگریكردنە بـــە ڕەتدانەوە یان دوودڵییەكی لە ئاگابەدەر دابنێین.

چۆن پێشكەوتنی توێژینەوە ســـایكۆلۆجییەكان بەودیو ئاگامەندی بگەیەنین، ئەگەر ئەو بوونە ئاگامەند نەبێت؟ ئەگەر نەخۆشـــەكەش لەكایەكەیدا تاكو كۆتایی بەردەوام بێت، پێویســـتە بەڕادەیەك چارەسەری نەخۆشییەكەی كرابێت. دەبێت نیشانەی نەخۆشـــییەكانی، كە هانیدا پزیشكەكە ببینێت، لەناوچووبن. كەوابوو، شەڕێكی بچوكتری هەڵبژاردووە: ئەو وای دەزانی نەخۆشییەكەی دەرمانی نییە بۆیە بۆلای پزیشـــكەكە هات. ئەو زۆری لە خۆی كرد پرۆژەكەی خۆی لەبەر ڕۆشناییدا نەبینێـــت و لەناویبەرێت. سەربەســـتانە بیكات بە پرۆژەیەكـــی دیكە. ئەو زۆری لێكـــراوە خۆی بەتەواوی چاكبكاتەوە. بەمجۆرەش، من، كە چارەســـەری ترس و تەتەڵەی زمانم دەكەم دەشێ لە بڕوای خراپدا بم. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڕاستییەش دەمێنێتـــەوە، كە من زۆرم لێكراوە كاریگەرێتییەكەیان بناســـم. لەمحاڵەتەدا ترس و تەتەڵەكردنی زمانم وندەبن؛ ئەمەش شەڕێكی بچوكترە. دڵنیاییەكی ساختەش جێگەیان دەگرێت. چارەســـەركردنی نەخۆشـــی هیســـتیریاش بە لێدانی شەپۆلی كارەبایی هەمانشێوە وەردەگرێت. ئێمە دەزانین ئەم چارەسەركردنە گرژبوونەوەی پێی نەخۆشـــەكە لەناودەبات، بەڵام وەكو دەبینیـــن، گرژبوونەوەكە دوایی لەنێو دەســـتدا ســـەرهەڵدەدات. هۆی ئەمەش ئەوەیە، كە پێویستە هەمووی هیستیریا چارەســـەربكرێت چونكە پرۆژەیەكی هەمووگیری بوونـ بۆـ خۆیە. چارەسەركردنی لایەنێكـــی تەنیا دیـــاردەكان ئاڵۆگـــۆڕ پێـــدەكات. چارەســـەركردنی ترس یان تەتەڵەكردنی زمانم دەبێت لە هەڵبژاردنی پرۆژەیەكدا بێت ڕێگە بە ســـەرهەڵدانی گرفتی دیكە بۆنموونە، هەســـتكردن بەگەمژەیی و ناتەبایی لەدڵنیابووندا، نەدات. مادام بڕیاردانەكـــەم هاندەرەكەی لەنێو هەڵبژاردنە سەربەســـت و بنەڕەتییەكەی كۆتاییەكانمدا دەدۆزێتەوە، لەوانەیە بە ڕووكەشـــانەش بەریان بكەوێت. ویستیش تەنیـــا لەنێو ڕووگەی پرۆژە بنەڕەتییەكەمـــدا كاریگەرێتی خۆی دەنوێنێت؛ منیش دەتوانم لەڕێگەی گۆڕانكارییەكی ڕادیكاڵانە لە پرۆژەكەمدا خۆم لە گرێی هەستكردن بە كەمی ڕزگاربكەم.

ئەمـــەش نابێت بە هۆكار و هاندەرەكانی لەنێو پرۆژەیەكی لەپێشـــتردا یان لە ئەزمونی شـــەرمكردن و خەمەكەمدا ببینێتەوە چونكە دووەمیان بۆ ناســـینەوەی پرۆژەی هەستكردن بە كەمی دانراوە. چەند لەنێو گرێكەدا بمێنمەوە ڕێگەی دەرچوون سەختتردەبێت. ئەگەر خەو بە دەرچوونیشەوە ببینم، خەوەكە ڕزگارم ناكات و بەڵكو

زۆرتر قێز لە حاڵەتەکەم دەکەمەوە. لەنێو ئەو حاڵەتەدا ڕاڤەدەکرێت، کە من خۆمی بە کەم تێدا دەبینم. لەگەڵ ئەمەشدا، لە هەموو ساتەکاندا هەڵبژاردنە سەرەتاییەکەم بە هەڵکەوت و بێبەڵگە دادەنێم؛ کەوابوو، هەموو ساتێک من وەکو شتێکی دەرەکی لێیتێدەگــەم و دەمەوێت تێپەڕیبکەم، بیخەمە ســەر ڕابردووم و خۆڕزگارکردنێکی کتوپڕانە بهێنمەکایەوە. دوودڵی و ترســەکەم جــادووم لێدەکەن (ڕادیکاڵانە دەبن بەشــتێکی دیکە)؛ ســەرهەڵدانی وەرگێڕانەکەش دەبێتە هۆکاری گۆڕان لە پڕۆژە بنەڕەتییەکەمدا. ئەم وەرگێڕانە، کە فەیلەســوفەکان باسیان نەکردووە، سەرنجی ڕۆماننوســەکانی ڕاکێشاوە. دەتوانین بیر لەو ســاتە بکەینەوە پاڵەوانەکەی گید بەناوی فیلۆکتیتس ڕق و کینەکەی تێدا بەرجەستە دەکات و دەیکات بە پڕۆژەیەکی بنەڕەتی و هۆکار بۆ بوونی خۆی و بوونیش بەگشتی. بیر لەو ساتەش دەکەینەوە، کە ڕاســکۆ لینکۆف بڕیاردەدات خۆی بە دەســتەوە بدات. لەم ساتە گرنگەدا، کە پڕۆژە لە پێشترەکان فڕێدەداتە نێو ڕابردووەوە و پڕۆژەی نوێ دادەهێنرێت، شەرم، دوودڵی، خۆشی و هیوا تیایدا کۆدەبنەوە و واز لە شتێک دەهێنن و شتێکی دیکە دەگرین. وێنەیەکی ڕوونی سەربەســتییەکەمان بۆ دەکێشن. بەڵام، هێشتا ئەمانە هەموو پڕۆژەکان نین و چەند پڕۆژەیەکن لەنێو هەموویاندا.

بەمجۆرە پارادۆکسی لە کارکەوتنی بڕیاردانە سەربەستەکانمان کەمتر دەردەکەوێت. وەکو ئەوە وایە بڵێین، بە هۆی ویستەوە خۆمان بەتەواوی دروستدەکەین. بەڵام ئەو ویستەی ئێمە دروستدەکات لەنێو ئەو پڕۆژە بنەڕەتییەدا واتا بە خۆی دەبەخشێت، کە من ڕەتی دەدەمەوە. دواجاریش، کاری دروســتکردنەکە لە بانگەشەکردنەکەی جیاوازتر دەردەچێت. نەخشــەی بونیادەکەی دەکات، بەڵام هەرگز ناتوانێت پڕۆژە بنەڕەتییەکە بگۆڕێت.

پــاش ئەم باســکردنە بەدرێــژی دەردەکەوێت بــە ڕادەیەک لە تێگەیشــتنە ئۆنتۆلۆجییەکەی سەربەستی تێگەیشتبین. ئێمەش ئەم تێگەیشتنە لەچەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوە.

**یەکەم**، لەگەڵ ســەرنجدانمان بۆ ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی تێدەگەین، کە بوون بۆ ئەو کردنە. دەروونناســەکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئەوانەی ئاماژەیان بۆ جوڵانی هاندەرەکان، مەبەست و هەستکردن دەکرد، دروست بۆ کێشەکە چوون. بەڵام جوڵان کردنە. هیچ شــتێک، وەکو مەزاج، خەسڵەت، سۆز، یاساکانی هۆش زکماکی نین. ڕوانینێکی ئەزمونگەرانە بوونی مرۆڤ بە یەکێتییەکی ڕێکخراوی هەڵســوکەوتەکە دەردەخات. کەسێکی چڵێس، ترسنۆک یان بێزارکراو بە کردەوە خۆی بەو شێوەیە دەگونجێنێت. لێرەدا، دەروونناســە ڕەفتارگەرییەکان باشــتر بۆ کێشەکە چوون و مرۆڤ بۆ ڕەفتار و هەڵوێســتەکانی دەگەڕێننەوە. هەروەها، بەو جۆرەی فێرگەی گیشــتاڵت باسیدەکات و کارەکانی ژانێت دەری دەخەن، دەبێت بەدوای هەڵوێستە

سۆزدارەکاندا بگەڕێین و هەست بە ڕەفتارەکان بکەین چونکە هەستکردن لەدەرەوەی ڕەفتار و جیهاندا ڕوونادات. تەنانەت، گوێنەدانی زانســـتخوازەکانیش، کە هایدیگەر باســـیدەکات، بەرانبەر بابەتەکە هەڵوێســـتی گوێ پێنەدانە و لە ئاکامدا ئەمەش دەبێتەوە بە یەکێک لە هەڵوێستەکان. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەپێشدا پەیدانابێت و دوایی بەکارەکانی هەستێت. بوون بۆ ئەو کردنە و نەکردنیش نەبوونە.

**دووەم**، ئەگەر ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی کردن بێت، ئەوا ســـوربوونی لەســـەر کارکـــردن خودی کردنـــە. ئەگەر ئەم بۆچوونە ڕەتبدەینەوە و ســـوربوونی مرۆڤ لەسەر کارکردن بۆ حاڵەتێکی لەپێشتر لەنێو جیهاندا بگەڕێنینەوە، وەکو ئەوە وایە ئەوەی دەستدەکەوێت لە سەرەتای زنجیرەکەوە دابنرێت. کەوابوو، کردەوەکان، بۆ ئەوەی جێگە بۆ زنجیرەیەک جوڵان دروستبکەن، لەناودەچن. چەمکی کارکردنیش لەگەڵ بۆچوونەکەی ژانێت و دەروونناســـە ڕەفتارگەرییـــەکان دەفەوتێت. بوونی کارکردن سەربەخۆییە.

**سێیەم**، لەسەرو ئەمەوە، ئەگەر کردن جوڵانێکی ڕووت نەبێت، پێویستە لەسەر مەبەست پێناسبکرێت. گرنگ نییە چۆن مەبەستەکە بناسرێت، هێشتا ئەو شتەی دراوە ڕەتـــدەکات و دەیەوێـــت بە ئاکام بگات. ئەوەی دراوە شـــتێکی ئامادەیە و ناتوانێت خۆی جێبهێڵێت. شـــتێکە هەیە و پڕە. هیچ هۆیەک بەو دیاردەیە نادات، کە واتاکەی بەو کۆتاییەوە بەســـتراوە پێیدەگەین و هێشـــتا پەیدانەبووە. کاتێک دەروونناســـەکان، بۆنموونە، ئارەزوو بە حاڵەتێکی فاکتۆری دادەنێن، ئەوە نازانن، کە هەموو خەســـڵەتەکانی بوون لە ئارەزوو دادەماڵن. بۆ جیاکردنەوەی ئارەزووی سێکســـی لە ئارەزوو بۆ خەوتن دەبێت تەماشای کۆتاییەکانیان بکەین. کۆتاییش نییە. پێویستە دەروونناسەکان سەبارەت بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەو دیاردەیەی خۆی دەردەخات و لەســـەر شـــتێک ڕادەوەستێت، کە نییە بپرســـن. مەبەست بونیادی بنەڕەتی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییە لەسەر شـــتێکی دراوەوە باسناکرێت. ئەگەر کەســـێک بیەوێت لە ڕاڤەکردنەکەیدا مەبەست بە کۆتاییەکانەوە بناسێت پێویستە ئـــاگای لەوەبێت، کە کۆتایی بە دراو دانەنێـــت. دەکرێت کۆتایی بە دراوێک پێش ئاکامەکـــە دابنرێت. لێرەدا کۆتایی لەناخی نەبووندا دەبێت بە هۆکاری ڕاڤەکردنی ئارەزوویەک یان کردنێک بەگوێرەی کۆتاییەکەی و بۆ ئەو مەبەســـتە دەگەڕێتەوە، کە لە بونیادی کۆتاییەکە لەدەرەوەدا دامەزراوە. مەبەســـت لەڕێگەی هەڵبژاردنی کۆتاییەوە خۆی دروستدەکات و دەناسرێت.

**چوارەم**، مادام مەبەســـت هەڵبژاردنی کۆتاییە و جیهان لە هەڵوێستماندا خۆی دەردەخات، ئەوا هەڵبژاردنێکی پڕمەبەســـتی کۆتاییە دەبێتە هۆکاری دەرخستنی جیهان. جیهانیش، وەکو ئەمشـــتە و ئەوشتە بەگوێرەی کۆتاییە هەڵبژێردراوەکان دەردەکەوێت. کۆتایی، کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر جیهان، ئەوحاڵەتە پەیدانەبووەی

جیهانە دەمانەوێت دەستمان بکەوێت. ئەمەش ئاگامەندییەکی تێڕامانانەیە لەئاستی کۆتاییدا. کاتێکیش ڕوودەدات، کە ئاگامەندی سەبارەت ئەگەرەکەی خۆی تێڕامانانە نەبێت. کە برسیمە کۆتایی ئامانجەکەم ژەمی خواردنی چاکە. بەڵام ئەم ژەمە چاکە لەودیو تەپوتۆزی ڕێگاکە بووە بە پڕۆژەیەک واتای ڕێگاکە بەرجەستەدەکات (ڕێگاکە مـــن دەگەیەنێتە ئوتێلێک، کە مێزی خواردنی تێـــدا ڕازاوەتەوە و خواردنی خۆش لێنراوە و چاوەڕوانیم دەکرێت)، بە پەیوەندییەکەشی لەگەڵ پڕۆژەی ئەگەری بوونمدا، کـــە لە تێڕامان بەدەرە لە ئەگـــەری خواردنەکە تێدەگەین. لەگەڵ ئەم دووڵایەنەدا کە لەیەکدی جیانابنەوە 'مەبەست' ڕۆشنایی دەخاتە سەر جیهان و بە کۆتاییەکی پەیدانەبووی دادەنێت. کۆتایی من حاڵەتێکی دەرەکی نێو جیهانە و ئەگەری منیش بونیادێکی دیاریکراوی خۆیەتییە. یەکێکیان لە تێڕاماندا دەردەکەوێت و دووەمیان دەکەوێتە ئەودیو تێڕامانەوە.

**پێنجەم**، ئەگەر شـــتە دراوەکە پێناسی مەبەســـتەکە نەکات، ئەوا مەبەستەکە و شـــتە دراوەکـــە لە یەکدی دادەبڕێـــن. لەگەڵ ڕوونەدانی ئەمحاڵەتەدا 'ئێســـتا' پڕدەبێـــت لە زنجیرەیەک ڕووداوی بێداهاتوو. هەروەها، دابڕانەکە بۆ ناســـینەوەی شـــتە دراوەکە پێویســـتە. لەڕاســـتیدا، دراوەکە نابێت بە هۆکار بۆ کردن ئەگەر نەناســـرێت. ناسینەکەشـــی ئەو کاتە ڕوودەدات، کە خۆمانی لێ دووربخەینەوە و لەبەر ڕۆشـــنایی شـــتێکی دیکەدا بیبینین. ئەوشـــتەش کۆتاییەکەیـــە. کەوابوو، مەبەست لە سەرهەڵدانێکی یەکگرتوودا کۆتاییەکە دیاریدەکات، خۆی هەڵدەبژێرێت و شـــتە دراوەکە لە کۆتاییەکەدا دەناســـێت. لەنێو ئەم بارودۆخەدا شتە دراوەکە بەو کۆتاییە دادەنرێت، کە هێشـــتا پەیدا نەبووە. لەبەر ڕۆشـــنایی ئەم نەبوونەدا بوون-لەنێو-خۆ دەردەکەوێت. دوو جۆر لەناوبردنی شـــتەدراوەکە تیایدا ڕوودەدات؛ لەلایەکەوە لەڕێگەی دابڕانەکەوە هەموو کارتێکردنەکانی خۆی بەسەر مەبەستەکەوە دەدۆڕێنێت؛ لەلاکەی دیکەشـــەوە، ڕوو لە لەناوچوونێکی دیکە دەکات. نەبوونەکە دەبێتـــە هۆکاری گەڕانەوەی کارتێکردنەکە. مادام ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتیکردنە، لە ناوەڕۆکدا دەبێت بەو بوونەی لە شـــتە دراوەکە دادەبڕێت. ئەو بوونەیە لەگەڵ دابڕان و ڕۆشنایی خستنە سەر ئەو شتەی هێشتا پەیدانەبووە شتە دراوەکە لەوێدا دەهێنێتە کایەوە.

**شەشەم**، پێویستی شـــتە دراوەکە لە بەستێنی ڕووگەی لەناوچوونەکەوە پەیدا دەبێـــت و لـــە ڕەتدانەوەی ناوەکیـــش دەچێت، کە ئێمە لە کەرتـــی دووەمی[ئەم نوسراوەدا] باسمانکرد. بێسودیشە بیر لە ئاگامەندی بەبێ شتێکی دراو بکەینەوە. لەمحاڵەتـــەدا ئاگامەندی دەبێت بە ئاگایی لە خۆی، وەکو ئاگایی لە هیچ، ئەمەش نەبوونی ڕەهایە. بوونی ئاگامەندیش بە شـــتە دراوەکەوە ئەو واتایە نابەخشـــێت، کە شـــتە دراوەکە ئاگامەندی مەرجداردەکات. ئاگامەندی ڕەتدانەوەیەکی ســـادە

و ڕەوانی شـــتە دراوەکەیە. بوونیشـــی مامەڵەنەکردنە لەگەڵ هەندێک شتی دراو، هەروەها مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەو شتە پەیدا نەبووانەی لە کۆتاییدان. ڕەتدانەوەی ناوەکیش ڕاســـتەقینەی ئەو بوونەیە بەردەوام لە پەیوەندییەکەی لەگەڵ خۆیدا لە خـــۆی دووردەکەوێتەوە. ئەگەر ئەم بوونە خۆی ڕەتنەداتەوە دەبێت بەوەی هەیە، بۆنموونە شتێکی سادەی دراو. لەبەر ئەمە پەیوەندی بە شتی دراوەوە نییە چونکە شـــتی دراو ئەوەیە، کە بە سروشت هەیە. ئەمەش هەموو ئەگەرەکانی دەرکەوتنی جیهـــان دەهاوێتە دەرەوە. بۆئەوەی نەبیت بە شـــتێکی دراو، بوون-بۆ-خۆ دەبێت بـــەردەوام لە خۆی دووربکەوێتەوە؛ بەردەوام بوونی خۆی بکات بەوەی، کە نییە. ئەم خەسڵەتەش بوون-بۆ-خۆ وادەردەخات، کە یارمەتی نەدرێت و کۆڵەکەیەکیش بۆ ڕاگرتنی هەبوونی نادۆزێتەوە. لە ســـەرێکی دیکەوە، بوون-بۆ-خۆ سەربەستە و جیهان پەیدادەکات. ئەو بوونەیە دەیەوێ لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی هەیە ببێت بەوەی لە داهاتوودا دەیگاتێ.

سەربەستی بوونی بوون-بۆ-خۆیە. مادام سەربەستیش شتێکی دراو یان خەسڵەت نییە، تەنیا لـــە هەڵبژاردنی خۆیدایە. سەربەســـتی بوون-بۆ-خـــۆ مامەڵەکردنە؛ سەربەســـتی نادیار و بێ هەڵبژاردن نییە. ئێمە بەبێ هەڵبژاردن لە بوونی خۆمان تێناگەین. بەڵام سەربەستی ئەو فاکتۆرەیە، کە هەڵبژاردن بەبێ مەرج دادەنێت.

**حەوتـــەم**، هەڵبژاردنێـــک بەبـــێ بناخـــە و دیاریکردنی هۆکارەکانـــی بێ واتا دەردەکەوێت. هۆی ئەمەش بۆ ئەو خاڵە دەگەڕێتەوە، کە سەربەستی بوونی خۆی هەڵدەبژێرێت، بەڵام نابێت بە بناخە بۆ بوونی خۆی. ئێمە دوایی لەم بەشـــەدا بۆ پەیوەندی نێوان سەربەســـتی و فاکتۆر باسیدەکەین. ئێستا ئەوەندە دەڵێین، کە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی دەتوانێت خۆی هەڵبژێرێت و ناتوانێت خۆی هەڵنەبژێرێت. تەنانەت ناتوانێت نەبێت؛ لەڕاســـتیدا، خۆ کوشتن هەڵبژاردنە و سەلماندنی بوونە. لەم ڕێگەیەوە، کە دەبێت بە شـــتێکی دراو، ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی بەشداری لە هەڵکەوتـــی هەمەکی بووندا دەکات، کە ئێمە بە بێهودەیـــی ناوزەدیدەکەین. ئەم هەڵبژاردنـــە لەبەر ئەوە بێهودە نییە، کە بـــێ هۆکارەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە ئەگـــەری خۆ-هەڵنەبژاردنی نییە. هەموو هەڵبژاردنێک لەســـەر بوونێک دامەزراوە چونکـــە هەڵبژاردن هەیە. بەڵام ئـــەم هەڵبژاردنە لێرەدا، وەکـــو ئەو دیاردەیەی ســـەرهەڵدەدات و پەیوەندی بە هیچ شـــتێکەوە نییە، بێهـــودە نییە. لەو ڕووەوە بێهودە دەبێت، کە بە هۆی هەڵبژاردنەوە هەموو بناخە و هۆکارەکان دێنە بوونەوە و واتایان پێدەبەخشرێت. بێهودەیە چونکە بوونێکە لەودیو هۆکارەکانەوە. کەوابوو، سەربەستی بەوجۆرەی ڕۆشنایی دەخاتە سەر بوونی کۆتاییەکە هەڵکەوتێکی سادە و ڕووت نییە. هەڵهاتنێکی بەردەوامە لەدەست هەڵکەوتن؛ بە ناوەکیکردن، لەناوبردن و بەخۆکردنی هەڵکەوتەکەیە، کە دەبێت بە هەڵبژاردن.

**هەشــتەم،** پرۆژە سەربەســتانەکە بنەڕەتییە چونکە بوونی منە. نابێ تەماع و ســۆزمان خۆش بوێ و گرێی هەستکردن بەکەمیش بە پرۆژەی بنەڕەتی دابنرێت. بەڵکو پێویســتە لە پرۆژە بنەڕەتییەکانەوە لەوان تێبگەین و بیاناسین. میتۆدێکی فینۆمینۆلۆجی دیاریکراو بۆ دەرخســتنی پرۆژە ســەرەتاییەکە دەبێ بدۆزینەوە. ئێمە ئەم میتۆدەش ناودەنێین ســایکۆلۆجی شــیکاری بونگەرایەتی و لە بەشــی داهاتوودا باســیدەکەین. ئێستا، ئێمە دەڵێین پرۆژە بنەڕەتییەکە، کە بوونی منە، پەیوەندی بەمشــتە و ئەوشــتەوە نییە، بەڵکو هەمووی بوونمــە لەنێو جیهاندا. مــادام جیهانیش لەبەر ڕۆشــنایی کۆتاییەکە دەردەکەوێت ئــەوا پرۆژەکە لەگەڵ ڕووکردنی بــەرەو کۆتاییەکە جۆرە پەیوەندییەک بە جیهانــەوە دیاریدەکات، کە بوونـ‌بۆ‌ـخۆ دەیەوێت هەیبێت. پرۆژەکە ســاتیش نییە چونکە دەشێ لەنێو کاتدا نەبێــت. هەروەهــا بەوجۆرەش لە کات بەدەریش نییــە تاکو دوایی کات بۆ خۆی دابنێ. بیرۆکەی "هەڵبژاردنی خەســڵەتێکی ئاگامەندانەی" کانت ڕەتدەدەینەوە. بونیادی هەڵبژاردن لەوەدایە، کە هەڵبژاردن لەنێو جیهاندا بێت. ئەو هەڵبژاردنەی هیچــە و دژی هیچە هەڵبژاردنی هیچە و وەکو هەڵبژاردنیش ڕەتدەدرێتەوە. تەنیا هەڵبژاردنــی دیاردەیی هەیە بە مەرجێک ئێمەش لە دیاردە، وەکو ڕەها تێبگەین. بــەڵام لەگەڵ ســەرهەڵدانیدا هەڵبژاردن دەبێت بە کاتی چونکە دەیەوێت ئێســتا بــە داهاتوو ڕوشــنبکات. ئێمە، لێرەدا، لەبەر ئەوەی مامەڵــە لەگەڵ هەڵبژاردندا دەکەین ئەوا هەموو هەڵبژاردنێکمان ئاماژە بۆ هەڵبژاردنی دیکەش دەکات. ئەگەری هەڵبژاردنەکانی دیکە نە سەریانهەڵداوە و نەئاشکران. ئەمەش واتای بێهودەیی بە هەڵبژاردن و بوونم دەبەخشێت. کەوابوو، سەربەستییەکەم دەبێت بە سەرەخۆرەی سەربەستییەکەم. مادام من سەربەستم، هەموو ئەگەرەکانی خۆم دەکەم بە پرۆژە. هەمانکات، من خۆم، وەکو کەسێکی سەربەست دەردەخەم و دەتوانم بەردەوام ئەم پرۆژەیەم ڕەتدەنەوە و بیکەم بە ڕابردوو.

کاتێک بوونـ‌بۆ‌ـخۆ دەیەوێت بیر لە خۆی بکاتەوە ئەو شــتەی هەیە لەڕێگەی پرۆژەی نەبوونەوە دەناسێت، لە بوونی خۆی ڕادەکات. ئەوەی هەیە بەجۆرێکی دیکە دەردەخات. خۆنەســەلماندنەکەی بەسە تاکو سات بەرجەستەبکات؛ کە بە نەمانی پرۆژەی پێشو پرۆژەی نوێ دروســتدەکات. سەرهەڵدانی پرۆژەی نوێ لەناوبردنی پرۆژەی پێشــوە. لەبەرئەمە بوونـ‌بۆ‌ـخۆ لەبوونی نوێــی خۆی دڵنیانییە. لەگەڵ ڕەتدانــەوەی ئەو پرۆژەیــەی کەوتۆتە نێو ڕابردووەوە دەبێت بــەو پرۆژەیەی، کە 'هەبوو'، واتە، پرۆژەکانی نێو ڕابردوو دەبن بە هەڵوێستی بوونـ‌بۆ‌ـخۆ. هیچ یاسایەکی بوون ژمارەیەکی لەپێســتر بۆ پرۆژەکانی بوونم دانانێت. ئەم بوونەی بوونـ‌بۆ‌ـخۆ جەوهەری مەرجدار دەکات. بەڵام پێویستە پرس بە مێژووی هەموو مرۆڤێک بکەین تاکو لەبارەی ئەو بوونـ‌بۆ‌ـخۆیەوە بیرۆکەیەکی لێوەرگرین. پرۆژە هەندەکییەکانمان

لەنێو جیهاندا ڕوو لە داهاتوویـــەک دەکەن و هەموویان لەنێو پڕۆژەیەکی جیهانیدا یەکیـــان گرتووە، کە بوونـــی ئێمەیە. بەڵام ئێمە هەمووی هەڵبـــژاردن و کردنین، ئەوا پڕۆژە جیهانییەکە پڕۆژە هەندەکییەکان ســـنوردار ناکات. هەریەکێک لە ئەوان هەڵبژاردنە؛ جۆرێک لە هەڵکەوت و داهاتووەکەی نەناسراوە. لەگەڵ ئەمەشدا لەنێو بەســـتێنی هەموو پەیوەندییەکانی منەوە لە بوونم لەنێو جیهاندا دەناســـرێن. لەم تیبینیانەوە بیردەکەینەوە باســـی سەربەستی بوون-بۆ-خۆمان لە بنەڕەتی بوونیدا کردبێت. هەروەها، بینیمان ئەم سەربەستییە داوای شتێکی دراوەدەکات، نەک وەکو ســـنورداری بەڵکو چەند مەبەســـتێکی دیکە. یەکەم، سەربەستی ڕەتدانەوەی شتە دراوەکەیە (خاڵـــی پێنجەم)؛ بەڕادەیەک ڕەتدانەوەی ناوەکی و ئاگامەندانەیە (خاڵی شەشـــەم)و ئاگامەندییەکەش ئاگامەندییە لە شتێک. بێجگە لەمە سەربەستی واتە سەربەستی هەڵبژاردن نەک سەربەستی هەڵنەبژاردن.

هەڵنەبژاردنیش، لەڕاستیدا، هەڵبژاردنی هەڵنەبژاردنە. ئاکامی ئەمەش ئەوەیە، هەڵبـــژاردن بناخەی بوونێکـــی هەڵبژێردراوە نەک خودی هەڵبـــژاردن. هەروەها، بێهودەیی سەربەستییە (کە لە خاڵی حەوتەمدا) ڕوونکرایەوە. لەپێشدا ئاماژەمان بۆ شتێکی دراو کرد، کە بێجگە لە فاکتۆری بوون-بۆ-خۆ چی دیکە نییە. دواجاریش، پـــڕۆژە جیهانییەکەی، جیهان ڕۆشـــندەکاتەوە. بە هۆی ئەم و ئەو هەڵوێســـتەوە دەکرێت دیاریبکرێت و بخرێتە سەر هەڵکەوتی جیهان.

هەموو ئەم خاڵانە بەرەو گرفتێکی گرانمان دەبەن: ئەویش پەیوەندی سەربەستییە بە فاکتۆرەوە. هەروەها، توشـــی ڕەخنەشـــمان دەکەن. ئایا من، کە کورتە باڵام دەتوانـــم هەڵیبژێرم باڵابـــەرز بم؟ ئەگەر قۆڵێکم هەبێـــت دووان هەڵبژێرم؟ هتد. ئەمەنە سنورداریێتین، کە فاکتۆری حاڵەتەکەم بەسەر سەربەستی هەڵبژاردنەکەمدا دەیســـەپێنێت. کەوابوو، باشـــترە لە لایەنەکانی دیکەی سەربەستی بکۆڵینەوە و باسی پەیوەندییەکەی بە فاکتۆرەوە بکەین.

## ٢. سەربەستی و فاکتۆر: هەڵوێست

ئەو بەڵگە باوەی دژی سەربەستی دادەنرێت گرنگی باسەکەمان بیردەخاتەوە. دەردەکەوێت بەبی گۆڕانی هەڵوێســـتمان نەتوانین خۆمان بگۆڕین. من لە وازهێنان لە چینەکەم، نەتەوەکەم و خێزانەکەم یان لە دامەزراندنی دەستەڵات و چارەنوسی خۆمدا سەربەست نیم. من بە کرێکاری، وەکو فەرەنسییەک و بە نەخۆشی سفلسەوە یان سیلەوە لەدایکبووم. مێژووی ژیان، بەهەرجۆرێک بێت، مێژووی سەرنەکەوتنە. هەروەها، بۆ پەیڕەویکردنی سروشـــت پێویستە ملکەچ بیت؛ ئەمەش دامەزراندنی کارەکانمە لەنێو تۆڕی ناچارەکییدا. لەوەدەچێت مرۆڤ لەجێگەی خۆدروســـتکردن

ئاووهەوا، زەمین، ڕەگەز یان چین و زمان دروســـتیبکەن. ئەو بەشێکە لە میرات، بارودۆخی منداڵی، ڕەوشت و ڕووداوە گەورە و بچوکەکانی ژیانی.

ئەم بەڵگەیە گرفتێکی گەورەی بۆ شــوێنکەوتوانی سەربەستی دروستنەکردووە. دێکارت، لەپێش هەموو بیریارەکانەوە (ویســـتی)بە نەبڕاوە داناوە و لەو باوەڕەشدایە پێویســـتە "خۆمان بدۆزینەوە نەک چاوەڕوانی چارەنوس بین." لێرەدا، دەبێت چەند جیاوازییەک دەستنیشـــان بکرێن. شوێنکەوتوانی ناچارەکی باس لە چەند فاکتۆریک دەکەن، کە پێویســـت نـــاکات ئێمە ئاوەڕیان لێبدەینـــەوە. بەتایبەتی پێکەوەبوونی لایەنە دژەکان لەنێو شـــتەکاندا دژی سەربەســـتی بە بەڵگـــە دانانرێت چونکە ئێمە پەیدایاندەکەیـــن. لوتکەی چیاکە، کە خۆی بە بەرز و ســـەخت بـــۆ پێداهەڵگەڕان دەردەخات، بۆ تەماشاکردنی دەشت و دۆڵەکە شوێنێکی خۆشە. لوتکەکە بە تەنیا و بەبێ ئەم پەیوەندییانە شتێکی بێ لایەنە: چاوەڕوانە کۆتاییەک ڕۆشنایی بخاتە سەر و بدۆزرێتەوە و خۆی، وەکو کۆسپ یان شوێنێکی خۆش دەربخات. هەروەها، خۆی لەنێو بەستێنی ئامێرە-ئالۆزەکان، کە لەپێشتر باسمانکرد، بەرجەستەدەکات. بەبێ تەکنیکی هەڵگەڕان بەسەر شاخدا و ئەو شتانەی پێویستیمان پێیانە لوتکەکە بۆ هەڵگەڕان نە ئاسان و نە سەختە؛ پرسیارکردنەکەش لەبارەیەوە پەیوەندی بە شاخ هەڵگەڕان نابێت. شتە سەختەکان (کە هایدیگەر بە 'هەبووە سەختەکان' ناوزەدیان دەکات، لەسەرەتاوە سەربەستی کارکردنەکانمان بەربەستدەکەن، بەڵام سەربەستییەکەمان ئەو بەستێن و تەکنیکانە یان کۆتاییانە پێکدەهێنن، کە پەیوەندییان بە دەرخستنی بەربەستەکەوە هەیە. ئەگەر لوتکەکە "زۆر ســـەخت بۆ هەڵگەڕانیـــش" دەرکەوێت، ئێمەش کۆڵ لە هەڵگەڕانەکە بدەین لوتکەکە بەمجۆرە خۆی نیشاندەدات چونکە لەبنەڕەتەوە ئێمە بەو شتەمان دانا، کە دەتوانین پیایدا هەڵگەڕێین. کەواتە، سەربەستییەکەمان ئەو ڕێگرانە پێکدەهێنێت، کە توشمان دەبن.

هەڵبەتە، پاش ئەم تێبینیانە، ئـــەوەی ناوی نەهێنراوە و بیری لێنەکراوەتەوە لە بوون-لەنێو-خۆدایە، کە لەو فاکتۆرە بەرپرســـە سەربەســـتییەکەمان ڕۆشنایی دەخاتەســـەر. ئەم پاشماوەیە نابێت بە بەربەستی سەربەسستی: لەڕاستیدا چەند پاشماوەکە سەخت بێت سەربەستییەکەش زۆرتر دەبێت بە سەربەستی. بێگومان، هەموو کەســـێک لەگەڵ ئێمە لەســـەر ئەو خاڵە هاوڕایە، کە کەسێکی سەربەست ئەوەیە بڕیار لەســـەر پرۆژەکانی بدات. بۆ ئەوەی بە کردەوە پرۆژەکان دابمەزرێن و بڕیاردان لەســـەر کۆتایی پرۆژەیەکی ســـادە دەبێت لە ناســـینەوەی لەپێشتری کۆتاییەکە جیابکرێتەوە. ئەگەر ناســـین بۆ بڕیـــاردان بەس بێت، ئەوا بە جۆرێک دەکەومە نێو جیهانەوە، کە خەون و ڕاســـتەقینەی تێدا جیانەکرێنەوە. من حوکم بەســـەردادراوە گۆڕانکارییەکانی جیهـــان لەگەڵ گۆڕانکارییەکانـــی ئاگامەندیمدا

ببینــــم؛ من ناتوانم له پەیوەندییەکەمــــدا لەگەڵ چەمکەکەم "لەنێو کەوانەدانان" و دواخســـتنی حوکمدانەکەم بکەم، کە ڕاســـتەقینە لە چیرۆک جیادەکاتەوە. ئەگەر بابەتێک کتوپڕ لەگەڵ هەســـتپێکردنەکەدا ســـەرهەڵدات ئەوا ناتوانین هەڵیبژێرن یـــان ئەو بابەتە بێت ئێمە دەمانەوێت. کاتێک جیاوازی لەنێوان حەزێکی ســـادە، نوێنەرایەتییدا من هەڵیدەبژێرم و هەڵبژاردن دامەزرا، سەربەستیش وندەبێت. ئەو کاتە سەربەستین، کە دوا چەمکێک ئێمە بە خۆمان دەناسێنێت دەبێت بە کۆتایی و ئەوەی هێشتا نییە. لە ئاکامدا، دەشێ کۆتاییەکە بەرزێتی بێت بەتایبەتی ئەگەر هەبوویەکی ڕاســـتەقینە بێت و ئێمەش لە خۆی جیابکاتەوە. لەگەڵ ڕەتدانەوەی ناوەکیدا بوون-بۆ-خۆ ڕۆشـــنایی دەخاتە ســـەر بوونی شتەکان و پەیوەندییان بە یەکدییەوە. لێرەدا، سوڕانەوەی بازنەیی نادۆزینەوە چونکە سەرهەڵدانی بوون-بۆ-خۆ ڕاســـتەوخۆ کاریگەرێتی خۆی دەنوێنێت. ئەگەر ئەمەش دروســـت بێت، ئەوا بەرجەستەبوونی شتەکان لە سەربەستی جیانابێتەوە. بە هۆی ئەوانەوە سەربەستی خـــۆی لەکۆتاییەکە جیادەکاتەوە و یەکدەگرێتەوە، کە[بوون-بۆ-خۆ]دەکات بەوەی هەیە. بەرگریکردن لەلایەن هەبوویەکەوە مەترســـی بۆ سەربەستی دروستناکات و یارمەتیدەدات خۆی وەکو سەربەســـتی بەرجەستەبکات. سەربەستی بوون-بۆ-خۆ بە بەرگریکردن لەلایەن جیهانەوە هەیە. لەدەرەوەی ئەم پەیوەندییەدا چەمکەکانی سەربەستی، ناچارەکی و پێویستی واتایان وندەکەن.

لەســـەرو ئەمەوە پێویســـتە ئاماژە بۆ ئەو خاڵەش بکەین، کە سەربەستی ئەو واتایە نابەخشـــێت "هەموو خواستێکت بەدەســـت بهێنێت"، بەڵکو ئەوەیە (لەنێو واتا بەرفراوانەکەی هەڵبژاردندا) "کەســـێک خواســـتەکانی خۆی دیارییبکات." بە واتایەکی دیکە، ســـەرکەوتن بۆ سەربەستی گرنگ نییە. بەڵگەی کەسە سادەکان دژی فەیلەســـوفەکان لە تێنەگەیشـــتنەوە پەیدادەبێت: چەمکـــی ئەزمونگەرانە و باوی سەربەســـتی، کە بارودۆخی مێژوویی، ڕامیاری و ئاکاری هێناویانەتە کایەوە، "تەوانایيە بۆ گەیشـــتن بە کۆتایی." چەمکی فەلســـەفی و تەکنیکی سەربەستی، ئەو چەمکەی ئێمە دەمانەێت بەکارییبهێنین ســـەربەخۆیی هەڵبژاردنە. بەهەرحاڵ، پێویســـتە، ئەوەش بزانین کە هەڵبژاردن و کردن یەک شـــتن و بۆ ئەوەی خەون و خواست لەیەکدی جیابکرێنەوە دەبێت پێش بڕیاردان لەسەری هەڵبژاردن بناسرێت. ناگونجێت بڵێین زیندانییەکە هەمیشـــە لە چوونەدەرەوەی لە زیندان سەربەستە. ئەمە بێهودەیە یان بڵێن لە حەزکردنەکەی بۆ بەربوون سەربەستە، کە ڕاستییەکی سادەیە. ئەو لەهەوڵدانیدا بۆ ڕاکردن لە زیندان (یان بەربوون) سەربەستە؛ لەهەرچ حاڵەتێکدا بێت، دەتوانێت ڕاکردن بکات بە پڕۆژە و بەهاکەشی لەڕێگای کارکردن بۆ ڕاکردنەکە دیارییبکات.

لەبەرئـــەوەی هەڵبـــژاردن و کردن لـــە یەکدی جیاناکەینەوە، باســـەکەمان بۆ سەربەســـتی زۆرمان لێدەکات واز لە جیاوازی نێوان مەبەست و کردنیش بهینین. وەکو چۆن بیرۆکەکان لەو زمانە جیانابنەوە، کە دەریاندەبڕێت مەبەستیش لە کردن جیانابێتەوە؛ گوتەکانمان بیرۆکەکانمان دەردەخەن و کردەوەکانیشمان مەبەستەکان بەرجەستەدەکەن. یارمەتی مەبەستەکانمان دەدەن تاکو مامەڵە لەگەڵ بابەتەکاندا بکەن.

دێکارت، پاش تێگەیشـــتن لە ڕواقییەکان، ئەم جیاوازییەی نێوان سەربەستی هەڵبژاردن و سەربەســـتی بۆ وەدەستهێنان باســـکردوە. هەروەها، کۆتاییش بەو بەڵگانە دەهێنێت، کە لەســـەر جیاوازی نێوان "ویســـت" و "توانایی" ڕادەوەستن و تاکو ئەمڕۆش نەیارانی سەربەســـتی بەکاریاندەهێنن. لەگەڵ ئەمەشدا، دروستە سەربەســـتی لەلایەن بابەتە ڕەتدراوەکەیەوە بەرەنگاری دەکرێت. بۆ دەرخســـتنی ئەوەی بزانین، کە لایەنە دژوەســـتاوەکان و خەســـڵەتی بابەتەکە لە سەربەستی جیانابنەوە، دەبێـــت بەڵگەیەک دابمەزرێنین دوو ڕێگا ببڕێـــت؛ یارمەتیمان بدات بیســـەلمێنین سەربەســـتی لە ئاستی بابەتە دراوەکەیدا بە ســـاختە دەرناچێت و لەلایەکی دیکەشەوە بارودۆخێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ سەربەستی دەربخات. ئایا نابێت لەگەڵ هەندێک فەیلەســـوفی سەردەمدا بڵێین، سەربەســـتی بەبێ ڕێگرتن نییە؟ وەکو چۆن ئەوەمان باســـکرد، کە سەربەســـتی بەتەنیا ناتوانێت ڕێگەگرتنەکە بۆ خۆی دروستبکات، مەحاڵیشـــە بڵێین بوون-لەنێو-خۆ ئۆنتۆلۆجییانە لە بوون-بۆ-خۆ لەپێشـــترە. لەبەرئەمە بۆ خاڵەکانی پێشـــومان دەگەڕێینەوە و مامەڵە لەگەڵ پرســـیارەکەمان ســـەبارەت فاکتۆر دەکەیـــن. ئێمە ئەو خاڵەمان ســـەلماند، کە بوون-بۆ-خۆ سەربەســـتە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێـــت بوون-بۆ-خۆ بناخەی بوونی خۆیەتی. ئەگەر سەربەستی لەوەدابێت ئەو بوونە بناخەی خۆیەتی، ئەوا پێویستە سەربەستی بڕیار لەسەر بوونی خۆی بدات. ئەم پێویستییەش بە دووجۆر واتاکەی لێکدەدرێتەوە. یەکەم، پێویستە سەربەستی بڕیار لەسەر بوونی-سەربەستی خۆی بـــدات. ئەمەش تەنیا لە هەڵبژاردنی کۆتاییدا نییە، بەڵکو دەبێت بوونی خۆشـــی هەڵبژێرێـــت. ئەمە ئـــەوە دەگەیەنێت، کە ئەگەر بوونی سەربەســـت و بوونی نا-سەربەست پێکەوە و بەیەکسانی لەبەردەم هەڵبژاردنە سەربەستەکەدا قوتدەبنەوە. مادام سەربەســـتییە لەپێشترەکە بۆ هەڵبژاردنی سەربەستی پێویستە ئەوا توشی پرۆسەیەکی نەبڕاوە دەبین. لەڕاستیدا، ئێمە ئەو سەربەستییەین، کە هەڵدەبژێرێت، بەڵام هەڵینابژێرین سەربەســـت نین. حوکم بەســـەر ئێمەدا دراوە سەربەست بین، وەکو لەپێشتر باسمانکرد، فرێدراوینەتە نێو سەربەستییەوە یان هایدیگەر گوتەنی، (بەجێماوین). بەجێمانەکەش بێجگە لە سەربەستی هیچ بناخەیەکی دیکەی نییە. ئەگەر سەربەستی ڕاکردن لە بابەتە دراوەکە و فاکتۆر بێت، ئەوا فاکتۆری ڕاکردن

له فاكتۆر دێتەكایەوە. ئەمەش فاكتۆری سەربەستییە. مادام سەربەستی نابێت بە بناخە بۆ بوونی خۆی، ئێمە دەتوانین بە جۆرێكی دیكەش لەم خاڵە تێبگەین، كە بەهەمان ئاكاممان دەگەیەنێت. ئەگەر سەربەستی بڕیار لەسەر بوونی خۆی بدات تەنیا بوونی نا-سەربەستانەی من نابێت بەشتێكی پێویست بەڵكو نەبوونی ڕەهای منیش دەبێت بە گونجاو. ئێمە بینیمان چۆن لە پرۆژەی سەرەتایی سەربەستیدا كۆتایی بۆ هۆكارەكان دەگەڕێتەوە تاكو پێكیان بهێنێت؛ بەڵام ئەگەر سەربەستی بناخەی خۆی بێت، ئەوا كۆتاییەكە دەبێت بۆ خۆی بگەڕێتەوە و هۆكەش بهێنێتە بوونەوە. بابزانین ئاكامی ئەمە چییە: بوون-بۆ-خۆ لە نەبوونەوە بۆ گەیشتن بە كۆتایی ڕێدەگرێت. ئەم شێوازی بوونە بەگوێرەی كۆتاییەكەی دەگونجێت نەك بەگوێرەی ماف یان فاكتۆر. هەروەها، دروستە لەنێو یەكێك لەو هەزار ڕێگایانەی بوون-بۆ-خۆ ڕوویانتێدەكات، ئەم بوونە خۆی بە كەسانی دیكە، وەكو بوونێكی خاوەن ماف بناسێنێت. ئێمە لەنێو بەستێنێكی بەرفراوانی پرۆژەیەكماندا، كە بوونمان لە هەڵسوكەوتەدا دیاریدەكات لەسەر مافەكانمان سوردەبین. ئەمەش هۆكارە بۆ خۆدانانی مرۆڤ بە هەڵسوكەوتەكانی و خۆی لەبەردەم "دادوەری نێو دادگا" و "فەرمانبەری داراییدا" دەبینێت. بوونی هەریەكێك لەم هەڵسوكەتانە لەسەر كۆتاییەكەیان ڕاوەستاوە. بە خۆدانانی یەكێك لەوان دەكەوێتە سەر خۆپاراستنیش لە هەڵكەوت. بەڵام سەركەوتن، وەدەستهێنان لە ڕاكردن و هەڵكەوت دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی بوونی هەڵكەوتەكە. سەربەستی بە كۆتاییەكەی خۆی سنوردارناكات. بێگومان بە هەڵبژاردنەوە هەیە، كە كۆتاییەكە دروستدەكات، بەڵام خاوەنی ئەو ڕاستییەش نییە، كە گوایە سەربەستییەك هەیە كۆتاییەكە دەناسێت. ئەو سەربەستییەی بوونی خۆی پێكدەهێنێت واتای سەربەستی وندەكات. سەربەستی دەستەڵاتێكی سادە و بێسنور نییە. ئەگەر وا بوایە دەبوو بە هیچ یان بوون-لەنێو-خۆ؛ بە تێهەڵكێشكردنی شێواوی نەبوون و بوون-لەنێو-خۆ كەسێك سەربەستی بە هێزێكی ڕووتی پێش هەڵبژاردن دادەنێت. سەربەستی لەگەڵ سەرهەڵدانی كردەوە خۆی سنوورداردەكات. وەكو بینیمان، كردنیش پێویستی بە لەناوبردنی بابەتەكەی هەیە. مرۆڤ كار لەسەر شتێك یان بەرانبەر شتێك دەكات. كەوابوو، سەربەستی كەمی بوونە لە پەیوەندییەكەیدا لەگەڵ شتە دراوەكە؛ بوون بە پڕی سەرهەڵنادات. ئەگەر ئەم كەلەبەرە بێت لە بووندا، ئەم نەبوونەی بوون، كە باسمانكرد، پێویستی بە هەموو بوونە تاكو لەوێوە، وەكو كەلەبەر خۆی دەربخات. بوونی خۆی لە نەبوونەوە دیارنیاكات چونكە هەموو بەرهەمێك لەبەر ڕۆشنایی نەبووندا تەنیا بوون-لەنێو-خۆیە.

ئێمە لە كەرتی یەكەمی ئەم نوسراوەدا سەلماندمان، كە نەبوون تەنیا لەنێو بووندا سەرهەڵدەدات. ئێستا دەمانەوێت لە پەیوەندی نێوان بونیادەكانیان

تێبگەین. لەبەر ئەوەی سەربەستی ڕاکردنە لە بوون و خۆ لەگەڵ بووندا ڕێکناخات، لەنێو پرۆژەی (پشکنین)دا دروستدەبێت؛ ئەگەر کەسێک لەنێو ئامانجێکدا زیندانی نەکرابێت لێی ڕاناکات. پرۆژەی (خۆ) لە قەراخ بووندا ناتوانێت ببێت بە لەناوبەری بوونەکە. سەربەستی ڕاکردنە لە مامەڵەکردن لەگەڵ بووندا؛ لە ناوبردنی ئەو بوونەیە، کە هەیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە دەبێ لەپێشـــدا ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی هەبێت و دوایی سەربەستییەکەی بدۆزرێتەوە. لەپێش و دوایی دوو چەمکن خودی سەربەستی دایهێناون. سەربەستی دووجۆر لەناوبردنە، لەناوبردنی ئەو بوونەی، کە هەیە و لەناوبردنی ئەو بوونەی لەنێو بوونە هەبووەکەدایە. ئاشـــکرایە، سەربەستی بوونـ-لەنێو-خۆ نییە. بەڵام لەبەر ڕۆشنایی کەمییەکە و ئەو کۆتاییەی هەڵبژاردوە بوونێک هەیە، کە دەبێت بەبوونی ئەو. سەربەســـتی لەپشـــت بوونی خۆیەتی یان لەودیو ئەو بوونەیە، کە هەڵینەبژاردوە؛ مادام ئاوەڕ لە خۆی دەداتەوە، سەربەستی دەبێت بەســـەرچاوە بۆ سەرهەڵدانی پەیوەندییەکەی بە بوونەوە؛ یان بوونی لەنێو جیهاندا. سەربەســـتیش ئەوە نییە کەسێک سەربەست بێت سەربەست نەبێت یان بوونی نەبێت. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاســـتەقینەیەی، کە ئەو ناتوانێت نەبێت یان نەبێت بەهەڵکەوت. هەڵکەوت و فاکتۆر یەک شـــتن؛ بوونێک هەیە، کە سەربەستییە و لە شێوازی نەبوون (لەناوبردن)دایە. بوونی فاکتۆری سەربەستی یان بوون لەنێو جیهاندا یەک شتن و لەیەکدی دەچن. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لە بنەڕەتەوە سەربەستی پەیوەندییە لەگەڵ شتە دراوەکەدا.

ئایا ئەم پەیوەندییە چییە؟ ئایا ئەوە دەگەیەنێت، کە شتەدراوەکە (بوونـ-لەنێو-خۆ) سەربەســـتی ســـنوورداردەکات؟ با لە نزیکەوە تەماشای ئەم کێشەیە بکەین. شـــتەدراوەکە نابێتە هۆکار بۆ سەربەستی (چونکە تەنیا شتی دراو دروستدەکات)، هەروەها بەڵگەش بۆ سەربەستی نییە (چونکە سەربەستی بەڵگە دادەنێت). مادام ئێمەش لە ئاســـتی هەڵکەوتێکـــی ڕەواندابین، ئەوا نابێت بە مەرجێکی پێویســـت بۆ سەربەســـتی. ئەو زەمینەش نییە، کە بەبێ ئەو سەربەســـتی نەتوانێت خۆی بخاتەگەر چونکە ئەگەر وابێت سەربەستی دەبێت بە فۆرمەکەی ئەریستۆ و شتیکی لەپێشتر ئامادەکراو یان (پنیۆما)ی ڕواقییەکان و بەدوای ئەستویەکدا دەگەڕێت کاری لەسەربکات. شتەدراوەکە ناکەوێتە نێو پێکهاتەی سەربەستییەوە چونکە سەربەستی ناوەکییە و ڕەتدانەوەی ناوەکی شـــتەدراوەکەیە. سەربەستی بە هەڵبژاردنی خۆی دەبێت بە هەڵکەوتێکی ڕەوان و شـــتەدراوەکە ڕەتدەداتەوە. شتەدراوەکە پانتایی بوونە و سەربەســـتی بە کەمییەکەیەوە ڕەنگی دەکات، بەڕەتدانەوەکەشی ڕووناکی دەخاتە ســـەر و ئەو کۆتاییەی تێدا دەبینێت، کە هێشـــتا پەیـــدا نەبووە. مادام سەربەستی هەیە شـــتە دراوەکەش دەبێت بە سەربەستی. سەربەستیش ناتوانێت بە هیچ جۆرێک خۆی لە بوون بشـــارێتەوە. پێویســـتە خوێنەر تێبگات، کە شتە

دراوەکە ئەوەیە بوونـ‌بۆ‌ـخۆ ڕەتی دەداتەوە ببێت بە ئەو. لەش، وەکو تێڕوانینێک بۆ جیهان، ئەو ڕابردووەی بووە بە جەوهەری بوونـ‌بۆ‌ـخۆ سەر بە یەک جۆر ڕاستەقینەن. سەربەستی لەگەڵ خۆ دوورخستنەوەکەیدا سیستەمی پەیوەندییەکان دادەمەزرێنێت. ئەمەش لەسەر تەماشاکردنی کۆتاییەکەیە لەنێوان هەموو بوونە‌ـلەنێو‌ـخۆکاندا (پانتایی بوون لەنێو جیهاندا) و ئەو بوونەی سەرهەڵدەدات، ڕوودەدات.

لەگەڵ پڕۆژەدانان و ڕووەو کۆتایی سەربەستی خۆی دەکات بە بوونێکی هەندەکی و هەبوو لەنێو جیهاندا. سەربەستی بوونی خۆی هەڵنابژێرێت؛ بەڵکو بە هەڵبژاردنی کۆتاییەکەی ئەو هەبووەش لەم یان لەو شێوازەدا پەیدادەکات. هەڵکەوتنی سەربەستی و جیهان لەبەر ڕۆسنایی کۆتاییە هەڵبژێردراوەکەدا دەردەکەوێت؛ لەنێو یەک ڕەتدانەوەدا دادەمەزرێت. سەربەستیش ناتوانێت ئەو هەبووە بناسێتەوە چونکە بۆ ئەو کارە دەبێت خۆی لەدەرەوە هەڵبژاردنەکان ڕاگرێت. ئەمەش سەربەستی لەناودەبات. ئێمە هەڵوێست بۆ هەڵکەوتی سەربەستی لەنێو پانتایی بووندا بەکاردەهێنین، ئەگەر شتەدراوەکەی لەبەر ڕۆشنایی هەڵبژاردنەکەدا سەربەستی سنوردار نەکات. کەوابوو، شتەدراوەکە خۆی وەکو بوونـ‌لەنێو‌ـخۆیەکی دڕندە نیشاننادات. هەمیشەش وەکو هۆکار دەناسرێت و کۆتاییەکە دەریدەخات.

هەڵوێست و هاندەر یەک شتن. بوونـ‌بۆ‌ـخۆ خۆی لەنێو مامەڵەکردن لەگەڵ بووندا و هەڕەشەکردن لەلایەن بوونەوە دەدۆزێتەوە. حاڵەتی شتەکان، وەکو هۆکار بۆ ڕەتدانەوە، بەرگریکردن و پەلاماردان دەبینێت. بەڵام دەتوانێت ئەوانە بدۆزێتەوە ئەگەر سەربەستانە ڕوو لە کۆتاییەکە بکات، هەست بە هەڕەشەکردن و خۆشگوزەرانی دەوروبەری بکات. ئەم تێبینیانە دەریدەخەن، هەڵوێست، کە دەستکردی هەڵکەوتنی بوونـ‌لەنێو‌ـخۆ و سەربەستییە، دیاردەیەکی تەمومژاوییە و مەحاڵە بوونـ‌بۆ‌ـخۆ تیایدا بەشداریکردنی سەربەستی و هەبووەکە لەیەکدی جیابکاتەوە. بەوجۆرەی سەربەستی ڕاکردنە لە هەڵکەوت، کە بۆ ئەوەی ڕابکات دەبێ هەبێت، هەڵوێستیش هاوئاهەنگییەکی سەربەستانە و دیاریکردنێکی سەربەستانەی هەبووە دڕندەکەیە، کە ڕێگە بە دیاریکردنەکە بە هیچ شێوەیەک نادات. من لەژێر لوتکەی چیایەکدام، کە ناپێورێت. تاشە بەردەکە، وەکو پڕۆژەی دووەم لەنێو پڕۆژەی پێوانەکەدا دەبینرێت. واتاکەشی بە پڕۆژە سەرەتاییەکەی بوونمەوە لەنێو جیهاندا بەستراوە. کەوابوو، بەردەکە لەنێو زەمینەی جیهاندا هەڵبژاردنە سەربەستە سەرەتاییەکەم دەیتاشێ. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە، ئەوەی سەربەستییەکەم دەستی نایگاتێ پێوانی بەردەکەیە. ئەمەش پەیوەندی بە بوونی سەختی بەردەکەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەکە بەرگریکردنی خۆی بۆ پێوانەکە دەردەخات ئەگەر بۆ پێوان سەربەستی بیخاتە نێو هەڵوێستەوە. بۆ گەشتیارێک

بێــرەدا گــوزەردەكات و دەیەوێت جوانی دەشــت و دەر ببینێت، لوتكەی چیاكە خۆی وەكو شــتێک بپێوێت یان نا دەرناخات؛ وەكو شــتێكی جوان یان ناشــرین دەبینرێت. مەحاڵە بزانین، لە هەموو حاڵەتێكی تایبەتدا، چی لە سەربەستی و لە هەبووە دڕندەكەوە ڕوو لە بوون-بۆ-خۆ دەكات. شتەدراوەكە تەنیا لەبەر ڕۆشنایی پرۆژەی سەربەستیدا دەبینرێت. پرۆژەی سەربەستیش شتە دراوەكە، بەو جۆرەی هەیــە دەردەخات (بەرگریدەكات یان تەســلیم دەبێت). پێویســتە ئەوەش بزانین بەرگریكردنی شــتەدراوەكە خەســڵەتێكی بوون-بۆ-خۆ نییە ڕاستەوخۆ بناسرێت. سەربەستی ڕۆشنایی دەخاتەســەر. جیهان بەرانبەر سەربەستی بەرەنگاریدەكات. مرۆڤ لە سەربەســتییەكەیدا توشی بەرەنگاری دەبێتەوە. هەروەها، ئەوەی بۆ من دەبێت بە ڕێگر لەوانەیە بۆ كەســێكی دیكە ڕێگر نەبێــت. ڕێگرتنێكی ڕەها نییە و تەنیا لەنێو پێكەوەبوونی لایەنە نەیارە سەربەســتەكان سەرهەڵدەدات. پێكەوە بوونەكەش بەهای كۆتایی سەربەســتییەكە دیاریدەكات. تاشــەبەردەكە ناتوانێت ببێت بە ڕێگر ئەگەر من ســوربم لەسەر هەڵگەڕان بە لوتكەی چیاكەدا. لەلایەكی دیكەشــەوە، ئەگەر من ئارەزووەكەم بۆ هەڵگەڕان مەرجداربكەم لوتكەكە نابێت بە هاندەر بۆ گەیشتن بە كۆتاییەكەم.

كەوابوو، پێكەوەبوونم لەگەڵ جیهاندا، وەكو دوولایەنی نەیار، پەیوەندی وەستانم لەئاستی كۆتاییەكانمدا، كە خۆم دایدەمەزرێنم دەردەخات. پەیوەندییەكەش ئاسان نییە. پەیوەندییەكە سەربەســتی ڕۆشنایی دەخاتەسەر و لەنێو شتە دراوەكەدایە، لە لێواری تاشــەبەردەكە و سەربەستییەكەی مندایە؛ لەنێوان فاكتۆرێكی ڕووت و هەڵكەوتێكدایە، كە نییە. لەوانەیە هەڵگەڕان بەســەر تاشەبەردەكەدا بۆ كەسێكی وەرزشكار ئاسان و كەسێكی دیكە سەخت بێت، كە لەشی ڕانەهاتووە. لەشەكەش لێــرەدا وا خــۆی دەردەخات پەیوەنــدی بە وەرزش و ڕاهێنانەوە سەربەســتانە هەبێت. من لەبەر ئەوەی لەوێدا وەستاوم و خۆم كردوە بەوەی هەم تاشەبەردەكە، وەكو نەیار دەردەكەوێت. بۆ پارێزەرێک لەنێو شــار دەژی و ڕۆبی پارێزەری لەنێو دادگا لەبەردایــە، هەڵگەڕانی بەردەكە نە ســەختە و نە ئاســان؛ لەنێو هەمووی 'جیهــان'دا تواوەتەوە. لەلایەكەوە، من لەشــم بە لاواز هەڵدەبژێرم و لەئاســتی ســەختییەكاندا (هەڵگەڕان بەســەر چیادا، ســواری پاســكیل یان وەرزشكردن) ڕایدەگرم. ئەگەر بەشداری لەوەرزشدا نەكەم. لەنێوشار بژیم، تەنیا بازرگانی بكەم یان بنوسم، ئەوا لەشم بۆ كارە[سەختەكان] ناگونجێت.

كەوابوو، با بڕوانینە پارادۆكســی سەربەســتی: سەربەستی لەنێو هەڵوێستدا هەیە، هەڵوێســتیش لەنێو سەربەســتیدایە. لە هەموو شــوێنێكدا، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی بەرەنگاری و ڕێگرەكان دەبێتەوە، كە خۆی دروستینەكردون و واتاكەشیان لە هەڵبژاردنە سەربەستەكەیدا دەردەكەوێت. بۆ ئەوەی لە واتاكانیان

تێبگەین چەند نموونەیەک دەهێنێنەوە. ئەوەی بە فاکتۆری سەربەستی ناوزەدمانکرد شـــتێکی دراو بوو، کە هەیە و پرۆژەکە ڕۆشـــنایی دەخاتە سەر. هەرچەندە لەبەر ڕۆشـــنایی یەکێتی پرۆژەیەکدا دەردەکەوێت، شتەدراوەکە بە چەند شێوازێک خۆی بەرجەستەدەکات. ئەو شـــوێن، لەش، ڕابردوو، بارودۆخی منە و کەسانی دیکەش حوکمی بەســـەردا دەدەن. دواجاریش، دەبێت بە پەیوەندییە بنەڕەتییەکەم لەگەڵ کەسانی دیکەدا. ئێمە بە نموونەوە ئەم بونیادانەی هەڵوێست باسدەکەین. باشترە ئەو خاڵەشـــمان لەبیرنەچێت، کە هیچ لەم بونیادانـــە لەوانی دیکە جیانابێتەوە و بەتەنیا نییە.

## ئەلف. شوێنی من

ئەو شـــوێنەی منی تێدایە، بەگوێرەی (ئەوان)ی نێو جیهان، پێناســـدەکرێت. بێگومـــان، ئـــەو خاڵەیە منـــی تێـــدا "دەژیـــم" (وڵاتەکەمە بە خۆرەتـــاوەوە، ئاوهەواو، ســـامانەکەی، دەریا، ڕوبار و چیاکانی). هەروەها، ڕێکخســـتنی بابەتە ئامادەبووەکانیشـــە (وەکو مێزەکە، پەنجەرەی پشت مێزەکە، کەنتۆری لای چەپی مێزەکە، کورســـییەکەی لای ڕاست و لەودیو پەنجەرەکەشەوە شەقام و دەریاکە.) ئەمانە هەموویان دەبن بە بەشـــی ڕێکخستنەکە. ناگونجێت من لە شوێنێکدا نەبم، ئەگینـــا پەیوەندییەکەم بە جیهانەوە دەبێت بەحاڵەتـــی لێکۆڵینەوە و جیهانیش بەوجۆرەی باسمانکرد بۆ من نابێت. بێجگە لەمە، هەرچەندە سەربەستانە دەتوانم شـــوێنەکەم هەڵبژێرم (من خۆم "هاتم" بۆ ئێرە)، هێشـــتا بوونم لەم شوێنەدا بەو ڕێگە و بابەتانەوە بەستراوە من شوێنیان کەوتوم.

شوێنەکەم ئاماژە بۆ شـــوێنێکی پێشو دەکات، ئەویش بۆ شوێنێکی پێشوتر و هتد، تا دەگاتە هەڵکەوتێکی ڕووتی شوێنەکەم؛ ئەوەش ئەو شوێنەیە، کە ئاماژە بۆ شوێنێکی دیکە ناکات و بەشێکە لە ئەزمونەکەم: ئەو شوێنەیە لەگەڵ لەدایکبوونمدا بە من دراوە. بێسودە ئەم شوێنەش لەسەر ئەو شوێنەی دایکم لە کاتی لەدایکبوونی مندا لەسەری وەستاوە، باسبکەم. زنجیرەکە پچڕاوە و ئەو شوێنانەی دایک و باوکم سەربەستانە هەڵیانبژاردووە بۆ شوێنەکانی من دەستنادەن. ئەگەر کەسێک یەکێک لەو شوێنانە بە شوێنی بنەڕەتی من دابنێت، بۆنموونە بڵێت، "من لە بۆردیۆ لەدایکبووم چونکە باوکم بۆکارکردن ڕەوانەی ئەوێ کراوە." یان "من لە تورس لەدایکبووم چونکە باپیرم موڵکی لەوێ هەبووە، دایکیشـــم ســـکی بە من هەبووە، کە هەواڵی مردنی باوکمی بیست چوو لەوێ لەگەڵ باپیرمدا ژیا." ئەمانە دەریدەخەن چۆن لەدایکبوون و شوێنی لەدایکبوونم دەبن بە هەڵکەوت. کەوابوو، لە دایکبوون، وەکو خەسڵەتگەلێکی دیکە، بوون لە شوێندایە یان بەگوێرەی باسەکەمان، شوێن وەرگرتنە.

دەردەکەوێت لێرەدا سەربەستییەکی سنوردارمان هەیە. کاتێک بیریلێدەکەینەوە پرسیاکردنەکە ئاڵۆز دەردەکەوێت. شوێنکەوتوانی ویستی-سەربەست لەو باوەڕەدان لەگەڵ ئامادەبوونم لەو شوێنەی ئێستا تیایدام دەتوانم شوێنی دیکەش هەڵبژێرم. نەیارەکانی سەربەستیش جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەن، کە خەسڵەتی نەبڕاوەی شوێن ڕێگەی هەڵبژاردنەکەی من دەگرێت و شوێنەکەشم دەبەستێت بە بارودۆخی (وەکو شـــێوازی تەندروســـتیم و ئاووهەوا و هتد)یەوە. لەنێوان ئەم دوو بەرەیەدا بڕیاردان مەحاڵە چونکە مشتومڕەکەیان نەخراوەتە سەر زەمینەیەکی دروست.

ئەگەر بمانەوێ پرسیارەکە بکەین، پێویستە لەم بەربەرەکانەیەوە بکەوینەڕێ: ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتـــی لـــە بنەڕەتەوە لەنێو شـــتەکاندا شـــوێن وەردەگرێت؛ ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی ئەوەیە، کە لەڕێگەی ئەوەوە شـــتەکانیش دەکەونە نێو شوێنەوە. بەبێ ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی شوێن نییە، لەگەڵ ئەمەشدا، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەبێ ئەوەی هیچ گوتەیەکی لەســـەر هەبێت لەنێو شـــتەکاندا شوێنی پێدەدرێت. لەڕاســـتیدا شتێکی شاراوە لێرەدا نییە، بەڵام باسکردنەکە دەبێت لەم بەربەرەکانەیەوە دەستپێبکات؛ ئەمەش پەیوەندییەکی تەواوی نێوان سەربەستی و فاکتۆر نیشاندەدات.

ئێمە بینیمان، کە شـــوێنی ئەندازیـــاری، بۆنموونـــە ئاڵوگۆرکردنێکی ڕووتی پەیوەندییەکانی نێو شوێن-نەبوونێکی ڕووتە. درێژبوونەوەیەکی ڕەها، وەکو ئەوەی شـــوێنەکەی من پێناسیدەکات و لەناوەڕاســـتدایە و دوورییەکەنی لێوە دەپێوین، شـــوێنێکی کۆنکرێتییە. لەو شوێنە ڕەهایەوە دەستپێدەکات، کە منی تێدایە. هیچ بنکەیەکی دیکە بە ڕەها بۆ ئامازەکردنەکان دانانرێت، ئەگەر خاوەنی ڕێژەگەرییەکی جیهانی نەبێت.

ئەگەر درێژبوونەوە لەنێو ســـنوری تێگەیشتنی بوونم، وەکو سەربەست یان نا-سەربەست هەبێت، درێژبوونەوەیەک بۆ من ناچارەیی بێت یان جیاواز لەبەرئەوەیە، کـــە من بەبێ هەڵبژاردن بێ پێویســـتیش وەکو فاکتۆرێکـــی ڕەهای بوونم-لەوێ، لەنێـــو شـــوێندام. من لێرەم و لەوێ نیم. ئەمە فاکتۆرێکـــی ڕەهایە و لە بنەڕەتی درێژبوونەوکەدایـــە. هەروەها، لە بنەڕەتی پەیوەندییەکەشـــم بە شـــتەکانەوەیە. فاکتۆری هەڵکەوتنێکی ڕووت لە واتا بەدەرە.

لەلایەکی دیکەوە، ئەو شـــوێنەی منی تێدام، پەیوەندییە. هەڵبەتە هاودەنگە، بـــەڵام پەیوەندییەکـــە هەموو جارێک وەکو خۆیەتی. ئەگەر بوون لە شـــوێندا من ســـنورداربکات ئەوا من ناتوانم هەمانکات لە شوێنێکی دیکەدا بم و پەیوەندییەکە دیاریبکـــەم؛ تەنانەت ناتوانم لـــە پەیوەندییەکەم بە شـــتەکانەوە تێبگەم. تەنیا هاندەرە دەروونییەکانم دەبینم، کە بابەتە نەناسراوەکانی دەوروبەرم دەیانوروژێنن. بەهەمانشێوەش، ڕاســـتەقینەی درێژبوونەوە ڕەهاکە وندەبێت و منیش لەو شتانە

دادەبڕێم، کە لە شـــوێن دەچن. لەســـەرو ئەمەوە، من نە سەربەستم و نە ناچار. مـــن بوونێکـــی ڕووتم بەبێ تەوق و بەبـــێ بیانویەکیش تاکو نکۆڵـــی لە تەوق و ڕێگرتن بکەم. ئەوەی بە درێژبوونەوە دادەنرێت و شـــوێنی من پێناسدەکات دێتە جیهانەوە. بەهەمانشـــێوەش ڕۆشنایی دەخاتە سەربوونی من. پێویست ناکات من لە شـــوێندا، بۆنموونە لەوێدا بم. پێویســـتە من بتوانم لێرەدا نەبم تاکو نزیک ئەو بابەتەی دە پێ لە منەوە دوورە و لەو شـــوێنەی لەســـەری ڕادەوەســـتم، لێی بم. هاودەنگی پەیوەندییەکە، کە شـــوێنی من پێناسە دەکات دەبێت بە پەیوەندی ئەو شتەی، کە منە و ئەو شتەی من نیم. ئەم پەیوەندییەش بۆ دامەزراندنی پێویستی بەخۆدەرخستنە. بۆ ئەم کارانەش دەبێت من لەنێو حاڵەتێکدا بم:

(١) پێویستە من بتوانم لەو بوونەی خۆم ڕابکەم، کە ئێستا هەمە، لەناوییەرم و هەمانـــکات بە پەیوەندی دابنێم. ئەم پەیوەندییەش ڕاســـتەوخۆ دەدرێت. لەنێو بیرکردنەوەیەکی ســـادە لە بابەتەکان سەرهەڵنادات (ئەگەر بمانەوێت شوێن لەنێو بیرکردنەوەیەکی ڕووتدا بدۆزینەوە، ئـــەو ڕەخنەیەمان لێدەگرن، کە بابەتەکان بە ڕەهەندە ڕەهاکانەوە نەک دووری و نزیکی ڕەهاوە دەدۆزینەوە).

پەیوەندییەکە لەنێو بیرکردنەوە لە کردەوەکانمان ڕاستەوخۆ بەدەست دێت ("ئەو بـــەرەو ئێمە دێت"، "با خۆمانی لێبشـــارینەوە"، "من بەدوایـــدا ڕادەکەم" و هتد) بیرکردنـــەوەن لە بوونی من لەوێدا. پێویســـتە بوونی منیـــش لەوێدا لە ڕوانگەی ڕەهەندەکانی دیکەوە پێناســـبکرێت. من لەوێدام و کەســـێک بەرەو من ڕادەکات. کەســـێک کاتژمێرێکی دیکەی دەوێت تا بە لوتکەی چیاکە بگات. کاتێک دەڕوانمە لوتکەکـــە، بۆنموونە، ئێمە مامەڵە لەگەڵ ڕاکردنێک لە منەوە و لەگەڵ لێشـــاوی لوتکەکە بەرەو بوونم-لەوێ دەکەین تاکو خۆم لەنێو هەڵویستێکدا دابنێم. پێویستە من ئەوەبم، کە هەم تاکو لە دەســـتی ڕابکەم. بۆ ئەوەی شـــوێن پێناسەم بکات، پێویســـتە یەکەمجار لە بوونم ڕابکەم و خۆم لە ناوەڕاستی جیهاندا دابنێم. بوونم لەوێ ڕەتکردنەکە ســـنوردارناکات، کە شتەکان دادەمەزرێنێت چونکە بوونم لەوێ شتێکی دراوی ڕووتە و ناتوانێت پرۆژە دابنێت.

(٢) پێویستە لە ڕێگەی ڕەتدانەوەی ناوەکییەوە بتوانم لە 'ئەوانە' ڕابکەم، کە لەنێو ئەو جیهانەدان. ئەوان من نین و منیش لەوێوە ئەو بوونەی هەمە دەیناسم. دۆزینەوە و ڕاکردن لێیان لە ئاکامی ڕەتدانەوەکەوە پەیدادەبێت. لێرەدا، دیسانەوە دەڵێم، کە ڕەتدانەوەی ناوەکی لەئاستی بابەتەکەدا پەیوەندییەکی کتوپڕی هەیە. ناکرێ بڵێین بابەتەکە تێگەیشتنمان دەوروژێنێت؛ بەپێچەوانەوە، بۆ ئەوەی شتێک هەبێت پێویســـتە دووری خۆی لە منەوە دەربخات و منیش بە ڕەتدانەوەی ناوەکی لـــە ئەو ڕابکەم. لەناوبردن، ڕەتدانەوەی ناوەکی و گەڕانەوە بۆ بوونی خۆم ســـێ کارکردنی پێکەوە بەستراون. ساتەکانی بەرزێتییە بنەڕەتییەکەن، کە بە لەناوبردنی

مـــن ڕووو لە کۆتایی دەکات و منیش لە داهاتوودا بوونی خۆم دەناســـم. کەوابوو، سەربەستییەکەم بڕیار لەسەر شوێنم دەدات و دانانم لەوێدا پێناسیدەکات. هۆکاری سنورداێتی من بەو بوونەوەیە، کە لەوێدایە و بوونی منە بۆ بونیادی ئۆنتۆلۆجیم. وەکو ئەوە نییە، کە هەیە و ئەوەیە، کە نییە دەگەڕێتەوە.

دیاریکردنی شوێن، کە بەرزێتی پێشـــیدەکەوێت بە پەیوەندی لەگەڵ کۆتاییدا ڕوودەدات. لەبـــەر ڕۆشـــنایی کۆتاییدا جێگاکـــەم واتا دەبەخشـــێت چونکە من بەبێ کۆتایی ناتوانم لەوێدا بم. شـــوێنەکەم دەبێت بـــە مەنفا یان بەپێچەوانەوە، سروشـــت و ئەو ناوچەیـــەی مۆریاک بە (کیۆرینچی) ناوزەدیـــدەکات و لەگەڵ ئەو شـــوێنەدا بەراودیدەکات، کە هەموو کاتێک گایە بریندارکراوەکە لە یاریگاکەدا بۆی دەگەڕێتـــەوە. لەگـــەڵ پەیوەندییەکەمدا بە پرۆژەی کردنەوە، جیهان بەگشـــتی و بوونم لەنێو جیهاندا، جێگاکەم دەبێت بە یاریدەدەر یان ڕێگر. بوون لەنێو شوێندا واتە دووری و نزیکی. واتاکەش بەستراوە بەو بوونەوە، کە هێشتا پەیدا نەبووە و کەسێک دەیەوێت بیگاتێ. گەیشتن و نەگەیشتن بە کۆتاییەکە شوێن پێناسدەکات. کەوابوو، لەبەر ڕۆشـــنایی ئەو نەبوونە و داهاتوودا حاڵەتەکەم دەناسرێت. "بوونم لەوێدا" هانگاونانە بۆ گەیشتن بە قۆرییە چاکە، دەست درێژکەم و پاندانەکە بکەمە نێو شوشـــەی مرەکەبەکە، پشـــت لە پەنجەرەکە بکەم و پەرتووکەکە بخوێنمەوە، ســـواری پاسکیلەکەم ببم؛ لەدەست ماندووبوون و گەرمای نیوەڕۆ بۆ دوو کاتژمێر خۆم ڕزگار بکەم و پیرۆی هاوڕێم ببینم یان ئەگەر بمەوێت (ئانی) ببینم؛ بەشـــەو سواری شەمەندەفەرەکە ببم. "بوون لەوێدا" بۆ کۆلۆنێل بیست ڕۆژ دوورییەکەی لە فەرەنساوە دیاریدەکات؛ یان باشترە بڵێین، ئەگەر ئەو فەرماندەر بێت و چاوەڕوانە دەوڵەت خەرجی گەشتەکەی بدات، ئەوا شەش مانگ و حەوت ڕۆژی لە بۆردیا یان ئێتەپلسەوە پێدەچێت. "بوون لەوێدا" بۆ سەربازێک سەدو دە یان سەدو بیست ڕۆژ لە دەرچوونی لە سەربازییەوە دوورە. پرۆژەکانی داهاتوو لە هەموو شوێنێکدا هەن؛ ئەو داهاتووەیە من بە پاندانە تەڕەکە و مەرەکەب دەینوسم، بوونی من لەنێو شوێندا دیاریدەکات، شپرزەم دەکات یان بێ ئۆقرە و بە نۆستەڵجاوە ڕامدەگرێت. لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر لە دەست چەند کەسێک ڕابکەم و خۆم لە ڕای گشتی بدزمەوە، ئەوا شـــوێنەکەم ئەو کاتە پێناسەیدەکات، کە کەسەکان لە دوور و دەرەوەی گوندەکە، بە گەیشـــتنیان، منی تێدا دەدۆزنەوە. لەمحاڵەتەدا، دوورەپەرێزییەکەم شـــوێنی [خۆشـــاردنەوە] بە ئارەزووکراو دەردەخات. لێرەدا بوون لەنێو شـــوێندا دەبێت بە پەناگە. هەڵبژاردنی ئەم کۆتاییەم دەکەوێتە نێو پەیوەندییەکانی شـــوێنەوە (بەرز و نزم، چەپ و ڕاســـت...هتد) تاکو واتای بوونگەرانەیان بدەمێ. ئەگەر لە بناری چیاکەدا بژیم ئەوا چیاکە هەموو لایەنێک دادەپۆشـــێت؛ ئەگەر لەسەر لوتکەکەشی ڕاوەستم پرۆژەی خۆ-بەگەورەدانانم دەیدۆزێتەوە و من لەوێوە خۆم بە گەورەتر لە

کەسانی دیکە دادەنێم. هەروەها ڕووبارەکە دووری دەریا لەبەر ڕۆشنایی پڕۆژەکەمدا دیاریدەکات. ئێمە دوایی بە درێژی، کە باسی بابەتی میتۆد و سایکۆلۆجی شیکاری دەروونناسی دەکەین، لەســـەر ئەم خاڵە دەدوێین. پەیوەندی نێوان بابەتەکان لە دەرەوەدا واتا و هێماکان وەرناگرێت چونکە ئێمە دروســـتیدەکەین. ئەو شـــارەی بیست میل لە گوندەکەمەوە دوورە و ڕێگەی ئۆتۆمبیلی هەیە لە لوتکەی ئەو چیایە نزیکترە، کە تەنیا چوار میل لێرەوە دوورە و دووهەزارو هەشت سەد مەتر بەرزە. هایدیگەر باســـیکردووە چۆن نیگەرانی ڕۆژانە جێگای ئامێرەکان دیاریدەکات و ئەو جێگایەش پەیوەندی بە شـــوێنی ئەندازیارییەوە نییـــە: ئەو دەڵێت، چاویلکەکەم لەسەرچاوم لەو بابەتەوە لە من دوورترە، کە لە چاویلکەکەوە دەیبینم.

کەوابـــوو، پێویســـتە بڵێین، فاکتۆری شـــوین بۆ من، لەڕێگـــەی هەڵبژاردنی سەربەســـتانەی کۆتاییەکەم ســـەرهەڵدەدات. سەربەســـتی لە دۆزینەوەی فاکتۆر جیانابێتەوە. من لە لایەنەکانی پڕۆژەکەی داهاتوومەوە لە واتای فاکتۆر تێدەگەم. لەبەر ڕۆشـــنای داهاتووە هەڵبژێردراوەکەدا فاکتۆر بە خەســـڵەتەکانییەوە خۆی نیشـــانی من دەدات، منیش بۆم دەردەکەوێت فاکتۆرەکـــە گرنگە یان نا گرنگ و لاوازە یـــان لە واتا بەدەرە. خەوبینینم بە ژیانی نیۆرکەوە ژیانی من لە مۆنت دی مارسۆن ناخۆش و ئازاراوی دەکات.

فاکتۆریش تەنیا ڕاســـتەقینەیەکە سەربەســـتی دەیدۆزێتەوە و لەگەڵ بینینی کۆتاییەکەدا لەناویدەبات. تەنیا شتێکە کۆتایی واتاکەی تەواودەکات. ئەگەر کۆتایی ڕۆشـــنایی بخاتەســـەر هەڵوێســـت لەبەر ئەوەیە، کە کۆتایی کراوە بە پێکهاتەی گۆڕانی پڕۆژەی هەڵوێستەکە. شوێنەکەم بە هۆی گۆڕانکاری لە پڕۆژە دانانەکەمدا دەردەکەوێـــت. گۆڕان ئاماژە بۆ شـــتێکی گـــۆڕاو دەکات، کە شـــوێنەکەی منە. سەربەســـتی، کەوابوو، ناســـینەوەی فاکتۆری منە. بێهودەیە هەوڵی پێناسەکردن و باسکردنی نرخی ئەم فاکتۆرە پێش کاریگەرێتی سەربەستی بەسەریەوە بدەین. شـــوێنم، پێش سەربەســـتییەکەم نییە. هەروەهـــا، پرســـیارکردنیش لەبارەیەوە نادروســـتە چونکە مامەڵە لەگەڵ 'پێشـــتر'دا دەکات، کە بێ واتایە. سەربەستی لەگەڵ بەکاتیکردنی خۆیدا 'پێشـــتر' و 'پاشتر' دەهێنێتەکایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو خاڵەش، وەکو خۆی دەمێنێتەوە، کە بەبێ نرخی فاکتۆر سەربەستی خۆی بە سەربەســـتی دانانێت. ئەو فاکتۆری سەربەستییەکەی منە. تەنیا بە کردەوە، ئەو کردەوەیەی سەربەستی فاکتۆرەکەی تێدا دەردەخات و بە شوێنی دادەنێت، شوێن، وەکو ڕێگری ئارەزووەکانم دەردەکەوێت. ئەگینا چۆن دەبێت بە ڕێگر؟ ڕێگری چی؟ زۆرلێکردن بۆ چی؟ چیرۆکێک هەیە ســـەبارەت ئەو کۆچەرەی پاش سەرنەکەوتنی پارتە ڕامیارییەکەی لە فەرەنسا کۆچ بۆ ئەرجەنتین دەکات: کاتێک ئاگادارکرا، کە ئەرجەنتین "زۆر دوورە"، لە وەڵامدا پرسی، "لە چییەوە دوورە؟"

دروسته، ئەرجەنتین بۆ ئەوانەی لە فەرەنسا دەژین دووره، بەڵام بۆ شۆڕشگێڕێکی جیهانی ئەرجەنتین، وەکو هەموو وڵاتێکی دیکە لە ناوەڕاستی جیهاندایە. ئەگەر سنورەکانی فەرەنسامان کردبێت بە پرۆژەیەکی ڕەهای شوێن بۆ خۆمان، چەند ڕووداوێکی تراجیدیش زۆرمان لێبکەن ڕوو لە هەندەران بکەین، ئەوا لەم پرۆژەیەدا ئەرجەنتین بۆ ئێمە وەکو هەندەران زۆر دووره و خۆمان بە ئاوارە دادەنێین.

کەوابوو، ئەو ڕێگرەی توشی بووین سەربەستییەکەمان دروستیدەکات. سەربەستییە لەگەڵ دانانی کۆتاییەکەدا و هەڵبژاردنی، وەکو شتێک دەست بکەوێت یان دەست نەکەوێت بەرگریکردن و سەختییەکە دەهێنێتە پێش. دووبارە، سەربەستییە پەیوەندی نێوان بابەتەکان، وەکو ئامێرەکان دادەمەزرێنێت و بڕیار لەسەر تەکنیکی دووری و پێوانییان دەدات و خۆی سنوردارەدەکات. لەبەر ئەوەی سەربەستیش هەڵبژاردنە بەسنورداری دەمێنێتەوە. هەموو هەڵبژاردنێک، وەکو بینیمان، پێویستی بە لەناوبردن و دەستنیشانکردن هەیە؛ هەموو هەڵبژاردنێک هەڵبژاردنی شتێکی براوەیە. سەربەستی لەوێدا بە ڕاستی سەربەستییە، کە فاکتۆر بۆ سنورداریێتی خۆی پێکبهێنێت. دروست نییە بڵێین، من لە چوونم بۆ نیۆرک سەربەست نیم چونکە لە مۆنت دی مارسان فەرمانبەرێکی بچوکم. بەڵکو، بەپێچەوانەوە، لە پەیوەندی پرۆژەدانانەکەمدا بۆ گەشتەکەم بەرەو نیۆرک من خۆم لەنێو مۆنت دی مارسان دادەنێم. شوێنم لەنێو جیهاندا، پەیوەندیم بە مۆنت دی مارسان، نیۆرک و چینەوە جیاواز دەبێت، ئەگەر بۆنموونە، من جوتیارێکی دەوڵەمەندی مۆنت دی مارسان بم. لەپێش هەموو شتێکدا، مۆنت دی مارسان لەنێو جیهاندا دەردەکەوێت، کە پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە نیۆرک، ماڵبۆرن و شەنگەهایەوە هەیە؛ دووەم، لەنێو زەمینەیەکی ناجۆری جیهاندا سەرهەڵدەدات. من بڕیاریش لەسەر گرنگی گەشتەکە بۆ نیۆرک دەدەم. لەوانەیە لەسەر ناڕەزاییم لە مۆنت دی مارسان راوەستێت؛ لێرەدا جەختەکە لەسەر مۆنت دی مارسان دەکرێت.

من بەڵگە بۆ لەناوبردنی شوێنەکەم دەهێنمەوە و دەمەوێت پەیوەندییەکەم، لەگەڵ ئەو شارەی تیایدا دەژیم، ببڕم. دەشێ ببێت بە پرۆژە و بەتەواوی خۆمی پێوە ماندووبکەم. لەحاڵەتی یەکەمدا، شوێنەکەم بەڕێگرێکی بەسەردا سەرنەکەوتوو دادەنێم و ناڕاستەوخۆش پێناسیدەکەم. لەحاڵەتی دووەمدا، ڕێگرەکە نامێنێت؛ خۆم بە شوێنەکەوە نابەستمەوە. دەمەوێت لێی دەرچم و بگەمە نیۆرک. لەهەموو حاڵەتێکدا خۆم لەنێو جیهاندا دەبینم و مامەڵە لەگەڵ هەڵکەوتی شوێندا دەکەم. ئەم مامەڵە کردنەشە، کە سەربەستییەکەی منە و واتا بە هەڵکەوتی شوێن دەبەخشێت. بەدڵنیاییەوە، لەگەڵ لەدایکبوونمدا شوێنێک دەگرم. بەڵام من بەرپرسی شوێن وەرگرتنەکەم. لێرەدا پەیوەندییەکی نەپچڕاوی نێوان سەربەستی و فاکتۆر لەنێو هەڵوێستدا دەبینین. بەبێ فاکتۆر سەربەستی نییە. سەربەستی هێزی لەناوبردن و هەڵبژاردنە. بەبێ سەربەستیش فاکتۆر نادۆزرێتەوە و واتاش نابەخشێت.

## با. ڕابردووی من

ئێمە خاوەنی ڕابردووین. ئەوەشــمان سەلماند، کە ڕابردوو، وەکو دیاردەیەکی لەپێشــتر بۆ دۆزینەوەی دیاردەکانی دوای خۆی، کردەوەکانمان ســنوردارناکات؛ ئەوەشمان باسکرد، کە ڕابردوو لە پێکهێنانی ئێستا و نەخشەدانانی داهاتوودا بێ دەسەڵاتە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو سەربەستییەی ڕوو لە داهاتوو دەکات، ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی ڕابردوو دابنێت. ئەو ناتوانێت بەبێ ڕابردووش خۆی دروستبکات. ئەو دەبێت ببێت بە ڕابردووی خۆی و ڕابردووش نەگۆڕە. لەسەرەتاوە، دەردەکەوێت سەربەســتی نەتوانێت ڕابردووی خۆی بگۆڕێت؛ دەســتمان بــە ڕابردوو ناگات و ڕابردووش لە دوورەوە بووە بە دێوەزمەی بوونمان. ئەگەر ڕابردوو کارنەکاتە ســەر کردەوەکانمان بڕیاردانەکانمان پەیوەندییان بە ڕابردوومانەوە دەبێت. ئەگەر من لە کۆلێجی دەریایی بخوێنم و ببم بە فەرمانبەرێکی دەریاوان لە هەموو حاڵەتێکدا بڕیار دەدەم مامەڵە لەگەڵ شــتەکاندا بکەم؛ لەسەر پردی پاپۆڕەکە دەوەستم و دەزانم من دووەم فەرمانبەری نێو پاپۆڕەکەم. لەپڕ دژی ئەم فاکتۆرە ڕادەوەستم و بڕیاری خۆکوشــتن دەدەم. ئەم بڕیاردانە ڕادیکاڵە پەیوەندی بە ڕابردوومەوە هەیە. ئەگەر بیەوێت ڕابردووم لەناوبەرێت لەبەر ئەوەیە، کە ڕابردووم هەیە. بڕیاردانەکەشم لەوێدا ســەرکەوتوو دەردەچێت، کە لە ئاستی ڕابردوومدا نەرێ بێت. ئەمەش ناسینەوەی ڕابردووە.

هەموو کردەوەیەک من لە ڕابردووم داپچڕێت، دەبێت وەکو ڕابردوویەکی دیاریکراو بناسرێت؛ واتە، ئەو کردەوەیە لەنێو ڕابردوویەکی دیارەوە سەریهەڵداوە و دەیەوێت لەناوییەرێت. دەڵێین، کردەوەکانمان دوای ئێمە دەکەون. ڕابردوو ئێستایە و لەنێو ئێستادا دەتوێتەوە؛ قاتە جلەکە شــەش مانگ لەمەوبەر هەڵمبژارد، ئەو خانوەی تیایدا دەژیم دروستکراوە، پەرتووکەکەی زستانی پێشو دەستمدایە، هاوسەرەکەم و بەڵێنەکانــی پێمدا و منداڵەکانم؛ هەموو ئەوانەی منن، ئەوانەن من هەمە. زیادە ڕۆیــی لە گرنگی ڕابــردوود ناکرێت چونکە بۆ من "نــاوەڕۆک لە بووندایە". بەڵام لێرەدا توشــی ئەو پارادۆکســە دەبینەوە، کە لەپێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد؛ من بەبــێ ڕابردوو لە بوونم تێناگــەم. ناتوانم بیر لە بوونم بکەمەوە، چونکە بیر لەوە دەکەمەوە، کە هەیە و منیش لەنێو ڕابردوودام؛ لەلایەکی دیکەوە، من ئەو بوونەم ڕابردوو دەهێنمە نێو بوونم و جیهانەوە.

با لە نزیکەوە ســەرنجێکی پارادۆکسەکە بدەین. مادام سەربەستی هەڵبژاردنە، ئەوا گۆڕانە. ئەو کۆتاییە پێناسەیدەکات، کە پڕۆژەکە دایدەنێت؛ واتە ئەو داهاتووەی پەیدادەبێت. لەبەر ئەوەی داهاتووش هێشتا پەیدانەبووە لە پەیوەندییەکەیدا بەوەی ئێســتا هەیە دەناسرێت. مەحاڵە ئەوەی هەیە ڕۆشــنایی بخاتە سەر ئەوەی نییە

چونکە ئەوەی هەیە کەمییە و بەوجۆرەش دەناســـرێت. کۆتایی ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەوەی هەیە. بەڵام گەڕان بەدوای کۆتاییدا و پەیداکردنی ناسینی ئەوەی هەیە پێویستی بە بوونێکە لەودیو هەیەکەوە بێت و خۆی لێدابڕێت. واتای ئەوەی هەیە، کەوابـــوو، لە ڕەتکردنی بەرەو داهاتوو دەدۆزێتەوە. هەروەها، ئەوەی هەیە دەبێت بە ڕابردوو.

لێـــرەدا، دەبینین چۆن ڕابردوو "وەکو ئەوەی دەبـــێ بگۆڕێت" لە هەڵبژاردنی داهاتووەوە جیانابێتەوە و چۆن ڕەتکردنێکی سەربەســـتانەش بەبێ ئەو ڕابردووە نابێت. ڕابردوو تەنیا لەگەڵ هەڵبژاردنی داهاتوودا دەبێت بە ڕابردوو. خەســـڵەتی نەگـــۆڕی ڕابردوو لەگـــەڵ هەڵبژاردنی داهاتوومدا ســـەرهەڵدەدات؛ ئەگەر ڕابردوو بەمشێوەیە بناسرێت ئەوا ڕابردوو ئەوەیە، کە لە شوێندا جێی دەهێڵین و دەکەوێتە ئەودیو گۆڕانەوە. بۆ ئەوەی داهاتوو بناسرێت پێویستە ڕابردوو نەگۆڕ بێت. دەشێ من نەبم؛ بەڵام ئەگەر هەبم بەبێ ڕابردوو نابم. ئەمەش ئەو شـــێوازەیە پێویســـتی هەڵکەوتنەکەم دەیســـەلمێنێت. لەلایەکی دیکەوە، وەکو بینیمان، دوو خەسڵەتی بوونگەرانە بۆ بوون-بۆ-خۆ دەبن بە بنەڕەتی:

(١) هیچ شتێک لەنێو ئاگامەندییدا نییە، کە ئاگایی لە بوون نەبێت.

(٢) لە بوونی مندا، پرســـیار لە بوونم دەکرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هیچ شتێک لە بوونمدا بەبێ هەڵبژاردن پەیدانەبووە.

بێگومان، بینیمان ئەو ڕابردووەی تەنیا ڕابردووبوو لەنێو هاوئاهەنگی بووندا دەڕوخێ و پەیوەندی بە ئێســـتاوە نامێنێت. بۆ ئەوەی ڕابردوومان هەبێت پێویســـتە بە هۆی پڕۆژەکانی نێو داهاتوومانەوە لەنێو بووندا بیهێڵینەوە؛ ئێمە هەســـت بە ڕابردوومان ناکەین، بەڵام هەڵکەوتنی بوونمان زۆرمان بۆ دەهێنێت ڕابردوومان هەڵبژێرین. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە "دەبێ ببێت بە ڕابردووی خۆت." ئەم پێویســـتییە لە ڕوانگـــەی کاتەوە دەبینرێت و لە بونیادی بنەڕەتی سەربەســـتیش جیانابێتەوە، کە لەناوبردنی ئەو بوونە هەبووەیە و جەخت لەسەر ئەو شتە دەکات، کە هەیە.

لە کاتێکدا دەڵێین سەربەستی هەڵبژاردنی کۆتاییە و بە داهاتووەوە بەستراوە، بەپێچەوانەشـــەوە، ڕابردوو بە پەیوەندییەکەی لەگـــەڵ کۆتاییە هەڵبژێردراوەکەوە هەیە. ڕابردوو خەسڵەتێکی ئاڵوگۆڕ نەکراوی هەیە (بۆنموونە، من لە تەمەنی پێنج ســـاڵیدا توشی کۆکەڕەشە بووم)، هەروەها خەسڵەتی جۆراو جۆریش هەیە (واتای ئەو فاکتۆرەی پەیوەندی بە هەموو بوونمەوە هەیە). بەڵام، مادام، لەلایەکی دیکەوە واتـــای فاکتۆری ڕابردوو خۆی دەســـەپێنێت (لەدەرەوەی پـــڕۆژە دیاریکراوەکەی واتاکە دادەنێت، من بیرم ناکەوێتەوە بە منداڵی توشی کۆکەڕەشە بووم)، مەحاڵە بتوانـــم بوونـــە نەگۆڕەکە لە واتا جۆراوجۆرەکانی جیابکەمـــەوە. ئەگەر بڵێم "من لە تەمەنی چوارســـاڵیدا کۆکەڕەشـــەم هەبوو" هەزار پڕۆژە دەستنیشان دەکات،

بەتایبەتی دانانی ڕۆژ ژمێرێک بۆ بوونم (دانانی سیستەمێک بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیم) و بڕواکردنی بە کەسی سێیەم، کە باسی منداڵیم دەکات. ئایا ئەو فاکتۆرە لەخۆیدا بەبێ گەواهیدانی کەسانی دیکە، ساڵەکە و زمانە تەکنیکییەکەی بۆ نەخۆشییەکە دانراوە (دامەزراندنی واتاکەی لەســـەر پڕۆژەکانی من) چی دیکەیە؟ کەوابوو، ئەو بوونە، کە پێویســـت و نەگۆڕە، وەکو کۆتاییەکی ئایدیاڵی بەبێ ئەوەی دەستمان بیگاتێ ڕادەوەســـتێت. واتاکەشی لەنێو سیستەمی یادەوەریدایە. بێگومان بابەتی ڕەوانی یادەوەری هەیە و (برگسۆن)یش باسیدەکات؛ بەڵام کاتێک خۆی دەردەخات هەمیشە لەنێو پڕۆژەدایە.

واتای ڕابردووم بە پڕۆژەکانی ئێستامەوە بەستراوە. مەبەستمان ئەوەش نییە، کە دەتوانم واتای جیاواز بە کردەوەکانی پێشـــوم ببەخشـــم. بەتەواوی کێشـــەکە بەپێچەوانەوەیە، ئەو پڕۆژە بنەڕەتییەی منە بڕیار لەسەر ڕابردووی من و کەسانی دیکەش دەدات. من بەتەنیا بڕیار لەســـەر هەڵگرەکانی ڕابردوو دەدەم. مشتومڕیان لەسەرناکەم و هەڵیانناسەنگینم؛ بەڵکو پڕۆژەی بوونم بەرەو کۆتایی دیارییاندەکات. مـــن ڕابردوو لەنێـــو خۆمدا دەپارێـــزم و بەکـــردەوەش واتاکـــەی دادەمەزرێنم. کێ بڕیاردەدات ئەو گرفتەی لە تەمەنی پانزەســـاڵیدا توشـــم بـــوو پەیوەندی بە هەرزەکارییـــەوە هەبوو یـــان یەکەم هێمای وەرگێڕانی داهاتـــووم بوو؟ بەگوێرەی تەمەنی بیست یان سی ساڵیم من بڕیارەکە دەدەم. پڕۆژەی وەرگێڕانەکەم بەیەکجار گرفتەکانی هەرزەکارێتی دەســـەلمێنێت و بەهای پێشوەختی بۆ دادەنێت، کە من زۆر بەلامەوە گرنگ نەبووە. کێ بڕیاردەدات ئەو کاتەی پاش دزیکردنەکە لە زیندان بەسەرم برد سودبەخش یان زیانبەخش بوو؟ من، بەگوێرەی وازهێنانم لە دزیکردن یان دزیکردنی زۆرتر، بڕیاری لەســـەر دەدەم. کێ بڕیار لەســـەر بەهای فێربوونی گەشـــتەکە، ڕاستگۆیی لە خۆشەویستیدا و مەبەستی پاکی ڕابردوو و هتد دەدات؟ هەمیشـــە من، بەگوێرەی کۆتاییەکان، کە ڕۆشنایی دەخەنە سەر ڕابردوو بڕیاریان لەســـەر دەدەم. ڕابردووم زۆرم لێدەکات، پەلەم لێدەکات و دەستەڵات فەرزدەکات، بەڵام واتاکەی بەکۆتایی پڕۆژەکانمەوە بەستراوە. هەڵبەتە مامەڵەکردنەکەم گرانی دەخاتە سەرشـــانم. هاوسەربوونەکەی پێشـــوم و خانوەکەی پار کڕیم و کەلوپەلم تێکرد، ئەگەرەکانم ســـنوردارکردەکەن و حوکم بەســـەر هەڵوێستمدا دەدەن؛ بەڵام پڕۆژەکانـــم بەجۆرێکن، کە من خۆم جارێکی دیکە بڕیار لەســـەر هاوســـەربوونی دەدەمەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە من "بڕوانامەی هاوسەربوونەکە بە ڕابردوو، تێپەڕیو یان مـــردوو دانانێم". هەروەها، بەپێچەوانەوە، پڕۆژەکانم لەگەڵ مامەڵەکردنەکە و بڕیاردانەکەدا ڕاستگۆن و دەمەوێت ژیانێکی باشم وەکو هاوسەر یان باوک هەبێت. ئەم پڕۆژانە ڕۆشنایی دەخەنە سەر هاوسەربوونەکەی پێشوم و بەهای بۆ دادەنێن. کەوابوو، سەرهەڵدانی ڕابردوو لە داهاتووەوەیە.

گریمـــان، وەکو پاڵەوانی شـــڵوبێرگەر پرۆژەکەم ڕادیکاڵانـــە دەگۆڕم. واز لەو بەختەوەرییە دەهێنم و کاروبارەکانی پێشوم بە گرنگ دانانێم. بوونی ئەوان نامێنێ و وەکو بوونی بورج و ئاســـەوارەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی لێدێت. کەس نکۆڵی لە بوونیان ناکات، بەڵام واتاکەیان تەنیا لەوەدایە، کە ســـەر بە شارستانییەتێکی پێشـــو یان سیســـتەمێکی ڕامیـــاری و ئابووریـــن ئەمڕۆ نەماوەتـــەوە و مردووە. ڕابردوو، لەبنەڕەتەوە، وەکو سەرهەڵدانی بوونم، پرۆژەیە. بەو ڕادەیەی پرۆژەشە، چاوەڕوانکردنە؛ واتاکەی لە داهاتووەوە دێت، کە نەخشـــەکە دەکێشـــێت. کاتێک ڕابـــردوو دەکەوێتە نێو ڕابردووەوە بەها ڕەهاکەی دەکەوێتە ســـەر ســـەلماندن و نەسەلماندنی چاوەڕوانکردنەکان، کە هەبوون. ئەمەش دەکەوێتە سەر سەربەستی ڕاســـتەقینەی من تاکو واتای چاوەڕوانکردنەکان ببەخشـــێت و خۆی لەئاستیاندا بەرپرس دابنێت. لەم حاڵەتەدا، ئەو بەشـــەی پـــاش دەکەوێت، ڕووتدەکرێتەوەو دەبێت بە شتێکی چاوەڕوانکراوی وازلێهێنراو. بەبی هێز دەمێنیتەوە. هۆی ئەمەش لەوەدایـــە، کە هێزی ڕابردوو لە داهاتووەوە دێت؛ چەند لەنێو ڕابردوومدا بژیم و بە گرنگی دابنێم، گرنگییەکەی دەکەوێتە سەر پرۆژە دانانم لە داهاتوودا.

سیســـتەمی پرۆژەدانانی داهاتووم سیستەمی ڕابردووم ســـنوردارەدەکات. ئەم سیســـتەمەش ڕیزکردن بەگوێرەی کات نییە. هەمیشـــە بۆ یەکەمجار ئەو ڕابردووە هەیە، کە تیایدا دەژین: بەڵێنی خۆشەویستی، کاروبارەکانم و ئەو وێنەیەی بوونم، کە من بە ڕاستگۆ دەردەخات. کەوابوو، ڕابردوویەکی شاراوە هەیە من ناڕاستەوخۆ هێشـــتومەتەوە و حەزیشـــی لێناکەم: ئـــەم جلوبەرگـــەی لەبەرمدایە لە کاتێکی دیاریکراودا کڕیومە تاکو شوێن مۆدێل بکەوم، ئێستا حەزی لێناکەم؛ ئەو ڕابردووەی جلەکەم تێدا هەڵبژارد مردووە. بەڵام، لە پرۆژە ئابوورییەکەمدا بەردەوام ئەم جلە لەبەردەکەم و جلێکی دیکە ناکڕم. ئەمەش دەیکات بە ڕابردوویەکی زیندوو هەروەها مردوو. ئەمەش لەو دەستگا کۆمەڵایەتییانە دەچێت، کە لە ڕابردوودا بۆ کۆتاییەکی دیاریکـــراو دامەزران و ئەمڕۆ ماونەتـــەوە و ڕوویان لە کۆتاییەکی جیاواز، تەنانەت ناکۆکیش لەگەڵ کۆتاییەکانی پێشودا کردوە. ڕابردووی زیندوو، نیوەمردوو، درێژە پێدراو، شاراوەکان و ناجۆرەکان: دامەزراندنی ئەم بەشانەی ڕابردوو لەنێو یەکێتی پرۆژەکەمدا ڕوودەدەن.

ســـەبارەت بە بەهاش بڕیاردانەکە، سیســـتەمەکە و سەربەســـتی ڕابردوومان، بەگشـــتی، هەڵبژاردنێکی مێژووییە. مەبەستمان لە بەمێژووبوونی کۆمەڵگاکانیش لەوێـــدا نییە، کە خاوەنی ڕابردوون، بەڵکو لەیادکردنەوەی ڕابردووەکەدایە. کاتێک ڕژێمی ســـەرمایەداری ئەمەریکا بڕیار لەسەر بەشداریکردنی جەنگ لەگەڵ ئەوروپا لە ســـاڵی ١٩١٤-١٩١٨ دەدات، بڕیاردانەکە لەبەر سودوەرگرتنە نەک مێژووییانە. بەڵام لەبەر ڕۆشنایی ســـودوەرگرتنەکە پەیوەندییەکەی پێشوی لەگەڵ فەرەنسادا

جارێکی دیکە دەدۆزێتەوە، دەیەوێت قەرزەکەی بداتەوە و خزمەتی فەرەنسا بکات. لێـــرەدا دەبێت بە مێژوویی. لەو دەستەواژەیەشـــەوە، کە دەڵێت: "لافەیات، ئیمە لێرەین!" خۆی دەکات بە مێژوویی. ئەو ڕاســـتییە ناڵێـــت، کە بەرژەوەندییەکەی هانیداوە لەگەڵ ئەڵمانیا بێت و پێویســـتی بە یادەوەرییەکانیشی بۆ ئەم مەبەستە نابێـــت. پڕوپاگەندەش بۆ پەیوەندی خوێن یـــان خزمایەتی، کە ئەڵمانییەکان لە ســـەدەی نۆزدەهەمدا دروستیانکرد دەبێت ڕەچاویشبکرێت. بۆ ڕاکێشانی جەماوەر ئەمە پێویستە و جەماوەریش داوای پڕۆژەیەکی ڕامیاری بۆ سەلماندنی ڕابردووەکە دەکات. هەروەها، ئاشکرایە ڕابردووش دروستکراوە. ڕابردووی هاوبەشی ئەمەریکا و فەرەنسا دامەزرێنراوە، کە لەلایەکەوە ئاماژە بۆ بەرژەوەندییەکی ئابووری گەورەی ئەمەریکییەکان دەکات، لەلاکەی دیکەشـــەوە، پەیوەندی نێوان دوو سیســـتەمی دیموکراسی سەرمایەدارییە. بەهەمانشێوەش، لە ساڵی ١٩٣٨ ئێمە بینیمان چۆن نەوەی نوێ ڕۆشـــناییان خستە سەر ســـاڵەکانی (١٩١٨- ١٩٣) و بە کاتی نێوان جەنگەکان ناوزەدیانکرد. کتوپڕ ئەو کاتەی نێوان (١٩١٨- ١٩٣٨) بوو بە پێکهاتەیەکی تێپەڕکراوی دیاریکراو، لەکاتێکدا ئەوانـــەی تیایدا ژیان بە پڕۆژەکانیانەوە ڕوویان لە داهاتوو کرد و بەردەوامیش لە ئێســـتایاندا بە ڕابردووشـــییانەوە بەسترابوون. پڕۆژە ڕاســـتەقینەکە، کەوابوو، بڕیار لەسەر بەردەوامبوونی ڕابردوویەکی دیاریکراو بە ئێســـتاوە یان دابڕانی دەدات. لەبەرئەمە، پێویســـتە مێژووی مرۆڤایەتی پێش ڕووداوێکـــی دیاریکراو تەواوبکرێت، بۆنموونە، گرتنی باســـیل دەشـــێ واتەیەکی تەواو ببەخشـــێت. کەس نکۆڵی لەوە ناکات، کە باســـیل لە ساڵی١٧٨٩دا گیرا: ئەمـــە فاکتۆرێکی نەگۆڕە. بەڵام ئایا لەم ڕووداوەدا شۆڕشـــێک بەبێ ئاکامەکانی دەبینین، هێرشـــێکی جەماوەر بۆ ســـەر قەڵاکە، کە کەنیســـە نایەوێت بیکات بە ڕابـــردووی خۆی، کە بـــوو بە کارێکی مەزن؟ ئایا دەکرێت بەســـەرهەڵدانی هێزی جەماوەری دابنێین، کە خۆی ســـەلماند و پەلاماری ڤێرسای "لە کۆتایی ڕۆژەکانی ئۆکتۆبەردا"دا؟ ئەو کەسەی ئەمڕۆ پرسیارەکان دەکات ئەو خاڵەی لەبیردەچێت، کە مێژوونوس مێژووییە. بە نوسینی مێژووی خودی خۆی لەبەر ڕۆشنایی پڕۆژەکانی و کۆمەڵگاکەیدا دەبێت بە مێژوویی. لەبەرئەمە واتای ڕابردووی کۆمەڵایەتی بەردەوام بە هەڵواســـراوی دەمێنێتەوە. ئێستا، وەکو کۆمەڵگا، تاکیش ڕابردووی یادکراوەی هەڵواســـراوی هەیە. ئەم پرســـیارکردنە بەردەوامەش بوو ســـەبارەت ڕابردوو زانا و نوســـەرە تراجیدییەکانی یۆنان لەو پەندەدا دەریانبڕی و لەشـــانۆگەرییەکانیاندا دایاننا، کە دەڵێت: "کەس لەبەردەم مردندا بە بەختەوەر دانانرێت." بەمێژووکردنی بەردەوامی بوونێ بۆ خۆ سەلماندنی بەردەوامی سەربەستییەکەیەتی.

کاتێک توانیمان ئەم فاکتۆرە بسەلمێنین، ڕابردووی بوونێ بۆ خۆش بە هەڵواسراوی و تەمومژاوی، ناتەواو نابێت بە مێژوویەکی لەپێشـــتر. وەکو هەڵبژاردنی بوونێ بۆ

خۆ خودی ئەم بوونە دەیناسێ و پێناسەیدەکات. بەهەمانشێوە، کەشتییەکەی تیتیۆس یان ستونی تراجان، هەرچ واتایەکی مێژوییان لەشوێنێکی دیکەدا هەبێت، بۆ ڕۆمانییەکان یان گەشتیارەکان، ڕاستەقینەیەکی تاک و تەنیان. لەبەر ڕۆشنایی ئەو پرۆژەیەی ڕووناکییان دەخاتەسەر ڕابردوو دەردەکەوێت. خەسڵەتی هەڵواسراوی ڕابردوو ڕووداوێکی نائاسای نییە؛ تەنیا بەگوێرەی دروستکردنی ڕابردوو هەروەها بوون-لەنێو-خۆ لایەنی پرۆژەدانانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی دەردەبڕێت. لەبەرئەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیش پرۆژەدانانێکی سەربەستانە و سەربەستیی چاوەڕواننەکراویش دەیخوات و دەیکات بە ڕابردوو. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی فەرمانی بەسەردادراوە، کە خۆی بە ڕابردوو بکات و بۆ هەمیشەش لە داهاتوودا چاوەڕوانی سەلماندنی ڕابردووی بێت. ئەمەش ڕابردوو دەکات بە شتێکی هەڵواسراوی هەمیشەیی چونکە راستەقینەی مرۆڤایەتی چاوەڕوانیدەکرد و چاوەڕوانیش دەبێت. چاوەڕوانی و هەڵواسین لە سەلماندندا شوێن یەکدی دەکەون و سەربەستیش دەبێت بە پێکهاتەیان. ئەو کاتەی دەڵێین، ڕابردووی بوون-بۆ-خۆ هەڵواسراوە، مەبەست ئەوەیە، کە ئێستای چاوەڕوانییە. داهاتووشی پرۆژەیەکی سەربەستە یان بەبێ ئەوەی هەبێت ئەو هیچ نییە و هەمووی ئەم نا-هەمووانەیە. بەڵام ئەمە شاراوەیی لەو ڕابردووەمدا ئێستا دەیبینم نییە، بەڵکو ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ناسینەوەی ڕابردووەکە پرسیارم لا دروستدەکات. بەو جۆرەی ئێستام چاوەڕوانییە ئەو ڕابردووەی پەیوەندی بە چاوەڕوانییەکەوە هەیە بەشداری تێدادەکات. هەرچەند واتای ڕابردوو، وەکو شتێکی تاک دەرکەوتوە، لەسەر چاوەڕوانییەکە و چاوەڕوانییەکەش لەسەر نەبوونێکی ڕەها ڕادەوەستێت؛ کە ئەو پرۆژە سەربەستەیە هێشتا پەیدا نەبووە. ڕابردووم، کەوابوو، کۆنکرێتییە و چاوەڕاوانی مۆرکردنە. ئەمەش واتایەکە (کافکا) لە دادگاکەیدا ڕوشنایی دەخاتەسەر. ئەو خەسڵەتەیە، کە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەردەوام لەبەردەم دادگادا ڕادەگرێت. سەربەستی ئەوەیە بەردەوام سەربەستییەکەت بخەیتە بەردەم دادگا. ئاکامی ئەم کارەش ئەوەیە، کە ڕابردووەکەم لەنێو بەستێنی هەڵژادنی سەربەستەوە بەشێکی گرنگ و جیانەکراوەی پرۆژەکەمە. دەتوانین بەنموونە ئەمخاڵە ڕوونبکەینەوە. ڕابردووی سەربازێکی خانەنشین قارەمانێتی سەبازەکەیە پاشگەڕانەوەی لە ڕوسیا. ئەم ڕابردووەش پرۆژەیەکی سەربەستی داهاتووی سەربازەکە بووە. ئەو بە ڕەتدانەوەی بەشداریکردنی لەنێو لەشکری لویسی هەژدەهەم و حەزی ئەو لە خانەنشینی نەک سەربازێکی چالاکی ناپۆلیۆن، ڕابردووەکەی هەڵبژاردووە. سەربازێکی دیکە، کە پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەیە هەمان ڕابردوو هەڵنابژێرێت. ئەگەر سەربازێکی خانەنشینکراو بە هەژاری بژی و حەز بکات ئیمپراتۆر بۆ سەر دەستەڵات بگەڕێتەوە، لەبەرئەوەیە، کە ئەو قارەمانی گەڕانەوەکەبوو لە ڕوسیا. لێرە پێویستە لەم خاڵەش

تێبگەین: ڕابردوو لەسەر هیچ پێکهاتەیەکی دۆزینەوەدا کارناکات و سنورداری ناکات. کاتێک ڕابردوو "سەربازەکەی سەردەمی ئیمپراتۆر" هەڵدەبژێرێت، بوون-بۆ-خۆ لە ڕابردووەکەی تێدەگات. تەنانەت جیاوازی لەنێوان هەڵبژاردنی ئەم ڕابردووە لەلایەن سەربازەکەوە و تێگەیشتنی لە ڕابردووەکە بە ڕەفتار نییە. بوون-بۆ-خۆ بۆ بەگەورەکردنی ڕاستەقینەی نێو خۆیەتی ڕابردووی ئەو ڕابردووە بۆ کەسانی دیکە دەکات بە ڕاستەقینەیەکی دەرەکی. مامەڵەکردنی کەسانی دیکە لەگەڵیدا وا لە سەربازەکە دەکات خۆی بەو کەسە دابنێت، کە خاوەنی ڕابردووە بەنرخەکەیە. ئەو ڕابردووەشی بۆیە هەڵبژاردووە تاکو لە ناخۆشی و سەرنەکەوتنی ئێستا بیپارێزێت. ئەو خۆی، وەکو کەسێکی سازشنەکەر دەرناخات و مافی وەرگرتنی موچەی خانەنشینیش دەدۆڕێنێت؛ ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە ئەو خاوەنی ڕابردوویەکی بێ نرخ نییە.

ئێمە لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکی دیاریکراودا ڕابردوومان هەڵدەبژێرین. لەوێوە ڕابردووش خۆی بە سەرماندا دەسەپێنێت. ئەمەش لەبەر ئەوە نییە، کە ڕابردوو بوونی خۆی هەیە و لە ئێمەوە جیاوازە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە: (١) بەرجەستەبوونی ئەو داهاتووەیە، کە بوونی ئێمەیە؛ (٢) لەنێو جیهاندا بۆ ئێمە و کەسانی دیکە خۆی دەردەخات، تەنیا نییە و دەکەوێتە نێو ڕابردووی جیهانییەوە. خۆی دەکات بە پێوەر بۆ ئەوانی دی. بەوجۆرەی ئەندازیارێک لە کێشانی وێنەیەکی ئەندازیارییدا، بە حەزی خۆی، سەربەستە و ناتوانێت وێنەیەک بکێشێت هیچ پەیوەندییەکی بە نموونە ئەندازیارییەکانەوە نەبێت، هەڵبژاردنی سەربەستانەی ئێمەش، لەگەڵ سەرهەڵدانی پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی ڕابردوومان، دەبێت بە هۆکاری پەیدابوونی کۆمەڵێک پەیوەندی نەبڕاوەی ڕابردوو بە جیهان و کەسانی دیکەوە. نەبڕانەوەی پەیوەندییەکان نەبڕانەوەی ئەو هەڵوێستانەیە ئێمە دەبێت وەریانگرین چونکە هەڵسەنگاندنەکەی ڕابردوومان لە داهاتوودا ڕوودەدات. وەرگرتنی هەڵوێستەکانیش لە چوارچێوەی پرۆژە بنەڕەتییەکەماندا خۆی دەسەپێنێت. سووربوون لەسەر دامەزراندنی ئەم پرۆژەیە سووربوونە لەسەر ڕابردوو؛ ئەمەش لە ناسینەوەی هەزاران هەڵوێست و ڕەفتاردایە. لۆجیکانەش، داواکاری ڕابردوو گریمانەیەکی مەرجدارە: "ئەگەر تۆ حەزبکەیت ئەو یان ئەم ڕابردووەت هەبێت، ئەوا دەبێت ئەم یان ئەو کارەبکەیت." مادام چەمکی یەکەم کۆنکرێتی و هەڵبژاردنێکی کاتیگۆریانەیە، مەرجدارییەکەش دەبێت بە مەرجدارییەکی کاتیگۆریانە. مادام هێزی خۆسەپاندنی ڕابردووم لە سەربەستی، لە تێڕامانی هەڵبژاردن و هێزی هەڵبژاردنەکەوە پەیدابووە، دژوارە بە شتێکی لەپێشتر دابنرێت. هەڵبژاردنە سەربەستەکەی من بە تەنیا ناوەڕۆک و ڕێکخستنی ناوەڕۆکەکە دیاریناکات؛ پەیوەستبوونی ڕانەبردووشمە بە داکەوتەوە. ئەگەر لەنێو پرۆژە بنەڕەتییەکەمدا، ئەو پرۆژەیەی هێشتا پەیدانەبووە،

یەکێک لە پڕۆژە بچوکەکانی پێشـــبکەوێت، بۆنموونە، بەهەرجۆرێک بێت خۆی لە دۆێنێ پێشتر دەربخات، یان کاتژمێرێک زووتر بێتەپێش، ئەم پڕۆژە پێشکەوتووە لە پەیوەندییەکەیدا بە ڕابردوومەوە مامەڵە لەگەڵ زنجیرەیەک ڕووداوی دیکە دەکات. ڕابردووەکەم، کە ئێستا لە لوتکەی پێشکەوتنەکەوە تەماشایدەکەم، کەمێک قێزی لێدەکەمەوە و بابەتێکی نەبزێوی پێوەر و حوکمدانە ڕەوشـــتییەکەمە. "من چەند گەمـــژە بووم!" یان "من چەند شـــەڕانی بووم!"، ئەمانە دەڵێم چونکە خۆم لێیان جیادەکەمەوە. من، ئێســـتا، لەنێویاندا ناژیم و نامەوێت لەناویشـــیاندا بم. ئەمەش هـــۆی ئەوە نییە، کە ئەوانە نەماون، بەڵکو ئـــەوان ئەو خۆیەن، کە من نین. من ئەو کەســـە[گەمژەیە] نیم. ڕۆڵی سەرهەڵدانەکەش بۆ ئەوەیە من بتوانم خۆمی لێ جیابکەمەوە و بتوانم خۆم هەڵســـەنگێنم. ئەمجۆرە بوونـ‌بۆـ‌خۆیە بەبێ هاوکاری لەگەڵ خۆیدا بوونی خۆی هەڵدەبژێرێت. ڕابردووی خۆی لەناونابات بەڵکو ڕابردوو دەردەخات تاکو خۆی لێ جیابکاتەوە و جەخت لەسەر سەربەستییەکەی بەتەواوی بکات (ئەوەی ڕابردووە جۆرێکە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕابردوودا و هەروەها جۆرێک لە نەریت.) لەلایەکی دیکەوە، بوونـ‌بۆـ‌خۆ هەیە، کە لە پڕۆژەکەیدا کات ڕەتدەداتەوە و هاوکارییەکـــی کەمی لەگەڵ ڕابردوودا هەیە. لە دۆزینەوەی زەمینەیەکی پتەودا، ڕابـــردوو هەڵدەبژێرێت و شـــتەکانی دیکەش بە ڕاکردن لـــە نەریت دادەنێت. ئەو لەســـەرەتاوە هەڵیانبژاردووە ڕانەکات؛ ڕەتـــی ڕەتدانەوەیانی داوە. ڕابردوو بۆ ئەو ڕۆڵی ڕاستگۆیی دەنوێنیت.

جۆری یەکەمی کەســـەکان بەقێزەوە دان بە هەڵەکەیدا دەنێت، بەڵام بۆ کەسی دووەم ئەمە مەحاڵە و بەبێ گۆڕانی پڕۆژە بنەڕەتییەکە ناکرێت. ئەم جۆرە کەسە، کەوابوو، توشـــی بڕاوی خراپ لەنێو جیهاندا دەبێت. خۆدۆزینەوەکانیشی لەپێناوی مانەوەی لەنێو بڕوای خراپدا دەبن بە پێکهاتەی پڕۆژە بنەڕەتییەکەی. ڕابردوو، وەکو شوێن، لەنێو هەڵوێستدا، کاتێک بوونـ‌بۆـ‌خۆ داهاتوو هەڵدەبژێرێت، پێکدێت. بەهاش بەسەر فاکتۆری ڕابردوویدا دەسەپێنێت و دەیکات بە هاندەر بۆ کردەوەکانی.

## جیم. ژینگەی من

ژینگە ئەو شـــوێنە نییە من داگیریدەکەم، کە لەپێشـــتر باسمانکرد. ژینگە لە ئامێرەکانی دەوروبەرم پێکهاتووە، کە ناتەبایی و سودمەندێتیشـــیان دەگرێتەوە. بێگومان، لە داگیرکردنی شـــوێنەکەمدا، من زەمینە بۆ بەرجەستەکردنی ژینگەکەم خۆشدەکەم و بە گۆڕانی شوێنەکەشم ژینگەکەم دەگۆڕم. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە، کەســـانی دیکەش، بەبێ مـــن، دەتوانن ژینگە بگۆڕن. برگســـۆن لە (یادەوەری و ماتەر)دا ڕوونیکردۆتەوە، کە گۆڕانکارییەکی کەم لە شـــوێنەکەمدا دەبێتە هۆکاری

گۆڕانـــی تەواو لە ژینگەدا. بەڵام بۆ باســـکردنی گۆڕانی تەواو لە شـــوێندا دەبێت بڕوانینـــە گۆڕانی تەواوی ژینگە. گۆڕانی گشـــتی ژینگـــە نابینرێت، بەڵام نکۆڵی لەو ڕاســـتییەش ناکرێت، کردەوەکانـــم بەردەوام لەگەڵ ســـەرهەڵدان و ونبوونی بابەتەکاندا، کە من دەســـتمتیایاندا نییە، دەبینرێن. بەگشتی پێکەوەبوونی لایەنە نەیارەکان و ســـودمەندێتی ئامێرەکان بەتەواوی پشت بە شوێنی منەوە نابەستن. من کاتێک پەیدادەبم، کە فرپیدەدرێمە نێو ئەو شتانەوە لەمنەوە جیاوازن. ئەوانیش لـــە دەورەبەری مندا هێزی خۆیـــان بۆ من یان دژی مـــن زیاددەکەن. بۆنموونە، دەمەوێت زوو بە پاسکیل بگەمە شارۆچکەکەی دیکە. ئەم پڕۆژەیە مامەڵە لەگەڵ کۆتاییە تایبەتییەکانی مندا دەکات و پەیوەندی بە شوێنی من و دووری شوێنەکەم لەو شـــارۆچکەیەوە هەیە. هەروەها مامەڵە لەگەڵ هەوڵدانە سەربەستەکەشـــم بۆ گەیشتن بەو کۆتاییە دەکات.

بـــەڵام تایەی پاســـکیلەکەم پەنجەردەبێت، خۆرەکە گەرمـــە، باکە بەرەوڕووم هەڵـــدەکات و هتـــد. هەموو ئەم دیاردانەی بیرم لێنەدەکردنـــەوە دەبن بە ژینگە. هەڵبەتـــە لەنێو پـــڕۆژە ســـەرەکییەکەمدا پەیدادەبن؛ لە پڕۆژەکـــەی مندا باکە بەهێز یان ســـوک دەردەکەوێت و خۆرەکەش گەرم دەبێت. تێهەڵکێشـــکردنی ئەم ڕووداوە بەردەوامانەیە ئەو یەکێتییە دروســـتدەکەن، کە ئاڵمانەکان بە (ئۆم وێڵت) ناوزەدیدەکەن. (ئۆم وێڵت)یش تەنیا لەنێو سنوری پڕۆژەی سەربەستدا، بۆنموونە، هەڵبژاردنی کۆتاییەکان، کە بوونی منن، پەیدا دەبێت.

ئەگـــەر لێرەدا بوەســـتین باســـەکەمان ســـادە دەردەکەوێت. ئەگەر ڕاســـت بێـــت هەریەکێک لە بابەتەکانی دەوروبەرم لەنێو هەڵوێســـتدا بناســـرێت و کۆی بابەتەکانیش هەڵوێســـت پێکنەهێنن؛ ئەگەر ڕاست بێت هەریەکێک لە ئامێرەکان لەنێو بەســـتێنی هەڵوێســـتەوە لەنێو جیهاندا سەرهەڵدات، هێشتا ئەو ڕاستییەش وننابێت، کە دەرکەوتنی کتوپڕی ئامێرێکی دیکە بەشداری لە گۆڕانێکی ڕادیکاڵانەی هەڵوێســـتەکەدا دەکات. کاتێک تایەی پاسکیلەکە کتوپڕ پەنچەر دەبێت دووریم لە شـــارۆچکەکەوە گۆڕانی بەسەردا دێت؛ دوورییەکە بەپێ نەک بە سوڕانەوەی تایەی پاســـکیلەکە دەپێورێت. ئەو ڕاستییەشم بۆ دەردەکەوێت، کە کەسەکەی دەمەوێت لەوێ بیبینم، تاکو من دەگەمە ئەوێ سواری شەمەندەفەرەکە دەبێت و دەڕوا. ئەم دڵنیاییە کاردەکاتە ســـەر چەند بڕیاردانێکی دیکەش (گەڕانەوەم بۆ شوێنەکەی خـــۆم یان ناردنی تەلەگرامێک و هتد.) دەگونجێت دڵنیا نەبم لەوەی بتوانم لەگەڵ ئەو کەســـەدا پەیمانەکە دروســـتبکەم و دەبێ کەسێکی دیکە بدۆزمەوە یان واز لە پلانەکـــە بەتەواوی بهێنم. ئایا پڕۆژەکەم بە ســـەرنەکەوتوو دابنێم؟ لەمحاڵەتەدا، دەڵێم، نەمتوانی پیرۆ لە کاتی خۆیدا ئاگادار بکەم و تێبگەیەنم. ئایا ناســـینەوەی ئەم بێدەستەڵاتییە نییە، کە سەربەســـتییەکەم سنوردار دەکات؟ بێگومان نابێت

سەربەستی هەڵبژاردنەکەم لەگەڵ ئەو سەربەستییەی دەستمدەکەوێت تێکەڵبکرێت. بەڵام، هەڵبژاردنەکەشم نییە، کە لێرەدا کایەدەکات چونکە نەیاربوونی ژینگە لەزۆر حاڵەتدا گۆڕانکاری لە پرۆژەکانمدا دروستدەکات.

پێش رەخنەگرتن لە پرسیارە سەرەکییەکە، باشترە پرسیارەکە دیارییبکەین، ئەگەر گۆڕانکارییەکانی نێو ژینگە گۆڕان بەسەر پرۆژەکانمدا بهێنێنن، ئەوا دەبێت لە دوو ئاستدا دایانبنێین. یەکەم، خودی گۆڕانکارییەکان بەتەنیا ناتوانن کاربکەنە سەر پرۆژە بنەڕەتییە وازلێهێنراوەکەم، کە بەپێچەوانەوە، دەبێت بە پێوەر بۆیان. لەبەر رۆشنایی پرۆژەی بنەڕەتی دیکەدا دەبن بە هۆکار بۆ وازلێهێنان لەم یان لە ئەو پرۆژەیە؛ ئەگینا نابن بە هۆکار دانانرێن چونکە ئاگامەندییەکی-هاندەر هۆکار دەناسێت، کە هەڵبژاردنێکی سەربەستی کۆتاییە. ئەگەر هەورەکان بە ئاسمانەوە رێگەی پرۆژەی چونەدەرەوەم بگرن لەبەر ئەوەیە، کە لە پرۆژە سەربەستەکەمدا ناسراون و پەیوەندیان بە بەهای چوونەدەرەوەوە هەیە؛ هەنگاوبەهەنگاویش پەیوەندی بە من و سروشتەوە و ئەو جێگەیەی پەیوەندییەکەی لەسەرە هەیە. دووەم، لەژێر هیچ بارودۆخێکدا ئەو بابەتەی سەریهەڵداوە یان ونبووە، نابێت بەهاندەری وازهێنانم لەپرۆژەکە. دەبێت بابەتەکە، وەکو شتێکی کەم لەنێو هەڵوێستە سەرەکییەکەدا بناسرێت؛ پێویستە دەرکەوتن و خۆشاردنەوەکەی لەناوببرێت و من خۆمی لێ دووربخەمەوە. دواجاریش، لەبەردەم بابەتەکەدا خۆم حوکم بەسەر خۆمدا دەدەم. ئێمە روونمانکردەوە، کە گازە سورە گەرمەکەی ئەشکەنجەدانیش لە سەربەستیمان دانابڕێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە هەمیشە گرفتەکان چارەسەردەکرێن، بەڵکو مەحاڵی بەردەوامبوون لە رەهەندێکدا دەبێت سەربەستانە پێکبێت. مەحاڵبوونەکە لەرێگەی وازهێنانی سەربەستانەی ئێمەوە دەکەوێتە سەر شتەکان. مانەوەی جۆرە رەفتارێک هانی مەحاڵبوونەکە بۆ وازهێنانەکەمان نادات.

کاتێک ئەم راستییە دامەزرا، دەبێت بزانین، ئامادەبوونی شتێکی دراو، دوور لەوەی رێگربێت بۆ سەربەستییەکەمان، سەربەستییەکەمان داوای دەکات. سەربەستییەکەش سەربەستییەکی دیاریکراوە، کە بوونی منە. ئایا من بێجگە لە رەتدانەوەی ناوەکی بوون-لەنێو-خۆ چی دیکەم؟ بەبێ ئەو بوون-لەنێو-خۆیەی رەتی دەدەمەوە لەنێو نەبووندا وندەبم. لە پێشەکی[ئەم نوسراوەشدا] ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە ئاگامەندی بوونی بوون-لەنێو-خۆ بۆ "بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی" بەکاردەهێنێت. ئەگەر ئاگامەندی ئاگای لە شتێک هەبێت، ئەوا پێویستە ئەو شتە راستەقینە بێت؛ واتە بوونێکی سەر بە ئاگامەندی نەبێت. ئێستا دەبینین ئەم بەڵگەیە بەرفراوانترە: ئەگەر من بتوانم بە کارێک هەستم، ئەوا پێویستە لەسەر ئەو هەبووانە کارەکەم بکەم، کە بوونێکی سەربەخۆیان هەیە و لە بوونی من و کارەکەمەوە جیاوازن. کارەکە بوونی ئەو شتە سەربەخۆیە بۆ من ئاشکرادەکات،

بەڵام مەرجداری ناکات. سەربەســـتی ئەوەیە تۆ سەربەســـتانە بتوانیت شـــتەکان بگۆڕیت. سەربەســـتی، کەوابوو، بوونی گۆڕانە لە ژینگـــەدا: لابردنی ڕێگرەکان و بەکارهێنانی ئامێرەکانە. بێگومان، سەربەســـتیش ئەو شـــتانە بە ڕێگر دەبینێت، بەڵام لە هەڵبژاردنی سەربەســـتانەدا واتاکەیان لێکدەداتەوە. پێویســـتە شتەکان لەوێدا بن و دڕندانە خۆیان دەرخەن بۆ ئەوەی سەربەســـتی هەبێت. سەربەســـتی ئەوەیە لە کارکردندا و لەنێو جیهاندا سەربەســـت بیت. ئەگەر ئەمە ڕاســـت بێت، سەربەستی ئەوەیە بتوانیت بگۆڕیت و لە پرۆژەکەتدا بوونی سەربەخۆی هەبووەکە بناسیتەوە. ڕەتدانەوەی ناوەکی بوونی ســـەربەخۆی بوون-لەنێو-خۆ دەردەخات. ئەم سەربەخۆییەیە خەســـڵەتی بوون بە شت بە بوون-لەنێو-خۆ دەبەخشێت. لە ئاکامدا، ئەوەی سەربەستی لەگەڵ سەرهەڵدانییدا دایدەنێت دەریدەخات، کە مامەڵە لەگەڵ شـــتێک بێجگە لە خۆی دەکات. کردن، بەتەواوی گۆڕانی ئەو شـــتەیە، کە تەنیا پێویســـتی بە خۆی بۆ بوونی هەیە؛ کارکردن لەسەر ئەو شتە دەکرێت، کە بایـــەخ بەکار نادات و بەبێ کارکردن هەیە. بەبێ ئەمە کارکاردن لە واتا بەدەرە و سەربەستیش لەناودەچێت. بەگشتی پرۆژەی سەربەستی هەڵبژاردنە، کە ناسینەوە و بڕواکردنە بە جۆرێک بەرەنگاری لە شـــوێنێکدا. سەربەســـتی دەیەوێت بەســـەر بەرەنگاریکردنی جیهاندا سەرکەوێت.

مادام شتە دەرەکییەکان ســـەربەخۆن هەموو پرۆژەیەک لە دامەزراندنی خۆیدا توشی چاوەڕوان لێنەکراوەکان بە ڕادەیەک دەبێت. کاتێک دەمەوێ بۆ بینینی پیرۆ بۆ گوندەکەی نزیکمان بڕۆم، لە ڕێگادا پەنچەربوونەکە و هەڵهاتنی بایەکی توند و هەزارەهـــا ڕووداوی زانراو و نەزانراوی دیکە بەرەو ڕووم دەبنەوە. هەموویان واتای پرۆژەکەم پێکدەهێنن. پەنچەربوونە چاوەڕواننەکراوەکە پرۆژەکەم دەشـــێوێنێت. بەبێ هەڵبژاردنی من دێتە نێو جیهانەوە. بێگومان، من هەمیشە چاوەڕوانی ڕووداوە چاوەڕواننەکراوەکانم. ئەگەر شـــتێک ببێت بە ڕێگـــرم، کە هەرگیز بڕوام نەدەکرد ڕوویدات، وەکو لافاو یان هەرەسهێنانی لایەکی چیاکە، ئەم ڕووداوە چاوەڕواننەکراوانە بە ڕادەیەک لەپێشـــتر دەبینران. وەکو چۆن ڕۆمانییەکان جێگەیەکی تایبەتیان بۆ خواوەندە نەناســـراوەکان دادەنا، منیش لەنێو پرۆژەکەمدا پەراوێزێک بۆ ڕووداووە چاوەڕواننەکراوەکان دروستدەکەم. ئەمەش پەیوەندی بە سروشتی پرۆژەکەوە نەک توندی باکە یان ئەو دووربینییەی ئەزمون دەستیدەکەوێت، هەیە.

ئەم تێبینیانەیە ڕۆشـــنایی نوێ دەخەنە ســـەر هەڵبژاردنی سەربەست: هەموو پرۆژەیەکی سەربەســـتی کراوەیـــە و داخراو نییە. هەرچەنـــدە هەموو پرۆژەیەک دەبێت بە شـــتێکی تاک، بەڵام لەنێو خۆیـــدا ئەگەرەکانی گۆڕانکاری هەڵدەگرێت. پرۆژە لە بونیادەکەیدا سەربەخۆیی لەنێو جیهاندا بۆ شتەکان دادەمەزرێنێت. ئەم پێشبینییەی پێشبین نەکراوەکان لەنێو پرۆژەدا، کە بوونی منە، یارمەتیمان دەدات

لە ڕووداو یان کارەســـاتەکان تێبگەین و لە ئاســـتیاندا سەرسام ڕانەوەستین. هیچ شتێک لەنێو جیهاندا شیاوی سەرسوڕمان نییە. هیچ شتێک بەبێ بڕیاردانی خۆمان لەسەر سەرسوڕمان سەرمان ناسوڕمێنیت.

بابەتی سەرەکی سەرسوڕمان بوونی ئەم یان ئەو شتە لەنێو جیهاندا نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە جیهان بەگشتی هەیە؛ من فڕێدراومەتە نێو هەبووەکانەوە، کە بۆ من ناجۆرن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەڵبژاردنی کۆتای. من پەیوەندییەکانم لەگەڵ هەبووەکاندا هەڵدەبژێرم و هەبووەکانیش پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. من هەڵیدەبژێـــرم، کە بچنە نێو پێکهاتەیەکی ناســـراوی بوونی منەوە. کەوابوو، نەیاری هەبووەکان دەبێت بە گەواهێک لەپێشتر و سەربەستییەکەم، وەکو مەرجێک هێڵەکانی دیاریدەکات.

هەرکاتێک پرســـیار سەبارەت هەڵوێســـت بکرێت پێویستە لەسەر ئەو خاڵەش ســـوربین، کە حاڵەتە باسکراوەکانی شـــتەکان لایەنی ئەودیویشی هەیە. لێرەدا، ئەگەر سەربەســـتی پێشـــوەخت نەیاری شـــتەکان بەگشتی بناســـێت ئەوا ئەمە هەمانـــکات بوونی دەرەکـــی و ناجۆری بوون-لەنێو-خۆ دەســـەلمێنێت. هەڵبەتە، نەیاری لە سەربەســـتییەوە ڕوو لە شتەکان دەکات. ئەمەش لەوێدا ڕوودەدات، کە سەربەستی ڕۆشنایی بخاتە سەر فاکتۆری بوونی خۆی، وەکو بوون-لەنێو-شتەکاندا و بوون-لەنێو-خۆی ناجۆرەکان. سەربەســـتی خۆی بەلایەنی جیاواز لە شتەکانەوە دەردەخات (واتایان پێدەبەخشـــێت و دەیانکات بە شـــت). بەڵام لەگەڵ ناســـینی شتە دراوەکەدا واتاکەش خۆی دەسەپێنێت؛ سەربەستی دوورکەوتنەوەی خۆی لە بوونە-لەنێو-خۆ ناجۆرەکان دەبێ ببینێت، تاکو تێپەڕیانبکات. بەپێچەوانەشەوە، هەڵکەوتە دراوەکە پشـــتگیری لە واتا دانانەکانی دیکەشدا دەکات. دوورکەوتنەوە لەنێو شـــتە ناجۆرەکاندا بۆ بوون-بۆ-خۆ دەگرێتە خۆی. ئەمە بونیادی سەرەتایی هەڵوێستە و لێرەدا ئاشکرا دەبینرێت.

لەگەڵ ئەو سەرســـوڕمانەی لەئاستی شتەکەدا توشمان دەبێت و ڕووکردنەکەی لەکۆتاییـــدا، سەربەســـتی بوونـــی شـــتە دراوەکـــە، وەکـــو ئەو شـــتە لێرەدا، بەرجەستەدەکات (لەپێشتر لێرە، لەوێ، ئەم یان ئەو شتە نەبوو). شتە دراوەکەش فـــۆرم وەرناگرێت، بەڵکو هەبوویەکی ڕووتە و ناســـراوە بـــۆ ئەوەی تێپەڕبکرێت. هەمانکات، سەربەســـتی ڕەتکردنی شتە دراوەکەیە و خۆی، وەکو ڕەتکردنی شتە دراوەکە هەڵدەبژێرێت. سەربەستی هەموو ڕەتکردنێکی شتی دراو نییە. لەگەڵ ناسینی هەبووە ڕووتەکە و واتا پێبەخشینی، سەربەستی بوونی خۆی هەڵدەبژێرێت. گۆڕانی شتە دراوەکە کۆتاییەتی و شتە دراوەکەش لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییە هەڵبژێردراوەکەدا دەبینرێت. کەوابوو، سەرهەڵدانی سەربەستی ڕۆشنکردنەوەی کۆتاییە لەودیو شتە دراوەکەوە و دەرخســـتنی شـــتە دراوەکەیە لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکەدا: ئەم دوو

بونیـــادە لەیەکدی جیانابنەوە و پێکەوە هەن. لەدواییدا ڕوونیدەکەینەوە، کە بەها هەمەکییەکانی کۆتاییە هەڵبژێردراوەکان تەنیا لە شـــیکردنەوەدا دادەبڕێن؛ هەموو هەڵبژاردنێک هەڵبژاردنی گۆڕانێکی دیاریکراوە بەسەر شتە دراوە دیاریکراوەکەوە. هەموو هەڵوێستێکیش دیاریکراوە. نایاری شتەکان و تەواناییان بەگشتی لەکۆتاییە هەڵبژاێردراوەکاندا دەبینرێن. بەڵام کۆتایی تەنیا بۆ بوون-بۆ-خۆ هەیە، کە بوونی خۆی بە فرێدراوی لەنێو شتە ناجۆرەکاندا دەدۆزێتەوە. بەم خۆ دۆزینەوەیە هیچی نوێ بێجگە لە واتادانان ناخاتەسەر هەڵکەوتنەکە. ئەو لە فڕیدانەکەی بەرپرسە و بە هەڵوێستی دادەنێت.

لەبەشی چوارەمی کەرتی دووی[ئەم نوسراوەدا] بینیمان، کە بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ سەرهەڵدانیدا بوون-لەنێو-خۆش دەهێنێتە نێو جیهانەوە؛ بەشێوەیەکی گشتی، بە هۆی نەبوونەوە شـــتەکان یان بوون-لەنێو-خۆ 'لەوێدا' هـــەن. هەروەها بینیمان، خودی ڕاســـتەقینە لەوێدا، لەگەڵ خەسڵەتەکانیدا بەبێ شێواندن یان پێوەنوسان هەن. ئێمە، لەگەڵ ســـەرهەڵدانەکەماندا و بەڕەتدانەوەکان: وەکو جیهان، شوێن، کات و لایەنـــە هێزەکییـــەکان، لێی جیادەبنەوە. ئێمـــە، بەتایبەتی، بینیمان، کە هەرچەندە شـــتەکان (لێوانەکە، شوشەی مەرەکەبەکە، ئەم مێزە و هتد) دەورەیان داوین و خودی ئامادەبوونەکانیان ناناســـرێت، ئەگەر ئێمە کارێک یان هەڵوێستێک لە داهاتـــوودا بەرانبەریان دیارینەکەین. ئێمە ئێســـتا دەتوانین لە واتای حاڵەتی شتەکان تێبگەین: ئێمە، هیچ شتێک، بێجگە لە سەربەستییەکەمان لە شتەکانمان جیاناکاتەوە؛ سەربەستییەکەمان لەڕاستی بوونی ناجۆر و چاوەڕواننەکراوی شتەکان بەرپرســـە. ئەو ڕاستییە دەناسێت، کە نەیارە و ئێمەش لەوەوە جیاوازین: چونکە لەسەر زەمینەی ڕەتدانەوە دەردەکەوێت و دەبینرێت. کەوابوو، پرۆژەی سەربەستیم هیچ بۆ شـــتەکان زیادناکات: تەنیا بوونیان لەوێدا دەچەســـپێنێت. بوونیان لەنێو ئەزمونـــدا بەرجەســـتەدەکات و لەنێو جیهان و کاتـــدا دەریاندەخات. دواجاریش، سەربەســـتییەکەمان بوونی شـــتەکان دوور لە دەســـتەڵاتی ئێمە و سەربەخۆ بەو نەبوونەی، کە بوونی منە نیشـــاندەدات و لە منەوە جیایاندەکاتەوە. لەبەر ئەوەی سەربەستی حوکمی بەســـەردا دراوە سەربەستی بێت ناتوانێت خۆی هەڵبژێرێت. لەگەڵ ناســـینی شـــتە هەڵکەوتوەکان و تێپەڕکردنیان هەڵبژاردن و ڕێکخســـتنی شـــتەکان لەنێو هەڵوێســـتدا پەیدادەکرێن؛ هەڵکەوتنی سەربەستی و بوون-لەنێو-خۆیە لەنێو هەڵوێستدا لەڕێگەی ڕووداوە نەیار و چاوەڕواننەکراوەکانەوە دەردەبڕێن. کەوابوو، من سەربەســـتییەکی ڕەهام هەیە و لە ئاستی هەڵوێستەکەشمدا خاوەنی لێپرسینەوەیەکی ڕەهام. بەڵام من بەبێ هەڵوێست هەرگیز سەربەست نابم.

## دال. هاوڕێکانم

ژیـــان لەنێو جیهانێکدا هاوڕێکانی تێدابێت تەنیا توشـــی ڕووبەڕوو بوونەوەمان لەگەڵ کەســـانی دیکە لە هەموو شـــەقامێکدا ناکات؛ من خۆشم لەنێو جیهانێکدا دەدۆزمـــەوە، کە مامەڵـــە لەگەڵ بابەتە ئاڵۆزەکاندا دەکـــەم و واتاکەیان پڕۆژەی سەربەستییەکەم دروستیاننکات. ئەمەش، هەروەها، ئەوە دەگەیەنێت واتاکە دراوە و ئەو واتایەش ڕووبەڕووی واتاکەی من دەبێتەوە، کە هێشتا بە من نەدراوە. کاتێک پرســـیار ســـەبارەت فاکتۆرە بنەڕەتی و هەڵکەوتوەکەش دەکەین، کە بوونی ئێمە لەنێو جیهانێکدا لەگەڵ کەسانی دیکە لەنێو هەڵوێستماندا دیاریدەکات، کێشەکە سێ لایەنی ڕاستەقینە دەخاتە پێش، کە هەڵوێستێکی کۆنکرێتی من پێکدەهێنن: ئامێرە واتاپێبەخشـــراوەکان (وەکو، ئیستگەکە، هێما دانراوەکانی هێڵی شەمەندەفەرەکە، بەرهەمێکـــی هونەری و تێبینی بۆ هاتووچۆکردن)، ئەو واتایەی بوونی من هەیەتی و دەیدۆزمەوە (وەکو، نەتەوەکەم، ڕەگەزەکەم و چۆنیەتی لەشـــولارم)، هەروەها، کەسانی دیکە، وەکو بنکەی ئاماژەکردن بۆ ئەم واتایانە.

هەمووشـــتێک ئاســـان دەبوو ئەگەر ســـەر بە جیهانێک بوومایە واتاکان لەبەر ڕۆشـــنایی کۆتاییەکانی مندا دروســـتبکرانایە. لەمحاڵەتەدا وازم لە ئامێرەکان لە چوارچێوەی هەڵبژاردنی بوونی خۆمدا دەهێنا؛ ئەم هەڵبژاردنە چیاکە دەکات بە ڕێگر و ســـەخت بۆ هەڵگەڕان یان ئەو شوێنەی دیمەنێکی جوانی لێوە دەبینم؛ کێشەکە لە واتای چیاکـــەدا نەدەبوو بەوجۆرەی خۆی دروســـتیدەکات چونکە من[لەوێدا] دەبم بەو ڕاســـتەقینەیەی واتای پێدەبەخشـــێت. گرفتەکە ئاسانیش دەبوو ئەگەر مـــن مۆنادێکی بێ دەرگا و پەنجەرە بوومایە. لەڕێگەیەکەوە بمزانیایە، کە مۆنادی دیکەش هەیە و واتای نوێ بەو شتانە دەبەخشن، کە من دەیانبینم. لەمحاڵەتەدا، کە فەیلەسوفەکانیش توێژینەوەکەیان لەسەر دامەزراندوە، واتاکانی دیکە بە ئەگەر دادەنێم. دواجاریش فرەلایەنی واتاکان بە فرەلایەنی ئاگامەندییەکانەوە دەبەستینەوەو بۆ منیش دانانی واتای نوێ ئاسان دەبوو. بەڵام بینیمان، چەمکی مۆناد خۆ-ویستی لەنێودا شـــاراوەتەوە و فرەلایەنی واتاکان، کە من بە ڕاستییەوە دەیانبەستمەوە و فرەلایەنی واتای سیســـتەمەکان، کە هەریەکەیان ئاماژە بۆ ئاگامەندییەک دەکات و ئـــەو ئاگامەندییەش من نیم، تێکەڵدەکات. بێجگە لەمە، لە ئاســـتی ئەزمونێکی کۆنکرێتییدا باســـکردنە مۆنادییەکە ناجۆرە. لەڕاســـتیدا، شتێک لە جیهانی مندا هەیە، کە لە فرەلایەنی واتاکانەوە جیاوازە؛ واتای دەرەکی هەن، کە من دروســـتم نەکردوون. من، ئەو بوونەی واتا بە شتەکان دەبەخشێت، خۆم لەنێو جیهانێکی پڕ واتادا دەدۆزمەوە بەبێ ئەوەی من درستم کردبن.

دەشی کەسێ بزانێت بۆنموونە واتاگەلێکی لە ژمارەبەدەر بەبێ هەڵبژاردنم لەو

شـــارەدا هەیە، کە منی تیدا دەژیم: ســـەقامەکان، خانوەکان، دوکانەکان و پاس، هێمای سەرشـــەقامەکان، مۆســـیقای نێو ڕادیۆکە و هتد هەن. لە تەنیاییدا بوونی ڕووت دەدۆزمـــەوە؛ بۆنموونە، ئەم بەردە دەبینم؛ واتە ئەو هەبووە لەوێدایە و هیچ لەدەرەوەیدا نییە. لەگەڵ ئەمەشدا، واتای پێدەبەخشم، وەکو "پیایدا سەردەکەوم" و "لێـــی دوور دەکەومـــەوە"، "بیری لێدەکەمەوە" و هتـــد. کاتێک دەچمە ئەودیوی شـــەقامەکەوە و کۆشکێک دەبینم ئەو کۆشـــکە هەبوویەکی ڕووت نییە من لەنێو جیهاندا بەرجەستەیبکەم. من نابم بە هۆکاری سەرهەڵدانی 'ئەو'؛ بەڵکو واتاکەی، کە بۆ مـــن دەردەکەوێت ســـەربەخۆیە. من دەیدەۆزمەوە، دەزانم کۆشـــکەکە بۆ جێنشینیبوونە، فەرمانگەی کارخانەی گازە یان زیندانە و هتد. لێرەدا، ئەم واتایە هەڵکەوتە و ســـەر بە هەڵبژاردنی من نییە؛ وەکو ڕاستەقینەیەکی بوونی لەنێو خۆ بەهەمان ناجۆرییەوە خۆی ئامادەکردوە.

بەهەمانشێوەش، پێکەوەبوونی لایەنە نەیارەکان لەنێو شتەکاندا پێش ئەزمونەکەم خۆی دەرخستوە. هێماکە بۆ من دانراوە و لەسەری نوسراوە؛ "خێرایی کەمکەرەوە"، "لەسەرخۆ پێچبکەوە،""قوتابخانەیە خێرا مەڕۆ"، "شوێنی مەترسییە"، "پاش سەد مەتر پردێکی باریک هەیە" و هتد. ئەم واتایانە بەســـەر شتەکانەوە ڕاستەوخۆش پەیوەندییان بە منەوە هەیە. من لە شوێنی پەڕینەوە دەچمە ئەوبەری شەقامەکە. بـــۆ کڕینی ئەوەی دەمەوێت دەبـــێ بچمە ئەو دوکانە. دواجاریـــش، ئەم ئامێرە، بۆنموونە پاندانەکە ئەم یان ئەو فۆڕمەی پێ پردەکەمەوە.

ئایا هەموو ئەم شـــتانە سەربەســـتییەکەم ســـنوردار ناکەن؟ ئەگەر شـــوێن نەخشەی کەســـەکە نەکەوم ڕێگاکەم وندەکەم و دەکەومە سەر شەقامێکی دیکە، شـــەمەندەفەرەکەش جێم دەهێڵێت و هتد. ئەم هێمایانە، وەکو "چوونەژوورەوە" و "چوونەدەرەوە" پێویســـتن. واتای ئەم هێمایانە لەسەر دەرگاکان نوسراوە. منیش پەیڕەویان دەکەم. ئەوان لایەنـــە نەیارەکان زۆرتر دەکەن. ئەگەر منیش ملکەچی ئەم سیســـتەمە بم، ئەوا دەبێت هەمووکاتێک پشتی پێبەستم. دەشێ سودەکانی بۆ من بوەستن؛ لە کاتی جەنگدا یان کاتێک من لەنێو پرۆژەکەمدا گیردەخۆم، لە پێویستییەکانم بێبەری دەبم تاکو بە کۆتاییەکانم بگەم. بەتایبەتی، ئێمە تەماشای هێمـــا، ئاگادارییەکان و قەدەغەکراوەکانمان کرد، کـــە بەو جۆرەی ڕوو لە هەموو کەســـێک دەکەن ڕوو لە منیش دەکەن. منیش لە پەیڕەویکردنیان دەچمە ڕیزەوەو خۆم تەســـلیمی ئامانجی مرۆڤایەتی دەکەم، کە هەموو کەســـێکە. کەوابوو، مادام من ئەو کۆتاییـــەم، کە هەڵمبژاردووە و ئامێرەکانیش بۆ ناســـینەوەی کۆتاییەکە هەرچییـــەک بن، ئەوا گۆڕانم بەســـەر بوونمدا هێناوە. هەمانـــکات، مادام جیهان لەنێـــو تەکنیکە بەکارهێنراوەکانی منەوە خۆی دەردەخات، ئەوا جیهانیش گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەو جیهانەی لەنێو بەکارهێنانی پاسکیلەکەی منەوە، ئۆتومۆبیلێک و

شەمەندفەر دەناسرێت ڕوخساری لەسەر ئەو ئامێرانە نیشاندەدات، کە من بەکاریان دەهێنم؛ کەوابوو، جیهان ڕوخساری خۆی بۆ هەموو کەسێک دەردەخات. ئاشکراشە، کەسێک دەڵێت، سەربەســتییەکەم لە هەموو لایەک لە من ڕادەکات؛ هەڵوێستێک وەکو بەســتێنی واتاکان بۆ جیهان، لە چواردەوری سەربەستی هەڵبژاردنەکە و لە خۆ بوونەکەمەوە نییە؛ بەڵکو حاڵەتێک هەیە، کە بەســەرمندا ســەپێنراوە. ئەم گرفتەیە ئێمە دەمانەوێ لێی بکۆڵینەوە.

بێگومان بوونم لەنێو جیهانێکدا، کەســانی دیکەشی تێدا بژی بەهای فاکتۆری خــۆی هەیە. ئاماژەش بــۆ فاکتۆری بنەڕەتی ئامادەبوونی کەســانی دیکە لەنێو جیهانــدا دەکات. ئەمەش ئەو فاکتۆرەیە، بینیمان، لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆوە دەرناچێت. هەرچەندە ڕەگی فاکتۆری بوونمان قوڵتر دادەکوتێت، هێشتا لە فاکتۆری بوونی ئێمەوە، مادام دووەمیان هەڵکەوتنی بوون-بۆ-خۆ بە پێویســت دادەنێت، هەڵناقوڵێت. باشترە بڵێین: بوون-بۆ-خۆ لەنێو فاکتۆردا هەیە؛ بوونی ئەو لەگەڵ ڕاســتەقینەیەکی سەر بە یاسا نابێت بە یەک و تەنانەت لەگەڵ هەڵبژاردنی سەربەستیشدا یەک شــت نین. لەنێو فاکتۆرەکاندا یەکێکیان، وەکو بوون-لەنێو-جیهاندا-لەگەڵ-کەســانی دیکەدا، نە لە شتێکی دیکەوە دەدرێت نە دەسەلمێنرێت. ئەم فاکتۆرە پێویســتی بە سەربەســتی من بۆ دۆزینەوەی هەبێت یان نەبێت لە دواییدا باسیدەکەین.

فاکتۆر لەم ئاســتەدا لەگەڵ دەرکەوتنی مندا دەردەبڕێت، کە بە هۆی تەکنیکە بــە کۆمەڵ و لەپێشــتر پێکهاتووەکانەوە بۆ دۆزینــەوەی جیهانێک، کە واتاکەی لەدەرەوەی بوونی مندایە، خۆی دەسەپێنێت. تەکنیکەکان من بۆ شتە کۆمەڵەکان دەگەڕێننەوە: وەکو ڕەگەزی مرۆڤایەتی، نەتەوە، کۆمەڵە پیشەییەکان و خێزان.

پێویســتە زۆرتر لەســەر ئەم فاکتۆرە بدوێین: لەدەرەوەی بوونمدا بۆ-کەسانی دیکە، کە لەدواییدا باســیدەکەین، تەنیا ڕێگەیەکی ئــەرێ بۆ دانانی فاکتۆرەکەم بەکارهێنانی تەکنیکە دروستکراوەکانە، کە لە ئەوانەوە پەیدادەبێت. پێناسەکردنی بوونم، وەکو ئەندامێکی ســەر بە ڕەگەزی مرۆڤایەتــی پەیوەندی بە بەکارهێنانی تەکنیکە ســەرەتایی و گشتییەکانەوە هەیە: بۆنموونە، بزانیت چۆن دەڕۆیت، شت بکڕیت، چۆن حوکم بەســەر بابەتەکاندا بدەیت، زمان بەکاربهێنیت، بزانیت چۆن ڕاستی لە ناڕاستی جیابکەیتەوە و هتد. بەڵام ئەم تەکنیکانە لەلای ئێمە ڕووتکراوەو لە فۆرمێکی هەمەکییدا نین: گوتن دەنگەکان و واتای وشەکان بەگشتی ناگرێتەوە؛ ئەوەیــە، کە بزانیت چۆن بە زمانێک بدوێیت و لــە ڕێگەیەوە خۆت بە یەکێک لە ئەندامانی مرۆڤایەتی لەســەر ئاســتی ئەو نەتەوەیە دابنێیت. هەروەها، گوتن ئەو زانینە ڕووتکراوەیە نییە سەبارەت زمانەکە هەتبێت، کە فەرهەنگە ئەکادیمییەکان پێناسیدەکەن و ڕێزمانەکەی ڕووندەکەنەوە؛ بەڵکو ئەوەیە کەسێک بتوانێت لەودیو

گۆڕانکارییەکانەوە و دیاردەی ناوچەگەری پیشـــەیی و خێزانەوە بەکاری بهێنیت و بتوانێت بڵێت، ڕاستەقینەی بوونم، وەکو ئەندامێکی سەر بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە نەتەوەکەمان، ڕاســـتەقینەی ســـەر بە نەتەوەش لە خێزان، ناوچە و پیشەیە. ڕاســـتەقینەی گوتنیش زمانە و زمانیش دیالێکت، شـــێوەزمانی بـــازاڕی و زاراوە تایبەتییە بەکارهاتووەکانە. بەپێچەوانەشـــەوە، ڕاســـتی دیالێکت زمانە و ڕاستی زمانیـــش گوتنە. تەکنیکی کۆنکرێتی، کە پەیوەندی خۆمانی بە خێزان و ناوچەوە پێ دیاریدەکەین، ئاماژەی بوونمان بۆ بونیادێکی گشـــتیتر، کە واتاو ناوەڕۆکەکان پێکدەهێنێت، دەکات؛ ئەوانیش ئاماژە بۆ لایەنی گشتیتر دەکەن، تاکو بەگشتیترین و سادەترین ناوەڕۆک دەگەین، کە لە جیهاندا هەموو تاکێک هەیەتی.

بوون بە فەرەنسی، بۆنموونە، ئەو ڕاستییەیە، کە ساڤۆیاردی بیت. بەڵام مەرج نییە هەموو کەسێکی ساڤۆیاردی لەناوچەی ساڤۆیدا بژی؛ هەزار خەسڵەتی دیکەشی هەیە، وەکو بە زستان خلیسکان لەسەر بەفر بکات و بۆ گواستنەوە بەکاریبهێنێت. هەروەها، پەیڕەوی میتۆدی فەرەنســـی بۆ خلیســـکان نەک میتۆدی ئارڵبێرگ یان نەرویجـــی بکات. بەڵام مادام چیا بەفراوییەکان و لوتکە ســـپییەکانی بە تەکنیک هەســـتیان پێدەکرێت ئەوا واتای خلیسکانی ســـەربەفری فەرەنسی دەدۆزینەوە. بەگوێرەی ئـــەو میتۆدەکەی کەســـەکە وەریدەگرێت. میتـــۆدی نەرویجی، کە بۆ بەرزایی تەخت یان میتۆدی فەرەنسی بۆ بەرزایی لێژ باشترە، ئەوا خۆدەرخستنی بەرزاییەکە بە تەختی یان لێژی دەکەوێتەســـەر پێداهەڵگەڕانەکە بۆ ئەو کەســـەی سواری پاسکیلەکە بووە و دانانی پاسکیلەکەش لەسەر گێڕی بۆش یان خوارەوە. کەوابوو، فەرەنســـییەک "گێڕ"ی فەرەنســـی بۆ هاتنەخوارەوەی بەســـەر بەرزاییە بەفرینییەکـــەدا هەڵدەبژێرێت. ئەم گێڕەش جۆرێک لە بەرزایی بۆ ئەو دەردەخات. ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە چیا ئەڵپییەکانی سویســـرا یـــان باڤاریا، تێلەمارک یان یورا هەمیشـــە واتایەک، چەند ســـەختییەک، ئامێرەئاڵـــۆزەکان یان کۆمەڵی ڕووداوی نەیاری ئاڵۆزی فەرەنسی بۆ ئامادەدەکەن. بەهەمانشێوەش، ئاسانە ئەوە نیشانبدەین، کە زۆربەی هەوڵدانەکان بۆ پێناسەکردنی چینی کرێکار لە وەرگرتنی پێوەرێـــک بۆ بەرهەمهێنان، بەرهەمخۆری یان جۆرێک دیدی جیهانگەرانە لە گرێی هەستکردن بەکەمی دێتەکایەوە؛ لە هەموو حاڵەتێکدا کۆمەڵێ تەکنیک بۆ باسکردن و تێگەیشتین لە جیهان لەودیو ئەو شتەی بە "پرۆلیتاریای ڕۆاڵەتی" ناوزەدیدەکەین، لەگەڵ دژوەستانە توندوتیژەکەیدا، جەماوەرەکەی، لایەنی خۆدەرخستنەکانی و ئەو کۆتاییانەی ڕۆشنایی دەخرێنە سەر بەشداریدەکەن.

ئێســـتا، ئاشـــکرایە بوونم بە یەکێک لە ئەندامی چینێک یـــان نەتەوەیەک لە فاکتـــۆری منـــەوە، وەکو بونیادێکـــی ئۆنتۆلۆجی دەرنەچـــووە. فاکتۆری بوونم، بۆنموونە، لەدایکبوون و شـــوێنی لەدایکبوونم پەیوەندییان بە تێگەیشـــتنمەوە بۆ

جیهان و بوونی خۆم بە ڕێگەی تەکنیکی دیاریکراوەوە هەیە. ئەم تەکنیکانەی من هەڵمنەبژاردوون واتا بە جیهان دەدەن. دەریدەخەن من نەتوانم بڕیار لەسەر کۆتاییم بدەم. گرنگیشـــە من جیهان لەچ شـــێوازێکدا دەناسم، ئاسان و دژوەستانی چینی پرۆلیتاریای جیهانی یان لەنێو پەیوەندییە بورژوازییەکاندا بێت. من فرێنەدراومەتە نێو بوونێکی ڕووتەوە، بەڵکو لەنێو جیهانی کرێکار، فەرەنسایی، جیهانی لۆرین یان خواروو، کە بەبێ من واتای خۆیان هەیە، دانراوم.

باسەرنجێکی وردتر بدەین. لەپێشتر باسمانکرد، کە نەتەوەکەم سەر بە ڕاستی ئەندامبوونی منە لە ناوچە، خێزان یان گروپێکی پیشـــەییدا. ئایا پێویستە لێرەدا بوەستین؟ ئەگەر زمان ڕاستی دیالێکت بێت، ئایا دیالێکت دەبێت بە راستەقینەیەکی کۆنکرێتی؟ ئایا زاراوە تایبەتییە پیشەییەکانی 'ئەوان' بەکاریدەهێنن یان دیالێکتی ئەلساتی یاساکان دیاریدەکات؟ ئایا ئەمە دیاردەی سەرەتاییە، کە بناخەکەی لەسەر فاکتۆری ڕووت و هەڵکەوتنی بنەڕەتی دادەمەزرێت؟ دەشێ توێژینەوەی زمانەوانی لێرەدا توشـــی هەڵەکردن بێت؛ ئامار ڕۆشـــنایی دەخاتە سەر دەنگە نەگۆڕەکان، فۆنەتیک یان گۆڕانکارییە سیمەنتیکەکانی زمانە دراوەکە؛ ڕێگەمان دەدەن فۆمینە و مۆرفۆمینەی زمانە دراوەکە پێشـــبخەین، کە وشە بە دیاردەیەکی تاکەکەس بە واتا و مێژووەکەیەوە دەردەخات.

تاکەکان کاریگەرێتی کەمیان بەســـەر گەشـــەکردنی زمانـــەوە هەیە. فاکتۆرە کۆمەڵایەتییەکان، وەکو داگیرکردن، ڕێگاوبان و پەیوەندییە بازرگانییەکان هۆکاری بنەڕەتین بۆ گۆڕانی زمان. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە پرســـیار لە ئاستێکی ڕاستی شـــتە کۆنکریتییەکـــەدا دانەنراوە. ئێمـــەش تەنیا ئەوە دەبینین، کـــە بە دواییدا دەگەڕێین. بیریارە سایکۆلۆجییەکان لێکیانداوەتەوە، کە وشە توخمێکی کۆنکریتی گوتن نییە. تەنانەت وشەی دیالێکتیش یان خێزان بە خەسڵەتی تایبەتی خۆیەوە نابێت بەو توخمە؛ بونیادی ســـەرەتایی گوتن ڕســـتەیە. لەنێو ڕستەدا وشە ڕۆڵ دەبینێت؛ لەدەرەوەی ڕاســـتەدا وشـــە تەنیا ڕۆڵی پێشنیاری هەیە. لەنێو گوتاردا خەسڵەتی (هۆلۆفرەســـتیک)ی دەردەکەوێت. ئەمەش واتای وشە سنوردار ناکات، بەڵکو دەیکات بە بەشێکی دانەبڕاوی بەستێنەکە، وەکو فۆرمی دووەم لەنیو فۆرمە سەرەکییەکەدا. بەبێ ڕیکخستنە ئاڵۆز و چالاکەکە، کە خۆی تێدا بەرجەستەدەکات وشە لەدەرەوەدا بوونێکی ڕاستەقینەی نییە. پێش بەکارهێنانی بۆ ئەو مەبەستەی دانراوە لەنێو ئاگامەندی یان ئەودیو ئاگامەندی بوونی نییە: ڕستە لە وشەکان پێک نایەت. هێشـــتا بەمەش ڕازی نابین. پۆلهان لە (فلورس دی تاربس)دا نیشانیداوە، کە تەواوی ڕســـتەکان، "شوێنە هاوبەشەکان"، لەپێش بەکارهێنانیان دروستنابن. ئەگەر لەدەرەوەدا خوێنەر تەماشـــایان بکات تەنیا شوێنە هاوبەشەکانن، کە تیایدا پەرەگرافەکان ڕێکدەخرێن.

بــەڵام بەگوێرەی ڕوانینی نوســـەرەکە خەســڵەتە ناســـراوەکانیان دەگۆڕێت. ئەگەر ئەمە ڕاســـت بێت، ئەوا وشەکان، ڕستەسازی و ڕستە ئامادەکراوەکان پێش بەکارهێنانیان پەیدا نابن. مادام یەکێتی دەربڕین ڕســـتەیەکی واتادارە ئەوا ڕستە دەبێــت بەکردارێکی پێکهێنراو، کە ئـــەو بەرزێتییەی ڕەتیدەکات و ڕوو لە کۆتایی دەکات، دەیناســـێت. تێگەیشتن لە وشە لەبەر ڕۆشـــنایی ڕستەدا تێگەیشتنە لە شتێکی دراو لەنێو هەڵوێستدا و هەڵوێستیش لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکاندا.

بۆ تێگەیشـــتن لە ڕســـتەیەکی گوتراوی بەرانبەرەکەم، لەڕاســـتیدا، دەبێت لە ڕێگاکانـــی جوڵانی بەرزێتییەکەی ئەو تێبگەم. دەبێـــت منیش لەگەڵ ئەودا خۆم لەبەردەم ئەگەر و کۆتاییەکاندا دابنێم. زمانی گوتراو هەمیشـــە لەنێو هەڵوێستەوە ڕاڤەدەکرێت. ئاماژەکردن بۆ ئاووهەوا، شـــوێن و کات، ژینگە، شـــوێنی شـــارێک، ناوچەیەک یان وڵاتێک پێش وشـــەکە دەکرێـــت. خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان و باری تەندروستی پیرۆ و پەریشانییەکەی، ئەم بەیانییە، کە بینیم و سڵاوی لێکردم، بۆ من بەسن تێبگەم، کە شتەکان بە چاکی بەڕێوە ناڕۆن. تەندروستی ئەو نییە، کە خراپە، مادام دەموچاوی ئاڵ دیارە، کارەکە و خانوەکەشـــی نییە؛ بەڵکو حاڵەتی شار یان وڵاتەکەمانە. من ئەوەم دەزانی. لە پرسیارکردنەکەشمدا، "شتەکان چۆن بەڕێوە دەچن؟" من ڕاڤەی وەڵامدانەوەکەی دەکەم؛ من خۆم بۆ ئاســـۆی چوارلایی گواســـتەوە و ئامادەشـــم لەوێوە بـــۆ لای پیرۆ بگەڕێمەوە تاکو لـــە ئەو تێبگەم. گوێگرتن لە گفتوگۆ "گوتنە لەگەڵ"، نەک لەبەر ئەوەی بۆ ڕاڤەکردن لاسایی یەکدی دەکەینەوە، بەڵکو لە بنەڕەتەوە خۆمان بەرەو ئەگەرەکان دەکەین بە پرۆژە و دەبێت لە جیهانیش تێبگەین. ئەگەر ڕســـتە پێش وشە بکەوێت، ئەوا ئاماژە بۆ گوتەبێژ، وەکو بناخەیەکی کۆنکریتی گوتەکەی دەکەین. لەوە دەچێت وشە 'ژیان'ی هەبێت ئەگەر کەســـێک لە ڕســـتەکاندا و لە کاتە جیاوازەکاندا بەکاریبهێنیت. ئەم ژیانە وەرگیـــراوە لە ژیانی ئەو بابەتە دەچێت لە فلیمی فەنتازییدا دەیبینین؛ بۆنموونە، ئەو چەقۆیەی لەخۆیەوە هەرمێکە قاشـــدەکات. خرانە پـــاڵ یەکترە کتوپڕیەکان کاریتێدەکات؛ هونەرێکی سینەماتۆگرافییە؛ لەنێو کاتێکی جیهاندا پێکهاتوە. ئەگەر لە کاتی پرۆژەی ســـینماتیک یان فلیمی مۆرفۆلۆجیدا وشـــەکان بژین، ئەوا کۆی ڕستەکە دروستناکەن؛ وەکو ئەو ڕێگایانەی حاجیەکان یان کاروانچییەکان شوێنیان دەکەون ئەوانیش دەبن بە ئاســـەواری تێپەڕبوونی ڕســـتەکان. ڕســـتە پرۆژەیەکە لەبەر ڕۆشنایی ڕەدانەوەی شتە دراوەکە (ئەو شتەی کەسێک دەیەوێت دیاریبکات) کۆتاییەکە دیاریدەکرێت. ئەگەر شتە دراوەکە، وەکو وشە ڕستەکە دیاری نەکات، یان بەپێچەوانەوە ڕستە بۆ ڕۆشنکردنەوەی شتەدراوەکە پێویست بێت و وشەش لەبەردەم تێگەیشتندا ڕاگرێت، ئەوا ڕســـتە دەبێت بە ساتێکی هەڵبژاردنە سەربەستەکەم و کەســـەکەی لەگەڵمدایە تێیدەگات. ئەگەر زمان ڕاستەقینەی گوتن بێت، دیالێکت

و زاراوە تایبەتییەکان ڕاســـتەقینەی زمان بن، ئەوا ڕاستەقینەی دیالێکت کارێکی سەربەستی واتا دانانە، کە من هەڵیدەبژێرم. ئەم کارە سەربەستەش وشەڕیزکردن نییە. بەدڵنیاییەوە، ئەگەر وشە ڕیزکردنێکی ڕووت یان تەنیا شوێنکەوتنی یاساکانی ڕێزمان بوایە ئەوا سنورداریێتی فاکتۆر بەسەر سەربەستی گوتە بێژەکەدا دەسەپێنرا؛ سنورداریێتییەکە بەستراوە بە فۆنەتیک و سروشتی پێکهاتووی وشەکانەوە، زاراوە بەکارهێنراوەکان و زاراوە تایبەتییەکانی گوتەبێژەکەوە ئەوەشـــمان ڕوونکردەوە، کە ئەم حاڵەتەش دروســـت نییە. لەم دواییەدا ســـەلمێنراوە، کە وشـــەکان جۆرە سیستەمێکی ژیان و یاسای دینامیکیەتی گوتنیان هەیە. ژیانێکی نا-کەسی لۆگۆسە یان بەکورتییەکەی، گوتن سروشـــتە و بەڕادەیەکیش مرۆڤ دەبێت ملکەچی بکات تاکـــو بتوانێت بەکاری بهێنێت. هەندێک جار مرۆڤ گوتـــن بە مردوو "بۆنموونە، گوتـــراوە" دادەنێـــت و ژیانێکی نا-کەســـی و هیزی دەداتێ. جـــۆرە پەیوەندی و جیابوونەوەیەکی بۆ دادەمەزرێنێت، کە لە سەربەســـتی کەســـێتی بوون-بۆ-خۆی گوتەبێژەوە ســـەریانهەڵداوە. خەڵکی گوتن دەکەن بە زمان، کە بۆ خۆی دەدوێت. ئەمەش هەڵەیە و نابێ ڕووبدات. ئەگەر مرۆڤ لەنێو ئەو تەکنیکانەوە بەرجەســـتە بێـــت، کە خۆیان کاردەکەن، زمانێک خۆی بدوێت، زانســـتێک خۆی دابمەزرێنێت، شارێک بەگوێرەی یاســـاکانی خۆی، خۆی دروستبکات؛ ئەگەر واتاکان چەسپاوبن و بەرزێتی مرۆڤیش بناســـینەوە، ئەوا ڕۆڵی مرۆڤ وەکو ڕۆڵی ئەو کەشتییەوانەی لێدێت بەگوێرەی خێرایی با و شـــەپۆلەکان کەشتییەکە دەخاتەگەر. بەڵام هەموو تەکنیکێک بۆ گەیشـــتنی بەو کۆتاییانەی مرۆڤ دەیخوازێت پێویستی بە تەکنیکی دیکـــە هەیە؛ بۆنموونە، بۆ بەڕێوەبردنی کەشـــتییەکە دەبـــێ بدوێت. ئەمەش بە تەکنیکی تەکنیکمان دەگەیەنێت-کە خۆی بەڕێوەدەبات و لەم حاڵەتەدا بۆ هەمیشە خاوەن تەکنیکەکە وندەکەین. لەلایەکی دیکەوە، بە گوتن وشە بهێنینەکایەوە ئێمە پەیوەندییە پێویســـتەکانی نێوان تەکنیکەکان لەنێو ڕستەدا ناشارینەوە. باشترە پێویســـتییەکە دامەزرێنین. بۆ دامەزراندنیشـــی یان بۆ ئاشـــکراکردنی پەیوەندی نێوان وشـــەکان لەگەڵ یەکدیدا، دەبێت لەنێو ئەو تێهەڵکێشـــەیەدا یەکبگرن، کە لەوانەوە پەیدا نابێت. بەشاردنەوەی تێهەڵکێشراوەکەی بە "گوتن" ناوزەددەکرێت، یەکگرتنەکە هەڵدەوەشـــێتەوە؛ هەریەکێک لە وشـــەکان بۆ شوێنی تەنیای خۆی دەگەڕێتەوە و واتاکانی وندەکات. کەوابوو، لەنێو پرۆژە سەربەســـتەکەی ڕستەوە یاســـاکانی گوتن دادەمەزرێن؛ بە گوتن ڕێزمان دروســـتدەکەم. سەربەستی تەنیا بناخەیەکی گونجاوی یاساکانی زمانە.

بێجگـــە لەمە، بۆ کێ یاســـاکانی زمان هەن؟ پۆڵهان وەڵامی ئەم پرســـیارەی داوەتەوەو دەڵێت: بۆ گوتەبێژەکە نین، بەڵکو بۆ بیســـەرن. گوتەبێژەکە واتاکان هەڵدەبژێرێت و وشـــەکان ڕیزدەکات. تەنیا پەیوەندییک لەنێوانیاندا ببینێت خۆی

دروستیکردون. له ئاکامدا، ئەگەر دوو یان زۆرتر وشه بدۆزینەوە، کە نەک پەیوەندی بەڵکو زۆرتر لەنێوانیاندا پێناسدەکرێت ئەمەش واتای زۆریان بە ڕیزکراوی یان دژی یەکدی پێدەبەخشـێت، ئەگەر "بەشی شەیتان"ی تێدا بێت، ئەوا ئەمە لەژێر دوو جۆر بارودۆخدا ڕوودەدات: (١) دەبێت وشه ڕیزکراو و ئامادەکراوەکان پێکهاتەیەکی واتاداریان هەبێت؛ (٢) تێهەڵکێشکردنەکە لەدەرەوەدا ببینرێت، بۆنموونە، کەسێکی دیکە ببینێت و شـفرەیەکی واتا بەخشـی پێکهاتەکەش بێت. لـەم حاڵەتەدا، هەریەکێک لە وشـەکان واتایەکی چوارگۆشـەیی پێدەبەخشـرێت و بە وشەیەکی دیکەوە دەبەسترێتەوە. پێکهاتەکەش چەند واتایەک پەیدادەکات. تێگەیشتن لە واتا ڕاستەکە (بۆنموونە، ئەوەی گوتەبێژەکە بە ویستی خۆی دەریدەبڕێت) واتای جیاوازتر بە دەستەوەدەدات، بەڵام نایانشارێتەوە. گوتن، کە پڕۆژەیەکی سەربەستانەی منە یاسـای جیاوازی بۆ کەسانی دیکە هەیە. یاساکانیش بۆ خۆیان لەنێو تیهەڵکێشە بنەڕەتییەکەدا کاردەکەن. دەتوانین جیاوازییەکی ئاشکرا لەنێوان ڕووداو "ڕستە" و ڕووداوی سروشتیدا دیاریبکەین. فاکتۆری سروشتی لەگەڵ یاسا بەرجەستەبووەکەدا تەبایە و یاسـایەکی دەرەکی بەرهەمهێنانە. ڕستە، وەکو ڕووداو یاسای سیستەمی خۆی هەڵدەگرێت و لەنێو پڕۆژە سەربەسـتەکەدا بۆ دانانی یاسا (بۆنموونە یاسای ڕێزمانی) پەیوەندی نێوان وشەکان دروستدەکات. لەڕاستیدا، لە ئاستی بیسەردا هیچ یاسـایەکی گوتن نییە. گوتە پڕۆژەیەکی سەربەستی واتادانانە، هەڵبژاردنی بوون-بۆ-خۆ دیاریدەکات و بۆ ڕاڤەکردن لەنێو هەڵوێستێکی جیهانگەرییدا ئامادەیدەکات. ئەوەی سەرەکییە هەڵوێستەکەیە، کە من تیایدا لە واتای ڕستەکە تێدەگەم؛ خودی واتاکەش شـتێکی دراو نییە، بەڵکو کۆتاییەکی هەڵبژێردراوە، کە سەربەسـتانە واتاکانی دیکە تێپەردەکات. ڕاستەقینەیەکە زمانناسەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە.

لەم ڕاستەقینەیەوە، شیکردنەوەیەکی بەرەودوا ڕۆشنایی دەخاتە سەر بونیادی سادەتر و گشگرتر، کە لە نەخشەدانانی یاسا دەچێت. بەڵام نەخشەدانانەکە، وەکو کارکردنی یاسـاکانی دیالێکت، لەنێو خۆیاندا ڕووتکراوەن. پێش حوکمدان بەسەر پێکهێنانی ڕسـتە و تێپەڕین بەسەریاندا لەنێو ڕستە و بە هۆی ئەوەوە هەیە. لەم ڕووەوە، ڕاسـتە سەربەستانە یاسا بۆ خۆی دادەنێت. ئێمەش، لێرەدا، خەسڵەتی بنەڕەتی هەموو هەڵوێستێک دەدۆزینەوە؛ لەگەڵ تێپەڕکردنی شتە دراوەکەدا (وەکو یاسـاکانی زمان) پڕۆژەی سەربەستی ڕسـتە دەبێت بە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو شتە دراوە (یاساکانی سیسـتەمی وشە و دیالیکتیکی دەنگەکانی). بەڵام پڕۆژەی سەربەستی ڕستە ئەو نەخشەدانانەیە، کە بیر لە شتە دراوەکە دەکاتەوە؛ بەتەنیا بیرکردنەوە نییە، بەڵکو دەیەوێت بگات بەو کۆتاییەی لەودیو شتە پەیدابووەکانەوە هێشتا پەیدا نەبووە و لەڕێگەی ئەوانەوە واتاکە دروستدەکات.

کەوابوو، ڕستە سیستەمی وشەکانە و وشەکانیش تەنیا لەو سیستەمەدا دەبن بە

وشـــه. ئەمەش بۆچوونی زمانەوان و دەروونناسەکانیشە و شەرمەزارییەکەشیان بۆ ئێمە دەبێت بە دژە بەڵگە؛ ئەوان لەو باوەڕەدابوون بۆ پێکهێنانی گوتن خولەیەکی بازنەییان دۆزیوەتەوە و گوایە بۆ گوتن دەبێت کەسەکە بیرۆکەکانی خۆی بناسێت. ئایا چۆن بیرۆکەکان، وەکو ڕاستەقینەیەک و ئاشکرا بە هۆی چەمکە نەگۆڕەکانەوە بـــە گوتن دەناســـرێت؟ کەوابوو، گوتـــن ئاماژە بۆ بیرۆکـــە و بیرۆکەش بۆ گوتن دەکات. لێـــرەدا تێدەگەین، کە خولەیەکـــی بازنەیی لە ئارادا نییە، کە زمانەوان و دەروونناســـەکان بیانەوێت لێی ڕابکەن؛ بەڵکو ئەوەی هەیە خەسڵەتی هەڵوێستە بەگشـــتی. ئەمەش بێجگە لە بەستنەوەی ئێســـتا بە ڕابردوو هەروەها داهاتووەوە چی دیکە نییە، کە سنورداركردنێکی سەربەستانەی شتە هەبووەکەیە بەو شتەوەی هێشـــتا پەیدانەبووە و ئەو شـــتەی پەیداش نەبووە بە شتە هەبووەکەوە. کاتێک بتوانن ئەم فاکتۆرە دابمەزرێنین ئەوا نەخشەکێشانە ڕووتکراوەکەش ئاشکرا دەبێت و دەبێت بە یاســـا و بنەمای ڕســـتە: نەخشەکێشانی دیالێکتی-زمانی نەتەوەیی و دواجاریش زمان بەگشتی. نەخشەکێشانەکان پێش ڕستە کۆنکرێتییەکان سەربەخۆ ڕاناوەستن. سەربەستییە ئەوان بەرجەستەدەکات.

بێگومـــان، دەبێـــت لەو خاڵەش تێبگەیـــن، کە گوتـــن نموونەیەکی تەکنیکی کۆمەڵایەتی و جیهانییە. ئەمەش بۆ هەموو تەکنیکەکانی دیکە دروســـتە. تەور و چەکوشلێدان ئەو ئامێرانە بەرجەســـتەدەکەن. دەگونجێت تەکنیکی خلیسکاندنی سەر بەفر بەگشـــتی بەڕێگەی میتۆدی فەرەنسییەوە بەرجەستە ببێت. بەڵام ئەم تەکنیکەی مرۆڤ بە تەنیا و ڕووتکراوی هیچ نییە؛ بوونێکی هێزەکی هەیە؛ بە هۆی یاریزانەکەوە بەرجەستەدەبێت و ئێمەش دەتوانین پەیوەندییەکەی بە پێشبڕکێکەوە دیاریبکەیـــن. بەبێ ڕەگەزی مرۆڤ و بوونی مرۆڤ، بەدڵنیاییەوە، ڕاســـتی نییە. ئەوەی دەمێنێتەوە هەڵبژاردنی ناماقوڵ و هەڵکەوتی تاکە کەسە، کە هیچ یاسایەکی بۆ دانانرێت. ئەگەر ڕاســـتییەک هەلبژاردنەکانی تاکە کەســـێک پێکەوە گرێبدات، ئەوا تەنیا ڕەگەزی مرۆڤ دەتوانێت ئەو ڕاســـتییە بۆ ئێمە ســـاخبکاتەوە. ئەگەر ڕەگەزیش ڕاســـتی تاکە کەس بێت، بەبێ ناکۆکی نابێت بە شتێکی دراو لە بوونی تاکەکەسەکەدا. بەو جۆرەی یاساکانی گوتن لەنێو پرۆژە سەربەست و کۆنکرێتییەکەی ڕستەدا بەرجەستەدەبن و دەمێننەوە ڕەگەزی مرۆڤیش (وەکو دەستەیەک تەکنیک بۆ پێناســـەکردنی چالاکی تاکەکان) پێش پەیدابوونی تاکەکەســـەکە، کە یاساکە بەرجەســـتەدەکات، دەستەیەک پەیوەندی ڕووتکراوەن لەنێو هەڵبژاردنی تاکەکەدا دەمێننـــەوە. بوون-بۆ-خۆ بـــۆ هەڵبژاردنی بوونی خۆی ئەو سیســـتەمە ناوەکییە دادەمەزرێنێت و ڕەتیشـــیدەداتەوە، ئەو سیســـتەمەش لەنێو خۆیدا نەتەوەیی یان مرۆڤانەیـــە. کەســـێک لەوانەیە بڵێت، زۆرباشـــە. بەڵام تۆ خۆت لە پرســـیارەکە دزیوەتەوە. بوون-بۆ-خۆ تەکنیک و سیستەمە زمانەوانییەکانی دروستنەکردووە؛ لە

کەســـانی دیکەوە وەریگرتوون. من ئەو یاسایەی بەکاریدەهێنم لە کەسانی دیکەوە وەریاندەگرم چونکە ئەوان هێناویانەتەکایەوە. لەم ڕووەوە گوتنەکەم دەکەوێتە ژێر دەستەلاتی گوتنی کەسانی دیکەوە و دواجاریش ژێردەستەڵاتی گوتنی نەتەوەیی.

پێویســـتە نکۆڵی لەم فاکتۆرە نەکرێت. بـــۆ ئەمەش گرفتەکەمان لەوەدا نییە، کە نیشـــانیبدەن بوون-بۆ-خۆ بنەمایەکی سەربەستی بوونی خۆیەتی؛ بوون-بۆ-خۆ سەربەستە، بەڵام لەنێو بارودۆخدایە. پەیوەندی نێوان بارودۆخ و سەربەستییەکەیە ئێمە دەمانەوێت بۆ تێگەیشـــتنمان لە هەڵوێســـت واتاکەی ڕوونبکەینەوە. ئەوەی دامانمەزراندووە، لەڕاســـتیدا، بەشـــێکی ڕاســـتەقینەکەیە. ئەو خاڵەمان باسکرد، کـــە ئـــەو واتایانەی بوون-بۆ-خۆ دروســـتیانناکات نابن بـــە ڕێگرێکی دەرەکی بۆ سەربەســـتییەکەی. بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ هەڵبژاردنی خۆیدا، وەکو کەس خەسڵەتە کۆمەڵایەتییـــەکان لەنێو بوونی خۆیدا دەپارێزێت. ئەو خەســـڵەتانەش کەســـەکە دەکەن بە پیاو یان ژن؛ هەروەها پەیوەندییە پێویستەکانی نێو بوون بە پیاو لەسەر بناخەی هەڵبژاردنی سەربەستدا سەرهەڵدەدەن؛ هەریەکێک لە بوون-بۆ-خۆکان لە بوونی خۆیدا بەرانبەر ڕەگەزی مرۆڤایەتی بەرپرســـە. بۆ ئێمەش گرنگە نکۆڵی لەو فاکتـــۆرە نەکەین، کە بوون-بۆ-خۆ دەتوانێت لەودیـــو دیارکراوەکانەوە، کە بوونی ئـــەو نابن بە بنەڕەتیان خـــۆی هەڵبژێرێت. هەریەکێک لە بوون-بۆ- خۆکان لەگەڵ هەڵبژاردنـــی خۆی لەودیو ڕەگەز و نەتـــەوەوە دەبێت بە بوون-بۆ-خۆ. ئەمەش لە هەڵبژاردنی گوتن لەودیو مۆرفیم و وشە سازییەوە دەچێت. "لەودیو" سەربەخۆیی بوون-بۆ-خۆ لەو بونیادەوە مسۆگەردەکات، کە دەیەوێت تێپەڕیبکات؛ ڕاستییەکەش لەوەدایە، بوون-بۆ-خۆ "لەودیـــو" ئەو بونیادەوە خۆی پێکدەهێنێت. ئایا ئەمە چ واتایەک دەبەخشێت؟ واتە بوون-بۆ-خۆ لەنێو ئەو جیهانەدا سەرهەڵدەدات، کە بۆ بوون-بۆ-خۆکانـــی دیکەش جیهانە و شـــتێکی دراوە. وەکو بینیمان، لەم ڕووەوە، واتـــای جیهان بۆ بوون-بۆ-خـــۆ نامۆیە. هەریەکێک لە تاکـــەکان خۆی لەبەردەم دەســـتەیەک واتادا دەبینێت، کە خۆی دروستی نەکردون. لەنێو جیهانێکدا دەژی، کە دراوە و لەو درزە دەچێت لەپێشـــتر کەسێکی دیکە بینیبێتی، دۆزیبێتییەوە و واتای بۆ دانابێت. ئێمە، لێرەدا، مامەڵە لەگەڵ ســـنوردارێتی سەربەستیدا ناکەین: بەڵکو دەبێت لەنێو ئەم جیهانەدا بوون-بۆ-خۆ سەربەستییەکەی بدۆزێتەوە؛ لەنێو ئەم بارودۆخانـــەدا خۆی هەڵبژێرێت. لەلایەکی دیکـــەوە، بوون-بۆ-خۆ؛ بۆنموونە پیاوێک لەگەڵ پەیدابوونیدا بەدەســـت کەســـانی دیکەوە ئازار ناخوات؛ ئەو زۆری لێدەکرێت بوونی کەســـانی دیکە هەڵبژێرێت. ئەو لە هەڵبژاردندا کەســـانی دیکە، وەکو خۆ و بابەت دەناســـێت. بەو ڕادەیەی کەســـی دیکە بۆ ئەو تەماشـــاکردنە پرسیار لەبارەی تەکنیک یان واتا بێگانەکانەوە ناکرێت؛ بوون-بۆ-خۆ خۆی، وەکو بابەت لەنێو جیهانی تەماشـــاکردنی کەســـەکەدا دەبینێت. کاتێکیش بوون-بۆ-خۆ

لەگەڵ ڕەتکردنی کەســەکە بەرەو کۆتاییەکانی خۆی ئەو دەکات بە بەرزێتییەکیِ بەرزکراو، واتا بە ڕەتکردنە سەربەستەکەی دەبەخشێت. کە کەسەکە، وەکو بابەت دەبێت بە ئاماژەکردن بۆ کۆتاییەکان. بوونِ-بۆ-خۆش سەربەستانە خۆی فرێدەداتە نێو ئەو جیهانەوە، کە هەڵســوکەوتەکان، وەکو بابــەت کۆتاییەکان دیاریدەکەن. کەوابوو، ئامادەبوونی کەسی دیکە، وەکو بەرزێتیِ-بەرزی ئاڵۆزی ئامێرەکان ڕووەو کۆتاییەکان دەردەخات. مادام ئامێر بڕیار لەسەر کۆتایی و کۆتاییش لەسەر ئامێر لەگەڵ سەرهەڵدانیدا دەدات، لەئاستی کەسەکەی دیکەدا، وەکو بابەت بوونِ-بۆ-خۆ دەبێــت بە هۆکاری پەیداکردنی کۆتاییەکان لەنێــو جیهاندا؛ ئەو لەنێو جیهانێکدا پەیدادەبێــت، کە خەڵکی دەبن بــە کۆتاییەکان. ئەگەر تەکنیــک و کۆتاییەکان بە تەماشــاکردنی بوونِ-بۆ-خۆ ســەرهەڵدەن، پێویســتە ئەوە بناسینەوە، کە بە بۆچوونێکی سەربەستانە بۆ حاڵەتی بوونِ-بۆ-خۆ لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی بەرانبەر کەسانی دیکە دەبن بە تەکنیک. کەسێکی دیکە بە تەنیا پڕۆژەکان لەبەردەم بوونِ-بۆ-خــۆدا بە تەکنیک ناکات. لەبەر ئەمە، بۆ کەســێکی دیکە، بەو ڕادەیەی خۆی ڕەتــدەکات و ڕووەو ئەگەرەکانی دەڕوات، ئەوەی دەیــکات تەکنیک نییە، بەڵکو کردنە و کۆتاییەکەش پێناســیدەکات. ئەو پینەچییــەی بنێکی نوێ بۆ پێڵاوێک دادەنێت خــۆی وا نابینێت، کە "لەنێو پرۆســەی بەکارهێنانی تەکنیکدایە"؛ ئەو تەنیا کارەکە دەکات و دەست دەداتە پارچە چەرمەکە، چەکوشەکە و هتد. کاتێک بوونِ-بۆ-خــۆ حاڵەتەکەی خۆی لەبەردەم کەســێکی دیکە دەبینێت تەکنیکەکان، وەکو ڕەفتاری کەسێکی دیکە یان بەرزێتییەکیِ-بەرزکراو دەهێنێتە نێو جیهانەوە. تەنیا لەو ساتەدا بورژوا، کرێکار، فەرەنسی و ئەڵمانی یان بەکورتییەکەی، مرۆڤ لەنێو جیهاندا دەردەکەوێت.

کەوابــوو، بوونِ-بۆ-خۆیە ڕەفتاری کەســانی دیکە لەنێــو جیهاندا بۆ تەکنیک دەگۆڕێت. بوونِ-بۆ-خۆ ناتوانێت ئەو جیهانە بێنێتە کایەوە، کە ئەم یان ئەو تەکنیکە تیایدا ســەرهەڵدەدات (ئەو ناتوانێت لەنێو جیهانی ســەرمایەداری، سیستەمێکی ئابووری و سروشــتی یان شارستانییەتێکی مشــەخۆردا، خۆی پەیداکات)، بەڵکو دەبێت بە هۆکاری ئەوەی کەســێکی دیکە پێی دەژی و لــەدەرەوەدا پڕۆژەیەکی سەربەستە و دەبێت بە تەکنیک؛ بوونِ-بۆ-خۆش ئەمکارە لەوێدا بە ئاگام دەگەیەنێت، کە خۆی لەدەرەوەی کەســێکی دیکــەدا دابنێت. کەوابوو، لەگــەڵ هەڵبژاردن و بــە مێژووکردنی خۆیــدا بوونِ-بۆ-خۆ جیهان دەخاتە نێو مێــژووەوە و تەکنیکی ڕۆژژمێری بۆ دادەنێت. تەکنیکەکانیش، وەکو بابەت دەردەکەون و بوونِ-بۆ-خۆش تەکنیکــە بەجێکان هەڵدەبژێرێت (بۆنموونە، لەنێو ئەو جیهانەدا دەردەکەوێت، کە پیرۆ و پۆڵ پێکەوە دەدوێن یان کاتێک ســواری پاســکیلەکە بووە، ئوتومبیلەکە دەهــاژوێ لەلای ڕاســتەوە دەڕوا و هتد.) لەگەڵ بەبابەتکردنــی ئەم کردەوانە و

واتا پێبەخشـــینیان، بوون‌ـ بۆ ـ خۆ بەرانبەر فاکتۆری بوونی ئەو جیهانەی دەبێ لە ڕاستەوە ئۆتومبیل بهاژوێ یان بە فەرەنسی بدوێی، بەرپرسی دەبێت. ئەو یاسای ناوەوەی کردەوەکانی کەسانی دیکە دادەمەزرێنێت، کە لە ئاکامی مامەڵەکردنێکی سەربەستانە لەگەڵ پڕۆژەکاندا پەیدادەبن و دەبن بە یاسای دەرەکی، وەکو بابەت. هەروەها، یاساکان بەسەر هەموو ئەو کردەوانەدا دەسەپێنرێن، کە لەیەکدی دەچن و هەموو کەســـێکیش پەیڕەویان دەکات. ئەم بەمێژووکردنە، کە لەژێر کاریگەرێتی هەڵبژاردنی سەربەســـتی بوون‌ـ بۆ ـ خۆ پەیدابووە، سەربەســـتی سنوردار ناکات؛ بەڵکو بەپێچەوانـــەوە، لەنێو ئەم جیهانەدا، نەک جیهانێکی دیکەدا سەربەســـتی دەکەوێتەگەر؛ بوون‌ـ بۆ ـ خۆ لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ ئەم جیهانەدا خۆی دەخاتە نێو پرسیارکردنەوە. سەربەستی ئەوە نییە جیهانێکی مێژوویی هەڵبژێریت و تیایدا بژیت، بەڵکو هەڵبژاردنی بوونی خۆتە لەنێو جیهاندا ئینجا گرنگ نییە ئەو جیهانە چۆن بێت.

لـــەم ڕووەوە، بێهودەیـــە تەکنیکەکان بە ڕێگر لە ئاســـتی ئەگەرەکانی مرۆڤدا دابنرێن. بێگومان دێنس ســـکۆتس ئاگای لە بوونـــی ئۆتۆمۆبیل و فرۆکە نەبوو؛ بـــەڵام ئەو لە بۆچوونی ئێمـــەوە بە نەزان دەبینرێت چونکـــە ئێمە ئەو دەخەینە نێـــو جیهانێکەوە، کە ئوتومۆبیل و فرۆکەی تێدایە. بۆ ئەو، وەکو کەســـێک هیچ پەیوەندییەکی بەم بابەت و تەکنیکانەوە نییە، ئێمە ئاماژەیان بۆ دەکەین. جۆرێک لە نەبوونی ڕەها و نەناســـراو هەیە. ئەو نەبوونە بوون‌ـ بۆ ـ خۆیەک سنوردارناکات، کـــە بوونی خۆی هەڵدەبژێرێت؛ چۆن بیری لێبکەینەوە نابێت بە کەمی. بوون‌ـ بۆ ـ خۆیەک لە سەردەمی دێنس سکۆتس خۆی بکات بە بوونێکی مێژوویی لەنێو پڕی بوونـــدا خۆی لە ناودەبات. ناکرێت بڵێین، ئەلبیگانییەکان گولەتۆپیان نەبوو تاکو بەرگری لە سیمۆن دی مۆنت فۆرت بکەن چونکە ساگنیۆر دی ترەنکەڤاڵ و کۆمت دی تۆلۆس لە جیهانێکدا بوونی خۆیان هەڵبژارد، کە گولە تۆپی تێدا نەبوو: لەنێو ئەو جیهانەدا بیریان لە ڕامیاری دەکردەوە و نەخشەیان بۆ جەنگ دادەنا. پشتیوانی کاتارییان کرد و بوون بەوەی خۆیان هەڵیانبژارد. بەتەواوی وەکو پەنزەر ـ دیڤنسیۆن یان (ئار.ئەی.ئێف) لەنێو جیهانی خۆیاندا بوون.

ئەوەی بۆ تەکنیکە ماتەریەکان دادەنرێت بۆ تەکنیکەکانی دیکەش دروســـتە. ژیانی میرێکی بچوک لە لانۆدۆک لە سەردەمی ڕایمۆندی شەشەم ئەگەر بخرێتە نێو جیهانـــی دەرەبەگایەتی ئەو کاتەی میرەکە هەبووە و خۆی ئەو ژیانەی هەڵبژاردوە حوکمی بەســـەردا نادرێت. جیهانی دەرەبەگایەتی ســـەردەمی ڕایمۆندی شەشەم ئەگەرەکانی هەڵبژاردن بێســـنور دەکات؛ ئێمـــە لەوە زۆرتر نابین بە خاوەنی. ئەو پرسیارەی، وەکو خەونێکی یۆتۆپیا، هەندێک جار دەکرێت لەواتا بەدەرە: دێکارت چۆن بیریدەکردەوە ئەگەر فیزیای نوێی بزانیایە؟ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت دێکارت

خۆرســـکێکی لەپێشـــتری هەبێت و زانســـتیش لە ســـەردەمەکەیدا ئەو خۆرسکە ســـنوردار بکات. ئێمەش بتوانین بۆ سەردەمەکەمانی بگوێزینەوە و بەرانبەر زانین زیاتـــر هەڵبچێت. ئێمە لە بیری دەکەین، کە دێـــکارت ئەوەیە خۆی هەڵیبژاردوە. هەڵبژاردنێکـــی ڕەهای بوونی خۆیەتی لەنێو ئـــەو جیهانەدا، کە زانین و تەکنیکی جۆراوجۆری تێدایە و هەڵبژاردنەکەی وەدەســـتیان دەهێنێت و لەناونیشـــاندەبات. دێکارت ســـەرهەڵدانێکی ڕەهایە لەنێو کاتێکی مێژوویی ڕەهادا و لە ســـەردەمێکی دیکەدا بیری لێناکرێتەوە. ئەو بە دروســـتکردنی خۆی مێژووشـــی دروستکردوە. ئـــەو، نەک کەســـێکی دیکە، بڕیاری لەســـەر زانینی ماتماتیکی بـــە دامەزراندنی پرنسیپاڵەکانی ئەندازیاری شیکاری، پێش خۆی داوە. ئەمەش لێرەدا، دۆزینەوەیەکی سەربەستانەیە و ئەو داهاتووەش دیاریدەکات، کە ڕۆشنایی دەخاتەسەر ڕانەبردوو؛ دەستنیشانکردنی تەکنیکی تەواوە لەبەر ڕۆشنایی داهاتوودا، کە یارمەتیمان دەدات حاڵەتی بوونی تەکنیک هەڵسەنگێنین.

کاتێـــک بوون-بۆ-خۆ بەرانبەر کەســـێکی دیکە خۆی وەکـــو بابەت دادەنێت، بەهەمانشـــێوە تەکنیکەکانیش بەرجەستەدەکات. کەوابوو، دەتوانێت خاوەنێتییان بکات یان بیانکات بە ناوەکی. بەڵام، کتوپڕ ئەم ئاکامانە قوتدەبنەوە: (١) لەگەڵ بەکارهێنانـــی تەکنیکێدا، بوون-بۆ-خۆ تەکنیکەکە ڕەتدەکات و ڕووەو کۆتاییەکەی دەڕوات؛ ئەو بەردەوام لەودیو تەکنیکە بەکارهێنراوەکەیەتی. (٢) ئەو تەکنیکەی لـــە بوونی کەســـانی دیکەدا-وەکو-بابەت ڕەفتارێکی ڕووت و واتادار بوو ئێســـتا، لەبـــەر ئەوەی بـــووە بە ناوەکی خەســـڵەتی بوون بە تەکنیک ونـــدەکات. لەنێو هەڵوێستی ڕەتدانەوەکە ڕووەو کۆتایی دەتوێتەوە؛ تەنیا سەربەستی دەیدۆزێتەوە و هەڵیدەگرێت بەوجۆرەی دیالێکت یان گوتن لەنێو پرۆژەی سەربەستی ڕستەداناندا هەڵدەگیرێت. دەرەبەگایەتی، وەکو تەکنیکی پەیوەندی نێوان تاکە کەسەکان نییە؛ شتێکی ڕووتکراوەیە و هەزار تاکە کەس لە هەڵوێستی یەک مرۆڤدا، کە پەیوەندی بـــە دەرەبەگێکـــەوە هەیە، دەیهێڵنەوە و ڕەتیشـــیدەکەن. مەبەســـتمان لەمەش گەیشـــتن بە نۆمینەڵیزمێکی مێژوویی نییە. ئێمە ناڵێین دەرەبەگایەتی سەرجەمی پەیوەندییەکانـــی نێـــوان جوتیار و خـــاوەن زەوییە. بەپێچەوانـــەوە، بونیادێکی ڕووتکـــراوەی ئەم پەیوەندییانەیە؛ هەموو پرۆژەیەکی تاکـــەکان لەمکاتەدا ڕوو لە ساتێکی کۆنکرێتی ئەم ڕووتکراوە دەکات. لەبەر ئەمە پێویست ناکات بە ژماردنی ئەزمونەکان واتای گشتی تەکنیکی دەرەبەگایەتی دیارییکەین. ئەم تەکنیکە لەنێو ڕەفتاری تاکە کەســـەکاندا پێویســـتە هەبێت و لە هەموو حاڵەتێکیشدا دەتوانین ڕۆشنایی بخەینەسەر. بەڵام، تەنیا لەوێدا دەبێ تێپەربکرێت. بەهەمانشێوە، بوون-بۆ-خـــۆ نابێت بە کەس، بۆنموونە ئەو کۆتاییـــە هەڵبژێرێت، کە بوونی خۆیەتی، ئەگەر ئەو ژن، پیاو ئەندامی کۆمەڵەیەک چینێک یان خێزانێک نەبێت. بەڵام ئەمانە

بونیـــادی ڕووتکـــراوەن و بوونێ-بۆ-خۆ بە پرۆژەکانی دەیانهێڵێتەوە و ڕەتیشـــیان دەکات. ئەو خۆی دەکات بە فەرەنســـی، کەســـێکی ســـەر بە دەڤەری باشـــور و کرێکارێـــک تاکو خۆی لە ئاســـۆی ئەم دیاریکردنانەدا بدۆزێتـــەوە. ئەو جیهانەی خۆی بـــۆ بوونێ-بۆ-خۆ دەردەخات لەنێو بەســـتێنی بەکارهێنانی تەکنیکەکەدایە. وەکو جیهانێ-بۆ-فەرەنســـییەک، جیهانێ-بۆ-کرێکار و هتد، بە هەموو خەسڵەتاکانی دیکەیەوە دێتە پێش. بەڵام خەسڵەتەکان سەربەخۆ نین. ئەو جیهانەی دەبێت بە جیهان بۆ کەسێکی فەرەنسی یان کرێکار لەپێشدا ئەو جیهانە بووە، کە بوونێ-بۆ-خۆ بە کۆتاییەکانی ڕۆشنایی خستۆتە سەر و جیهانی خۆی بووە.

لەگەڵ ئەمەشدا، بوونی کەسێکی دیکە سنورێکی فاکتۆری بۆ سەربەستییەکەم دادەنێت. جۆرە دیاریکردنێک بە سەرهەڵدانی ئەو دێتەکایەوە، کە من هەڵیاننابژێرم. من دەبم بە جولەکە یان ئاری، جوان یان ناشرین، کەسێک قۆڵێکی هەبێت و هتد. ئەمانە منن لەبەردەم کەســـەکەدا بەبێ هیوا بۆ تێگەیشـــتن لەو واتا دەرەکییەی بـــۆ من دانراوە و لەمەش گرنگتر هیوای گۆڕانیانم نییە. گوتن بە تەنیا بوونی من دەگەیەنێت؛ ئەمەش لەوێدا دروســـتدەبێت، ئەگەر ببێت بە بابەتی مەبەستێکی بێ ناوەڕۆک؛ هەموو مەبەســـتێک بۆ هەمیشـــە دەبێت بە نکۆڵیکردن لە بوونم. ئەگەر لای کەســـەکە ڕەگەز یان لەشـــولارم تەنیا وێنەیەکی من بێت یان بوونم لەســـەر بۆچوونی کەسەکە بەرانبەر من ڕاوەستابێت ئەوا زوو کاری لەگەڵدا دەکەین؛ بەڵام بینیمـــان، ئێمە مامەڵە لەگەڵ خەســـڵەتی دەرەکیـــدا دەکەین، کە بوونی من بۆ کەســـانی دیکە پێناسدەکات. کاتێک سەربەســـتییەک بێجگە لە سەربەستییەکەی خۆم ســـەرهەڵدەدات و ڕووبەڕووم دەبێتەوە من دەکەومـــە نێو ڕەهەندێکی نوێی بوونەوە. ئەمجارە پرســـیارکردن ســـەبارەت ســـەپاندنی واتاکان بەسەر هەبووە ڕووتەکاندا یان ســـەبارەت بە لێپرسینەوەم لە ئاستی ئەو واتایانەدا نییە کەسانی دیکە دایانناون. من بونی خۆم بەو شێوەیە دەبینم، کە واتای بەسەردا سەپێنراوە و هیچ تەواناییەکیشـــم نییە خۆم بە لێپرســـراو لە ئاســـتیدا دابنێم. لەم ڕەهەندە نوێیەی بوونمدا لایەنێکم، وەکو شتێکی دراو سەرهەڵدەدات؛ بە لای کەمەوە بۆ من وا دەردەکەوێـــت چونکە من تاڵی ئەو بوونە دەچێژم، کە لەپێشـــتر نەبوو. من لە پەیوەندییەکانمدا لەگەڵ کەسانی دیکە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مندا ئەو ڕەهەندەی بوونم دەناسم. لەنێو هەزاران شـــتی قەدەغەکراو یان بەرهەڵستیدا کاتێک بەریان دەکەوم و دژیان ڕادەوەســـتم ڕووبەڕوویان دەبمەوە. بۆنموونە، دەڵێن تۆ منداڵیت نابێ ئەم یان ئەو شتەت هەبێت. لەبەر ئەوەی جولەکەم لەنێو زۆر کۆمەڵدا جێگەم نابێتەوە و هتد. من لە ناوەوەی خودی خۆمدا ناتوانم هەست بە بوونی خۆم، وەکو جولەکە، منداڵ یان ئاری بکەم. لێرەدا، دژایەتی من بەرانبەریان دروســـتدەبێت و دەڵێم، کە ڕەگەز، ئەندێشەییە و تەنیا تاکەکان ڕاستەقینەن و هەن. کتوپڕ، توشی

نامۆییەکی تەواو لە بوونمدا، وەکو تاکە کەس دەبم: من دەبم بەو شتەی خۆم هەڵم نەبژاردوە. ئایا ئاکامی ئەم هەڵوێستە چییە؟

پێویســـتە تێبگەین، کە سەربەستییەکەمان توشـــی سنوردارییەکی ڕاستەقینە بووە، ئەویش ئەو شـــێوازی بوونە بەسەرا ســـەپێنراوەیە، کە سەربەستییەکەمان نەبووە بە بناخەی. گرنگە بزانین، ســـنوردارییەکە لە کردەوەی کەســـانی دیکەوە دەرناچێت. لە بەشـــی پێشـــوی [ئەم نوســـراوەدا] بینیمان، چۆن ئەشکەنجەدان ناتوانێت سەربەستییەکەمان زەوتبکات؛ تەنانەت سەربەستانە خۆمان بەدەستەوە دەدەین. بەگشـــتی، ڕووبەڕوو بوونەوەی قەدەغەکردنێک لەسەر ڕێگاکەم ("جولەکە بۆی نییە بێتە ئێرە" یان" ئەمە چێشـــتخانەی جولەکەکانە و بۆ ئارییەکان نییە"و هتـــد) ئاماژە بۆ حاڵەتەکە دەکەن باســـمانکرد (بۆنموونە تەکنیک بەکۆمەڵەکان). واتای قەدەغەکردنەکە لەســـەر هەڵبژاردنی سەربەســـتدا ڕادەوەستێت. بەگوێرەی لێپرســـینەوەی سەربەســـتانەی هەڵبژاردنەکەم، دەتوانم قەدەغە شکێن بم، گوێی نەدەمێ یان بەپێچەوانەوە گوێڕایەڵ بم و بەهای بۆدابنێم. بێگومان قەدەغەکردنەکە هەڵوێستی خۆی، وەکو شتێک لە ویستێکی بێگانەوە دەرچوو، ونناکات؛ هەڵبەتە لە بونیادە دیاریکراوەکەشدا من بەبابەت دادەنێت. لەبەر ئەمە بەرزێتییەک لەژوور بەرزێتی منەوە دەردەخات. هێشـــتا ئەو ڕاستییەش دەمێنێتەوە، کە لەنێو جیهانی مندا بەرجەستە نەبووە. لە هەڵبژاردنەکەمدا دەستەڵاتی سەرکوتکەرانەی وندەکات. لەگـــەڵ ئەگەرەکانمـــدا، کە ئایا من ژیانم لە مردن لا شـــیرینترە یان نا لە هەندێ حاڵەتدا دەگەمە ئەو باوەڕەی مردن لە ژیان باشتربێت و هتد. سنوری ڕاستەقینەی سەربەســـتییەکەم لەوێدایە، کە کەسەکە من، وەکو بابەت دەناسێت. هەڵوێستیشم بۆ ئەو خەســـڵەتی خۆی وندەکات و دەبێت بە شـــێوازێکی دەرەکی و بوونی منی لەســـەر دادەمەزرێت. ئەم پرۆســـەی نامۆبوونی هەڵوێســـتە دەبێت بە سنورێکی دیاریکراو و بەردەوامی هەڵوێســـتەکەم و لەوەش دەچێت بوونی-بۆ-خۆی من لەنێو بوون-بۆ-کەســـانی دیکەدا دابنرێت. ئەم دوو ســـنوردارکردنەیە دەبن بە دیوار بە دەوری سەربەستییەکەمدا.

بەکورتییەکەی، فاکتۆری بوونی کەســـانی دیکە من دەخاتە نێو هەڵوێستەوە، کە دەرەوەی هەیە و منیش تیایدا نامۆدەبم. بێجگە لە کارکردن لەســـەری ناتوانم لەناوییەرم. ئەم سنوردارێتییەی سەربەستییەکەم، وەکو باسمانکرد، بوونی کەسانی دیکە دەیسەپێنێت؛ واتە بەرزێتی من بەرانبەر بەرزێتی ئەوان ڕادەوەستێت. لێرەدا ڕاســـتییەکی گرنگ دەناسین: ئێمە لەپێشـــتر بینیمان، کە خۆمان لەنێو ڕووگەی بوون-بۆ-خۆ دادەنێین و خودی سەربەســـتییەکەمە سەربەســـتیم سنورداردەکات؛ ئێستا دەبینین، کاتێک بیر لە بوونی کەسانی دیکە دەکەمەوە، سەربەستییەکەم لەم ئاســـتە نوێیەدا لەلایەن سەربەستی کەسانی کەسانی دیکەشەوە سنورداردەکرێت.

کەوابوو، لە هەموو ئاستێکدا ئەوەی سەربەستی سنورداردەکات سەربەستییە. ئەمەش گوتەکەی (سپینۆزا)مان بیردەخاتەوە، کە دەڵێت، بیرۆکە دەتوانێت بیرۆکە سنورداربکات. سنورداریێتی سەربەستی، وەکو بڕانەوەیەکی ناوەکی، لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە سەربەستی ناتوانێت سەربەست نەبێت و حوکمی بەسەردا دەدرێت سەربەست بێت؛ سنورداریێتییە دەرەکییەکەش لەوەدایە، کە سەربەستی بۆ سەربەستی کەسانی دیکەیە. سەربەستی کەسانی دیکەش ئەو لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکانی خۆیدا دەناسێت. پاش دامەزراندنی ئەمە، پێویستە سەرنجی ئەو خاڵەش بدەین، کە نامۆبوونی هەڵوێستەکە نوێنەرایەتی گۆڕانکارییەکانی ناوەوە و پێشکەشکردنی شتە دراوەکە، وەکو بەرەنگاریکردنێکی ڕووت لەنێو هەڵوێستەکەی من تیایدا دەژیم، ناکات. بەتەواوی بەپێچەوانەوەیە، نامۆبوونەکە گۆڕانکاری ناوەکی و گۆڕانی لایەنێکی هەڵوێستەکە ناگرێتەوە؛ لەنێو ڕەوتی کاتیشدا ڕوونادات؛ من هەرگیز لەنێو هەڵوێستەکەدا ڕووبەڕووی نابمەوە و خۆی بۆ درککردنەکەم ئامادەناکات. بەڵکو لە من ڕادەکات؛ ئەو دەبێت بە ڕواڵەتی دەرەکی هەڵوێستەکە، کە بوونێتی بۆ کەسانی دیکە لە دەرەوەدا. کەوابوو دەبێت مامەڵە لەگەڵ خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی هەموو هەڵوێستێک بەگشتی بکەین؛ ئەمەش کارناکاتە سەر ناوەڕۆکی. ئەو بوونەی لەنێو هەڵوێستەکەدایە دەیدۆزێتەوە و وەریدەگرێت. لەم ڕووەوە، هەڵبژاردنە سەربەستەکەمان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەڵوێست، شێوازی دەربڕینی هەڵبژاردنەکە و خەسڵەتی بنەڕەتی هەڵوێستەکەش، کە نامۆبوونە؛ واتە کەسەکە لەنێو هەڵوێستەکەدا دەبێت بە شێوازێکی لەنێو-خۆ بۆ کەسانی دیکە. ئێمە ناتوانین خۆمان لەم نامۆبوونە ڕزگاربکەین چونکە بیرکردنەوە لە بوون لەنێو شێوازێکی لە هەڵوێست بەدەر بێهودەیە. ئەم خەسڵەتە لە ئاکامی بەرەنگاریکردنێکی ناوەکییەوە پەیدانەبووە؛ لەبەر ئەمە ڕێگرێکی سەرانسەری نییە و سوڕانەوەی هێزە لەنێو سروشتی سەربەستیدا و لاوازیشە لە بنەڕەتەکەیدا، کە ئەو ڕووە نیشاندەدات سەربەستی ناخوازێت هەڵبژێرێت. بۆ کەسانی دیکەش دەبێت بە بوونێکی ڕووت. هەروەها، ئەم خەسڵەتە سەر بە سروشتی سەربەستی نییە چونکە سروشت شتێک نییە هەبێت؛ لەسەرو ئەمەشەوە، ئەگەر سروشتێک هەبێت ئەوا ئەم خەسڵەتەی لێوە دەرناچێت چونکە بوونی کەسانی دیکە بەتەواوی فاکتۆرێکی هەڵکەوتوە. هاتنە نێو جیهانەوە بە سەربەستییەوە ڕووبەڕوو بوونەوەی کەسانی دیکە دەکات بە نامۆکردن. ئەگەر کەسێک سەربەستی خۆی هەڵبژێرێت دەبێت لەنێو جیهاندا بێت و ڕووبەڕووی کەسانی دیکەش بێتەوە. لەم گۆشەنیگایەوە، ئەو کەسەی بەمجۆرە بوونی خۆی دامەزرێنێت بە سۆزەوە ڕوو لە سەربەستییەکەی دەکات.

لەلایەکی دیکەوە، من لەدەرەوەمدا هەڵوێستە نامۆکراوەکەم و بوونی نامۆکراوی خۆم دانامەزرێنم. لە یەکەم شوێندا، بێگومان، بینیمان، لەسەر بنەمایەکی

بیردۆزەیی هەرشتێک نامۆکرابێت بونیشـــی بۆ کەسانی دیکەیە. من ناتوانم بەبێ ناســـینی کەسانی دیکە و بەرزێتییەکەیان ئەم نامۆییە بسەلمێنم. ئەم بڕوایەش لە بێ بڕواکردنێکی سەربەســـتانە بە سەربەستی کەسانی دیکە واتا نابەخشێت. بەم بڕواکردنە سەربەستانەیەش، کە بۆ سەلماندنی نامۆبوونەکەم دایدەمەزرێنم بوونم-بۆ-کەســـانی دیکە، بـــە هەرجۆرێک بێت، دادەنێم چونکـــە پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئەوانـــدا دیاریدەکات. کەوابوو، بوونی کەســـێکی دیکە، وەکو سەربەســـتی لەنێو پڕۆژەی سەربەستی ناسینەوەمدا بۆ ئەو دەناسم (دەگونجێت سەربەستانە بوونی کەسەکە، وەکو بابەت بناسم)؛ پڕۆژەی سەربەستی ناسینەوەی کەسێکی دیکە لە بیرۆکەی سەربەستانەم بۆ بوونم، وەکو بوونێک-بۆ-کەسانی دیکە جیانابێتەوە.

ئێستا دەبینین چۆن سەربەستییەکەم ســـنورەکانی خۆی دەدۆزێتەوە چونکە بوونی خۆم لەئاســـتی کەســـانی دیکەدا بە سنورکراوی دەبینم. ئەوان بە خۆیەتی و بوونی خۆشـــم بۆ ئەوان دادەنێم. ئەمەش ســـوڕانەوەیەکی بازنەیی نییە. لەگەڵ دانانێکی سەربەستانەی ئەم بوونە-نامۆکراوەی نێو ئەزمونەکەم هەست بە بەرزێتی کەســـانی دیکە بەرانبەر بوونم دەکەم. تەنیا لەگەڵ ناسینەوەی من بۆ سەربەستی دژایەتیکـــردن لەگەڵ جولەکەدا (گرنگ نییە چـــۆن بەکاریدەهێنن) و دانانی بوون، وەکو جولەکە، من بۆ ئەوان دەبم بە جولەکە؛ لێرەدا بوون-بە-جو، وەکو سنورێکی دەرەکی هەڵوێستەکە دێتەکایەوە. ئەگەر، بەپێچەوانەشەوە، حەزبکەم دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکەدا بەبابەتێکی ڕووت دابنێم، ئەوا بوونم-وەکو-جو وندەبێت و کتوپڕ جێگە بۆ ئاگامەندییەکی سەربەســـتی سادە دەکەمەوە، کە دەبێت بە بەرزێتییەکی ناجۆر. ناسینەوەی کەسانی دیکە، لەوحاڵەتەدا من جولەکە بم و دانانی بوون-بە-جو دەبن بە یەک شت. کەسانی دیکە هەڵوێستم سنوردار دەکەن، بەڵام ئەو کاتەی بوونم-بۆ-کەســـانی دیکە دادەنێم و بەگوێرەی کۆتاییـــە هەڵبژێردراوەکان واتایان پێدەبەخشم، هەست بە سنورەکان دەکەم. هەڵبەتە، ئەم دانانەش نامۆییە؛ لایەنی دەرەوەی هەیە، بەڵام لەم دانانەوە من هەســـت بە بوونم-لەدرەوەدا، وەکو دەرەوە دەکەم. کەوابوو چۆن هەســـت بە سنورە درەکییەکانی بوونم، وەکو بوون بە جو، ئاری، ناشـــرین، جوان، فەرمانبەر یان هەژار و هتد، دەکەم؟ چ کاتێک گوتن ئەم ســـنورانە بە من ڕادەگەیەنێت؟ ئەمە لە ڕێگەی هەســـتکردنی ڕاستەوخۆی من بە جوانی، ناشـــرینی و ڕەگەزی کەســـەکەی دیکە یان لەگەڵ ئاگاییەکی لە تێڕامان بەدەری بە پڕۆژەکردنی بوونمدا ڕووەو ئەگەرەکانم ڕوونادات. پێویســـتیش ناکات هەموو ئەم خەســـڵەتە دەرەکییانە بە ڕووتکراوە دابنێین: هەندێکیان ڕووتکراوە و ئەوانی دی ڕووتکراوە نین. جوانی و ناشرینیم یان ناگرنگی ڕوخسارم بۆ کەسەکەی دیکە شـــتێکی کۆنکرێتییە. ئەم شـــتە کۆنکرێتییەیە لە گوتنی ئەودا ئاماژەی بۆ دەکرێـــت؛ بەرانبەر ئەم شـــتەیە من بە بەتاڵییەوە خۆمی ئاڕاســـتەدەکەم. لێرەدا

مامەڵە لەگەڵ شتێکی ڕووتکراوەدا ناکەین. ئەو شتە خاوەنی بونیادێکی پێکهاتوە. پێکهاتەکەش، لەڕاستیدا، منم. لەسەرەتای کەرتی دووەمی [ئەم نوسراوەشدا] نوسیمان، کە بوون-بۆ-خۆ ناتوانێت ببێت بە هەموو شتێک. من مامۆستا یان نوسەرێکی نێو قاوەخانەکە نیم، جوان یان ناشرین نیم، جو یان ئاری نیم، کەسێکی گیانەوەر یان سادە نیم. ئەم خەسڵەتانە بە نەناسراو ناوزەددەکەین و نابێت بە ئەندێشاویش دایان بنێین. پێویستە مامەڵە لەگەڵ هەبووە ڕستەقینەکاندا بکەین؛ بەڵام ئەو شتانەی ئەم خەسڵەتانە هەڵدەگرن خودی خەسڵەتەکان نین. منیش، کە ئەوانم هەستیان پێناکەم. بۆنموونە، ئەگەر پێم بڵێت، کە من کەسێکی سادەم ئەوا ڕاستەوخۆ سروشتی سادەییم بۆ دەردەکەوێت؛ چەمکی "سادەیی" دەخەمەسەر کەسایەتییەکەم. بەڵام واتای ئەم چەمکە بە کەسایەتییەکەمەوە گرێنادەم. بێگومان ئاماژە بۆ جۆرە بەستنەوەیەک دەکات، کە بە هۆی بەناوەکیکردنی سادەیی یان بەبابەتکردنی کەسەکەوە پەیدا دەبێت، بەڵام ئەم دوو پرۆسەیە ڕاستەقینەکەی نێو پرسیارکردنەکە لەناودەبەن.

کەوابوو، دەورمان بە شتە نەناسراوە نەبڕاوەکان گیراوە. ئەوانەی دڵنیاین لێیان و هەستیان پێدەکرێت ئامادەنەبوونەکانە. ئەو کەسانەی پاش ژیانێکی زۆر لە هەندەران دەگەڕێنەوە لەوەدا نائومێد دەبن، کە هەست ناکەن لەنێو پاریسن. بابەتەکان لەوێدان و ئاشنایی خۆیان ئامادەدەکەن، بەڵام من ئامادە نیم و تەنیا نەبوونێکی ڕووتی پێویست بونیان لەنێو پاریس ئامادەدەکات. هاوڕێ و خەمەکانم ئەندێشەی بەڵێنی نیشتمانم لادروست دەکەن، کاتێک دەڵێن: "دواجار تۆ لێرەیت! گەڕایتەوە! تۆ لە پاریسیت!" بەڵام من دەستم بەو نیشتمانە ناگات. ئەگەر خەڵکەکە مافی ئەوەیان هەبێت لەبەردەم کەسانی دیکە یان بۆ خۆیان "دوو ڕوو بن"، ئەگەر ئەمەش بکەن و لەئاستی هەڵەکردنەکەی دوێنێدا، کە لە کەسێکدا دۆزییانەوە و تانەیان لێدا، هەست بە ئازاری ویژدانی بکەن، لەوانەیە بڵێین،" ئەوە هەمانشت نییە" چونکە بەڕاستی "هەمانشت نییە." کردن بابەتێکی دراوە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەوشتی؛ کەسێکی دیکەش بەرزێتییەکی ڕووتە، کە بوونی سەلماندنێتی چونکە بوونی ئەو هەڵبژاردنە. لەڕێگەی بەراوردکردنی ئاکامە لەیەکچوەکانی دوو کردەوەی لەدەرەوەدا دەتوانین بیخەینە سەر باوەڕ، بەڵام ویستی لەنێو جیهاندا نایەڵێت لێکچونەکە بناسێت. لێرەدا سەرچاوەیەکی لایەنی چاکی گرفتەکانی ئاگایی ڕەوشتی دەبینین، بەتایبەتی ئەو خەمەی لە ئەکامی ئەوەی نەتوانیت بە ڕاستی ڕقت لە شتێک بێتەوە، هەست بە ناشرینی خۆت نەکەیت و بەردەوامیش هەست بە بۆشایی نێوان چەمکە دەربڕاوەکانی، وەکو "من ناشرینم، من گوناهم کردوە" بکەیت.

دواجاریش هەستکردنێکی تەواو بە هەڵوێستەکە. بەکورتییەکەی، ئەمە بنەڕەتی هەموو دوودڵییەکە و لەنێو "ویژدانێکی خراپدا"، ئەویش ئاگامەندی نێو بڕوای

خراپدایە، کە خۆی هەڵدەسەنگێنێت، بۆنموونە، بیر لە بۆچوونی کەسانی دیکە بەرانبەر بوونی خۆی دەکاتەوە.

ئەگەر هەندێک لەو خەسڵەتە نەناسراوانە زۆرتر لەوانی دیکە کار بکەنە سەرمان و ببن بە بابەتی باسکردنی سایکۆلۆجی، نابێت چاومان لە ئاستی ئەو ڕاستییەدا کوێر بکەن، کە ئەم خەسڵەتە نەناسراوانە لە ژمارە بەدەرن چونکە نوێنەری لایەنی وەرچەرخاوی هەڵوێستەکە دەکەن.

ئەم خەسڵەتە نەناسراوانە، بەهەرحاڵ، تەنیا خۆیان بە نەناسراوی بۆ ئێمە دەرناخەن؛ بۆ ئەوەی ببن بە نەناسراو دەبێ لەنێو ئەو پرۆژەیەدا سەرهەڵدەن، کە ڕوویان تێدەکات. ئەمەشمان لەپێشتر باسکردو ڕوونمانکردەوە چۆن بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ ناسین و بڕواکردن بە بوونی کەسانی دیکە، بوونی خۆی دەکات بە بوون-بۆ-کەسانی دیکە. لەم پرۆژەیەدا ئەوەی نەناسراوە دەبێت بە شتێکی ناسراو. بێگومان، لەسەرەتاوە، گریمانەکە لەسەر پرۆژە بنەڕەتییەکەی من ڕادەوەستێت. من بێ چالاکانە خۆم سنوردارناکەم تاکو واتای "ناشرین"، "زەبون"، ڕەگەز" و هتد وەدەست بهێنم. بەپێچەوانەوە، من لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکانمدا لە واتاکانیان تێدەگەم. ئێمە ئەم خاڵەمان باسکرد، بەڵام بەوەرچەرخانی چەمکەکان، کاتێک دەڵێن فاکتۆری بوونی ڕەگەزێک ڕەتدانەوە بەرانبەر خۆ-بەگەورەدانان یان هەست بەکەمیکردن دیاریدەکات، ڕاستییەکەشمان گۆڕی. لەڕاستیدا، ڕەگەز، زەبوونی و ناشرینی تەنیا لەنێو سنوری هەڵبژاردنی مندا بۆ هەست بەکەمیکردن یان خۆ-بەگەورەدانان دێتەکایەوە. تەنیا سەربەستییەکەم واتایان پێدەبەخشێت. واتاکان بۆ کەسانی دیکەشە، بەڵام ئەو کاتە بۆ من دەبن بە واتا، کە هەڵیاندەبژێرم. یاسای سەربەستییەکەم، کە ڕێگەنادات من بەبێ خۆ-هەڵبژاردن هەبم بەسەر ئەمەشدا دەسەپێنرێت: من هەڵمنەبژاردوە ببم بەوەی کەسانی دیکە دەیناسن، بەڵام دەتوانم هەوڵبدەم ببم بەوەی بۆ کەسانی دیکە هەیە. مرۆڤێک یەکەمجار نابێت بە جولەکە و دوایی هەست بە شەرمەزاری یان سەربەرزی بکات؛ بەڵکو سەربەرزییەکەی-بۆ-بوون بە جو، شەرمەزارییەکەی-بۆ-بوون بە جو یان بێ دەربەستییەکەیەتی ئەو دەکات بە جو. بوون-بە-جو لە دەرەوەی سەربەستی ئەودا بۆ هەڵگرتنی یەکێک لەم هەڵوێستانە نییە. هەرچەندە من ڕێگەی جیاوازم بۆ خۆ دەرخستن لە ئاستی کەسانی دیکەدا لەبەردەممدایە، بەڵام ناتوانم هیچیان نەگرمە بەر. لێرەدا، دیسانەوە، حوکمکردن بەسەر سەربەستیدا دەدۆزینەوە، کە لەسەرەوە بە فاکتۆر ناوزەدمانکرد. من ناتوانم بەتەواوی واز لە بوونی خۆم بەو جۆرەی بۆکەسانی دیکە دەردەکەوێت بهێنم چونکە ڕەتدانەوەی دوورکەوتنەوە نییە. من لە هەموو حاڵەتیکدا، لەگەڵ تووڕەبووندا، ڕق، سەربەرزی، شەرمکردن، دڵشکاندن یان خۆشی، پێویستە ئەو بوونەم هەڵبژێرم، کە دەمەوێت بیگەمێ.

کەوابوو، شتە نەناسـراوەکان بۆ بوون-بۆ-خۆ، وەکو ئەو شتە نەناسراوانەن بۆ ناسین دەردەکەون. خەسڵەتی خۆیان بۆ سـنوردارکردن ونناکەن. سنورداربیەکی دەرەکیـن و بوون-بۆ-خۆ دەیانکات بە ناوەکی. خەسـڵەتی زۆرەکییان هەیە. ئێمە مامەڵـە لەگەڵ ئامێرێکدا ناکەین بۆ بەکارهێنان سـەری هەڵدابێت. لێرەدا، شـتە نەناسـراوەکە سنوردارییەکی لەپێشتر و بۆ هەڵویسـتەکەی من دانراوە (من ئەم کەسەم بۆ ئەوان). چاوەڕێی من ناکات تاکو پەیدای بکەم؛ هەمانکات لەنێو پرۆژەی سەربەسـتی منیشدا دەناسرێت. هەمانکات، مادام شـتێکی نەناسراوە، ئەوا خۆی بەودیو هەوڵدانەکانی منەوە بۆ ناسـینی دەگەیەنێت. دەبێت بە شتێکی لەپێشتر و بۆ خۆ سەپاندنی داوای خۆ خەریکردن لە من دەکات. ئەگەر ئەمە پێویست نەبێت دەبێ چی بێت؟ بێگومان دەبێ بکرێت بە شتێکی ناوەکی (لەدەرەوە، وەکو هەموو فاکتۆرێک دروستدەبێت)، بەڵام سیستەمەکەی هەرچییەک بێت، بەو لایەنە دەرەکییە دادەنرێت، کە دەبێت بە ناوەکی. ئەگەر سیسـتەم فاکتۆرێکی ڕووتی دراو نەبێت، کە کەسێک هەوڵی گۆڕانی دەدات، پێویستە من لەگەڵ سەربەستییەکەمدا بیناسم و بیکەم بە بونیادی پڕۆژە سەربەستەکەم. ئەگەر سیستەم، سیستەم بێت و ڕەوتێکی سەربەستانەی ڕووەو کۆتاییەکانم نەبێت، ئەوا دەبێت لە ناو سەربەستی هەڵبژاردنمدا خەسڵەتی دەرەکی خۆی بپارێزێت. لەگەڵ هەوڵدانی بوون-بۆ-خۆ و بە ناوەکیکردنی لایەنی دەرەکی هێشـتا ئەو لایەنە لە دەرەوەدا دەمێنێتەوە. ئەمەش پێناسەی ئەو شتە نەناسراوانەیە، کە دەناسرێن. لەبەر ئەمەیە بە پێویست دادەنرێن.

دەتوانین زۆرتر لەسـەر باسی نەناسـراوەکان بڕۆین؛ ئەوان سنورەکانی منن. لەبەر ئەمەش بۆ سەربەسـتی من تەنیا سـنورن نەک شتێکی دراو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە سەربەسـتییەکەم لەگـەڵ هەڵبژاردنی سەربەسـتانەی بوونیدا سـنورەکەی خـۆش هەڵدەبژێرێت؛ یان، ئەگەر حەزبکەیـت دەڵێین، هەڵبژاردنی سەربەستانەی کۆتاییەکانم (بۆنموونە ئەوەی، کە منە) سنوردارییەکەش دەگرێتەوە. دیسـانەوە، لێرەدا، هەڵبژاردنەکە دەبێت بە هەڵبژاردنی شـتێکی بڕاوە. ئەو شتە بڕاوەیەش ناوەکییە، بۆنموونە دەسـتەڵاتی سەربەسـتییەکەیە و ئەو سنورەی بە هۆی سـەرهەڵدانی شتە نەناسروەکانیشەوە پەیدادەبێت بڕاوەیەکی دەرەکییە. من لە دوورەوە بوونی خۆم بە شێوازێک هەڵدەبژێرم، کە هەموو هەڵبژاردنەکانی دیکەم سنوردارەدەکات و وەرچەرخانەکانیشیان پێکدەهێنێت؛ هەڵیدەبژێرم، کە شتێکی دیکە بێجگە لە خودی هەڵبژاردنەکە، سـنورداربکات. ئەگەر خۆم بە سەریا تووڕەبکەم و هەوڵبدەم بە هەموو شێوەیەک شتە نەناساوەکان بدۆزمەوە، کە لە بەشی پێشتری ئەم نوسـراوەدا بینیمـان، تەنانەت بەهێزترین هەوڵدان بۆ ناسـینەوەیان دەبێت بناخەکەی لەسـەر ناسینەوەیەکی سەربەستانە و سـنوردارکردنی سنورەکان، کە کەسەکە دەیکات بە ناوەکی، دابمەزرێت. لەبەر ئەوە سەربەستی بەتەواوی بەرپرسە.

شـــتە نەناسراوە بڕاوەکەش بە سنوردارکردنی خۆی لە ئاستی سەربەستی کەسانی دیکەدا دەخاتە نێو هەڵوێستەوە. لە ئاکامدا، سنورە دەرەکییەکانی نێو هەڵوێست دەبن بە سنور-هەڵوێســـت، دەکەونە نێو هەڵوێستەکەوە و دەبن بە"نەناسراوێک" کە هەوڵی ناســـینی دەدرێت. وەکو لایەنی هەڵبژێـــردراو و بەدواداگەڕاو، هەروەها وەرچەرخاوی هەڵبژاردنەکەم دەبن بە واتا بۆ هەوڵدانەکەم. هەرچەندە وەکو مردن پێــش هەوڵدانەکەم دەکەون. جۆرێکی دیکەی نەناســـراوەکان، کە لێرەدا باســـی ناکەین و دەبێت بە سنور-هەڵوێســـت بە مەرجێک بە ڕووداوێکی نێو ژیان دابنرێت هەرچەندە ئاماژە بۆ جیهانیش دەکات، کە ئامادەبوونم و ژیانم تیایدا نەناسرێتەوە، ئاماژە بۆ ئەودیو ژیان دەکات.

ئەو فاکتۆرەی ئاماژە بۆ ئەودیو ژیان دەکات، تەنیا بە ژیانی منەوە واتا هەڵدەگرێت و بۆ منیش دەبێت بەشتێکی نەناسراو. ئەو فاکتۆرەی ئاماژە بۆ سەربەستی لەودیو سەربەستی منەوە، هەڵوێســـت لەودیو هەڵوێستی منەوە دەکات، وەکو فۆرمێکی دەرەکی لەنێو شـــتەکانی دیکـــەدا، لەنێو جیهاندا دراوە: لێرەدا دووجۆر ســـنور-هەڵوێســـت هەن، کە خەسڵەتی پارادۆکسیان بەرانبەر سەربەستییەکەم لە هەموو لاکانەوە هەیە. هەمانکات واتایان بێجگە لەوەی سەربەستییەکەم پێیان دەبەخشێت چـــی دیکە نییە. بۆ هەموو چین، لەش، کەســـانی دیکـــە و ڕوودانێک "بوونێکی سەربەست-بۆ-." هەیە. لەوێوە بوون-بۆ-خۆ پرۆژەکەی دەخاتەگەڕ و ڕووەو یەکێک لە ئەگەرەکانی دەڕوات، کە هەمیشـــە دەبێت بە ئەوپەڕی ئەگەرەکەی. ئەگەرێکی شـــوێنکەوتو ئەگەری خۆ بینینە؛ بوونێکە بێجگە لە خۆی لەپێناوی بینینی خۆی لەدەرەوەدایە. لە هەموو حاڵەتەکاندا، پرۆژەی خۆ بەرەو "کۆتاییەک"، کە ناوەکییە و لەنێو خانەی ئەگەرەکاندا دەبێت بە واتایەکی لەودیو-گەیشتنەوە، سەرهەڵدەدات. کەسێک دەتوانێت هەبێت تاکو "ببێت بە-فەرەنسی"، " ببێت-بە-کرێکار" و کوڕی پاشـــاش "ببێت-بە-خاوەن دەستەڵات." ئێمە، لێرەدا، مامەڵە لەگەڵ سنورەکان و حاڵەتە ڕەتدراوەکانی بوونمان دەکەین. بیریان لێدەکەینەوە بەوجۆرەی بۆنموونە، جویەکی زایۆنیســـت بیر لـــە بوونی خۆی لەنێو ڕەگەزەکەیـــدا دەکاتەوە. ئەو بە ڕاســـتی و بڕیاردانەوە بیر لە نامۆبوونی هەمیشەیی خۆی دەکاتەوە. بەهەمانشێوە کرێکارێکی شۆڕشگێڕ لەگەڵ پرۆژەی شۆڕشکردندا بیر لە "بوونی خۆی-لەپێناوی-بوون-بەکرێـــکار" دەکاتـــەوە. وەکو، هایدیگەریش ئاماژە بۆ ئـــەو خاڵە دەکەین، هەرچەندە چەمکەکانی ڕەســـەن و ناڕەسەنی لەبەر ڕەهەندە ئاکارییەکانیان ڕوون نین، هەڵوێستی ڕەتدانەوە و ڕاکردن بەردەوام ئەگەرن لە بووندا. کەسێکی بورژوا بە ڕەتدانەوەی چینەکانی دیکە خۆی دەکات بە بورژوا و کرێکارەکەش بە ڕەتدانەوەی چینەکان و چالاکییە شۆڕشـــگێڕانەکانی، وەکو یەکێک لەنێو-چینەکەیدا، دەبێت بە کرێکار. بەڵام ئەم ســـنوردارییە دەرەکییانەی سەربەستی، لەبەر ئەوەی دەرەکین

و وەکو شـــتێکی نەناســـراو بە ناوەکی کراون هەرگیز نابن بە ڕێگرێکی ڕاستەقینە بۆ سەربەســـتی. سەربەستی هەمووگیر و نەبڕاوەیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ســـنوری نەبێت بەڵکو هەرگیز ڕووبەڕوویان نابێتەوە. ئەو ســـنورانەی سەربەستی توشـــیان دەبێت ئەوانەن خودی سەربەستی بۆ خۆی دروستیان دەکات و ئێمەش مامەڵەکردنمان لەگەڵ ڕابردوودا، ژینگە و تەکنیکەکان باسکردوە.

## ئێ . مردنی من

پاش دەرکەوتنی مردن بۆ ئێمە، وەکو شتێکی نا-مرۆڤانە و باڵادەست، لەسەر دیوارەکەی ئەو بەرەوە، بڕیارماندا لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە تەماشای بکەین و لێی بکۆڵینەوە؛ وەکو ڕووداوێکی ژیانی مرۆڤ باسیبکەین. ئەم گۆڕانکارییە بە ئاسانی ڕووندەکەینەوە: مردن ســـنورە و هەموو سنورێکیش (لەســـەرەتاوە یان کۆتاییدا) دووسەرە. گرنگ نییە بە بەشێک لە نەبوونی بوون، کە پرۆسەکان دەبڕێت، دابڕێت یان نا. ئەو بوونەیە، کە سەر بە پرۆسەیەکە و تاکو ڕادەیەکیش واتا بە پرۆسەکە دەبەخشێت. دوابەشی گۆڕانییەکە هەمیشە ڕوو لە بێدەنگی دەکات، ئەویش نەمانی دەنگە، کە شـــوێن گۆڕانییەکە دەکەوێت؛ لەلایەکەوە، بە بێدەنگی دروســـتکراوە چونکە ئەو بێدەنگییەی سەرهەڵدەدات لە دوابەشی گۆڕانییەکەدا ئامادەبووە و بووە بە واتاکەی. لەلایەکی دیکەوە، بەشێکە لەو بوونەی گۆڕانییەکە مەبەستێتی؛ بەبێ دوابەش گۆڕانییەکە بەردەوام لەنێو هەوادا دەمێنێتەوە و دوابەشـــەکەش لەم نۆت بۆ ئەو نۆت دەڕوات و گۆڕانییەکە کۆتایی پێ نایەت.

مردن هەمیشـــە، ڕاست یان ناڕاست، ئەو شتەیە دەستەڵاتمان بەسەریدا نییەو دوا ســـنوری ژیانی مرۆڤە. لەبەر ئەمە ئاســـایی بوو فەلســـەفە، کە بەگشـــتی لە کێشـــەی پەیوەندی هەڵوێستی مرۆڤ لەگەڵ لایەنە نامرۆڤەکانی دەکۆڵییەوە، بیر لە مردن، وەکو دەرگایەکی کراوە بۆ نەبوونی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بکاتەوە. ئەو نەبوونەش بە لەناوبردنێکی ڕەهای شـــێوازی بوونی مرۆڤ دابنێت. ئێمە دەتوانین بڵێین، چەمکی ڕیالیســـتانەی مردن، کە ســـەرهەڵدانی مردن بە پەیوەندی لەگەڵ لایەنی نامرۆڤانە دادەنێت، ســـەرهەڵدەدات. کەوابـــوو، مردن لە مرۆڤ ڕادەکات و هاوکات چواردەوری بە سنورێکی ڕەهای نامرۆڤانە دەگرێت.

مەحاڵە بیریارێکی ئایدیالیست و مرۆڤخواز بیرۆکەی ڕووبەڕووبوونەوەی سنورێکی نامرۆڤانە وەرگرێت. ئایدیالیســـت نایەوێت، وەکو فەیلەسوفەکان بڕوانێتە مردن، بەڵکو شاعیرانە، وەکو ڕیلکە یان ماڵرۆی ڕۆماننوس دەڕوانێتە کێشەکە. ئەوەندەش بەسە مردن بەدوا بەشی زنجیرەکە دابنێین. مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەو شتانە دەبێتەوە، کـــە مرۆڤانەیە؛ ژیان ڕووی ئەودیوی نییە، مردنیـــش دیاردەیەکی مرۆڤانەیە؛ دوا

دیاردەی ژیان و ژیانێکی وەســتاوە. بە وەرچەرخانی کاردەکاتە سەر هەموو ژیان. ژیــان خودی خۆی ســنووردارەکات؛ دەبێت بە جیهانی "بڕاوە نەک ســنوردار"ی ئاینشتاین. مردن، وەکو دوابەشی گۆرانییەکە واتا بە ژیان دەبەخشێت. ڕووداوێکی نائاسایی نییە؛ بەشێکی زنجیرەکەیە.

بەڵام مردنە دۆزراوەکە بەتەنیا نابێت بە ڕووداوێکی مرۆڤانە؛ دەبێت بە ڕووداوی من. کاتێک مردن لەناوەوە دەبینرێت دەبێت بە ڕووداوێکی تاکەکەســی، وەکو ئەو شــتە گەورە نەناســراوە و ســنورە بۆ مرۆڤایەتی نامێنێتەوە؛ دەبێت بە دیاردەی ژیانی تاکە کەســیم و ژیانیشم دەکات بەشتێکی تایبەت؛ ژیانم وا بۆدەردەخات، کە جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە. لەم ڕووەوە من بەرانبەر ژیان و مردنم بەرپرسم. مەبەستم لێپرســینەوە لە مردنەکەم نییە، بەڵکو لە بڕانــەوەی ژیانە. لەم بۆچوونەوە ڕێلکە هەوڵدەدات ئەوەمان نیشــاندات، کە مردنی هەموو تاکە کەسێک لە ژیانی دەچێت چونکە هەموو ژیانی خۆ-ئامادەکردنە بۆ گەیشــتن بــە کۆتایی. مالڕۆش لە (لێس کۆنکویرنت) دا باســیدەکات، کە کەلتووری ئەوروپی بە بەخشینی واتای مردن لای هەندێک ئاسیاییەکان، کە کتوپڕ توشیان دەبێت ئەو ڕاستییە دەناسنەوە، کە ژیان تایبەتە. هایدیگەریش فۆرمێکی فەلسەفی بە مردنی مرۆڤدا. ئەگەر دازاین پرۆژەدانان بێت ئەوا دەبێت پرۆژەی مردنیشی لەنێو جیهان، وەکو ئەگەرێک دابمەزرێنێت. مردن دەبێت بە ئەگەرێکی تایبەتی دازاین و ڕاســتەقینەی مرۆڤایەتیش بە بوون-بەرەو-مردن. بەو ڕادەیەی دازاین پرۆژەی مردن دادەمەزرێنێت هەست بە سەربەستیش-بۆ-مردن دەکات و بوونی خۆی، وەکو هەبوویەکی بڕاوە پێکدەهێنێت.

لەسەرەتاوە دەردەکەوێت ئەم بیردۆزەیە سەرنجڕاکێش نەبێت: مەبەستمان لە بە ناوەکیکردنی مردن ئەوەیە، کە بۆ کۆتاییەکانی ئێمەیە؛ ئەم سنورەی سەربەستیش خودی سەربەستی دەیدۆزێتەوە. بەڵام لایەنی باش و خراپی ئەم بۆچوونانە توشی هەڵەمان ناکەن. پێویستە جارێکی دیکە پرسیارەکە لە خۆمان بکەین.

بەدڵنیاییەوە، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، کە خەسڵەتی بە جیهانبوونیش، دەهێنێتە کایەوە، ناتوانێت ڕووبەڕووی شــتێک ببێتەوە مرۆڤانە نەبێت؛ تەنانەت چەمکی نا-مرۆڤانە مرۆڤ دروستیکردوە. کەوابوو، ئەگەر مردن لەخۆیدا دەربەندێک بێت بەرەو شــتێکی ڕەهای نا-مرۆڤانە، نابێت هیوامان پێی هەبێــت و ببێت بە پەنجەرەیەک لەســەر ئەو ڕەهایــە. مردن تەنیا بوونی خۆمان بۆ لــە بۆچوونێکی مرۆڤانەوە بۆ دەردەخات. ئایا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە مردن شتێکی لەپێشتری ڕاستەقینەی مرۆڤانەیە؟

پێویستە، یەکەمجار، باسی لایەنی بێهودەیی مردن بکەین. لێرەدا ئەو بۆچوونەی مردن بەدوا بەشی گۆرانییەکە دادەنێت ڕەتدەدەینەوە. هەندێک دەڵێن ئێمە لەنێو کەسە گیراوەکاندا، کە فەرمانی کوشتنیان بەسەردا دراوە، بەبێ ئەوەی پێی بزانین،

دانراویـــن. ڕۆژانەش گیراوەکانی دیکە لەبەرچاومان دەکوژن. بەڵام بەتەواوی بەم شێوەیە نییە. باشترە خۆمان بەو مرۆڤە دابنێین، کە فەرمانی کوشتنی دەرچووە، ئازایانە خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات، لەســـەر سەکۆی سێدارەکە ڕادەوەستێت و گوێ ناداتە هیچ نەخۆشـــییەکیش. ئەمەش مەسیحایەتی باسیدەکات. گوایە مرۆڤ دەبێـــت هەموو کاتێک خۆی بۆ مردن ئامادەکردبێت. لەم بۆچوونەوە مرۆڤ دۆخی مـــردن بۆ مردنێکی چاوەڕوانکراو دەگۆڕێت. ئەگەر واتای ژیانمان چاوەڕوانکردنی مـــردن بێت، بە ڕوودانی مۆری کۆتایی لە ژیـــان دەدات. ئەمەش ناوەڕۆکی ئەرێی 'بڕیاردان'ە لای هایدیگەر.

بێبەختانە ئەم ئامۆژگارییە ئاسانە، بەڵام شوێنکەوتنی گرانە، نەک لەبەر ئەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤانە بە سروشت لاوازە یان ناڕەسەنە، بەڵکو لەبەر خودی مردنە. کەســـێک دەتوانێت چاوەڕوانی مردنێکی تایبەت بێت نەک مردن بەگشتی. دەست سوکییەکەی هایدیگەر ئاماژەی بۆ کردوە دۆزینەوەی ئاسانە. ئەو مردن دەکات بە ڕووداوی تاکە کەس و پێمان دەڵێت، کە مردنی کەسە، مردنی تاکە و هیچ کەسێک ناتوانێت بۆ منی بکات. ئەم تاکە نموونەییەی بە دازاین ناوزەددەکرێت ڕووبەڕووی مردنـــی خۆی دەبێتـــەوە. بوونی دازاینیش دەکات بە بوونی تاکە کەســـی خۆی؛ لەگەڵ دانانی دوا پڕۆژەی بوونیدا سەربەستانە ڕەسەنییەتی بوونی دەستدەکەوێت. لەپێناوی ســـەقامگیرکردنی کەســـایەتییەکەیدا خۆی لە کێشە بازاڕییەکانی ژیانی ڕۆژانەی دادەبڕێت. بەڵام لێرەدا ســـوڕانەوەیەکی بازنەیی ڕوودەدات. کێ دەتوانێت بیســـەلمێنیت مردن خەسڵەتی تاکە کەسی دەبەخشـــێت؟ هەڵبەتە، ئەگەر مردن بە مردنی مـــن دابنرێت ئەوا دەتوانم چاوەڕوانی بم؛ ئەگەرێکی دوور وەســـتاوە و خەسڵەتی خۆی هەیە. بەڵام ئایا ئەو مردنەی ڕوومتێدەکات مردنی منە؟ لەسەرەتاوە شـــتێکی گەورەیە ئەگەر بڵێین، "مردن ئەو شتەیە کەس ناتوانێت بۆ من بیکات". بەڵام لێرەدا جۆرێک لە بڕوای خراپ ســـەرهەڵدەدات؛ ئەگەر کەســـێک مردن بەدوا ئەگەری خۆی دابنێت، ئەو ڕووداوەبێت بوون-بۆ-خۆ بایەخی پێبدات، ئەوا دروستە، کە کەسێکی دیکە ناتوانێت بۆ من بمرێت. هەمانکات، پڕۆژەکانی دیکەشم، لەسەر زەمینەیەکی ڕەسەنانە یان ناڕەسەنانە کەسێکی دیکە بە ئەنجامیان ناگەیەنن. کەس ناتوانێت بۆ من خۆشەویستی بکات، ئەزمونی سۆز و هەڵچونی هەبێت. ئەم (خۆ) یەش لێرەدا هیچ پەیوەندییەکی بەو کەسەوە نییە، کە لە مامەڵەکردنە بازاڕییەکانی ژیانی ڕۆژانەیدا ســـەرکەوتوە (بۆ هایدیگەر گرنگە کەســـێک سەربەستانە بمرێت. خۆشەویستییەکەی من هەســـتیپێدەکەم خۆشەویستی منە نەک خۆشەویستییەک لەنێـــو مندا بۆ ئەوان.) ئاماژە بۆ ئەو خۆیە دەکات هایدیگەر بۆ هەموو دازاینێکی دادەنێت و گرنگ نییە ڕەســـەن یان ناڕەسەنیش بێت. ئەو دەڵێت، "دازاین بوونی منـــە." لەم بۆچوونەوە، خۆشەویســـتی، وەکو مردن تایبەتمەندە و هیچ شـــتێک

جێگەی ناگرێتەوە؛ کەس ناتوانێت بۆ من خۆشەویستی بکات.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر کردەوەکانم لەنێو جیهاندا لەبەر ڕۆشـنایی کاریگەری و ئاکامەکانیان تەماشـابکرێن ئەوا ئاشکراش دەردەکەوێت، کە ئەوەی من دەیکەم کەسـانی دیکەش دەتوانن بیکەن. ئەگەر کێشەکە لەوەدابێت ئەم ئافرەتە دڵخۆش بکرێت، ژیان و سەربەسـتییەکەی مسـۆگەر بکرێن و ڕێگـەی خۆڕزگارکردنی بۆ بدۆزرێتەوە یان ماڵێکی بە منداڵەوە بۆ دابمەزرێنرێت. ئەگەر ئەمانە بە خۆشەویستی دابنرێن ئەوا کەسـێکی دیکە لە جێگەی من دەتوانێت بیکات. ئەمە نموونەی ئەو قوربانیدانە ڕاستەقینانەن هەزارجار لە ڕۆمانە ڕۆمانسییەکاندا باسکراوە. وێنەی ئەو پاڵەوانانەمان بۆ دەگێڕنەوە لە خۆشەویستی و شەوقیان لە پێناوی بەختەوەرکردنی ئافرەتێکدا بەرانبەر لایەنە نەیارەکەیان دەسوتێن چونکە لایەنە نەیارەکە دەتوانێت باشتر ئافرەتەکە بەختەوەربکات. لایەنە نەیارەکە ئافرەتەکەی خۆشدەوێت چونکە پێناسەی خۆشەویستی بۆ ئەو لەسەر بەختەوەرکردنی ئافرەتەکە ڕادەوەستێت.

لـەم بۆچوونەوە، هەموو کردەوەکانم بەهەمانشـێوە دەردەکـەون و تەنانەت مردنیشم دەگرێتەوە. ئەگەر مردن لەپێناوی هاندان و نیشتمان پەروەری و هتد بێت ئەوا هەرگیز کەسێکی دیکە ناتوانێت بۆ من بمرێت. بەکورتییەکەی، هیچ بەهایەکی تاکە کەسـی بە مردنمەوە تایبەتمەند نییە. مردن لەکاتێکدا دەبێت بە مردنی من، کە خۆیەتی خۆم بەرجەسـتەدەکەم. پێناسـەکردنی خۆیەتـی منە بە کۆجیتۆی پێش تێڕامان مردنـم دەکات بە ڕووداوێکی خۆیەتی بێ وێنە. لەمحاڵەتەدا، مردن خەسـڵەتی بۆ دانانرێت؛ چونکە مردنی منـە و بونیادە بنەڕەتییەکەی ڕێگەنادات ببێت بەو ڕووداوە تاکەکەسـییەی چاوەڕوان دەکرێت. بێجگەلەمە، مردن چاوەڕوان ناکردێت. مەگەر بۆم دانرابێت یان فەرمانی کوشـتنم دەرچووبێت (دوای هەشـت ڕۆژ هەڵدەواسـرێم، نەخۆشم و دەمرم، کە دەزانم ڕوودەدات). پێویستە دوو واتای 'چاوەڕوانی' بەوردی لە یەک جیابکەینەوە، کە بەردەوام تێکەڵیاندەکەین: چاوەڕوانی مـردن چاوەڕوانکردنی مردن نییە. ئێمە تەنیـا چاوەڕوانی ڕووداوێک دەکەین، کە دەیناسـین. من چاوەڕوانی گەیشتنی شەمەندەفەرەکەم لە (کارتەرس)ەوە چونکە دەزانم ئیسـتگەی وەستانەکەی لە کارتەرس جێهێشتوە و سوڕانەوەی تایەکانی لە پاریس نزیکتریدەکاتەوە. هەڵبەتە، دەشـێ شـەمەندەفەرەکە دوابکەوێت؛ توشی ڕووداوێک ببێت. بەڵام ڕاستی پرۆسەی گەیشتنەکە دەمێنێتەوە و دەزانم بەرێوەیە. ڕووداوەکەش پرۆسـەی گەیشـتنەکە لە هەموو لاکانەوە داناخات و مایەرسـەن گوتەنـی بووە بـە "بونیادێکی دەمار زۆر". من دەتوانم بڵێـم چاوەڕوانی پیرۆم، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەشـم شەمەندەفەرەکەی درەنگ بگات. بەهەمانشێوە ئەگەری مردنم ئەو واتایە دەبەخشـێت، کە من لە ڕووی بایۆلۆجییەوە بەتەواوی دانەخراوم و سیستەمەکەشـم دوورەپەرێز نەکراوە؛ تەنیا ئەوەندە دەردەخات، کە لەشم سەر

بە هەموو بوونەکانە. وەکو دواکەوتنی شـــەمەندەفەرەکەیە نەک گەیشـــتنی پیرۆ. لەگەڵ شـــتێکی نەبینراودا، ڕێگرێکی چاوەڕواننەکراودا، کە دەبێت لە بیری نەکەین هاوشان ڕادەوەســـتێت. ئەگەر لەو باوەڕەشدابین فاکتۆرەکان مەرجدارن، تەنانەت نەسەلمێنراویشن، هێشتا ژمارەیان نەبڕاوە و چەسپاندنیان نەبڕاوەیەکی نەبڕاوەیە؛ پێکەوە بوونیان هیچ سیســـتەمێک دانامەزرێنێت. بەلای کەمەوە، ئەم بۆچوونەوە، ڕۆژی کۆتاییە بینراوەکە (مردنم) نابینرێت. لەبەرئەمە چاوەڕوان ناکرێت. لەکاتێکدا بـــە ئارامی لەنێو ئەم ژوورە دەنوســـم، حاڵەتی جیهانی لەوەدایە، کە مردنم نزیک دەبێتەوە؛ بەڵام، بەپێچەوانەوە، ئێستا بە بیرکردنەوە دوور کەوتۆتەوە. بۆنموونە، ئەگـــەر چاوەڕوانی فەرمانی جێگۆڕین بم ئەوا تێدەگەم، کە مردنم نزیکە ڕوودەدات، بەڵام دەشـــێ لەهەمانکاتدا کۆنفراســـێکی جیهانی بە نهێنی ببەسترێت و ئاشتی بەرقەرابکات.

کەوابـــوو، ناتوانم بڵێم لەگەڵ تێپەڕبوونی خولەکانـــدا مردنم نزیک دەبێتەوە. دروســـتە مردن بەرەو مـــن دێت، ئەگەر بیر لـــە بڕاوەیی ژیانـــم بکەمەوە. بەڵام لەنێو بڕانەوە لاســـتیکییەکاندا (لە تەمەنی سەد ســـاڵیدا یان سبەینێ لە تەمەنی ســـی و حەوت ســـاڵیدا دەمرم). من نازانم ئەو کۆتاییە نزیک دەبێتەوە یان دوور دەکەوێتەوە. هۆی ئەمەش بۆ جیاوازی نێوان خەســـڵەتی نێوان مردن لە تەمەنی پیری و مردنێکی کتوپڕدا هەیە، کە لە تەمەنی جوانیدا ڕوودەدات و جوانەمەرگمان دەکات. لەحاڵەتی یەکەمدا چاوەڕوانکردنی مردن ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ژیان پڕۆژەیەکـــی بڕاوەیە؛ ئەمەش جۆرێکە لە هەڵبژاردنی شـــتە بڕاوەکان. لەحاڵەتی دووەمدا چاوەڕوانکردنەکە ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ژیانم پڕۆژەیەکە بە کەمییەوە پەیدا بووە. ئەگەر مردن تەنیا بە پیرییەوە هەبوایە ئەوا چاوەڕوانی مردنم دەکرد. بەڵام خەســـڵەتی تایبەتی مردن ئەو ڕاســـتییە دەردەخات لەپێشوەختا ئەوانەی چاوەڕوانی دەکەن سەرســـام دەکات. هەرچەندە مردن لـــە تەمەنی پیریدا لەگەڵ بڕانەوەی هەڵبژاردن تێکەڵدەکرێت. وەکو دوابەشـــی گۆڕانییەکەی ژیانمان بڕیاری لەســـەر دەدرێت. مردنی کتوپڕیش چاوەڕواننەکراوە و ئێمە سەرسامدەکات چونکە پێشوەخت دێتەکایەوە. چاوەڕوانکردنەکەمان دەکات بە ساختە و دەمانەوێت دوای ساتی مردنەکەش بژین.

بێجگە لەوەی مردنی کتوپڕ بە خەســـڵەت لە مردنی دیکەوە جیاوازە بەگوێرەی ژیانی بایۆلۆجیشـــمان (لە گۆشـــە نیگایەکی جیهانییەوە هۆکار و فاکتۆرەکانیان جیاناکرێنـــەوە)، ئەمجۆرە مردنانە لەنێو یەکدیدا هەن. واتە، کەســـێک لە تەمەنی پیریدا کوێرانە یان لەســـەر بـــڕوای خراپ چاوەڕوانی مـــردن دەکات. ئێمە پێش تەواوکردنی کارەکانمان لەبەردەم مردندا ڕادەوەستین. کەوابوو، زۆرکەم بەڕێکەوت مردنمان، سۆفۆکلیس گووتەنی، وەکو دوابەشی گۆرانییەکە ئامادە دەبێت. ئەگەر

ڕێکەوتیش بڕیار لەسەر خەسڵەتی مردنمان بدات، ئەو مردنەی لە بەشی کۆتایی گۆرانییەکە دەچێت چاوەڕواننەکراوە. بۆ ئەوەی کۆتایی گۆرانییەکە واتادار بێت ئەوا پێویستە بەشێک لە خودی گۆرانییەکە بێت.

مردنەکەی سۆفۆکلیس باسیدەکات و بە دوابەشی گۆرانییەکەی دادەنێت، وەکو ئەو کۆمەڵە پیتانەی دەکەونە خوارێ و بە ڕێکەوت وشەیەک پێکدەهێنن وایە. ئەو ڕێکەوتەی بەردەوام لەنێو پرۆژەکاندا سەرهەڵدەدات ئەگەری من نییە، بەڵکو لەناوبەری ئەگەرەکانمە، لەناوبردنێکە لەدەرەوەی ئەگەرەکانی مندایە و بەشێک نییە لە ئەوان. کەوابوو، مردن ئەگەری من نییە، ئەگەری لەناوبردنی ئەگەرەکانمە و لەدەرەوەی ئەگەرەکانمدایە.

ئەگەر لە واتای مردن وردببینەوە دەتوانین لە ڕوویەکی دیکەوە بەرەو ئەم کێشەیە بڕۆین. ئێمە دەزانین ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی خودی خۆی بە نەبوون دەناسێت یان ڕووەو خۆی دەڕوات. ئەگەر بەردەوام مامەڵە لەگەڵ داهاتوودا بکات، زۆرمان لێدەکات بڵێین، چاوەڕوانی چەسپاندنی داهاتوویەتی. ئەوەی داهاتووە و ئامادە دەبێت ئێستا هێڵکاری بۆ کراوە. هێڵکاریکردنەکەش لە ئێستادا واتا بۆ بوونی من دادەنێت. ئەم ئیستایەش دۆزینەوەیەکی سەربەستانەی ڕابردوومە لەبەر ڕۆشنایی داهاتوویەکی نوێدا. ئێمە داهاتووەکە سنوردار ناکەین بەڵکو پرۆژەیەکە و چاوەڕوانی سەرهەڵدانەکەی دەکەین. هەڵوێستەکەم ڕەخنە و لۆمەی کەسێکە گێچەڵی پێکردووم. بەڵام کێ ناڵێت ئەو ڕەخنەیەم لە ترسا ناگۆڕێت بۆ تەتەڵەکردنی زمانم و ڕابردووم؟ سەربەستی دەبێتە سنور بۆ سەربەستی؛ واتای ڕابردووش لە ئێستادا دەدۆزرێتەوە. ئەمەش ئەو پارادۆکسە دەردەخات، کە هەڵوێستەکەمان ئاشکرا (کۆجیتۆی پێش تێڕامانە) و شاراوەشە. هەرزەکارێک لەلایەنی شاراوەی هەڵوێستەکەی بەئاگایە و هەمانکات دەبێت باوەڕیشی بە داهاتوو هەبێت. دەیەوێت دڵنیابێت، کە بە پرۆسەی (قەیرانی هەرزەکاریدا) تێدەپەڕێت یان بە گوڕەوە ڕوو لە ژیانی زاهیدی بکات. سەربەستییەکەی داهاتوومان، تاکو ئەو پلەیەی ئەگەری ڕاستەقینە نییە و بناخەی ئەگەرە نەبووەکانە، لەنێو ئاشکرابوونەکەدا تەڵخی دروستدەکات. بارێس گوتەنی "نهێنییەکە لەبەر خۆری نیوەڕۆدا". ئەمەش پێویستی چاوەڕوانکردنەکەمان بۆ بوونمان دەسەلمێنێت. ژیانمان چاوەڕوانیکردنێکی درێژخایەنە: یەکەمجار چاوەڕوانی ناسینەوەی کۆتاییەکانمان دەکەین (هەموو مامەڵەکردنێک چاوەڕوانکردنیشە بۆ ئاکامەکانی). هەروەها، چاوەڕوانی بوونی خۆمانین (ئەگەر پرۆژەیەکم دامەزرا، ئەگەر کەسەکە منی خۆشویست، لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوبم، ئەو چاکەکردنە، دەبێت بڕیار لەسەر شوێن، واتا و بەهای ئەو پرۆژەیە بدەم، کە پێی دەوترێت ژیان). ئەمەش پەیوەندی بە هەڵکەوتنی کەمی لە سروشتی مرۆڤدا نییە، یان لەو شپرزەییەوە پەیدا

نابێت ڕێگەنەدات خۆمان بە ڕانەبردووەوە ببەستینەوە و ڕاستبکرێتەوە و ببێت بە شـــتێکی کاتی. پێویســـتە ژیان بەو بوونە دابنێین، کە دروستکراوە نەک تەنیا بە چاوەڕوانییەوە، بەڵکو بەو چاوەڕوانیانەشەوە، کە چاوەڕوانی چاوەڕنکردنن. لێرەدا بونیادی (خۆ) دەدۆزینەوە: ئـــەوەی دەیەوێت ببێت بە (خۆ) دەبێ بۆلای (خۆ)ی بڕوات. چاوەڕوانیکردنەکان ئاماژە بۆ دوا ماوە دەکەن، کە بێ چاوەڕوانی بۆ شتێکی دیکـــە چاوەڕواندەکرێت. دڵئارامی ئەوەیە، کە چاوەڕوانی بوونێکی دیکە نەکەیت. زنجیرەی هەموو شـــتەکان بە دوا ماوەکەوە بەســـتراوە، کە شـــتێکی دراو نییە و بەهای بوونی ئێمەش؛ واتە، ئاشـــکرایە، کە پڕییە لە شێوازی "بوون-لەنێو-خۆی-بوون-بۆ-خۆدا."یە. لە ڕێگەی دوا ماوەکەشـــەوە بەتەواوی بۆ هەمیشە ڕابردوومان دەدۆزینەوە. دەزانین ئەزمونێکی تەمەنی لاوییمان بەردار یان بێبەرە. هەڵوێستێکی هەرزەکاریم هەڵەشەیی یان فۆرمێکی پێکهاتوو بۆ خەریکردنکەی دوایی بوو؛ خواری و لێژی ژیانمان بۆ هەمیشە دەچەسپێن. بەکورتییەکەی، کارنامەی ژیانمان کۆتایی بە نوسینی دێت. مەسیحیەکان مردن بەم دوا ماوەیە دادەنێن. کەشیش بۆسیلۆت لە گفتوگۆیەکی لەگەڵ مندا هەوڵیدا تێمبگەیەنێت، کە 'ڕۆژی قیامەت' داخســـتنی دەفتەری کارنامەکانە و هەموو کەسێک دەکات بەوەی، کە هەیە و کەس ناتوانێت خۆی ڕزگار بکات.

بـــەڵام هەڵەیەک لە لێکچونەکەماندا، کە پێشـــتریش لـــە پەیوەندییەکەمان بە بۆچوونەکەی لایبنیزەوە ئاماژەمان بۆ کرد، دەدۆزینەوە. ئێمە بۆ لایبنیز سەربەستین چونکە کردەوەکانمان لە جەوهەرمانەوە هەڵدەقوڵێن. بەڵام لەسەر ئەو ڕاستییەی، کە ئێمە جەوهـــەری خۆمان هەڵنەبژاردووە دەریدەخات، کە سەربەســـتییەکەمان کۆیلایەتییەکـــی تەواو دەشـــارێتەوە. خـــوا جەوهەری ئادەمی هەڵبـــژارد. ئەگەر داخســـتنی کارنامەکەمان واتـــا و بەها بۆ ژیان دابنێت ئـــەوا هەموو ئەو کارانەی کردومانە سەربەســـتانە نەبووە؛ لێرەدا واتاکان نامێنن، ئەگەر خۆمان دوا کردەوە لەنێو کارنامەکەدا نەنوسین و داینەخەین.

ئەمـــەش لە بەرهەمەکانی دیدرۆتدا بە کورت و پوختـــە دەرکەوتووە. دوو برا لە ڕۆژی قیامەتدا ڕادەوەستن. یەکەمیان بە خوا دەڵێت، "بۆچی بەلاوێتی منت کوشت؟" خواش وەڵامدەداتەوە دەڵێت، "ویستم ڕزگارت بکەم. ئەگەر تەمەنت درێژتربوایە تۆش وەکـــو براکەت تاوانی زۆرت دەکرد." دوای ئەمە براکەی بە خوا دەڵێت، "ئەی بۆچی منت بە پیری کوشت؟" ئەگەر مردن بڕیاردانێکی سەربەستی بوونمان نەبێت ژیانمان تەواو ناکات. ئەگەر خولەیەک کەمتر یان زیاتر زۆرشت بگۆڕێت و ئەو خولەیە بخرێتە سەریان لەنێو کارنامەکەمدا دەربهێنرێت، هەرچەندە من بە سەربەست دابنرێم، هێشتا ناتوانم واتا بە ژیانم ببەخشـــم. مردنی مەسیحایەتی لە خواوە دێت. خوا کاتی مردن دیاریـــدەکات. هەرچەندە خۆم بە بوونەوەرێکی کاتی دابنێم هێشـــتا کاتی مردنەکەم

دەستنیشانناکەم و ئاکامەکانی جیهان سنورداری دەکات.

ئەگەر ئەمە دروست بێت، ناتوانین بڵێین مردن لەدەرەوەدا واتا بە ژیان دەبەخشێت؛ واتا لە خۆیەتییەوە پەیدا دەبێت. مادام مردن لەسەر بناخەی سەربەستی دانەمەزراوە ئەوا هەموو واتایەکی ژیان دەسڕێتەوە. ئەگەر من چاوەڕوانی بم و چاوەڕێی چاوەڕانی بکەم و کتووپڕ دوا بابەتی چاوەڕوانییەکەم تێپەڕێت ئەوا چاوەڕوانی دەبێت بە بێهودە. بۆنموونە، لاوێک سێ ساڵی تەمەنی چاوەڕوانە ببێت بە نوسەرێکی گەورە. خودی چاوەڕوانیکردنەکە بەس نییە؛ بەگوێرەی ئەو پەرتووکانەی دەیانوسێت دەبێت بە شتێکی نەزۆک یان ناسینەوەی باهایەکی بەرز. ئەو یەکەم پەرتووکی بڵاوکردۆتەوە، بەڵام ئەو کارە بە تەنیا چ واتایەکی هەیە؟ پەرتووکێکە بۆ خوێندەوارێکی سەرەتایی. گریمان پەرتووکێکی چاکە؛ هێشتا واتاکەی لە داهاتوویدایە. ئەگەر نایاب بێت ئەوا یەکسەر دەبێت بە بەڵێن و سەرەتایەکی چاک. ئەو تەنیا پەرتووکێکی نوسیوە؛ کارەکەی سنوردارە و بڕاوەیە؛ ڕووداوە. ئەگەر پەرتووکی چاکتر بنوسێت ئەوا دەبێت بە یەکێک لە نوسەرە چاکەکان. لەم ساتەدا، کە بیر لە نوسراوێکی دیکە دەکاتەوە و چاوەڕان بوو ببێت بە نوسەرێکی گەورە، دەمرێت. ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی هەموو شتەکان فڕێبداتە نێو نادیارییەکەوە: من ناتوانم بڵێم نوسەرە مردووەکە نوسەری یەک پەرتووکە یان چەند پەرتووکێکی دەنوسی (چونکە یەک پەرتووکی دەرچووە). من ناتوانم هیچ بڵێم. گریمان بەلزاک پێش ڕۆمانەکەی (لێس چۆوانس) دەمرێت؛ ئەو وەکو نوسەری چەند ڕۆمانێکی خراپی لە چاپنەدراو دەمێنێتەوە. بەڵام کتوپڕ چاوەڕوانی نوسەرە لاوەکە، ئەو چاوەڕوانییەی دەیکرد بە نوسەرێکی گەورە واتاکەی وندەکات؛ هیچ بڕیارێکی بۆ نادرێت. بێهودەشە بڕیادانەکە لەسەر قوربانیدانەکانی بۆ هونەر و ژیانی ناخۆشی دابنرێت؛ زۆر نوسەری پێنەگەیشتوش دەدۆزرینەوە، کە هەمان قوربانیان دابێت. دوای بەهای کارکردنەکە بەردەوام بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە؛ یان دەکەوێتە نێو بێهودەییەوە. کەوابوو، مردن واتا بە ژیان نابەخشێت؛ بەڵکو بەپێچەوانەوە، ژیان لە واتا دادەبڕێت. ئەگەر پێویست بکات بمرین ژیان هیچ واتایەکی نابێت چونکە چارەسەر بۆ گرفتەکانی نادۆزرێتەوە و واتای گرفتەکانیش نادیاردەمێننەوە. بێهودەشە پەنا بۆ خۆکوشتن بەرین تاکو لەو پێویستییەی مردن ڕابکەین. خۆکوشتن بە کۆتایی ژیان دانانرێت، کە بوونی من بناخەیەتی. مادام کردەوەیەکی ژیانمە داوای واتا دەکات و ئەو واتایەش لە داهاتوودایە. لەبەر ئەوەی دوا کردەوەی ژیانمە ئەوا داهاتووشی نییە. لەبەر ئەمە نادیارە. ئەگەر لە مردن ڕابکەم یان تفەنگەکە چروک بکات نابێت حوکم بدەم، کە خۆکوشتنەکەم ترسنۆکانە دەرچوو؟ ئایا ئاکامەکە نیشانم نادات، کە ڕێگەی دیکەش [بۆ خۆکوشتن] هەبوو؟ مادام ئەم ڕێگەچارانە پرۆژەی منن لە کاتێکدا سەرهەڵدەدەن، کە من زیندوو بم،

خۆكوشتن ئەو بێهودەییەیە، كە ژیانم لەنێو بێهودەییدا بەرجەستەدەكات.

ئەم سەرنجانە لە تێگەیشتنمانەوە بۆ مردن سەریانهەڵنەداوە، بەڵكو لەنێو تێگەیشتنمان بۆ ژیانە؛ ئەمەش لەبەر ئەوەیە، كە بوونێ-بۆ-خۆ ئەو بوونەیە پرسیار سەبارەت بوونی دەكات؛ مادام بوونێ-بۆ-خۆ ئەو بوونەیە ڕووەو دوایی دەڕوات ئەوا مردن لە بوونی بوونێ-بۆ-خۆدا نییە. ئەی واتای چاوەڕوانیكردنی مردن چییە ئەگەر چاوەڕوانی بۆ نادیار نەبێت، كە هەموو چاوەڕوانییەكانی دیكە بێهودە دەردەخات؟

چاوەڕوانكردنی مردن خۆ-لەناوبردنە چونكە دەبێت بە ڕەتدانەوەی هەموو چاوەڕوانییەكانی دیكە. پرۆژەدانانم ڕووەو مردنێكی دیاریكراو تێگەیشتنی ئاسانە (خۆم دەكوژم، خۆم شەهیددەكەم و دەبم بە قارەمان). بەڵام پرۆژەدانانم بۆ مردنم، وەكو ئەگەرێكی نادیار دەبێت بە لەناوبردنی هەموو پرۆژەیەك. كەوابوو، مردن نابێت بە ئەگەرێكی تایبەتی؛ تەنانەت یەكێك لە ئەگەرەكانیشم نییە. لەسەرو ئەمەوە، مردن، بەو ڕادەیەی خۆی بۆ من دەردەخات، تەنیا و هەمووكاتێكیش لەناوبردنی هەموو ئەگەرەكانم نییە. لەناوبردنێكی دەرەكی ئەگەرەكانە. پرۆژەیەك نییە هەموو پرۆژەكان و خۆشی بروخێنێت. ڕوخاندنێكی مەحاڵی هەموو چاوەڕوانییەكانمە. سەركەوتنی بۆچوونی كەسانی دیكەشە بەسەر بۆچوونی من، كە بەرانبەر بوونی خۆم هەمە. ئەمەش، بێگومان، ئەوەیە ماڵرۆ باسیدەكات و دەڵێت، "مردن ژیان بەرەو چارەنوس دەبات". لەڕاستیدا، مردن لەلایەنە نەرێكەیەوە لەناوبردنی ئەگەرەكانمە. لە ڕێگەی ڕوخانی ئەو بوونێ-لەنێو-خۆیەی بوونی منەوە، كە پێی گەیشتوم، دەبم بە ئەگەرەكانم. مردن، وەكو لەناوبردنی لەناوبردن دانانی بوونمە، وەكو بوونێكی-لەنێو-خۆیە بەو جۆرەی هیگڵ دەڵێت، "ڕەتدانەوەی ڕەتدانەوە ئەرێیە". تاكو بوونێ-بۆ-خۆ لە ژیاندا بێت ڕابردووی خۆی جێدەهێڵێت و ڕووەو داهاتوو دەڕوات. ڕابردووش ئەو بوونەیە بوونێ-بۆ-خۆ پێیگەیشتووە. كاتێك ژیانی بوونێ-بۆ-خۆ دەبڕێتەوە ڕابردووەكەی لە ناوناچێت و لەنێو-خۆیدا پەنگدەخواتەوە. هەموو ژیانم ئەوەیە، كە هەیە. ئەمەش ئەو واتایە ناگەیەنێت، كە هەموویەكی هاوئاهەنگە، بەڵكو شتێكە بڕاوەتەوە، ناتوانێت بەردەوام بێت و گۆڕان بەسەرخۆیدا بە ئاگاوە دروستبكات. هەرچ ئامانجێكی هەبووبێت، وەكو خۆی دەمێنێتەوە، كە سۆفۆكلیس ژیانێكی بەختەوارانەی هەبوو، ژیانی بەلزاكیش ڕەنجدانێكی سەیروسەمەرە بوو. ئەم جۆرە بۆچوونانە زۆرتر وردەكرێنەوە و دەتوانین شیانبكەینەوە. بۆنموونە، دەتوانین باسی ژنێكی مردوو بكەین بەو شێوەیەی مۆریاك باسی یەكێك لە ژنە قارەمانەكان دەكات و دەڵێت "ژنێكی وریای بێ هیوا بوو." دەبێت لە واتای گیان لای پاسكاڵ تێبگەین "بۆنموونە ژیانی ناوەوەی"، وەكو شتێكی "تاڵ و مەزن"، كە نیتشە باسیدەكات. ئێمە دەتوانین بە شتێكی 'ترسنۆكانە' یان 'كەمزانی'

دابنێــن بەبێ ونکردنی ئەو ڕاســتییەی تەنیا لەنێو بەســتێنی "بوونە-بەردەوام-هەڵواســراوەکە"، کە بوون-بۆ-خۆیە واتای پێببەخشــین. ئەو واتایەش دەبێت بە ناوەڕۆکێکی ئەرێ و خەسڵەتێک، کە بە ڕووداو چەسپاوە. بۆچوونە جیاجیاکانیش لەســەر ژیانی پیرۆ، کە خودی پیرۆ لەســەریان کاریگەر بوو، واتاکانیان دەگۆڕا؛ هەموو باسکردنێک لەبارەی ژیانی بوون-بۆ-خۆوە و لەلایەن ئەو بوونەوە دەبێت بە پڕۆژەی خۆ لەودیو ژیانەوە. لەگەڵ گۆڕانی پڕۆژەکەشــدا، ژیانی پیرۆ دۆخ و واتا لەنێو بە کاتبوونی خۆی دەگۆڕێت. ئێســتا ئەو مردوە، یادەوەرییەکانی کەســانی دیکەیە، کە ڕێگەنادەن لەنێو پڕی بوون-لەنێو-خۆدا ڕەق و وشکببێتەوە. خەسڵەتی تایبەتی ژیانێکی مردوو لەوەدایە، کە کەسانی دیکە خۆیان دەکەن بە پارێزگاری. مەبەســت لەمەش ئەوە نییە، کە کەســانی دیکە ژیانی مردووەکە هەڵدەگرن و بە زانین هەڵیدەبەستن. هەڵبەستنەکە یەکێکە لە هەڵوێستەکانی کەسانی دیکە لەگەڵ ژیانە مردووەکەدا؛ لەم ڕووەوە خەســڵەتی "هەڵبەستنی ژیان"، (لەنێو خێزانەوە، لەســەر یادەوەری کەسوکاری مردووەکەوە و مێژووەوە) چارەنوسێکی دیاریکراوە، کە هەندێک لایەنی ژیان لەوانی دیکە دادەبڕێت. خەسڵەتە نەیارەکەش (ئەو بەشە ژیانــەی لەبیردەچێتەوە)، نوێنەرایەتی چارەنوســێکی دیاریکراوی دیکە دەکات و دەبێت بە ئاکامێکی پێویســت. بۆ ئــەوەی لەبیربچێتەوە دەبێ ببێت بە بابەت بۆ هەڵوێســتی کەســێکی دیکە و بڕیاردانەکەی. لێرەدا، لەسەر بڕیاردانی ئەو تۆ بۆ هەمیشە دەبیت بەو توخمەی لەنێو تۆپەڵێک شتدا دەتوێیتەوەو دەبیت بە (میرێکی گەورەی سەدەی ســیانزدەهەم، بورژوایەکی ســەدەی هەژدەهەم، فەرمانبەرێکی ســۆڤیەت و هتد)؛ بە هیچ شــێوەیەک لەناوناچێت، بەڵام بۆ ئەوەی لەنێو ئەواندا پێکبێت، پێویســتە بوونی تاکە کەســی خۆت ونبکەیت. ئەمــەش ئەوخاڵەمان بۆدەردەخات، کە نیازی سەلماندنیمان هەبوو: کەسەکەی دیکە بەبێ پەیوەندی من بە مردووەوە ناتوانێت بڕیاربدات. لەڕاســتیدا پەیوەندی بە مردووەوە-و بە هەموو مردووەکانەوە-بونیادێکی بنەڕەتی پەیوەندییە بنەڕەتییەکەیە، کە ئێمە بە "بوون-بۆ-کەســانی دیکە" ناوزەدمانکرد. لەم سەرهەڵدانەدا بوون-بۆ-خۆ پەیوەندییەکەی لەگەڵ مردووەکەدا دیاریدەکات. پڕۆژە سەرەتایەکەی ئەوان لەنێو تۆپەڵەیەکی ڕەق و وشکی لەیەکچودا یان تاکە کەسە جیاوازەکان ڕیزدەکات. دووری و نزیکی خۆی دیاریدەکات؛ دووری و نزیکییەکە بەگوێرەی شــوێن و کات دەپێورێت. لە ڕوانگەی کۆتایی پڕۆژەکانییەوە دەیانبینێت. بێزەنتییەکان، ڕۆم، ئەسینا، خاچهەڵگرەکانی دووەم، کۆبوونەوەکە و گۆڕستانی شارە کۆنەکان لە دوورەوە یان نزیکەوە دەبینم. بە دۆزینەوەی پەیوەندی هۆکارەکان و سەرنجدانێکی ورد، لەو هەڵوێستەوە وەریدەگرم و لە بوونی خۆمەوە لێیان تێدەگەم. پێناسکردنی مرۆڤێک بە مردنەکەی (بەمەرجێک ئەو خەسڵەتە بناسین) کارێکی مەحاڵ نییە (بۆنموونە بەو شوێنانەی لەنێو کۆمەڵدا

داگیریکـــردوە، ئەو ڕێگایانەی گرتونییەتەبەر، بـــەو زانیارییانەی بڕیارەکانی خۆی لەسەر داوە و بەو ڕەنگانەی لەوێ دایکوتاون) پێناسیدەکەتن.

بێگومان، مردووەکان ئێمە هەڵدەبژێرن، بەڵام پێویســـتە ئێمە لەپێشدا ئەوان هەڵبژێریـــن. لێرەدا پەیوەندی نێـــوان فاکتۆر و سەربەســـتی دەدۆزێتەوە: ئێمە هەڵوێســـتمان لەئاســـتی مـــردووەکان هەڵدەبژێرین، بەڵام ناکرێت هەڵوێســـتێک هەڵنەبژێرین. گوێنەدان بە مردوویەک دەگونجێت (نموونەی ئەمەش لەنێو ئاوارە، جۆرێک لە شۆڕشگێر و خۆپەرستەکاندا پەیدابکرێت). گوێنەدانیش، کە مردووەکە جارێکی دیکە دەمرێنێت، یەکێکە لە هەڵوێســـتەکان. لە ڕوانگەی بە فاکتۆربوونی بوون-بۆ-خۆوە ئەم بوونە بەرانبەر مردوو فرێدەدرێتە نێو 'لێپرسینەوە'؛ ئەو دەبێت سەربەستانە بڕیار لەسەر چارەنوســـی مردووەکە بدات. بەتایبەتی، ئەو مردووەی لـــە ئێمـــەوە نزیکە. مەحاڵە دیار و نادیار بڕیاری بۆ نەدەین. ئەمەش ئاشـــکرا لە هەڵوێســـتی ئەو کوڕەدا دەردەکەوێت، کە پاش مردنی باوکی دەبێت بازرگانییەکە بەڕێوەبەرێت یان ئەو خوێندکارەی لە جێگەی مامۆستاکەی وانەکان دەڵێتەوە. لە نێو هەندێک بارودۆخدا پەیوەندییەکە کەمتر دەبینرێت، بەڵام لەوانیشدا مردوەکە و مرۆڤە زیندووەکە سەر بە یەک کۆمەڵەی مێژوویی و کۆنکرێتین. من و هاوتەمەنەکانم بریاردەدەیـــن بەردەوامی بە هەوڵدانە ڕامیـــاری و کۆمەڵایەتییەکانی پێش خۆمان بدەین یان بیانگۆڕین. وەکو بینیمان، ئەمەریکای ١٩١٧ بڕیاری لەسەر واتاو بەهای کردەوەکانی (لا فایەت)یدا.

لەم بۆچوونەوە ئاشـــکرا جیاوازی نێوان ژیان و مـــردن دەبینرێت: ژیان خۆی بڕیار لەســـەر واتاکەی دەدات چونکە هەمیشە لە ئەگەر و نەگەردایە؛ دەستەڵاتی ڕەخنەلەخۆگرتـــن و دۆخگۆڕینـــی هەیە. ئەمـــەش ژیان، وەکو "ئەوەی هێشـــتا پەیدانەبـــووە" یان گۆڕانی تێدا ڕوودەدات، پێناســـدەکات. ژیانـــی مردوو گۆڕانی بەسەردا نایەت و ئەو شتێکی پڕ و تەواوە. لە گۆڕانەکانیش بەرپرس نییە.

شـــێوەگۆڕینێکی ڕادیکاڵانەی هەیە، کە هیچ شتێک لە ناوەوەیدا ڕوونادات؛ لە هەموو لاکانەوە داخراوە؛ هیچ شـــتێک ناچێتە نێوی، بەڵام واتاکەی لە دەرەوەیدا دەستکاری دەکرێت. تاکو ئەو ڕۆژەی ئەم پێخەمبەری ئاشتییە دەمرێت خۆی واتای پڕۆژەکەی دادەنێت، "تاکو لێرە بم جەنگ ڕوونادات".

بەڵام واتاکە سنوری تاکە کەسێکی سادە دەبڕێت، بەو ڕادەیەش ئەو کەسە لەسەر هەڵوێستەکەی (ئاشـــتی بۆ ئەوروپا) خۆی دەناسێت، مردنیش دەبێت بە نوێنەری لێســـەندنەوەیەکی تەواو؛ کەسانی دیکە واتای هەوڵدانەکان لە پێخەمبەری ئاشتی دەســـەنن و ئەویش خۆی وەکو سەرکەوتو یان سەرنەکەوتو دەبینێت. مردن لەنێو ژیانماندا ئێمە بۆ بەرژەوەندی کەســـانی دیکە نامۆدەکات. کەسێکی مردوو نێچیری مرۆڤە زیندووەکانە. ئەو کەسەی دەیەوێت واتای مردنی لە داهاتوودا بدۆزێتەوە خۆی

دەکات بە نێچیر بۆ کەســانی دیکە. لێرەدا جۆرێک لە نامۆیی سەرهەڵدەدات، کە لە بەشەکەمان لەسەر بوونـ بۆـ خۆ باسماننەکرد. دەکرا نامۆییەکانی ئەو بەشە لە ڕێگەی بەرزدانانی بەرزێتی کەسانی دیکەوە لەناوببرێن. ئەمەش، وەکو لەناوبردنی لایەنی دەرەکییمان بە ناوەکیکردنی سەربەستییەکەمان وایە. مادام زیندووم دەتوانم لەو بوونەم ڕابکەم، کە بۆ کەسانی دیکەیە. سەربەستانە خۆم تێدەگەیەنم، کە من هیچ نیم و دەبم بەوەی خۆم دەمەوێت. مادام زیندووم دەتوانم درۆ لەگەڵ کەسانی دیکــە بکەم، بەرەوکۆتایی جیاواز بڕۆم و دەربیخەم، کە بوونـ بۆـ خۆم و بوونـ بۆـ ئەوان بە هەمانپێوانە بەراوردناکرێن. لەم ڕووەوە، من بەردەوام لەدەســت دەرەوەم ڕادەکەم و بەردەوامیش کەسانی دیکە دەمدۆزنەوە؛ لەم جەنگە دوولایەنییەدا هیچ کام لەو دوو شێوازی بوونە سەرکەوتوو نابێت. بەڵام مردن بەبێ ئەوەی لایەنگری یەکێک لەم لایەنانە بکات ســەرکەوتنەکە دەبەخشــێت بەکەســانی دیکە. مردن، لێرەدا، ئەو واتایەی هەیە، کە گرنگ نییە تۆ لە ژیاندا لە چەند جەنگدا سەرکەوتوو بووبیت، تەنانەت کەسانی دیکە پەیکەریشت بۆ بکەن، ئەوەیە تۆ لەڕێگەی کەسانی دیکەوە هەبیت و ئەوان واتا بۆ تۆ و سەرکەوتنەکانت دادەنێن.

ئەگــەر شــوێن بۆچوونەکانی ڕیالیســتێک بکەوین، کە لە کەرتی ســێیەمدا باســمانکردن، پێویســتە دان بەوەدا بنێین، کە بوونم دوای مردن ئاســەوارێکی تەماوی (نێــو ئاگامەندی کەســانی دیکــە) لەشــێوەی (وێنە و یادەوەرییەکاندا) نییە. بوونمـ بۆـ کەسانی دیکە ڕاســتەقینەیە. ئەگەر، وەکو چاکەتە بەجێماوەکەم لەبەردەستی ئەودا بێت ئەوە هۆکەی بۆ ڕەهەندی ڕاستەقینەی بوونم دەگەڕێتەوە. ئەو ڕەهەندەی تایبەتمەندێتی منی تێدایە. ڕیچالی، لویسی پانزەهەم، باپیرم کۆی وێنە و بیرۆکەکانی نێو یادەوەریم نین. ئەوان بوونێکی دەرەکی و ڕاســتەقینەیان هەیە، کە بەتەواوی بوون بە شتێکی دەرەکی. بەردەوامیش لەنێو مێژووی جیهاندا دەمێننــەوە. بەڵام بێجگە لە بەرزێتییەکی بەرزێتی لەنێو شــتەکانی جیهاندا چی دیکــە نین. کەوابوو، مــردن تەنیا لە چاوەڕوانییەکانم بێبەریــم ناکات، بەڵکو لە دەرەوەدا واتا بەو لایەنە ناوەکییەی من دەبەخشێت، کە تیایدا ژیاوم. مردن هەموو واتا ناوەکییەکان ڕەتدەداتەوە و دەیانکات بە دەرەکی و لە بەردەســتی کەســانی دیکەدا دایاندەنێت. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم چارەنوسەی ژیانم لە ئەگەر و نەگەردایە وەڵامی ئەو پرســیارەی، "ئایا چارەنوسی ئاشــکرا و مێژوویی ڕۆبسپیەر چییە؟" دەکەوێتە سەر وەڵامی ئەو پرسیارە، کە "ئایا میژوو واتای هەیە؟ " یان "ئایا مێژوو تەواو دەبێت یان تەنیا لەناودەچێت؟" هێشتا وەڵامی ئەم پرسیارانەم نەداوەتەوە. هەڵبەتە، وەڵامیشی نادرێتەوە چونکە هەموو وەڵامەکان (تەنانەت وەڵامی ئایدیالیزم، کە دەڵێت: "مێژووی میسر مێژووی میسرناسییە." مێژوویین.

لەگــەڵ ئەوبــاوەڕەدا، کە مردنم لەنێــو ژیانمدا دەردەکەوێت، ئــەوا نابێت بە

بەرگرتنێکی ڕووتی خۆیەتییەکەم؛ بۆ ئەو جۆرە بەرگرتنە لەبەر ئەوەی ڕووداوێکی ناوەوەی خۆیە دەبێت تەنیا پەیوەندی بە خۆیەتییەوە هەبێت. ئەگەر دۆگمای ڕیالیزم لە دانانی مردن بە حالەتی مردن دروست نەبێت، بۆنموونە بەرزێتی بۆ ژیان نەبێت، ئەو مردنەی من توشی دەبم و دەبێت بە مردنی من شتێکی دیکەش بێجگە لە من بە خۆیەوە دەبەستێت. لەسەر ئەو ڕاستییەی، کە لەناوبەری هەموو ئەگەرەکانمە لە دەرەوەی ئەگەرەکانم ڕادەوەستێت. کەوابوو، من ناتوانم چاوەڕێی بکەم؛ بەو جۆرەی ڕوو لە ئەگەرەکانم دەکەم ناتوانم ڕوو لە مردن بکەم. مردن بەشێک لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆ نییە. مادام سەرکەوتنی کەسانی دیکەیە بەسەر مندا، ئەوا ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە دەکات، کە بنەڕەتییە، بەڵام بەتەواویش هەڵکەوتە و پەیواندی بە بوونی کەسانی دیکەوە هەیە. ئەگەر کەسانی دیکە نەبوونایە ئێمە مردنمان نەدەناسی؛ لەلای ئێمە دەرنەدەکەوت و تەنانەت نەماندەکرد بە دۆخگۆڕینی بوونمـــان بەرەو چارەنوس؛ دەبوو بـــە ونبوونێکی کتوپڕی بوون-بۆ-خۆ و جیهان، خۆیەتی و بابەتی هەموو واتاکان. ئەگەر مردن تاکو ڕادەیەک دۆخگۆڕینی واتاکانی من بێت، واتاکان خۆیان بە قەرزداری بوونی کەسانی دیکە دەبینرێن. لەبەر بوونی کەسانی دیکەیە مردنم، وەکو فاکتۆرێکی خۆیەتی من فرێدەداتە دەرەوەی جیهان. هەروەهـــا لەناوچوونی ئاگامەندی و جیهانیش پێکەوە نییە. لێرەدا خەســـڵەتێکی بنەڕەتی ئەو فاکتـــۆرە خۆی دەردەخات، کە نکۆڵی لێناکرێت. ئەویش هەڵکەوتی ڕادیکاڵانەیە لە مردن و بوونی کەســـانی دیکەدا دەدۆزرێتەوە. ئەم هەڵکەوتە مردن دەخاتە دەرەوەی دەسەڵاتی بیرۆکە ئۆنتۆلۆجییەکان. بیرکردنەوەش لە ژیان لەبەر ڕۆشنایی مردندا، وەکو بیرکردنەوە لە خۆیەکی من لە ڕوانگەی کەسانی دیکەوەیە. ئێمە بینیمان ئەم کارەش مەحاڵ نییە.

ئێمە دژی بۆچوونەکەی هایدیگـــەر بەو ئاکامە دەگەین، کە مردن دوور لەوەی ئەگەرێکـــی تایبەتی من بێت، فاکتۆرێکی هەڵکەوتووە، کـــە لە من ڕادەکات و لە بنەڕەتیشدا سەر بە فاکتۆری بوونمە. نە دەتوانم مردنم بدۆزمەوە نە چاوەڕوانیش بم. ئەو شـــتەیە خۆی بە نەناســـراوی دەهێڵێتـــەوە و هەمـــوو چاوەڕوانییەکان پوچەڵدەکاتەوە. هەموو هەڵوێستەکان چەقوەستاو لە دەرەوەی خۆیەتیدا ڕادەگرێت و کەســـانی دیکەش واتایان پێدەبەخشـــن. مردن، وەکـــو لەدایکبوون فاکتۆرێکی ڕووتە؛ لە دەرەوە بەرەو بوونی ئێمە دێت و ئێمەش دەکات بە شـــتێکی دەرەکی. لەڕاستیدا، مردن لە لەدایکبوون جیا نییە. ناسنامەی لەدایکبوون و مردنیشە ئێمە بە فاکتۆر ناوزەدیدەکەین.

ئایا ئەمە ئەو واتایە دەبەخشێت، کە مردن سەربەستییەکەمان سنوردار دەکات؟ ئایا وازهێنانمان لە بوون-بەرەو-مردنی هایدیگەر بۆ هەمیشـــە ئێمە لە هەڵوێستی سەربەســـتانە و دانانی واتا بۆ ئەو بوونەی بەرانبەری بەرپرسین دوور دەخاتەوە؟

بەپێچەوانەوە، مردن لەگەڵ خۆدەرخستنی بۆ ئێمە، بەو جۆرەی هەیە، ئێمە لە سنورەکان ڕزگاردەکات. ئەم خاڵەش بەسەرنجدانێکی قوڵ باشتر ڕووندەبێتەوە.

یەکەم، پێویستە ڕادیکالانە دوو بیرۆکەکەی مردن و بڕانەوە لە یەکدی جیابکەینەوە. بەگشتی، وا زانراوە، کە مردن بڕانەوەی بوونمان پێکدەهێنێت و بە ئێمەی دەناسێنێت. لەم بۆچوونەوە بەو خاڵە گەیشتوین، کە مردن دەبێت بە پێویستییەکی ئۆنتۆلۆجی و بڕانەوەش لەوەوە پەیدا دەبێت و دەبێت بە خەسڵەتێکی هەڵکەوتو. هایدیگەر بیردۆزەی بوونی-بەرەو-مردن لەسەر دانانی ئەم دوو بیرۆکەیە بە یەک شت داناوە. بەهەمانشێوە، کاتێک مالرۆ دەڵێت، مردن تایبەتمەندێتی ژیانمان پێدەناسێت، مەبەستی ئەوەیە، کە مادام دەبێت بمرین ئەوا خۆمان بێدەسەلات دەدۆزینەوە و دەبین بە هەبوویەکی بڕاوە. سەرنجدانێکی وردی ئەم بۆچوونانە نادروستییەکەیان دەردەخات: مردن فاکتۆرێکی هەڵکەوتوە و سەر بە فاکتۆری بوونە؛ بڕانەوە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون-بۆ-خۆیە، کە سەربەستی سنورداردەکات و تەنیا لەنێو پرۆژە سەربەستیەکانمدا ڕووەو کۆتایی سەرهەڵدەدات، کە واتا بەو بوونم دەبەخشن. بە واتایەکی دیکە، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی نەمریش بێت هەر بڕاوەیە چونکە بە هەڵبژاردنی خۆی، وەکو مرۆڤ دەبێت بە بوونێکی بڕاوە. بوونێکی بڕاوە ئەو بوونەیە، کە خۆی هەڵدەبژێرێت؛ بە پرۆژەکانی بەبێ کەسانی دیکە بوونی خۆی دەناسێت. سەربەستی، کەوابوو، دروستکردنی بڕانەوەیە. ئەگەر من خۆم دروستبکەم ئەوا دەبم بە بوونێکی بڕاوە و ژیانیشم دەبێت بە تایبەت. لە ئاکامدا، ئەگەر نەمریش بم، نەمرییەکەم ڕێگە نادات "سەکتەی مێشکم" بوەستێنم. ئەوەی ڕێگری منە نەگەڕانەوەی کاتە، کە خەسڵەتێکی تایبەتی سەربەستییەکەمە. هەڵبەتە، ئەگەر نەمر بم دەتوانم ئەگەری (با) ڕەتبکەم و خۆم بە ئەگەری (ئەلف) بگەیەنم و دوایی هەلێکم بۆ هەڵکەوێت بەرەو ئەگەری (با) بڕۆم. بەڵام ئەو هەلە دوای ڕەتکردنەکە ڕوودەدات و هەرگیز، وەکو ئەگەرەکەی پێشو دەرناچێت. لێرەدا، بۆ هەمیشە لەگەڵ ڕەتدانەوەی ئەگەری یەکەمدا بێ گەڕانەوە خۆم دەکەم بە بوونێکی بڕاوە.

لەم بۆچوونەوە، مرۆڤی نەمر، وەکو مرۆڤی بمر چەند جارێک لەدایک دەبێت، بەڵام یەکجار خۆی دروستدەکات. ئەگەر کەسێک لەنێو کاتیشدا نەبڕاوە بێت، هێشتا لە بوونیدا بڕاوەیە چونکە تایبەتمەندێتی خۆی دروستدەکات. مردن هیچ پەیوەندییەکی بەم بڕانەوەیەوە نییە. مردن لەنێو کاتدا ڕوودەدات و ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیش بە دەرخستنی بڕاونەوە تایبەتمەندەکەی لەناوچوونی خۆی نادۆزێتەوە. کەوابوو، مردن بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونم نییە. بەتایبەتی ئەگەر بوونم بوون-بۆ-خۆ بێت؛ ئەوەی دەمرێت کەسێکی دیکەیە. لەنێو بوون-بۆ-خۆدا جێگەی مردن نابێتەوە؛ بوون-بۆ-خۆ چاوەڕوانی مردن ناکات و نایناسێ و نایکات بە پرۆژە بۆ بوونی. ئایا مردن

چییه؟ مردن بێجگه لەلایەکی دیاریکراوی فاکتۆر و بوون-بۆ-کەسانی دیکە چی دی نییە. بێهودەیە ئێمە لەدایکبووین؟ مردنیشـــمان بێهودەیە. لەلایەکی دیکەوە، ئەم بێهودەیییە بووە بە نامۆبوونێکی هەمیشـــەیی بوونم بۆ ئەگەرەکان، کە لەوە زۆرتر نابن بە ئەگەری من و دەچنە لای کەســـانی دیکە. لەم تێڕوانینەوە، مردن سنوری دەرەکی و فاکتۆری خۆیەتی منە!

ئایا لە ڕوونکردنەوەی بەشـــەکانی پێشوی ئەم نوسراوە تێدەگەین؟ ئەم سنورە فاکتۆرییە پێویســـتی بە سەلماندن هەیە چونکە هیچ شتێک لە دەرەوە نایەتە نێو ئێمەوە. هەروەها ئەزمونی مردنمان شـــتێکی پێویســـتە. فاکتۆرەکەش ڕوبەڕووی بوون-بۆ-خۆ نابێتەوە و تەنیا لە بوونی ئەودا-بۆ-کەســـانی دیکەدایە. ئەم سنورە بێجگە لە شتێکی نەناسراو دەبێ چی بێت؟ ئەگەر تێهەڵکێشەی لایەنی وەرچەرخاوی ئێمە نەبێت ئەی چییە؟ بوونی مەرگداری من بوونم دەخاتە بەردەســـتی کەسانی دیکە؛ مردن واتای داهاتووی بوونم بۆ کەسانی دیکە ئامادەدەکات. کەوابوو، مامەڵە لەگەڵ سنورێکی هەمیشەیی پڕۆژەکانم دەکەم؛ ئەو سنورەش دەبێت بناسرێت.

ئـــەو لایەنە دەرەکییەیە لە دەرەوە دەمێنێتەوە و ئەو نەناســـراوەیە، کە دەبێ بناســـرێت. لە بنەڕەتەوە جیاوازی لەنێوان هەڵبژاردنی سەربەستی بۆ مردن، وەکو سنورێکی نەناسراوی خۆیەتی و ئەو هەڵبژاردنەی دەیەوێت ببێت بە سەربەستییەک، کە سەربەســـتی کەسانی دیکە ســـنورداری دەکات، نییە. بەگوێرەی پێناسەکەی پێشـــومان، مردن ئەگەری بوونم نییە؛ هەڵوێستێکی-سنوردارە. نابێت بە ئەگەرم چونکـــە من نایکەم بە کۆتایی بوونم، بەڵکو پێویســـتییەکە ناتوانێت خۆیەتی لێ دووربخەیتەوە و دەبێت بە "دوا" ڕووداو و خۆی دەهاوێتە ناوەوە.

مـــردن دەبێت بە دێوەزمەی هەمـــوو پڕۆژەیەکـــم و هەڵیاندەگێڕێتەوە. بەڵام هەڵگەڕانەوەکە ئەگەری بوونم نییە. سەربەستییەکەم، کە سەربەستی منە بە پڕی و نەبڕاوە دەمێنێتەوە. مردن نابێت بە ڕێگری پڕۆژەکانم؛ بەڵکو چارەنوسی پڕۆژەکانم دەکەونە شـــوێنێکی دیکە. هۆی ئەمەش ئەوە نییە، کە مردن سەربەســـتییەکەم سنوردارناکات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە سەربەستی ڕووبەڕووی ئەو سنورە نابێتەوە. من لە مردندا سەربەست نیم، بەڵام مەرگدارێکی سەربەستم. مادام مردن لە دەست پڕۆژەکانم ڕادەکات چونکە نەناســـراوە، منیش لە پڕۆژەی بوونمدا لە دەست مردن ڕادەکەم. مادام مردن هەمیشە لەودیو خۆیەتی منەوەیە ئەوا ناکەوێتە نێو خۆیەتی منـــەوە. کەوابوو، بیر لە مردن ناکەینەوە و چاوەڕێشـــی نابین و خۆشـــمان دژی بێ چەک ناکەین؛ پڕۆژەکانیشـــمان سەربەخۆن و پشـــت بە مردن نابەستن، نەک لەبەر ئەوەی لە ئاســـتی مردندا کوێرین، بەوجۆرەی مەسیحییەکان دەڵێن، بەڵکو لەبەر بیروباوەڕمانە. هەڵبەتە هەڵوێســـتی جۆراوجۆریش لەبەردەمیدا دەنوێنین و دەمانەوێت بیناسین، بەڵام هیچ کامیان بە ڕەسەن و ناڕەسەن دانانرێت چونکە ئێمە

بە سەوداگەرییەوە دەمرین. باسکردمەکەمان لەسەر شوێن، ڕابردوو، ژینگە، مردن و هاوڕێکانم درێژخایەن نییە. مەبەستیشمان لە باسکردنیان بۆ ڕوونکردنەوەی واتای هەڵوێســـت بوو. لەبەر ڕۆشنایی ئەم باسکردنە پێناسەیەکی تەواوی "بوون-لەنێو هەڵوێست" دەکەین، کە بوون-بۆ-خۆ لەئاستی ڕەفتارەکانی، بەبێ ئەوەی ببێت بە بناخەی بوونی خۆی، بەرپرسدادەنێت.

یەکـــەم، من هەبوویەکـــم لەنێو هەبووەکانی دیکەدا. بـــەڵام ئەم بوونەم لەنێو کەســـانی دیکەدا ناناســـمەوە؛ من بابەتەکانی دەوروبەرم، وەکو هەبوون و بوونی خۆشـــم، وەکو هەبوویەکی دەورەدراو نابینم. تەنانەت لـــە واتای "لەنێوان" بەبێ هەڵبژاردنی بوونم تێناگەم. هەڵبژاردنی ئەم کۆتاییە هەڵبژاردنی ئەو شـــتەیە، کە هێشـــتا پەیدانەبوە. بوونیشم لەنێوان شـــتەکانی جیهاندا لەسەر ئەو پەیوەندییە پێناســـدەکرێت، کە لەنێوان سودبەخشێتی ئامێرەکاندا هەیە یان دژ بە شیکردنی ڕاستەقینەکان لەدەوەری من و فاکتۆری بوونمدا دەدۆزرێتەوە؛ ئەویش دۆزینەوەی مەترسییەکانە، کە ڕوو لە من دەکەن، دەبن بە ڕێگر و ئەو هاوکارییانەی پێویستیم پێیانە. هەموو لەبەر ڕۆشـــنایی لەناوچوونـــە ڕادیکاڵییەکەی خۆمدا و ڕەتدانەوەی ناوەکی بەرانبەر بوون-لەنێو-خۆدا لە ڕەوتە سەربەســـتانەکە بەرەو ئەو کۆتاییەی دانراوە کاریان تێدەکرێت. ئەمەیە واتای هەڵوێست دەبەخشێت.

دووەم، هەڵوێســـت تەنیا لەگەڵ ڕەتکردنی شتە دراوەکان بەرەو کۆتایی هەیە. ئەو شـــێوازەیە شـــتە دراوەکە، کە منە و ئەوەشـــە، کە من نییە بۆ بوون-بۆ-خۆ ئاشـــکرا دەبێت و بوونی من لەشێوازی شتێکی نەبوودا دەردەخات. کاتێک باسی هەڵوێســـت دەکەین لەو "جێگرتنە ناســـراوە لەلایەن بوون-بۆ-خۆوە دەدوێین، کە لەنێو هەڵوێستدایە." مەحاڵە هەڵوێست لەدەرەوەدا بیری لێبکرێتەوە؛ لە شێوازێکی ناوەکیـــدا لەنێو خۆیدا چەســـپاوە. لەبەر ئەمە، هەڵوێســـت نە بـــە بابەتی نە بە خۆیی دادەنرێت، هەرچەندە بە شتێکی ئەم بونیادە (لێوانەکەی بۆ ئاو خواردنەوە بەکاریدەهێنـــم، مێزەکەی خۆم بەســـەریداداوە و هتد) بابەتیـــن و لە دەرەوەدان. هەڵوێســـت خۆیەتیش نییە چونکە یەکێتی نێوان جێنیشانەکان نییە، کە شتەکان لەســـەر مێشـــکی ئێمە جێیان دەهێڵن، بەڵکو خودی شـــتەکانە و بوونی منیشە لەنێویاندا. ســـەرهەڵدانی بوونم لەنێو جیهانـــدا، وەکو لەناوچوونێکی ڕووتی بوون هیچ ئاکامێکی دیکەی بێجگە لە هۆکار بۆ بوونی شـــتەکان نییە و هیچیش ناخاتە ســـەریان. لەم ڕووەوە، هەڵوێســـت خیانەت لە فاکتۆری بوونم دەکات؛ شـــتەکان لەوێدا بەبێ پێویستی و گونجاندنی بوون هەن و منیش لەنێویاندا سەرهەڵدەدەم. هەڵوێست بەو واتایەش، کە شتێکی دراوی ڕووت نییە نابێت بە دەرەکی و (خۆ) لەدەرەوەی ئەودا ناوەڕۆکەکەی پێکناهێنێت. لەڕاســـتیدا هەڵوێست واتا بە هەموو شتێکی دراو دەبەخشێت و ئاماژە بۆ سەربەستی بوون-بۆ-خۆ دەکات.

ئەگەر هەڵوێست ناوەکی یان دەرەکی نەبێت لەبەر ئەوەیە، کە زانین پێکناهێنێت یان حاڵەتی جیهان بە خۆ ناناسێنێت. هەڵوێست پەیوەندی بوونە لەنێوان بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆدا، کە بوون-بۆ-خۆ لەناویدەبات. هەڵوێست هەمووی خۆیە (خۆ بێجگە لە هەڵوێستەکەی هیچی دی نییە) و هەمووی شتیشە (هیچ شتێک بێجگە لە شتەکان نییە). هەڵوێست ئەو خۆیەیە شتەکان بە تێپەڕکردنیان ڕۆشندەکات. ئەگەر حەزیش بکەین دەڵێین، ئەو شتانەن ئاماژە بۆ وێنەی نێو ئەندێشەی خۆ دەکەن. هەمووی فاکتۆرە، هەڵکەوتنی ڕەهای جیهانە، لەدایکبوونمە، شوێن، ڕابردوو، ژینگە و فاکتۆری بوونی هاوڕێکانمە. سەربەستییەکەمە بەبێسنور و لەوێدا فاکتۆر بۆ من دروستدەکات. بەرزایی و تۆزی ئەو ڕێگەیەیە، تینوێتییەکەم و ڕازینەبوونی ئەو خەڵکەیە بۆ ئاو خواردنەوەکەم چونکە پارەم پێ نییە بیاندەمێ یان من هاوولاتی ولاتەکەی ئەوان یان سەر بە ڕەگەزیان نیم؛ بە جێمانم لەنێو ئەو خەڵکە دڵڕەقەدا و بەو ماندووییەوە، کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەم دەبن بە ڕێگر هەڵوێستە. هەروەها، ئامانجەکەشم هەڵوێستە نەک بە تەنیا لەبەر ئەوەی من پێکیدەهێنم بەڵکو لەبەر ئەوەی لە هەموو شوێنێکدایە و لە دەوروبەرم هەموو فاکتۆرەکان کۆدەکاتەوە و ڕوونیان دەکاتەوە.

سێیەم، ئەگەر بوون-بۆ-خۆ بێجگە لە هەڵوێست چی دیکە نەبێت، ئەوا بوون- لەنێو-هەڵوێست ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەسەر بوونی-لەوێدا و بوونی-لەودیوەوە پێناسەدەکات. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی هەمیشە لەودیو (بوون-لەوێدا) یە. هەڵوێست هەمووگیری بوون-لەوێدایە، کە لەسەر ڕاڤەکردن و ژیان لە بوون-لەودیوەوە دەناسرێت. کەوابوو، هیچ هەڵوێستێک نییە مافی تایبەتی هەبێت. مەبەستمان لەم خاڵەش ئەوەیە، کە هیچ هەڵوێستێک نییە لەژێرەوەیدا شتە دراوەکە سەربەستییەکەی پەیدایدەکات لەناوبەرێت. بەپێچەوانەشەوە هەڵوێستێک نییە، کە تیایدا بوون-بۆ-خۆ زۆرتر لە کەسانی دیکە سەربەست بێت. ئەمەش ئەو سەربەستییە ناوەکییە ناگرێتەوە برگسۆن باسیدەکات و پۆلیتزار لە (کۆتایی خۆپیشاندانی فەلسەفە)دا گاڵتەی پێدەکات یان بڕواکردن بە سەربەخۆیی ژیانی ناوەوەی کۆیلە و دڵ لەنێو زنجیردا نییە. کاتێک دەڵێین کۆیلەی زنجیرکراو وەکو خاوەنەکەی بوونێکی سەربەستی هەیە، لەو سەربەستییە نادوێین، کە نادیارە. کۆیلە زنجیرکراوەکە لە ئاستی پچڕاندنی زنجیرەکەدا سەربەستە؛ واتای زنجیرەکەی لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکەیدا دەردەکەوێت، کە خۆی بڕیاری لەسەردەدات: بە کۆیلەیی بمێنێتەوە یان ژیانی بخاتە نێو مەترسییەوە و کۆیلایەتی لەناوبەرێت. هەڵبەتە، کۆیلە ناتوانێت سامان و شێوازی ژیانی خاوەن کۆیلەی دەستبکەوێت؛ بەڵام ئەمانە ئامانجی پرۆژەکەی نین؛ ئەو تەنیا خەویان پێوە دەبینێت. فاکتۆری کۆیلەکە ئەوە نیشاندەدات، کە جیهان بۆ ئەو ڕوخسارێکی دیکەی هەیە و دەبێت کۆمەڵێ کێشە

چارەسەربکات؛ بەتایبەتی پێویستە لەنێو بەستێنی کۆیلایەتیدا خۆی هەڵبژێرێت و واتا بە ڕێگرە نادیارەکان ببەخشێت. ئەگەر ئەو هەڵوێستی شۆڕشگێرانە هەڵبژێرێت ئەوا کۆیلایەتی، کە لە ســـەرەتاوە ڕێگربوو، واتاکەی خـــۆی و کاریگەرێتییەکەی بەســـەر لایەنە نەیارەکەیەوە تەنیا لەنێو شۆڕشدا بەرجەســـتەدەکات. بۆ ئەوەی هەبێـــت و دادوەربێت ئەوەیە، کە ژیان بۆ کۆیلە، ئەو کۆیلەیەی شۆڕشـــدەکات و لەپێناویـــدا دەمرێت دەبێت ببێت بە ژیانێکی سەربەســـتانە. دادوەریش لەوەدایە، کە هەڵوێستەکەی ببێت بە پڕۆژەیەکی سەربەست، پڕ و کۆنکرێتی و ئامانجەکانی ژیان وەدەستبهێنێت. بەو خاڵەمان بگەیەنێت، کە باری ژیانی کۆیلە و خاوەنەکەی بەراورد ناکرێن. هەر یەکێک لە ئەوان، وەکو بوون-بۆ-خۆ لەنێو هەڵوێســـتیدا و لە هەڵبژاردنی سەربەستانەی پڕۆژەکانیان لە واتا تێدەگەن. کەسی سێیەم دەتوانێت بەراوردەکـــە بکات و لـــەم ڕووەوە، بەراوردکردنەکە لەنێـــوان دوو بابەتدا و لەنێو جیهاندا ســـەرهەڵدەدات؛ بێجگە لەمە، لەبەر ڕۆشنایی هەڵبژاردنی سەربەستانەی پڕۆژەی کەسی سێیەمدا دادەمەزرێت. هیچ بۆچوونێکی ڕەها نادۆزینەوە، کە بتوانین هەڵوێستە جیاوازەکانی لەسەر بەراوردبکەین؛ هەرتاکەش یەک هەڵوێست دەناسێت ئەویش هەڵوێستی خۆیەتی.

چوارەم، مادام هەڵوێســـت لەبەر ڕۆشنایی کۆتاییەکانیدا دەبینرێت و ئەوانیش لەسەر زەمینەی بوون-لەوێدا، وەکو پڕۆژە دانراون ئەوا ئامادەبوونیان کۆنکرێتییە. هەڵبەتە جۆریک لە بونیادی هەمەکی ڕووتکراوەیان هەیە، بەڵام تاکە ڕوخساریکی هەیـــە، کە جیهان لە ڕووی ئێمـــەدا دایدەنێت و دەبێت بە ڕێکەوتنی ئێمە. لێرەدا نموونەی چیرۆکێکی کافکا دەهێنینەوە: بازرگانێک دێتە قەڵاکە تاکو کێشـــەکەی بخاتەڕوو. پاســـەوانێک ڕێگەی چوونە ژوورەوەی نادات. بازرگانەکە ناتوانێت لەوە زۆرتر بڕوا: لەوێدا دەوەســـتێت و بە چاوەڕوانییەوە دەمرێت. لە ســـەرەمەرگا بە پاسەوانەکە دەڵێت، "بۆچی من تاکە کەسێک بووم چاوەڕێمکرد؟" پاسەوانەکەش وەڵام دەداتەوە و دەڵێت، "چونکە ئەم دەروازەیە تەنیا بۆ تۆ دروستکراوە." ئەمە حاڵەتـــی بوون-بۆ-خۆیە و هەر تاکە دەروازەی خۆی هەیە. خەســـڵەتی کۆنکرێتی هەڵوێســـت لەوەدایە، کە بوون-بۆ-خۆ هەرگیز ڕوو لـــە کۆتایەک ناکات ڕووتکراوە و هەمەکی بێت. بێگومان، لە بەشـــی دواییدا ڕوونیدەکەینەوە چۆن واتای تەواوی هەڵبـــژاردن هەمەکییە و لە ئاکامی ئەمەشـــدا بوون-بۆ-خۆ، وەکو جۆر دەبێت بە ســـەرچاوەی ڕاتەقینەی مرۆڤایەتی. پێویستە واتا شـــاراوەکانیش ئاشکرا بکەین. بۆ ئەم مەبەســـتەش سایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی بەکاردەهێنین. لەگەڵ ئاشـــکراکردنەکەدا واتـــای بوون-بۆ-خـــۆ دەردەکەویت، کە بۆ بەرجەســـتەبوونی پێویســـتی بە جۆرێک هەبووی کۆنکرێتییە. بەڵام کۆتایی بوون-بۆ-خۆ لە پڕۆژەدا، کـــە ڕاســـتەقینەی پێدەدۆزێتەوە و تێپەڕیدەکات لە بوونـــی کۆنکرێتییەوە، وەکو

گۆرانکارییەکی دیاریکراو لەنێو هەڵوێســـتێکی تایبەتدا سەرهەڵدەدات. بۆنموونە، بوون-بۆ-خۆ زنجیرەکە دەپچڕێنێت، دەبێت بە پاشای فرانکەکان، پۆلۆنیا ڕزگاردەکات یان بۆ مافەکانـــی پرۆلتیاریا خەباتدەکات. لەســـەرەتادا، بوون-بۆ-خۆ لەپێناوی چینی پرۆلیتاریادا بەگشـــتی پرۆژەی خەباتکردن دانامەزرێنێت. بەڵکو ڕوودەکاتە دەســـتەوتاقمێکی پرۆلیتاریـــای تایبەت، کە خۆی بە یەکێـــک لە ئەوان دادەنێت. ئەمەش ســـەر بەو هۆکارەیە، کە کۆتایی ڕۆشـــنایی دەخاتە ســـەر شتە دراوەکە و هەڵبژێـــردراوە تاکو ڕەتیبکات. بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ هەمـــوو کۆتاییە دراوەکەدا سەرهەڵنادات ئەو لەگەڵ دیاریکردنی هەڵوێستەکەیدا خۆی دروستدەکات.

پێنجەم، بەو شێوەیەی هەڵوێست نە بابەتی نە خۆییە بە ئاکامێکی سەربەستانەی سەربەســـتی و کوێی ڕێگرەکانیش بۆ من، کە خۆم دایاننانێم؛ لەبەرئەو ڕۆشناییەی سەربەستی دەیخاتە سەر سنورە ڕێگرەکان ئەوا واتای ڕێگری پێدەبەخشێت. لەنێوان هەبـــووە ڕووتەکاندا پەیوەندی نییە؛ سەربەســـتی پەیوەندییەکان لەڕیزکردنیاندا، وەکو ئامێرە ئاڵۆزەکان دادەمەزرێنێت؛ هەروەها سەربەستیشە هۆی پەیوەندییەکان و کۆتاییەکەی دەدۆزێتەوە. لەبەرئەوەی پرۆژە بەرەو کۆتاییم دادەهێنم و بەســـەر پەیوەندییەکان لە جیهاندا تێپەڕیدەکەم، ئەوا من ڕووبەڕووی بەرەودوایی زنجیرە و شتە ئاڵۆزەکان دەبمەوە و دەبێت پەیڕەوی یاساکان بکەم. ئەم یاسایانە و شێوەی بەکارهێنانیان ســـەرکەوتن و ڕوخانی هەوڵدانەکەم دیاریدەکان. بەڵام سەربەستی پەیوەندیی یاسایی دەهێنێتە جیهانەوە. کەوابوو، سەربەستی خۆی بە زنجیر لەنێو جیهاندا دەبەستێتەوە.

شەشەم، بوون-بۆ-خۆ کاتییە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە بوون-بۆ-خۆ ئەوە نییە هەیە، بەڵکو "خۆی دروستدەکات". ئەو هەڵویستەیە، کە دەیەوێت بەو بەردەوامییە بنەڕەتییە بگات لە بوونی کەسانی دیکەدا دەیبینین، بۆنموونە دەڵێین "ئەو نەگۆڕاوە" یان "وەکو جاران ماوە". مانەوە لە پرۆژەیەکی دیاریکراودا بەردەوامی نییـــە؛ بەڵکو بەپێچەوانەوەیـــە، نوێکردنەوەیەکی بەردەوامـــی مامەڵەکردنەکەمە. لەلایەکی دیکەوە، ئەو ڕاســـتەقینانەی پرۆژەیەک ڕۆشـــناییان دەخاتە سەر ئاماژە بۆ بەردەوامی بوون-لەنێو-خۆ دەکات؛ بەو ڕادەیەی ڕاســـتەقینەکان وێنەکانی نێو بیرکردنـــەوە بۆ ئێمە دەگەڕێننەوە ئەوا بە مانەوەیان پشـــتگیری ئێمەش دەکەن؛ زۆرجـــار ڕوودەدات مانەوەی ئەوان بە مانەوەی بوونی خۆمان دادەنێین، بەتایبەتی مانەوەی شـــوێن و ژینگە، بۆچوونـــی هاوڕێکانمان بەرانبەر ئێمـــە و ڕابردوومان وێنەیەکی نزمی مانەوەکەمان پێکدەهێنن. لەنێو بوونە کاتییەکەمدا من بۆ کەسانی دیکە هەمیشە فەرەنسی، فەرمانبەر یان پرۆلیتارم. ئەم شتە نەناسراوە خەسڵەتی سنورێکی یەکجۆری بەسەر هەڵوێستەکەوە هەیە. بەهەمانشێوە، ئەوەی بە سروشت یان ڕەفتاری تاکە کەسێکی دادەنێن پرۆژەیەکی سەربەستی بوونی-ئەوە-بۆ کەسانی

دیکــە و بۆ بوون-بۆ-خۆش دەبێت بە شــتێکی نەناســراوی یەکجۆر. (ئالەین)، دروست بۆ کێشەکە چووە و دەڵێت، ڕەفتار سوێندخواردنە. کاتێک مرۆڤ دەڵێت، "من بە ئاســانی دڵخۆش نابم." سەربەستانە مامەڵە لەگەڵ ڕەفتارە نەخۆشەکەیدا دەکات. وشەکانیشــی ڕاڤەکردنێکی سەربەســتی جۆرێک لە ڕابردووی تەمومژاوی ئــەوە. لەم ڕووەوە، ڕەفتار نییە؛ تەنیا پــرۆژەی بوون هەیە. بەڵام نابێت بەهەڵە لەلایەنی دراوی ڕەفتار تێبگەین. دروســتە بۆ ئەو کەســانەی مــن، وەکو بابەت دەناسن ڕەفتارم بە نەخۆش و کەسایەتییەکەشم بە دووڕوو یان ڕاستگۆ، ترسنۆک یان ئازا دادەنێن. ئەم لایەنەی بوونم تەماشــاکردنی کەســێکی دیکە ئاماژەی بۆ دەکات؛ لــە ئەزمونی تەماشــاکردندا ئەم ڕەفتارە، کە پڕۆژەیەکی سەربەســت و زیندوو هەروەها خۆ-ئاگا بوو، دەبێت بە نەناسراوێک و هەوڵی ناسینی بۆ دەدرێت. ئەمەش تەنیا ناکەوێتە ســەر بوونی کەســێکی دیکە. لەسەر شێوازی دەرکەوتوی لایەنی بوونی منیش بەرانبەر ئەو ڕادەوەســتێت. تاکو من ڕێگە بە خۆم بدەم ئەو تەماشــام بکات ڕەفتارەکەم بۆ من دەبێت بە شــتێکی نەناســراو، مانەوە و ئەو شــتەی ڕۆژانە باسیلێدەکرێت، وەکو "من چل و پێنج ســاڵ تەمەنمە، من ئەمڕۆ خــۆم ناگۆڕم." زۆرجار ڕەفتار ئەوەیــە بوون-بۆ-خۆ ئەوەی ببێت بە بوون-لەنێو-خۆی بوون-بۆ-خۆ وەریدەگرێت. لەگەڵ ئەمەشدا، پێویستە ئەو خاڵە بخرێتە ڕوو، کە بەردەوامی ڕابردوو، ژینگە و ئەو ڕەفتارانەی خەســڵەتیان پێنەدراوە؛ لەســەر ئەو شــتانەوە دەردەکەون پەیوەندییان بە مانەوەی پڕۆژەکەمەوە هەیە. بۆنموونە، پــاش جەنگ و ژیانێکی درێژخایــەن لە هەندەران مرۆڤێــک دیمەنی چیایەک بە نەگۆڕا و دەبینێت. بێهودەشــە بە ئاواتی ئەوەوەبێت لەســەر نەجوڵان و مانەوەی دیــاردەی بەردەکان داوای ژیانەوەی ڕابردوو بکات. دیمەنەکە مانەوەی خۆی تەنیا لە پڕۆژەیەکی هەڵگیراودا دادەمەزرێنێت. واتای چیاکان لەنێو هەڵوێســتی مندان؛ لەلایەکەوە پەیوەندی من بە گەلێکەوە دەبەســتنەوە، کە لە ئاشــتیدایە. جارێکی دیکە لە کاتی جەنگدا یان داگیرکردنی لایەکی وڵاتەکەم تەماشــایان بکەم هەمان دیمەنیــان نابێت چونکە من پڕۆژەیەکــی جیاوازترم هەیە و جیاواز مامەڵە لەگەڵ جهاندا دەکەم. لەکۆتاییدا، بینیمان، هەڵچونی ناوەوەی هەڵوێســت، لەبەر ئەوەی گۆڕانکارییەکانی ژینگە ســەربەخۆیە، شــتێکی چاوەڕوانکراوە. ئەو گۆڕانکارییانە گۆڕانی پڕۆژەکانم ناوروژێنێت، بەڵکو لەسەر بناخەی سەربەستییەکەم کاردەکەنە ســەر ســادەیی و ئاڵۆزی هەڵوێســتەکە. لەبەرئەمە، پڕۆژە ســەرەتاییەکەم بە خەســڵەتی ســادەی زۆرترەوە خۆی نیشــانی من دەدات. مرۆڤ سادە یان ئاڵۆز نییە، بەڵکو هەڵوێســتەکەی یەکێک لەم خەسڵەتانەی هەیە. لەڕاستیدا من لەودیو هەڵوێســتێکی دیاریکراوەوە پڕۆژەی بوونی خۆمم. ئەم پڕۆژەیەش هێڵکاری بوونم لەنێو هەڵوێستێکی دیاریکراودا دەکات. ئەگەر هەڵوێستەکە سادە بکرێت، هەرچەندە

دیمەن، ئەشـــکەوتاکان و لێژی ڕێگاکە وێنەیەکی ســـەخت و دژواری بخاتەبەر من هێشـــتا بە ســـادەیی دەمێنمەوە چونکە هەڵبژاردنەکەم ناســـینەوەی هەڵوێستە سادەکەیە. سەرهەڵدانی ئاڵۆزی من دەخاتە بەردەم هەڵوێستی جیاوازتر و ئاڵۆز، کـــە خۆم تیایدا ئاڵـــۆز دەبینم. ئەمەش لای هەموو کەســـێک دادەمەزرێت ئەگەر ببینێت چۆن زیندانییەکانی جەنگ بەرانبەر هەڵوێستێکی زۆر سادە ڕەفتاردەکەن. سادەگیرییەکە واتای پرۆژەکەیان ناگۆڕێت؛ بەڵکو لەسەر بناخەی سەربەستییەکە ژینگەکە خەستدەکاتەوە و کۆتاییەکی سەختی زیندانییەکە دیاریدەکات. بەکورتی، ئێمە مامەڵە لەگەڵ مێتابۆڵیزمی ناوەوە، نەک دۆخ گۆڕینێکی جیهانی دەکەین، کە کاردەکاتە سەر شێوەی هەڵوێست. ئەوانەش گۆڕانن لە ژیانی خۆمدا پەیدایاندەکەم و لەنێو بەستێنی تاکە پرۆژەیەکدا دێنەکایەوە.

## ٣- سەربەستی و لێپرسینەوە

هەرچەنـــدە ئەم لێکۆڵینەوانەی خوارەوە لەپێش هەموو شـــتێکەوە ســـەرنجی ڕەوشتناس ڕادەکێشێت، بەڵام گرنگە لەوێوە بۆ سەربەستی بوون-بۆ-خۆ بگەڕێنیەوە و هەوڵبدەن لەو فاکتۆرە تێبگەین، کە نوێنەرایەتی چارەنوسی مرۆڤ دەکات.

ئاکامی بنەڕەتی ســـەرنجدانەکانی پێشـــو ئەوە دەگرێتەوە، کە مرۆڤ حوکمی بەسەردا دراوە سەربەست بێت و باریگرانی هەموو جیهان لەسەرشانی دابنێت. ئێمە چەمکی "لێپرســـینەوە" بە واتا باوەکەی وەردەگرین و بە ئاگامەندی ئەو بوونەی دادەنێیـــن، کە خـــۆی بە داهێنەری بێ هاوتای ڕووداو یـــان بابەتەکەی دەبینێت. لەم واتایەدا لێپرســـینەوەی بوون-بۆ-خۆ پەرێشانکەرە چونکە مرۆڤ ئەو بوونەیە دەیهێنێتە کایەوە. ئەو هەرچ هەڵوێســـتێکی هەبێت پێویستە سەربەرزانە خۆی بە خاوەنـــی دابنێت. لەبەر ئەمە گلەییکردن بێ واتایـــە چونکە هیچ هێزێکی بێگانە هەستکردنمان دروست ناکات، نامانژیەنێت و بڕیار لەسەر بوونمان نادات.

لەسەرو ئەمەوە، ئەم لێپرسینەوە ڕەهایە وازهێنان نییە؛ داوایەکی لۆجیکمەندانەی ئاکامەکانی سەربەســـتییە. ئەوەی بەســـەر مندا دێت بە دەستی خۆم ڕوودەدات. من ناتوانم لە ڕێگەی ئەوەوە لەســـەر خۆم کاریگەربم، ناتوانم دژی ڕاوەســـتم یان وازی لێبهێنم. هەروەها، من خاوەنی ئەوەم لە من ڕوودەدات. مەبەســـتمان لەمەش ئەوەیە، کە یەکەم، من هەمیشـــە، وەکو مرۆڤ لەگـــەڵ ڕووداوەکانمدا بەرانبەرم. ئەوەی لە ڕێگەی خۆ و کەسانی دیکەدا بەسەر مرۆڤدا دێت مرۆڤانەیە. ناشرینترین هەڵوێســـتەکانی جەنگ و دڕندەترین ئەشکەنجە بارودۆخی نا-مرۆڤکردو نین؛ هیچ هەڵوێستێک نییە نا-مرۆڤانە بێت. بە هۆی ترسەوە، هەڵهاتن و ڕووکردن لە ڕەفتاری

جادوگەریانە باوەڕ بە هەڵوێستێک دەکەم مرۆڤ نەیکردبێت. هێشتا باوەڕکردنەکەش مرۆڤانەیە و پێویستە خۆم بە لێپرسراو لە ئاستیدا دابنێم. من خاوەنی هەڵوێستم چونکە هەڵوێســـت وێنەی هەڵبژاردنێکی سەربەســـتی بوونی خۆمە. من خاوەنی هەموو شێیکی ئامادەکراوی نێو هەڵوێستەکەم، کە هێما بۆ من و نوێنەرایەتی بوونم دادەنێن. ئایا ئەو کەســـە من نیم، کە بڕیار لەسەر کاریگەرێتی لایەنە نایارەکان لە شتەکاندا دەدات و تەنانەت ڕەهەندە نەناسراوەکانیشیان دەدۆزێتەوە؟

کەوابـــوو، ڕێکەوت لە ژیاندا نییە؛ چالاکییەکـــی کۆمەڵایەتی دێتە پێش و من مامەڵـــەی لەگەڵدا دەکەم و لەدەرەوەدا دروســـتنابێت. ئەگەر بچمە جەنگەوە ئەوا جەنگەکـــە دەبێت بە جەنگی من؛ لەنێو بیرکردنەوەی مندایە و منیش شایســـتەی ئـــەوم چونکە دەمتوانی بە خۆکوشـــتن یـــان هەڵهاتن لە دەســـتی ڕزگاربم. ئەم ئەگەرانە لەگەڵ بەرەوڕووبوونەوەی هەڵوێســـت ســـەرهەڵدەدەن. هەروەها، لەبەر نەبوونی ڕێگەیەک بۆ هەڵهاتن من جەنگ هەڵدەبژێرم. دەشێ ئەمەش پەیوەندی بە کەمتەرخەمی، ترسنوکیم لەبەردەم جەماوەردا یان هەڵنەبژاردنی بەهاکانی هەڵهاتن لـــە جەنگ (بیروبـــاوەڕی خزمان بەرانبەرم، ســـەربەرزی خێزانەکەم و هتد) هانم بدەن بـــۆ جەنگ بڕۆم. بەهەرحاڵ، کێشـــەکە هەڵبژاردنە، گرنـــگ نییە تۆ چۆن تەماشـــای دەکەیـــت. هەڵبژاردنەکەش بەردەوام تاکو کۆتایـــی بە جەنگەکە دێت ســـەرهەڵدەدات. پێویستە لەگەڵ ژین ڕۆمانیس هاوڕا بین، کە دەڵێت، "لە جەنگدا زیانلێکەوتووی بێتاوان نییە." ئەگەر جەنگ لە جێگەی خۆکوشـــتن و سەرشۆڕی هەڵبژێـــرم دەبێت لێپرســـینەوەی جەنگەکە بگرمە ئەســـتۆم. بێگومان من دەزانم کەســـانی دیکە جەنگەکەیان بەرپاکردوە و منیش تەنیـــا هاوکارییان بکەم. بەڵام هاوکاریکردن واتایەکی یاسایی هەیە و لێرەدا وەریناگرین. بۆ من و لە ڕێگەی منەوە جەنگەکـــە لەناودەچێت و من بڕیارم داوە، کە هەبێـــت. زۆرلێکردن لەمەدا نییە. زۆرلێکردن ناتوانێت سەربەستی داگیربکات. من هیچ بیانویەکم نییە؛ چەندجارێک لەم نوســـراوەدا گوتومانە، کە بیانونەگرتن خەسلەتێکی تایبەتمەندی ڕاستەقینەی مرۆڤانەیە. ئەوەی بۆ من دەمێنێتەوە هەڵوێستمە بەرانبەر جەنگەکە.

جەنگەکە جەنگی منە چونکە لەنێو ئەو هەڵوێستەوە سەرهەڵدەدات، کە من وەریدەگرم و بە چوونە نێوی یان وەســـتان دژی دەیدۆزمەوە. بەڵام ئێســـتا ناتوانم هەڵبژاردنی بوونم لە هەڵبژاردنی جەنگەکە جیابکەمەوە. چوونە نێو جەنگەوە هەڵبژاردنی بوونمە لەوێدا و هەڵبژاردنی ئەویش هەڵبژاردنی بوونی خۆمە. بیر لە "چوار ساڵ پشودان"، "دواخســـتن" و "شوێنی خۆشـــاردنەوە" ناکەمەوە، یان بەشێکی لێپرسینەوەکەم بۆ هاوســـەریبوون، خێزان و ژیانی تایبەتیم دانانێم. لـــە هەڵبژاردنی جەنگەکەدا ڕۆژانە بوونی خۆم هەڵدەبژێرم. بەوشێوەیەی دەبم بەخاوەنی بوونم، خۆم دەکەم بە خاوەنی جەنگەکەش. من لێپرسراوم ئەگەر چوارساڵی بەتاڵیش بخایەنێت.

دواجار، وەکو لەپێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، هەر تاکە کەسێک هەڵبژاردنی ڕەهای خۆیەتی، لە گۆشەنیگایەکی جیهانییەوە، لەبەر ڕۆشنایی زانین و تەکنیکەکان هەڵبژاردنەکە ڕوودەدات؛ هەر تاکە کەسێک سەرهەڵدانێکی ڕەهایە لە کاتێکی ڕەهادا و هەرگیز لە کاتێکی دیکەدا بیری لێناکرێتەوە. کات بەفیرۆدانە ئەگەر کەسێک بپرسێت بوونی من چۆن دەبوو ئەگەر جەنگ نەبوایە چونکە خۆم لەنێو سەردەمێکدا هەڵبژارد، کە جەنگی تێدا ڕوویدا. من لەو سەردەمە جیا نیم؛ نەمتوانی خۆم بەسەردەمێکی دیکە بەبێ ناکۆکی بگەیەنم. لەبەرئەمە، من جەنگەکەم، کە سەردەمەکەی پێش خۆی براوەو سنورداردەکات. دەتوانین بەگوێرەی گوتەکەی پێشو "لە جەنگدا زیانلێکەوتووی بێتاوان نییە." لێپرسینەوەی بوون-بۆ-خۆ پێناس بکەین. ئێمە وشەکانی گوتەکە دەگۆڕین و دەڵێین، "ئێمە شایستەی ئەو جەنگەین هەڵمانگیرساندوە." کەوابوو، بەتەواوی سەربەستم و لەسەردەمەکەشم، کە هەڵمبژاردوە، جیاناکرێمەوە و لێپرسراوم. من هیچ بیانویەکم پێنییە؛ چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی بوونمدا بە تەنیا و بەبێ یارمەتی کەسانی دیکە جیهانی گران بە کۆڵمدا دەدەم.

جۆری لێپرسینەوەکە تایبەتە. لەوانەیە کەسێک بڵێت، "من داوام نەکرد لەدایکبم." ئەمەش بۆچوونێکی سادەیە بۆ جەختکردن لەسەر فاکتۆری بوونمان. بێجگە لە خودی لێپرسینەوەکەم چونکە من بناخەی بوونی خۆم نیم. لەوەدەچێت بە زۆر لێپرسینەوەم بەسەردا درابێت. من فڕێدراومەتە نێو جیهانەوە، بەو واتایە نا، کە من لەنێو جیهانێکی سەخت و ناخۆشدا، وەکو پارچە تەختەیەکی سەرشەپۆل زەبوون بم. من کتوپڕ دەتوانم بەبێ یارمەتی بوونم بدۆزمەوە، مامەڵە لەگەڵ جیهاندا بکەم ئەو جیهانەی بەرانبەری لێپرسراوم. هەرچییەک بکەم ناتوانم خۆم لەم لێپرسینەوەیە بدزمەوە. تەنانەت بەرانبەر خۆدزینەوەم لە لێپرسینەوەش لێپرسراوم.

دوورەپەرێزی لە جیهانەوە کارنەکردنە لەسەر شتەکان و کەسانی دیکە. ئەم دوورە پەریزییەش جۆرێکە لە هەڵبژاردنی بوونی خۆم، تەنانەت خۆکوشتن شێوازێکی بوونە لەنێو جیهاندا. لەگەڵ ئەمەشدا، لێپرسینەوەی ڕەهام بەرانبەر فاکتۆری لەدایکبوونم ڕاستەوخۆ شتێکی نەناسراوە و نەزانراوە چونکە فاکتۆرێکی ڕووت نییە و هەمیشە لەنێو پرۆژەی پێکهێنانی بوون-بۆ-خۆمدایە. من شەرمەزارم، سەرسامم یان دڵخۆشم لەدایکبووم. لەلایەکی دیکەوە بۆ لەناوبردنی ژیانم هەوڵدەدەم خراپی ژیانم بخەمە ڕوو. لەم بۆچوونەوە، بە ڕادەیەک من لەدایکبوونم هەڵدەبژێرم. ئەم هەڵبژاردنە تێکەڵی فاکتۆرەکە دەبێت، لەگەڵیدا یەک دەگرێت و من ناتوانم هەڵنەبژێرم. فاکتۆرەکەش بە ڕەتکردنی من بەرەو کۆتاییەکانم دەردەکەوێت.

کەوابوو، فاکتۆر لە هەموو شوێنێکدا هەیە، بەڵام ناناسرێت؛ من بێجگە لە

لێپرســـینەوەکەم ڕووبەڕووی هیچی دی نابمەوە. لەبەرئەمەیە ناکرێت بپرسین، "بۆ چی لەدایکبووم؟" یان نەفرەت لە ڕۆژی لەدایکبوونم بکەم و بڵێم من داوام نەکرد لەدایکبم. ئەم هەڵوێســـتانە لە ئاســـتی لەدایکبوونمدا، بۆنموونە، ئەو فاکتۆرانەی ئامادەبوونـــی مـــن لەنێـــو جیهاندا دەستنیشـــان دەکەن ڕێگەن بۆ ناســـینەوەی لەدایکبوونەکە و خۆبەخاوەنکردن و لێپرســـینەوە لەبەرانبەریدا. لێرەدا، من تەنیا ڕووبەڕووی خـــۆم و پرۆژەکانم دەبمەوە. فاکتۆری بوونم ئەوە دەگەیەنێت، کە من بەتەواوی حوکمم بەســـەدا دراوە بەرانبەر بوونم لێپرســـراوبم. من ئەو بوونەم، کە لەبوونیدا پرسیار لەبارەی بوونیەوە دەکرێت.

ئەم "هەیە"یەی بوونیشم، وەکو ئێســـتا نەناسراوە. لەژێر ئەم بارودۆخانەدا، مـــادام هەموو ڕووداوێک لەنێو جیهاندا خـــۆی بۆ من وەکو هەلێک دەردەخات یان باشترە بڵێین، هەرشتێک لە ئێمە ڕوودەدات ڕێکەوتە و (لە ئێمە ڕوودەدات تاکو لەو بوونە بگەین، کە لەبوونیدا پرسیار لەبارەی بوونیەوە دەکرێت)، هەروەها کەسانی دیکەش، وەکو بەرزێتی-بەرزکراو هەلوڕێکەوتن ئەوا لێپرسینەوە بوون-بۆ-خۆ هەموو جیهان، کە جیهانی مرۆڤە، دەگرێتەوە.

لەبەر ئەمە، بوون-بۆ-خۆ دوودڵە؛ ئەو بناخەی بوونی خۆی و بوونی کەســـانی دیکە و بوون-لەنێو-خۆ نییە. زۆریلێدەکرێت بڕیار لەسەر واتای بوون لە چواردەوری خـــۆی و دەرەوەدا بدات. ئەو بوونەی دوودڵە و فڕێدراوەتە نێو لێپرســـینەوە هیچ پەشیمانی و بیانویەکی نییە؛ ئەو بێجگە لە سەربەستی هیچی دی نییە، کە بوونی خۆی بەرجەستەدەکات و بوونیشـــی لەنێو بەرجەستەبوونەکەدا جێنشین دەبێت. بەڵام، وەکو لەسەرەتاوە باسمانکرد، زۆرجار لە دەست دوودڵی ڕادەکەین و توشی بڕوای خراپ دەبین.

# بەشی دووەم

## کردن و هەیەتی

### ١. سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی

ئەگەر ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بەو جۆرەی هەوڵماندا بیسەلمێنین بە کۆتاییەکانی ناسنامە و پێناسە بۆ خۆی دروستبکات ئەوا لێکۆڵینەوەو پۆلێنکردنی ئەم کۆتاییانە دەبێت بە کارێکی پێویست. لە بەشی پێشودا لە ڕوانگەی پڕۆژەی سەربەستییەوە لە بوون-بۆ-خۆ دواین، کە دەبێت بەهاندەر بۆ ڕووکردن لە کۆتایی. ئێستا پێویستە پرسیار سەبارەت کۆتاییەکە بکەین چونکە بەشێک لە خۆیەتی ڕەها پێکدەهێنێت و بەرزێتی و سنورێکی دەرەکیشە. لەبەر ئەمەیە سایکۆلۆجی ئەزمونگەری دەگەیەنێتە ئەو خاڵەی مرۆڤ بە ئارەزووەکانی پێناسبکات. بەهەرحاڵ، پێویستە لێرەدا خۆمان لە دوو جۆر هەڵەکردن بپارێزین.

هەڵەی یەکەم، کاتێک بیریارێکی سـایکۆلۆجی ئەزمونگەری پێناسـی مرۆڤ بەگوێـرەی ئارەزووەکان دەکات خۆی توشـی وەهمی جەوهەریـش دەکات. ئەو ئـارەزووەکان دەخاتە نێو ئاگامەندی مرۆڤەوە و لەو باوەڕەدایە، کە واتای ئارەزوو لە خودی ئارەزوودایە. لە بیرۆکەی بەرزێتی دووردەکەوێتەوە. ئەگەر من ئارەزووی خانوویەک، لێوانێک ئاو یان لەشی ئافرەتێک بکەم چۆن خانو، لێوانە ئاوەکە یان لەشـی ئافرەتەکە لەنێو ئارەزووی مندان؟ چۆن ئارەزووشم دەبێت بە ئاگایی لەم بابەتانە؟ پێویستە ئاگاداربین و ئەم ئارەزووانە بە شتێکی دەروونی لەنێو ئاگامەندیدا دانەنێین؛ ئەوان بە پڕۆژە بنەڕەتی و بونیادە بەرزەکەوە خودی ئاگامەندین چونکە لەبناخەدا ئاگامەندی ئاگاییە لە شتەکان.

هەڵەی دووەم، کە پەیوەندی بە هەڵەی یەکەمەوە هەیە، لەوخاڵەدایە توێژەرە دەروونناسـەکە لەگەڵ گەیشـتن بە دۆزینەوەی ئارەزووە ئەزمونگەرییەکان واز لە توێژینەوەکە بهێنێت. لێرەدا، مرۆڤ لەسـەر کڵافەیەک هانـدەر و ئارەزووەکانی پێناسدەکرێت، کە توێژینەوە ئەزمونگەرییەکە دایمەزراندون.

هەڵبەتـە بیریـارە سـایکۆلۆجییەکە هەمـوو جارێک خۆی بـەو کڵافەیەوە نابەسـتێتەوە؛ هەوڵـدەدات پەیوەندییەکانی نێوانیان و هاوئاهەنگیان بناسـێت؛ هەوڵـدەدات بزانێت چۆن ئارەزووەکان کار لەسـەر یەکدی دەکەن. ڕەخنەگرێک، بۆنموونە، دەیەوێت "سایکۆلۆجی" فلوبێرت باسبکات و دەنوسێت، کە "دەردەکەوێت

ئەو لە ســـەرەتای لاوێتییدا گەشـــەکردنێکی بەردەوامی هەبـــووە، کە لە ئاکامی هەســـتکردنێکی دوولایەنییەوە سەریهەڵداوە. لەلایەکەوە تەماعی گەورە و لەلاکەی دیکەوە دەســـتەڵات نەبەزەکەی .... هەڵقوڵانـــی خوێنی لاوێتی زوو لە ئەودا و لە تەمەنی هەژدەســـاڵیدا بوو بە حەز و ئارەزووی بۆ ئەدەب. لە وزە و شـــێواز یان داســـتانەکاندا جـــۆرە ڕزگاربوونێکی لە کردەوە توندوتیژەکان یان ئەو ســـۆزانەی ئەشکەنجەیان دەدا دۆزییەوە."[٦٨] لەم بەندەدا کەسایەتییەکی ئاڵۆزی هەرزەکارێک بۆ چەند ئارەزوویەکی ســـەرەتایی، وەکو (جۆو) زانایەکی کیمیا لە شتێکی ئاڵۆز چەند توخمێکی ســـادە دادەنێت، گەڕاوەتەوە. شتە دراوەکان لەسەرەتاوە تەماعی گەورەن، پێویســـتیان بـــە کردەوە توندوتیژەکان و هەســـتکردنە قوڵەکەی هەیە؛ کاتێک ئەم توخمانە یەکدەگرن گەشەکردنێکی هەمیشەیی دروستدەکەن. بەوجۆرەی بۆرگێت ئاماژەی بۆ دەکات، لەچەند دێرێکیدا، کە دامانناون، گەشەکردنەکە لەسەر هەڵبژاردنێکی شارەزایانەی خوێندنەوە و دەربڕین لە ڕۆماندا بەرجەستەبوو. لێرەدا سەرچاوەی دەرونێکی ئەدەبخواز دەبینین.

ئەم شـــیکردنەوە سایکۆلۆجییە لەو پاشخانەوە دەســـتپێدەکات. کە فاکتۆری تاکەکەس لە دوو ڕیانەی یاســـا هەمەکی و ڕووتکراوەکانـــەوە دەکەوێتەگەر. ئەو فاکتۆرەی دەبێت باسبکرێت، کە لێرەدا ویستی ئەدەبی (فلوبێرت)ە، لەنێو ئارەزووە ڕووتکراوەکانـــدا تواوەتەوە، کە لە ژیانی ســـادەی هەموو لاوێکـــدا دەدۆزرێنەوە. تەنیا پێکەوە بەســـتنی ئـــارەزووەکان لەم هەوڵدانـــەدا کۆنکرێتییە؛ لەنێو خۆیاندا نموونـــەی ئەگەرەکانن. کەوابوو، لەم گریمانەیەدا ئەوەی ڕووتکراوەیە پێش شـــتە کۆنکرێتییەکان دەکەوێت. شتە کۆنکرێتەکەش لە ڕووتکراوەکان پێکهاتوە؛ تاکەکەس دوو ڕیانی نەخشـــەیەکی هەمەکییە. بێجگە لـــە بێهودەییە لۆجیکمەندانەکەی ئەم ئاکامـــە، لەنموونـــە هەڵبژاردووەکەماندا، لە پرۆژەی تاکە کەســـایەتی تێناگەین. لەڕاستیدا هەستکردنێکی قوڵ، وەکو نموونەیەکی هەمەکی شاردراوەتەوە و بووە بە کەناڵێک بۆ ســـەرهەڵدانی پێویستی نوسین. ئەمەش ئەو داواکارییە نییە فلوبێرت دەیخوازی؛ بەپێچەوانەوە، ئەمە ئەوەیە، کە پێویستە باسبکرێت. بێگومان، کەسێک دەتوانێت هەزار بارودۆخی دیکە دیاریبکات، گرنگ نییە ئێمە بیانناســـین یان نا، کە پێویستییەکەیان بۆ ئەو کردەوەیە هێناوەتەکایەوە.

بەڵام ئەمە لە ســـەرەتاوە وازهێنانـــە لە گەڕان بەدوای شـــتە نەزانراوەکاندا. هەروەها ئەم میتۆدە تاکەکەســـی ڕووت، کە خۆیەتی فلوبێرت وازیلێهێناوە و بووە بە بارودۆخە دەرەکییەکانی ژیانـــی، ڕەتدەداتەوە. دواجاریش، نامەکانی فلوبێرت دەیسەلمێنن، ئەو پێش قەیرانەکانی تەمەنی هەرزەکاری و لە منداڵییەوە ئارەزووی بۆ نوسین ئەشکەنجەیداوە.

لە هەموو قۆناخێکی باســـکردنەکەی ســـەرەوەدا توشی بۆشایی دەبین. بۆچی تەماع و هەستکردن بە دەستەڵات لای فلوبێرت لە جێگەی چاوەڕوانیکردنێکی ئارام

---

٦٨ ئەمە بەندەێکە لە توێژینەوەی پۆڵ بۆرگێت لەسەر سایکۆلۆجی فلۆبێرت.

یان ئۆقرەنەگرتنێکی ڕەشـــبینانە گەشەکردن دروستدەکات؟ بۆچی گەشەکردنەکە بە زۆر خۆی دەسەلمێنێت؟ یان بۆچی گەشەکردنەکە لە کۆتایی بەندەکەدا کتوپڕ دەردەکەوێت؟ بۆچی گەشەکردنەکە لە جێگەی پەنابردن بۆ توندوتیژی یان داوێن پیســـی هێمایانە ڕێگایەکی دیکە هەڵدەبژێرێت؟ بۆچی فلوبێرت بوو بە نوســـەر و نەبوو بە هونەرمەندی شـــێوەکاری یان مۆسیقازان؟ ئەو دەیتوانی هیچ ڕێگەیەکی هونەری هەڵنەبژێرێت (بۆنموونە ڕێگەی سۆفیگەریش هەیە). فلوبێرت لە شوێنێکدا دەنوسێت، "دەمتوانی ببم بە ئەکتەرێکی گەورە". بۆچی نەیتوانی ئەم کارەبکات؟ بەکورتییەکەی، ئێمە لە هیچ تێنەگەیشتوین؛ تەنیا زنجیرەیەک ڕووداو یان کڵافەیەک ئارەزوومان بینیوە بە چەک و تفاقەوە بەرجەستەدەبن و بێ ئەوەی بزانین لە کوێوە سەریان هەڵداوە.

گۆرانکارییەکان، پێکهاتنەکان و شێوەگۆڕکێ لە ئێمە شاردراونەتەوە.

بەشێوەیەکی ئەزمونی ســـــتەمێکی سنوردار بۆ ڕووداوەکان دیاریدەکەین، کە لەڕاســـتیدا شـــوێنکەوتنی ڕووداوەکان لەنێو خۆیاندا (وەکو پێویستی کارکردن لە تەمەنی لاوێتیدا پێش پێویستی نوسین دەکەوێت) نەزانراوە.

هێشـــتا بەمە دەوترێت سایکۆلۆجی! هەرچ ژیاننامەیەک دەکەیتەوە ئەم باسەی تێدادەدۆزیتەوە، کە ڕووداوە دەرەکییەکان و شـــتە ئەندێشـــاوییەکان بە بتەکانی ســـەردەکەمان دادەنێت و دەیانبەســـتێت بەمیرات، فێربـــوون، ژینگە و پێکهاتە فزیۆلۆجیەکانەوە. هەندێکجار، لە نوسراوێکی چاکدا پەیوەندییەکە لەنێوان ڕووداوە لەپێشتر و پاشترەکاندا یان لەنێوان دوو ئارەزووی هاوکاتیدا دامەزراوە. کاریگەرێتییان لەسەر یەکدی بەزنجیرەی سەرهەڵدانەکەیانەوە نەبەستراوەتەوە؛ هەندێکجار دەتوانین بەوجۆرەی یاسپەرز لەنێو نوسراوەکەیدا لەسەر سایکۆپاتەلۆجی تێدەگات ئێمەش تێبیگەین. بەڵام تێگەیشتنەکە ناسینەوەی پەیوەندییە گشتییەکانە. بۆنموونە ئێمە پەیوەندی نێوان پاکژی و سۆفیگەرایەتی یان بورانەوە و دووڕوویی دەزانین. بەڵام پەیوەندی کۆنکریتی نێوان ئەو پاکژییە (دوورکەوتنە لەو ئافرەتە یان دژوەســـتان بەرانبەر جۆرە فریودانێک)و ناوەڕۆکی تاکە کەســـێک لە ژیانی ســـۆفیگەرایەتیدا نازانین؛ بەهەمانشـــێوە، پزیشکی دەروون لەگەڵ ڕۆشـــنایی خستنەسەر بونیادی گشتی وەهمەکان زوو ڕازی دەبێت و هەوڵنادات لە تاکەکەس، ناوەڕۆکی نەخۆشییە دەروونییەکان (بـــۆ ئەو مرۆڤە هەســـتدەکات ئەو کەســـایەتییە مێژوویییە نەک کەسایەتییەکی دیکە) تێبگات.

لـــە هەمووی گرنگتر، ئەم توێژینەوە "ســـایکۆلۆجییانە"ئێمە بۆ بنەڕەتە دراوە ڕوونەکراوەکان دەبات. ئەوانەش توخمی سادەی سایکۆلۆجین. گوایە، بۆنموونە، فلوبێرت "تەماعی گەورە"ی هەبووە و هەموو باسەکەی دوایی دەکەوێتە سەر بنەڕەتی ئەم تەماعە. ئەمە بەڕادەیەک دروســـتە. تەماعەکە فاکتۆرێکی کەمنەکراوەیە، کە بیرکردنەوە ڕازیناکات. کەمنەکردنەوە، لێرەدا، بێجگە لە درێژەدان بە توێژینەوەکە هۆیەکی دیکەی نییە. زانا سایکۆلۆجییەکە لەو شوێنانەدا، کە دەوەستا فاکتۆرەکەی

بەردەمیشـــی دەبوو بە شتێکی ســـەرەکی دراو. لەبەر ئەمەش کاتێک توێژینەوە سایکۆلۆجییەکان دەخوێنینەوە دڵگران دەبین و ڕازیماننناکەن. تەماشاکە، ئێمە بە خۆمان دەڵێین، "فلوبێرت تەماعکار بوو، ئەو جۆرە مرۆڤەبوو." پرسیارکردنەکەمان پوچـــەڵ دەردەچێت، ئەگەر بڵێین بۆچی بەوجۆرە بوو؟ ئەمەش، وەکو ئەوە وایە بپرســـین بۆچی مرۆڤێکی باڵابەرزی قژ زەرد بوو؟ هەڵبەتە دەبێت لە شـــوێنێکدا توێژینەوەکەمان بوەستێنین؛ ئەمەش هەڵکەوتی هەموو هەبوویەکی ڕاستەقینەیە. ئەو بەردە قەوزەی گرتوە و بەردەکەی تەنیشتی پاکە. گوستاف فلوبێرت تەماعی ئەدەبی هەبوو، بەڵام ئەشلی برای نەیبوو. بەهەمانشێوەش دەمانەوێت خەسڵەتەکانی فســـفۆڕ بدۆزینەوە و بۆ بونیادە کیمیاوییەکـــە گەردیلەکانی بگەڕێنینەوە. بۆچی ئەوجۆرە گەردیلانانە هەن؟ چونکە بەوجۆرە هەن. ئەمە هەموو وەڵامێکە. باسکردنی ســـایکۆلۆجی فلوبێرت، ئەگەر بگونجێت، لە ئاماژەکردن بۆ ئاڵۆزی ڕەفتارەکانی، هەستەکانی، حاڵەتە گەڕاوەکانی بۆ خەسڵەتەکان و بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەوانەی تەنێکـــی کیمیاوی هەیەتی، کە لەو دیویانـــەوە فلوبێرت ناتوانێت تەماعی هەبێت، پێکهاتوە. هێشتا بە شاراوەیش هەستدەکەین فلوبێرت تەماعەکەی دەستنەکەوتوە. ئەو شتێکی واتا بەخشە؛ کەوابوو سەربەستە. میرات، کەلتوری بورژوازی و فیربوونی، وەکو دەمارگیری مەزاجی ناخرێنە سەری. دەمار واتابەخش نییە؛ مادەیەکی لینجە، کە دەکرێت باســـبکرێت و خەســـڵەتی بەرزێتی نییە؛ خـــۆی تێپەڕناکات تاکو لە واتـــای بوونی خۆی تێبـــگات. لەژێر هیچ بارودۆخێکدا دەمـــار زەمین بۆ واتاکەی خـــۆی دانامەزرێنێت. لە ڕوویەکەوە، تەماعـــی فلوبێرت، وەکو هەموو هەڵکەوتنی فاکتۆرەکان، فاکتۆرە. دروستیشە، کە ناتوانین بەودیوی بگەین، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە خۆی دروستدەکات. ئێمەش دەمانەوێت شتێکی دیکە لەودیوی بدۆزینەوە. شـــتێک، وەکو بڕیاردانێکی ڕادیکاڵ، بەبێ ئەوەی واز لە خەســـڵەتی هەڵکەوتنی بهێنین ببێت بە شتێکی بێ درۆی کەمنەکراوی دەروونی.

ئەوەی دەمانەوێت دەستمان بکەوێت و کەس نەیداوینەتێ شتێکی کەمنەکراوەی بێ درۆیە؛ ئەو شـــتە کەمنەکراوەیەیە، کە کەمنەکردنەوە تیایدا بەڵگە نەویســـتە و ئاکامێـــک نییە دەروونناس دایمەزراندبێت. ئەم داواکارییەش لە ئاکامی گەڕانی بەردەوام بە شـــوێن هۆدا پەیدا نابێت، کە بـــە گەڕانەوەیەکی بەرەودوای نەبڕاوە دادەنرێت و هەندێکجار، وەکو توێژینەوەی هۆشەکی دەبینرێت. هەروەها ئەو پرسیارە ســـاوایەش نییە لەبارەی "چونکە"وە دەکرێت و لەوە زۆرتریش ناڵێین "بۆچی؟" بەپێچەوانـــەوە، داواکارییەکەمان لەســـەر تێگەیشـــتنێکی پێش-ئۆنتۆلۆجییانەی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ ڕادەوەستێت. بە ڕەتدانەوەی ئەو بۆچوونەوە بەستراوە گوایە دەکرێت بوونی مرۆڤ شـــیبکرێتەوە و بە شـــتە دراوەکان دابنرێت. بکرێت بەو ئارەزووە دیاریکراوانەی خۆ پشـــتیوانیان دەکات و وەکو خەســـڵەتەکانی نێو بابەتێـــک تەماشـــادەکرێن؛ ئەگەر بەم جۆرەش لە ڕاســـتەقینەی مرۆڤ تێبگەین هێشتا پێویستە خاوەنی هەڵبژاردن بێت: ئەگەر فلوبێرت ئەو مرۆڤە بێت خۆشمان دەوێت یان ڕقمان لێیە، زەم یان ستایشی بکەین، کە نوێنەرایەتی کەسانی دیکە

دەکات و ڕاســـتەوخۆ بەو ڕاســـتییەی، کە هەیە لە بوونمان دەدات، لە بنەڕەتدا ئـــەو جەوهەرەیە، کە ئەم ئارەزووانەی تێدا نییە؛ قوڕێکی بێ شـــێوەیە و دەبێت خەسڵەتەکان وەرگرێت یان بۆ کلاًفەیەک لەم هاندەرانەی دەگەڕێنینەوە.

لەهەردوو حاڵەتەکەدا بوونی مرۆڤ وندەبێت؛ ئێمە کەسێک نادۆزینەوە، کە ئەم یان ئەو ئەزمونەی بەسەرداهات؛ لە تەماشاکردنمان بۆ کەسێک توشی جەوهەرێکی مێتافیزیکی ناکۆک و بێســود دەبین یان ئەو بوونەی دەمانەوێت بیناســین لەنێو تـــۆزی دیاردەکاندا وندەبێت و پەیوەندییەکانی دەرەکی دادەمەزرێن. بەڵام ئێمە لە هەوڵدانمان بۆ تێگەیشـــتن لە بوونی کەسێکی دی نامانەوێت بە بیرۆکەی جەوهەر بگەین، کە نامرۆڤانەیە. دواجاریش، لەڕاســـتیدا ئەو بوونەی دەمانەوێت بیناســـین لەنێو تۆزەکەدا وننابێت و یەکێتییەکەش لەنێویدا دەدۆزینەوە.

جەوهەر هەبوویەکی کارتۆنی هەیە و ئەوەی بوونەکە هەیەتی، خۆشەویست یان قێزلێکراو، ستایشـــکراو یان لۆمەکراو بەکورتی کەسایەتییەکەیە. ئەو یەکێتییەی لە بوونی مرۆڤدا دەمانەوێت بیدۆزینەوە یەکێتییەکی سەربەســـتە و دوای ئەو فرە لایەنییـــەش پەیدا نابێت، کە دەبێ یەکبگرن. بوون بۆ فلوبێرت و هەموو ئەوانەی ژیاننامەیان دەنوســـنەوە یەکگرتنـــە لەنێو جیهاندا. یەکگرتنـــە کەمنەکراوەکەی دەمانەوێت بیدۆزینەوە، کە خودی فلوبێرتە، دەمانەوێت نوســـەری ژیاننامەکانیش باســـبکەین، یەکگرتنی پڕۆژە بنەڕەتییەکەیە. ئەو یەکگرتنەیە، کە لەنێو بوونێکی ڕەهـــای نا-جەوهەرییـــدا خۆی بۆ ئێمـــە دەردەخات. کەوابوو، دەبێت ئەو شـــتە کەمنەکراوانە بدۆزینەوە و بیانکەین بە پێوەر و ســـەرەتای گەشـــتەکەمان نەک لە ئاستیدا ڕاوەستین و بە بەڵگەنەویست بیانخوێنینەوە و کۆتایی بە توێژینەوەکەمان بهێنین.

بەتایبەتی، نابێت کەســـەکە لەســـەر ئارەزووەکانی پێکبهێنین. (سپینۆزا)ش ئاگادارمان دەکات، کە جەوهەر کۆی شێوازەکانی نییە. هەریەکێک لە ئارەزووەکان شـــتێکی کەمنەکراوەیـــە، هەڵکەوتێکی بێهودەیـــە و بێهـــودەش مامەڵە لەگەڵ هەمووگیری ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتیدا دەکات. ئەگـــەر بڵێم یەکێک لە هاوڕێکانم حەزی لەسەوڵلێدانە، ئەوا من توێژینەوەکەم لەوێدا دەوەستێنم. لەلایەکی دیکەوە، فاکتۆرێکی هەڵکەوتوو دادەمەزرێنم، کە هیچ شـــتێک باســـیناکات و هەرچەندە لە ئاکامی بڕیاردانێکی سەربەستەوە پەیدابووە، سەربەخۆ نییە. من ناتوانم ئارەزووی ســـەوڵلێدان بە پرۆژەیەکی بنەڕەتی (پیرۆ) دابنێم؛ لـــە پلەی دووەمدا دادەنرێت و لە شـــتێکی دیکەوە وەرگیراوە. ئەوانەی وێنەی کەســـایەتییەکمان بۆ دەکێشن لەگـــەڵ دانانی هێڵەکانیاندا دەریدەخەن، کە هەریەکێک لەو هێڵانە یان ئارەزووانە پەیوەندییەکـــی دەرەکی و هەڵکەوتووی بەوانی دیکەوە هەیە. ئەوانەی دەیانەوێت ڕاڤەی ئەم پەیوەندییە بکەن شوێن بۆچوونەکەی کۆمت دەکەون، کە بە "ماتریالیزم" ناوزەدیکرد؛ ئەویش ڕاڤەکردنی شـــتە بەرزەکانە لە شتە بچوکەکانەوەیە. هەندێک، بۆنموونە، دەڵێن، ئەو بابەتەی لێیدەکۆڵینەوە کەســـێکی وەرزش کارە، حەزی لە ڕاهێنان و مەشـــقێکی زۆرە، هەروەها حەزی لە وەرزشی نێو مەیدانی کراوەیە. بە

دووركەوتنەوە لە باســـە گشـــتییەكان و نزیكبوونەوە لە شتە وردە دیاریكراوەكان دەیەویت ئارەزووەكە دەستنیشـــان بـــكات، كە بەرانبەر شـــتەكانی دیكە، وەكو پەیوەندی نێوان جۆری بچوک و گەورەی ئاژەڵناسی، ڕادەوەستێت. ئەو توێژینەوە سایكۆلۆجییەی نایەوێت لە پڕا ڕاوەستێت، هەندێكجار پەیوەندی نێوان ئەو شتانەی پێكەوە یان دوای یەكدی سەرهەڵدەدەن باسدەكەن و پۆڵێنیان دەكات. باسكردنی پیرۆ، وەكو كەســـێک حەزی لە ســـەوڵلێدانە دەكەین بە یەكێک لە ئەندامانی ئەو وەرزشـــكارانەی حەزیان لە وەرزشی نێو مەیدان نییە و خێزانەكەشی بەگشتی بە وەرزشەوە دەبەستینەوە. ئەگەر وەرزش بە ئارەزوو بۆ ڕێكەوت پێناس بكەین شتی گشـــتی زۆرتر دەدۆزینەوە و بەسەر ئەودا دەیانســـەپێنین. ئەم جۆرە باسەش لە دانانـــی جۆری ڕووەكەكان لە خانەی جیاوازدا دەكات، كە زانا كۆنەكان پەیڕەویان دەكرد؛ لەشـــتە گشـــتییە ڕووتكراوەكانەوە بۆ شـــتە دیاریكراوە كۆنكرێتییەكان دەڕوات. لەپێشـــدا ئارەزووی وەرزشكردن بەگشتی هەبوو، دوایی ئەو ئارەزووە بوو بە ئارەزووكردن لە ســـەوڵلێدان، ئەویش دەبێت بە ئارەزووكردنی سەوڵلێدان لەنێو جۆگەیەک ئاوی دیاریكراودا و لە بارودۆخ و وەرزێكی دیاریكراودا.

چـــۆن بزانین ئارەزووكردن بۆ ســـەوڵلێدان ئارەزووی ســـەوڵلێدانە؟ ئایا ئێمە ناڵێین دەكرێت كەمیبكەینەوە بۆ ئەوەی هەیە؟ زانایانی ڕەوشـــت ڕوونیانكردۆتەوە چۆن ئارەزوو بە مەبەســـتەكانی ئەودیو خۆی دەگات. پاسكاڵ لەو باوەڕەدابوو لە كارەكانـــدا، بۆنموونە ڕاوكردن یان یاری تێنس پێویســـتییەک بە لادان هەیە. بە دیدی ئەو، لە هەموو چالاكییەكدا واتایەكی بەرز هەیە، كە ئاماژە بۆ ڕاستەقینەی مرۆڤ و بارودۆخی دەكات. بەهەمانشـــێوە، ستێنداڵ، لەگەڵ پەیوەندییەكەشی بە وانەی خاوەنی ئایدۆلۆجین و پرۆســـت ڕوونیدەكەنەوە، كە خۆشەویســـتی و غیرە بۆ ئارەزووكردنی خاوەنێتـــی تاكە ئافرەتێک كەمناكرێنەوە. بەڵكو ئەو ئارەزووانە دەیانەوێـــت هەموو جیهان لە ڕیگەی بوونـــی ئافرەتێكەوە داگیربكەن. ئەمە واتای "بەشوشەكردن"ە لای ستێنداڵ و لەبەر ئەم هۆیەشە خۆشەویستی بۆ ئەو شێوازێكی بوونە لەنێو جیهاندا. خۆشەویســـتی پەیوەندییەكی بنەڕەتی بوون-بۆ-خۆیە لەگەڵ جیهان و بوونی خۆیدا لە ڕێگەی تاكە ئافرەتێكەوە؛ ئافرەت نوێنەرایەتی لەشـــێک دەكات لەنێو سوڕانەوەكەدا دانراوە. دەشێ تەواوی ئەم شیكردنەوانە یان هەندێک لایەنی دروســـت بن؛ لەگەڵ ئەمەشـــدا ئێمە لە ئاســـتی میتۆدەكەدا توشی گومان دەكەن. بەهەمانشـــێوە، ڕۆماننوسە كاسۆلیكەكان ڕاستەوخۆ لە خۆشەویستییەكی پاكدا دەبینن، كە مرۆڤ ڕوو لە خوا دەكات. دۆن ژوان "بۆ هەمیشـــە نەیدەتوانی تێـــر بێت" و لە تاوانەكانیدا "خوا لە هیچ شـــوێنێک نەبوو." لێرەدا پرســـیارەكە سەبارەت دۆزینەوەی شـــتێكی گشتی و ڕووتكراوە لەودیو شتە كۆنكرێتییەكانەوە نییـــە؛ هانـــدەری ڕوو لە خوا كـــردن، وەكو ڕووكردن لە ئافرەتێـــک كۆنكرێتییە. هاندەر تاكەكەسی و تایبەتە. بەوجۆرەی (بۆرگێت) شیدەكاتەوە، بۆنموونە، باسی پێكهێنانی تاكەكەس لە ڕێگەی كۆكردنەوەی پێوەرە گشـــتییەكانەوە، هاندەرەكە پێویستی نوسین و نوسینی پەرتووكێكی تایبەتمان بۆ دەرناخات، بەڵكو پێویستی

چالاکییەکە بەگشتی دەدۆزێتەوە. ڕەتدانەوەی بیردۆزەی قوڕە شێلراوەکە و کڵافەی هاندەرەکان دەبێتە هۆی دۆزینەوەی تاکەکەس لە پرۆژە سەرەتاییەکەیدا، کە بوونی ئەو پێکدەهێنێت. ئەمەش کەمنەکردنەوەی ئاکامەکە دەکات بە بەڵگەنەویست نەک لەبەر ئەوەی هەژارترین و ڕووتکراوەترینە بەڵکو دەوڵەمەنتر نییە. دەرک کردنەکە هەمووی تاکە کەسەکەی لەگەڵدا دەبێت.

گرفتەکە لەم خاڵانـــەدا دەردەکەوێت: ئەگەر لـــەو باوەڕەدابین، کە تاکەکەس بوونێکی هەمووگری هەیە، ئەوا ناتوانین هیچ بخەینە سەربوونی یان بوونی بە دانانی حەزە جیاوازەکانی دابنێین، کە ئێمە لە ئەزمونەکانمدا دۆزیماننەوە. بەپێچەوانەوە، لە هەر یەکێک لەو حەز و ئارەزوانەدا کەســـەکە تەواوی بوونی خۆی دەردەبڕێت. هەڵبەتە لە گۆشـــەیەکی جیاوازەوە یان بەوجۆرەیە جەوهەرەکەی ســـپینۆزا خۆی لەنێو خەســـڵەتەکانیدا دەردەخات. ئەگەر ئەمە دروســـتبێت، لەنێو هەریەکێک لە ئـــارەزوەکان یان هەڵوێســـتێکدا واتایەکی بەرز دەدۆزینەوە. غیرەی کەســـێک لە ڕۆژێکی دیاریکراودا و بەرانبەر ئافرەتێک ڕۆشنایی دەخاتە سەر ڕاڤەکردنی هەموو پەیوەندییەکانی[ئەو کەسە]لەگەڵ جیهاندا. ئەو هەڵوێستە ئەزمونگەرییە دەربڕینە بـــۆ "هەڵبژاردنی ڕەفتارێکی ئاگامەندانە." ئەمەش هیچ لایەنێکی شـــاراوەی نییە. ئەگەر ئەزمونەکە ئاماژە بۆ هەڵبژاردنی ڕەفتارێکی ئاگامەندانە بکات ئەوا ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە[ڕەفتارەکە]خودی هەڵبژاردنەکەیە. بێگومان، خەسڵەتی ڕەفتارێکی ئاگامەندانە، کە لەدوایدا باســـیدەکەین، واتایەکی بەرزە بۆ هەموو هەڵبژاردنێکی ئەزمونـــی و کۆنکرێتـــی. بە هیچ جۆرێک لایەنی نا-ئـــاگا کاری تێناکات؛ تەنانەت شتیکی ئۆنتۆلۆجی پێویستداریش پێش هەڵبژاردنە ئەزمونییەکە ناکەوێت. ئەگەر من سەوڵێبدەم بێجگە لە بوونم، وەکو کەسێک سەوڵێدەدات لێرە و لە شوێنێکی دیکە هیچ نیم. ئەم پرۆژەیە، کە هەموو بوونم دەردەخات هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکەم لەنێو بارو دۆخێکی تایبەتیدا دەردەبڕێت؛ بێجگە لە هەڵبژاردنی هەموو بوونم هیچی دیکە نییە. لەبەر ئەمەشـــە دەبێت میتۆدێک هەبێت واتا بنەڕەتییەکەی پرۆژەکە، کە نهێنی تاکە کەســـەکەیە لەنێو جیهاندا جیاکاتەوە. بـــە بەراودکردنی ئارەزووە جۆراوجۆرەکانی تاکە کەســـێکیش پرۆژە بنەڕەتییەکە دەدۆزینەوە، کە دەبێت بە زەمینەیەکی هاوبەشیان نەک بە کۆکردنەوەی هەموویان؛ هەریەکێک لە ئارەزووەکان نوێنەرایەتی هەمووی بوونی کەسەکە دەکات.

بەوشێوەیەی بوونی مرۆڤەکان نەبڕاوەیە ئەگەری پرۆژەکانیش نەبڕاوەن. ئەگەر یەکێک لە خەســـڵەتەکان بناسین و لەنێو کاتیگۆری گەورەتردا ڕیزیبکەین باشترە لە حاڵەتە ئاســـانەکانەوە توێژینەوەکەمان لەســـەر تاکە کەسەکە دەستپێبکەین. لە توێژینەوەکەماندا شـــوێن ئەم یاســـایە دەکەوین؛ تەنیا لە ئاســـتی بەڵگەیەکی کەمنەکراوەدا بوەســـتە؛ واتە، لەو باوەڕەدامەبە بە پرۆژە سەرەتاییەکە گەیشتویت تاکو کۆتایی پرۆژەکە خۆی، وەکو بوونی ئەو بابەتەی لێیدەکۆڵیتەوە، دەرنەخات. لەبەرئەم هۆیەشـــە ناتوانیـــن لەبەردەم خانەدانی "پرۆژەی ڕەســـەن" و "پرۆژەی ناڕەسەن"ی هایدیگەردا کۆتای بە توێژینەوەکەمان بهێنین. هەرچەندە ئەم ڕیزکردنە

ڕەهەندێکی ڕەوشتی هەیە و لە چەمکە بەکارهێنراوەکانیشدا دەردەکەوێت، پەیوەندی بە هەڵوێســـتی (خۆ)وە لەگەڵ مردندا هەیە. ئەگەر مردن بۆ سەرهەڵدانی دوودڵی ببێتە هۆکار، لە ئاکامیشـــدا ئێمە دەبێت خۆمان لە دەست دوودڵی ڕزگار بکەین یان بە بڕیاردانەوە بازدەینە نێوی. ڕاستییەکی سادەیە ئەگەر بڵێین ئێمە لەپێناوی ژیانـــدا ئەوکارە دەکەین. لە ئاکامدا، دوودڵی لەبـــەردەم مردندا و بڕیاردانەکە یان هەڵهاتنەکەمان ڕووەو بوونێکی ناڕەسەن نابێت بە پڕۆژەیەکی بنەڕەتی لە بووناندا. تەنیا لەســـەر بناخـــەی پڕۆژەی بنەڕەتـــی ژیان لە واتاکـــەی تێدەگەین؛ ئەویش هەڵبژاردنی بنەڕەتی بوونی خۆمانە. کەوابوو، دروســـتە هەموو جارێک ئاکامەکانی ڕاڤەکردنەکەی هایدیگەر تێپەڕبکەیـــن و ڕووەو پڕۆژەیەکی بنەڕەتی بڕۆین. نابێت پڕۆژە بنەڕەتییەکە ئاماژە بۆ شتێکی دیکە بکات و پێویستە وەکو خۆی بناسرێت. نابێـــت پەیوەندی بە ژیان و مردنەوە یان خەســـڵەتێکی دیاریکـــراوی بارودۆخی مرۆڤـــەوە هەبێت؛ پڕۆژەی بنەڕەتی بوون-بۆ-خۆ تەنیا ڕوو لە بوونی[بوون-بۆ-خۆ] دەکات. پڕۆژەی بوون یان ئارەزووی بوون لەنێو لایەنە جیاوازە ســـایکۆلۆجییەکان و هەڵکەوتە ئەزموونییەکاندا نییە؛ لەڕاستیدا لە بوونی بوون-بۆ-خۆ جیاناکرێتەوە. بوون-بۆ-خۆ ئەو جۆرە بوونەیە، کە لە بوونیدا پرســـیاکردن، وەکو پڕۆژەی بوونی هەیـــە. بۆ بوون-بۆ-خۆ بوون ئەوەیـــە خۆی لە ڕێگەی ئەگەرەکانەوە، کە دەبن بە بەها، بناســـێت. پێناســـەی ئۆنتۆلۆجییانەی بوون-بۆ-خۆ ئەوەیە، کە ئەم بوونە کەمییـــە. ئەگەریـــش کەمییە لەم بوونەدا. بەوجۆرەی ئـــەم بوونە لە هەمووگیری بێبەشە بەهاش بووە بە دێوە زمەی

لە کەرتی دووەمی ئەم نوســـراوەدا باسمانکرد، کەمی سەربەستییە. بوون-بۆ-خـــۆ خاوەنـــی هەڵبژاردنە چونکە کەمی لە بوونیدایە؛ سەربەســـتی و کەمی یەک شـــتن. سەربەستی شـــێوازێکی کۆنکرێتی بوونی کەمییە لە بووندا. لەبۆچوونێکی ئۆنتۆلۆجییانـــەوە، بەها و ئەگەری بوون ســـنوری ناوەکی کەمین، کە تەنیا وەکو کەمی بوون دەتوانێت هەبێت یان ســـەرهەڵدانی سەربەستی ئەگەرەکە دیاریدەکات و دەوری بەهاکەشی دەدات.

لێرەوە زۆرتر هەنگاو نانێین، بەڵام شـــتە کەمنەکراوە بەڵگە نەویستەکەمان بە گەیشتن بە پڕۆژەی بوون بینیوەتەوە؛ لەبەر ئەمە مەحاڵە بوون تێپەڕبکەین. هەروەها جیاوازیش لەنێوان پڕۆژەی بوون، ئەگەر و بەها لەلایەک و بوونیش لەلاکەی دیکەوە نییە. لە بنەڕەتدا مرۆڤ ئارەزووکردنە بۆ بوون. بوونی ئارەزووکردنەکەش لەســـەر ئیندەکشنی ئەزموونگەرانە دانامەزرێت؛ ئاکامی باسکردنێکی لەپێشتری بوونی بوون-بۆ-خۆیە چونکە ئارەزوو کەمییە و بوون-بۆ-خۆ ئەو کەمییەی لە بوونیدا هەڵگرتوە. پـــڕۆژە بنەڕەتییەکەی لە ئەزموونەکاندا دەبینرێـــت، کەوابوو، پڕۆژەی بوونە؛ یان، هەریەکێـــک لە ئەزموونـــەکان لەگەڵ پڕۆژە بنەڕەتییەکەدا هەیـــە. بۆ فرۆیدیش بە پەیوەندییە ئاڵۆزەکە و بنەڕەتی (لبیدۆ)وەیە. ئارەزووی بوونیش شتێکی لەپێشتر بۆ بوونی خۆی نییە. هیچ شتیک پێش دەربڕینە هێماییەکە ناکەوێت، کە ئارەزووە

کۆنکریتییەکان دەدۆزێتەوە. لەسەرەتاوە، یەکجۆر ئارەزووی بوون پەیدا نابێت و دوای ئەو هەزار هەستکردن سەرهەڵدەن، بەڵکو ئارەزووی بوون هەیە و خۆی لەنێو غیرەکردن، تەماع، خۆشەویستی بۆ هونەر، ترسنۆکی، ئازایەتی و هەزار جۆر دەربڕینی هەڵکەوتوی دیکەدا بەرجەستە دەکات.

ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەڕێگەی تاکە کەسێکەوە بۆ ئێمە ئاشکرا دەکات. ئێمە بابەتی ئارەزووەکە لەپێشدا دەناسین. بوونـ‌بۆـخۆ ئەو بوونەیە، کە کەمی لە بوونیدایە. ئەو کەمییەی بوونـ‌بۆـخۆ هەیەتی بوونـ‌لەنێوـخۆیە. بوونـ‌بۆـخۆ، وەکو لەناوبەری بوونـ‌لەنێوـخۆ سەرهەڵدەدات. ئەم لەناوبردنە پڕۆژەیە بەرەو بوونـ‌لەنێوـخۆ. بوونـ‌بۆـخۆ لەنێوان بوونەـ‌لەنێوـخۆ لەناوبراوەکە و بوونەـ‌لەنێوـخۆی ناوپڕۆژەکەدا هیچ نییە. کۆتایی و ئامانجی لەناوبردنەکە، کە منم دەبێت بە بوونـ‌لەنێوـخۆ. کەوابوو، ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی ئارەزووە بۆ بوونـ‌لەنێوـخۆ. بەڵام، ئەو بوونـ‌لەنێوـخۆیەی ئارەزوومەندە هەڵکەوتنێکی ڕووت نییە یان لەنێوـخۆیەکی بێهودە نییە. لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ ئەو بوونەی لەناویدەبات بەراود دەکرێت.

لەناوبردن، وەکو بینیمان، شۆڕشی بوونـ‌لەنێوـخۆیە بۆ لەناوبردنی بوونی خۆی دژی هەڵکەوتن. کاتێک دەڵێین بوونـ‌بۆـخۆ بە فاکتۆرەکانییەوە دەژی، وەکو لەو بەشەدا باسی لەشمان کرد، ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لەناوبردن بۆ دۆزینەوەی بوونی خۆی کارێکی پوچەڵی بوونە. هەروەها دوورکەوتنەوەیە لە دامەزراندنی ئەو بوونەی نەبوون دەهێنێتە بوونییەوە. ئەو بوونەی بابەتی ئارەزووی بوونـ‌بۆـخۆ دروستدەکات بوونـ‌لەنێوـخۆیە، کە دەتوانێت ببێت بە بناخە بۆ بوونی؛ واتە، پەیوەندییەکەی لەگەڵ فاکتۆرەکەیدا لە پەیوەندی نێوان بوونـ‌بۆـخۆ و هاندەرەکانی دەچێت. لەسەرو ئەمەوە، بوونـ‌بۆـخۆ، کە ڕەتدانەوەی بوونـ‌لەنێوـخۆیە، ناتوانێت ئارەزوویەکی سادە و ڕووتی بۆ گەڕانەوە بەرەو بوونـ‌لەنێوـخۆی هەبێت. لێرەدا، ئێمەش لەگەڵ هیگڵدا دەڵێین، ڕەتدانەوەی ڕەتدانەوە بۆ خاڵی سەرەتا نامانگەڕێنێتەوە. ئەوەی بوونـ‌بۆـخۆ لە بوونـ‌لەنیوـخۆ داوادەکات، هەمووی ناـ‌هەمووی "بوونـ‌لەنێوـخۆ لەناوبراوەکەیە لەنێو بوونـ‌بۆـخۆدا." بە واتایەکی دیکە، بوونـ‌بۆـخۆ، ئەو بوونەی هەیە، دەکات بە پڕۆژە. ئەوەش وەکو ئەو بوونەیە، کە هێشتا نییە و ئەوەش نییە، کە ئێستا هەیە. ئەو، کە ئاگامەندییە، دەیەوێت چارەنوسێکی نەبڕاوەی، وەکو بوونـ‌لەنێوـخۆی هەبێت. وەکو لەناوبەرێکی بوونـ‌لەنێوـخۆ و داگیرکەرێکی هەمیشەیی هەڵکەوتنەکان و فاکتۆرەکان دەیەوێت ببێت بە بناخەی بوونی. لەبەر ئەم هۆیەشە ئەگەر بەگشتی، وەکو کەمی بوونـ‌بۆـخۆ دەکرێت بە پڕۆژە تاکو ئەم بوونە ببێت بە بوونـ‌لەنێوـخۆ. بەهای سەرەکی ئەم پڕۆژەیە بوونـ‌لەنێوـخۆیـ‌بوونـ‌بۆـخۆیە؛ واتە، ئاگامەندی دەیەوێت بە ڕێگەی ئاگامەندییە ڕەوانەکەی، ببێت بە بناخەی بوونـ‌لەنێوـخۆی بوونی.

ئەم وێنەیە بە بوونی خوا ناوزەددەکەین. کەوابوو، چاکترین ڕێگە بۆ تێگەیشتن لە پڕۆژە بنەڕەتییەکەی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی لەوێدایە بڵێین مرۆڤ دەیەوێت ببێت بە خوا. گرنگ نییە ئایینەکان لەسەر چ جۆرە ئەفسانەیەک دامەزرابن، خوا، لەپێش هەمووشـــتێکدا، "بۆ دڵ پڕواتایە" چونکە بە کۆتایی پڕۆژە بنەڕەتییەکەی بوون دادەنرێت.

ئەگەر مرۆڤ تێگەیشتنی پێش ئۆنتۆلۆجییانەی بۆ بوونی خوا هەبێت، جێگەی سەرســـوڕمان نییە و دەســـتەڵاتێکی کۆمەڵایەتیش بە خۆی نادات. خوا، بەها و دواکۆتایی بەرزێتی نوێنەرایەتی سنورێکی هەمیشەیی دەکات، کە مرۆڤ دەیناسێت. بوون بە مرۆڤ گەیشتن بە بوون بە خوایە یان مرۆڤ لەبنەڕەتەوە ئارەزووی بوون بەخوایی دەکات. دەشێ ئەو پرسیارەش بکرێت، ئەگەر بوونی مرۆڤ لەنێو جیهاندا بوون بێت بەرەو خوایەتی یان ســـنوری خۆی، ئەگەر ئەو بوون بەخوا هەڵبژێریت، چی بەسەر سەربەستی دێت؟ چونکە سەربەستی بێجگە لە هەڵبژاردنی ئەگەرەکان چی دیکە نییە. بەڵام لێرەدا، دەردەکەوێت پڕۆژەی ســـەرەتایی بوون بە خوا، کە پێناســـەی بوونی مرۆڤ دەکات، لە بوونی "سروشـــت" یان "جەوهەر" بۆ مرۆڤ نزیک دەبێتەوە. وەڵامی پرســـیارەکەش ئەوەیە، کە لە کاتێکدا واتای ئارەزووەکە لـــە پڕۆژەی بوون بە خوادایە، دەبێت بزانین، کە ئەم واتایە ئارەزوو پێکناهێنێت؛ بەپێچەوانەوە، نوێنەرایەتی یەکێک لـــە کۆتاییە دۆزراوەکانی دەکات. کۆتاییەکان هەڵوێســـتێکی دیاریکراوی ئەزمونەکانن. شوێنکەوتنمان بە دوای ئەم کۆتاییانەدا دەوروبەری هەڵوێســـتەکە دیاریدەکات. ئارەزووی بوون هەمیشە ئارەزووکردنە بۆ شـــێوازێکی بوون. ئارەزووکردنی شێوازێکی بوونیش خۆی لەنێو واتای ژمارەیەکی زۆری ئارەزووە کۆنکرێتییـــەکان دەردەبڕێت، کە ژیانی ئاگامەندیمان پێکدەهێنن. لێرەدا، خۆمان لە ئاستی بونیادێکی هێمایی ئالۆزدا دەبینین. ئەم بونیادەش سێ نهۆمـــی هەیە. لە ئارەزووی ئەزمونیدا هێماکانی ســـەر بە ئارەزوویەکی بنەڕەتی و کۆنکرێتی ئاشـــکرادەکەم، کە بوونی تاکە کەســـەکەیە و نوێنەرایەتی ئەو شێوازە دەکات، کـــە لەنێویدا بڕیاریداوە ئەو بوونە بێت پرســـیاری لەبارەوە دەکات. ئەم ئارەزووە بنەڕەتییە دەربڕینێکی کۆنکریتانەیە لەنێو جیهاندا و لەنێو هەڵوێستێکی دیاریکراودا، تاکە کەسەکە و واتای بونیادە ڕووتکراوەکە، کە ئارەزووی بوونە بەگشتی، دەپێچێتەوە؛ دەبێت بە ڕاستەقینەیەکی مرۆڤانە و لە بوونی تاکەکەسەکەدا دابنرێت. پەیوەندییەکەی لەگەڵ کەسانی دیکەشدا ئاشکرادەکات. ئەمەش ڕێگەدەدات ڕاستی لەبارەی بوونی مرۆڤەوە نەک تەنیا تاکە کەســـێک بناسین. کۆنکرێتییەکەی ڕەها، تەواوکردن و هەمووگیری بوون ســـەر بە ئارەزووی بنەڕەتی و سەربەســـتییە، کە بوونی تایبەتمەندی کەسەکەیە. ئارەزووی ئەزمونی هێمایی ئەمەیە؛ ئاماژە بۆ ئەمە دەکات و واتاکەشی لەمەوە دەردەچێت. ئارەزووی بوونیش لە فۆرمە ڕووتکراوەکەیدا

ڕاستی ئارەزوویەکی کۆنکرێتی و بنەڕەتییە، بەڵام لەسەر ڕاستەقینە ڕاناوەستێت. کە وابوو، پرۆژە بنەڕەتییەکە یان کەسەکە و ناسینەوەی سەربەستانە بۆ ڕاستی بوونی مرۆڤ (بێجگە لەو شـــتە ناجۆرانەی لە بەشی پێشوی ئەم نوسراوەدا باسمانکردن) لە هەموو شوێنێکدا لەنێو ئارەزووەکاندا هەن. لەڕێگەی ئارەزووەوە نەبێت هەستیان پێناکرێت. ئەمەش، وەکو هەستکردن بە شوێن لەڕێگەی تەنەکانەوەیە، هەرچەندە شـــوێن چەمک نییە و ڕاســـتەقینەی خۆی هەیە. یان، ئەگـــەر حەزبکەیت، وەکو بابەتەکەی هوسرڵ وایە، کە تەنیا خۆی بۆ هەڵسەنگاندن بەبێ توانەوە دەردەخات. پاش ئەم ڕوونکردنەوانە تێدەگەین، ئارەزووی ڕووتکراوەی ئۆنتۆلۆجییانە بۆ بوون نوێنەرایەتـــی بونیادی بنەڕەتی و مرۆڤانەی تاکەکەس نـــاکات؛ نابێت بەڕێگریش لەبەردەم سەربەســـتییەکەیدا. سەربەستی، وەکو لە بەشی پێشوی ئەم نوسراوەدا باســـمانکرد، لەناوبردنە. ئەو بوونەی بە سەربەســـت ناوزەدیدەکەین ئەوەیە، کە بوونی خۆی لەناودەبات. هەروەها دەزانین، کە لەناوبردن کەمی بوونە و هیچی دی نییە. سەربەســـتی، بەتەواوی، ئەو بوونەیە، کە خۆی بە کەمی دەردەخات. بەڵام مـــادام ئارەزوو کەمی بوونە ئەوا سەربەســـتی دەبێت بە ئارەزووی بوون؛ پرۆژەی بوونـ-بۆ-خۆیە بۆ بوونـ-لەنیو-خۆیـ-بوونـ-بۆ-خۆ. ئەمەش بونیادێکی ڕووتکراوەیە، کە نابێ بە سروشت یان جەوهەری سەربەستی دابنرێت. سەربەستی بوونە و ئەو بوونەش پێش جەوهەر دەکەوێت. ســـەرهەڵدانی سەربەستی کتوپڕ و کۆنکرێتییە. لەسەر هەڵبژاردنیش دانامەزرێت؛ ئەم بونیادەی باسیدەکەین ڕاستی سەربەستییە؛ واتای مرۆڤە بۆ سەربەستی.

دەگونجێت ڕاســـتی مرۆڤانـــەی تاکە کەس بە فینۆمینۆلۆجـــی ئۆنتۆلۆجییانە بدۆزینـــەوە. بۆ ئـــەم کارەش لیســـتی ئـــارەزووە ئەزموونییەکان لـــە توێژینەوە سایکۆلۆجییەکەدا دروستدەکەین. ئەمانە، بۆ فەیلەسوف، ئاماژە بۆ پەیوەندییەکان دەکەن، کە خۆیان بە شێواز و ئارەزووەکانی دیکەوە دەبەستنەوە. پەیوەندییەکی کۆنکرێتیـــش لەنێوان کەســـەکە و هەڵوێســـتەکانیدا دەردەخات، کـــە دەتوانین ئەزمونگەریانـــە پێناســـیبکەین. بەڵام بـــۆ دانانی ئارەزووەکانی تاکە کەســـەکان لەنێوخانەدا میتۆدەکان یارمەتیمان نادەن. ناتوانین پرســـیار لەبارەی ئەو شـــتە لەپێشـــترە بکەین و ئۆنتۆلۆجییانە بۆ پێشـــبینی نەکردنی کارە سەربەســـتەکە دابینێین. لەبەر ئەمەشـــە ئەو پرســـیارە لە خۆمان ناکەیـــن. لەهەرچ حاڵەتێکدا بمانەوێت کەســـێک بکەین بە بابەتی توێژینەوەکەمان دەبێ بزانین، کە ئەو کەسە بەگشتی سەر بە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە. یان، ئەگەر حەزبکەیت دەڵێین، ئەمەیە لەســـەر بناخەی ئۆنتۆلۆجـــی دادەمەزرێت. بەڵام توێژینەوە و ئاکامەکانیشـــی لە دەرەوەی ئەگەرەکانی ئۆنتۆلۆجیدان.

لەلایەکـــی دیکـــەوە، لێکۆڵینەوەیەکـــی ســـادە، ڕەوان و ئەزمونگەرانە تەنیا

کەتەلۆگەکان دەخاتە بەردەستمان و شتە کەمنەکراوە ساختەکان (وەکو، ئارەزوو بۆ نوسـین، مەلەکردن، حەزکردن لە گەشـت و کاری مەترسـیدار، غیرەکردن و هتـد) خۆیان دەسـەپێنن. دانانی لیسـتی ڕەفتار و ئـارەزووەکان بەس نییە و دەبێت چارەسـەربکرێن؛ پێویستە بزانین چۆن پرسـیار لەبارەیانەوە بکرێت. ئەم توێژینەوەیەش بەگوێرەی یاساکانی میتۆدێکی تایبەت دەخرێتەگەر و بە سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی ناوزەدیدەکەین.

بنەمای ئەم سـایکۆلۆجییە شیکارییە ئەوەیە، کە بوونی مرۆڤ هەموو- گیرییە نەک کۆکراوە. لەم ڕووەوە، تەنانەت لە ڕەفتارێکی بچوکی نا-گرنگدا مرۆڤ هەموو بوونـی خۆی دەردەبڕێت. هیـچ تام، کردەوە و ڕەفتارێـک نییە هەمووی مرۆڤی تێدا بەرجەستە نەبێت. ئامانجی سـایکۆلۆجی شیکاری چارەسەرکردنی ڕەفتاری ئەزموونی شـێوازی بوونی مرۆڤە؛ دەیەوێت هەریەکێک لـەو ڕەفتارانە لە ڕێگەی چەمکەکانەوە بناسێت و چارەسەریان بکات.

خاڵی دەرچوونیشی ئەزموونە؛ ئەستونی ڕاگرتنی تێگەیشتنێکی بنەڕەتی و پێش ئۆنتۆلۆجییانەیە، کە مرۆڤ، وەکو تاکە کەس هەیەتی. هەرچەندە زۆرینەی خەڵک گوێ نادەنە ئەو ئاماژەکردنانەی لە دەموچاو گۆڕین و وشەیەک یان تەماشاکردنێکدا هەن، بەڵام هەموو مرۆڤێک لەگەڵ خۆیدا و لەپێشتر واتای ئەو بەهایانە دەزانێت، کە دەیەوێت دەریانبڕێت و تەوانای چارەسەرکردنیشـیانی هەیە، بەتایبەتی ئەگەر یارمەتی بدرێت.

لێرەدا، وەکو لە هەموو شـوێنێکی دیکەدا، بە ڕێکەوت ڕاسـتی نادۆزرێتەوە؛ بەو شـێوەیەی کەسێک بەدوای سـەرچاوە و کانیاوی ڕووباری (نیل) یان (نایجیر) دا دەگەڕێت لە شوێنێکیشـدا دانەنراوە تاکو مرۆڤ بیگاتێ. لەپێشـدا سـەر بە تێگەیشـتنی مرۆڤە و کاری هێرمنیۆتیکە بیدۆزێتەوە؛ ئەمەش چارەسەرکردنەکە، سـوربوون لەسـەر و بە چەمکردنی دەگرێتەوە. میتۆدەکەی بەراوردکردنە. مادام هەریەکێک لە کردەوەکانی مرۆڤ هێمایە بۆ هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکەی، کە دەبێت ڕۆشـنایی بخرێتەسەر، مادام هەریەکێک لەو کردەوانە هەڵبژاردنەکە دەشارێتەوە و بە شێوەیەکی دیکە لەنێو هەلومەرجەکانی مێژوودا دەریدەخات، تەنیا بەراوردکردنی ئەم کردەوانە کاردەکاتە سەر دەرکەوتنە تایبەتییەکەیان و دەربڕینی ڕێگای جیاواز لە سەرهەڵدانیان. فرۆید و شوێنکەوتوانی یەکەم نەخشەی سایکۆلۆجی شیکارییان کێشـاوە. بۆ ئێمەش بە سوددەبێت ئەگەر خاڵە هاوبەشـەکان و جیاوازییەکانی سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی و فرۆیدی ڕوونبکەینەوە.

هەر دوو جۆرە سایکۆلۆجییە شکارییەکە هەموو بەرجەستە بوونە دەرەکییەکانی "ژیانی دەروونی" بە هێما و پەیوەندی هێمایی لەگەڵ بونیادی هەمووگیری و بنەڕەتی کەسـایەتی تاکەکە دادەنێن. هەردووکییان لەو باوەڕەدان هیچ شتێکی لەپێشتری

دراو، وەکو میراتی، خەسڵەت و هتد نییە. سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایی باوەڕ بە بوونی هیچ شتێک لەپێش سەرهەڵدانی سەربەستی مرۆڤەوە ناکات؛ سایکۆلۆجی شـــیکاریش دەڵێت، کــە کاریگەرێتییە بنەڕەتییەکە پێش مێـــژوو مۆمێکە هیچی لەســـەرهەڵنەکەنراوە. لیبدۆ تەنیا چەقە کۆنکرێتییەکانێتی. هەردووکیان مرۆڤ بە بوونەوەرێک دادەنێن، کە بەردەوام دەگەڕێ و مێژوو دروستدەکات. هەردووکیان لەو باوەڕەدان مرۆڤ لەنێو جیهاندایە و بەبێ تێگەیشتن لە هەموو هەڵوێستەکانیشی لە بوونی تێناگەین. ئامانجی توێژینەوەی سایکۆلۆجی بونیادنانەوەی ژیانی کەسەکەیە لە یەکەم ڕۆژی ژیانییەوە تاکو کاتی چاک بوونەوەکەی؛ هەموو زانیارییەک سەبارەت کەســـەکە پەیدادەکەن؛ بـــەدوای نامەکانی، گەواهـــەکان، ئارەزووەکانی و هەموو جۆریک لە زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێن. ئەوەی دەیانەوێت دایبمەزرێننەوە بونیادێکی دوو لایەنییە؛ بەســـەرهاتی گرنگی منداڵی و بارە دەروونییەکەی دەوری ئەم ڕووداوەیە. لێرەدا، جارێکی دیکە مامەڵە لەگەڵ هەڵوێســـتدا دەکەین. هەموو فاکتۆرێکی "مێژوویی" لەم بۆچوونەوە دەبێت بە فاکتۆرێکی گەشەکردووی دەروونی و هێمای گەشەکردنەکەش چونکە ئەو بە تەنیا هیچ نییە. کارکردنەکەی دەکەوێتە ســـەر مامەڵەکردن لەگەڵیـــدا. مامەڵەکردنەکەش بە هێما مەیلـــی ناوەوەی تاکە کەسەکە دەردەبڕیت.

ســـایکۆلۆجی شیکاری و ســـایکۆلۆجی بوونگەرایەتی لەنێو هەڵوێستەکەدا بۆ ڕەفتارێکی بنەڕەتی دەگەڕین، کە لەڕێگەی پێناسەی سادە و لۆجیکەوە دەرنابڕێت چونکـــە پێش هەموو لۆجیکێـــک دەکەوێت و دەبێت بەگوێرەی یاســـاکانی جۆرە تیهەڵکێشکردنێک دابمەزرێتەوە. سایکۆلۆجی شیکاری ئەزمونگەرانە دەیەوێت شتە ئاڵۆزەکان دیاریبکات. سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی هەلبژاردنە بنەڕەتییەکەی دوێت. هەڵبژاردنی بنەڕەتی کار لەســـەر جیهـــان دەکات و هەڵبژاردنی حاڵەتێکە لەنێو جیهاندا و وەکو شـــتە ئاڵۆزەکان هەمووگیرییە و پێش لۆجیکیش دەکەوێت. ئەمەیە کاتێک ڕووبەڕووی یاساکان و لۆجیک دەبێتەوە بڕیار لەسەر ڕەفتاری تاکە کەس دەدات. کەوابوو، پرســـیار لەبارەی لۆجیکەکەیەوە ناکەین. لەگەڵ خۆیدا و پێش تێهەڵکێشکردنی لۆجیکانە هەمووگیری بوون دەهێنێت. بۆ واتاکانیش دەبێت بە کرۆکی ئاماژەکردن.

هەردوو جۆرە ســـایکۆلۆجییە شـــیکارییەکەش بابەتـــی لێکۆڵینەوەکەیان لە بارودۆخێکی تایبەتدا دانانێن و لەوێوە توێژینەوەکە بخەنەگەڕ. هەردووکیان جەخت لەسەر میتۆدێکی بابەتی دەکەن و زانیارییەکانی تاکە کەسەکە و بۆچوونی کەسانی دیکەش کۆدەکەنەوە. هەڵبەتە، کەسەکە دەتوانێت دەروونی خۆی شیبکاتەوە. بەڵام، دەبێت واز لە ســـودوەرگرتن لە حاڵەتەکەی بهێنێت و بەوجۆرەی کەســـێکی دیکە پرسیاری لێدەکات پرسیار لە بوونی خۆی بکات. سایکۆلۆجی شیکاری ئەزمونگەری

لەسەر گریمانەی بوونی لایەنی دەروونی ئەودیو ئاگاییەوە ڕەگدادەکوتێت، کە لەژێر درککردنی کەسەکە ڕادەکات. سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی گریمانەی ئەودیو ئاگایی ڕەتدەداتەوە؛ کارە دەروونییەکە و ئاگامەندی پێکەوە دەگونجێنێت. ئەگەر پرۆژە بنەڕەتییەکە لە ئەزمونی تاکە کەسەکەدا بێت و کەسەکەش بەئاگا بێت ئەوە ناگەیەنێت، کە بەهەمانجۆر دەبێ ئەو بیزانێت؛ بەتەواوی بەپێچەوانەوەیە. خوێنەر لەبیرێتی چۆن لە پێشەکی ئەم نوسراوەدا ئاگایی و زانینمان لەیەکدی جیاکردەوە. بێگومـــان، تێڕامان بە ڕواڵەت بە زانیـــن دادەنرێت. بەڵام ئەوەی تێڕامان دەیگاتێ هەمـــوو کاتێک پرۆژە ڕووتەکەی بوونِ-بۆ-خۆ نییـــە، کە بە هیماکان دەردەبڕێت. ڕەفتـــارە کۆنکرێتییەکە دەبینێت؛ کە لەنێو تۆڕی هەموو خەســـڵەتەکاندا ڕۆژێکی دیاریکراوی ئارەزووە. لە یەک کاتدا هیما و بەهیماکردنیش دەســـتگیردەکات. ئەم تێگەیشـــتنە تێگەیشـــتنێکی پێش-ئۆنتۆلۆجییانەی پرۆژە بنەڕەتییەکەیە؛ بەڵام تەکنیـــک و ئامێرەکان بۆ دووردانانی هەڵبژاردنی بەهێماکردنەکە ناگرێتەدەســـت. لەنێو چەمکەکاندا ڕاگیریان ناکات و ڕۆشنایی ناخاتەسەر.

ئێمە لێرەدا، وەکو فرۆیدییەکان مامەڵە لەگەڵ مەتەڵێکی نەزانراو ناکەین؛ ئەوەی هەیە شتێکە ڕووناکی خراوەتە سەر؛ تێڕامان بووە بە خاوەنی و تێیدەگات. بەڵام ئەم "شتە شاراوەیەی بەر ڕووناکی خۆر" لەبەر ئەوە هەیە چونکە خاوەنێتییەکەی بێ وەســـیلەیە، کە ڕێگە بۆ شـــیکردنەوە و بەچەمککردنی دەدات. هەموو شتێک بەبێ ســـێبەر، بەرەڵاکردن و پەیوەندییە گـــەورەکان دەگرێت. نەک لەبەر ئەوەی ئەمانە لە شـــوێنێکی جیاوازتردا دانراون بەڵکو دەبێت هەڵوێستی کەسێکی دیکە دایانبمەزرێنێت و تەنیا بە هۆی زانینەوە هەن. تێڕامان نابێت بە بناخەی سایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی. تەنیا کەرەســـەکانمان دەداتێ و بیریارە دەروونناسەکە لییاندەکۆڵێتەوە. ئەویش لە تێگەیشـــتنەکە دەزانێت. لە ئاکامدا، شتە ئاڵۆزەکان لەودیو ئاگاییەوە دەردەهێنرێن. ئەمەش لەو پرۆژانە دەکات ســـایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی دەریاندەخات و کەسەکەی دیکە لێیان تێدەگات. لەئاکامدا، ئەو بابەتەی ڕۆشنایی دەخرێتەســـەر بەگوێرەی بونیادەکانی بەرزێتی-بەرزکراو پێکدێت؛ واتە، بوونی دەبێت بە بوونِ-بۆ-کەسانی دیکە. گرنگیش نییە کەسەکە و دەروونناسەکە دوو کەســـی جیاوازیـــش نەبن. ئەو پرۆژەیەی یەکێک لەم جۆرە ســـایکۆلۆجییانە دایدەمەزرێنێت هەمووی کەســـەکەیە و توخمە کەمنەکراوەکانی بەرزێتییەکەیەتی، کە بوونیادەکەی بوونە-بۆ-کەســـانی دیکە. ئەو شـــتەی لەژێـــر لێکۆڵینەوەی ئەم میتـــۆدەدا ناگیرێت پرۆژەکە و ئاڵۆزییەکەیەتی. پرۆژەکە تەنیا لە ئەزموونی ژیاندا دەبینرێـــت؛ ناجۆریش لەنێوان بوونِ-بۆخۆ و بوونێکی بابەتیدا هەیە. بەڵام بابەتی توێژینەوەی هەردوو جۆرە ســـایکۆلۆجییە شیکارییەکە ڕاستەقینەی بوونی تێدایە؛ زانینی کەسەکە لەبارەیەوە دەتوانێت بەری تێڕامانەکە ڕووناک بکاتەوە. تێڕامانیش دەبێت بە خاوەنێتی و زانینێکی بە ڕواڵەت.

لەم حاڵەدا لێکچونی هەردووجۆرە ســـایکۆلۆجییە شــیکارییەکە لەناودەچێت. لەوێشدا لە بنەڕەتەوە لەیەکدی جیادەبنەوە، کە سایکۆلۆجی شیکاری ئەزموی لە باتی ڕێگە بدات شـــتە کەمنەکراوەکان لەنێو درککردنە بەڵگە نەویستەکەدا خۆیان دەربخەن بڕیاری خۆی لەسەریان دەدات. لبیدۆ یان ویستی هێز بەرماوە دەروونییە-بایۆلۆجییەکە پێکدەهێنێت، کە لەخۆیدا شـــتێکی ئاشکرا نییە و لەپێشدا خۆی بۆ ئێمەش، وەکو شتێکی کەمنەکراوە و بڕاوە دەرناخات. دوا جاریش، ئەزمون بناخەی ئەو لایەنە ئاڵۆزانە لەســـەر ئەم لبیدۆیە یان ئەم ویســـتی هێـــزە دادەمەزرێنێت؛ ئاکامەکانـــی ئەم توێژینەوە ئەزمونگەرانەیەش بەتەواوی هەڵکەوتن و ئێمە بە بڕوا ناگەیەنن. هیچ شتێک ڕێگە لە تێگەیشتنی پێشومان لە «ڕاستەقینەی مرۆڤایی» ناگرێت، کە ویستی هێز نەتوانێت دەریبڕێت و لبیدۆش نەبێت بەپێکهێنەری پڕۆژە بنەڕەتییەکە.

لەلایەکی دیکەوە، هەڵبژاردنەکەی سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی ڕێنمایمان دەکات چونکـــە هەڵبژاردنێکـــە لەجێگـــەی هەڵکەوتنە بنەڕەتییەکـــە دادەنرێت. هەڵکەوتـــی هەڵبژاردنیش دیوی وەرگێڕاوی سەربەســـتییە. بەو ڕادەیەی لەســـەر کەمی بوون ڕادەوەستێت، دەبێت بە خەسڵەتێکی بنەڕەتی بوون، ئێمەش دەزانین لەوەزۆرتـــر نابێ پاڵپێوەبنێین. هەریەکێک لـــە ئاکامەکان هەڵکەوتێکی تەواوە و شتێکە کەمناکرێتەوە. هەروەها، هەمیشە بەتایبەتی دەمێنێتەوە؛ واتە، بە ئامانجی کۆتایی توێژینەوەکەمان ناگەین . بەپێچەوانەوە، کۆتاییەکە هەڵبژاردنێکە تایبەت و لەسەرەتاشەوە خۆی، وەکو شتێکی ڕەهای کۆنکرێتی دەردەخات. درێژەی باسێک لەسەر ڕەفتاری جۆرێک لە هەڵبژاردن دیاریدەکات، بەڵام کۆنکریتی ناکات. هۆکاری ئەمەش بۆ ئـــەوە دەگەڕێتەوە، کە هەڵبژاردن بوونی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییە؛ ئەمەش، وەکو ئەوەیە بڵێین، بەشـــێک لە ڕەفتارێکـــی دیاریکراو یان هەڵبژاردنی بنەڕەتی هەیە ئەم ڕاســـتەقینەیەی مرۆڤایەتی دەردەبڕێت چونکە جیاوازی نێوان بوون و هەڵبژاردن بۆ ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی نییە. لێرەدا، تێدەگەین سایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی لە شتە ئاڵۆزە بنەڕەتییەکانەوە دەست بە توێژینەوەکەی نـــاکات، کە هەڵبژاردنی بوونە. شـــتە ئاڵۆزەکە دوا هەڵبژاردنە، هەڵبژاردنی بوونە و خۆی بەو شـــێوەیە دروستدەکات. ڕۆشنایی خستنە سەری هەمووجارێک، وەکو شتێکی کەمنەکراوە نیشانیدەدات.

ئەمـــەش لبیدۆ و ویســـتی هێز لای ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی بە خەســـڵەتی گشـــتی و هاوبەش لەنێوان هەموو مرۆڤەکانـــدا کەمنەکراوە دانانێت. لەوانەیـــە بڵێین پاش توێژینەوەکەمان ئەمانـــە لای هەندێک ببن بە پێکهاتەیەکی دیاریکراوی هەڵبژاردنەکە. دەزانین چۆن ئارەزوو لەگەڵ خولیای جوتبوون بەگشتی دەبێت بە دەربڕینی هەوڵدانی ســـەرەتایی بوون-بۆ-خـــۆ بۆ دۆزنەوەی بوونی، کە لەڕێگەی پەیوەندی بە کەسانی دیکەوە لیی نامۆ بووە.

ویســـتی هێزیش ئاماژە بۆ کەســـانی دیکە دەکات، ناســـینی کەسانی دیکە و هەلبژاردنی خۆ ڕزگارکردنە لەڕێگەی ئەوانەوە. بنەمای ئەم هەڵوێستە هەڵبژاردنە

بنەڕەتییەکەیە، کە بە هۆیەوە ئێمە لە یەکبوونی ڕادیکاڵانەی بوون-لەنێو-خۆ لەگەڵ بوون-بۆ-کەسانی دیکەدا دەیبینین.

هەڵبــژاردن دوا چەمکــی ئەم توێژینـــەوە بوونگەرایەتییەیە. ئەمەش باشــتر ســـایکۆلۆجییە شـــیکارییەکەمان لەوی دی جیادەکاتەوە. ئـــەو بۆچوونەش، کە گوایـــە ژینگە لەخۆیەوە کاردەکاتە ســـەر تاکە کەس، ڕەتدەداتـــەوە. لەبەر ئەمە توێژینەوەیەکی بابەتگەرانەی ژینگەکە سودی بۆ ئێمە نابێت. لەسەرەتاوە، ژینگە بە هەڵوێســـت دادەنێین و ئاماژە بـــۆ بوون-بۆ-خۆ دەکات. لەگـــەڵ ڕەتدانەوەی هۆکاریەتی میکانیزم هەموو ڕاڤەکردنێکی هیماکراویش، کە توشی دەبین، لادەبەین. مەبەستمان دانانی زنجیرەیەک یاسای ئەزموونی نییە و بەهیماکردنێکی جیهانیش دروستناکەین. بەڵکو دەبێت لە هەموو حاڵەتێکی تایبەتیدا ئەو هێمایانە بدۆزینەوە کەسەکە باکاریان دەهێنێت.

ئەگـــەر هەریەکێک لـــە هەبووەکان لەخۆیـــدا هەمووگەری بێت ئـــەوا ناکرێت بڕیار لەســـەر بوونی ســـەرەتایی پەیوەندییـــە هێماییەکانیـــش بدەین (بۆنموونە، دەموچـــاوەکان، وەکو زێڕ و لباد و ســـنگ)، کە واتاکانیـــان لە هەموو حاڵەتێکدا دەمێننەوە؛ بەگوێرەی بەکارهێنانە جیاوازەکانیان گۆڕانیان بەسەردا نایەت. بێجگە لەمە، بیریاری سایکۆلۆجی شیکاری ئەو خاڵەی لەبیرناچێت، کە هەڵبژاردن ژیانە و تاکە کەسەکە دەتوانێت وازی لێبهێنێت.

ئیمە لەبەشی پێشودا گرنگی کتوپڕیمان لەنێو گۆڕانکارییە چاوەڕواننەکراوەکاندا باســـکرد. لەم خاڵەی ئێستاوە، دەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو خاڵەی هێماکان واتاکان دەگۆڕن و هێما بەکارهێنراوەکان جێدەهێڵن، ئامادەبین. لەبەر ئەمە، سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی دەبێت باوەڕی بە گۆڕانکاری هەبێت و خۆی لەگەڵ بچوکترین گـــۆڕان لە بابەتی توێژینەوەکەیدا بگونجێنێت. ئەوەی مەبەســـتمانە تێگەیشـــتنە لـــە بوونی تاکە کەس و ســـاتەکانی بوونی. هەروەها، ئەو میتـــۆدەی بۆ تاکێک بەکاریدەهێنین دەشێ بۆ تاکێکی دیکە یان بۆ هەمان تاک لە قۆناخێکی بەرزتردا شیاو نەبێت. ئامانجی توێژینەوەکە دۆزینەوەی هەڵبژاردنە نەک حاڵەت. پێویستە دەروونناســـەکە هەمـــوو کاتێک بزانێت، کە بابەتـــی توێژینەوەکەی لەنێو تاریکی ئەودیو ئاگامەندییەوە نەنێژراوە. بەڵکو بڕیاردانێکی سەربەســـت و ئاگامەندانەیە، کە تەنانەت لەنێو ئاگامەندیشدا جێنشین نەبووە چونکە لەگەڵ ئەم ئاگامەندییەدا بووە بە یەک. سایکۆلۆجی شـــیکاری ئەزمونی، بەگوێرەی ئەوەی میتۆدەکەی لە بنەماکانی باشـــترە، زۆرجار لەبەرچاوی دۆزینەوەی بوونگەرانەیە، بەڵام ئەو خۆی جیادەکاتەوە. کاتێک ڕوو لە هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکە دەکات بەرگریکردنی کەسەکە کتوپڕ دەڕوخێت و وێنەی خۆی، وەکو چۆن تەماشـــای ئاوێنە دەکات، دەبینێت و بۆی ئامادەدەکرێت . ئەم زۆرکردنە لە کەسەکە بۆگەواهیدان بۆ دەروونناس بە نرخە؛ لەوێدا ئامانجە دەستکەوتوەکەی دەدۆزێتەوە. لەوێشەوە چارەسەرەکە دابیندەکات. بەڵام هیچ شـــتێک لەســـەر بنەماکانی ڕێگەی نادات لە گەواهییەکە تێبگات. ئایا ئەو لە کوێوە ئەم مافە بەدەســـت دەهێنێت؟ ئەگەر شتە ئاڵۆزەکە ئاگایی نەبێت،

دیوارێک لەنێوان هێماکە و ئەو شـــتەدا هەبێت، کە هێماکەی بۆ دادەنرێت، چۆن کەســـەکە دەیناسێتەوە؟ ئایا ئەو شـــتە ئاڵۆزە بێ ئاگایە خۆی دەناسێتەوە؟ ئایا پێمان ناڵێن، کە تێگەیشـــتنی نییە؟ ئەگەر لەبەر پێویســـتی تەواناى تێگەیشتنی هێماکانی بدەینێ، ئایا ئەمەش نایکات بە ئاگاییەکی بێ ئاگا؟

ئەگەر تێگەیشتن ئاگایی لەو شتەوە نەبێت، کە تێیدەگات، چییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین ئـــەو خۆیە ئاگامەندە، کە وێنەکەی بەرانبەری دەناســـێتەوە؟ بەڵام، چۆن دەتوانێت لەگەڵ حاڵەتە ڕاســـتەقینەکەیدا بـــەراوردی بکات لە کاتێکدا لەوەوپێش هیچـــی لەبارەوە نەزانیـــوە؟ ئەو تەنیا ئەوەندە دەتوانێت بڵێت، کە شـــیکردنەوەوە دەروونییەکە دروستە. پەیوەندییەکەشی لەگەڵ شیکردنەوەکەدا دەبێت بە پەیوەندی کەسی سێیەم یان پەیوەندی دەروونناسەکە؛ شوێنیکی تایبەتمەندی نادرێتێ. ئەگەر گریمانەی شـــیکردنەوەکەش بە دروست دابنێت، ئایا ئەمە دەبێت بە بڕواکردنێکی ســـادە، کە لەنێو ســـنوری ئاگامەندیدا دەمێنێتەوە و بـــەری لایەنەکانی ئەودیو ئاگامەندیش ئاوەڵابکات؟ بێگومان، بیریارە دەروونناســـە شـــیکارییەکە وێنەیەکی تەمومژاوی ڕووداوە هاوبەشـــییەکانی نێـــوان ئاگامەندی و ئەودیو ئاگامەندی لایە. بەڵام هەموو میتۆدێکی بۆ تێگەیشینێکی پۆزەتیڤی لەم هاوبەشییە لابردوە.

هێشتا، ڕۆشـــنکردنەوەی بابەتەکە شتێکی دروستە. لێرەدا درککردنێک هەیە، کە بەڵگەیەک ئاوەڵێتی. ئەو بابەتەی بیریارە دەروونناســـەکە ڕیگەناســـێتی خۆی لەگـــەڵ گریمانەکەدا دەگونجێنێت؛ دەســـتی لێـــدەدات و دەزانێت چییە. ئەمەش لەوێـــدا ڕوودەدات، کە بابەتەکە بەردەوام لە هانـــدەرە ناوەکییەکانی بە ئاگابێت؛ باشـــترە بڵێین، ئەگەر هاندەرەکان لە ئاگامەندی خۆی ئـــەو جیانەکرێنەوە. لەم حاڵەتـــەدا، دەبینین ڕاڤەکردنی ســـایکۆلۆجی نەرێخواز ڕیگەی نادات هەســـت بە بوونی خۆی بەوجۆرەی هەیە بکات؛ بەڵکو زانینی سەبارەت بوونی خۆی دەداتێ. تەنیا سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتییە، کە بانگەشە بۆ گرنگی دوا درککردنی بابەتەکە دەکات.

ئـــەم بەراوردکردنـــە یارمەتیمان دەدات باشـــتر لە ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی، ئەگـــەر هەبێت، تێبگەین. ئەو میتۆدەیـــە دەیەوێت، لە فۆرمێکی دەرەکی تەواودا ڕۆشنایی بخاتەسەر هەڵبژاردنە خۆیەتییەکە، کە بە هۆیەوە هەموو تاکێک خۆی دەکات بە کەس؛ واتە، هەســـت بەو بوونەی دەکات، کە هەیە. مادام میتۆدەکـــە بـــە دوای هەڵبژاردنی بووندا دەگەڕێت، دەبێـــت ڕەفتارێکی دیاریکراو بـــە پەیوەندییەکی بنەڕەتـــی دابنێت. ئەو پەیوەندییەش ئـــارەزووی جوتبوون و ویســـتی هێز نییە، بەڵکو پەیوەندی بوونە، کە لە ڕەفتارەکەدا بەرجەســـتە بووە. لەبەر ئەمە لەســـەرەتاوە ڕوو لە تێگەیشتن لە بوون دەکات. بێجگە لەم ئامانجەش نابێـــت ئامانجی دیکە بۆ خۆی دیاریبکات. هەروەهـــا، نابێت ڕێگەی بدرێت پێش گەیشـــتن بەم ئامانجە واز لە شـــیکردنەوەکە بهێنیت. تێگەیشـــتنی لە بوونیش، کە خەســـلەتەکانی بیریارەکەش، لەبەر ئەوەی ســـەر بە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە دیاریدەکات، بەکاردەهێنێت؛ هەوڵدەدات بـــوون لە دەربڕینە هێماییەکان دابڕێت.

هەمـــوو جارێک بە هـــۆی بەراوردکردنـــەوە لەنێوان کـــردەوە و ڕەفتارەکاندا ئەو هێمایـــە بدۆزێتەوە، کە ئاماژەیان بۆ دەکات. پێوەری ســـەرکەوتنەکەی کۆمەڵێک فاکتۆرە، کە گریمانەکەی دەیانخوێنێتەوە و دەرککردنە بەڵگە-نەویستەکەی یەکیان دەخات. بەگوێرەی پێویســـتیش گەواهیکردنی کەسەکە دەخرێتە سەر پێوەرەکە. ئاکامە دەســـتکەوتوەکانیش، کە کۆتاییەکانی تاکە کەســـەکەن دەبن بە بابەت بۆ پۆلێنکردن. بەراوردکردنیان بە بیرۆکە گشتییەکانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، وەکو هەڵبژارنێکی ئەزموونی کۆتاییەکانی خۆی، دەگەین. ئەو ڕەفتارەی ئەم سایکۆلۆجییە شیکارییە لەسەری دەکۆڵێتەوە تەنیا خەوەکان، سەرنەکەوتنەکان، شتە زاڵبوەکان بەسەرمێشکدا و دەمارگیرییەکان کۆناکاتەوە، بەڵکو بەتایبەتی بە دوای بیرۆکەکانی نێو ئاگایی، کارە ســـەرکەوتوەکان و شـــێوازی ژیانی تاکە کەسەکەشدا دەگەڕێت. ئەمجۆرە سایکۆلۆجییە شیکارییە هێشتا فرۆیدی نەدۆزیوەتەوە. تەنیا سێبەری ئەو لەنێو هەندێک ژیاننامەی سەرکەوتودا دەبینین. هیوادارین لە شوێنێکی دیکەدا ئەم خاڵە لە دوو نموونەدا لەسەر فلوبێرت و دۆستۆیەڤسکی ڕوونبکەینەوە. بەڵام بوونی بۆ ئێمە ئەوەندە گرنگ نییە؛ گرنگییەکەی لەوەدایە، کە دەگونجێت هەبێت.

## ٢-«کردن» و «هەیەتی» : خاوەنێتی

ئەو زانیارییەی ئۆنتۆلۆجی ســـەبارەت ڕەفتار و شێوەکانی ئارەزوو دەماندات، دەکرێـــت ببێت بە بنەما بۆ ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە شـــێوازی ڕووتکراوەی ئـــارەزووەکان هەبێت و بە هەموو تاکەکان درابێت؛ بەڵکو ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە ئـــارەزووە کۆنکرێتییەکان بونیادیان هەیە و ئەو بونیادەش لە توێژینەوە ئۆنتۆلۆجییەکەدا ســـەرهەڵدەدات. هەریەکێک لـــە ئـــارەزووەکان؛ ئارەزووکردن لە خواردن، نوســـتن هەروەهـــا ئارەزووکردن لە کاری هونەری ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی دەردەبڕن؛ زانینێکی ئەزمونی و کەم لەم حاڵەتەدا گرنگی نابەخشـــێت. دەبێت ســـەرکەوتوانە ئەو زانینـــە بۆ دامەزراندنی بناخەی سایکۆلۆجییەکەمان بەکاربهێنین. بێگومان، ئەمەش خاڵێکە بۆ وەستانی ئۆنتۆلۆجی؛ دوا شـــتە دۆزراوەکانی دەبن بە یەکەم بنەمای سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی.

لێرە بەدواوە، پێویستە میتۆدێکی دیکە پەیدابکەین چونکە بابەتی توێژینەوەکەمان جیاوازە. ئایا ئۆنتۆلۆجی لەبارەی ئارەزووەوە، مادام ئارەزوو بوونی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییە، چیمان فێردەکات؟

ئارەزووکردن کەمی بوونە. لەبەر ئەمە ئەو بوونەی، کە کەمییە ڕایدەگرێت. ئەو بوونەش، وەکو باســـمانکرد، بوونی-لەنێو-خۆی-بوونی-بۆ-خۆیە، ئاگامەندییە دەبێت بە جەوهەر، جەوهەریشـــە دەبێت بـــە هۆکار بۆ خۆی یان ئـــەو مرۆڤەیە دەبێت

بـــه خوا. کەوابوو، لـــە بنەڕەتدا بوونی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتی جەوهەر نییە و پەیوەندییەکانی ژیانە. چەمکە سنوردارەکانی پەیوەندییەکەش یەکەمجار لەنێو-خۆ بنەڕەتییەکەیە، لەنێو هەڵکەوتن و فاکتۆردا گیریخواردووە و خەسڵەتی گرنگیشی لەوەدایە، کە شتێکە هەیە؛ دووەم، بوون-لەنیو-خۆی-بۆ-خۆ یان بەهایە، کە وەکو وێنەیەکی بـــەرزی هەڵکەوتنی بوون-لەنێو-خۆ هەیـــە و لەودیو هەموو هەڵکەوت و هەبووەکانـــەوە دەبینرێت. مـــرۆڤ هیچ کام لەمانە نییـــە. ناتوانین بڵێین ئەو شتێکە، کە هەیە. ئەو ئەوەیە، کە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە؛ لەناوبەری شتە لەنێو-خـــۆ هەڵکەوتوەکەیە و خۆی لەناوبردن ڕزگاردەکات، ڕووە و بوون-لەنێو-خۆ دەڕوات و دەبێت بە هۆکار بۆ خۆی. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی هەوڵدانە بۆ بوون بە خوا بەبێ ئەوەی هەوڵدانەکەی لەســـەر بوونی جەوهەرێک دامەزرابێت. ئارەزووش هەوڵدانەکە دەردەبڕێت. هەروەها، پێناســـەی ئارەزوو لەســـەر پەیوەندییەکەی بە بوون-لەنێو-خۆ-وەکو هۆکار بۆ خودی خۆی دروستنابێت. پەیوەندی بە هەبوویەکی کۆنکرێتیشەوە هەیە، کە بە بابەتی ئارەزوکردن ناوزەددەکرێت. ئەو بابەتە دەشێ پارچەیەک نان، ئۆتۆمۆبیلێک، ئافرەتێک یان شـــتێکی هیشـــتا نەناســـراو بێت، بۆنموونە ئارەزووی هونەرمەند بێت بۆ داهێنانی بەرهەمێکی هونەری. لەم ڕووەوە، ئارەزووکـــردن پەیوەندی مرۆڤ بـــە بابەتێک یان چەند بابەتێکەوە لە نێو جیهاندا دیاریدەکات؛ شێوازێکی بوونە لەنێو جیهاندا. لەم خاڵەوە دەبینین، پەیوەندییەکە شـــتێکی تایبەت نییە. هەزار نموونەمان لەبەردەستدایە تاکو ڕوونیبکەینەوە چۆن ئارەزووی خاوەنێتی ئەو بابەتە، کارێک، یان بوون بە کەسێک دەکەین. ئەگەر حەز لەو تابلۆیە بکەم، ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئارەزووی کڕینی دەکەم و دەمەوێت ببم بە خاوەنی. ئەگەر ئارەزووی نوسینی پەرتووکێک بکەم، بۆ پیاسەکردن بڕۆم، ئەو واتایە دەبەخشێت، کە دەمەوێت پەرتووکەکە بنوسم و پیاسەکە بکەم. ئەگەر جل لەبەربکەم ئەوا ئارەزووی خۆ ڕازانەوەدەکەم. خۆم فێردەکەم ببم بە زانستکار و هتد. لەم بۆچوونەوە هەرسێ کاتیگۆرییە گەورەکەی بوونی کۆنکرێتی مرۆڤ لەسەر بناخەکەیان خۆیان دەردەخەن، کە: کردن، هەیەتی و بوونن.

ئاســـانە ببینین ئارەزووی کردن شـــتێک نییە کەمبکرێتەوە. کەسێک بابەتێک دەکات دەیـــەوێ لەگـــەڵ بابەتەکەدا بچێتە نێو پەیوەندییەکـــی تایبەتییەوە. ئەم پەیوەندییە نوێیە یەکسەر دەبێت بە هەیەتی. بۆنموونە، لقی درەختێک لێدەکەمەوە تاکـــو هەمبێت. کردنەکە دەچێتە شـــێوازی هەیەتییەوە. ئەمـــە نموونەیەکی زۆر باوە. بەڵام لەوانەشـــە چالاکییەکەم بە ئاشـــکرا نەبێت بە هەیەتی. دەشی وەکو شـــتێکی سوپاسگوزار خۆی دەرخات. ئەمەش لە توێژینەوەی زانستانە، وەرزش و داهێنانە هونەرییەکاندا دەبینرێت. هیشـــتا لەم نموونانەدا کردن نابێت بە شتێکی دیکە. ئەگەر تابلۆیەک، شـــانۆگەرییەک یان گۆرانییـــەک دابهێنم دەبێت بۆ ئەوە بوونێکـــی کۆنکرێتیم هەبێت. ئەم بوونەش ئەوەندە بـــۆ من گرنگە، کە من لەنێو خـــۆم و بابەتەکەدا پەیوەندی داهێنان دادەمەزرێنـــم و مافی خاوەنێتیم دەداتێ. بوونی تابلۆکە لەنێو بیرکردنەوەمدا بەس نییە؛ پێویستە لەڕێگەی منەوە بابەتەکە

بێتەکایەوە. ئاشـــکرایە، لە ڕوویەکەوە، بیرۆکەکە ئەوەیە من تابلۆکە لە بووندا بە هـــۆکاری داهێنانەوە ئامادە بکەم. دواجاریـــش، دەبێ من خاوەنی بم. لەڕوویەکی دیکەوە، تابلۆکە دەبێت لە بوونی منەوە جیاواز بێت، تاکو بتوانم بیکەم بە موڵکی خـــۆم و ئەو من نەبێت. لێـــرەدا، بەوجۆرەی لە بیـــردۆزەی جەوهەر لای دێکارت دەبینرێـــت، لەوانەیە بوونی بابەتە داهێنراوەکە لەنێـــو بوونی مندا لەبەر نەبوونی ســـەربەخۆیی و بابەتگەری لەنێو مندا بتوێتەوە؛ یان بوونی لەنێو خۆیدا پێویست بێـــت؛ بوونی خۆی بـــەردەوام نوێبکاتەوە. لەئاکامـــدا، بەرهەمەکە بۆ من دەبێت بـــە داهێنانێکی بەردەوام، بەڵام لەنێو بوونی خۆشـــیدا دەچەقێت؛ بۆ هەمیشـــە مۆری من بەســـەر خۆیەوە هەڵدەگرێت؛ واتە، بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو دەبێت بە بیرۆکـــەی من. هەموو بەرهەمێکی هونەری بیرۆکەیە؛ خەســـڵەتەکانی بیرۆکەین و بێجگە لە واتا چی دیکە نین. لەلایەکی دیکەشەوە، واتاکە یان بیرۆکەکە بەردەوام ئـــەو کاتەی بیریشـــی لێناکەمەوە چالاکـــە. پەیوەندییەکەم لەگەڵیـــدا دەبێت بە دووجۆری. لەلایەکەوە ئەو ئاگامەندییەم، کە هەست بە بابەتەکە دەکات و لەلایەکی دیکەشـــەوە، ئەو ئاگامەندییەم بەرانبەری ڕادەوەستێت. لەڕاستیدا ئەم دووجۆری پەیوەندییەیـــە لـــە گوتەی "ئەوە بۆ منە" دەریدەبڕم. واتـــای ئەمەش ئەو کاتەی پێناسەی کاتیگۆری "هەیەتی" دەکەین دەردەکەوێت. بۆ ئەم دووجۆرە پەیوەندییە دەمەوێت بەرهەمەکەم دابهێنم. تێهەڵکێشـــکردنی ئـــەم خۆ و نا-خۆیەیە دەمەوێ وەدەســـتی بهێنم و خاوەنێتی منیش دادەمەزرێنێت. من بەتەنیا باســـی بەرهەمی هونـــەری ناکەم. لقی درەختەکەش هەمان دووجۆری پەیوەندی لەگەڵ مندا هەیە: یەکەم، وەکو بابەتێک ڕوژانە بەکاردێت و لەبەردەستی مندایە، وەکو جلوبەرگەکانم یان پەرتووکەکانم من خاوەنیـــم. دووەمیش، وەکو بەرهەم دەبێت بە موڵکی من. ئەو کەســـانەی ڕۆژانە کەلوپەلەکانیان لەچواردەورە و خۆیان دروستیانکردوون بە موڵکـــی خۆیانی دادەنێـــن و چێژیان لێوەردەگرن. ئـــەوان لەنێو یەک بابەتدا یان یەکجۆر سازاندا بە بوون بەخاوەن و چێژوەگرتن و داهێنان یەکدەگرن. لەوەدەچێت یەکگرتنەکەیان لە هەموو شوێنێکدا لە هونەرەوە بۆ دروستکردنی جگەرە لەنێو یەک پرۆژەدا بێت. وەکو ئەوە وایە بڵێت، " کاتێک چاکترە، کە خۆم لولی دەکەم." دوای ئەم پرۆژەیە لەبەر ڕۆشـــنایی پەیوەندییەکەی بە خاوەنێتییەوە باســـدەکەین، کە دەبێتە هۆکاری کەمکردنەوەی حەســـانەوە چونکە حەسانەوە خەسڵەتی بابەتە بە موڵککراوەکە نییە و خەسڵەتی خاوەنێتییە.

زانین، بەوجۆرەی لە پێشـــەکی کەرتی چواری[ئەم نوســـراوەدا] باســـمانکرد، شێوازێکی خاوەنێتییە. لەبەر ئەمەش توێژینەوەی زانستی هەوڵدانە بۆ خاوەنێتی. ڕاستییەک دەدۆزرێتەوە، وەکو بەرهەمێکی هونەری، دەبێت بە زانینی من؛ تۆمینای بیرکردنەوەیـــە و ئەو کاتە دەدۆزێتەوە، کە من بیردەکەمەوە و بوونی لەســـەر من ڕادەوەستێت. لەڕێگەی منەوە جیهان خۆی دەردەخات. لەم لایەنەوە، من داهێنەر و خاوەنـــم نەک لەبەر ئەوەی بیر لەلایەنێکی بوون دەکەمەوە و دەیدۆزمەوە بەڵکو ئەو لایەنە خۆی بۆ من دەردەخات و شـــتێکە بە ڕاســـتی هەیە. من دەتوانم تەنیا

بڵێــم من ئــەو دەردەخەم، بەو جــۆرەی (گید) دەڵێت، "ئێمە دەبێت شــتەکان دەربخەین." بەڵام من لێکچونێکی ســەربەخۆ لەنێوان بەرهەمی هونەری و ڕاســتی نێــو بیرۆکەکەم دەدۆزمــەوە؛ ئەویش لە بابەتگەرایەتیدایە. ئــەو بیرۆکەیەی من دروستیدەکەم و دێتەکایەوە سەربەخۆیی خۆی دەسەلمێنێت و دەبێت بە بیرۆکەی هەموو کەسێک. دوولایەنی من هەڵدەگرێت: ئەو جیهانەیە خۆی بۆ من دەردەخات و هەروەها "من"یشم لە پەیوەندییەکەم لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

ئەو بیرۆکەیەی دروســتیدەکەم دەچێتە نێو بیرکردنەوەی کەسانی دیکەشەوە. هەمانکاتیش دوو دەرگا لەســەر مــن دادەخات: ئەو بوونەیە، کە من نییە (چونکە خۆی بۆ من دەردەخات)، هەروەها لە یەکەم ســاتی دروســتبوونییەوە دەبێت بە بیرۆکەی هەموو کەسێک و نەناسراو. ئەم تێهەڵکێشکردنەی خۆ و نا-خۆ بە چەمکی "هی منە" دەردەبڕێت.

لەســەرو ئەمەوە، بیرۆکەی دۆزینــەوەو دەرکەوتن بیرۆکــەی چێژوەگرتن لە خاوەنێتیش هەڵدەگرێت. ئەوەی دەبینرێت خۆ بەخاوەنکردنە؛ بینین بێ بنکردنە. ئەگەر ســەرنجێکی بەراوردکردنەکان لەنێوان زانەر و زانراودا بدەین زۆریان، وەکو توندوتیــژی بینین دەردەکەون. بابەتە نەزانراوەکە شــتێکی پاک و بێگەردە و لە سپێتی دەچێت. هێشتا نهێنییەکەی ئاشکرا نەبووە؛ هێشتا مرۆڤ لێی نەپچڕیوە. هەموو ئــەم وێنانە بێ ئاگایی بابەتەکە لە مەبەســتی توێژینــەوەکان و ئامرازە بەکارهێنراوەکان نیشــاندەدات؛ ئەو نازانێت، کــە دەزانرێت؛ بەبێ ئەوەی بزانێت ســیخوڕی بەســەرەوە دەکرێت لە بوونــدا بەردەوامە. لەو ژنــە دەچێت نازانێت کەســەکەی بە لایدا دەڕوات لەنێو گەرماوەکە دەیبینێت. گوتن هەندێکجار ئاشکرا و جاری دیکەش تەمومژاوییە. ئێمە باس لە داماڵینی ڕووپۆش لەســەر سروشــت دەکەین (بۆنموونە وێنەی ڕووپۆشــی سایس لای شــیلەر). هەموو توێژینەوەیەک بیرۆکــەی داماڵینــی کاڵای تێدایە و ڕێگرەکان لەبەردەم شــتەکەدا لادەبات و لە شــوێنێکی دیار و کراوەدا دایدەنێت. لە ڕێگە پاککردنەوەکەی ئەکتیۆن بۆ بینینی دیانا لە نێو گەرماوەکــە دەکات. لەمەش زۆرتر، زانین ڕاوکردنە. بایکۆن بە ڕاوی (پان) ناوزەدیکرد. زانســتکار ڕاوچییە و بەدوای شتێکی سپی و ڕووتدا دەگەڕێت و بە تەماشاکردنیشی مافی دەخوات. کۆی ئەم وێنانە ئەوشتە دەردەخەن ئێمە بە گرێی ئەکتیۆن ناوزەدیدەکەین.

بیرۆکەی ڕاوکردن دەکەین بە ڕێنیشاندەری باسەکەمان. هەوڵیش دەدەین هێمایەکی دیکەی خاوەنێتی بدۆزینەوە، کە زۆرتر ســەرەتاییە: مرۆڤ بۆ خواردن ڕاودەکات. خۆ-تێهەڵقورتاندن لە ئاژەڵدا پەیوەندی بەسێکس یان برسێتییەوە هەیە. زانینیش بەکارهێنانی چاوەکانە. لێرەدا، بەگوێرەی ئەوەی زانین پەیوەندی بە هەستەکانەوە هەیە، پرۆسەکە بەپێچەوانەی ئەوەوەیە، کە لە پەیوەندی بە بەرهەمی هونەرییەوە بینیمان. ئێمە گوتمان بەرهەمی هونەری لە ڕێژەنێکی چەســپاوی هۆش دەچێت.

هۆش بەردەوام دروستیدەکات و خۆشی تەنیا و جیاواز لە بەرهەمەکە دادەنێت. ئەم پەیوەندییە لەزانینیشـــدا هەیە، بەڵام لایەنە دژەکەی لێی جیاناب‌ێتەوە. لە زانیندا، ئاگامەندی بابەتەکە بەرەوخۆی ڕادەکێشێت و دەیخاتەسەر خۆی. زانین توانەوەی بابەتە. نوسینی بیریارە ئەپســـتمۆلۆجییەکانی فەرەنسا پڕی چەمکە و میتافۆرە لەســـەر خواردن (وەکو توانەوە، هەرســـکردن و قوتدان). جوڵانێکی خۆتوانەوە لە بوونی بابەتەکەدا بەرەو زانراوەکەیە. شتە زانراوەکە دەگۆڕێت بەرەو من؛ دەبێت بە بیرۆکەم و بوونی لەسەر من ڕادەوەستێت. بەڵام جوڵانی توانەوەکە چەقوەستاوەو شـــتە زانراوەکە لە جێگەی خۆی ناجوڵێت. بەتـــەواوی دەتوێتەوە و کەچی وەکو خۆشـــی دەمێنێتەوە. هەرسدەکرێت و لە دەرەوەشـــدا، وەکو بەرد جوڵە ناکات. بۆ بیرکردنەوەیەکی ســـادە هێمای "هەرسکراوێکی هەرســـنەکراو" گرنگە؛ وەکو بەرد لە گەدەی حوشـــترمەل (نەعامە)دا و یۆحەناش لەنێو سکی نەهەنگەکەدایە. هێمـــا نموونەیە بۆ خەونی توانەوەیەکی بێڕوخـــان. فاکتۆرێکی نابەختەوەرانەیە، کە هیگڵ باســـیدەکات و دەڵێت، ئـــارەزوو بابەتەکەی خۆی لەناودەبات. بۆ هیگڵ ئارەزوو چاوبرســـییە. دژی ئەم پێویســـتییە دیالێکتیکییە، بوون-بۆ-خۆ خەو بەو بابەتـــەوە دەبینێت، کە من بتوانم بەتەواوی قووتی بدەم و بەتەواویش لەنێو مندا نەتوێتەوە. بوونی خۆی، وەکو شتێکی لەنێو-خۆ بهێڵێتەوە: ئەوەی من ئارەزوومە بابەتە؛ ئەگەر بیخۆم ئەوا بابەتەکە تەواودەبێت و بێجگە لە بوونی خۆم چی دیکە نامێنێتەوە.

ئـــەم تێهەڵکێشـــییە مەحاڵەی توانەوە و شـــتە تواوەکە، کـــە مانەوەی خۆی پەســـنددەکات پەیوەندییەکی قووڵی بە ئارەزووی سێکیشـــەوە هەیە. بیرۆکەی "داگیرکردنی لەش" شتێکی ناخۆشە، بەڵام لەشێکی ئارەزوو مەندکراو، کە بەردەوام دەکرێت بە موڵک و نوێش دەبێتەوە و خاوەنێتی مۆری خۆی لەسەر جێناهێڵێت، دەخاتـــە ڕوو. ئەمەش لە هێمای 'لوس' یان 'بریقەدار' دا دەردەبڕێت. هەســـت بە لوســـی دەکرێت، بەڵام ناچێتە ناوەوەو لە دەستلەملکردن زۆرتر ناڕوات؛ وەکو ئاو وایە. هۆی ئەمەش، باســـکردنی ڕووتانە جەخت لەســـەر لەشـــی ئافرەتی سپی و لوس دەکات. لوسی لە دەست لەملکردندا خۆی پێکدەهێنێت و وەکو ئاو فۆرمێکی نوێ بـــە تێپەڕبوون بەســـەربەردەکاندا و کون کردنیان بۆ خۆی دروســـتدەکات. خەونـــی دڵدارەکەش ئەوەیە، کە خۆشەویســـتەکەی بکات بـــە خۆی و هەمانکات تاکەکە کەسایەتییەکەشـــی بهێڵێتەوە؛ ئەو دەیەوێت، کەسانی دیکە بەبێ ئەوەی لەناوبچن ببن بە ئەو. لێرەدا، لێکچونەکە لەگەڵ توێژینەوەی زانســـتیدا دەبینین: بابەتە زانراوەکە، وەکو بەردی نێو گەدەی حوشترمەلەکە (نەعامە)، لەنێو مندایە، تواوەتەوە و بووە بە هی من و بەتەواوی منە؛ بەڵام شـــتێکە بە ناویدا تێپەڕنابین و فۆرمەکەی ناگۆڕێت، بە تەواوی لوســـەو لەشـــێکی ڕووتە، کە خۆشەویستەکەی

بێهودە باوەشــی پیادەکات. شــتێکە لەدەرەوەدا دەمێنێتەوە؛ بۆئەوەی بیناسێت دەبێ بۆی برسی بێت و نەشی خوات. دەبینین چۆن تەوژمەکانی سێکس و خواردن تێکەڵدەبن تاکو گرێی ئەکتێون یان گرێی یۆحەنا دروستبکەن؛ دەتوانین ڕەگوڕیشەی هەســـتەکی و هەرسکردن ببینین، کە یەکدەگرن تاکو ئارەزوو بۆ زانین پێکبهێنن. زانین خستنەناوە و دەست لەملکردنێکی ڕواڵەتییە. فۆرمی خۆی هەرگیز ونناکات. داهێنانی بەردەوامی بیرکردنەوەیە و دامەزراندنی سەربەخۆیی بیرۆکەکەشە. بابەتە زانراوەکە، وەکو شـــت بیرۆکـــەی منە و ئامانجی توێژینەوەکەشـــمە. پەیوەندییە ســـازاوەکەی زەمین بۆ دامەزراندنی هاندەرە جیاوازەکان خۆشدەکات و پەیوەندی خاوەنێتییە. لەبەرئەمەشە، ئارەزووی زانین، گرنگ نییە، چەند بمانەوێ پەیوەندی خاوەنێتییە. زانین شێوازێکی هەیەتییە.

یەکجۆر لـــە چالاکی دەمێنیتەوە، کە سوپاســـگوزارانەیە؛ ئەویش "یاریکردن" و هاندەرەکانێتـــی. ئایا دەتوانیـــن هاندەری خاوەنێتی لە وەرزشـــدا بدۆزینەوە؟ بەدڵنیاییەوە، پێویســـتە یەکەمجار ئەو خاڵە باسبکەین، کە وەرزش، بەو جۆرەی لەسەر گیانێکی جیدی پێکهاتوە، دەردەکەوێت کەمترین هەڵوێستی خاوەنێتی هەبێت. گیانە جیدیەکەی لە جیهانەوە دەستپێدەکات و زۆرتر ڕاستەقینە بە جیهان نەک بە خۆی دەدات؛ مرۆڤەکە سەر بە جیهانبوونی خۆی دەردەخات. بەڕێکەوت نییە، کە ماتەریالیزم جیدییە؛ بەڕێکەوتیش نەبووە بە ڕاپەوێکی شۆڕشگێرانە. لەبەرئەوەیە شۆڕشـــگێڕەکان جیدین. ئەوان لەڕێگەی ئەو جیهانەوە، کە دەیانچەوســـێنێتەوە خۆیان دەناســـن و دەیانەوێت بیگۆڕن. ئەوان لەگەڵ دوژمنە کۆنەکانیاندا، ئەوانەی لەڕێگەی جیهانەوە خۆیان دەناسن هاوڕان. هەموو بیرۆکەیەکی جیدی لەنێو جیهاندا خەســـتدەبێتەوە؛ چڕتری دەکات؛ وەلادانی ڕاســـتەقینەی مرۆڤایەتییە لەپێناوی جیهاندا. مرۆڤی جیدی ســـەر بە جیهانە و بەتەنیا بێدەرامەتە. تەنانەت ناتوانێت بیر لـــە دەرچوون لەنێو جیهان بکاتەوە. ئەو بوونی بەردی بە خۆی داوە و لەنێو شتەکانی جیهاندا شتێکی نەبزێوە. دروستە، کە مرۆڤە جیدیەکە ئاگایی سەربەستی لـــە خۆی دەشـــارێتەوە؛ لەنێو بڕوای خراپـــدا دەژی و دەیەوێت خۆی وەکو ئاکام ببینێت. هەمووشـــتێکیش ئاکامی ئەوە و ســـەرەتای نییە. هۆی ئەمەشە گوێ بە ئاکامی کارەکانی دەدات. مارکس لەپێشخستنی بابەت و دواخستنی خۆدا پێشنیاری دۆگمای بنەڕەتی 'جیدی' کردوە. مرۆڤ بە دانانی بوونی بە بابەت جیدییە.

یاریکردن، وەکو گاڵتەجاڕییەکەی کیرکیگارد، خۆیەتی بەردەدات. لە یاریکردندا مـــرۆڤ یەکەم بنەڕەتە و خۆی یاســـاکان دادەنێت. ئایا بێجگە لە شـــوێنکەوتنی یاســـاکان هیچ ئاکامێکـــی دیکەی لەدوایە؟ کاتێک مرۆڤ دەزانێت سەربەســـتە و سەربەســـتییەکەی بەکاردەهێنێت چالاکییەکەی دەبێت بە یاری. یەکەم یاســـای یاریکردن خودی مرۆڤەکەیە؛ مرۆڤ بە ڕێگای یاریکردن لە سروشتی ڕادەکات؛ بەها

به یارییەکەی دەدات و بەو یارییەش ڕازیدەبێت، کە خۆی یاساکانی بۆ داناوە.

لە ئاکامدا و لەم ڕووەوە ڕاستەقینەیەکی بچوک دێتە جیهانەوە. لەوانەیە ئەو کاتەی مرۆڤ یارییەک دەکات و خۆی بە داهێنەری سەربەســتی یارییەکە دادەنێت، گوێ بە خاوەنێتی شــتێک لەنێو جیهاندا نەدات. ئامانجی ئەو لە وەرزش و یاریکردندا بوونی خۆیەتی لە شێوازێکی تایبەتیدا. ئەوەش ئەو بوونەیە، کە پرسیاری لەبارەوە دەکات.

مەبەســت لەم خاڵانە ئــەوە نییە، کە ئــارەزووی یاریکــردن کەمنەکراوەیە. بەپێچەوانــەوە، پێویســتە بەو ئاکامــە بگەین، کە لێــرەدا ئــارەزووی 'کردن' دەبێــت بە ئارەزوو بۆ 'بــوون'. کردنەکە نابێت بە واتا بــۆ خۆی؛ بەڵکو دەبێت سەربەســتییەکی ڕەها بەرجەســتە بکات، کــە بوونی مرۆڤەکەیە. ئــەم پرۆژە تایبەتییە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. ڕادکاڵانە لە پرۆژەکانی دیکەوە جیاوازە. دەبێــت بە درێــژی پەیوەندییەکەی لەگەڵ پرۆژەی بوون بــە خوا ڕوونبکەینەوە، کە لە قوڵایی بونیادی ڕاســتەقینەی مرۆڤایەتیدایــە. بەڵام ڕوونکردنەوەکە لێرەدا ناکەیــن؛ پەیوەنــدی بە ڕەوشــتەوە هەیــە؛ لەمحاڵەتەدا دەبێت هەڵوێســتێکی ڕەوشــتانە لە ئاســتی بەهادا هەبێــت. لەگەڵ ئەمەشــدا ئەو ڕاســتییە لەناونا چێت، کە ئارەزووی یاریکردن لە بنەڕەتەوە ئارەزووکردنە بۆ بوون.

ســێ کاتیگۆرییەکەی 'بون'، 'کردن' و 'هەیەتی' لێرەدا و لە هەموو شوێنێکی دیکەدا بۆ دوو کاتیگۆری کەمدەکەینەوە؛ 'کردن' گواســتنەوەیە. ئەمەش ئارەزوو دەکات بــە ئــارەزووی هەیەتی و بــوون. زۆرکەمیش هەڵدەکەوێــت وەرزش هیچ هەڵوێســتێکی خاوەنێتی تێدا نەبێت. مــن حەزدەکەم یارییەکەم چاک بێت و ببم بە هاندەریش بۆ یاریزانەکان؛ لێرەدا باســی ئارەزووی خاوەنێتی لە شتێکی جوان و ماســولکاوی ناکەم، کە لە ئارەزووکردنم بۆ خۆیەتی دەرەکی بوونم-بۆ-کەسانی دیکەوە هەڵدەقوڵێت.

هەمووجاریک ئەم ئارەزووانە ناچێتە ژوورەوە و بنەڕەتیش نین. بەڵام لە وەرزشدا هەمیشە لایەنی خۆیەتی هەیە. وەرزش شێوە گۆڕانێکی سەربەستی ژینگەیە بۆ ئەو خەسڵەتانەی پشتگیری کردنەکە دەکەن. ئەمەش وەرزش، وەکو هونەر، دەکات بە داهێنان. دەشێ ژینگە کە گۆرەپانێکی بەفرین یان لوتکە لێژەکانی چیای ئەلپ بێت. بینینی دەبێت بە خۆیەتی و بەچاو دەکرێت بە هێمایەکی بوون. شــتێکی دەرەکی ڕووت و شــوێنێکی ڕادیکاڵە؛ ناجۆرییەکەی، دووبارە بوونەوەکەی و ســپێتیەکەی جەوهەرەکەی بە ڕووتی دەردەخەن؛ بوون-لەنێو-خۆ بوونی دیاردەیە و لە دەرەوەی هەموو دیاردەکان کتوپڕ خۆی دەردەخات. هەمانکات ڕەقی و چەقوەستاوی لایەنی هەمیشەیی و دەرەکی بوون-لەنێو-دەردەبڕێت. هێشتا ئەم چێژوەرگرتنە سەرەتاییە بــۆ من و بەس نییە. ئەو بوونە-لەنێو-خۆیەی، ئەگەر بە جەوهەرە درێژ بووەکەی دێکارتی دابنێین، وەکو دیاردەی شــتێک، کە بوونی من نییە سەرســامم دەکات؛

من حەزدەکەم ئەو بەشـــێک بێت و لە بوونی منەوە دەرچووبێت و بەوشـــێوەیەی هەیە بمێنێتەوە. ئەمەش لەو بووکە بەفرینەیەیە دەچێت منداڵان دروســـتیدەکەن؛ ئامانجەکە کردنی شـــتێکە لە بەفر؛ واتە فۆرمێکی بدەیتێ، کە لە ئەســـتوەکەدایە و ئەســـتوەکەش لەپێناوی فۆرمەکەدا هەیە. بەڵام ئەگەر پەیوەندیم لەگەڵ کێڵگە بەفراوییەکەدا دروستبکەم هەمووشـــتێک دەگۆڕێت. تەرازووی بوونی تێکدەچێت؛ بوونـــی جیاجیا و پارچەپارچـــە دەبینرێت؛ پەڵە و فڵچە و بۆشـــایی ئینجەکانی دەردەخـــەن. دەتوێتەوە و دەبێت بە ئـــاو. من تاکو ئەژنۆم دەچێتە نێو بەفرەوە؛ ئەگەر تۆپەڵێک بەفر هەڵگرم، لەنێو دەســـتمدا دەبێـــت بە ئاو و دەڕژێت؛ هیچی نامێنێتەوە. ئەو بوونە-لەنێو-خۆیە شێوە دەگۆڕێت و دەبێت بە هیچ. ئارەزووم بۆ خاوەنێتـــی بەفرەکە هەمانکات لەناودەچێت. هەروەها، نازانم چی لەو بەفرە بکەم، کە دەیبینم و لەنێو دەستمدایە. ناتوانم باوەش بە هەموو کێڵگەکەدا بکەم؛ تەنانەت ناتوانم، وەکو ئەو جەوهەرەی خۆی لە بینینەکەمدا دەرخســـت پێکبهێنمەوە، کە کتوپڕ رووخا.

خلیســـکانی ســـەربەفر جوڵانی خێرا نییە و لێزانینی دەوێت. هەروەها منیش دەکات بـــە خاوەنـــی کێڵگە بەفرینەکە. ئێســـتا من دەمەوێت شـــتێکی لێبکەم. ئەمـــەش ئەوە دەگەیەنێت، من وەکو یاریزانی ســـەر بەفرەکـــە بەفرەکە دەگۆڕم و واتای پێدەبەخشـــم. دەبینم لێژاییەک لەبەردەممدایـــە و دەبێت بیبرم، دوایش بەردەوامی و یەکێییەکەی دەدۆزمەوە. لەمحاڵەتەدا ئەمە پێکەوەبەســـتنە. لەنێوان دوو چەمکی براوەدا هەیە؛ خاڵی ســـەرەتا و گەیشـــتنەکە پێکەوە دەبەستێتەوە. مـــن لە داگەڕانەکەشـــدا چاو دەبڕمە ئەو شـــوێنەی دەمەوێ بیگەمـــێ و ڕوولەو خاڵەدەکەم. پێداگەڕانەکە چالاکییەکی بزێوی ڕووت نییە؛ تێهەڵکێشەی ڕیزکردن و پەیوەندییەکانیشە؛ بەوجۆرەی ئەندازیارێک، (کانت) گوتەنی، بەکێشانی هێڵێکی ڕاســـت تێدەگات، منیش بە تەماشاکردنی کێڵگە بەفرەکە تێیدەگەم. هەروەها ئەم ڕیزکردنە پەراوێزی نییە و چڕە؛ کێڵگەکە بۆ خۆی و لەنێو خۆیدا یەکی نەگرتوە؛ ئامانجەکە ئاشـــکرا دیارە و بابەتە ویستراوەکەشم ئەو خاڵەیە لە قەراخ کێڵگەکە دەیبینم، کە دەبێت بیگەمێ. شوێنە بەفرینەکە تەنێکی ڕەق و بەفراوییە؛ بۆ ئەوەی بە کۆتایی بگەم، بەوجۆرەی کەسێک بۆ گرتنی چەکوشەکە مافورەکەی تەنیشتی بۆ داکوتین نابینێت، منیش کێڵگەکە نابینم.

هیـــچ خاوەنێتییەک ئەوەنـــدەی خاوەنێتی ئامێـــرەکان تەواو نییـــە؛ لێرەدا، چالاکی خاوەنێتی چالاکییەکی تەکنیکییە بۆ سودوەرگرتن. کردنەکەم بەوجۆرەی چەکوشوەشـــاندنەکە واتای چەکوشـــەکە دیاریدەکات، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بەفرەکە. هەمانکات، بۆ ئەوەی لە لوتکەی بەفرەکە تێبگەم بۆچوونێکی دیاریکاوم هەڵبژاردوە: ئەوەش خێراییەکی دیاریکراوی منە، کە دەتوانم کەم یان زۆرتری بکەم؛

لەو خێراییەوە کێڵگەکە دەبێت بە بابەتێکی جیاوازتر لە خۆی و بەپێی خێراییەکە دەگۆڕێت. خێراییەکە شتەکان بە ویستی من کۆدەکاتەوە؛ بیر لەو ناوچەیە بکەوە بە پێ، ئوتۆمۆبیل، شـــەمەندەفەر یان پاســـکیل پیایـــدا گەڕاویت. بۆچوونەکانت بەگوێـــرەی خێراییەکانیان دەگۆڕێن. دووری (بێزیـــەر) لە (ناربۆنەوە) دەبێت بە کاتژمێرێک، ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی گەشـــتەکە. کەوابوو، من بەگوێرەی خێراییەکە سەربەستانە فۆرم بە کێڵگە بەفرینەکە دەبەخشم. هەمانکات من کار لەسەر لەشی خۆم دەکەم. خێراییەکە بەتەنیا فۆرم بەســـەر بابەتە دەرەکییەکەدا ناسەپێنیت؛ مەتەرەکاەشـــی دروســـتدەکات. ئەو بەفرەی لەژێر پای مندا دەتەپێت یان لەنێو دەستمدا دەتوێتەوە لەگەڵ خێرایی چالاکییەکەمدا دەبێت بە شتێکی ڕەق؛ پشتگیری من دەکات. هۆکاری ئەمەش لاچوونی سوکی و نا-جەوهەربوونییەکەی لەناوچوونە بەردەوامەکەی نییە. بەپێچەوانەوە، ئەو ســـوکی، لەناوچوون و شلییە نهێنییەیە، سەرنجی من ڕادەکێشێت؛ ڕەق و شل دەبێت تاکو پشتگیری لە من بکات. هۆکاری ئەمەش بۆ پەیوەندی خاوەنێتیم لەگەڵ بەفرەکەدا، کە خلیسکاندنە، دەگەڕێتەوە. ئێمە لەدواییدا باســـی ئەم پەیوەندییە دەکەین. بەڵام ئێســـتا هەوڵدەدەین لە واتا جەوهەرییەکەی تێبگەین. ئێمە وا بیر لە خلیسکاندن دەکەینەوە، کە لەسەر زەمین دەمێنێتەوە. ئەمەش دروستە. بەدڵنیاییەوە، من لەسەر ڕووی زەمین دەبم و ئەمەش پێویســـتی بە لێکۆڵینەوە هەیە. بەڵام تێهەڵکێشەیەکی قوڵیشی هەیە. من دەزانم بەفرەکە لەژێرەوە خۆی گرتوە تاکو من لەسەری بڕۆم؛ خلیسکاندنەکە چالاکییەکە لە دوورەوە؛ لە خۆیەتیم بۆ مەتەرەکە بەبێ ئەوەی پێویست بکات ڕەتیبکەم دڵنیام دەکات. خلیسکاندن بەپێچەوانەی ڕەگداکوتانە. ڕەگەکە نیوەی چۆتە ژێر زەمینەوە خۆی داکوتاوە؛ بووە بە بەشـــێک لە ژیانی گەشـــاوەی زەوی؛ بۆ سودوەرگرتن لە زەوی دەبێت خۆی بە زەوی بکات. خلیســـکاندن، بەپێچەوانەوە، یەکێتی ماتەری لە قوڵاییدا بەبێ ئەوەی بچێتە ناوەوە دەناســـێت؛ لەو خاوەن دەستەڵاتە ترسناکە دەچێت، کە پێویســـت ناکات بۆ ئەوەی پەیڕەوی فەرمانەکانی بکرێت زۆربکات و دەنگ بەرزبکاتەوە. لەمەشـــەوە پێشنیارە باوەکەمان بیردەکەوێتەوە، کە دەڵێت، "ئەی مرۆڤە تەمەن کورتەکەن بخلیسکێن و بیر لە خوارەوە مەکەنەوە". مەبەست ئـــەوە نییە لەشـــتەکان قووڵ نەبیتەوە، بەڵکو تێهەڵکێشـــەکان بە قووڵی ببینەو کۆڵمەدە.

خلیسکاندن خۆیەتییە چونکە تێهەڵکێشەکەی پشتگیریدەکات، لە خێراییەکەدا دەبینرێت و بۆ خلیسکەرەکە لە کاتی خلیسکاندنەکەدا دروستە. ڕەقی بەفرەکە تەنیا بۆ من کاریگەرە و واتا بەخشە؛ نهێنییەکە، کە بەفرەکە بۆ منی ئاشکرا دەکات و لەپشتی منەوە نابێت بەشتێکی ڕاست. خلیسکاندن پەیوەندییەکی مێژوویی نێوان تـــاک و ماتەر دەردەخات؛ مەتەرەکە خۆی بە ڕەقی کۆدەکاتەوە تاکو من بگرێت.

لەپشـــتی منەوە بە ماندوویی پەرشوبڵاو دەبێتەوە. بە تێپەڕبوونەکە ئەوەی بۆ من گرنگە دەدۆزمەوە. بیرۆکەی خلیسکاندن خودی خلیسکاندنە، کە هیچ ئاسەوارێک لەپاش خۆی جێناهێڵێت. خلیســـکاندنی ســـەرئاو لە پاش بەلەمەوە یان بەلەمی ماتۆڕییەوە، لەم دواییەدا دروســـتکراوە، نموونەی وەرزشـــی ئاوییە. خلیسکاندنی سەربەفر کەمتر تەواوکۆیە؛ ئاسەوارێک لە پاش من جێدەهێڵێت. یارییەکی کەمترە ئەگەر خەڵکـــی ئەم یارییە بکەن و گوێ نەدەنـــە کەمییەکەی، هۆکاری دیکەیان بەدەســـتەوە هەیە. لەکاتێکدا ئاسەواری خلیســـکاندنەکەمان پاش خۆمان لەسەر بەفرەکە دەبینین کەمێک توشـــی نائومێدی دەبیـــن. چەند خۆش دەبوو بەفرەکە بچوایەتەوە شـــوێنی خۆی! هەروەها ئێمەش لەگەڵ خلیسکاندنەکەمان لە لوتکەی چیاکەوە حەزدەکەین ئاسەوار پاش خۆمان جێنەهێڵین. دەمانەوێت بەفرەکە وەکو ئاوەکە ڕەفتار بکات. لەبەر ئەمە خلیســـکاندن لـــە داهێنانێکی بەردەوام دەچێت. خێراییەکەش هێمایە و ئاماژە بۆ ئاگامەندی دەکات و کاریگەرێتی بەسەر ماتەرەکەوە دیاریدەکات. دەرخســـتنی یەکگرتنەکە تێهەڵکێشـــکردنە خەســـتەکەی کێڵگەی بەفرەکە، کە دەبێت بە تەنێکی ڕێکخراو بۆ ســـود لێوەرگرتن، بەوجۆرەی سود لە چەکوشـــەکە یان دەزگایەک وەردەگرین و بە ئاســـانی دێتە ژێر دەست، بەردەوام لە داهێناندا دەبێت؛ بەفرەکە بە خلیســـکاندنەکە ڕەق دەبێت و لە دەستەمۆکردنی لەشـــی ڕووتی ئافرەتەکە لە دەســـت لەملکردنەکەدا دەچێـــت. بەڵام، بەفرەکە لە دەرەوەدا دەمێنیتەوە و دەســـتمان نایگاتێ؛ لەڕوویەکەوە، چالاکی خلیسکێنەرەکە لایەنـــە هێزەکییەکانی بەفرەکە دەخاتە بەرچـــاو. ڕەقی و یەکلایەنی ماتەرەکە لە وەرزشەکەیدا ئاشکرا دەبێت. ڕەقی و یەکلایەنییەکەشی خەسڵەتی ماتەرەکەن. ئەم تێهەڵکێشکردنەی خۆ و نا-خۆ لە چالاکی وەرزشزانەکەدا بەوجۆرەی لە بیرکردنەوە و بەرهەمی هونەریشدا هەیە، بەجەختکردنی مافی یاریزانەکە لەسەر و بەفرەکەوە دەردەبڕێت. من هەزارجار خۆم گواســـتۆتەوە و بەخێراییەکەم کارمکردۆتە ســـەر هێزی خەستبوونەوەکە؛ کە من خاوەنیم.

ئەمجۆرە خاوەنیتییە لە وەرزشـــدا دژوارییەکـــی دیکەی تێدایە. پێش داگەڕانم بە لوتکە بەفرینییەکەدا دەبێت پیایدا هەڵگەڕێم و بچمە ســـەری. پێداهەڵگەڕانەکە بەرگریکردنێکی دیکەی بەفرەکەم نیشـــاندەدات. من بەماندووبوونەکەم هەست بە بەرگریکردنەکەی دەکەم. هەموو ساتێکیش نزیکبوونەوەی سەرکەوتنەکەم دەپێوم. لێرەدا، بەفرەکە و بوونی کەســـانی دیکە و چەمکە باوەکانی، وەکو 'تێپەڕکردن' ، 'داگیرکـــردن' ، 'کارامە' و هتد لەیـــەک دەچن. پەیوەندی نێوان من و بەفرەکە بە پەیوەندی نێوان خاوەن کۆیلەو کۆیلە دادەنێن.

ئەم خاوەنێتییەی لە هەڵگەڕانەکەدا دەبینرێت لە مەلەوانیشدا هەیە. ئەو سەرەی ئاڵاکەی لێدانراوە دەبێت خاوەنێتی ئەو ســـەرەی ئاڵاکەی لیدانراوە بکەین. بنەمای

وەرزش، کەوابـــوو، بەتایبەتی ئەو وەرزشـــانەی لە دەرەوەی هـــۆڵ و یاریگاکاندا دەکرێن، داگیرکردنی تەنە گەورەکەی زەمین و هەواو ئاوە، کە لەوەوپێش سودیان لێوەرنەگیـــراوە. خاوەنێتیش لە هەموو حاڵەتەکاندا پرســـیاری لەبارەوە دەکرێت. هونەر، زانســـت و یاریکردن چالاکین بۆ وەدەســـتهێنانی خاوەنێتی لەودیو بابەتە کۆنکرێتییە ویستراوەکەوە، کە خودی بوونە یان بوونە ڕەها لەنێو-خۆکەیە.

ئۆنتۆلۆجـــی فێرماندەکات لە بنەڕەتدا ئارەزوو ئارەزووکردنە بۆ بوون. ئەمەش پەیوەندی بە خەسڵەتی کەمی و سەربەستی بوونەوە هەیە. هەروەها، فێرماندەکات ئـــارەزوو پەیوەندییە بە هەبوویەکی کۆنکرێتییەوە لەنێو جیهاندا و ئەو هەبووەش بوون-لەنێو-خۆیـــە؛ فێرماندەکات پەیوەندی نێوان ئەو بوون-لەنێو-خۆیە و ئارەزوو خاوەنێتییـــە. لێرەدا لەبـــەردەم دوولایەنی ئارەزوودا ئامـــادە دەبین: لەلایەکەوە، ئارەزوو ئارەزوکردنە بـــۆ بوونێکی دیاریکراو، کـــە بوونێکی-لەنێو-خۆی-بۆ-خۆی هەیـــە و نموونەییە: لەلایەکی دیکەوە، ئـــارەزوو لەزۆرحاڵەتدا پەیوەندییە لەگەڵ بوون-لەنێو-خۆی هەڵکـــەوت و کۆنکرێتیدا، کە پرۆژەی خاوەنێتی هەیە. ئایا ئەم دوولایەنە بەسەریەکدیا زاڵدەبن؟ هاوتەراز دادەنرێن؟ ئێمە دەتوانین لە بنەماکانی سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی دڵنیابین ئەگەر ئۆنتۆلۆجی پێناسەی پەیوەندی نێوان ئەو دووجۆر بوونە و خاوەنێتییەکە بکات. ئێســـتاش هەوڵدەدەین ئەم خاڵە ڕوونبکەینەوە.

ئایـــا مەبەســـتمان لە 'خاوەنێتی' چییـــە؟ یان چی لـــە داگیرکردنی بابەتێک تێدەگەیـــن؟ ئێمە کاتیگۆری 'کردن'مان کەمکردەوە تاکو کاتیگۆریەکانی 'بوون' و 'هەیەتی' ببینین. ئایا دەتوانین ئەمە لەگەڵ کاتیگۆری 'هەیەتی'دا بکەین؟

ئاشـــکرایە، لەزۆر حاڵەتـــدا، داگیرکردنی بابەتێک لەوەدایە بتوانیت ســـودی لێوەرگریـــت. بەڵام زۆر لەگەڵ ئـــەم بۆچوونەدا هاوڕا نیم. من لـــە قاوەخانەکەدا ســـود لە لێوان و قاپەکە وەردەگرم، بەڵام نابم بە خاوەنیان. سود لە تابلۆی سەر دیوارەکە وەرناگرم، کەچی من خاوەنیم. ئەو مافەی بۆ لەناوبردنی بابەتێک هەمە، کە من خاوەنیم هەندێکجار دروست دەرناچێت.

پێناسەکردنی خاوەنێتی لەسەر ئەم مافە دەبێت بە پێناسەیەکی ڕووتکراوە. لە کۆمەڵگایەکدا، کە پلانی ئابووری بۆ دادەنرێت خاوەن کارخانەیەک مافی خاونێتی کارخانەکەی هەیە، بەڵام مافی داخستنی پێنادرێت. لە ڕۆما خاوەن کۆیلە دەیتوانی کۆیلەی هەبێت، بەڵام مافی کوشتنی کۆیلەکەی پێنەدەدرا.

ئایا مەبەست لە مافی لەناوبردن یان سودوەرگرتن چییە؟ ئەم مافە من دەخاتەسەر زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی و پێناســـەی خاوەنێتیش لەســـەر ئەو زەمینە دەکرێت. هەروەها، ماف نەرێیەکی ڕووتە و سنورە بۆ ڕێگرتنی کەسانی دیکە لە سودوەرگرتن و لەناوبردنی ئەو شـــتانەی هەمە. بێگومان، دەتوانین پێناسەی خاوەنێتی لەسەر

کارکردنی کۆمەڵایەتی بکەین. بەڵام، لەپێش هەموو شتێکدا، هەرچەندە کۆمەڵ مافی خاوەنێتی بەگوێرەی یاسا دەسەلمێنێت، هێشتا پەیوەندی خاوەنێتی دروستناکات. ئەوپەڕی دەتوانێت بیکات بە یاسایی. ئەگەر خاوەنێتی بخرێتە ئاستی پیرۆزییەوە دەبێــت لەنێوان بوونی-بۆ-خــۆ و بوونی-لەنێو-خۆیەکی کۆنکرێتیدا پەیوەندی بێت. ئەگەر بیر لە داهاتووی ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بکەینەوە، کە خاوەنێتی تاکەکەسی تیادا ناپارێزرێت و داگیردەکرێت ئەوە ناگەیەنێت پەیوەندی خاوەنێتی لەناودەچێت؛ لەگــەڵ پەیوەندی تایبەتی نێوان مرۆڤ و شــتەکاندا دەمێنێتــەوە. لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، کە پەیوەندی هاوسەرییبوون نەکرابوو بە یاسا و میراتی لە دایکەوە دەستپێدەکرد، پەیوەندی سێکسی، لە شێوەی دۆستایەتیشدا بووبێت، هەرهەبوو. کەوابوو، پێویستە خاوەنێتی و مافی خاوەنێتی لەیەکدی جیابکەینەوە. لەبەرهەمان هۆکار، پێناســەکەی پرۆدۆن، کە دەڵێت، "خاوەنێتــی دزیکردنە" ڕەتدەدەمەوە. بێگومان خاوەنێتی لە دزییەوە پەیدا دەبێت یان لە پێناوی خاوەنێتیدا کەســێکی دیکە تــاڵان دەکەین. دزێک خۆی بە خاوەنی پارە دزراوەکەی دادەنێت. کەوابوو، کێشەکەمان روونکردنەوەیەکی تەواوی پەیوەندی نێوان دز و شتە دزراوەکان و ئەو شتانەیە ڕەوایانە بە یاسا بوون بە ماڵ.

ئەگەر بیر لەو بابەتە بکەمەوە، کە ماڵی منە، دەبینم خەسڵەتی بوونی بەتەواوی ئامــاژە بۆ ناولێنانی دەرەکی و بابەتــە دەرەکییەکە بۆ من ناکات؛ بەپێچەوانەوە، خەســڵەتەکە بە قووڵــی کاریتێدەکات؛ بۆ من و کەســانی دیکەش دەریدەخات، کە بەشــێکی بوونی بابەتەکەیە. لەبەر ئەمەشــە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بە هەندێک کەسیان دەگووت، 'داگیرکراو'، واتە سەر بە شتێکی دیکەیە... بۆ ئەمەش مردووەکانیان بە کەلوپەلەکانیانەوە دەناشت، تاکو لەدواییدا بەکاریان بهێنن. هەڵبەتە ئەو کاتەی ئەمجۆرە کەلتوورە ســەریهەڵدا وا بیری لێنەدەکراویەوە. کەلوپەلەکان خەســڵەتی مردووەکەیان هەڵدەگرت و هەمووی بوونی ئەویان پێکدەهێنا؛ ناشتنی مردووەکە بەبێ کەلوپەلەکانی، وەکو ناشتنی لاشەکەی بەبێ قاچەکانی بوو. لاشە و لێوانەکەی ئاوی پێدەخواردەوە لەگەڵ چەقۆکەی کەسە مردووەکەیان پێکدەهێنا. ســوتاندنی بێوەژنیش لە ناوچەی (مالەبار) لەگەڵ لاشــەی مــردووی مێردەکەدا سەربەم بنەمای پەیوەندییەیە؛ ژنەکە بوونێکی داگیرکراوی هەیە؛ پیاوە مردووەکە لەگەڵ خۆیــدا دەیباتە نێو گۆڕ. بەگوێرەی کۆمەڵ و یاســای ئەو کۆمەڵە ژنەکە لاشەیەکی مردووە؛ سوتاندنەکە یارمەتی دەدات بە مافی مردن لەدەست ئەم مردنە دەربازبێت. ئەو بابەتانەی ناخرێنە نێو گۆڕەکەوە دەبن بە دێوەزمە. خێو بیرۆکەی داگیرکردنی خانویەک [لەلایەن هێزێکی نادیارەوە] دەکات بە بیرۆکەیەکی کۆنکرێتی. لــە کاتێکدا دەڵێین، خانوەکە خێوی تێدایە مەبەســتمان ئەوەیە پارە و هەوڵدان کارناکەنە سەر ڕەهەندی مێتافیزیکی و فاکتۆری ڕەهای خاوەنێتییەکەی کەسەکەی

پێشو. دروستە، کە ئەو خێوانەی لەنێو قەڵا کۆنەکاندا هەن (لاریس)ی نزمن. بەڵام ئەمانە بێجگە لەو نهۆمانەی خاوەنێتی بەسەر دیوارەکانەوە چین؟ یەکەم، دەربڕین بۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان شـــتێک و خاوەنەکەی بەتەواوی دەچێتە ناوەوەی چەمکی خاوەنێتییەوە؛ مەبەســـت لە داگیرکردن ئەوەیە کەسێک خاوەنی تۆ بێت. واتە، بابەتە داگیرکراوەکە دەستی لە بوونی دراوە. هەروەها لەناوبردنی خاوەنەکە دەبێتە هۆکاری لەناوبردنی مافی داگیرکراوەکە. بەپێچەوانەشـــەوە، مانەوەی شتە داگیرکراوەکـــە دەبێتە هۆکاری مانەوەی مافی خاوەنەکە. بەندی خاوەنێتی بەندی نـــاوەوەی بوونە. مـــن لەنێو بابەتە داگیرکراوەکـــەدا خاوەنەکەی دەبینم. ئەمەش گرنگی پاشماوە کۆنەکانە؛ مەبەستمان تەنیا پاشماوەی ئایینی نییە، بەڵکو هەموو کەلوپەلەکانی مرۆڤێکی ناوداریشە، کە لەوانەیە ئەو مرۆڤە بناسین.(بۆنموونە، بیر لە مۆزەخانەی ڤیکتۆرهۆگۆ یان کەلوپەلەکانی بلزاک و فلوبێرت بکەوە.)

ئەم بەنـــدە ئۆنتۆلۆجییە ناوەکییە لەنێوان شـــتەکە و خاوەنەکەیدا بیردۆزەی خاوەنێتی ڕیالیستانە ڕاڤەناکات. ئەگەر پێناسەکەمان بۆ ڕیالیزم، وەکو خۆ و بابەت بە دوو لایەنی سەربەخۆ دابنێت و دروستبێت، ئەوا بۆ خاوەنێتی بەکارنایەت. بەڵام زانیمان کە بوونی جەوهەری بـــە بابەتە زانراوەکە دەدرێت. ئەمەش بۆ خاوەنێتی دەبێت: شـــتە داگیرکراوەکە بوونی خۆی هەیە، شتێکە بەردەوام و لە کات-بەدەر. کەوابوو، دەبێ سەربەخۆیی پێببەخشین. جەوهەرێک نابێت بە خاوەنی جەوهەرێکی دیکە. ئەگەر خەسڵەتی 'داگیرکردن' بە شتێک بدەین. لەبەر ئەوەیە، کە پەیوەندی بنەڕەتی و ناوەکی بوون-بۆ-خۆ لەگەڵ بوون-لە-نێو خۆدا، کە دەبێت بە خاوەنێتی لـــە ناتـــەواوی بوون-بۆ-خۆوە پەیدا دەبێت. ئەوەش دروســـتە، کـــە بابەتەکە بە داگیرکردنی کارناکرێتە سەری و وەکو بابەتی زانین وایە. بەبێ دەستلێدان (مەگەر لەو حاڵەتەدا بابەتە داگیرکراوەکە مرۆڤێکی دیکە، بۆنموونە کۆیلە یان لەشفرۆشێک بێت) دەمێنێتەوە. ئەمەش کارناکاتە ســـەر واتاکەی؛ واتاکەی ئەم خاوەنێتییە بۆ بوون-بۆ-خۆ دەردەخات.

ئەگەر خاوەن و شـــتە داگیرکراوەکە لە پەیوەندییەکی ناوەکییدا لەسەر کەمی بوونی بوون-بۆ-خۆ یەکبگرن، دەبێت واتا و سروشـــتی ئەو یەکگرتنە دوولایەنییە ڕوونبکەینـــەوە. لەڕاســـتیدا، پەیوەنـــدی ناوەکـــی تێهەڵکێشـــەیە و کاردەکاتە ســـەر هەردوو لایـــان. واتە، هەردوو لایەنەکە بە بیرۆکە ڕاســـتەقینەیەکی تایبەت دروســـتدەکەن. خاوەنێتی یەکگرتنە لەگەڵ بابەتەکـــەدا. حەزکردن لە بابەتێکی دیاریکراو حەزکردنێکی سادە بۆ ئەو بابەتە نییە؛ ئارەزووکردنە لە یەکگرتن لەگەڵ بابەتەکەدا و بەســـتنی پەیوەندییەکی ناوەکییە لە شێوازی یەکگرتنی "داگیرکەر و داگیرکراوەکەدا." ئارەزووکـــردن لە هەیەتی دەبێت بە ئارەزووی پەیوەندی لەگەڵ بابەتێکدا و لە پەیوەندییەکی دیاریکراو لەگەڵ بووندا.

لەگـــەڵ دامەزراندنـــی پەیوەندییەکـــەدا، بەوجۆرەی تەماشـــای هەڵوێســـتی زانســـتکارەکە، هەنەرمەندەکە و وەرزشزانەکەمان کرد، بۆ ئێمەش سودی دەبێت. لە هەڵوێستی هەریەکێک لەواندا شێوازێکی خاوەنێتیمان دۆزییەوە. دەرکەوت، کە بابەتەکە جۆرێکە لە هەڵقولاوی لایەنی خۆیەتیمان و لەدەرەوەشدا سەربەخۆییەکەی پارێزراوە. "هی منە"، وەکو پەیوەندی بوون لەنێوان لایەنێکی خۆیەتی ڕەهای من و لایەنـــی دەرەکی ڕەهای ئەوەی من-نییە دامەزرا. لەنێو هەمان ســـازاندنی خۆ و نا-خۆدا و نا-خۆ و خۆدا ســـەریهەڵدا. بەڵام، پێویستە لە باسی ئەم پەیوەندییەدا وریاتر بین. لە پرۆژەی خاوەنێتیدا ڕووبەڕووی بوون-بۆ-خۆ دەبینەوە. ســـەربەخۆ و جیا لەو ئەگەرەوە ڕادەوەســـتێت، کە ئەوە. ئەو ئەگەرەش ئەگەری داگیرکردنی بابەتە. هەروەها، ئـــەو بەهایەش دەبینین، کە دەبێت بە دێوەزمەی بوون-بۆ-خۆ، وەکو بیرۆکەی هەمووی بوون و یەکگرتنەکە دروســـتیدەکات. کەوابوو، خاوەنێتی پەیوەنـــدی بوونە لەنێـــوان بوون-بۆ-خـــۆ و بوون-لەنێو-خۆیەکـــی کۆنکرێتیدا و یەکگرتنەکەی نێوانیان پێکدەهێنێت.

خاوەنێتی واتە شتێک هەیە بۆ منە؛ واتە، من کۆتاییەکی تایبەتی ئەو بابەتەم. ئەگەر خاوەنێتی بەتەواوی شتێکی دراوبێت کەسەکە دەبێت بە خاوەنی بابەتەکە. مـــن ئەو پاندانەم هەیـــە؛ واتە ئەو پاندانە بۆ من هەیە یان بۆ من دروســـتکراوە. لەســـەرو ئەمـــەوە، من ئەو بابەتەی دەیخوازم دروســـتدەکەم. دابەشـــکردنی کار بناخەی ئەم پەیوەندییە لەقدەکات، بەڵام لەناوینابات. خۆشگوزەرانی لە پلەوپایە نزمکردنەوەیەتی؛ لەخۆشگوزەرانییدا من بابەتێکم هەیە کەسانی دیکە (وەکو کۆیلە یان نۆکەرەکانی نێوماڵ) بۆ من دروســـتیان کردوە. خۆشـــگوزەرانی شـــێوازێکی خاوەنێتییە، بەڵام ســـەرەتاییە. لەنێو کۆمەڵدا، کاتێک باســـی دابەشـــکردنی کار دەکەین، ئەم پەیوەندییە ســـنووردارەکرێت و دادەپۆشـــرێت، بەڵام خەفەناکرێت. ئەو بابەتەی هەمە ئەوەیە، کە کڕیومە. پارە دەبێت بە دەســـتەڵاتی من؛ ئامێرێکە بۆ خاوەنێتی. لەبەر ئەمەش، بێجگە لە حاڵەتە نائاســـاییەکانی چاوچنۆکی، پارە بۆ ئەگەری کڕین دەوردەبینێت؛ شـــتێکی کەم خایەنە و بۆ دەرخســـتنی بابەتەکە دروســـتکراوە و بوونێکی گوێزراوەی هەیە. بەڵام بۆ من دەســـتەڵاتێکی داهێنەرە: کڕینـــی بابەتێک، وەکو داهێنانی بابەتەکە کارێکی هێمایییە. لەبەر ئەمەیە پارە بە دەستەڵات دادەنرێت. لەبەر ئەوە نییە دەتوانین ئەوەی ئارەزوومانە پێی پەیدابکەین بەڵکو نوێنەری کاریگەرێتی ئارەزووەکەشـــمە. شـــتێکی بەرزە ڕووەو بابەتەکە و نوێنەری پەیوەندییە جادوگەرییەکەمە لەگەڵ بابەتەکەدا. پارە پەیوەندی تەکنیکی نێـــوان خۆ و بابەت دادەپوشـــێت. ئارەزوو دەخاتەگـــەر و دەبێت بە جادوی نێو داســـتانە جادوگەرییەکان. لەبەردەم جانتایەک پارەی نێو گیرفانت ڕاوەستە؛ ئەو شتانەی بۆت دانراون نیو ساڵ کەمتر کۆنن. لەم ڕووەوە، پارە بەندێکی خاوەنێتی

لەنێوان بوونی-بۆ-خۆ و هەموو بابەتەکانی نێو جیهان دەبەستێت. بە هۆی پارەوە ئارەزوو دەبێت بە زانیاری بەخش و داهێنەر.

لە ڕێگەی کەمکردنەوەی بەردەوامی پلەوپایە بەرزەکە بەندی داهێنانی نێوان خۆ و بابەت دەمێنێتەوە. هەیەتی، یەکەمجار داهێنانە. کەوابوو، بەندی خاوەنێتی بەندی داهێنانی بەردەوامە؛ ئەو بابەتەی دامهێناوە خراوەتە نێو ژینگەی منەوە؛ بوونی بە هەڵوێستی منەوە گرێدراوە. چرای سەرمێزەکەم گلۆپ و چەتری سەری و وایەری کارەباکە نییە؛ هێزێکی ڕووناکی تایبەتە لەسەر مێزەکەم و لای پەرتووکەکانمەوە؛ بە شەو ڕووناک کەرەوەی کارەکانمە و پەیوەندی بە خوێندنەوە و نوسێنمەوە هەیە. ڕۆشن و ڕەنگدارە بەوجۆرەی من سودی لێوەردەگرم و بەکاریدەهێنم؛ لە ڕێگەی سود وەرگرتنەکەوە هەیە. ئەگەر لە مێز و کارەکانم جیابکرێتەوە و لەسەر زەوی دوکانێک لەنێو شتەکانی دیکەدا دابنرێت، چراکەم ڕادیکاڵانە لەناودەچێت؛ نابێت بە چرای من. بەڵکو دەبێت بە ئەندامێکی جۆری هەموو چراکان و بۆ ڕەسەنی خۆی دەگەڕێتەوە. بەم شێوەیە من لە بوونی ئەو شتانەی هەمە بەرپرسم. بەخاوەنێتی بوونیان دەگۆڕم. ژیانیشم داهێنانە، چونکە بە بەردەوامی ژیان بابەتەکانیش دەبن بەهی من. کۆمەڵێک شتی کۆکراوە لەگەڵ بوونی خۆمدا دەهێنمە بوونەوە. ئەگەر لە من دابڕێن، وەکو جیهانەکەم دەمرن.

بەڵام پەیوەندی ڕادیکاڵ و بنەڕەتی داهێنان پەیوەندی ڕێژەنانەیە. ئەو گرفتانەی توشی بیردۆزەی جەوهەری دێکارتی بوون یارمەتیمان دەدەن ئەم پەیوەندییە بدۆزینەوە. ئەوەی دایدەهێنم خودی خۆمە ئەگەر داهێنان دەرهێنانی فۆرم و ماتەر بێت بۆ بوون. تراجیدیای داهێنەری ڕەها، ئەگەر داهێنەر هەبێت، نەشیاوی دەرچوونە لە بوونی خۆیەوە بەرەو دەرەوە چونکە ئەوەی دایدەهێنێت بوونی خۆیەتی. چۆن شتێکی داهێنراو، کە فۆرم و ماتەری سەر بە بوونی منە دەرەکییە و سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێت؟ تەنیا شتێکی نەجوڵا و دەتوانێت ڕایگرێت. ئەو شتە نەجوڵاوەش پێویستە من بەردەوام بە داهێنان ڕایوەستێنم. بەو ڕادەیەی خۆم بە داهێنەری بابەتەکان دەبینم بە پەیوەندیش خاوەنێتی بابەتەکان دەکەم بە موڵکی خۆم. پاندان و سەبیلی جگەرەکەم، جلوبەرگ و مێزەکەم و خانوەکەم منن. کۆی هەموو ئەو شتانەی هەمە کۆی بوونی منە. من ئەوەم، کە هەمە. کاتێک دەست لە لێوانەکە دەدەم دەست لە بوونی خۆم دەدەم. ئەو شاخەی پیایدا هەڵدەگەڕێم بوونی خۆمە و دەمەوێت پیایدا سەرکەوم؛ کاتێک بە لوتکەکەی دەگەم و لەوێوە تەماشای دامانی چیاکە دەکەم من خودی دیمەنەکەم؛ دیمەنە گەورەکە بوونی منە لە ئاسۆدا چونکە بە هۆی منەوە و بۆ من هەیە.

داهێنان چەمکێکی چاوبرسییە، بەجوڵانەوە هەیە و بە وەستان وندەبێت. ئەگەر بەزۆریش وەریگرین، هەرلەناودەچێت؛ من بە تەنیا لایەنی خۆیەتیم دەدۆزمەوە یان

ڕووبەڕووی ماتەرێکی ڕووتی ناجۆر دەبمەوە، کە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. مانەوەی داهێنان لەسەر گۆڕانێکی بەردەوام لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە ڕادەوەستێت. بەوجۆرەی بابەتێک لەنێو جیهانی مندا سەرهەڵدەدات دەبێت ئەویش بەگشتی من بێت و منیش نەبێت. ئەمەش لە خاوەنێتیدا هەیە. بابەتە داگیرکراوەکە داهێنانێکی بەردەوامە؛ بەڵام سەربەخۆشە و بوونێکیِ-لەنێوِ-خۆیە. ئەگەر پشتی تێبکەم وننابێت؛ ئەگەر دوور بکەومەوە بوونم لای مێزەکەوە، لەنێو ژوورەکەدا یان لەنێو جیهاندا دەستنیشاندەکات. بەڵام لەسەرەتاوە مەحاڵە بچینە ناوی. ئەو پاندانە بەتەواوی منە، تەنانەت کاتێک پێی دەنوســـم لە نوسینی جیاناکەمەوە. لەلایەکی دیکەوە، وەکو خۆیەتی؛ خاوەنێتی من نایگۆڕێت؛ تەنیا پەیوەندییەکی بیرۆکەیی لەنێوانماندا هەیە. واتە، ئەگەر سودبەخش بێت چێژ لە خاوەنێتییەکـــەی وەردەگرم. کاتێک بیر لە بوونی دەکەمەوە پەیوەندی خاوەنێتی نامێنێت. ســـەبیلی جگەرەکەم لەسەر مێزەکە بوونێکی سەربەخۆی هەیە. هەڵیدەگرم، هەستیپێدەکەم و تەماشایدەکەم تاکو پەیوەندی خاوەنێتییەکەم لەگەڵیدا ببینم؛ ئەم جوڵانانە چێژی خاوەنێتیم پێدەبەخشـــن. من هەست بە بوونی بۆڕییەکی نەجوڵاوی لەداردروستکراو لەنێو پەنجەکانمدادەکەم. چێژوەرگرتنەکەم بە بەکارهێنان و سود بەخشینەکەیەوە وەستاوە.

پەیوەنـــدی بەردەوامـــی داهێنان لەنیـــو خۆیدا ناکۆکییـــەک هەڵدەگرێت، کە لەگەڵ ســـەربەخۆیی بابەتە داهێنراوەکاندا پەیدادەبێت. خاوەنێتی پەیوەندییەکی جادوگەرانەیـــە؛ من ئەو بابەتانەم، کە هەمن، بەڵام لـــەدەرەوەدا ڕووبەڕووی خۆم دەبمەوە؛ من وەکو شـــتێکی ســـەربەخۆ لەخۆم دروستیاندەکەم. ئەو شتانەی من خاوەنیانم لەدەرەوەی بوونی مندا و خۆیەتی مندا هەن. وەکو بوونِ-لەنێوِ-خۆ لەژێر دەستم ڕادەکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی من هەمیشە لەدەرەوەی بوونی خۆمدام، وەکو شـــتێکی ناتەواو خۆم دەناسم. کاتێک دەبم بەخاوەنی بابەتێک بوونم بۆ بابەتەکە دەگۆڕم. لەپەیوەندی خاوەنێتییدا لایەنی بەدەستەڵات بابەتەکەیە؛ بەبێ بابەتەکە مـــن بێجگە لـــە خاوەنێتییەکی ڕووت، ناتەواو، کە تـــەواوی و پڕی بە بابەتەکەوە بەستراوە، هیچ دیکە نیم.

لە خاوەنێتیدا من دەبم بە بناخە بۆ بوونم چونکە لەنێو بوونِ-لەنێوِ- خۆدام. بەو ڕادەیەی خاوەنێتی داهێنانێکی بەردەوامە ئەوا بابەتەکە بە شتێکی داهێنراو لەلایەن خۆمـــەوە دەبینم. لەلایەکی دیکەوە، لەبەر ئـــەوەی داهێنان ڕێژەنە ئەوا بابەتەکە جارێکـــی دیکە لە بوونی مندا دەتوێتەوە و دەبێت بە من. لەکۆتاییدا، مادام لەنێو خۆیدایـــە، ئەوا من نییە، بەڵکو منم و ڕووم لە خۆم کردووە. شـــتێکە دەرەکی و هەمیشەیی، ناچێنە ناخییەوە و پەیوەندییەکی دەرەکی لەگەڵ مندا هەیە.

مادام من پەیوەندییەکی ناجۆری بوونِ-لەنێوِ-خۆم لەگەڵ بوونی خۆمدا هەیە، ئەوا بناخەی بوونم. ئەمەش پرۆژەی بوونِ-لەنێوِ-خۆیِ-بۆ-خۆیە. ئەم بوونە ئایدیاییە

بـــەو بوونە-لەنێو-خۆیە دانرا، کە تیایدا بوون-بۆ-خۆ دەبێت بە بناخەی بوونی یان ئەو پرۆژە بنەڕەتییەی، کە بوون-بۆ-خۆ نایەوێت تیایدا ببێت بە شێوازێکی بوون، بەڵکـــو بەو بوونە-لەنێو-خۆیەی هەیە. دوولایەنی بوون-بۆ-خۆیەکەی دەیەوێت ببن بـــە خاوەن و بوون-لەنێو-خۆکەی داگیردەکرێت. لەو بوونە دەچێت دەیەوێت ببێت بە خاوەنی داهێنانی خۆی یان ببێت بە خوا. کەوابوو، داگیرکەر دەیەوێت خۆشی لە بوون-لەنێو-خۆی خۆی یان بوونی دەرەکی خۆی وەرگرێت. لە خاوەنێتییدا من ئـــەو بابەتە دەدۆزمەوە، کە وەکو بوون-بۆ-ئەوان وایە. لەبەر ئەمە ســـەرهەڵدانی کەســـانی دیکە سەرسامم ناکات؛ ئەو بوونەی کەسێکی دیکە حەزدەکات بیهێنێتە نێو جیهانەوە منم-بۆ-کەسانی-دیکە. ئەو بوونەیە خۆشی لێوەردەگرم. خاوەنێتی، بەمجۆرە، بەرگریکردنە لە خۆمان دژی کەسانی دیکە. ئەوەی هی منە خودی منە لە شـــێوازی نا-خۆیەتیدا و منیش بناخە سەربەستەکەیم. ناتوانم جەختی زۆریش لەســـەر ئەو خاڵە بکەم، کە ئەم پەیوەندییە بیرۆکەیی و هێماگەریانەیە. ئارەزووی بنەڕەتیم بۆ بوون هەرگیز لە خاوەنێتیدا، وەکو نەخۆشەکەی فرۆید نییە، کە گرێی ئۆدیبی هەیە و خەو دەبینێت سەربازێک (بۆنموونە پاشای ڕووس)، کە نوێنەرایەتی باوکی دەکات دەکوژێت و ڕازی نابیت، منیش ڕازی نابم. لەبەر ئەمەشە خاوەنێتی لای خاوەن وەکو شـــتێکی دراو بەیەکجار لە ئەزەلەوە دراوە و کاتێکی نەبڕاوەشی دەوێت لێیتێبگات. هیچ کارێکی تایبەتی سودوەرگرتن خۆشی خاوەنێتی بە تەواوی دەرناخات؛ تەنیا ئامـــاژە بۆ کردەوەکانی دیکەی خاوەنێتـــی دەکات. هەریەکێک لـــە ئەوان بەهایەکی جادوگەرانەی هەیە. پێش ئەوەی پاســـکیلێکت هەبێت دەبێ تەماشای پاسکیل بکەیت و دەستی لێبدەیت. بەڵام دەستلێدان بەس نییە؛ گرنگە سواری پاسکیلێک ببیت و سوڕێک بدەیت. ئەم سوارییە سوپاسگوزارەش بەس نییە؛ پێویستە بە پاسکیلەکە بۆ شوێنێک بڕۆیت. ئەمەش ئاماژە بۆ بەکارهێنانی زۆرتر و گەشتی زۆرتر بەناو فەرەنسادا دەکات. ئەم گەشتانەش ئاماژە بۆ هەزار کردەوەی دیکـــەی خاوەنێتی دەکەن و ئەوانیش ئاماژە بۆ ئەوانی دیکە دەکەن. لە کۆتاییدا، بەو جۆرەی پێشـــبینی دەکرێت، نوســـینی چەکی بانقێک بەسە تاکو من بکات بە خاوەنی پاســـکیلەکە. بەڵام تێگەیشتن لە خاوەنێتییەکەی هەموو ژیانمی دەوێت. بە دەســـتکەوتنی بابەتەکە تێدەگەم، کە خاوەنێتی پرۆژەیە و مردن لەناویدەبات. ئێستا تێدەگەین بۆچی؛ چونکە مەحاڵە لە پەیوەندییەک تێبگەین هێماکردن ببێت بە خاوەنی. لەڕاستیدا، خاوەنێتی کۆنکرێت نییە. چالاکییەکەی ڕاستەقینە (وەکو خـــواردن و خواردنەوە و نوســـتن) نییـــە تاکو بە هێما بۆ ئارەزوویەکی ناســـراو دابنرێت. تەنیا وەکـــو هێما هەیە؛ هێماکان واتاکەی بوونی و پێکەوە لکاندنەکەی دەردەخـــەن. لەدەرەوەی بەها هێماگەرییەکەیدا خۆشـــی لێوەرناگیرێت؛ ئاماژە بۆ خۆشییەکی بەرزی خاوەنێتی (ئەو بوونەی بناخەی خۆیەتی) دەکات. هۆی ئەمەش

مەحاڵبوونی بڕوانامە بە خاوەنێتی بابەتێک بوون-بۆ-خۆ توشی توندو تیژی دەکات تاکو لەناوییبەرێت. لەناوبردن توانەوەی ئەوشتە لە بوونی خۆمدایە؛ ئەو ئاگرەی من بەرمداوەتە کێڵگەیەک کاردەکاتە سەر یەککگرتنی من و کێڵگەکە. کتوپڕ پەیوەندی بوون لە داهێنانەکەدا وەردەچەرخێت؛ من دەبم بە بناخەی کایەنە سوتاوەکە. من کایەنەکەم چونکە لەناویدەبەم. لەناوبردن باشتر لە داهێنان خاوەنێتی دەناسێتەوە. بابەتە لەناوبراوەکە نامێنێت تاکو بەرگری بکات. ئەو لێوانەی لەسەر میزەکە دانرابوو من شـــکانم، هێشتا لەوێیە، بەڵام بووە بە شەفافییەتێکی ڕەها. من دەبینم هەموو هەبووەکان بەزۆر ســـەپێنراون. ئەمەیە دەرهێنەرە سینەماییەکان لە فلیمەکانیاندا نیشـــانیدەدەن. بابەتە لەناوبراوەکە لە ئاگامەندی دەچێت هەرچەندە، وەکو بوون-لەنێو-خۆیەک ئومێدی چاکبوونەوەی نییە. هەروەها، من خاوەنیم. ئەو ڕاستییەی من دەکات بەوەی هەم بابەتە لەناوچووەکە دەپارێزێت. من لەگەڵ دروستکردنی خۆمدا ئەویش دروســـتدەکەم؛ لەم بۆچوونەوە لەناوبردن لەگەڵ ناسینەوەی لێپرسینەوە بەرانبەر هەموو ئەو شتانەی هەیە، داهێنانە.

پێویســـتە لەناوبردن بخرێتە ڕیزی ئەو کردەوانەی خاوەنێتی دادەمەزرێنن. زۆر لـــەو کردەوانەش بونیادێکی ڕوخێنەریان لە تەنیشـــت بونیادەکانی دیکەوە هەیە. بەکارهێنان ســـودوەرگرتنە. سود لەبەکارهێنانی پاسکیلەکەم وەردەگرم و سواری دەبـــم؛ بەردەوامی داهێنانێکی خاوەنێتی لە ڕوخانی بەشـــێکیدایە. بەکارهێنانەکە لەبەر هەندێک هۆکار پەرێشانی دروستدەکات، بەڵام خۆشییەکی نهێنیش دەهێنێت، کە وەکو خۆشـــی وەرگرتن لە خاوەنێتییـــە؛ چونکە لە ئێمەوە دەردەچێت و ئێمە کەســـەکەین بەکاریدەهێنین. دەبێت ئەو خاڵە فەرامۆش نەکەین، کە 'بەکارهێنان' واتای لەناوبردنی خاوەنێتی خۆشی وەرگرتنیش دەبەخشێت. بەکارهێنان لەناوبردنە، خواردنە؛ لەناوبردنی شتێکە تاکو بیخەیتەسەر بوونی خۆت. ئەگەر سواری پاسکیلەکە ببم بە کۆنبوونی تایەکانی پەرێشـــان دەبم، چونکە کەس نادۆزمەوە بۆم بگۆڕن؛ وێنەی خۆشییەکەی لەشم لەسواربوونەکەوە وەریدەگرێت خاوەنێتییەکی لەناوبردنی "داهێنان-لەناوبردنە". پاسکیلەکە دەخشێ و بەو جوڵانەی من دروستیدەکەم دەبێت بە هی من و دەمگوێزێتەوە. داهێنانەکە لەســـەری مۆردەکرێت و لەگەڵ کۆنبوونی تایەکان، وەکو نیشانەی خاوەنێتی بەسەر کۆیلەوە، خۆی دەچەسپێنێت. بابەتەکە بـــۆ منە چونکە من بەکاریدەهێنم؛ بەکارهێنانی ئەو شـــتەی مـــن خاوەنیم دیوی دووەمی ژیانی منە.

ئەم بۆچوونانە یارمەتیمان دەدەن باشـــتر لە واتای هەندێک لە هەســـتکردن و ئەو ڕەفتارانە تێبگەین، کە گوایە کەمناکرێنەوە؛ بۆنموونە ســـەخاوەتی. لەڕاستیدا دیـــاری فۆرمێکی ســـەرەتایی لەناوبردنە. ئێمە دەزانین ئاهەنگـــی دیاریگۆڕینەوە دەبێتە هۆکاری لەناوبردنی چەند کەلوپەلێک. ئەم لەناوبردنە بۆ کەســـێکی دیکە

قەدەغەن؛ دیارییەکە دەیبەستێتەوە. لێرەدا گرنگ نییە بابەتەکە لەناوبرابێت یان بە کەسێکی دیکە درابێت؛ لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئاهەنگی دیاری گۆڕینەوە لەناوبردن و بەستنەوەی کەسەکەی دیکەیە. من بە بەخشین ئەو بابەتە لەناودەبەم. خەسڵەتی خاوەنێتی من بۆ بابەتەکە دەشارمەوە، کە لەنێو بوونیدایە و لەبەرچاوم لای دەبەم. وەکو پەیوەندیم لەگەڵ مێز و ژوورەکەمدا بە ئامادەنەبوو دایدەنێم، ســەخاوەتی، لەبەرئەم هۆکاریە، ڕۆڵی ڕوخێنەر دەبینێت. حەزکردن لە بەخشینی کەلوپەل، کە زۆرجار توشی چەند کەسێک دەبێت حەزکردنێکی قووڵە لە ڕوخاندن؛ وەکو شێتییە یان خۆشەویستییە بۆ وردوخاشــکردنی بابەتێک. حەزە قوڵەکەی لەناوبردن، کە لەسەخاوەتیدا هەیە حەزکردنە لە خاوەنێتی. هەموو ئەو شتانەی وازیان لێدەهێنم و دەیانبەخشمەوە زۆر خۆشییان لێوە وەردەگرم چونکە دەمەوێت وازیان لێبهێنم؛ بەخشینەوە خۆشی پێگەیشتنێکی تیژ و کورتە، لە چێژوەرگرتنی سێکسی دەچێت. بەخشــینەوە خۆشی وەرگرتنە لەو بابەتەی هەتە و دەیبەخشیتەوە؛ هەڵوێستێکی خاوەنێتی ڕوخێنەرانەیــە. لەهەمانکاتدا دیارییەکە جادو لەو کەســە دەکات، کە وەریدەگرێت؛ زۆری لێدەکات داهێنەربێت، بەردەوام داهێنەرانە ئەو بەشەی من، کە نامەوێت و لەناومبردوە و تەنیا وێنەکەیم لاماوە، لای خۆی بهێڵێتەوە. بەخشــین بەکۆیلەکردنــە. بەڵام ئەم لایەنەی دیاری بەخشــین بۆ ئێمــە گرنگ نییە و تەنیا بۆ پەیوەندیمان لەگەڵ کەســانی دیکەدا باســیدەکەین. جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەین، کە سەخاوەتی کەمنەکراوەیە؛ بەخشین خاوەنێتییە لە ڕێگەی لەناوبردنەوە و بەکارهێنانی لەناوبردنەکەشــە بۆ بەکۆیلەکردنی کەســێکی دیکە. سەخاوەتی، کەوابوو، هەستکردنە و بوونی کەسێکی دیکە بونیادەکەی پێکدەهێنێت. ئاماژەش بــۆ خاوەنێتی بە ڕوخاندن دەکات. لــەم ڕووەوە، زۆرتر بەرەو نەبوون نەک بوون-لەنێو-خۆمان دەبات (لێــرەدا نەبوونی بوون-لەنێو-خۆمان هەیە، کە خودی بوون-لەنێو-خۆکەیە، بەڵام وەکو نەبوون هێمایە بۆ ئەو بوونەی دەبێت بە نەبوونی خۆی). ئەگەر سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی لە کەسێکدا خەسڵەتی سەخاوەتی بینی پێوســیتە بەدوای پرۆژە بنەڕەتییەکەیدا بگەڕێت. پێویســتە بپرسێت بۆچی ئەو کەسە هەڵیبژاردووە بە ڕوخان خاوەنێتی بچەسپێنێت نەک بە داهێنان. وەڵامی ئەم پرسیارە پیوەندییە بنەڕەتییەکەی ئەو کەسە، کە کەسایەتییەکەی پێکدەهێنێت، لەگەڵ بووندا دەردەخات.

مەبەســتمان لەم ڕوونکردنەوەیە ڕۆشنایی خستنەسەری خەسڵەتی پەیوەندی خاوەنێتی و کارکردنی هێمایی هەموو کردەوەکان بوو، کە هەوڵی خاوەنێتی دەدەن. پێویستە ئەوەش بزانین، کە هێما لەگەڵ بابەتەکەیدا یەکناگرێت و شتێکیش نییە لەودیو ئاگامەندییەوە ســەریهەڵدابێت، بەڵکو لە بونیــادی بوون-لەنێو-جیهانەوە پەیدا دەبێت. لەو بەشــەدا باسی بەرزێتیمان کرد، ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵەش کرد،

که سیســـتەمی ئامێرەکان لەنێو جیهاندا لە ئاکامی پرۆژەدانانی من بەرەو بوون-لەنێو-خۆ، وێنەی ئەگەرەکانم، کە بوونی منن، پەیدا دەبێت. بەڵام هەرگیز ناتوانم لەگەڵ ئەو وێنەیەی جیهاندا ببم بە یەک چونکە تەنیا بە تێڕامانێک دەتوانم خۆم لە شێوازی بابەتدا ببینم. مادام سوڕانەوەی خۆ تێڕامانانە نییە، ئەوا بەیەکدانانی ئەو بوونەی هەمە دەبێت بە شتێکی نا-بیردۆزەیی، کە "بوون-لەنێو-خۆ"ی بوونی منەو بەبــێ ئەوەی من بزانم جیهانیش ئاماژەی بۆ دەکات. منیش بە هۆی کارەکانمەوە دەتوانم لەگەڵیدا بگونجێنم. لەئاکامدا، لە خاوەنێتیدا مەرج نییە کەســـەکە بزانێت بابەتەکەی بەدەســـتەوەیە؛ بەڵکو خاوەنێتـــی واتە لەنێو پەیوەندییەکەدا بێت یان باشترە بڵێین، خودی پەیوەندییەکە بێت. بابەتە داگیرکراوەکە بۆ ئێمە ڕاستەوخۆ خەســـڵەتی ناســـراوی هەیە، کە بەتەواوی گۆڕانی بەســـەردا دەهێنێت و دەیکات بەو بوونەی من خاوەنیم. بەڵام ئەم خەســـڵەتە نابێتە هۆکاری یەکگرتنەکە؛ تەنیا بـــە کردن خۆی دەردەخات. واتایەکی دیاریکراو دەبەخشـــێت و لەو ساتەشـــەوە دەمانەوێـــت کەمێک خۆمانی لێ دوور بخەینـــەوە و بیر لە بوونی بکەینەوە. بەبێ دەرخستنی واتای بونیادەکەی خەسڵەتەکە لەناودەچێت. خۆ دوور خستنەوەکەمان لەناوبردنی پەیوەندی خاوەنێتییە. لەپێشـــتر من لەگەڵ وێنە گشتیەکەدا مامەڵەم دەکرد و نەمدەزانی؛ ســـاتێکی دیکە و ئەو وێنەگشتییە دەڕوخێ و منیش ناتوانم واتاکەی لەنێو پارچەکانیدا بدۆزمەوە. ئەمەش لە نموونەی بە نا-کەسکردنی هەندێک نەخۆشـــدا، هەرچەندە خۆیان نایانەوێت، دەبینرێت. کەوابوو، بە زۆر دەبێت پەنا بۆ سایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی بەرین تاکو لە هەموو حاڵەتەکاندا واتای تێهەڵکێشەی خاوەنێتیمان بۆ دەرکەوێت، کە واتا گشتی و ڕووتکراوەکەیمان لەسەر ئۆنتۆلۆجی دامەزراند.

ئەوەی باســـمان نەکردووە واتای گشـــتی بابەتە داگیرکراوەکەیە. ئەم باسکرنە کۆتایی بە زانیاریمان لەسەر پرۆژەی خاوەنێتی دەهێنێت. کەوابوو، ئەو شتە چییە ئێمە دەمانەوێت ببین بە خاوەنی؟

یەکەمجار ئاســـانە ببینین ئێمە لە بنەڕەتەوە ئامانجمان داگیرکردنی شـــتێکی ڕاستەقینە و بابەتێکی دیاریکراوە. لەڕاستیدا، ئەوەی من ئارەزووی خاوەنێتی دەکەم نوێنەرایەتـــی بوون-لەنێو-خۆ دەکات؛ من دەمەوێ ببـــم بە بناخەی بوونی چونکە بەشـــێکە لە من. هەروەها دەمەوێت بزانم، کـــە لە ڕوانگەیەکی ئەزمونییەوە بابەتە داگیرکراوە، کە لەنێو خۆیدا شـــتێکی ڕاســـت نییە و بەتەنیاش سودبەخش نییە. هیچ خاوەنێتییەک لـــە دەرەوەی درێژبوونەوەیدا واتابەخش نییە: پاندانەکەی پێی دەنوســـم، وەکو هەموو پاندانەکانی دیکەیە؛ من خاوەنی شتێکم، کە لەنێو جۆری پاندانەکاندایە. لەسەرو ئەمەشەوە، من لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی ئەگەری نوسینم، فۆرم و ڕەنگەکان بەکاردەهێنم (سود لەو ئامێر و مەرەکەبە پێکەوە وەردەگرم).

ئەم خەسڵەتە واتای ڕەنگ و پاندان و لاپەڕەکە، بەرگریکردینان و بۆن و هتد پێکدەهێنێت. لەگەڵ خاوەنێتییەکەدا ئەو بلورە شوشەییەی ستێندالٚ دروستبووە، کە بە تێهەڵکێشەی خۆشەویستی ناوزەدیدەکات.

بەوجۆرەی دەرکەوتنی ئەو ئافرەتەی خۆشمدەوێت لەگەڵ خۆیدا ئاسمان، کەناری دەریا و دەریاکەی دەوروبەریشـــی دەردەخات، هەریەکێک لە بابەتە داگیرکراوەکان لەنێو جیهاندا هەموو جیهان بەرجەستەدەکات.

کەوابـــوو، خاوەنێتی ئەو بابەتە خاوەنێتییەکـــی هێماگەرانەی هەموو جیهانە. هەریەکێک لەوانە لە ئەزمونەکەیدا ئاماژەی بۆ دەکات: نموونەیەکی خۆم دەهێنمەوە، نەک بۆ ئەوەی خاڵەکە بســـەلمێنم، بەڵکو دەمەوێت یاریدەی خوێنەر بدەم باشتر تێبگات.

چەندســـاڵێک لەمەوبەر بڕیارمدا واز لە جگەرەکێشـــان بهێنـــم. هەوڵدانەکەم ســـەخت هاتە بەرچاو. ئەوەندە گوێم بەتامـــی توتنەکە نەدەدا، کە جارێکی دیکە ناکەوێتە ســـەرزارم. بایەخدانەکەم زۆرتر بە جگەرەکێشان دەدا. لێرەدا بەتەواوی بلورە شوشـــەییەکە دروستدەبێت. من لەسەر شـــانۆ، بەیانیان لە کاتی نوسیندا، ئێواران دوای نانخواردن جگەرەم دەکێشا. هەستمدەکرد وازهێنان لە جگەرە خۆشی سەرشانۆ لەناودەبات، نانخواردنی ئێواران بێتام دەکات و گیانی نوسینی بەیانیانیشم دەکوژێت. هەموو ئەو شـــتانەی چاوەڕوان ناکرێن دەهاتنە بەرچاوم. ئەو خەسڵەتە کۆنکرێتییەیە بەسەر هەموو شتێکەوە دەبینرا تەواناییی بوونم بەرانبەر جگەرەکێشان بوو. دەردەکەوت من لە هەموو شتێکی دەسەنم و لەنێو ئەم جیهانە هەژارەدا ژیان شیاوی هەوڵدانە. بەڵام جگەرەکێشـــان کردەوەیەکی خاوەنێتی ڕووخێنەرە. توتن هێمای بوونە 'داگیرکراوەکەیە' چونکە لە هەناســـە هەڵمژینەکانمدا لەناودەچێت و لە شـــێوازی لەناوچوونی بەردەوامدایە. ئەو دەچێتـــە نێو من و بۆ دووکەڵ خۆی دەگۆڕێت. لە پەیوەندی نێوان ئەو دیمەنەی لە کاتی جگەرەکێشاندا تەماشامدەکرد لە بە سوتوکردنەکەدا توتنەکە هێمایەک بوو بۆ دیمەنەکە. واتە، لەناوبردنی توتنەکە هێمای خاوەنێتییەکی ڕوخێنەری هەموو جیهانە. لەگەڵ توتنەکەدا جیهانێک هەبوو مـــن ئاگرم تێبـــەردەدا، دەبوو بە دووکەڵ، دەچووە هەواوە و جارێکی دیکە بۆ ناو هەناسەم دەگەڕایەوە. لەگەڵ بڕیاردانم بۆ وازهێنان لە جگەرە دەبێت بلورە شوشەکە بشـــکێنم؛ نابێت بیر لە کردەوەکەم بکەمەوە. توتنەکـــە تەنیا بە توتن دادەنێم و بێجگە لە ڕووەکێک، کە دەسوتێت چی دیکە نییە. پەیوەندییە هێماییەکانی لەگەڵ جیهاندا دەبڕم؛ خۆم ڕازی دەکەم، کە وازهێنان لە جگەرە هیچ لە شانۆ، دیمەنەکە، ئەو پەرتووکەی دەمخوێندەوە کەم ناکاتەوە. من بەبێ جگەرە بیریان لێدەکەمەوە؛ بەبێ جگەرەکێشـــان لە شـــێوزێکی دیکەی بووندا دەبێت بیانناسم. ئەگەر بتوانم خۆم ڕازی بکەم پەشـــیمانییەکەم کەمدەبێتەوە. بیر لەوە دەکەمەوە کە ئیتر بۆنی

جگەرە ناکەم و هەســـت بە گەرماییەکەشی لەنێوان پەنجەکانمدا ناکەم. بەڵام ئەم پەشیمانییە بە ئاسانی لەناودەچێت و دەتوانم بەرگری لەخۆم بکەم.

ئـــەوەی لە بابەتێکدا دەمانەوێت خاوەنێتـــی بکەین بوونی بابەتەکە و جیهانە. ئەم دوو کۆتاییەیە خاوەنێتی یەک شـــتن. من لەودیـــو دیاردەکەوە بۆ خاوەنێتی بوونـــی دیاردەکە هەوڵـــدەدەم. بەڵام، ئەم بوونە لە دیـــاردەی بوونەوە جیاوازە؛ بوونی-لەنێو-خۆیە، نەک بوونی شتێکی دیاریکراوە. ئەمەش پەڕینەوە بۆ لایەنێکی هەمەکـــی نییە. ئەو بوونـــەی بە ڕووتی دەرکەوتوە ڕاســـتەوخۆ دەبێت بە بوونی ســـارتاپاگیر. ئەمەش پەیوەنـــدی خاوەنێتی بۆ ئێمە ئاشـــکرادەکات: خاوەنێتی ئارەزووکردنە بۆ خاوەنێتی جیهان لەودیو شـــتێکی هەندەکییەوە. مادام خاوەنێتی ئەو هەوڵدانەیە بۆ تێگەیشـــتن لە بوونی خۆمان، وەکو بناخەی بوونی ئەوا هەموو پرۆژەیەکی خاوەنێتی هەوڵدەدات بوونی-بۆ-خۆ بکات بە بناخەی جیهان یان بناخەی سەرتاپاگیرییە کۆنکرێتییەکەی بوونی-لەنێو-خۆ. ئەم سەرتاپاگیرییە بوونی-بۆ-خۆیە لە شـــێوازی بوونی-لەنێو-خۆدا. بوون لەنێو جیهـــان دانانی پرۆژەیە بۆ خاوەنێتی جیهان؛ واتە تێگەیشـــتن لە هەمووی جیهان، وەکو ئەو شتەی بوونی-بۆ-خۆ کەمە، لەبەر ئەمە پێویستە ببێت بە بوونی-لەنێو-خۆی بوونی-بۆ-خۆ. دەبێت مامەڵە لەگەڵ هەمووگیرییەکـــەدا بکرێت، کە بیرۆکە و بەهایە یان هەمووی ســـەرتاپاگیرییەکەیە و لە ڕێگەی پێکەوەبوونی ئایدیالانەی بوونی-بۆ-خۆ و جیهان، وەکو ســـەرتاپاگیری بوونی-لەنێو-خۆی ئەو بوونەی هەیە، پێکدێت.

پێویســـتە بزانین پـــڕۆژەی بوونی-بۆ-خۆ بوونی هۆش، ئـــەو بوونەی یەکەمجار بوونی-بۆ-خۆ دەیناسێت و فۆرم و ماتەرە و دوایی دەیهێنێتە بوونەوە، پێکناهێنێت. ئەمجـــۆرە بوونە ڕووتکراوە و هەمەکییە؛ چەمکەکەشـــی پێش بوونی-لەنێو جیهان ناکەوێـــت؛ بەپێچەوانـــەوە، چەمکەکەی لەســـەر بوونی-لەنێو-جیهان دەوەســـتێت و پێویســـتی بە تێگەیشـــتنی پێش-ئۆنتۆلۆجییانەی بوونە، کە کۆنکریتییە و لە ســـەرەتاوە لەوێـــدا یان بوونی-لەوێـــدا ئامادەیە؛ ئەوەش بوونـــی جیهانە. بوونی-بۆ-خۆ لەپێشـــدا نییـــە دوایی بیر لە چەمکی هەمەکییـــەکان بکاتەوە. بوونی ئەو هەڵبژاردنە و هەڵبژاردنیش ڕووتکراوە نییە. بوونی بوونی-بۆ-خۆ تاکەکەســـییەکی بوێـــرە، هەڵبژاردنەکەشـــی دەبێت هەڵبژاردنی تاکەکەس بـــۆ بوونێکی کۆنکرێتی بێت. ئەمە، وەکو بینیمان، بۆ هەڵوێســـتیش دروســـتە. هەڵبژاردنی بوونی-بۆ-خۆ هەمیشـــە هەڵبژاردنی هەڵوێستێکی کۆنکرێتییە، کە مەودایەکی ئۆنیۆلۆجی هەیە. کاتێک دەڵێین، بوونی-بۆ-خۆ پرۆژەی بوونە، مەبەست ئەوە نییە، کە بوونی-لەنێو-خـــۆ، ئەو بوونەی پرۆژەی بوونەکە پێکدەهێنێـــت، بونیادێکی هەمەکی بۆ هەموو هەبـــووەکان هەڵگرتوە؛ پرۆژەکەی بە هیچ جۆرێـــک چەمک نییە. ئەوەی پرۆژەی بوونەکە پێکدەهێنێت ســـەرتاپاگیرییەکی کۆنکرێتییە؛ ئەو هەبووە هەندەکییەیە.

هەڵبەتە دەتوانین لەم پرۆژەیەدا پێشـــبینی ئەگەرەکان بۆ پێشخســـتنی هەمەکی بکەین؛ بەڵام، ئەمە بەهەمانشـــێوەیە، کە دڵدارێک بوونی ئافرەتی لە ڕێگەی ئەو ئافرەتەوە خۆشـــدەوێت، کە دڵداری لەگەڵدا دەکات. بوونـ بۆـ خۆ پرۆژەی بوونە. بەڵام، وەکو دەبینین، بناخەی ئەو بوونە کۆنکرێتییە ناناسرێت چونکە کۆنکریتیە؛ بە ئەندێشەش دروستناکرێت، چونکە شتەکانی نێو ئەندێشە بوونی دەرەکیان نییە. لەبەر ئەمە، ئەو شتە دەبێ هەبێت؛ بۆنموونە، ئەوەیە بوونـ بۆـ خۆ دروستیدەکات. بوونـ بۆـ خۆ هەڵبژاردنێکی بەرەنگارییە. بەو هەڵبژاردنە پێناسدەکرێت، کە بناخەی بوونی بابەتەکەی بەرانبەرێتی. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشـــێت، کە بوونـ بۆـ خۆ، وەکو پرۆژەیەکی تاکەکەسی، هەڵبژاردنی ئەم جیهانەیە و تاکەکەسێکە، کە خۆی دەکات بە ســـەرتاپاگیر بۆ بوون؛ بۆ گەیشتن بە چەمکێکی هەمەکی لۆجیکمەندانە تێپەڕیناکات، بەڵکو ئەو کاتە تێپەڕیدەکات، کە بیەوێت بە بارودۆخێکی کۆنکرێتی هەمان جیهان بگات. هەروەها، لەنێویدا بوون دەبێت بەو بوونەـ لەنێوـ خۆیەی بوونـ لەنێوـ خـــۆ دایمەزراندوە؛ واتە بوونـ بۆـ خۆ بەرەو بوونێکی کۆنکرێتی لەودیو بوونە کۆنکرێتییەکەی بوون دەڕوات. کەوابوو، بوونـ لەنێوـ جیهان پرۆژەی خاوەنێتی ئەم جیهانەیـــە. ئەو بەهایەی دەبێت بە دێوەزمـــەی بوونـ بۆـ خۆ کۆنکرێتییە و ئاماژە بۆ بوونی تاکەکەس دەکات بە تێهەڵکێشـــکردنی ئەم بوونـ بۆـ خۆیە و ئەم جیهانە پێکدێت. بوون، لە هەرچ شـــێوازێکدا و لە هەرشوێنێکدا بێت، بوونـ لەنێوـ خۆ یان بوونـ بۆـ خـــۆ بێت، بیرۆکەی نەگونجـــاوی بوونـ لەنێوـ خۆی بوونـ بۆـ خۆ بێت، لە هەڵکەوتنە بنەڕەتییەکەیدا تاکێکی بوێرە.

لێرەدا دەتوانین پێناسەی ئەو پەیوەندییانە بکەین، کە دوو کاتیگۆرییەکەی بوون و هەیەتی پێکەوە دەبەستن. ئێمە باسمانکرد، ئارەزوو بۆ بوون یان بۆ هەیەتییە. بـــەڵام دووەمیان کەمناکرێتەوە. لە کاتێکدا ئارەزوو بۆ بوون ڕاســـتەوخۆ لەســـەر بوونـ بۆـ خۆ کاریگەرە و سەلماندنیشـــی پێویســـتی بە ناوەندی بوونـ لەنێوـ خۆی بوونـ بۆـ خـــۆ نییە، بوونـ بۆـ خۆ لەنێو جیهاندا دەبێت بە ئامانجی ئارەزووکردن لە هەیەتـــی. لە ڕێگەی خاوەنێتی جیهانەوە پرۆژەی هەیەتی دەیەوێت، وەکو ئارەزوو بـــۆ بوون هەمان بەهای دەســـتکەوێت. لەبەر ئەم هۆیەشـــە، ئـــەم ئارەزووانە بە شیکردنەوە جیادەبنەوە، بەڵام لەڕاســـتیدا جیا نین. مەحاڵە ئارەزووکردنی بوون بەبێ ئارەزووکردن بۆ هەیەتی بدۆزینەوە و بەپێچەوانەشەوە دروستە.

لە بناخەوە دەبێت تەماشـــای دوو لایەنـــی یەک ئامانج بکەین، یان بە دووجۆر ڕاڤەی هەمان هەڵوێســـتی بنەڕەتی بکەین؛ یەکێکیان بوون بەسەر بوونـ بۆـ خۆدا بەبێ لادان دەسەپێنێت، ئەوی دیکەیان سوڕانەوەی خۆیەتی دادەمەزرێنێت؛ جیهان لەنێوان بوونـ بۆـ خۆی و بوونی خۆی دادەنێت. سەبارەت هوڵوێستە بنەڕەتییەکەش، بوونی منە، کە کەمییە؛ ئەو بوونەمە، کە دروستیدەکەم.

بەڵام بوونی من کۆنکرێتی و تاکە کەسییە؛ ئەو بوونەیە هەیە و منیش لەنێویدا دەبم بە کەمی. من نەبوونێکی کۆنکرێتی و تاکم، وەکو بوونیش ئەم لەناوبردنەم و هێشتا نەبووم بە لەناوبردنێکی دیکە. هەریەکێک لە بوون-بۆ-خۆکان هەڵبژاردنێکی سەربەستە؛ هەریەکێک لە کردەوەکانی، گرنگ و ناگرنگ دەربڕینی هەڵبژاردنەکەیە. ئەمەش سەربەســتییە. ئێســتا لە واتای هەڵبــژاردن تێدەگەیــن؛ هەڵبژاردنەکە هەڵبژاردنی بوونە ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی خاوەنێتی جیهانەوە یان هەردووکیان لە یەک کاتدا. بەمجۆرە سەربەستییەکەم هەڵبژاردنی بوون بە خوایە. هەموو کردەوە و پڕۆژەکانم زمانی حاڵی سەربەســتییەکەمن و بە هەزار شێوە دەریدەبڕن چونکە بوون و هەیەتی فرەجۆرن. ئامانجی سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی ئەوەیە بە هۆی ئەم پڕۆژە کۆنکرێتییە ئەزمونگەریانەوە ڕێگا بنەڕەتییەکە لە هەموو مرۆڤدا، کە بوونی خۆی هەڵدەبژێرێت بدۆزێتەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە لەســەری بکۆڵێنەوە هۆکاری بەخاوەنێتی جیهانە، کە سەربەستییەکی دیاریکراوی تێدا دەبینرێت.

لەگەڵ ئەمەشــدا خودی بوونی بابەتەکە کەمناکرێتــەوە. دەمانەوێت لەنێویدا لەڕێگەی شێوازێکی بوونییەوە یان چۆنییەتییەوە بوونی بگرین. چۆنیەتی، بەتایبەتی چۆنیەتی ماتەری، وەکو شلی ئاو یان ڕەقی بەرد شێوازێکی بوونە و لە شێوازێکی دیاریکراودا ئەو بوونە دەردەخات. ئەوەی هەڵیدەبژێرین ڕێگەیەکی دیاریکراوە، کە ئەو بوونە تیایدا خۆی نیشاندەدات و خۆی بۆ خاوەنێتی بەدەستەوە دەدات. ڕەنگی زەرد، سور یان تامی تەماتە یان نەرمی لۆبیا شتێکی دراوی کەمنەکراوەن. بە هێما نوێنەرایەتی بوونێکی دیاریکراو دەکەن و بۆ هەستکردنمانی دەردەخەن. ئێمەش بە ئارەزوو یان هەرســکردن، بەگوێرەی بینینمان بۆ بوون، ئەو بوونە ئامادەدەکەین. سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی دەبێت واتای ئۆنتۆلۆجی چۆنیەتییەکان بخاتەڕوو. لەبەر ئەمەشە، نەک تێگەیشتنمان لە سێکسگەرایەتی، کە بۆنموونە، هەندێک شتی نەگۆڕ لەنێو 'ئەندێشــە' شیعرییەکاندا (وەکو جیۆلۆجی ڕامبۆ و شلی ئاو لای پۆو) دەدۆزینەوە. یان زەوقی هەریەکێک لە تاکەکانە، ئەو زەوقانەی ڕێگەمان پێنادرێت باسیان بکەین و نموونەن بۆ هەمووی ئایدێۆلۆجی، هەمووی هەڵبژاردنی بوون و لە چاوی ئەو مرۆڤانەی دروستیانکردوە بەڵگە نەویستن. هەنگاوی دووەممان، کەوابو نەخشەدانانە بۆ توێژینەوەی زۆرتر لە سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتیدا. لەسەر ئاستی تام و شیرینی یان تاڵی هەڵبژاردنی سەربەست نابێت بە کەمنەکراوە، بەڵکو ئەم کارە لە ئاستی هەڵبژاردنی لایەنێکی بووندایە، کە لەڕێگەی شیرینی یان تاڵی نەجوڵانی بابەتەکەوە دەردەکەوێت.

## ٣- چۆنییەتی، وەکو دەرکەوتنی بوون

ئەوەی لێرەدا هەوڵیبۆدەدەین سـایکۆلۆجی شـیکارییە بۆ شـتەکان. (میم. باچـەلارد) ئەم هەوڵەی داوە و لەدوا پەرتووکیدا (ئاو و خەونەکان) تەوانایی خۆی دەربڕیوە. ئەم نوسـەرە لە کەرەسەی ئەندێشـەیدا زۆرشتی گرنگی دۆزیوەتەوە. لەڕاستیدا چەمکی ئەندێشە بۆ ئێمە ناگونجێت و خۆی بەو دیو شتەکان و خەسڵەتی جەلاتینی، ڕەقی و شـلی وێنە ئەندێشاوییەکانمان ناگەیەنێت. هەستکردنیش، کە لە شـوێنێکی دیکەدا باسـمانکردوە هیچ هاوبەشـییەکی لەگەڵ ئەندێشەدا نییە؛ لـە یەکدییەوە جیـاوازن. هەسـتکردن دامەزراندنی وێنەکان لەڕێگـەی ئەندامە هەسـتکەرەکانەوە نییە؛ ئەم تێزە لە بیردۆزەی پێکەوە بەسـتنی سایکۆلۆجییدا سەرهەڵدەدات و دەبێت وازی لێبهێنرێت. لەبەر ئەمە، سایکۆلۆجی شیکاری بەدوای وێنەکانـدا ناگەڕێت و ڕاڤەی واتای شـتەکان دەکات. هەڵبەتە واتای 'مرۆڤانە' بۆ لینجی یان باریکی سـەر بە بوون-لەنێو-خۆ نییـە. تەنانەت لایەنە هێزەکییەکانی هەڵنەگرتوە. هەمانکات ئەو شتانەیە جیهان پێکدەهێنن. کەرەسەی نێو ئەندێشە، هەسـتکردنی مرۆڤ بۆ دەرزییەکان، بەفر، تەختە و بۆ قەرەباڵغی، گریسـاوی و هتد، وەکو جیهان ڕاسـتەقینەن. هاتنە نێو جیهانیشـیانەوە ڕاوەستانیانە لە نێو ئەو واتایانـەدا. بێگومان جیاوازییە بچوکەکەیان بـە چەمکەکان جیادەکەینەوە. میم باچەلارد بوێرانە بناخەی ئەم بیرۆکەیەی لە سـایکۆلۆجییە شیکارییەکەیدا بۆ ڕووەکەکان دەستنیشانکردوە. یەکێک لە نوسراوەکانی ناوناوە (سایکۆلۆجی شیکاری بۆ ئاگر). ئەو میتۆدی ڕاڤەکردنی بابەتێتی بۆ شتەکان نەک خۆ دەکات و ئاماژەی لەپێشتریش بۆ (خۆ) ناکات. کاتێک دەمەوێت واتای دەرەکی بەفر بدۆزمەوە دەبینم لە پلەیەکی گەرمی تایبەتییدا دەتوێتەوە و توانەوەکەشی مردنە. ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ زانیاری چەسپاندنێکی دەرەکییدا دەکەین. کاتێک بمەوێت واتای توانەوەکە ساخبکەمەوە پێویستە لەگەڵ بابەتەکانی نێو شوێنەکانی دیکەدا بەراوردیبکەم، کە ئەوانیش دەرەکین و بەرزن، بۆنموونە بیرۆکەکان، هاوڕێیەتی یان کەسەکان، کە لە بارەیانەوە دەتوانم بڵێم توانەوە. پارە لەنێو دەسـتمدا دەتوێتەوە. من مەلەدەکەم و لەنێو ئاوەکەدا دەتوێمـەوە. هەندێک بیرۆکە، لەوڕووەوە، کە واتایەکی دەرەکی کۆمەڵایەتییان هەیە، "تۆپەڵە بەفر" یان شتەکانی دیکە دەتوێنەوە. ئێمە دەڵێین، "ئەو چەند باریک بووە! چۆن پوکاوەتەوە!"، بێگومان دەبێت پێکەوەبەستنی چەند فۆرمێکی بوون لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بدۆزمەوە.

گرنگـە نموونەی توانـەوەی بەفر لەگەڵ هەندێک توانـەوەی نادیاری دیکەدا، وەکو ناوەڕۆکی هەندێک میتۆلۆجی، بەراوردبکەین. لە چیرۆکی پەریانی گریمسدا،

بەرگدرووەکـــە پارچەیەک پەنیر هەڵدەگرێـــت، وا بیری لێدەکاتەوە بەرد بێت و بە هەموو هێزی دەیگوشێت تاکو پەنیراوی ئۆزیسی لێ چۆڕا؛ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەو باوەڕەدابوون ئاوی لەنێو بەرد دەرهێناوە. ئەم بەراوردکردنە لەبارەی خەسڵەتی شلی لەنێو ڕەقییدا زانیاریمان دەداتێ، لە ئۆدیبێرتیش دەچێت، کە باسی ڕەشێتی ڕەنگی شـــیر دەکات. ئەو شـــلێتییەی لەگەڵ ئاوی میوە و خوێنی مرۆڤ بەراورد دەکرێت، بۆ پیاویش، وەکو ئاوی نهێنی خۆی وایە، ئێمە بۆ ئەگەرێکی هەمیشەیی، کە "پەستراوێکی دەنگدارە"، خۆ بۆ بوونێکی هاوڕەگەزی شل و ناجۆر دەگۆڕێت. ئێمـــە لەبنەڕەتییەوە و لە گرنگی ئۆنتۆلۆجییـــەوە لەلایەنە بەردەوام و بڕاوەکانی، مێینـــە و نێرینەکانی تێدەگەین و بیردۆزەی کوەنتەم و میکانیزم و پەرەســـەندنی دیالیکتیکییانەی بـــۆ دادەنێین. کەوابوو، دەتوانین واتایەکی نهێنی یەکگرتوو، کە ئۆنتۆلۆجییانەیـــە بۆ بەفر دابنێین. لەنێو ئەمانـــەدا چ پەیوەندییەک لەگەڵ خۆدا دروســـتدەبێت؟ یان بە ئەندێشـــەوە هەیە؟ ئێمە تەنیا بونیـــادە دەرەکییەکانمان بەراورد کردووە و هەوڵمانداوە گریمانەیەک بۆ یەکگرتنی بونیادەکان دروستبکەین. لەبەر ئەم هۆیەشە سایکۆلۆجی شیکاری پشت بە خودی شتەکان دەبەستێت نەک مرۆڤ. لەبەر ئەمەشـــە کەمتر باوەڕ بە هەوڵدانەکەی میم باچەلارد بۆ دۆزینەوەی کەرەســـەی ئەندێشـــەی شـــاعیرەکانی، وەکو لۆتریمۆنت، ڕامبـــۆ و پاوو دەکەم. بەدڵنیاییەوە، خۆشە بەدوای نوسراوەکانی لۆتریمۆنت، کە لەسەر زاری ئاژەڵەکان نوســـراوە بگەڕێیت. بـــەڵام گەڕانەکە لەوێدا بایەخدارە، کـــە ئاکامەکان بۆ لایەنی خۆیەتی بگەڕێینەوە و لۆتریمۆنت بەسەرچاوە و بنەڕەتی ئاژەڵگەری دابنێین و واتا دەرەکییەکەشی دیاریبکەین. ئەگەر لۆتریمۆنت ئەوەی بوێت پێویستە سروشت ئەو شتەی بوێت بناسین.

ئێمە دەزانین ئەو شتێکی جیاوازتر لەوەی من دەخاتە نێو جیهانی ئاژەڵەوە. بەڵام دەوڵەمەندکردنە خۆیەتییەکە، کە زانیاریمان ســـەبارەت لۆتریمۆنت دەداتێ لەسەر بونیادە دەرەکییەکەی ئاژەڵگەری دەبێت بە دوولایەنی. لەبەر ئەمەشە سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی بۆ لۆتریمۆنت داوای ڕاڤەکردنی واتا دەرەکییە ئاژەڵگەرییەکانی لێدەکات. بەهەمانشێوەش بۆ ماوەیەکی زۆرە بیرم لە زەڕەنگەری بۆ ڕامبۆ کردۆتەوە. بەڵام بەبێ دامەزراندنی گرنگی زەویناسی چ واتایەک دەبەخشێت؟

ئەو بۆچوونەی جەخت لەسەر بوونی پێش واتا دەکات ڕەتدەدرێتەوە. مرۆڤیش، لەبەر ئەوەی بوونێکی بەرزی هەیە، لەگەڵ هاتنە نێو جیهانییەوە واتا دروستدەکات. بەرزێتی ئەو ئاماژە بۆ بەرزێتییەکانی دیکە دەکات، کە دەکرێت بەبێ گەڕانەوەیان بۆ لایەنی خۆیەتی ڕاڤەبکرێن. وزەی لەش خەســـڵەتێکی دەرەکی ئەو لەشەیە، کە دەتوانرێت لەدەرەوەدا لەبەر ڕۆشـــنایی بارودۆخە بابەتگەرییەکاندا بپێورێت. ئەو وزەیەش لە پەیوەندییەکەیدا لەگەڵ بوون-بۆ-خۆ دێتە نێو لەشـــەکە و جیهانەوە.

بەهەمان شـــێوەش، سایکۆلۆجییەکی شیکاری بابەتگەری و وردبین دەیدۆزێتەوە، کە ئەوەی لە ناخی ئەســـتوەکاندا کاردەکات هەموو شـــتێک نییە. چەند لایەنێکی هێزەکـــی دیکەش هەن، کە بە بـــەرزی دەمێننەوە و بۆ هەڵبژاردنە بنەڕەتییەکەی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، کە هەڵبژاردنی بوونە، دەگەڕێنەوە.

ئەمـــەش ئێمـــە بە خاڵـــی دووەمـــی ناتەباییەکەمـــان لەگەڵ میـــم باچەلارد ئاشـــکرادەکات. نکۆڵی لەوەناکرێت هەموو سایکۆلۆجییەکی شیکاری دەبێت بنەما لەپێشـــترەکانی هەبێت. بەتایبەتی دەبێ بزانێت بەدوای چیدا دەگەڕێت یان چۆن ئەو شـــتە دەدۆزێتەوە. مادام ئامانجەکەشی بە سایکۆلۆجی شیکاری بەبێ کەوتنە نێـــو ســـوڕانەوە نادۆزرێتەوە، ئەوا دەبێت ئەو کۆتاییە پێشـــمەرج بێت؛ لەڕێگەی ئەزمونەوە دەیگەیەنێ یان لەسەر بنەمای زانستێکی دیکە دروستیدەکەین. لبیدۆی فرۆید پێشـــمەرجە؛ ویستی هێز لای ئەدلەر لە زانیارییە ئەزمونییەکانەوە لەڕێگەی بەهەمەکیرکردنێکی بێ میتۆد پەیدابووە. نەبوونی ئەم میتۆدەشە هانیداوە گوێ بە بنەماکانی میتۆدی سایکۆلۆجی شیکاری نەدات. میم باچەلارد پشتی بەم بیریارانەی پێش خۆی بەستوە؛ پێشـــمەرجە سێکســـییەکان توێژینەوەکەیان داگیرکردەوە؛ هەندێـــک جاری دیکەش ئاماژە بۆ مردن، کارەســـاتی لەدایکبوون و ویســـتی هێز دەکات. بەکورتییەکەی، سایکۆلۆجییە شیکارییەکەی لە میتۆدەکەی دڵنیاترە وەک لە بنەماکانی و پشـــت بە ئاکامەکانیشی بۆ گەیشـــتن بە ئامانجی توێژینەوەکەی دەبەستێت. بەڵام ئەمە لە دانانی ئەسپەکە لەپشت گالیسکەکەوە دەچێت؛ ئاکامەکان ڕێگە نادەن دابمەزرێنین. دەردەکەوێت ئێمە واز لەم بنەما ئەزمونیانە یان پێشمەرجانە بهێنین، کە مرۆڤ دەکات بە شـــتێکی لەپێشـــتر، سێکسگەری یان ویستی هێز و ئامانجی ســـایکۆلۆجی شیکاری بە بۆچوونی ئۆنتۆلۆجییەوە ببەستینەوە. ئێمەش ئەم هەوڵەمان داوە. ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، بێ ئەوەی بە لبیدۆ یان ویستی هێزی دابنێین، ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی خاوەنێتی جیهانەوە، هەڵبژاردنی بوونە. بینیمان، هەڵبژاردنەکە بە خاوەنێتی دەردەبڕێت. هەریەکێک لە شتەکان لەدوا شیکردنەوەدا هەڵبژێردراون نەک لەبەر ئەوەی لایەنی هێزەکی سێکســـییان تێدایە، بەڵکو لەسەر شێوازێکی بوون دامەزراوە و لەوێوە سەرهەڵدەدات. سایکۆلۆجی شیکاری شتەکان هەوڵـــدەدات بزانێت چۆن هەریەکێک لەو شـــتانە دەبێت بە هێمایەکی دەرەکی بۆ بوون و پەیوەندی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیش بەو بوونەوە.

من ناڵێم پێویســـت ناکات هیماگەری سێکســـی لە سروشتدا بدۆزینەوە، بەڵکو ئەو کارە ســـەرەکی نییە و کەمدەکرێتەوە و پێویســـتی بە سایکۆلۆجی شیکاری پێش-بونیادەکانی ســـێکس هەیە. کەوابوو، توێژینەوەکەی میم باچەلارد لەســـەر ئاو پێشـــنیار و کۆکردنەوەی بابەتە گرنگەکانە بۆ ئەو ســـایکۆلۆجییە شیکارەی بنەماکانی خۆی دەناسێت.

ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی ڕاستەقینەی واتای شتەکان و پەیوەندی ڕاستەقینەیان بە مرۆڤەوە بۆ سایکۆلۆجی شیکاری دەردەخات. بە تەنیا ئۆنتۆلۆجی دەتوانێت لەنێو پانتایی بەرزێتی و لە گۆشـــەنیگایەکەوە بوون-لەنێو-جیهان بە دوو چەمکەکەیەوە بناســێت چونکە بە تەنیا ئۆنتۆلۆجی لەنێو تێڕوانینـــی کۆجیتۆدا جێگەی خۆی داگیـــردەکات. هەروەهـــا بیرۆکەکانی فاکتۆر و هەڵوێســـت یارمەتیمان دەدەن لە هێمادانانی بوونگەرانە بۆ شـــتەکان تێبگەین. ئەمەش لـــە بیردۆزەدا دەگونجێت، بەڵام بە کردەوە مەحاڵە فاکتۆر و ئەو پرۆژەیەی هەڵوێست پێکدەهێنێت لەیەکدی جیابکەینەوە. ئەم تێبینییە لێرەدا بۆ ئێمە سودبەخشـــە؛ بینیمان، کە پێویســـت نـــاکات بڵێین 'ئەوە'، کاتێک لەدەرەوەدا بەبێ جیـــاوازی و بێ بوون-بۆ-خۆ هەیە و خاوەنی واتایە. لەڕاســـتیدا، خەســـڵەتەکە بوونی ئەوە. زەردی لیمۆ شێوازێکی خۆیەتی تێگەیشتن لە لیمۆ نییە؛ خودی لیمۆکەیە. ئەوەشمان باسکرد، کە بوونی لیمۆکە لەنێو خەســـڵەتەکاندا درێژدەبێتەوە و هەریەکێک لەو خەســـڵەتانە بەسەر ئەوانی دیکەدا کەوتوە؛ ئەمەش 'ئەوە'یە، کە بە دروســـتی باسمانکرد. هەریەکێک لە خەسڵەتەکانی  بوون هەمووی بوونە؛ ئامادەبوونی هەڵکەوتنە ڕەهاکەیەتی؛ بێ جۆرە کەمنەکراوەکەیەتی. لەکەرتی دووەمی ئەم نوسراوەشـــدا جەختمان لەســـەر جیانەکردنەوەی پـــرۆژە و فاکتۆر لە چۆنیەتییەکدا کرد. "بۆ ئەوەی چۆنیەتییەک هەبێت پێویســـتە بوون هەبێت چونکـــە نەبوون، کە بە سروشـــت بوون نییە... چۆنیەتی هەمووی بوونە و لەنێو سنوری ئەو بوونەی لەوێدایە خۆی دەردەخات." لەسەرەتاوە نەمانتوانی خەسڵەتی واتا بۆ بوون-لەنیو-خۆ دابنێیین، چونکە "لەوێدا هەیە" شتێکی پێویســـت بوو؛ کە تێڕامانی لەناوبردنی بوون-بۆ-خۆیە و پێویستە لەوێدا بۆ بوونی خەســـڵەتەکان لەوێدا هەبێت. ئاسانیشـــە لەو خاڵە تێبگەین، کە گوایە واتای چۆنیەتی ئاماژە بۆ شـــتێکی دانراو "لەوێـــدا هەیە"، دەکات،  بەرەو بوونێک، کە لە بوونێکی ڕەها و لەنێو-خۆ دەچێت، دەڕوات.

لەتێگەیشـــتنی چۆنییەتیدا هەوڵدانێکی میتافیزیکییانە بۆ ڕاکردن لەدەســـت بارودۆخی خۆمان هەیە و دەیەوێت کون بکاتە نێو قاوغی نەبوونەوە؛ سەبارەت بە "لەوێدا هەیە" و بچێتە نێو بوون-لەنێو-خۆی ڕووتەوە. ئاشکراشـــە ئێمە خەسڵەت بە هێمای بوون دادەنێین، کە هەرچەنـــدە لەوێدا لەبەردەمماندایە بەتەواوی خۆی لـــە ئێمە دوور دەخاتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بونیادێکی نوێ بۆ "لەوێدا هەیە"دروستدەکەین.

ئەم بونیادەش ناودەنێین واتا گەیاندنی میتافیزیکییانەی خۆدەرخســـتنەکانی بوون لەنێو درککردندا. ئامانجی ســـایکۆلۆجی شیکاریش وەدەستهێنانی ئەم واتا گەیاندنەیە. ئایا واتا گەیاندنی مێتافیزیکی زەرد، ســـور، بریقەدار یان چرچ و لۆچ چییە؟ پاش ئەم پرسیارە سەرەتاییانە دەپرسین، ئایا لایەنی مێتافیزیکی نەگۆڕی

لیمۆ، ئاو، ڕۆن و هتد چییە؟ پێویســـتە ســـایکۆلۆجی شیکاری چارەسەر بۆ ئەم گرفتانـــە بدۆزێتـــەوە ئەگەر بیەوێت بزانێت بۆچی پیرۆ حـــەزی لە پرتەقاڵە و لە ئاودەترسێت؛ بۆچی حەزی لە تەماتەیە و ڕقی لە لۆبیایە، بۆچی دەرشێتەوە ئەگەر بەزۆر گوێماسی یان هێلکەی بۆگەن بخوات.

ئێمە ئەوەشـــمان باســـکرد، چۆن لە دانانی پرۆژەدا لەسەر شتەکان، ڕۆشنایی خستنەسەر یان ڕەنگکردنیان توشی هەڵە دەبین. یەکەم، هەستکردن ئامادەبوونێکی ناوەکی نییـــە، دەرەکی و پەیوەندییەکی بەرزە بۆ ناســـینی بابەتەکەی. ئەمەش هەموو لایەنەکانی ناگرێتەوە. ئەو باســـەی لە پرۆژەکەدا سەرهەڵدەدات و دەڵێین، "دیمەنەکە گیانەکییە". ئاکامەکەی ئاشکرایە. بۆنموونە، بیر لە خەسڵەتی "باریکی" بکـــەوە. بۆ هەرزەکارێکی ئەوروپـــی ئاماژە بۆ کۆمەڵێک ڕەفتـــاری مرۆڤانەوە و ڕەوشتی دەکات، کە دەکرێن بە پەیوەندی لەگەڵ بووندا. تەوقەکردن، زەردەخەنە، بیرۆکـــە و هەســـتکردنیش دەکرێ باریـــک بن. بۆچوونە گشـــتییەکە ئەوەیە، کە یەکەم، من هەســـت بە جۆرێک ڕەفتار و هەڵوێســـتی ڕەوشتانەی قێزاوی دەکەم. ئەو ڕەفتارە تاوانباردەکەم. لەســـەرو ئەمەشەوە ئەزمونی هەستەکیم بۆ 'باریکی' هەیە. لەدواییدا، بیردۆزەکە دەڵێت، پێویســـتە پەیوەندی نێوان هەســـتکردنەکان و باریکییەکـــە دروســـتبکەم. باریکیش ڕۆڵی هێما بۆ جۆرێک لە هەســـتکردن و هەڵوێستی مرۆڤانە دەبینێت. من بە پرۆژە دانانەکەم 'باریک'م دەوڵەمەندکردوە و زانینم خستۆتە سەر. چۆن ئەم باسە بە پرۆژەدانان وەرگرین؟ ئەگەر بڵێین، ئێمە لەپێشـــدا هەستکردنەکان، وەکو خەسڵەتی ســـایکۆلۆجی ڕووت دەناسین، چۆن پەیوەندییەکانیان لەگەڵ 'باریک'یدا دەدۆزینەوە؟ ئەگەر 'باریک' لەســـەرەتاوە واتا نەبەخشێت و بە بابەتی خەسڵەتێک دابنرێت ئەوا کەس نازانێت چۆن بۆ یەکێتییەکی ناســـراوی دەروونی دەبێت بە هێما. ئەگەر بە ئاگاوە و ئاشکرا پەیوەندی هێمایی لەنێوان باریک و لینجاوی کەمی تاکە کەســـەکان دروســـت کەین، دەبێت لە کەمی لەنێو باریک و باریک لەنێو کەمییەکەدا تێبگەین.

باســـکردن لەلایەن پرۆژەکەوە هیچ ڕووناکاتەوە چونکە ئەوەی باســـیدەکات بڕیاری لەســـەر داوە. ئەگەر خۆی لەم ڕەخنەیەش بپارێزێت توشـــی ڕەخنەیەکی دیکە دەبێت، کە لە ئەزمونەکەوە دەردەچێت؛ باســـکردن لەلایەن پرۆژەکەوە ئەوە دەردەخات، کە ئەو خۆیەی پرۆژەکەی خســـتۆتەگەر بە ئەزمون و شیکردنەوە بە جۆرێک زانین سەبارەت بونیاد و هەڵوێستەکانی ئەوەی بە 'باریک' ناوزەدیدەکات، گەیشـــتوە. بەگوێرەی ئەم چەمکە، کەرەســـەکانی لاوازی، وەکـــو زانین ئەزمونی کەمی مرۆڤ دەوڵەمەند ناکەن. تەنیا دەتوانین بە یەکێتییەکی بیرۆکەیی دابنێین. لەلایەکی دیکەوە، خودی باریک بە جیا و بە کردەوە زیان بەخشە (چونکە شتێکی باریک و لینجاوی بە دەســـت و جلەوە دەنوســـێت و پەڵە دروســـتدەکات)، بەڵام

باریکی نەگونجاو نییە. لەڕاستدا ڤێزکردنەوە لەسەر پێکەوە دانانی ئەم خەسڵەتە و خەسڵەتێکی تایبەتی ڕەوشتیدا ڕاڤەدەکرێت. تەماشاکردنیش فێرماندەکات منداڵیش حەز لە شتێکی باریک ناکات. لەو کاتەوە زمان دەگرن لە بەهای وشەکانی، وەکو نەرم و نزم و هتد کاتێک بۆ هەستکردنەکان دادەنرێن، تێدەگەن هەموو ئەمانە تێپەڕدەبن و دەڵێن ئێمەش دێینە نێو جیهانێکەوە تیایدا هەستەکان و کردەوەکان خاوەنی کەرەسەن، جەوهەریان هەیە و نەرمن، ناخۆش، باریک، نزم یان بەرزن؛ لەنێویاندا جەوهەرە مەتەرییەکە واتای دەروونی هەیە، کە دەیانکات بە شتێکی نەگونجاو ترسناک. ئێمە بە هیچ ڕاڤەکردنێک لەلایەن پڕۆژەکەوە یان بە لێکچون ڕازی نابین.

بەگشتی، مەحاڵە بەهای هێمای دەروونی 'باریکی' لە خەسڵەتی ڕووتی 'ئەوە' دەربهێنین. مەحاڵیشە واتای 'ئەوە' لە پڕۆژەکەدا بە زانین بۆ هەڵوێستەکانی دەروون دابنێین. ئایا چۆن لەم هێماگەرێتییە هەمەکی و بێ ئەندازەیە تێبگەین، کە لەسەر وەرگێڕانی ڕقەکانمان، بەزەیی و سەرنجڕاکێشانمان بۆ بابەتە بێ واتاکان ڕادەوەستێت؟ بۆ بەرەوپێشەوە چوون لە توێژینەوەکەماندا پێویستە واز لە چەند پێشمەرجێک بهێنین. بەتایبەتی پێویستە پێشمەرجی لەپێشتری خەسڵەتی باریکی بۆ هەستکردنێکی تایبەت، وەکو وێنە نەک زانین وازلێ بهێنین. گرنگە نکۆڵی لەوەش بکەین، تاکو زانیاری تەواومان پێدەگات، کە لایەنە دەروونییەکە ڕێگەمان دەدات بابەتە ئەستوییەکە بە هێما یان ئەزمونمان بۆ کەمی مرۆڤ پێش تێگەیشتنمان لەواتای 'باریکی' دەرکەوێت.

با بۆ پڕۆژەی بنەڕەتی بگەڕێینەوە. پڕۆژەی بنەڕەتی پڕۆژەی خاوەنێتییە. زۆر لە 'باریکی' دەکات بوونی خۆی دەربخات؛ چونکە سەرهەڵدانی بوون-بۆ-خۆ لەنێو بووندا خاوەنێتییە، ئەو شتە باریکەی دەناسرێت دەبێت بە باریکییەکی داگیرکراو؛ بەندی بنەڕەتی نێوان باریکی و من لەوەدایە من پڕۆژەی بوونەکە دەکەم بە بناخەی بوونەکەی و لە ڕوویەکی بیرۆکەیشەوە ئەوە بوونی منە. لەسەرەتاوە دەردەکەوێت بگونجێت بوونی خۆم دابمەزرێنم؛ چۆنیەتی دەروونی هەیە. بەدڵنیاییەوە، ئەمە بەخشینی 'دەروون' بە بوونی خۆم، وەکو زیندەوەرێکی سەرەتایی، ناگەیەنێت؛ چاکەیەکی میتافیزیکیش بە خۆم نادەم. زۆرکردنی داگیرکەرانە بۆ ئەوەی 'باریکی' واتای خۆی بۆ من دەربخات دەشێ وەکو شتێکی لەپێشتر دابنرێت هەرچەندە پڕۆژەکە سەربەستە و بە بوونی بوون-بۆ-خۆ دادەنرێت. شێوازی خاوەنێتی پێویستی بە شێوازی بوونی باریکی نییە، تەنیا پێویستی بە بوونە ڕووتەکەیەتی لەوێدا و ڕووبەڕووی دەبێتەوە؛ ئەمەش لە ڕووبوونەوەکانی دیکە جیاوازتر نییە چونکە پڕۆژەیەکی سادەی خاوەنێتییە و لە "لەوێدا هەیە"ی ڕووت جیانابێتەوە. بەتەواوی دەکەوێتە نێو سنوری پڕۆژەی خاوەنێتی باریکییەوە. باریکییەکە وەڵامدانەوەی

داواکارییەکەی منە؛ لەدەرەوەدا دەردەکەوێت، وەکو زەروو خوێنم دەمژێت و وەڵامی پرســـیارێکی کۆنکرێتییە؛ بە هەموو بوونیەوە وەڵام دەداتەوە. وەڵامدانەوەکەی بە پڕی پرسیارەکەیە. هەمانکات تاریکە و هەموو کەرەسە نەناسراوەکانی هەڵگرتوە، کە دەربڕینیان مەحاڵە.

بەو ڕادەیەی وەڵامێکی دروستە ئەوا ئاشکرا و ڕوونە؛ باریکی خۆی بەو کەمییە نیشـــاندەدات، کە من هەمە. ڕێگەش دەدات تەماشـــای بکرێت و بگیرێت. باریکی خۆی بۆ خاوەنێتی دەخاتە بەردەست. بەڵام هێشتا بە تاریکی دەمێنێتەوە، فریای خۆی دەکەوێت و بە شـــتی نوێ خۆی پڕدەکاتەوە. ئێمە توشـــی واتایەکی پڕوچڕ دەبین و بوون-لەنێو-خۆ دەستنیشـــان دەکات چونکە باریکی خۆی لەنێو جیهاندا دەرخستوە. دووەمیش، نەخشەی (خۆ)شمان بۆ دەکێشێت چونکە خاوەنێتییەکە، وەکو کردەوەیەکی بنەڕەتی سەر بە 'باریکی' نەخشە دادەنێت.

ئەو خەسڵەتە دەرەکییەی بەرەو ڕوومان دێت سروشتێکی نوێیە. نە ماتەری نە دەروونییە، بەڵکو شـــتێکە ناکۆکی نێوان هەردوو ئەو دوولایەنە ڕەتدەکات و خۆی، وەکو دەربڕینێکی ئۆنتۆلۆجییانەی هەموو جیهان دەردەخات؛ دەبێت بە زەمینەیەکی نەرم بۆ خانەکردنی هەمووی 'ئەوانە' لەنێو جیهاندا. خاوەنێتی 'باریکی'، کە بۆ بوون-لەنێو-خۆی جیهان دانراوە شێوازێکی دراوە، کە خۆی دایدەنێت. خۆی هێما بۆ بوون دادەنێت؛ واتە، تاکو پەیوەندییەکە لەگەڵ 'باریکی'دا بەردەوام بێت هەموو شـــتێک بۆ ئێمە وادەردەکەوێت، کە باریکی واتا بێت بۆ هەموو جیهان. بەهەمانشێوەش بۆ خێڵە سەرەتاییەکانی شەوگەردەکان هەموو بابەتێک شەوگەرد بوو.

ئایا چ شێوازێکی بوون 'باریکی' بە هێما کردەوە؟ یەکەمجار، دەبینم هاوڕەگەزییە و لاســـایی کردنەوەی شلییە. شتێکی باریک، وەکو سواخدان شلەیەکی نائاساییە. لەگەڵ سەرهەڵدانی شلیدا ئەو بوونەش بەرجەستە دەبێت، کە لە هەموو لایەکەوە ڕادەکات و وەکو خۆی دەمێنێتەوە. شـــتێک لەســـەرخۆی بەبێ ترس و بیرەوەری هەڵدەگرێت. بۆ هەمیشـــە دەبێت بە خۆی و ئێمە هیچ مۆرکێک بەســـەر ئەوەوە و ئەویش بەســـەر ئێمەوە جێناهێڵێت. ئەو بوونەیە دەخلیســـکێ و ئێمەش لەسەری دەخلیسکێین. شتێک بتوانێت لەسەری بخلیسکێ (وەکو بەلەمی سەولێی، بەلەمی ماتۆڕی و بەلەمی خلیسکانی ســـەرئاو). خاوەنێتی دەستدەکەوێت، بەڵام هەرگیز نابێت بـــە خاوەنی چونکـــە ڕادەکات، بەردەوام دەگۆڕێت. بـــەڵام باریکی کتوپڕ خۆی وەکو شـــتێکی تەمومژاوی دەردەخات چونکە شلییەکەی زۆر هێواشە؛ لەنێو شلییەکەیدا لینجاوی و چڕە. سەرکەوتنی ڕەقی بەسەر شلیدا نیشاندەدات. لینجی ئازار و ئەشـــکەنجەیە بۆ ئاو. دیاردەیەکە لە پرۆسەی پێکهاتندایە؛ مانەوەی لەنێو گۆڕاندا پێنییە، بەو جۆرەی ئاو هەیەتی. ئەم وەســـتانە بن لەقە لە لینجیدا ڕێگە بە خاوەنێتی نادات. ئاو زۆرتر لەجوڵاندایە، بەڵام دەتوانرێت، وەکو شتێکی جوڵاو

داگیربکرێــت. لینجی بە توندی ڕادەکات و لـــەو پەیوەندییە دەچێت هەڵۆ لەگەڵ زەویدا هەیەتی نەک مریشــک. تەنانەت ڕاکردنەکەشـــی ناگیرێت چونکە باوەڕ بە ڕاکردنی خۆی ناکات. بەئاشــکرا شــتێکی ڕەقی بەردەامە. هیچ شتێک ئەوەندەی "جەوهەرێــک لەنێوان دوو بارودۆخدا" زۆرتر لەو هێواشـــییەی لینجاوییەکە تیایدا دەتوێتەوە، گەواهی لەســـەر خەســـڵەتە نادیارەکەی نادات. ئەو دڵۆپە ئاوەی بەر پانتایی ئاوێکی زۆر دەکەوێت ڕاســـتەوخۆ دەبێت بە ئاوەکە؛ ئەمەش لە توانەوەی گیانەکـــی تاکەکەس لەنێو فۆرمێکی مەزن دەچێــت، کە لێوەی دەرچووە. هێمای تەنی ئاوەکە لە پێکهێنانی سیســـتەمی یەکانەکی بووندا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت؛ پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوان بـــوون و هەبوو دیاریدەکات. ئەگەر بیر لە لینجی بکەینەوە، دەبینین نوێنەرایەتی هیستیریای بەردەوام لەنێو دیاردەی بووندا دەکات. هەنگوینەکەی بە کەوچکەکەمدا لەسەر شوشەی هەنگوینەکە دێتە خوارێ پەیکەریک بە خۆهەڵواسینەکەی دروســـتدەکات و یەککگرتنیشی لەگەڵ هەموو هەنگوینەکەدا نوقم بوونێکی لەســـەرخۆیە؛ کەوتنە خوارەوەیەکە، کە لە فشبوونەوە دەچێت (بیر لە خۆشی ئەو منداڵە بکەوە، کە لە کاتی یاریکردن بە کەلوپەلەکانی گویی لە فیکە بە پڕ بوونیان و لوورەش بە فشـــبوونەوەیان دەبێت.) ئەمیش، وەکو پیشاندان لە مەمکە پانەوەبووەکانی ئەو ئافرەتە دەچێت لەسەرپشت ڕاکشاوە.

لەو جەوهـــەرە لینجاوییەی لەنێو خۆیدا دەتوێتـــەوە جۆرێک لە بەرگریکردن دەبینرێت. ئەمەش لە ڕەتدانەوەی ئەو تاکەکەسە بەرانبەر لەناوبردنی لەنێو هەموو بووندا دەچێت. هەروەها ئەو نەرمییەشـــە فرێدراوەتە ئەو پەڕییەوە. نەرمی نیوە لەناوبردنە؛ وێنەی ئێمە، وەکو هێزێکی ڕووخێنەر و سنورەکانی نیشاندەدات. هێواشی لەناوبردنـــی دڵۆپێکی لینجدا لەنێو هەموودا لەنەرمیدا دەناســـرێت. نەرمییەکەش تاکـــو دواتر دەمێنێتەوە؛ تەنـــی جەوهەرە لینجەکە دڵۆپەکـــە هەڵدەمژێت. ئەم دیاردەیە چەند خەســـڵەتێکی لینجی ئاشـــکرا دەکات. یەکەم ئەوەیە، کە دەستی لێدەدەیت نەرمە. ئاو بڕژێنەسەر زەوی؛ دەڕوات. شتێکی لینج بڕژێنە ڕادەوەستێت و خۆی نیشـــاندەدات. پاندەبێتەوە و نەرمە؛ ئەگەر دەســـتی لێبدەیت ڕاناکات و دەچەســـپێت. ئەو خەسڵەتەی، کە بەدڵڕەقی و بێبەزەییانە ڕێگەنادات ئاو بگرین بە نهێنی دەیکات بە کانزا؛ دواجاریش، وەکو پۆڵا دەبێت بە شتێک لێی تێنەگەین. لە لینجی تێدەگەین. خۆی وا دەناســـێنێت، کـــە بتوانین داگیریبکەین. باریکی و خۆبەستنەوەکەشی ڕێگە نادات لە دەستمان هەڵبێت؛ دەتوانم بیخەمە سەردەستم. نەختێک لە هەنگوینەکە جیابکەمەوە. بەردەوام شـــتێکی نوێی تاک دروستبکەم؛ بەڵام هاوکات نەرمی شتەکە، کە لەنێو دەستمدا پانکراوەتەوە تێمدەگەیەنێت، کە من بەردەوام هەوڵی ڕووخانی دەدەم.

ئەمە وێنەی ڕووخاندنێکی-داهێنەرانەیە. لینجی بە ئاســـانی دەستەمۆ دەبێت.

لەکاتێکدا لەو بڕوایەدام داگیرم کردوە، ئەویش من داگیردەکات. ئەمەش خەسڵەتی بنەڕەتــی ئەوە: نەرمییەکەی، وەکو زەرووە. ئەگەر بابەتەکەی نێو دەســتم ڕەق بێت، هەرکاتێک بمەوێت فرێی دەدەم؛ وەســتانی ئەو هێمایە بۆ هەموو هێزی من؛ بناخەکەشــی دروستدەکات. بەڵام بناخەی من دروســتناکات؛ بوونێ-بۆ-خۆ بوونێ-لەنێو-خــۆ لەنێو بابەتدا کۆدەکاتەوە. بابەتەکەش بــۆ بوونێ-لەنێو-خۆیەکی دیکە بەرزدەکاتەوە بەبێ ئەوەی هیچ لە پلەی خۆی کەم بکاتەوە. ئەو هەمیشــە، وەکو هێزێکی داهێنەر دەمێنێتەوە. بوونێ-بۆ-خۆیە، کە بوونێ-لەنێو-خۆ دەتوینێتەوە. بە واتایەکی دیکە، خاوەنێتی لە تێهەڵکێشەی بوونێ-لەنێو-خۆی بوونێ-بۆ-خۆدا بوونێ-بۆ-خۆ لەپێشتر دادەنێت. بەڵام، کتوپڕ بوونێ-بۆ-خۆ واز لە مافی خۆی دەهێنێت. من دەستم دەکەمەوە تاکو شتە لینجەکە بڕوات، کەچی لە دەستم نابێتەوە. شێوازی بوونی نە وەستانە، وەکو ڕەقی نە وەکو ئاویش دەجوڵێت. لە تاو ڕاکردنی لە من ماندوو دەبێت. ئەو شــتیکی نەرم، جوڵێنەر، تەڕ و مێینەیە. بە شاراوەیی لەژێر پەنجەکانمدا دەژی. منیش، وەکو گێژبوون هەســتی پێدەکەم. لینجی خەسڵەتی دەستلێدانی هەیە و منیش لەوەزیاتر خاوەنی نیم. بەردەوام دەمێنێتەوە. لەلایەکەوە شتێکی داگیرکراوی دەستەمۆ و لەلاکەی دیکەوە لە دڵسۆزی سەگێک دەچێت، کە کاتێک داواشی ناکەیت ئەو ئەتداتێ. لەژێر دەستەمۆکردنەکەشەوە خاوەنێتییەکی نهێنی لەنێوان خاوەنەکە و شتە داگیرکراوەکەدا هەست پێدەکەیت.

لێرەدا هێمایەک کتوپڕ خۆی دەخاتــە ڕوو: ئەویش خاوەنێتییەکی زەهراوییە؛ ئەگەری توانەوەی بوونێ-بۆ-خۆ لەنێو بوونێ-لەنێو-خۆدا هەیە؛ واتە، دەشێ بوونێک پەیدابێت، کە بەپێچەوانــەی بوونێ-لەنێو-خۆی بوونێ-بۆ-خۆیە. لەم بوونەدا بوونێ-لەنێو-خۆ بوونێ-بۆ-خۆ ڕادەکێشێتە نێو هەڵکەوتن و دەرەکییەکی ناجۆرەوە یان بۆ نێو بوونێکی بێ بناخەوە. لێرەدا، من یەکسەر تەڵەی لینجی دەناسمەوە: ئەو شلییەیە من دەگرێت و ناچارم دەکات واز لە پلەومافم بهێنم. من ناتوانم لەسەری خلیسکاندن بکەم، وەکو زەروو پێمەوە دەنوسێت. نکۆڵی لە خلیسکاندنەکە، بەوجۆرەی لەسەر ڕەقــی هەیە، نەکراوە؛ تەنیا پلەکــەی کەمکراوتەوە. وا دەردەکەوێت لینجی خۆی بۆ من شــلبکات، بانگم بکات چونکە تەنێکی لینجی وەستاو لەدوورەوە لە تەنێکی شــلی پڕ دەچێت. بەڵام ئەمە تەڵەیە. جەوهەرێکی خلیســکاو خلیســکاندنەکەی هەڵوەشــایەوە و هیچ ئاسەوارێکی بەسەر منەوە جێنەهێشتوە. لینجی لەو شلییە دەچێت لە خەوی ناخۆشدا دەیبینین، کە هەموو خەسڵەتەکانی زیندوو دەبن و دژی من ڕادەوەســتن. لینجی تۆڵەسەندنی بوونێ-لەنێو خۆیە. تۆڵە سەندنێکی مێینەی شــیرین و دەردەدارە و هێمای 'شــەکری' بۆ دادەنرێت. لەبەرئەم هۆیەشــە تامی شــیرینی، وەکو شەکر شــیرینییەکی هەتاهەتایی، کە پاش قوتدانی لەنێو دەمدا دەمێنێتەوە، ناوەڕۆکی لینجی بە پڕی تەواو دەکات. لینجییەکی شــیرین نموونەی

چاکـــی لینجییە؛ هێمایە بۆ مردنی شـــیرینی بوون-بۆ-خۆ (وەکو ئەو هەنگە وایە دەکەوێتە نێو مرەباکەوە و تیایدا نوقم دەبێت.) هەمانکات لەســـەر ئەو ڕاستییەی من نەخشە بۆ خاوەنێتی جەوهەرە لینجەکە دەکێشم، لینجییەکە دەبێت بە بوونی من. لێسانەوەی شتە لینجاوییەکە بە دەستمەوە بەردەوامی بە لینجییەکە لە بوونی منـــدا دەدات. دەزووە نەرم و درێژە لینجاوییەکانی لە پەنجەمەوە شـــۆڕدەبنەوە و دەکەونە سەر لەشی لینجاوی من (کاتێک پەنجەم دەکەمە ناوی و دەریدەهێنمەوە) خۆتێهەڵکێشـــانی بوونمە لەنێو لینجاوەکەدا. ئەو هیســـتیریایەی بە گەیشـــتنی کۆتاییەکان، بۆ ئەو دەزوانەی بە لەشێکی گەورەترەوە هەن بەرجەستەیان دەکەم، بـــۆ بەرگریکردنە لە توانەوەی بوونم لەنێـــو بوون-لەنێو-خۆدا. ئەگەر بازدەمە نێو ئاوەوە و خۆم نوقم بکەم توشی پەرێشانی نابم چونکە ناترسم لەوەی لەنێو ئاوەکە بتوێمەوە؛ لەنێو ئەو شلییەدا بە ڕەقی دەمێنمەوە. ئەگەر بکەومە نێو لینجاوێکەوە، هەســـتدەکەم وندەبم؛ لەنێویدا دەتوێمەوە چونکە لینجی لە پرۆســـەی بەرەو ڕەق بووندایە. لەگەڵ تێگەیشتنم لە بوونی لینجی جەوهەرێکی چەسپان سەرهەڵدەدات، کـــە لە پلـــەم نزمدەکاتەوە و لە هاوســـەنگی بەدەرە و لـــە دێوەزمەی یادەوەری کەسێکی دۆخگۆڕاو دەچێت.

ئەگەر دەست لە لینجی بدەیت بوونی خۆت دەخەیتە نێو مەترسی توانەوە لەنێو لینجاوەکەدا. ئەم توانەوەیە ترسناکە چونکە توانەوەی بوون-بۆ-خۆیە لەنێو بوون-لەنێو-خۆدا بەو جۆرەی مەرەکەبە لەنێو کاغەزی وشـــککردنەوەکەدا نوقم دەبێت. ترسناکتریشە ئەگەر دۆخ گۆڕینەکە تەنیا بۆ شتێک نەبێت بەڵکو بۆ لینجی بێت.

ئەگـــەر بیر لە توانەوەی خۆشـــم بکەمەوە (وەکو دۆخ گۆڕینـــی بوونم بۆ ئاو) هێشـــتا زۆرکاریگەر نابێت چونکە ئاو بە جوڵان و شـــلی و ڕووواڵەتە ساختەکەی، کـــە ڕەق دەردەکەوێت و ڕاکردنە بەردەوامییەکەیـــەوە هێمایە بۆ ئاگامەندی. ئەو بیریارە دەروونناســـانەی بۆ یەکەمجار ســـەرنجیان دایە خەسڵەتی بەردەوامبوونی ئاگامەندی (وەکو جێمس و برگســـۆن) ئاگامەندییان لەگەڵ ڕووباردا بەراوردکردوە. ڕووبار وێنەی ڕاڤەکردنێکی بەردەوامی بەشەکانێتی لەنێو هەمووەکەدا و پەیوەندییە پچڕاوە هەمیشەییەکە و جوڵانە سەربەستەکەش. بەڵام لینجی وێنەیەکی ترسناکی هەیە؛ ترســـناکە ئاگامەندی ببێت بە لینجی. هۆی ئەمەش خەسڵەتی نوساندنە لە لینجیدا. هاوکارییەکی فێڵاوی تێدایە لەسەرو هەموویانەوە لێکچونەکەیەتی لەگەڵ زەرووددا. ئەو ئاگامەندییەی دەبێت بە لینجی بیرۆکە لینجاوییەکانی دەیگۆڕن.

لەوڕۆژەوە ئێمە دێینە نێو جیهانـــەوە، ئەو وێنەیەی ئاگامەندی بەرەو داهاتوو یـــان پرۆژەی بوونمان دوامان دەکەوێت. لەکاتێکدا دەگەینە ئەوێ و ئەویش لەوێدا دەبێت بـــەو ئاگامەندییە ڕابردوو بە فێڵ ڕایدەگرێت و هەزار مشـــەخۆر پەلاماری پرۆژەکـــە دەدەن تاکو بەتـــەواوی ونی دەکەن. "فڕینی بیرۆکـــەکان"، کە لە نێو

دەروونی کاریگەرێتییدا هەیە باشترین نموونەی ئەم بارودۆخە ترسناکەمان دەداتێ. بەڵام ئەو شــتە چییە ئەم ترسە لە ئاستێکی ئۆنتۆلۆجییانەدا دەریدەبڕێت، ئەگەر هەڵهاتنی بوونٚ-بۆٚ-خۆ لەبەردەم فاکتۆری بوونٚ-لەنێوٚ-خۆ یان بەکاتبوون نەبێت؟

ترســناکی لینجی تۆقێنەرە و تیایدا فاکتۆر بەردەوام بەرەوپێشەوە دەڕوات و بوونٚ-بۆٚ-خــۆ دەتوێنیتــەوە. ئەمەش ترس لە مردن یــان لەنێوٚ-خۆیەکی ڕووت و نەبوون نییە بەڵکو ترســە لە بوونێکی تایبەت، کە تەنیا لە شێوازی بوونٚ-لەنێوٚ-خــۆی بوونٚ-بۆٚ-خۆدا هەیە و لینجییەکــە نوێنەرایەتی دەکات. ئەو بوونەیە من بە هەمــوو هێزمەوە ڕەتیدەدەمەوە وەکو بەها بووە بــە دێوەزمەی بوونم. ئەو بوونە نموونەییەیە، کە تیایدا بوونٚ-لەنێوٚ-خۆی بێ بناخە خراوەتە پێش بوونٚ-بۆٚ-خۆوە. ئێمە ئەمە بە دژە بەها ناوزەددەکەین.

لــە پرۆژەی خاوەنێتی لینجیدا، لینجییەکە کتوپڕ دەبێت بە هێما بۆ دژە بەها: جۆرە بوونێکی نەناســراوە، بەڵام هەڕەشــەکەرە و بەردەوام بۆ ئاگامەندی دەبێت بە مەترســی و ڕادەکات. کتوپــڕ پرۆژەی خاوەنیتییەکەشــی دەکات بە پڕۆژەی فڕین. شتێک ســەرهەڵدەدات، کە بە ئەزموون نەدۆزراوەتەوە بەڵکو ئاکامی پێش تێگەیشتنی ئۆنتۆلۆجییانەی بوونٚ-لەنێوٚ-خۆ و بوونٚ-بۆٚ-خۆیە.

ئەمــەش واتایەکی تایبەتی لینجییــە. لەلایەکەوە، ئەزمونــە چونکە درککردن دەیدۆزێتەوە؛ لەلاکەی دیکەوە لە دۆزینەوەی گەشتە پڕ مەترسییەکەی بوون دەچێت. لێرە بەدواوە، مەترسییەکی نوێ بۆ بوونٚ-بۆٚ-خۆ، بوونێکی هەڕەشەکەر، کە پێویستە لێی دوورکەوینەوە لە هەموو شوینێکدا پەیدا دەبێت. لینجییەکە هێمای هیچ هەڵوێستێکی لەپێشــتری دەروونی نییە؛ جۆرە پەیوەندییەکی بوون لەگەڵ خۆیدا دەخاتەڕوو. ئەو پەیوەندییەش خەســڵەتێکی دەروونی هەیە. من لە نەخشەدانانەکەمدا بۆ خاوەنێتی دۆزیمەتــەوە و وێنەی خۆی بۆ گەڕاندومەتەوە. لــەم ڕووەوە، یەکەم پەیوەندی بە لینجییەکەوە، لەســەر شێوازی ئۆنتۆلۆجی لەودیو جیاوازییەکان لەنێوان دەروونی و نادەروونیدا، کەواتای بوون بۆ هەموو هەبووەکان بە کاتیگۆرییەکی تایبەت ڕاڤەدەکات، منیش دەوڵەمەنــد دەکات. ئەم کاتیگۆرییە کە جم جمەیەک دەچێت پێش ئەزمون لەگەڵ چەند جۆریک لە شــتە لینجەکان دانرابێت. من لەگەڵ پرۆژە بنەڕەتییەکەمدا ئەوم هێناوەتە نێو جیهانەوە؛ بونیادێکی دەرەکی جیهانە و هەمانکات دژە بەهاشە؛ ئەو شــوێنە داگیردەکات، کە بابەتە لینجەکان تیایدا خۆیان ڕێکدەخەن. هەرکاتێک بابەتێک ئەم پەیوەندییەی بوونم بۆ ئاشکرا بکات، لە تەوقەکردندا، زەردەخەنە یان بیرۆکەیەکدا بێت لە پێناســەکەیدا، وەکو لینجی دەناســرێت؛ کە دەکەوێتە ئەودیو بەســتێنی دیاردکەیەوە و بۆ من دەکەوێتە ڕیزی شــتەکانی وەکو لەزگە، کەتیرە، هەنگوین و هتد. ئەمانە لە دەڤەری ئۆنتۆلۆجی لینجیدان.

بەپێچەوانەشـــەوە، بەوڕادەیەی من دەمەوێت ببم بە خاوەنی ئەو شتە، شتەکە بۆ من هەموو جیهانـــە و لەگەڵ یەکەم پەیوەندیمدا دەردەکەوێت دەوڵەمەند بێت و واتایەکی شـــاراوەی لەنێو خۆیـــدا هەڵگرتبێت. لینجییەکـــە، وەکو "زۆرتر لە لینجی" خۆی دەردەخات. لە یەکەم ســـاتی خۆ دەرخســـتنەکەیەوە ژوور هەموو جیاوازییەکانـــی نێوان دەروونی و نادەرونی، بوونێکـــی ڕووت و واتاکانی جیهان دەکەوێـــت؛ واتایەکی گونجـــاوی بوونە. یەکەم ئەزموونی منـــداڵ لەگەڵ لینجیدا منداڵەکە لە ڕووی دەروونی و ڕەوشتیەوە دەوڵەمەند دەکات؛ ئەو چاوەڕێ ناکات گەورەبێت تاکو جۆری کەمی لینجی بدۆزێتەوە. ئەوە، لەوێدا، لەشـــێوازی کەتیرە یان هەنگوین لەبەردەستیایەتی. ئەمەش بۆ هەموو بابەتەکانی دیکەی چواردەوری منداڵ دروســـتە. مەبەستمان ئەوەنییە لەسەرەتاوە ئەو 'ناشرینی'، 'جوانی' بوون دەناسێت. بەڵکو خاوەنی واتاکانی بوونە، کە ناشرینی، جوانی، هەڵوێست، نیشانە دەروونییەکان، پەیوەندییە سێکســـییەکان و هتد، تیایدا بەرجەستە دەبن. ئەمانە تەنیـــا نموونەن. لینجی و کەتیراوی و تەماوییـــەکان و چاڵەکانی نێو لم، زەوی، ئەشـــکەوتەکان و ڕووناکی و شەو هتد. شـــێوازی بوونی پێش-دەروونی و پێش-ســـێکس بۆ دەردەخات، کە بەدرێژایی تەمەنـــی دەبێت لە واتاکانیان بکۆڵێتەوە. "بێ خەتایی" منداڵ دروست نییە.

لەگەڵ فرۆیدا باوەڕ بە ژمارەیەک پەیوەندی لەنێوان سیکس و فۆرم و هەڵوێستی تایبەتی ژینگەی منداڵدا دەکەین. بەڵام ناڵێین ئارەزووی سێکسی دەریان دەبڕێت، بەڵکـــو بەجۆرێک بۆ منداڵەکە دەردەکەون، کە سێکســـگەرایەتییەی پێکدەهێنن. نموونەی سەرنجڕاکێشـــانی منداڵ لەبینینی کوندا باســـدەکەین، کە زۆر لە بیریارە دەروونناســـەکانیش ئاماژەیان بۆ کردوە (گرنگ نییە کونەکە چاڵی نێو لم، زەوی، ژێرزەمین یان ئەشکەوت بێت.) ئەم بیریارانە کونەکەیان بە هەڵویستی سێکسی کونی پاش منداڵ، هەژان لە کاتی لەدایکبووندا و هەستکردن بە مەترسییەکی چاوەڕوان نەکراو لەکاری سێکســـی لای هەرزەکار دانـــاوە. بەڵام ئێمە لەگەڵ بۆچوونەکانیان هاوڕانین. بیرۆکەی هەژان لەکاتی لەدایکبووندا نموونەیەکی چاکە. بەراودکردنی کون لەگەڵ ئەندامی سێکسی مێینە پێویستی بە ئەزموون یان هەستکردن بە مەترسی چاوەڕواننەکراو لەسێکســـدا هەیە، کە ئەو نییەتی. سەبارەت هەڵوێستی سێکسی منداڵەکەشـــی لە پاشـــەوە، بیر لە ڕەتدانەوەی ناکەینەوە؛ بەڵام ئەگەر ئاماژە بۆ ئەو کونانە بکات دەیانبینێت و بە هێما دایاندەنێت، ئەوا پێویستە منداڵەکە پاش خۆی، وەکو کون ببینێت. ئاشکراتر دەڵێین، پێویستە منداڵەکە ناوەڕۆکی کون یان دەم بناسێت، چونکە پەیوەندییان بە کونی پاشییەوە هەیە. بەڵام ئێمە بەتەواوی هەڵوێســـتی ناوەکی "بوونی خۆمم لەگەڵ لەشمدا" باسکرد. مەحاڵە بڵێین منداڵ ئەندامێکی لەشی بە بونیادێکی دەرەکی بۆ جیهان دادەنێت. تەنیا بۆ کەسێکی دیکە

کونی پاشەوە لەدەم دەچێت. منداڵەکە ئەمە نازانێت. تەنانەت بایەخدانی دایکیشی ئەوەی بۆ دەرناخات، چونکە کونی پاشـــەوە، وەکو بەشـــێکی پـــڕ ئازار دەماری هەســـتپێکراوی لەکۆتاییەکەدا بۆ دانەنراوە. دایکەکەش لەڕێگەی وشـــەوە، کە بۆ لەشی منداڵەکە بەکاریدەهێنیت دەزانێت، کە ئەو بەشە کونە. کەوابوو، هەستکردن بە سروشتی دەرەکی کونەکە لەنێو جیهاندا بۆ ئەو ڕۆشنایی دەخاتە سەر سروشتی دەرەکی واتای کونی پاشـــەوە و واتاش بە بەرزێتی هەســـتکردنەکان دەدات، کە لەوەوپێش بە بوون ســـنوردارکرابوون. خودی کون بەتەنیا هێمایە بۆ شـــێوازێکی بوون، کە پێویستە ســـایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی باسیبکات. لێرەدا، ئێمە بەدرێژی باســـیدەکەین. کەســـێک دەتوانێ ببینێت، کە کون ئەو نەبوونەیە داوای 'پرکردنەوە' بە گۆشتی خۆم دەکات؛ منداڵەکە ناتوانێت پەنجەی یان هەموو قۆڵی نەخاتە نێو کونەکەوە.

کون وێنەی بۆشاییە لە مندا. من بۆ ئەوەی ببم بەو بوونەی چاوەڕوانم خۆم بەرەوکونەکە دەخشـــێنم. کونەکە دەبێت بەهەلکۆڵێن، کە بە وریاییەوە گۆشتم لە قاڵبی دەگرێت بە جۆریک خۆمی تێبگوشم و جێی خۆمی تێدا بکەمەوە؛ بەشداری لە پڕکردنەوەی بوون لە جیهاندا دەکەم. چوونە نێو کونەوە قوربانی دانە بە بوونم بۆ پڕکردنەوەی بوون؛ بوونـ-بۆ-خۆ دەیەوێت بەســـۆزەوە هەمووگیری بوونـ-لەنێو-خۆ، تەواوکۆییەکەی و مانەوەی دروستبکات.

لێرەدا، لە بناخەکەیەوە یەکێک لە مەیلەکانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی دەناسین، ئەویـــش مەیلی پرکردنـــە. لەگەڵ ئەم مەیلەدا رووبەڕووی هـــەرزەکاری و تەمەنی دوای هەرزەکاریـــش دەبینەوە. بەشـــێکی چاک لە ژیانمان بـــە پرکردنی کونەکان دەگوزەرێت. منداڵ لەگەڵ یەکـــەم ئەزمونی تێدەگات کونی هەیە. پەنجە دەخاتە نێو دەمی و بەدوای کونەکانی دیکەی نێو دەم و چاوی دەگەڕێت؛ هەست بە پڕی بوونەکەی پارمەنیدســـیش دەکات، ئەگەر پەنجە بمژێـــت و بیەوێت لەنیو دەمیدا بیتوێنێتەوە. ئەو دەیەوێت پەنجەی بکات بە هەویرێکی لینج و دەمی پڕبکات. ئەم مەیلە لە خواردندا بنەڕەتییە؛ خواردنیش پڕکردنە.

لەم بۆچوونەوە بەسێکس دەگەین. ناشرینی سێکسی مێینە لە 'کونەکراوەکاندا'یە. ئـــەوەش، وەکو هەموو کونەکانی دیکە، داوای بوون دەکات. ژن داوا لە لەشـــێکی دەرەکـــی دەکات بوونی بۆ پڕی بگۆڕێت. ژن لەبەرئەوەی "لە شـــێوازی کوندا" یە هەست بەمەدەکات. ئەمەش بنەڕەتی تەواوی گرێی ئەدلەرە. بێگومان، سیکس بۆ ئەو دەمە، دەمێکی برسی، کە ئەندامی سێکسی نێرینە دەخوا. ئەمەش فاکتۆرێکە بۆ بیرۆکەی خەساندن. شەیدابوون خەساندنی پیاوە؛ چونکە سێکس کونە. دەبێت لێرەدا باســـی کارتێکردنی پێش-سێکسیش بکەین، کە لەدواییدا وەکو هەڵوێستی ئەزمونی و ئاڵۆزی مرۆڤ دەبێت بە یەکێک لە بنەماکانی سێکسگەری. بەڵام هیچ

شتێکی هاوبەشی لەگەڵ سێکسدا نییە. سروشتی ئەمەشمان لە کەرتی سێیەمی ئەم نوسراوەدا باسکرادوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەزموونی کون، کاتێک منداڵ ڕاستەقینەکە دەبینێت، ئۆنتۆلۆجی ئەزمونی سێکسیشی بەگشتی لەگەڵدایە؛ منداڵەکە بەلەشیەوە لەبەردەم کونەکەدا ڕادەوەستێت، کونەکەشی پێش هەموو دیاریکردنێکی سێکسی شتێکی ناشرینی چاوەڕوانکراوە و ڕوو لە لەش دەکات.

ئێمــە گرنگی ئــەم کاتیگۆرییە بوونگەرایەتییانە بۆ ســایکۆلۆجی شــیکاری بوونگەرایەتــی دەزانیــن. بەهۆیانەوە بابەتی گشــتی ڕاســتەقینەی مرۆڤایەتی دەدۆزینەوە. ئەوەی بیریاریکی دەروونناس دەیەوێت بیزانێت تێگەیشتنە لە پڕۆژەی سەربەستی تاکەکەسێک لە پەیوەندییەکانیدا. دەشێ من حەز بکەم دەست لە لینجی بدەم یان لە کون بترسم و هتد. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت من واتای ئۆنتۆلۆجی لینجــی، چەوری، کون و هتد ونبوە. بەڵکو، ئــەو واتایە من لە پەیوەندییەکەمدا لەگەڵ ئەم یان ئەوشتە بڕیاری لەسەردەکەم. ئەگەر لینجی هێمایەک بۆ بوون بێت، کــە تیایدا بوونی-لەنیو-خۆ بوونی-بۆ-خۆ قوتــدەدات. ئایا من لە ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ کەســانی دیکەدا، چ جۆرە کەسێکم ئەگەر حەز لە لینجی بکەم؟ ئاماژە بۆ چ پرۆژەیەکی بنەڕەتی بوونم بکەم ئەگەر بمەوێت باســی حەزکردنم بۆ شــتێکی نادیار و خۆرا و لەلایەن بوونی-لەنێو-خۆوە بکەم؟ بەم جۆرە تام نابێت بەشــتێکی دراوی کەمنەکراوە؛ ئەگەر کەسێک بزانێت پرسیار لەبارەیانەوە بکات، ئەوا پرۆژەی بنەڕەتی کەسەکە دەردەخەن. تەنانەت ئاماژەکردن بۆ خوار دەمیش واتا بەخشە. ئەمەش لەوێدا دەردەکەوێت ئەگەر هەریەکێک لە تامەکان بەبابەتێکی هەســتەکی ڕووت دانەنرێت و وەکو بەهایەکی ئاشکرا تەماسابکرێت. ئەگەر حەز لە تامی سیر بکەم هەستدەکەم هەمووکەسێک حەزی لێدەکات.

خواردن خاوەنێتییە لەڕێگەی لەناوبردنەوە؛ هەمانکات خۆ پڕکردنە بە جۆرێک بوون. ئەو بوونەش تێهەڵکێشەی گەرمی، چڕی و تامە تایبەتەکەیە.

ئاماژە بۆ جۆرێک بوون دەکات؛ کاتێک دەخۆین هەوڵی زانینی خەســڵەتەکانی ئەو بوونە لەڕێگەی تامەکەوە نادەین؛ بە تامکردنەکە خۆمان دەکەین بە خاوەنی. تامکــردن توانەوەیە؛ دانەکان لەگــەل گازگرتنەکەدا چــڕی بوونەکە، کە بۆ گاز دەگۆڕێت، دەردەخات. کەوابوو، تێهەڵکێسکردنی درککردنەکەی خواردن تورانەوە و لەناوبردنە. ئەو بوونەم بۆ دەردەخات، کە من دیکەم بەگۆشت لە لەشمدا.

لێرەدا بەدواوە، ئەوەی من وەریدەگرم یان بەقێزەوە وازی لێدەهێنم بوونی ئەو هەبووەیە یان خواردنەکە جۆرێک لە بوونم بۆ دەردەخات، کە من دەمەوێت هەمبێت یان نامەوێت. هەمووی ئەو بوونە بووە بە فۆرمێک کەمتر چڕو گەرمە. شــیرینی، بۆنموونــە، کاتێک کەوچکێک هەنگوین دەخۆین لینجی دەردەبڕیت. ئەمەش وەکو دەربڕینی کەوانەیە لە شــیکردنەوەیەکی ئەندازیارییــدا. ئەمەش، واتە هەموو ئەو

خەسڵەتانەی تامیش دەگرێتەوە، کە تامی تامەکە نین.(پارچەیەک چۆکلێت لەژێر دانمـــدا ڕەقە بـــەڵام دوایی نەرم دەبێت و دەشـــکێت و لەوەزۆرتر بەرگری ناکات؛ بەرگریکردنەکە و شـــکاندنەکەش خودی چۆکلێتەکەیە). لەگەڵ ئەوەشـــدا، ئەمانە لەنێو خەســـڵەتی کاتی تامەکەدا یەکیان گرتوە؛ بوون بەشـــێوازی کاتی بۆ ئەو. هەندێک تام زوو خۆیان بەدەســـتەوە دەدەن، ئەوانـــی دیکەیان دوادەکەون. ئەم خەســـڵەتانە پەیوەندییان بە چڕی و پلەی گەرمـــی بابەتەکانەوە هەیە. هەروەها شـــێوەی خواردنەکەش ددەردەخـــەن. ئەگەر پارچەیەک کێکـــی پەمەیی بخۆم، تامەکەشی پەمەیی دەبێت؛ شـــەکرە بۆنداره نەرمەکەی، چەوری کەرەکە پەمەیی دەبـــن. کەوابوو، مـــن پەمەیی دەخۆم. لەئاکامـــدا، تام، لەبەر ئـــەم هۆکارەیە، ئەندازیارییەکی ئاڵۆز و کەرەسەی جیاوازی خۆی هەیە؛ ئەم کەرەسەیەیە بوونێکی تایبەتیمان پێدەناسێنێت. ئێمەش دەمانەوێت بیتوێنینەوە یان قێزی لێدەکەینەوە. گرنگ نیە گوێ نەدەینە ئەوەی حەز لە گوێی ماســـی یان ڕۆبیان دەکەین. ئەوەی پێویستە بزانین گرنگی بوونگەرانەی ئەم خواردنانەیە.

بەگشتی ، تامی کەمنەکراوە نییە. هەموو ئاماژە بۆ خاوەنێتی جۆرێک لە بوون دەکەن. ڕیزکردن و خانەکردنیان دەکەویتە سەر سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی. لێرەدا ئۆنتۆلۆجی وازمان لێدەهێنێت؛ یارمەتی دابن دوا کۆتاییەکانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتـــی، ئەگـــەرە بنەڕەتەکانی و بەهاکەی بناســـین. هەر ڕاســـتەقینەیەکی مرۆڤایەتی، هەمانکات، ڕاســـتەوخۆ پرۆژەی دۆخگۆڕینی بوون-بۆ-خۆیە بۆ بوون-لەنێو-خـــۆی بوون-بۆ-خۆ. پرۆژەی خاوەنێتی جیهانە، وەکو هەمووی بوون-لەنێو-خۆ لەشێوازی خەسڵەتی بنەڕەتیدا. هەریەکێک لە ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی سۆزە، کـــە تیایدا پرۆژەی خۆ ونکردنی لەپێناوی دۆزینەوەی بووندا بەرجەســـتە دەبێت. دەیەوێ ببێت بـــەو بوون-لەنێو-خۆیەتی بەهۆی بوون بەبناخە بۆ بوونی خۆی لە هەڵکـــەوت ڕادەکات. دەبێت بە هۆکار بۆ بوونی خۆی یان ئەو خوایەی ئایینەکان (هۆکارە بۆ خۆی) باوەڕی پێدەکەن. کەوابوو، سۆزی مرۆڤ بەپێچەوانەی سۆزی مەسیحەوەیە چونکە مرۆڤ دەیەوێت بوونی خۆی، وەکو مرۆڤ ونبکات و ببێت بە خوا. بەڵام بیرۆکەی بوونی خوا ناکۆکە. ئێمەش بوونی خۆمان بێهودە وندەکەین. مرۆڤ سۆزێکی بێسودە.

# سەرەنجام

## ١- لەنێو-خۆ و بۆ-خۆ: ئاکامە مێتافیزیکییەکانی

دواجار بە سەرەنجامەکان دەگەین. لە پێشەکی نوسینەکەماندا دۆزیمانەوە، کە ئاگامەنـــدی بانگی بوون دەکات. ڕوونمانکردەوە چۆن کۆجیتۆ ڕاســـتەوخۆ ئاماژە بـــۆ بوونی-لەنێو-خـــۆ دەکات و بۆ ئاگامەندی دەیکات بەبابەت. پاش باســـکردنی بوونی-لەنێو-خۆ و بوونی-بۆ-خۆ دژواربوو پەیوەندی لەنێوانیاندا دروستبکەین. لەوە دەترســـاین توشـــی دووەلیزمێکی لەچارەبەدەر بین. دووەلیزمەکەش لە ڕوویەکی ترەوە هەرەشەی لێدەکردین. لەڕاستیدا، لەبەر ئەوەی دەتوانین بڵێین بوونی-بۆ-خۆ شتێکە، کە هەیە، خۆمان لەبەردەم دوو شێوازی ڕادیکاڵی جیاوازی بووندا دۆزیەوە: ئـــەو بوونی-بۆ-خۆیەی، کە بووە بـــەوەی هەیە، بۆنموونە ئەوە، کە نییە و ئەوەش نییە، کە هەیە. هەروەها بوونی-لەنێو-خۆ هەبووەکە. ئەو پرسیارەشـــمان کرد، کە ئایا دۆزینەوەی ئەم دوو شێوازەی بوون بۆتە هۆکاری پچڕاندن و دابەشکردنی بوون بۆ چەند بەشـــێکی لەیەک دابڕاو، هەریەکێک لە ئەوانیش واتایەکی بنەڕەتی بوون هەڵدەگرێت یان نا.

بەهۆی توێژینەوەکەمانەوە توانیمان وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە: بوونی-بۆ-خۆ و بوونی-لەنێو-خۆ لەنێو تێهەڵکێشـــەیەکدا یەکیان گرتۆتەوە تێهەڵکێشەکەش خودی بوونی-بۆ-خۆیە. بوونی-بۆ-خۆ لەناوبردنێکی ڕووتی لەنێو-خۆیە؛ کەلەبەرێکە لە ناخی بووندا. دەشێ، لێرەدا بیر لەو چیرۆکە باوەی سەبارەت یاسای پاراستنی وزەیە، بکەینـــەوە. ئەگەر بڵێین هەریەکێک لە ئەتۆمەکان، کە جیهان پێکدەهێنن لەناوبچێت کارەســـات ڕوودەدات و هەموو جیهانیـــش دەگرێتەوە. ئەمەش کۆتایی بـــە زەمین و سیســـتەمی خۆر دەهێنێـــت. ئەم مێتافۆرە بۆ ئێمە، لەم باســـەدا، سودبەخشە. بوونی-بۆ-خۆ، وەکو لەناوبردنێکی بچوکە و لە ناخی بوونیشدایە؛ ئەم لەناوبردنە بۆ خرۆشاندنی بوونی-لەنێو-خۆ بەسە. خرۆشاندنەکەشی جیهانە. بێجگە لە لەناوبردنی بوون بوونی-بۆ-خۆ ڕاســـتەقینەیەکی دیکەی نییە. خەســـڵەتەکەی لەسەر ئەو ڕاســـتییە دامەزراوە، کە ئەم بوونە لەناوبردنی تاک و بوونێکی-لەنێو-خۆی هەندەکییە نەک بوون بەگشـــتی. بوونی-بۆ-خۆ نەبوونێکی گشتی نییە بەڵکو کەمییەکـــی دیاریکراوە؛ خۆی بە کەمی ئـــەو بوونە دادەنێت. کەوابوو، کاری ئێمە

نییە لەسەر یەکگرتنی بوونـ بۆـ خۆ و بوونـ لەنێوـ خۆ بدوێین چونکە بوونـ بۆـ خۆ جەوهەرێکی سەربەخۆ نییە. مادام لەناوبردنە ئەوا بوونـ لەنێوـ خۆ دروستیکردوە؛ لەڕێگـەی ڕەتدانەوەی ناوەکییەوە و لەڕێگـەی بوونـ لەنێوـ خۆوە ئەوەی نییە بە خۆی دەناسێنێت. لەئاکامدا دەبێت بەوەی هەیە. ئەگەر کۆجیتۆ دەرچوونێکی پێویست بێت لە (خۆ)وە، ئەگەر ئاگامەندی بەسەر ئەوەی دەیەوێت بخلیسکێت بەبێ ئەوەی بتوانێت واز لە بوونـ لەنێوـ خۆ بهێنێت، لەبەر ئەوەیە، کە ئاگامەندی بەتەنیا ناتوانێت، وەکو خۆیەتییەکی ڕووت هەبێت. لەسەرەتاوە ئاماژە بۆ شتەکان دەکات.

هیـچ بوونێک بێجگە لەو تێڕامانە بۆ شـتێک ئاگامەنـدی نییە. ئایا ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێت، کە ئاگامەندی ئەوی دی ئەفلاتونییە؟ باسی کەسە بێگانەکەی نێو دایەلۆگی سۆفستمان لەبیرە، کە لە "ئەوی دی" دەدوێت، تەنیا "لەنێو خەودا دەبینرێت" و ئەوی دی (بۆنموونە، بوونی خۆی دەخوازێ) ناتوانێت بەتەنیا هەبێت. لە کاتێکدا دەردەکەوێت، کە کەسـێک تەماشای بوون بکات. ئەفلاتون خەسڵەتی دینامیکییەتی ئەوی دی کەسانی دیکەش لە پەیوەندییەکەی لەگەڵ خۆیدا بینیوە. لە هەندێک شوێندا ئەمە بە سەرچاوەی جوڵان دادەنێت. بەڵام ئەو دەیتوانی زۆرتر لە کێشـەکە بدوێت؛ دەیتوانی کەسـێکی دیکە یان ئەو نەبوونە ڕێژەییە، بە هۆی ئاگامەندییەوە بوون دابمەزرێنێت. ئەوەی لە بوون نییە لەنێو یەکێتی ڕەهەندەکانی کاتدا دەبێت بە خۆـ ئاگایی. ئەگەر ئەوی دیکە یاری کورسی و مۆسیقاکە نەبێت بە تێڕامـان کایەکە بکات و ئێمەش بە ناخی بوونـ بۆـ خۆمان دانا، ئایا چییە؟ تەنیا شـێوازێک بوونی کەسانی دیکەی، وەکو کەسانی دیکە تێدابێت ئاگاییە لە بوونی خۆ، وەکو کەسـێکی دیکە. کەسی دیکە، لەڕاستیدا، ڕەتدانەوەی ناوەکییە و ئەم ڕەتدانەوەیەش سـەر بە بوونی ئاگامەندییە. کەسـی دیکەش بەبێ دەرچوونی لە بوونەوە نابێت بە کەسـی دی؛ لەم ڕووەوە پەیوەندی بە بوونـ لەنێوـ خۆوە هەیە. بـەڵام خۆی دەکات بەوی دیکە؛ ئەگەر وانەبێت خەسـڵەتی ئەوی دی دەبێت بە شتێکی دراو. دواجاریش دەبێت بە بوونـ لەنێوـ خۆ. پەیوەندییەکەشی لەگەڵ بوونـ لەنێوـ خۆدا بە فاکتۆری دەبەستێتەوە؛ بەڵام، مادام بوونی خۆی دروستدەکات ئەوا شـتێکی ڕەهایە. ئەو خاڵەشمان لەوێدا باسکرد، کە گوتمان بوونـ بۆـ خۆ بناخەی بوونی خۆی، وەکو نەبوونی بوون نییە و بەردەوام نەبوونی بوونی دادەمەزرێنێت. کەوابوو، بوونـ بۆـ خۆ بوونێکی ناـ جەوهەری ڕەهای هەیە و سەربەخۆ نییە. پرسیار سەبارەت ڕاستەقینەی بوونی دەکرێت. پرسیارکردنی لەبەر ئەوەیە، کە ئەو بوونێکە لەنێو پرسیاردا؛ بوونی شتێکی دراو نییە بەڵکو پرسیاری لەبارەوە دەکرێت چونکە نەبوونـی بوونی کەسـانی دیکە بوونی ئەو لە خـۆی جیادەکاتەوە. بوونـ بۆـ خۆ هەمیشـە لـە چاوەڕوانیدایە چونکە بوونی دواخراوە. ئەگـەر لەگەڵ بوونیدا یەک

بگرێت ئەوی دی لەگەڵ ئەگەرەکان، زانین و جیهان لەناودەچێت. کەوابوو، گرفتی ئۆنتۆلۆجییانەی زانین لەگەڵ دانانی ئۆنتۆلۆجییانەی بوون-لەنێو-خۆ لەپێش بوون-بۆ-خۆدا چارەسەردەکرێت.

ئەمەش ڕاســـتەوخۆ دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی توێژینەوەی مێتافیزیکییانە. ســـەرهەڵدانی بوون-بۆ-خۆ و دەستپێکردنی گەشتەکەی بە بوون-لەنێو-خۆ لەگەڵ ســـەرچاوەی دیالیکتیکی ئەوی دی ئەفلاتونیدا بـــەراورد ناکرێت، کە لە بوونەوە دەستپێدەکات. 'بوون' و 'ئەوی دی' بۆ ئەفلاتون جۆرن. ئێمە، بەپێچەوانەی ئەمەوە، بە تاکمان دانان. بەهەمانشێوە، دەرکەوتنی بوون-بۆ-خۆ ڕووداوێکی ڕەهای ڕووەو بوونە. کەوابوو، لێرەدا جێگەی گرفتێکی مێتافیزیکییانەمان کردۆتەوە؛ بۆچی بوون-بۆ-خۆ، وەکو بوون سەرهەڵدەدات؟ بێگومان، مەبەستی ئێمە لە 'میتافیزیکانە' ئەو توێژینەوەیەیە پرۆســـەکانی تاکە کەس، کە جیهان بە هەمووگیرییەکی کۆنکرێتی تایبەت دەبینێت، دەکات بەبابەتی خۆی. لەم ڕووەوە، پەیوەندی نێوان مێتافیزیک و ئۆنتۆلۆجی لە پەیوەندی نێوان مێژوو لەگەڵ کۆمەڵناسی دەچێت. بێهودەیە بپرسین بۆچی بوون ئەوی دییە؟ ئەم پرســـیارە لەنێو سنوری بوون-بۆ-خۆدا دەگونجێت. تەنانەت بەرایی نەبوون بەســـەر بووندا دەســـەپێنێت. دەتوانین ئەم پرسیارە بە پرســـیارێکی دیکەوە، کە لەدەرەوە لەو دەچێت و هێشـــتا جیاوازیشە، ئاڕاستەی خۆمان بکەین: بۆچی بوون هەیە؟ هەروەها دەزانین پێویســـتە ئەو دووپرسیارە لە یەکدی جیابکەینەوە. یەکەمیـــان هیچ واتایەکی نییە: هەموو 'بۆچی' یەکان پاش بوون دێن و پێویســـتییان بو بوونە. بوون بێ هۆکار و پێویســـتییە؛ پێناسەکەی خەسڵەتی هەڵکەوتنیمان پێدەڵێت. وەڵامی دووەم پرسیاریشمان داوەتەوە. لەسەر زەمینەیەکـــی ئۆنتۆلۆجی نەک مێتافیزیکی دامەزراوە: بوون "لەوێدا هەیە" چونکە بوون-بۆ-خۆ هەیە. خەسڵەتی دیاردە لەڕێگەی بوون-بۆ-خۆوە دێتە بوونەوە.

کاتێک پرســـیارەکان ســـەبارەت بنەڕەتی بوون یان جیهان لە واتابەدەرن، یان وەڵامەکەیان ســـەر بە ئۆنتۆلۆجییە، کێشەکە بۆ بنەڕەتی بوون-بۆ-خۆ دەگۆڕێت. بوون-بۆ-خـــۆ دەتوانێـــت بۆ بنەڕەتی بوونـــی بگەڕێتەوە. ئـــەو بوونەی 'بۆچی' دەهێنێتەکایەوە مافی هەیە پرسیاری 'بۆچی' لە بوونی خۆشی بکات چونکە بوونی ئەو پرســـیارکردنە. ئۆنتۆلۆجی وەڵامی ئەم پرســـیارە نەداتەوە. گرفتەکە باسی ڕووداو دەکات و ئاماژە بۆ بونیادی بوون ناکات. ئەوەندە دەتوانێت ڕوونیبکاتەوە، کە ئەو نەبوونەی بوون-لەنێو-خۆ دروستیدەکات شتێکی لە واتابەدەر نییە. واتای نەبوونی لەناوبردن دەبێ دروستبکرێت تاکو بوون دابمەزرێت. ئۆنتۆلۆجی دووجۆر زانیاریمان دەداتێ، کە دەبن بە بناخە بۆ مێتافیزیک: یەکەم، هەموو پرۆسەیەک لە بناخەی (خۆ)دا پچڕانە لە ناسناوی بوونی بوون-لەنێو-خۆدا؛ دوورکەوتنەوەی بوونە لە خۆی لەنێو پەیوەندییەکەیدا و ئامادەبوونی خۆی یان ئاگامەندییەتی. بە بوون-

بۆ-خۆکردن ئەم بوونە دەبێت بە هاندەر بۆ بوونی و ئاگامەندیش، وەکو لەناوبردنی بـــوون. کەوابوو، قۆناخێک زۆرتر خۆی لـــە هۆگەرییەکی ناوەکی نزیک دەکاتەوە. بۆنموونـــە، دەبێت بە هۆکار بۆ خۆی. بـــەڵام نزیک بوونەوەکەی لەبەر کەمی لەب وونیدا ڕادەوەستێت. کاتی ئاگامەندی پرۆسەیەکی ژوورکێش بەرەو بوون بە هۆکار بۆ خۆ نییە. هۆکار-بۆ خۆ شتێکی مەحاڵە. بەهەمانشێوە ڕاکێشانی ستونی دەریا لەلایەن مانگەوە دەبێتە هۆکاری دروستبوونی شەپۆلەکان بێت بە تەختی. زانیاری دووەم، کە مێتافیزیک لە ئۆنتۆلۆجییەوە دەستیدەکەوێت، لەوەدایە، کە بوون-بۆ-خۆ پرۆژەیەکـــی بەردەوامە بۆ دامەزراندنی بوونی خۆی و بەردەوامیش لەم پرۆژەیەیدا سەرناکەوێت. ئامادەبوونی بە هەموو لایەنەکانی لەناوبردنەوە (وەکو لەناوبردنی سێ ڕەهەندەکەی کات و لەناوبردنی دوولایەنییەکەی تێڕامانی تێڕامان) ســـەرهەڵدانی ئەم پرۆژەیەیە؛ تێڕامان دابەشـــبوونی پرۆژەکـــە و گەڕانەوەیە بۆ خۆ تاکو خۆی دابمەزرێنێت. ســـەرنەکەوتنی پرۆژەکەش ئاســـتەنگی لەناوبردنەکە دروستدەکات. 'کردن' و 'هەیەتی'، کە کاتیگۆری ســـەرەکی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتین ڕاستەوخۆ یان ناڕاســـتەوخۆ دەبن بە پرۆژەی بوون. دواجاریش، هەردووکیان پێکەوە ڕاڤەی هەوڵدانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بۆ دۆزینەوەی خۆی دەکات. ڕادیکالانەش بوون و بوونی ئاگامەندی لەیەکدی جیادەکاتەوە.

ئۆنتۆلۆجی فێری دوو شـــتمان دەکات: یەکەم، ئەگـــەر بوون-لەنێو-خۆ خۆی دابمەزرێنێـــت دەبێـــت بە بوونێکـــی ئاگامەند؛ چەمکی بوون بـــە هۆکار بۆ خۆی ئامادەبوونی لەبەردەم خۆشـــیدا دەگرێتەوە. بۆنموونە، دەبێت ببێت بە لەناوبەری بوون. دووەم، ئاگامەندی پرۆژەی خۆ دامەزراندنە؛ دەبێت بە لەنێو-خۆی-بۆ-خۆ یان لەنێو-خۆ وەکو هۆکار-بۆ-بوونی خۆی. بەڵام هیچی دیکە دانامەزرێنن. هیچ شتێک ڕێگەمان نادات لە ئاســـتە ئۆنتۆلۆجییەکەدا لە سەرەتاوە لەناوبردنی بوون-لەنێو-خۆ لەنێو-بوون-بۆ-خۆدا بسەلمێنین، واتای هەیە و پرۆژەکەی بوونیش هۆکارە بۆ خۆی. لێرەدا ئۆنتۆلۆجی دژی ناکۆکی ڕادەوەســـتێت چونکە بوون-بۆ-خۆ ئەگەری بناخـــە دەهێنێتە نێو جیهانەوە. بۆ ئەوەی ببێت بە پرۆژەی بناخەی خۆی بوون-لەنێو-خۆ دەبێت لەبەردەم خۆیدا ئامادەبێت یان ئاگامەندبێت. کەوابوو، ئۆنتۆلۆجی بە بانگەشـــەکردنەکەی بۆ بوون-لەنێو-خۆ بـــۆ ئەوەی خۆی بکات بە بناخە دەبێ بوون-بۆ-خۆ بگۆڕێت. مێتافیزیک دەتوانێت گریمانەکان بۆ تێگەیشتن لەم پرۆسەیە، وەکو ڕووداوێکی ڕەها و تاجدانان لەســـەر تاکە کەس و بوونی دابنێت. ئاشکراشە ئەم گریمانانە بە گریمانەیی دەمێننەوە. ئێمە ناتوانین بیانسەلمێنین یان پوچەڵیان بکەینەوە. ســـەلماندنەکەیان دەکەوێتە سەر ئەگەری پێکەوەبەستنی ئەو شتانەی ئۆنتۆلۆجی پێکیاندەهێنێت. پێکەوەبەستنەکەش نابێت لە بۆچوونێکی مێژووییەوە بێت. کات لـــە ڕێگەی بون-بۆ-خۆوە ســـەرهەڵدەدات. لەبەر ئەمە پرســـیارکردن

لەبارەی بوونەوە پێش پەیدابوونی بوونۣ‌بۆ‌خۆ بێ واتایە. بەڵام مێتافیزیک دەبێت خەسڵەت و سروشتی ئەم پرۆسەیەی پێش مێژوومان پێبناسێت، کە سەرچاوەی هەموو مێژووە و هەوڵدانەکانی تاکە کەسی لەسەر ڕادەوەستێت. ئەرکی سەرشانی بیریارانی میتافیزیکە بڕیار لەسەر ئەو خاڵە بدەن، کە جوڵانەکە لەلایەن بوونۣ‌لەنێو‌خۆوە بۆ دامەزراندنی خۆی یەکەم هەنگاوە یان نا. هەروەها پەیوەندی جوڵان، وەکو "نەخۆشی لە بووندا" لەگەڵ بوونۣ‌بۆ‌خۆ، وەکو " نەخۆشییەکی قوڵتری لەناوبردن" بسەلمێنێت.

ئەوەی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە باسیبکەین گرفتی دووەمە، کە لەپێشەکی [ئەم نوسراوەدا] پێکمانهێنا: ئەگەر بوونۣ‌لەنێو‌خۆ و بوونۣ‌بۆ‌خۆ دوو شێوازی بوون بن، ئایا کەلێنێک لەنێو بیرۆکەی بووندا پەیدا نابێت؟ ئایا دووجۆر تێگەیشتنی جیاوازیان بۆ دروستنابێت، کە لەسەر دووجۆرە جیاوازە ڕادیکاڵەکەیان ڕادەوەستێت؟ ئەوەی لێرەدا یارمەتیمان دەدات ئاکامەکانی توێژینەوەکەمانە. ئێمە روونمانکردەوە بوونی لەنێو‌خۆ و بۆ‌خۆ لەتەنیشت یەکدییەوە دانەنراون. بەڵکو بەپێچەوانەوە، بوونۣ‌بۆ‌خۆ بەبێ بوونۣ‌لەنێو‌خۆ دەبێت بە شتێکی ڕووتکراووە؛ لەو ڕەنگە دەچێت سەر بە هیچ شتێکی ڕەنگدار یان ئەو دەنگەی سەربە هیچ شتێکی دەنگدار نەبێت. ئەو ئاگامەندییەی ئاگامەنییە لەبارەی هیچەوە هیچێکی ڕەهایە. بەڵام ئەگەر ئاگامەندی پەیوەندییەکی ناوەکی لەگەڵ بوونۣ‌لەنێو‌خۆدا هەبێت ئەوە دەگەیەنێت، کە لەگەڵ بوونۣ‌لەنێو‌خۆدا پێکهاتوە و هەمووگیری دروستدەکات. ئایا ئەو هەمووگیرییە نییە بە بوون یان ڕاستەقینە ناوزەددەکرێت؟ بێگومان، بوونۣ‌بۆ‌خۆ لەناوبردنە، وەکو لەناوبردنیش هەیە؛ لەگەڵ بوونۣ‌لەنێو‌خۆدا لە یەکێتییەکی پێشتردایە. یۆنانییەکان ڕاستەقینەی گەردوونیان لەو هەمووگیرییە، کە ئەم یان ئەو بۆشاییە نەبڕاوەی دەوری دابوو، جیاکردەوە. بەدڵنیاییەوە، ئێمە گوتمان بوونۣ‌بۆ‌خۆ هیچە و بێجگە لە تێڕامان بۆ ئەو هیچە، کە خۆی جیاکردۆتەوە و لەسەر بوونۣ‌لەنێوخۆ کە پێناسەدەکرێت، هیچ لەدەرەوەی بوونۣ‌لەنێو‌خۆدا نییە. بەڵام لێرەدا، ئێمەش شوێن بیریارە یۆنانییەکان دەکەوین و دەپرسین، ئایا ڕاستەقینە چییە؟ بەچی بڵێین بوون؟ بە گەردوون یان هەمووگیرییەکە؟ بە بوونۣ‌لەنێو‌خۆیەکی ڕووتی دابنێین یان لەنێو‌خۆیەکی گەمارۆدراوە لەلایەن ئەو نەبوونەوە، کە بە بوونۣ‌بۆ‌خۆ ناوزەدمانکرد؟

ئەگەر هەمووگیری بوون بە تێهەڵکێشەی بوونۣ‌بۆ‌خۆ و بوونۣ‌لەنێو‌خۆ دابنێین، ئایا توشی ئەو سەختییە نابینەوە، کە خۆمان لێی دوورخستەوە؟ ئایا لە بووندا توشی کەلێنەکە نابین؟ چۆن پێناسی ئەو بوونە بکەین، کە وەکو بوونۣ‌لەنێو‌خۆ شتێکە هەیە و وەکو بوونۣ‌بۆ‌خۆش ئەوە نییە، کە هەیە؟

ئەگەر بمانەوێت چارەسەری ئەم گرفتانە بکەین دەبێت بیر لە هەمووگیرییەکە

بکەینـــەوە: فرەلایەتی بونیادەکەی لەنێو یەکێتییەکیدا ببینین تاکو هەر یەکێک لە ئەوان بە ڕووتکراوی دەرنەکەون. ئاگامەندی بەتەنیا ڕووتکراوەیە؛ بەڵام بوون-لەنێو-خۆ پێویســـتی بە بوون-بۆ-خۆ بۆ بوونی نییە؛ ســـۆزی بوون-بۆ-خۆ تەنیا بوونی بوون-لەنێو-خۆ لەوێدا دەردەخات. دیاردەی دابڕاو لە ئاگامەندی ڕووتکراوەیە، بەڵام بوونی دیاردەکە ڕووتکراوە نییە.

ئەگەر بمانەوێت هەمووگیرییەک بدۆزینەوە تیایدا بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆ بە دوو شـــتی لە یەکدی دابڕاو دانەنرێن، پێویســـتە ئەو هەمووگیرییە بە جۆرێک بێت، کە بوونی بوون-لەنێو-خۆ لەناویدا لەو لەناوبردنەوە سەرهەڵدات، کە لێی بە ئاگا دێت. ئایا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە هەمووگیرییەکە لەســـەر ئەو بوونەی دەبێت بە هۆکار بۆ خۆی ڕادەوەســـتێت؟ ئەگەر پرســـیارەکەمان سەبارەت بوون-بۆ-خـــۆ بە بوون-لەنێو-خۆوە ببەســـتینەوە لەبەر ئەوەیـــە بوونی خۆمان بە هۆی تێگەیشـــتنی پێش-ئۆنتۆلۆجییانەی هۆکار-بۆخۆ، بە شتێکی لەپێشتر دادەنێین. بێگومـــان هۆکاری-بۆ خۆ مەحاڵە و ناکۆکیش لەنێو بیرۆکەکەیدا هەیە. هێشـــتا، مادام ئێمە پرسیار سەبارەت بوون دەکەین و لە ڕوانگەی هۆکار-بۆ-خۆوە دەڕوانینە کێشـــەکە پێویستە لەو بوونە تێبگەین. ئایا بە هۆکاری پەیدابوونی بوون-بۆ-خۆوە ســـەرهەڵنەداوە؟ ئایا بوون-بۆ-خۆ لە بنەڕەتەوە نابێت بە هۆکاری پرۆژەی بوونی خۆ؟ بەمجۆرە دەتوانین بە هەمووگیری ڕاســـتەقینە بگەیـــن. هەمووی بوون ئەو چەمکەیـــە هیچ کەڵێنێک نایکات بـــە دووکەرتەوە و لەناوبردنـــی بوون-بۆ-خۆش فرێنادات دەرەوە. ئەو بوونە تێهەڵکێشەی بوون-لەنێو-خۆ و ئاگامەندی تێدایە ئەو لەنێو-خۆیەیە بوون-بۆ-خۆ پەیدای کـــردوە و لەبوون-بۆ-خۆ دەچێت. بەڵام لەبەر ئـــەوەی ئێمـــە دەمانەوێت بڕوانینە ئەم بوونە تاکو حوکمی بەســـەردا بدەین ئەوا دەبێت وەدەستهێنانی خۆ-هۆکاری دەبێت بە هەوڵدانێکی سەرنەکەوتو. هەرشتێک ڕووبـــدات دەریدەخات مرۆڤ، جیهان و مرۆڤ لەنێو جیهاندا خوای لەگەڵدا نەبێت. دەردەکەوێت لەنێو تێهەڵکێشـــەکەدا هەموو پەیوەندییەکانی نێوان بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنیو-خۆ هەڵدەوەشـــێنەوە. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە یەکگرتنەکە ڕوویدابێت ، بەڵکو هەمیشە مەحاڵ بووە.

ئەم سەرنەکوتنە بەردەوامەیە تێکەڵ نەبوونی بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆ و هەمانکات پەیوەندی کەڵێنەکەی نێو چەمکی بوون دەردەخات. ئەگەر مەحاڵ بێت لـــە چەمکی بوون-لەنێو-خۆوە بۆ چەمکـــی بون-بۆ-خۆ بڕۆین و لەنێو یەک جۆردا یەکێتییەکان دروستبکەین لەبەر ئەوەیە، کە تێپەڕبوونەکە لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی دیکە و یەکێتییەکەشـــیان کاریگەر نییە. ئێمە دەزانین بۆ سپینۆزا و هیگڵ ئەگەر لەنێو تێهەڵکێشەیەکدا چەمکەکان پەیوەنیدار و سەربەخۆش بن ئەو تێهەڵکێشەیە بە هەڵە دروســـتکراوە. بۆنموونە، لای سپینۆزا چەمکی خڕی لە سوڕانەوەی نیوە

بازنـــه بە دەوری تیرەکەیدا واتاکەی دەردەکەوێت و دەســـەلمێنرێت. بەڵام ئەگەر چەمکی خڕیمان دەســـتنەکەوێت دیاردەی ســـوڕانەوەی نیوە بازنەییەکە ســـاختە دەردەچێت. چەمکەکانی سوڕانەوە و بازنە پێکەوەن بەبێ ئەوەی یەکیان گرتبێت؛ هیچ کامیان بۆ ئەوی دیکە کەم ناکرێتەوە.

لەم ئاســـتەدا جارێکی دیکە چەمکی هەمووگیری نا-هەمـــوو دەدۆزینەوە، کە باســـەکەمان لەسەر بوون-بۆ-خۆ و پەیوەندی ئاگامەندی کەسانی دیکەوە توشمان بوو. بەڵام ئەمە جۆری ســـێیەمی نا-هەمووەکەیە. لە هەمووگیری نا-هەمووەکەی تێڕاماندا ئەو شـــتەی لەبەردەم تێڕاماندایە دەبێت تێڕامان بکەوێتە سەری. ئەوەی تێڕامانیش دەکەوێتە ســـەری دەبێ لەبـــەردەم تێڕاماندا بێت. ڕەتدانەوەی دووقات لەناودەچێت. لەحاڵەتی بوون-بۆ-کەســـانی دیکـــەدا تێڕامانەکان جیادەکرێنەوە و هەریەکێک لە ئەوان نابێ کەســـانی دیکە بێت. کەوابوو، بوون-بۆ-خۆ و کەسەکەی دیکەی-بوون-بۆ-خۆ بوونێک پێکدەهێنن، کە تیادا هەریەکێک لە ئەوان بوونی خۆی وەکو کەسێکی دیکە بۆ کەسەکەی دیکە دەسەلمێنێت. سەبارەت هەمووگیرییەکەی بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆشەوە بوون-بۆ-خۆ لەنێویدا بۆ بوون-لەنێو-خۆ خۆی دەکات بەکەســـێکی دیکە، بەڵام بوون-لەنێو-خۆ لە بوونی بوون-بۆ-خۆدا نابێت بە ئەوی دی؛ بوون-لەنێو-خۆ هەیەیەکی ســـادەو ڕووتە. ئەگەر پەیوەندییەکەی نێوان بوون-بۆ-خۆ و بوون-لەنێو-خۆ دوولایەنی بێت ئەوا دەکەوینە نێو پەیوەندی بوون-بۆ کەسانی-دیکە. بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەمجۆرە پەیوەندییەیان نییە. تاکو ئەم ڕادەیە پرسیار ســـەبارەت هەمووگیرییەکە بێهودە نییە. کاتێک لەسەر بوون-بۆ-کەسانی دیکەمان کۆڵییەوە باسی ئەوەمانکرد، کە پێویستە کەسێکی دیکە بۆ بوونم هەبێت. هەروەها ئەوەشـــمان ڕوونکردەوە ئەو کەســـەی دیکە بۆ من دەتوانێت لەدەرەوەدا هەبێت. لەم بۆچوونەوە پرسیارمان لەبارەی خەسڵەتی پارادۆکسی هەمووگیرییەکە کرد. بەو باوەڕەش گەیشتین، کە پرسیار لەبارەی یەکێتی ئاگامەنییەکان بێ واتایە چونکە تێڕوانینی ئێمەی پێویست بوو! ئێمە لەسەر بناخەی هەمووگیرییەکە دەژین و مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.

ئەگەر تێڕوانینمان نەبێت هۆکەی بۆ ئەو خاڵە دەگەڕێتەوە، کە کەسێکی دیکە خۆی بە من دانابێت و منیش خۆم بە ئەو دانانێم. پەیوەندی دانەوەی نێوانیان ڕێگەبەستی تێگەیشتنمە لە هەمووەکە. لەحاڵەتی ڕەتدانەوەی ناوەکی بوون-لەنێو-خۆی-بوون-بۆ-خـــۆ پەیوەندییەکە دوولایەنی نییە. من یەکێک لە چەمکەکانی پەیوەندییەکە و پەیوەندییەکەشم. ئەو کاتەی لە بوون تێدەگەم و دەبم بە تێگەیشتنەکە لە بوون. ئەو بوونەی لێی تێدەگەم ڕووبەڕووی من نابێتەوە تاکو من لەبەردەم خۆی دابنێت؛ ئەو شـــتەیە، کە تێیگەیشتوم. بوونیشـــی نابێت بەو بوونەی تێیگەیشتوین. بەم واتایە، دەتوانم پرســـیار لەبارەی هەمووگیرییەکـــەوە بکەم. من هەم تاکو مامەڵە

لەگەڵ هەمووگیرییەکەدا بکەم، بـــەڵام مامەڵەکردنەکە ماندووم دەکات چونکە من لە یەک کاتدا ئاگاییم لە بوون و ئاگاییشم لە بوونی خۆم. پرسیارەکەش سەبارەت هەمووگیری ســـەربە ئۆنتۆلۆجی نییە. دەڤەرەکانـــی ئۆنتۆلۆجی بوونۦ-لەنێوۦ-خۆ، بوونۦ-بۆۦ-خـــۆ و هۆکارۦ-خۆییە. بۆ ئۆنتۆلۆجی گرنگ نییە بوونۦ-بۆۦ-خۆ و لەنێوۦ-خۆ پێکەوە پێکبهێنین یان جیابکرێنەوە. مێتافیزیک بڕیار لەسودبەخشی لایەنێکیان بۆ زانینن دەدات (بەتایبەتی بۆ ســـایکۆلۆجی فینۆمینۆلۆجییانە، مرۆڤناسی و هتد.):

مامەڵە لەگەڵ بوونێکدا دەکات ئێمە ناوی دەنێین دیاردە و دوو ڕەهەندی بوونی، وەکو بوونۦ-لەنێوۦ-خۆ و بوونۦ-بۆۦ-خۆی بۆ دادەنرێت (لەم ڕووەوە تەنیا یەک دیاردە هەیە، کە جیهانە)؛ وەکو لە فیزیای (ئانیشـــتاین)دا بـــاس لە ڕووداوێک دەکەین ڕەهەندەکانی شـــوێنی و کاتی هەبێت یان چۆن لە کۆندا باسی دوولایەنی بوون و ئاگامەنـــدی دەکرا. تەنیا تێڕوانینێکی ئۆنتۆلۆجییانە هەبێت ئەوەیە، کە دەتوانین چەمکێکـــی نویێ بۆ دیاردەی پێدروســـتبکەین، کە هەمووگیرییـــە پێکهاتوەکەیە. ئێمەش دەتوانین بەشتێکی ناوەکی و یان بەرزی دابنێین.

مەترسییەکەش لە گەڕانەوەماندایە بۆ ڕاڕەوی ناوەکییەکی ڕووت (وەکو ئایدلیزمی هوســـرڵ) یان ڕاڕەوی بەرزێتی ڕووت، وەکو بابەتێکی نویێ. بەڵام خودی ڕەهەندی دیاردەکە لایەنی ناوەکی و ڕەهەندی بۆۦ-خۆ لایەنی بەرزێتی سنوردار دەکەن. پاش بڕیاردان لەســـەر پرسیاکردن سەبارەت بنەڕەتی بوونۦ-بۆۦ-خۆ و سروشتی دیاردەی جیهـــان بیرپاری مێتافیزیک دەتوانێت چەنـــد گرفتێکی گرنگ، بەتایبەتی لەبارەی کارکردنەکەیەوە، بناسێت.

لەڕاســـتیدا، کارکردن ڕاستەوخۆ دەبێت لەســـەر زەمینەی بوونی بوونۦ-بۆۦ-خۆ و بوونۦ-لەنێوۦ-خۆ دابنرێت. مامەڵە لەگەڵ پڕۆژەیەکدا دەکات، کە ســـەرچاوەکەی ناوەکییـــە و گۆڕان بەســـەر بوونە بەرزە[دەرەکییەکەدا] دەهێنێت. بێســـودە بیر لەوەبکەینەوە، کە کارکردن گۆڕان بەسەر دیاردەی شتەکەوە دروستدەکات. ئەگەر دیـــاردەی لێوانێک بگۆڕین بۆ شـــتێکی نەبوو، هەروەهـــا بوونی لێوانەکەش تەنیا چۆنیەتییەکـــەی بێت ئەوا کردەوەکە دەتوانێت بوونـــی لێوانەکە بگۆڕێت. گرفتی کارکـــردن لەوەدایە، کـــە داوای ڕوونکردنەوەی بەرزێتـــی کاریگەرێتی ئاگامەندی دەکات. ئێمەش دەخاتە سەر ڕێگای پەیوەندی جۆراوجۆر لەنێوان بوون و بووندا، کە بیرپاری فیزیاش بەلایەنی دەرەکی دەناسێت. ئەو لایەنەش دەرەکییەکی ڕووت یان ناوەکییە و فۆرمی گیشـــتاڵتی بۆ ئێمە دەردەخات. لەم چەمکانەوە کەســـێک دەتوانێت مێتافیزیکی سروشت دابمەزرێنێت.

## ٢- ئاكامە ڕەوشتییەکان

ئۆنتۆلۆجـــی بـــۆ چوونە ڕەوشـــتییەکان پێکناهێنێت. ئەو تەنیـــا لە چییەتی دەکۆڵێتەوە، ئێمەش ناتوانین فەرمانەکان لەوێوە دەربهێنین. بەڵام ڕێگەمان دەدات تەماشایەکی ڕەوشت بکەین و ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ هەڵوێستی مرۆڤانەدا بیر لە لێپرسینەوەکانمان بکەینەوە.

ئۆنتۆلۆجی سروشت و بنەڕەتی بەهامان بۆ دەردەخات؛ ئێمە بینیمان، کە بەها لە پەیوەندی نێوان بوون-بۆ-خۆ و بووندا کەمییە. مادام بوون-بۆ-خۆ هەیە بەهاش سەرهەڵدەدات و دەبێت بە دێوەزمەی ئەم بوونە. لەبەر ئەم چالاکییەکانی بوون-بۆ-خۆ دەبن بە بابەتی سایکۆلۆجی شیکاری بوونگەرایەتی چونکە ئامانجی هەموویان پێکەوەبەســتنەوەی ئاگامەندی و بوونە لەشـــێوازی بەها یـــان خۆ-هۆکاریەتیدا. کەوابوو، ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی توێژینەوەیەکی ڕەوشتییە. واتای ڕەوشتی پڕۆژەکانی مرۆڤمان پێدەناسێت. ڕێگەنادات شوێن سایکۆلۆجی سودبەخش و ڕاڤەکردنی سودبەخشـــگەری بۆ هەڵوێســـتی مرۆڤ بکەوین. واتا ئایدیاڵەکانمان پێدەگەیەنێـــت. ئەم واتایانە لەژوور خۆگـــەری و خەڵک خواییەوە یان هەموو ئەو هەڵوێستانەوەیە، کە بەنەویست ناودەبرێن.

بـــۆ ئەوەی مرۆڤ ببێت بە خوا دەبێت خۆی بکات بەمرۆڤ. ʻخۆʼ لەم ڕووەوە دەبێت بە بناخەی خۆگەری؛ پێوەرێکی دیاریکراویش لەنێوان ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی و خۆ-هۆکارییـــدا نییە تاکو بڵێین لەوێدا مرۆڤ خۆی وندەکات بۆ ئەوەی ببێت بە هۆکار بۆ خۆی. لەبەر ئەمە بوونی مرۆڤ سۆزە، بوونەوەرێکی ناوداری خۆ-ویستە، کە سەربەستانە هەڵبژاردوە بوونی خۆی بەوسۆزە دابنێت.

بەڵام ئاکامی سەرەکی سایکۆلۆجی شیکاری بونگەرایەتی دەبێت کارمان تێبکات واز لـــە گیانی (جیدی) بهێنیـــن. گیانی (جیدی) دوو خەســـڵەتی هەیە: بەهاکان بـــە بەرز و دراو لەودیـــو خۆیەتی مرۆڤەوە دادەنێت، خەســـڵەتی ʻحەزلێکراوʼ لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی شتەکانەوە بۆ پێکەهاتە ماتەرییە سادەکان دەگوێزێتەوە. بۆ گیانی (جیدی)، بۆنموونە، نان شتێکە ویستراوە چونکە بۆ ژیان پێویستە. ئاکامی گیانی (جیدی)، وەکو دەزانین، فەرمانڕەوایی جیهان دەکات.

چڕی بابەتە ویستراوەکە دەخاتە پێشەوە و ڕێگەی کەمکردنەوەی نادات. کەوابوو، ئێمە لەسەر زەمینەی ڕەوشـــت ڕاوەستاوین، بەڵام هەمانکات توشی بروای خراپیش بووین چونکە ڕەوشت شەرم لە ناوهێنانی خۆی دەکات و ناوێرێ بیدرکێنێت. بۆ ئەوەی خـــۆی لە دوودڵی ڕزگاربکات هەموو ئامانجەکانی خۆی بە شـــاراوەیی داناوە. مرۆڤ کوێرانە بەشاردنەوەی پڕۆژە سەربەستەکەی لە خۆی دەیەوێت دوای بوونی بکەوێت.

ســـایکۆلۆجی شـــیکاری بوونگەرایەتی ئامانجی ڕاستەقینەی گەڕانەکەی مرۆڤ بـــە دوای خۆیدا دەردەخات، کە تێهەڵکێشـــەی بوونـ لەنێو خۆ و بوونـ بۆ خۆیە؛ مرۆڤ بە سۆزی دەناسێنێت. لەڕاستیدا زۆرکەس ئەم سایکۆلۆجییە شیکارییەکان بەسەرخۆیاندا بەبێ فێربوونی بنەماکانی تاقیکردۆتەوە. زۆرکەس ئامانجی گەڕانیان بـــەدوای بووندا و بەگوێـــرەی زانینەکەیان، ناســـیوە. نایانەوێت لەپێناوی خودی شـــتەکاندا ببن بە خاوەنیان و خاوەنێتییەکـــی هێماگەرانەیان بۆ بوونـ لەنێو خۆ هەیـــە. بەڵام لەبەر ئـــەوەی ئەم هەوڵدانە جۆرە گیانێکی (جیـــدی) پێوە دیارە و کەســـەکانیش لەوباوەڕەدان کاریگەرێتییەکەیان بەســـەر بوونـ لەنێو خۆی بوونـ بۆ خۆوە نوســـراوەتەوە خەمۆکی دەبن؛ بۆیان دەردەکەوێت هەموو چالاکییەکانی مرۆڤ (چونکە لەپێناوی گەیشـــتن بە بوونێکـــی هۆکار خۆییدا قوربانی بە بوونی مـــرۆڤ دەدەن)، وەکـــو یەکن. هەموویـــان لەبنەڕەتـــەوە ڕووەو ڕووخان دەڕۆن. کەوابوو، جیاوازی لەنێوان مرۆڤێکی سەرخۆشـــی تەنیا و سەرۆکی گەلێکدا نییە. ئەگەر یەکێک لە چالاکییەکان پێش ئەوانی دیکە بکەوێت لەبەر ئامانجەکەی نییە، بەڵکو لەبەر ڕادەی ئاگامەندییەکەیەتی لە ئامانجەکەی. لەمحاڵەتەدا، گۆشەگیری و تەنیایی سەرخۆشەکە پێش هەوڵدانە بێبەرەکەی سەرۆکەکە دەچێت، کە دەیەوێت کاربکاتە سەر گەلەکەی.

ئۆنتۆلۆجی و ســـایکۆلۆخی شـــیکاری بوونگەرایەتی پێویستە ئەوە بۆ مرۆڤ دەربخەن، کە لەڕێگەی بوونی ئەوەوە بەهاکان دێنەکایەوە. لێرەدا سەربەستییەکەی دەبێت بە خۆ ئاگایی و خۆی لە دوودڵیدا، وەکو سەرچاوەی نەبوون و بەها، کە جیهان دەهێنێتە بوونەوە و بەرجەستە دەکات. ئەو کاتەی سەربەستی توێنێتییەکەمان بۆ بوون و خاوەنێتی بوونـ لەنێو خۆ دەکات بە ئەگەرەکانی تێدەگات، کە ئەگەرەکان لەڕێگەی ئەگـــەری دیکەوە دەبن بە ئەگەر. مـــادام ئەگەرەکانیش هەڵدەبژێرین و ڕەتیش دەکرێن، ئەو بناخەیەی یەکێتی هەموو ئەگەرەکان دروستدەکات بەهایە یان ئامادەبوونی بیرۆکەیی هۆکار خۆییە. ئایا سەربەســـتی چی بەسەر دێت ئەگەر واز لەم بەهایە بهێنێت؟ ئایا سەربەستی بەهاکە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت کاتێک واز لە بوونـ لەنێو خۆی بوونـ بۆ خۆ دەهێنێت؟ ئایا سەربەستی لەپشتەوە بەو بەهایەدا دەناســـرێتەوە، کە دەیەوێ بیری لێبکاتەوە؟ یان سەربەســـتی لە پەیوەندییەکی لەگەڵ خۆیدا خۆی دەناسێت و کۆتایی بە بەهاکانی دەهێنێت؟ ئایا دەکرێت خۆی بە بەها و ســـەرچاوەی بەهاکانیش دابنێت یان دەبێت لەڕێگەی ئەو بەها بەرزەوە پێناســـبکرێت، کە بووە بە دێوەزمەی؟ ئاگامەندی ئەو سەربەستییەیە، کە ڕوو لە خۆی دەکات، ئەو بوونەیە کە ئەوە نییە ئێستا هەیە و ئەوەشە، کە نییە، هەروەها وێنەی بوونیش لەنێو ئەوەدا دەبینێت، کە هێشتا نییە و ئەوەشە ئێستا هەیە.

ئەم سەربەســـتییە نایەوێت خۆی بدۆزێتەوە بەڵکو لەدەســـت خۆی ڕادەکات،

نایەوێت لەگەڵ بوونی خۆیدا یەکسان بێت بەڵکو دوور لە خۆی ڕادەوەستێت. چۆن لەم بوونە تێبگەین، کە خۆی بە ترسەوە ڕادەگرێت و دوور دەوەستێت؟ ئایا ئەم پرسیارە سەبارەت بڕوای خراپ یان هەڵوێستێکی گرنگی دیکەیە؟ ئایا کەس هەیە بەم جۆرە بژی؟ ئایا سەربەستی بە دانانی خۆی، وەکو کۆتایی لە هەموو هەڵوێستێک ڕادەکات؟ یان بەپێچەوانەوە خۆی لەنێو هەڵوێستدا دەبینێت؟ ئایا خۆی دەخاتە نێو هەڵوێستەوە تاکو زۆرتر ببێت بەشتێکی تاک و پڕۆژەی بوونی بخاتەگەر و لەنێو دوودڵیدا خۆی مەرجدار بکات، هەموو لێپرسینەوەیەک بگرێتە ئەستۆی و خۆی بەو بوونە دابنێت، کە جیهان دەهێنێتە کایەوە؟ هەموو ئەم پرسیارانە، کە ئێمە بەرەو تێڕامانێکی ڕەوان نەک یاریدەدەر ڕادەکێشن، وەڵامەکانیان لە بەستێنی ڕەوشتدا دەدرێنەوە. ئێمەش لێکۆڵینەوەی زۆرتری بۆ تەرخان دەکەین.

## کۆتایی